# ئانا کارنینا

## لیۆن تۆلستۆی

وەرگێڕانی

ئەمین گەردیگلانی

وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان بەڕێوەبەرایەتی
گشتی رۆژنامەنووسی و چاپ و بلاوکردنەوە
بەڕێوەبەرایەتی بلاوکردنەوەی هەولێر

دەزگای توێژینەوە و بلاوکردنەوەی موکریانی

- **ئانا کارنینا (رۆمان)**
- **نووسینی: لیۆن تۆلستۆی**
- **وەرگێڕانی لە فارسییەوە:** ئەمین گەردیگلانی
- **نەخشەسازی ناوەوە:** رێدار جەعفەر
- **بەرگ: هۆگر سدیق**
- **نرخ: هەردوو بەرگ (پازدە هەزار دینار)**
- **چاپی یەکەم ٢٠١١**
- **تیراژ:** دانە
- **چاپخانە:** چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان (هەولێر)
- **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٦٦٠)ی ساڵی (٢٠١١) پێدراوە.**

**زنجیرەی کتێب (٦٦٧)**

**ئەو کتێبە و کتێبەکانی وەزارەتی**
**رۆشنبیری لەسەر ئەو ماڵپەڕە بخوێنەوە**

**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com
**www .Kurdchap.com** **ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# پێرست

## پێشەکی وەرگێڕ

لەوەتا هەستم بە دەوڵەمەندیی زمانەکەمان کردووە و زانیومە دەتوانم لەگەڵ فەرهەنگ و زمانی دیکەدا بە زۆرانی بدەم. خەمی زمان و فەرهەنگەکەم هەڵم دەچۆقێنێ و دەمهەوێ بە هەموو شێوەیەك خزمەتی پێبکەم و دەوڵەمەندی بکەم. بۆیە بۆ هەموو لایەك پەلدەکوتم و خەریکی هەموو کڕوکاش و هەوڵ و تەقەلایەکم. ئێمە زمانەکەمان لە وشەدا زۆر دەوڵەمەندە، بەڵام رێزمانەکەی کاری پێنەکراوە، بۆیە لاواز ماوەتەوە. من دەمهەوێ ئەوەندەی لە دەستم دێ رستەی تەواو و زاراوە و کینایە و ئیدیۆم و دەستەواژە لەسەر خەرمانی زمانەکەم کۆکەمەوە و گەشەی پێ بدەم. لێرەدا بە باشی دەزانم ئەو نەختە ئەزموونەی لە ماوەی ئەو چەند ساڵەدا وەدەستم هێناوە، بیخەمە بەر دیدەی خوێنەرانی ئازیز.

بۆ وەرگێڕان بەر لە هەموو شتێك خوێندنەوەیەکی ناوەکی و چڕوپڕ و شۆڕبوونەوە بە قووڵایی دەقەکەدا پێویستە بە جۆرێ، کە وەرگێڕ لەگەڵ رۆحی نووسراوەکە تێکەڵ بێ و وا بزانێ ئەو بەرهەمە خۆی نووسیویێتی. هەموو نووسراوەیەکیش بۆ وەرگێڕانەوە نابێ، رەنگە دەقەکە لاوازبێت و گرینگایەتییەکی ئەوتۆی نەبێ، کە وەرگێڕ زەحمەتی پێوە بکێشێ و وەختی بۆ بەفیڕۆ بدا، چونکە ئەو کێش و نرخەی نییە، کە بتوانێ کەلێنێك پڕبکاتەوە.

چونکە مەبەستی سەرەکیی وەرگێڕ تیشك خستنە سەر ئەو بابەتەیە، کە وەریدەگێڕێتەوە و ئاشناکردنی خوێنەرانی خۆمانە بەو دەقانەی کە بە پێویستی دەزانێ ئەو جۆرە بابەتە لە ئەدەبیات و زمانەکەی خۆشیدا ببێ و کەڵکی لێ وەرگیرێ، یان کاتێ دەیخوێنێتەوە هێندەی بەلاوە شیرینە و تام و چێژی لێ دیوە، کە پێی حەیفە کەسانێکی دیکەش وەك ئەو، ئەو تام و چێژەی لێ وەرنەگرن. کەسێك وەرگێڕی باشە کە بەسەر دوو زمانی سەرچاوە و مەبەستدا زاڵبێ و بە شێوەی ئەمانەتدارانە ناوەرۆك و هونەری دەقەکە راگوێزێتە سەر زمانێکی تر و لە راستیدا وەرگێڕانەکەی نووسینەوەیەکی نوێ بێ.

وەرگێڕان لە باری زمانیشەوە خزمەت بە ئەدەب دەکات و زمانی پێ پوختە دەبێ و بە تایبەت بۆ ئێستای زمانەکەمان زۆر باشە و وەرگێڕ بە وەرگێڕانەکەی هاوتا و هاولفی زۆر لە وشەکان دەدۆزێتەوە و بەکاریان دێنێ و زمانی پێ دەوڵەمەند دەبێ.

یەکێکی دیکە لە ئەرکەکانی وەرگێڕان ئەمانەتدارییە، وەرگێڕی رۆمان و چیرۆك دەبێ هێندە خوێنەرێکی کارامە و لەزەبر بێ و هێندەی چیرۆك و رۆمان خوێندبێتەوە، کە شێوەی داڕشتنی چیرۆك و رۆمان بزانێ و وای دابڕێژێتەوە کە زەبر لە ناوەرۆك و تەکنیکی دەقەکە نەدات. چونکە وەرگێڕان ژوانگەی پێگەیشتن و لێك تێگەیشتنی فەرهەنگ و زمانەکانە. هەر نەتەوەیەك خۆی لەو ژیارە بە دووربگرێ و ئاوڕ لە هونەری وەرگێڕان نەداتەوە و ئەدەب و هونەر و زمانەکانی تر نەناسێ، تاك و تەریك دەکەوێتەوە و زمان و فەرهەنگەکەی بەرەو لاوازبوون و تێداچوون گلۆردەبێتەوە و لە جێی خۆی دەپووکێتەوە، یان بێ هێز و بڕشت دەبێ و توانایی بەرەوڕووبوون لەگەڵ کلتوور و فەرهەنگەکانی ئەمڕۆی نابێ. هەروەها چیرۆك و شێعر و رۆمان و لێکۆڵینەوەی باش لەزمانەکانی دیکەدا هەن، کە لە ئەدەبیاتی ئەمڕۆی ئێمەدا جێیان خاڵییە و دەتوانین بە وەرگێڕانی باش و بە نرخ ئەو بۆشاییانە پڕ بکەینەوە. . وەرگێڕ جگە لەوەی دەبێ بەسەر هەر دوو زمانەکەدا زاڵ بێ، لە راستیدا دەبێ لەگەڵ هەر دوو زمانەکەش ژیابێ و کانگای پەند و زاراوە و ئیدیۆمەکانی هەر دوو زمانەکەی لە مێشکیدا کۆکردبێتەوە، دەبێ ئەزموونی خوێندنەوەی چڕ و پڕ و نووسینی دەقیشی هەبێ و شێوازی نووسینەکان تا رادەیەکی زۆرباش بناسێ. وەرگێڕی رۆمان دەبێ خاوەنی زمانێکی پاراو و دەوڵەمەندبێ و بۆ وشە و پەند و زاراوە دانەمێنێ و هاوسەنگەکەیان بناسێ. لەسەریەك دەبێ مێشکی ئینسایکلۆپیدیایەکی «بانکی زانیاری» پەند و زاراوە و وشەبێ.

یەکێ لە گرفتە سەرەکییەکانی وەرگێڕان رووبەڕووبوون لەگەڵ زاراوەیە کە وەرگێڕ دەبێ ئەو تواناییەی هەبێ کە هاولفی ئەو زاراوەیە یا شێوەی هاومانای وشە و زاراوەکە لە زمانەکەی خۆیدا بدۆزێتەوە. بۆ وێنە لە فارسیدا دەڵێن: «بیا چایی تو بخور یخ شد» ئێمە ئەگەر بڵێین «وەرە چایەکەت بخۆ بوو بە سەهۆڵ» جوان نییە و هاولفی ئەو زاراوەیە لە زمانی ئێمەدا ئەوەیە: «وەرە چاییەکەت بخۆ بوو بە دەمی مردوو». «از شادی در پوست خود نمی گنجید.» خۆناکرێ بڵێین «لە خۆشیاندا لە پێستی خۆیا جێی نەدەبۆوە.» ئێمە دەبێ بزانین کوردێك لەو کاتەدا چی دەڵێ، ئەوەی لە جێ دانێین. هاوسەنگی پڕ بە پێستی ئەوەش ئەمەیە: «لە خۆشیانا پێی وە عەرز نەدەکەوت.»، یان «جواب های، هو است»، «جێی کلۆ بەردە»، «جێگای قوزەڵقورت سندان و دەردە.»" «کاسە داغتر از آش»، «کوچکی گەرمتر لە ئاور»" «کاسەای زیر نیم کاسە است»، «ئەم ماستە بێ موو نییە»" «خر بیار و باقالی بار کن»، «وەرە ئەو کەرە لەو قوڕاوە دەرێنەوە.»" «نە شیر شتر، نە

دیدار عرب»، «نه گۆشتی کەروێشك، نە بۆتسی تاجی»" «نوشداروی بعد از مرگ سهراب»، «دوای باران کەپەنك»" «مار گزیدە از ریسمان سیاه و سفید می رسد»، «دەمی بە شیر سووتاوە فوو لە دۆش دەکات».

یەکی دیکەش لەو دیاردە ناحەز و زەقانەی کە لە زۆربەی وەرگێڕاوی ئەمڕۆدا دەکەوێتە بەر چاو، وەرگێڕانی وشە بە وشەی کۆ(جمع)یە. بۆ وێنە فارس دەڵێ: «درختهای گیلاس» وەرگێڕی کوردینەزان و کەمتەرخەمیش وەریدەگێڕێ بە «دارەکانی گێلاس» کە ئەوە هەڵەیەکی زۆر زەق و دزێوە و رووخاندنی بنچینەی زمانە، چونکە لە کوردیدا کۆ دەبێتە پاشگری ناو. بۆیە دەڵێین: «دار گێلاسەکان». لە زۆر جێگاشدا تاك، مانای کۆ دەدا بە تایبەت لە رستەی تەواودا. کاتێك دەکەوێتە رستەی تەواوەوە زۆر بە ئاسانی دەتوانین نیشانەی کۆی لێبقرتێنین، بۆ وێنە ئەم رستە فارسییە، کە کۆ بە ناوی بکەرەوە نووساوە، ئاوا وەرگێڕینەوە. «درختان بلوط کوهستان را پوشانیده بود.» «دار بەڕوو، کوێستانیان داپۆشیبوو.» ئیتر ناڵێین «دار بەڕووەکان کوێستانیان داپۆشیبوو.» چەند نموونەی دیکەش لەو بارەوە دێنمەوە: «پرندگان تیزبال» «باڵندە تێژباڵەکان» دروستە نەك «باڵندەکانی تیژباڵ»، «شهرهای دور» «شارە دوورەکان» دروستە نەك «شارەکانی دوور»، «درختان سرو» «دارە سەوڵەکان» دروستە نەك «دارەکانی سەوڵ».

## بۆ رۆمانی «ئانا کارنینا»م وەرگێڕا؟

ڕۆمانی ئانا کارنینا یەکێك لە شاکارە ئەدەبییەکانی جیهانە و بە زۆربەی زمانە زیندووەکانی دنیا وەرگێڕدراوەتەوە. ڕاستە ڕۆمانی "شەڕ و ئاشتی" یەکەم شاکاری لیئۆ نیکۆلایڤیچ تۆلستۆی دێتە ئەژمار، بەڵام ڕۆمانی ئانا کارنیناش شاکارێکی کەم وێنەیە و تۆلستۆی زۆری گرینگی پێداوە و ئەگەر ئاوڕ لە ژیان و سەربردەی پڕ لە هەوراز و نشێوی ئەو نووسەرە بدەینەوە، بۆمان دەردەکەوێ شیلە و هەوێن و هەستەکانی ژیانی هەمووی لەو ڕۆمانەدا ڕەنگی داوەتەوە و لە ڕاستیدا هیوا و ئاوات و خەمەکانی خۆیەتی نووسیویێتەوە. من دوای چەند جار خوێندنەوە و لەکاتی وەرگێڕانیشدا زۆر جار پێم وابوو ژیاننامەی تۆلستۆی دەخوێنمەوە و زۆر جار لە زەینی خۆمدا «لەڤین» و«تۆلستۆی» و «کیتی»و «سۆفیا»م لیێ تێکەڵ دەبوو.

تۆلستۆی هەمیشە دڵتەنگ و خەملەبەری چینی هەژاری کۆمەڵگاکەی بوو و لە هەموو بارێکەوە یارمەتیی دەدان و ئاسانکاریی بۆ دەکردن و تەنانەت زۆر جار کاریشی لەگەڵ دەکردن. هەروەها خۆشەویستی و ئەوینی سۆفیا تێکەڵ بە خوێن و دەماری بووبوو، سەرەڕای کێشە و شەڕە دەندووکە و گومان و ساردی و تۆران و ئاشتبوونەوە، هەستی دەکرد تەواوی ژیان و بوونی بە سۆفیاوە بەندە و بێ ئەو ناتوانێ بژی. لە ڕۆمانی ئانا کارنیناشدا کاتێك خۆشەویستی و ئەوینی لەڤین دەبینین بۆ کیتی، ناهەقمان نییە ئەگەر پێمان وابێ تۆلستۆی لەڤینە و سۆفیاش کیتییە.

هەروەها تۆلستۆی جیاوازیی چینایەتی زۆری ئازارداوە و تەنانەت خەمی ئەوەش هەڵیچۆقاندووە، کە هۆزێك یان کەمەنەتەوەیەك خەریکە بە دەستی گەلی باڵادەست و دەسەڵاتدار دەتوێتەوە و دەیانهەوێ زمان و دابونەریتیان بسڕنەوە و زمان و فەرهەنگی خۆیانیان بە سەردا بسەپێنن. بۆیە لەو ڕۆمانە کۆمەڵایەتی و دڵدارییەشدا ئاوڕی لەو مەسەلە سیاسییە گرینگە داوەتەوە و نەیتوانیوە وەپشت گوێی بخات.

زۆر جاریش ناڕاستەوخۆ و لە دیالۆگی پاڵەوانەکاندا ئاماژە بەو پەتایەی ئەو سەردەمەی رووسییە دەکات، کە خەڵك چەندەیان زمان و فەرهەنگەکەی خۆیان بەلاوە سووك بووە و بۆ

خۆنواندن و فیز و پۆزلێدان بە زمانی فەڕەنسی قسەیان کردووە و لە جلوبەرگ پۆشین و هەڵسوکەوت و میوانی و میوانداریدا لاسایی فەڕەنسییەکانیان کردۆتەوە. ئەمەش زۆر لەگەڵ دەردی ئەمڕۆی ئێمەی کورد یەك دەگرێتەوە کە بۆ خۆنواندن و پۆزوهەوا پەنا بۆ فارسی و عەڕەبی دەبەین و دایك و باوك و خاڵ و پوور و مامی خۆمان بە هی عەرەب و عەجەمان دەگۆڕینەوە!

تۆلستۆی لە رۆمانی ئانا کارنینادا کە دەتوانین بڵێین بە راستی رۆمانێکی رەخنەییە و لەودا بە ئاشکرا قامك لەسەر پەتا و درم و گەندەڵییە ئەخلاقی و تۆلازی و داوێن تەڕییەکان دادەنێ و دیارە ئەو ئاریشەیە زۆری شوێن لەسەر رۆحی داناوە و هەستی کردووە، کە ئەو درم و ئاپۆرە خەریکە کۆمەڵگای رووسیا لەبەریەك هەڵدەتەکێنێ و پاکی و راستی خەریکە لە نێو بنەماڵەکاندا بارگەوبنەی دەپێچێتەوە، بۆیە هەموو ئازار و ژانەکانی ناخی بە نووسینی ئەم رۆمانە هەڵڕشتووە.

ئەم رۆمانەم بۆیە بەلاوە گرینگ بوو و بە پێویستم زانی وەریگێڕمەوە سەر زمانی کوردی، چونکە بە چڕوپڕی باس لە گرفت و ئاریشە کۆمەڵایەتییەکان دەکات و ئەو گرفت و پەتا و ئاپۆڕانەی کە سەردەمی تۆلستۆی رووسیای داگرتبوو ئێستا لەلای ئێمە خەریکە سەرهەڵدەدا و تا رادەیەك سەری هەڵداوە و وڵات و کۆمەڵگاکەمان بە دەستییەوە دەناڵێنێ.

بەو هیوایەی توانیبێتم گەورەیی و گرینگی ئەو رۆمانە شیرینە راگرم و خزمەتێکم کردبێ بە ئەدەب و زمان و کتێبخانەی کوردی.

**ئەمین گەردیگلانی**

**بۆکان/هاوینی٢٠١٠ی زایینی**

## ساڵژمێرژمێری ژیان و بەرهەمی لیئۆ نیکۆلایڤیچ تۆلستۆی

١٨٢٨: لە گوندی "یاستاپۆلیانا" هەڵکەوتوو لە ١١٠ کیلۆمیتریی مۆسکۆ لە دایك بوو.

١٨٣٠: دایکی مرد.

١٨٣٧: باوکی مرد.

١٨٤٤: بۆ زانستگای غازان دەرچوو.

١٨٥١: بە ویستی خۆی چوو بۆ سەربازی و لە ریزەکانی ئەرتەشدا دامەزرا.

١٨٥٢: چیرۆکی «منداڵی» نووسی و نیکراسۆڤ شاعیری بەناوبانگی رووسی و سەرنووسەری گۆڤاری «سەردەم» لەو گۆڤارەدا چاپی کرد و بووە هۆی ناوبانگ دەرکردنی.

١٨٥٣: چیرۆکی «مێرمنداڵی» نووسی.

١٨٥٥: لە ریزی ئەرتەش هاتەدەرێ و دەستی کرد بە نووسین و لەگەڵ کانجارۆڤ و تۆرگینێڤ و نیکراسۆڤ ئاشنایەتیی پەیداکرد و ئەو نووسەر و شاعیرانە شوێنێکی قووڵیان لە سەر هەستی دانا و ئەو کارتێکەرییە لە نووسراوەکانیدا رەنگی داوەتەوە.

١٨٦٩: لەگەڵ کچی پزیشکێك ژیانی هاوبەشی پێکهێنا. ئەو کچە دڵسۆز و شۆخوشەنگە ناوی سۆفیا ئاندرێ یڤنا بوو. هەر ئەو ساڵەش دەستی کرد بە نووسینی رۆمانی «ئانا کارنینا».

١٨٨٠: بە نووسینی کتێبی «دانپیانان» گەڕانەوەی خۆی لە ئایینی ئۆرتۆدۆکس راگەیاند و ئایینێکی تری هەڵبژارد، کە خۆی بە باشی لەگەڵی ئاشنابوو.

١٨٨١: لەگەڵ بنەماڵەکەی کۆچی کرد بۆ مۆسکۆ و لەوێ نیشتەجێبوو. هەر ئەو ساڵەش دەستی کرد بە نووسینی رۆمانی «شەڕ و ئاشتی». نووسینی ئەو کتێبە پێنج ساڵی خایاند.

تۆلستۆی جگە لەو کتێبانەی ئاماژەم پێکرد حەڤدە بەرهەمی تری نووسیوە، کە بریتین لە:

حاجی مراد، دیلی قەفقاز، وزەی نەزانی، هونەر چییە، هەستانەوە، ئاهەنگی کورتزر، شەیتان، ترووسکەی تیشك و تاریکی، تۆڵەی مێرد، ژن و مێردایەتی نابەدڵ، یەك تیری وڵاتی دۆزەخ، میوەی زانست، سێ مەرگ، دوو سەرباز، دەبێ چ بکەین.

**١٨٩٢:** گرانی و قاتوقڕییەکی قورس رووسیای داگرت و تۆلستۆی لەو ماوەیەدا ١٨٨ ماڵی بۆ برسی و لێقەوماوان کردەوە و نان و خۆراکی بۆ دابینکردن. بۆ بنەتووی بەهارەکێڵ گەنمی بە سەر جووتیاراندا دابەش کرد و چەند نانەواخانەی کردەوە کە بە نرخێکی هەرزان نان بدەن بە خەڵك.

**١٩١٠:** بڕیاری دا بڕوات بۆ دەرەوەی وڵات و لە دەفتەری بیرەوەرییەکانیدا نووسیی: «من لە دەست ئاسوودەیی و دەوڵەمەندیی خۆم و هەژاری و لێقەوماویی خەڵك وەزاڵە هاتووم و ئیتر ناتوانم تاملّی بکەم، بۆیە هەموو شتێك بەجێدێڵم و دەڕۆم بۆ هەندەران.» بەڵام نەیتوانی خۆی دەربازبکات و زۆری ئازار کێشا. لە ئاکامدا تووشی خوێنبەربوونی سییەکان هات و ئەو نووسەرە مەزنەی دنیای زانست و ئەدەب لە رۆژی حەوتی نوامبری ساڵی ١٩١٠ سەعات شەش و نیوی بەیانی لە رێگای نێوان مۆسکۆ ـ تۆلا لە هەشتا و دوو ساڵیدا بۆ هەمیشە چاوی لێکنا و ماڵئاوایی لە نووسین و دنیای پڕ لە رەنج و ئازار کرد و بە پێی وەسییەتی خۆی لە زێدەکەی واتە گوندی (یاستا پۆلیانا) بە خاکیان سپارد.

# بەشی یەکەم

## تۆڵە سەندن هەر بۆ منە،
## سزادەر تەنیا هەر منم[1]

١ - ڕیسالەی پۆلسی ڕەسووڵ بۆ ڕۆمییەکان. (بەشی دوازدەهەم، ئایەتی نۆزدەهەم): ئەی خۆشەویستان، تۆڵەی خۆتان مەکەنەوە، بەڵکوو دەرفەت بە تووڕەیی و ڕق بدەن نووسراوە، خودای گەورە دەفەرمێ: تۆڵەسەندن هەر بۆ منە، سزادەر تەنیا هەر منم.

# یەك

بنەماڵەی بەختەوەر هەموو وەکوو یەکن، بەڵام بنەماڵەی چارەڕەش هەرکام بەدبەختیی تایبەت بە خۆیان هەیە.

ماڵی ئابلۆنسکی بە جاریٚ شیٚوابوو. ژنە زانیبووی میٚردەکەی لەگەڵ دایەنی پیٚشووی منداڵەکانی کە ژنیٚکی فەڕەنسی بوو، کەینوبەینی هەیە“ بۆیە پیٚی گوتبوو ئیتر ناتوانیٚ لەگەڵیان بژی و چاوی بەرایی نادا بیبینیٚ. ئەو بارودۆخە سیٚ رۆژ بوو ماڵەکەی تەنیبۆوە و نەك ئەو ژن و میٚردە، بەڵکوو هەموو خیٚزانی ماڵەکەی تووشی خەم و پەژارە کردبوو. خیٚزان و خزمەتکار لەو ماڵە هەموو هەستیان دەکرد کە ژیانیٚکی سارد و بیٚ مانا لەگەڵ یەکتر رادەبویٚرن و تەنانەت ئەو موسافیرانەی کە بە ریٚکەوت لە موسافیرخانەیەکی نیٚوڕیٚ شەویٚك پیٚکەوە رادەبویٚرن، زیاتر لە بنەماڵەی ئابلۆنسکی و خزمەتکارەکانیان پیٚکەوە لە پیٚوەندیدان. خاتوونی ماڵیٚ لە ژوورەکەی نەدەهاتەدەریٚ و میٚردەکەشی دوو رۆژ بوو کەس چاوی پیٚی نەکەوتبوو، منداڵەکانیش سەرلیٚشیٚواوانە لەم ژوورەوە بۆ ئەو ژوور هەڵدەهاتن، دایەنە ئینگلیزییەکەشیان لەگەڵ کەیخوداژنی ماڵیٚ دەمقڕەیان لیٚ پەیدابووبوو، بۆیە کاغەزیٚکی بۆ هاوڕیٚکەی نووسیبوو کە جیٚگایەکی تری بۆ ببینیٚتەوە. ئاشپەزەکەشیان لە رۆژی رابردووەوە تۆرابوو، یاریدەدەری ئاشپەز و عارەبانەچییەکەش داوای هەقومزی خۆیان کردبوو.

پرێنس ستیپان ئارکادیچ ئابلۆنسکی، کە لە کۆڕ و دانیشتنی دەوڵەمەندان‌دا بە ستیڤا ناوی دەرکردبوو، سیٚ رۆژ دوای دەمەقاڵیٚ لەگەڵ ژنەکەی هەروەك جاران سەعات هەشتی بەیانی، نەك لە ژووری خەوەکەی خۆیان، بەڵکوو لە ژووری کارەکەی لە سەر قەنەفەیەکی قایش خەبەری بۆوە. بەو قەڵافەتە قەڵەو و نازپەروەردەیەوە لە سەر قەنەفە فەنەردارەکە تلیٚکی دا، وەك ئەوەی بیهەویٚ ماوەیەکی زۆر بەو شیٚوەیە راکشیٚ. بالیفەکەی لە باوەش گرت و روومەتی توند پیٚوە نووساند، بەڵام لەپڕ هەستا دانیشت و چاوی هەڵیٚنا.

ئەو خەونەی دیتبووی هاتەوە بیری و لەبەر خۆیەوە گوتی: «با بزانم چ بووە؟ ئەها، «ئالابین» لە دارمشتات میوانییەکی وەڕێخستبوو. نا، دارمشتات نەبوو، شارێکی ئەمریکایی بوو. بەڵام وا دیارە هەر دارمشتات بوو لە ئەمریکا. بەڵێ، ئالابین میواندارییەکەی بۆ نیوەڕۆ وەڕێخستبوو و مێز و کورسییەکان هەموو بلوور بوون، گۆرانییان دەگوت: il mio Tesoro ئەوەش نا، il mio Tesoro[٢]. لەوەش جوانتر لە سەر مێزەکان جۆرێ گۆزەڵە ریزکرابوون، کە بە شکڵی لەشولاری ژن بوون، لە خەونەکەمدا هەر لە پەیکەری ژن دەچوون.»

بریقەی شادییەك لە چاوی ستیپان ئارکادیچدا درەوشایەوە. زەردەیەکی گرت و خەیاڵ هەڵیگرت. لە دڵی خۆیدا دەیگوت: «پەککوو لەو خەونە خۆشە! چ کەیفێکی لە لا بوو! بەڕاستی پڕ بوو لە شتی جوان و بێوێنەی دیکە. بەڵام ئەو شتانە لە کاتی بەخەبەریدا لە تاریف نایەن و تەنانەت لە خەیاڵیشدا ناگونجێن.»

هەرکە چاوی بەو تاڵەتیشکە کەوت کە لە کەلێنی پەردەی پەنجەرەوە لە ژوورەکەی دەدا، بە کەیفخۆشی لاقی بە لێواری قەنەفەکەدا شۆڕکردەوە و ئەو کەوشە چەرمی و زێڕینانەی بە نووکی لاقی دۆزییەوە کە ژنەکەی گوڵدۆزیی کردبوو و ساڵی پێشوو لە جێژنی لەدایکبوونیدا بە دیاری پێی دابوو. بە پێی عادەتی ئەو نۆ ساڵەی ژیانی ژن و مێردایەتی، هەروا بە دانیشتنەوە دەستی کێشا کە لە ژووری خەوەکەی ربدۆشامبرەکەی هەڵواسرابوو دایگرێ، بەڵام لەپڕ وەبیری هاتەوە کە بە چ هۆیەك لە ژووری خەوەکەی و لە پاڵ ژنەکەیدا نییە، بەڵکوو لە ژووری کارەکەی و لە سەر قەنەفەکە خەوتووە" بۆیە زەردە لە سەر لێوی پەڕی و گرژ بوو.

ئەوەی سێ ڕۆژ لەمەوبەر قەومابوو هاتەوە بیری و هەناسەیەکی هەڵکێشا: «پەککوو... پەککوو...» دیسانیش هەموو کێشە و دەمەقاڵێیەکانی لەگەڵ خێزانی و ئەو تەنگژە بێدەرەتانەی تێیکەوتووە و لە هەمووشی تاڵتر تاوانەکەی خۆی لەو رووداوەدا هاتنەوە بەرچاوی.

ناخۆشترین کاریگەرییەك کە ئەم کێشە لە سەر رۆح و هەستی دانابوو هاتەوە بیری و لەوپەڕی هیوابڕاویدا بەو ئاکامە گەیشت کە «نا، قەتم لێ نابوورێ، ناتوانێ لێم خۆش بێ. لە هەمووشی خراپتر ئەوەیە هەر من تاوانبارم. خەتای منە و لەگەڵ ئەوەشدا بە دەست خۆم نییە، نەهامەتییەکەش هەر ئەوەیە، پەککوو.. پەککوو...»

---

٢ - خۆشەویستەکەم

لە هەمووشی تاڵتر سەرەتای ڕووداوەکە بوو، ئەو کاتەی شاد و بەکەیف و دڵخۆش بە ژیان، لە شانۆ گەڕابۆوە و هەرمێیەکی گەورەی بە دەستەوە بوو بۆ ژنەکەی، بەڵام کە خۆی بە ژووریدا کرد، ژنەکەی لە هۆڵی میوانداری نەدی. لە ژووری کارەکەشی نەبوو. لە ئاکامدا لە ژووری خەوەکەی بە یادداشتێکی تاڵ ئاکامەوە دییەوە کە رازەکەی لێ ئاشکرا کردبوو.

ژنەکەی، ئەو «دالی»یەی[٣] هەمیشە دڵتەنگ و هەروەها هەڵسووڕ و چالاك لە ماڵەکەدا دەهات و دەچوو، بەڵام ئەو پێی وا بوو گێژ و ساویلکەیە، پەڕەیەك کاغەزی بە دەستەوە، مات دانیشتبوو و بە چاوێکی پڕ لە ترس و ناهومێدی و رقەوە تێی دەڕوانی.

یادداشتەکەی نیشانی دا و لێی پرسی: ئەوە چییە؟ ها، ئەوە چییە...

ئابلۆنسکی کاتێك ئەو ڕووداوەی لە دالغەی خۆیدا تاوتوێ دەکرد، تاوانەکەی خۆی شتێکی وا نەبوو، بەڵام ئەو وەڵامەی بە ژنەکەی دابۆوە وەك مێو و رۆن هەڵێدەچۆقاند.

لەو کاتەدا وەك ئەو کەسانە دەچوو کە لە کاتی کردەوەیەکی زۆر ناحەز و قێزەوندا مەچەکیان دەگرن و بە دەندووك پێوە دەبن. فریا نەکەوتبوو تەنانەت تۆزێ رەنگ و ڕووی خۆی لەگەڵ بارودۆخەکە رێك بخات و پاش ئاشکرا بوونی رازەکەی و راوەستان لە هەمبەر ژنەکەیدا. بە جێی ئەوەی خۆی تووڕە بکات یان حاشای لێبکات، بیانوویێك ببینێتەوە و داوای لێبوردن بکات، یان خۆی لێ گێل بکات، کە هەموویان لەو کارەی کە کردی باشتر دەبوون، لەناکاو بزەیەکی نەخوازراو، زۆریش نەخوازراو، نیشتە سەر ئەدگارە دلۆڤانەکەی، هەر لەو جۆرە بزانەی کە بە لای ئابلۆنسکییەوە ئاسایی بوو و نیشاندەری دڵە ناسکەکەی، لە ئاکامیشدا گەوجانەی دەنواند. ستیپان ئارکادیچ ئابلۆنسکی کە زۆر هۆگری فیزیۆلۆژی بوو سەبارەت بەو بزەیە لە دڵی خۆیدا دەیگوت ئانقەست نەبوو، کردەوەیەکی سروشتی بوو کە سەرچاوەکەی مێشکە.[٤]

ستیپان ئارکادیچ بۆ ئەو زەردەخەنە گەوجانەیە لە خۆی خۆش نەدەبوو. دالی بە دیتنی ئەو زەردەیە کەوتە لەرزین و دەتگوت لەشی دەرزیئاژن دەکەن، چونکە ژنێکی کەم تاقەت و

---

٣- Dally، کورتکراوەی داریا

٤- کتێبی ڕەنگدانەوەی مێشك، بەرهەمی سێچنۆڤ (Setchenov ـ ١٨٢٩ ١٩٠٥). کە شوێنێکی بەرچاوی لە سەر هاوچەرخەکانی نووسەر دانابوو. نووسەر لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە سەرچاوەی هەموو کردەوەیەکی خوازراو و نەخوازراوی مرۆڤ بە شێوەیەك ڕەنگدانەوەیە. هەمووان، تەنانەت ئەوانەی زانیارییان لەمەڕ ئەو کتێبە بە ڕادەی بیستن بوو، بەڵگەیان لەو کتێبە دێنایەوە و سەبارەت بە ناوەڕۆکەکەی دەکەوتنە مشتومڕ.

ئاڵەتیش بوو، خێرا هەڵچوو و مێردەکەی دایە بەر دەسترێژی جنێو و قسەی رەق و لە ژوورەکە دەرپەڕییە دەرێ. دوای ئەوە ئیتر نەیدەویست چاوی پێی بکەوێ.

ستیپان ئارکادیچ لە دڵی خۆیدا دەیگوت: «هەموو خەتای ئەو بزە گەوجانەیە بوو.»

پاشان هیوابڕاوانە لە خۆی پرسی: «بەڵام چ بکەم؟ ئاخر چم لە دەست دێ؟» هیچ وەڵامێکی نەدەدۆزییەوە.

## دوو

ستیپان ئارکادیچ مرۆڤێکی بێ فڕوفێڵ بوو. لەگەڵ خۆیدا یەکچاو بووبۆوە و نەیدەویست خۆی فریو بدا و وا بە خۆی بسەلمێنێ کە پەژیوان بۆتەوە. ئەو نەیدەتوانی ئەمڕۆ لە دووپاتکردنەوەی کارێك پەژیوان بێتەوە کە پێنج شەش ساڵ لەمەوبەر، کاتێك کە بۆ یەکەم جار خەیانەتی بە ژنەکەی کردبوو، پەژیوان بووبۆوە. نەیدەتوانی لەوە پەشیمان بێ، کە ئیتر ئاشقی ژنەکەی نییە، ژنێك کە تەنیا ساڵێك لەو چکۆڵەتر بوو و دایکی پێنج منداڵی زیندوو و دوو کۆرپەی کۆچکردووی بوو" ئێستاش کە خۆی لاوێکی سی و چوار ساڵان و جوان چاك بوو و گڕی ئەوین لە دڵیدا بڵێسەی دەکێشا. داخ و پەشیمانییەکەی تەنیا بۆ ئەوە بوو، کە نەیتوانیبوو نهێنیی خۆی لە ژنەکەی بشارێتەوە، بەڵام هەستی بە نەهامەت و چارەڕەشی دەکرد و دڵی بە خۆی و ژن و منداڵەکانی دەسووتا. رەنگە ئەگەر بیزانیبایە ئەو پەتە سەر ئاو کەوتنە بەو رادەیە ژنەکەی تووشی ئازاردەکات، بە شێوەیەك هەوڵی دەدا، کە تاوانەکانی خۆی لە ژنەکەی بشارێتەوە و نەهێڵێ لێی ئاشکرا بێ. قەت بە روونی بیری لەو شتە نەکردبۆوە، تەنیا جاروبار نەبێ دەکەوتە گومانەوە، کە ژنەکەی هەستی بە ساردوسڕییەکەی کردووە و وا دەنوێنێ، کە نەیزانیوە. تەنانەت پێی وا بوو کە ژنەکەی ئیتر گەڕاوە و پێچووە و ئەو جوانی و گەشاوەییەی رابردووی نەماوە و غەیری ئەوەی، کە پڕشنگێکی دایکانە دەوری تەنیوە، هیچ شتێکی تری نییە کە سەرنج راکێشێ، بۆیە ئەگەر ئینسافی هەبێ، دەبێ لێبوردوویی زیاتر لە خۆی نیشان بدات. بەڵام دەرکەوت کە بارودۆخەکە راست بە پێچەوانەی ئەوەیە.

«پەککوو.. پەککوو، لەو نەهامەتییە!» ستیپان ئارکادیچ بەردەوام خەریکی ئاخ وداخ بوو و هیچ دەرەتانێکی بە زەین نەدەگەیشت. «بەر لەوە داروبارەکە چەند باش کەوتبوو، ژیان

چەندە شیرین بوو. دالی لە ژیان رازی و لەگەڵ منداڵەکان سەرو دڵخۆش بوو. منیش کارم بە سەرییەوە نەبوو، بوارم پێدابوو چۆنی پێخۆشە لەگەڵ منداڵەکان رایبوێرێ و کاروباری ماڵەکە بە دڵی خۆی هەڵسووڕێنێ. هەڵبەت هیچ باش نەبوو ئەو کچە دایەنی منداڵەکانم بێ. نا، هیچ باش نەبوو. دەست تێکەڵکردنیش لەگەڵ دایەنی منداڵان کارێکی دزێوە. مرۆڤی خاوەن زەوق و کەسایەتی کاری وا ناکا. بەڵام عەجەب مەحشەرێك بوو! (چاوی رەش و دڵڕفێنی مادموازێل رۆلان و بزە شیرینەکەی بە روونی هاتەبەر چاوی)، بەڵام خۆ هەتا ئەو کاتەی کە لە ماڵی ئێمە بوو، بە ئاستەم دەستبزێویم نەکرد. لەوەش خراپتر ئەوەیە ئێستا ئەو ژنە بۆ بەدبەختی.. پەککوو... پەککوو...! بەڵام چ بکەم، چیم لە دەست دێ؟»

ئەو پرسیارە هیچ وەڵامێکی نەبوو، مەگین هەر ئەو وەڵامە گشتییەی، کە ژیان بە مەسەلە دژوار و بێ وەڵامەکانی دەداتەوە، ئەویش ئەمەیە: دەبێ لەگەڵ ئاریشە و کەندوکۆسپی رۆژگار هەڵکەی، یانی لەبیر خۆتی بەرییەوە. بەڵام ئیتر نەیدەتوانی خۆی لەو شتانە گێل بکات و لەبیر خۆی بەرێتەوە، لانی کەم هەتا شەوێ، بەڵکوو لە خەودا بیدۆزێتەوە. هەروەها نەیدەتوانی پەنا بۆ ئەو گۆرانییە خۆشە بەرێ، کە گۆزەڵە شێوە ژنەکان دەیانچڕی. لە ئاکامدا چارەی نەبوو جگە لەوەی لە خەونەکانی ژیانیدا بە دوای ئەو فەرامۆشییەدا بگەڕێ.

ئابلۆنسکی لەبەرخۆیەوە دەیگوت: «دەی با بزانین دەبێ بە چی.» هەستا و ربدۆشامبرە خۆڵەمێشینەکەی خۆی، کە بەرێکی هەورێشمینی شینی هەبوو، لەبەری کرد و کەمەربەندەکەی گرێدا، هەناسەیەکی قووڵی پڕ بە دەفەی سینگی هەڵکێشا و بە هەنگاوی قورس و قایم و رەوتێکی خێرا کە لاقی خوار دادەنا و لەگەڵێدا قەڵافەتە قەڵەوەکەی بە نەرم و سووکی بادەدا، رۆیی بۆ لای پەنجێرەکە و پەردە کرکرەکەی هەڵکێشا. دەستی کرد بە زەنگ لێدان. ماتڤێی خزمەتکاری کە ئیتر وەك هەڤاڵی وا بوو لەگەڵ بیستنی زەنگەکە بە پەلە بە جلوبەرگ و جزمە و پسوولەی تێلگەڕافەوە خۆی کرد بە ژوورێدا. بە دوای ئەودا کابرای دەلاك بە کەلوپەلی ریشتاشینەوە هاتەژوورێ.

ستیپان ئارکادیچ تێلگەڕافەکەی لە ماتڤێ وەرگرت و لەبەرئاوێنەکە دانیشت و پرسیی: لە دایرەوە دەوسییەیەکیان نەهێناوە؟

ماتڤێ چاوێکی پرسیارئامێز و دڵسۆزانەی لێکرد و دوای تۆزێ گتگرتن بە بزەیەکی مانادارەوە گوتی: لە سەر مێزەکەم داناوە، پیاوێکیش لە نووسینگەی فایتوونی کرێوە هاتبوو.

ستیپان ئارکادیچ وەڵامی نەدایەوە و تەنیا لە نێو ئاوێنەکەدا چاوی لە ماتڤیێ کرد. لەو روانینەی نێو ئاوێنەکە و تێکهەڵەنگووتنی سەرنجیانڕا دیاربوو، کە باش لە قسەی یەکتر دەگەن. روانینەکەی ستیپان ئارکادیچ دەیپرسی «مەبەستت لەو قسەیە چییە؟ خۆ تۆ دەزانی.»

ماتڤیێ دەستی نایە گیرفانی، لاقی لێك بڵاو کرد و بێدەنگ بوو. بە بزەیەکی خێرخوازانە و ناڕوونەوە لە ئەربابەکەی خۆی روانی.

گوتی: گوتم ئەم یەکشەممەیە نا، یەکشەممەی داهاتوو بێتەوە. هەتا ئەو کاتەش نە دەرگا بە ئێمە بگرێ و نە کاتی خۆشی بە فیڕۆ بدا. دیاربوو ئەو قسەیەی لە پێشدا ئامادەکردووە.

ستیپان ئارکادیچ تێگەیشت کە ئەو قسەیەی ماتڤیێ گاڵتەیە. پاکەتی تێلگەڕافەکەی هەڵپێچڕی و ئەو وشانەی کە وەك هەمیشە بە هەڵە نووسرابوون، بە بۆچوونی خۆی لەگەڵ ئەوەی راستی دەکردنەوە خوێندنییەوە و رەنگی روخساری کرایەوە.

دەستی گۆشتن و سپیکەڵەی کابرای دەلاك کە لە لاجانگەوە دەستی پێکردبوو و ریشە درێژ و لوولەکەی لاڕوومەتی دەتاشی و باریکەیەکی ئاڵ و پاك تاشراوی لە سەر لاگووپی سازکردبوو، تۆزێ راگرت و گوتی: ماتڤیێ، سبەینێ ئانا ئارکادیۆڤنای خوشکم دێ بۆ ئێرە.

ماتڤیێ گوتی: شوکر بۆ خودا!

بەو وەڵامەش دەرکەوت کە ئەویش وەك ئەربابەکەی ئەو هەواڵەی بەلاوە گرینگە و دەزانێ ئانا ئارکادیۆڤنا، خوشکی خۆشەویستی ستیپان ئارکادیچ لەوانەیە بتوانێ ئەو و ژنەکەی پێکەوە ئاشت بکاتەوە.

پرسیی: بە تەنیا تەشریف دێنێ یان لەگەڵ مێردەکەی؟

ستیپان ئارکادیچ نەیدەتوانی قسە بکات، چونکە سەرتاشەکە خەریکبوو سمێڵی دەتاشی، بۆیە قامکێکی هەڵێنا. وێنەی ماتڤیێش لە ئاوێنەکەدا سەری داخست.

ـ بە تەنیا تەشریف دێنن؟ ژووری سەرێیان بۆ ئامادەبکەین؟

ـ بە داریا ئەلکساندرۆڤنا بڵێ، ئەو هەر چۆنێك فەرمانی دا وا بکە.

ماتڤیێ بە لەبزێکی تێکەڵ بە دڕدۆنگییەوە دووپاتی کردەوە: بچمە خزمەت داریا ئەلکساندرۆڤنا؟

ـ بەڵێ برۆ پێی بڵێ، هانێ، تێلگەڕافەکەش بەرە و پاشان وەرەوە بزانم گوتوویە چی.

دەیویست بڵێ «حەتمەن دەتەوێ هەوای دەمی بزانی؟» بەڵام تەنیا گوتی: بە سەر چاو گەورەم.

ستيپان ئارکادیچ بە دەموچاوی شۆراو و قژی شانەکراوەوە، دەیویست جلەکانی لەبەربکات کە ماتڤیێ سیڕەسیڕی جزمەکانی هات و بە تێلگەڕافەکەوە خۆی کرد بە ژوورەکەدا و بە نەرمی بە سەر مافوورەکەدا هاتە پێشێ. کابرای دەلاك رۆیشتبوو.

گوتی: داریا ئەلکساندرۆڤنا فەرموویان تەشریف دەبەن. گوتیان هەرکارێك کە خۆیان پێیان خۆشە، یانی هەر کارێك کە جەنابتان پێتان خۆشە بیکەن! کە ئەوەی گوت تەنیا بە چاوی زەردەی دەگرت و دەستی لە گیرفانی نابوو. ملی کەچ کردبوو و چاوی لە ئەربابەکەی بڕیبوو.

ستیپان ئارکادیچ ماق ما. بزەیەکی شیرین و تۆزێ بەزەیی بزوێن نیشتە سەر روخسارە سەرنجڕاکێشەکەی.

سەری لەقاند و گوتی: ئاخ، ماتڤیێ، چ بکەین؟

ماتڤیێ گوتی: خەمت نەبێ گەورەم، جێبەجێدەبێ.

ـ جێبەجێدەبێ؟

ـ بەڵێ گەورەم، حەتمەن.

ـ پێت وایە جێبەجێدەبێ؟ لە پشت دەرگاکەوە خشەخشی کراسی ژنانە هات و پرسیی: کێ لەوێیە؟

دەنگێکی بەرز و نەرم و ژنانە هاتە گوێ: منم گەورەم.

ڕوخساری جیددی و هاوڵاویی دایە ماتریۆڤنا فیلی مۆنۆڤنا، لە کەلێنی دەرگاکەوە وەدیار کەوت.

ستیپان ئارکادیچ بەرەوپیری چوو بۆ لای دەرگاکە و پرسیی: چییە، ماتریووشا، چیت دەوێ؟

ستیپان ئارکادیچ ئەگەرچی لە هەمبەر ژنەکەیدا خۆی زۆر بە تاوانبار دەزانی و تەنانەت لە دڵی خۆشیدا ددانی بەو تاوانەدا دەنا، بە گشتی هەموو خێزانی ماڵەکە تەنانەت دایە ماتریۆڤنا فیلی مۆنۆڤناش کە زۆر لە داریا ئەلکساندرۆڤنا نزیکبوو، لایەنگریی لە ئەرباب دەکرد.

بە لەبزێکی خەماوییەوە پرسیی: دەی، دەڵێی چی؟

ـ ئەرباب، بە سەر پێیەکەوە بچۆ بۆ لای و داوای لێبوردنی لێبکە، بەڵکوو خودا لە دڵی نێ و ئاشت بێتەوە. زۆر دڵتەنگە. پیاو کە دەیبینێ لەوانییە ئاوری بۆی تێبەربێ. ماڵەکە وا شێواوە دەڵێی رۆژی قالووبەلایە. دەبێ مشوورێکی ئەو منداڵانە بخۆی، برۆ داوای لێبوردنی لێبکە ئەرباب. کاتێك خەریکی حەککوو حەککوو بووی دەبوو بیر لە پەککوو پەککووی ئەمڕۆش بکەیەوە.

ـ من لە خودام دەوێ، بەڵام ئەو نایەوێ چاوی بە من بکەوێ...

ـ ئێوە هەوڵی خۆتان بدەن، خودا گەورەیە. داوا لە خودا بکە گەورەم، داوا لە خودا بکە...

ستیپان ئارکادیچ لە ناکاو سوورهەڵگەڕا و گوتی: زۆر چاکە، بڕۆ ـ بە پەلە ربدۆشامبرەکەی لەبەرداکەند و رووی کردە ماتڤێ و گوتی: چاکە دەی، وەرە جلەکانم لەبەربکە!

ماتڤێ کە کراسەکەی وەك سەرجلی ئەسپ راگرتبوو و فووی لێدەکرد تاکوو تەپوتۆزە نادیارەکەی لێ بتەکێنێ، بە کەیفێکی ئاشکراوە کراسەکەی لەبەرئەربابەکەی کرد.

## سێ

ستیپان ئارکادیچ هەرکە جلەکانی لەبەرکرد، عەتری لە خۆی دا و سەرقۆڵی کراسەکەی دەرکێشا و لۆیەکی هەڵداوە بە شێوەیەکی لە سەرەخۆ و تایبەت بە خۆی قوتووی جگەرە و جزدان و شقارتە و سەعاتەکەی بە دوو زریزەی ناسك و بریقەدارەوە نایە گیرفانەکانی و زریزەکانی بە لێواری گیرفانیدا شۆڕکردەوە. دەسرە دەستەکەی لەبەرلووتی راتەکاند و سەرباری ئەو خەم و پەژارەی لە سەر دڵی بار بوو، خۆی خاوێن و بۆنخۆش و لەشساخ هاتە بەرچاو و هەستی بە شادی و نەشە کرد، بەرەو ژووری نان خواردن رۆیشت و لەگەڵ هەر هەنگاوێك تۆزێ لەرەی دەهات، بەرچایی ئامادەبوو و لە پاڵ ئەویشدا ئەو نامە و دەوسییە و کاغەزانە ریز کرابوون کە لە دایرەوە هێنابوویان.

ستیپان ئارکادیچ دانیشت و ملی لە نامە خوێندنەوە نا. بە دیتنی نامەیەکیان زۆر گەشایەوە. نامەکە هی بازرگانێك بوو کە دەیویست پەڵەیەك لەو دارستانە بکڕێ کە ملکی خێزانی، واتە داریا ئەلکساندرۆڤنا بوو. ئەو ناچاربوو ئەو پەڵە دارستانە بفرۆشێ، بەڵام هەتا لەگەڵ ژنەکەی ئاشت نەبوایەتەوە، نەدەبوو بیر لەو کارە بکاتەوە. لە هەمووشی ناخۆشتر ئەوە بوو کە بەو شێوەیە مەسەلەی ماڵی و ئاشتبوونەوە تێکەڵ دەبوون و لە لایەکیشەوە بە سووکایەتیی دەزانی کە لەبەرناچاری و بە بۆنەی فرۆشتنی دارستانەکەوە لەگەڵ ژنەکەی ئاشت بێتەوە.

کە لە خوێندنەوەی نامەکان بۆوە، دەستی برد و ئەو کاغەزانەی هێنا پێشێ کە لە دایرەوە هێنابوویان. بە پەلە دوو پەروەندەی هەڵدایەوە و بە قەڵەم و خەتێکی درشت شتێکی نووسی و پەروەندەکانی خستە ئەولاوە و دەستی کرد بە خواردنی بەرچایی. لەگەڵ خواردنەوەی قاوە رۆژنامەی بەیانیی کردەوە و ملی نا لە خوێندنەوەی کە هێشتا خاو بوو و هەوای تەمومژاویی بەرەبەیان نەرمی کردبۆوە.

ستیپان ئارکادیچ رۆژنامەی لیبرالی بۆ دەهات و دەیخوێندەوە. هەڵبەت نەك رۆژنامەی لیبراڵە رادیکاڵەکان، بەڵکوو خوێنەری بلاڤۆکی باڵی زۆرینەی ئەو حیزبە بوو. ئەو هیچ هۆگرییەکی بە بابەتە زانستی و هونەری و سیاسییەکان نەبوو. لە بواری هەموو ئەو بابەتانەدا تەنیا ئەو بابەتەی بۆ خوێندنەوە هەڵدەبژارد کە تایبەت بە باڵی زۆرینە بوو، تەنیا کاتێکیش بڕوای دەگۆڕدرا کە باڵی زۆرینە بیر و بڕواکەی گۆڕانی بە سەردا بێ. هەڵبەت وا باشترە بڵێین کە ئەو بڕوای نەدەگۆڕی، بەڵکوو بڕوا و مەڕامی هەر لە خۆوە بێ ئەوەی ئاگای لێ بێ گۆڕانی بە سەردا دەهات.

ستیپان ئارکادیچ نە رێبازی سیاسیی بۆ خۆی هەڵدەبژارد، نە بیروباوەڕێك. بەڵکوو هەڵوێست و بیروباوەڕ خۆیان دەهاتن بۆ لای. هەروەها کە شکڵی کڵاو یان رێدنگووتی لە سەر دەنا، خۆی هەڵینەدەبژارد، بەڵکوو هەر ئەو جۆرە کڵاو و رێدنگووتەی دەکردە سەر کە باوی رۆژ بوو. بیروباوەڕ بۆ ئەو کە لە چینی هەڵبژاردەی کۆمەڵگادا دەژیا و وەك خەڵکانی تر لە دەورانی پێگەیشتنندا پێویستی بە چالاکیی زەینی هەبوو، هەر بەو رادەیەش کڵاو بە لایەوە گرینگ بوو. بۆ بە باشتر زانینی رێبازی لیبراڵی لە رێبازی کۆنەپارێزی، کە ئەوەش بە لای زۆربەی هەڤاڵان و هاوڕێبازەکانییەوە پیرۆز بوو، هۆیەکی هەبوو، ئەویش بەو هۆیە نەبوو کە ئەو رێبازی لیبراڵی پێ باشتر و جێکەوتووترە، بەڵکوو بەو هۆیەوە بوو کە ئەو رێبازەی لەگەڵ بارودۆخی ژیانی خۆی بە سازگارتر دەزانی. حیزبی لیبراڵ دەیگوت هەموو کاروبارێك لە رووسیا ئاڵۆز و بێ سەرەوبەرەیە و ستیپان ئارکادیچ دەیدی کە تووکەسەریشی بۆتە قەرز و پارەی بە دەستەوە نەماوە. حیزبی لیبراڵ دەیگوت ژیانی هاوبەشی دابێکی کۆن و سواوە و دەبێ چاکسازیی بۆ بکرێ. ژیانی هاوبەشی ستیپان ئارکادیچیش ئیتر ئەو تاموچێژەی جارانی نەمابوو بۆیە ناچاربوو درۆبکات و بڵێ کە ئەو دۆخە لەگەڵ سروشت و حاڵی ئەو ناسازگارە. حیزبی لیبراڵ دەیگوت، یان باشترە بڵێین کە بە پانەوە لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە ئایین تەنیا لغاوێکە بۆ مرۆڤە دڕندە و بێ فەرهەنگەکان. هەر بەڕاستیش ستیپان ئارکادیچ نەیدەتوانی تەنانەت رێوڕەسمێکی دۆعا و پاڕانەوەش لە کلێسە بەبێ ئازار تامڵ بکات و تێنەدەگەیشت کە ئەو قسە و باسە سامناك و پڕ لە تامولامانە سەبارەت بە ئەو دنیا بۆ چییە؟ کە دەکرێ لەم دنیاش ژیان شیرین و پڕخۆشی و نەشە بێ. جگە لەوانەش مرۆڤێکی قۆشمە و گاڵتەباز بوو، زۆری حەز لە نەقڵ و نەزیلە دەکرد. هێندێ جار پێی خۆش بوو خەڵکانی ساویلکە و دڵپاك تووشی سەرسوڕمان بکات و دەیگوت: ئەگەر دەمانەوێ شانازی بە باوباپیرانمانەوە بکەین ئیتر

بۆچی گەڕان و لێکۆڵینەوەی پێشینان لە سەر ریووریك[٥] بگیرسێنینەوە و حاشا لە باپیرەگەورەی خۆمان واتە مەیموون بکەین؟ بەو شێوەیە لایەنگری لە رێبازی لیبراڵ بۆ ستیپان ئارکادیچ بووبووە خووخدە و حەزی لە خوێندنەوەی رۆژنامەکەیان دەکرد. هەر بۆیە کێشانی جگەرەی بەرگی لە پاش نان خواردن بەو هۆیەوە پێخۆش بوو تووشی گێژی و مەنگییەکی خۆشی دەکرد. سەروتاری رۆژنامەکەی خوێندەوە. لەو وتارەدا نووسرابوو ئەمڕۆ هاواری نارەزایەتی لەخۆرا بەرزبۆتەوە، کە رادیکالیسم دارودەستەی کۆنەپەرست لە نێو دەبا و دەوڵەت لە سەرییەتی بۆ لە رەگوڕیشە دەرهێنانی دێوەزمەی شۆڕش دەستبەکار بێ. ئەگەرچی «بە پێچەوانە، ئێمە لە سەر ئەو باوەڕەین کە ئەو مەترسییەی بۆتە هەڕەشە لە سەرمان دێوی سامناکی شۆڕش نییە، بەڵکوو پێداگری کردنە لە سەر پارێزگاری لە دابونەریتە کۆنەکان کە بۆتە کۆسپ و لەمپەر لە سەر رێی پێشکەوتن.» وتارێکی دیکەشی لەو بابەتە خوێندنەوە کە سەبارەت بە باری ماڵی بوو و لەودا باس لە بێنتهام[٦] و میل[٧] کرابوو و وەزارەتی دارایی دابووە بەر پلاری تیر و توانج. ستیپان ئارکادیچ هێندە وردبین بوو لە هەموو ئەو تیز و نەرێساتانە دەگەیی و دەیزانی ئەو پلارانە لە لایەن کێوە هاوێژراون و دەیهەوێ چزە لە کێ هەستێنێ و لەبەرچ بۆنە و هۆیەکە، دیارە ئەوەش زۆری دڵخۆش دەکرد. بەڵام چونکە داخوازییەکانی ماتریۆڤنا فیلی مۆنۆڤنا و هەروەها بێ سەرەوبەرەیی ماڵەکەی دەهاتەوە بیر هەموو ئەو چێژ و خۆشییانەی لێ دەبووە ژەقنەمووت. ئەو هەروەها خوێندیەوە کە کۆنت بیووست[٨] وەك باسی دەکەن سەفەری کردووە بەرەو ویسبادین[٩] و هەروەها دەرمانی سپی بوونی موو دۆزراوەتەوە و ئاگاداریی فرۆشتنی فایتوونێکی سووکیشی خوێندەوە. هەروەها ئاگاداریی ژنێکی گەنجی خوازیاری کار. بەڵام ئەم ئاگادارییانە بە پێچەوانەی رابردوو نەبووە هۆی چێژێکی نەرم و ئاوێتەی تانووت.

---

٥ - Riourik کەسایەتییەکی نیوەمێژوویی و نیوەئەوسانەیی و دامەزرێنەری یەکەم دەوڵەتی ڕووسی.

6 - Bentham

7-Mill

8- Beust

٩- فریدریش فردیناند فێن بویست سەرۆك وەزیری نەمسا و ڕەقیبی سیاسیی بیسمارك (سەرۆك وەزیری پرۆس) بوو، ڕۆژنامەکانی ئەو سەردەمە سەبارەت بە کار و سەفەرەکانی زۆریان نووسی. وێسبادین کە ئەمڕۆ پێتەختی هەرێمی هێسێنە، یەکێکە لە ناوەندەکانی ئاوی گەرمی بەناوبانگی پرووس.

ڕۆژنامەکەی خوێندەوە و دووهەمین پەرداخی قاوەی بە کولیچەی نقیشکییەوە هەڵقوڕاند، هەستا پرزۆڵی کولیچەکەی لە سەر جلیسقەکەی تەکاند و سینگی دەرپەڕاند، بە شادییەوە زەردەیەکی گرت، بەڵام نەك ئەوەی دڵی خۆش بێ، بەڵکوو ئەو زەردەخەنە شادانەیە نیشاندەری تێر خواردن بوو. بەڵام هەر ئەو بزەیە لە ناکاو هەموو شتێکی وەبیرهێنایەوە و بەرەو چاڵی خەم و خەیاڵ لوولی دا.

دوو دەنگی منداڵانەی لە پشت دەرگاکەوە هاتە گوێ. (ستیپان ئارکادیچ دەنگی گریشا کوڕە چکۆڵەکەی و تانیا کچە گەورەکەی ناسییەوە.) ئەوان شتێکیان بە دوای خۆیاندا رادەکێشا.

کچە بە ئینگلیزی گوتی: پێم گوتی نابێ لە سەربانەکەی موسافیر سوار بێ. زوو کە کۆیان کەوە.

ستیپان ئارکادیچ لەبەرخۆیەوە گوتی: «هەموو شتێك شێواوە، ئەوەتا ئەو منداڵانە بەرەڵڵا کراون.» رۆیشت بۆ لای دەرگاکە و بانگی کردن. منداڵەکان ئەو گاردۆنەیان بەجێهێشت، کە یاریی قەتارێنیان پێدەکرد و هەڵاتن بۆ لای.

کچەکە گوڵەجەرگەی باوکی بوو بە هەڵاتن رۆیی بۆ لای و دەستی کردە ملی و بە پێکەنینەوە خۆی پێوە هەڵواسی. وەك هەمیشە بە بیستنی ئەو بۆنە عەترەی کە لەگەڵ لووتی ئاشنابوو و لە ریش و لاجانگی باوکی هەڵدەستا چێژی وەرگرت. دوای ئەوەی روومەتی باوکی ماچی کرد، کە بە هۆی داهاتنەوە سوورهەڵگەڕابوو، ویستی بگەڕێتەوە بۆ یارییەکەی، بەڵام باوکی لە باوەشی گرت و نەیهێشت بڕوا. دەستی بە لاملی نەرم و ناسکی کچەکەیدا هێنا و لێی پرسی: دایە گیان چۆنە؟ بە پێکەنینەوە وەڵامی کوڕەکەی دایەوە کە سڵاوی کردبوو: سڵاو!

خۆشی دەیزانی کە کچەکەی لە کوڕەکەی خۆشتر دەوێ و هەمیشە هەوڵی دەدا فەرقیان نەخا، بەڵام کوڕەکەی وەك هەمیشە هەستی پێکرد و وەڵامی بزە سارد و سڕەکەی باوکی نەدایەوە.

کچە وەڵامی دایەوە: دایە گیان؟ هەستاوە لە خەو.

ستیپان ئارکادیچ هەناسەیەکی هەڵکێشا و لە دڵی خۆیدا گوتی: «یانی دیسان هەتا بەیانی چاوی نەچۆتە خەو؟"

ـ دەی، خۆ تووڕە نییە؟

کچە دەیزانی کە باوکی و دایکی پێکەوە نێوانیان نییە و کەوایە دایکی وێناچێ خۆشحاڵ بێ، باوکیشی حەتمەن ئاگای لەوە هەیە و ئەوەی ئاوا بە سانایی، وەك ئەوەی هیچ شتێك رووی

نەدابێ، لە حاڵی دایکی دەپرسێ، خۆ نواندنە. بە بیستنی ئەو قسەیەی باوکی سوورهەڵگەڕا. باوکیشی خێرا تێگەیشت و ئەویش سوورهەڵگەڕا.

کچە گوتی: نازانم. دایە گیان گوتی ئەمڕۆ پێویست ناکات دەرس بخوێنین. گوتی لەگەڵ میسگوول بچین بۆ ماڵی دایە گەورە.

ـ زۆر چاکە، بڕۆ کچەکەم، تانچۆرچکا[١٠] گیان. بەڵام نا سەبرکە ـ تانیای ڕاگرت و بە ئەسپایی دەستی بە دەستە نەرم و ناسکەکەیدا هێنا.

قوتووی غوڕابییەکەی لە سەر کوورەکە هەڵگرت کە ڕۆژی پێشوو لەوێی دانابوو، دوو دەنکی غوڕابی شەگەڵاتی و خامەدار لەوانەی کە دەیزانی کچەکەی پێی خۆشە هەڵگرت و دایە دەستی.

کچە غوڕابییە شەگەڵاتییەکەی نیشان باوکی دا و گوتی: ئەوەیان بدەم بە گریشا؟

ـ ئەرێ، ئەرێ ـ دیسان دەستی بە لاملی ناسکی کچەکەیدا هێنا و لاواندییەوە. لاجانگی بە موو داپۆشراوی ماچکرد و بەری دا.

ماتڤێ گوتی: عارەبانە ئامادەیە. بەڵام خانمێك هاتووە و داخوازییەکی هەیە.

ستیپان ئارکادیچ پرسیی: لەمێژە چاوەڕوانە؟

ـ نزیکەی نیو سەعات دەبێ.

ـ چەند جارم پێ گوتووی کاتێك کەسێك دێ و کاری پێمە خێرا پێم بڵێ.

ماتڤێ بە تووڕەییەکی دۆستانەوە کە قەت نەدەبووە هۆی دڵمەند بوون، وەڵامی دایەوە: ئاخەر ئێوەش دەبێ دەرفەتی ئەوەتان هەبێ قاوەیەك بخۆنەوە.

ئابلۆنسکی بە ناڕەحەتییەوە نێوچاوانی تێکنا و گوتی: باشە، ئێستا زوو بچۆ پێی بڵێ بێتە ژوورێ.

ئەو خاتوونەی هاتبوو، ژنی ملازم کالینین بوو، داواکارییەکی بوو کە نە ماقووڵانە بوو، نە جێبەجێدەکرا. بەڵام ستیپان ئارکادیچ بە پێی عادەت داینیشاند و بێئەوەی بپەڕێتە نێو قسەکانییەوە بە وردی گوێی لێگرت و پاشان بە جوانی ڕێنوێنیی کرد کە بچێت بۆ لای کێ. خێراش بە خەتە جوان و گەورە و ڕەوانەکەی خۆی یادداشتێکی بۆ ئەو مەقامە نووسی کە وێدەچوو یارمەتیی بدا. کە ژنی ملازمی بەڕێ کرد، کڵاوەکەی داگرت و ڕاوەستا" هەوڵی دا و

---

١٠- سووکەڵە ناوی تانیا

گوشاری بۆ مێشکی هێنا کە هیچی لە بیرنەچووبێ. هیچی لە بیرنەچووبوو. مەگین ئەوەی کە بە قەست بیهەوێ لە بیر خۆی بەرێتەوە: ژنەکەی.

ـ ئاخ، بەڵێ! ـ سەری داخست و تەمی خەم لە ڕەنگوڕووی نیشت. لەبەرخۆیەوە گوتی: «بچم یان نەچم؟» دەنگێك لە ناخییەوە گوتی پێویست ناکات بچی چونکە جگە لە درۆ کردن و خۆڕانان هیچی ترت لە دەست نایە. نەیدەزانی ئاشتبوونەوە و هێنانەوەی بنەماڵە و کاروبارەکانی بۆ سەر دۆخی جاران جێبەجێدەبێ یان نا، چونکە ئیتر ژنەکەی لەبەردڵی شیرین نییە و ناتوانێ گڕی ئەوین لە ناخیدا هەڵگیرسێنێ، ئەویش ناتوانێ خۆی وا پیر بکات کە ئاگردانی دڵی دامرکێتەوە و واز لە دڵداری و خۆشەویستی بێنێ. ئەگەر بچێت بۆ لای جگە لە فێڵ و مەرایی کردن، هیچ کارێکی تر ناکا. فێڵ و تەڵەکە و درۆ کردنیش لەگەڵ سروشتی سازگار نییە.

# چوار

داریا ئەلکساندرۆڤنا فانیلەیەکی لە بەردا بوو و ئەو پرچە پڕ و جوانەی کە سەردەمێك دڵی لە داو دەخست و ئێستا تەنك بووبوو، لە پشتە سەری کۆکردبۆوە و قردیلەیەکی لێدابوو. ڕوخساری وشك و ڕەقەڵە بوو، چاوە گەورەکانیشی لەبەر کز و لاوازی زەقبووبوونەوە و نیشاندەری ترس و دڵەڕاوکە بوون. لە نێو کەلوپەلی شپڕێوی ژوورەکەدا لە بەردەرکەی کراوەی دۆلابێکدا ڕاوەستابوو و دەیویست شتێك دەرهێنێ. هەرکە گوێی لە ترپەی هەنگاوی مێردەکەی بوو، جووڵەی لێبڕا و سەری بۆ لای دەرگاکە وەرسووڕاند. لە خۆوە هەوڵیشی دا خۆی تووڕە و وشك نیشان بدا. هەستی دەکرد لە مێردەکەی و ئەو دیدارە ناچارییەی بێزارە و ترسی خستۆتە دڵییەوە. حەولی دەدا کارێك بکات کە لە ماوەی ئەم سێ ڕۆژەدا ویستبووی بیکا، یانی کەلوپەل و جلوبەرگی خۆی و منداڵەکانی جیا بکاتەوە و لەگەڵ منداڵەکانی بڕواتەوە بۆ ماڵی دایکی. بەڵام هەرچی دەیهێنا و دەیبرد، نەیدەتوانی خۆی ڕازی بکات. سەرەڕای ئەوانەش دیسان وەك جاری جاران لە دڵی خۆیدا دەیگوت ناکرێ ئاوا کۆتایی پێ بێنم، دەبێ کارێك بکەم، دەبێ مێردەکەم سزا بدەم، ئابڕووی بەرم و تەنانەت ئەگەر بۆم بکرێ بە تۆڵەی ئەو هەموو ئازارەی کێشاومە، تالاوی تۆڵەی بە گەروودا بکەم. بەردەوام دەیگوت لێی جیا دەبمەوە، بەڵام هەستی دەکرد ناتوانێ" ئەویش بەو هۆیەی کە بە پێی عادەت ئەوی بە مێردی خۆی دەزانی و

خۆشیدەویست، بۆیە نەیدەتوانی واز لەو خۆشەویستییە بێنێ. جگە لەوەش دەیزانی لە ماڵەکەی خۆی بە حاڵەحاڵ دەتوانێ ئاگای لەو پێنج منداڵەی بێ و پێیان رابگا، جا چ بگا بە ماڵی دایکی. هەر لە ئێستاوە لە ماوەی ئەو سێ رۆژەدا منداڵە چکۆلەکەی نەخۆش کەوتبوو. شلەی چەند رۆژ لەمەوبەریان دابوویە و منداڵەکانی دیکەشی هیچ نەبوو بیخۆن. بۆیە هەستی دەکرد ناکرێ بڕوا، لەگەڵ ئەوەشدا خۆی فریودەدا و وای دەنواند کە دەیهەوێ بڕوا.

هەرکە چاوی بە مێردەکەی کەوت، دەستی کرد بە نێو دۆڵابەکەدا و وای نواند کە بە دوای شتێکدا دەگەڕێ. تەنیا کاتێك سەری وەرسووڕاند کە مێردەکەی بە تەواوی لێی نزیکبووبۆوە. ئەگەرچی دەیویست خۆی قورس و قایم و بڕیاردەر نیشان بدا، بەڵام روخساری شەکەتی و خەمی لێدەباری.

ستیپان ئارکادیچ بە دەنگێکی نەرم و شەرمنانەوە گوتی: دالی! ـ سەری بە خوزدا گرت و لارەملانە راوەستا و دەیویست خۆی خەمبار و مات نیشان بدا. بەڵام سەرتاپای لەشساخی و شادی و بێخەمیی پێوە دیاربوو.

ژنەکەی بە چاوێکی مانادارەوە تێیڕوانی کە گەشاوەیی و بێخەمییەکەی هاواری دەکرد و لە دڵی خۆیدا گوتی: «بەڵێ، وا دیارە زۆر کامڕەوا و لە دنیا رازییە، منیش؟... ئەو مێهرەبانییە قێزەونانەیەشی، کە هەمووانی شەیدا کردووە و تاریفی لێ دەکەن، من چەندە لەو مێهرەبانییەی وەڕەزم.» لێوی توند بە یەکدا نا و روومەتی راستەی روخساری هەڵبزرکا و تووڕەییەکەی پەڕی.

بە دەنگێك کە وەك جاران نەدەچوو و لە ناخی دڵییەوە هەڵنەدەستا بە توندی گوتی: چیت دەوێ؟

ستیپان ئارکادیچ بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی: دالی!... ئانا دێ.

دالی گوڕاندی: دەیجا دێ بە جەحەندەم! خۆ من ناتوانم میوانداری بکەم.

ـ بەڵام، دالی! خۆ ئاوا نابێ...

ژنە بێ ئەوەی چاو لە مێردەکەی بکات قیژاندی: بڕۆ، بڕۆ دەرێ، لە کۆڵم بەوە! دەتگوت ئەو هاوارەی لەبەر ژانێکی بەسۆی جەستەییە.

ستیپان ئارکادیچ دەیتوانی لە کاتی بێخەمیدا بیر لە ژنەکەی بکاتەوە. بە هیوا بوو کاروبارەکان هەروەك ماتڤێ دەیگوت جێبەجێ بن و ئەو خەمەی لە کۆڵ بێتەوە، دەشیتوانی لەگەڵ خواردنەوەی قاوە و خوێندنەوەی رۆژنامەکەی ئاسوودە و بێخەم بێ، بەڵام کاتێك چاوی بە روخساری خەمتێزاو و هەڵبزرکاوی ژنەکەی کەوت و ئەو قیژەیەی وەك زەنگی تەسلیم و داماوی دەچوو کەوتە بەر گوێی، ئۆناقێك گەرووی گرت و فرمێسك لە چاویدا قەتیس ما.

ـ دالی گیان، تۆ خودا بۆچی وا دەکەی، مەگین من چیم کردووە؟ دالی گیان، تۆ خودا... ئاخر... ـ بەڵام نەیتوانی لەوە زیاتر قسە بکات و گریان گەرووی ڕێکگوشی.

ژنەکەی دەرگای دۆلابەکەی پێوەدایەوە و چاوێکی لێکرد.

ـ دالی، چۆن بڵێم؟... بمبوورە، تۆخودا بمبوورە.. بێنەوە بیرت... نۆ ساڵ ژیان... ناتوانێ قەرەبووی... قەرەبووی هەڵەیەك...

ژنەکەی بە پێوە سەری داخستبوو و قسەکانی دەبیست. چاوەڕێبوو بزانێ مێردەکەی دەڵێ چی. وەك ئەوە دەچوو بە پاڕانەوە و لالانەوە بیهەوێ دڵی نەرم بکات.

ئاخری گوتی: ... هەڵە و شێتییەکی زووتێپەڕ قەرەبوو بکاتەوە؟... ـ دەیویست درێژە بە قسەکانی بدا، بەڵام لەگەڵ دەربڕینی ئەو قسەیە لە ناکاو ژنەکەی دی هەمیسان وەك ئەوەی ژانێکی جەستەیی پێگەیشتبێ، لێوی توند بەسەر یەکدا نا و ڕوومەتی ڕاستەی کەوتە پەڕین.

بە دەنگێکی تیژتر لە پێشوو قیژاندی: بڕۆ دەرێ، بەرچاوم بەردە. نامەوێ باسی شێتی و کارە چەپەڵەکانت ببیستم.

دەیویست دوورکەوێتەوە بەڵام لاقی لەرزی و دەستی بە شانی کورسیلەکە گرت بۆ ئەوەی نەکەوێ. دەموچاو و لێوی هەڵزڵەپا بوو و فرمێسك لە چاویدا قەیس مابوو.

ستیپان ئارکادیچ بە دەم قوڵپەی گریانەوە گوتی: دالی، تۆ خودا، بیر لەو منداڵانە بکەوە. ئەوان خۆ هیچ تاوانێکیان نییە. تاوانبار منم، من سزا بدە، تۆڵەم لێ بکەوە، پێم بڵێ چۆن ئەو تاوانە قەرەبوو بکەمەوە. تۆ چۆن بڵێی من وا دەکەم. من تاوانبارم. هیچ وشەیەك نییە کە ئەو تاوانەی خۆمی پێ بەیان کەم، بەڵام دالی، تۆ خودا بمبوورە!

دالی دانیشت، ئابلۆنسکی گوێی لە سیخە و هەناسەسوارییەکەی دەبوو. هێندەشی دڵ پێی دەسووتا کە لە گوتن نایە. دالی چەند جار ویستی قسە بکات، بەڵام نەیتوانی. بۆیە بێدەنگ بوو و لە جێی خۆی ماق ما.

دالی گوتی: تۆ کاتێك منداڵەکانت وەبیردێتەوە کە ئیشتیای یاری کردنت کرابێ. بەڵام من قەتیان لێ غافڵ نیم و دەزانم وەعزیان چەندە ناخۆشە ـ دیاربوو ئەوە وتەیەك بوو کە لە ماوەی ئەو سێ ڕۆژەدا چەندین جار لەبەرخۆیەوە پاتەی کردبۆوە.

ژنەکەی پێی گوتبوو «تۆ» ئەویش بە چاوێکی هەقناسانە تێی دەڕوانی. بۆیە لە پڕ شنگڵی لە خۆیدا و ویستی دەستی ژنەکەی بگرێ بەڵام ئەو بە ڕقەوە خۆی ڕاپسکاند.

ـ من له بیری منداڵەکاندا هەم و هەر کارێکی لەو دنیایەدا له دەستم بێ بۆ نەجات و بەختەوەری ئەوان دەیکەم. بەڵام نازانم رێگای نەجاتی ئەوان چییه. نازانم ئەوان له باوکیان دوورخەمەوه یان له لای باوکه شەرواڵ پیس و هەوەس بازەکەیان بەجێبێڵم. بەڵێ باوکه هەوەس بازەکەیان... بەڵام من ناڵێم، خۆت بڵێ دوای ئەو کاره جوانەت ئیتر دەتوانین پێکەوه بژین و بەختەوەر بین؟ نا، بەڕاستی شتی وا دەبێ؟ ـ زیاتر دەنگی هەڵێنا و دیسان پرسیی: نا. پێم بڵێ دەی، شتی وا دەبێ؟ دوای ئەوەی مێردەکەم، باوکی منداڵەکانم، لەگەڵ پەرستاری منداڵەکانی دەستی تێکەڵکردووه...

ستیپان ئارکادیچ به دەنگێکی زەلیلانەوه گوتی: بەڵام تازه چ بکەم؟ چی دەکرێ؟ خۆشی نەیدەزانی دەڵێ چی و جار لەگەڵ جار زیاتر سەری شۆڕدەکردەوه.

ژنەکه جار لەگەڵ جار زیاتر قینی هەڵدەستا، قیژاندی: ئیتر تۆ لەبەرچاوم مرۆڤێکی خوێڕی و قێزەونی. ئەو فرمێسکه بەدرۆیانەشم بۆ هەڵمەوەرێنه. تۆ قەتت من خۆش نەویستووه. تۆی دڵڕەق نازانی شەرەف و حەیا چییه. پیاوێکی پەست و چەپەڵی، خوێڕی و هیچوپووچی و بۆ من نامۆی ـ ئەو وشه تۆقێنەرەی «نامۆ»ی به رق و قینێکی ژناوییەوه دەربڕی.

ستیپان ئارکادیچ چاوی له ژنەکەی بڕیبوو و ئەو رقەی به روخسارییەوه دیاربوو به جارێ تووشی ترس و دڵەخورپه و سەرسوڕمانی کردبوو. نەیدەزانی که دڵسۆزیی ئەو زیاتر رقی ژنەکەی هەڵدەستێنێ. ژنەکەی دەیزانی که دەردەدڵی مێردەکەی بەزەیی پێداهاتنه نەك ئەوین و خۆشەویستی. ستیپان ئارکادیچ له دڵی خۆیدا گوتی: «نا، له من بێزاره. لێم نابوورێ... لەو بەدبەختییه. ئەوه بەدبەختییه، بەدبەختی!»

لەو کاتەدا زیڕەی گریانی منداڵێك له ژوورەکەی تەنیشتەوه بەرزبۆوه، که وێدەچوو کەوتبێ به زەویدا. داریا ئەلکساندرۆڤنا گوێی شل کرد و له ناکاو رەنگی پەڕی.

چەند ساتێکی خایاند تا وەخۆ هاتەوه. وێدەچوو نەزانێ له کوێیه و دەبێ چ بکات. پاشان له ناکاو له جێی خۆی دەرپەڕی و هەڵات بۆ لای دەرگاکه.

ستیپان ئارکادیچ وەدوای کەوت و گوتی: دالی تەنیا یەك وشەی دیکه..

ـ ئەگەر به دوامدا بێی خزمەتکاران و منداڵەکان بانگ دەکەم. با هەمووان بزانن چ پیاوێکی خوێڕی و چەپەڵی. من هەر ئەمڕۆ لێره دەڕۆم. با تۆ لەگەڵ ماشقەکەت به کەیفی خۆت رایبوێری.

شەق دەرگاکەی به یەکدا دا و چووەدەرێ.

ستیپان ئارکادیچ هەناسەیەکی هەڵکێشا و دەستی به دموچاویدا هێنا و به نەرمی و بێچرپه له ژوورەکه چووەدەرێ. له دڵی خۆیدا دەیگوت: «ماتقێ دەڵێ جێبەجێدەبێ، بەڵام چۆن؟ قەت رێی

تێناچێ. پەککوو لەو بەدبەختییە!» قیژە و هاواری ژنەکەی و وشەی «خوێڕی و ماشقە» هاتنەوە بیری. «قیژاندنەکەشی چەند رەشۆکییانە بوو. لەوانەیە کلفەتەکان گوێیان لێ بووبێ. چەند سامناکە، سامناك و رەشۆکییانە.» ستیپان ئارکادیچ چەند خولەکێك بە تەنیا راوەستا و پاشان چاوی سڕی و هەناسەیەکی هەڵکێشا، سینگی دەرپەڕاند و لە ژوورەکە چووەدەرێ.

رۆژی هەینی بوو و سەعاتسازە ئاڵمانییەکە لە ژووری نان خواردن خەریکی قورمیش کردنی سەعاتەکە بوو. ستیپان ئارکادیچ نوکتەیەکی وەبیرهاتەوە کە بۆ ئەو سەعاتسازە سەرقۆقەی سازکردبوو کە هەموو کارێکی وەك سەعات رێك و میزان بوو. گوتبووی: «ئاڵمانییان قورمیش کردووە کە هەموو تەمەنی خەریکی سەعات قورمیش کردن بێ.» پاشان دەستی کرد بە پێکەنین. ستیپان ئارکادیچ زۆری حەز لە نەقڵ و نوکتە دەکرد. لەبەرخۆیەوە گوتی: «لەوانەیە جێبەجێش بێ. دەستەواژەیەکی جوانە. جێبەجێدەبێ. دەبێ ئەو بگێڕمەوە.»

هەرای کرد: ماتڤێ! ـ کە ماتڤێ هات گوتی: خۆت لەگەڵ ماریا ژووری چکۆلەی میوانداری بو ئانا ئارکادیۆڤنا ئامادە نکەن.

ـ بە چاوان گەورەم.

ستیپان ئارکادیچ باڵتە کەڵپۆسەکەی خۆی لەبەرکرد و رۆیشتە سەر بانیژەی لای پلیکانەکان.

ماتڤێ لەگەڵ ئەوەی ئەربابەکەی بەڕێ دەکرد پرسیی: بۆ نان خواردن تەشریف دێننەوە بۆ ماڵێ؟

ـ با بزانین چۆن دەبێ. هانێ ئەوە بگرە بۆ خەرجی ماڵێ ـ دە رۆبلی لە جزدانەکەی دەرهێنا و دایە دەست ماتڤێ و پرسیی: بەستانە؟

ماتڤێ دەرگای کەژاوەی فایتوونەکەی پێوەدا و پاشەوپاش بە پلیکانەکاندا سەرکەوت و گوتی: بەس بێ و بەس نەبێ دیارە دەبێ بەوەندە بەسندە بکەین.

داریا ئەلکساندرۆڤنا لەو ماوەیەدا منداڵەکەی ژێر کردبۆوە و کە بە دەنگی تەقوکوتی فایتوونەکەدا زانیی مێردەکەی رۆیشتووە گەڕاوە بۆ ژووری خەوەکەی. ئێرە تەنیا شوێنێك بوو کە دەیتوانی لە چنگ ئەو دەردەسەرییانەی لە ماڵەکەدا دەورەیان دەدا، پەنای بۆ بەرێ. هەر ئەو کاتە، لەو ماوە کورتەدا کە چووبووە ژووری منداڵەکان، پەرستاری ئینگلیزی و ماتریوونا هاتبوون بۆ لای و هێندێ پرسیاریان لێکردبوو، کە نەدەکرا هەڵیگرن بۆ دوایی و تەنیا ئەو بوو کە دەیتوانی وەڵامی ئەو پرسیارانە بداتەوە: بۆ گەڕان و چوونە دەرێ چی لەبەر منداڵەکان بکەن؟ شیریان بدەنێ؟ نەنێرن بە دوای ئاشپەزێکی تردا؟

داریا ئەلکساندرۆڤنا گوتی: ئاە، دە لە کۆڵم بنەوە، لێم گەڕێن با بە دەردی خۆمەوە داکەوم! ـ دیسان گەڕاوە بۆ ژووری خەوەکەی و دیسان لەو جێیە دانیشتەوە کە کاتی قسەکردن لەگەڵ مێردەکەی لێی دانیشتبوو، دەستە ڕەقەڵەکانی کە لەبەر لاوازی ئەنگوستیلەی پێ شل بوو و لە قامکیدا دەگەڕان، توند قووچاندنی و لە زەینیدا هەموو قسەکانی خۆی لەگەڵ مێردەکەی وەبیرهاتەوە.

لە دڵی خۆیدا گوتی: «چاکە، ڕۆیشت. بەڵام کاری لەگەڵ ئەو ژنەتیوە بە کوێ گەیشتووە. یانی هێشتا کەینوبەینیان هەیە؟ بۆ لێم نەپرسی؟ نا، نا، ئیتر مەحاڵە لەگەڵی ئاشت ببمەوە. ئەگەر لە بنمیچی ماڵێکیشدا بژیین، ئیتر هیچ کات ژن و مێرد نابین. ڕاست وەك دوو بێگانە.» ئەو وشەیەش کە زۆری بە لاوە سامناك بوو بە جەختەوە دووپاتی کردەوە «ئاخ، خودایە گیان، چەندەشم خۆشدەویست، ئەویش چ خۆشەویستییەك! چەندە شەیدای بووم! بەڵام ئەی ئێستا خۆشم ناوێ؟ لە جارانم خۆشتر ناوێ؟ لە هەمووشی خراپتر ئەوەیە کە...» بەڵام فکر و خەیاڵەکەی تەواونەکرد، چونکە ماتریۆڤنا فیلی مۆنۆڤنا سەری لە کەلێنی دەرگاکەوە کرد بە ژووریدا و پرسیی:

ـ ئەگەر دەستوور بفەرموون بنێرم بە دوای براکەمدا. هەرچۆنێك بێ دەتوانێ چێشتێك لێنێ. دەنا منداڵەکان دیسان وەك دوێنێ دەبێ هەتا سەعات شەش برسییەتی بکێشن.

ـ چاکە، ئێستا دێم کارەکان ڕادەپەڕێنم. کەسێکت نارد شیری تازە بکڕێ؟

داریا ئەلکساندرۆڤنا دیسان کەوتەوە نێو گێژاوی دەردەسەرییەکانی ڕۆژانەوە، بە شێوەیەکی کاتی خەمەکانی لەبیرچۆوە.

## پێنج

ستیپان ئارکادیچ لاوێکی زۆر وریا و بەهۆش بوو. قوتابخانەی زۆر سەرکەوتووانە بە کۆتایی گەیاندبوو. لەگەڵ ئەوەشدا کە قوتابییەکی زیرەك نەبوو، زۆریش هاروهاج بوو، یەکێك لە دوایین دەرچووان بوو. ئەگەرچی ژیانی هەر بە کەیف و عەیش و نۆش ڕادەبوارد و لە دایرە پلە و پایەیەکی باڵای نەبوو، بەو تەمەنە کەمەشەوە سەرۆکی یەکێك لە دایرە گرینگەکانی مۆسکۆ بوو، مووچەیەکی باشی وەردەگرت. سەرۆکایەتی دایرەشی لە ڕێی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ کارنینەوە بە دەست هێنابوو، کە خۆی لە وەزارەتخانەیەك خاوەن پلە و مەقامی باڵا بوو، کە دایرەکەی ستیپان ئارکادیچ سەر بە ئەوێ بوو. بەڵام ئەگەر کارنین ژنبراکەی خۆی

لەو دایرە دانەمەزراندایە، ستیڤا ئابلۆنسکی ئەو پلەیە یان پلەیەکی وەك ئەوی بە ساڵی شەش هەزار رۆبل مووچەوە، لە لایەن یەکێ لە سەدان کەسی دەستڕۆیشتووی دیکەوە، جا لە رێی برایەك، خوشکێك، خاڵۆزایەك، پوورزایەك، یان ئامۆزایەکەوە هەر بە دەست دەهێنا. ئەو زۆری پێویستی بە مووچەی ئەو دایرەیە هەبوو. چونکە سەرەڕای ماڵ و سامانی زۆری ژنەکەی، باری ماڵیی هیچ باش نەبوو.

نیوەی پیاوماقووڵا ن و دەوڵەمەندانی مۆسکۆیی و پترزبۆرگی خزم و ئاشنای ستیپان ئارکادیچ بوون. ئەو لە نێو تایەفەیەکدا لە دایك بووبوو، کە لە دەسەڵاتدارانی ئەو رۆژگارە بوون، یان پێشتر بووبوون. یەك لە سێی کاربەدەستانی خاوەن پلەوپایەی دەوڵەت، یانی بەساڵاچووان، دۆست و ئاشنای باوکی بوون و ئەویان هەر لە تافی منداڵییەوە دەناسی، یەك لە سێی دیکەش ئاشنا و رۆشنای نزیکی بوون، کەوایە ئەو کەسانەی کە نێعمەتی ئەم دنیایە، واتە پلەوپایەی نان و ئاودار و کاپۆ و مڵك و ماڵیان هەبوو، لە نێوان ئەم و ئەودا دابەشیان دەکرد، هەموو هەڤاڵ و هاوڕێی ئەو بوون و نەیاندەتوانی چاوپۆشی لە خۆییەك بکەن. ئابلۆنسکیش بە پێویستی نەدەزانی، کە زەحمەت وەبەر خۆی نێ هەتا پلە و پایە و سەربەشی باش وەدەست بێنێ. هەر ئەوەندە بەس بوو لە کاروبارەکاندا سەختگیری نەکا، بەرچاوتەنگ نەبێ و خۆ لە شەڕ و کێشە لادات و بە کششەمەمرەیەکیش نەتۆرێ. بەڵام ئەو چونکە مرۆڤێکی باش و خاوەن خووخدەیەکی سەلیم بوو هیچ کام لەو مەرجانەی بە کۆسپ و تەگەرە نەدەزانی. ئەگەر پێیان بگوتبایە ئەو پلە و پایەی، کە دەیهەوێ و مووچەکەشی بە دڵە پێی نادرێ، بە لایەوە شتێکی قۆڕ بوو. چونکە ئەو قەت ئەوەندە بەرزەفڕ نەبوو چاوی لە پلە و پایەی باڵا بێ. ئەو تەنیا شتێکی دەویست کە هاوڕێ و هاوشانەکانی هەیانە و لەوانی زیاتر نەدەویست. ئەرکی تایبەت بە خۆشی زۆر بە باشی بەجێدێنا و لە هیچ کەس نەدەمایەوە.

ستیپان ئارکادیچ تەنیا لەبەردڵپاکی و یەکڕەنگی و دەستپاکییەکەی نەبوو، کە دۆست و ئاشنایان خۆشیان دەویست، بەڵکوو روخساری کراوە و خوێنی شیرین و سەرنجڕاکێش و چاوە رەش و گەشەکانی و قژ و برۆ رەشەکەی و دەموچاوە سوور و سپییەکەی زۆر لە دڵەوە نزیکبوو و کاریگەرییەکی خۆش و نەشەبزوێنی لە سەر رۆحی هەمبەرەکەی دادەنا. هەمیشە ئەو ئاشنا و رۆشنایانەی دەیاندی بە بزەیەکی شادانەوە دەیانگوت: «ئەوەتا ستیڤا ئابلۆنسکی، چاوی لێکەن!» تەنانەت ئەگەر هێندێ جار هەڵدەکەوت کە ئاخافتن لە گەڵی شادی و نەشەیەکی

تایبەتی پێوە دەبوو، هەتا ڕۆژی دوایی یان دوو ڕۆژ دوای ئەوەش هەموو ئەو قسە خۆشەیان لە بیردەما و پێی وە نەشە دەکەوتن.

نزیکەی سێ ساڵ بوو ستیپان ئارکادیچ سەرۆکایەتیی ئەو دایرەیەی لە مۆسکۆ وەئەستۆ گرتبوو. لەو ماوەیەدا نەك دەوروبەرەکانی کردبووە هۆگری خۆی، بەڵکوو کارێکی کردبوو هەموو هاوکاران و ژێردەستان و بەرپرسان و لە سەر یەك هەموو ئەو کەسانەی پێوەندییان لەگەڵی هەبوو ڕێزیان بۆ دادەنا. گرنگترین خدەی ئابلۆنسکی کە بووبووە هۆی ئەوەی هاوکارانی ڕێزی بۆ دانێن، یەکیان چاوپۆشی و لێبوردەیی دەرهەق بە خەڵکی بوو، کە ئەوەش بەو هۆیەوە بوو کە کەموکوورییەکانی خۆی دەناسی. دووهەمیش جوامێری بوو، بەڵام لەو جۆرە جوامێرانە نەبوو، کە ببێتە لیبراڵ و تاریفەکەی لە ڕۆژنامەکاندا دەخوێندەوە، بەڵکوو لایەنگری ڕەسەنایەتییەك بوو کە لە گەڵ خووخدەی ئاوێتە بوو. هەر ئەوەش بووبووە هۆی ئەوەی کە هەموو خەڵك دەوڵەمەند و هەژار و دەسەڵاتدار و بێدەسەڵات بە چاوێك تەماشابکات، سێهەمیش کە لە هەمووی گرنگترە، ئەوە بووە کە زۆر پشوودرێژ و لەسەرخۆ بوو کارەکەی بە باشی بەڕێوەدەبرد، بێ ئەوەی تووشی بیربلاوی بێ و هەڵەبکات.

ستیپان ئارکادیچ کە گەیشتە دایرەکەی، دەرگاوان بە ڕێزەوە هەتا بەردەرگای ژوورەکەی لەگەڵی چوو، جانتا بە دەست پێی نایە ژوورە تایبەتییەکەی خۆیەوە. لەوێ جلوبەرگی تایبەتی سەرۆکایەتیی لەبەرکرد و ڕۆیی بۆ نووسینگەی کارەکەی. نووسیار و کارگێڕ هەموو لە بەری هەستان و بە ڕووخۆشی و ڕێزەوە دەستیان بۆ بە سینگەوە گرت. ستیپان ئارکادیچ بە پەلە چووە پێشێ و دەست و مشتاخی لەگەڵ هەموویان کرد و لە سەر کورسییەکەی خۆی دانیشت. چەند ساتێك ئەوەندەی لوا چاك و خۆشی و گاڵتەی لەگەڵ کردن و پاشان دەستبەکاربوو. هیچ کەس وەك ستیپان ئارکادیچ ناتوانێ میزانی شیاو بۆ ئازادی و دڵپاکی و بێ دەماری و فەرمی بوون بۆ وەگەڕکەوتنی دڵخوازانەی کار بدۆزێتەوە. نووسیارەکەی بە ڕوویێکی خۆش و ڕێزێکی تایبەتەوە، هەر ئەو جۆرەی لە دایرەکەدا باو بوو، بە چەند کاغەز و دەوسیەوە هات بۆ لای و بە لەبزێکی خۆمانە و بێ تەکلیفانەوە، کە ستیپان ئارکادیچ ئەو جۆرە هەڵسوکەوتەی لە نێو ئیدارەکەدا چەسپاندبوو، دەستی کرد بە قسەکردن و گوتی: ئاخری توانیمان ئەو زانیارییەی کە دەمانەوێ لە پارێزگای پینزای وەدەست بێنین. ئەگەر ڕەزایەتت لە سەر بێ...

ستیپان ئارکادیچ قامکی لە سەر کاغەزەکە دانا و گوتی: کە وایە ئاخری وەدەستتان خست... زۆر باشە، براینە... ـ ئیتر کاری دایرە دەستیپێکرد.

ستیپان ئارکادیچ لەگەڵ ئەوەی گوێی لە ڕاپۆرتەکە گرتبوو بە ویقارەوە تۆزێ سەری بە لادا خستبوو و لەبەرخۆیەوە دەیگوت: «ئەگەر ئەوانە دەیانزانی سەرۆکەکەیان هەتا نیو سەعات لەمەوبەر چۆن وەکوو منداڵێکی خەتابار سەری بەردابۆوە!» چاویشی بریقەی دەهات. کارەکەیان هەتا سەعات دووی دەخایاند. سەعات دووش کاتی پشوودان و خواردنی قاوەڵتی بوو.

هێشتا نەبووبووە سەعات دوو، کە دەرگای شووشەیی و گەورەی تەلارەکە کرایەوە و پیاوێك هاتەژوورێ. هەموو کارمەندەکان کە لە ژێر وێنەی گەورەی ئیمپراتۆر و لە پشت شەبەنگی سێپاڵووەوە[11] دانیشتبوون، لە خۆشیانا گەشانەوە، چونکە ئەو ڕووداوە مزگێنییەکی خۆش بوو بۆ سەرگەرمی و هەموویان سەریان بۆ لای دەرگاکە وەرسووڕاند. بەڵام ئەو نیگابانەی لەبەر دەرگاکە ڕاوەستابوو هەر خێرا کابرای کردە دەرێ و دەرگا شووشەییەکەی لێ پێوەدا.

کاتێك ڕاپۆرتەکە هەتا کۆتایی خوێندرایەوە، ستیپان ئارکادیچ هەستا و تۆزێ خۆی کێشایەوە و بۆ ڕەچاوکردنی ئاکاری جوامێرانە، کە ڕۆحی سەردەم بوو هەر لەوێ جگەرەیەکی دەرهێنا و ڕۆیی بۆ نووسینگە تایبەتەکەی خۆی. دوو کەسیش لە هاوکارە نزیکەکانی، نیکیتین کە کارمەندێکی دێرین و ڕۆحسووك و بە دەستوبرد و خاوەن ئەزموون بوو، هەروەها گرینیەڤیچ[12] کە ئاجوودانی دەربار بوو، لە گەڵی ڕۆیشتن.

ستیپان ئارکادیچ گوتی: ئەو کارە دوای نانی نیوەڕۆ تەواودەکەین.

نیکیتین گوتی: حەتمەن جێبەجێیدەکەین.

گرینیەڤیچ گوتی: بەڵام ئەو فۆمینە[13] زۆر نالەبار و ڕووهەڵماڵدراوە! ـ فومین یەکێك لەو کارمەندانە بوو، کە لە ماجەرای پێڕاگەیشتندا بەشداربوو.

ستیپان ئارکادیچ وەڵامی نەدایەوە و تەنیا نێوچاوی تێکنا و بەو شێوەیە تێیگەیاند، کە داوەریی بەپەلە زۆر نەشیاوە.

ستیپان ئارکادیچ لە دەرگاوانەکەی پرسی: کێ بوو هاتەژوورێ؟

---

١١- لە تایبەتمەندییەکانی تەلاری شۆڕا لە مەرزینگە دەوڵەتییەکان، ئاوێنەی عەدالەت بوو، ئەویش ئەو شەبەنگە شووشەییە سێ پاڵووە کە وێنەی هەڵۆیەکی بە سەرەوە بوو، باڵی فش کردبۆوە، داوێنەکەشی ئەو دەستوورانەی پیتێری کەبیری لە سەر بوو سەبارەت بە یاسای داد و مافی شارۆمەندان.

12- Grinievitch

13- Fomine

ـ بۆ تاوێك ئاگام لێ نەبوو، گەورەم، کابرایەك بەبێ ئیجازە سەری پێوەنا و هاتەژوورێ. کاری بە ئێوە بوو گەورەم. گوتم هەرکاتێك کۆمیسیۆن تەواوبوو و کارمەندان هاتنە دەرێ، ئەو کاتە...

ـ ئێستا لە کوێیە؟

ـ پێموایە لە سەرسەرایە. هەتا تاوێ لەمەوبەر لەوێ پیاسەی دەکرد ـ پیاوێکی کەڵەگەت و چوارشانەی ریش لوولی نیشان دا، کە کڵاوێکی پێستەبەرخی لە سەر نابوو و بە پەلە و گورجوگۆڵ لە پلیکانە بەردینە سواوەکان دەهاتە سەرێ. کارمەندێکی بەلەباریکە کە جانتایەکی بە دەستەوە بوو بە پلیکانەکاندا دەهاتە خوارێ، راوەستا و چاوێکی تەوساویی لە لاقوقولی ئەو کابرا گورجوگۆڵە کرد و پاشان سەری هەڵێنا و لە ئابلۆنسکیی روانی.

ستیپان ئارکادیچ لە سەر پلیکانەکان راوەستابوو. ئەدگاری بە هۆی نییەت پاکییەوە نوورانی بوو و لە یەخەی کەڵبەدوون کراوی بەرگە فەرمییەکەی هاتبووە دەرێ، بە دیتن و ناسینەوەی کابرا گورجوگۆڵەکە گەشایەوە و دەموچاوی نوورانیتر بوو.

بە بزەیەکی دۆستانە و تۆزێ تێکەڵ بە تەشەرەوە چاوی لە لەڤین[14] بڕی کە دەهاتە پێشێ، گوتی: ئەوە تۆی لەڤین، شوکر ئێمەت وەبیرهاتەوە ـ بە گوشینی دەستی رانەوەستا، لاڕوومەتی ماچکرد و گوتی: چۆن ویستت خۆت گوتەنی لەم «ڕەهۆڵی دزانە»دا بێی بۆ لای من؟ لەمێژە هاتووی؟

لەڤین شەرمنانە و لەگەڵ ئەوەشدا بە وەڕەزی و بێئۆقرەییەوە لە دەوروپشتی خۆی روانی و گوتی: هەرئێستا گەیشتمە ئێرە و زۆرم حەزدەکرد چاوم پێتبکەوێ.

ستیپان ئارکادیچ کە ئاگای لە شەرمنی تێکەڵ بە سەماخیی هەڤاڵەکەی بوو، دەشیزانی رقێکی شاراوە لە ناخەوە هەڵدەچۆقێنێ گوتی: چاکە، وەرە با بچین بۆ ژوورەکەی من ـ قۆڵی گرت و بە دوای خۆیدا وەك ئەوەی بیهەوێ بە رێگایەکی مەترسیداردا بیبات و رێنوێنی بکات، کێشای هەتا وەتاغەکەی خۆی.

ستیپان ئارکادیچ تەقریبەن لەگەڵ هەموو ئاشنا و رۆشناکانی خۆی خۆمانە هەڵسوکەوتی دەکرد و ئەوانی بە «تۆ» بانگ دەکرد. لەگەڵ پیرەپیاوانی شەست ساڵ تەمەن و لاوانی بیست ساڵان و ئەکتەر و وەزیر و کاسبکار و ژێنراڵ و ئاجوودان، کە زۆربەیان لەو کەسە خۆمانانە

14- Levin

بوون هەرکام لە سەرێکی پەیژەی کۆمەڵایەتی هەڵکەوتبوون و ئەگەر بیانزانیبایە لە لایەن ئابلۆنسکییەوە خاڵێکی هاوبەشیان هەیە، بە جارێ تووشی سەرسووڕمان دەبوون. ئەو هەموو ئەو کەسانەی بە تۆ بانگ دەکرد کە لەگەڵی دەبوونە هاوپیاڵە و شامپاینیان لەگەڵ دەخواردەوە، لەگەڵ هەموو کەسیش هەڵسوکەوتی دەکرد و شامپاینی دەخواردەوە، بەو هۆیە هەرکاتێك لەلای کارمەندێکی خۆی لووتی بە لووتی یەکێك لەو خۆمانانەدا دەتەقی کە لەوانە بوو ببێتە هۆی شەرمەزاری، (بە گاڵتە پێی دەگوتن «تۆ» کانی ناتۆ) دەیتوانی بە زیرەکیی تایبەتی خۆی پەڵەی ناحەزی ئەو رووداوە لە زەینی کارمەندەکانی بسڕێتەوە. لەڤین لەو دۆستانەی نەبوو کە بۆی ببێتە مایەی شەرمەزاری، بەڵام ئابلۆنسکی بە بۆچوونی تایبەت بە خۆی هەستی دەکرد کە لەوانەیە لەڤین پێی وابێ ئەو نایەوێ لە بەرچاوی کارمەندەکانی بە گەرموگوڕی و بە شێوەیەکی خۆمانە پێشوازیی لێبکات و هەستی گەرمی دۆستانەی دەربڕێ، بۆیە دەیویست زۆر بەتاڵووکە و خێرا بیبات بۆ نووسینگە تایبەتەکەی خۆی.

ئابلۆنسکی لەگەڵ لەڤین هاوتەمەن بوو و خۆمانە بوونەکەشی لەگەڵی تەنیا بە هۆی هاوپیاڵە بوونی نەبوو. لەڤین هاوڕێ و هەڤاڵی تافی لاویی ئابلۆنسکی بوو. ئەوان ئەگەرچی لە سەلیقە و خووخدەدا دژوازی یەك بوون، بەڵام وەك سەردەمی گەنجی و سەرەتای بوونە هەڤاڵ یەکتریان خۆشدەویست. سەرەڕای ئەوەش هەروەك زۆر جار دیتوومانە هێندێ کەس لە ژیاندا ڕێگا و کاری جۆراوجۆر هەڵدەبژێرن. ئەگەرچی هەرکام لەوانە کاتێك باسی کارەکە دێتە گۆڕێ هی ئەوی دیکەی پێ باشترە، بەڵام لە دڵی خۆیدا بە سووکی دەزانێ. هەرکام لەوان پێی وا بوو ئەو شێوە ژیانەی خۆی تاقە ژیانی ڕاستەقینەیە و ژیانی ئەوی تر تەنیا تاپۆیەکی لێڵی ژیانە و بەس. ئابلۆنسکی لەگەڵ دیتنی لەڤین نەیتوانی بەرگری لەو بزە مانادار و تەشەراوییە بکات کە لە ناخەوە ختووکەی دەدا. ئەوە چەندەمین جار بوو کە دەیدی لەڤین لە گوندەوە دێ بۆ مۆسکۆ. دەیزانی لە گوندەکەیان چالاکە، بەڵام بە جوانی بۆی روون نەبوو کە چالاکییەکەی لەوێ چییە و زۆریش لە سەر ئەوە سوور نەبوو بزانێ. لەڤین هەمیشە کە دەهات بۆ مۆسکۆ، بە پەلە و پەشۆکاو و هێندێ شەرمێون بوو و زۆریشی رق لەو شەرمێونییەی خۆی بوو. هەرجارەش سەبارەت بە مەسەلەیەك بیروڕای تازە و سەیروسەمەرەی دەردەبڕی و ستیپان ئارکادیچ پێکەنینی بەوە دەهات و هەڵبەت زۆریشی خۆشدەویست. لەڤینیش هەر بەو شێوەیە ژیانی شارنشینی هەڤاڵەکەی بە شتێکی قۆڕ و بێبایەخ دەزانی و پلە و پایەی ئەوی بە هیچ دانەدەنا و لە دڵی خۆیدا زۆریش بە سووکی دەزانی و پێکەنینی پێی دەهات. بەڵام جیاوازیی ئەوان لەوەدا بوو کە ئابلۆنسکی هاوڕەنگی هەمووان بوو و

بە دڵنیایی و ڕۆخۆشییەوە بە کاری هەڤاڵەکەی پێدەکەنی، بەڵام لەڤین لە ناخەوە دڕدۆنگ بوو و پێکەنینەکەی تاڵ و هێندێ جار دەخەزدارانە بوو.

ستیپان ئارکادیچ کە پێی نایە ژوورەکەی خۆیەوە، قۆڵی لەڤینی بەردا، وەك ئەوەی بەو کارە وا بنوێنێ کە لە هێمنایەتیدان، گوتی: ئێمە زۆر لەمێژە چاوەڕێتین. چاوم روون بۆوە بە دیتنت. دەی، بۆم باس کە کەنگێ هاتی؟

لەڤین بێدەنگ دانیشتبوو و دەیڕوانییە روخساری نائاشنای هاوکارانی ئابلۆنسکی، بەتایبەت دەستی گرینیەڤیچ کە پیاوێکی زۆر قۆز و تەڕپۆش بوو. چاوی لە سەر قامکە شووش و باریك و نینۆخە زەرد و درێژ و نووکخوارەکانی هەڵنەدەگرت، دوگمەی سەرقۆڵی کراسەکەی زۆر گەورە و بریقەدار بوون و دیاربوو کە بە جارێ سەرنجیان راکێشاوە و ناهێڵن بێخەیاڵ و ئەرخەیان بێ. ئابلۆنسکی خێرا لەو روانینەی لەڤین گەیشت و زەردەیەکی گرت.

گوتی: ئاە، ئیزن بدەن بە یەکترتان بناسێنم. هاوکارانی من فیلیپ ئیڤانۆڤیچ نیکیتین و میخاییل ئیستانیسلاڤیچ گرینیەڤیچ ـ پاشان رووی لە لەڤین کرد و گوتی: هاوڕێی دێرینم کۆنستانتین دمیتریچ لەڤین، برای سرگی ئیڤانۆڤیچ کازنیشۆڤ[15]ی بەناوبانگ، ئەندامی بەناوبانگی زێمستڤا[16]یە و هەڵبەت لە ئەندامانی نوێخوازی ئەو شۆڕایە. ئێستاش سەرقاڵی ئاژەڵدارییە. جگە لەوەش راوچی و وەرزشوانە و دەتوانێ کێشانەیەکی پێنج تۆنی بە دەستێك بەرزکاتەوە.

کارمەندە بەساڵاچووەکە گوتی: خۆشحاڵم لە ئاشنایەتیتان.

گرینیەڤیچ دەستە ناسکەکەی بەو نینۆکە درێژانەوە هێنا پێشێ و دەستی لەڤینی گوشی و گوتی: «بە شانازییەوە ئاشنایەتیم لەگەڵ سرگی ئیڤانۆڤیچ هەیە.»

لەڤین نێوچاوانی تێکنا و بە ساردوسڕی دەستی ئەوی گوشی و خێرا سەری بۆ لای ئابلۆنسکی وەرسووڕاند. ئەگەرچی زۆری رێز بۆ سرگی ئیڤانۆڤیچی زڕبرای دادەنا کە نووسەرێکی ناوبەدەرەوە بوو و ناوبانگی هەموو رووسیای داگرتبوو، بەڵام قەت پێی خۆش نەبوو بە بۆنەی سرگی ئیڤانۆڤیچی برایەوە رێزی بۆ دانێن، نەك لەبەرخۆی کە کۆنستانتین لەڤینە.

---

15- Koznichov

١٦- Zemstvo شۆڕای ناوچەیەکی گوندنشین لە ڕووسیای تزاری، کە ئەندامەکانی هەموو ساڵێك لە لایەن پیاوماقووڵان و مالیکانەوە هەڵدەبژێردران و ئەرکیان پێڕاگەیشتنی کاروباری گوند و دابین کردنی خزمەتگوزاری و فێرکاری و تەندروستی بووە.

ڕووی لە ئابلۆنسکی کرد و گوتی: نا، من ئیتر ئەندامی زێمستڤا نیم، لەگەڵ هەموویان بە شەڕ هاتم و ئیتر لە کۆڕەکانیاندا بەشداری ناکەم.

ئابلۆنسکی بە پێکەنینەوە گوتی: سەیرە ئاوا زوو. بەڵام چۆن؟ بۆ؟

گوتی: نەقڵەکەی دوور و درێژە. رۆژێك بۆت باس دەکەم ـ بەڵام خێرا بە لەبزێکی ئەوتۆوە کە دەتگوت زویریان کردووە دەستی کرد بە گێڕانەوە: بە کورتی بۆم دەرکەوتبوو کە لە هیچ شوێنێك زێمستڤا چالاکیی نییە و کەسیش خەبەری لێی نییە، هەر ناشتوانێ ببێ. راستت دەوێ هەموو گەمەیە. پەرلەمانبازییان وەڕێخستووە. منیش نە هێندە منداڵم و نە ئەوەندەش پیرم کە خۆم بەو گەمە قۆڕانەوە سەرقاڵ بکەم" هەروەها (بە منجەمنج کەوت) بوارێکە بۆ دزی و فزیی هێندێ داروودەستەی دەسەڵاتدار و رەخنەکردووی پارێزگا. ئەو کاتانە کاری ئاسان و پڕ داهات یان سەروەسیەت بوون، یان دادوەری لە دادگا، بەڵام ئەمڕۆ بوونە ئەندامی زێمستڤایە. ئەو سەردەمە رامالینی ماڵ و سامان و بەرتیل وەرگرتن بوو، ئێستاش مووچەی زۆر و نارەوا ـ لەگەڵ گوتنی ئەو قسەیە، وەك بڵێی یەکێك لە دانیشتووان بیهەوێ دژایەتی لەگەڵ بکات، بە تینوگوڕێکی زۆرەوە دەریبڕی.

ستیپان ئارکادیچ گوتی: دا راوەستە بزانم، وا دیارە تۆ دیسان رێچکەیەکی نوێت گرتۆتە بەر و بەرەو کۆنەپەرستی دەخوشی، ئەگەرچی وا باشە ئەو باسە دانێین بۆ کاتێکی تر.

لەڤین گوتی: بەڵێ، دایدەنێین بۆ دوایی. بەڵام من دەمویست حەتمەن چاوم پێت بکەوێ ـ کە ئەوەی گوت بە رقەوە چاوی لە دەستی گرینیەڤیچ بڕیبوو.

بزەیەکی کەمڕەنگ نیشتە سەر لێوی ستیپان ئارکادیچ.

چاوێکی لە جلوبەرگە نوێیەکەی کرد، کە دیاربوو تازە لە بەردەستی بەرگدرووی فەڕەنسی هاتۆتە دەرێ و گوتی: دەی، ئەوە رۆژ لە کوێوە هەڵدێ؟ خۆ تۆ دەتگوت تازە جلوبەرگی ئەورووپایی لەبەرناکەم، بەڵام وا دیارە بیرورات گۆڕیوە.

لەڤین لە ناکاو سوورهەڵگەڕا، بەڵام نەك وەکوو بەساڵاچووان کە تۆزێ سوورهەڵدەگەڕێن و خۆیان نازانن کە سوورهەڵگەڕاون، بەڵکوو وەك کوڕیژگەیەکی کە هەست دەکات شڵەژان و دەست و پێ تێکەڵهاتن ئابڕووی بردووە و هەست بە شەرمەزاری دەکات و سوورتر دەبێتەوە و هێندەی نامێنێ دەست بکات بە گریان، قەڵافەتی ئەو لاوە خاوەن ژیارەش بەو ئەدگارە پیاوانەیەوە لەبەر تەوژمی ئەو ئازارە منداڵانەیەدا هێندە سەیر بوو، کە ئابلۆنسکی چاوی لە سەر هەڵنەدەگرت.

لەڤین گوتی: لەوە گەڕێین، لە کوێ دەتوانم بتبینم؟ من حەتمەن دەبێ قسەت لەگەڵ بکەم، کارێکی تایبەتم پێتە.

ئابلۆنسکی ساتێك چووە ماڵی فیکرەوە و پاشان گوتی:

ـ رێستۆرانتی گوورین[17] دەزانی؟ بۆ خواردنی فراوێن دەچین بۆ ئەوێ. لەوێ پێکەوە قسە دەکەین. من هەتا سەعات سێی دوای نیوەڕۆ بێ کارم.

لەڤین تۆزێ بیری کردەوە و گوتی: نا، من دەبێ بە سەر پێیەکەوە بچم بۆ شوێنێك.

ـ باشە، کە وایە ئێوارە پێکەوە نان دەخۆین و قسەش دەکەین.

ـ نان بخۆین؟ راستت دەوێ قسەکە زۆریش گرینگ نییە. دەمهەوێ شتێکت لێ بپرسم. دواتریش دەتوانین پێکەوە قسە بکەین.

ـ دەی باشە، هەرئێستا پرسیارەکەت بکە. قسەکانمان هەڵدەگرین بۆ کاتی نان خواردن.

ـ باشە، پرسیارەکەم ئەوەیە... ئەگەرچی شتێکی گرینگ نییە.

لە ناکاو رقێکی شاراوە روخساری داگرت. کە ئەویش بە هۆی ئەو لە خۆ نووسانەوە بوو، کە دەیهەویست بە سەر شەرمەونییەکەیدا زاڵ بێ.

گوتی: هەواڵت لە ئیشچر باتسکییەکان هەیە؟ هیچ رووداوێکی تازە نەقەوماوە؟

بزەیەکی کاڵ روخساری ستیپان ئارکادیچی کراوەتر کرد و بریقەیەك لە چاویدا درەوشایەوە. لەمێژ بوو دەیزانی لەڤین حەز لە کیتیی ژنخوشکی دەکات.

ـ تۆ گوتت دوو وشە، بەڵام من ناتوانم بە دوو وشە وەڵامی تۆ بدەمەوە، چونکە... داوای لێبوردن دەکەم، تۆزێ سەبرکە...

نووسیارەکەی بە رێزێکی زۆر خۆمانەوە کە خاکەڕایی پێوە دیاربوو (وەکوو هەموو نووسیارێك)، کە دیارە زیاتر لە سەرۆکەکەی ئاگای لە کاروباری دایرەکەیە، بە چەند نامەوە هاتەژوورێ و لەبەر مێزەکەی ستیپان ئارکادیچ راوەستا و بە شێوەی پرسیار دەستی کرد بە روونکردنەوەی گرفتێکی دایرەکە. ئابلۆنسکی نەیهێشت ئەوەی دەیهەوێ هەتا ئاخر لە سەری بڕوا، دەستی بە نەرمی و مێهرەبانی بە قۆڵی نووسیاردا هێنا و گوتی: نا، ئێوە هەر ئەو کارەی پێم گوتوون بەڕێوەی بەرن ـ بە بزەیەك کە کاریگەریی ئەو وەڵامەی لە سەر دڵی نووسیارەکە دەسڕییەوە، بیروڕای خۆی لە سەر بابەتەکە بۆ

17- Gurin

شیکردەوە و دەوسیەکەی دایەوە دەستی و گوتی: تکات لێ دەکەم، زاخارنیکی تیچ، ئاوا بکە، تکادەکەم.

نووسیار بە شەرمەزارییەوە چووەدەرێ. لەڤین کە لە ماوەی دمەتەقێی ئابلۆنسکی و نووسیارەکەیدا بە سەر پەشۆکاویی خۆیدا زاڵ بووبوو، هەنیشکی لە سەر شانی کورسییەکە دانابوو و هەستابووە سەر پێ، روخساری نیشانەی سەرنجێکی تێکەڵ بە گاڵتەجاڕی پێوە دیاربوو.

گوتی: تێناگەم، هیچ تێناگەم.

ئابلۆنسکی کە خەریکی هەڵگرتنی جگەرەیەك بوو، هەروا بە بزەیەکەوە گوتی: لە چی ناگەی؟ ـ چاوەڕێبوو لەڤین قسەیەکی سەیروسەمەرە بکات.

لەڤین شانی هەڵتەکاند و گوتی: تێناگەم ئێوە چ دەکەن؟ چۆن دەتوانن جیددی بن لە کارەکانتاندا؟

ـ بۆ؟

ـ چونکە ئەوە کار نییە.

ـ تۆ پێت وایە بە قەد تووکە سەرمان کار هەیە؟

لەڤین گوتی: رەنگە بشتانبێ، بەڵام من رێزم بۆ پلە و پایەی بەرزی ئێوە هەیە و شانازی دەکەم کە هەڤاڵەکەم ئاوا خاوەن کەسایەتییەکی باڵایە، لەگەڵ ئەوەی هەوڵی دەدا راست چاو لە چاوی ئابلۆنسکی ببڕێ، گوتیشی: بەڵام وەڵامی پرسیارەکەی منت نەدایەوە.

ـ باشە باش، جارێ پەلە مەکە. نۆرەی خۆشت دێ. تۆ خەمی هیچت نییە. چونکە سێ هەزار دسیاتین زەویت لە پارێزگای کارازین[18] هەیە و شانوباهۆت بەهێزە و روخسارت هێندەی کچێکی دوازدە ساڵان تورت و ناسکە، بەڵام سەبرکە تۆش رۆژێك وەك ئێمەت لێدێ. بەڵام وەڵامی تۆ، بارودۆخەکە نەگۆڕاوە، سەد مەخابن تۆ ئەو ماوەیە لێرە نەبووی!

لەڤین پەشۆکاوانە پرسیی: بۆ مەگین چ بووە؟

ئابلۆنسکی وەڵامی دایەوە: هیچ نەبووە. پاشان قسەی لێدەکەین. بەڵام تۆ بۆچی هاتووی؟

لەڤین دیسان وەك چەوەندەر سووربۆوە و گوتی: چاکە، سەبارەت بەوەش پاشان قسە دەکەین.

ستیپان ئارکادیچ گوتی: بەڵێ، بەڵێ حەتمەن! دەزانی چی، زۆرم پێخۆش بوو بانگهێشتنت کەم بۆ ماڵێ، بەڵام ژنەکەم حاڵی باش نییە، ئەگەر پێتخۆشە ئەوان ببینی ئەمڕۆ حەتمەن لە

18- Karazin

باخچەی ئاژەڵان دەبن. لە سەعات چوارەوە هەتا پێنج. کیتی دەچێ بۆ یاریی پاتیناژ[19]. تۆش برۆ بۆ ئەوێ، منیش دێم بۆ ئەوێ و پێکەوە دەچین نان دەخۆین.

ـ زۆر چاکە، کە وایە بە هیوای دیدار.

ستیپان ئارکادیچ بە پێکەنینەوە هەرای لێکرد: بەڵام ئاگات لە خۆت بێ، چونکە من زۆر باشت دەناسم. یان لە بیرت دەچێتەوە، یان یەکسەر دەڕۆیەوە بۆ دێ!

ـ نا، خاترجەم بە.

لەڤین لە نووسینگەی ئابلۆنسکی هاتەدەرێ" کاتێك خەریکی هاتنە دەرێ لە دایرەکە بوو وەبیری هاتەوە خوداحافیزی لە هاوکارەکانی ئابلۆنسکی نەکردووە.

کاتێك لەڤین ڕۆیشت گرینیەڤیچ گوتی: دەبێ پیاوێکی زۆر بەتین وگوڕ بێ.

ستیپان ئارکادیچ سەری لەقاند و گوتی: بەڵێ، براکەم، مرۆڤێکی زۆر بەختەوەرە. لە کارازین سێ هەزار دسیاتین زەویی بەراوی هەیە. تازە سەرەتای لاوییەتی و ئاوا جوان و جحێڵە. وەزعیشی زۆر لەگەڵ من جیاوازە.

ـ تۆ بۆ گازاندەت هەیە، ستیپان ئارکادیچ؟

ستیپان ئارکادیچ هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و گوتی: چونکە زۆر لە بارودۆخێکی ناخۆشدام، زۆر ناخۆش.

## شەش

کاتێك ئابلۆنسکی لە لەڤینی پرسی بۆچی هاتووە، لەڤین سوورهەڵگەڕا و لەوەی سوورهەڵگەڕابوو ڕقی لە خۆی هەستا، چونکە نەیدەتوانی وەڵام بداتەوە، کە «هاتووم بۆ خوازبێنیی ژنخوشکەکەی تۆ» ئەگەرچی هەر بەو قەستە هاتبوو.

ماڵباتی لەڤین و ئیشچر باتسکی هەردوو لا لە ئاغاواتی قەدیمیی مۆسکۆ بوون و هەمیشە پێکەوە خزمایەتیی و دۆستایەتیی نزیکیان بووە. ئەو پێوەندییە لە دەورانی خوێندنی لەڤینەوە لە زانستگا چڕوپڕتر بووبوو. لەڤین لەگەڵ پرێنس ئیشچر باتسکی چکۆلە، برای دالی و کیتی، پێکەوە

---

19 -Patinaj (خلیسکێنی سەر سەهۆڵ)

خۆیان بۆ چوونە زانستگا ئامادەکردبوو. پاشانیش پێکەوە چووبوونە زانستگا. لەو ماوەیەدا لەڤین زۆری سەردانی ماڵی ئیشچر باتسکی دەکرد و زۆریش هۆگریان بوو. ئەگەرچی لەوانەیە ئەو قسەیەتان پێ سەیر بێ، بەڵام لەڤین شەیدای ئەو ماڵە بوو. هۆگری تەواوی بنەماڵەکە و بەتایبەت ژنەکانیان. لەڤین دایکی خۆی وەبیرنەدەهات و خوشکە تاقانەکەشی لە خۆی گەورەتر بوو، بە جۆرێك کە یەکەم جار لەو شوێنە خۆشە لەگەڵ ئەو بنەماڵە نەجیبزادە و قەدیمییە، یانی ماڵباتێکی خاوەن ژیار و بەشەرەف، کە خۆی بە هۆی مردنی باوك و دایکییەوە لێی بێ بەش بوو، ئاشنابوو. هەموو ئەندامانی ئەو بنەماڵەیە، بەتایبەت ئافرەتەکانی لەبەرچاوی ئەو بە جلوبەرگێکی رازاوە و شاعیرانە خۆیان دادەپۆشی و ئەو نەك هیچ چەشنە عەیبێکی لەواندا نەدەدی، بەڵکوو لە بن ئەو پۆشەنەدا جوانترین هەست و هەموو چەشنە کەماڵێکی دەدی. بۆ ئەو سێ کچە دەبوو بە نۆبە رۆژێك بە فەرەنسی و رۆژی دوایی بە ئینگلیزی قسە بکەن؟ بۆ لە سەعاتی دیاریکراودا بە نۆرە پیانۆ دەژەنن، کە دەنگەکەی هەمیشە دەگاتە ژووری براکەیان لە نهۆمی سەرێ، کە ئەو و براکەی لەوێ دەرسیان دەخوێند؟ بۆچی ئەو مامۆستایانەی ئەدەبی فەرەنسی و مۆسیقا و وێنەگەری و سەما بە فایتوون دەهاتن بۆ ماڵەکەیان و دەرۆیشتنەوە؟ بۆچی هەرسێ کچەکە بە فایتوون لەگەڵ مادموازێل لینۆن دەچوونە بلۆاری تورسکۆی بۆ سەیر و گەڕان و کراسی ئەتلەسییان لەبەردەکرد؟ کراسی دالی شۆڕ و کراسی ناتالیا تۆزێ قوڵەتر و کراسی کیتی ئەوەندە قوڵە بوو بەلەکە سپی و ناسك و بە گۆرەویی سوور رێکگوشراوەکەی دیاربوو. بۆ دەبوو حەتمەن لەگەڵ خزمەتکارێك، کە نیشانەی زێڕین بە کڵاوەکەیەوە بوو بێن بۆ سەیران لە بلۆاری تورسکۆی؟ ئەو هەرچی سەری دێنا و دەبرد لەو کارانە و هەموو چەشنە کارێکی تر، کە لەو شوێنە رەمزاوییەدا بەرێوەدەچوون، نەدەگەیشت. بەڵام دەیزانی کە هەموو هەڵسوکەوت و رووداوەکانی ئەو ماڵە پاك و چاکە و لەوەش باشتر نابێ. بۆیە ئەویش راست هۆگر و شەیدای رەمزاوی بوونی ئەو کارانە بوو، کە لەوێ بەرێوەدەچوون.

لە کاتی خوێندندا هێندەی نەمابوو ئاشقی دالی بێ کە لە هەموویان گەورەتر بوو، بەڵام زۆر زوو دالییان دا بە ئابلۆنسکی. بەڵام دواتر وردە وردە شەیدای خوشکی دووهەم واتە ناتالیا بوو. لەوە دەچوو هەست بکات کە حەتمەن دەبێ دڵ بە یەکێك لەو خوشکانە بدا. بەڵام لە هەڵبژارندا دامابوو. ناتالیاش هەرکە پێی کرایەوە بۆ کۆڕ و کۆبوونەوەکان، لەگەڵ دیپلۆماتێك بە ناوی لڤۆڤ[٢٠] زەماوەندی کرد. کاتێك لەڤین زانکۆی تەواوکرد کیتی هێشتا چکۆڵە بوو.

---

20 - Lvov

براکەیان ئیشچر باتسکیی چکۆلە، بوو بە دەریاوان و پاشان لە دەریای بالتیك گیانی لە دەست دا. بەو شێوەیە هاتوچۆی لەڤین لەگەڵ بنەماڵەی ئیشچر باتسکی، سەرەڕای دۆستایەتی لەگەڵ ئابلۆنسکی کەمبۆوە. بەڵام ئەمساڵ کە سەرەتای زستان هات بۆ مۆسکۆ و دوای ساڵێك نیشتەجێبوون لە دێ چوو بۆ سەردانی بنەماڵەی ئیشچر باتسکی، بۆی دەرکەوت کە چارەنووس چارەی ئەوی لە کام یەك لەو سێ خوشکە نووسیوە.

لەوە دەچوو بۆ لاوێکی سی و دوو ساڵان و لە بنەماڵەیەکی ئەشرافی و تا رادەیەك دەوڵەمەندی وەك ئەو خوازبێنی کردن لە پرێنس ئیشچر باتسکایا کارێکی زۆر ئاسایی و سروشتی بێ. زۆریش وێدەچوو لە رێوە وەك زاوایەکی شایستە چاوی لێبکەن و کچەکەی بدەنێ. بەڵام لەڤین ئاشق بوو، هەر بەو هۆیەش کیتیی لە هەموو بارێکەوە چووبووە دڵەوە و بە فرشتەی دەزانی. لە هەموو خەڵکی سەرزەویی بە زیاتر دەزانی و خۆی لە هەمبەر ئەودا بە مرۆڤێکی چکۆلە و بێ بایەخ دادەنا و تەنانەت بە بیریشیدا نەدەهات، کە کەسێك یان بەتایبەت کیتی ئەو بە شیاوی ئەو پێوەندە بزانێ.

دوای ئەوە دوو مانگی رەبەق وەك گێژ و مەنگان لە مۆسکۆ خولایەوە و هەر رۆژەی لە کۆڕ و کۆبوونەوەیەك چاوی بە کیتی دەکەوت و هەر بە مەبەستی دیتنی ئەویش دەچوو بۆ ئەو شوێنانە، تا لە پڕ هاتە سەرئەوەی، کە ئەو شتە بە هیچ شێوەیەك نالوێ و ناچار گەڕاوە بۆ گوندەکەیان.

ئەم بە خۆسەلماندنەی لەڤین کە ئەو پێوەندییە مەحاڵە، بەو هۆیەوە بوو کە لە خەیاڵی خۆیدا پێی وا بوو کەسوکاری کیتی ئەو بە زاوایەکی باش و شیاوی خۆیان دانانێن و لە هیچ روویێکەوە شایستەی ئەوە نییە ببێتە هاوسەری ئەو کچە بێوێنەی ئەوان و کیتی خۆشی قەت وێنەدەچوو ئەوی خۆش بوێ. بنەماڵەی کیتی ئەویان بە پێچەوانەی خەڵکی بە خاوەنی کار و پیشەیەك نەدەزانی کە بکرێ ناوی پیشەی لێ بنێی و خاوەنی هیچ پلە و پایەیەکیش نەبوو. لەو لاشەوە هاوشان و هاوتەمەنەکانی ئەو یان ئەفسەر بوون یان ئاجوودان و مامۆستای زانکۆ، یان لە مەزرینگەیەکی گەورەی وەك بانك یان هێڵاسن پلە و پایەیەکی بەرچاویان هەبوو، یان وەك ئابلۆنسکی سەرۆکی دایرەیەك بوون. بەڵام ئەو (کە خۆی دەیزانی خەڵك بە چ چاوێك لێی دەڕوانن) جگە لە جووتوگا و راوی مراوی و کۆلکە بەننایەکی لادێیانە هیچ هونەرێکی تری نەبوو، یانی لاوێکی دەستەوستان و خوێڕی بوو، کە قەت بە هیچ کوێ نەدەگەیشت و کارەکەشی لە روانگەی کۆمەڵگاوە، کارێکی سووك و بێ قابیلەت بوو.

کیتیی ژیکەڵە و بەدەویش قەت وێنەدەچوو پیاوێکی زەبەلاح و ناشیرینی (ئەو خۆی وا دەهاتە بەرچاو) وەك ئەوی خۆش بوێ و لەوەش خراپتر پیاوێك، کە هیچ تایبەتمەندییەکی باش و بەرچاوی نییە. جگە لەوەش پێوەندیی ئەو و کیتی، یانی پێوەندیی پیاوێکی گەورە و کچۆڵەیەکی وردیلە، کە

بە هۆی رفێقایەتیی برا گەورەکەیەوە بوو، لە روانگەی لەڤینەوە کۆسپێکی تر بوو لە سەر رێگای ئەو ئەشقە. پیاوێکی ناشیرین و مێهرەبانی وەك ئەو وێدەچوو ـ هەڵبەت خۆی پێی وا بوو ـ وەك دۆست و ئاشنا رێزی بۆ دانێن، بەڵام ئەگەر پیاوێك بیهەوێ وەك ئەو شەیدا و ئاشقی کیتی بێ، دەبێ جوان چاك و لەوەش گرینگتر پیاوێکی سەرامە و خاوەن کەسایەتی بێ.

بیستبووی ژنان زیاتر پیاوانی ناحەز و ساویلکەیان خۆش دەوێ، بەڵام بڕوای بەوە نەدەکرد. چونکە کارەکەی بە پێوانەی خۆی هەڵدەسەنگاند، کە تەنیا ژنانی جوان و بەدەو و جیاوازی خۆشدەویست.

بەڵام دوای ئەوەی دوو مانگ بە تەنیا لە گوند دانیشت، بەو ئاکامە گەیشت کە ئەشقی ئەو لەو جۆرە ئەشقەی تافی لاوی نییە کە وەك ئاوری بە پووشوو وا بێ. ئەم ئەشقە پڕ لە هەستەی ئەو خولەکێك هەدای پێنادا و هەتا ئەو کاتەی مەسەلەی خۆی و کیتی و ژیانی هاوبەشیان لایەکی بە لایەکدا نەکەوێ ئۆقرەناگرێ و لەوانەیە نەشتوانێ بژی. لە دڵی خۆیدا دەیگوت هیوابڕاوییەکەم تەنیا بە هۆی فکر و خەیاڵەوەیە و هیچ بەڵگە و هەگەرێك نییە، کە ببێتە هۆی ئەوەی رووی لە عەرز دەن. ئێستاش بەو بڕیارە پتەوەوە هاتبوو بۆ مۆسکۆ و سووربوو لە سەر ئەوەی کە بچێتە خوازبێنیی کیتی و ئەگەر وەڵامی ئەرێنی بدەنەوە زەماوەندی لەگەڵ بکات، یان... بەڵام «یان» لە گۆڕێدا نییە. ئەو نەیدەتوانی بیر لەوە بکاتەوە ئەگەر وەڵامی نەرێنی بدەنەوە چی دەکات.

## حەوت

لەڤین کاتێك بە شەمەندەفەری بەیانی گەیشتە مۆسکۆ چوو بۆ ماڵی کازنیشۆڤی زڕبرای و دوای ئەوەی جلوبەرگی گۆڕی رۆیی بۆ نووسینگەکەی هەتا هەرچی زووتر هۆی هاتنەکەی بۆ مۆسکۆ بە براکەی راگەیێنێ و بزانێ بیروڕای ئەو چییە. بەڵام براکەی بە تەنیا نەبوو، مامۆستایەکی بەناوبانگی فەلسەفە لە لای دانیشتبوو. ئەو مامۆستایە لە خارکۆڤەوە تەنیا بەو هۆیە هاتبوو بۆ لای تا ئەو مەسەلە فەلسەفییە گرینگەی بووبووە هۆی گرژییەك لە نێوانیاندا، بۆی روون بکاتەوە. ئەو مامۆستایە کەوتبووە کێشەیەکی[٢١] قووڵەوە و بە دژی ماتریالیستەکان هەڵوێستی گرتبوو، سرگی کازنیشۆڤیش بە هۆگرییەکی زۆرەوە پێوشوێنی کێشەکەی هەڵگرتبوو

---

٢١- ئاماژەیە بە کێشەیەك کە ئەو کاتە لە نێوان لایەنگرانی کاولین و سیچۆڤدا سەبارەت بە سەرچاوەی مادی و فیزیۆلۆژیکیی دیاردەکانی ڕۆح لە گۆڕێدا بوو.

و کاتێك دوایین وتاری مامۆستای خوێندبۆوە بیروڕای دژوازانەی خۆی بە نامەیەك بۆ ناردبوو و ڕەخنەی لێگرتبوو کە بۆ ئەوەندە سەبارەت بە ماتریالیستەکان گوێلینجە و کەمتەرخەمی دەنوێنێ. مشتومڕەکەشیان لە سەر مەسەلەیەك بوو کە لەو ڕۆژانەدا کەوتبووە سەر زاری هەمووان. مەسەلەکەش ئەوە بوو کە: ئایا لە ئاکاری مرۆڤدا لە نێوان هەڵچوونی ڕۆحی و دیاردەی فیزیۆلۆژیکدا سنوورێکی دیاریکراو هەیە؟ ئەگەر هەیە لە کوێدایە؟

سرگی ئیڤانۆڤیچ براکەی هەر بەو بزە سارد و مێهرەبانەوە کە کاتی بەرەوڕووبوون لەگەڵ هەموو کەس دەکەوتە سەر لێوی، دوای ئەوەی ئەوی بە مامۆستا ناساند گەڕاوە سەر باسوخواسەکە.

کابرای وردیلەی چاویلکە لە چاوی زەردەڵ و نێوچاوان تەسك، ساتێك بۆ سڵاو چاکوخۆشی لەگەڵ لەڤین بە ناچاری دەستی لە باسەکەی هەڵگرتبوو، بێئەوەی سەرنجێکی ئەوتۆی پێبدا ملی نایەوە لە قسەکردن. لەڤین چاوەڕوان دانیشت کە مامۆستا بڕوات، بەڵام زۆر زوو مەوزووعی باسەکە سەرنجی ڕاکێشا.

لەڤین ئەو وتارانەی لە بڵاڤۆکەکاندا خوێندبۆوە کە ئەوان خەریکی مشتومڕ بوون لە سەری و لە ڕوانگەی ئاڵوگۆڕی بنەمای زانستی سروشتییەوە گرینگیی پێدابوو، چونکە لە زانکۆ بەشی زانستی سروشتیی خوێندبوو و لەگەڵ ئەو چەمکە ئاشنابوو، بەڵام قەت لە نێوان ئەم بەڵگە زانستییانەی سەبارەت بە بنەمای ئاژەڵیی مرۆڤ و لە لایەکی تریشەوە ڕەنگدانەوەی ئاکار و ژینناسی و کۆمەڵناسی، هەروەها مانایەك کە بۆ مەسەلەی مەرگ و ژیان هەیبوو و خۆی زۆری بیر لێ دەکردەوە و لەم دواییانەدا زۆری پێوە سەرقاڵ بوو، لە لایەکی دیکەشەوە تا ئێستا ئەو چەمکانەی بۆ نەخرابوونەوە سەر یەك، بۆیە بە وردی گوێی بۆ دەمەتەقێی مامۆستا و براکەی ڕاگرتبوو و دەیدی کە ئەوان مەسەلە زانستییەکان لەگەڵ مەسەلە ئایینییەکان پێکەوە گرێ دەدەن و چەند جار هێندەی نەمابوو بەو مەسەلە ئایینییە بگەن کە بۆ ئەو لە هەمووی گرینگتر بوو، بەڵام هەر جارێك کە نزیك دەبوونەوە وەك ئەوەی بە قەستی خۆی لێ ببوێرن، باسەکەیان بە لایەکی دیکەدا دەکێشا. دیسان لە بواری پاژبەندیی وردبینانە و مەرج و گرفت و بەڵگە و نەڕێسات دەچوونەوە سەر وتەی خاوەن ڕایان، بە جۆرێك کە لەڤین زۆر بە زەحمەت تێدەگەیی باسەیەکان لە سەر چییە.

سرگی ئیڤانۆڤیچ بە ڕوونی و زمانێکی پاراو و شێوەڕاوێژێکی شکۆمەندانە، کە تایبەتی خۆی بوو گوتی: من ناتوانم قەبووڵی بکەم... بە هیچ شێوەیەك ناتوانم بیروڕای کەیس[٢٢] قەبووڵ بکەم، کە دەڵێ تێڕوانینی من لە عالەمی هەندەران هەمووی بە هۆی هەستی

22- Keiss

خۆمەوەیە، چونکە بنەڕەتیترین واتا، کە واتای بوونە لە ڕێگەی هەستەوە تێدەگەین. لەبەرئەوەی هەستێك بۆ ئەوەی واتایە بوونی نییە.

ـ بەڵێ، بەڵام وورست[23] و کناوست[24] و پریپاسۆڤ[25] وەڵامی ئێوە دەدەنەوە، کە ئاگاداریی ئێوە لەسەر بوون، بە هۆی ئەو کۆمەڵە هەستانەی ئێوەوەیە و ئاگاداری لە بوون ئاکامی هەستەکانە. تەنانەت وورست بە روونی دەڵێ، کە ئەگەر هەستەکان نەبوایەن واتای بوونیش نەدەبوو.

سرگی ئیڤانۆڤیچ گوتی: من بە پێچەوانە، لە سەر ئەو باوەڕەم کە...

بەڵام لێرەدا لەڤین کە دیتی دیسان لە مەبەستی سەرەکی نزیکبوونەتەوە و خەریکن دیسان خۆی لێ دەبوێرن، پەڕییە نێو قسەکانیانەوە و گوتی:

ـ کەوایە بەو شێوەیە ئەگەر هەستەکانی من لەنێوبچن، یانی ئەگەر لەشی من بمرێ، ئیتر هیچ بوونێك لە گۆڕێدا نامێنێ.

مامۆستا بە قەڵسی و ژانێکی رۆحییەوە، کە سەری باسەکەی لێ شێوابوو، چاوێکی لەو پرسیارکەرە نامۆیە کرد، کە قەڵافەتی زیاتر لە لۆتکەچییەکی زەبەلاح دەچوو نەك فەیلەسووف، پاشان سەری بۆ لای سرگی ئیڤانۆڤیچ وەرسووڕاندەوە، وەك بڵێی بەو روانینە لێی دەپرسێ: «دەی ئێستا من چ وەڵامێك بەو پرسیارە بدەمەوە؟» بەڵام سرگی ئیڤانۆڤیچ کە بە هیچ شێوەیەك وەك مامۆستا بۆ دەربڕینی قسەکانی پێویستی بە خۆهەڵگوشین نەبوو و وەك ئەو پێداگریی لە سەر یەك روانگە نەدەکرد و زەینی ئەوەندە بەرین بوو، کە بتوانێ هەم وەڵامی مامۆستا بداتەوە و هەم لەو روانگە سروشتی و ئاساییە بگات کە بۆتە هۆی ئەو پرسیارە، بۆیە گوتی: ئێمە هێشتا هەقمان نییە لەو مەسەلە بکۆڵینەوە.

مامۆستا بۆ سەلماندنی قسەکەی ئەو گوتی: وەڵامی پێویستمان بۆ ئەو کارە لەبەردەستدا نییە ـ ئەوەی گوت و خێرا کەوتەوە سەر بەڵگە هێنانەوە: نا، من لە سەر ئەو بڕوایەم ئەگەر پریپاسۆڤ بە ئاشکراش دەڵێ هەستەکانی ئێمە بە هۆی کارتێکەریی هۆش و بیرمانەوە بێ، پێویستە ئەو دوو واتایە بە وردی لێك هەڵاوێرین.

لەڤین ئیتر گوێی لە مشتومڕەکەیان نەگرت و تەنیا چاوەڕێبوو مامۆستا بڕوات.

---

23- Wurst
24- Knaust
25- Pripasov

# هەشت

کاتێك مامۆستا ڕۆیشت، سرگی ئیڤانۆڤیچ ڕووی لە براکەی کرد و گوتی: دەی، زۆرم پێخۆشە هاتی. هەتا کەنگێ لێرە دەمێنییەوە؟ کاروبارەکەت چۆن دەڕواتە پێشێ؟

لەڤین دەیزانی کە برا گەورەکەی هیچ هۆگرییەکی بە کاروباری وەرزێڕی نییە و تەنیا لەبەردڵی ئەوە کە ئەو پرسیارە دەکات و هەر لەبەرئەوەش تەنیا سەبارەت بە فرۆشی گەنم و باری ماڵی قسەی کرد.

لەڤین دەیویست سەبارەت بە قەستی ژنهێنانەکەی لەگەڵی بدوێ و بزانێ بیروڕای کاکی چییە، دەنا بە تەواوی بڕیاری خۆی دابوو. بەڵام کە چاوی پێی کەوت و مشتومڕەکەی لەگەڵ مامۆستا بیست، پاش ئەوەش بەو لەبزە سارد و ئەربابانەیەی کە پرسیاری مووچە و مەزراکەی لێ کردبوو (لە لایەکی تریشەوە میراتی دایکیان بەش نەکرابوو و لەڤین بەشەکەی خۆی و ئەوی دادەچاند.) هەستی کرد کە ناتوانێ سەبارەت بە بڕیارەکەی واتە ژنهێنان قسەی لەگەڵ بکات. پێی وا بوو براکەی ئەو جۆرەی کە ئەو دەیهەوێ لەمەڕ ئەو کارەوە هاوفکریی لەگەڵ ناکات.

سرگی ئیڤانۆڤیچ زۆر هۆگری کاروباری زێمستڤا بوو و گرینگییەکی زۆری پێدەدا، بۆیە پرسیی: دەی کاروباری زێمستڤاکەتان چۆنە؟

ـ ڕاستت دەوێ نازانم...

ـ چۆن نازانی. مەگین تۆ ئەندامی بەڕێوەبەرایەتیی ئەو شۆڕایە نیت؟

کۆنستانیتن لەڤین وەڵامی دایەوە: نا، ئیتر ئەندام نیم، دەستم کێشاوەتەوە و ئیتر ناچمە کۆڕ و کۆبوونەوەکانیان.

سرگی ئیڤانۆڤیچ ناوچاوانی تێکنا و گوتی: حەیف!

لەڤین بە مەبەستی ڕوونکردنەوە بە وردی باسی کاروباری کۆڕەکانی شۆڕای زێمستڤای کرد.

سرگی ئیڤانۆڤیچ قسەکەی پێبڕی: دەی هەمیشە هەر وایە. ئێمەی ڕووسی هەمووومان هەر واین. ڕەنگە ئەو تواناییەی کە دەتوانین کەموکوڕییەکانمان ببینین نیشانەی گەورەیی و

هەڤیازی بێ، بەڵام ئێمە دۆ و دۆشاو تێکەڵ دەکەین و دڵی خۆمان بەو توانج و چزەبزەی هەمیشەیی خۆش دەکەین. من تەنیا شتێکت پێ دەڵێم: ئەگەر ئەم سەربەشایەتییەی ئێمە، یانی دامەزراوەی شۆڕای لادێکانی ئێمەیان بە گەلێکی ئەورووپایی، بۆ وێنە ئاڵمانییەکان یان ئینگلیزییەکان بدایە، حەتمەن لەوەوە ڕێگایەکیان بۆ گەیشتن بە ئازادی دەدۆزییەوە. بەڵام ئێمە تەنیا بیر لە تیر و توانج و یەکتر شکاندن و چزەبزە دەکەینەوە.

لەڤین بە لەبزێکی وا کە دەیویست پاکانە بۆ کەمتەرخەمیی خۆی بکات گوتی: بەڵام چیم پێ دەکرێ؟ بە تەواوی توانامەوە هەوڵی خۆم دا و بە گیان و دڵ تێکەوتم، بەڵام ناتوانم، لەوەش زیاتر لە توانامدا نییە.

سرگی ئیڤانۆڤیچ گوتی: نا، قسە لە توانایی نییە. تۆ ئەو جۆرەی کە پێویستە چاو لە مەسەلەکە ناکەی.

لەڤین بە لەبزێکی خەمبارانەوە گوتی: ڕەنگە واش بێ.

ـ زانیوتە نیکۆلای برامان دیسان هاتۆتەوە؟

نیکۆلای برا گەورەی دایك و بابیی کۆنستانتین لەڤین و زڕبرای سرگی ئیڤانۆڤیچ بوو. پیاوێکی داماو بوو کە تەواوی ماڵوحاڵی خۆی بە با دابوو و لەگەڵ خەڵکانێکی زۆر نابار و خراپ هەڵسوکەوتی دەکرد و لەگەڵ براکانی دانووی نەدەکولا.

لەڤین بە ترسێکی ئاوێتەی سەرسووڕمانەوە گوتی: شتی وا نەڵێی! تۆ چووزانی هاتۆتەوە؟

ـ پڕۆکفی[26] لە کۆڵان چاوی پێی کەوتبوو.

لەڤین هەستا سەر پێ، وەك ئەوەی بیهەوێ خێرا بڕواتە دەرێ، پرسیی: لێرە؟ مۆسکۆ؟ لە کوێیە؟ شوێنەکەی دەزانی؟

سرگی ئیڤانۆڤیچ کە دیتی براکەی ئاوا پەشۆکاوە، سەرێکی ڕاوەشاند و گوتی: بە داخەوەم کە ئەوەم پێگوتی. کەسێکم ناردووە کە شوێنی نیشتەجێبوونەکەی پەیدابکات و پارەی ئەو سفتەیەشم دایەوە، کە دابووی بە تروبین[27]. ئەوەش جوابی چاکەکەمە دایەوە.

سرگی ئیڤانۆڤیچ کاغەزێکی لە نێو چەکمەجەی مێزەکەی دەرهێنا و دایە دەستی. لەڤین ئەو یادداشتەی خوێندەوە، کە بە خەتی سەیروسەمەرەی براکەی نووسرابوو: «خاکەڕایانە

---

26- Prokfy
27- Trubin

تکات لێ دەکەم دەستم لە کۆڵ کەنەوە. ئەوە تەنیا شتێکە کە لەو برا خۆشەویستانەمم دەوێ. نیکۆلای لەڤین.»

لەڤین پسوولەکەی خوێندەوە و هەروا کاغەز بە دەستەوە سەری داخست و لە بەردەمی سرگی ئیڤانۆڤیچ چەقی.

ویستی ئەوەی کە برا چارەڕەشەکەی جارێ فەرامۆش بکات و هاوکات ئاگادار لەوەش، کە ئەو کارە باش نییە. دوو وزە بوون کە پێکەوە لە ناخیدا ململانێیان دەکرد.

سرگی ئیڤانۆڤیچ لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: دیارە دەیهەوێ من بڕەنجێنێ، بەڵام ناتوانێ، منیش پڕ بە دڵ دەمهەوێ یارمەتیی بدەم و لەگەڵ ئەوەشدا دەزانم بە هیچ جۆرێ نالوێ.

لەڤین گوتی: بەڵێ دەزانم، لە هەستی بەرپرسایەتیی تۆ ئاگادارم و لە لام بەڕێزە، بەڵام دەبێ بچم بۆ لای.

سرگی ئیڤانۆڤیچ گوتی: ئەگەر پێت خۆشە بچۆ بۆ لای، ئەگەرچی من داوات لێناکام بچی. هەڵبەت لە لایەن خۆمەوە هیچ ترسێکم نییە. ئەو ناتوانێ نێوانی من و تۆ تێکبدات. بەڵام بە بڕوای من باش وایە نەچی. چونکە هیچ یارمەتییەکت لە دەست نایە. بەڵام مەیلی خۆتە دەچی یان ناچی.

ـ رەنگە بتوانم یارمەتییەکی بدەم. بەڵام وا هەست دەکەم، ئەویش ئێستا... ئەگەرچی ئەوە شتێکی ترە، وا هەست دەکەم کە ناتوانم، ئاراوقارام لێ براوە.

سرگی ئیڤانۆڤیچ گوتی: دەزانم، ئەوە تێدەگەم ـ پاشان گوتیشی: تەنیا شتێك دەزانم، ئەویش دەرسی خاکەڕاییە کە فێری بووم. لەو کاتەوە نیکۆلای برامان تووشی ئەو رۆژەڕەشە بووە، من بە چاوێکی تر دەڕوانمە خوێڕیگەری و هەرچی ناوی خوێڕییەتییە. یانی بە چاوپۆشییەکی زیاترەوە لێی دەڕوانم. دەزانی چیی کردووە؟

لەڤین گوتی: پەککوو، هەر باسی مەکە، زۆر شتێکی ناخۆشە.

ناونیشانی براکەی لە خزمەتکاری سرگی ئیڤانۆڤیچ وەرگرت و دەیویست دەستبەجێ بڕوا بۆ لای، بەڵام بیری کردەوە و وای بە باش زانی چاوپێکەوتنی براکەی هەڵگرێ بۆ ئێوارە. بەر لە هەموو شتێك، بۆ ئەوەی دڵی ئۆقرە بگرێ، دەبوو پێ و شوێنی ئەو کارە بگرێ، کە بەرەو مۆسکۆ بکێشی کردبوو. لە ماڵی براکەیەوە رۆیی بۆ دایرەی ئابلۆنسکی. کاتێك ئاگاداری بارودۆخی بنەماڵەی ئیشچر باتسکی بوو، بەرەو شوێنێك ملی پێوەنا، کە گوتبوویان لەوێ دەتوانێ چاوی بە کیتی بکەوێ.

# نۆ

سەعات چوار، لەڤین بە دڵەکوتە و گیانێکی بێ ئۆقرەوە لەبەر دەرگای باخچەی ئاژەڵان لە فایتوونەکە دابەزی و بە باریکەڕێیەکدا بەرەو لای ئەو گردانە وەڕێکەوت، کە شوێنی خلیسکێن (پاتیناژ) بوو. دڵنیا بوو کە کیتی لەوێیە و چاوی پێی دەکەوێ. چونکە لەبەر دەرگای باخچەی ئاژەڵان چاوی بە فایتوونەکەی ماڵی ئیشچر باتسکی کەوتبوو.

هەوا سارد و تاووساو بوو. لەبەر دەرگای باخچەی ئاژەڵان فایتوون و عارەبانە و کاشە و ئاژان بە ریز راوەستابوون. خەڵك بە جلوبەرگی خاوێن و رازاوەوە کە کڵاوەکانیان لەبەرتاو بریقەی دەهات، لەبەرباخچەی ئاژەڵان و باریکەڕێی نێوان کۆخە دارینەکان، کە هەرکام پەیکەرەیەکی لە دار تاشراویان بە سەرەوە بوو دەهاتن و دەچوون، بەفری باریکە رێگاکان ماڵدرابوو و کاتی تێپەڕین پێیاندا زۆر جار تێکهەڵدەنگوتن. دار تووزە پیرەکان کە تاجی بەفریان لە سەر نابوو و هێندێ لە لق و پۆپەکەیان لە ژێر باری بەفردا داهاتبوو، دەتگوت عابای شکۆمەندی جێژنیان لەبەرکردووە و خۆیان رازاندۆتەوە.

لەڤین ملی رچەیەکی گرت و بەرەو گۆڕەپانی یارییەکە رۆیشت لە پەستا لە دڵی خۆیدا دەیگوت: «نابێ گوێ بە دڵەخورپە و پەشۆکان بدەی، لەسەرەخۆ بە! مەگین چی بووە؟» بە دڵی خۆی دەگوت: «داکەوە گەوجە، بۆ وا کەوتوویە فرکەفرك.» بەڵام هەرچەندە دەیویست و هەوڵی دەدا لە سەرەخۆ بێ، دڵی زیاتر کوتەی دەهات و هەناسەی سوار دەبوو. ئاشنایەك چاوی پێی کەوت و بانگی کرد، بەڵام لەڤین نەیناسییەوە. لە گردەکان نزیکبۆوە و زرەی زنجیری کاشەکان دەهاتەگوێی، کە هەڵدەکشان و دادەکشان. خشەی خلیسکانی کاشە و هەرا و زەنازەنای پڕ لە شادی سوارەکانیان وڵاتی داگرتبوو. چەند هەنگاو چووە پێشترەوە و گۆڕەپانی خلیسکێنەکە لە بەردەمیدا بوو، هەر لە یەکەم روانیندا چاوی بە کیتی کەوت لە کۆڕی خەڵکەکەدا لای پیستەکە راوەستابوو.

لەڤین بە دیتنی کیتی هێندە تووشی شادی و پەشۆکاوی بووبوو چاوی یەکی بە دوو دەدی. بۆیە پێی وا بوو لە نێو کۆڕی خەڵك و یاریزانەکاندایە، دەنا ئەو لەولای گۆڕەپانەکەوە لەگەڵ

ژنێك راوەستابوو قسەی دەکرد. وێدەچوو نە جلوبەرگەکەی شتێکی تایبەتی بێ، نە شێوەی راوەستانەکەی. بەڵام لەڤین زۆر بە سانایی ناسییەوە و دەتگوت گوڵێکی سووری لە نێو پۆلێك گەزگەزکدا دیوەتەوە. هەموو شتێك بە بۆنەی ئەوەوە رووناك بوو. گوڵ بزەیەك بوو، کە هەرچی لە دەوری بوو رووناکی دەکرد. لەڤین بە خۆی گوت: «یانی بلێی بتوانم بچمە سەر پیستەکە و لێی نزیك ببمەوە؟" پێی وا بوو ئەو جێگایەی ئەوی لێیە حەرەمێکە هیچ کەس ناتوانێ لێی نزیك بێتەوە. خولەکێك تێپەڕی و ئەو هێندە دەترسا، کە خەریکبوو بگەڕێتەوە. ناچاربوو هەوڵ بدا و لە دڵی خۆیدا گوتی: «هەموو جۆرە مرۆڤێك لە دەوروبەری دێن و دەچن، کە وایە منیش دەتوانم بۆ خلیسکێن بچمە سەر پیستەکە.» رۆیشتەخوارێ، بەڵام لە چاولێکردنی بەردەوام خۆی بوارد، هەروەك ئەوەی بیهەوێ چاو لە خۆر بکات، زوو سەری دادەخستەوە. بەڵام کە چاویشی لێ نەدەکرد ئەوی هەروەك خۆر دەهاتە بەرچاو.

لەو رۆژەدا و لەو سەعاتە تایبەتەدا هەموو چەشنە مرۆڤێك لە چین و توێژی کۆمەڵگا کە هەموویان یەکتریان دەناسی لە سەر پیستەکە و دەوروبەری کۆدەبوونەوە. راهێنەرانی پاتیناژیش لەوێ بوون، کە بە شارەزاییەوە خلیسکێنیان دەکرد و خۆیان دەنواند، تازەفێربووانیش بە کورسیلەی پاڵ و پشتدارەوە بە شێوەیەکی شەرمنانە و خەشیمانە بە سەر بەفر و سەهۆڵەکەدا دەخزین. منداڵ و بەساڵاچووش بۆ پاراستنی تەندروستی خۆیان هاتبوون بۆ خلیسکێن. هەمووشیان لە بەرچاوی لەڤین بەختەوەر و خواپێداو بوون، چونکە بە دەوری کچی دڵخوازی ئەودا دەسووڕانەوە. وا دیاربوو هەموو یاریزانەکان بە پشوودرێژییەوە پێی دەگەیشتنەوە یان وەپێشی دەکەوتن، بەڵام ئاگایان لەو بەختەوەرییەی خۆیان نییە، تەنانەت قسەشیان لەگەڵ دەکرد. بە ئازادی جەفەنگیان لەگەڵ لێدەدا و چێژیان لە دیتنی کیتی و هەوای پاك و تەکووزبوونی سەهۆڵەکە وەردەگرت.

نیکۆلای ئیشچر باتسکی، ئامۆزای کیتی کە چاکەتێکی قوڵەی لەبەردابوو و پانتۆڵێکی تەنگی لە پێدا، بە کەوشی خلیسکێنەوە لە سەر کورسییەك دانیشتبوو، هەر لەگەڵ چاوی بە لەڤین کەوت هەرای کرد:

ـ ئەها، ئەوەش یەکەم سەهۆڵبازی رووسییە! لە کەنگێوە هاتووی؟ زۆر پیستی چاکە، جووتێ کەوشی خلیسکێن لە پێ بکە و وەرە مەیدان!

لەڤین زۆری پێ سەیر بوو کە ئاوا خۆمانە و رووهەڵماڵدراوانە لە بەرچاوی کیتی ئاوا قسەی لەگەڵ دەکات. ئەگەرچی تەماشای کیتیی نەدەکرد، بەڵام بۆ چرکەیەکیش لێی خافڵ نەبوو: خۆ کەوشی خلیسکێنیشم نەهێناوە.

هەستی دەکرد هەتاو خەریکە لێی نزیك دەبێتەوە. کیتی لە سووچێکی پیستەکە بوو، پەلوپووزە ناسکەکانی بە پۆستاڵێکی ملدرێژ داپۆشیبوو و زۆر بە نەرمی و خاترجەمی هەنگاوی هەڵدێنایەوە و لاقی بڵاو دادەنا و دیاربوو زۆر بە وریاییەوە بەرەو لای ئەو دێ. کوڕێکی مێرمنداڵ کە جلوبەرگی رووسیی لەبەردابوو و زۆر بە توندی دەستی رادەوەشاند، بە تەواوی خۆی کۆم کردبۆوە و دەیویست وەپێشی کەوێ. کیتی لە ترسی ئەوەی نەکەوێ دەستی لە دەستەوانە نەرموناسکەکانی دەرهێنابوو، کە بە پەتێکی باریك بەملا و ئەولای کەلەکەیەوە شۆڕبووبوونەوە و دەستی وەك باڵ فش کردبۆوە و لەنگەری خۆی پێ ڕاگرتبوو. لە خۆشیی ئەوەی لەڤینی ناسیبۆوە و هەروەها ترسی کەوتنی خۆی بزەی دەهاتێ. کاتێك دەورێکی پیستەکەی لێدا، قەوەتێکی لە لاقی خۆی دا و بە بازێکی نەرم راست وەرسووڕا بۆ لای نیکۆلای ئیشچر باتسکی و کاتێك دەستی پێوە گرت و ترسی کەوتنی نەما سەرێکی بۆ لەڤین لەقاند. زۆر لەوە جوانتر بوو کە لەڤین بیری لێ دەکردەوە. کاتێك لەڤین لە خەیاڵی ئەودا بوو، دەیتوانی سەرتاپای ئەو کیژە شەنگ و شۆخە بێنێتە بەرچاوی خۆی، بەتایبەت سەروپرچە زێڕینەکەی کە دڵڕفێنانە و بە ئازادی بە سەر شان و ملە کچانەکەیدا شۆڕبووبۆوە و هەروەها روخسارە پاك و بێگەرد و منداڵانەکەی کە فریشتەئاسایی بوو و ساتێك لەبەر زەینی لانەدەچوون. دڵڕفێنیی تایبەتی ئەو هەر لەو حاڵەتە منداڵانەی روخساری و جوانی و ناسك و لەباربوونی بەژنوباڵایدا بوو کە لەڤین زۆر چاکی تێگەیشتبوو. بەڵام چاوە نەرم و گەش و بێدرۆکەی و بەتایبەت بزە شیرینەکەی بوو، کە لە بەرچاوی لەڤین هەر جارەی بە شکۆ و جوانییەکی چاوەڕواننەکراوەوە خۆی دەنواند و ئەوی بەرەو جیهانێکی جادوویی دەبرد، کە لەوێدا وەك رۆژانی منداڵی خۆی دەدیتەوە و وەبیریشی دەهاتەوە کە ئەو دەمە چەندە دڵنەرم و مێهرەبان بوو.

کیتی دەستی بە نەرمی گوشی و گوتی: لەمێژە هاتووی؟

چونکە لەڤین دانەوی و ئەو دەسرەیەی کە لە بەینی دەستەوانەکانییەوە کەوتبووە خوارێ، هەڵیگرتەوە دایەوە دەستی، گوتی: زۆر سپاس.

لەڤین کە لەبەر پەشۆکاوی مانای پرسیارەکەی ئەوی وەرنەگرتبوو، وەڵامی دایەوە: من؟... نا، لەمێژ نییە...، دوێشەو... یانی ئەمڕۆ بەیانی هاتم. دەمویست بێم بۆ دیدەنیی ئێوەش... ـ بەڵام کە وەبیری هاتەوە بە چ قەستێك دەیویست بچێت بۆ لای، ئەوەندەی تر پەشۆکا و رەنگی تێکچوو، گوتیشی: من نەمدەزانی تۆش خلیسکێن دەکەی. ئەویش ئاوا چاك...

کیتی بە وردی سەرنجی روخساری لەڤینی دا و وێدەچوو بزانێ هۆی چی بوو ئاوا لە پڕ سوورهەڵگەڕا.

به دەستی ناسك و دەستەوانەی رەشتیدا، ئەو لەتكە سەهۆڵەی كەوتبووە سەر تیسكی باڵتەكەی لەڤین، بە نەرمی تەكاندی و گوتی: ئێوە لێرە رێزێكی زۆرتان هەیە. قەدیمییەكان دەڵێن هیچ كەس وەك ئێوە لە یاریی پاتیناژدا شارەزا نییە.

ـ بەڵێ، سەردەمێك زۆر هۆگری ئەو یارییە بووم و دەمویست قەت دەستی لێ هەڵنەگرم و بە پلەی باڵا بگەم.

كیتی بە پێكەنینەوە گوتی: ئێوە وا دیارە هەموو كارێكتان زۆر بە تامەزرۆییەوە ئەنجامدەدەن. زۆرم پێ خۆشە چاوم بە خلیسكێنی ئێوە بكەوێ. كەوشی خلیسكێن لە پێ كە و وەرە پێكەوە دەورێك لێدەین.

لەڤین لەگەڵ ئەوەی چاوی تێبڕیبوو و لە دڵی خۆیدا گوتی: «پێكەوە دەورێك لێدەین؟ یانی شتی وا دەبێ؟ خەون نییە؟»

گوتی: هەر ئێستا دەچم لە پێی دەكەم.

ڕۆیشت بۆ لە پێ كردنی كەوشی خلیسكێن.

یەكێك لەو كەسانەی لەوێ كاری دەكرد لەگەڵ ئەوەی لاقی لەڤینی بەرزكردبۆوە و خەریكی گرێدانی بەند و ئاغزوونەی كەوشەكانی بوو گوتی: لەمێژە تەشریفتان نەهێناوە، گەورەم. لەو كاتەوە ئێوە رۆیشتوون هیچ پیاوێك نەبووە وەك ئێوە شارەزا بێ و خلیسكێنی چاك بكات ـ قەیتانی كەوشەكەی توندكرد و پرسیی: ئاوا باشە گەورەم؟

لەڤین بزەیەكی پڕ لە شادی كە بێ ئیختیار نیشتبووە سەر لێوی، لەگەڵ ئەوەی بە زۆری دەیویست بیشارێتەوە گوتی: بەڵێ، بەڵێ زۆر چاكە، تكات لێدەكەم زووتر ـ لە دڵی خۆشیدا دەیگوت «بەه، بەوە دەڵێن ژیان، بەوە دەڵێن بەختەوەری. گوتی وەرە پێكەوە دەورێك لێدەین. یانی هەرئێستا پێی بڵێم؟ ئاخر لەبەرئەوەی كە بەختەوەرم دەترسم پێی بڵێم، ئەگەرچی بەختەوەرییەكەشم بە هۆی هیواداریەوەیە. ئەی ئەگەر.. بەڵام دەبێ پێی بڵێم... حەتمەن دەبێ پێی بڵێم... شەرموشكۆ وەلا نێ...»

هەستا و باڵتەكەی داكەند. لە سەر سەهۆڵی زبری نزیك وەتاغەكە دەورێكی لێدا و وەك بای شەماڵ خوشی، بێئەوە لە خۆی بنەوێ دەتگوت تەنیا لەبەر تكای دڵ، خوشینەكەی توند و سووكدەكاتەوە و بە هەموو لایەكدا دەسووڕێ، شەرمنانە لە كیتی نزیكبۆوە و بزە شیرینەكەی دڵنیای كرد.

كیتی دەستی خۆی دا دەستی و شان بە شانی یەك خوشین. هەتا بەپڕتاوتر دەخوشین، كیتی زیاتر دەستی دەگوشی.

گوتی: ئەگەر لەگەڵ ئێوە بم زۆر زوو فێردەبم. هەست دەکەم زۆرم باوەڕ بە ئێوەیە.

لەڤین گوتی: منیش کاتێك شان بە شانی تۆم زیاترم باوەڕ بە خۆمە ـ بەڵام هەرکە ئەو قسەی کرد، ترس و پەشۆکاوی دایگرت و سوورهەڵگەڕا. هەر بەڕاستیش بەو قسەیە، شیرینی و مێهرەبانی لە روخساری کیتی فڕی. وەك ئەوەی هەورێك بەری خۆر بتەنێ، لەڤین کە چاوی بە روخساری کەوت و لەگەڵ حاڵەتی ئەو ئاشنابوو، تێگەیشت کە زۆر ئاڵۆز و پەشۆکاوە و نێوچاوانی گنجی تێکەوتووە.

لەڤین بە توندی پرسیی: شتێك نارەحەتی کردووی؟ ئەگەرچی من هەقم نییە ئەو پرسیارەتان لێ بکەم.

کیتی بە ساردوسڕی وەڵامیداوە: نا، بۆ؟ بۆ نارەحەت بم؟ ـ هەر بە دوای ئەوەدا گوتیشی: مادموازێل لینۆن[28]ت نەدیوە؟

ـ نا، هێشتا نەمدیوە.

ـ بڕۆ بۆ لای زۆری تۆ خۆشدەوێ.

لەڤین لە دڵی خۆیدا گوتی: «یانی چی؟ بۆ وا عاجزم کرد، خودایە خۆت یارمەتیم بدە!» پاشان بە پەلە رۆیی بۆ لای پیرێژنێکی قژ لوولی ماشوبرنجی، کە لە سەر کورسییەك دانیشتبوو. ئەو پیرێژنە فەرەنسی بوو. ژنە هەروەك دۆستێکی لەمێژینە رووخۆش و دەمبەپێکەنین هات بەرەو پیری و ددانە عەمەلییەکەی وەدەرکەوت.

بە چاوی ئاماژەی بە کیتی کرد و گوتی: بەڵێ. دیتووتە گەورەدەبین و پیردەبین و.. بە پێکەنینەوە گوتیشی: Tiny Bear[29] ئیتر گەورە بووە ـ ئەوەش ئاماژەیەك بوو بە گاڵتەیەکی لەڤین، کە بە پێی چیرۆکێکی ئینگلیزی بەو سێ خوشکەی دەگوت سێ بەچکە ورچ. مادموازێل لینۆن دیسان بە شیلەبزەیەکەوە گوتی: لەبیرتە، ئەو کاتە ناوت نابوو ورچە چکوول؟

لەڤین بەڕاستی وەبیری نەدەهاتەوە، کە گاڵتەیەکی ئاوای کردبێ، بەڵام مادموازێل لینۆن دە دوازدە ساڵ بوو، هەرکاتێك ئەو گاڵتەیەی وەبیردەهاتەوە قاقا پێدەکەنی و ئەو قسەیەی زۆر پێ خۆش بوو.

---

28- Linon

٢٩ - ورچە چکۆل

ـ چاکە، بڕۆن، بڕۆن بە لای خلیسکێنەکەتانەوە. بەڵام کیتیی ئێمە وا دیارە خلیسکێنی چاك دەکات، وا نییە؟

کاتێك لەڤین گەڕایەوە بۆ لای کیتی، ئیتر ئەو وشکی و ساردوسڕییەی پێشوو بە ئەدگارییەوە دیارنەبوو، خۆشەویستی و میهرەبانی لە چاوانیدا شەپۆلی دەدا. بەڵام لەڤین پێی وا بوو ئەو میهرەبانی و نەرمییەی کیتی شتێکی رواڵەتییە و ئەوەش لە ناخەوە دڵی دەگوشی. کیتی دوای ئەوەی هێندێك باسی فێرکارە پیرەکەی و رەوشتە سەیروسەمەرەکەی کرد، لەمەڕ حاڵ و ژیانی خۆیەوە پرسیاری لێکرد.

ـ هەر بە راست، زستانانە لە دێ چۆن تاقەت دێنن؟

لەڤین وەڵامی دایەوە: نا، قەت بێتاقەت نابم. چونکە زۆر بە کارەوە سەرقاڵم ـ هەستی کرد کیتی بەو نەرمی نواندنە دەیهەوێ شکستی بدا، ئەویش ئەو توانایییەی نەبوو خۆی دەربازبکات، هەروەك سەرەتای زستان نەیتوانیبوو.

کیتی پرسیی: ئەمجارە زۆر لێرە دەمێنییەوە؟

لەڤین بێ ئەوەی بیر لەو وەڵامە بکاتەوە، کە دەیداتەوە گوتی: نازانم ـ بیری ئەوەی ئەگەر تەسلیمی ئەو نەرمی نواندنەی کیتی بێ، ئەمجارەش ناچارە بەبێ بڕیاردان بگەڕێتەوە بۆ گوندەکەیان، بۆیە شووی لێ هەڵکێشا.

ـ چۆن نازانی؟

ـ نازانم. بە دەست ئێوەیە ـ ئەوەی گوت و خێراش لە قسەکەی خۆی پەژیوان بۆوە و ترسی لێ نیشت.

کیتی قسەکەی ئەوی بیست یان گوێی خۆی لێ خەواند، بەڵام خێرا گومبەتەی لە خۆی دا و دوو جار لاقی بە سەهۆڵدا کوتا و بەپڕتاو لێی دوورکەوتەوە. چوو بۆ لای مادموازێل لینۆن و شتێکی پێ گوت و پاشان بەرەو ئەو وەتاغە رۆیشت، کە ئافرەتان کەوشی خلیسکێنیان لێ وەردەگرت.

لەڤین لە دڵی خۆیدا گوتی: «خودایە گیان چیم کرد! خودای گەورە، یارمەتیم دە! یارمەتیم دە و فێرم کە چی بکەم!» دۆعای دەکرد و لەگەڵ ئەوەشدا بە پێویستی زانی، کە جینگڵ لە خۆی بدا و هێندێ بەپڕتاو دەور لێدا. بۆیە زۆر بە توندی خۆی دایە دەست سووڕان و خوشێنیکی شێتانە و جەغزی نێویەك و بەدەر لە یەکی رەسم کرد.

لەو کاتەدا لاوێك کە یەکێك لە باشترین یاریزانانی سەرسەهۆڵ بوو جگەرە بە دەمەوە و کەوشی خلیسکێن لە پێ لە قاوەخانەکە هاتەدەرێ و بەپڕتاو بە پلیکانەکاندا خزییە خوارێ و کەوشەکانی سیڕەیان دەهات. زۆر بە توندی داگەڕا و بێئەوەی تەنانەت دەست و باڵی بکاتە لەنگەری خۆی و باریان لێ بگۆڕێ، لە سەر پیستەکە دەستی کرد بە سووڕان.

لەڤین گوتی: ئا، ئەوەش شتێکی تازە ـ خێرا هەڵگەڕا تاکوو ئەویش ئەو کارە بکات.

نیکۆلای ئیشچر باتسکی هەرای کرد: وریا بە، خۆت سەقەت دەکەی، دەبێ لێی بزانی.

لەڤین بە پلیکانەکاندا وەسەر کەوت و هەتا ئەو جێیەی توانیی بازیدا و لەگەڵ ئەوەی بە جووڵان و فشکردنەوەی دەستی لەنگەری خۆی راگرتبوو، داخزی. کە گەیشتە دوایین پلیکان لاقی گیری کرد، بەڵام لە چاو ترووکانێکدا دەستی لە سەهۆڵەکان درا و بە جووڵەیەك خۆی راست کردەوە و بە پێکەنینەوە درێژەی بە خلیسکێنەکەی دا.

کیتی کە لەو کاتەدا لەگەڵ مادموازێل لینۆن لە وەتاغەکە دەهاتەدەرێ، بە بزەی ئاوێتەی خۆشەویستی، وەك ئەوەی چاو لە برایەکی مێهرەبان بکات. لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئاخ، چ کوڕێکی باش و خوێنشیرینە! یانی من خەتابارم؟ یانی کارێکی خراپم کرد؟ بەو کارە دەڵێن دڵڕفێنی و گێرەشێوێنی. دەزانم زۆرم خۆش ناوێ، بەڵام کاتێك لەگەڵ ئەوم دڵخۆشم. چەندە کوڕی چاکە! بەڵام ئاخەر بۆ ئەو قسەی کرد؟...»

لەڤین دیتی کیتی لە سەر پلیکانەکان تووشی دایکی بوو و پێکەوە دووردەکەوتنەوە. بە روخسارێکی گرژ و سوورهەڵگەڕاوەوە راوەستا و کەوتە گۆمی بیر و خەیاڵەوە. کەوشی خلیسکێنی لە پێ داکەند و لە دەرەوەی باخەکە پێیان گەیشتەوە.

پرینسس پێی گوت: بە دیتنت چاوم روون بۆوە. بە پێی دابی هەمیشەیی پێنجشەممە میوانداریمان هەیە.

ـ یانی هەر ئەمڕۆ؟

پرینسس بە ساردوسڕی گوتی: وەرە، زۆرمان پێ خۆش دەبێ.

خوڵکە ساردوسڕەکەی پرێنسس لە دڵی کیتی گران هات و نەیتوانی گوێی خۆی لەو خوڵکە ساردەی دایکی بخەوێنێ و قەرەبووی نەکاتەوە. سەری بۆ لای لەڤین وەرسووڕاند و بە بزەیەکەوە گوتی: بە هیوای دیدار.

لەو کاتەدا ستیپان ئارکادیچ کە کڵاوەکەی لار دانابوو و بە روخسارێکی شاد و کراوەوە کە دەتگوت شێری بە گوێ گرتووە گەیشتە بەردەرگای باخەکە. بەڵام کە گەیشتە لای ئەوان و خەسووی سەبارەت بە دالی پرسیاری لێکرد، بە رەنگوڕوویێکی خەمبار و تاوانبارەوە وەڵامی دایەوە. دوای ئەوەی تۆزێك بە پەشۆکاوی و دڵتەنگییەوە لەگەڵ خەسووی دوا، سینگی دەرپەڕاند و قۆڵی لەڤینی گرت.

پرسیی: دەی ئێستا بڕۆین؟ ـ بە چاوێکی ماناداروە لە چاوی لەڤینی روانی و گوتی: من هەر لە بیری تۆدا بووم، زۆرم پێخۆشە هاتووی.

لەڤین کە بەردەوام دەنگی «بە هیوای دیدار» لە گوێیدا دەزرینگایەوە و ئەو شیلەبزەیەی لە گەڵیدا شنایەوە لە بەرچاوی لانەدەچوو، زۆر دڵخۆش و شیرینکام بوو وەڵامی دایەوە: بڕۆین، با بڕۆین!

ـ بۆ ڕێستۆرانتی ئینگلیزی یان ئارمیتاژ؟

ـ من فەرقی پێناکەم، هەرکامیانت پێ باشە.

ستیپان ئارکادیچ گوتی: چاکە، کەوایە دەچین بۆ ڕێستۆرانتی ئینگلیزی! ـ ئەو هەڵبژاردنەشی لەبەرئەوە بوو کە قەرزی ئەم ڕێستۆرانتەی زیاتر لە سەر بوو تا ئارمیتاژ و بە باشی نەدەزانی کە لە چوونی بۆ ئەوێ خۆی ببوێرێ. پرسیی: عارەبانەت پێیە، ها؟ زۆر چاکە، چونکە من فایتوونەکەم نارد بە دوای کاری خۆیدا.

لە ڕێگا بێدەنگ بوون. لەڤین ئاڵۆز و پەشۆکاو نەیدەزانی ئەو تێکچوونەی کیتی مانای چی بوو؟ هێندێ جار بە خۆی دەسەلماند کە جێی هیوادارییە و هێندێ جاریش هیوابڕاو دەبوو، سوورسووریش دەیزانی کە هیوادارییەکەی بە هۆی شێتییەوەیە و هەر لەو کاتەشدا هەستی دەکرد لە چاو ئەو دەمەی کە هێشتا ئەم «بە هیوای دیدار»ەی لێ نەبیستبوو، زۆری فەرق کردووە و مرۆڤێکی ترە.

ستیپان ئارکادیچ بە ڕێگاوە هەر لە بیری بەرنامەی نان خواردنەکەدا بوو. کە لە عارەبانەکە دادەبەزی، پرسیی: تۆ «تووربۆ»[٣٠]ت پێخۆشە، نا؟

لەڤین پرسی: چیت گوت؟ تووربۆ؟ بەڵێ تووربۆ شتی چاکە.

## دە

کاتێك لەڤین لەگەڵ ئابلۆنسکی چوونە نێو ڕێستۆرانتەکەوە، شادییەکی تایبەت بە روخسار و سەرتاپای ستیپان ئارکادیچەوە دیاربوو، کە وەکوو نەشەیەکی شاراوە و پڕشنگدار وا بوو لە بەرچاوی. ستیپان ئارکادیچ باڵتەکەی داکەند و هەر بەو کڵاوە لارەیەوە، لە هۆڵی میوانداری تێپەڕی و لەگەڵ ئەوەی هەنگاوی دەنا دەستووری بەو خزمەتکارە تاتارییانە دەدا، کە بە جلوبەرگی سپی و بەروانکە و بەرهەڵبێنەوە شان بە شانی دەڕۆیشتن و لێی دوورنەدەکەوتنەوە. بە ڕاست و بە چەپدا لەگەڵ ئاشناکانی، کە لێرەش وەك هەموو شوێنێکی تر زۆری لێبوو سڵاو و چاکوخۆشیی کرد هەتا گەیشتە بووفەکە و پەرداخێکی ڤۆدکا هەڵدا و جنچکێ گۆشت

30- Turbot

ماسیی بە دوادا بەڕێ کرد. ژنێکی فەڕەنسی کە ئارایشتێکی خەستی کردبوو و سەروبەرگی بە تۆڕ و تەنزیلی سوور و سپی رازاندبۆوە و پرچە لوولەکەی بە هەردوو لادا شۆڕکردبۆوە و لە پشت مێزێك دانیشتبوو، ئابلۆنسکی قسەیەکی لەگەڵ کرد، کە ژنە لە دڵەوە قاقای کێشا. بەڵام لەڤین هەر بەو هۆیەوە وازی لە خواردنەوەی ڤۆدکا هێنا، چونکە ئەو ژنە جگە لە پرچی دەستکرد و ئەو سووراو و سپیاوەی لە سەروچاوی هەڵسووبوو، هیچیتری نەبوو دڵ بپشکوێنێ، بۆیە دڵی تێکەڵ هات و وا بە پەلە لێی دوورکەوتەوە دەتگوت لە زبڵدانێکی بۆگەن خۆ لادەدا. بیری کیتی سەرتاپای داگرتبوو، لە نێو دڵیدا شەپۆلی دەدا و بزەیەکی سەرکەوتووانە و هیوایەکی گەش لە چاویدا دەدرەوشایەوە.

پێشخزمەتی تاتاری کە مووی سەری سپی بوو و ساتێك لە ستیپان ئارکادیچ دوورنەدەکەوتەوە و سمت و پاشەڵی هێندە پان بوو کە شاقەلی رووپۆشەکەی لە هەردوو لاوە زاری کردبۆوە، گوتی: لەم لایەوە تەشریف بێنن گەورەم، لێرە هیچ کەس مزاحیمتان نابێ قوربان ـ پاشان رووی لە لەڤین کرد و لەبەردڵی ئابلۆنسکی کە میوانی بوو، رێزی بۆ ئەویش دانا و گوتی: کڵاوەکەتان بدەن بە من گەورەم.

ڕوومێزییەکی پاکوخاوێنی هێنا و لە چاوترووکانێکدا دای بە سەر مێزێکی گردا، کە لە ژێر چلچرایەکی برنجی هەڵکەوتبوو، پاشان دوو کورسیی مەخمەری هێنا پێشێ و دەسرەی بەفرینی سفرەسڕینی بە سەر قۆڵ و مەچەکیدا شۆڕکردەوە و کتێبی رێبەری خواردن بە دەستەوە لە بەردەمی ستیپان ئارکادیچ راوەستا کە دەستووری خواردن بدات.

ـ گەورەم ئەگەر پێتانخۆشە ژووری تایبەتی هەتا چەند ساتێکی تر چۆڵ دەبێ. پرێنس گالیتیسن لەگەڵ خانمێك لەوێیە. ئەگەر مەیلتان لێیە سەدەفی تازەشمان بۆ هاتووە.

ـ بەه بەه، سەدەف!

ستیپان ئارکادیچ چوو دە ماڵی فکرەوە.

قامکی لە سەر لاپەڕەی کتێبڕێبەری خواردن گیرسایەوە و پەشۆکاوییەکی قوول بە ئەدگارییەوە دەرکەوت و گوتی: لەڤین چۆنە بەرنامەکەمان بگۆڕین؟ سەدەفەکەتان بەڕاستی باشە؟ راستم پێ بڵێ.

خزمەتکارەکە گوتی: تازە لە فلێنسبۆرگەوە هاتووە، هی ئۆستێند[٣١] نییە.

---

31- Ostend

ـ هی فلێسبۆرگ بێ تازەیە؟

ـ دوێنێ بۆیان هێناوین قوربان.

ـ چۆنە بە سەدەف دەستپێبکەین و پاشان هەڵبەت هەموو بەرنامەی خواردنەکەمان دەگۆڕین. باشە؟

ـ من فەرقی پێناکەم. ئەگەر لە سەلیقەی من دەپرسی، من سووپی کەلەرم و شلەی ساوەرم لە هەموو شتێك پێ باشترە. بەڵام ئەو جۆرە شتانە پێم وانییە لێرە هەبێ.

پێشخزمەتی تاتاری هەروەك دایکێك کە دادەنەوێتەوە بۆ منداڵەکەی. بە سەر لەڤیندا نووشتاوە و گوتی: مەبەستت سوپی ئالارووسە[٣٢]؟

ـ نا، گاڵتە وەلانێین، هەرچی تۆ پێتخۆشە منیش پێم خۆشە. من خلیسکێنم کردووە و برسیمە ـ کە دیتی ئابلۆنسکی رەنگی ناڕەزایەتی بە ئەدگارییەوە دیارە گوتی: پێت وا نەبێ من ئیشتیاکەی تۆم بە دڵ نییە. من خواردنی باشم زۆر زۆر پێخۆشە.

ستیپان ئارکادیچ گوتی: پێتوایە هونەرت نواندووە؟ هەرچیت پێخۆشە بیڵێ، خواردن یەکێك لە گەورەترین چێژەکانی دنیایە ـ پاشان رووی لە پێشخزمەتەکە کرد و گوتی: دەی براله، دوو دانە، یان نا، دوو دانە کەمە. سێ بڵووتی دە دانەییمان سەدەف بۆ بێنە لەگەڵ سووپی سەوزی.

پێشخزمەت وتەکەی ئەوی وەرگرت و دووپاتی کردەوە: سووپی پرینتانییەر.

بەڵام ستیپان ئارکادیچ دیاربوو نایەوێ بە گوتنی ناوی فەرەنسی خواردەمەنییەکان دڵخۆشی بکات گوتی: ئەرێ، سووپی سەوزی، پاشانیش تووربۆ لەگەڵ سۆسی خەست، دوای ئەویش روستبیڤ، بەڵام پێت نەڵێمەوە با گۆشتەکەی ناسك بێ، دوای ئەوانەش کەڵەشێری برژاو و کۆنسێرڤ.

پێشخزمەت لەبەر دڵی ستیپان ئارکادیچ، کە پێی خۆش نەبوو ناوی خواردنەکان بە زمانی فەرەنسی بڵێ، هەموو جارێ دووپاتی نەدەکردەوە، بەڵام نەیتوانی لە چێژی دووپاتکردنەوەی هەموو بەرنامەی خواردنەکە بە شێوەی خۆی چاوپۆشی بکات، بۆیە گوتی: سووپی پرینتانییەر و تووربۆ و سۆسی بۆمارشە و پولارد ئالیستراگۆن و ماسیدۆنی دیفرۆیت[٣٣] ـ پاشان هەر خێرا وەك ئەوەی دەستی فەنەری بێ، پەڕاوی جزووبەندکراوی چێشتی بە هێواشی لەولاوە دانا و کارتی شەڕابەکانی هەڵگرت و هێنای بۆ ستیپان ئارکادیچ.

ـ چ شەڕابێکتان دەوێ گەورەم؟

---

32- Soape alarusse

33- Soupe Printaniere ‹turbo ‹sauce Beaumarchais ‹Poularade a l'estragon ‹ macedonie de fruits

ـ من؟ هەرچی تۆ پێتخۆشە. بەڵام زۆر کەم. شامپانی!

ـ چۆن؟ هەر لەرێوە شامپانی؟ ئەگەرچی راست دەفەرمووی. بۆ نابێ؟ شامپانیی چاپسپیتان بۆ بێنێ؟

پێشخزمەت دووپاتی کردەوە: کاشەبلان[٣٤].

ـ باشە، بتڵێك لەو مارکە و سەدەف بێنە، پاشان با بزانین چۆن دەبێ.

ـ بە سەر چاو گەورەم، بۆ مەیلکردنی لەگەڵ چێشت و نانەکە چ شەرابێکتان بێنمە خزمەت؟

ـ نوویی[٣٥] بێنە، بەڵام نا، هەر شابلی باشترە.

ـ بە سەر چاو قوربان. لەگەڵ پەنیر بێ وەك هەمیشە؟

ـ بەڵێ، پارمیزان[٣٦]، یان تۆ پەنیرێکی ترت پێخۆشە؟

لەڤین کە نەیدەتوانی بزەکەی بشارێتەوە گوتی: نا، من فەرقی پێناکەم.

پێشخزمەتی تاتاری بە پەلە دوورکەوتەوە و شاقەلی رووپۆشەکەی لە سەر پاشەڵە پانەکەی تەکەی دەهات. دوای پێنج خولەك هەروا بە پەلە بە کەشەفێك سەدەفی هەڵپچڕاو لە سەر دەست و بتڵێك شەراب بە دەستەکەی دیکەیەوە گەڕایەوە.

ستیپان ئارکادیچ لۆیەکی بەروانکە سپییەکەی کردەوە و سووچێکی لە پێسیری جلیسقەکەی هەڵچەقاند، هەردوو دەستی بە هێواشی هێنایەوە خوارێ و دەستی کرد بە خواردنی سەدەف.

ـ بەه، بە راستی خۆشەـ بە چنگاڵێکی زێوین نەرمایی لینچقی سەدەفەکانی لێ دەکردەوە و یەك لە دوای یەك قووتی دەدا. زوو زوو دووپاتی دەکردەوە: بەه، بە راستی خۆشە! ـ جارجاریش چاوێکی لە لەڤین و پێشخزمەتی تاتاری دەکرد.

لەڤین سەدەفی پێ ناخۆش نەبوو، بەڵام نان و پەنیری پێ چاکتر بوو. سەرەڕای ئەوانەش بە چاوی رێزەوە لە ئابلۆنسکیی دەڕوانی. تەنانەت پێشخزمەتیش کە سەری بتڵەکەی هەڵپچڕیبوو و شەرابی گەش و گازداری لە پەرداخە زاریپەلەکان دەکرد دەستی بە بۆینباخە سپییەکەیدا دەهێنا و لەگەڵ ئەوەی رێکوپێکی دەکرد، بە بزەیەکی پڕ لە رەزایەتی ئاشکراوە، دەیڕوانییە ستیپان ئارکادیچ.

---

34 - Cachet blanc

35 -Nuit

36 -Parmesan

ستیپان ئارکادیچ پەرداخەکەی نا بە سەرییەوە و گوتی: بەڵام وا دیارە تۆ سەدەفت پێخۆش نییە، یان لەوە دەچێ پەرۆش بی؟ ها؟

پێی خۆش بوو لەڤین شاد ببینێ. بەڵام لەڤین ئەگەرچی نەدەکرا بڵێی شاد نییە، بەڵام بێخەمیش نەبوو. خەمێکی قورس لە سەر دڵی بار بوو، لەو رێستۆرانتەدا و لەو ژوورە تایبەتانەی کە پیاوان لەگەڵ ژنان یەك دەکەوتن و خواردنیان مەیل دەکرد، لە نێو هاتوچۆی بەپەلەی پێشخزمەتەکاندا دڵی هەروا رێك دەگوشرا و خەمبار و پەرۆش بوو. ئەم شوێنە برنجی و ئاوێنەبەند و پڕ لە گڵۆپ و چرایە و پێشخزمەتی تاتاری ئەوەندەی تر بێزار و جاڕزیان دەکرد. دەترسا ئەوەی لە گیانیدایە و خەریکە کەلاوڕێژ دەکات، لەو شوێنە رموودە بێ.

گوتی: من؟ بەڵێ، زۆریش پەرۆشم. بڕوام پێ بکە لەم شوێنە دڵم ئاسوودە نییە، هەست بە دڵتەنگی و وەڕەزی دەکەم. تۆ نازانی بۆ منی لادێیی ئەم جۆرە شوێنانە هەمووی وەك نینۆخی ئەو کابرایەی نووسینگەکەی تۆ قێزەونن.

ستیپان ئارکادیچ بە پێکەنینەوە گوتی: بەڵێ دیتم کە نینۆخی ئەو گرینیەڤیچە بێچارەیە چۆن سەرنجی راکێشابووی.

لەڤین وەڵامی دایەوە: چ بکەم؟ تۆ هەوڵ بدە خۆت لە جێی من دانێی و بە چاوی گوندنشینێك لێم بڕوانی. ئێمە لە دێ هەوڵ دەدەین دەستوپلمان بە جۆرێك راگرین، کە بتوانین بە سانایی کاری پێبکەین. هەر بۆیە نینۆخمان دەکەین و زۆر جار قۆڵێشمان هەڵدەکەین. بەڵام لێرە خەڵك نینۆکی درێژ دەهێڵنەوە و دوگمەی سەر قۆڵێشیان بە قەد ناڵبەکییەك دەبێ. بە جۆرێك کە ناتوانن لە دەستیان کەڵك وەرگرن.

ستیپان ئارکادیچ بە نەشەوە زەردەیەکی گرت.

ـ چاکە، ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە ئەو پێویستی بە کاری قورس نییە. کاری ئەو فیکرییە.

ـ رەنگە واش بێ. بەڵام بۆ من زۆر سەیرە. راست وەك ئەو نان خواردنەی ئێستای ئێوە. ئێمە خەڵکی دێ کە دەستدەکەین بە خواردن، هەوڵدەدەین زوو تێر بخۆین بۆ ئەوەی بە کارەکانمان رابگەین. بەڵام من و تۆ ئێستا هەولدەدەین ئەوەندەی پێمان دەکرێ درەنگتر تێر بخۆین، هەر بەو مەبەستەش سەدەف دەخۆین...

ستیپان ئارکادیچ سەری لەقاند و گوتی: راست دەکەی، بەڵام ئامانجی ژیار و شارستانییەت هەر ئەوەیە. دەبێ چێژ لە هەموو کارێك وەرگری.

ـ چاکە، ئەگەر ئامانجی ژیار ئەوەیە، من وای بە باشتر دەزانم کە وەحشی و کێوی بم.

ـ هەر ئێستاش وەحشیی، ئێوە بنەماڵەی لەڤین هەمووتان وەحشین.

لەڤین هەناسەیەکی هەڵکێشا. کەوتەوە بیری نیکۆلای برای و ئەوە تووشی ئازاری ویژدانی کرد و ناوچاوی گرژ بوو. بەڵام ئابلۆنسکی مەسەلەیەکی هێنا گۆڕێ، کە لە ڕێوە ئەو بیر و خەیاڵەی لە سەری ڕەواند.

سەدەفە زبرەکانی لە بەردەمی خۆی دوورخستەوە و پیاڵەی پەنیرەکەی بردە پێشێ و بە چاوێکی مانادارەوە بزەی هاتێ: چاکە، ئەمشەو دێی بۆ لام، یانی بۆ ماڵی ئیشچر باتسکی، دێی یان نا؟

لەڤین وەڵامی دایەوە: حەتمەن دێم، ئەگەرچی پرێنسس خولکخۆش نەبوو.

ستیپان ئارکادیچ گوتی: مرۆڤێکی سەیری، ئەوە چ قسەیەکە!... ـ رووی لە خزمەتکارەکە کرد و گوتی: وەرە برالە سووپ بێنە... ـ پاشان درێژەی بە قسەکانی دا و گوتی: خووخدەی هەروایە، دەیەوێ خۆی گەورە و بەرێز نیشان دا. منیش دێم. بەڵام دەبێ لە پێشدا بۆ پرۆڤەی مۆسیقا و گۆرانی بچم بۆ ماڵی کۆنتسبانینا. بەڵام تۆ؟ چۆن بوو ئاوا لەپڕ لە کەللەی دای و لێرە رۆیشتی؟ چۆن دەکرێ ئەوە روونکەیەوە؟ کەچی دەڵێی وەحشیش نییت! بنەماڵەی ئیشچر باتسکی بەردەوام هەواڵی تۆیان لە من دەپرسی. پێیان وا بوو من دەزانم! بەڵام من تەنیا یەك شت دەزانم، ئەویش ئەوەیە کە تۆ هەمیشە کارێك دەکەی کە هیچ کەس نایکا.[37]

لەڤین هێواش بەڵام بە لەبزێکی پەشۆکاوانە گوتی: بەڵێ، هەق بە تۆیە، من وەحشیم، بەڵام وەحشیگەرییەکەم بەو هۆیە نییە کە لە مۆسکۆ رۆیشتم، هی ئەوەیە هاتوومەوە بۆ مۆسکۆ، بەڵام تازە هاتووم ئیتر...

ستیپان ئارکادیچ چاوی لە چاوی لەڤین بڕی و گوتی: پەککوو، چەندە مرۆڤێکی بەختەوەری!

ـ بۆ؟ لە چ لایەنێکەوە بەختەوەرم؟

ستیپان ئارکادیچ ئەو پەندە بەناوبانگەی بە دەنگی بەرز خوێندەوە:

**بارگینی چەمووش بە داخەکەیدا دیارە**
**ڕازی دڵی ئاشـــق لـە نیگایـدا دیارە**[38]

---

٣٧ - تۆلستۆی ڕۆژی ٢٦ی ئاوریلی ١٨٧٦ لە نامەیەکدا بۆ ئیستراخۆڤی هاوڕێی دەنووسێ: ئەگەر ڕەخنەگرانی بیرکورت پێیان وایە بۆ باسکردنی جۆری خواردنەکەی ئابلۆنسکی هەوساری قەڵەمەکەمم پساندووە و لە ڕووی هەوەسەوە شتێکم نووسیوە، بە هەڵە چوون.

٣٨ - هی ئاناکرئۆن پووشکینە

تۆ هێشتا هەموو ژیانت لە پێشە.

ـ یانی تۆ ژیانت لە کیس چووە؟

ـ نالێم لە کیسم چووە، بەڵام تۆ داهاتووت هەیە و من ئێستا، ئەویش چ ئێستایەك نیوەی بە با چووە.

ـ چۆن؟

ستیپان ئارکادیچ گوتی: بەڵێ براله، من ژیانم لێ تاڵ بووە، بەڵام نامەوێ باسی خۆم بکەم. جگە لەوانەش خۆ ناکرێ هەموو شتێك روونکەیەوە. ئێستا تۆ بڵێ بزانم چۆن بوو گەڕایەوە؟ ـ پاشان بانگی پێشخزمەتەکەی کرد: هۆی، وەرە ئەوانە کۆکەوە.

لەڤین بە چاوێکی زیت و پڕ هەیەجانەوە لە ستیپان ئارکادیچی روانی و وەڵامی دایەوە: یانی نازانی؟

ستیپان ئارکادیچ بە بزەیەکی نەرمەوە وەڵامی دایەوە: بۆچی، رەنگە بشزانم، بەڵام ناتوانم ئاوا خێرا بۆت لە بنی کوولەکەکە بدەم. هەر بەوەدا دەبێ بزانی بۆچوونەکەم وایە یان نا.

لەڤین بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی: دەی ئێستا دەڵێی چی؟ ـ هەستی کرد کە هەموو ماسوولکەکانی دەموچاوی دەلەرزن. ـ بیروڕات لەو بارەوە چییە؟

ستیپان ئارکادیچ بێئەوەی چاو لە سەر لەڤین هەڵگرێ بە هێوری پەرداخی شابلی هەڵقوڕاند و گوتی: من؟ هیچ ئاواتێکم نییە لەوە زیاتر، هیچ ئاواتێك.

لەڤین بە چاوێکی تامەزرۆوە لە هاوڕێکەی روانی و پرسیی: یانی بە هەڵە نەچووی؟ دەزانی باسی کێ دەکەم و مەبەستم کێیە؟ پێتوایە ئەو شتە بلوێ؟

ـ ئەی بۆ نالوێ، زۆر چاکیش دەلوێ.

ـ نا، هەر بەڕاستی پێتوایە ئەو کارە جێبەجێ بێ؟ راستم پێ بڵێ، تۆ چۆن بیردەکەیەوە؟ ئەگەر دەستم بە رووەوە بنێن چی؟... ئەگەرچی من دڵنیام کە...

ستیپان ئارکادیچ بزەیەکی بە هەیەجانەکەی لەڤین هاتێ و گوتی: بۆ پێتوایە دەستت بە رووەوە دەنێن؟

ـ هێندێ جار وای بۆ دەچم. بیری لێ بکەوە، ئەگەر داواکارییەکەم قەبووڵ نەکەن، بۆ منیش خراپە و بۆ ئەویش...

ـ بۆ کچە هیچ خراپ نییە. خوازبێنی بۆ هەموو کچێك نیشانەی سەربەرزییە.

ـ هەموو کچێك بەڵێ، بەڵام ئەو خۆ هەموو کچێك نییە.

ستیپان ئارکادیچ گرژییەوە. ئەو چاك لەو هەستەی لەڤین دەگەیی. دەیزانی بۆ ئەو کچانی دنیا دوو دەستەن، یەکیان ئەو کچانەی جگە لە ئەو خاوەنی هەموو عەیب و کەموکوورییەکن و کچانی ئاساین. دەستەکەی تریش کە تەنیا ئەوە لە هەموو عەیب و خەوشێك بەرییە و لە هەموو مرۆڤەکان سەرترە.

لەڤین کە خەریکبوو قوتووی سۆسەکەی راداتە دواوە، ئابلۆنسکی دەستی گرت و گوتی: سەبرکە بۆ سۆس تێناکەی؟

لەڤین لەبەر دڵی ئەو تۆزێکی کردە سەر دەورییەکەی، بەڵام دەرفەتی خواردنی بە ستیپان ئارکادیچ نەدا و گوتی: نا، جارێ پەلە مەکە. تۆ دەبێ تێبگەی ئەو مەسەلەیە بۆ من زۆر گرینگە و مەرگ و ژیان لە گۆڕێدایە. من سەبارەت بەوە لەگەڵ هیچ کەس نەدواوم و لەبزم لە لەبزی کەس نەگەڕاوە. قەتیش لە لای ئەم و ئەو باسی ناکەم، مەگین لە لای تۆ. هەڵبەت من و تۆ هیچ کات وەك یەك ناچین و جیاوازیمان زۆرە، نە سەلیقەمان لە یەکتر دەچێ و نە بیروڕامان. بەڵام دەزانم تۆ منت خۆشدەوێ و لێم تێدەگەی، هەربۆیە منیش خۆشمدەوێی. تۆ خودا ئەگەر پێتخۆشە نێوانەکەمان تێکنەچێ، هیچم لێ مەشارەوە.

ستیپان ئارکادیچ بە پێکەنینەوە گوتی: من بیروڕای خۆمت پێدەڵێم، هەڵبەت مەسەلەکە لەوە گرینگترە. ژنەکەی من، مرۆڤێکی بێوێنەیە... ـ ئەوەی گوت و وەبیر کێشە و گرفتەکەیان کەوتەوە و هەناسەیەکی هەڵکێشا، تۆزێ مات بوو و دەستی کردەوە بە قسەکردن: ئەو تواناییی هەیە پێشبینی داهاتوو بکات، ناخی من دەبینێ. بەڵام لەوانە گرینگتر ئەوەیە لە چارەنووسی خەڵك، بەتایبەت سەبارەت بە ژیانی هاوبەش دەگا و لەوسەری دێتەوە. بۆ وێنە پێشبینی کردبوو کە شاخۆسکایا لەگەڵ برنتلین[٣٩] زەماوەند دەکات. ئەوە شتێك بوو کە هیچ کەس بڕوای نەدەکرد، بەڵام قسەی ئەو بوو. لەو کارەشدا ئەو لایەنگری تۆیە.

ـ یانی چی لایەنگری منە؟

ـ یانی ئەوەی نەك هەر زۆری خۆشدەوێی، بەڵکوو لێی روونە کە کیتی شووت پێ دەکات.

لەڤین بە بیستنی ئەو قسەیە گەشایەوە و زەردەی گرت و بەو زەردەخەنەیە فرمێسکی شادی لە چاوی گەڕا.

بە نەشەیەکی زۆرەوە گوتی: ئەوە قسەی ئەوە؟ من هەمیشە دەمزانی کە ئەو ژنەی تۆ بێوێنەیە ـ دوای ئەو قسەیە هەستا پێ و درێژەی پێدا: زۆر چاکە، ئیتر بەسە، ئیتر پێویست ناکات زۆری لە سەر بڕۆین.

---

39 - Brentlen

ـ باشە، جاریٚ بۆ هەستای، دانیشە سووپەکەت بخۆ.

بەڵام لەڤین ئۆقرەی لیٚ بڕابوو. لەو ژوورە ڕکەئاسایەدا بە هەنگاوی توند و پتەوەوە کەوتە راویٚچکە. خیٚرا خیٚرا چاوی دەترووکاند بۆ ئەوەی فرمیٚسکەکانی بشاریٚتەوە. دوای ئەوە دیسان لە پشت میٚزەکە دانیشتەوە.

گوتی: پیٚم خۆشبوو بزانی کە ئەوە عەشق نییە. من پیٚشتر ئاشق بووم، بەڵام ئەمەیان جیاوازە. ئەوە شتیٚك نییە کە لە هەستمدا بیٚ. وزەیەکی دەرەکییە و بە سەر وجوودمدا زاڵ بووە. دەزانی خۆ، ئەو جارەی دیکە بۆیە لیٚرە رۆیشتم پیٚم وابوو ئەو کارە بە هیچ کلۆجیٚ نالویٚ. خۆ تیٚدەگەی، پیٚم وابوو ئەوە بەختەوەرییەکە کە لەم دنیایە بە نسیبی هەموو کەسیٚك نابیٚ. لەگەڵ خۆمدا ململانیٚم بوو، بەڵام ئاخری بەو ئاکامە گەیشتم، کە ژیان بیٚ ئەو مەحاڵە و دەبیٚ بڕیاریٚکی پتەو بدەم...

ـ دەی باشە، ئیتر بۆ دەڕۆیشتی؟

ـ تۆ پەلە مەکە، ئیٚستا عەرزت دەکەم. کاکە نازانی چەندەم فکر و خەیاڵ لە سەردا بوو! زۆر شت هەبوو دەمویست لیٚت بپرسم! تۆ نازانی بەو قسەیەت چ خزمەتیٚکی گەورەت پیٚ کردم! من ئەوەندە بەختەوەرم لە خۆشیانا خەریکە شیٚت بم. هیچم لە بیرنەماوە... ئەمڕۆ ئاگادارکرام، کە نیکۆلای برام هاتۆتەوە. ئەو دنیایەت دیوە، ئەو لیٚرەیە و من لە بیرم بردۆتەوە. هەر دەڵیٚی ئەو بەختەوەرییەی من بەشی ئەویشی پیٚوەیە. ئەمە شیٚتییە. بەڵام شتیٚکی تر هەیە کە زۆر سامناکە... خۆ دەزانی، تۆ ژنت هەیە و باش لەوە دەگەی. ئەوەی کە ترسناکە ئەوەیە کە ئیٚمە پیاوان کە نەختیٚك بەساڵاچووین، رابردوویٚکی رەش و تاریکمان هەیە و تروسکەی ئەشقی تیٚدا بەدی ناکریٚ. کەچی لە ناکاو لەگەڵ کچیٚکی پاك و بیٚتاوان تیٚدەکەوین و ئەوەش بەڕاستی زۆر ترسناکە. هەر لەبەرئەوە ناکریٚ خۆم بە شیاوی ئەو بەختەوەرییە بزانم.

ـ وا دیارە تۆ باری تاوانەکانت زۆر قورس نییە.

لەڤین گوتی: بۆچی، لەگەڵ ئەوەشدا، لەگەڵ ئەوەشدا «کاتیٚك لاپەڕەکانی دەفتەری ژیانم هەڵدەدەمەوە... لەرزم لیٚدیٚ و خۆم بە نەحلەت دەکەم و هەناسە هەڵدەکیٚشم و بیٚز لە خۆم دەکەم... بەڵیٚ.»[٤٠]

---

٤٠ دیٚڕیٚك لە شیعری «بیرەوەری» بەرهەمی پووشکین. تۆلستۆی گوتوویە: لە تەواوی وێژە و ئەدەبی جیهاندا پیٚم وانییە پیٚنج یان لانی زۆر دە شیعری وەك ئەمە هەبیٚ.

ستیپان ئارکادیچ گوتی: دەی خۆ هیچ ناکرێ، ژیانە ئیتر..
ـ تەنیا شتێك هەیە بۆ من کە جێگای هیوا بێ، ئەویش دۆعایەکە کە هەمیشە لە دڵمدا بووە و ئەویش ئەمەیە: «خودایە هیوام بە کەرەم و بەخشینی بێسنووری تۆیە، نەك کردەوەی باش و بێبایەخی خۆم..» هیوام هەر بە بەخشندەیی ئەوە.

## یازدە

لەڤین پەرداخەکەی خۆی نا بە سەرییەوە و هەردووکیان بێدەنگ بوون.
ستیپان ئارکادیچ پرسیی: بەڵام دەبێ شتێکی ترت پێ بڵێم: ڤرۆنسکی[٤١] دەناسی؟
ـ نا، نایناسم، بۆچی؟
پێشخزمەتی تاتاری کە خەریکی پڕکردنەوەی پەرداخەکانیان بوو و بوونیشی لەو شوێنە پێویست نەبوو، بەڵام لە خۆڕا بە دەوریاندا دەهات و خۆی تێهەڵدەقوتاندن، ستیپان ئارکادیچ پێی گوت: بڕۆ بتلێکی تر بێنە.
ـ بۆ دەبێ ڤرۆنسکی بناسم؟
ـ بۆیە دەبێ بیناسی چونکە یەکێك لە رەقیبەکانی تۆیە.
لەڤین گوتی: ڤرۆنسکی کێیە؟ ـ هەر لەپڕیش هەڵچوونێکی منداڵانە، کە ستیپان ئارکادیچ زۆری پێ خۆش بوو. روخساری شێواند و رقێکی تاڵ خۆی لە دەنگ و رەنگی هاڵاند.
ـ ڤرۆنسکی یەکێك لە کوڕەکانی کۆنت کیریل دیوانۆڤیچ ڤرۆنسکییە و یەکێك لە پڕشنگدارترین نموونەی لاوانی خاوەن کەسایەتی و هێژای پترزبۆرگە. من کاتێك لە تڤێر[٤٢] کارم دەکرد لەگەڵی ئاشنابووم. بۆ سەربازگیری هاتبوو. لاوێکی زۆر دەوڵەمەند و جوانچاکە، خزموکەسەکانی زۆر دەستڕۆیشتوون و قسەیان بڕەکات و خۆشی ئاجوودانی تایبەتی ئیمپڕاتۆرە و جگە لەوانەش لاوێکی باش و خوێنشیرین و لە دڵەوە نزیکە. بەڵام خۆ ناکرێ هەر بڵێین کوڕی چاکە، زۆر لەوانە زیاتر تاریف هەڵدەگرێ. لێرە باشترم ناسی. خاوەن بیر و وریا و خوێندەوارە. لەو کەسانەیە کە پلەی زۆر دەچێتە سەرەوە.

---

41- Vronsky
42- Tver

لەڤین رەنگی تێکچوو و بێدەنگ بوو.

ـ ماوەیەك دوای رۆیشتنی تۆ هات بۆ ئێرە و وەك بۆم دەرکەوتووە ئاشق و شەیدای کیتییە. بەڵام حیسابی تۆ جیایە، چونکە دایکی ...

لەڤین کە خەم نێوچاوانی پێ گرژ کردبوو هەستایە سەر پێ و گوتی: داوای لێبوردن دەکەم، چونکە هیچ تێناگەم ـ لەپڕ نیکۆلای برای وەبیرهاتەوە، رقی لە خۆشی هەستا کە مرۆڤێکی خراپە و براکەی خۆی لەبیربردۆتەوە.

ستیپان ئارکادیچ دەستی گرت و بە پێکەنینەوە گوتی: سەبرکە، بۆ وا زوو هەڵدەچی؟ من ئەوەی دەمزانی پێم گوتی، بەڵام دیسان پێت دەڵێمەوە لەو کارە ناسك و هەستیارەدا، هەتا ئەو جێیەی من بۆی بچم، پێم وایە تۆ شانسی سەرکەوتنت زیاترە.

لەڤین لە سەر کورسییەکە دانیشتەوە. رەنگی هەڵبزرکابوو.

ئابلۆنسکی لەگەڵ ئەوەی پێکەکەی بۆ پڕکردەوە و گوتیشی: من داوات لێ دەکەم هەتا ئەو جێیەی دەتوانی زووتر بڕیاری خۆت بدە.

لەڤین پەرداخە پڕەکەی رادا دواوە و گوتی: نا، سپاست دەکەم، ئیتر بۆم ناخورێتەوە. سەرخۆش دەبم... ـ بە راشکاوی و بە قەستی ئەوەی باسەکە بگۆڕێ پرسیی: دەی لەوە گەڕێین، باسی خۆتم بۆ بکە، حاڵت چۆنە؟

ستیپان ئارکادیچ گوتی: ئەم ئامۆژگارییەم لە گوێ بگرە، لێی رامەوەستە و کۆتایی بەو کارە بێنە. ئەمشەو باسی هیچ مەکە. سبەینێ بەیانی بە پێی دابونەریتی باو بچۆ بۆ خوازبێنی. خودا پشتیوانت بێ.

لەڤین گوتی: تۆ بڕیاربوو بێی بۆ دەڤەرەکەی ئێمە کاکی راوچی ئەی بۆ نەهاتی؟ ئەم بەهارە هەر چاوەڕێت بووم.

ئێستا زۆر پەژیوان بوو کە لە لای ستیپان ئارکادیچ پرێسکەی دڵی کردبۆوە. هەستە پاك و پیرۆزەکەی بەو قسانە رووشابوو، باسی ئەو ئەفسەرە پترزبۆرگییە کە بووبووە رەقیبی و هەروەها باسی خوازبێنی و زەماوەند و پێشنیارەکانی ستیپان ئارکادیچ وای لێکردبوو بێزی لە خۆی هەستێ.

ستیپان ئارکادیچ گرژییەوە. چاکی دەزانی کە لەڤین چۆن لە ناخەوە هەڵدەچۆقێ.

گوتی: دێم، رۆژێك دێم. خۆ دەزانی براله، ژن تەوەرێکە کە هەموو شتێك بە دەوریدا هەڵدەسووڕێ. نازانی من چۆن تووشی گێچەڵ بووم، زۆر پیسم لێقەوماوە. هەمووشی خەتای

ژنە ـ جگەرەیەکی بەرگی دەرهێنا و دەستێکی بە جامی شەڕابەکەوە گرت و درێژەی بە قسەکانی دا: ئێستا تۆ پێم بڵێ چ بکەم؟ فکرێکم بۆ بکە.

ـ مەسەلە چییە؟

ـ مەسەلەکە ئەوەیە: وای دانێ ژنت هەیە و ژنەکەشت زۆر خۆشدەوێ و ئاشقی ژنێکی تر دەبی...

ـ داوای لێبوردن دەکەم، لێرەوە ئیتر لەو قسانەت تێناگەم. وەك ئەوە وایە کە... ئەم قسەیەی تۆ هێندە بۆ من سەیر و بێ مانایە، وەك ئەوە وایە کاتێك لێرە بە تێروپڕی دەڕۆینە دەرێ، بە پەنا نانەواخانەیەکدا تێپەڕین و نانە ناسکەیەك بدزین.

ستیپان ئارکادیچ هەردوو چاوی بریقەی دەهات و زیت دەیڕوانی.

ـ بۆ؟ بۆنی نانە ناسکەی تازە جاری وایە وا مەستت دەکات خۆت پێ راناگیرێ، شاعیر گوتەنی:

*چەند خۆشە گەر لە دەستم بێ*
*زاڵ بم بە سەر ویستی ناخا*
*بەڵام ئەگەر نەشمتوانی*
*خۆشە بەو چێژە تێراو کەم*
*دڵی ئاشقم لە داخا*[٤٣]

ستیپان ئارکادیچ کە ئەو شێعرەی بە زمانی ئاڵمانی خوێندەوە، نەرمە زەردەیەکی گرت. لەڤینیش نەیتوانی ددان بە خۆیا بگرێ و پێنەکەنێ.

ئابلۆنسکی دەستی پێکردەوە: بەڵێ، گاڵتە وەلانێین، بیری لێبکەوە، ژنێکی جوان و ژیکەڵە، شۆخێك تۆی خۆشدەوێ، هەموو شتێکی فیدای تۆ کردووە و ئێستا تەنیا و داماوە. من ناڵێم تۆ بڵێ ئێستاکە کەڵەشێری خۆت بە لەپەوە لێناوە و بە کامی دڵت گەیشتووی، بیری لێبکەوە، دەتوانی هەروا وێڵی بکەی؟ خۆ دەزانم، دەبێ لێی جیا بییەوە بۆ ئەوەی ژیانی بنەماڵەیی تێکنەچێ، بەڵام نابێ لانیکەم رەحمی پێبکەی و پەڕۆیەکی لێ دادڕی و تۆزێ خەمی لە سەر سووك کەی؟

ـ بەڵام، داوای لێبوردن دەکەم. دەزانی چی، لە روانگەی منەوە ژنان دوو دەستەن.. نا، وا چاکە بڵێم لایەك ژنانن و لایەکی دیکە... من بوونەوەری گومڕا و دلڕفێنم نەدیوە و

---

٤٣ - کۆپلەیەك لە ئۆپێرای یووهان ئیشتراوس بە ناوی «شەمشەمەکوێرە»

ناشیبینم.. وەك ئەو ژنە فەڕەنسییەی پشت مێزەکە کە قنج دانیشتووە و قژە لوولەکەی بەرداوەتەوە، ئەو لە روانگەی منەوە بوونەوەرێکی بێنرخ و چەپەڵە. ئەو بوونەوەرە گومڕایانەش وەك ئەو وان...

ـ هەروا ئەو ژنە تاوانبارەش کە لە ئینجیلدا باسی کراوە؟

ـ ئەە، باشە لە سەری مەڕۆ... ئەگەر مەسیح دەیزانی، مەسیحییەکانی ئاوا خراپ و پێچەوانە لە وتەکانی دەگەن. هیچ کات ئەو قسانەی نەدەکرد. لەو هەموو ئایەتەی ئینجیل تەنیا ئەوەیان لە دالغەیاندا راگرتووە... جگە لەوەش، من لە خۆڕا قسەناکەم و نامەوێ بیروڕای خۆمت بە سەردا بسەپێنم. من هەستی خۆم دەردەبڕم بۆت و بێزم لەو جۆرە ژنانە هەڵدەستێ. تۆ لە کاکڵەمێشان دەترسی و من لەوانە... پێم وا نییە تۆ متالآت لە سەر کاکڵەمێشان کردبێ و لەگەڵ خووخدەی ئاشنابی، منیش هەروا.

ـ وتنی ئاسانە. راست وەك ئەو پیاوە کە لە چیرۆکەکەی «دیکێنز»دا باسی کراوە، هەموو مەسەلەیەکی گران بە دەستی راستی بۆ پشت شانی چەپەی فڕێدەدا. بەڵام خۆ ناکرێ بە حاشاکردن لە راستییەکان ئەو مەسەلەیە حەل بکەی، چی دەکرێ؟ پێم بڵێ چ بکەم؟ ژنەکەت پیر دەبێ، بەڵام خۆت حەز و چێژی ژیان و هەوەس لە ناختدا بڵێسە دەکێشێ. ئاوڕبدەیەوە تێدەگەی کە ناتوانی لەگەڵ ئەو هەموو رێزەی بۆ ژنەکەتت هەیە ئاشقی بی ـ پاشان بە خەمباری و هیوابڕاوانە گوتی: پاشان شۆخێکی دلڕفێن دێ و ئەقڵ و ئیمانت دەڕفێنێ و شێتت دەکات. ئیتر کار لە کار دەترازێ و خۆت دەدۆڕێنی.

لەڤین پێکەنی و لچی هەڵقورتاند.

ئابلۆنسکی تێهەڵچووەوە: بەڵێ ئیتر کار لە کار دەترازێ و هیچت پێناکرێ و خۆت دەدۆڕێنی، جا بزانم چ دەکەی؟

ـ نانە ناسکەکە نادزم!

ستیپان ئارکادیچ پێکەنی: هەە! هەر دەم لە ئەخلاق دەکوتن، هەر ئەخلاق! بەڵام نا، بیری لێبکەوە، تۆ لەگەڵ دوو ژن تێکەوتووی، یەکیان تەنیا هەر خۆی دەبینێ و خۆی بە هەقدار دەزانێ، بە پێداگرییەوە دەیەوێ ئەو هەقە بە دەست بێنێ، ئەو هەقەش ئەشقە، کە تۆ ناتوانی پێی بدەی. ئەوی دیکەشیان هەموو شتێکی خۆیت فیدادەکات و لە هەمبەردا هیچی ناوێ. دەی چار چییە؟ تۆ بی چ دەکەی؟ تراژیدیای پڕمەترسی ئەوەیە.

ـ ئەگەر لەو بارەوە بیروڕای منت دەوێ، دەبێ پێت بڵێم کە ئەو مەسەلەیە هیچ کارێکی بە سەر تراژێدیاوە نییە. بۆچی؟! چونکە من پێم وایە ئەشق... هەردوو جۆری ئەشقەکە،

ئەگەر لە بیرت بێ، ئەفلاتوون لە «میوانداری»ی خۆیدا باسی دەکات، هەردووکیانیش مەحەکێکن بۆ ناسینی مرۆڤەکان. هێندێ خەڵك تەنیا لە جۆرێکی تێدەگەن و هێندێکیش جۆرەکەیتری. ئەو کەسانەی کە جگە لە عەشقی غەیرە ئەفلاتوونی هیچی دیکە ناناسن لە خۆڕا باسی تراژێدیا دەکەن. ئەم جۆرە ئەشقە هیچ پێوەندییەکی بە تراژێدیاوە نییە. «زۆرت سپاس دەکەم کە ئەو چێژەت پێ بەخشیم، خوداحافیز!» سەرلەبەری تراژێدیاکەیان هەر ئەوەیە و بەس! لە ئەشقی ئەفلاتوونیشدا تراژێدیا جێی نییە، چونکە لەو جۆرە ئەشقەدا هەموو شتێك پاك و بێگەرد و روونە. چونکە...

لەو کاتەدا لەڤین وەبیر تاوانەکانی خۆی و کێشە دەروونییەکانی کەوتەوە و بەبێ پێشەکی گوتیشی:

ـ ئەگەرچی رەنگە هەق بە تۆش بێ. هیچ بەدووریش نییە... بەڵام من نازانم... هەر بەڕاستی من سەرم لێی دەرناچێ.

ستیپان ئارکادیچ گوتی: دەزانی چی؟ تۆ مرۆڤێکی راست و یەکڕەنگی. ئەوەش سەرقاڵییەکی گەورەیە، بەڵام عەیبی تۆشی تێدایە. تۆ مرۆڤێکی پاك و راستی و خوازیاری ئەوەی کە ژیان هەمووی پڕ لە دیاردەی رووناك بێ و دوور بێ لە شك و دڕدۆنگی. بەڵام راستەقینە شتێکی ترە. وا دیارە ئەم کارەی ئێمە کە لە دەوڵەتدا خزمەت دەکەین پێت شتێکی سووك و بێبایەخە، چونکە پێتخۆشە کار و ئامانج پێوەندییەکی رۆشنیان پێکەوە هەبێ. چونکە ئەوە شتێکی ئەستەمە. تۆ دەتهەوێ چالاکییەکانی خەڵك بۆ ئامانجێکی دیاریکراو بێ، دەخوازی ئەوین و ژیانی بنەماڵە یەکێك بن، ئەوەش مەحاڵە. بۆ نازانی خۆشی و جوانیی ژیان هەمووی لەو تاریکوڕوونییانە پێکهاتووە.

لەڤین هەناسەیەکی هەڵکێشا و وەڵامی نەدایەوە. بیری لە لای کاری خۆی بوو و گوێی بە قسەکانی ئابلۆنسکی نەدەدا.

لە ناکاو هەردووکیان هەستیان کرد کە ئەگەرچی هەڤاڵن و پێکەوە نان دەخۆن و شەراب دەنۆشن، دەبوو زۆر لە یەك نزیك بن، بەڵام هەرکام لە بیری ئیش و کاری خۆیدایە و کاری بە سەر ئەوی ترەوە نییە. ئابلۆنسکی ئەم دووپۆیی و تێکەڵنەبوونەی زۆر جار دوای نان خواردن هەست پێ کردبوو، کە بە جێی یەکبوون و هاودڵی لە نێوانیاندا سازدەبوو. بۆیە دەیزانی لەو جۆرە کاتانەدا چ بکا.

گوڕاندی: حیساب! ـ پاشان رۆیشت بۆ هۆدەکەی تەنیشت و خێرا لەگەڵ ئاجودانێکی ئاشنا کەوتە قسە کە کتوپڕ لووتی بە لووتیدا تەقیبوو، سەبارەت بە ژنە ئەکتەرێك دەدوان کە

پیاوێك پارەی دەرشتە بەر پێی. ئەو دمەتەقێیەش لەگەڵ ئاجوودان شەکەتیی ئەو ماوەیەی لەش دەردەکرد، کە لەگەڵ لەڤین مشتومڕی کردبوو و بووبووە هۆی کێشەی رۆحی و فیکری، بۆیە هەستی بە سووکباری و حەسانەوە کرد.

کاتێك پێشخزمەتی تاتاری لیستەی حیسابەکەی هێنا، کە بیست و شەش رۆبڵ و چەند کاپك دەبوو، شتێکیشی وەك دەستخۆشانە خستە سەری، لەڤینی لادێیی بە پێچەوانەی هەمیشە کە لەبەر زۆریی پارەکە ترسی لێدەنیشت، ئەمجارە بەشی خۆی کە چاردە رۆبل بوو دای و رۆیشتەوە بۆ ماڵێ تاکوو خۆی ئامادەبکات بۆ ماڵی ئیشچر باتسکی، ئەو شوێنەی کە چارەنووسی ئەوی لێ دیاری دەکرا.

## دوازده

پرێنسس کیتی ئیشچر باتسکایا هەژدە ساڵی تەمەن بوو. یەکەم زستان بوو کە لە میوانداریيەکاندا بەشداریی دەکرد. لەو کۆڕ و کۆبوونەوانەشدا لە هەردوو خوشکەکەی زیاتر سەرنجی خەڵکی رادەکێشا و ئەمجارەشیان زۆر لەوە زیاتر بوو کە پرێنسسی دایکی چاوەڕوانیی دەکرد. نەك هەر لە میوانداریيەکانی مۆسکۆ دڵی هەموو لاوانی رفاندبوو، بەڵکوو هەر لەو یەکەم زستانەدا دوو خوازبێنی جیددیی بۆ پەیدابوو: یەکیان لەڤین و هەر دوای رۆیشتنی ئەویش کێنت ڤرۆنسکی.

وەدیار کەوتنی سەروسەکوتی لەڤین لەو سەرەتای زستانەدا و هاتوچۆی بەردەوامی بۆ ماڵی ئیشچر باتسکی و بە ئاشکرا حەز لێکردووییەکەی بووە هۆی ئەوەی دایك و باوکی کیتی بکەونە مشتومڕ لە سەر داهاتووی کچەکەیان و هێندێ جار تووشی دەمەقاڵێش دەبوون. پرێنسی گەورە لایەنگریی لە لەڤین دەکرد و دەیگوت کە مێردێکی لە ئەو چاکتری ناوێ بۆ کچەکەی. بەڵام پرێنسس بەو خووخدە تایبەتەی ژنانەوە کە خۆ لە ئەسڵی مەبەست دەبوێرن، بیانووی ئەوەی دێنایەوە کە کیتی هێشتا منداڵە و وەختی شووی نییە و لەڤینیش هێشتا بە پرکێشییەوە قەستی خۆی ئاشکرا نەکردووە و لەوە ناچێ دڵی بە کیتییەوە بێ، هەروەها زۆر بەڵگە و بیانووی تر. بەڵام قەت باسی هۆی دژایەتییەکەی خۆی نەدەکرد، ئەویش لەبەرئەوە بوو کە چاوەڕوانی خوازبێنییەکی باشتر بوو بۆ کچەکەی و حەزی نەدەکرد لەڤین ببێتە زاوای،

چونکە لە قسە و کارەکانی نەدەگەیشت. کاتێك لەڤین کتوپڕ ڕۆیی بۆ گوند، پرێنسس زۆری پێخۆش بوو و سەرکەوتووانە بە مێردەکەی گوت: قسەکەی منت بۆ دەرکەوت! ـ هاتنی ڤرۆنسکی شادیی خستە دڵی پرێنسسەوە و بووە هۆی ئەوەی لە سەر بیروباوەڕی خۆی پێداگر بێ. لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە کیتی جگە لەوەی کە دەبێ مێردێکی باش بکات، دەبێ زاواکەشیان لە هەموو بارێکەوە سەرامە و بەرچاو بێ.

ڤرۆنسکی و لەڤین لەبەرچاوی پرێنسس شیاوی پێکەوە هەڵسەنگاندن نەبوون. رادەربڕین و هەڵسوکەوتی توند و نابەجێی لەڤین و دەستەوستانی و بێ دەمودوو بوونی لە کۆڕەکاندا، کە پرێنسس پێی وا بوو هۆی دەمار و قۆڕەدەماخییە، لە لایەکی تریشەوە ژیانی لە گوند و کەسپی ئاژەڵداری و هەڵسوکەوت لەگەڵ لادێییەکان دوور لە ژیار و شارستانییەت بوو و بە هیچ شێوەیەك نەدەچووە دڵییەوە. هەروەها زۆری پێناخۆش بوو کە لەڤین حەز لە کچەکەی بکات و مانگ و نیوێك هاموشۆی ماڵەکەیان بکات بێ ئەوەی هیچ شتێك بدرکێنێ. دەتگوت لەوە دەترسێ کە خوازبێنییەکەی ئەوەندە شانازییەکی گەورە بێ کە کچەکەی شیاوی نەبێ، وێدەچوو تێنەگا کە کاتێك پیاوێك هاتوچۆی ماڵێك بکات کە کچی عازەبیان هەیە، دەبێ قەستی خۆی لەو هاتوچۆیە دەربڕێ. سەرەڕای ئەوەش، بێ ئەوەی شتێك بڵێ لە ناکاو خۆی ون کردبوو. دایکی لەبەرخۆیەوە دەیگوت: بەختەوەرانە هێندە زەبەلاحە کیتی ئاشقی نەبووە.

بەڵام ڤرۆنسکی زۆر کەوتبووە بەر دڵی پرێنسس. چونکە دەوڵەمەند و خاوەن کەماڵ و نەجیمزادە بوو، لەگەڵ ئەوەشدا کەسایەتییەکی بەرچاو و لە ئەرتەش و دەرباردا داهاتوویێکی پڕشنگداری هەبوو، هەروەها لاوێکی جوانچاك و قۆز بوو و زاوای لەوە چاکتر هەر نەبوو.

ڤرۆنسکی لە کۆڕی سەما و هەڵپەڕکێدا راشکاوانە دەیویست سەرنجی کیتی راکێشێ و دڵی نەرم بکات. سەمای دەکرد لەگەڵیدا و هاتوچۆی ماڵەکەیانی دەکرد، خۆی وا نیشان دەدا کە ئەو قەستە جیددییەی تووشی دڕدۆنگی نەدەکردن. بەڵام لەگەڵ ئەوانەشدا سێ مانگەی زستان پرێنسس هەر لەگەڵ دڵەخورپە و بێئۆقرەییدا رایبوارد.

پرێنسس خۆی سی ساڵ لەمەوبەر شووی کردبوو و پووری بووبووە ناوبژیوانی ئەو خوازبێنی و زەماوەندە. بنەماڵەی بووك لە بنجوبناوانی ماڵباتی زاوا دەگەیشتن. زاوا هاتبوو چاوی بە بووك کەوتبوو، کەسوکاری بووکیش هەموویان زاوایان بە دڵ بووبوو. پووری کە چارەنووسی ئەو دوو گەنجەی لێك گرێ دابوو وەڵامی بۆ هەردوو لا بردبۆوە و دیارە بیروڕای هەردوو لا ئەرێنی بوو. پاشان زاوا لە ڕۆژێکی دیاریکراودا کە دایك و باوکی کچە چاوەڕێبوون، چووبووە

خوازبێنیی کچەکەیان. هەموو کارەکانیش زۆر بە سانایی بەڕێوەچووبوون. یان لانیکەم پرێنسس بە ئاسانی دەزانی، بەڵام کاتێك کچەکانی خۆی بە شوودەدا، بۆی دەرکەوت کە ئەو کارەی ئاوا بە سووك و سانای دەزانی، ئاسان نییە و بەڵکوو زۆریش کارێکی دژوارە. بۆ بەشوودانی دوو کچەکەی تری یانی داریا و ناتالیا خەمی دنیا لە سەر دڵی کەڵەکە بووبوو، فیکر و خەیاڵ ئارا و قارای لێ هەڵگرتبوو. پارەیەکی زۆری خەرج کرد و چەندین جار لەگەڵ مێردەکەی تووشی دەمقڕە هاتن! ئێستاکە کچە چکۆلەکەی وەك خاتوونێکی گەنج پێی دەنایە کۆمەڵگاوە دیسان ئەو خەم و خەیاڵ و دڕدۆنگی و ترسانە، تەنگی پێهەڵچنیبوو و تەنانەت لەگەڵ مێردەکەشی هێندەی کێشە و بەزم سازکردبوو خەریکبوو بە جارێ ددانیان لێك سپی بێتەوە. پرێنسی پیر، وەك هەموو باوکێك، سەبارەت بە حەیا و ئابڕووی کچەکانی کەمتەرخەم نەبوو و هەمیشە لە بیری بەختەوەری و سەربەرزییاندا بوو، لەوەش دەترسا پێیان هەڵخلیسکێ. بۆ هەموو کچەکانی هەر وا بوو، بەڵام بۆ کیتی کە گوڵەجەرگەی بوو زۆر زیاتر چاوی بە سەرییەوە بوو و لەرادەبەدەر هەڵسوکەوتی خستبووە ژێر چاوەدێری. سات بە سات لەگەڵ پرێنسس کێشەی بوو کە بۆ ئاگاداری ئابڕووی کچەکەیان نییە. پرێنسس بە سەر دوو کچەکەی دیکەیاندا لەگەڵ ئەو خووخدەیەی مێردەکەی ڕاهاتبوو، ئەمجارەیان هەستی دەکرد، کە سەختگیری و دڕدۆنگیی مێردەکەی لە خۆڕا نییە. دەیدی کە لەم دواییانەدا زۆربەی دابونەریتە کۆمەڵایەتییەکان ئاڵوگۆڕیان بە سەردا هاتووە و ئەرکی دایکانیان قورستر کردووە. دەیدی کە کچانی هاوتەمەنی کیتی بۆ خۆیان کۆڕ و کۆبوونەوەیان داناوە و دەرس دەخوێنن و ئازادانە لەگەڵ پیاوان پێدەکەنن و ڕادەبوێرن، بە تەنیا سواری فایتوون دەبن و بە نێو شاردا دەسووڕێنەوە، زۆربەشیان کاتی بەرەوڕووبوون لەگەڵ گەورەتر لە خۆیان سڵاوناکەن و مێشێکیشیان میوان نییە، بە کورتی لە لای ئەوان گەورە و چکۆلە نەماوە. لە هەمووشی گرینگتر ئەوەیە لە سەر ئەو باوەڕە سوورن، کە هەڵبژاردنی مێرد کاری خۆیانە و دایك و باوك هەقیان نییە خۆ لە کاریان هەڵقوتێنن.[٤٤] ئەو کچە عازەبانە و تەنانەت پیرەکچانیشیان لە سەر

---

٤٤ - مانگی نوامبری ١٨٧٢ دەورەی باڵای فێرکاریی ئافرەتان لە ژێر چاوەدێری پڕۆفیسۆر گریەدا لە مۆسکۆ پێکهاتبوو. لە پترزبۆرگ کۆڕ و کۆبوونەوەی ژنان و دەورەگەلی فێرکاری (ماف، وێژە و پزیشکی) دامەزرابوو. ئەو کۆڕ و کۆبوونەوانە و دەورەگەلی فێرکاری بوارێکی لەبار بوو بۆ گەشەپێدانی ئامانج و ئازادیی بەرەی لاوانی ئەو سەردەمە.

ئەو باوەڕە بوون، کە «ئەمڕۆ ئیتر کچ بەشوودان وەك سالّی سالّان نییە» بەلاّم ئەوەی کە ئەمڕۆ دەبیّ چۆن کچ بە شوو بدەن پرسیاریّك بوو هیچ کەس وەلاّمەکەی نەدەزانی.

دابی فەڕەنسی کە چارەنووسی کچان بە دەست دایك و باوکیان بوو، بە شتیّکی کۆنیان دەزانی و ئیدانەیان دەکرد. رەوشتی ئینگلیزییەکانیش کە کچانیان بە تەواوی ئازادکردبوو لە هیچ باریّکەوە لیّپرسینەوە نەبوو پیّیان قەبوولّ نەدەکرا و هەلّگری کۆمەلّگای رووسیا نەبوو. دابی رووسییەکانیش کە خوازبیّنی لە ریّی کەیخودا و ناوبژیوانەوە بوو و هەردوو لای بە یەکتر دەناساند، ئیتر بە شتیّکی نەشیاو دادەنرا و هەموو کەس، تەنانەت پرێنسسیش ئەوەی بە شتیّکی قۆڕ و دواکەوتووانە دەزانی. بەلاّم ریّگای دروست و باشی شووکردن و کچ بە شوودان کامەیە، هیچ کەس نەیدەزانی. هەموو ئەو کەسانەی کە پرێنسس قسەی لەگەلّ دەکردن تەنیا دەیانگوت «بە قوربان ئیتر ئەو دابونەریتە کۆنە تێیهەلّدەن با بڕوا. ئاخر ئەوە لاوەکانن زەماوەند دەکەن نەك دایك و بابیان. دەبیّ ئازادیان بکەی ژیانی خۆیان چۆنیان پیّ خۆشە ئاوای دامەزریّنن.» بەلاّم ئەو قسانە بۆ ئەو کەسانە ئاسان بوو کە خۆیان کچیان نەبوو. پرێنسس دەیزانی ئەو چەشنە ئاشنایەتییانەی بەر لە زەماوەند لەوانەیە ببیّتە هۆی دلّداری و حەز لیّکردوویی و کچەکەیان لەوانەیە دلّ بدا بە کەسیّك کە پاشان نەیهەویّ زەماوەندی لەگەلّ بکات و تەنیا بۆ خۆشی و رابواردن لەگەلّی دەبیّ و لەوانەیە شیاوی ئەوەش نەبیّ شووی پیّ بکات. هەرچەندە دەیانویست بە پرێنسسی بسەلمیّنن کە لەم سەردەمەدا وا باشە گەنجەکان ئازاد بن و خۆیان بۆ چارەنووسی خۆیان بڕیاربدەن، بەلاّم ئەو ئەوەی پیّ هەزم نەدەکرا و نەیدەتوانی بە خۆشی بسەلمیّنیّ. بۆیە هاتبووە سەر ئەو باوەڕەی کە قەت دەمانچە بۆ مندالّیّکی پیّنج سالاّن نابیّتە کەرەستەیەکی باش بۆ یاری کردن. هەر بەو هۆیەش زیاتر لە دوو کچەکەی تری پەرۆشی کیتی بوو.

پرێنسس ئیّستا پەرۆشی ئەوە بوو نەکات ڤرۆنسکی هەر بیهەویّ لەگەلّ کچەکەی رایبویّریّ و دەستی پیّ گەرم بکاتەوە. دەیدی کە کچەکەی دلّی پیّداوە. لە لایەکیشەوە دلّی خۆی بەوە خۆش دەکرد کە ڤرۆنسکی پیاویّکی بەشەڕەفە و ئەم گومان و دلّپیسییەی ناویّ. هەروەها دەیزانی کە ئەو ئازادی و پیّکەوە رابواردنەی ئەمڕۆی کچان و کوڕان دەبیّتە هۆی ئەوەی بە ئاسانی شەیدای یەك بن و تووشی هەلّە و خلیسکانیش بن. حەوتووی رابردوو کیتی وتەکانی خۆی و ڤرۆنسکیی لە کاتی سەمای مازورکادا بۆ دایکی گیّڕابۆوە. ئەم وتوویّژە تا رادەیەك پرێنسسی دلّنیاکردبوو. ڤرۆنسکی پیّی گوتبوو ئەو و براکەی وایان عادەت گرتووە، کە لە هەموو کاریّکدا بە مەیلی دایکیان

بجووڵێنەوە و بەبێ ئیزنی ئەو قامك بە ئاودا نەکەن. هەرەها گوتبووشی: «ئێستاش زۆر بە تامەزرۆییەوە چاوەڕوانی دایە گیانم لە پترزبۆرگەوە بێ.»

کیتی ئەم وتەیەی زۆر بە کەمتەرخەمییەوە و بێ ئەوەی گرنگیی پێبدات بۆ دایکی گێڕابۆوە، بەڵام دایکی شتێکی تری لەو قسەیە هەڵکڕاندبوو. ئەو دەیزانی کە دایکی ڤرۆنسکی لەم رۆژانەدا دێت و بە خاترجەمییەوە خۆشحاڵی و رەزایەتیی خۆی دەردەبڕێ بۆ ئەو هەڵبژاردنەی کوڕەکەی، هەروەها پێشی سەیر بوو کە ڤرۆنسکی لە ترسی زویربوونی دایکی، خۆی لەو خوازبێنییە بواردووە. بەڵام هێندە تامەزرۆی ئەو ژیانە هاوبەشەی کیتی و ڤرۆنسکی بوو، لە لایەکی تریشەوە ئەوەندە خوازیاری ئارخەیانی و نەجات بوون لە دڵەدواییی بوو، بۆیە باوەڕی بەم واتایە کرد. ئەگەرچی دیتنی کچە گەورەکەی واتە دالی، کە دەیویست تەڵاق لە مێردەکەی وەرگرێ، بۆ پرێنسس زۆر ناخۆش و بەژان بوو، بەڵام دڵەخورپەیەك کە بۆ کچە چکۆلەکەی و یەکلابوونەوەی کارەکەی دایگرتبوو، هەموو شتێکی لەبیربردبۆوە. ئەمڕۆش لەڤین بەو هاتنە کتوپڕەی خەم و دڵتەنگییەکی دیکەی بۆ زیادکردبوو. لەوە دەترسا کچەکەی کە ماوەیەك دڵی بە لەڤینەوە بووە، بە هۆی دڵسافی و گەورەییەوە لە رووی لەڤین دابمێنێ و دەست بە رووی ڤرۆنسکییەوە بنێ. بە گشتی لەوە دەترسا ئێستا کە کارەکەیان خەریکبوو لە یەکلابوونەوە و ئاکامێکی پیرۆز نزیك دەبۆوە، لەڤین بەو هاتنە ناوەختە لێیان تێکبدا و ریسەکەیان لێ بکاتەوە بە خوری.

کاتێك گەیشتنەوە ماڵێ، پرێنسس سەبارەت بە لەڤین پرسیاری لە کیتی کرد: کیتی! دا پێم بڵێ بزانم ئەوە لە کەنگێوە هاتووە؟

ـ هەر ئەمڕۆ هاتووە، دایە گیان!

پرێنسس گوتی: من دەمهەوێ تەنیا شتێکت پێ بڵێم... ـ کیتی کە دیتی دایکی ئاوا رەنگی تێکچووە، تێگەیشت دەیهەوێ باسی چی بکات، بۆیە سوورهەڵگەڕا و زۆر بە توندی لە دایکی چووە پێشێ و گوتی: دایە گیان، تکات لێدەکەم، تکات لێدەکەم باسی ئەوەم بۆ مەکە، خۆم دەزانم، هەموو شتێك دەزانم.

کیتی خۆشی هەر ئەوەی دەویست کە دایکی پێی خۆش بوو، بەڵام ئەو ویست و دڕدۆنگییانەی دایکی ئازاری دەدا و پێی وەڕەز بوو.

ـ من تەنیا دەمهەوێ بڵێم ئەگەر کەسێك بە هیوا بکەی...

ـ دایە گیان، لە دەورت گەڕێم، تۆخودا هیچم پێ مەڵێ، نامەوێ لەو بابەتەوە گوێم لە هیچ قسەیەك بێ، چونکە زۆر تاڵە و ئازارم دەدا...

دایکی کە دیتی فرمێسك لە چاوی کچەکەیدا قەتیس ماوە، گوتی: باشە کچم، هیچ ناڵێم. قسەناکەم، تەنیا شتێك، کچە شیرینەکەم تو بەڵێنیت بە من دابوو هیچم لێ نەشارییەوە، خۆ لە سەر بەڵێنییەکەی خۆت ماوی؟

کیتی چاوی لە دایکی بڕی، سوورهەڵگەڕا و وەڵامی دایەوە: بەڵێ دایە گیان، دڵنیا بە هیچ شتێکت لێ ناشارمەوە! بەڵام ئێستا هیچ قسەیەکم نییە پێتی بڵێم. من... من... ئەگەر ویستباشم.. نەمدەزانی بڵێم چی... چۆنی بدرکێنم... هیچ نازانم...

دایکی بە دیتنی نەشە و هەیەجانی کچەکەی زەردەیەکی گرت و لە دڵی خۆیدا گوتی: «نا، ئەو چاوانەت درۆناکەن.» بزەکەی پرێنسس بۆ ئەوە بوو، کە ئەوەی لە رۆحی کچە ساویلکەکەیدا دێت و دەچێ، بە شتێکی گەورە و گرینگی دەزانی.

## سێزدە

کیتی لە دوای فراوێن هەتا دەستپێکردنی میوانداری هەستێك لە دڵیدا بوو وەکوو هەستی لاوێك دەچوو کە بەرەو شەڕ و ململانێیەکی پڕمەترسی دەچێ. تووشی دڵەوڕێزەیەکی قورس بووبوو و ئاڵۆز و سەرلێشێواو دەهات و دەچوو و حەجمانی نەبوو.

هەستی دەکرد کە شەوێ، کاتێك بۆ یەکەم جار پێکەوە بەرەوڕوو دەبن، دەبێ کاریگەرییەکی تەواو لە سەر چارەنووسی دانێ. دەبوو بەردەوام ئەو دووانە، یانی لەڤین و ڤرۆنسکی هێندێ جار پێکەوە و هێندێ جاریش بە جیا جیا بێنێتە بەر چاوی خۆی. کاتێك کە بە رابردوودا دەهاتەوە و دەگەیشتە ئەو بیرەوەرییانەی خۆی و لەڤین، بە عەشق و چێژەوە رادەوەستا. دەکەوتەوە بیری سەردەمی منداڵی و یادی ئەو دەمانەی کە لەڤین لەگەڵ براکەی هەڤاڵ بوو و پێوەندیی لەگەڵ ئەو چێژێکی شاعیرانەی پێ دەبەخشی. دەیزانی لەڤین زۆری خۆشدەوێ و شك و گومانی لەوە نەبوو، بۆیە شادی و غوروور سەرتاپای دادەگرت. بیرەوەرییەکانی لەڤین زۆر شیرین بوون بە لایەوە، بەڵام بیرەوەریی لەگەڵ ڤرۆنسکی بە پێچەوانەی ئەو تووشی خەم و کۆڤانی دەکرد، ئەگەرچی ڤرۆنسکی زۆر مەجلیس خۆش و لە دڵەوە نزیکبوو. لەوە دەچوو کە شتێکی درۆیین، نەك لە کردەوە و هەڵسوکەوتی ڤرۆنسکیدا کە مرۆڤێکی رووخۆش و مێهرەبان بوو، بەڵکوو لە ناخی خویدا شەپۆلی دەدا. کەچی کاتێك

لەگەڵ لەڤین دەدوا، زۆر سەرودڵخۆش دەبوو و رووناکی و شادی لە دڵی دەگەڕا. بەڵام کاتێك بیری لە داهاتووی خۆی لەگەڵ ڤرۆنسکی دەکردەوە خۆی لە ژیانێکی پڕشنگدار و شیریندا دەدی، کەچی لەگەڵ لەڤین ئەو داهاتووەی تاریك و سارد دەهاتە بەرچاو.

کاتێك رۆیشت بۆ ژوورەکەی خۆی لە نهۆمی سەرێ تاکوو خۆی بڕازێنێتەوە، چاوێکی لە ئاوێنەکە کرد و بە شادی و نەشەوە بۆی دەرکەوت، کە ئەو شەوە یەکێك لە خۆشترین شەوانی ژیانیەتی. بۆی دەرکەوت کە تەواوی وزە رۆحییەکانی خۆی لە ئیختیاردایە و ئەو حاڵەش بۆ بەرەوڕووبوون لەگەڵ چاوەڕوانییەکانی زۆر پێویست بوو. بۆی دەرکەوت هێمنایەتیی رواڵەت و جوانی و نەرمونیانی هەمووی لە وجوودیدا کۆ بوونەتەوە.

سەعات حەوت و نیو، هەرکە هاتە خوارێ و رۆیشت بۆ هۆڵی میوانداری، پێشخزمەت بە دەنگێکی بەرز هاتنی لەڤینی راگەیاند. «کۆنستانتین دیمیتریچ لەڤین». پرێنسس هێشتا لە ژوورەکەی خۆی بوو و مێردەکەشی بەم زووانە نەدەهاتەدەرێ. کیتی لە دڵی خۆیدا گوتی «دەمزانی» لەپڕ دڵی وەکوتەکوت کەوت. کە سەری هەڵبڕی و لە ئاوێنەکەدا لە خۆی روانی و رەنگی هەڵبزڕکاوی خۆی دی ترسی لێ نیشت.

دڵنیا بوو کە لەڤین بۆیە زووتر هاتووە تاکوو ئەو بە تەنیا ببینێ و داوای لێ بکات ژیانی هاوبەشی لەگەڵ پێك بێنێ. ئەو کاتە بوو کە بۆ یەکەم جار مەسەلەکە بە شێوەیەکی نوێ و نەك وەك هەمیشە لە بەرچاوی زەقبۆوە. هەر ئەو کاتەش بۆی دەرکەوت کە مەسەلەکە تەنیا پێوەندیی بە ئەوەوە نییە. مەسەلەکەش تەنیا ئەوە نییە کە لەگەڵ کامیان بەختەوەردەبێ و کامیانی خۆشدەوێ، بەڵکوو ناچاربوو ئەو کەسەی کە خۆشی دەوێ ئازاری بدات و زۆر دڵڕەقانەش ئازاری بدات. بۆچی؟ تاوانی لەڤین، ئەو خۆشەویستییە چییە؟ هەر بۆیەشە خوشیدەوێ و ئاوا دڵی پێداوە. بەڵام ناچاربوو، دەبوو ئەو کارە بکات کە پێویستە بیکات.

لەبەرخۆیەوە گوتی: «خودایە گیان، یانی دەبێ خۆم ئەو هەواڵە تاڵەی بدەمێ؟ ئاخر چیی پێ بڵێم؟ یانی بەڕاستی دەبێ پێی بڵێم خۆشم ناوێ؟ خۆ ئەوە راست نییە! پێی بڵێم پیاوێکی دیکەم خۆشدەوێ؟ ئەوە مەحاڵە. دەڕۆم، هەڵدێم و خۆم دەربازدەکەم.»

لە دەرگاکە نزیکبووبۆوە. کە ترپەی پێی لەڤینی بیست، لە دڵی خۆیدا گوتی: «نا، ئەوە کارێکی ناڕەوایە. ترسی بۆ چییە؟ خۆ کارێکی خراپم نەکردووە. هەرچی دەبێ با ببێ. راستییەکەی پێدەڵێم. خەجاڵەتیش ناکێشم.» بەڵام کە قەڵافەتی تێکسمڕاو و روخساری شەرمنی لەڤینی دی، کە تێی رامابوو و دەدرەوشایەوە لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئاخ، چاوی

لێبکە، هات.» ڕاست چاوی لە چاوی بڕی وەك ئەوەی لە بەری بپاڕێتەوە کە ڕوحمی پێبکات. پاشان دەستی گوشی.

لەڤین چاوێکی لە هۆڵە خاڵییەکە کرد و گوتی: وا دیارە زۆر زوو هاتووم ـ کاتێك دیتی بە ئارەزووی خۆی گەیشتووە و هیچ شتێك بەرهەڵستی نییە کە قسەی دڵی بکات، خەفەت دایگرت.

کیتی گوتی: نا، بە خێر بێی، زوو نەهاتووی! ـ پاشان خۆی لە پشت مێزەکە دانیشت.

لەڤین گوتی: من هەر ئەوەم دەویست، پێم خۆشبوو بە تەنیا چاوم پێت بکەوێ ـ پاشان دانیشت، چاویشی لە چاوی نەکرد، نەوەك ورە بەردا و خۆی بدۆڕێنێ.

کیتی گوتی: دایە گیانم هەرئێستا دێ، دوێشەو زۆر ماندووبوو. دوێشەو... ـ بێ ئەوەی خۆی بزانێ چ وشەگەلێك لە زاری هەڵدەفڕن چاوی پڕ لە داوا و لێوڕێژ لە خۆشەویستیی تێبڕی.

لەڤین چاوێکی لە چاوی کرد، کیتی سوورهەڵگەڕا و بێدەنگ بوو.

ـ پێمگوتن کە نازانم ماوەیەکی زۆر لێرە دەمێنمەوە یان نا... ئەوەش پێوەندیی بە ئێوەوەیە...

کیتی جار لەگەڵ جار زیاتر سەری دادەخست و نەیدەزانی وەڵامی ئەو قسانەی ئێستا چۆن بداتەوە.

دووپاتی کردەوە: ئەوە پێوەندیی بە ئێوەوەیە. دەمویست بڵێم کە... بۆ ئەوە هاتووم... کە... ـ بێ ئەوەی بزانێ دەڵێ چی، درێژەی بە قسەکانی دا: کە شووم پێبکەی... ـ بەڵام هەستی کرد ئەوەی وتنەکەی بە لایەوە زۆر دژوار بوو ئاخری درکاندی. بۆیە بێدەنگ بوو و چاوی تێبڕی.

کیتی چاوی لێنەدەکرد. هەناسەی سوار بووبوو. لە ناخیدا هەستی بە شەپۆل و هەڵچوونێکی زۆر دەکرد. ڕۆحی لێوڕێژ بوو لە شادی و نەشە. قەت چاوەڕوانی ئەوە نەبوو ئەو قسانەی لەڤین و دەربڕینی عەشقەکەی ئاوا بە قووڵی شوێنی لە سەر دانێ. بەڵام ئەو حاڵە چەن چرکەیەکی خایاند و لە پڕ ڤرۆنسکیی وەبیرهاتەوە. چاوی گەش و ڕاستوێژی خۆی ڕاست لە چاوی بڕی و کە تۆزی ناهومێدیی بە ئەدگارییەوە بینی خێرا وەڵامی دایەوە: بەڵام ئەوە مەحاڵە... ببوورە...

خولەکێك لەمەوبەر کیتی چەندەی لێ نزیکبوو و چەندە گرینگ بوو لە ژیانیدا، بەڵام ئێستا چەندە دوور و پێی نامۆ بوو!

بێ ئەوەی چاو لە چاوی بکات گوتی: ئەی دەبوو چ بکەم کە مەحاڵ نەبێ؟

کڕنۆشێکی کرد و هەستا بڕوا.

# چاردە

بەڵام هەر لەو کاتەدا پرێنسس لە ژوورەکەی خۆی هاتەدەرێ. کاتێك ئەوانی بەو شێوەیە شڵەژاو و رەنگبزڕکاو پێکەوە دی، تەمی ترس روخساری تەنی. لەڤین کرنۆشێکی بۆ کرد و هیچی نەگوت. کیتیش بێ ئەوەی سەری هەڵێنێ، بێدەنگ راوەستا. دایکی لە دڵی خۆیدا گوتی: «خودایە زۆر شوکر، وا دیارە داخوازییەکەی رەتکردۆتەوە!» روخساری بە بزەیەك کرایەوە، کە رۆژانی پێنجشەممە عادەتی پێگرتبوو ئاراستەی میوانەکانی بکات. دانیشت و سەبارەت بە ژیانی گوند دەستی کرد بە پرس و جۆ. لەڤین چاوەڕوان دانیشت تاکوو میوانەکان بێن و لە کاتی قەرەباڵغی هۆڵەکەدا فیزماڵکێك لێدا و خۆی بدزێتەوە.

پێنج خولەك دواتر دەستەخوشکێکی کیتی، کۆنتس نۆردستۆن[٤٥] کە زستانی رابردوو شووی کردبوو هاتەژوورێ.

ژنێکی زۆر بەلەباریکە و جینگزی و زەردەڵ بوو، بەڵام چاوی رەش و گەش بوون. ئەو ژنە زۆری کیتی خۆشدەویست و خۆشەویستییەکەشی بۆ ئەو وەك هەموو ژنێکی خاوەن ماڵ و مێرد، کە بە چاوی مشتەری لە کچان دەڕوانن و دەیانهەوێ مێردیان بۆ بدۆزنەوە وا بوو. ئەویش بە پێی ئەو ئامانجەی کە هەیبوو خۆی رادەنا و حەزی دەکرد کیتی شوو بە ڤرۆنسکی بکات. ئەو ژنە زۆری رق لە لەڤین بوو و سەرەتای زستان، کە دەیدی هاموشۆی ماڵی ئیشچر باتسکی دەکات زۆری پێ ناخۆش بوو. هەرکاتێکیش دەیدی، بە شێوەیەك گاڵتەی پێدەکرد و دەیبوغزاند، لەو کارەشی چێژی وەردەگرت.

کە پاشملەش باسی دەکرد و دەیگوت: کاتێك لە لووتکەی شاخی خۆبینی و گەورەییەوە بە چاوی پڕ سووکایەتی لە من دەڕوانێ، یان کاتێك دەگاتە حاندم، قسە قەڵەمییەکانی کورت دەکاتەوە یانی ها من سایلۆحم و تێناگەم، یان ئەو کاتانەی دەرهەق بە من لێبوردەیی نیشان دەدا و چاوپۆشی لە سووکایەتی پێکردنەکانم دەکات، زۆرم پێخۆشە. بەتایبەت لێبوردووییەکەیم پێخۆشە. کاتێك دەیبینم و دەزانم کە چاوی بەرایی نادا من ببینێ، لەوانەیە لە خۆشیانا شاگەشکە بم.

---

45- Nordston

ئەو ژنە هەقی بوو، چونکە لەڤین بەڕاستی چاوی بەرایی نەدەدا ببینیێ و ئەوی بەو هۆیە خۆشنەدەویست و بە چاوی سووك تەماشای دەکرد، چونکە زۆر بە خۆی دەنازی و بە کردەوەی قۆڕەدەماخانە و ناز و نووز و گوێلینج بوون سەبارەت بە کاروباری ژیان دەیویست دەوروبەرەکانی ببوغزێنیێ.

پێوەندییەك لە نێوان نۆردستۆن و لەڤیندا هەبوو، کە لە کۆڕ و کۆبوونەوەی دەوڵەمەنداندا زۆر دەبیندرێ و جاری وایە دوو کەس پێکەوە بەڕواڵەت هێندێك پێوەندیی دۆستانەیان پێکەوە هەیە، بەڵام یەکتر وا بە سووك دەزانن کە تەنانەت ناتوانن بە شێوەیەکی بنەوەشی لەگەڵ یەك بەرەوڕوو بن و یەکتر بە شیاوی ئەوەش نازانن، کە زویربن و دەنگ داگۆڕن.

کۆنتس نۆردستۆن هەر لەگەڵ چاوی بە لەڤین کەوت گورج رۆیشت بۆ لای و دەستی گچکە و زەردەڵی بۆ تۆقە کردن بردە پێشیێ و گوتی: ئاخ کۆنستانتین دیمیتریچ، دیسان گەڕایەوە بۆ ئەم ***بابلە*** پڕ لە گەندەڵییەی ئێمە؟ ـ ئەوەش ئاماژەیەك بوو بە قسەی لەڤین کە سەرەتای زستان گوتبووی مۆسکۆ دەڵێی ***بابلە***" ئەوەی گوت و بە پێکەنینێکی مانادارەوە چاوی لە کیتی کرد و درێژەی بە قسەکانی دا: ئێستا پێتوایە ***بابل*** چاکسازیی بۆ کراوە یان تۆ رووخاوی؟

لەڤین کە بەو دەرفەتە کورتە پشووی هاتبۆوە بەر خۆی و هێوربووبۆوە، خێرا بە پێی عادەت لەبزی تووڕە و تێکەڵ بە گاڵتەی خۆی خستە کار و لەگەڵ کۆنتس هەر بەو شێوەیە دەدوا، بە روانینێکی سووکایەتی ئامێزەوە گوتی: کۆنتس بۆ من جێی شانازییە، کە ئاوا قسەکانم لە دڵت چەقیوە. وا دیارە چاکی کار تێکردووی.

ـ هەڵبەت من هەمووی یادداشت دەکەم. دەی کیتی، ئەمڕۆ چوون بۆ خلیسکێن؟

لەگەڵ کیتی کەوتە قسە. ئەگەرچی لەو کاتەدا رۆیشتنە دەرێ لە تەلارەکە جوان نەبوو، بەڵام لەڤین بە باشی دەزانی ئەو کارە نەشیاوە بکات. ئەو شەوەش بەردەوام خۆی لە هەمبەر کیتیدا دەدی و هێندێ جار چاوی لێ دەکرد، بەڵام ئەو دەیویست خۆی لە چاوی کچە بدزێتەوە. دەیویست هەرچۆنێکە هەستێ و بڕوا، بەڵام پرێنسس کە دیتی بێدەنگ دانیشتووە رووی تێکرد و گوتی:

ـ ئێوە ئەمجارە پێموایە خەیاڵتان هەیە ماوەیەکی زۆر لە مۆسکۆ بمێننەوە، وا نییە؟ ئەگەرچی ئەندامی زێمستڤای و لەوە ناچێ بتوانی دوور لە گوندەکەتان بی.

لەڤین گوتی: نەخێر، پرێنسس، من ئیتر ئەندامی شۆڕا نیم. تەنیا دوو سێ رۆژیش لێرە دەمێنمەوە.

کۆنتس نۆردستۆن چاوێکی لە روخساری گرژ و تووڕەی لەڤین کرد و لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەمرۆ خولقوخووی ئاسایی نییە. بۆ دڵی پێوە نییە وەك هەمیشە نەقڵ و نەزیلە بێنێتەوە و سواری قسەی خۆی بێ؟ بەڵام من هەرچۆنێك بێ وەقسەی دێنم. زۆرم پێ خۆشە لە بەرچاوی کیتی سەر بخەمە سەری و بیتەزێنم. حەتمەن ئەو کارە دەکەم.»

ڕووی تێکرد و گوتی: کۆنستانتین دیمیتریچ، ئێوە کە بۆ ئەو جۆرە مەسەلانە شارەزان، تکایە تێمگەیێنن ئەوە یانی چی... لە گوندەکەی ئێمە لە پارێزگای کالۆگا، لادێیەکان و ژنەکانیان هەرچی بوویانە داویانە بە ئارەق و شەڕاب و ئێستا تووکی سەریشیان قەرزە و نایدەنەوە، ئێوە کە هەمیشە لایەنگری لەو رەعیەتانە دەکەن، پێم بڵێن ئەوە یانی چی؟

لەو کاتەدا خاتوونێکی تر هاتە نێو کۆڕەکەوە، لەڤین لە بەری هەستا و گوتی: ببوورن کۆنتس، راستت دەوێ من لەو بارەوە هیچ ئاگادارییەکم نییە و ناتوانم بۆتانی روون بکەمەوە ـ ئەوەی گوت و رووی وەرگێڕا بۆ لای ئەفسەرێك، کە بە دوای خاتوونێکدا دەهاتەژووریَ و چاوی تێبڕی.

لە دڵی خۆیدا گوتی «ئەوە دەبێ ڤرۆنسکی بێ» بۆ ئەوەی دڵنیا بێ ئەوە یان نا، چاوێکی لە چاوی کیتی کرد. کیتی لەو دەرفەتە کورتەدا هەلی بۆ هەڵکەوت کە چاوێك لە ڤرۆنسکی بکات و هەرخێراش سەری بۆ لای لەڤین وەرسووڕاند و چاوی لێکرد. بەڵام لەڤین هەر بەو روانینە بێ ئیختیارەدا بۆی دەرکەوت کە ئەو پیاوەی کیتی بە دڵێتی هەر ئەوەیە. بەو کورتە نیگایە وا بە یەقین گەیشت کە دەتگوت کیتی خۆی لە لای ئەو ددانی پیا ناوە. بەڵام ئەو ئەفسەرە لاوە کێ بوو؟

ئێستا چاك یان خراپ، بە قەولی کوردی تاڵی بێ و خۆشی بێ، لەڤین نەیدتوانی لە کۆڕەکە بڕواتە دەرێ. دەیویست بزانێ ئەو پیاوەی کە دڵی کیتیی خستۆتە داوی خۆی کێیە و چ جۆرە مرۆڤێکە.

هێندێ کەس هەن لە کاتی ململانێدا کە دەبینن رەقیب لە خۆیان ئازاترە بە سووك و ئاسانی چاوپۆشی لە هەموو چاکەکارییەکانی دەکەن و تەنیا خراپەکانی دەبینن، بەڵام هێندێ کەسیش هەن کە بە پێچەوانە بەر لە هەموو شتێك دەیانەوێ لە وجوودی رەقیبەکەیاندا تایبەتمەندییەك بدۆزنەوە کە بۆتە هۆی ئەوەی بە سەریاندا زاڵ بێ، بۆیە بە دڵێکی کەیلی ئازارەوە لە چاکە زیاتر هیچی دیکەی پێوە نابینن. لەڤین لەو جۆرە کەسانە بوو. بەڵام دۆزینەوەی تایبەتمەندیی چاك و دڵڕفێن لە وجوودی ڤرۆنسکیدا زۆر دژوار نەبوو بە لایەوە، چونکە تایبەتمەندییەکەی زۆر ئاشکرا و بەرچاو بوو. ڤرۆنسکی لاوێکی دەستە و گورجوگۆڵ و توندوتۆڵ بوو، چاو و برۆ و قژی رەش و ئەدگاری

جوان و هێدی و خۆڕاگر، ئەوانەش هەمووی نیشاندەری ئاکار جوانی و خووخدە پاکی بوو. سەرتاپای جوان بوو، هەر لە روخسار و قەڵافەتییەوە بگرە هەتا دەگاتە قژە رەشە کورتەوە کراوەکەی و ریشی تیفتیفەدراو و یۆنیفۆرمی فشوفۆڵ و نوێی، هەموو شتێکی لەگەڵ ئەوەی سادە و ساکار بوو رازاوە و شیاویش بوو.

ڕێگای بۆ خاتوونەکەی هاوڕێی کردەوە، کە لە پێشییەوە بێتە ژووری و یەکسەر رۆیشت بۆ لای پرێنس و پاشان چوو بۆ لای کیتی.

کاتێك گەیشتە نزیکی کیتی، بریقەی خۆشەویستییەك لە چاوە جوانەکانیدا درەوشایەوە و بە بزەیەکی کامڕەوا و پڕ لە هەستەوە ـ کە لەڤین سەرکەوتنێکی پڕ لە خاکەڕاییی پێوە دەدی ـ بە رێز و پارێزێکی زۆرەوە لە بەردەمی داهاتەوە و دەستە چکۆلە و پانکەڵەکانی بۆ تەوقەکردن بردە پێشێ.

دوای ئەوەی لەگەڵ دەوروبەرییەکان چاکوخۆشیی کرد، بێ ئەوەی چاو لە لەڤین بکات، کە چاوی تێبڕیبوو دانیشت.

پرێنسس گوتی: ئیزن بفەرموون با بە یەکترتان بناسێنم ـ پاشان ئاماژەی بە لەڤین کرد و گوتی: کۆنستانتین دیمیتریچ لەڤین، کۆنت ئەلکسی کیریلویچ ڤرۆنسکی.

ڤرۆنسکی هەستا سەر پێ و دۆستانە چاوی لە چاوی لەڤین کرد و دەستی لەگەڵ لێکدایەوە و بە بزەیەکی ساکار و سادقانەوە گوتی: پێم وا بڕیار وا بوو سەرەتای زستان بۆ شێوێك لە خزمەت ئێوەدا بم. بەڵام ئێوە بێ هەواڵ و لە ناکاو رۆیشتنەوە بۆ دێ.

کۆنتس نۆردستۆن گوتی: کۆنستانتین دیمیتریچ لە شار و لە ئێمەی شارنشین بێزارە و بە چاوی سووك لێمان دەڕوانێ.

لەڤین گوتی: وا دیارە وتەکانی من چاکی شوێن لە سەر ئێوە داناوە، کە ئاوا لە داڵغەتدا ماوە ـ کە وەبیریشی هاتەوە پێشتریش ئەو قسەیەی کردووە، سوورهەڵگەڕا.

ڤرۆنسکی چاوێکی لە لەڤین و کۆنتس نۆردستۆن کرد و گرژییەوە.

پرسیی: ئێوە هەمیشە هەر لە دێ دەمێننەوە؟ زستانانە لە دێ وەڕەز نابن؟

لەڤین بە توندی وەڵامی دایەوە: ئەگەر پیاو بێکار نەبێ قەت وەڕەزنابێ. جگە لەوەش پیاو لە خەڵوەتدا لەگەڵ خۆی بۆ وەڕەزدەبێ؟

ڤرۆنسکی لە لەبزە توندەکەی لەڤین گەیشت، بەڵام لەگەڵ ئەوەی خۆی لێ گێل کرد گوتی: من ژیانی لادێم زۆر پێخۆشە.

کۆنتس نۆردستۆن گوتی: بەڵام هیوادارم رازی نەبن، کە بۆ هەمیشە لە دێ بمێننەوە.

ـ نازانم، قەتم ئەو کارە بۆ ماوەیەکی درێژخایەن تاقی نەکردۆتەوە، لە گوند هەستێکی سەیرم هەیە. قەت بە قەد ئەو زستانەی لەگەڵ دایکم لە گوندی نیس گوزەراندم، دڵم بۆ گوندەکانی رووسیا و گوندنشینە کاڵە لە پێکانی تەنگ نەبووە. زۆرم بیرکردوون. دەزانی نیس زۆر زوو پیاوی لێ وەڕەز بێ. بەڵام ناپل و سۆرنتۆ لانیکەم دەتوانی ماوەیەکی کورت لێیان بمێنییەوە. لەوێش پیاو هەر بیری رووسیا دەکات، ئەویش گوندەکانی رووسیا وەك ئەوە وایە...

ڕووی دەمی لە کیتی و لەڤین بوو، بەڵام جاروبار چاوی بەو کەسانەی دیکەشدا دەگێڕا و ئەوەی بە زەینیدا دەهات لە دەرووی زمانییەوە هەڵیدەفڕاند.

کە دیتی کۆنتس نۆردستۆن دەیهەوێ شتێك بڵێ قسەکەی خۆی ناتەواو هێشتەوە و بە وردی گوێی بۆ راگرت.

دەمەتەقێکە بۆ چرکەیەك نەخەوت، ئەگەرچی پرێنسی گەورە بۆ ئەو کاتانەی کۆڕەکەی خەریکە دەشێوێ، دوو چەکی قورسی ئامادە پێبوو ـ کە یەکیان هەڵسەنگاندنی بەرنامەی کۆن و نوێی فێرکاری و ئەوی دیکەیان خزمەتی سەربازی بوو ـ بە پێویستی نەزانی هیچ کامیان بخاتە سەر پێ" کۆنتس نۆردستۆن هەلی بۆ نەڕەخسا لەگەڵ لەڤین تێوە بچێت.

لەڤین دەیویست لەو دەمەتەقێ گشتییەدا بەشداری بکات، بەڵام دەرفەتی بۆ هەڵنەدەکەوت و لە پەستا لەبەرخۆیەوە دەیگوت: «ئیتر بڕۆم باشە.»، بەڵام نەدەڕۆیشت و چاوەڕوانی شتێك بوو.

باس هاتە سەر ئەڕواح و کورسیی خولۆك، کۆنتس نۆردستۆن، کە زۆری باوەڕ بە بانگکردنی ئەڕواح هەبوو باسی شتی زۆر سەیری دەکرد و بە سوێندانەوە رەشوشین دەبۆوە، کە بە چاوی خۆی دیویەتی.

ڤرۆنسکی بە پێکەنینەوە گوتی: خاتوو کۆنتس، تۆ ئەو خودایە بمبە بۆ لایان. من وڵات بە دوای ئەو جۆرە کەسانەدا گەڕاوم و هیچ کات شتێکی نائاساییم نەدیوە.

کۆنتس نۆردستۆن گوتی: زۆر چاکە، شەممەی داهاتوو ـ پاشان رووی لە لەڤین کرد و پرسیی: ئەی ئێوە، کۆنستانتین دیمیتریچ، باوەڕتان بە ئەڕواح هەیە؟

ـ خۆت وەڵامەکەی من باش دەزانی، ئیتر بۆ پرسیار دەکەی؟

ـ بیستنەکەی شتێکی ترە.

لەڤین وەڵامی دایەوە: بە بڕوای من مەسەلەی ئەو کورسییە خولۆکانە دیاردەکەی ئەوەیە، کە کۆمەڵگای بە ناو خوێندەواری ئێمە زۆر لە گوندنشینەکان خاوەن ژیارتر نین. لادێییەکان باوەڕیان بە چاو و تەلەسم و جادوو هەیە و ئێمە...

ـ یانی چی؟ بۆ ناکات تۆ بڕوات پێی نەبێ؟
ـ قەت ناتوانم بڕوام بە شتی وا بێ کۆنتس.
ـ بەڵام من بە چاوی خۆم دیومە...
ـ ژنانی لادێییش دەڵێن «داماوی[٤٦]»یان بە چاوی خۆیان دیوە.
ـ کە وایە دەڵێی من درۆدەکەم؟ ـ بە رقەوە پێکەنی.

کیتی بەو قسەی لەڤین سوورهەڵگەڕا و بە شەرمەزارییەوە گوتی: نا، ماشا، مەبەستی کۆنستانتین دیمیتریچ ئەوەیە کە ناتوانێ بڕوای بەو شتانە بێ ـ لەڤینیش لەو مانایە گەیشت و رەنگی تێکچوو، شینگڵی لە خۆی دا وەڵام بداتەوە، بەڵام ڤرۆنسکی بە پێکەنینێکی شیرینەوە پەڕییە نێوانیان و رەنگێکی تری بە مشتومڕەکە دا، کە خەریکبوو قڕەی لێ هەڵدابیسا، پرسیی: تەنانەت ئێوە وەك گریمانەش قەبووڵتان نییە؟ کە وایە چۆن بوونی وزەی کارەباتان قەبووڵە، کە هێشتا ئەویش ناناسین؟ بۆ نابێ بوونی وزەیەکی نوێ قەبووڵ کەین کە هێشتا نەماننناسیوە. وزەیەك کە...

لەڤین بە توندی قسەکەی پێ بڕی و وەڵامی دایەوە: کاتێك وزەی کارەبا دۆزرایەوە، سەرەتا دیاردەکەیان کەشف کرد و هەتا ماوەیەکی زۆر بنۆس و کاریگەرییەکەی نەناسرابوو، سەدان ساڵی خایاند هەتا بە بیریاندا هات کەڵکی لێ وەرگرن. بەڵام ئەوانەی باوەڕیان بە بانگکردنی رۆح هەیە، بە پێچەوانە سەرەتا لەو گریمانەیەوە دەستیان پێکرد، کە کورسی شتێکیان بۆ دەنووسێ و ئەرواح لێیان نزیك دەبنەوە، پاشان گوتیان دەبێ وزەیەکی نەناسراو هەبێ.

ڤرۆنسکی بە پێی عادەتی خۆی بە وردی گوێی لە قسەکانی لەڤین دەگرت و دیاربوو قسەکانی پێ خۆشە.

ـ راستە، بەڵام بڕوا بەرۆحان دەڵێن: ئێمە نازانین چ وزەیەك لە کاردایە، بەڵام دەزانین وزەیەك هەیە و لە هەلومەرجێکی تایبەتدا وەگەڕ دەکەوێ. ئێستا ئەرکی بیرمەندانە چییەتیی ئەو وزەیە بدۆزنەوە. نا، من نازانم بۆ ناتوانین بە بوونی وزەیەکی تازە رازی بین، خۆ...

لەڤین دیسان قسەکەی پێبڕی: سەبارەت بە کارەبا، هۆیەکەی ئەوەیە هەر جارێك کە بتهەوێ لەتێك جیوە بە سەر پەڕۆیەکی پەشمینەدا بێنی، دیاردەیەکی ئاشکرا خۆ دەنوێنێ،

---

٤٦- خەڵکی ڕەشۆکی ڕووسیا لە سەر ئەو باوەڕەن کە جندۆکەیەك هەیە سەر بە هەموو ماڵێکدا دەکات و نابێ بیرەنچێنن. ئەگەر ڕێزی لێ بگرن بۆ هەموو ئەندامانی بنەماڵەکە بەکەڵکە.

بەڵام لێرەدا هەرجارەی ڕووداوێکی دیاریکراو دەقەومێ. کەوایە بەو ئاکامە دەگەین، کە لێرەدا دیاردەیەکی سروشتی لەگۆڕێدا نییە.

ڤرۆنسکی وێدەچوو هەستی کردبێ، کە ئەو مشتومڕە بۆ کۆڕێکی میوانی نابێ و خەریکە خراپی لێ هەڵدەستێ، وەڵامی نەدایەوە و بە مەبەستی گۆڕینی باسەکە بە نەشەوە قاقایەکی کێشا، ڕووی لە ئافرەتەکان کرد و گوتی: کۆنتس، وەرن با هەر ئێستا تاقیی بکەینەوە.

بەڵام لەڤین دەیویست بیروڕای خۆی هەتا ئاخر دەربڕێ و درێژەی پێدا: من پێموایە هەوڵی بڕوا بە ڕۆحان بۆ ڕوونکردنەوەی پەرجۆکەیان (ئەویش دیار نییە بە یارمەتیی چ وزەیەکی نوێ) بە هیچ کوێ ناگا. ئەوان بە ڕاشکاوی باسی هەبوونی وزەیەکی ڕۆحی دەکەن و پاشان دەیانهەوێ بە شێوەی ماددی تاقیی بکەنەوە.

هەموو چاوەڕێبوون لەڤین قسەکانی تەواوبکات و خۆشی هەستی بەوە دەکرد.

کۆنتس نۆردستۆن گوتی: بەڵام من پێموایە ئێوە هۆکارێکی باش دەبن. لە وجوودی ئێوەدا شتێك هەیە کە باس لە سەفایەکی تایبەت دەکات.

لەڤین خۆی چەپوچیڕ کردەوە و ویستی شتێك بڵێ، بەڵام سوورهەڵگەڕا و هیچی نەگوت.

ڤرۆنسکی گوتی: تکایە وەرن با هەر ئێستا جووڵانی ئەم کورسییە تاقی بکەینەوە، ئیجازە دەفەرموون پرێنسس؟

ڤرۆنسکی هەستا پێ و بە چاو دەگەڕا بە شوێن کورسییەکی چکۆلەدا.

کیتی هەستا بڕوا کورسییەك بێنێ، کاتێك بە پەنا لەڤیندا تێپەڕی، چاوی لەگەڵ چاوی تێکگیران. کیتی لە ناخی دڵییەوە بەزەیی پێیدا دەهات، بەتایبەت لەبەرئەوەی کە خۆی بووبووە هۆی ئەو کێشەیە. چاوی پێی دەگوت: «ئەگەر دەکرێ ببوورە، دە ببوورە دەی، ئەگەر ببووری جا دەزانی چەندە بەختەوەرم."

چاوی لەڤین پێی دەگوت: «لە هەمووان بێزارم، لە ئێوەش و لە خۆشم." کڵاوەکەی لە سەری داگرت. بەڵام وا دیاربوو چارەنووس ناهێڵێ بڕوات" چونکە کاتێك ویستیان دەوری کورسییەکە بگرن و لەڤین خۆی ئامادەکردبوو بڕوا، پرێنسی گەورە لەولاوە هات و دوای چاکوخۆشی لەگەڵ میوانەکان ڕووی لە لەڤین کرد و بە ڕووخۆشییەوە گوتی: ئەوە لێرەی لەڤین، لەمێژە هاتووی؟ خۆ نەمزانی تۆ لێرەی. زۆر شادم بە بینینت، دڵم ڕوونبۆوە.

پرێنسی گەورە هێندێ جار «تۆ»ی بە لەڤین دەگوت و هێندێ جاریش «ئێوە». دەستومشتاخ و ماچومووچی لەگەڵ کرد و لە قسە گیران. نەیدیبوو ڤرۆنسکی لە بەری هەستاوە و بە تامەزرۆییەوە چاوەڕوانە پرێنس رووی تێبکات.

کیتی هەستی دەکرد کە دوای ئەو چەلەحانێ و مشتومڕەی پێشوو تامڵ کردنی باوکی بۆ لەڤین چەندە ناخۆش و جاڕزکەرە. هەروەها دیتی کە باوکی ئاخری بە ساردوسڕی وەڵامی کڕنۆشەکەی ڤرۆنسکیی دایەوە و دیتیشی کە ڤرۆنسکی چۆن بە رووخۆشی و تامەزرۆییەوە چاو لە باوکی دەکات و هەوڵ دەدا بزانێ بۆچی و بە چ هۆیەك دەبێ کەسێك ئاوای هەڵسوکەوت لەگەڵ بکات و بە نامۆ و نەناسیاوی بزانێ، بۆیە سوورهەڵگەڕا.

کۆنتس نۆردستۆن گوتی: پرێنس، لە کۆنستانتین دیمیتریچ گەڕێ، وەرە دەمانەوێ تاقیکاری ئەنجام بدەین.

پرێنس چاوێکی لە ڤرۆنسکی کرد و بە ئەقڵ زانیی گەڵاڵەی ئەو یارییە ئەو دایڕشتووە، گوتی: تاقیکاریی چی؟ دەتانەوێ کورسییەکە بۆتان هەڵخولێ؟ دەبێ ببوورن میوانانی هێژا، بەڵام من پێموایە پشکیلان زۆر لەوە خۆشترە و لانیکەم مانایەکی هەیە.

ڤرۆنسکی چەند چرکەیەك بە سەرسووڕمانەوە چاوی لە پرێنس بڕی و پاشان بزەیەکی سارد و بە زۆری نیشتە سەر لێوی و لەگەڵ کۆنتس نۆردستۆن دەستی کرد بە قسەکردن سەبارەت بە میوانداریی سەما و هەڵپەڕکێ، کە حەوتووی داهاتوو بەڕێوەدەچوو.

چاوی لە کیتی کرد و گوتی: هیوادارم تۆش بێی.

لەڤین هەرکە پرێنسی گەورە چاوی لێ خافڵ کرد بێ ئەوەی کەس بزانێ فیزماڵکێکی لێدا و لە تەلارەکە رۆیشتە دەرێ. دوایین شتێك کە لەو میوانییەدا شوێنی لە سەر دڵی دانابوو و وەك بیرەوەرییەك لەگەڵ خۆی بردی، روخساری شاد و لێوی بەبزەی کیتی بوو، کە وەڵامی پرسیارێکی ڤرۆنسکیی دەدایەوە.

# پازده

که میوانداریییەکە کۆتایی هات، کیتی قسەکانی خۆی و لەڤینی بۆ دایکی گێڕایەوە، ئەگەرچی دڵی پێی دەسووتا، بەڵام دڵخۆش بوو بەوەی کە کەسێك داوای لێکردووە شووی پێبکات. دڵنیا بوو کە کارێکی خراپ و نەشیاوی نەکردووە. لەگەڵ ئەوەشدا کاتێك لە سەر پێخەفەکەی راکشا هەتا ماوەیەکی زۆر خەوی لێنەدەکەوت. شتێك لە سەر دڵی قورسایی دەکرد و ئاراوقارای لێ هەڵگرتبوو. ئەو خەیاڵە تاڵەش روخساری لەڤین بوو، کە بە نێوچاوانی گرژ و سیمایەکی تووڕە و خەمبارەوە گوێی لە قسەکانی باوکی گرتبوو و زوو زووش چاوی لە ئەو و ڤرۆنسکی دەکرد. بۆیە هێندەی خەمی لەڤین بوو و بەزەیی پێیدا دەهات لە تاوانا چاوی پڕ بوو لە ئاو. بەڵام لە ناکاو هاتەوە بیری، کە لەبەر خاتری کێ دەستی بە رووی ئەوەوە ناوە. ئەدگاری قایم و پیاوانەی ڤرۆنسکی و ئەو هێمنایەتییەی کە نیشاندەری پاکی و حەیای ئەوە و گەشبینییەك کە دەرهەق بە هەموو کەس لە ناخیدایە و بە روونی هێنایە بەرچاوی خۆی، هەروەها ئەوین و خۆشەویستیی ئەو لاوەی دەرهەق بە خۆی هێنایەوە بیر و دیسان شادی لە هەموو دەمارەکانی گیانی گەڕا و بە بزەیەکی شیرین و بەختەوەرانەوە سەری کردە سەر بالیفەکەی. لە دڵی خۆیدا گوتی «سەد مخابن، بەڵام چیم پێدەکرێ؟ خەتای من چییە؟» بەڵام هاوارێك لە ناخییەوە هەڵدەستا و باسی شتێکی تری دەکرد: لەوە پەشیمان بوو، کە لەڤینی شەیدای خۆی کردووە؟ یان ئەوەی کە وەڵامی داخوازییەکەی نەداوەتەوە و دەستی بە رووەوە ناوە؟ خۆشی نەیدەزانی. بەڵام ژاراوی دڕدۆنگی هەموو شیرناییەکانی ژیانی لێ کردبووە ژەقنەمووت. لەگەڵ ئەوەی خەریکبوو خەو پێلووی قورس بکات، گوتی: خودایە روحم پێبکە، خودایە گیان، خودایە یارمەتیم بدە، خودایە گیان.

هەر لەو کاتەدا لە نهۆمی خوارێ و لە ژووره چکۆلەکەی پرێنس کێشە و هەڵڵای باوك و دایکی کیتی لە سەر گوڵەجەرگەکەیان دەستی پێکردبوو، کە ئەو هەرا و کێشەیان ماوەیەك بوو بەردەوام لە نێوانیاندا بوو.

پرێنس دەستی بۆ هەردوو لا رادەوەشاند و خێرا هەردوو ئاتەگی ربدۆشامبرەکەی، کە کەڵپۆسێکی نەرم بوو، لە خۆی دەپێچا و دەیگوڕاند: چیم لێ دەپرسی؟ کەوایە گوێ بگرە! تۆ نە پۆز و دەمارت هەیە نە گەورەیی، خەریکی خۆت سووکدەکەی. تۆ بەو خۆتێهەڵقوتاندنە دزێو و گەوجانەیەت بۆ بە شوودانی ئەو کچە بەستەزمانە دەتهەوێ ئابڕووی بەری و ناوی بزڕێنی.

پرنێسس کە تۆزێکی مابوو دەست بکات بە گریان، گوتی: بەڵام پرێنس، ئاخر بۆ هەر دارەکە لە سەری مندا دەشکێنی، مەگین من چیم کردووە؟

پرێنسس دوای ئەوە قسەی دڵی کچەکەی بیستبوو بە شادی و نەشەوە چووبووە لای مێردەکەی، تاکوو وەك شەوانی تر شەوخۆشی پێبڵێ، ئەگەرچی قەستی ئەوەی نەبوو سەبارەت بە داخوازیی لەڤین و وەڵامی «نا»ی کچەکەی لەگەڵی بدوێ. بە شێوەی کینایە گوتبووی پێمواییە کارمان لەگەڵ ڤرۆنسکی یەکلایی بۆتەوە و ئەگەر دایکی بێت بۆ خوازبێنی، ئیتر هەموو شتێك تەواودەبێ. هەر بەو قسانە پرێنس ئاوری گرت و دەستی کرد بە هەرا و هوریا و جنێودان.

ـ چیتان کردووە؟ بەر لە هەموو شتێك لاوێك فریودەدەن و رێی بۆ دەکەنەوە بێتە ماڵێ و سروشتیشە، کە دەنگۆ دەکەوێتە سەر زمانی خەڵکی مۆسکۆ. ئەگەر دەتانهەوێ بەزم و میوانی وەرێبخەن هەمووان بانگهێشتن بکەن، نەك بگەڕێن و تەنیا لاوەکان گوڵبژێر بکەن. هەرچی لووسکە و دەمڕووتە کۆی دەکەنەوە (پرێنس بە لاوانی مۆسکۆی دەگوت لووسکە و دەمڕووت) یەکجاری پیانۆژەنێکیشتان بهێنایە با شایی و سەما بکەن، نەك وەکوو ئەمشەو زاوا بۆ کچەکەتان داتاشن. هەر بە دیتنی ئەو هەتیوە حاڵم تێکدەچێ و دڵم تێکەڵ دێ. بەڵام چاك بە دەستتانەوە هات ئەو کوڕە بەستەزمانە شێت کەن. ئاخەر لەڤین سەگی وەك ئەو هەتیوە لووسکە و بەرەڵڵایە وایە، کە لە پترزبۆرگەوە هێناوتانە. ئەوانە هەموویان خوێڕی و دەستوپێ سپیلکەن، هەموویان وەك یەك وان و پۆلێ بووکەباخەی نێوهەڵۆڵن و چڵەپووشێك ناهێنن. ئەو خوێڕییە ئەگەر شازادەش بێ کچی من بە هیچی نازانێ و شووی پێناکا.

ـ بەڵام خۆ من هیچم نەکردووە.

پرێنس بە تووڕەیی گوڕاندی: چۆن هیچت نەکردووە!...

پرێنسس قسەکەی پێبڕی: من دەزانم ئەگەر گوێم بە قسەی تۆ بدایە قەتمان ئەو کچە بۆ بە شوو نەدەدرا و ناچار دەبووین بچین لە دێ نیشتەجێ بین.

ـ دەی لەوە چاکتر چیت دەوێ.

ـ نا، سەبرکە بزانم، مەگین من ناردوومە بە دوایدا، لاوێك، لاوێکی زۆر هێژا و نەجیمزادە کچەکەمانی خۆشدەوێ. کچەکەشمان وا دیارە...

ـ بەڵێ وا دیارە... جا ئەگەر بەڕاستی ئاشقی ئەو هەتیوە بووبێ و ئەویش هەر ئەوەندە بیر لە ژن هێنان بکاتەوە، کە من دەیکەمەوە چی؟... بریا کوێر بوایەم و نەمدیبایە... قالەژنانی، هەر لە پەستا ئا، بانگکردنی ئەرواح... ئا، نیس.. ئا، میوانداریی سەما و هەڵپەڕکێ... ـ پرێنس لاسایی ژنەکەی دەکاتەوە و لەگەڵ گوتنی هەر ئایەك بۆ کڕنۆش چۆکی دەنووشتێنێتەوە: ئێستا ئەگەر کاتنکا[47] بەڕاستی دڵی ئەو هەتیوە پیسەی گرتبێ ئێمە بە دەستی خۆمان کچۆڵە بەستەزمانەکەمان بەدبەخت کردووە.

ـ بۆ وا بیردەکەیەوە؟

ـ من وا بیرناکەمەوە، دەزانم. خۆ کوێر نیم، خو منیش وەك ئێوە ژنان، ئەقڵم لە کۆشمدا نییە... من پیاوێکی وەك لەڤین کە بەڕاستی قەستی ژنهێنانی هەیە لەگەڵ بووکە باخەیەکی خۆخەملاندووی وەك ئەو لووسکەی بەرەڵڵایە لێك دەکەمەوە، کە تەنیا لە بەزم و رابواردن دەگەڕێ.

ـ دەی کاتێك بیرێك لە مێشکتدا گوورا، ئیتر...

ـ دەی ئەو کاتە ئیتر درەنگ بووە و بشزانی کەڵکی نییە، وەکوو داشنکا[48].

پرێنس کە بەو قسەیە وەبیر رۆژە ڕەشییەکانی دالی کەوتەوە، دوایی بە چەلەحانێکەیان هێنا و گوتی: باشە، باشە، با زۆری لە سەر نەڕۆین.

ـ هەرچۆنێکت پێخۆشە وا بکە. شەوخۆش.

خاچی یەکتریان کێشا و باوەشیان بە یەکدا کرد و دەموڕوومەتی یەکیان راموسی. بە هەستێکەوە کە هەردووکیان لە سەر باوەڕی خۆیان سوورن لێکهەڵبڕان.

پرێنسس سەرەتا سوور دەیزانی کە ئەو شەوە چارەنووسی کیتی دیاریکراوە و قەستی ڤرۆنسکی زۆر جیددییە و بۆ گومان و دڕدۆنگی نابێ. بەڵام ئەو قسانەی مێردەکەی پەرۆش و خەمباری کرد. کە گەڕایەوە بۆ ژوورەکەی خۆی، راست ئەویش وەك کیتی لە هەمبەر ترس و گومانی داهاتوودا خۆی دیتەوە و بە دڵەوڕێزەوە چەند جار پاتەی کردەوە: خودایە هاوار، خودایە گیان، خودایە یارمەتیمان بدە.

---

٤٧ - کورتکراوەی ناوی کاترینا بۆ خوشەویستی. "کیتی"ش هەر کورتکراوەی ناوی ئەوە.

٤٨ - کورتکراوەی ناوی داریا، کە "دالی"ش هەر کورتکراوەی ناوی ئەوە.

# شازده

ڤرۆنسکی قەتی ژیانی بنەماڵەیی بە خۆیەوە نەدیبوو. دایکی بە جحێڵی کۆڕ و کۆبوونەوەی دەوڵەمەندانی گەرم دادێنا و کاتێك مێردیشی کرد، دەستی لە حەزلێکردوویی و دڵداری هەڵنەگرت و هێندەی چیرۆکی ئاشقانە خولڤاندبوو، بووبووە بنێشتەخۆشکەی خەڵکی. لە بیریشی نەمابوو باوکی کێیە و لە کوێیە، لە فێرگەی سەربازی و زانکۆی ئەفسەریی تایبەتی نەجیمزادان گەورە بووبوو.

کە لە زانکۆی ئەفسەری هاتەدەرێ، لاوێکی چالاك و لە هەموو بارێکەوە شیاو و لێهاتوو بوو. پاشان کەوتە سەر رێی ئەفسەرانی دەوڵەمەندی پترزبۆرگ. ئەگەرچی هێندێ جار هاتوچۆی کۆڕ و بەزمی دەوڵەمەندانی پترزبۆرگی دەکرد، بەڵام چیرۆکی دڵداری و ئەشقەکانی هەمووی بەدەر لە چوارچێوەی دەوڵەمەندان بوو.

لە مۆسکۆ دوای شوێنە پڕ زەرقوبەرقەکان و بەدوور لە عاتیفە و مرۆڤدۆستی پترزبۆرگ، یەکەم جار لەگەڵ کچێکی پاك و ژیکەڵە ئاشنابوو لە چینی دەوڵەمەندان. هەر ئەو ئاشنایەتییەش بووە هۆی دڵداری. بە بیریشیدا نەدەهات لەوانەیە پێوەندییەکەی لەگەڵ کیتی شتێکی نەشیاو بێ. لە کۆڕی سەمادا زۆر جاران سەمای لەگەڵ دەکرد و بەردەوام هاتوچۆی ماڵەکەیانی دەکرد. قسەکانیشی لەگەڵێدا هەر ئەو قسانە بوون، کە لە ژیانی دەوڵەمەنداندا خۆی پێوە رادەنێن و هەمووشی قسەی بێسەرەوبەرە بوو، بەڵام ئەو قسە پووچ و بێسەرەوبەرانەی بێ ئیختیار وا تێکهەڵدەکێشا، بۆ کیتی مانایەکی تایبەتی لە خۆ دەگرت. ئەگەرچی شتێکی وای نەدەگوت کە لە هەنتەشی خەڵکیدا نەتوانێ بیدرکێنێ، بەڵام هەستی دەکرد کیتی جار لەگەڵ جار زیاتر ئاشقی دەبێ و هەرچەندەش ئەو هەستە پەرەی دەسەند، زیاتر دڵی ئاوێتەی ئەوین و خۆشەویستی دەبوو و ژیانی لەبەرچاو شیرین دەبوو. نەیدەزانی ئەو هەڵسوکەوتەی لەگەڵ کیتی ناوێکی تایبەتی هەیە، نەیدەزانی رفاندنی دڵی کیژێك بێ ئەوەی قەستی زەماوەندی لەگەڵێدا هەبێ، یەکێك لە نەشیاوترین کارەکانە کە لە نێو لاوانی جوانچاك

و دەوڵەمەندی وەك ئەودا بۆتە باو. پێی وا بوو خۆی ئەم پێوەندییەی دۆزیوەتەوە و لەو دۆزینەوەیەی خۆی چێژی وەردەگرت.

ئەگەر بیتوانیبایە مشتومڕی ئەو شەوەی دایك و باوکی کیتی ببیستێ، ئەگەر بیتوانیبایە لە روانگەی بنەماڵەوە چاو لە خۆی بکات و بزانێ ئەگەر لەگەڵ کیتی زەماوەند نەکات دەبێتە هۆی بەدبەخت بوونی، تووشی سەرسووڕمان دەبوو و باوەڕی نەدەکرد. نەیدەتوانی بڕوابکات کە ئەوەی بۆتە هۆی ئەم چێژە خۆش و دڵگرە و لەوەش گرینگتر بۆتە هۆی شادی و نەشەی کیتی، کارێکی خوێڕیانەیە. بۆیە بیری زەماوەندکردن لەگەڵێدا هیچ کات مێشکی ئەوی بە خۆیەوە خەریك نەکرد.

قەت بە بیریدا نەدەهات رۆژێك بتوانێ ژن بێنێ. نەك حەزی لە ژیانی بنەماڵەیی نەبوو، بەڵکوو بە پێی ئەو باوەڕە گشتییەی لە چوارچێوەی ژیانی ئەو و ئەفسەرانی رەبەندا باو بوو، ژیانی بنەماڵەیی و بەتایبەت رۆڵی مێردیان لەگەڵ خۆیان بە شتێکی سازگار نەدەزانی و بە جۆرێك دوژمنایەتییان دەزانی دەرهەق بە خۆیان. لە هەمووشی گرینگتر بە شتێکی قۆڕ و بە کارێکی سووك و مەڵحەکەی دەزانی. بەڵام ئەگەرچی ئەوەی ئەو شەوە دایك و باوکی کیتی باسیان دەکرد لە زەینی ئەو بەدوور بوو، ئەو شەوە کاتێك لە ماڵی ئیشچر باتسکی چووەدەرێ هەستی کرد ئەو پێوەندییە شاراوە رۆحییەی لە نێوان ئەو و کیتیدا دروست بووە ئەو شەوە وای ریشەداکوتاوە، کە ناچارە کارێك بکات. بەڵام ئەو کارە چییە و دەبێ چی بێ، شتێك بوو کە بە هیچ شێوەیەك ئەقڵی پێی نەدەشکا.

لەگەڵ ئەوەی لە ماڵی ئیشچر باتسکی دەگەڕایەوە و وەك هەمیشە هەستێکی شیرین و پاك و سەفایەکی لە دڵدا بوو، کە بەشێکی هی ئەوە بوو چەند سەعات جگەرەی نەکێشابوو، بەشێکیشی بە هۆی نەشە و حاڵێکەوە بوو کە ئەشقی کیتی لە دڵیدا هەڵیگیرساندبوو، لە دڵی خۆیدا دەیگوت: «ئەم حاڵە چەندە شیرینە، بێ ئەوەی وشەیەك لە دەممان هەڵفڕێ هەر بەو دەمەتەقێ و چاوەبڕکێ و زیروبەمەی دەنگمان لە مەبەستی یەکتر دەگەین، هەر بەو زمانەش بوو کە ئەمشەو روونتر لە هەمیشە پێی گوتم خۆشیدەوێم. چەندەش شیرین و سادە و لە هەمووشی گرینگتر چ متمانەیەکی پێم بوو! منیش وا هەست دەکەم بوومەتە مرۆڤێکی باشتر و پاکتر. هەست دەکەم دڵێکم هەیە و ناخم لێوڕێژە لە چاکە و خۆشەویستی. پەککوو لەو چاوە جوان و شەیدایەی کاتێك گوتی: گەلێ!

دەی پاشان چی؟ پاشان هیچ! من شادم، ئەویش شادە، ئیتر چیم دەوێ» کەوتە بیری ئەوەی ئەو شەوە چۆن رابوێرێ.

ئەو شوێنانەی کە دەیتوانی بچێت هەموو لە دالّغەی خۆیدا مروور کردەوە «بچم بۆ باشگا و لەگەڵ ئیگناتۆڤ پاشتۆ بکەم و شامپانی بخۆمەوە، نا، ناچم بۆ باشگا. بچم بۆ ***کۆشکی گوڵ***، لەوێ چاوم بە ئابلۆنسکی دەکەوێ و بە زەمکردنی ئەم و ئەو بێتاقەتم دەکات. بۆیەم ئیشچر باتسکییەکان خۆشدەوێ لە ماڵی ئەوان هەست دەکەم بوومەتە مرۆڤێکی باش. لە هەمووشی باشتر ئەوەیە بڕۆمەوە بۆ ماڵەکەی خۆم.» راست رۆیشت بۆ هوتێل دووساوو[٤٩] و خۆی کرد بە ژوورەکەیدا. فەرمانی دا شێوی بۆ بێنن. جلوبەرگەکانی داکەند و هەرکە سەری کردە سەر باڵنجەکەی وەك هەمیشە خەوێکی قووڵ و ئارام باڵی بە سەردا کێشا.

## حەڤدە

بەیانیی رۆژی دوایی سەعات یازدە ڤرۆنسکی بە سواری فایتوون رۆیشت بۆ وێستگەی هێلّاسنی مۆسکۆ، تاکوو پێشوازی لە دایکی بکات، کە بە شەمەندەفەر لە پترزبۆرگەوە دەهات، یەکەم کەسیش کە لە سەر پلیکانە گەورەکانی وێستگە راوەستا ئابلۆنسکی بوو، ئەویش هاتبوو بۆ پێشوازیی خوشکی، کە ئەویش هەر بەو قەتارە لە پترزبۆرگەوە دەگەیشتە مۆسکۆ.

ئابلۆنسکی هەرای کرد: هۆی مەزنە پیاو! تۆ هاتووی بۆ پێشوازیی کێ؟

ڤرۆنسکی وەکوو هەرکەسێکی تر کە چاو لە ئابلۆنسکی بکات، سەری وەرسووڕاند و بە پێکەنینەوە گوتی: هاتووم بۆ پێشوازیی دایە گیانم! ـ تەوقەی لەگەڵ کرد و پێکەوە بە پلیکانەکاندا وەسەرکەوتن: بڕیارە ئەمڕۆ لە پترزبۆرگەوە بێ بۆ ئێرە.

ـ من دوێشەو هەتا سەعات دوو چاوەڕوانت بووم. لە ماڵی ئیشچر باتسکییەوە چووی بۆ کوێ؟

ڤرۆنسکی وەلّامی دایەوە: رۆیشتمەوە بۆ ماڵێ. راستت دەوێ، کە لەوێ هاتمە دەرێ، دڵم ئەوەندە خۆش بوو نەمویست بۆ هیچ کوێ بچم.

ستیپان ئارکادیچ هەروەك رۆژی پێشوو ئەو شیعرەی بۆ لەڤینی خوێندبۆوە، بۆ ڤرۆنسکیشی خوێندەوە:

49- Dusseaux

**بارگینی چەمووش بە داخەکەیدا دیارە**
**ڕازی دڵـی عاشـق بە نیگایـــدا دیارە**

ڤرۆنسکی زەردەیەکی گرت یانی حاشای لێناکا، بەڵام هەرخێرا باسەکەی گۆڕی.

پرسیی: تۆ هاتووی بۆ پێشوازیی کێ؟

ئابلۆنسکی وەڵامی دایەوە: بۆ پێشوازیی خاتوونێکی شۆخوشەنگ!

ـ ئافەرین! هەر بژیی!

ـ ***لە دز وایە هەموو کەس دزە،*** بیری خراپ مەکەوە، هاتووم بۆ پێشوازیی ئانای خوشکم.

ڤرۆنسکی گوتی: ئەها، ئانا کارنینا!

ـ بۆ دەیناسی؟

ڤرۆنسکی کە ناوی کارنینی وەك مرۆڤێکی وشك و بەدعیە دەهاتە بەر زەین، گێژ و وێژ وەڵامی دایەوە: بەڵێ، رەنگە. یان... نا... راستت دەوێ، لە بیرم نییە...

ـ بەڵام خۆ مێردەکەی خوشکم ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ خۆ دەناسی، هێندە بەناوبانگە هەموو کەس دەیناسێ.

ـ بە ناو دەیناسم، بەڵام روالەتیم نەدیوە. دەزانم کە مرۆڤێکی سەودادار و تێگەیشتووە. پێموا بڕێ مەزهەبیشە. بەڵام خۆ دەزانی ئەو جۆرە مرۆڤانە... ناچنە دڵمەوە. ستیپان ئارکادیچ گوتیشی: مرۆڤیکی بەرز و بەڕێزە، هێندێ خۆپارێزە، بەڵام پیاوی چاکە، زۆر زۆر پیاوی چاکە!

ڤرۆنسکی بە پێکەنینەوە گوتی: خۆزگەم بە خۆی! ـ رووی لە پیرەپیاوێکی کەڵەگەت کرد کە پێشخزمەتی دایکی بوو و لەبەر دەرگانەی وێستگەکە راوەستابوو گوتی: ئەوە تۆش لێرەی؟ وەرە سەرێ وەرە!

ڤرۆنسکی جگە لەوەی وەك هەموو کەس ستیپان ئارکادیچی خۆشدەویست، لەم دواییانەدا بە هۆی کیتییەوە زۆر زیاتری رێز بۆ دادەنا.

قۆڵی ئابلۆنسکیی گرت و بە پێکەنینەوە گوتی: دەی، وا دیارە ئەم یەکشەممەیە بۆ شادیانەی گۆرانیبێژی بەناوبانگ میواندارییەك وەڕێدەخەی، ها؟

ـ بەڵێ، بەڵێ، کۆکردنەوەی پارەکەشی لە سەر خۆمە. دەی پێم بڵێ دوێشەو لەگەڵ لەڤینی هاوڕێم ئاشنابووی؟

ـ بەڵێ، بەڵام نازانم بۆ وا زوو رۆیشت.

ستیپان ئارکادیچ گوتی: زۆر کوڕی چاکە، وا نییە؟

ڤرۆنسکی وەڵامی دایەوە: نازانم بۆ ئەو مۆسکۆییانە هەموویان... ـ پاشان بە گاڵتەوە گوتی: هەڵبەت بە پێچەوانەی جەنابت. هێندە رووناخۆشن. وەك ئەسپی چەمووش خێرا هەڵدەستنە سەر پاشوو، هەر دەڵێی دەیانەوێ پیاو چاوترسێن بکەن کە...

ئابلۆنسکی پێکەنی و گوتی: راست دەکەی، وایە!

ڤرۆنسکی لە یەکێك لە کرێکارانی وێستگەکەی پرسی: زۆری ماوە شەمەندەفەرەکە بگاتێ؟

کابرا وەڵامی دایەوە: زۆری نەماوە، رایانگەیاندووە کە نزیکبۆتەوە.

جموجۆڵ و هاتوچۆ لە وێستگەکە دەستی پێکرد، باربەرەکان کەوتبوونە پەلەپەل، پەیدابوونی سەروسەکوتی ئاژانەکان و کرێکارانی وێستگە و هورووژمی پێشوازیکەران نیشاندەری نزیکبوونەوەی قەتارەکە بوو. کرێکارانی هێڵاسن، کەڵپۆسی قوڵە لەبەرو جزمەی لمەدی لە پێ بە نێو هێڵە پێچەڵاوپووچەکاندا دەهاتن و دەچوون و لە نێو تەمومژی بە سەرما سازبووی ئەو شوێنەدا وەك تارمایی و تاپۆ دەهاتنە بەرچاو. فیکەی شەمەندەفەر و جووڵانی شتێکی قورس لەولای هێڵاسنەکەوە دەبیسترا.

ستیپان ئارکادیچ کە دەیویست ڤرۆنسکی لە قەستی لەڤین سەبارەت بە کیتی ئاگاداربکات گوتی: نا، تۆ ئەو لەڤینەی ئێمەت نەناسیوە. رەنگە هێندێ تووڕە و رووناخۆش بێ، بەڵام زۆر کوڕێکی دڵنەرم و مێهرەبانە. نازانی چەندە لاوێکی پاك و بێ دەغەڵەیە، زۆریش رۆحسووك و راستوێژە ـ بە پێکەنینێکی مانادارەوە گوتیشی: بەڵام رووناخۆشییەکەی دوێشەوی هۆیەکی تایبەتی بووە. بەڵێ، لە خۆڕا نەبووە ـ کە ئەوەی گوت هەستی خەمخۆریی رۆژی رابردووی خۆی دەرهەق بە لەڤین بە تەواوی لەبیرچووبۆوە و ئێستا ئەو هەستەی بۆ ڤرۆنسکی لە دڵدا بوو.

ڤرۆنسکی راوەستا و بە راشکاوی پرسیی: مەبەستت چییە؟ یانی دوێشەو داوای لە ژنخوشکت کردووە شووی پێبکا؟...

ستیپان ئارکادیچ گوتی: رەنگە... دوێنێ وای بۆچووم... کە وایە دەبێ بزانی ئەو رووناخۆشی و زوو رۆیشتنەی لە خۆڕا نەبووە... زۆر لەمێژە دڵی پێوەیەتی. بەزەییم پێیدا دێ.

ڤرۆنسکی گوتی: کە ئاوا! بەڵام من پێموایە کیتی شایانی مێردێکی باشترە ـ سینگی دەرپەڕاند و دەستی کردەوە بە پیاسەکردن، پاشان گوتی: ئەگەرچی من نایناسم، بەڵام لە بارودۆخێکی خراپدایە. هەربۆیە پیاوان زیاتر کەسانێکی وەك کلارایان پێ باشترە. لەگەڵ ئەواندا ناکامی تەنیا بە هۆی خاڵی بوونی گیرفانەوەیە،

بەڵام لێرە بایەخە راستەقینەکانی مرۆڤ دەخرێنە تای تەرازووەوە. ئەوە قەتارەکەش هات.

شەمەندەفەرەکە بە فیکەفیك و تەقوهۆڕ لەولاوە هات. دوای چەند خولەك سەکۆی وێستگەکە وەلەرزین کەوت و شەمەندەفەرەکە لە هەردوو لاتەنیشتییەوە هەڵمێك دەهاتەدەرێ و لەبەرسەرما هەڵمەکە رووبەری زەوی و پانتایی دەوروبەری وێستگەکەی داگرت و بە هێواشی و بە هەڵبەزدابەزی رێکوپێك و میزانی لۆسەکانی کە خێرا خێرا کۆدەبوونەوە و دەکرانەوە و تایەی ناوەندییان وەگەڕ دەخست. کابرای قەتارئاژۆ سەری پێچراو بە لەچکە و بەفر لێنیشتووی خۆی بۆ دەرەوە خوار کردبۆوە. پاشان هەماری خەڵووزەبەرد گەیشتێ و خێراییەکەی تەواوکەمبۆوە و سەکۆی وێستگەکە زیاتر کەوتە لەرزین و پاشان فارگۆنی تۆشەبەر گەیشتێ کە سەگێك لە نێویدا دەیلووراند، بە دوای ئەوانیشدا فارگۆنی موسافیران گەیشتە بەر سەکۆکە و دوای یەکدوو راتەکان و هەژان راوەستا.

کارگێڕێکی بەدەمار و خۆنوێن فیتوویێکی لێدا و بەر لەوەی قەتارەکە راوەستێ، بازی دا خوارێ و بە دوای ئەویشدا موسافیرەکان یەك بە دوای یەکدا لە فارگۆنەکان دابەزین. ئەفسەرێکی پارێزەر بە قەڵافەتێکی قیتوقۆزەوە بە توندی چاوێکی لە دەوروبەر کرد و دابەزی، بە دوای ئەویشدا بازرگانێکی توندوتۆڵ بە پێکەنینەوە بازیدا خوارێ و کیسەیەکی بە دەستەوە بوو. کابرایەکی جووتیاریش کە جەواڵێکی بە کۆڵەوە گرتبوو هاتەخوارێ. ڤرۆنسکی لە پەنا ئابلۆنسکی راوەستابوو و چاوی لە فارگۆنەکان و ئەو موسافیرانە دەکرد کە دادەبەزین. دایکی هەر لە بیرنەمابوو، ئەوەی چەند سات لەمەوبەر سەبارەت بە کیتی بیستبووی وەنەشەی هێنابوو و هەستی بە دڵخۆشی دەکرد. بێ ئیختیار سنگی دەرپەڕاندبوو و چاوی بریقەی دەهات، لە دڵەوە هەستی بە سەرکەوتن دەکرد و گوێزی بە کلك دەشکاند.

کارگێڕی بەدەمار لێی نزیکبۆوە و گوتی: کۆنتس ڤرۆنسکایا تەشریفیان لەو کووپەیەدایە.

قسەی کارگێڕەکە وەخۆی هێنایەوە و دایکی وەبیرهاتەوە و دیدارێك کە دوای چەند ساتی تر لەگەڵی دەیبێ. لە ناخی دڵەوە رێز و خۆشەویستیی بۆ دایکی نەبوو، ئەگەرچی بە پێی یاسا و رێسای ئەخلاقی باوی کۆمەڵگا و کاروباری پەروەردەیی نەیدەتوانی رێزی بۆ دانەنێ و لە قسەی دەرچێ، هەرچەندە لە دڵی خۆیدا دەیویست کەمتری رێز بۆ دانێ و خۆشینەوێ، لە رواڵەتدا زیاتری بە قسە دەکرد و رێزی بۆ دادەنا.

# هەژدە

ڤرۆنسکی بە دوای کارگێڕەکەدا چووە نێو ڤاگۆنەکەوە و لە بەر دەرگای کووپەکە راوەستا تاکوو رێگا لەو خاتوونە نەگرێ کە دەیویست بێتەدەرێ. بە پێی هەڵسەنگاندن و وردبینییەکی پیاوانە و ئەزموونی کۆمەڵایەتی هەر بە یەك روانین لە بەژن و باڵای ئەو خاتوونە بۆی دەرکەوت کە دەبێ ژنێکی پایەبەرز بێ. داوای لێبوردنی کرد و کاتێك ویستی بچێتە نێو کووپەکەوە، هەستی کرد هەتا چاوێکی تر لەو خاتوونە نەکات ناتوانێ هەنگاو هەڵێنێتەوە. بەڵام ئەو هەستە نە بە هۆی جوانیی لەرادەبەدەرییەوە بوو، نە بە هۆی نەرم و نیانی و ساکارییەکەوە بوو کە بە سەرتاپایەوە دیاربوو، بەڵکوو بە هۆی ئەوەوە بوو کە کاتێك بە پەنایدا تێپەڕی روخسارە شیرینەکەی نەرمی و مێهرەبانییەکی تایبەتی پێوە دیاربوو. کاتێك ڤرۆنسکی لای کردەوە بۆ لای ئەو خاتوونە، ئەویش لای کردبۆوە. چاوە شین و گەشەکانی لە ژێر سێبەری برژۆڵە چڕوپڕەکەیدا رەشی دەنواند و بە شێوەیەکی دۆستانە و سەرنجێکی تایبەتەوە چاوی لە روخساری بڕیبوو، وەك ئەوەی ناسیبێتییەوە، بەڵام خێرا رووی کردەوە ئاپۆرەی خەڵکەکە کە بەرەو لای قەتارەکە دەهاتن، دەتگوت چاو لە کەسێك دەگێڕێ. ڤرۆنسکی هەر بەو نیگایەدا توانیی ئەشقێکی شاراوە لە سیمای ئەو ژنەدا ببینێ کە نائارامانە و لە نێوان چاوە گەشەکانی و زەردەخەنەیەکی کەمڕەنگدا کە لێوە ئەرخەوانییەکەی دەنەخشاند شەپۆل دەدا. دەتگوت شتێك لە ناخیدا بە تەوژمەوە قوڵپ دەدا و بە پێچەوانەی ویستی خۆی هێندێ جار لە نیگایدا و هێندێ جار لە بزەیدا خۆ دەنوێنێ. هەوڵی دەدا کە بریقەی چاوی خامۆش بکات، بەڵام ئەو بریقەیەش بە پێچەوانەی مەیلی خۆی لە بزە کەمڕەنگەکەیدا دەدرەوشایەوە.

ڤرۆنسکی چووە نێو کووپەکەوە. دایکی پیرێژنێکی چاوڕەشی رەقەڵە بوو. قژی لە سەر تەوێڵی لوول کردبوو و لە نێوان پێلووی وێکهاتوویەوە لە کوڕەکەی دەڕوانی و لێوە باریك و قەیتانییەکەی بزەی تێزابوو. هەستا سەر پێ، جانتاکەی دایە دەست پێشخزمەتەکەی خۆی و

دەستە رەقەڵە و چکۆڵەکەی دایە دەست کوڕەکەی و سەری ڤرۆنسکی، کە نیشتبووە سەر دەستی، بە دەستەکەی تری هەڵهێنا و ناوچاوانی ماچکرد.

ـ تێلگەڕافەکەم بە دەستت گەیشت؟ شوکر سلامەتی، سپاس بۆ خودا.

ڤرۆنسکی کە دەیویست لە پەنا دایکی دانیشێ، گوتی: سەفەرەکەت ناخۆش نەبوو؟ ـ بێ ئیختیار گوێی هەڵخست بۆ دەنگێکی ژنانە کە لە پشت دەرگاکەوە دەهات. زانیی کە دەنگی ئەو خاتوونەیە وا کاتی هاتنە نێو ڤارگۆنەکەوە تووشی بوو.

دەنگی ئەو خاتوونە دەیگوت: سەرەڕای ئەوانەش لەگەڵتان هاوڕا نیم.

ـ بیروڕای ئێوە بیروڕای پترزبۆرگییەکە خاتوون.

ژنە وەلامی دایەوە: پترزبۆرگی نا. تەنیا بیروڕای ژنێکە.

ـ ئیزن بفەرموون دەستی مەبارەکتان ماچ بکەم.

ـ خوداحافیز ئیڤان پترۆڤیچ، دا بزانە براکەم لەوێ نییە؟ ئەگەر لەوێ بوو بینێرە بۆ لام.

خاتوون ئەو قسەی راست لە بەر دەرگای کووپەکەدا کرد و هاتەژوورێ.

کۆنتس ڤرۆنسکایا رووی لەو خاتوونە شۆخە کرد و پرسیی: براکەتان دۆزییەوە؟

ڤرۆنسکی ئەو کاتە زانی کە ئەو خاتوونە ئانا کارنینایە.

لە بەری هەستا و گوتی: براکەتان لێرەیە. ببوورن کە پێشتر نەمناسینەوە ـ دوای کڕنۆشێك گوتیشی: هەر ئەوجارە یەکترمان دی، ئەویش ماوەیەکی هێندە کورت بوو، کە حەتمەن ئێوە منتان لەبیرنەماوە.

خاتوون گوتی: بە پێچەوانە، دەبوو بتناسمەوە، چونکە لەگەڵ دایە گیانت لە ماوەی ڕێگاکەدا باس باسی ئێوە بوو ـ کە ئەوەی گوت نەشەی دەروونی کە خەریکبوو کەلاوڕێژی دەکرد ئاخری لە دەرووی بزەیەکەوە دەربازی کرد و گوتی: بەلام وا دیارە براکەم دیار نییە.

کۆنتسی پیر بە کوڕەکەی گوت: بڕو بانگی کە ئالیووشا[50]!

ڤرۆنسکی لە کووپەکە چووەدەرێ و لە بەر دەرگای ڤارگۆنەکەوە هەرای کرد: ئابلۆنسکی، وەرە، لێرەن.

بەلام کارنینا لە سەر براکەی مەحتەل نەبوو و بە هەنگاوی گورج و نەرم لە ڤارگۆنەکە چووەدەرێ و هەرکە گەیشتە لای براکەی بە شێوەیەکی جوان و دڵسۆزانە باوەشی بۆ براکەی

---

٥٠ - سووکەڵە ناوی ئەلکسی

گرتەوە و ڤرۆنسکیی تووشی سەرسوورِمان کرد. کە گەیشتە بەردەمی براکەی دەستی چەپەی لە ملی براکەی کرد و بە تەکانێك کێشای بۆ لای خۆی و بە گەرموگورِی ماچی کرد. ڤرۆنسکی کە چاوی لە سەر هەڵنەدەگرتن. نەیدەزانی بۆچی زەردەی گرتووە. پاشان کە وەبیری هاتەوە دایکی چاوەرِوانێتی، گەرِایەوە بۆ نێو کووپەکە.

کۆنتس ئاماژەی بە ئانا کارنینا کرد و گوتی: ژنێکی جوانە، وا نییە؟ مێردەکەی هێنای لە کووپەی مندا داینیشاند، منیش زۆرم پێخۆش بوو. لە هەموو ماوەی رێگادا پێکەوە قسەمان دەکرد. دەی تۆ باسم بۆ بکە! ـ پاشان بە تەشەرەوە گوتی: ***بیستوومە هەموو ژیانتان بۆ ئەشق و دڵداری تەرخان دەکەن. زۆر چاکترە، خۆشەویستەکەم، زۆر چاکتر!***

کورِەکەی بە لەبزێکی ساردوسرِ وەڵامی دایەوە: نازانم مەبەستتان چییە، دەی، دایە گیان. نەرِۆین؟

کارنینا هاتەوە بۆ نێو ڤارگۆنەکە تاکوو خوداحافیزی لە کۆنتس بکات. بە دڵخۆشییەوە گوتی: زۆر چاکە، ئێوە کورِەکەتان دییەوە و منیش براکەم. باس و چیرۆکی منیش تەواوبوو، ئیتر هیچم نەماوە بۆتانی بگێرِمەوە.

کۆنتس دەستی گرت و گوتی: نا، خوشەویستەکەم. ئەگەر لەگەڵ ئێوە دەوری دنیاشم لێبدایە ماندوونەدەبووم. ئێوە لەو ژنە شیرین و بەرِێزانەن، کە لەگەڵ ئێوە قسەکردن و بێدەنگی هەردووکیان خۆش و بەتامن. زۆریش بیر لە کورِەکەتان مەکەنەوە. خۆ ناکرێ هەمیشە لە لای عەولاد بمێنیتەوە.

کارنینا بێجووڵە راوەستابوو و خۆی قیت کردبۆوە و زەردەی دەگرت.

کۆنتس بۆ کورِەکەی باس کرد کە ئانا کارنینا کورِێکی هەشت ساڵانی هەیە. تا ئێستا قەتی لێ دوورنەکەوتۆتەوە و خەمی ئەوەیەتی بەجێیهێشتووە.

کارنینا گوتی: بەڵێ، من و کۆنتس هەتا ئێرە پێکەوە قسەمان کرد، ئەو باسی کورِی خۆی کرد و منیش کورِی خۆم ـ دیسانیش روخساری بە بزە گەشایەوە. ئەو بزەیەشی لێورِێژ بوو لە لاواندنەوە و خۆشەویستی بۆ ڤرۆنسکی.

ڤرۆنسکی ئەو دڵرِفێنییەی وەك تۆپێك بە حەواوە قۆستەوە و بەرِێی کردەوە بۆ هەڤبەرەکەی و گوتی: حەتمەن زۆریشی ماندووکردوون ـ بەڵام هەڤبەرەکەی نەیدەویست بەو لەبزە لەوە زیاتری لە سەر برِوا، رووی لە کۆنتسی پیر کرد و گوتی:

ـ زۆرتان سپاس دەکەم، هاورِێیی لەگەڵ ئێوە هێندە خۆش بوو نەمزانی چۆن کات تێپەرِی. خوداحافیز کۆنتسی خۆشەویست!

کۆنتس وەلامی دایەوە: خودات لەگەڵ بێ ئازیزەکەم، دا بێنە با ئەو روخسارە جوانەت ماچکەم. من پیرم و زۆری ناپێچمەوە. کورت و کرمانجی دەبێ پێت بڵێم ئاشقت بووم.

ئەگەرچی ئەو قسەیە تەنیا شووتییەك بوو کۆنتس دەینایە بنهەنگڵی، بەڵام کارنینا باوەڕی بە قسەکانی کرد و شادی لە دڵی گەڕا. سوورهەڵگەڕا و تۆزێ دانەوییەوە روومەتی بە لێوی کۆنتس بەخشی و دیسان راست بۆوە و لەگەڵ بزەیەك کە لە نێوان لێو و چاوانیدا قەتیس مابوو دەستی ڤرۆنسکیی گوشی.

ڤرۆنسکی ئەو دەستە ناسك و نەرمەی گوشی کە وەك خەڵاتێکی بەنرخ وا بوو لە نێو دەستیدا، ئەو تەکان و گوشارەی کارنینا و گوشینی بێباکانەی دەستی زۆری خۆشحاڵ کرد. کارنینا بە پەلە و گورج بەژنی شلك و زراوی بادا و شەپۆلئاسا لە کووپەکە چووەدەرێ.

پیرێژن گوتی: چ ژنێکی شۆخ و شیرینە.

کوڕەکەشی لە دڵی خۆیدا هەر ئەوەی گوت. هەر بەو بزەیەوە کە نیشتبووە سەر لێوی، بە نیگای بەرێی کرد هەتا بەژنوباڵا جوانەکەی لە نێو ئاپۆرەی خەڵکەکەدا ون بوو. لە پەنجەرەوە چاوی لێ بوو گەیشتە لای براکەی و دەستی خستە دەستییەوە و خێرا خێرا قسەی لەگەڵ براکەی دەکرد و دیاربوو قسەکانیشی سەبارەت بە ئەو، یانی ڤرۆنسکی نەبوو، ئەوەش چێژێکی خۆشی بە دڵی بەخشی.

ڕووی کردە دایکی و گوتی: دەی، دایە گیان، خو شوکر ساغ و سلامەتی؟

ـ زۆر چاکم کوڕم، لەوە چاکتر هەر نابێ. ئەلکساندر زۆر مێهرەبان بوو و ماریش زۆر شۆخوشەنگە و هەر شیرینە لێی بڕوانی.

دیسان دەستی کردەوە بە تاریف کردنی ڕێوڕەسمی سەرانشۆی نەوەکەی بە ئاوی پیرۆز، کە هەر بۆ ئەوە چووبوو بۆ پترزبۆرگ و زۆری بەلاوە خۆش بوو، هەروەها ئەو ڕێزە تایبەتەی ئیمپراتۆر بۆ کوڕە گەورەکەی داناوە.

ڤرۆنسکی کە لە پەنجێرەکەوە دەیڕاوانی گوتی: زۆر چاکە، ئەوەش لاورنتی، ئێستا ئەگەر پێتخۆشە با بڕۆین.

خزمەتکارێکی پیر کە لە سەفەردا هاوڕێی کۆنتس بوو، هاتە نێو ڤارگۆنەکەوە و رایگەیاند کە هەموو شتێك ئامادەیە" بۆیە کۆنتس هەستا بڕوا.

ڤرۆنسکی گوتی: دەی با بڕۆین، وێستگەش چۆڵ بووە.

کچێکی خزمەتکار کیفەکەی کۆنتس و سەگە چکۆلەکەی هەڵگرت و خزمەتکاری پیر و بارەبەرەکان چانتا و کیسەکانی دیکەیان هەڵگرت. ڤرۆنسکی قۆڵی دایکی گرت، بەڵام کاتێك

لە ڤارگۆنەکە دادەبەزین چەند کەس تۆقیوانە و بە واقوڕمانەوە بە لایاندا تێپەڕین. سەرۆکی وێستگەش کە کڵاوێکی نائاسایی لە سەر نابوو، بە دوایاندا هەڵدەهات. دیاربوو ڕووداوێکی چاوەڕوان نەکراو قەوماوە. ئەو موسافیرانەی ڕۆیشتبوون، بە هەڵەداوان گەڕانەوە بۆ لای شەمەندەفەرەکە.

ـ چییە.. چی بووە؟... بۆ کوێ؟... خۆی فڕێدا؟ لەتوکوت بوو؟.... ـ ئەوانە قسەی ئەو کەسانە بوون کە بە هەڵەداوان دەهاتن.

ستیپان ئارکادیچ و خوشکەکەشی کە قۆڵیان لە قۆڵی یەك نابوو بە ڕوخساری تۆقیو و ترس لێنیشتووەوە گەڕابوونەوە و لە دوور خەڵکەکە و لە نزیك دەرگای ڤارگۆنەکە ڕاوەستابوون.

ژنان دیسان گەڕانەوە بۆ نێو ڤاگۆنەکان و ستیپان ئارکادیچ و ڤرۆنسکی بە دوای خەڵکەکەدا چوونە ژوورێ تاکوو بە وردی لەو ڕووداوە دڵتەزێنە ئاگاداربن.

نگابانێکی وێستگە، بە هۆی مەستی یان سەرماوە سەری خۆی بە لەچکە پێچابوو، ئاگای لە کشانەوەی شەمەندەفەرەکە نەبووە و کەوتۆتە ژێری جیقوفیقی دەرهاتووە.

ژنەکان بەر لەوەی ڤرۆنسکی و ستیپان ئارکادیچ بگەڕێنەوە، باسی ئەو ڕووداوەیان لە زمانی خزمەتکارە پیرەکە بیستبوو.

ڤرۆنسکی و ستیپان ئارکادیچ هەردووکیان تەرمی پلیشاوی نیگابانەکەیان دی. ئابلۆنسکی بە دیتنی ئەو دیمەنە زۆر تێکچوو. ڕەنگی هەڵبزڕکابوو و دەتگوت هەرئێستا دەست دەکات بە گریان.

دەیگوت: پەککوو چەند ترسناك بوو! پەککوو، ئانا، ئەگەر بتدیبایە! زۆر دڵتەزێن بوو.

ڤرۆنسکی بەو ڕوخسارە جوان و جیددییەوە بێدەنگ ڕاوەستابوو، زۆر لەسەرەخۆ چاوی دەگێڕا و نقەی نەدەکرد.

ستیپان ئارکادیچ گوتی: ئاخ، کۆنتس ئەگەر دەتدی، ژنەکەشی لەوێ بوو.. پیاو ئاوری تێبەردەبوو، خۆی بە سەر تەرمەکەیدا کێشابوو. دەڵێن چەند سەر خێزانی هەیە و بژێوی ئەو بنەماڵەیە هەر ئەو دابینی کردووە.

کارنینا بە دڵپڕییەوە زۆر لە سەرەخۆ گوتی: ناکرێ کارێکی بۆ بکەن؟

ڤرۆنسکی چاوێکی لێکرد و خێرا لە ڤارگۆنەکە چووەدەرێ.

کە گەیشتە بەردەرکی ڤاگۆنەکە، سەری وەرسووڕاند و گوتی: هەرئێستا دەگەڕێمەوە، دایە گیان.

دوای چەند خولەك گەڕایەوە، ستیپان ئارکادیچ سەبارەت بە ژنێکی گۆرانیبێژی تازە ناوبانگدەرکردوو قسەی دەکرد و کۆنتس ئۆقرە لێبڕاوانە چاوی لە دەرگاکە بڕیبوو و چاوەڕێبوو کوڕەکەی بگەڕێتەوە.

ڤرۆنسکی هاتەوە ژووری و گوتی: ئیتر بڕۆین باشە ـ هەموویان پێکەوە چوونە دەرێ. ڤرۆنسکی لەگەڵ دایکی لە پێشەوە دەڕۆیشتن و ئانا کارنینا و براکەشی بە دوایاندا. کە گەیشتنە بەردەرگای وێستگەکە، سەرۆکی وێستگە بە پەلە خۆی گەیاندە ڤرۆنسکی و گوتی: ئێوە دووسەد رۆبڵتان داوە بە جێگرەکەم، تکایە بفەرموون ئەو پارەیە بدا بە کێ؟

ڤرۆنسکی شانی هەڵتەکاند و گوتی: بیدەن بە ژنەکەی... نازانم ئەو پرسیارە بۆ چییە؟

ئابلۆنسکی دەنگی هەڵێنا: دووسەد رۆبلت پێدان؟! دەستی خوشکی گوشی و گوتی: ئافەریم، بژیی! چ لاوێکی باش و بەدەهەندە، وا نییە؟ ـ پاشان رووی کردە خاتوو کۆنتس: حەزرەتی کۆنتس ئەگەر ئیزنتان لە سەر بێ، ئێمە دەڕۆین.

ئەوەی گوت و لەگەڵ خوشکی راوەستان هەتا خزمەتکارەکەیان بگاتێ.

کاتێك لە وێستگە چوونە دەرێ، فایتوونەکەی ڤرۆنسکی رۆیشتبوو. ئەو کەسانەی لە وێستگەکە دەچوونە دەرێ، هێشتا هەر باسی ئەو رووداوە دڵتەزێنەیان دەکرد.

پیاوێك کە بە پەنایدا تێدەپەڕی گوتی: زۆر کارەساتێکی ناخۆش بوو، دەڵێن بووە بە دوو لەتەوە. یەکێکی تر گوتی: بە پێچەوانە، من پێموایە لە هەموو مەرگێك ساناتر بووە، چونکە چرکەیەکی زیاتر نەخایاندووە.

سێهەمی گوتی: ئەوە بۆ هیچ کارێکی بۆ ناکەن؟

کارنینا سواری فایتوونەکە بوو و ستیپان ئارکادیچ بە سەرسووڕمانەوە دیتی کە لێوی دەلەرزێ و فرمێسك لە چاویدا قەتیس ماوە.

کاتێك چەند سەد ساژێن دوورکەوتنەوە پرسیی: ئەوە چییە ئانا؟

خوشکی وەڵامی دایەوە: رووداوێکی نەشەمە و خراپ بوو.

ستیپان ئارکادیچ گوتی: جا ئەوە قسەیە! هاتنی تۆ لە هەموو شتێك گرینگترە. نازانی من چەندەم هیوا بە تۆیە!

خوشکی پرسیی: لەمێژە ڤرۆنسکی دەناسی؟

ـ بەڵێ، ئێمە بە هیواین لەگەڵ کیتی زەماوەند بکات.

ئانا بە ئەسپایی گوتی: سەیرە! وەك ئەوەی بیهەوێ بیرێکی ملۆزم لە زەینی خۆی دوور خاتەوە، سەری بە نەرمی هەڵتەکاند و گوتیشی: دەی، باسی خۆتم بۆ بکە. سەبارەت بە کار و ژیانت بدوێ. نامەکەتم خوێندەوە و خێرا وەڕێکەوتم.

ستیپان ئارکادیچ گوتی: بەڵێ، هیوای گەورە و گرانم تۆی.
ـ دەی، بۆم باس بکە چی بووە؟
ستیپان ئارکادیچ تۆزێ خوی ئەمبارەوبار کرد و هەمووی بۆ گێڕایەوە.
کاتێك گەیشتنە ماڵێ، ئابلۆنسکی خوشکی لە فایتوونەکە دابەزاند و هەناسەیەکی هەڵکێشا. بە نەرمی دەستی گوشی و ڕۆیشت بۆ دایرەکەی.

## نۆزدە

کاتێك ئانا چووە ژووریّ، دالی لە ژووری چکۆلەی میوانداری دانیشتبوو، گوێی لە کوڕە قژزێڕین و خرپنەکەی گرتبوو کە دەرسی فەڕەنسیی دەخوێندەوە، کوڕە هەر بەو منداڵییە شێوەی چووبۆوە سەر باوکی، لەگەڵ ئەوەی خەریکی خوێندنەوە بوو قۆپچەی کۆتەکەی بە دەستی بادەدا، کە بە تاڵێك بەند بوو دەیویست لێی بکاتەوە. دایکی چەند جار دەستی گرت و لە سەر دوگمەکەی لابرد، بەڵام کوڕەکە دەستە خرپنەکەی دیسان دەگەڕایەوە سەر دوگمەکە. دایکی ناچار قۆپچەکەی لێکردەوە و نایە گیرفانی.
گوتی: تۆ بۆ دەستت ناسرەویّ، گریشا ـ دیسان پۆپەشمینەکەی هەڵگرتەوە. ماوەیەکی زۆر بوو دەستی پێکردبوو و لە ساتە دژوارەکانی ژیانیدا خۆی پێوە سەرقاڵ دەکرد و ئێستاش بە دڵێکی پەرۆش و ئۆقرە لێبڕاوەوە خەریکی چنینی بوو. کامواکەی بە قامکی دەخستە سەر میلەکە و دەنك دەنك تاڵ و گۆیەکانی دەبژارد. ئەگەرچی دوێنیّ بە مێردەکەی گوتبوو کاری بە سەر هاتن و نەهاتنی خوشکەکەیەوە نییە، بەڵام هەموو شتێکی بۆ هاتنی دشەکەی ئامادەکردبوو و چاوەڕێبوو بگاتیّ.
باری خەفەت گوشاری خستبووە سەر دڵی و ئازاری بێدەرەتانی حەجمانی لیّ هەڵگرتبوو و لە خەمی خۆی زیاتر هیچی لەبیرنەبوو. بەڵام ئەوەی لەبیر بوو کە ئانای دشی هاوسەری یەکێك لە کەسایەتییە دەسەڵاتدارەکانی پترزبۆرگە و خۆشی خاتوونێکی بەناوبانگ و ناسراوی پێتەختە. هەر لەبەرئەوەش ئەوەی بە مێردەکەی گوتبوو نەیکرد و لەبیری نەبردەوە، کە دشەکەی میوانی ئەوە. لە دڵی خۆیدا گوتبووی: «دەی خۆ ئانا هیچ تاوانێکی نییە. خۆ من لە چاکە زیاتر هیچم پێوە نەدیوە و تا ئێستاش قەتی لە گوڵ کاڵتر پیّ نەگوتووم، زۆر

رووخۆش و مێهرەبانە لە گەڵمدا.» پاشان تا ئەو جێیەی توانیی ئەو شوێنەی کە ماڵی کارنین لە پترزبۆرگ لە سەر دڵی دانابوو وەبیر بێنێتەوە، دەیدی کە ئەو ماڵەی پێ خۆش نەبووە و نەچۆتە دڵییەوە. ژیانی بنەماڵەییيان ئاوێتەیەك بوو لە ڕەنگی یاسا. لە دڵی خۆیدا گوتی: «بۆ میوانداریی لێ نەکەم؟ بەڵام خۆزگە بۆ دڵدانەوەی من نەهاتبێ و نەکەوێتە گیانم! چونکە هەموو دڵدانەوە و ئامۆژگارییەکانی ئەم و ئەو و لێبوردووییەکانی مەسیحم لەبەرە و خۆم هەزار جار لە مێشکمدا لێکمداوەتەوە و هیچ کەڵکێکی نەبووە.»

دالی ئەم چەند ڕۆژەی لەگەڵ منداڵەکانی ڕابواردبوو. نەشیدەویست سەبارەت بە گرفتەکەی لەگەڵ کەس بدوێ و هەتا قورسایی ئەو خەمەش لە سەر دڵی بێ، مەحاڵ بوو باسی شتێکی تر بکات. دەیزانی بە هەر شێوەیەك بێ پرێسکەی دڵی بۆ ئانا دەکاتەوە. هێندێ جار دەکەوتە نەشە و بڕیاری دەدا کوڵوکۆی ناخی بۆ ئانا هەڵڕێژێ، هێندێ جاریش کە بیری دەکردەوە ناچارە سەبارەت بە سەرشۆڕی و شەرمەزاریی خۆی بۆ ئانای دشی بدوێ و گوێ لە ئامۆژگاری و دڵدانەوەی بگرێ، ڕقی هەڵدەستا.

ئەگەرچی چاوەڕوانی میوانەکەی بوو و چاوی لە سەر سەعاتەکە هەڵنەدەگرت، بەڵام ڕاست لەو کاتەدا کە میوانەکەی گەیشتێ، ئاگای لێنەبوو، وا لە خەم و خەیاڵەوە پێچرابوو گوێی لە زرەی زەنگی دەرگاکەش نەبوو.

کاتێك خشەخشی تەنوورەکەی و ترپەی نەرمی پێی لەبەر دەرگانەکەدا بیست، سەری وەرسووڕاند و ڕوخسارە خەمتێزاوەکەی بێ ئیختیار بە جێی شادی و بزە تەمی سەرسووڕمان دایگرت. بە پەلە هەستا و دشەکەی لە ئامێز گرت.

بە دەم ماچوموچەوە گوتی: بۆ ئاوا بێ چرپە، هەر ئاگام لێ نەبوو!

ـ دالی، چەندە بە دیتنت خۆشحاڵم!

دالی گوتی: منیش هەروا ـ بە بزەیەکی کەمڕەنگیش هەوڵی دا بە شێوەی ڕوانین و ڕوخساری ئانادا بۆی دەرکەوێ ئاگاداری کێشەکەیانە یان نا. کە ئاسەواری هاودەردیی لە ڕوخساریدا دی، لە دڵی خۆیدا گوتی: «حەتمەن زانیویە.» دەیویست تا ئەو جێیەی دەتوانێ باسی کێشەکەیان وەدوا بخات، گوتی: دەی باشە، فەرموو با بتبەم بۆ ژوورەکەت.

ئانا گوتی: ئەوە گریشایە؟ ئەی جەرگەکەم، چۆن گەورە بووە! ـ بێ ئەوەی چاو لە سەر ڕوخساری دالی هەڵگرێ گریشای ماچکرد و ڕاوەستا، ڕەنگی سوورهەڵگەڕا و گوتی: نا، جارێ ڕاوەستە، پەلەت چییە، بچین بۆ کوێ؟

لەچکە و کڵاوەکەی داگرت و تاڵێك لە قژە رەشە لوولەکەی لە کڵاوەکەی گیرابوو، تەکانێکی لە سەری دا و تاڵە مووەکەی ئازادکرد.

ئانا گوتی: من؟... پاشان رووی لەو کچە کرد کە بە هەڵەداوان هاتەژوورێ و گوتی: ئەیەرۆ ئەوەش تانیایە. هاوتەمەنی سریۆژای[51] منە ـ لەگەڵ ئەوەی کچەی لە باوەش گرت و ماچی کرد، گوتیشی: چەندە جوانە، پووری بە قوربانی بێ!

منداڵەکانی بە ناوی خۆیان بانگ دەکرد و نەك ناوی هەرکامیانی لەبیر بوو، تەنانەت ساڵ و مانگی لە دایکبوونیشیانی دەزانی و تەنانەت لە خووخدە و نەخۆشییەکانیشیان ئاگاداربوو. دالی نەیدەتوانی ئەمەگی ئەو هەموو سەرنجەی ئانای لە چاودا نەبێ.

گوتی: وەرە با بچین بۆ ژوورەکەیان، بەڵام بە داخەوە واسیا خەوتووە.

دوای ئەوەی منداڵەکانیان دی، گەڕانەوە بۆ ژووری میوانداری و بە جووت لە پشت مێزی قاوەخواردنەوە دانیشتن. ئانا دەستی بۆ کەشەفی قاوەکە برد، بەڵام خێرا دەستی کێشایەوە دواوە و گوتی: دالی، کاکم هەموو شتێکی بۆ باس کردم.

دالی بە ساردوسڕی چاوی لێکرد. چاوەڕێبوو گوێی لەو وتانە بێ، کە بۆنی هاودەردیی درۆیینەیان لێ دەهات. بەڵام قسەکانی دالی هیچی وا نەبوون.

گوتی: دالی گیان، گوێ بگرە، من لایەنگری و پاکانە بۆ ئەو ناکەم و ناشمەوێ دڵداریی تۆ بدەمەوە. چونکە ئەوە بە باش نازانم. بەڵام چاوەکەم، من تەنیا خەمی تۆمە، بە خودا دڵم پێتدەسووتێ.

لە کەلێنی برژانگە رەش و پڕەکانییەوە لە ناکاو تنۆکی فرمێسك داوەرین. بە ئەسپایی هەستا و لە پەنا براژنییەوە دانیشت و دەستی بێهێزی براژنی بە دەستە ناسك و بەهێزەکانی گرت. دالی خۆی لێنەبوارد، بەڵام ئەو ساردوسڕییە هەروا بە ئەدگارییەوە دیاربوو.

گوتی: ئیتر مەحاڵە دڵم چاك بێتەوە. بە جارێ فەوتاوم. دوای ئەو رووداوە ئیتر بێزم لە خۆشم هەڵدەستێ. ئیتر هیچ هیوایەکم بە ژین نییە ـ لەگەڵ دەربڕینی ئەو قسانە رەنگی روخساری لە ناکاو نەرم بۆوە. ئانا دەستە کز و رەقەڵەکەی داریای هەڵێنا، ماچی کرد و گوتی: بەڵام دالی گیان، ئێستا دەبێ بیر لەوە بکەینەوە کە چیمان پێ دەکرێ و لەم بارودۆخە تاڵ و نالەبارەدا چ بکەین باشە؟

دالی گوتی: هەموو شتێك لە نێوانماندا تەواوبووە و لەوەش خراپتر ئەوەیە ناتوانم دەستی لێ هەڵگرم و بڕۆم، ناتوانم منداڵەکانم بەجێبێڵم. لە لایەکی تریشەوە ناتوانم لەگەڵ ئەو بژیم. ئیتر دیتنی ئازارم دەدا.

---

٥١ - سووکەڵەناوی سرگی

ـ دالی گیان، ئەو هەموو شتێکی بۆ گێڕامەوە، بەڵام من پێم خۆشە لە زمانی تۆی ببیستم، هەرچی هەیە بیڵێ و لە دڵتدا رایمەگرە.

دالی واقوڕماوانە چاوی لێدەکرد.

ڕوخساری ئانا هاودەردی و ئەشقێکی سادقانەی پێوە دیاربوو.

لە ناکاو گوتی: باشە، هەموویت بۆ دەگێڕمەوە. تۆ ئاگاداری من چۆنم شووکرد. دایکم جۆرێك عاملاندبوومی نەك هەر پاك و بێدەنگ، بەڵکوو لە دنیاش بێخەبەر بووم، بە کورتی گێژ و گەمژە بووم. ئاگام لە هیچ شتێك نەبوو. بیستوومە کە مێرد ژیانی رابردووی خۆی بۆ ژنەکەی دەگێڕێتەوە. بەڵام ستیڤا... بەڵام خێرا گێڕایەوە و گوتی: ستیپان ئارکادیچ هیچی بۆ من باس نەکرد. رەنگە باوەڕ نەکەی، بەڵام من تا ئێستا پێم وابوو مێردەکەم لە من زیاتر لە هیچ ژنێکی تر نزیك نەبۆتەوە. من هەشت ساڵ ئاوا ژیام. بیری لێبکەوە، نەك بە بیریشمدا نەدەهات خەیانەتم پێ بکات، بەڵکوو پێم وابوو شتی وا مەحاڵە. ئێستا بیری لێ بکەوە ژنێك بەو بیر و روانینەوە کتوپڕ لە تەواوی کردەوە رەش و چەپەڵەکانی مێردەکەی ئاگاداربێ... بیری لێ بکەوە، ژنێك بە دڵنیاییەوە خۆی بە بەختەوەر بزانێ و لە ناکاو... ـ گتێکی گرت تاکوو قوڵپی گریانەکەی قووت داتەوە. پاشان درێژەی پێدا: ... نامەیەکی وەدەست دەکەوێ، نامەی مێردەکەی کە بۆ گراوەکەی نووسیوە... بۆ پەرستاری منداڵەکانی من.... نا، ئەو کردەوە چەپەڵ و گڵاوە لە توانامدا نییە تامڵی بکەم ـ بە پەلە دەسرەکەی دەرهێنا و بە بەرچاوییەوە گرتی. پاش گتێکی کورت درێژەی پێدا: لانیکەم ئەگەر هەوەسێکی زوو تێپەڕ بوایە دەکرا چاوپۆشیی لێ بکەی... بەڵام نا، کارەکەی بە پێی پیلان بووە، بیری لێ کردۆتەوە، زانیویەتی و منی فریوداوە.. ئەویش لەگەڵ کێ... لەگەڵ ئەو رایبواردووە و بۆ منیش رۆڵی ژن و مێردایەتیی گێڕاوە... نازانم بڵێم چی، تۆ قەت ناتوانی دیمەنی رەشی ئەو چەپەڵکارییە بێنیتە بەرچاوی خۆت، تۆ نازانی...

ئانا دەستی گوشی و گوتی: چۆن نازانم دالی گیان. زۆر چاکیش دەزانم.

دالی درێژەی بە قسەکانی دا: ئەی پێتوایە ئەو لەو چارەڕەشی و بارودۆخە تاڵەی من دەگا؟ قەت تێناگا، شاد و بەنەشەیە و لە ژیانیش رازییە.

ئانا بە توندی پەڕییە نێو قسەکانی: نا، نا، ئەویش وای لێهاتووە بەزەییت پێیدا دێ. گڕی پەشیمانی وەك پیو هەڵیدەچۆقێنێ.

دالی قسەی بە دشەکەی بڕی، چاوی لە چاویشی بڕی و پرسیی: تۆ پێتوایە ئەو دەزانێ پەشیمانی چییە؟

ـ بەڵێ من چاکی دەناسم. ناتوانم چاوی لێبکەم و دڵم پێی نەسووتێ. من و تۆ هەردووکمان دەیناسین، مرۆڤێکی رۆحسووك و دڵگەورەیە و ئێستا خەریکە لە تاوانا دیق دەکات. دەزانی چی، ئەوەی لە هەموو شتێك زیاتر منی پەرۆش کردووە چییە (ئانا لێرەدا ئەقڵەن دەیزانی چی لە هەموو شتێك زیاتر دەتوانێ شوێن لە سەر دڵی دالی دانێ.) ئەوەیە کە لە دوو سەرەوە ئازار دەکێشێ... هەم لە هەمبەر منداڵەکانیدا خۆی بە شەرمەزار دەزانێ و هەم لە هەمبەر تۆدا کە زۆری خۆشدەوێی... ـ لێرەدا کە دیتی دالی خەریکە ناڕەزایەتی دەربڕێ، بە پەلە قسەکەی پێ بڕی و گوتی: بەڵێ، بەڵێ، تۆی لە هەموو کەس خۆشتردەوێ لەم دنیایەدا، ئێستاش کە دەبینێ بۆتە هۆی ئازار و دڵهێشانت، بەردەوام دەڵێ: نا نا، دالی قەتم لێ نابووورێ.

دالی بە بیستنی ئەو قسانە مات بوو و چاوی لە خاڵێکی نادیاری ئەولای دشەکەیەوە بڕیبوو.

لە ئاکامدا گوتی: بەڵێ، دەزانم زۆر لە بارودۆخێکی خراپدایە. تاوانبار ئەگەر بزانێ تەواوی بەدبەختییەکان بە هۆی تاوانی خۆیەوە تووشی بووە، لە ژێر باری ئازاری ویژداندا پشتی دەچەمێتەوە. بەڵام ئاخر من چۆن دەتوانم لێی ببوورم؟ دوای ئەو رووداوە پیسە چۆن دەتوانم ژنی بم و لەگەڵی بژیم؟ هەر راست لەبەرئەوەی خۆشمویستووە، هەر لەبەرئەوەی خۆشمدەوێ و ئەشقی ئەو سەرتاپای بوون و ژیانی داگرتووم، ناتوانم لەگەڵی بژیم و لێی ببوورم...

دوای دەربڕینی ئەو قسانە دای لە قوڵپەی گریان و قسەی بۆ نەهات.

بەڵام هەرجارێك کە دەهات دڵی نەرم بێ، ـ دەتگوت بە قەست وا دەکات ـ باسی شتێکی تری دەکرد و هەمیسان ئاڵەتی دەبوو و رقی هەڵدەستا.

کەوتەوە قسە: بەڵێ، ئەو ژنە جوان و جەحێڵە، شۆخوشەنگە. بەڵام ئانا تۆ دەزانی جوانی و گەنجێتی من لە رێی کێدا فەوتا؟ هەموویيم فیدای ئەو و منداڵەکانی کرد. من وەك قەرەواشێك خزمەتم کرد و هەموو شتێکی خۆمم لە کیسدا، ئێستاش ئەو ژنە رووهەڵماڵدراوە سووکوچرووکە لە لای ئەو شیرینترە. ئەو جووتە داخۆ چەندەیان باسی من کردبێ. بەڵام لەوەش خراپتر ئەوەیە کە بە هیچیان دانەنابێتم، تێدەگەی؟ ـ دیسان گڕی رق لە چاوانیدا بڵێسەی کێشا: دوای ئەوە دەیەوێ قسەم لەگەڵ بکات... بەڵام یانی من ئەوەندە گەوجم باوەڕی پێ بکەم؟ قەت قەت! نا، دوای ئەوە ئیتر، ئەوەی مایەی دڵخۆشیم بوو، ئەوەی پاداشی رەنج و

کوێرەوەرییەکانم بوو، هەمووی بە فیڕۆ چوو... تۆ باوەڕدەکەی هەر ئێستا پێش ئەوەی تۆ بێی، دەرسم بە گریشا دەگوت. ئەو کارە پێشتر بۆ من چێژ و ئەشق بوو، بەڵام ئێستا ئازار و ئەشکەنجەیە. ئیتر بۆچی زەحمەت بکێشم، بۆ ئەو ئازارانە تامڵ بکەم؟ مندالّ بە کاری چی دێ؟ من رۆحم هەڵتەکاوە، ژێرەوژوور بووە، رقوقین جێگای ئەوین و خۆشەویستیی گرتۆتەوە، بەڵێ رقوقین، ئەوەش زۆر تالّ و ترسناکە. باوەڕم پێبکە، دەمویست بیکوژم...

ـ دالی گیان، چاوەکەم، تێدەگەم، بەڵام ئاوا خۆت ئازار مەدە. تۆ وا دلّت شکاوە و رقیشت وا هەستاوە، کە زۆر شت بە جوانی نابینی.

دالی بێدەنگ بوو، ماوەیەك هەردووکیان مات بوون.

ـ چ بکەم؟ فکرێکم بۆ بکە، ئانا، یارمەتیم بدە! من زۆرم بیر لێ کردۆتەوە و هیچ رێگایەکم پێ شك نەهاتووە.

ئاناش بیری بۆ هیچ نەدەچوو، بەڵام دلّی وەڵامی هەرکام لەو قسە و حاڵەتەکانی روخساری دارپای دەدایەوە.

ئانا گوتی: من تەنیا شتێك دەڵێم، من خوشکی ئەوم و زۆر چاکی دەناسم، دەزانم کە پێدەچێ هەموو شتێك لەبیربەرێتەوە ـ بە نیشانەی هەموو شتێك دەستی لەبەرچاوی راتەکاند ـ دەزانم پێدەچێ بە تەواوی شەیدای شتێك بێ، بەڵام ئەوەندەشی قابیلەت هەیە پەشیمان بێتەوە. خۆشی ئێستا باوەڕ ناکا، خۆشی نازانێ چۆنی توانیوە ئەو کارە چەپەڵە بکات.

دالی پەڕییە نێو قسەکانییەوە: نا، تێدەگا، تێگەیشتووە، بەڵام من... تۆ بەجێی من بی چاوپۆشی لێدەکەی... پێتوایە ئەوە بۆ من ئاسانە؟

ـ سەبرکە، ددانی پێدادەنێم، کاتێك ئەو قسەی بۆ دەکردن هێشتا لە بارودۆخی تالّی ژیانی تۆ نەدەگەیشتم. تەنیا حاڵی ئەوم دەدی و ئەوەی کە بنەماڵەکەی خەریکە لەبەریەك هەڵدەوەشێ. دلّم پێی دەسووتا، بەڵام ئێستا کە لەگەڵ تۆ قسە دەکەم، لە روانگەی ژنێکەوە، شتێکی تر دەبینم، ئازارەکانت دەبینم، نازانم چۆنت پێ بڵێم کە چەندەم دلّ پێت دەسووتێ. بەڵام دالی گیان، خۆشەویستەکەم، هەست بە ئازارەکانت دەکەم، تەنیا شتێك نازانم. نازانم کە... نازانم دلّی تۆ چەندە خۆشەویستیی بۆ ئەو تێدا ماوە. تەنیا تۆ ئەوە دەزانی. بێژی دلّت ئەوەندەی خۆشەویستی تێدا مابێ کە بتوانی لێی ببووری؟ ئەگەر ماوە لێی خۆشبە.

دالی هات قسە بکا: نا... ـ بەڵام ئانا دەستی ماچکرد و نەیهێشت قسە بکات. گوتی:

ـ بڕوانە من لە تۆ زیاتر خەڵك دەناسم. دەزانم کەسانێکی وەك ستیڤا چۆن لەگەڵ ئەو مەسەلەیە هەڵسوکەوت دەکەن. تۆ دەڵێی لەگەڵ ئەو ژنە باسی تۆیان کردووە، ئەوە ڕاست نییە. ئەو جۆرە مرۆڤانە داوێنپیسی دەکەن، بەڵام بنەماڵە و ژنەکەیان زۆر بەلاوە پیرۆزە. ئەوان ئەو جۆرە ژنانە بە واتایەکی تایبەت بە سووك دەزانن و مەسەلەی ئەوان و بنەماڵەکەیان پێکەوە تێکەڵ ناکەن. ئەوانە لە نێوان ئەو ژنانە و بنەماڵەکەیاندا هێڵێك دەکێشن، کە لێی تێناپەڕن. من سەرم لەو ڕازەیان دەرناچێ، بەڵام دەزانم وایە و ڕاستیشە.

ـ بەڵێ، بەڵام ئەو لەگەڵ ئەو ژنە دەستی تێکەڵکردووە...

ـ پەلە مەکە دالی، چاوەکەم، من لەبیرمە ئەو کاتەی ستیڤا تازە ئاشقی تۆ بووبوو. چاکم لەبیرە کاتێك دەهات بۆ لام و باسی تۆی دەکرد فرمێسك بە چاویدا دەهاتەخوارێ. هەستم کردبوو کە خاوەنی چ پلە و پایەکی بەرزی لەلای ئەو. چ شێعرێکی جوان و پیرۆز بووی. دەشزانم چەندەت ژیان لەگەڵیدا درێژە پێداوە سەد ئەوەندە بایەخ و پلەوپایەت لەلای ئەو بەرز و پیرۆز بووە. ئێمە زۆر جار گاڵتەمان پێدەکرد، چونکە سەری زمان و بنی زمانی هەر باسی تۆ بوو «دالی ژنێکی بێ وێنەیە!" تۆ بۆ ئەو خۆرێکی گەش بووی و ئێستاش هەر هەی و تیشك و تینی تۆ لە دڵیدا بەو لادانە زوو تێپەڕە کەم نابێتەوە.

ـ ئەی ئەگەر ئەو لادانەی دووپاتکردەوە؟

ـ ئەو جۆرەی من بۆم دەرکەوتووە تازە دووپاتی ناکاتەوە...

ـ بەڵام ئەگەر تۆ بەجێی من بوایەی لێی خۆش دەبووی؟

ئانا گوتی: نازانم، ناتوانم ئەو داوەرییە بکەم... پاشان تۆزێ بیری کردەوە و بارودۆخەکەی هێنایە بەرچاوی خۆی، هەڵیسەنگاند و گوتی: نا، دەمتوانی، دەمتوانی، دەمتوانی. بەڵێ لێی خۆش دەبووم. واشی لێخۆش دەبووم، کە ئەنەهوو ئەو ڕووداوە هەر نەقەوماوە.

دالی بە توندی پەڕییە نێو قسەکانی، وەك ئەوەی زۆری بیر لەو شتە کردبێتەوە، گوتی: بەڵێ، ڕاستەکەی، ئەگەر ئەوە نەبوایە لێبووردن مانای نەدەبوو. ئەگەر لە کەسێك خۆشدەبی، دەبێ بەڕاستی لێی خۆشبی. بەڕاستی ـ هەستا سەرپێ و درێژەی پێدا: ئێستا وەرە با بتبەم بۆ ژوورەکەت، پاشان ـ بە دەم ڕۆیشتنەوە باوەشی بە ئانادا کرد و گوتی: ئانا گیان چەندەم پێخۆشە هاتووی. زۆرم پێخۆشە! بارێکی قورست لەسەر دڵم لابرد. سووك بووم.

## بیست

ئانا ئەو رۆژە هەتا ئێوارە لە ماڵێ و لەلای دالی مایەوە. ئیزنی دیداری بە هیچ کام لە خزم و ئاشنایانی نەدا، کە لە هاتنی بۆ مۆسکۆ ئاگاداربووبوون. ئەو رۆژەی لەگەڵ دالی و منداڵەکانی رابوارد. تەنیا پسوولەیەکی بۆ براکەی نارد و داوای لێکرد بۆ فراوێن حەتمەن بێتەوە بۆ ماڵێ: نووسیبووی: وەرەوە بۆ ماڵێ دڵۆڤانە!

ئابلۆنسکی فراوێنی لە ماڵێ خوارد. باسی هەموو شتێکیان کرد و دالی لەگەڵ مێردەکەی قڕوقەپی شکاند و ئەوەش شتێکی تازە بوو. نێوانەکەیان هێشتا برێ سارد بوو، بەڵام باسی تەڵاق و جیابوونەوە لە گۆڕێدا نەبوو. ستیپان ئارکادیچ دیتی هەلی قسەکردن و ئاشتبوونەوەی بۆ رەخساوە.

ماوەیەك دوای فراوێن کیتی هات. کیتی ئانا ئارکادیۆڤنا[٥٢]ی دەناسی، بەڵام زۆر لەگەڵیدا خۆمانە نەبوو، دڵی ئاسوودە نەبوو لە ماڵی خوشکی و تا رادەیەك هەستی بە غەریبی و نامۆیی دەکرد. لەوە دەترسا کە ئەو خاتوونە ناودارە پترزبۆرگییە، کە ناوی کەوتۆتە سەر زاران، چۆنی هەڵسوکەوت لەگەڵ دەکات. بەڵام ئانا ئارکادیۆڤنا زۆری حەز بە دیتنی کیتی کرد و ئەمیش خێرا تێگەیی. دیاربوو شۆخوشەنگی و جوانییەکەی سەرنجی راکێشاوە و کیتی تا وەخۆ هاتەوە هەستی کرد نەك بەجارێ کەوتۆتە ژێر کاریگەریی، بەڵکوو وەك ئەو کیژۆڵانەی کە دڵ بە ژنانی بە تەمەنتر و خاوەن ماڵ و مێرد دەدۆڕێنن، ئاوا ئاشقی ئانا بووە. ئانا ئارکادیۆڤنا وەك سەرە ژنێکی چینی دەوڵەمەند، یان دایکی کوڕێکی هەشت ساڵان نەدەچوو، بەڵکوو توندوتۆڵی و رەوت و رۆیین و روخساری گەش و بێگەردی کاتێك پێدەکەنی یا دەیڕوانی حەز و ئەشقێکی بێ وێنەی لێهەڵدەقوڵاو وەك کچێکی بیست ساڵان دەچوو، بەڵام شێوەی روانینی

---

٥٢- لە فەرهەنگی ڕووسیدا ئەگەر بیانهەوێ بە فەرمی و ڕێزەوە ناوی کەسێك بێنن ناوی چکۆلەیان لەگەڵ ناوی باوکیان بەکار دێنن. ئەگەر بەردەنگەکە پیاو بێ «یۆڤیچ» یان «ئیچ» بەدوای ناوی باوکیدا دەڵێن، ئەگەر ژنیش بێ «یۆڤنا» یان «ئۆڤنا» یان تەنیا «ئا» بۆ وێنە باوکی ئانا و ستیڤا ناوی «ئارکاردی»یە بۆیە دەڵێن ئانا ئارکادیۆڤنا و ستیپان ئارکاردیۆڤیچ یان ئارکادیچ. دالی و کیتی چونکە ناوی باوکیان ئەلکساندرە دەبنە داریا ئەلکساندرۆڤنا و کاترینا ئەلکساندرۆڤنا.

جیددی و چاوانی خەم تێزاوی کە هێندێ جار دەبووە هۆی سەرسووڕمانی کیتی و سەرنجی بۆ لای خۆی رادەکێشا، قەرەبووی ئەو هەڵسوکەوتە هەرزەکارییەی دەکردەوە. کیتی هەستی دەکرد، کە ئانا ژنێکی زۆر سادەیە و هیچ شتێکی خۆی ناشارێتەوە، بەڵام لە ناخیدا دنیایەك ویست و حەزی شاعیرانە و پێچەڵاوپووچ شەپۆل دەدا کە زۆر شتێکی بەرز و دەگمەنە و ئەو دەستی پێی راناگا.

دوای نانخواردن، کە دالی چوو بۆ ژوورەکەی خۆی، ئانا بە لەز هەستا و رۆیی بۆ لای براکەی کە جگەرەیەکی بەرگی داگیرساندبوو، بە شادی و نەشەوە چاوێکی لێ قرتاند و خاچی کێشا، بە چاویشی ئاماژەی بەلای دەرگاکە کرد و گوتی: ستیڤا، هەستە برۆ، خودا روحمی پێکردی.

ستیپان ئارکادیچ لە مەبەستی گەیشت، جگەرەکەی کوژاندەوە و لە دەرگاکە چووەدەرێ.

دوای رۆیشتنی براکەی ئانا گەڕایەوە و لەسەر قەنەفەکە دانیشت و منداڵەکان دەوریاندا. جا بە هۆی ئەوەوە بوو کە دایکیان هۆگری پووریێ گیان بوو، یان بەو هۆیەی کە وەك زۆربەی منداڵان خۆشەویستی و مێهرەبانی سەرنجی راکێشابوون، سەرەتا گەورەکان و پاشان چکۆلەکان هەر لە کاتی هاتنییەوە پێوەی نووسان و لێی دوورنەدەکەوتنەوە. دەستیان کرد بە چەشنێ یاری لەگەڵ پووریان، ئەویش ئەوەبوو هەرکامیان هەوڵی دەدا زیاتر لە پووری نزیك بێتەوە و خۆی تێهەڵساوێ و دەستە ناسکەکەی بگرێ و ماچی بکات و یاری بە ئەنگوستیلەکەی بکات، یان لانیکەم دەست لە تۆڕی کراسەکەی وەربدا.

ئانا ئارکادیۆڤنا بەر لەوەی دانیشێ گوتی: دەی گوڵەکانم، پێشتر چۆن دانیشتبوون؟ ـ گریشا سەری خستە ژێر هەنگڵییەوە و روومەتی بە کراسەکەیەوە نووساند و بریقەی غووروورێك روخساری گەشاندەوە. ئانا رووی لە کیتی کرد و پرسی: دەی ئێستا ئەو کۆڕی سەمایە کەنگێ دەبێ؟

ـ حەوتووی داهاتوو دەبێ و زۆریش بەشکو بەڕێوەدەچێ. لەو چەشنە کۆڕانەیە کە هەمیشە خۆش و نەشە بزوێنە.

ئانا بە تەشەرێکی تێکەڵ مێهرەبانییەوە گوتی: کەوایە کۆڕی سەمای واش هەیە کە هەمیشە خۆش و نەشەبزوێن بێ؟

ـ بەڵێ هەیە، رەنگە پێت سەیر بێ. سەما و هەڵپەڕکێی ماڵی بۆبریشچۆڤ[53] هەمیشە پڕ نەشەیە، هی ماڵی نیکیتینیش هەروا، بەڵام لە ماڵی مشکۆف لەجیاتی شادی هەست بە خەم و پەژارە دەکەی. ئێوە ئەوەتان بۆ دەرنەکەوتووە؟

53- Bobrichtchev

ئانا گوتی: نا، کیتی گیان، کۆڕی سەما و هەڵپەڕکێ ئیتر بۆ من نابێ ـ کیتی لە چاویدا ئەو جیهانە تایبەتەی دی، کە دەستی پێی ڕانەدەگەیشت. ئانا درێژەی بە قسەکانیدا: تەنیا ئەو کۆڕانە بۆ من دەبن، کە بەقەد کۆڕەکانی تر وەڕەزم نەکەن.

ـ بەڵام چۆن دەبێ کۆڕی سەمایەك، ئەویش بۆ ئێوە ناخۆش و جاڕزکەر بێ.

ئانا پرسی: بۆ دەبێ ناخۆش و جاڕزکەر نەبێ؟

کیتی تێگەیشت کە ئانا وەڵامی ئەو پرسیارەی لێی دەکرێ، هەر لە پێشدا دەزانێ.

ـ چونکە ئێوە لە هەموو کەس باشترن.

ئانا زۆر هەستەوەر بوو و خێرا سوورهەڵگەڕا و گوتی: جارێ ئەو شتە قەت وانییە، وای دانێین ئەگەر واشبێ خۆ لەو وەڕەزییە کەم ناکاتەوە.

کیتی پرسیی: ئێوە دەچن بۆ ئەو کۆڕە؟

ـ ڕەنگە نەکرێ نەچم ـ ڕووی کردە تانیا کە خەریکبوو ئەنگوستیلەکە لە قامکی داماڵێ، قامکە سپی و شووشەکەشی چونکە بەرەو نووکەکەی باریك بووبۆوە ئەنگوستیلەکەی بە ئاسانی لێدادەکەندرا، گوتی: هانێ، ئەوە بگرە.

ـ ئەگەر ئێوە بێن من زۆرم پێخۆش دەبێ. زۆرم دڵ پێوەیە ئێوە لە کۆڕێکی سەما و هەڵپەڕکێ ببینم.

ـ ئەگەر ناچاربم بچم لانیکەم دڵم بەوە خۆشە، کە هاتنەکەم دەبێتە هۆی دڵخۆشیی ئێوە ـ گریشا خەریکبوو یاریی بە پرچی دەکرد، بە نەرمی دەستێکی پێدا هێنا ڕێکوپێکی کردەوە و گوتی: گریشا گیان تکات لێدەکەم قژم مەئاڵۆزێنە ئەوەندە لەخۆیا ڕێکوپێك نییە تۆش ئەوەندەی دیکەی دەشێوێنی.

ـ من لەو کۆڕەدا ئێوەم بە جلوبەرگی بنەوشەوە لەبەر چاوە.

ئانا بە پێکەنینەوە گوتی: جا بۆ زیادە لەو هەموو ڕەنگە بنەوش؟ پاشان منداڵەکانی نارد بۆ ژووری میوانداری و گوتی: دەی ڕۆڵە گیان بڕۆن، گوێتان لێیە، میسگول بانکتان دەکات، بچن چاییەکەتان بخۆنەوە.

ـ دەزانم بۆچی من بۆ ئەو کۆڕە بانگهێشت دەکەی، ئەو کۆڕە بۆ ئێوە زۆر گرینگە و پێتانخۆشە هەموو کەس بەشداریی تێدا بکات و بە چاوی خۆیان درەوشانەوەی ئێوە ببینن.

ـ بەڵێ، وایە، بەڵام تۆ چووزانی؟

ئانا گوتی: خۆزگەم بە دڵتکا، ژیان هەر لە تەمەنی ئێوەدا خۆشە! لەبیرمە، تەمومژێکی خەست هەیە کە کێوەکانی سویسڕات وەبیردێنێتەوە. ئەو تەمومژە لەو سەردەمە شیرینەدا کە تازە خەریکە منداڵی بارگەی دەپێچێتەوە، پەردە بەسەر هەموو شتێکدا دەکێشێ و مرۆڤ لە دنیای منداڵییەوە کە بەستێنی بەرینی شادی و خۆشییەکان بووە، ڕێگایەك دەگرێتەبەر کە جار لەگەڵ جار باریکتر دەبێتەوە و گرتنەبەری ئەو ڕێگایەش زۆر خۆش و نەشە بزوێنە، بەڵام بێترس و دڵەخورپەش نییە، ئەگەرچی ڕێگایەکی ڕووناك و جوانە... کێش هەیە کە ئەو ڕێگایەی نەبڕیبێ.

کیتی بە بێدەنگی گرژییەوە. دەموچاوی ئێستای مێردەکەی، ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ، کە هیچ شتێکی شاعیرانە نەبوو هێنایە بەرچاوی و لە دڵی خۆیدا گوتی: «یانی ئانا ئەو ڕێگایەی بڕیوە؟ چەندەم پێخۆشە چیرۆکی ئەشقی ئەو ببیستم!»

ئانا درێژەی بە قسەکانی دا: من ئاگام لە هێندێ شت هەیە، ستیڤا بۆی باس کردم. پیرۆزباییت پێدەڵێم، زۆر کوڕێکی باشە، بەر دڵم کەوت. من لە وێستگەی هێڵاسن ورۆنسیکم دی.

کیتی سوورهەڵگەڕا و پرسیی: سەیرە، ئەویش لەوێ بوو؟ ستیڤا چیی پێگوتن؟

ئانا گوتی: ستیڤا هەموو شتێکی بە تێرو تەسەلی بۆ گێڕامەوە. دوێنێ لەگەڵ دایکی ڤرۆنسکی هاوسەفەر بووم. ئەویش بەردەوام باسی کوڕەکەی بۆ دەکردم. ڤرۆنسکی تاقانە کوڕێتی. من دەزانم کە داوەریی دایکان بۆ منداڵەکانیان چۆنە، بەڵام...

ـ دایکی چیی بۆ ئێوە باس کرد؟

ـ هەر مەپرسە، زۆر شت. من دەزانم کە ئەو گوڵەجەرگەی دایکێتی، بەڵام سەرەڕای ئەوەش دیارە لاوێکی بێباك و بە دەهەندە. بۆ وێنە باسی کرد کە دەیەوێ بەشەماڵەکەی خۆی بدات بە براکەی، یان بە منداڵی ژنێکی لە خنکان ڕزگارکردووە ـ دووسەد ڕۆبڵەکەی وێستگەشی وەبیرهاتەوە و بە بزەیەکەوە گوتی: لە سەریەك لاوێکی دەستودڵباز و کەم وێنەیە ـ بەڵام باسی دووسەد ڕۆبلەکەی نەکرد. ڕوون نەبوو بۆچی وەبیرهاتنەوەی ئەو مەسەلەیەی پێخۆش نەبوو. هەستی دەکرد ئەو کارە شتێکی تێدایە، کە پێوەندیی بە ئەوەوە هەیە، بۆیە لە دڵی گران هات.

درێژەی بە قسەکانیدا: دایکی زۆری پێداگری کرد، کە بچم بۆ دیدەنییان و منیش زۆرم کەوتە بەر دڵ و سبەینێ دەچم بۆ ماڵەکەیان ـ پاشان بە مەبەستی گۆڕینی باسەکە گوتی: بەڵام وادیارە ستیڤا لەلای دالی دایکوتا. خودایە زۆر شوکر! ـ هەستا سەرپێ و جۆرێك کە کیتی پێیوابوو لە شتێك نارازییە.

قیژەقیژی منداڵەکان پەیدابوو، کە چاییەکەیان تەواوکردبوو و دەهاتنەوە بۆ لای پوورە ئانا و بە هەڵاتنەوە دەیانگوت: هەوەڵ من... نا، من هەوەڵ بووم....

ئانا گوتی: زۆر چاکە هەمووتان پێکەوە... ـ بە پێکەنینەوە بەرەو پیریان چوو و لە باوەشی گرتن و هەموو منداڵەکان کە دەیانقیژاند و قریشکەی پێکەنینان بەرزبوو پێکەوە کۆی کردنەوە و لەسەر قەنەفەیەك داینیشاندن.

## بیست و یەك

کاتی چایی خواردنەوەی گەورەکان، دالی لە ژوورەکەی خۆی هاتەدەرێ. ستیپان ئارکادیچ لەگەڵی نەبوو. دیاربوو لە دەرگای پشتەوەی ژووری ژنەکەیەوە چۆتەدەرێ.

دالی رووی لە ئانا کرد و گوتی: دەترسم نهۆمی سەرێ بۆ تۆ سارد بێ. پێم خۆشە بێیتە خوارێ. ئاوا لە یەکتریش نزیکتر دەبین.

ئانا وەڵامی دایەوە: نا، خەمی منت نەبێ! ـ بە وردی چاوی لە روخساری دالی بڕی تاکوو بزانێ لەگەڵ ستیڤا ئاشتبوونەتەوە یان نا.

براژنی گوتی: ئێرە رۆشنتریش دەبێ.

ـ گوتم خەمی منت نەبێ. من لەسەر بەردیش خەوم لێدەکەوێ.

ستیپان ئارکادیچ کە لە ژوورەکەی خۆی دەهاتەدەرێ رووی لە ژنەکەی کرد و پرسیی: مەسەلە چییە؟

ئانا و کیتی بە شێوەی قسەکردنەکەیدا تێگەیشتن کە ئاشتبوونەوە.

دالی وەڵامی دایەوە: دەمەوێ ئانا بێنمە خوارێ، بەڵام دەبێ پەردەکان بگۆڕین. ئەوەش کاری خۆمە و هیچ کەس ناتوانێ بیکا.

ئانا کە لەبزی سارد و لەسەرەخۆ قسەکردنی دالیی بیست لە دڵی خۆیدا گوتی: «خودا دەزانێ کە ئاشتییەکەیان بەڕاستییە یان نا.»

ستیپان ئارکادیچ گوتی: دالی! دە بەسیکە ئیتر، تۆ بۆ دنیات بە کۆڵەوە گرتووە. لێی گەڕێ و ئەو ئیشانە دانێ بۆ من.

ئانا لە دڵی خۆیدا گوتی: «وادیارە بەڕاستییە.»

دالی گوتی: بۆ تۆی دانێم؟ دەزانم چۆنی جێبەجێدەکەی! ئیشەکە بە ماتڤیٚ دەسپێری کە شارەزا نییە و خۆت بۆی دەردەچی، ئەویش بە چەکمەوە تێی دەکەوێ ـ لەگەڵ ئەو قسانە بزە ماناداره هەمیشەییەکەی گنجی خستە لالێوی.

ئانا لە دڵی خۆیدا گوتی: «نا، تەواو ئاشتبوونەتەوە، خودایە زۆر شوکر!» لەوەی کە بووبووە هۆی ئەو ئاشتییە لە دڵەوە هەستی بە شادی دەکرد، چوو بۆ لای دالی و روومەتی ماچکرد.

ستیپان ئارکادیچ بە بزەیەکی کەمڕەنگەوە بە ژنەکەی گوت: هیچ وانییە، تۆ بۆ من و ماتڤیٚ ئەوەندە بە دەستەوستان دەزانی؟

دالی هەتا شەوێ وەك هەمیشە تانەوتەشەری پێوە دیاربوو، ستیپان ئارکادیچیش شاد و دڵخۆش بوو بەڵام ئاشکرای نەدەکرد، چونکە لێی خۆشبوون تاوانی لەبیربردۆتەوە.

سەعات لە نۆو نیوی لادابوو کە وتووێژی گەرموگوڕ و خۆمانەی بنەماڵە لە دەوری مێزی چایی، بە رووداوێکی بە رواڵەت ئاسایی تێکچوو، بەڵام ئەو رووداوە ئاساییە روون نەبوو بە چ هۆیەك تووشی سەرسووڕمانی کردن. ئانا سەبارەت بە ئاشنا و رۆشناکانی پترزبۆرگ دەدوا، لەناکاو هەستاو گوتی:

ـ وێنەکەیم پێیە لە ئەڵبۆمەکەدا ـ بە بزەیەکی پڕ لە غوروری دایکانە گوتیشی: ئێستا وێنەی سریۆژای خۆمتان پیشان دەدەم.

سەعات دە بوو، ئەمەش سەعاتێك بوو، کە هەر جارێك دەچوو بۆ کۆری سەما بە پێی عادەت خوداحافیزیی لە کوڕەکەی دەکرد و دەیبردە سەر جێوبانەکەی و دەیخەواند، ئەمشەو لە دووریی جگەرگۆشەکەی خەمبار بوو و باسی هەر شتێکیان دەکرد ئەو سریۆژای وەبیردەهاتەوە و کاکۆڵە لوولەکەی دەهاتەوە بەرچاوی. دەیویست چاو لە وێنەکەی بکات و لەگەڵی بدوێ. ئەوە بوو کە کەڵکی لە یەکەم بیانوو وەرگرت و هەستا و گورج ڕۆیشت ئەڵبۆمەکە بێنێ. ئەو پلیکانانەی دەچوونە ژوورەکەی ئەو دەبوو بە دالانێکی گەورە و گەرمدا تێپەڕێ. کاتێك لە ژووری میوانداری چووەدەرێ زەنگی دەرگاکە لە سەرسەراوە زرەی هات.

دالی گوتی: دەبێ کێ بێ؟

کیتی گوتی: هێشتا زووە. وێناچێ بەدوای مندا هاتبێتن، کاتی ئەوەش نییە میوان بێ.

ستیپان ئارکادیچ گوتی: رەنگە لە دایرەوە هاتبێتن و کاغەز یان دەوسیەیان هێنابێ ـ کاتێك ئانا گەیشتە سەر پلیکانەکان پێشخزمەتێك بە هەڵەداوان هاتەسەرێ تاکوو هەواڵی هاتنی میوانەکە راگەیێنێ، میوانەکەش لەلای دەرگای سەرسەرا و پەنا چراکە راوەستابوو. ئانا چاوێکی لە خوارێ کرد و لە ڕێوە ورۆنیسکی ناسییەوە، هەستێکی خۆش و سەیر لەگەڵ

فرمێسکی نامۆ دڵی خستە کوتەکوت. ڤرۆنسکی باڵتە لەبەر راوەستابوو شتێکی لە گیرفانی دەردەهێنا. کاتێك ئانا گەیشتە نێوەڕاستی پلیکانەکان ڤرۆنسکی سەری هەڵێنا و دیتی، لەگەڵ دیتنی تەمی ترس و شەرمێك خۆی لە روخساری پێچا. ئانا بە نەرمی سەری داخست و تێپەڕی. ئانا گوێی لە دەنگی ستیپان ئارکادیچ بوو، کە خولکی دەکرد بچێتە ژووریٚ و دەنگی نەرم و لەسەرەخۆی ڤرۆنسکیش کە داوای لێبوردنی دەکرد و دەیگوت ناتوانیٚ بمێنێتەوە.

کاتێك ئانا بە ئەڵبۆمەکەیەوە هاتەوە ڤرۆنسکی رۆیشتبوو، ستیپان ئارکادیچ گوتی هاتبوو تا سەبارەت بە میوانداریی سبەی نیوەڕۆ کە بۆ رێزگرتن لە کەسایەتییەکی بەناوبانگ رێکخراوە ئاگاداربیٚ.

ستیپان ئارکادیچ گوتیشی: هاتنەکەیم پیٚ سەیر بوو. تێشیدا شل و کوت بووم نەهاتەژووریٚ.

کیتی سوورهەڵگەڕا. پێی وابوو هەر ئەو دەزانیٚ هۆی نەهاتنەژوورێی چییە. لە دڵی خۆیدا دەیگوت: «حەتمەن چووە بۆ ماڵی ئێمە و کە چاوی بە من نەکەوتووە هەستی کردووە، کە من لێرەم بۆیە هاتووە، بەڵام چونکە شەو درەنگە و ئاناش لێرەیە بۆیە نەهاتۆتە ژووریٚ.»

هەموو لە یەکتریان روانی هیچیان نەگوت، دەستیان کرد بە تەماشاکردنی ئەڵبۆمەکە.

لاوێك سەعات نۆونیوی شەویٚ سەری لە ماڵی هاوڕێکەی هەڵێناوە تاکوو سەبارەت بە میواندارییەکەی سبەی نیوەڕۆ ئاگاداربیٚ و نەهاتۆتە ژووریٚ. ئەو مەسەلەیە هیچ شتێکی نائاسایی نەبوو، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هەموانی تووشی سەرسووڕمان کرد.

ئەو کارەش لە هەمووان زیاتر ئانای تووشی سەرسووڕمان کردبوو و بە شتێکی نەشیاوی دەزانی.

## بیست و دوو

سەما تازە دەستی پێکردبوو کە کیتی لەگەڵ دایکی هاتنە سەرسەرای بەگوڵ خەملاو و نووربارانەوە. پێشخزمەتەکان بە جلوبەرگی سوور و دەموچاوی سووراو و سپییاو کراوەوە لە دوو بەر بە ریز راوەستابوون. ژاوەژاوی لە پەستا و جمەی خەڵك، وەك پلوورە هەنگ دەنگی دەدایەوە و هەتا سەرسەرا دەهات، ئەوان لەگەڵ ئەوەی لەسەر پێگۆڕکەی پلیکانەکان لە هەمبەر ئاوێنەی باڵانوێنی پاڵ گوڵدانەکان کە درەختەکانیان باڵا پیاوێك هەستابوون، خەریکی ئارایشت و داهێنانی قژیان بوون، دەنگی کەمانی ئۆرکیسترا کە زۆر رەوان و هونەرمەندانە هەوای «واڵس»یان دەژەنی لە تەلاری سەماوە دەبیسترا. پیرە پیاوێکی خڕیلانە کە جلوبەرگی

مەدەنیی لەبەردا بوو، لەبەر ئاوێنەیەکی تر خەریکی ڕێکوپێك کردنی مووی لاجانگی بوو و بۆنە عەترێکی توندی لێدەهات، لەسەر پلیکانەکان تووشیان بوو، خۆی کێشایە دواوە و دیاربوو لە دڵی خۆیدا ئافەرین بە کیتی دەڵێ کە ئاوا جوان و دڵڕفێنە. لاوێکی منداڵکارە کە هێشتا سمێڵی بۆر نەبووبوو، یەکێك لەو کوڕانە بوو کە پرنس ئیشچر باتسکی پێی دەگوتن لووسکە، پێشی جلیسقەکەی تەواو ئاوەڵا کردبوو و بەدەم ڕۆیشتنەوە خەریکی ڕاستەوپاستە کردنی بۆینباخە سپییەکەی بوو، کڕنۆشێکی کرد و بە پەنایاندا تێپەڕی، بەڵام لەپڕ گەڕایەوە و داوای لە کیتی کرد لە هۆڵەکە سەمای لەگەڵ بکات. کیتی بەڵێنی یەکەم سەمای بە ڤرۆنسکی دابوو و بە ناچاری بەڵێنی دووهەمی بەولاوە دا.

ئەفسەرێك کە لەبەر دەرگاکە ڕاوەستابوو و ئاغزوونەی دەستەوانەکەی توند دەکرد ڕۆیشتە ئەولاوە، دەستێکی بە سمێڵیدا هێنا و بە چاوێکی پەسەندەرانەوە لە ڕووی وەك گوڵاڵەی کیتیی ڕوانی.

ئەگەرچی کیتی بۆ جلوبەرگ و ئاڕایشت و ڕازاندنەوەی سەروپرچی و خۆ ئامادەکردن بۆ ئەو کۆڕی سەمایە زەحمەتێکی زۆری کێشابوو و بیری لێکردبۆوە، بەڵام ئێستا بە کراسی دامتەلی تۆڕییەوە کە بەرەکەی سوور بوو، بە شێوەیەکی هێندە ئاسایی و ئازاد پێی نایە تەلارەکەوە دەتگوت تەواوی ئەو گوڵ و تەنزیلانەی کراسە تۆڕەکەی پێ ڕازاندۆتەوە، تەنانەت خولەکێك کات و وردبینیی خۆی و بنەماڵەکەی نەویستووە. دەتگوت هەر بەو کراسە دامتەڵە و ئەو ئاڕایشتە و ئەو گوڵە سوورەی بە دوو گەڵای ناسك و سەوزەوە لە لاجە سەری دابوو لەدایك بووە.

کاتێك پرێنسسی پیر، بەر لەوەی بێنە نێو تەلارەکەوە دەیویست کەمەرەکەی تۆزێك بۆ ڕێکوپێك بکات، کیتی تۆزێ کشایە دواوە. چونکە هەستی دەکرد هەموو شتێکی جلوبەرگ و ئارایشتی هەر لەخۆوە دەبێ باش و بێعەیب بێ و بەژنوباڵای پێویستی بە ڕاستەوپاستە کردن نییە.

ئەوە یەکێك لە ڕۆژە شیرینەکانی ژیانی کیتی بوو. کراسەکەی چەسپ و لەبار دەتگوت خشت بە باڵای دووراوە، ستیانەکەی شل نەبووبۆوە و مەمکی قوتوڕەق وەك کارەبا سەرنجی لاوانی ڕادەکێشا. تەنزیلی بە گوڵکراو کە کراسە تۆڕەکەی پێ ڕازابۆوە دەقیان نەشکابوو، کەوشە سوورە پاژنە بەرزەکانی لاقی ئازار نەدەدا و بەڵکوو هێندەی تر وەنەشەی خستبوو. پەلکەی زێڕین بە پشتە سەرییەوە هەروەك کەزیەی خۆی ڕێك و جوان لەجێی خۆیان ڕاوەستا بوون. قۆپچەی زێوینی دەستکێشە مل درێژەکانی کە پڕ بە زەند و مەچەکی بوون و چرچولۆچی تێنەکەوتبوو، هەرسێکیان داخرابوون و نەدەکرانەوە. تەنزیلێکی مەخمەری بە میدالیایەکەوە بە نەرمی لە ملی هاڵابوو و خەملاندبووی. ئەو تەنزیلە مەخمەرە زۆر جوان

بوو، کیتی کاتێك لە ماڵێ لەبەر ئاوێنە راوەستابوو چاوی لە گەردن و بەرۆکی خۆی کردبوو، هەستی کردبوو ئەو تەنزیلە لەگەڵ گەردنی دەدوێ. رەنگبوو پاژێك لە بەرگ و ئاڕایشتەکانی تری تۆزێ جێی گومان بن، بەلاّم ئەو تەنزیلە شاکارێك لە ناسکی و جوانی بوو، کیتی لێرەش، لە تەلاری سەما، کە لە ئاوێنەکەدا دیتی بێ ئیختیار بزەیەکی شیرین لێوی نەخشاند. کە شان و ملە رووتەکەی خۆشی دی هەستی بە مەڕمەڕی سارد کرد و ئەو هەستەش چێژێکی شیرینی پێدەبەخشی. چاوی بریقەی هات و کە دلڕفێنی و شەنگوشۆخیی خۆی بۆ دەرکەوت، لێوە یاقووتەکەی نەیتوانی شیلەبزەی تێ نەگەڕێ. هێشتا نەچووبووە نێو تەلارەکەوە و ریزی ئەو ژن و کچانەی کە وەك بارستایەك لە تۆڕ و گوڵ و تەنزیل چاوەڕوان بوون بۆ سەما بانگیان بکەن. (کیتی قەت لەو کۆڕەدا چاوەڕوان رانەدەوەستا) هەر لەگەڵ گەیشتنی بۆ سەمای والس بانگهێشتن کرا، ئەویش باشترین پیاوی سەماکار، کە سەرتۆپی سەماکاران بوو، یانی یەگوورۆشکا کارسۆنسکی فێرکاری بەناوبانگی سەما، کە پیاوێکی جوانچاکی مەدەنی بوو، خاوەن ژن و منداڵ و بەڕێوەبەری کۆڕەکەش بوو. تازە دەستی کۆنتس بانینای بەردابوو کە یەکەم دەوری سەمای والسی لەگەڵ ئەو بوو، چاوێکی لە دەوروبەری خۆی کرد کە چەند جووت ژن و پیاو خەریکی سەما بوون و لەپڕ چاوی بە کیتی کەوت کە خەریکبوو دەهات بۆ نێو تەلارەکە، گورج و خێرا و ئازادانە و بەبێ شەرم و شکۆ کە تایبەتی بەڕێوەبەرانی کۆڕی سەمایە رۆیشت بۆ لای و کڕنۆشێکی کرد وبێ ئەوەی لێی بپرسێ حەزی لە سەمایە یان نا، دەستی هەڵێنا کە لەنێو قەدی باریك و زراوی کیتیی هاڵێنێ. کیتی چاوێکی لە دەوروبەری کرد کە باوەشێنەکەی بداتە دەست، کە ژنێکی میواندار بە پێکەنینەوە هات و لێی وەرگرت.

پیاوی سەماکار قۆڵی لە قەدی کیتی هالاّند و گوتی: زۆر چاکە لە کاتی خۆیدا هاتی، هێندێ کەس پێیان وایە درەنگ هاتن نیشانەی گەورەییە.

کیتی دەستی چەپەی هەڵێنا و لەسەر شانی کارسۆنسکیی داناو لاقە جوان و ناسکەکانی بەو کەوشە تەسك و ترووسکە سوورانەوە سووك و خێرا و نەرم و لەبار لەگەڵ هەوای مۆسیقا لەسەر تەرکی خزی تەلارەکە وەسەماکەوتبوون.

کارسۆنسکی بەدەم نەرمە سەمای والسەوە گوتی: سەماکردن لەگەڵ ئێوە شەکەتی لە لەش دەرد دەکات. چەند سووك و لەبار سەما دەکەی! ئەوەش وتەیەك بوو کە هەمیشە بە نزیکترین ئاشناکانی دەگوت.

ئەو تاریفە ترووسکەی بزەی خستە سەر لێوی کیتی، کە لەودیوی شانی ئەوەوە چاوی لە تەلارەکە دەکرد. کیتی زۆریش نەدەچوو بۆ ئەو جۆرە کۆڕانە و شێوە و رواڵەتی میوانەکان وەك

وێنەیەکی جادوویی لە زەینیدا تێکەڵ و پێکەڵ نەدەبوون، سەرەڕای ئەوەش هێندەی لەو کۆڕانەدا سەماکردبوو کە هەموو روخسارەکان لەبەر چاوی هەتا رادەیەك ئاشنابوون، بەڵام واشنەبوو کە لە تامی دەرکات. تازەبوونی کۆڕەکان هێندێ جار تووشی هەیەجانی دەکرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هۆشی بەخۆیەوە بوو و وردبینانە هەموو شتێکی دەدی. دیتی لە سووچێك جوانانی سەرتۆپی کۆڕەکە کۆبوونەتەوە. لیدای شۆخ و شەنگ، هاوسەری کارسۆنسکی لەگەڵیانە و شان و بەرۆکی لەڕادەبەدەر رووت کردووە و شەڕ لەگەڵ بەفری کوێستان دەکات، خاتوونی میوانداریش لەو کۆڕەدا بوو، هەروەها چاوی بە کریوین کەوت کە سەرە بێتووکەکەی بریقەی دەهات و لە هەر شوێنێك جوانان کۆدەبوونەوە ئەویش لەوێ بوو. پەپوولەی سەرنجی لاوان هەر بۆ لای ئەو تاقمە دەفڕین، بەڵام خۆیان نەیاندەوێرا لێیان نزیك ببنەوە. کیتی لەپڕ چاوی بە ستیڤا کەوت لەنێویاندا و پاشان بەژنوباڵای لەباری ئانا کە کراسێکی مەخمەری رەشی دەبەردا بوو. «ئەویش" لەوێ بوو. کیتی بە چاوە وردبینەکانی لەڕێوە ناسییەوە و زانیی ڤرۆنسکی چاوی تێبڕیوە. لەو شەوەوە کە ستیڤا خوڵکی کردبوو بچێتە ماڵێ و نەچووبوو، ئیتر چاوی پێی نەکەوتبوو.

کارسۆنسکی کە تۆزێ کەوتبووە هەناسەبڕکێ گوتی: پێتخۆشە گەڕێکی دیکە سەما بکەین؟ ماندوو نەبووی؟

ـ نا، بەڵام بەسە، سپاست دەکەم.

ـ دەتەوێ بۆ کام لا بچی؟

ـ وادیارە خاتوو کارنینا لەوێیە، بمبە بۆ لای ئەو.

ـ هەرجێیەك مەیلت لێیە.

کارسۆنسکی، هەروا بەدەم سەماکردنەوە بە کاوەخۆ و هەنگاوی هێور راست رۆیشت بۆ لای کۆمیلکەی دەستە چەپی تەلارەکە و لەپەستا دەیگوت: «ببوورن خانمەکان، ببوورن، ببوورن خاتوونە بەڕێزەکان، وەکوو پاپۆڕێکی تووشی مۆنج و شەپۆل هاتوو بەنێو دەریایەك تۆڕو دامتەل و تەنزیلدا خاتوونی هاوسەمای خۆی نەرم و چالاکانە و بێ ئەوەی خۆی لە گوڵ و تۆڕ و کراسێك بدا، بردی و لە ئاکامدا وای هەڵخولاند کە داوێنی کراسەکەی وەك چەتر کرایەوە و لاقی کریوینی داپۆشی و پەلوپووزی ناسکی کیتی بە گۆرەویی تەنکەوە وەدیار کەوت. کارسۆنسکی کڕنۆشێکی بۆ کرد و سینگی خۆی لەژێر کراسە سپییە یەخە ئاواڵەکەیەوە هێنایە پێشێ، کە تەواو وەدەر کەوتبوو و باسکی خۆی بۆ کیتی شل کرد، کە

بیبا بۆ لای ئانا ئارکادیۆڤنا. کیتی سوورهەڵگەڕا و داوێنە تۆڕەکەی لەسەر چۆکی کریوین لابرد لەگەڵ نەختێ سەرەگێژە سەری وەرسووڕاند و چاوی بۆ ئانا دەگێڕا. ئانا بەپێوە راوەستابوو لەگەڵ ئەو ژن و پیاوانە قسەی دەکرد، کە لە دەوری کۆزیلکەیان بەستبوو. ئەو بە پێچەوانەی ویستی کیتی کە پێی خۆشبوو جلوبەرگی بنەوش لەبەر بکات، کراسێکی مەخمەری رەشی لەبەرکردبوو، کە درزی بەرۆکی زۆر کراوە بوو و شان وسینگ و قۆڵی گۆشتنی کە بە دوو دەست و پەنجەی شلك و ناسك دوایی دەهات و دەتگوت لە مەڕمەڕی سپیت داتاشیون، بە دەرەوە بوون. پەراوێزی کراسەکەی تۆڕی ناسکی وێنیزی بوو. بەسەر خەرمانی رەشی کەزییەوە، کە زۆر سروشتی بوو، زێدە بسکی تێنەبەستبوو، قردێلەیەکی گوڵ وەنەوشەیی خۆی لێ توندکردبوو و تۆڕێکی سپیی رازاوە بەو گوڵانە کەمەرە مەخمەرە رەشەکەی خەملاندبوو. ئارایشتی سەرو کەزیەی شتێکی تایبەتی نەبوو، تەنیا شتێك کە مەلی سەرنجی لە داو خست قولاپی ناسکی ئەگریجەکانی بوو، کە بناگوێ و لاجانگی داگیرکردبوو. گەردنی کێل و بلوورینیشی بە گەردانەیەکی مرواری رازابۆوە.

کیتی هەموو رۆژێ ئانای دەدی و بەجارێ شەیدای بووبوو و پێی خۆشبوو هەمیشە بە جلوبەرگی بنەوشەوە بیبینێ. بەڵام ئێستا کە بە جلوبەرگی رەشەوە دیتی هەستی کرد تا ئەم کاتە لە جوانیی ئەو نەگەیشتووە. ئێستا بە شێوەیەکی تەواو تازە دەیدی و چاوەڕوانی ئەوەی نەدەکرد. ئەمڕۆ بۆی دەرکەوتبوو کە ئانا نابێ قەت جلوبەرگی بنەوش لەبەرکا و شان و شکۆی ئەو لەوەدایە کە خۆی لە نێو جلوبەرگەکەیدا بدرەوشێتەوە و جلوبەرگ قەت ناتوانێ لە هەمبەر جوانیی ئەودا خۆی بنوێنێ، کراسی رەشیش بەو هەموو تۆڕ و گوڵەوە هەر پێوەی دیار نییە. جلوبەرگ وەك چوارچێوەیەك دیمەن و لەشولاری لە باوەش گرتبوو و بێجگە لە جوانیی خۆی کە سادە و سروشتی و پڕشکۆ و لەگەڵ ئەوەشدا پڕ لە گەشە و نەشە بوو، هیچ شتێکی تر سەرنجی رانەدەکێشا.

وەك هەمیشە قیتوقۆز راوەستابوو و کاتێك کە کیتی گەیشتە نێو کۆڕەکە، ئانا سەری بۆ لای خاتوونی میواندار وەڕسووڕاندبوو و لەگەڵی دەدوا. لە وەڵامی پرسیارێکدا دەیگوت: نا، من یەکەم بەرد ناهاوم... ـ پاشان شانی هەڵتەکاند و درێژەی بە قسەکانیدا: ئەگەرچی تێناگەم ـ لەپڕیش بە بزەیەکی پڕ لە خۆشەویستی و پارێزەوە سەری بۆ لای کیتی وەرسووڕاند. چاوێکی تیژ و ژنانەی لە سەرتاپای کیتی کرد و بە ئاستەم سەری لەقاند کە کیتی تێگەیشت رێکوپێکی و جوانیی ئەوی بەدڵە و گوتی: ئێوە بە سەماکردن پێ دەنێنە نێو تەلارەوە؟

کارسۆنسکی کە هەتا ئەو شەوە قەتی ئانا ئارکادیۆڤنا نەدیبوو لەبەر دەمی کڕنۆشێکی کرد و گوتی: ئەو یەکێك لە وەفادارترین یاریدەدەرانی منە. بە یارمەتیی پرێنس کۆڕی سەما رازاوە و پڕ گەشەونەشە دەبێ ـ دیسانیش کڕنۆشێکی کرد و گوتی: ئانا ئارکادیۆڤنا، دێی بۆ دەورێك والْس.

میواندار گوتی: سەیرە، ئێوە یەکتری دەناسن؟

کارسونسکی گوتی: کێ هەیە ئێمە نەیناسێ؟ من و ژنەکەم وەك گای قەشقە واین. هەموو ئێمە دەناسن. ئانا ئارکادیۆڤنا، دێی بۆ دەورێك والْس؟

ـ من ئەگەر بڕیار بێ سەما نەکەم نایکەم.

کارسۆنسکی گوتی: چاکە بەڵام ئەمشەو ناکرێ سەما نەکەی.

لەوکاتەدا ڤرۆنسکی هات بۆ لایان.

ئانا ئارکادیۆڤنا گوتی: دەی ئەگەر وایە و ناکرێ ئەمشەو سەما نەکەم، با دەست پێبکەین ـ بێ ئەوەی هەمیەت بە کڕنۆشی ڤرۆنسکی بدا گورج دەستی هەڵێنا و نایە سەرشانی کارسۆنسکی.

کیتی کە تێگەیشت ئانا ئارکادیۆڤنا خۆی لە کڕنۆشەکەی ڤرۆنسکی گێل کردووە لە دڵی خۆیدا گوتی: «بۆ وا ساردوسڕ بوو لەگەڵی؟» ڤرۆنسکی هات بۆ لای کیتی و یەکەم سەمای وەبیرهێنایەوە و بەداخەوە بوو کە ئەو ماوەیە نەیتوانیوە ببینێ. کیتی بە چاوێکی پەسندەرانەوە دیڕوانییە سەماکردنی ئانا و گوێی لە قسەکانی ڤرۆنسکی گرتبوو. چاوەڕێبوو ڤرۆنسکی داوای لێبکا بۆ سەمای والْس، بەڵام ڤرۆنسکی داوای لێنەکرد و کیتی بە سەرسووڕمانەوە چاوی لێکرد. ڤرۆنسکی سوورهەڵگەڕا و داوای لێکرد سەمای لەگەڵ بکات بەڵام لەگەڵ دەست وەرهێنانی لە قەدە باریکەکەی کیتی و هەڵێنانەوەی یەکەم هەنگاو ئۆرکێستراکە بێدەنگ بوو. کیتی لەو مەودا نزیکەوە چاوێکی پڕ لە گڕی ئەشقی لە چاوی ڤرۆنسکی کرد، بەڵام ڤرۆنسکی وەڵامی سەرنجە پڕ ئەوینەکەی نەدایەوە و کیتی هەتا ساڵانێکی زۆر لە دڵی دەرنەدەچوو.

کارسۆنسکی لەوسەری تەلارەکەوە گوڕاندی: ببوورن، ببوورن، والْس، والْســ هەر خێراش دەستی لە قەدی کچێکی نزیك خۆی وەرهێنا و دەستیکرد بە سەماکردن.

## بیست و سیٚ

ڤرۆنسکی لەگەڵ کیتی چەند دەوری سەمای والّس کرد. پاشان کیتی رۆیشت بۆ لای دایکی و هێشتا چاکوچۆنیی لەگەڵ نۆردستۆن تەواو نەبووبوو ڤرۆنسکی بۆ کادریی یەکەم هات بۆ لای. لە کاتی سەمای کادریدا باسی شتێکی ئەوتۆیان نەکرد. تەنیا کتوپڕ چەند قسەیەکیان سەبارەت بە کارسۆنسکی و ژنەکەی درکاند، کە ڤرۆنسکی بە لەبزێکی گاڵتەجارِانەوە دەربڕی و بە دوو منداڵی چل ساڵانەی شوبهاندن، هەروەها لەمەڕ ئەو شانۆیەی کە بڕیاربوو ئەکتەرانی ئاماتۆر بەرێوەی بەرن برێ دوا، تەنیا جارێك قسەکەی لە دڵی کیتی گران هات کە ڤرۆنسکی هەواڵی لەڤینی لێپرسی، پرسیارەکەشی ئەوە بوو کە هێشتا لەوێ ماوە و گوتی کە زۆری وەبەر دڵ کەوتووە. بەڵام کیتی سەمای کادریی زۆر بە دڵ نەبوو و تامەزرۆیانە چاوەڕوانی مازورکا بوو. پێیوابوو لەگەڵ ئەو سەمایەدا تەکلیفی ژیانی روون دەبێتەوە. ئەوەشی لە دڵ گران هات کە ڤرۆنسکی لە کاتی کادریدا داوای لێنەکردووە بۆ سەمای مازورکا. دڵنیا بوو کە وەك کوڕ و بۆنەکانی دیکە سەمای مازورکای لەگەڵ دەکات، بۆیە پێنج داوای سەمای رەتکردەوە و داوای لێبوردنی کرد کە بەڵێنی بە کەسێکی تر داوە. هەتا دواپین کادریی ئەو کۆڕە بۆ ئەو وەك خەونێکی خۆش و پڕ لە گوڵ و ئاوازی جوان و نەشە و ئەفسووناوی وابوو. تەنیا کاتێك دەستی لە سەما هەڵگرت کە لە رادەبەدەر ماندووبووبوو، بۆیە داوای کرد مۆڵەتی بدەنێ تۆزێ پشوو بدا. بەڵام لە کاتی دواپین کادرییدا کە هاوسەماکەی لاوێکی ئێسکقورس بوو و کیتی نەیتوانیبوو دەستی بە رووەوە بنێ، راست گەیشتە بەردەمی ڤرۆنسکی و ئانا. کیتی لە سەرەتای کۆڕەکەوە چاوی بە ئانا کەوتبوو، ئێستا کە کتوپڕ چاوی پێیکەوت لەبەر چاویدا وا گۆڕابوو کە کیتی بە دیتنی تووشی سەرسووڕمان بوو. کیتی رەنگدانەوەی ئەو حەز و شڵەژانەی لە روخساریدا دی کە خۆی لە ناخەوە هەستی پێکردبوو. دەیدی کە ئانا سەرخۆشی بادەی حەزێکە کە وەك گوڵ گەشاندوویەتەوە. کیتی لەگەڵ ئەو هەستە ئاشنابوو و لە کاریگەرییەکەشی دەگەیشت و خۆی

بەسەری هاتبوو. ئێستاش بە روونی ئەو هەستەی لە نەست و روواڵەتی ئانادا دەدی. وریشەیەکی لەرزان لە چاوی ئانادا شەپۆلی دەدا و بزەیەکی شیرینکامانە و تێکەڵ بە هەیەجانێکی بێ ئیختیار لەسەر لێوی پشکووتبوو، هەڵسوکەوتی ئاوێتەی حەز و ڤیتوقۆزییە ئاشکراکەی هیچی لە زەین و روانینی کیتی شاراوە نەبوو.

لە دڵی خۆیدا دەیگوت: «چییە؟ ئەو سەرخۆشییەی لەبەر کوڕەکەیە یان کەسێك؟» بێ ئەوەی ئاگای لە هاوسەماکەی بێ کە هەوڵی دەدا سەری قسەی لەگەڵ بکاتەوە، بە ئاشکرا خۆی دابووە دەست گوڕە و هاواری پڕ لە نەشە و شادیی کارسۆنسکی کە دەیویست کوڕی سەماکەی وەك بازنەیەکی گەورە و زنجیرەیی لێبکات. کیتی وازر و لەسەر هەست، لە ناخەوە تووشی شڵەژانێکی بێبڕانەوە بووبوو. «نا، ئەو سەرخۆشییە بە بۆنەی کوڕەکەوە نییە. ئەوە حەز و ئەشقی کەسێکە، ئەو کەسەش، بڵێی ئەو بێ؟» هەموو جارێك کە ڤرۆنسکی قسەیەکی لەگەڵ ئانا دەکرد ترووسکەی شادی لە چاویدا دەدرەوشایەوە. بە شیلەبزە و نەرمە قاقا لێوە سوورەکەی دەپشکووت. دەتگوت ئانا لە ناخەوە زۆر بۆخۆی دێنێ کە تاکوو ئەو دیاردەی شادییە هەرچۆنێکە بشارێتەوە، بەڵام دیاردەکان وەك رۆژ بە روخسارییەوە دیاربوون. «ئەی ڤرۆنسکی لە چ بارودۆخێکدایە؟» کیتی کە چاوی بە ئەویش کەوت دڵی داخورپا. ئەوەی لە ئاوێنەی روخساری ئانادا دەیدی لە چاوی ڤرۆنسکیدا دیاربوو. کەوایە ئەو لەسەرەخۆیی و کردەوەی پیاوانە و رواڵەتی بێخەم و ئارامییەی روخساری کوا؟ نا، ئێستا هەرجارێك کە لەگەڵ ئانا قسەی دەکرد، تۆزێ سەری دادەخست، وەك ئەوە وابوو کە بیهەوێ لە بەردەمی کڕنۆش بەرێ و سەری لە عەرزی بسوێ. کە چاوی لە ئانا دەکرد بە ئاشکرا ترس و خۆدۆڕاندنی پێوە دیاربوو. وەك ئەوە وابوو کە هەموو جارێ چاوی پێی بڵێ. «من نامەوێ دڵی کەس برەنجێنم، تەنیا دەمەوێ بە کاوی دڵم بگەم، بەڵام نازانم چۆن؟" رەنگ و رووالەتی جۆرێك بوو کە کیتی قەتی ئاوا نەدیبوو.

ئەوان باسی ئاشنا هاوبەشەکانیان دەکرد و بەڕاستی قسەکانیشیان زۆر بێتام و سووکبوون، بەڵام کیتی پێیوابوو ئەوەی لە دەمیان دێتە دەرێ پێوەندیی بە چارەنووسی ئەوەوە هەیە. سەیرەکەی لەوەدابوو ئەگەرچی ئەوان باسی ئیڤان ئیڤانۆڤیچیان دەکرد کە زمانی فەرەنسییەکەی زۆر قۆڕە یان ئەوەی خاتوو ئیلتسکایا دەیتوانی دەزگیرانێکی باشتر بدۆزێتەوە، بەڵام هەر ئەو قسانە بۆ ئەوان مانەیەکی تایبەتی هەبوو، ئەوان خۆشیان وەك کیتی ئاگایان لەو شتە هەبوو. کیتی بەرچاوی تاریك بوو، دەتگوت تەمێکی خەست سەرلەبەری کوڕەکە و

میوانەکانی داپۆشیوە، تەنیا ئەو حەیا و ئەدەبە بووە بەرهەڵستی کیتی کە لە منداڵییەوە بە سەر پەروەردە و ئەخلاقیدا زاڵ بووبوو، هۆی ئەوەی جۆرێك خۆی نیشان دا کە شوێنەکە هەڵگرێتی. یانی سەما بکات و وەڵامی پرسیارەکان بداتەوە و قسە بکات و پێبکەنێ. بەڵام بەر لە دەستپێکردنی مازورکا و ڕێکوپێك کردنی کورسییەکان، چەند جووتە کوڕ و کچی سەماکار لە ژوورەکانی ترەوە هاتن بۆ تەلاری گەورە و ئەوەش ترسی خستە دڵی کیتییەوە و دۆشداما، چونکە داوای پێنج لاوی ڕەتکردبۆوە و ئێستا ئیتر بۆ سەمای مازورکا هاوسەمای نەبوو. تەنانەت هیوای ئەوەشی نەبوو کە ئیتر کەسێك بۆ سەما بانگی بکات چونکە لە زۆربەی کۆڕەکاندا شەمی کۆڕەکە بوو و بە بیری هیچ کەسدا نەدەهات کە هەتا ئەو کاتە بێهاوسەما مابێتەوەو دەیوسیت بە دایکی بڵێ کە حاڵی باش نییە و پێویستە بڕواتەوە بۆ ماڵێ، بەڵام توانای گوتنی ئەوەشی لە خۆیدا شك نەدەبرد. زۆری هەست بە داماوی دەکرد. خۆی کرد بە ژوورێکی چکۆلەدا و لەسەر کورسیلەیەك دانیشت. داوێنی کراسە سووك و تەنکەکەی وەك هەورێك بە دەوری بەژنە ناسکەکەیدا فش بووبۆوە. دەستە باریك و رووت و ناسك و کچانەکەی کەوتبووە سەر چینی کراسە گوڵی ڕەنگەکەی و لە نێویدا ون بووبوو. دەستەکەی تریشی باوەشێنێکی توند لە قولەمیچەی گرتبوو توند و خێراخێرا روخسارە هەڵبزڕکاوەکەی باوەشێن دەکرد. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کە روخساری دەتگوت پەپوولەیەکی سرکە و لەسەر لقە گیایەك نیشتۆتەوە و ئامادەی هەڵفڕینە و دەیهەوێ باڵە ڕەنگینەکانی بکاتەوە. ناهومێدییەکی سامناك دڵی ڕێك دەگوشی.

"ڕەنگە بە هەڵە چووبێتم و ئەوە وا نەبێ."

دیسان ئەوەی دیتبووی هێنایەوە بەر زەینی خۆی.

کۆنتس نۆردستۆن بە پێدەزکە و بێخشپە بەسەر فەرشەکەدا هات بۆ لای و گوتی: کیتی، ئەوە چبووە؟ من سەرم لەو کارەت ماسیوە.

کیتی لێوی خوارەوەی لەرزی و بەپەلە هەستایە سەرپێ.

ـ کیتی، تۆ سەمای مازۆرکا ناکەی؟

کیتی بە دەنگێکی لەرزۆك و دڵی پڕەوە گوتی: نا، تاقەتم نییە.

کۆنتس گوتی: لەلای خۆم داوای لێکردم پێکەوە سەما بکەن ـ دەشیزانی کیتی تێگەیشتووە مەبەستی کێیە ـ ئەویش پرسیی: مەگین ئێوە لەگەڵ پڕێنس ئیشچر باتسکی سەما ناکەن؟

کیتی وەڵامی دایەوە: هاهوو ویڵیانکە، بۆ من فەرق ناکا.

هیچ کەس نەیدەزانی دەردی چییە و لێی تێنەدەگەیشتن. نەیاندەزانی کە ئەو دەستی بە رووی کەسێکەوە ناوە کە رەنگە لە دڵەوە خۆشی بوێ، بەو هۆیەش دەستی بە روویەوە نابوو کە دڵی لەلای کەسێکی تر بوو.

کۆنتس نۆردستۆن کارسۆنسکیی پەیداکرد کە بڕیاربوو سەمای مازورکای لەگەڵ بکات و پێیگوت کە کیتی بانگ بکات بۆ سەماکردن.

کیتی و هاوسەماکەی جووتی یەکەم بوون و بەختەوەرانە ناچار نەبوو لەگەڵی بدوێ چونکە کارسۆنسکی بەردەوام بۆ رێك خستنی سەمای مازورکا بەملاو بەولادا هەڵدەهات و دەستووری دەدا. ڤرۆنسکی و ئانا لەپێش ئەوەوە دانیشتبوون و کیتی وردبینانە چاوی تێبڕیبوون و هەموو شتێکی دەدی. لە نزیکیشەوە کاتێك کە دەچوون بۆ لای یەکتر کە ببنە جووتەی سەماکار دەیدین و جارلەگەڵجار بەو ئاکامە دەگەیشت کە تووشی هیوابڕاوی دەبێ، دەیدی کە ئەو جووتە لەو تەلارە گەورە و پڕ حەشیمەتەدا هێندە ئەرخەیانن دەڵێی لە ژوانگەدان. کیتی لە روخساری ڤرۆنسکیدا کە هەمیشە چاوقایم و بێقەیدوبەند بوو، جۆرێك شێواوی و خۆدۆڕاندنێکی سەرسووڕهێنەری دەدی، وەك سەگێکی وریا دەچوو کە تووشی هەڵەیەکی گەورە بووبێ.

کاتێك ئانا بزە دەنیشتە سەر لێوی لە روخساری ڤرۆنسکیدا رەنگی دەدایەوە و کاتێکیش مات دەبوو ئەدگاری ڤرۆنسکی حاڵەتێکی جیددی بەخۆوە دەگرت. وزەیەکی بەهێز و نادیار سەرنجی کیتیی بۆ لای روخساری ئانا رادەکێشا. ئانا بەو جلوبەرگە رەش و ساکارەوە زۆر جوان بوو. قۆڵ و زەندە نەرموشل و بە بازنەکەی و گەردنە کێل و بێوێنەکەی بەو ملوانکە مرواریییەوە شاکارێك بوو لە جوانی. بسکی پێچپێچ و تۆزێ شێواوی شکۆی لێدەباری. لەرەو رەوتی نەرم و سووکی لاقی و دەستە ناسك و شلکەکانی و ئەو حەزوکاوەی بە سیمایەوە دیاربوو، بینەری شەیدا دەکرد. بەڵام لە بن ئەو هەموو جوانی و شکۆیەدا شتێکی ترسناك و بێبەزەیی خۆی حەشار دابوو.

کیتی بە چاوێکی پەسندەرانەتر لە پێشوو سەرنجی دەدا و جار لەگەڵ جار زیاتر ئازار دڵ و رۆحی تێك دەشێلا. خۆی وەك شتێکی ورد و پێپەستکراو هەست پێدەکرد و ئەو ژانە جەرگبڕە لە سیمایدا رەنگی دابۆوە. پێشتر لە کاتی سەمای مازورکادا لەگەڵ ڤرۆنسکی ئاشنابووبوو و بەباشی نەیدەناسی و کیتی رەنگی بە رووەوە نەمابوو.

بۆ ئەوەی بێدەنگییەکە بشکێنێ گوتی: کوڕێکی خۆش و بێوێنەیە.

کیتی وەڵامی دایەوە: بەڵێ.

لە کاتی مازورکادا، لەگەڵ بەڕێوەبردنی فیگووری کە کارسۆنسکی تازە دایهێنابوو ئانا هاتە نێو خەڵکەکە و دوو ژن و دوو پیاوی هەڵبژارد و بانگی کردن بۆ لای خۆی کە یەکێك لەوان کیتی بوو، کاتێك بەرەولای ئەو دەڕۆیشت ترس روخساری داگرتبوو. ئانا چاوی زیت کردەوە بۆ ئەوەی سیمای کیتی جوانتر ببینێ، زەردەیەکی گرت و دەستی گوشی، بەڵام کە دیتی سیمای کیتی ترس و خەمی لێنیشتووە رووی وەرگێڕا و روو خۆشانە لەگەڵ خاتوونێکی تر ملی لە قسەکردن نا.

کیتی لە دڵی خۆیدا گوتی: «بەڵێ، شتێکی نامۆ و موقربازانە و شەیتانی لە ناخیدایە.»

ئانا نەیدەویست بۆ شام لەوێ بمێنێتەوە، بەڵام میواندار هەوڵی دەدا نەهێڵێ بڕوا.

کارسۆنسکی قۆڵە رووتەکەی گرت و نایە ژێر باسکی پۆشتەی خۆیەوە و گوتی: ئانا ئارکادیۆڤنا، بۆ هێندە خۆت سەغڵەت دەکەی! شەرمی ناوێ لێرە بمێنەوە. کۆتیلۆنێکی[٥٤] هێندە جوانم رێك خستووە هەر شیرینە سەیری بکەی. ***ئەنتیکەی وا هەر نییە!***

هێندێ خۆی لەراندەوە و هەوڵیدا ئەویش لەگەڵ خۆی ببا. میوانداریش بۆ ئەو پێداگرییەی ئەو، بزەی دەهاتێ.

ئانا بە پێکەنینەوە گوتی: نا، من لێرە نامێنمەوە ـ کارسۆنسکی و میواندار هەردووکیان ئەگەرچی پێکەنینی ئانا ئارکادیۆڤنایان دیبوو بەڵام بە لەبزی جیددیی ئانادا تێگەیشتن کە لەوێ نامێنێتەوە.

ئانا چاوێکی لە ڤرۆنسکی کرد کە لە پەنایدا راوەستابوو و گوتی: نا، من هەتا ئێرەش ئەمشەو لەو جێژنەی ئێوەدا بەقەد سێ مانگەی زستان لە پترزبوورگ سەمام کردووە. بەر لە سەفەرەکەم دەبێ تۆزێك پشوو بدەم.

ڤرۆنسکی پرسیی: کەوایە سبەینێ حەتمەن وەڕێدەکەون؟

ئانا، وەك ئەوەی ئەو پرسیارە کتوپڕە تووشی سەرسووڕمانی کردبێ وەڵامی دایەوە: بەڵێ وێدەچێ ـ تروسکەی چاوانیشی کە نەیتوانی بیشارێتەوە، لەگەڵ وتنی ئەو قسەیە و زەردەگرتنەکەی، ئاوری لە دڵی ڤرۆنسکی بەردا.

ئانا ئارکادیۆڤنا بۆ شێو نەمایەوە و رۆیشت.

---

٥٤- Cotillon سەمایەکی قەدیمی و جۆرێك کادرییە کە فیگۆڕەکانی لەگەڵ واڵس و پۆلکا و سەماکانی دیکە هەر یەکەو تێکەڵاوێکە لە هەموویان.

# بیست و چوار

لەڤین کاتێك لە ماڵی ئیشچر باتسکی هاتەدەرێ و بە پێیان بەرەو ماڵی براکەی وەڕێکەوت لەبەر خۆیەوە گوتی: «بەڵێ، من بوونەوەرێکی قێزەون و ئێسکقورسم. بەکاری هیچ کەس نایەم و پێمدەڵێن قۆڕە دەماخم. بەڵام نا، من لووتبەرز و قۆڕەدەماخ نیم. ئەگەر غوروور و هەوام ببوایە خۆم تووشی ئەو بارودۆخە نەدەکرد.» پاشان ڤرۆنسکی هێنایە بەرچاوی خۆی کە لاوێکی مێهرەبان و بەختەوەر و وریا و لەسەرەخۆیە و قەت خۆی تووشی بارودۆخێکی ئاوا خراپ ناکا. «بەڵێ، جادیارە کیتی هەر دەبێ ئەوی لە من پێباشتر بێ، من لە چاو ئەو هەر هیچ نیم. هەقیش وایە من نابێ لە دەست هیچ کەس سکاڵا بکەم. خەتای خۆمە و بەس. لەخۆڕا پێم وابوو ئەو لەوانەیە مەیلی لێبێ ژیانی هاوبەشم لەگەڵ پێکبێنێ. بۆ من کێم؟ چیم؟ مرۆڤێکی بێهونەر و دەستەوستان کە بەکاری هیچ کەس نایەم و هیچ کارێکم لەدەست نایە.» ئەمجار نیکۆلای برای وەبیرهاتەوە و بە خەیاڵی ئەوەوە خۆی سەرقاڵ کرد و تۆزێ هاتەوە سەرخۆ. «یانی هەق بە ئەو نییە کە دەڵێ هەموو شتێك لەم دنیایەدا خراپ و دزێوە؟ یانی ئێمە سەبارەت بە نیکۆلای برام بە ئینسافەوە داوەریمان کردووە؟ ئەگەر لە روانگەی براکۆڤەوە کە ئەوی بە باڵتەی شڕۆڵەوە و بە مەستی دیتووە بڕوانین، رەنگە شیاوی ئەوە بێ بە سووك و چرووکی دابنێین. بەڵام من ئەو بە جۆرێکی تر دەناسم. من لەگەڵ رۆح و ئەخلاقی ئەو ئاشنام و دەزانم کە ئێمە لەگەڵ ئەو جیاوازین و من لەجیاتی ئەوەی بچم بۆ لای ئەو رۆیشتم بۆ ریستۆرانت و لەوێ نانی نیوەڕۆم خوارد، لەوێشەوە هاتم بۆ ئەم کۆڕە.» لەڤین چووە ژێر دارچرابەرقێك و ناوونیشانی براکەی لە جزدانەکەی باخەڵی دەرهێنا خوێندییەوە و فایتوونێکی بانگکرد. لە ماوەی رێگادا هەتا گەیشتە ئەو میوانخانەیەی کە براکەی لەوێ ژوورێکی گرتبوو ئەوەی سەبارەت بە ژیانی ئەو دەیزانی هەمووی بە روونی هێنایەوە بەرچاوی خۆی. وەبیری هاتەوە کە براکەی لەماوەی ساڵانی زانکۆدا و ساڵێك دوای ئەویش، بێ ئەوەی گوێ بە هاوڕێکانی بدا وەك راهیبان دەژیا و هەموو فەرزەکانی مەزهەبی بەجێدەهێنا و لەو کارەشدا

زۆر سەختگیر بوو. دەچووە کلێسە و ڕۆژووی دەگرت، لە هەموو چێژێك خۆی دەبوارد بەتایبەت قسەکردن و رابواردن لەگەڵ ژنان، کەچی لەناکاو وەك ئەوەی زنجیری پساندبێ و لەگەڵ ناکەسترین مرۆڤی کۆمەڵگا هەڵسوکەوتی کردبێ، بەجارێ گومڕا بوو و دەستیکرد بە ئارەقخۆری و عەیشونۆش و داوێنپیسی. پاشان ماجەرای ئەو کوڕەی وەبیرهاتەوە کە براکەی لە گوندەوە هێنابووی تاکوو بیعاملێنێ، بەڵام ڕۆژێك رقی لێی هەڵدەستێ و کوڕە خوری شۆر دەکات و بەتاوانی لێدان و بریندار کردنی دەیگرن. پاشان ماجەرای ئەو قوماربازە گزەونەی وەبیرهاتەوە کە لە قوماردا گزە لە براکەی دەکات و لێی دەباتەوە، نیکۆلای بەراتێکی دابوویە و پاشان شکایەتی لێکردبوو کە گزەی لێکردووە. (ئەوەش هەر ئەو پارەیە بوو کە سرگی ئیڤانۆڤیچ بۆی دابوو) پاشان وەبیری هاتەوە کە براکەی بەهۆی شەڕ و توندوتیژی شەوێك لە ئاسایش بەند کرابوو، هەروەها سکاڵانامە بێشەرمانەکەی کە دژ بە سرگیئیڤانۆڤیچ دابووی بە دادگا و سوور بوو لەسەر ئەوەی کە براکەی بەشەکەی لە میراتی دایکی بە تەواوی پێنەداوە. دوایین ماجەراش ئەوەبوو کاتێك بۆ کار دەچێ بۆ یەکێك لە پارێزگاکانی ڕۆژاوا لەوێ بە تاوانی لێدانی بەرپرسی کارەکەی دەگیرێ... ئەوانە هەمووی کاری ناحەز و نەشیاو بوون، بەڵام لە روانگەی لەڤینەوە بەو رادەیە خراپ نەبوون کە لە روانگەی ئەو کەسانەوە کە نیکۆلای لەڤینیان نەدەناسی و لەگەڵ ژیانی رابردووی و حاڵ و ڕۆحی ئاشنا نەبوون.

لەڤین لەبیری بوو کاتێك نیکۆلای حەز و تامەزرۆییەکی ڕۆحانی هەڵیدەچۆقاند، ڕۆژووی دەگرت و لەگەڵ راهیبان بووبووە هاودەم و لە ڕێوڕەسمی کلێسەدا بەشداریی دەکرد، بە یارمەتیی مەزهەب دەیویست خۆی لەو بارودۆخە رزگار بکا کە تێیکەوتبوو و بەسەر هەوای نەفسی خۆیدا زاڵ بێ، بەڵام هیچ کەس پشتیوانیی لێنەدەکرد و تەنانەت لەڤین خۆشی سەرکۆنەی دەکرد و پێی پێدەکەنی. بە گاڵتە سەریان دەخستە سەری و پێیان دەگوت «حەزرەتی نووح» یان «جەنابی قەشە». ئەو کاتەی هەوساری پساند و دەستیشی کرد بە کاری نابار و توندوتیژی هیچ کەس یارمەتیی نەدا و هەموو بە ترس و رقەوە چاویان لێدەکرد و خۆیان لێلادەدا.

لەڤین هەستی دەکرد کە براکەی لە ناخەوە و لە قوڵایی دڵییەوە، سەرەڕای ئەو هەموو ناباری و شەڕلاتانییەی بەقەد ئەو کەسانە گومڕا نییە کە ئەو بە سووك و چرووك دەزانن. تاوانی خۆی نەبوو کە خاوەنی ئەو سروشتە سەرکەشە بووبوو و دایمە بیر و فکری ئاڵۆز بوو. ئەو هەمیشە هەوڵی دەدا کە ڕێگەی باش بگرێتە بەر. لەڤین نزیك سەعات یازدە گەیشتە بەر

ئەو میوانخانەیەی کە ناوونیشانەکەی پێبوو، بڕیاری خۆشی دابوو. «ئەوی لە دڵمدایە پێی دەڵێم و ناچاری دەکەم ئەویش ئەوەی لە دڵیدایە بیدرکێنێ، کارێك دەکەم بزانێ کە خۆشم دەوێ و بە باشی لە قسەکانی تێدەگەم.»

دەرگاوان لە وەڵامی لەڤیندا کە سۆراخی براکەی گرتبوو گوتی: نهۆمی سەرێ، وەتاغی ژوومارە دوازدە و سێزدە.

ـ ئێستا لەوێیە؟

ـ بەڵێ، دەبێ لەوێ بێ.

دەرگای ژووری ژومارە دوازدە نیوەکراوە بوو و لە کەلێنی دەرگاکەوە تیشکێك دەهاتەدەرێ. دووکەڵێکی خەست و بۆن ناخۆشی جگەرە لە ژوورەکەوە دەهات و دەنگێکی نائاشناش دەهاتە گوێ. لەڤین لەڕێوە زانیی براکەی لە ژوورێیە، چونکە کۆخەکەی بیست.

کاتێك لە دەرگاکە چووە ژوورێ دەنگە نەناسەکە دەیگوت: هەموو شتێك پێوەندیی بەوەوە هەیە کە ئاکارمان چەندە ئاگادارانە و لە رووی ئەقڵەوە بێ.

کۆنستانتین لەڤین چاوێکی لە ژوورێ کرد و تێگەیشت کە دەنگە نەناسەکە هی لاوێکە کە قژێکی پڕ و قرژ و لوولی هەیە و دەڵێی کڵاوێکی گەورەی لەسەر ناوە، عەبایەکی شۆڕی لەبەردا بوو و چاوی بە ژنێکی جحێڵ و هاوڵاویش کەوت لەسەر قەنەفەکە دانیشتبوو و کراسێکی پەشمینەی بێیەخە و سەرقۆڵی[٥٥] لەبەردا بوو. براکەی دیارنەبوو. کە چاوی بە هاوڕێیانی براکەی کەوت دڵی پڕ بوو. هیچ کام گوێیان لە ترپەی پێی نەبووبوو، لەڤین لەگەڵ ئەوەی خەریکی داکەندنی پێڵاوەکانی بوو گوێی بۆ قسەی لاوی عەبا لەبەر راداشتبوو. ئەو برادەرە مەعلووم نەبوو باسی چ مامەڵەیەك دەکات.

براکەی دەنگی هەڵێنا و دوای کۆخەیەك گوتی: نەحلەت لە چینی دەوڵەمەندان. ماشا، شێوەکە ئامادەکە و ئەگەر هەیە شەڕابیش بێنە، ئەگەر نیشە بنێرە بۆمان بێنن.

ژنە هەستا و هات بۆ لای کەوشکەندەکە و چاوی بە لەڤین کەوت.

گوتی: نیکۆلای دیمیتریچ، پیاوێك هاتووە.

نیکۆلای لەڤین گوتی: کاری بە کێیە؟

کۆنستانتین لەڤین هاتە بەر رۆشناییەکە و گوتی: منم.

---

٥٥- لەو سەردەمەدا لە ڕووسیا باوبوو ژنانی چینیمام ناوەندی کراسی یەخە و سەرقۆڵ سپییان لەبەر دەکرد.

دەنگی نیکولای گڕ و تووڕەتر لە پێشوو هاتە گوێ: من کێیە؟

لەپڕ هەستایە سەرپێ و لاقی لە شتێك گیرا و تەقەی هات، لەڤین لە هەمبەر خۆیدا لەبەر دەرگانەکەدا قەلافەتی کەڵەگەت و چوارشانە و پشتی کووڕی براکەی دی کە زۆر بە لایەوە ئاشنابوو، بەڵام دڕی و تووڕەیی و شوێنەواری نەخۆشین بە قەلافەتییەوە دیاربوو، هەروەها چاوە گەورە و ترس لێنیشتبووەکانی تووشی سەرسووڕمانی کرد.

نیکۆلای لەچاو سێ ساڵ لەمەوبەر کە لەڤین دوایین جار دیتبووی کزتر بووبوو. چاکەتێکی بێقۆڵی لەبەردا بوو و باسك و دەست و مەچەکی پان و ئەستوورتر لە پێشوو هاتە بەرچاوی. مووی سەری تەنکتر بووبوو، سمێڵی هەروا ساف و لووس بەسەر لێویدا شۆڕبووبۆوە و هەر بەو چاوە سەیر و سایلۆحانەیەوە تێیڕامابوو.

لەگەڵ ناسینەوەی براکەی ترووسکەی شادی لە چاوانیدا درەوشایەوە و گوتی: ئاخ، کوستیا! ـ بەڵام هەر لەو کاتەدا سەری وەرسووڕاند و چاوێکی لە لاوەکە کرد و سەر و ملی بە لەرینێك کە لەبەر چاوی کۆنستانتین دەتگوت بۆینباخەکەی لە ملی توند بووە بۆ لایەك لەقاند و رەنگی روخسارە کزەکەی هەڵبزڕکا، هەر لەگەڵ ئەوەشدا ئاسەواری تۆقین و رەنج و بێڕەحمی لە چاوانیدا مایەوە و گوتی: من بۆ تۆ و سرگی ئیڤانۆڤیچم نووسیبوو کە ناتانناسم و حەزیش ناکەم بتانناسم و چاوم بە چاوتان بکەوێ. تۆ... جەنابی هێژا چیت لە من دەوێ؟

نیکۆلا قەت ئەو کەسە نەبوو کە لەڤین بیری لێدەکردەوە و دەیهێنایە بەرچاوی خۆی. کاتێك بیری لێدەکردەوە ئەویکە دژوارترین و قێزەونترین لایەنەکانی خولق و خووی ئەو و لایەنەکانی هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەوی زۆر بەلاوە دژوار کردبوو هەمووی لەبیر بردبۆوە، بەڵام ئێستا کە روخساری ئەو و بەتایبەت ئەو لەرزینەی سەری براکەی چاو پێکەوت هەموو ئەو حاڵەتانەی وەبیرهاتەوە.

شەرمێونانە گوتی: من هیچم لە تۆ ناوێ. تەنیا هاتووم چاوم پێت بکەوێ.

ئەو شەرمنییەی لەڤین نیکۆلای خاو کردوەوە و لێوی لەرییەوە.

گوتی: ئەها، هەر بۆ ئەوە هاتووی؟ چاکە، وەرە ژوورێ، دانیشە، شێو دەخۆی؟ ماشا بڵێ سێ دەست بێنن. نا، پەلەمەکە ـ رووی کردە براکەی و پیاوە عەبا لەبەرەکەی پیشاندا و گوتی: تۆ دەزانی ئەوە کێیە؟ ئەوە ئاغای کریتسکییە. لە هاوڕێیانی کییۆڤی[٥٦] منە و زۆر کوڕێکی باشە. هەڵبەت پۆلیس بە دوایدا دەگەڕێ، چونکە پەست و خوێڕی نییە.

---

56 Kief

بەپێی عادەتی خۆی، چاوێکی لە حازرانی نێو ژوورەکە کرد و کە ژنەکەی دی لەبەر دەرگاکە راوەستاوە و ئامادەی رۆیشتنە، گوڕاندی: دەڵێم پەلە مەکە ـ هەر بەو زمانە ناپاراو و لاڵەپەتەیەوە و بەو ئاخافتنە نارەوانەیەوە کە کۆنستانتین بە جوانی دەیناسی، دوای ئەوەی دیسان چاوێکی لە حازران کرد دەستیکرد بە گێڕانەوەی سەربردەی کریتسکی بۆ براکەی کە چۆن بە تاوانی دامەزراندنی کۆمەڵەیەك بۆ یارمەتیدانی خوێندکارانی دەستکورتی زانکۆ و هەروەها دانانی پۆلی فێرکاری بۆ رۆژی یەکشەممانە، لە زانکۆ دەرکراوە، پاشان لە قوتابخانەیەکی سەرەتایی بۆتە مامۆستا و لەوێش دەرکراوە و پاشان بە بیانووی شتێکی ترەوە کێشاویانەتە بەر مێزی موحاکەمە لە دادگا.

کۆنستانتین لەڤین بۆ ئەوەی کە ئەو بێدەنگییە ناخۆشەی زاڵ بەسەر هۆدەکەدا بشکێنێ گوتی: ئێوە خوێندکاری زانکۆی کییێف بوون؟

کریتسکی نێوچاوانی تێکنا و بە رقەوە وەڵامی دایەوە: بەڵێ، من خوێندکاری زانکۆ بووم لە کییێف.

نیکۆلای لەڤین پەڕییە نێو قسەکانی و ئاماژەی بە ژنەکە کرد و گوتی: ئەو ژنەش هاوڕێی ژیانی منە، لە بەستۆکەخانە هێناومە ـ ئەوەی گوت و دیسان ملی لەقاند: بەڵام خۆشم دەوێ و رێزی بۆ دادەنێم ـ پاشان نێوچاوانی گرژ کرد و گوڕاندی: هەرکەسێکیش بیهەوێ لەگەڵ من تێکەڵیی هەبێ و هاتوچۆم بکات داوای لێدەکەم رێزی بۆ دانێ و خۆشی بووێ. چونکە لەگەڵ ژنی خۆم هیچ جیاوازییەکی نییە، هیچ جیاوازییەك. ئێستا بۆت دەرکەوت لەگەڵ کێ تێکەوتووی. ئەگەر پێتوایە ئەو هاتنەت بۆ ئێرە بۆتە مایەی شەرمەزاری و پێت عەیبە، فەرموو برۆ دەرێ و ئاوڕ مەدەوە.

دیسان بە وردی چاوێکی بە حازریاندا گێڕا.

ـ نازانم بۆ دەبێ هەست بە شەرمەزاری بکەم؟

ـ زۆر چاکە، ماشا، برۆ خواردن بێنە. سێ دەست، لەگەڵ ڤۆدکا و شەراب... نا، راوەستە... نا، پێویست ناکا... برۆ.

# بیست و پێنج

نیکۆلای لەڤین لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: دیوتە... ـ نێوچاوانی گرژتر کرد و بە توندی سەری لەقاند، دیاربوو نازانێ بڵێ چی و چ بکا: دیوتە...ـ دەستەیەکی میلەی ئاسنین کە بە پەتێك بەسترابوون و لە سووچێکی ژوورەکە هەڵپەسێردرا بوون، نیشانی براکەی دا و گوتی: ئەوانەت دیوە؟ ئەوە سەرەتای کارێکی تازەیە کە دەمانەوێ دەستی پێبکەین. ئەوەش کارێکی تازەی شەریکەیەکی هاویاریی بەرهەمهێنانە...

کۆنستانتین گوێی بە قسەکانی نەدەدا. چاوی لە روخسارە زەردەڵ و کزەکەی بڕیبوو کە دەتگوت سیلدارە و هەرچی زیاتر لێی ورد دەبۆوە زیاتر زگی پێی دەسووتا و نەیدەتوانی خۆی ناچاربکات و گوێ لەو قسەنانەی بگرێ کە سەبارەت بە شەریکە هاویارییەکەی دەیکرد. دەیزانی کە ئەو شەریکە هاوییارییە تەنیا بەهانەیەکە بۆ دڵخۆش کردنی خۆی و بەخەیاڵ خۆی بە کاسب دەزانێ. نیکۆلای لاڤین درێژەی بە قسەکانیدا: خۆ دەزانی سەرمایەدارەکان دەیانەوێ خوێنی کرێکاران بمژن و بیانچەوسێننەوە. کرێکاران لە وڵاتی ئێمە ئەو رەعیەتە لێقەوماوانەن کە هەرچی کاری گران و تاقەتپڕووکێنە لە ئەستۆیانە و هێندە چارەڕەش و بێدەرەتانن هەرچەندە هەوڵ دەدەن و لە خۆیان دەنووسێن لەو چارەڕەشی و لێقەوماوییە رزگاریان نابێ. تەواوی ماف و دەسترەنج و داهاتیان کە دەتوانێ خۆیان و ژیانییان ببووژێنێتەوە و ببێتە هۆی حەسانەوە و تواناییی ئەوەیان بداتێ بەرەو فێربوون و داهاتوویێکی رووناك هەنگاو هەڵگرن، سەرمایەداران لە چنگیان دەردێنن، رێکخراوی کۆمەڵگاش جۆرێکە هەرچەندە ئەوان زیاتر کار بکەن، بەرهەم و داهاتیان دەڕژێتە گیرفانی مالیکان و بازاڕییانەوە و رەنجبەران و کرێکاران هەمیشە وەك ئاژەڵ دەدۆشرێن و بار دەکرێن. ـ پاشان لە روخساری براکەی وردبۆوە و بەو ئاکامە گەیشت: ئەو بارودۆخەش پێویستە بگۆڕدرێ.

کۆنستانتین لەڤین چاوی لەو پەڵە سوورەی سەر روومەتی رەقوتەقی براکەی بڕی و گوتی: بەڵێ، وایە و لەگەڵتام.

ـ ئێمەش ئەو شەریکە هاوپارییەی ئاسنگەران ساز دەکەین کە لەوێدا هەموو ئەندامان کاری خۆیان لە ئەستۆیە و بەرهەم و قازانجی کارەکەشیان لە هەمووشی گرینگتر کەرەسەی بەرهەم هاتوو هی هەموویانە.

کۆنستانتین لەڤین پرسیی: شوێنی شەریکەکەتان لەکوێیە؟

ـ لە گوندی ڤازدرێمای[57] پارێزگای کازانە.

ـ جا بۆ لە دێ؟ من پێموایە لە دێ ئەگەر شەریکەش نەبێ ئیش و کار زۆرە.

نیکۆلای لەڤین بە لەبزێکی توورە و تۆسنانەوە دەنگی هەڵێنا: ئاخەر ئەوەش هی ئەوەیە رەعیەتەکانی ئەمڕۆ وەك رابردوو نابنە کۆیلەی ئەربابەکان و تۆ و سرگی ئیڤانۆڤیچیش ناتانەوێ و چاوتان بەرایی نادا بیبینن کەسانێك ئامادەن ئەوان لەو نەگبەتی و کۆیلەییە رزگار بکەن. کۆنستانتین چاوێکی لە دار و دیواری ژووری پیس و شێدارەکەیان کرد و هەناسەیەکی هەڵکێشا. ئەو هەناسەیەش وەك ئەوە وابوو کە بیهەوێ زیاتر رقی براکەی هەستێنێ.

ـ من دەزانم تۆ و سرگی ئیڤانۆڤیچ چیتان لە ژێر سەردایە. دەزانم کە ئەو بە هەموو توانایەوە هەوڵ دەدا و بیردەکاتەوە کە ئەم بارودۆخەی ئێستا زیاتر بخایەنێ.

لەڤین زەردەیەکی گرت و گوتی: جابۆ لە سرگی ئیڤانۆڤیچت هەڵپێچاوە؟

نیکۆلای لەڤین بە بیستنی ناوی سرگی ئیڤانۆڤیچ لەپڕ گوڕاندی: سرگی ئیڤانۆڤیچ؟ چونکە... چونکە... هەر لەخۆڕا لەسەری دەڕۆین! من تەنیا شتێك دەڵێم... پێمبڵێ تۆ بۆ هاتووی و دەرگات پێگرتووم؟ بڕۆ لەکۆڵم بەوە. تۆ ماڵەکەمت پێ پیسە، دەی چاکتر، بڕۆ با لەوە زیاتر قێزت هەڵنەشێوێ، بڕۆ ئیتر بەرچاوم بەردە... ـ لەجێی خۆی هەستا و گوڕاندی: بڕۆ دەی، بڕۆ... بڕۆ...

کۆنستانتین لەڤین شەرمانە گوتی: ئەو قسانە چییە؟ من ماڵەکەت بە ماڵی خۆم دەزانم. باشە ئیتر لەو باسە گەڕێین و من لەوە زیاتر لەسەری ناڕۆم...

لەوکاتەدا ماریا نیکۆلایۆڤنا گەڕایە. نیکۆلا لەڤین بە رقەوە چاوێکی لێکرد. ژنە هاتە پەنای و سرتاندی بە گوێیدا.

نیکۆلای لەڤین کە لەبەر توورەیی وەهەناسەبڕکێ کەوتبوو تۆزێ خاو بۆوە و گوتی: من نەخۆشم و ئەعسابم خراپە، تۆ باسی سرگی ئیڤانۆڤیچ و وتارەکەیت کرد. ئەو وتارەش زۆر قۆڕ

---

57- Vozdrema

و بێسەرە و بەرەیە و سەرتاپای هەڵە و خۆفریودانە. ئاخەر کەسێك کە خۆی مانای عەداڵەت نازانێ چۆن دەتوانێ وتاری لەبارەوە بنووسێ؟ ـ دیسان لە پشت میزەکە دانیشتەوە و تۆزێ جگەرە نیوە پێچراوەکانی خستە ئەولاوە و رووی کردە کریتسکی و گوتی: ئێوە وتارەکەیتان خوێندۆتەوە؟

کریتسکی کە دیاربوو نایهەوێ بێتە نێو مشتومڕەکەوە وەڵامی دایەوە: نا، نەمخوێندۆتەوە.

نیکۆلای لەڤین ئەمجار بە تووڕەیی چاوی لە چاوی کریتسکی بڕی و پرسیی: بۆ نەتخوێندۆتەوە؟

ـ چونکە بە پێویستیی نازانم کاتی خۆم بە خوێندنەوەی شتیوا بە فیڕۆ بدەم.

ـ دەکرێ بفەرموون بۆ خوێندنەوەی ئەو وتارە بە کاتبەفیڕۆدان دەزانن؟ زۆر کەس هەن فامی ئەوەیان نییە لەو وتارە تێبگەن. یانی سەوادی ئەوەیان نییە وتاری وا بخوێننەوە. من لەگەڵ ئێوە جیاوازم. من ئەودیوی بیرۆکەی ئەو دەبینم و لە خاڵە لاوازەکانی دەگەم.

هەموو بێدەنگ بوون. کریتسکی لەسەرەخۆ هەستا و دەستیدا کڵاوەکەی.

ـ شێو ناخۆی؟ زۆر چاکە، بەخێر چی! سبەینێ لەگەڵ ئاسنگەرەکە وەرن.

لەگەڵ رۆیشتنە دەرەوەی کریتسکی لە ژوورەکە نیکۆلای لەڤین پێکەنی، چاوێکی قرتاند و گوتی: ئەوەش هیچ کارێکی لەخۆ نەگرتووە... پێتوایە من نازانم...

بەڵام لەوکاتەدا کریتسکی لەبەر دەرگاکەوە بانگی کرد. نیکۆلای گوتی: چییە، چیت دەوێ؟ ـ رۆیشتە داڵانەکە بۆ لای. لەڤین کە لەگەڵ ماریا نیکۆلایۆڤنا تەنیا کەوت رووی تێکرد و پرسیی: ببوورە لەمێژە لەگەڵ نیکۆلای برام پێکەوەن؟

ژنە گوتی: دوو ساڵە. حاڵی باش نییە. زۆر دەخواتەوە.

ـ چ مەشروبێك؟

ـ زیاتر ڤۆدکا، زۆریش خراپە بۆی.

لەڤین بە ئەسپایی گوتی: هەر بەڕاستی زۆر دەخواتەوە؟

ژنە شەرمنانە گوتی: بەڵێ ـ هێواش سەری بۆ لای دەرگاکە وەرسووڕاند. نیکۆلای لەڤین هاتەوە ژوورێ. نێوچاوانی تێکنابوو. پرسی: چیتان دەگوت؟ ـ خێرا خێرا چاوی لێدەکردن و سەرنجی پڕ لە رق و ترسی هەرجارەی لەسەر روخساری یەکیان دەگیرسایەوە: باسی چیتان دەکرد؟

کۆنستانتین پەشۆکاوانە گوتی: هیچ، باسی هیچمان نەدەکرد.

ـ پێم نالێن، مەیلێن، کەیفی خۆتانە. بەڵام تۆ نابێ لەگەڵ ئەوە قسە بکەی، چونکە ئەو ژنێکی بەستۆکەیە و تۆش ئەربابی ـ کە ئەوەی گوت بێ ئیختیار سەروملی لەرییەوە. دیسان دەنگی بەرزکردەوە و درێژەی بە قسەکانیدا: دەزانم لە هەموو شتێك گەیشتووی و سەروبەری ژیانت هەڵسەنگاندووە و بەزەییت پێمدا دێ.

ماریا نیکۆلایۆڤنا دیسان هاتە پەنای و بە گوێیدا سرتاند: نیکۆلای دیمیتریچ، نیکۆلای دیمیتریچ.

ـ باشە، باش... شێوەکە بووبەچی؟ ـ کە چاوی بە پێشخزمەتی میوانخانەکە کەوت دەست بە کەشەفەوە هاتەژووری گوتی: ئەوەش شێوـ پاشان نێوچاوانی تێکنا: وەرە، لێرەی دانێ ـ هەر خێراش بتلی ڤۆدکاکەی هەڵگرت و پەرداخێکی بۆ خۆی تێکرد و بە هەڵپە نای بەسەرییەوە. رقەکەی نیشتەوە و بە پێکەنینەوە بە براکەی گوت: بێنە بۆت تێکەم، دەخۆیەوە؟ گوێ بە قسەی سرگی ئیڤانۆڤیچ مەدە، ئیتر هەر باسی ناکەین، بە دیتنت چاوم روون بۆوە. هەرچییەکیش بلێی قەیناکا، خۆ بێگانە نیی ـ پەنچکێ نانی نایە دەمی و بەپەلە سەگ بە حەوشەیەکی پێکرد و پەرداخێکی تری بۆ خۆی تێکرد و گوتی: بخۆ، بۆ راوەستاوی؟ دەی بۆم باسکە، ئێستا خەریکی چیی؟ ژیان چۆن رادەبوێری؟

کۆنستانتین وەڵامی دایەوە: وەك پێشوو، هەر لە دێ دەژیم، سەڵت و رەبەن، خەریکی کشتوکاڵم ـ بە سەرسوورِمانەوە چاوی لە دەست و دەمی براکەی دەکرد کە ئاوا بە هەڵپە دەخوا و هەوڵی دەدا سەرنج و نیگەرانیی خۆی لە براکەی بشارێتەوە.

ـ دەی، بۆ ژن ناهێنی؟

کۆنستانتین سوورهەڵگەڕا و وەڵامی دایەوە: بۆم نەلواوە تا ئێستا.

ـ بۆ؟ من تا ئێستا بە سەڵتی رامبواردووە دەزانم ژیانم بە با چووە و کارم تەواوە. هەمیشە گوتوومە و دیسانیش دەیلێمەوە، ئەگەر هەر ئەو کاتە بەشەماڵەکەی منیان بدایە کە پێویستم پێیبوو ژیانم بە تەواوی دەگۆڕا.

کۆنستانتین بە تاڵووکە باسەکەی گۆڕی و گوتی: زانیوتە ڤانیۆشکا[٥٨]ی تۆ لە پاکرۆڤسکۆی[٥٩] لای من بۆتە کارمەندی نووسینگە؟

---

٥٨- سووکەڵە ناوی ڤانیا کە خۆشی سووکەڵە ناوی ئیڤانە

59- Pokrovskoye

نیکۆلای خەیاڵ هەڵیگرت و سەروملی لەرییەوە و گوتی: دەی بۆم باسکە بزانم هەواڵی پاکرۆڤسکۆی چییە؟ ماڵە قەدیمییەکەمان هەرماوە؟ دارتووزەکان و ژووری دەرسەکەمان؟ فیلپی باخەوان ماوە؟ چارداخی نێو باخەکە و قەنەفەی ژووری میوانداری هێشتا هەر لەبەرچاومن. دەزانیچی ئەگەر ماڵەکە وەك خۆی ماوە دەستی لێمەدە، هەتا دەتوانی زووتر ژن بێنە و هەموو شتێك وەك پێشوو لێبکەوە، جا ئەگەر ژنەکەت جوان بێ من دێمەوە بۆلات.

لەڤین گوتی: دەی ئێستا بۆ نایەی؟ ئێمە دەتوانین لەوێ زۆر بە باشی پێکەوە بژیین.

ـ ئەگەر خاترجەم بوایەم لەوێ چاوم بە سرگی ئیڤانۆڤیچ ناکەوێ، دەهاتمەوە.

ـ خاترجەمبە، لەوێ چاوت پێی ناکەوێ. من بە تەنیام و کارم بەسەر ئەوەوە نییە.

بە چاوی پڕ لە شەرم و شکۆوە روانییە چاوی و گوتی: بەڵێ، بەڵام سەرەڕای ئەوانەش تۆ دەبێ لەنێوان من و ئەودا یەکمان هەڵبژێری.

شەرمی چاوانی شوێنی لەسەر دڵی کۆنستانتین دانا. گوتی: ئەگەر بتهەوێ ئەوەی لەو بابەتەوە لە دڵمدایە بیزانی گوێ بگرە، من کارم بەسەر کێشە و ناکۆکیی ئێوەوە نییە و هەردووکتان برامن، بۆیە نە لایەنگری لە تۆ دەکەم و نە لە ئەویش. ئێوەش هیچتان بێخەتا نین. خەتای تۆ زیاتر رواڵەتییە و خەتای ئەویش دەروونییە.

نیکۆلای دڵخۆشانە دەنگی هەڵێنا: تۆ ئەوەت زانیوە؟ یانی تۆ لەوە گەیشتووی؟

ـ بەڵێ، ئەگەر راستیشت دەوێ، من هاوڕێیەتیی تۆم زۆر لە هی ئەو پێخۆشترە، چونکە...

ـ دەی بۆ؟ بۆچی؟

کۆنستانتین نەیدەتوانی بڵێ لەبەرئەوەی تۆ لێقەوماو و چارەڕەشی و پێویستت بە هاوڕێیە. بەڵام نیکۆلای تێگەیشت کە مەبەستی براکەی هەر ئەوەیە و گرژ بوو و دیسان دەستیدا بترییەکە.

ماریا نیکۆلایۆڤنا دەستی رووت و گۆشتنی خۆی کێشا کە بترییەکەی لە دەست بستێنێ و گوتی: بەسە ئیتر نیکۆلای دیمیتریچ.

نیکۆلای گوڕاندی بە سەریدا: بەریدە، تۆ خۆت لەو شتانە هەڵمەقوتێنە، لێتدەدەم ها.

بزەیەکی شیرین نیشتە سەرلێوی ماریا نیکۆلایۆڤنا، شوێنی لەسەر نیکۆلای دانا و بترییەکەی لە دەستی وەرگرت.

نیکۆلای گوتی: پێتوایە ئەو هیچ نازانێ؟ هەموو ئەوانە لە من و تۆ چاکتر تێدەگا. راستییەکەی ئەوەیە کە شتێکی باش و دڵگری پێوەیە وانییە؟

کۆنستانتین بۆ ئەوەی شتێکی گوتبێ رووی لە ژنە کرد و گوتی: ئێوە پێشتر نەهاتوون بۆ مۆسکۆ؟

نیکۆلای گوتی: پێی مەڵێ ئێوە، دەترسێ. هیچ کەس تا ئێستا پێی نەگوتووە ئێوە. تەنیا کاتێك کە لە بەستۆکەخانە هەڵاتبوو و پاشان گرتبوویانەوە قازی لە دادگا پێی گوتبوو ئێوە ـ لە ناکاویش گوڕاندی: خوداگیان لەم دنیایەدا شتی بێ مانا چەندە زۆرن! ئەم دایرە تازە دامەزراوانە، ئەم دادگایانە، ئەم زێمستیڤایە چ کێشە و ئاڵۆزییەکی سەیرە!

پاشان دەستیکرد بە گێڕانەوەی ئەو کێشە و ناکۆکییانەی پێشووی لەگەڵ دایرەکان.

کۆنستانتین لەڤین گوێی بۆ قسەی براکەی راداشتبوو. چونکە لە دڵەوە حاشای لەو دامەزراوانە دەکرد و ددانی خێری پێدا نەدەهێنان ـ زۆر جاریش ددانی پێدا دەنا و لەو بوارەوە لەگەڵ براکەی هاوڕا بوو ـ ئەو رق و ناکۆکییانەی لەگەڵیان لە قسەکانیدا رەنگی دەدایەوە و ئەو داوەرییانەش شوێنێکی ناخۆشی لەسەر دڵی دادەنا.

بە گاڵتەوە گوتی: هەموو ئەوانەمان لەو دنیا بۆ روون دەبێتەوە.

چاوی ترسی لێنیشتبوو و سلۆکیی نیکۆلای لەسەر روخساری لەڤین گیرسابۆوە. گوتی: «ئەو دنیا؟ حەزم لەو دنیا نییە و پێم خۆش نییە هەر ناویشی ببیستم. ئەگەرچی بەجێهێشتنی ئەم دنیایەیە و دەربازبوونە لە دەست چەپەڵی و سووکایەتی، جا چ هی خۆمان بێ و چ هی خەڵکی، بەڵام من لە مردن دەترسم، زۆر لە مەرگ دەترسم ـ لەپڕ مۆچڕکێکی پێداهات. پاشان درێژەی بە قسەکانیدا: شتێك بخۆ، دەمت تەڕکە، شامپانیت بۆ تێکەم؟ پێتخۆشە بچین بۆ ریستۆڕانت؟ حەزدەکەی بتبەم بۆ لای قەرەجەکان؟ دەزانی، بەینێکە هۆگرییەکی زۆرم بە گۆرانیی رووسی و قەرەجەکان هەیە.

کەوتبووە منجەمنج و خێراخێرا بابەتی قسەکەی دەگۆڕی. کۆنستانتین بە یارمەتیی ماشا پێملیان کرد کە نەچێ بۆ هیچ کوێ، پاشان کە دیتیان زۆر سەرخۆشە و هۆشی نەماوە خەواندیان. ماشا بەڵێنی پێدا کە پێویستی بە شتێك بوو نامەی بۆ بنووسێ و نیکۆلای لەڤین پێمل بکات کە بچێت بۆ گوند و لەلای ئەو بمێنێتەوە.

# بیست و شەش

کۆنستانتین لەڤین بەیانی لە مۆسکۆ وەدەرکەوت و لای ئێوارە گەیشتەوە گوندەکەیان. لە ماوەی رێگادا و لە نێو ڤاگۆنی شەمەندەفەرەکەدا لەگەڵ هاوسەفەرەکانی باسی سیاسەت و هێلاسنی نوێی دەکرد و وەك ئەو کاتەی کە لە مۆسکۆ بوو بەهۆی ئالۆزیی بیروڕا و رقهەستان لەخۆی و شەرمێك کە روون نەبوو بەهۆی چییەوەیە تووشی کەسەر و دڵگرانی بووبوو، بەڵام کاتێك لە وێستگە دابەزی و کاشەوان یەکچاوەکەی خۆی ئیگناتی ناسییەوە کە ملیوانەی کەڵپۆسەکەی هەڵدابۆوە و لەبەرشۆقی کزی پەنجەرەی وێستگەکە کاشەکەی بە تەختی فەرش کراوەوە لە ئەسپەکان بەستبوو، کلك و یاڵ و بەرچاوکەی ئەسپەکان بە گوڵێنك و خشڵ و قاش و مەنگۆڵە رازابوونەوە و کاتێك کە ئیگنات بارگەوبنەکەی خستە سەر خێشکەکە و باس و خەبەری گوندی پێڕاگەیاند و گوتی کە پەیمانکار هاتووە و پاوا زاوە گوێلکێکی جوانی بووە، وردە وردە هەستی کرد کە خەریکە دێتەوە سەرخۆ و دڵی ئارام دەبێتەوە و شەرم و رق لەخۆ هەستانەکەی دەڕەوێتەوە. ئەو هەستەش بە دیتنی ئیگنات و ئەسپەکان لە دڵیدا سەری هەڵدا، بەڵام کاتێك ئەو کەڵپۆسەی لەبەرکرد کە بۆیان هێنابوو خۆی گەرم داپۆشی و لەنێو کاشەکەدا دانیشت و وەڕێکەوتن. لە رێگا بیری لەوە دەکردەوە کە چۆن بۆ کاروبارەکانی دێ دستوور بە خەڵکی بدا و لە ئەسپە کاشە کێشەکەی روانی کە سەردەمێك بۆ سواری وەك باوبۆران وابوو، بەڵام ئێستا لاواز و جدەو بووبوو و لە کاشەیان دەبەست، بۆیە لەپڕ خەیاڵ و بیرۆکەی گۆڕانی بەسەردا هات و بە چاوێکی تر لە رابردووی روانی. خۆی ئەو جۆرەی کە بوو دۆزییەوە و دیتی حەز ناکات مرۆڤێکی تر بێت. ئێستا تەنیا دەیویست لە پێشوو باشتر بێ. سەرەتا بڕیاریدا ئیتر لەو رۆژەوە بە هیوای بەختەوەریی بێوێنە نەبێ کە بەهۆی ژنهێنانەوە پێیوابوو پێیدەگات و بەو بیر و خەیالانە ئێستای خۆی نەفەوتێنێ، هەروەها قەت پێملی ئەو مامەڵە نەگبەتە نەبێ کە بیرکردنەوە لەو کاتەی کە خۆی بۆ خوازبێنی ئامادەدەکرد ئاوا ئازاری دابوو. پاشان نیکۆلای برای وەبیرهاتەوە و بەڵێنی بەخۆی دا کە ئاگای لەویش بێ و چاوی لێ خافڵ نەکات

و هەرکاتێك کەوتە تەنگانە و پێویستی پێیبوو بگاتە فریای. پاشان قسەکانی براکەی وەبیرهاتەوە کە سەبارەت بە کۆمۆنیزم بوو و ئەو کاتە زۆری گوێ پێنەدابوو بەڵام ئێستا بیری لێدەکردەوە. ئەو گۆڕانکاریی بنەڕەتیی لە سیستمی ئابووریدا بە شتێکی بێ مانا دەزانی، هەمیشە ئەو کاتانەی خۆشگوزەرانیی خۆی لەگەڵ خەڵکی هەڵدەسەنگاند و دەیدی دەستەنگ و لێقەوماون، خۆی بە زاڵم دەزانی و ئێستا بۆ ئەوەی باری ئەو زوڵمە لەسەر شانی خۆی سووك بکات، ئەگەرچی لە رابردووشدا ئەهلی رابواردن و کۆڕ و کۆبوونەوە نەبوو و خۆی لەو شتانە دەبوارد، بەڵێنی بەخۆی دا کە لەمەوبەدواوە زیاتر لە رابردوو هەڵسووڕ بێ و خۆی لەو کۆڕە جاروبارانەش ببوێرێ. ئەو کارانەش هێندە بەلایەوە ئاسان بوون کە لە تەواوی مەودای رێگادا بیری لێکردەوە و دەتگووت خەونێکی شیرین دەبینێ و بە دڵێکی پڕ لە شادی و هیوا بە ژیانێکی چاکترەوە، سەعات نۆی شەوێ کەیشتەوە ماڵێ.

لە پەنجێرەی ژووری دایەنی پیر، ئاگافیامیخائیلۆڤناوە شۆقێك لە بەفری بەر باڵەخانەکەی دەدا. ئەو پیرێژنە سەر سپییە کەیخوداژنی ماڵێ بوو. دیاربوو هێشتا نەخەوتووە. کۆزمای لە خەو هەستاندبوو و بە چاوی خەواڵوو و بە پێخاوسی ناردبوویە سەر پلیکانەکان. لاسکا، کە دێڵە تاژییەکی بە بازوبرد بوو هێندە بە پڕتاو دەرپەڕییە دەرێ و خۆیدا بە لاقی کۆزمادا خەریکبوو بیدا بە زەویدا. بەغار رۆیی بۆ لای لەڤین و بە نووزەنووز خۆی لە داوودەلینگی هەڵساوی و دەستی کرد بە کلکە سووتێ. لە بەردەمی لەڤین هەڵدەستا سەرپاشوو دەیویست خۆ بخاتە باوەشی بەڵام نەیدەوێرا.

ئاگافیامیخائیلۆڤنا گوتی: بۆوا زوو گەڕایەوە باوکەکەم؟

لەڤین وەڵامی دایەوە: تاقەتم بەسەرچوو ئاگافیامیخائیلۆڤنا. لە قەدیمەوە گوتوویانە «کششە کششە، مریشکە رەشە، میوان رۆژێك و دووان خۆشە.» پیاو لە ماڵی خۆی نەبێ ناحەسێتەوە ـ ئەوەی گوت خۆی کرد بە ژووری کارەکەیدا.

مۆمیان هێنا و ژووری کارەکەی وردە وردە رووناك بۆوە. کەلوپەل و دارو دیواری وەدیار کەوتن: شاخی بزنەکێوی بە دیوارەوە و دۆڵابی کتێب و ئاوێنەی سەر تاقە و دربیجەی خەفەنگ کە ماوەیەکی زۆربوو برِیاربوو دەستێکیان پێدابێنێ، قەنەفەکەی باوکی و کورسییە گەورەکە و کتێبێکی کراوە کە لە سەرێ بەجێمابوو و تەپڵەکێکی شکاو و دەفتەرێك کە ئەو بە خەتی خۆی هێندێ شتی تێدا نووسیبوو. کاتێك چاوی بەو شتانە کەوت بۆ تاوێك دوو دڵی دایگرت کە بڵێی وازهێنان لەو ژیانە و داڕشتنی گەڵاڵەیەکی نوێ کە لە ماوەی رێگادا بیری

لێدەکردەوە و پێوەی سەرقاڵ بوو بگونجێ؟ وەك ئەوە وابوو کە ئەو نیشانە و دیاردانەی دەوروبەری کە تایبەت بە ژیانی رابردوو بوون پێی بڵێن: «نا، تۆ دەست لە ئێمە بەرنادەی و نابیتە مرۆڤێکی تر و هەر ئەوە دەبی کە هەی: وەك هەمیشە لە خۆت قەڵس و دڕدۆنگ دەبی و بێهۆ هەوڵ دەدەی و بە هیچ کوێ ناگەی، هەروا هیوات بە داهاتوویێکی شیرینە و پێشی ناگەی.» بەڵام ئەوە قسەی ئەو کەلوپەلانەی دەوروپشتی بوو. هاوارێکی تر دەیچرپاند بە گوێی رۆحیدا: نابێ رق و تووڕەیی رابردوو هەنگاوت پێ شل کاتەوە و تەسلیمی بی، مرۆڤ دەتوانێ بە دڵی خۆی ژیان رابوێرێ و چۆنی پێخۆشە وابکا. بۆیە پێملی ئەو هاوارەی ناخی بوو و رۆیی بۆ سووچێکی ژوورەکە کە دوو دەمبێلی شازدە کیلۆیی لێداندرابوو، هەڵیگرتن و چەند جاری بەرزکردنەوە و دایناندەوە، هەوڵیدا توانایی و نەرمی بۆ ماسوولکەکانی شان و باهۆی بگێڕێتەوە. گوێی لە سیڕە سیڕی جزمەیەك بوو لە پشت دەرگاکە و بەپەلە دەمبێلەکانی لەجێی خۆی دانایەوە.

ئاریکارەکەی هاتەژوورێ و گوتی کە شوکر بۆ خودا هەموو کارەکان بە جوانی بەرێوەچوون، بەڵام گەنمە رەشە لە کوورەی وشککەرەوەدا سووتاوە. ئەو هەواڵە لەڤینی قەڵس کرد. ئەو وشککەرەوە نوێنەری خۆی دروستی کردبوو و هەتا رادەیەکیش داهێنانی خۆی بوو. هاریکارەکەی هەر لە سەرەتاوە رازی بە دروستکردنی ئەو کەرەسەیە نەبوو، ئێستا کە هەواڵی سووتانی گەنمەکەی بۆ هێنابوو هەستی بە سەرکەوتن دەکرد و لە دڵی خۆیدا دەیگوت «نەمگوت؟» بەڵام لەڤین سوور دەیزانی سووتانی ئەو گەنمە بە هۆی کەمتەرخەمییەوە بووە و سەدجار بە گوێی هەڵێنابوون کە وریا بن بەڵام گوێیان نەداوەتێ. تووڕە بوو و دەستیکرد بە سەرکۆنە کردنی هاریکارەکەی. بەڵام رووداوێکی دڵخۆشکەریش رووی دابوو، ئەویش زانی مانگا رەسەن و گرانبایەکەیان بوو کە لە پێشانگای ئاژەڵان کڕیبووی.

ـ کۆزما کەڵپۆسەکەم بۆ بێنە ـ پاشان بە هاریکارەکەی گوت: تۆش پێیان بڵێ چرایەکم بۆ بێنن، دەچم چاوێکی لێدەکەم.

ئەو گەوڕەی مانگا گرانباییەکانیان تێکردبوو راست لە پشتماڵەکەیان هەڵکەوتبوو. لە حەوشە تێپەڕی و بە پەنای کۆما بەفری پاڵ داریاسە بنەوشەکەدا رۆیشت و گەیشتە بەردەرگای گەوڕەکە. کاتێك دەرگای گەوڕەکەی کردەوە و سەهۆڵی دەوری گرێژەنەی دەرگاکە وە قرچەقرچ کەوت بۆنی پەین و هاڵاوی گەرمای تەویلەکە ئاوقای لووتی بوو. مانگاکان کە بەو رووناکییە ناوەختە گێژ و شەوارە بووبوون لەسەر ئاخوڕی پڕ لە ئالف و بەرپێی بە پەین و کا داپۆشراو

کەوتنە جموجۆڵ. پشتی پان و سپی و لووسی مانگای هولەندی کە خاڵ و پەڵەی ڕەشی پێوەبوو لەبەر شۆقی چراکە بریقەیان دەهات. بێرکووت[٦٠] جوانەگایەکی زەبەلاح بوو بە لمبۆزی دەمبێن کراوەوە ویستی لەجێی خۆی هەستێ بەڵام پەشیمان بۆوە و تەنیا کاتێك بە پەنایدا رابردن ملی سووڕاند و دووسێ جار مووشاندی. پاوا، مانگایەکی سووری زەبەلاح کە لەبەر قەڵەوی دەتگوت ئەسپی ئاوییە پشتی تێکردن و گوێلکەکەی لە پشت خۆیەوە شاردەوە بۆ ئەوەی لە چاوی ئەو کەسانەی دوور خاتەوە کە خۆیان کردبوو بە تەویلەکەدا و دەستی کرد بە لستنەوە و بۆن پێوەکردنی.

لەڤین چووە نێو کۆزەکەی پاوا و چاوی لێکرد. گوێرەکە ساواکە کە سوور بەڵەکێکی کاڵ بوو، لەسەر لاقە درێژ و لەرزۆکەکانی هەڵێستاند. پاوا کە ترسی لێنیشتبوو ویستی ببۆڕێنێ بەڵام کە لەڤین بەچکەکەی خستەوە بەری، لمبۆزە لێکرەویوەکەی وەك ئەوەی هەناسە هەڵکێشێ، بە دڵنیایی قووچاندەوە و بە زمانە زبرەکەی دەستی کرد بە لستنەوەی گوێلکە سوور.

گویلکەکەی لمبۆزە ناسکەکەی بە بن سکی دایکیدا گێڕا و کاتێك گوانی دایکی دۆزییەو دەستیکرد بە مژین و کەوتە راوەشاندنی کلکە چکۆلەکەی.

لەڤین کە چاوی لە گوێرەکەکە دەکرد گوتی: فیۆدۆر، دا چراکە بۆ ئێرە رادێرە. چەندە جوانە، راست دەڵێی دایکییەتی، کانێس ئەستوور و زگزل. تەنیا رەنگی پێستەکەی چۆتەوە سەر باوکیـ لە خۆشیی گوێلکەکەی سووتانی گەنمەکەی لەبیر چووبۆوە، بە رووخۆشی لەگەڵ هاریکارەکەی دەدوا و گوتی: وانییە ڤاسیلی فیۆدۆرۆڤیچ، گویلکێکی جوانە، وانییە؟

هاریکار گوتی: بۆ جوان نییە، زۆریش جوانە. کۆنستانتین دیمیتریچ، رۆژێك دوای رویشتنی ئێوە، سیمۆنی پەیمانکار، هەر ئەو پیاوەی کرێکار دەگرێ، هات بۆ ئێرە. واچاکە قسەی لەگەڵ بکەین و قەرار و بڕیەی کاری لەگەڵ ببەستین. من سەبارەت بە مەکینە پێشتریش عەرزم کردبوون.

هەر ئەو ئاماژەیە لەڤینی سەرلەنوێ بەرەو بەستێنی مڵکداری رەتاندەوە کە زەوی و زارێکی زۆر و زەوند بوو و بەڕێوەبردنەکەش زۆر گران و دژوار بوو. لە تەویلەکە هاتەدەرێ و راست رۆیشت بۆ نووسینگەی مڵکەکەی و ماوەیەك لەگەڵ ئاریکارەکەی و سیمۆنی پەیمانکار دوا، پاشان گەڕایەوە بۆ ماڵێ و رۆیشت بۆ ژووری میوانداری لە نهۆمی ژووروو.

---

60- Berkut

# بیست و حەوت

ماڵەکە، باڵەخانەیەکی قەدیمی و گەورە بوو، لەڤین ئەگەرچی بە تەنیا لەو ماڵەدا دەژیا بەڵام تەواوی ژوورەکانی گەرم رادەگرت و نەیدەهێشت چۆڵ بێ. دەیزانی ئەوەش کارێکی ئاقڵانە نییە و تەنانەت خراپیشە و لەگەڵ گەلاڵە تازەکانی یەك ناگرێتەوە. بەڵام ئەو ماڵە بۆ ئەو دنیایەکی تایبەت بوو و نەیدەتوانی چاوپۆشی لە هیچ بەشێکی بکات. دنیایەك بوو کە دایکی و باوکی لەوێدا ژیابوون و مردبوون. شێوەی ژیانی ئەوانیش لەو ماڵەدا سەرمەشق و ئامانجی لەڤین بوو و حەزی دەکرد خۆی و ژن و منداڵەکانی هەر بەو شێوەیە بژین.

لەڤین بە جوانی دایکی وەبیرنەدەهاتەوە. شێوەی روخساری وەك بیرەوەرییەکی لێل و پیرۆز خۆی لە زەینی هەڵدەساوی و هاوسەری داهاتووی خۆی وەك ئەو ژنە جوان و پاکە دەهاتە بەرچاو کە دایکی بوو.

ئەو لە خەیاڵی خۆیدا نەیدەتوانی خۆشەویستی ژن ببینێ جگە لە ئەشقی ئەو ژنەی کە دەبێتە هاوسەری. سەرەتا بنەماڵەی خۆی دەهاتە بەرچاو پاشان ژنێك کە ئەو بنەماڵەیەی بۆ پێکدێنێ. هەر بەو هۆیەش روانگەی ئەو بۆ زەماوەند لەگەڵ روانگەی زۆربەی ئاشنا و رۆشناکانی جیاواز بوو. زەماوەندکردن بۆ دیتران بەجێهێنانی یەکێك لە ئەرکە کۆمەڵایەتییەکان بوو، بەڵام بۆ لەڤین زەماوەندکردن گرینگترین کاری ژیان بوو کە پێوەندیی بە بەختەوەریی ئەوەوە هەبوو. بەڵام ئێستا ناچاربوو چاوپۆشی لەو بەختەوەرییە بکات.

کاتێك پێی نایە ئەو میوانخانە چکۆلەیەوە کە هەمیشە لەوێ چایی دەخواردەوە و لەسەر کورسیلە پاڵپشتدارەکەی دانیشت و کتێبێکی بە دەستەوە گرت و ئاگافیا میخائیلۆڤنا چایی بۆ هێنا و بەپێی عادەتی خۆی گوتی «منیش دادەنیشم باوکەکەم» و لەسەر کورسیلەی بەر پەنجێرەکە دانیشت، لەڤین هەستی کرد کە ناتوانێ چاوپۆشی لە خولیاکانی بکات و بێئەوان ناتوانێ بژی و سەریشی لەوە سوورِ مابوو، بۆی دەرکەوت کە خولیا و ئاواتەکانی لەگەڵ «ئەو» پێك نەهاتووە و لەگەڵ کەسێکی تر پێکدێ. کتێبەکەی دەخوێندەوە و بیری لەو شتە

دەکردەوە کە دەیخوێندەوە. جارجار دەستی لە خوێندنەوە هەڵدەگرت بۆ ئەوەی گوێ لە قسەکانی ئاگافیا میخائیلۆڤنا بگرێ کە بەردەوام قسەی دەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا وێنەی جۆراوجۆر و پێکەوە ناکۆکی مڵکداری و بنەماڵەیی داهاتووی لە خەیاڵیدا سەری هەڵدا. هەستی کرد شتێك لە قووڵاییی گیانیدا خەریکە دەگووزەرێ و مسۆگەر دەبێ و جێ دەکەوێ. گوێی لە قسەی ئاگافیا میخائیلۆڤنا گرتبوو کە دەیگوت پڕاخۆر خودای لەبیر بردۆتەوە و پارەیەك کە ئەرباب (لەڤین) پێی دابوو کە ئەسپێکی پێبکڕێ بۆخۆی هەمووی داوە بە ڤۆدکا و هێندە دەخواتەوە هۆشی نامێنێ و هێندە لە ژنەکەی دەدا لەوانەیە بیکوژێ. گوێی بۆ قسەکانی راداشتبوو و کتێبی دەخوێندەوە و ئەو بیرۆکانەی بە خوێندنەوەی کتێبەکە لە زەینیدا گەشەیان دەکرد دانە دانە وەبیر خۆی دەهێنانەوە. کتێبی تینداڵی[٦١] بە دەستەوە بوو کە سەبارەت بە وزەی گەرما بوو، وەبیری هاتەوە کە تیندالی ناکەوێتە بەر دڵ چونکە بەهۆی قۆڕە دەماخییەوە تاریفی زیرەکی و شارەزاییی خۆی کردبوو کە دەتوانێ ئەو هەموو ئەزموونە کۆ بکاتەوە، چونکە هیچ روانگەیەکی فەلسەفیی نەبوو تیروتوانجی پێدا دەدا. لە ناکاو ئەم بیرە شادیهێنە لە زەینی کەلاوڕێژی کرد کە «هەتا دوو ساڵی دیکە دوو گای هۆڵەندیم لە گاڕانەکەدا دەبێ و لەوانەیە پاوا خۆشی هەر بمێنێ، دوازدە مانگاشم لە بێرکۆت دەبێ و ئەم سێ جوانەگا هۆڵەندییەش تاجی سەری ئەوان دەبن. بەڕاستی ئەنتیکەیە!» دیسان ملی نایەوە لە کتێب خوێندنەوە.

لەبەر خۆیەوە گوتی: «وزەی گەرما و کارەبا جیاوازییەکیان لەگەڵ یەکتر نییە. زۆر چاکە. بەڵام دەکرێ کاتی هاوسەنگی کردنیان بۆ حەلکردنی مەسەلەیەك یەکیان لەجێی ئەوی تر دانێی؟ نا. دەکەوایە ئەمە چ چەشنە یەکسانییەکە؟ پێوەندیی نێوان هەموو وزە سروشتییەکان بەبێ ئەم قسانەش لەگەڵ غەریزە هەست پێدەکرێ... لەوەش ئەنتیکەتر ئەوەیە کە پاوا گویلکەکەی تریشی سووربەڵەك بێ و ئەو سێ جوانەگا هۆڵەندییە لەنێو گاڕانەکەدا سەرتۆپ بن. بەڕاستی ئەنتیکەیە! جا لەگەڵ ژنەکەم و میوانەکانمان دەچینە لەوەڕگا بۆ دیتنی مانگاکان... ژنەکەم دەڵێ: کوستیا و من ئەو گویلکە وەك منداڵی خۆمان دەپارێزین و پێیڕادەگەین. یەکێك لە میوانەکانیش دەڵێ: چۆنە کە ئێوە ئاوا هۆگریتان بەو شتانە پەیداکردووە؟ ژنەکەشم وەڵامی دەداتەوە کە: من ئەوەی مێردەکەم

---

61- Tyndal

هۆگریی پێی هەبێ منیش هۆگریم پێی هەیە. بەڵام ئەو ژنە دەبێ کێ بێ؟ پاشان وەبیری هاتەوە کە لە مۆسکۆ چی رووی دابوو... «دەی، چ بکەم؟ تاوانی من چییە؟ ئێستا هەموو شتێك بە شێوەیەکی نوێ دەست پێدەکەن. ئەوانە هەمووی قسەی قۆڕن ئەگەر بڵێین ژیان مەودا نادا یان رابردوو بۆتە لەمپەر و بەرهەڵستی کار و ژیان. دەبێ خەبات بکەین بۆ گەیشتن بە ژیانێکی باشتر، زۆر باشتر...» سەری لەسەر کتێبەکە هەڵگرت و چوو دەماڵی فکرەوە. لاسکای پیر کە هەروا لە خۆشی ئەربابەکەی دەینووزاند و کلکی رادەوەشاند هەڵاتبوو بۆ حەوشە، دەیمڕاند و غارغارێنی دەکرد، لە ناکاو خۆی کردەوە بە ژووریدا و بۆنی هەوای تازەی لەگەڵ خۆی هێنایە ژووری. لە خاوەنەکەی هاتە پێشێ و سەری کرد بە بەینی لاقیدا و بە نووزاندنێکی پڕ سکاڵاوە داوای کرد بیلاوێنێتەوە.

ئاگافیا میخائیلۆڤنا گوتی: ئەو بەستەزمانە قسەناکا، دەنا زۆر دەزانێ... دەیارە تێگەیشتووە ئەربابەکەی لە سەفەر گەڕاوەتەوە کەیفساز نییە.

ـ بۆ کەیفساز نەبم؟

ـ باوکەکەم بۆ من چاوم نییە و نابینم؟ دوای تەمەنێکی زۆر ئێستا خووخدەی ئەربابەکانم هاتۆتە دەست، من لە منداڵییەوە لە نێو ئێوەی ئەربابدا گەورە بووم. قەیناکا باوکەکەم خودا لەشی ساغت بداتێ و دڵی بێخەم!

لەڤین چاوی تێبڕیبوو، سەری سووڕمابوو کە ئەو پیرێژنە ئاوا لە دڵ و بیرۆکەی ئەو گەیشتووە.

پیرێژن پەرداخەکەی هەڵگرت و لە کاتی چوونە دەرەوەدا گوتی: پەرداخێکی ترت چایی بۆ بێنم؟ لاسکا لەپەستا سەری دەکرد بە بن پیل و باخەڵی ئەربابەکەیدا، ئاخری لەڤین دەستێکی بەسەر پشتیدا هێنا و لاواندییەوە. پاشان لاسکا هەر لەوێ لەبەر پێی ئەربابەکەیدا وەرکەوت. هەر دوو لاقی لە پێش خۆیەوە جووت کرد و سەری کردە سەری و خۆی کوشمەڵە کرد. پاشان وەك ئەوەی ئەرخەیان بووبێ دەمی کردەوە و دوای مڵچەمڵچێك لمبۆزی لینجی وێك هێنایەوە و بە ئاسوودەییەکی پڕ کەیف و نەشەوە بێدەنگ بوو. لەڤین کە بە وردی ئەو هەڵسوکەوتەی خستبووە ژێر چاوەدێری لە دڵی خۆیدا گوتی: «منیش وەك ئەو، منیش راست وەك ئەو، هێندەش گرینگ نییە. هەموو شتێك باش و رەزامەندانەیە.»

## بیست و هەشت

ئانا ئارکادیۆڤنا، ڕۆژی دوایی بەیانی زوو برووسکەیەکی نارد بۆ مێردەکەی و پێی ڕاگەیاند کە هەر ئەو ڕۆژە مۆسکو بەجێ دێڵێ.

بۆ ڕوونکردنەوەی قەستەکەشی بە براژنی گوت: نا، دەبێ بڕۆم، حەتمەن دەبێ بڕۆم، واچاکە هەر ئەمڕۆ بڕۆمەوە ـ لەبزی قسەکردنەکەشی وەك هی کەسێك دەچوو کە وەبیری کاروباری لە ڕادەبەدەر کەوتبێتەوە و لەبەر پڕکاری سەری لێشێوابێ.

ئیستپان ئارکادیچ ئەو ڕۆژە بۆ نانی نیوەڕۆ نەهاتەوە بۆ ماڵێ بەڵام وادەی دابوو کە سەعات حەوت دێتەوە و هەتا وێستگە خوشکی بەڕێ دەکات. کیتیش نەهات و پسوولەیەکی ناردبوو کە تووشی ژانەسەر بووە. دالی و ئانا لەگەڵ منداڵەکانی و پەرەستارە ئینگلیسییەکەیان نانی نیوەڕۆیان خوارد. منداڵەکان چونکە زۆردڵناسك و هەستیار بوون تێگەیشتن کە ئەو ڕۆژە پووریێ گیانیان، ئانا، بە هیچ شێوەیەك وەك ئەو ڕۆژە نییە کە خۆشیان ویستبوو و دیارە دڵی لە لایەکی ترە، بۆیە وردەوردە لێی دوورکەوتنەوە و خۆیان تێهەڵنەقوتاند و گوێیان بە ڕۆیشتنەکەی نەدا. ئانا چەن پسوولەی بۆ ئاشنایانی مۆسکۆی نارد و کاروبار و حیسابەکانی ڕێکخست و دەستیکرد بە پێچانەوەی جانتا و کەلوپەلەکانی. دالی تێگەیشتبوو کە ئانا پەشۆکاوە و پەرۆشییەکەشی لەو چەشنە پەرۆشییانەیە کە خۆی چاکی تێدەگەیشت، چونکە ئەزموونبووی و دەیزانی ئەو جۆرە پەشۆکاوییە بێهۆ نییە و زۆر جار پەردەیەکە و کێشە و ئاڵۆزییەکانی ویژدان دەشارێتەوە. ئانا دوای نانی نیوەڕۆ چووە ژوورەکەی خۆی تاکوو جلەکانی بگۆڕێ، دالیش لەگەڵیدا چوو.

دالی پێیگوت: ئەمڕۆ زۆر ئاڵۆز دیاری ئانا!

ـ تۆ وا بیردەکەیەوە؟ ئاڵۆز نیم، بەڵکوو زۆر حاڵم خراپە. هێندێ جار وام لێدێ. دەمهەوێ بەکوڵ بگریم. ـ ئەوەی بە توندی گوت و سوورهەڵگەڕا، سەری کردە سەر ساکێکی ناسك کە وەك لەیستۆك دەچوو و دەسرەدەست و کڵاوی شەوانەی تێدەخست. چاوانی بریقەیەکی سەیری

لێهەستا و لەپەستا فرمێسکیان تێدەزا. گوتی: من کاتێك لە پترزبۆرگ بووم نەمدەویست بێم بۆ ئێرە و ئێستا حەز ناکەم ئێرە بەجێ بێڵم.

دالی کە بە وردی چاوی تێبڕیبوو گوتی: تۆ هاتی بۆ ئێرە و بوویە هۆی چاکەکارییەکی گەورە.

ئانا بە چاوی فرمێسك تێزاوەوە لە دالیی روانی.

ـ دالی، نا وا مەڵێ، من هیچم نەکردووە و هیچیشم لە دەست نایە. زۆر جار بیردەکەمەوە کە بۆچی هەمووان دەستبەیەکی دەکەن بۆ ئەوەی نازی من بکێشن. من چیم کردووە و دەتوانم چی بکەم؟ تۆ خۆت دڵت ئەوەندەی ئەوین و خۆشەویستی تێدا مابوو کە بتوانی لە مێردەکەت خۆش بی...

دالی گوتی: ئەگەر تۆ نەبوایەی خوا دەزانێ چی دەقەوما. رۆحی تۆ وەك ئاوێنەی پاك و بێگەرد وایە.

ـ هەموو کەسێك لە رۆحی خۆیدا بە دەردی ئینگلیزییەکان دەڵێن تەرمێکی رزیوی شاردۆتەوە.

ـ ئەیەرۆ جا تۆ کوا دەتوانی تەرمێکی رزیوت لە قوژبنێکی رۆحتدا شاردبێتەوە؟ رۆحی تۆ ئەوەی تێیدایە رووناك و بێخەوشە.

ئانا لەناکاو گوتی: وانییە، رۆحی منیش زۆر شتی شاراوەی تێدایە ـ بزەیەکی بە مەکرانە و تەوساوی نیشتە سەرلێوی، کە دوای ئەو فرمێسکانە زۆر چاوەڕواننەکراوی دەنواند.

دالی بە پێکەنینەوە گوتی: چاکە، تەرمەکانی ناخی تۆ پێکەنینین، نەك خەفەتهێنەر.

ئانا لەسەر کورسییەکەی توندوتۆڵانە خۆی خست بە پشتدا و پاڵی دایەوە، چاوی لە چاوی دالی بڕی و گوتی: نا، زۆریش خەفەتهێنەرە. دەزانی من بۆ ئەمڕۆ بڕیارمدا بڕۆمەوە و نەمخستە سبەینێ؟

دالی بە سەرسووڕمانەوە دیتی روخساری ئانا هەتا لاجانگ و ژێر بسکە لوول و رەشەکانی پشت ملی سوورهەڵگەڕاوە.

ئانا لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: بەڵێ، دەزانی کیتی بۆ نانی نیوەڕۆ بۆ نەهات بۆ ئێرە؟ چونکە ئێرەیی بە من دەبرد. من جێژنەکەم لێتێکدا. من بوومە هۆی ئەوەی کۆڕی سەمای دوێشەوی لێببێتە شەوێکی پڕ لە ئازار نەك شەوێکی پڕ شادی و خۆشی. بەڵام راستت دەوێ خەتای من نەبوو، هەر بەڕاستی خەتای من نەبوو. خەتاشم بووبێ زۆر کەم ـ کاتێك گوتی «زۆر کەم» کێشی بە دەنگە ناسکەکەی هێنا.

دالی بە پێکەنینەوە گوتی: سەیرە ئەم «زۆر کەم»ەی تۆ راست وەك ستیڤا دەچوو!

ئانا زویرانە نێوچاوانی تێکنا و گوتی: ئەیەرۆ، نا، نا، من ستیڤا نیم. من بۆیە وا راشکاوانە مەسەلەکەم بۆ باس کردی چونکە لێم روونە و بە تۆزیش شکم نییە.

بەڵام هەر لەو کاتەدا کە ئەو قسانەی دەدرکاند هەستی کرد کە درۆدەکات. ئەو نەك بڕوای بە خۆڕاگرییەکەی خۆی نەبوو بەڵکوو بیرکردنەوە لە ڤرۆنسکی تووشی پەشۆکانی دەکرد و هەر بەوهۆیەش دەیویست زووتر بگەڕێتەوە بۆ پترزبۆرگ، بۆ ئەوەی ئیتر چاوی بە چاوی ڤرۆنسکی نەکەوێ.

ـ بەڵێ، ستیڤا پێیگوتم کە سەمای مازورکات لەگەڵ کردووە و ئەو...

ـ بڕوا ناکەم بزانی چ مەڵحەکەیەك بوو. من دەمویست ئەو جووتە بەیەك بگەیەنم، بەڵام لەناکاو دیتم بارودۆخەکە گۆڕا و بە لایەکی تردا کەوت. رەنگە من بەدەست خۆم نەبووبێ...

ئانا سوورهەڵگەڕا و بێدەنگ بوو.

دالی گوتی: ئەیەرۆ، ئەوانە لەڕێوە لەو شتانە دەگەن.

ئانا قسەکەی پێبڕی: بەڵام ئەگەر هەڵسوکەوتی ڤرۆنسکی تۆزێك جیددی بووبێ من بەجارێ تووشی ئاڵۆزی دەبم. هەڵبەت من دڵنیام ئەو شتانە لەبیردەچنەوە و کیتی ئەوەندە لە من قەڵس و بێزار نابێ.

ـ ئانا، دەتهەوێ راستت پێبڵێم. من ئەو شووکردنەی کیتیم بەدڵ نییە و زۆریش نارازییم. ئەگەر ورونسکی بە شەوێك ئاوا شەیدای تۆ بووبێ واچاکە ئەو زەماوەندە هەر سەر نەگرێ.

ئانا گوتی: ئەیەرۆ خودایە گیان، ئەوە زۆر شتێکی قۆڕ و بێتامە ـ کە دیتی ئەو بیرۆکەیەی مێشکی لە مەنگەنە دابوو لە زمانی دالییەوە کەلاوڕێژ دەکات دیسان چێژێکی گەرم روخساری سوورهەڵگێڕا. گوتی: کەوابێ بەو شێوەیە کیتیم کردە دژی خۆم ئەگەرچی ئەو هەمووەشم خۆش دەوێ، ئێستاش خەریکم لێرە دەڕۆم. پەککوو چ کچێکی لە دڵا شیرینە. بەڵام تۆ دەبێ تێبگەی بارودۆخەکە چۆن بوو، تێدەگەی؟

دالی بە زۆری دەیتوانی ددان بە خۆیا بگرێ و پێنەکەنێ. ئەو زۆری ئانا خۆشدەویست، بەڵام کە دەیدی ئەویش خاوەن کەموکووڕییە خۆشحاڵ بوو.

ـ دژ؟ تۆش قسەی وادەکەی! شتی وا هەر نابێ.

ئانا بە چاوی پڕ لە ئەسرینەوە گوتی: ئاواتەخواز بووم تۆ و کیتی منتان بەو رادەیە خۆش بوێ کە من ئێوەم خۆشدەوێ. ئێستاش من ئێوەم لە جاران زیاتر خۆشدەوێ. ئەیەرۆ، ئەمرۆ بۆ وا خودا گەوجی کردووم!

بە دەسرەیەك كولمە و چاوی سڕی و دەستی كرد بە لەبەركردنی جلەكانی.

ستیپان ئاركادیچ درەنگ هاتەوە. روخساری لەبەر شادی سوورهەڵگەڕابوو و بۆنی شەڕاب و جگەرەی لێدەهات. ڕاست بەر لە وەڕێكەوتنی ئانا گەیشتەوە ماڵێ.

هەست و كوڵی ئانا شوێنی لەسەر دالیش دانا و كاتێك بۆ دوایین جار باوەشی بە دشەكەیدا كرد بە سرتە گوتی:

ـ لەبیرت نەچێ ئانا، ئەو كارەی تۆ بۆت كردم قەتم لەبیرناچێتەوە. لەبیرت نەچێ، كە تۆ باشترین دۆستی منی و خۆشم دەوێی و هەمیشەش هەروا خۆشەویستم دەبی.

ئانا دشەكەی ماچكرد و لەگەڵ ئەوەی دەیویست فرمێسكەكانی بشارێتەوە گوتی: من تێناگەم بۆچی؟

تۆ لە حاڵوباڵی من گەیشتی و تێدەگەی. خوداحافیز، خۆشەویستەكەم.

## بیست و نۆ

كاتێك ئانا ئاركادیۆڤنا لەگەڵ براكەی بەردەرگای ڤاگۆنەكەیان گرتبوو خەریكی خوداحافیزی بوون شەمەندەفەرەكە دوایین فیكەی لێهەستا و یەكەم شت كە ئانا وەبیری هاتەوە ئەمە بوو «زۆر چاكە، شوكر بەخێر گوزەرا.» لەپاڵ ئانووشكای خزمەتكاریدا لەجێی خۆی دانیشت و لەنێو ڤاگۆنە نیوە تاریكەكەدا چاوێكی بە دەورووبەری خۆیدا گێڕا. «خودایە زۆر شوكر، سبەینێ سریۆژا و ئەلكسی ئەلكساندرڤیچ دەبینمەوە و ژیانم دەگەڕێتەوە سەر دۆخە ئاساییەكەی جاران.»

هەر لەگەڵ ئەو فكر و خەیاڵانەی كە ئەو رۆژە دەستیان لە كۆڵ نەكردبۆوە، بە شادی و دڵخۆشییەوە خۆی بۆ سەفەری شەوانە ئامادەدەكرد. بە دەستە ناسك و وردیلەكانی جانتا نەرم و تەنكەكەی كردەوە و باڵنجە چكۆلانەكەی دەرهێنا و لەسەر چۆكی داینا، بە ئارامی بەتانییەكەی لە لاقوقولی پێچاو جووڵەی لە خۆی بڕی. ژنێكی نەخۆش كە لە قەمارەكەی ئەواندا بوو هەر لەو كاتەوە خۆی بۆ خەوتن ئامادەدەكرد. دوو خاتوونی تریش كە هاوسەفەریان بوون قسەیان لەگەڵ دەكرد و پیرێژنێكی قەڵەویش كە لاقوقولی بە تەواوی لە بەتانییەكەی خۆی پێچابوو لە دەست كوورەی ڤاگۆنەكە بە گلەیی بوو و لەبەر خۆیەوە بۆڵەی

دەهات. ئانا لە جوابی ژنەکاندا چەن وشەیەکی دەربڕی، بەڵام چونکە باسەکەی بەدڵ نەبوو داوای لە ئانووشکا کرد کە چووکە چرای سەفەرەکەی بداتێ و لە شانی کورسییەکەی گیر کرد، پاشان تیخەڵەی لاپەڕە هەڵدانەوە و ڕۆمانێکی ئینگلیزیی لە جانتاکەی دەرهێنا. سەرەتا چێژی لە خوێندنەوەکەی وەرنەگرت. چونکە هاتوچۆ و جموجۆڵی هاوسەفەرەکانی بووبوونە مێملێ و فکر و هۆشی بۆ کۆ نەدەبۆوە. کاتێك شەمەندەفەرەکە وەڕێکەوت هاڕەو تەقوکوتی بەجارێ جاڕزی کرد. دوای وەڕێکەوتن بەفر و بادەوە هەڵیکرد و لە شووشەی لای چەپی ڤاگۆنەکەی دەدا و پێوەی دەنووسا، کارگێڕی شەمەندەفەرەکەش دەهات و دەچوو و بە کڵاو و شاڵگەردن خۆی گەرم داپێچابوو و لایەکی جەستەی بەفری لێنیشتبوو و دیاربوو لە دەرەوە تۆف و بەند و بادەوەیەکی سەختە و ئەوانە هەموو سەرنجی ئانایان بۆ لای خۆیان ڕاکێشابوو. جگە لەوانە هیچ شتێکی تر نەبوو کە ڕەوتی یەکهاویی شەمەندەفەرەکە تێکبدات، تەقوکوت و گرموهۆڕی چەرخەکان و کۆبوونەوەی بەفر لەسەر شووشەکە و گۆڕانی پەیتاپەیتای تینی کوورەکە لە گەرماوە بۆ سەرما و دیسان بە پێچەوانە و جارجار ڕووناك بوونەوەی روخساری وەك یەکی دانیشتووانی نێو کووپەکە و باسوخواسەکانیان، بۆیە ئانا دەستی کرد بە خوێندنەوەی کتێبەکە و توانی بیر و هۆشی خۆی لەسەر خوێندنەوە کۆ بکاتەوە. ئانووشکا خەوی لێکەوتبوو و دەستە پانەکانی بە دەستەوانەوە کە یەکیان کون بوو قامکی لێهاتبووە دەرێ، جانتا دەستییە سوورەکەی لەسەر کۆشی ڕاگرتبوو. ئانا ئارکادیۆڤنا کتێبەکەی دەخوێندەوە و ئەوەی دەیخوێندەوە تێیدەگەیشت، بەڵام خوێندنەوە و سەر دەرهێنان لە ژیان و سەربردەی خەڵکی پێخۆش نەبوو. خۆی زۆر تینووی ژیان بوو، بۆ وێنە کاتێك دەیخوێندەوە یەکێك لە پاڵەوانانی کتێبەکەی چۆن پەرستاری لە نەخۆشەکەی دەکات، حەزی دەکرد خۆی لە ژووری ئەو نەخۆشە بێ و بە ئارامی و بێچرپە لە ژوور سەری بێت و بچێت. یان کاتێك باسی مژولیایشی نوێنەرێکی پەرلەمانی دەخوێندەوە بە ئاواتەوە بوو خۆی وتاربێژەکە بێ، یان کاتێکیش دەیخوێندەوە کە لیدیمێری چۆن بە سواری ئەسپ لەگەڵ ڕەوەی توڵە و تاژی وەسەر نێچیر کەوتووە و دیرەتێنێ و سەر دەخاتە سەر براژنی و بە ئاکار و قسەی قوت هەمووان تووشی سەرسووڕمان دەکات حەزی دەکرد خۆی ئەو کارانە بکات. بەڵام هیچ کارێکی بۆ جێ بەجێ نەدەبوو و دەستە ناسك و وردیلەکانی بە دەمی لووسی تێخەڵەی لاپەڕە هەڵدەرەوەکەدا دەهێنا و جەختی لە خۆی دەکرد کە درێژە بە خوێندنەوەکە بدات.

پاڵەوانی رۆمانەکە خەریکبوو دەگەیشتە بەختەوەریی ئینگلیزی پەسندی خۆی، یانی پاکی و نەجیمی بۆخۆی دەستەبەر دەکرد و دەبووە خاوەنی ملکێکیش کە بە ئاواتییەوە بوو، ئاناش حەزی دەکرد لەگەڵ ئەو هەنگاو بنێتە نێو ملکەکەوە، بەڵام لە ناکاو هەستی کرد کە پاڵەوانەکەی دەبێ بەو کردەوەیەی خۆی تووشی شەرمەزاری بێ و خۆشی وەك ئەو شەرمەزار بوو. بەڵام لەپڕ بە سەرسوورڕمانێکی تێکەڵ بە زویربوونەوە لە دڵی خۆیدا گوتی: «پاڵەوانی رۆمانەکە چیی کردووە کە دەبێ هەست بە شەرمەزاری بکات و خۆشی بە چ هۆیەك هەست بە شەرمەزاری دەکات؟» کتێبەکەی لەولاوە دانا و لەسەر کورسییەکە پاڵی دایەوە و توند تێخەڵەی لاپەڕە هەڵدەرەوەکەی لە قولەمیچەی گرت. هیچ هۆیەك بۆ شەرمەزاری نەبوو. هەموو بیرەوەرییەکانی مۆسکۆی خۆی هێنایەوە بەرچاو و هیچ کام لە کارەکانی بە هەڵە و دزێو نەدەزانی. کوڕی سەماکەی وەبیرهاتەوە و هەروەها ڤرۆنسکی بە روخساری ئارام و دلڕفێن و شەیدا شێوەیەوە کە زۆر لاوێکی رۆحسووك و لە دڵا شیرین بوو و هەموو ئەو پێوەندی و هەڵسوکەوتانەی لەو ماوەیەدا لەگەڵی هەیبوو، هەموویانی لە زەینی خۆیدا وەرد دایەوە بەڵام هیچ شتێکی ناحەز و شەرماویی تێدا نەدی. لەگەڵ ئەوەشدا راست لەو شوێنەی بیرەوەرییەکەیدا هەستی شەرمەزارییەکەی بەهێزتر رۆحی داگرت. وەك ئەوە وابوو کە هاوارێك لە ناخەوە راست راست لەو شوێنەدا کە ڤرۆنسکیی وەبیرهاتبۆوە بانگی بە گوێی دڵیدا دەدا کە «گەرمە، گەرمە، بەڕاستی سووتێنەرە.» لەسەر کورسیلەکەی خۆی ئەمبارەوبار کرد و زۆر بە جیددی بەخۆی گوت «یانیچی؟ ئەوە بە چ مانایەکە؟ یانی بەڕاستی من ناوێرم بە شێوەیەکی جیددی لەگەڵ ئەو مەسەلەیە بەرەوڕوو بم؟ یانی بەڕاستی لە نێوان من و ئەو ئەفسەرە گەنجەدا کە لاوێکە وەك هەزاران لاوی تر، پێوەندییەك هەیە جگە لەوانەی وا لەگەڵ ئاشنا و خزمانی ترم بوومە و یانی لە راستیدا وێدەچێ پێوەندییەکی ئەوتۆ هەبێ؟» بزەیەکی تەوساوی و پڕسووکایەتی نیشتە سەر لێوی و دیسان دەستیدایەوە کتێبەکە، بەڵام ئیتر بەڕاستی نەیدەتوانی لەوەی دەیخوێنێتەوە تێبگا. تێخەڵەی لاپەڕە هەڵدەرەوەی بە شووشەی پەنجێرەکەدا هێنا و پاشان لاشانی لووس و ساردی تێخەڵەکەی بە روومەتی خۆیەوە نووساند. بەڵام لەبەر شادییەکی بێهۆ کە لەناکاو گیانی داگرتبوو بزەی هاتێ و هێندەی نەمابوو لە قاقای پێکەنین بدات. هەستی کرد ئەعسابی وەك ژێی کەوان لە دەوری کلیلۆکە پێچراون و کێشیان پێهاتووە و بەردەوام زەخت و گوشاریان

دەخرێتە سەر. هەروەها هەستی کرد چاوی جارلەگەڵجار زەقتر دەبنەوە و قامکی دەست و لاقی دەلەرزن و دڵی بە پڕتاو لێدەدا و خەریکە سنگی کون بکات، هەناسەی سوار بووە و هەموو شکڵ و دەنگەکان لەو تاریکوڕوونەدا لەگەڵ رووناکییەکی زۆر دێنە بەرچاوی و خەریکە وەشەوارەی بخەن. بەردەوام تووشی حاڵەتێك دەبوو کە نەیدەزانی شەمەندەفەرەکە بۆ پێشەوە دەڕوا یان بۆ دوواوە، یان لە جێگای خۆی چەقیوە و ئەوەی لە پەنایدا خەوتووە ئانووشکایە یان ژنێکی ترە. «ئەوەی بە رەختاوێزەکەدا هەڵواسراوە باڵتەی کەڵپۆسە یان کەلاکی ئاژەڵێك؟ ئەوەی لەوێش دانیشتووە لەڕاستیدا خۆیەتی یان کەسێکی ترە؟» دەترسا هەروا لەخۆڕا خۆی بدۆڕێنێ و ورەی لەدەست بدا. لەو حاڵەدا وزەیەکی بکێش شوێنی لەسەر دانابوو دەوری رۆحی تەنیبوو، دەیتوانی ئازادانە خۆی بە دەستەوە بدات یان خۆی لێ دەربازبکات. هەستا سەرپێ بۆ ئەوەی تۆزێ بێتەوە سەرخۆ. ئەو بەتانییەی لە لاقوقولی هاڵاندبوو لێی کردەوە و نایە ئەولاوە و کڵاوی جلە گەرمەکانی لە سەری داگرت. بۆ ساتێك وەخۆ هاتەوە و بۆی دەرکەوت مووژیکێکی بەلەباریکە هاتۆتە نێو قەمارەکەیان و باڵتەیەکی درێژی پەمۆیی زەردی لەبەردا بوو کە دوگمەیەکی داکەوتبوو، دیاربوو بەرپرسی کوورەکەیە و چاوی لە دەرەجەی تینەکەی دەکرد، کاتێك دەرگاکەی کردەوە بایەکی سارد و پڕتەزوو لە نێو قەمارەکە گەڕا. بەڵام پاشان هەموو شتێك دیسان تێکەڵ بوونەوە. کابرای مووژیك کە باڵتەیەکی درێژی لەبەردا بوو دەستیکرد بە گازگرتن لە دیوارەکە، پیرێژنەکەش لاقی راکێشا، هەتا ئەوسەری قەمارەکەی گرت و هەورێکی رەش پانتایی ڤاگۆنەکەی داگرت. پاشان قرچە قرچێکی سامناك و تەپوکوت هەستا، وەك ئەوەی کەسێك لەتوکوت بکەن. دوای ئەویش ئاورێکی سووری بە گرپە بڵێسەی کێشا و شۆقەکەی لەوانەبوو چاوی پیاو کوێر بکات، لە ئاکامیشدا هەموو ئەوانە لە پشت دیوارێك لە چاو ون بوون. ئانا هەستی کرد دەکەوێتە نێو لافاو و فەرتەنەیەکەوە. بەڵام هەموو ئەوانە تووشی دڵەخورپەیان نەدەکرد هیچ، بەڵکوو زۆریشی حەز پێدەکرد. ئەو مووژیکەی کە خوی گەرم داپێچابوو و بەفر باڵتەکەی داپۆشیبوو دەمی هێنایە بن گوێی ئانا و بە دەنگێکی بەرز شتێکی پێگوت. ئانا راچەنی و وەخۆ هاتەوە. بۆی دەرکەوت گەیشتوونەتە وێستگەیەك و ئەوەی دەگوڕێنێ کارگێڕی شەمەندەفەرەکەیە. داوای لە ئانووشکا کرد کڵاوی باڵتەکەی و

لەچکەکەی پێبداتەوە، لەچکەکەی بە سەریدا دایەوە و کڵاوەکەی لەسەر کرد و بەرەو دەرگای ڤاگۆنەکە ملی پێوەنا.

ئانووشکا لێیپرسی: خاتوونگیان حەزدەکەن بچنە دەرێ؟

ـ بەڵێ، دەمەوێ تۆزێ هەوای تازە هەڵمژم. هەوای ئێرە زۆر گەرمە.

دەرگاکەی کردەوە. بەفرو با بە توندی خۆیان بە سینگ و بەرۆکیدا کێشا، بەجۆرێك کە بۆ کردنەوەی دەرگاکە ناچاربوو لەگەڵ بایەکە ململانێ بکات و ئەوەشی زۆر بەدڵ بوو. ئاخری دەرگاکەی کردەوە و چووەدەرێ. دەتگوت بایەکە چاوەڕوانی ئەوە. لوورە و هاژەی گژەباکە وەنەشەی خستبوو و دەتگوت دەیهەوێ بەرزی بکاتەوە و بیبات، بەڵام ئانا بەهێز و قەوەتی خۆی میلەی ساردی قادرمەی ڤاگۆنەکەی گرت ولەگەڵ ئەوەی نەیدەهێشت با تەشك و داوێنی هەڵداتەوە گەیشتە سەرسەکۆی وێستگەکە و بە پاڵ ڤاگۆنەکاندا بەرەو پێشەوە ملی پێوەنا. تەوژمی سەرما و هاژەی بایەکە کە لەسەر قادرمەکان زۆر توندبوو لەسەر سەکۆی وێستگەکە و پەنا ڤاگۆنەکان ئارامتر بوو، ئانا هەوای بەفرین و ساردی پڕ بە سییەکانی هەڵدەمژی و چێژی لێوەردەگرت. لە پەنا ریزی ڤاگۆنەکان راوەستابوو و چاوی لەسەر سەکۆی رووناکی وێستگەکە بڕیبوو.

## سێ

گژەباکەی زۆر توندبوو و لە نێوان چەرخی ڤاگۆنەکان و دەوری ئەستوون و دیواری وێستگەوە لوورە و هاژەی دەهات. ڤاگۆنەکان و ئەستوونەکان و خەڵك و ئەوەی دەهاتە بەرچاو لایەکیان بەفری لێنیشتبوو و جارلەگەڵجار توێژاڵی بەفرەکە ئەستوورتر دەبوو. باو بۆرانەکە بۆ تاوێك ئارام بۆوە، بەڵام لەپڕ دەستی کردەوە بە گرفە و هاژە و بە گووڕ و تینێکی بە زەبرەوە خۆی بە هەموو شتێکدا دەکێشا و دەتگوت داروبەرد و دنیا خۆ لە هەمبەریدا ناگرێ. لەگەڵ ئەوەشدا کەسانێك هەبوون کە بەملاو ئەولادا هەڵدەهاتن و بە شادییەوە لەگەڵ یەکتر دەدوان و تەپوکوتیان لە تەختەی تەرکی وێستگە هەڵدەستاند و لە پەستا دەرگا گەورەکانیان دەکردەوە و پێوەیان دەدایەوە. سێبەری پیاوێك لەبەر پێیدا خوشی و تەقوکوتی چەکوش لەسەر ئاسن هەستا. دەنگێکی تووڕە و تۆسن لە ناخی تاریکی تۆفانەوە هەستا کە دەیگوت: «برووسکەکەم بدەیە!» دەنگێکی تریش هاواری

دەکرد: «فەرموون بۆ ئێرە، ژمارەی بیست و هەشت.» چەند کەسیش کە بەفر سەرتاپای سپی کردبوون باڵتەی گەرمیان لە خۆیانەوە پێچابوو و بە هەڵەداوان دەڕۆیشتن. دوو پیاویش کە سکڵی جگەرە بە سووچی لێویانەوە دەدرەوشایەوە بە پەنایدا تێپەڕین. ئانا هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا بۆ ئەوەی جارێکی تر سینگی خۆی پڕ بکاتەوە لە هەوای سارد، دەستێکی لەسەر قۆڵی تیسکنی باڵتەکەی دەرهێنا تاکوو میلەی ساردی قادرمەی ڤاگۆنەکە بگرێ و سوار بێتەوە پیاوێکی تر کە باڵتەی سەربازیی لەبەردا بوو، لێی نیزیك بۆوە و بەرشۆقی چراکەی گرت. ئانا سەری وەرسووڕاند و لەڕێوە روخساری ڤرۆنسکیی ناسییەوە. ڤرۆنسکی دەستی هەتا لێواری کڵاوەکەی بردە سەرێ و تۆزێ بۆ پێشەوە نووشتایەوە و لێیپرسی کە هیچی پێویست نییە، یان خزمەتێکی لەدەست دێ. ئانا ماوەیەکی زۆر بێ ئەوەی زمانی بگەڕێ لە ڤرۆنسکی راما، ئەگەرچی روخساری ڤرۆنسکی لە تاریکیدا بوو بەڵام ئانا حاڵەتی ئەدگار و چاوانی ئەوی دی یان پێیوابوو دەیبینێ. دیسان ئەو حاڵەتە شەیدایی و پڕ لە رێزە بوو کە رۆژی رابردوو شوێنی لەسەر دڵی دانابوو. لە ماوەی ئەو دوو رۆژەدا و هەتا ئەم کاتە لە دڵی خۆیدا گوتبووی ڤرۆنسکی بۆ ئەو یەکێك لەو سەدان گەنجەیە کە لە هەموو جێگایەك دەیانبینێ و هەموویان لە یەك دەچن و ئەو هیچ کات ئیزن بە خۆی نادا کە تەنانەت بیریشیان لێبکاتەوە، بەڵام ئێستا هەر بەو روانینە غورووڕێکی پڕ لە شادی دڵی داگرت. پێویستی نەدەکرد لێی بپرسێ لەوێ چدەکا. هۆی هەنتەشی ئەوی ئەوەندە لێ ڕوون بوو، کە دەتگوت ئەو بە زمانی خۆی پێیگوتووە. دەیزانی ڤرۆنسکی بۆیە هاتووە تاکوو لێی نزیك بێ.

ئەو دەستەی هەڵی هێنابوو کە نەردەی کەناری پلیکانی ڤاگۆنەکە بگرێ داینەواندەوە و گوتی: نەمدەزانی تۆش قەستی سەفەرت هەیە، چۆنبوو هاتن؟ ـ شادی و پەشۆکاوییەك کە نەیدەتوانی خۆی لێ ببوێرێ لە سیمایدا درەوشایەوە.

ڤرۆنسکی راست چاوی لە چاوی بڕیبوو و پرسیارەکەی ئەوی دووپاتکردەوە: چۆنبوو هاتم؟ خۆشتان دەزانن. بۆ ئەوەی لەگەڵتان بم، چارەم نییە، چ بکەم؟

لەوکاتەدا گژەبا، وەك ئەوەی بیهەوێ دوایین خۆڕاگریی بەربەستەکەی تێکبشکێنێ، بەفری سەربانی ڤاگۆنەکەی کردەخوارێ، دەنگیشی دەتگوت تەقو هۆڕی پێکدادرانی تەبەقی ئاسنینە. فیکەی گڕی شەمەندەفەر وەك ناڵەیەکی خەماوی لە پێشەوە بەرزبۆوە. مەترسی کڕێوە و بۆران بۆ ئانا شکۆیەکی مەزنی پەیداکردبوو. ئەو هەر ئەو شتەی درکاند کە رۆحی

ئانا تامەزرۆی بیستنی بوو بەڵام ئەقڵی لەو شتە دەترسا. وەڵامی نەدایەوە بەڵام ڤرۆنسکی لە سیمایدا رەنگدانەوەی کێشەیەکی دەروونیی دی.

ڤرۆنسکی بە لەبزێکی خاکەڕایانەوە گوتی: ئەگەر قسەیەکی بێتامم لە دەم دەرچوو داوای لێبوردن دەکەم.

ئەوەندە بە ئەدەبانە و رێزەوە و بە لەبزێکی قایم و پتەوەوە ئەو قسەیەی کرد کە ئانا هەتا ماوەیەك نەیتوانی وەڵامی بداتەوە.

ئاخری گوتی: ئەو قسەیەی کردت جوان نییە و تکات لێدەکەم کە وەك پیاوێکی بە شەڕەف ئەوەی گوتت لەبیری بەرییەوە، هەروەك منیش دەمەوێ لەبیری بەرمەوە.

ـ هەموو ئەو وشانەی کە لە دەمی ئێوە هاتۆتە دەرێ و ئەو هەڵسوکەوتانەی لە ئێوەم دیوە قەتم لەبیرناچنەوە، قەتقەت ناتوانم لەبیریان بەرمەوە.

ئانا بە تووڕەیی گوتی: بێدەنگبە، لەسەری مەڕۆ! ـ بەڵام لەخۆڕا هەوڵی دەدا روخساری خۆی کە ڤرۆنسکی تۆڵازانە چاوی تێبڕیبوو، گرژ و تووڕە بنوێنێ. دەستی بە نەردەی کەناری پلیکانەکانەوە گرت و چووە سەرێ و بەپەلە خۆی کرد بە نێو دالانی ڤاگۆنەکەدا و لە چاو ون بوو. بەڵام لەنێو دالانە باریکەکەدا راوەستا و ئەوەی رابردبوو لە خەیاڵیدا وەردی دایەوە. ئەگەرچی نە ئەوەی کە خۆی گوتبووی هەمووی لەبیر بوو، نە وتەکانی ڤرۆنسکیی بە شێوەی خۆماك هەست پێدەکرد کە هەر ئەم ئاخافتنە کورتە ئەوانی زۆر لە یەکتر نزیك کردۆتەوە، تووشی ترس و دڵەوڕێزەش بووبوو بەڵام لەپاڵ ئەوەدا وەنەشەش کەوتبوو. دوای گتێکی کورت لە دالانی ڤاگۆنەکە خۆی کرد بە نێو قەمارەکەدا و لەسەر جێی خۆی دانیشت. ئەو گوشارە سێحراوییەی کە سەرەتا ئازاری دەدا نەك دیسان خۆی لە دڵ و رۆحی هاڵاندەوە بەڵکوو ئەوەندەی تر لە ناخەوە هەژاندی و وایلێهات کە دەترسا ئەو جەخت و گوشارە تاقەتپڕووکێنە وا دڵی بخاتە کوتەکوت سینگی کون بکات و بێتەدەرێ. ئەو شەوە خەو نەچووە چاوی. بەڵام ئەو گوشارە رۆحییانە و ئەو حەز و خولیایانەی دەروونیان داگرتبوو لە هیچ بارێکەوە تاڵ و ناخۆش نەبوون، بە پێچەوانە شتێکی پڕ لە نەشە و سووتێنەر و هەستبزوێنیش بوون. بەرەبەری بەیانی هەروا دانیشتبوو و بەدەم فیکر و خەیاڵەوە تۆزێ چاوی چووە خەو، کە وەخەبەر هات وڵات رۆشن بووبوۆوە و شەمەندەفەرەکە لە پترزبۆرگ نزیکبووبۆوە. لەرێوە ماڵ و مێرد و کوڕەکەی وەبیرهاتەوە و ئەو کارانەی کاتی هاتن و رۆژانی دواییش هەموو هۆشوگۆشیان بە خۆوە خەریك کردبوو.

لە پترزبۆرگ، کە شەمەندەفەرەکە راوەستا و دابەزی، یەکەم شت کە سەرنجی راکێشا روخساری مێردەکەی بوو. لە روخساری سارد و قەڵافەتی مەند و ماقووڵی راما و بەتایبەت پەلی گوێی کە پەراوێزی کڵاوە گردەکەی رێکی گوشیبوو تووشی سەرسووڕمانی کرد، لەبەر خۆیەوە گوتی: «خودایەگیان ئەوە گوێچکەی بۆ وای لێهاتووە؟» هەر لەگەڵ چاوی بە ئانا کەوت بە هەڵەداوان هات بەرەوپیری و لێوی بە بزەیەکی تایبەت کرایەوە کە هەمیشە تەشەراویی دەنواند و سەرنجی چاوە ماندووەکانی راست لە روخساری ئانا بڕی. کاتێك ئانا قورساییی ئەو نیگا بەردەوام و ماندووەی مێردەکەی لەسەر روخساری خۆی هەست پێکرد خەمێکی تاڵ و نامۆ دڵی رێك گوشی. وێدەچوو چاوەڕوانی ئەوەبێ کە قەڵافەتی مێردەکەی گۆڕابێ. بەتایبەت هەستی تاڵی خۆی، کە ئەو کاتانەی لەگەڵی بەرەوڕوو دەبوو گیانی دادەگرت، تووشی سەرسووڕمانی کرد. ئەو هەستە، کە تازەش نەبوو و بۆ دڵیشی ئاشنابوو، زیاتر شێوەی لە مەرایی دەچوو بەڵام ئەو لە رابردوودا تێینەگەیشتبوو، بەڵام ئێستا سوور دەیزانی و ئەو تێگەیشتنەش زۆر تاڵ و ناخۆش بوو.

کارنین بە دەنگێکی ناسك و لەبزێکی نەرم گوتی: دەی دیتووتە، مێردە مێهرەبانەکەت چەندە تامەزرۆی دیدارتە و ئاراوقارای لێهەڵگیراوە، راست وەکوو تازە زاوایەك ـ لەبزی قسەکردن لەگەڵ ژنەکەی زۆربەی کات ئاوا تەشەراوی بوو و لەڕاستیدا توانجەکەشی بۆ ئەو کەسانە بوو کە لەگەڵ ژنەکەیان بەڕاستی ئاوا قسە دەکەن

ئانا پرسیی: سریۆژا چۆنە؟ خۆ شوکر چاکە؟

ـ ئەوەیە وەڵامی ئەو هەموو حەز و تامەزرۆییەی من؟ چاکە؟ شوکر چاکە.

## سی و یەك

ڤرۆنسکی ئەوشەوە تەنانەت هەوڵیشی نەدا سەرخەوێك بشکێنێ. لەسەر کورسییەکەی خۆی دانیشتبوو و زیاتر چاوی لە پێش خۆی دەبڕی و هێندێ جاریش سەرنجێکی ئەو کەسانەی دەدا کە دەهاتنە نێو کووپەکەوە یان دەچوونە دەرێ. ئەگەر لە رابردوودا بە هێمنی و لەسەرەخۆیی ناسیاوەکانی خۆی تووشی سەرسووڕمان دەکرد، ئێستا هەڵسوکەوتی زۆر لە کەسێکی لەخۆبایی و لەخۆ رازی دەچوو. بەجۆرێك لە ئەم و ئەوی دەڕوانی دەتگوت هەر بە مرۆڤییان نازانێ. لاوێك کە بەرەوڕووی دانیشتبوو و کاربەڕێوەبەری دادگای شار بوو زۆر تووڕە

دەهاتە بەرچاو و هەر لەبەر ئەو هەڵسوکەوتە زۆری لێ وەڕەز بوو. چەند جار جگەرەی بە جگەرەکەی ئەو داگیرساند. قسەی لەگەڵ دەکرد و تەنانەت هێندێ جار راشی دەتلەکاند تاکوو پێی بسەلمێنێ کە مرۆڤە و دیوار نییە، بەلام ڤرۆنسکی جۆرێك چاوی لێدەکرد دەتگوت چرای دیوارییە و لاوە هەستی دەکرد کە بەهۆی ئەو هەموو قۆڕەدەماخی و هەوایەی ئەوەوە خەرێکە ئیمان هەردە دەبێ، ئەو رقهەستانەش لە هەڵسوکەوت و سیمایدا بەدی دەکرا و هەر بەو هۆیەش خەوی لێنەدەکەوت.

ڤرۆنسکی هیچ کەس و هیچ شتێکی نەدەدی. لە دڵی خۆیدا شای بە سەپان نەدەگرت، بەلام نەك بەو هۆیەی کە پێیوابێ شوێنی لەسەر دڵی ئانا داناوە، هێشتا ئەو گومانەی لەلا دروست نەبووبوو، بەڵکوو بەو هۆیە کە ئانا شوێنی لەسەر رۆحی دانابوو و پێی وا بوو بەختەوەری دەکات، هەر بەو هۆیەش شانازیی بەخۆیەوە دەکرد.

ئاکامی ئەو کارە بەکوێ گەیشت، نەیدەزانی و تەنانەت بیریشی لێنەدەکردەوە. هەستی دەکرد تەواوی وزە و توانای کە هەتا ئەو کاتە بە فیڕۆ چووە و لێی پرژوبلاو بۆتەوە، ئێستا هەمووی کۆ بۆتەوە سەریەك و وەك وزەیەکی بەهێز و مەزن بەرەو ئامانجێکی بەختەوەرانە دەچێ. هەر ئەوە بووبووە هۆی ئەوەی کە خۆی بە بەختەوەر بزانێ. تەنیا دەیزانی کە قسەی راستی بە ئانا گوتووە و بۆ شوێنێك دەچێ کە ئەوی لێیە و شیرینی ژیان و تاقە مانای ژیان بۆ ئەو لەوەدایە کە ئەو ببینێ و گوێی لە دەنگی بێ، کاتێکیش کە لە بۆلۆگۆیە[62] لە ڤاگۆنەکە دابەزین بۆ خواردنەوەی ئاوی کانی، چاوی بە ئانا کەوت ئەو یەکەم وشانەی کە بێ ئیختیار پێیگوت هەر ئەو شتە بوو کە بیری لێدەکردەوە. زۆریش دڵخۆش بوو کە ئەو قسەی کردووە و ئانا ئێستا لە مانای قسەکەی گەیشتووە و بیری لێدەکاتەوە. ئەو شەوە خەوی لێنەکەوت. کە گەڕایەوە بۆ ڤاگۆنەکەی خۆی چۆنێتیی دیتنی ئانا و قسەکانی وەبیر خۆی هێنایەوە و ئەو دیمەنانەی کە وێدەچێ لە داهاتوودا بیانبینێ هەمووی هێنایە بەر زەینی خۆی و ئەو دیمەنانەش جۆرێك بوون کە تووشی دڵەکوتەیان کردبوو و لەوانەبوو هەناسەی راوەستێ.

کاتێك لە پترزبۆرگ لە شەمەندەفەرەکە دابەزی، ئەگەرچی شەوێك هەتا رۆژ خەو لە چاوی نەکەوتبوو، بەڕادەیەك هەستی بە شادی و نەشە دەکرد کە دەتگوت لە ئاوی سارددا مەلەی کردووە. لە پاڵ ڤاگۆنەکەی خۆی راوەستا و چاوەڕوانی ئانا بوو بێتەدەرێ. بە بزەیەکی نەخوازراوەوە لە دڵی خۆیدا

62- Bologoye

گوتی «جارێکی تر چاوم پێیدەکەوێ و لە روخساری و شێوەی رەوت و رۆینی دەڕوانم. حەتمەن شتێك دەڵێ، ئاوڕێکم لێدەداتەوە، چاوێکم لێدەکات و رەنگە زەردەیەکیش بگرێ.» بەڵام بەرلەوەی ئەو ببینێ مێردەکەی دی کە سەرۆکی وێستگە بە رێزێکی زۆرەوە لە نێو ئاپۆرەی خەڵکەکەدا رێنوێنیی دەکرد. لەبەر خۆیەوە گوتی: «ئاخ، بەڵێ ئەوە مێردەکەیەتی!» تازە بیری لێکردەوە کە مێردێك لە گۆڕێدایە و مێردیش کەسێکە کە گیان و دڵی بە ژنەکەیەوە بەندە. دەیزانی کە ئانا ئارکادیۆڤنا مێردی هەیە بەڵام باوەڕی نەدەکرد کە بەڕاستی مێردی هەبێ، کاتێك دڵنیا بوو کە بە چاوی خۆی دیتی و بۆی دەرکەوت کە خاوەنی سەر و شانێکە و هەروەها لاقی کە لە پانتۆڵی رەشدا شاردراونەتەوە، بەتایبەت کاتێك بە روونی تێگەیشت کە دیتی ئەم مێردە بە خاترجەمی و هەست کردن بە خاوەندارێتی قۆڵی ئەوی گرت.

کاتێك ئەلکسی ئەلکساندرڤیچی بە ریشی تاشراو و تیفتیفە دراوی پترزبۆرگیانەوە دی کە پۆز و لەخۆ رازیبوونی پێوە دیاربوو، بەو کڵاوە خڕەوە کە دوایەکەی خوار بووبۆوە بڕوای بە بوونی ئەو کۆسپە گەورەیە کرد و بە دیتنی ئەو هەستێکی تاڵ و پڕ لە حەسرەت دڵی داگرت و وەك رێبوارێکی تاونی و سیوشکە هەڵاتوو دەچوو کە شەکەت و ماندوو دەگاتە کانییەك بەڵام دەبینێ سەکێك یان بەرازێکی گەڕ پەڕیوەتە نێو دەرووی کانییەکە و خەریکی ئاو خواردنەوەیە و بە جارێ ئاوەکەی لێڵ و پیس کردووە. ئاکاری ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بە لاقی وشك و بادانی سمت و پاشەڵییەوە لەبەر چاوی ڤرۆنسکی زۆر ناحەز و ئازاردەر بوون. خۆشویستنی ئانای بە هەقی بێئەملاو ئەولای خۆی دەزانی، بەڵام ئانا هەر ئەوە بوو کە بوو و دیتنیشی هەروا شوێنی لەسەر لەشی دانا و دەروونی پڕکرد لە حەز و شیلەی بەختەوەری و ئەشقی ئاوێتەی رۆحی کرد. فەرمانی بە نۆکەرە ئاڵمانییەکەی دا کە لە ڤاگۆنە دەرەجە دووەکە دابەزی و بە هەڵەداوان هات بۆ لای تاکوو کەلوپەلەکانی هەڵگرێ و بیبا، خۆشی رۆیشت بۆ لای ئانا. ڤرۆنسکی بو یەکەم جار دیتی کە بەرەوڕوو بوونی ئەو ژن و مێردە سارد و سڕە و بە وردبینییەکی ئەویندارانەوە بۆی دەرکەوت کە خەمێکی شاراوە لە ناخی ئانادایە و کاتێك لەگەڵ مێردەکەی قسەی کرد تەواو لەوە دڵنیا بوو. لە دڵی خۆیدا بەو ئاکامە گەیشت کە «نا، وادیارە ئانا مێردەکەی خۆش ناوێ و ناتوانێ خۆشی بوێ.»

کاتێك کە لە دواوە لە ئانا ئارکادیۆڤنا نزیك دەبۆوە بە شادییەوە بۆی دەرکەوت کە ئانا هەستی بە نزیکبوونەوەی کردووە و خەریکە ئاوڕی لێدەداتەوە، بەڵام کە بۆی دەرکەوت ئەوە دیسان رووی لە مێردەکەی کردەوە. ڤرۆنسکی لە هەمبەر ئەو و مێردەکەی کڕنۆشێکی کرد و پرسیی: شەوێکی ناخۆشتان نەبوو؟ ـ هەر گوێشی لەوە نەبوو کە ئەلکسی ئالکساندرۆیچ کڕنوشەکەی ئەوی بەهێند گرتووە یان نا و دەیناسێ یان نایناسێ.

ئانا وەڵامی دایەوە: سپاست دەکەم، جێگاکەم ناخۆش نەبوو.

ڕوخساری ئانا ماندووی دەنواند و ئەو حەزە دەروونییەی کە بەردەوام دەیویست ببێتە بزەیەك لەسەر لێوی یا ببێتە ترووسکەیەك، لە نیگایدا دیاربوو، بەڵام کە چاوێکی لە چاوی کرد ترووسکەی بزەیەك لە چاوانیدا درەوشایەوە و ئەگەرچی ترووسکەی ئەو نیونیگایە چاوترووکانێکی نەخایاند و خێرا کوژایەوە بەڵام ڤرۆنسکیی وەنەشە خست. چاوێکی لە مێردەکەی کرد کە بزانێ ڤرۆنسکی دەناسێ یان نا. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بە چاویدا دیاربوو کە حەز بە دیتنی ڤرۆنسکی ناکات و ماتومەنگ هەوڵ دەدا وەبیری بێتەوە کێیە. لەسەرەخۆیی و متمانە بەخۆبوونی بەهێزی ڤرۆنسکی، لە هەمبەر ئەو بڕوا بەخۆبوونە ساردەی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچدا، وەك بەرەوڕوو بوونی دار و تەشوێ وابوو.

ئانا ئەوی بە مێردەکەی ناساند: کۆنت ڤرۆنسکی.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ گوتی: ئەها، پێموایە ئاشنایەتیمان هەیە ـ ئەوەی گوت و تەوقەی لەگەڵدا کرد، پاشان رووی لە ئانا کرد و گوتی: لەگەڵ دایك چووی و لەگەڵ کوڕ هاتییەوە ـ وشەکانی زۆر بە وردی و دانەدانە دەربڕی، دەتگوت وتەکانی هەرکام گەوهەرێکی نایابن و بە بەردەنگەکەی دەبەخشێ: ئێوە وادیارە لە مۆڵەت گەڕاونەتەوە ـ بێ ئەوەی چاوەڕوانی وەڵامیش بێ رووی لە ژنەکەی کرد و هەر بەو لەبزە گاڵتەئامێز و تەشەراوییەوە گوتی: دەی، کاتی ماڵئاوایی لە مۆسکۆ سێڵاوی فرمێسك هەستا؟

بەو قسەیە ویستی ڤرۆنسکی تێگەیێنێ کە دەیهەوێ بە تەنیا بن، پاشان دەستی هەتا لای کڵاوەکەی هەڵێنا، بەڵام ڤرۆنسکی رووی لە ئانا کرد و گوتی: هیوادارم شانازیی ئەوەم هەبێ بێمە خزمەتتان.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بە چاوی خەمتێزاوەوە لە رۆنسکی روانی و بە لەبزێکی سارد و سڕەوە گوتی: زۆرمان پێخوش دەبێ، ئێمە دووشەممانە میوانداریمان هەیە ـ ئەوەی گوت و بە تەواوی رووی لە ڤرۆنسکی وەرگێڕا و رووی لە ژنەکەی کرد و هەر بەو لەبزە گاڵتە ئامێزەوە گوتی: زۆرم پێخۆشە زوو هاتییەوە، قەزائەن نیو سەعات وەختم هەبوو کە بێم بۆ پێشوازیت و مێهرەبانیی خۆمت پێنیشان بدەم.

ئانا کە گوێی لە ترپەی هەنگاوی ڤرۆنسکی بوو بە دوایانەوە هەر بەو لەبزە گاڵتە ئامێزەوە وەڵامی دایەوە: تۆش ئەوەندە مێهرەبانیی خۆتم بە چاودا مەدەوە کە لەبەر چاوم بکەوێ ـ پاشان لە دڵی خۆیدا گوتی «چ بکەم، با گوێی لێبێ.» پاشان لە مێردەکەی پرسی کە سریۆژا لەو ماوەیەدا کە ئەو لە ماڵێ نەبووە چیی کردووە.

ـ ئەها، زۆرچاك. مارییەت[63] دەڵێ زۆر كوڕی چاك بووە. ڕەنگە پێشی تێك بچی، بەڵام ئەوە بزانە بە پێچەوانەی مێردەكەت، وادیارە هەر بیریشی نەكردووی. دیسان زۆرت سپاس دەكەم خۆشەویستەكەم كە ڕۆژێكت وەك پاداش پێدام و زووتر هاتییەوە. سەماوەری خۆشەویستمان خۆشحاڵ دەبێ (سەماوەر ئاوەڵناوی كۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا[64]ی بە ناوبانگ بوو كە ئەو بەسەریدا بڕیبوو، چونكە خەمی بۆ هەموو كەس دەخوارد و بووبووە مامەخەمە و وەك سەماوەر هەمیشە لە كوڵ بوو) بەردەوام سۆراخی تۆی دەگرت. ئەگەر بوێرم داوات لێدەكەم هەر ئەمڕۆ سەرێكی لێهەڵێنی. خۆ تۆ چاكی دەناسی، خەم بۆ هەموو كەس دەخوا. ئێستاش خەمی ئەو كێشەیەی ئابلۆنسكی و ژنەكەی ئەوەندەی تر خەفەتباری كردووە.

كۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا هاوڕێی مێردەكەی و بەڕێوەبەری یەكێك لە بنكەكانی نەجیمزادانی پترزبۆرگ بوو كە ئانا بەهۆی ئەلكسی ئەلكساندرڤیچی مێردییەوە زۆری لێ نزیكبوو.

ـ من خۆ ماجەراكەم بۆ نووسی.

ـ بەڵێ، بەڵام ئەو حەزدەكات هەمووی بە وردی بۆ باس بكەی، ئەگەر زۆر ماندوو نییت سەرێكی لێهەڵێنە، خۆشەویستەكەم. كۆندراتی[65] فایتوونەكەت بۆ دێنێ. من كومیسیۆنم هەیە. شوكر بۆ نانی نیوەڕۆ بە تەنیا نابم ـ بەڵام ئیتر لەبزی بۆنی گاڵتەی لێنەدەهات: گوتی: تۆ نازانی من چەندەم خوو پێگرتووە و...

دوای ئەوەی ماوەیەكی زۆر دەستی گوشی سواری عارەبانەكەی كرد.

## سی و دوو

یەكەم كەس كە ئانا لەماڵەوە چاوی پێیكەوت كوڕەكەی بوو. كوڕە بێ ئەوەی گوێ بە هاوار و هەرای پەرەستارەكەی بدا لە ژوورەكەی دەرپەڕی و بە هەڵاتن بە پلیكانەكاندا داگەڕا و ڕۆیشت بۆ لای دایكی. بە شادی و حەزێكی منداڵانەوە دەیقریشكاند و هەرای دەكرد: دایەگیان، دایەگیان! گەیشتە لای دایكی خۆی خستە باوەشی و دەستی لە ملی هاڵاند و خۆی پێوە هەڵواسی.

---

63- Mariette

64- LydiaIvanona

65- Kondraty

به پەرەستارەکەی گوت: نەمگوت، پێمنەگوتی دایەگیانمە، من دەمزانی.

دیداری کوڕەکەشی وەك دیداری مێردەکەی داخ و خەمێکی سووکی خستە دڵییەوە. لە خەیاڵیدا ئەوی چاکتر لەوەی کە بوو هێنایە بەرچاوی خۆی. ناچاربوو هەتا دوایین پلەی راستەقینە بێتە خوارێ بۆ ئەوەی ئەو جۆرەی کە هەیە چێژ لە دیداری کوڕەکەی وەرگرێ. بەڵام سریۆژا ئاواش بە قژو کاکۆڵی لوول و زێڕین و چاوانی شین و لاقی جوان و گۆشتن کە گۆرەوی لە قالْبی دابوو زۆر خۆشەویست و لە دڵا شیرین بوو. ئانا چێژێکی گەرمی لە نزیکی و لاواندنەوەی وەردەگرت و بە دیتنی روانینی منداڵانە و دڵی پڕ لە خۆشەویستی و متمانە و بیستنی پرسیاری دڵپاکانەی ئەو هەستی بە ئۆخژن و حەسانەوە دەکرد. ئەو دیارییانەی منداڵەکانی دالی بۆیان ناردبوو هەموویانی پێدا و بۆی باسکرد کە مۆسکۆ کچێکی لێیە ناوی تانیایە، کتێب دەخوێنێتەوە و تەنانەت منداڵانی تر فێری خوێندنەوە دەکات.

سریۆژا گوتی: یانی ئەو لە من چاکترە؟

ـ تۆ بەلای منەوە لە هەموو کەسێك چاکتری!

سریۆژا بە بزەیەکی منداڵانەوە گوتی: دەزانم.

ئانا هێشتا قاوەکەی نەخواردبۆوە کە پێشخزمەت هەواڵی هاتنی کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنای پێدا. کۆنتسلیدیا ئیڤانۆڤنا ژنێکی باڵابەرز و قەڵەو بوو کە زەردەڵییەکەی جۆرێك بوو دەتگوت نەخۆشە، چاوە رەش و جوانەکانیشی هەمیشە پڕ بوون لە خەم و خەیاڵ. ئانا زۆری ئەو ژنە خۆش دەویست بەڵام ئەمڕۆ دەتگوت بۆ یەکەم جارە عەیبەکانی ئەوی بۆ دەرکەوتووە.

کۆنتس هەرکە پێینایە ژوورەکەوە گوتی: دەی، خۆشەویستەکەم، کارەکەت بەکوێ گەیاند، شێری یان رێوی؟

ئانا وەڵامی دایەوە: بەڵێ، جێبەجێم کرد. بەڵام مەسەلەکە ئەوەندەش ئاڵۆز نەبوو کە ئێمە بیرمان لێدەکردەوە. براژنم هەروایە بۆ بڕیاردان زۆر پەلەپەل دەکات.

بەڵام کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا خۆی لە هەموو کارێك هەڵدەقوتاند و گوێی لەوە نەبوو پێوەندیی بەوەوە هەیە یان نا، عادەتیشی نەبوو گوێ بە روونکردنەوە بدا سەبارەت بەو شتەی کە هۆگریی پێیەهەیە. قسەکەی ئانای بڕی: بەڵێ ئەم دنیایە پڕە لە خەم و تاڵی و من ئەمڕۆکە زۆر دڵتەنگم.

ئانا بزەکەی سەر لێوی کاڵ بۆوە و پرسیی: بۆ، چبووە؟

ـ ئیتر ئەوەندەم لەخۆڕا لەخۆ بردوویی نواندووە و لایەنگریم لە هەق و هەقیقەت کردووە جاڕز بووم. جاریوایە خەریکم ئیمان هەردە دەبم. کاری «خوشکانی لێقەوماو» (دامەزراوەیەکی خێرخواز و

ئایینی و نیشتمانپەروەرانە بوو) خەریکبوو بە باشی بەرێوەدەچوو بەڵام کارکردن لەگەڵ ئەو پیاوانە زۆر ناخۆشە و دەبێ دڵت وەك پۆڵا وابێـ پاشان بە خاوبوونەوەیەکی گاڵتەجارانەوە گوتی: بیرۆکەی من دەدزن و پێچەوانەی دەکەنەوە، پاشان رەخنەی لێدەگرن کە شتێکی سووك و بێ مانایە. دەی چیم پێدەکرێ؟ دوو سێ کەس یەك لەوانە مێردەکەی تۆ لە گرینگایەتیی ئەو کارانە دەگا، ئەوانی دیکە دست لە هەوڵدان هەڵدەگرن. هەر دوێشەو پراڤدین بۆی نووسیبووم...

ئەو پراڤدینە پانئیسلاویزمێکی بەناوبانگ بوو لە هەندەران دەژیا و کۆنتس ناوەرۆکی نامەکەی ئەوی بۆ باس کرد.

کۆنتس پاشان هێندێ شتی زۆر ناخۆشی بۆ باس کرد، باسی ئەو دۆڵاب و دهۆیانەی کرد کە دژی یەکیەتیی گوورووپە جۆراوجۆرە ئاینییەکان لە ئارادایە، پاشان بەپەلە رۆیشت چونکە هەر ئەو رۆژە دەبوو لە کۆبوونەوەی فلان کۆمەڵە و هەروەها لە لێژنەی پانئیسلاویستەکاندا بەشداری بکات.

ئانا لە دلّی خۆیدا گوتی: «چاکە، ئەم تایبەتمەندییانەی ئەو خۆ هیچیان نۆبەرە نین. کەوایە من بۆ تا ئێستا بۆم دەرنەکەوتووە ئەوانە چدەکەن؟ یان وێدەچێ ئەو ئەمرۆ زیاتر لە جاران توورە بووبێ؟ بەڵام لە بەینی خۆماندا بێ زۆر شتێکی قۆرە. ئامانجی کاری خێرە و خۆشی بە مەسیحی دەزانێ بەڵام هەمیشە رقی لە خەڵکی هەستاوە و هەمووان لەگەڵی نەیارن و دوژمنایەتییەکەشیان لەسەر ئەو کارە خێر و مەسەلە مەزهەبییانەیە.»

دوای رۆیشتنی کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا دەستە خوشکێکی تری کە ژنی یەکێك لە سەرۆکانی ئیدارە بوو هات بۆ دیدەنیی و رووداوە تازەکانی نێو شاری بۆ باس کرد. سەعاتی سێ ئەویش رۆیشت و قەولیدا کە بۆ نان و چایی نیوەرۆ بگەرێتەوە. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لە وەزارتخانە بوو. ئەویش هەتا نیوەرۆ وەختی خۆی بۆ نانخواردن و دانیشتن لەلای کورەکەی تەرخان کرد (کورەکەی بە تەنیا نانی دەخوارد) لەگەڵ ئەوەشدا کەلوپەلەکانی خۆی رێکوپێك کرد و ئەو نامەو یادداشتانەی گەیشتبوون و لەسەر مێزەکەی داندرابوون خوێندییەوە و وەڵامەکەیانی نووسییەوە.

هەستی شەرمێك کە لە ماوەی سەفەرەکەیدا دلّی رێك دەگوشی لەو ماوەیەدا بە تەواوی لەبیری چووبۆوە. کاتێك کەوتەوە سەر دۆخی ئاسایی ژیان دیسان خۆی قورس و قایم راگرت و لە چنگ سەرکۆنە و ئازاری ویژدان رزگار بوو.

بارودۆخی شەوی پێشووی وەبیرهاتەوە تووشی سەرسوورمانی کرد: «مەگین چی بووبوو؟ هیچ! ڤرۆنسکی ورێنەیەکی کردبوو. زۆر بە ساناییش دەکرێ دوایی بەو ورینە و راواندنانە بێنێ. منیش ئەو وەڵامەی کە پێویست بوو پێمدایەوە. پێویستیش ناکا سەبارەت بەوە لەگەڵ

مێردەکەم قسە بکەم و ناتوانم هەر باسی بکەم. ئەگەر سەبارەت بەو بابەتە قسەیەك بکەم یانی گرینگایەتییەك کە نییەتی، پێیدەدەم.» وەبیری هاتەوە کاتێك ژێردەستانی مێردەکەی ئاشقی بووبوون و پێیان گوتبوو، بۆ مێردەکەی گێڕابۆوە و ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لە وەڵامیدا گوتبووی کە هەموو ژنێك لە کۆمەڵگای گەوراندا دەبێ خۆی بۆ بیستنی ئەو قسەو داخوازییانە ئامادەبکات و ئەو بڕوای تەواوی بە ژنەکەی هەیە و قەت ئیزن بەخۆی نادا دڵی لێ پیس بکات و ژنەکەی سووك بکات. لە دڵی خۆیدا گوتی: «کەوایە لەو بارەوە هیچ نەڵێم باشە و جوان نییە هەر باسی بکەم، خودایە زۆر شوکر، هەر باسیشی ناکەم.

## سی و سێ[٧]

سەعات چوار ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لە وەزارەتخانە گەڕایەوە بەڵام هەروەك ڕۆژانی تر نەیتوانی بچێت بۆ لای ئانا و ڕۆیشت بۆ نووسینگەکەی خۆی تاکوو وەڵامی کارهێنەرەکان بداتەوە و ئەو نامانە ئیمزا بکات کە بەرپرسی نووسینگەکەی هێنابووی. هەمیشە بۆ نان و چایی نیوەڕۆ سێ چوار کەسیان میوان دەبوو. ئەو ڕۆژەش ژنێکی بەساڵاچوو کە ئامۆزای ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ و بەرپرسی یەکێك لە ئیدارەکان بوو لەگەڵ مێردەکەی و لاوێك کە داوایان لە کارنین کردبوو لە وەزارەتخانەکەی کارێکی بۆ بدۆزێتەوە و دایمەزرێنێ لەسەر مێزەکە دانیشتبوون. ئانا بۆ بەخێرهاتنی میوانەکان هاتەژووری میوانداری. ڕاست سەری سەعاتی پێنج هێشتا سەعاتە برنجییەکەی تەلار (سەعاتێك بوو بە شێوازی پێتری کە بیر) پێنجەمین زەنگی لێنەدابوو کە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ فراك لەبەر بە کراواتی سپی و دوو ئەستێرە بەسەر سینگییەوە (چونکە ناچاربوو دوای نانی نیوەڕۆ خێرا بڕواتە دەرێ) خۆی کرد بە تەلارەکەدا. ژیانی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بەپێی بەرنامەیەکی ورد و ڕێکوپێك هەڵدەسووڕا، بەجۆرێك کە تەنانەت یەك خولەکی بە فیڕۆ نەدەچوو. بۆ ئەوەی بتوانێ ئەو ئیشانەی کە بۆ ڕۆژانەی خۆی پێشبینیی کردبوون ئەنجامیان بدات هەوڵی دەدا بەرنامەی کارەکانی زۆر بە وردبینی و ڕێك وپێکی بەڕێوەبچن. دروشمی هەمیشەی ئەوەبوو «نە پەلەپەل نە کەمتەرخەمی.» لەگەڵ ئەوەی دەستی بە نێوچاوانی خۆیدا دێنا هاتە نێو تەلارەکەوە و سڵاو و چاکوچۆنی لەگەڵ میوانەکان کرد و بە بزەیەکەوە چاوی لە ژنەکەی کرد و خێرا دانیشت.

ـ چاکە، ئیتر ڕۆژانی تەنیاییم کۆتایی هات. نازانن بە تەنیا نان خواردن چەندە ناخۆشە ـ لەسەر ناخۆشەکەش تەواو هەڵوەستەی کرد.

لەگەڵ نانخواردن سەبارەت بەو شتانە لە مۆسکۆ روویدابوو لەگەڵ ژنەکەی دواو بە بزەیەکی تەشەراوییەوە سەبارەت بە ستیپان ئارکادیچ پرسیی: بەڵام باسوخواسەکەیان گشتی بوو و زیاتر سەبارەت بە مەسەلە ئیداری و کۆمەڵایەتییەکان بوو. دوای نانخواردن نیو سەعاتێك لەگەڵ میوانەکان دانیشت و پاشان بە پێکەنینەوە دەستی ژنەکەی گوشی و بەرەو نووسینگەی شۆڕا وەڕێکەوت. ئانا ئەمجارە نەچوو بۆ دیدەنیی پرێنسس بێتسی تورسکایا[٦٦] کە زانیبووی لە سەفەر گەڕاوەتەوە بانگهێشتنی کردبوو، نەچوو بۆ شانۆ کە ئەوشەوە شوێنی تایبەتیان بۆ دانابوو. هۆی نەچوونەکەشی زیاتر لەبەرئەوەبوو کە ئەو جلوبەرگەی دەیویست لەبەری بکات هێشتا ئامادە نەبووبوو. دوای رۆیشتنی میوانەکان جلوبەرگەکانی ئەمبارەوبار کردو دوای ئەوەی هیچیانی بەدڵ نەبوو رقی هەستا. پارەی زۆر نەدەدا بە جلوبەرگ و لەگەڵ ئەوەی زۆر کەمخەرج بوو بەڵام مامۆستای خۆڕازاندنەوە و تەرپۆشی بوو. بەر لەوەی بچێت بۆ مۆسکۆ سێ کراسی لای بەرگدروو دانابوو کە وایان بگۆڕێ نەناسرێنەوە و بەرگدرووش بەڵێنی پێدابوو کە هەتا سێ رۆژی تر ئامادەیان دەکات. بەڵام یەکیانی بە پێچەوانەی ویستی ئانا گۆڕیبوو و دوو دەستەکەی تریشیان هەر دەستی لێنەدابوون. کابرای بەرگدروو هاتبوو بۆ لای ئانا و دەیگوت ئەو کارەی کردوویێتی زۆر باشترە لە داواکارییەکەی خۆی بۆیە وا رقی هەستابوو چەقۆت لێدایە خوێنی نەدەهات، بەڵام کاتێك بیری لەو ئاکارەی خۆی دەکردەوە تووشی شەرمەزاری دەبوو. بۆ ئەوەی رقەکەی بنیشێتەوە و بێتەوە سەرخۆ رۆیشت بۆ ژووری کوڕەکەی تاکوو ئەو شەوە لەگەڵی رایبوێرێ، کوڕەکەی خەواند و خاچی کێشا و بە جوانی داپۆشی. زۆریش خۆشحاڵ بوو کە بۆ هیچ کوێ نەچووە و کاتی خۆی ئاوا بە باشی رابواردووە. بە جوانی دەهاتەوە بیری کە هەموو ئەو رووداوانەی نێو شەمەندەفەرکە شتێکی ئاسایین و لەخۆڕا ئەوەندە بە گرینگی دەزانێ، هەروەها کارێکی واشی نەکردبوو کە لای خۆی یان کەسێکی تر شەرمەزار بێ و بەو هۆیەشەوە هەستی بە ئاسوودەیی و ئەرخەیانی دەکرد. رۆمانە ئینگلیزییەکەی هەڵگرت، لە پەنا کوورەکە دانیشت و چاوەڕوانی مێردەکەی بوو. سەری سەعاتی نۆونیو تەقەی دەرگاکە هات و مێردەکەی هاتەژوورێ.

ئانا گوتی: ئاخری هاتییەوە! ـ باوەشی بۆ مێردەکەی کردەوە، ئەویش ماچی کرد و لە پەنایدا دانیشت.

گوتی: وەك بزانم سەفەرەکەت سەرکەوتووانە بووە.

---

66- Betsy tverskaya

ئانا وەڵامی دایەوە: بەڵێ، زۆریش ـ هەموو شتێکی بە وردی بۆ گێڕایەوە: سەفەرەکەی لەگەڵ کۆنتس ڤرۆنسکایا و گەیشتنە مۆسکۆ و رووداوی وێستگەکە و پاشان خەم و پەرۆشی بۆ براکەی و هاوخەمی لەگەڵ دالی و....

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بە لەبزێکی سارد و رەق گوتی: بە بڕوای من مرۆڤی ئاوا بۆ لێبوردن نابێ، تەنانەت ئەگەر برای تۆش بێ.

ئانا گرژبییەوە. تێگەیشت کە ئەو بۆیە ئەو قسەیە دەکات هەتا نیشانیدا تەنانەت نزیکی و خزمایەتیش نابێتە هۆی ئەوەیکە بیروڕای خۆی سادقانە دەرنەبڕێ.

ئەلکسی ئەلکساندرۆڤنا گوتیشی: خۆشحاڵم کە کارەکانی تۆ بە باشی و بەخۆشی کۆتایی هات و گەڕایەوە. ئێستا پێمبڵێ بزانم ئەو یاسا نوێیەی بە شۆڕاکانم واژۆ کرد و رامگەیاند لە مۆسکۆ پێیان چۆن بوو؟

ئانا لەو بارەوە هیچی نەبیستبوو و هەستی بە شەرمەزاری کرد کە ئەو مەسەلەیەی لەبیرنەبووە کە بە لای مێردەکەیەوە تا ئەو رادەیە گرینگە.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بە بزیەکەوە کە وایدەنواند لە کارەکەی خۆی زۆر رازییە گوتی: لێرە بەپێچەوانە، هیچ دەنگدانەوەیەکی نەبوو.

ئانا دەیزانی مێردەکەی دەیهەوێ هەواڵێکی پێڕاگەیێنێ کە بەلای خۆیەوە زۆر دڵخۆشکەر و گرینگە بۆیە بە هێندێ پرسیار بیری مێردەکەی بەرەو بابەتەکە راکێشا و ئەویش بە بزەیەکی رەزامەندانەوە بۆی باس کرد کە دوای پەسەندکرانی یاسا نوێیەکە چ بەزمورەزمێك ساز بووە. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ گوتی: من بەهۆی ئەو شادی و بە مورەزمەی خەڵکەوە زۆر خۆشحاڵ بووم، ئەوەش پیشاندەری ئەوەیە کە لە وڵاتی ئێمە خەڵك خەریکن لە بواری بیروڕای ئاقڵانە و قورس و قایمدا هەنگاو هەڵدەگرن.

دوای ئەوەی دووهەمین پەرداخی چایی بە نان و نقیشکەوە خوارد هەستا تاکوو بڕوا بۆ نوسینگە تایبەتییەکەی خۆی.

گوتی: تۆ ئەمڕۆ بۆ هیچ کوێ نەچووی؟ حەتمەن لە ماڵێ تاقەتیشت بەسەر چووە؟

ئانا هەستا و رۆیی بۆ ئەوسەری تەلارەکە تاکوو لەگەڵی بچێت بۆ نووسینگەکەی و گوتی: نا، نا ـ پاشان پرسیی: ئێستا خەریکی خوێندنەوەی چ کتێبێکی؟

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ وەڵامی دایەوە: کتێبێکی دووکدێلیل[٦٧] دەخوێنمەوە بە ناوی «شیعری دۆزەخ». زۆر کتێبی چاکە.

---

67- Dukdelille

ئانا زەردەیەکی گرت. زەردەکەی وەکوو زەردەی کەسێکی گەورە وابوو کە چاوپۆشی لە هەڵەی خۆشەویستێکی خۆی دەکات. قۆڵی کردە قۆڵی مێردەکەی و هەتا بەردەرگای نووسینگەکەی لەگەڵی چوو. دەیزانی مێردەکەی بۆی بۆتە عادەت و سەرەڕای ئەو هەموو کارە ئیدارییەی کە تەواوبوونی نییە و هەموو کاتی خۆشی بۆ تەرخان بکات هێشتا فریا ناکەوێ، بەڵام خۆی بە ناچار دەزانێ کە لە هەموو بابەتە نوێیەکانی جیهانی ئەندێشە ئاگاداربێ. هەروەها دەشیزانی کە مێردەکەی زۆری حەز لە خوێندنەوەی کتێبی سیاسی و فەلسەفی و ئایینییە، بەڵام بەهۆی خووخدەی تایبەتی خۆیەوە خۆ لە قەرەی هونەر نادات. ئەگەرچی: رەنگە هەر بەو هۆیەش، هیچ رووداوێك نەبوو کە لەو بوارەدا دەنگدانەوەی هەبێت و ئەو گوێی خۆی لێ بخەوێنێ، بۆیە بە ئەرکی خۆی دەزانی کە هەموو شتێك بخوێنێتەوە. ئانا دەیزانی کە مێردەکەی سەبارەت بە سیاسەت و فەلسەفە و ئایین دڕدۆنگە و خەریکی لێکۆڵینەوەیە، بەڵام بیروڕای لە بەستێنی هونەر و شێعر و بەتایبەت مۆسیقادا کە هیچی تێنەدەگەیشت زۆر روون و قورس و قایم بوو. پێی خۆشبوو سەبارەت بە شکسپیر و رافائێل و بێتهۆڤن و هەروەها گرنگایەتیی رێبازە تازەکانی شیعر و مۆسیقا کە هەرکام بە شێوەیەکی روون و ئەقڵانی لە زەیندا شوێنی تایبەتیان هەبوو، قسە بکات.

ئانا لەبەر دەرگای نووسینگەکەی کە لەوێدا مۆمێك لەژێر ئاباژۆردا هەڵکرابوو و گۆزەڵەیەکی شین لە پەنایدا داندرابوو بەجێی هێشت و گوتی: جارێ خودات لەگەڵ، من دەڕۆم نامەیەك بۆ مۆسکۆ دەنووسم.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ دەستی گوشی و دیسان ماچی کردەوە.

ئانا گەڕایەوە بۆ ژوورەکەی خۆی و لە دڵی خۆیدا گوتی: «هەرچییەك بێ پیاوێکی باش و بەشەرەف و مێهرەبانە و لە بواری کاری خۆشیدا مرۆڤێکی هەڵکەوتەیە.» وەك ئەوەش وابوو کە بیهەوێ لە هەمبەر کەسێکدا کە بە مرۆڤێکی خوێنتاڵی دەزانی و پێیوابوو ناچێتە دڵەوە بەرەڤانیی لێبکات. «بەڵام سەیرە، گوێچکەی بۆ ئاوا پانن و قیت بوونەتەوە؟ رەنگە هی ئەوە بێ مووی سەری کورت کردۆتەوە؟»

ڕاست سەری سەعاتی دوازدە ئانا لە پشت مێزی نووسینەکەی دانیشتبوو خەریکی نووسینی نامە بوو بۆ دالی کە ترپەی پێی مێردەکەی هات کە کەوشی راحەتیی لەپێدا بوو. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ دەموچاوی شۆردبوو سەری شانە کردبوو و بە کتێبێکەوە کە نابوویە بن هەنگڵی هات بۆ لای.

بە بزەیەکی تایبەتەوە گوتی: کاتی خەوتنە، با بخەوین ـ پاشان رۆیشت بۆ ژووری خەوەکەیان.

ئانا ئەو سەرنجەی ڤرۆنسکیی هاتەوە بیر، کە لە مێردەکەی روانیبوو لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەو بە چ هەقێك ئاوا تەماشای کرد؟»

جلوبەرگی خۆی لەبەرکرد و رۆیشت بۆ ژووری خەوەکەیان، بەڵام ئەو حەز و شۆرەی کە کاتی مانەوەی لە مۆسکۆ لە نیگا و بزەیدا شەپۆلی دەدا، هیچ شوێنەوارێکی نەمابوو و دەتگوت ئاوری دەروونی بە تەواوی دامرکاوە، یان لە قووڵاییی دڵیدا حەشار دراوە.

## سی و چوار

ڤرۆنسکی کاتی رۆیشتن لە پترزبۆرگ باڵەخانە گەورەکەی بلۆاری مۆرسکایای بە دۆست و هاوڕێی خۆشەویستی پتریتسکی[٦٨] دابوو کە بچێتە نێوی.

پتریتسکی ملازمێکی لاوی بێماڵ و حاڵ بوو و نەك هیچ دارایییەکی نەبوو بەڵکوو هەتا بینەقاقاش کەوتبووە ژێر قەرز و قۆڵەوە. شەوانە هەمیشە مەستی دەکرد و بە هۆی کاری قۆڕ و نەشیاو لە کێشکچیخانەی پادگان زیندانی دەکرا، بەڵام هاوڕێیان و سەرۆکەکانی خۆشیان دەویست . ڤرۆنسکی کاتێك سەعات دوازدە لە وێستگەی هێڵاسن دابەزی و گەیشتە ماڵێ عارەبانەیەکی دی لەبەر دەرگای ماڵەکەی راگیرابوو و ناسییەوە هی کێیە، لە دەرگای دا و هێشتا دەرگاکەیان بۆ نەکردبۆوە کە گوێی لە قاقاکێشانی چەند پیاو و ژنێك بوو کە بە زمانی فەرەنسی قسەی دەکرد. پتریتکی گوڕاندی: ئەگەر لەو ناکەسانەیە رێی مەدە ـ ڤرۆنسکی دەستووری بە دەرگاوانەکەدا باسی هاتنی ئەو نەکات و بێچرپە خۆی کرد بە یەکەم ژووردا و بارۆنس شیلتۆن کچە هاوڕێی پتریتسکی کە بەو کراسە ئەتڵەسە بنەوەش و روخسارە سوور و سپی و جوان و چاوە شین و قژە زێرینەوە زۆر دڵڕفێن بوو، وەك کەو دەیقاسپاند و بە زاراوەی پاریسی قسەی دەکرد و لە پشت مێزێکی گرد دانیشتبوو و خەریکی دروستکردنی قاوە بوو. پتریتسکی باڵتەی لەبەردا بوو و کامرۆڤسکی[٦٩]کە وێدەچوو لەسەر خزمەتەوە راست هاتبێ بۆ ئەوێ. بە یۆنیفۆرم و جلوبەرگی سەربازییەوە لەملاوئەولای دانیشتبوون.

پتریتسکی لەگەڵ دیتنی ڤرۆنسکی بەپەلە لەبەری هەستا، کورسییەکەی ژێری خلیسکا و جیڕەی هات. بە دەنگی بەرز گوتی: بژی ڤرۆنسکی، خاوەن ماڵ و میوانداری بەرێزمان!

---

68- Petritsky

69- Kamerosky

بارۆنس لەو قاوە تازەدەمەی بۆ تێکە. بەڵام پێمانوانەبوو تەشریف دێنی. ـ لەگەڵ ئاماژەکردن بە بارۆنس گوتیشی: هیوادارم ئەو رازێنەرەی تەلارەکەت بەدڵ بێ. حەتمەن یەکتر دەناسن.

ڤرۆنسکی بە پێکەنینەوە دەستی نەرموناسکی بارۆنسی گوشی و گوتی: زۆر چاکیش! بەڵێ! ئێمە دۆست و هاورێی لەمێژینەی یەکین.

بارۆنس گوتی: لەگەڵ هاتنی ئێوە من دەرۆم ـ پاشان گوتیشی: ئەگەر دەزانن مزاحیمم هەر ئێستا دەرۆم.

ڤرۆنسکی گوتی: نا بارۆنس، ئێوە لە هەرکوێ بن ماڵی خۆتانە ـ پاشان بە ساردی تەوقەی لەگەڵ ئەفسەرەکەی دیکە کرد و گوتی: سڵاو کامرۆڤسکی.

بارۆنس رووی لە پتریتسکی کرد و گوتی: چاولێکە تۆ هیچ کات ناتوانی ئاوا قسەی جوان بکەی.

ـ بۆچی منیش کاتێك تێر بم قسەی لەو خراپتر ناکەم.

ـ دوای نانخواردن خۆ هونەر نییە. چاکە، کەوایە من قاوەتان بۆ تێدەکەم. برۆن ئاوێك بەخۆتاندا بکەن و جلەکانتان بگۆڕن ـ دیسان دانیشتەوە و خەریکی قاوەجۆشەکە بوو، سەرەکەی بادا و رووی لە پتریتسکی کرد و گوتی: پییەر قاوە بێنن با تۆزێکی تری تێکەم ـ ئەو پتریتسکیی بە ناوی بنەماڵەیی کە پییەر بوو بانگ دەکرد و پێوەندیی خۆی لەگەڵ ئەو نەدەشاردەوە.

ـ خراپی دەکەی.

ـ بۆ خراپی دەکەم؟ ـ رووی لە ڤرۆنسکی کرد کە لەگەڵ هاورێکەی قسەی دەکرد، قسەکەی پێبڕی و گوتی: دەی، ژنەکەت چۆنە؟ نەتهێناوە لەگەڵ خۆت؟ ئێمە لێرە ژنمان بۆ تۆ هێناوە.

ـ نا، بارۆنس، من قەرەج لەدایك بووم و قەرەجیش دەمرم. هیچ کەس ناتوانێ بمبەستێتەوە.

ـ چ باشتر، زۆر چاکە! کەوایە بێنە دەستت.

بارۆنس ئیتر ڤرۆنسکی بەرنەدا و بە دەم گاڵتە و گەپەوە دوایین گەلاڵەی ژیانی بۆ باسکرد و داوای رێنوێنیی لێکرد.

ـ ئەو بەهیچ شێوەیەك رازی نابێ تەڵاقم بدا. من دەبێ چ بکەم؟ («ئەو» مێردی بوو.) من ئێستا دەمهەوێ شکایەتی لێبکەم. بەتۆ چ بکەم باشە؟ کامرۆڤسکی، وریای قاوەکەبە هەڵنەچێ. نەتدیوە من گرفتارم؟ دەمهەوێ بچمە دادگا و شکایەت بکەم چونکە ناتوانم دەست لە ماڵ و سامانەکەم هەڵگرم ـ بە لەبزێکی سووکایەتیئامێز گوتیشی: دیوتە چەندە قۆرە. بە بیانووی ئەوەی کە من خەیانەتی پێدەکەم دەیهەوێ دەست بەسەر ماڵ و سامانەکەمدا بگرێ.

ڤرۆنسکی بە پێکەنینەوە گوێی بۆ قسەی ئەو ژنە جوانە راگرتبوو و وتەکانی دەسەلماند و بە گاڵتەوە رێنوێنی دەکرد، دیاربوو شێوەی قسەکردنەکەی لەگەڵ ئەو جۆرە ژنانە ئاسایی

نییه. له شوێنی ژیانی ئەو له پترزبۆرگ خەڵك بە دوو تاقمی دژوار دابەش دەبوون. تاقمێك چینی هەژاران بوون، که ئەو تاقمه زۆر گەوج و دواکەوتوون و پێیان وابوو ژیانی پیاو تەنیا لەگەڵ ژن که هاوسەری بێ دەگونجێ و کچانیان پاقژ و ژنانیان بەئابڕوو و پیاوانیشیان بەهێز و خۆڕاگر دەویست و لەسەر ئەو باوەڕە بوون که دەبێ بۆ عاملاندنی منداڵ هەوڵ بدەن و نانی خۆیان بە ئارەقەی نێوچاوان و هێزی شان و باهۆ وەدەست بێنن و ئەمین و دەستپاك بن و قەرزەکانی خۆیان بدەنەوە و لەو جۆرە وڕێنە و راواندنانە، ئەوانە کۆنەپەرست بوون و شیاوی گاڵتە پێکردن. بەڵام تاقمەکەی دیکە که بەڕاستی جوامێر بوون و ئەو و هاوڕێکانی لەو توێژە بوون، گرینگترین مەرجیان بۆ ئەوەی که سەر بە ئەو تاقمەن تەڕپۆشی و جوانی و دڵفڕاوانی و رووهەڵماڵدراوی بوو. دەبوو بەنەشە و گەشە بن و بۆ هەموو چەشنە مامەڵەیەك ئامادەبن و شەرموشکۆیان له هیچ شتێك نەبێ و پێکەنینیان بە هەموو شتەکانی دیکە بێ.

ڤرۆنسکی سەرەتای هاتنە ژووریێ بەهۆی شوێنەوارێك که له جیهانێکی دیکەوە هێنابووی و لەگەڵ ئەم شوێنەی ئێرە زۆر جیاواز بوو بەجاریێ کاس بووبوو، بەڵام زۆر زوو وەك ئەوەی جلوبەرگی ئێرەی خۆی لەبەرکردبێ و کەوشە قەدیمییەکانی خۆی لەپێ کردبێ گەڕایەوە سەر بارودۆخ و دنیای پڕ له شادی و نەشەی پێشینی خۆی.

قاوە هەر دەمی نەهێنا و لەپڕ هەڵچوو و جلوبەرگی هەمووانی پیس کرد و راست بە ئاکامی پێویست گەیشت، یانی بووە بەهانەیەك بۆ گاڵتە و پێکەنین و فەڕشە گرانباییەکەی ڤرۆنسکی و جلوبەرگی بارۆنس بەجاریێ پیس بوو.

بارۆنس گوتی: دەی، جاریێ خوداحافیز، دەنا ئێوە فریای خاوێنکردنەوە ناکەون و باری گەورەترین تاوانی مروڤ که پیس و چەپەڵییە دەخەنە ئەستۆی من. کەوایە ئێوە پێشنیارم پێدەکەن که چەقۆکە له ملی نێم؟

ڤرۆنسکی وەڵامی دایەوە: حەتمەن. بەڵام وایدانێ که دەستە جوانەکەت زۆر له لێوی نزیك بێ. ئەویش دەستت ماچ دەکات و کارەکان هەمووی بەخێر و خۆشی تەواودەبێ.

ـ زۆر چاکە، کەوایە هەتا ئەمشەو له شانۆی فەڕەنسی ـ هەستا و لەگەڵ ئەوەی کراسەکەی خشپەخشپی دەهات له ژوورەکە چووەدەرێ.

کامرۆڤسکیش هەستا بەڵام ڤرۆنسکی خۆی مەحتەلی رۆیشتنی نەکرد وخێرا تەوقەی لەگەڵ کرد و رۆیشت بۆ ئاودەست. لەگەڵ ئەوەی خەریکی شۆردن بوو پتریتسکی هەر ئاڵوگۆڕێکی که له کاتی رۆیشتنی ئەو بۆ مۆسکۆوە تووشی کاروبارەکەی بووبوو بە وردی بۆی باس کرد. ئەسپێ له گیرفانیدا

سەوزەڵێیان دەگوت و باوکی گوتبووی نە پارەم دەداتێ و نە قەرزەکانیشی دەداتەوە. بەرگدوورەکە و ئەو کەسانەی قەرزیان لەلای بوو هەڕەشەیان لێکردبوو کە دەیخەنە زیندان. فەرماندەری لیواکەی وریایی پێدابوو کە ئەگەر واز لەو کارە ناحەزانە نەهێنێ دەبێ لە ریزی هێزەکەیان بڕواتە دەرێ و بارۆنس وەزاڵەی هێنابوو، بەردەوام داوای پارەی لێدەکرد. بەڵام جوانێکی تری پەیداکردبوو کە حەتمەن دەبوو نیشان ئەو (یانی ڤرۆنسکیی) بدات. «جوانییەکەی لە تاقەتدا نییە و بە دەم ناگوترێ، وەك جوانە بەناوبانگەکانی رۆژهەڵات، وێنەی رەبکای کەنیز، تێدەگەی؟» رۆژی رابردووش لەگەڵ بێرکۆچێڤ تووشی کێشە هاتبوو و بێرکۆچێڤ داوای لێکردبوو شایەد بنێرێ بۆ بەڕێوەبردنی دوئێل، بەڵام کارەکە بەخێر گوزەرابوو، بەڵام لەسەریەك هەموو شتێك بە باشی و خۆشی دەڕۆیشتە پێشێ. دەرفەتی بە هاوڕێکەی نەدا بچێتە سەر باسی هەموو لایەنەکانی کارەکەی و دەستیکرد بە گێڕانەوەی شتە تازە و سەرنجڕاکێشەکان. ڤرۆنسکی لەگەڵ ئەوەی گوێی بۆ ماجەراکانی پتریتسکی راگرتبوو کە بەلایەوە نامۆ نەبوون لە شوێنی خووپێگرتووی باڵەخانەکەی کە سێساڵ بوو لەوێدا دەژیا، بە چێژ و حەزێکی زۆرەوە هەستی کرد کە جارێکی تر گەڕاوەتەوە بۆ ژیانێکی ئاسایی و بێ دەردەسەر لە پترزبۆرگ.

ڤرۆنسکی پێی بە پێداڵی دەستشۆرییەکەدا نا و ئاوی بە سەروملی سوور و سالمی خۆیدا کرد و لە وەڵامی پتریتسکیدا کە گوتبووی لۆرا[70] دڵی بە میلێیێڤ[71]داوە و فێرتنیگوفی[72] بەجێهێشتووە بە دەنگی بەرز گوتی: نا! وا نەڵێیی، من باوەڕ ناکەم! ـ پاشان پرسیی: هەروەکوو جاران بێشعوور و لەخۆڕازییە؟ دەی، بووسوولووکۆڤ[73] چ دەکا؟

پتریتسکی گوتی: ئەها، چاکبوو وەبیرت هێنامەوە، بووسوولووکۆڤ بەسەرهاتێکی سەیری هەیە و هەر خۆشە گوێت لێبێ. دەزانی بۆ چەندەی کۆڕی سەمای دەوڵەمەندان پێخۆشە. خۆ دەگەییێنێتە کۆڕی هەموو سەماکانی دەربار و تاقیان وەپاش نادات. جارێکیان تاسکڵاوێك لەو تازانە لەسەر دەکاو دەچێ بۆ کۆڕێکی سەمای بەشکۆ لە دەربار. خۆ ئەو تاسکڵاوانەت دیوە؟ زۆر جوانن و سووکترن لە کڵاوە قەدیمییەکان. وەلحاسڵ دەچێ و لەوێ لە سووچێك رادەوەستێ... جا تۆ گوێ بگرە...

---

70- Loura
71- Mileyev
72- Fertingf
73- Busulukov

ڤرۆنسکی کە بە خاولییەکی کوڵکن خەریکی وشککردنەوەی سەرو ملی بوو گوتی: گوێم لێیە...

پترێتسکی درێژەی پێدا: خوداوڕاستان گراندووشێس لەگەڵ یەکێك لە باڵوێزەکان لەو نزیکانەوە تێدەپەڕی و بۆ بەدبەختی باسی ئەو جۆرە تاسکڵاوانە دەکەن کە تازە بوونەتە باو، گراندووشێس دەیهەوێ یەکێك لەو کڵاوانە پیشانی باڵوێزەکە بدات. لەپڕ بووسوولووکۆڤی ئازیزمان دەبینێ کە بە تاسکڵاوی گۆرینەوە لەوێ راوەستاوە (پترتیسکی بۆ لاسایی کردنەوەی ئەو کڵاوێکی لەسەر ناو لە سووچێك چەقی).

گراندۆشیس داوای لێدەکات کڵاوەکەی بداتێ. بووسوولووکۆڤ نایداتێ. یانیچی؟ چاوێك لە یەکتر دەقرتێنن، سەریان ئەلەقێنن و نێوچاوانیان تێکدەنێن. «بێنە ئەو کڵاوە کوڕە!» بەڵام ئەو تاسکڵاوەکەیان ناداتێ و رەنگی هەڵدەبزڕکێ و لە جێی خۆی جووڵە ناکات، وەك داهۆڵ لەوێ دەچەقێ. جا تۆ بیری لێبکەوە. پاشان ئەو بۆرەکەیە، ناوی چییە... دەیهەوێ کڵاوەکەی لەسەر داگرێ... بەڵام ئەو ناهێڵێ... کڵاوی خۆیەتی و نایدا... تا وای لێدێ بەزۆر کڵاوەکەی لەسەر دادەکەنن و دەیدەنە دەست گراندۆشێس. گراندۆشێس وەریدەگرێ و پێشانی باڵوێزەکەی دەدات و دەڵێ: بەڵێ، ئەوەش تاسکڵاوی نوێ، خۆ دیتووتە... ـ کڵاوەکەی بۆ دەبەنەوە... جا بیهێنە بەرچاوی خۆت، هەرمێیەك و کیلۆیەك نوقڵ و شەگەڵاتی بۆ تێدەکەن. بووسوولووکۆڤی فەقیر هەمووی لە نێو تاسکڵاوەکەدا دەشارێتەوە...

ڤرۆنسکی قاقا پێدەکەنی و لەوانە بوو لە خۆ بێتەوە. هەتا ماوەیەك دواتریش کە باسەکەیان گوڕابوو کاتێك کڵاوەکەی وەبیردەهاتەوە دەستی دەکرد بە قاقاکێشان و ددانە قایم و رێکەکانی لەگەڵ پێکەنینەکەی کە زایەڵەی لەشساخیی پێوە دیاربوو وەدەر دەکەوتن.

کاتێك هەموو هەواڵەکانی لە پترتیسکی بیست بە یارمەتیی پێشخزمەتەکەی یۆنیفۆرمەکەی لەبەرکرد و رۆیشت کە گەڕانەوەی خۆی رابگەیێنێ. دوای ئەو کارە، دەیویست سەرێك لە براکەی هەڵێنێ و هەروەها چاوی بە بێتسی بکەوێ و بچێتە سەردانی چەند کەسی دیکەش تاکوو دەستبکات بە هاتوچۆی میوانی و کۆڕی سەما بەڵکوو لەوێ چاوی بە ئانا ئارکادیۆڤنا بکەوێ. هەروەك لە پترزبۆرگ بۆی بووبووە عادەت هەتا شەو نەزرینگایەوە بۆماڵێ نەگەڕایەوە.

# یەك

کۆتاییەکانی وەرزی زستان بوو کە لە ماڵی ئیسچر باتسکی شۆڕای پزیشکی پێك هاتبوو تاکوو سەبارەت بە بارودۆخی کیتی بڕیاربدەن و بزانن بۆ چارەسەر کردنی وزەی لەدەستچووی چ بکەن. کیتی نەخۆش بوو و نەخۆشییەکەشی لەگەڵ نزیکبوونەوەی وەرزی بەهار پڕ مەترسیتر دەبوو. پزیشکی بنەماڵە رۆنی ماسی و ئاسن و نیتراتی زیوی بۆ نووسیبوو. بەڵام چونکە هیچ کام لەو دەواو دەرمانانە ئاکامێکی باشی نەبوو، پێیگوتبوون کە بەهارێ نەخۆشەکەیان بەرن بۆ هەندەران، بۆیە پزیشکێکی زانا و بەناوبانگیان هێنابوو تاکوو بیروڕای ئەویش بزانن. پزیشکە بەناوبانگەکە تەمەنێکی زۆری نەبوو و پیاوێکی زۆر جوانچاك بوو بە پێویستی زانی کە پشکنین بۆ نەخۆشەکە بکات. ئەو لەسەر ئەو باوەڕەبوو کە شەرم و شکۆی کچان بەهۆی کۆڤێتییەوەیە و ئەگەر دەستی پیاوێکی جحێڵ لە لەشی رووتیان بکەوی شتێکی سروشتییە و زۆریش باشە، وێدەچوو بۆ پێداگری لەسەر ئەو بڕوایە چێژێکی تایبەت وەرگرێ. دوکتۆر ئەو کارەشی بەو هۆیە بە شتێکی سروشتی دەزانی کە کاری هەموو رۆژێکی بوو و پێیوابوو ئەو دەستلێدانە هەست یان بیرێکی خراپ لە مێشکیدا هەڵناگیرسێنێ، هەر لەبەرئەوەش شەرمی کچانی عازەبی بۆ رووت بوونەوە نەك هەر بە پاشماوەی کۆڤێتی دەزانی، بەڵکوو ئەوەی دەرهەق بە خۆشی جۆرێك بە سووکایەتی دادەنا.

ناچار پێملبوون، چونکە هەموو پزیشکەکان ئەگەرچی لە فێرگەیەك خوێندوویانە و ئەو کتێبانەی خوێندوویانە هەموو هەر وەکوو یەك وان و هەموویان یەك چەشنە زانست فێربوون و ئەگەرچی تاقمێك لەسەر ئەو باوەڕەن کە ئەو پزیشکە بەناوبانگە هیچ هونەرێکی نییە و لە ماڵی پرێنسس و لە نێو برێك لە دۆستان و ئاشنایانیدا دیارنەبوو بە چ هۆیەك پێیانوایە ئەو پزیشکە بێوێنەیە و تەنیا کەسێکە کە شتگەلێك دەزانێ کە دیتران نایزانن و تەنیا کەسێکە کە دەتوانێ کیتی چارەسەر بکات. پزیشکی بەناوبانگ دوای ئەوەی چاوی بە نەخوشەکەی کەوت و دەستی بە هەموو ئەندامانی لەشیدا هێنا و قامکی تێکوتا چوو دەستی بە جوانی

شۆرد و لە تەلاری میوانداری لەگەڵ پرێنس ملی لە قسەکردن نا. کیتیش بە هۆی شەرم و فهێتەوە پەشۆکابوو و گێژوویژ لە جێی خۆی وشك بووبوو. پرێنس بە نێوچاوانی گرژەوە دەکۆخی و گوێی بۆ قسەی دوکتۆر گرتبوو. ئەو تەمەنێکی درێژی رابواردبوو و تاڵی و سوێریی رۆژگاری چێشتبوو و زۆری ئاگا لە خۆی بوو و نەخۆش نەکەوتبوو بڕوای بە زانستی پزیشکی نەبوو و لە دڵەوە رقی لەو یارییە بوو. بەتایبەت ئەوەی کە رەنگە تەنیا کەسێك بێ کە هۆی نەخوشینی کچەکەی دەزانێ چییە. گوێی بۆ وڕێنەوێژییەکانی پزیشکی ناودار سەبارەت بە هۆی نەخۆشینی کچەکەی شل کردبوو و لەبەر خۆیەوە دەیگوت: «عەجەب باز[٧٤] دەهۆڵێکە!» لە دڵی خۆیدا ئەو زاراوەی راوچیانی بۆ ئەو پزیشکە ناودارە بە شیاو زانیبوو. بەڵام دوکتۆر ددانی بەخۆیدا گرت و وەڕووی خۆی نەهێنا کە ئەو ئەربابۆچکە بەساڵاچووە سووکایەتیی پێکردووە و زۆر بە دژواریش توانیی خۆی هەتا رادەی ئەو بێخەبەرە لە وردەکارییەکانی هونەر، بهێنێتە خوارێ. ئەو بۆی دەرکەوتبوو کە لەگەڵ ئەو پیرەپیاوە هیچ قسەیەکی بۆ گوتن نییە و لەو ماڵەدا تەنیا خانم بڕیاردەرە و دەیویست لەلای ئەو گەوهەرەکانی هەڵڕێژێ و شەکر بشکێنێ. هەر لەوکاتەدا پرێنسس لەگەڵ دوکتۆری بنەماڵە پێی نایە نێو تەلارەکەوە. پرێنس لەوێ دوورکەوتەوە و هەوڵی دەدا وا نەنوێنێ کە ئەو یارییە چەندە بە شتێکی قۆڕ و بێتام دەزانێ. پرێنس پەشۆکابوو و نەیدەزانی چ بکا. لە هەمبەر کیتیدا هەستی بە تاوان دەکرد.

گوتی: زۆر چاکە دوکتۆر چارەنووسی ئێمە روون بکەوە. گوێت لێنەبێ هەرچی هەیە پێمبڵێ ـ دەیویست بپرسێ کە هیوایەك هەیە یان نا؟ بەڵام لێوی دەلەرزی و نەیتوانی ئەو پرسیارە بکات. گوتی: دەی، دوکتۆر...چ

ـ بەسەرچاو، پرێنس، ئیزن بفەرموون با لەگەڵ هاوکارەکەم راوێژێك بکەم و پاشان بیروڕای خۆمتان عەرز دەکەم.

ـ یانی ئێوە بە تەنیا بەجێ بێڵین؟

ـ ئەگەر زەحمەت نەبێ.

پرێنس هەناسەیەکی هەڵکێشا و رۆیشتە دەرێ.

---

٧٤- دەهۆڵێکی برنجییە کە لە زینی ئەسپی دەبەستن و کاتی ڕاوکردن بە باز هەتا ئەو کاتەی بازەکە بە حەواوەیە لێی دەدەن. پرنس بویە ئەو وشەیەی بەکار هێناوە، یانی دەهۆڵ ناوەکەی بۆشە و لەلایەکیشەوە تایبەتی ڕاوچییانە کە بە شاتوشووت و چاوڕاو کردن بەناوبانگن.

کاتێك دوو پزیشك پێکەوە ماونەوە، پزیشکی بنەماڵە شەرمنانە دەستی کرد بە دەربڕینی بیروڕای خۆی. ئەو لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە دیاردەی سەرەتایی دەردە باریکەی پێوە دیارە، بەڵام....

پزیشکی ناودار گوێی بۆ قسەکانی ڕاگرتبوو. لە نێوان قسەکانیدا چاوێکی لە سەعاتە گەورە ئاڵتوونەکەی خۆی کرد وگوتی: بەڵێ، بەڵام...

پزیشکی بنەماڵە لەبەر شەرمێونی و ڕێزدانان بۆ پزیشکی ناودار لاڵ و بێدەنگ بوو.

پزیشکی ناودار گوتی: هەروەك دەزانن ناتوانین بە جوانی دیاردەی سەرەتایی سیل دەستنیشان بکەین. هەتا شوێنەواری ئاوسان و کون لە سیپەلاکیدا سەر هەڵنەدا، تەنیا دەتوانین وەك گریمانە باسی بکەین. هەڵبەت دیاردەگەلێکیش هەن. بێئیشتیایی و حەساسییەتی عەسەبی و لەوجۆرە شتانە. مەسەلەی گرینگ ئەوەیە کاتێك بۆمان دەرکەوێ تووشی سیل بووە دەبێ چ بکەین کە لانیکەم ئیشتیای بکرێتەوە.

پزیشکی بنەماڵە غیرەتی وەبەر خۆینا و بە زەردەیەکەوە گوتی: بەڵام دەبێ ئەوەش بزانین کە زۆر جار لە ژێر ئەو دیاردە ڕواڵەتییانەوە هۆکارێکی ڕەوانیش خۆ حەشار دەدا.

پزیشکی ناودار دیسان چاوێکی لە سەعاتەکەی کرد و گوتی: چاکە، ئەوە روون و ئاشکرایە- پاشان پرسیی: ببوورە، ئێوە زانیوتانە پردی یاڤسا[75] کرابێتەوە یان هێشتا دەبێ ئەو ڕێگا دوور و درێژە ببڕین و دەور لێدەین؟ ئەها، چاکە کراوەتەوە، کەوایە من نزیکەی بیست خولەکم وەخت هەیە. کەوایە هاتینە سەر ئەوەیکە ئیشتیای نەخۆشەکە بکەینەوە و ئەعسابی ئارام کەینەوە، چونکە ئەو دوانە پێکەوە پێوەندییان هەیە، دەبێ کارەکەمان لەسەر هەردوو نیوە جەغزەکە درێژە پێبدەین.

پزیشکی بنەماڵە پرسیی: بیروڕای ئێوە سەبارەت بە سەفەری هەندەران چییە؟

ـ ڕاستت دەوێ من سەفەری هەندەران بە باش نازانم. خۆ دەزانی ئەگەر نەخۆشینەکەی سەرەتای سیل بێ، کە جارێ هیچ مەعلووم نییە، سەفەری هەندەران هیچ کەڵکێکی نییە. دەبێ ڕێگایەك هەڵبژێرین کە ئیشتیای بکاتەوە و هیچ زەرەدێکیشی نەبێ.

پزیشکی ناودار وای بە باش زانی کە ماریجەی کیتی بە ئاوی گازدار بکرێ، هەڵبەت گرینگترین بەڵگەشی بۆ ئەو دەرمانکردنە بێزەردبوونی ئەو ئاوە بوو.

---

75- Yavsa

پزیشکی بنەماڵە بە وردی و ڕێزەوە گوێی بۆ وتەکانی شل کردبوو، پاشان گوتی: هۆی ئەوەی کە سەفەری هەندەرانم بەباش زانیوە ئەوەیە کە لە شوێن و ژیانی ئاسایی دووردەکەوێتەوە و هێندێ بیرەوەری کە تووشی خەفەتی دەکەن تا ماوەیەك لەبیریان دەباتەوە، جگە لەوانەش دایکی نەخۆشەکە ئەو سەفەرەی پێخۆشە و حەزدەکات بیبا.

ـ دەی، کەوایە با بچن. زەرەدەکەشی تەنیا ئەوەیە کلاوچی و گزیکاری ئاڵمانی شوێنیان لەسەر دادەنێن. تەنیا دەبێ قسەی ئێمە لەگوێ بگرن... بەو مەرجە قەیناکا با بچن... دیسان چاوێکی لە کاتژمێرەکەی کردەوە.

ـ ئیتر من دەبێ بڕۆم ـ ئەوەی گوت و بەرەولای دەرگاکە ملی پێوەنا.

پزیشکی ناودار بە پرێنسسی گوت کە دەبێ جارێکی تر چاوی بە نەخۆشەکە بکەوێ (پێویستیی لەبەرچاوگرتنی هێندێ دابونەریتی پیشەیی ئەوە دەخوازێ.)

دایکی کیتی شلەژاوانە دەنگی هەڵێنا: چی؟ یانی دیسان دەتەوێ فەحسی کەیتەوە؟

ـ نا، تەنیا هێندێ شت هەیە دەبێ بیزانم.

ـ باشە، تکایە فەرموون.

ژنە لەگەڵ دوکتۆرەکان گەڕاوە بۆ ژووری میوانداری کە کیتی لەوێ بوو.

کیتی بە روخساری کز و لە شەرمان سوورهەڵگەڕاوەوە لە چەقی ژوورەکە راوەستابوو و چاوی هێشتا بە هۆی تاملکردنی شەرمی فەحسەکەوە بریقەی دەهات. لەگەڵ چاوی بە دوکتۆرەکە کەوت رەنگی هەڵبزڕکا و فرمێسك لە چاوانیدا قەتیسما. تەواوی قسەوباس و بیروڕای پزیشك و نەخۆشین و ماریجەی بە شتێکی بێ مانا و تەنانەت هیچوپووچ دەهاتە بەرچاو و هەوڵدان بۆ چارەسەرکردنی خۆی بە کارێکی بێئاکام دەزانی، کارێکی وەك پێکەوە نووساندنەوەی گلێنەیەکی لەتوکوتکراو. ئەو دڵی شکابوو و ئەوانە دەیانویست بە دەوا و دەرمان و حەب و ئەو جۆرە شتانە چارەسەری بکەن. بەڵام نەیدەویست دایکی ئازار بدات، بەتایبەت دایکی کە لەو نێوەدا خۆی بە تاوانبار دەزانی.

پزیشکی ناودار گوتی: تکایە فەرموون دانیشن.

بە بزەیەکەوە بەرەوڕووی کیتی دانیشت و نەبزی گرت و دیسان دەستیکردەوە بە پرسیاری بێهوودە. کیتی وەڵامی دەدایەوە بەڵام لەناکاو قەڵس بوو، هەستا سەرپێ و گوتی: ببوورە دوکتۆر، ئەو پرسیارانە بێهوودەن. ئەمە جاری سێهەمە کە ئەو پرسیارانەم لێدەکەی.

پزیشکی ناودار شلوێ نەبوو و کاتێك کیتی چووەدەرێ رووی لە پرێنسس کرد و گوتی: ئەو تووڕەبوون و شێواوییە بەهۆی نەخۆشینەکەوەیە. هەڵبەت من کارەکەم تەواوکردبوو.

دوکتۆر پێیوابوو پرێنسس ژنێکی زۆر خاوەن ژیار و بەهۆشە، بۆیە بارودۆخی لەشساخیی کچەکەی بە شێوەیەکی زانستی بۆ روونکردەوە و لە کۆتاییدا لەسەر ئەوە پێداگریی کرد کە دەبێ ئاوی کانیی بدەنێ کە ئەوەش زۆر پێویست نەبوو. کاتێك پرێنس لێیپرسی: کە سەفەر بۆ هەندەران پێویستە یان نا، چوو دەفکرەوە، وەك ئەوەی بیهەوێ مەسەلەیەکی زۆر گران حەل بکات. ئاخریش حەلی مەسەلەکەی بەم شێوەیە پێراگەیاندن کە بچن بەڵام گوێ بە قسەی ساختەچی و فێڵبازان نەدەن و لە هەموو بارێکەوە راوێژ لەگەڵ ئەو بکەن.

پرێنسس، وەك ئەوەی دوای رۆیشتنی دوکتۆر رووداوێکی نەشەبزوێن رووی دابێ، بە پێکەنین و رووخۆشی گەڕایەوە بۆ لای کچەکەی، کیتیش وای نواند کە خۆشحاڵە. کیتی لەم دواییانەدا هەمیشە ناچاربوو بە رواڵەت واپیشان بدات کە شاد و دڵخۆشە.

گوتی: دایەگیان، بەڕاستیمە، من نەخۆش نیم. بەڵام ئەگەر حەزدەکەی سەفەرێك بکەین بۆ هەندەران من قسەیەکم نییە ـ واشی نواند کە ئەو سەفەرەی زۆر پێخۆشە و دەستی کرد بە خۆسازکردن و پێچانەوەی کەلوپەلی سەفەر.

## دوو

دوای رۆیشتنی دوکتۆر، دالی هات. ئەو دەیزانی کە ئەورۆ بڕیاربووە شۆڕای پزیشکی بۆ راوێژکاری کۆ ببنەوە، لەگەڵ ئەوەشدا زەیستان بوو و تازە منداڵی بووبوو (لە کۆتایی زستاندا کچێکی بووبوو.) کەچی هیچ پەرۆشی و چەرمەسەرییەکی نەبوو، بۆیە بە دڵنیایی منداڵە بەرمەمکانەکەی و کچە نەخۆشەکەی بەجێهێشتبوو و بۆ سەردانی ماڵی دایکی هاتبوو و دەیویست بۆشی روون بێتەوە کە کێشەکەی کیتی بەکوێ گەیشتووە.

خۆی بە ژووری میوانداریدا کرد و هێشتا کڵاوەکەی لەسەری دانەگرتبوو پرسیی: دەی بوو بە چی؟ دڵخۆش دێنە بەرچاوم، وادیارە کاروبارەکە ئاکامێکی باشی بووە.

هەوڵیان دا هەموو قسەکانی دوکتۆری بۆ بگێڕنەوە. بەڵام چونکە دوکتۆر ماوەیەکی زۆر قسەی کردبوو و قسەکانیشی وانەبوو تووشی سەرەگێژەیان بکات، هەروەها بە شتێکی گرینگیشیان نەدەزانی بۆیە نەیانتوانی ناوەرۆکی قسەکانی بۆ دالی باس بکەن. ئەوەی کە زۆر بەلایانەوە گرینگ بوو ئەو بڕیارە بوو کە سەفەرێك بکات بۆ هەندەران.

دالّی بێ ئیختیار هەناسەیەکی هەڵکێشا. خوشکەکەی واتە دلۆڤانترین هاودەمی پێوەبوو بڕوا. بۆیە ژیانی خۆی بەدوور لە خۆشی و شادی دەدی. نێوانیشی لەگەڵ ستیپان ئارکادیچ دوای ئاشتبوونەوەیان ئەو گەرموگوڕییەی جارانی نەمابوو. ئەو هەوڵەش کە ئانا بۆ ئاشتبوونەوەیان دای و پێکەوەی پێوەند دانەوە، زۆر پێوەندێکی قورس و قایم نەبوو و سازگاریی بنەماڵەیی و نێوانیان بە موو بەند بوو. ڕووداوێکی تایبەت نەقەومابوو بەڵام ستیپان ئارکادیچ زۆر کەم دەکەوتەوە ماڵێ و ئیتر گیرفانیشی گەسکی لێدرابوو، دالیش بەردەوام لە مێردەکەی دڕدۆنگ و بەگومان بوو و لە ناخەوە خۆی دەخواردەوە، هەوڵی دەدا ئەو گومان و دڵپیسییە لەخۆی بتارێنێ، چونکە ئەو ئازار و مەینەتەی لە ماوەی ئەو چەند ڕۆژەدا بە هۆی دڵپیسی و گومانەوە تووشی بووبوو بەجارێ تۆقاندبووی. لێمشتی دڕدۆنگی ئەگەر جارێك دامرکێتەوە، ئیتر دووپات نابێتەوە و خەیانەتی ئاشکراش تەنانەت وەك جاری یەکەم شوێندانەر نابێ. ئێستا ئەگەر خەیانەتێکیشی بۆ دەرکەوتایە ئاکامەکەی هەر ئەوە دەبوو کە خۆی ناچاربکات واز لە ژیانی هاوسەری بێنێ. هەقی بە خۆشی دەدا کە خۆی هەڵخەڵەتێنێ و بۆ کەفارەتی ئەو تاوانە ئەو و زیاتر لە ئەویش خۆی بەلاوە سووکوچرووك بێ. جگە لەوەش چەرمەسەری و گرفتی منداڵە سەروپێچکەکانی بەردەوام تەنگی بە ڕۆحی هەڵچنیبوو. جارێك منداڵە ساواکەی مەمکی نەدەگرت و هێندێ جاریش دایەنەکەی دەتۆرا و دەڕۆیشت، جاری واش بوو وەك ئێستا یەکێك لە منداڵەکانی نەخۆش دەکەوت.

دایکی لێی پرسی: دەی، منداڵەکانت چۆنن؟

ـ بڵێمچی دایەگیان، خۆ خەم و دەردی من دەنکێك و دووان نییە. لیلی نەخۆشە و دەترسم مێکوتەی لێ هاتبێ. ئەمڕۆ هاتم کە ڕێنوێنییەك لە ئێوە وەرگرم، چونکە ئەگەر خودا نەخواستە مێکوتەی لێ هاتبێ، ئیتر ناتوانم لە ماڵێ بێمەدەرێ.

پرێنسی پیریش دوای ڕۆیشتنی پزیشك لە ژوورەکەی هاتەدەرێ و دەمی هێنا پێشێ کە دالی ماچ بکات، دوای ئەوەی تۆزێکی لەگەڵ دووا ڕووی کردە ژنەکەی و گوتی:

ـ دەی، چ بڕیارێکتاندا؟ دەڕۆن؟ ئەمن چ بکەم؟

ژنەکەی گوتی: پێموایە تۆ لێرە بمێنیتەوە باشترە، ئەلکساندر ئاندرڤیچ.

ـ باشە چۆنتان پێخۆشە وادەکەم.

کیتی گوتی: بۆ، دایەگیان؟ بۆ باوکم لەگەڵمان نەیەت؟ بۆ ئەویش خۆشە و بۆ ئێمەش.

پرێنسی پیر هەستا و دەستی بەسەری کچەکەیدا هێنا. کیتی سەری هەڵێنا و بەزۆر بزەیەکی هێنایە سەر لێوی خۆی و چاوی لێکرد. پێیوابوو باوکی لە هەموو ئەندامانی

بنەماڵەکەیان زیاتر تێیدەگا، ئەگەرچی زۆر کەم لەگەڵی دەدوا. ئەو وەکوو پاشەبەرە و گوڵەجەرگەی باوکی پێیوابوو باوکی هێندەی خۆشدەوێ تەنیا دڵی بە ئەو روون دەبێتەوە. ئێستاش کە چاوە شین و مێهرەبانەکەی دی کە لە ناخی روخسارە چرچولۆچەکەیەوە تێیڕامابوو، هەستی کرد کە سەرنجی باوکی بە قووڵاییی رۆحیدا دەچێتە خوارێ و لەو کێشە و ئاژاوەی ناخی دەگا و دەزانێ دەدری چییە. بۆیە سوورهەڵگەڕا و بە هیوای ماچێك لە باوکی چووە پێشێ، بەڵام باوکی تەنیا دەستێکی بە سەروپرچیدا هێنا و گوتی:

ـ ئاخ لە دەستی ئەو شینیۆنە دەستکردە قۆڕانە. پیاو حەز ناکا دەست بەسەر کچەکەی خۆیدا بێنێ، چونکە تەنیا قژی ژنێك نەوازشت دەکەی نازانی کێیە و کەی مردووە ـ پاشان رووی لە کچە گەورەکەی کرد و پرسیی: دەی دۆلینکا، تۆ پێمبڵێ بزانم، ئەو چەپکە گوڵە بەغیرەتەت چ دەکا؟

دالی کە تێگەیشت مەبەستی باوکی ستیپان ئارکادیچی مێردیەتی وەڵامی دایەوە: چاکە باوکە گیانـ بەڵام نەیتوانی بیشارێتەوە و بە بزەیەکی ساردوسڕەوە کە سووکایەتیی پێوە دیاربوو گوتی: خۆ ناکەوێتەوە ماڵێ، زۆر کەم دەیبینم.

ـ هێشتا نەچووە بۆ فرۆشتنی دارستانەکە؟

ـ نا، هێشتا نەچووە. هەرپێوەیە بچێت. بەخەیاڵ خەریکی پیچانەوەی جانتاکەیەتی.

پرێنس گوتی: سەیرە، ئاووا! دانیشت، رووی لە ژنەکەی کرد و گوتی: دەی، کەوایە دەفەرموون منیش جانتا و بارگەوبنەم بپێچمەوە؟ بەسەرچاو ـ پاشان رووی لە کچە چکۆلەکەی کرد و گوتی: کاتیا، رۆژێك بەیانی کە لە خەو هەڵدەستی دەبێ بەخۆت بڵێی: خۆ من عەلەمم نییە، شاد و دڵخۆشم. چەندەم پێخۆشە بەیانی زوو، بەو سەرما و سەهۆڵبەندانە لەگەڵ باوکە گیانم بڕۆم بۆ گەڕان و پیاسەکردن. باشە؟

قسەی پرێنس زۆر سادە و ساکاری دەنواند بەڵام کیتی وەك تاوانبارێکی ئابڕوو تکاو بە بیستنی ئەو قسانە شڵەژا. لە دڵی خۆیدا گوتی: «بەڵێ ئەو هەموو شتێك دەزانێ و تێدەگا، بەو قسانە دەیهەوێ پێمبڵێ ئەگەرچی شەرمەزارم، بەڵام دەبێ بەسەر شەرمەزارییەکەمدا زاڵ بم.» ورەی ئەوەندە لاوازبوو نەیتوانی وەڵامم بداتەوە. هەوڵیدا شتێك بڵێ بەڵام کوڵی گریان ئەوکی گرت و بەپەلە رۆیشتە دەرێ.

پرێنسس بەگژ مێردەکەیدا هات: تۆش دەست لەو گاڵتە و گەپانەت هەڵناگری! ـ دەستی کرد بە سەرکۆنە کردنی مێردەکەی: تۆ هەمیشە...

پرێنس ماوەیەك بێدەنگ بوو و پرتەوبۆڵەی ژنەکەی بیست و جار لەگەڵ جاریش زیاتر ڕەنگی تێکدەچوو.

پرێنسس گوتی: دیوتە ئەو بەستەزمانە چیی لێهاتووە، پیاو خەریکە ئاوری بۆی تێبەر بێ، ئەو ئەوە دەمرێ، تۆش لە قسەی قۆڕ ناکەوی، پێتوایە ئەو تەشەرانە بۆ نەخوشێکی ئاوا چەندە تاڵ و بەژانە. دیوتە، پیاو چۆن سەبارەت بە خەڵکی تووشی هەڵە دەبێ! ـ کە شێوەی قسەکردنەکەی گۆڕا، دالی و پرێنس هەدووکیان تێگەیشتن کە مەبەستی ڤرۆنسکییە: من نازانم بۆ دەبێ هیچ یاسایەك بۆ سزادانی ئەو جۆرە مرۆڤە خوێڕی و بێئەمەگانە نەبێ.

پرێنس هەستا سەرپێ و خەمناکانە گوتی: ئیتر تاقەتی بیستنی ئەو قسانەم نییە! بەرەو دەرگاکە ڕۆیشت و هێشتا پێی نەنابووە دەرێ گوتی: یاسا هەیە، دایکۆڵە، ئێستا کە ناچارم دەکەی قسە بکەم، گوێ بگرە با پێتبڵێم، تاوانی هەموو ئەوانە لە ئەستۆی تۆیە، تەنیا تۆ! یاسا بۆ سزادانی ئەو لووسکە و پووسکانە هەیە و هەمیشەش بووە، ئەگەر ئەوەی نەدەبوو بکرێ، نەکرابایە، هەر منی پیرەپیاو ئەو گەنجە خوێڕی و ناجسنەم دەمکوت دەکرد. ئێوەش هەر برۆن دەستەوداوێنی پزیشکان بن و ئەو هەڵە و هەرزانە بانگهێشتن بکەن بۆ ماڵێ و سواری سەری خۆتانیان بکەن.

پرێنس وێدەچوو هێشتا زۆری قسە لە دڵدا مابێ، بەڵام پرێنسس کە تێگەیشت مێردەکەی تووڕە بووە، وەکوو هەموو جارێك کە قسەیان لێکهەڵدەبەزییەوە خێرا نەرمیی دەنواند، ددانی بە خۆیدا گرت و پەشیمانی خۆی دەربڕی.

بە دڵی پڕ و چاوی فرمێسکاوییەوە هات بۆ لای مێردەکەی و گوتی: ئەلکساندر، ئەلکساندر...

پرێنس کە دیتی ژنەکەی دەگری بێدەنگ بوو. گەڕایەوە بۆ لای و گوتی: باشە، باشە، مەگری، دەزانم تۆش پێتناخۆشە. چمان پێدەکرێ؟ خودا گەورەیە، بارودۆخەکەش ئەوەندە ئاڵۆز نییە چاری نەکرێ. سپاست دەکەم... ـ ئەوەی گوت بەڵام خۆشی نەیدەزانی دەڵێ چی؟ سپاسەکەشی بۆ ماچە فرمێسکاوییەکەی پرێنسس بوو کە لەسەر پشتی دەستی هەستی پێکرد و لە ژوورەکە چووەدەرێ.

دالی کە دیتی کیتی بە گریانەوە ڕۆیشتە دەرێ، بە پێی خووخدەیەکی دایکانە و هۆگریی بە بنەماڵە لەڕێوە تێگەیشت کە کارێکی ژنانە پێویستە و خۆی ئامادەکرد ئەرکی سەرشانی خۆی بەجێ بێنێ. کڵاوەکەی لەسەری داگرت و قۆڵی بۆ کار هەڵماڵی. کاتێك کە دایکی

بەسەر باوکیدا دەیگوڕاند هەوڵی دابوو تا ئەوجێیەی کە ڕێز و گەورەیی دایکی ئیجازەی بدا ئارامی بکاتەوە و نەهێڵێ زۆر پێی لێهەڵبڕێ. کاتێك پرێنس ڕقی هەستابوو دەنگی لێوە نەهات. سەبارەت بە دایکی هەستی بە شەرمەزاری دەکرد، کاتێکیش باوکی ڕق و تووڕەییەکەی خۆی خواردەوە و لەگەڵ دایکی نەرمیی نواند هەستی کرد زۆری باوکی خۆش دەوێ و ڕێزی بۆی هەیە. بەڵام کاتێك باوکی لە ژوورەکە چووەدەرێ بڕیاریدا کە گرینگترین کاری پێویست ئەنجام بدات، یانی بچێت بۆ لای کیتی و دڵخۆشیی بداتەوە.

بە دایکی گوت: دایەگیان، من لەمێژە دەمویست پێتان بڵێم کە لەڤین دواجار کە لێرەبوو لە ڕاستیدا بۆ خوازبێنی کیتی هاتبوو. خۆی بە ستیڤای گوتبوو.

ـ دەی چ بکەم؟ من تێناگەم، مەبەستت چییە؟

ـ وێدەچێ کیتی دەستی بە ڕووەوە نابێ، لای ئێوە باسی نەکردووە؟

ـ نا، باسی هیچ کامێکیانی بۆ نەکردووم. ئەو چەتیوە زۆر ڕۆحزلە. بەڵام من دەزانم هەموو خەم و نیگەرانییەکەی بۆ ئەم...

ـ بەڵێ، بیری لێبکەوە ئەگەر وەڵامی نەرێنی بە لەڤین دابێتەوە، من دەزانم ئەگەر لەبەر ئەو نەبوایە دەستی بەڕووی لەڤینەوە نەدەنا... لە ئاکامیشدا ئەو هەتیوە هەرزەیە ئاوا فریویدا... زۆر ناخۆشە.

بیرکردنەوە لەوەی کە چەندە دەرهەق بە کچەکەی تاوانبارە، بۆ پرێنسس زۆر تاڵ و دژوار بوو، هەر بۆیە ئاوا ڕقی هەستا.

ـ ئاخ، من بە هیچ جۆرێ تێناگەم. ئەمڕۆ هەموو دەیانهەوێ بە ئەقڵی خۆیان بژین، هیچی بە قسەی گەورەی خۆیان ناکەن و ئەوەش ئاکامەکەیەتی...

ـ دایەگیان من دەچم بۆ لای ئەو.

دایکی گوتی: بچۆ باشە بچۆ، خۆ من نەمگوتووە مەچۆ؟

# سێ

دالی خۆی کرد بە ژوورە جوان و نوقڵییەکەی کیتیدا کە بە پەیکەرەی ناسك و قەدیمی رازابۆوە، پەیکەرەکان هەموو لە چینی ساکس[٧٦] دروست کرابوون. ژوورەکە ئەو جوانی و رازاوەییەی دوو مانگ لەمەوبەری پێوە دیاربوو، کە وەکوو ئەو کاتەی کیتی شاد و بەنەشەی دەنواند، وەبیری هاتەوە کە ساڵی رابردوو لەگەڵ کیتی بە چ گەشە و نەشەیەکەوە ژوورەکەیان رازاندبۆوە. کاتێك چاوی بە کیتی کەوت لە پەنا دەرگاکەدا لەسەر کورسیلەیەکی پێچکە قوڵە دانیشتووە و چاوی لە سووچی مافوورەکە بڕیوە دڵی داخورپا. کیتی چاوێکی لە خوشکی کرد و حاڵەتی سارد و بڕێك سەختی روخساری نەگۆڕا.

داریا ئەلکساندرۆڤنا لە پەنایدا دانیشت و گوتی: من ئیتر دەڕۆمەوە بۆ ماڵێ و لەسەر ماڵ و حاڵی خۆم دادەنیشم، تۆش ناتوانی بێی بۆلام... دەمەوێ هێندێکت قسە لەگەڵ بکەم.

کیتی بە ترسەوە سەری هەڵێنا و بە توندی گوتی: قسەی چی؟

ـ دەتەوێ باسی چی بکەین. دیارە باسی ئەم خەم و ئازارەی تۆ.

ـ من هیچ خەمێکم نییە.

ـ دەواز بێنە کیتی ، یانی پێت وایە من هیچم نەزانیوە؟ لە هەموو شتێك گەیشتووم، بڕوام پێ بکە زۆر شتێکی ئاساییە و خەمی ناوێ... ئێمە هەموو ئەوانەمان دیوە و تاقیمان کردوونەتەوە.

کیتی بێدەنگ بوو، هەروا گرژ و بێ تاقەت دانیشتبوو.

داریا ئەلکساندرۆڤنا بەبێ پێشەکی چووە سەر باسەکە: ئەو بەڕاستی بایەخی ئەوەی نییە کە تۆ ئاوا خۆتی بۆ ناڕەحەت بکەی و ئازار بکێشی.

کیتی بە دەنگێکی لەرزۆك و گریاناوییەوە گوتی: بەڵێ، چونکە بۆتە هۆی سەرشۆڕیم! قسە مەکە، تکایە هەر باسی مەکە.

---

76- Saxs

ـ کێ باسی سەرشۆڕیی کردووە؟ هیچ کەس قسەی وای نەکردووە. من دڵنیام ئەو ئاشقی تۆ بوو و ئێستاش هەر دڵی پێتەوەیە، بەڵام...

کیتی رقی هەستا و گوڕاندی: ئاخ، لە هەموو شتێك ناخۆشتر ئەو دڵسۆزییانەیە ـ هەروا بە دانیشتنەوە سەری وەرسووڕاند و سوورهەڵگەڕا و خێراخێرا قامکی دەجووڵاندەوە. ئاغزوونەی کەمەربەندەکەی جارێك بە دەستێك و جارێکی تر بە دەستەکەی تری دەگرت و دەیگوشی. دالی لەو خووخدەیەی خوشکی دەگەیشت کە هەر شتێکی بە دەستەوە بێ کاتی رقهەستان دەستا و دەستی پێدەکا. دەیزانی کاتێك کیتی قەڵس دەبێ هۆش و ئیختیاری لە لانامێنێ و ئەوەی جنێو و قسەی ناخۆشە بە دەمیدا دێ: دەیویست هێوری بکاتەوە بەڵام ئیتر کارلەکار ترازا بوو.

کیتی بە توندی گوتی: دەتەوێ بڵێی چی؟ دەتەوێ تێمبگەیەنی کە ئاشقی کەسێك بووم و ئەویش پێم رازی نییە و من خەریکە دڵم بۆی دەتۆقێ؟ ئەوەیە ئەو قسەی کە خوشکەکەم پێمی دەڵێ؟ و... و... پێشی وایە هاودەردیم لەگەڵ دەکا؟ من هیچ پێویستییەکم بەو هاوخەمییە نییە و رقی دنیام لە دووڕوویییە.

ـ کیتی زۆر بێئینسافی.

ـ بۆچی حەتمەن دەتەوێ ئازارم بدەی...

ـ من بە پێچەوانە... دەبینم ئازار دەکێشی...

بەڵام کیتی هێندەی رق هەستابوو کە گوێی لە قسەی خوشکی نەبوو.

ـ من هیچ خەمێکم نییە و پێویستیشم بە دڵدانەوە نییە. من ئەوەندەش دەتوانم گەورەیی خۆم راگرم کە کەسێك خۆشی نەویستم منیش خۆشم نەوێ.

داریا ئەلکساندرۆڤنا دەستی گرت و گوتی: بەڵام من هیچم نەگوت... من تەنیا دەمەوێ شتێك بزانم. پێم بڵێ بزانم، لەڤین قسەی لەگەڵ کردی...

بیستنی ناوی لەڤین وەك چەقۆیەك وابوو کە دوایین دەماری خۆڕاگریی کیتی بڕیبێ. لەپڕ هەستا سەرپێ و ئاغزوونەی کەمەربەندەکەی بە زەویدا کێشا و لەگەڵ ئەوەی بە توندی دەستی رادەوەشاند گوتی:

ـ ئیتر چکارت بە لەڤین داوە؟ تێناگەم، بۆ دەتەوێ ئازارم بدەی؟ پێم گوتی و دیسان دووپاتی دەکەمەوە من ئەوەندە بەرزەمڤ و رۆحزل هەم کە قەت ئیزن بە خۆم نەدەم وەکوو تۆ بچمەوە بۆ لای پیاوێك کە خەیانەتی پێکردووم و لەگەڵ ژنێکی تر کەینوبەینی بووە. من تێناگەم، لەوە ناگەم، تۆ دەتوانی، بەڵام من ناتوانم.

کە ئەو قسانەی کرد لە خوشکی روانی و کە دیتی بێدەنگ بووە و خەمناکانە ملی بە خوزدا گرتووە، بەجێی ئەوەی لە ژوورەکە بڕواتە دەرێ کە بەو قەستە هەستابووە سەرپێ، هەر لە جێی خۆی لە پەنا دەرگاکە دانیشت و دەسرەیەکی بەبەر چاوییەوە گرت.

بێدەنگییەکەیان نزیکەی دوو دەقیقەی خایاند. دالی بیری لە حاڵوباڵی خۆی کردەوە. سوکایەتییەك بەردەوام لەبیری بوو و لە ناخەوە هەڵیدەچۆقاند کاتێك خوشکەکەی بە روویدا دایەوە زۆر بەژانتر و تاڵتر بوو. چاوەڕوانیی ئەو ئاکارە دڵڕەقانەیەی لە خوشکی نەبوو و دڵی لێیهێشا. بەڵام لەناکاو خشەخشی داوێنی کراسێك و کوڵی گریان و هەنیسکێکی بیست و دوو دەست لە خوارەوە باوەشیان کرد بە ملیدا. کیتی بوو لە بەردەمی چۆکی دادابوو.

کیتی تاوانبارانە و بە دەنگێکی نزم گوتی: دولینکا، نازانی چەندە چارەڕەشم، نازانی!

ڕوخسارە جوانکیلە و فرمێسکاوییەکەی بە داوێنی کراسەکەی داریا ئەلکساندرۆڤناوە نا و دای لە قوڵپەی گریان.

هەردوو خوشکەکە دوای گریان و فرمێسك هەڵوەراندنێکی زۆر پێکەوە کەوتنە قسە بەڵام نەك سەبارەت بەو شتەی کە دڵی رێکدەگوشین، بەڵکوو باسی هێندێ شتی تر و دەردەدڵ و راز و نهێنیی تر. دەتگوت فرمێسك رۆنێکە بۆ نەرم کردنی کەرەسەی پێوەندیی نێوان دڵی ئەو دوو خوشکە پێویستە بۆ ئەوەی نەرم و خێراتر کار بکات. کیتی زانیی ئەوەی لە کاتی رقهەستاندا سەبارەت بە سووکایەتی و خەیانەتی مێردەکەی پێیگوتووە دالیی بێچارەی بەجارێ تێکشکاندووە بەڵام خوشکی لێیخۆش بووە. لەلایەکی ترەوە دالی ئەوەی دەیویست بۆی دەرکەوتبوو. دڵنیابوو کە بۆچوونەکەی راست بووە و خەمی قورس و ئازاری دەروونیی خوشکی لەبەرئەوەیە لەڤین خوازبێنیی لێکردووە و ئەو لەبەر ڤرۆنسکی وەڵامی نەرێنیی پێداوەتەوە و پاشانیش ڤرۆنسکی فریوی داوە و ئاشقی کەسێکی تر بووە، دالی تێگەیشت کە خوشکی ئامادەیە دیسان دەرگای دڵی بۆ لەڤین بکاتەوە و لە ڤرۆنسکی بێزارە. کیتی لەو بارەوە یەك وشەش نەدوابوو. تەنیا باسی خەم و ئازارەکانی خۆی بۆ خوشکی کردبوو.

کاتێك رق و کوڵی گریانەکەی دامرکایەوە گوتی: من هیچ خەمێکم نییە، بەڵام خۆ تێدەگەی؟ هەموو شتێك لەبەر چاوم دزێو و چەپەڵ و ئاڵۆزە، بێزم لە هەموو شتێك و زیاتر لە هەمووان لە خۆم هەستاوە. تۆ نازانی هەر شتەی چ بیر و خەیاڵێکی دزێو و کرێت لە مێشکمدا دەورووژێنن.

دالی بە پێکەنینەوە پرسیی: چ بیر و خەیاڵێکی دزێو دەبێ لە مێشکی تۆدا بورووژێن؟

ـ بیر و خەیاڵی زۆر رەش و کرێت و ئاڵۆز، ناتوانم بۆتی باس بکەم. نە خەمە و نە پەژارە، زۆر لەوانە ئاڵۆزترە. وەك ئەوە وایە ئەوی شتی چاکە لە ناخمدا بزر بووبێ ئەوی شتی ناحەز و کرێتە لە ناخمدا مابێتەوەـ کە شوێنەواری سەرسووڕمانی لە چاوی خوشکیدا بەدی کرد درێژەی بە قسەکانیدا: چۆنت بۆ باس بکەم؟ باوکم ئێستا دەیویست سەری قسەم لەگەڵ بکاتەوە... پێموایە ئەو لەسەر ئەو باوەڕەیە کە تەنیا ماریجەی دەردی من شووکردنە. دایکیشم لەپەستا دەمبا بۆ کۆڕی سەما و هەڵپەڕکێ. دەزانی من چۆن بیردەکەمەوە؟ من پێموایە بەو کارەی دەیهەوێ هەرچی زووترە بە مێردم بدات و لە دەستم رزگار بێ. دەزانم ئەو بیر و خەیاڵانە راست نین بەڵام لە مێشکم ناڕۆنە دەرێ. چاوم بەرایی نادا خوازبێنیکەر ببینم. پێموایە ئەوانە لە خەیاڵی خۆیاندا هەڵمدەسەنگێنن و هەموو شتێکم بە وردی دەخەنە ژێر چاوەدێری. بەر لەوە زۆرم حەزدەکرد بە جلوبەرگی سەماوە بچم بۆ ئەو کۆڕانە، چاوم لە خۆم دەکرد و لە خۆشیانا لەوانە بوو شاگەشکە بم و ئافەریم بە خۆم دەگوت. بەڵام ئێستا کە جلوبەرگی سەما لەبەر دەکەم هەست بە شەرمەزاری دەکەم و دەست و لاقم تێکەڵ دێ. دەی دەتهەوێ چ بکەم؟ دوکتۆر... دەی چاکە...

کیتی ئیتر زمانی نەگەڕا. دەیویست ئەوەش بڵێ کە لەوەتا تووشی ئەو گۆڕانە بووە، چاوی بەرایی نادا ستیپان ئارکادیچ ببینێ. چونکە ناتوانێ چاوی پێی بکەوێ و دزێوترین و ناحەزترین بۆچوون و روانین لە دالغەیدا نەگووڕێ.

درێژەی بە قسەکانیدا: چ بکەم ئیتر بە دەست خۆم نییە، هەموو شتێك لەبەر چاوم گەمار و کرێت و ناحەزن. نەخۆشیی من ئەوەیە. رەنگە رۆژێك چارەسەری ئەو نەخۆشینەم پەیدابێ.

ـ دەی باشە، بیرمەکەوە.

ـ ناتوانم. تەنیا کاتێك لەگەڵ منداڵەکانم هەست بە هێمنایەتی دەکەم، تەنیا لە ماڵی ئێوە.

ـ بەداخەوە ناتوانی بێی بۆ ماڵی ئێمە.

ـ نا، دێم، من مێکوتەم لێ هاتووە. تازە نایگرمەوە، دایکم رازی دەکەم.

کیتی لەسەر قسەی خۆی پێداگریی کرد و چوو بۆ ماڵی خوشکی. خوشکەزاکانی هەموویان مێکوتەیان گرتبوو و کیتی لە ماوەی نەخۆشینەکەیاندا وەك پەرەستارێکی باش ئاگاداریی لێدەکردن. ئەو دوو خوشکە ئاگادارییان لەو شەش منداڵە کرد هەتا بە یەکجاری چاك بوونەوە، بەڵام باری تەندرووستیی کیتی چاکتر نەبوو و بنەماڵەی ئیشچر باتسکی لە ماوەی چلەی[٧٧] رۆژوودا سەفەریان کرد بۆ دەرەوەی وڵات.

---

٧٧- چل ڕۆژ بەر لە جێژنی «پاك» کە مەسیحییە تەرکە دنیاکان لە خواردنی گۆشت پارێزیان دەکرد.

# چوار

کۆمەڵگای گەورانی پترزبۆرگ لە راستیدا تەنیا تاقمێکی گەورەن و هیچی تر. لەو کۆمەڵگایەدا هەمووو یەکتر دەناسن و پێکەوە تێکەڵاوییان هەیە. بەڵام ئەو تاقمە گەورە بەسەر چەند دەستەدا دابەش دەبن. ئانا ئارکادیۆڤنا کارنینا لە سێ دانە لەو دەستانەدا دۆست و هاوڕێی نزیکی هەبوو. یەکێك لەو دەستانە دەستەی بەڕێوەبەرایەتی و فەرمی بوو کە مێردەکەی ئەندامی ئەوێ بوو، هەروەها هاوکاران و کارمەندانیشی لەوێدا بوون کە بەپێی بارووددۆخی کۆمەڵایەتییان بە شێوەیەکی زۆر سەیر و جۆراوجۆر پێکەوە لە پەیوەندیدا بوون یان لە یەکتر جیا دەبوونەوە. ئانا ئێستا زۆر بە دژواری دەیتوانی ئەو هەستی ئەو رێز و خۆشەویستییەی کە لە سەرەتادا دەرهەق بە ئەندامانی ئەو دەستەیە لە دڵیدا بوو وەبیر خۆی بهێنێتەوە. ئەو ئێستا ناسیاوییەکەی لەگەڵ ئەوان بە شێوەیەك بوو کە خەڵکی شارێکی چکۆلە لەگەڵ یەکتر ناسیاوییان هەیە. ئاگای لە هەمووو هەڵسوکەوت و خووخدەیەکیان هەبوو، دەیزانی کە هەرکامیان بەچی دەگەشێتەوە و بە چیش دەرهەڵدەبێ، هەروەها ئاشنایەتیی لەگەڵ پێوەندی و کەینوبەینیان و بزوتنەوە و چالاکییان لە نێو ناوەندی سەرەکیی دەستەکەدا هەبوو. دەیزانی کە کێ لەگەڵ کێ و بە چ شێوەیەك پشتیوانی دەکات و تەنانەت کێ لە کێ و لە چ شتێکدا کۆك و ناکۆکییان هەیە. بەڵام ئەو دەستەیەی کارمەندان لەگەڵ ئەوەشدا کە کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا هەوڵی بۆ دەدا و پێوەی هیلاك بوو بەڵام سەرنجی ئەوی رانەدەکێشا و نەیدەویست تخوونیان بکەوێ.

دەستەیەکی تر کە ئانا ئارکادیۆڤنا لە نزیکەوە دەیناسین ئەو دەستەیە بوو کە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لە رێگای ئەوەوە توانیبووی لە سیستەمی دوڵەتیدا گەشە بکات و جێی خۆی بکاتەوە. کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا دەمڕاستی ئەو ناوەندە بوو. ئەو تاقمەش لە پیرێژنانی خێرخواز و ئیماندار و بەڵام لە جوانی بێ بەش  و هەروەها پیاوانی بەهۆش و زانا و خاوەن ئەزموون پێکهاتبوو. یەکێك لەو خاوەن هۆشانەی کە خۆشی ئەندامی ئەو دەستەیە بوو ئەو ناوەندەی بە (ویژدانی کۆمەڵگای پترزبۆرگ) لە قەڵەم دابوو. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ زۆر

هۆگری ئەو دەستەیە بوو و ئاناش کە بە باشی دەیتوانی لەگەڵیان هەڵسوکەوت بکات، لە سەرەتای ژیانییەوە لە پترزبۆرگ لەگەڵ ئەو تاقمەش ئاشنایەتیی پەیداکردبوو. بەڵام ئێستا دوای گەڕانەوە لە مۆسکۆ تامڵ کردنی ئەندامانی ئەو دەستەیەی زۆر بەلاوە دژوار بوو. پێیوابوو لەو دەستەیەدا بۆ خۆنواندن بۆتە ئەندام و ئەوانی دیکەش وەك خۆی جگە لە خۆنواندن و ڕواڵەتسازی هیچ کارێکی تریان نییە، بۆیە خۆشی لەچارەیان نەدەهات و ئەوەندەی بۆی بکرایایە لێیان نزیك نەدەبۆوە و بۆ سەردانی لیدیا ئیڤانۆڤناش زۆر کەم دەچوو.

تاقمی سێیەمیش کۆمەڵەی ڕاستەقینەی ڕەهیشتە و ناوداران بوو، دنیای میوانداری و کۆڕی سەما و جلوبەرگی ڕازاوە، دنیایەك کە پێوەندیی خۆی لەگەڵ دەرباری حکوومەت قایم ڕاگرتبوو و لەوە دەترسان کە نرخ و بایەخیان دابەزێ و وەکوو کۆمەڵەی دواکەوتووی خۆشگوزەرانەکان چاویان لێبکەن. چونکە بە پێی سەلیقە و ئاکار زۆر لەوان دەچوون و هیچ جیاوازییەکیان لەگەڵیاندا نەبوو، بەڵام بە چاوی سووك لەوانیان دەڕوانی. پێوەندیی ئانا لەگەڵ ئەو دەستەیە بەهۆی پرێنسس تۆرسکایا، هاوسەری کوڕەکەی مامیەوە بوو. ئەو پرێنسسە ساڵی سەد و بیست هەزار ڕۆبڵی داهات هەبوو. هەر لە سەرەتای هاتنی ئاناوە بۆ ئەو دنیا ئەشرافییە بوو بە هۆگری و هەوڵی دەدا خۆی لێ نزیك بخاتەوە و سەرنجی ئانا بۆ لای دەستەکەی خۆی ڕاکێشێ و گاڵتەی بە دەستەکەی لیدیا ئیڤانۆڤنا دەکرد و پێیان پێدەکەنی.

بێتسی دەیگوت: منیش هەرکاتێك بوومە پیرێژنێکی ناحەز و چرچولۆچ ئەو کارانەی ئەوان دەکەم. بەڵام بۆ ئێوە کە ژنێکی جوان و جحێڵن حەیفە کە ئاوا زوو کاتی خۆتان بۆ کاروباری خێرخوازی تەرخان بکەن و جوانییەکەتان بەفیڕۆ بدەن.

ئانا لە سەرەتاوە هەتا ئەو جێیەی بۆی بکرایە خۆی لەو دەستەیە دەبوارد و تخوونیان نەدەکەوت، چونکە پێوەندی گرتن و بوونە ئەندام لەو دەستەیەدا پارە و خەرجێکی زۆری دەویست کە لە توانای ئەودا نەبوو، لەباری ڕۆحیشەوە زیاتر حەزی دەکرد خۆی لە تاقمی یەکەم نزیك بخاتەوە. بەڵام پاش سەفەری ئەم دواییەی بۆ مۆسکۆ هۆگرییەتییەکەی ئاوەژوو بۆوە، خۆی لە دۆست و هاوڕێ خێرۆمەندەکانی دەبوارد و زۆری هۆگریی خۆی بۆ دنیای باڵای ئەشراف و دەوڵەمەندان نیشان دەدا. لەو کۆڕانەدا چاوی بە ڤرۆنسکی دەکەوت و بەو دیدارانە شادییەکی گەرموگوڕ لە ناخی دەگەڕا. ئانا زیاتر لە ماڵی بێتسی چاوی بە ڤرۆنسکی دەکەوت، کە بە کچی ناوی ڤرۆنسکایا بوو ئامۆزای ڤرۆنسکی بوو. ڤرۆنسکی لە هەر کوێیەك بۆنی ئانای بکردایە و بیزانیبایە هەلی دیتنی بۆ دەرەخسێ، خۆی دەگەیاندێ و سەبارەت بە ئەوین و خۆشەویستیی خۆی لەگەڵی دەدوا. ئانا

نەیدەهێشت پێی زیادی داکێشیێ، بەڵام هەرجارێك كە چاوی پێیدەكەوت ئەو حەز و شۆرەی یەكەم دیداری لە شەمەندەفەرەكەدا دەهاتەوە بیری و دڵی وەكورکە کورك دەكەوت، هەستی دەكرد لەگەڵ دیتنی ئەو تروسكەی شادی لە چاوانیدا شەپۆل دەدا و پەپوولەی بزە لەسەر لێوی باڵ دەبزێوێ و لە توانایدا نییە ئەو تروسكەیە بشارێتەوە و باڵی پەپوولەكە هەڵوەرێنێ.

ئانا سەرەتا زۆر سادقانە لەسەر ئەو باوەڕە بوو كە ڤرۆنسكیی ناكەوێتە بەردڵ، چونكە زۆر منجڕ و رووهەڵماڵدراوە و دەستی لە كۆڵ ناكاتەوە و وەدوای دەكەوێ. بەڵام رۆژێك، هێندێك دوای گەڕانەوەی لە مۆسكۆ، چووە میوانییەك كە پێیوابوو لەوێ چاوی بە ڤرۆنسكی دەكەوێ، بەڵام ئەو لەوێ نەبوو و بەو خەمەدا كە باڵی بەسەر دڵیدا كێشا تێگەیشت كە خۆی فریودەدا و منجڕ بوونی ڤرۆنسكی نەك بە شتێكی خراپ نازانێ، بەڵكوو شیرینی بە ژیانی دەبەخشێ.

دووهەمین جار بوو كە گۆرانیبێژێكی بەناوبانگ گۆرانیی دەگوت و تەواوی پیاو ماقووڵان و ناودارانی شار لەو شانۆیە كۆ بووبوونەوە. ڤرۆنسكی لە ریزی پێشەوە لەسەر جێی خۆی دانیشتبوو كە چاوی بە كچەكەی مامی كەوت، چاوەڕوانی ئانتراكت نەمایەوە و هەستا و رۆیشت بۆ لای كە لە لۆژەكەی دانیشتبوو.

بتسی پێیگوت: بۆچی بۆ مەیلكردنی فراوێن نەهاتی؟ ئەو پێوەندییە سێحراوییە و ئاگادارییی دڵی ئەویندارانی شتێكی سەرسووڕهێنەرە! ـ پاشان بە بزەیەك و چرپەیەك كە تەنیا ڤرۆنسكی گوێی لێبێ گوتی: چونكە ئەو لێرە نەبوو؟ بەڵام دوای ئۆپێراكە وەرە.

ڤرۆنسكی چاوێكی ماناداری لێكرد. بتسی بە سەر ئاماژەیەكی بە تەنیشتی خۆی كرد، ئەویش زەردەیەكی گرت و سپاسی لێكرد و لە پەنایدا دانیشت.

پرێنسس بێتسی كە بڵێسە كێشانی ئەو ئەشقە سەرنجی راكێشابوو و چێژێكی زۆری پێدەبەخشی، درێژەی بە قسەكانیدا: كاتێك دێتەوە بیرم كە چۆن گاڵتەت بە ئەموئەو دەكرد... ئەو بزە تەشەراوی و مانادارانە چییان لێهات؟ ئەوا خۆشت لە داو كەوتی چاوەكەم!

ڤرۆنسكی بە بزەیەكی هێمنانە و شیرینەوە وەڵامی دایەوە: من بە ئاواتەوەم لە داو بكەوم. ئەگەر راستت دەوێ من گازەندەم لەوەیە كە داوەكە لە ملم توند ناكا. ئیتر خەریكە هیوابڕاو دەبم.

بێتسی كە سەبارەت بە هاوڕێكەی هێندێ شلوێ بووبوو گوتی: ئیتر بە هیوای چیی؟ «***بۆ لە قسەی یەكتر تێناگەین؟...***» ـ بەڵام بڵێسەیەك لە چاوانییەوە كەلاوڕێژی كرد كە دیاربوو ئەو زۆر چاك و تەنانەت وەك خۆی تێدەگا كە بە هیوای چییە. ڤرۆنسكی پێكەنی و ریزی ددانە رێك و سپییەكانی وەدیار كەوت و گوتی: هیچ هیوایەك! داوای لێبوردن دەكەم ـ پاشان دووربینە

زەریفەکەی لە دەستی وەرگرت و لە پشت شان و ملە رووتەکەیەوە دەستیکرد بە تەماشاکردنی لۆژەکانی رووبەڕوویان، لە درێژەی قسەکانیدا گوتیشی: دەترسم خۆم کردبێتە گاڵتەجاڕی خەڵکی.

ئەگەرچی زۆر باش دەیزانی کە نە لە روانگەی بێتسییەوە دەبێتە گاڵتەجاڕ نە لە روانگەی کەسانی دیکەی نێو دەستەکەوە. ئەو بە باشی دەیزانی کە لە روانگەی خەڵکەوە حەزکردن لە کچ و بێوەژن و ناکامبوون رەنگە ببێتە هۆی گاڵتەجاڕی، بەڵام ئەگەر پیاوێك منجڕانە وەشوێن ژنێکی مێردداربکەوێ و هەوڵ بدات کە لە خشتەی بەرێت و تووشی خلیسکانی بکات کارێکی نوێیە و بە ئازایەتییەکی گەورە دێتە ئەژمار و قەت وێناچێ ببێتە هۆی گاڵتەجاڕی، هەر بەو هۆیەوە بە شێوەیەکی شاد و لەخۆباییانە بسکەی سمێڵی دەهات. دووربینەکەی لە چاوی کردەوە و لە ئامۆزاکەی خۆی روانی.

کچەکەی مامی بە چاوێکی پەسندەرانەوە چاوی لێکرد و پرسیی: دەی، ئێستا پێمبڵێ بۆچی بۆ مەیلکردنی فراوێن نەهاتی؟

ـ دەبێ بۆت باس بکەم. زۆر سەرقاڵ بووم. ئامادەم یەك بەسەد یان یەك بەهەزار مەرج بکەم کە نازانی و شکیشت بۆی ناچێ کە سەرقاڵی چی بووم. دەمویست مێردێك لەگەڵ ئەو کەسانە ئاشت بکەمەوە کە سووکایەتییان بە ژنەکەی کردبوو.

ـ دەی ئاشتت کردنەوە؟

ـ تا رادەیەك.

بێتسی هەستا سەرپێ و گوتی: دەبێ بەسەرهاتەکەم بو وەگێڕی، هەر لەم ئانتراکتەدا.

ـ ناتوانم، دەبێ بچم بۆ شانۆی فەڕەنسی.

بێتسی کە دەنگی نیلسۆنی لەگەڵ دەنگی گۆرانیبێژێکی گومناوی کۆڕی کۆمبێژان لێکنەدەکردەوە بە واقوڕمانەوە گوتی: نیلسۆن[٧٨] بەجێ دێڵی و دەچی بۆ شانۆی فەڕەنسی؟

ـ چ بکەم، لەوێ قەرارم داناوە، هەر بۆ ئەو ئاشتکردنەوەیە.

بێتسی گوتی: بەختەوەرن ئەو کەسانەی ئاشت دەبنەوە چونکە بەرزگاری دەگەن.[٧٩] وتەیەکی وەك ئەوەی لە کەسێك بیستبوو ـ چاکە کەوایە دانیشە و هەر ئێستا بۆم باس بکە، بزانم چباسە؟

هەمیسان دانیشتەوە.

---

78- Nilsson

٧٩- ئایەتێکی ئینجیلی مەتییە کە دروستەکەی ئاوایە: بەختەوەرن ئەوانەی ئاشت دەبنەوە چونکە بە کوڕی خودا دێنە ئەژمار.

## پێنج

ڤرۆنسکی بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی: هەڵبەت نەختێ شوورەییشە بەڵام ئەوەندە شتێکی خۆشە حەزدەکەم بۆتی بگێڕمەوە. بەڵام ناوی کەس ناهێنم.

ـ چاکتر، بەبۆچوونی خۆم تێدەگەم.

ـ کەوایە گوێ بگرە. دوو لاوی قۆشمە و کەیفخۆش بە سواری عارەبانە بە شەقامدا تێدەپەڕن.

ـ جا ئەوە دیارە لە ئەفسەرانی هەنگی ئێوەن.

ـ من کوا گوتم ئەفسەر، تەنیا گوتم دوو لاو، کە نانی نیوەڕۆیان خواردبوو و زگیان لەوەڕاندبوو...

ـ بفەرموو مەست بوون.

ـ رەنگە مەستیش بووبێتن. دەچوون بۆ ماڵی یەکێك لە ئاشناکانیان. شەوێ لەوێ بانگهێشتن بوون و لەخۆشیایانا پێیان وەعەرزی نەدەکەوت. ژنێکی زۆر جوان کە بە سواری فایتوون بەلایاندا تێدەپەڕێ و چاویان لێدەکا، پێدەکەنێ و بەسەر ئاماژەیان پێدەکا، یان رەنگە ئەوان وا تێگەیشتبێتن. دەی ئەوانیش دەستەوبەجێ وەدوای دەکەون و تووشی سەرسووڕمان دەبن کە دەبینن فایتوونی ژنە راست لەبەر ئەو باڵەخانەیە راوەستا کە ئەمانیش لەوێ میوانن و ژنە بە هەڵەداوان بە پلیکانی باڵەخانەکەدا دەڕواتە سەرێ. ئەوان تەنیا لێوە سوور و ناسکەکەیان لە بن تۆڕە کورتەکەی روخسارییەوە دیبوو و پەلوپووزە ناسك و لاقە وردیلەکانیشی کە لەژێر داوێنی کراسەکەیەوە دیاربوون.

ـ ئەوەندە بە تامولامەوە دەیگێڕییەوە پیاو پێیوایە خۆت یەکێك لەو دوو کەسە بووی.

ـ تۆ هەر ئێستا باسی چیت دەکرد؟ لەوە گەڕێین. ئەو دوو لاوە لە ماڵی هەڤاڵەکەیان وەژوور دەکەون. ئەو میوانییەش بە بۆنەی خوداحافیزییەکەوە بووە. ئەوانیش هەروەك لەو جۆرە میوانییانەدا دیتوومانە، ئەوەندەی زگیان دەیبا مەشرووب دەخۆنەوە. لە کاتی خواردنی

شێودا سەبارەت بە داروسێی نهۆمی سەرەوە دەدوێن و دەکەونە سەروسۆراغ گرتنی. هیچ کام لە دانیشتووانی کۆڕەکە ئەو دراوسێیەی نهۆمی سەروو ناناسن. بەڵام کاتێك لە پێشخزمەتی خانەخوێکەیان دەپرسن کە نهۆمی سەرێ ژنی شۆخوشەنگی لێیە، پێشخزمەت لە وەڵامدا دەڵێ نهۆمی سەرێ پڕە لەو جۆرە ژنانە. ئەو دوو لاوەش دوای خواردنی شێو دەچنە نووسینگەی خانەخوێکەیان و نامەیەك بۆ ئەو خاتوونە نەناسراوە دەنووسن، نامەیەکی ئەویندارانەی ئاگرین و بەسۆز، هەر خۆشیان دەیبەن بۆ قاتی سەرێ تاکوو ئەوەی نەگونجاوە بینووسن، خۆیان بە وردی داخۆیانیی بکەن.

ـ دەی ئەم قسە قۆڕانە چییە بۆ منی دەگێڕیتەوە؟ پێم بڵێ بزانم ئاخری چیتان کرد.

ـ لە دەرگاکە دەدەن و کلفەتێك دەیکاتەوە. ئەوانیش نامەکە دەدەنە دەستی و هەوڵ دەدەن وابنوێنن کە هەردووکیان وا ئاشق و شەیدا بوون کە هەر ئەوەندەی ماوە لە پشت دەرگاکە گیانیان دەرناچێ. کلفەتەکە بە سەرسووڕمانەوە دەیهەوێ حاڵییان بکات و بۆیان روون بکاتەوە کە خراپ تێگەیشتوون، لەناکاو کابرایەکی سووری زرتەبۆز کە لە دوولاوە ریشی لەسەر لاجانگی دەتگوت کەوچکن شۆڕبوونەتەوە پێیان دەڵێ ئەم ماڵە جگە لە ژنەکەی من هیچ خاتوونێکی تری لێ نییە و دەریان دەکاتە دەرێ.

ـ تۆ چووزانی ریشی کابرا وەك دوو کەوچك شۆڕبووبوونەوە؟

ـ ئێشتا گوێ بگرە. ئاخەر ئەمڕۆ چووم ئەوانە پێکەوە ئاشت بکەمەوە.

ـ دەی، پاشان بووبەچی؟

ـ سەیری خۆش لێرەی ماجەراکەدایە، دەرکەوت کە ئاغا پلەی راوێژیار[٨٠]ی هەیە و ئەو خاتوونە بەختەوەرەش هاوسەرێتی. ئاغای راوێژیار شکایەتی لەو دوو لاوە کردووە و دەڵێ سووکایەتییان بە ژنەکەی کردووە. بۆیە من دەبێ ناوبژیوانییان بکەم و ئاشتیان بکەمەوە. ئەویش چۆن! بڕوام پێبکە بۆ ئاشتکردنەوە و ناوبژیوانی تالۆران بە قامکە تیتۆڵەی من نابێ.

ـ دەی گرفتی کار لەکوێ دایە؟

ـ گوێ بگرە... ئێمە ئەو جۆرەی کە شیاوی دابونەریتی مرۆڤایەتییە داوای لێبوردنمان کرد، «بەڕاستی خۆمان بە شەرمەزار دەزانین و نازانین ئەو پرکێشییە چۆن قەرەبوو بکەینەوە. تکاتان لێدەکەین چاوپۆشی لەو هەڵە ناحەزەی ئێمە بفەرموون.» ئاغای راوێژیار بەو دوو

---

٨٠- راوێژیار: لە زنجیرە پلەکانی کاربەڕێوەبەریی پیتری کەبیر، کە چاردە پلە بووە «راوێژیار» پلەی شەشەم بووە.

ریشە کەوچکییەیەوە وردە وردە دڵی نەرم دەبێ بەڵام دەیهەوێ رادەی تووڕەیی خۆی بنوێنێ و جارلەگەڵ جار ئاڵەتی دەبێ و دەست دەکات بە جنێودان، من دیسان ناچار دەبم هونەری خۆم بنوێنم و دیپلۆمات ئاسایانە دەست بکەم بە زمانلووسی: «هەڵبەت هەق بە ئێوەیە، کردەوەی ئەوان زۆر ناحەز بووە. بەڵام تکایە ئەوەتان لەبیرنەچێ کە قەستێکی خراپیان نەبووە و تووشی هەڵە بوون. هەرزەکارن، جگە لەوەش تازە نانیان خواردبوو، خۆتان باش دەزانن. ئەوان بەڕاستی پەشیمانن و تکا دەکەن لێیان خۆشبی.» ئاغای راوێژیار دڵی نەرم دەبێ و دەڵێ «ڕاست دەکەی حەزرەتی کۆنت، هیچ قسەیەکم نییە، لێیان خۆش دەبم.» بەڵام ئاخر خۆتان بیری لێبکەنەوە، ژنەکەی من، ژنە داوێنپاك و نەجیمەکەم... دوو لاو بکەونە شوێنی و رووهەڵماڵدراوانە قسەی سووکی پێبڵێن، بێنا....» ئێستا ئێوە بیهێننە بەرچاوی خۆتان کە ئەو هەرزەکارانە لێرەن و من دەمهەوێ ببمە ناوبژیوانیان و ئاشتیان بکەمەوە. دیسان بە زمانی لووسی دیپلۆماتی ئاغای راوێژیار نەرم دەکەم، بەڵام خەریکە هەوڵەکەم بە ئاکام بگات و لەناکاو دەرهەڵدەبێ، وەك چەوەندەر سوورهەڵدەگەڕێ و کەوچکەکانی قرژ دەبنەوە و دیسان ناچارم دەکات پەنا بۆ وردەکارییەکانی دیپلۆماسی بەرمەوە.

بێتسی رووی کردە ئەو خاتوونەی کە دیویست پێبنێتە لۆژەکە و بە پێکەنینەوە گوتی: ئا، دەبێ ئەو ماجەرایەتان بۆ بگێڕمەوە. بڕوام پێبکەن ئەوەندە پێکەنیم لەوانەبوو ژان بکەم. ئەو قامکەشی کە بۆ گرتنی باوەشێنەکەی هیچ رۆڵێکی نەبوو بۆ لای ڤرۆنسکی درێژ کرد و گوتی: زۆر چاکە، سەرکەوتوو بنـ بە تەکانێك شانی کراسەکەی کە هەڵکشابوو داکێشایەوە تاکوو لەبەر شۆقی چراکان شان و بەرۆکی رووتی وەدیار کەوێ و ئەو جۆرەی کە شیاوە بکەوێتە بەر سەرنجی هەمووان.

ڤرۆنسکی رۆیشت بۆ دیتنی شانۆی فەڕەنسی، چونکە لەوێ حەتمەن دەبوو چاوی بە فەرماندەی هەنگەکەیان بکەوێ کە هیچ کام لە پرۆگرامەکانی ئەو شانۆیەی بە خەتەر نەدەدا، تاکوو سەبارەت بە هەوڵەکانی خۆی لە بواری ناوبژیوانیدا راوێژی لەگەڵ بکات کە لە سێ رۆژ لەمەوبەرەوە هەموو فیکر و زیکری بە خۆیەوە خەریك کردبوو و تا رادیەك بۆشی بووبووە سەرگەرمی و رابواردن. چونکە ڤرۆنسکی زۆری پتریتسکی خۆش دەویست و هەروەها ئەو لاوەش کە ناوی پرێنس کێدرۆڤ[٨١] بوو و تازە هاتبووە هێزەکەیانەوە و وەك هاوڕێیەکی

81- Kedrov

خۆشەویستی خۆی چاوی لێدەکرد. ئەوانیش ئەو دوو لاوە بوون کە تووشی ئەو ماجەرا سەرەڕۆیانەیە بووبوون و ئابڕووی هەنگەکەشیان خستبووە مەترسییەوە.

هەردووکیان لە هاوقەتارانی ڤرۆنسکی بوون. ئاغای ڤێندێن[٨٢]، راوێژیاری گۆرین، ئەویش هاتبوو بۆ لای فەرماندەی هەنگ تاکوو بە شێوەی فەرمی شکایەت لەو دوو ئەفسەرە بکات کە سووکایەتییان بە ژنەکەی کردبوو. گوتبووی کە ژنە جحێڵەکەی (خۆی گوتەنی شەش مانگ نابێ ژیانی هاوبەشیی لەگەڵ پێکهێناوە) لەگەڵ دایکی لە کلیسا بووە و لەناکاو دڵی پێکداهاتووە (ئەو دڵ تێکەڵهاتنەش بۆ ئەم بارودۆخەی ئەو شتێکی سروشتی بووە) بۆیە نەیتوانیوە لەوە زیاتر لە کلێسە بمێنەتەوە و بە سواری عارەبانە کەوتوونە شوێنی. ژنەش لە ترسانا ئەوەندەی تر حاڵی تێکچووە و بە هەڵەداوان لە پلیکانەکان وەسەر کەوتووە. ڤێندێن خۆشی تازە لە ئیدارە گەڕابۆوە و کە گوێی لێبووبوو لە دەرگا دەدەن، هاتبووەبەر دەرگاکە و دیتبووی ئەو دوو ئەفسەرە بە نامەکەیانەوە لە پشت دەرگاکە راوەستاون. بۆیە بە تووڕەیی هەردووکیان دەردەکات. ئەوانەی گوتبوو و داوای کردبوو کە ئەو دوو ئەفسەرە بە توندی سزا بدرێن.

فەرماندەی هەنگ ڤرۆنسکیی بانگکردبوو و پێیڕاگەیاندبوو «کە چۆنت پێخۆشە وابکە، بەڵام ئەو هەتیوە پتریستکی زۆری پێ لێهەڵبڕیوە و حەوتوو نییە ئاژاوەیەك نەنێتەوە. ئەو کابرا بۆرەکەیەش، ڤێندێن دەستبەردار نابێ و پێوشوێنی سکاڵاکەی دەگرێ.» ڤرۆنسکی زانیبووی کە کێشەکە خەریکە زۆر ئاڵۆز دەبێ و بۆ دوئێلیش نابێ و تەنیا چارە ئەوەیە کە دڵی ئاغای راوێژیار نەرم بکەن و ئەو کێشەیە دیزە بە دەرخۆنە بکەن. فەرماندەی هەنگەکەشیان بۆیە ڤرۆنسکیی بۆ ئەو کارە هەڵبژاردبوو چونکە دەیزانی ئەفسەرێکی نەجیم و بەهۆشە و لە هەمووشی گرینگتر زۆر بە پەرۆشی ئابڕووی هەنگەکەیەتی. پێکەوە کەوتنە راوێژ و بەو ئاکامە گەیشتن کە پتریتسکی و کێدرۆڤ لەگەڵ ڤرۆنسکی بچن بۆ لای ڤێندێن و داوای لێبوردن بکەن و دڵی چاك بکەنەوە. فەرماندەری هەنگ و ڤرۆنسکی خۆشی بە تەما بوون ناوی ڤرۆنسکی و پلەی ئاجودانییەکەی کە مەقامێکی کەم نەبوو شوێن لەسەر راوێژیار دانێ و دڵی نەرم بکات. هەر بەڕاستیش ئەو شتە کاریگەریی خۆی هەبوو، بەڵام ئاکامی مەردایەتییەکەی ئەو، ئەو جۆرەی کە خۆی دەیگوت: بەتەواوی جێی متمانە نەبوو.

ڤرۆنسکی کە گەیشتە شانۆی فەڕەنسی، فەرماندەری هەنگی بردە سووچێکی تەلارەکە و باسی دەملەپووشمان و لە راستیدا سەرنەکەوتنەکەی خۆی بۆ باس کرد. فەرماندەی هەنگ

---

82- Venden

دوای هەڵوێستەیەك لەسەر مەسەلەکە، بڕیاری دا کە پێوشوێنی کێشەکە بگرێ. بەڵام بۆ رابواردن و گاڵتە دەستیکرد بە پرسوجۆ کردن و چۆنێتیی چاوپێکەوتنەکەی لەگەڵ کابرای سکاڵاکار و دوای ئەویش هەتا ماوەیەك لەبەر پێکەنین لەوانە بوو لە خۆ بێتەوە، کە ڤرۆنسکی گوتی چۆن ئاغای راوێژیار هەموو جارێ دڵی نەرم دەبوو، بەڵام کە چۆنێتیی رووداوەکەی وەبیردەهاتەوە دیسان دەرهەڵ دەبوو، ڤرۆنسکی کە دوایین نیوەبەڵێنی ئاشتبوونەوەی لێ وەرگرت بە پەلە پترتیێسکیی وەپێش خۆی دابوو و لەماڵەکەی هاتبوونە دەرێ.

فەرماندەی هەنگ بە پێکەنینەوە دیسان گوتی: بەڕاستی ماجەرایەکی بێئاکام و پێکەنینییە. بەڵام چارە چییە، کێدۆرۆڤ خۆ ناتوانێ لەگەڵ ئەو پیاوە دوئێل بکات... دەی، کەوایە ئەو بۆرە پیاوە چەقۆت لێدایە خوێنی نەدەهات، ها؟ ـ پاشان قسەکەی گۆڕی و دەستیکرد بە تاریف کردنی ئەو ژنە ئەکتەرە تازەی فەڕەنسی: کلاییر[83] ئەمڕۆ چۆن بوو؟ زۆر چاك بوو، نا؟ هەرچەندە چاو لە دەورگێڕانەکەی بکەی ماندوو نابی. رۆژ لەگەڵ رۆژ تازەتر دەنوێنێ. ئەو هونەرەش هەر لە فەڕەنسییەکان دەوەشێتەوە.

## شەش

پرێنسس بێتسی هەتا کۆتاییی شانۆکە دانەنیشت و گەڕایەوە بۆ ماڵی خۆیان لە شەقامی بالشایا مۆرسکایا. تازە چووبووە ژووری ئارایشتەکەی و خەریکبوو سپیاو لە دەموچاوە کز و رەنگ بزڕکاوەکەی هەڵساوێ، چەوری کردبوو و پرچی داهێنابوو و بەسەر شان و ملیا شۆڕی کردبۆوە کە میوانەکانی یەك لەدوای یەك هاتن. میوانەکانی لەبەرپلیکانەکانی بەردەرگا لە عارەبانە دابەزین و دەرگاوانێکی قەڵەوە کە بەیانیان لە پشت دەرگا شووشەییەکە دادەنیشت و رۆژنامەی بۆ دەرو جیران و ئەو کەسانە دەخوێندەوە کە لەوێوە تێدەپەڕین، دەرگا گەورەکەی بە ئارامی بۆ کردنەوە و میوانەکان بە بەردەمیدا تێپەڕین و هاتنە ژوورێ.

خاتوونی خانەخوێ بە سەروکەزیەی رازاوە و روخساری گەش و ئاڕایشت کراوەوە لە دەرگاکەوە هاتە تەلاری میوانداری و میوانەکانیش لە دەرگایەکی ترەوە. رەنگی دیواری

---

83- Claire

تەلارەکە تەڵخ و فەرشەکانی نەرم بوون. سپیاییی سەرپۆشی مێزەکان و قەندان و پەرداخ و سەماوەری زێوین لە سەریان، لەبەر شۆقی مۆمەکان دەدرەوشانەوە و سەرنجیان رادەکێشا.

خاتوونی خانەخوێ لەبەر سەماوەرەکە دانیشت و دەستەوانەکانی داکەند. پێشخزمەتەکان بێ ئەوەی سەرنجڕاکێشن بە نەرمی دەهاتن و دەچوون و کورسییە دەسکدار و بێ دەسکەکانیان ڕێکوپێك دەکرد بۆ ئەوەی میوانەکان دانیشن. میوانەکان بوون بە دوو بەشەوە، دەستەیەکیان لە دەوری خاتوونی خانەخوێ دانیشتن کە لەبەر مێزی چاییەکە دانیشتبوو، دەستەکەی تریش لەوسەری تەلارەکە و لە دەوری هاوسەری شۆخوشەنگی باڵوێز دانیشتن کە کراسێکی مەخمەری ڕەشی لەبەردا بوو و چاو و برۆ ڕەشەکەی زۆر سەرنجڕاکێش بوو. سەرەتا هیچ کام لە دوو دەستەکە بە گەرمی نەکەوتنە ئاخافتن لەگەڵ یەکتر و لەگەڵ هاتنی میوانی تازە و سڵاو و چاکوچۆنی و چاییدانان بێدەنگ دەبوون و دەستیان پێدەکردەوە، قسەکانیان سەبارەت بە شتێکی تایبەت نەبوو و زووزوو باسەکەیان دەگۆڕی.

دیپلۆماتێك لە نێو دەستەی هاوسەری باڵوێزدا گوتی: ئەو ئەکتەرێکی زۆر هونەرمەندە و دیارە چۆتە ناخی تابلۆکانی «کاولباخ[٨٤]»ەوە. دیتتان چۆن خۆی بە زەویدا کێشا؟

ژنێکی کوڵمە سووری قژ زێرین و گۆشتن کە برۆی نەبوو و شینیۆنیشی لە بسکی نەدابوو و کراسێکی هەوریشمینی نیوداشتی لەبەرکردبوو گوتی: ئاە، تکاتان لێدەکەم ئیتر با باسی نیلسۆن نەکەین. ئەوی دەبوو بگوترێ سەبارەت بە ئەو گوترا ـ ئەو کەسەی کە سادەوێژی و زمانی تیژ و هەڵسوکەوتە ئاژرانەکەی ناوبانگی دەرکردبوو، خاتوون پرێنسس میاخکایا[٨٥] بوو کە پێیان دەگوت دەڵێی لەژێر چەکوشی شەیتان دەرپەڕیوە. پرێنسس میاخکایا لە نێوان ئەو دوو دەستەیەدا دانیشتبوو و گوێی بۆ قسەی هەردوولا راداشتبوو لەگەڵ هەردوو بەر فریای دمەتەقێ دەکەوت: ئەمڕۆ من راست ئەو دەستەواژەیەم لە سێ کەس بیست سەبارەت بە کاولباخ. وێدەچێ پێکەوە دستبەیەکییان کردبێ. نازانم چ شتێکی ئەو دەستەواژەیە وەکەیفی هێناون.

ئەو بیرۆڕا دەربڕینەی پرێنسس قسەکەی پێبڕین و پێویست بوو بابەتێکی تازە بدۆزنەوە و لەسەری بدوێن.

---

٨٤- Wilhelm Von Kaulbach (١٨٠٥ ـ ١٨٧٤) وێنەگەری بەناوبانگی نەمسایی کە وێنەگەلێکی لە شانۆ نامەکانی شکسپێر و گۆتە کێشاوەتەوە و نیلسۆن بۆ وەدەست هێنانی ڕۆڵی ئۆفلیا و دیزدی مۆنا و گرتشن بۆ ئوپێرا ئیلهامی لە ئەو وەرگرتووە.

85- Myagkaya

هاوسەری باڵوێز لەو جۆرە قسەوباسە کورت و ناسك و دڵپەسندانە زۆر شارەزا بوو کە ئینگلیزییەکان پێی دەڵێن Small talk. رووی کردە دیپلۆماتێك کە قەزائەن ئەویش لەوکاتەدا نەیدەزانی سەبارەت بەچی باخێوێ و گوتی: دا بەسەرهاتێکی سەرنجڕاکێش بگێڕەوە، بەڵام با فێڵەبازانە نەبێ.

دیپلۆمات زەردەیەکی گرت و گوتی: دەڵێن ئەو کارە زۆر دژوارە و تەنیا قسەی فێڵەبازانە و گاڵتەجاڕییانە دڵپەسەندە. بەڵام من هەوڵی خۆم دەدەم . ئێوە بابەتێکم بۆ دەسنیشان بکەن، کە پێوەندیی بە باسەکامانەوە ببێ. هەر مەبەستەکە مەعلووم بێ ئیتر ئاسانە چونکە قسە، قسە دێنێ. من زۆر جار دێمە سەر ئەو باوەڕە ئەگەر وتەبێژانی گەورەی سەدەی رابردوو، ئەمڕۆ ژیابایەن زۆر بە زەحمەت دەیانتوانی قسەی بەرێوجێ بکەن. ئەمڕۆ قسەی بە کاکڵ و حیسابی هێندە لە دڵ ناخۆش دێ کە...

هاوسەری باڵوێز بە پێکەنینەوە قسەکەی پێبڕی: ئەم قسەیەش ئیتر شتێکی نوێ نەبوو.

مشتومڕێکی زۆر نەرم و لەسەرەخۆ دامەزرا بەڵام راست بە هۆی ئەوەوە کە زۆر لەسەرەخۆ دەدوان دیسان بێدەنگ بوون و باسەکەیان راوەستا. لە رووی ناچارییەوە پەنایان برد بۆ شتێکی تاقیکراوە کە هیچ کات بێئاکام نەبووە، ئەویش پاشملە باسی ئەموئەو کردن بوو.

دیپلۆمات ئاماژەی بەو گەنجە کاکۆڵ زێڕینە جوانچاکە کرد کە لەلای مێزەکە راوەستابوو و پرسیی: پێتان وانییە تووشکڤیچ[٨٦] شتێکی پێوەیە کە پیاو وەبیر تەلاری رازاندنەوەی سەردەمی لوویی پازدەهەم دەخاتەوە؟

ـ راست دەکەی، ئەو کوڕە گەنجە لەگەڵ رازاندنەوەی ئەم تەلارە زۆر سازگارە، هەر بەو هۆیەشەوە هەمیشە لێرەیە.

دەمەتەقێ گەرم داهات، چونکە قسەکان پڕبوون لە تیروتوانج کە لەم تەلارەدا نەدەکرا بە ئاشکرا دەریانبڕی، ئەویش سەبارەت بە پێوەندیی نێوان خاتوونی خانەخوێ و تووشکڤیچ بوو.

هەر لەو کاتەدا مشتومڕی نێوان ئەو دەستەیەی کە دەوری خاتوونی خانەخوێ و مێزی سەماوەرەکەیان دابوو پەرەیسەند و وەك ئەو دەستەیەی تر و چەشنی هەمیشە، ماوەیەك وەك باڵندەیەکی چەواشە بوو بە نێو نوێترین هەواڵی کۆڕی گەورەپیاوان و شانۆ و غەیبەت کردنی ئەموئەودا فڕی و ئاخری لەسەر مەبەستی سێهەم، یانی پاشملە باسی ئەموئەو کردن نیشتەوە.

---

86- Touchkevitch

ـ بیستووتانە مالتیشچێڤا[87]، هەڵبەت دایکی نەك کچەکەی، خەریکە جلوبەرگی ***سووری تۆخ و پڕ زریقە و بریقە بۆ خۆی دەدەووریێ***؟

ـ ئەوە دەڵێی چی؟ ئەیەرۆ، بەڕاستی سەرنجڕاکێشە!

ـ من لەوە سەرم سووڕماوە ئەگەرچی زۆر ژنێکی زیرەکە، بەڵام بیر لەوە ناکاتەوە کە خۆی دەکاتە گاڵتەجاڕی ئەموئەو؟

هەرکەسەی هەستا بە دژی مالتیشچێڤای بێچارە شتێکی گوت و بۆ خۆشکردنی ئاورەکە ئێزنگێکی نایە سەر، دەمەتەقێ وەك ئاگر بڵێسەی کێشا و کۆڕەکە گەرم داهات.

مێردەکەی پرێنسس بێتسی، کە پیاوێکی قەڵەو و مێهرەبان بوو و هۆگرییەکی زۆری بە کۆکردنەوەی گراڤور هەبوو، کە زانیی ژنەکەی میوانی هەیە بەر لە رۆیشتنی بۆ یانەی وەرزشی سەرێکی لە تەلاری میوانداری هەڵێنا... بەسەر فەرشەکەدا بە نەرمی و بێچرپە لە پرێنسس میاخکایا نزیکبۆوە.

گوتی: پرێنسس، نیلسۆن چۆن بوو؟

پرێنسس وەڵامی دایەوە: ئەیەرۆ، ئەوە کوا شێوەی نزیکبوونەوەیە لە خەڵك، باوکەکەم، ئاوا بێهەواڵ و بە پێدزکە، خۆ دڵم نەما ئەوەندە ترسام! تکات لێدەکەم باسی ئۆپێرام لەگەڵ مەکە، خۆ تۆ لە مۆسیقا ناگەی. واچاکە من بۆ ئاستی تۆ داکێشم و سەبارەت بە چینی ماژۆلیك و گراڤورەکانتان بدوێین. بۆم باسکە دەی بەمزووانە چ شتێکی ئەنتیکەت لە ئەنتیکەخانەکان دۆزیوەتەوە؟

ـ ئەگەر پێتخۆش بێ پیشانتی دەدەم، بەڵام خۆ تۆ سەرت لەو شتانە دەرناچێ.

ـ پیشانمدە. من بەر لەمە... ناویان چییە، مەبەستم ئەو بانکدارانەیە... شتێك فێر بووم. گراڤور زۆر جوانن. پیشانیان دەداین.

خاتوونی خانەخوێ لەبەر سەماوەرەکەوە گوڕاندی: چۆن، مەگین ئێوە چوونەتە ماڵی شۆتزبۆرگ؟

پرێنسس میاخکایا کە تێگەیشت هەموو گوێیان لێگرتووە بە دەنگێکی بەرز گوتی: بەڵێ، خۆشەویستەکەم چووینەتە ماڵی، من و مێردەکەمیان بۆ نانی نیوەڕۆ بانگهێشتن کرد. بیستوومە کە ئەو سۆسەی لەگەڵ خواردەمەنی پێیان داین هەزار رۆبڵیان پێدابوو، هەڵبەت سۆسێکی زۆر بێتام و ناخۆشیش بوو، شتێکی سەوز بوو هەر لە قەوزە دەچوو. ئێمەش ناچاربووین بانگهێشتنیان کەین و من سۆسێکم بۆ سازکردن کە هەشتا و پێنج کاپکی

87- Maltichtchva

هەڵگرت و هەمووشیان تاریفی سۆسەکەمیان دەکرد. من نازانم سۆسی هەزار رۆبڵی ساز بکەم.

هاوسەری باڵوێز گوتی: بێوێنەیە!

یەکێکی تر گوتی: ژنێکی سەیرە!

ئەو شوێنەی کە قسەکانی پرێنسس میاخکایا لەسەر کۆڕەکەی دادەنا هەمیشە یەکسان بوو و رازەکەشی لەوەدا بوو کە قسەکانی ئەگەرچی هەمیشە وەك ئێستا لەبەرئەوەی بە دڵۆ بوون و بێپەردە دەدوا، نابەجێیان دەنواند، بەڵام سادە و مانادار بوون. قسەکانی لەو کۆڕ و میوانداریيانەدا کە بەشداریی دەکرد وەك نەقڵ و نوکتەی زۆر ناسك و گونجاو چاوی لێدەکرا. پرێنسس میاخکایا خۆی نەیدەزانی هۆی چییە قسەکانی ئاوا شوێندانەرن، بەڵام ئاگاداری ئەو شوێندانەرییەی بوو و کەڵکی لێ وەردەگرت.

کە بێدەنگی کۆڕەکەی داگرت و هەموو گوێیان بۆ قسەکانی پرێنسس میاخکایا شل کردبوو و دەستەکەی هاوسەری باڵیۆزیش هەروا متەقیان نەدەکرد، خاتوونی خانەخوێ ویستی هەموو میوانەکانی لە یەك دەستەدا کۆ بکاتەوە بۆیە بە هاوسەری باڵیۆزی گوت: ئێوە بەڕاستی ئیشتیاتان لە چایی نییە؟ ناتانەوێ بێن بۆ لای ئێمە؟

هاوسەری باڵوێز بە پێکەنینەوە گوتی: نا، ئەم شوێنەی خۆمان زۆر باشە ــ پاشان درێژەی بە قسەکانی دا.

قسەکانیان زۆر سەرنجڕاکێش بوو. کەوتبوونە سەروکاری کارنین و رەخنەیان لەو ژن و مێردە دەگرت.

یەکێك لە دۆستانی نزیکی ئانا کارنینا دەیگوت: لەو کاتەوە لە مۆسکۆ هاتۆتەوە زۆرگۆڕاوە. ئیتر ئەو ئانایەی جاران نییە.

هاوسەری باڵوێز گوتی: گەورەترین گۆڕانی ئەوەیە کە ئەلکسی ڤرۆنسکی وەك نیسێ بەدوای خۆیدا رادەکێشێ.

ــ دەیجا ئەوە چییە؟ یەکێك لە چیرۆکەکانی (گریم) چیرۆکی «پیاوی بێنیسێیە[٨٨]» ئەویش بەسەرهاتی پیاوێکە کە سێبەری نییە و ئەوەش سزای تاوانێکە کە ئەنجامی داوە. من بە هیچ جۆرێ تێناگەم ئەوە چجۆرە سزادانێکە؟ بەڵام بۆ ژنێك، زۆر دژوارە سێبەری نەبێ.

دۆستەکەی ئانا گوتی: بەڵێ، بەڵام ئەو ژنانەی کە سێبەریان هەیە، زیاتر کارەکەیان لێ چڕ دەبێتەوە.

---

٨٨- برایانی گریم چیرۆکێکی وایان نییە، بەڵکوو نووسەری ڕۆمانتیکی ئاڵمانی ئادالبێرت کامیسۆ چیرۆکێکی بەو ناوە هەیە.

پرێنسس میاخکایا کە ئەوەی بیست لەناکاو گوتی: دەمتان لێکنێن. کارنینا زۆر ژنی چاکە. رقم لە مێردەکەیەتی بەڵام زۆرم خۆی خۆشدەوێ.

هاوسەری باڵوێز گوتی: بۆ رقت لە مێردەکەیەتی؟ خۆ پیاوێکی خراپ نییە. مێردەکەم دەڵێ لەو جۆرە پیاوە دەوڵەتییانە لە ئەورووپا زۆر کەمن.

پرێنسس میاخکایا گوتی: مێردەکەی منیش وادەڵێ، بەڵام بڕوا ناکەم. ئەگەر مێردەکانمان وایان نەگوتبایە ئێمە ئەومان وەك خۆی دەدی. بەڵام ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بە بڕوای من زۆر گەوجەپیاوە. هەڵبەت ئەو قسە لە بەینی خۆماندا بێ. ئەگەر ئەو بەگەوج بزانین هەموو شتێك روون دەبێتەوە، وانییە؟ ئەو کاتانەی کە دەیانویست بە منی بسەلمێنن کە پیاوێکی زیرەك و بیر تیژە من هەولم دەدا بزانم زیرەکییەکەی لە چیدایە و کە تێنەدەگەیشتم لە دلی خۆمدا دەمگوت رەنگە هۆی ئەوەبێ خۆم شعوورم نەبێ. بەڵام لە دلی خۆمدا بیرم لێکردەوە، گوتم گەوجە، بەڵام دواتر هەموو شتێکم بۆ روون بۆوە و زانیم وا نییە.

ـ ئێوە ئەمڕۆ بۆ ئاوا بەرقدا چوون؟

ـ نا، من بەرقدا نەچووم. ئەوە لە دوو حاڵەت بەدەر نییە. یەکێك لەو دوو کەسەمان گەوجین. بەڵام مرۆڤ هیچ کاتێك ناتوانێ بەخۆی بسەلمێنێ کە گەوج خۆیەتی.

دیپلۆمات شیعرێکی فەرەنسیی بۆ نموونە هێنایەوە کە: هیچ کەس بە سامانی خۆی رازی نییە، بەڵام هەموو لە ئاوەزی خۆیان رازین.

پرێنسس میاخکایا خێرا رووی تێکرد وگوتی: راست دەکەی، بەراستی وایە. بەڵام من هەروا لایەنگری لە ئانا دەکەم. ئەو هێندە ژنێکی چاك و مێهرەبانە مەگین خودا بزانێ، خەتای ئەو چییە، پیاوان هەموو ئاشقی دەبن و وەك سێبەر دەکەونە شوێنی؟ خۆ ئەوە تاوانی ئەو نییە.

دۆستە نزیکەکەی ئانا بۆ خۆپەراندنەوە گوتی: بەڵام من بە هیچ شێوەیەك نەمدەویست رەخنەی لێبگرم.

ـ ئەگەر کەسێك وەك سێبەر وەدوای ئێمە ناکەوێ، نابێتە هۆی ئەوەی کە هەق بە خۆمان بدەین و کەسێکی تر بە تاوانبار بزانین.

دوای ئەوەی دۆستەکەی ئانای بە تەواوی هەڵگولۆڤی و لەولاوە داینا، هەستا و لەگەڵ هاوسەری باڵیۆز رۆیشت بۆ نێو کۆڕی دەوری مێزەکە کە سەبارەت بە شاپرووس قسەیان دەکرد.

بێتسی پرسیی: ئێوە لەوێ پاشملە باسی کێتان دەکرد؟

هاوسەری باڵوێز لە پشت مێزەکە دانیشت و بە پێکەنینەوە گوتی: باسی کارنین و ئانا ئارکادیۆڤنامان دەرکرد. پرێنسس خەریکبوو تاریفی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچی دەکرد.

خاتوونی خانەخوێ گوتی: بەداخەوە ئێمە لە بیستنی بێ بەش بووین. چاوێکی لە دەرگای هاتنە ژوورەوەی تەلارەکە کرد و بە پێکەنینەوە رووی لە ڤرۆنسکی کرد کە خەریکبوو دەهاتەژووریَ و گوتی: ئاه، ئاخری هاتی!

ڤرۆنسکی جگە لەوەی کە لەگەڵ هەموو میوانەکان ئاشنایەتیی هەبوو، هەموو رۆژێکیش یەکبەیەکی ئەوانی دەدی بۆیە هێندە بە خاترجەمی هاتەژووریَ دەتگوت تاوێك لەمەوبەر چۆتە دەریَ.

لە وەڵامی پرسیارەکەی هاوسەری باڵوێزدا گوتی: دەپرسی لە کوێوە هاتووم؟ چ بکەین، دەبێ دانی پێدابنێم کە چووبووم بۆ بووف (شانۆی فەرەنسی). سەد جارم ئەو بەرنامەیە دیتووە و هەرجارەی چێژێکی تایبەتم لیَ وەرگرتووە. دەزانم ئەم کارە دەبێ کارێکی شوورەیی بێ بەڵام چ بکەم. کە دەچم بۆ ئۆپێرا خەونووچکە دەمباتەوە و لەپەستا وەنەوز دەدەم، بەڵام بۆ ئەو شانۆنامە پێکەنینییانە هەتا کۆتایی دادەنیشم و شاد و کەیفخۆشم. ئەمشەو...

ناوی ژنە ئەکتەرە فەرنسییەکەی هێنا و دەیویست سەبارەت بەو ژنە شتێك بڵێ بەڵام هاوسەری باڵوێز بە گاڵتە و ترس لێنیشتووانە قسەکەی پێبڕی. تکات لێدەکەم ناوی ئەو عیفریتە مەهێنە.

ـ بەچاوان، ناوی ناهێنم. بەتایبەت کە هەموو ئامادەبووان ئەو جۆرە عیفریتانە دەناسن.

پرێنسس میاخکایا قسەکەی بەدڵ بوو و گوتی: ئەگەر چوون بۆ ئەو شانۆیە وەکوو چوون بۆ ئۆپێرا نیشاندەری کەسایەتی بووایە هەموو دەچوون بۆ ئەویَ.

## حەوت

ترپەی پێیەك لەلای دەرگای هاتنە ژوورەوەی تەلارەکەوە هاتە گویَ و پرێنسس بێتسی کە دەیزانی ترپەی پێی کارنینایە چاوێکی لە ڤرۆنسکی کرد. ئەو حاڵەتە تازەی کە روخساری ڤرۆنسکیی داگرت شتێکی سەیر بوو. سەری بۆ لای دەرگاکە وەرسووڕاند. بە شادییەکی زۆر و لەگەڵ ئەوەشدا بە شەرمەوە چاوی لە خاتوونی تازە هاتوو بڕی و لە بەری هەستا. ئانا پێی نایە تەلاری میوانداریییەوە. وەك هەمیشە قیتوقۆز دەڕۆیشت و چاوی لە خاتوونی خانەخوێ

دەکرد. بە هەنگاوی نەرم و قایم و خێرا کە ئاکاری ئەوی لە ژنەکانی تری چینی دەوڵەمەندان جیا دەکردەوە، چەند هەنگاوێك کە لێی دوور بوو، چووە پێشێ و دەستی نایە نێو دەستی و گرژییەوە، هەر بەو زەردەخەنەیەشەوە لە ڤرۆنسکیی روانی. ڤرۆنسکی کڕنۆشێکی لە دڵەوە بۆ کرد و کورسییەکی بۆ بردە پێشێ.

ئانا بۆ کڕنۆشەکەی ڤرۆنسکی تەنیا سەرێکی لەقاند و سوورهەڵگەڕا و نێوچاوانی تێکنا. بەڵام لەڕێوە تێگەیشت کە ئامادەبووان ئاگایان لێیە، بۆیە سەرێکی بۆ لای ئەوانیش لەقاند و ئەو دەستانەی بۆ تۆقە هاتبوونە پێشێ بە گەرمی گوشینی و رووی کردە خاتوونی خانەخوێ و گوتی: من لە ماڵی کۆنتس لیدیا بووم و دەمویست زووتر بێم بەڵام لەوێ وەدرەنگ کەوتم. سیرجان[89] لەوێ بوو. مرۆڤێکی سەیرە.

ـ ئەها، مەبەستت ئەو بانگەشەکارە ئاینییەیە؟

ـ بەڵێ، باسی ژیانی هێندییەکان دەکات. زۆر شتێکی سەیرە.

لەگەڵ هاتنی ئانا بێدەنگ بوون، هەروەك گڕی چرایەك کە فووی لێبکەی و بیکووژێنیتەوە.

ـ سیرجان! بەڵێ، سیرجان، من چاوم پێیکەوتووە. زۆر جوان داخێوێ. ڤلاسێڤا[90] شێت و شەیدای ئەوە.

ـ ئەرێ بەڕاست، دەڵێن خوشکە چکۆلەکەی دەیهەوێ شوو بکات بە تاپۆڤ، ئەوە راستە؟

ـ بەڵێ، دەڵێن بڕیاری خۆی داوە.

ـ من سەرم لە دایك و باوکی سووڕماوە. دەڵێن لەو چەشنە زەماوەندانەیە کە بە هۆی ئەوینداریییەوە پێکهاتووە.

ژنەکەی باڵوێز گوتی: زەماوەندی ئەویندارانە؟ ئێوە وەك سەردەمی دەقیانووس بیردەکەنەوە! ئەمرۆ ئیتر کێ باسی ئیشق و ئاشقی دەکا؟

ڤرۆنسکی گوتی: چی دەکرێ؟ ئەم دابە کۆن و گەوجانەیە هێشتا باوی ماوە.

ـ قوڕ بەسەر ئەو کەسانەی هێشتا لەسەر ئەو شتە سوورن. ئەو ژیانە هاوبەشە گەرم و سەرکەوتووانەی کە من پێمشك دێ تەنیا لە رووی ئەقڵ و بەرژەوەندییەوە پێك هاتوون.

---

89- Sir gohn
90- Vlaceva

ڤرۆنسکی گوتی: بەڵێ، بەڵام زۆربەی ئەو ژیانە هاوبەشیانەی بە سەرکەوتوویان دەزانین، ئەگەر ئەو ئەشقەی سەرەتا گوێیان پێنەداوە سەر هەڵداتەوە کۆشکی بەختەوەرییەکەیان دەڕووخێنێ.

ـ بەڵام مەبەست لە زەماوەندی مەسڵەحەتی یان ئاقڵانە ئەو زەماوەندانەیە کە هەردوولا پێشتر هەرزەیی و شەیداییەکەیان تێپەڕ کردبێ. ئەم چیرۆکی ئەوینەش وەك مێکوتە وایە. هەموو دەبێ ئەو نەخۆشینە بگرن. هەرکاتێك گرتت ئیتر خاترجەم دەبی.

ـ کەوایە دەبێ رەوشتی کوتانی دەستکرد بدۆزرێتەوە، وەك واکسەنی دژە خولێرکە.

پرێنسس میاخکایا گوتی: من بە کچی ئاشقی یاریدەدەرێکی مجێوری کلێسە بووم، پێموانییە ئەو کوتانە هیچ کەڵکێکی هەبێ.

پرێنسس بتسی گوتی: نا، گاڵتە وەلا نێن، من پێموایە بۆ تیگەیشتن لە ئەشق دەبێ سەرەتا هەڵە بکەی تاکوو پاشان بە بەختەوەری بگەی. چونکە سوار هەتا نەگلێ نابێ بە سوار.

ـ هاوسەری باڵوێز بە گاڵتەوە گوتی: تەنانەت دوای زەماوەندیش؟

پیاوی دیپلۆمات پەندێکی پێشینانی ئینگلیزیی بۆ نموونە هێنایەوە و گوتی: بۆ پشیمانی هیچ کات درەنگ نییە.

پرێنسس بێتسی قسەکەی سەلماند: راستوایە. هەروەك گوتم، سەرەتا دەبێ هەڵە بکەی بۆ ئەوەی مانای ژیانی هاوبەش بزانی ـ رووی کردە ئانا کە بە بزەیەکی مانادار و کەم رەنگەوە بێدەنگ دانشتبوو و گوێی راگرتبوو بۆ قسەکانیان، لێیپرسی: تۆ بیرورات لەوبارە چییە؟

ئانا کە دەستەوانەکانی لە دەستی داکەندبوو کایەی پێدەکردن گوتی: من پێموایە ئەوە راستە کە دەڵێن هەر سەرێك ئەقڵێکی تێدایە و هەر دڵێکیش ئەشقێکی تایبەت بەخۆی.

ڤرۆنسکی چاوێکی لە ئانا کرد و بە دڵەکوتەوە چاوەڕێبوو بزانێ دەڵێ چی. کە ئەو قسەی لە ئانا بیست وەك ئەوەی لە مەترسییەکی گەورە رزگاری بووبێ هەناسەیەکی ئاسوودەیی هەڵکێشا و دڵنیا بوو.

ئانا لەناکاو چاوێکی لێکرد و گوتی: لە مۆسکۆوە نامەیەکم پێگەیشتووە کە نووسیویانە کیتی ئیشچر باتسکایا زۆر نەخۆشە.

ڤرۆنسکی نێوچاوانی گرژ کرد و گوتی: سەیرە.

ئانا بە توندی چاوی لێکرد و گوتی: ئەو هەواڵە بۆ تۆ گرینگ نییە؟

ـ بەپێچەوانە، زۆریش گرینگە. دەکرێ بفەرموون بە وردی چییان نووسیوە؟

ئانا هەستا چوو بۆ لای بێتسی و لەپشت کورسییەکەی ئەو راوەستا و گوتی: پەرداخێك چاییم پێدەدەی؟

هەتا پرێنسس چاییەکەی تێکرد، ڤرۆنسکی هات بۆ لای.

پرسیارەکەی دووپاتکردەوە: بە وردی چییان نووسیوە؟

ئانا وەڵامی پرسیارەکەی نەدایەوە و گوتی: من زۆر جار پێموایە پیاوان لە مانای حەیا و شەرەف ناگەن، ئەگەرچی بەردەوام باسی دەکەنـ چەند هەنگاو چووە پێشێ و لە پەنا مێزێك کە لە سووچێك هەڵکەوتبوو و چەند ئەلبۆمی لەسەر بوو دانیشت و گوتی: زۆر لەمێژە دەمەوێ ئەوەتان پێبڵێم.

ڤرۆنسکی پەرداخە چاییەکەی برد دایە دەستی و گوتی: نازانم مەبەستتان چییە.

ئانا بە چاو ئاماژەی بە قەنەفەیەکی تەنیشت خۆی کرد و ڤرۆنسکی خێرا دانیشت.

ئانا بێ ئەوەی چاو لە چاوی بکات گوتی: بەڵێ دەمویست پێتان بڵێم کە کارەکەی تۆ جوان نەبوو. زۆریش خراپ بوو.

ـ تۆ پێتوایە من نازانم کارەکەم ناحەز بوو؟ بەڵام تاوانبار کێیە؟

ئانا بە توندی چاوێکی لێکرد و گوتی: ئەوە بۆ بە من دەڵێی؟

ڤرۆنسکی لێو بەبزە و رووهەڵماڵدراوانە چاوی لە چاوی بڕی و بێ ئەوەی چاوی بتروکێنێ وەڵامی دایەوە: خۆتان دەزانن بۆچی.

ڤرۆنسکی شلوێ نەبوو، بەڵام ئانا لە شەرمانا سوورهەڵگەڕا.

گوتی: ئەوەش نیشانەی ئەوەیە کە زۆر دلڕەقیـ بەڵام چاوی پێیدەگوت کە خۆی دەزانێ دلڕەق نییە و هەر بەو هۆیەش لێی دەترسێ.

ـ ئەوەی ئێوە ئێستا باستان دەکرد ئەوین نەبوو هەڵە بوو.

ئانا بە تووڕەییەوە گوتی: لەبیرت بێ من ئیزنم نەداوی وشەیەکی ئاوا، ئەو وشە پیسە لە دەمت بێتەدەرێ ـ بەڵام دەستبەجێ هەستی کرد کە هەر بەو وشەیەی «ئیزنم نەداوی» ددانی پێداناوە کە هەقێکی بەسەرییەوە هەیە و هەر بەوەش هانیداوە کە باسی ئەوین و خۆشەویستی بکات. بە سەرنجێکی توند و لەخۆڕادیوانە لێی مۆڕ بۆوە و بە دەموچاوی سوورهەڵگەڕاو و روومەتی هەڵاییساوەوە تێیڕاخوڕی: من لەمێژە دەمویست ئەوەت پێبڵێم، ئەمڕۆش دەمزانی لێرە چاوم پێتدەکەوێ بۆیە هاتم. بەتایبەتی هاتووم کە پێتبڵێم ئەو ماجەرایە دەبێ تەواوبێ. من لەوەتا هەم لەلای هیچ کەس بە خۆمدا نەشکاومەتەوە و لە شەرماندا سوورهەڵنەگەڕاوم، ئێوە کارێکتان کرد کە هەست بە تاوان بکەم... تاوانێك کە خۆشم نازانم چییە.

ڤرۆنسکی چاوی تێبڕیبوو و لەو جوانییە ناوەکییە نوێیەی کە شوێنەوارەکەی لە روخساریدا دەدرەوشایەوە، سەری سووڕ مابوو.

بە شێوەیەکی زۆر ئاسایی و جیددی گوتی: ئێوە چیتان لە من دەوێ؟

ـ دەمهەوێ بچی بۆ مۆسکۆ و داوای لێبوردن لە کیتی بکەی ـ لەگەڵ وتنی ئەو قسەیە ترووسکەیەك لە چاوانیدا درەوشایەوە.

ڤرۆنسکی گوتی: تۆ ئەوەت لە من ناوێ.

ئەو دەیزانی ئانا خۆی ناچار کردووە کە ئەو قسەیە بدرکێنێ، دەنا خواستی دڵی شتێکی دیکەیە.

ئانا منجاندی: ئەگەر راست دەکەی و منت خۆشدەوێ، کارێك بکە دڵم ئاسوودە بێ.

ڤرۆنسکی گرژییەوە.

ـ تۆ یانی نازانی کە رۆح و ژیانی منی؟ ئۆقرە و ئاسوودەیی لە من هەڵگیراوە و ناتوانم شتێك کە خۆم نیمە بۆ ئێوەی بێنم. دەتوانم بوونی خۆم و ئەشقی خۆمت پێشکەش بکەم! چونکە من ناتوانم خۆم و تۆ بە دوو مرۆڤی جیا لە یەکتر بزانم. بۆ من، تۆ و خۆم تەنیا یەکێکین. من پێموانییە داهاتووی هیچ کاممان ئۆقرە و ئاسوودەیی تێدابێ. ئەوەی بۆ داهاتوومانی پێشبینی دەکەم داماوی و چارەڕەشییە... لەگەڵ ئەوەدا بەختەوەریش دەبینم، ئەویش چ بەختەوەرییەك! ـ بە جووڵانەوەی لێوی بێ ئەوەی ورتەی لێوەبێ گوتیشی: یانی ئەوە نالوێ بۆمان؟ـ ئەگەرچی وتەکەی بێدەنگ بوو، بەڵام ئانا تێگەیشت.

ئانا بە تەواوی توانای مێشکییەوە هەوڵی دا تاکوو ئەوەی کە ئەرکی سەرشانییەتی پێیبڵێ، بەڵام بەجێی ئەوەی شتێك بڵێ چاوانی پڕ لە ئەوینی بە ترووسکەیەکی ئاشقانە درەوشانەوە و هیچی نەگوت.

ڤرۆنسکی شاد و سەرمەست لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەوەتا، شوکر گرتی، راست لە کاتێکدا کە خەریکبوو هیوابڕاو دەبووم، راست لە کاتێکدا کە دەتگوت چاوەڕوانییەکەم بێکۆتاییە، ئەها، چاکە شوکر! وادیارە خۆشی دەوێم. خۆی ددانی پێدانا.»

ـ دەی ئەو کارەم بۆ بکە و ئیتر واز لەو قسانە بێنە. پێکەوە دەبینە دوو هاوڕێی باش ـ ئەو قسانەی دەکرد بەڵام چاوی شتێکی تری دەگوت.

ـ ئێمە پێکەوە نابینە هاوڕێ، خۆتان زۆر باش دەزانن. ئێمە یان دەبینە بەختەورترین مرۆڤ یان چارەڕەشترین، ئەوەش بە دەست تۆیە.

ئانا دەیویست شتێك بڵێ بەڵام ڤرۆنسکی قسەکەی پێبڕی.

ـ من تەنیا داواكارییەكم لە ئێوە هەیە، ئەویش مافی هیواداربوونە. ئیزنم بدەنێ وەك ئێستا ئازار بكێشم. ئەگەر بۆشت نالوێ، دەستوور بفەرموو هەر ئێستا دەڕۆم و ئاوڕ نادەمەوە. ئەگەر پێتخۆش نییە چاوت پێمبكەوێ ئەوا خۆم وا بزر دەكەم ئیتر نەمبینییەوە.

ـ من نامەوێ لە خۆمت بتارێنم.

ڤرۆنسكی بە دەنگێكی لەرزۆكەوە گوتی: هیچ شتێك مەگۆڕە. لێگەڕێ هەموو شتەكان وەك خۆیان بمێننەوە. ئەوەش مێردەكەت.

ڕاست لەوكاتە ئەلكسی ئەلكساندرڤیچ شلوشەوێق و بە كاوەخۆ پێی نایە نێو تەلارەكەوە.

چاوێكی لە ڤرۆنسكی و ژنەكەی كرد و رۆیشت بۆ لای خاتوونی خانەخوێ و لە پەنا مێزی چاییەكە دانیشت و وەك هەمیشە بە دەنگێكی بەرز و خێراخێرا دەستیكرد بە قسەكردن، لەبزی ئاخافتنەكەی گاڵتەئامێزانە بوو و وێدەچوو تیتاڵی بە كەسێك بكات.

چاوێكی لە هەموو حازریان كرد و گوتی: ئێوەش بۆخۆتان كۆڕێكی وەك رامبۆیە[٩١]تان هەیە. گراس و موسیش[٩٢] جمەیان دێ.

بەڵام پرێنسس بێتسی كە خۆی گوتەنی ئەو لەبزە چزوودار و چڕەبزەی ئەلكسی ئەلكساندرڤیچی بەدڵ نەبوو و خانەخوێیەكی زۆر بەهۆشیش بوو، لەرێوە باسەكەی گۆڕی و چووە سەرباسی بابەتێكی زۆر جیددی كە ئەویش خزمەتی ئیجباریی گشتی[٩٣] بوو. ئەلكسی ئەلكساندرڤیچ لە رووی ناچارییەوە هاتە نێو باسەكە و بە شێوەیەكی جیددی دەستی كرد بە لایەنگری لەو یاسا نوێیە. پرێنسس بێتسیش كە دژی ئەو یاسایە بوو بە توندی هەڵیدەكوتا سەری و بە شتێكی خراپی دەزانی.

ڤرۆنسكی و ئانا هەروا لە پاڵ مێزە چكۆلەكەدا دانیشتبوون.

یەكێك لەو ژنانەی لە كۆڕەكەدا بەشداربوو بە چاوی ئاماژەی بە ڤرۆنسكی و ئانا و مێردەكەی كرد و لەبەر خۆیەوە گوتی: ئیتر خەریكە بێتامی دەكەن.

---

٩١- لاماركیز دووڕامبۆیە (Ramboillet (1665 - ١٥٨٨) یەكەم كۆڕی ئەدەبیی لە ماڵی خۆی لە ڕامبۆیە دامەزراند كە شوێنێكی باشی لەسەر زەوق و بیری گشتیی ئەو سەردەمە دانا.

٩٢- گراس (Graces) خوایانی ئەساتیری كە وێنەی دیاری جوانی و دڵڕفێنی بوون و مۆز (Muses) خودا نۆیینەی هونەرەكان بوون.

٩٣- سەرەتای ژانویەی ١٨٧٤ خزمەتی سەربازی ئیجباری لە ڕووسیا كە لە بیست و پێنج ساڵەوە بوو بە شەش ساڵ و بۆ ماوەی سێ ساڵ لە بڵاوكراوەكاندا لەسەری دەدوان هەتا ئاخری مسۆگەر بوو.

هاوڕێ نزیکەکەی ئانا وەڵامی دایەوە: من چیم پێگوتن؟

بەڵام نەك هەر ئەو دوو خاتوونە بەڵکوو هەموو ئەو کەسانەی لە تەلارەکە بوون و تەنانەت پرێنسس میاخکایا و پرێنسس بێتسیش چەند جار چاویان لە ئانا و ڤرۆنسکی کرد کە دوور لە میوانەکان دانیشتبوون، دەتگوت دوور دانیشتنی ئەو دووکەسە بۆتە مێملّی باسەکەیان. تەنیا ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بوو کە تەنانەت بۆ تاقە جارێکیش چاوی لێنەکردن و نەیدەتوانی بۆ ساتێك لەو مشتومڕە خافڵ بێ کە دامەزرابوو.

پرێنسس بێتسی کە تێگەیشتبوو ئەو کردەوەیەی ئانا و ڤرۆنسکی شوێنی لەسەر میوانەکان داناوە لە جێی خۆی هەستا و کورسییەکەی دا بە یەکێك لە میوانەکان کە بتوانێ باشتر گوێ لە قسەکانی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بگرێ و خۆی ڕۆیشت بۆ لای ئانا.

گوتی: من هەمیشە سەرم لە وردبینی و قسەی روونی ئەو مێردەی تۆ سووڕماوە. کاتێك قسە دەکات دژوارترین واتای عالەمی بالّام بۆ روون دەبێتەوە.

ئانا، بزەیەکی کامڕەوا روخساری گەشاندەوە و یەك وشەش لە قسەکانی بێتسی نەگەیشت گوتی: بەڵێ! ـ هەستا رۆیشت بۆ لای میوانەکان کە لە دەوری مێزی چاییەکە دانیشتبوون و بەشداریی لە مشتوومڕەکەیاندا کرد.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ نیو سەعاتێك دانیشت و پاشان هات بۆ لای ژنەکەی و پێشنیاری پێکرد پێکەوە بڕۆنەوە بۆ ماڵێ، بەڵام ئانا بێ ئەوەی چاوی لێبکات گوتی بۆ شێو لەوێ دەمێنێتەوە. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ کە ئەوەی دی کڕنۆشێکی بۆ کۆڕی میوانەکان کرد و رۆیشت.

فایتوونەوانەکەی ئانا کارنینا کە تاتارێکی پیری قەڵەو بوو و باڵتەیەکی کەڵپۆسی بریقەداری لەبەردا بوو، ئەسپە بۆرەکەی لای چەپەی بە زەحمەت لەبەر دەرگاکە بۆ زەوت کرابوو کە لە سەرمانا هەدای نەدەدا و ئۆقرەی لێهەڵگیرا بوو. پێشخزمەتەکە راوەستابوو و دەرگای فایتوونەکەی کردبۆوە. دەرگاوانیش لەوێ راوەستابوو و دەرگای چوونە ژوورەوەی لەسەر گازەرای پشت کردبۆوە. ئانا کارنینا کە تۆڕی سەر قۆڵی کراسەکەی لە قولاپی باڵتەکەی گیرابوو خەریکی لێکردنەوەی بوو سەری داخستبوو و بە چێژەوە گوێی بۆ قسەکانی ڤرۆنسکی شل کردبوو کە بۆ بەڕێکردنی هاتبوو.

دەیگوت: ئێوە هیچ بەڵێنێکتان نەدامێ، قەیناکا، منیش هیچم لە ئێوە ناوێ. خۆشت ئەوە باش دەزانی من پیاوی هاوڕێیەتی نیم. لە ژیانا بۆ من تەنیا یەك بەختەوەری هەیە،

ئەویش شتێکە کە ئێوە پێتان خۆش نییە، لە دەمم بێتەدەرێ... بەڵێ، بۆ من تەنیا ئەوین بوونی هەیە و هیچی تر.

هاوارێك لە ناخییەوە هەڵدەستا و خۆی دەکرد بە گوێچکەیدا «ئەوین...» هەر لە پڕیش، کە تۆڕی دامتەڵەکەی لە قولاپەکە کردەوە بە دەنگێکی بەرز گوتی: گوێ بگرە ئەوەی کە من پێم خۆش نییە ئەو وشەیەت بە دەمدا بێ ئەوەیە کە بۆ من مانایەکی زۆر قووڵی هەیە. گرینگایەتییەکەشی بۆ من زۆر لەوە زیاترە کە ئێوە بیری لێدەکەنەوە ـ ئەوەی گوت و چاوێکی لە چاوی کرد، گوتیشی: بەهیوای دیدار!

تۆقەی لەگەڵ کرد و بە هەنگاوی نەرم و خێرا بەلای دەرگاوانەکەدا تێپەڕی و خۆی خزاندە نێو فایتوونە سەرداپۆشراوەکەوە و لە چاو بزربوو.

نیگای چاوان و گەرمایی دەستی ئانا شوێنێکی ئاگرینی لەسەر ڤرۆنسکی دانا. بەری دەستی خۆی، ئەو شوێنەی کە دەستی ئانای وێکەوتبوو ماچی کرد و گەڕایەوە بۆ ماڵێ. لەوەی کە بەو تاقە شەوە زیاتر لە دوو مانگی رابردوو لە ئامانجەکەی نزیکبووبۆوە شاد و دڵخۆش بوو و پێی وەعەرز نەدەکەوت.

## هەشت

بە بڕوای ئەلکساندرڤیچ دانیشتنی ژنەکەی لەگەڵ ڤرۆنسکی لەسەر مێزێك کە ئاوا بە گەرموگوڕی پێکەوە قسەیان دەکرد و ئاگایان لە دورووبەری خۆیان نەمابوو شتێکی نائاسایی نەبوو و بەشتێکی ناحەز و نەشیاوی نەدەزانی، بەڵام کە تێگەیشت ئەو کارە لە روانگەی میوانەکانەوە شتێکی ناحەز بووە، ئەویش پێیوابوو کارێکی باش نییە و بە پێویستی زانی کە لەوبارەوە قسە لەگەڵ ژنەکەی بکات.

کاتێك گەیشتەوە ماڵێ، بەپێی عادەتی خۆی رۆیشت بۆ نووسینگەی کارەکەی و لەسەر کورسییەکی نەرم دانیشت و دەستیدا کتێبێك کە سەبارەت بە پاپپەرەستی بوو و کاردی لاپەڕە هەڵدانەوەی بۆ دیاریکردن خستبووە بەینی کتێبەکەوە، لێکیکردەوە و هەتا ئەو کاتەی کە عادەتی بوو بۆ موتاڵا دانیشت. تەنیا جارجارێك دەستێکی بە نێوچاوانە پانەکەی خۆیدا دەهێنا و سەری دەلەقاند. دەتگوت دەیهەوێ خەیاڵێك لە زەینی خۆی دوور بخاتەوە. لە کاتی

دیاریکراودا هەستا و وەکوو هەموو شەوانی تر دەستیکرد بە خۆشۆردن. ئانا ئارکادیۆڤنا هێشتا نەهاتبۆوە. کتێبەکەی نایە بن هەنگڵی و بە قاڵدرمەکاندا وەسەرکەوت، بەڵام ئەمشەو بەجێی بیر و خەیاڵی شەوانەی و سەرقاڵ بوون و بیرکردنەوە لە کاروباری ئیدارەکەی، فکر و زەینی لای ژنەکە بوو و بیری لەو رووداوە تاڵە دەکردەوە کە ژنەکەی خەریکبوو دەیقەوماند. بەپێچەوانەی عادەتی خۆی نەچووە سەر پێخەفەکەی راکشێ. دەستی لە پشتەوە هەڵپێکا و دەستی کرد بە راوێچکە کردن لە نێو ژوورەکەدا. نەیدەتوانی بخەوێ چونکە بەپێویستی دەزانی بەر لە خەوتن سەبارەت بەو مەسەلە تازەیە کە رووی دابوو بیر بکاتەوە.

کاتێك کە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بڕیاریدا قسە لەگەڵ ژنەکەی بکات مەسەلەکەی زۆر بەلاوە سووك و ئاسان بوو، بەڵام ئێستا کە دەستی کرد بە بیرکردنەوە، ئەو بارودۆخە تازە زۆر بە لایەوە پێچەڵاوپووچ و دژوار بوو.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ خانەگومان نەبوو. بە بڕوای ئەو دڵپیسی کردن لە ژنەکەی چەشنێك سووکایەتی پێکردن بوو. لەو بڕوایەدابوو کە ژنەکەی شایانی ئەوەیە متمانەی پێبکا و دڵی لێی کرمۆڵ نەبێ. ئەوەش کە بۆ دەبێ متمانەی پێبکات و لێی روون بێ کە ژنەکەی هەمیشە خۆشی دەوێ و خەیانەتی پێناکات، پرسیارێك بوو کە لە خۆی دەکرد. هەر ئەوەی کە خانەگومان نەبوو، ناچاربوو متمانەی پێبکات و بە خۆی دەگوت کە متمانە کردنەکەی زۆر بەجێیە، بەڵام ئێستا ئەگەرچی لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە دڵپیسی کارێکی شوورەییە و متمانەکردن بە هاوسەر ئەرکی سەرشانە و بەموو لەو باوەڕەی لانەدابوو، هەستی دەکرد لە هەمبەر مەسەلەیەکی بێ مانادا گیری خواردووە کە مەنتیق لەوێدا هیچ پێگەیەکی نییە و هەرچی سەری دەهێنا و دەبرد نەیدەزانی چ بکا. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لەگەڵ ژیان تێکەوتبوو، وێدەچوو خۆشەویستیی کەسێك جگە لە خۆی لە دڵی ژنەکەیدا سەر هەڵبدا و هەر ئەوەش بەلای ئەوەوە شتێکی نەگونجاو بوو و نەیدەتوانی تێبیگات چونکە ژیان راست ئەوەبوو. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ هەموو تەمەنی لە چوارچێوەی فەرمانگەدا ژیابوو و بە کاروباری دایرەوە سەرقاڵ بوو و بەردەوام لەگەڵ کێشە و گرفتەکانی ژیان رایبواردبوو. هەرجارێك کە راستەوخۆ لەگەڵ راستییەکانی ژیان تێکەوتبوو خۆی لێ لادابوو. ئێشتاش وەك کەسێك دەچوو کە خاترجەمانە بەسەر پردێکدا دەڕوا کە ژێرەکەی هەڵدێر و هەزار بە هەزارێکە و لە ناکاو پردەکە دەڕووخێ و ژێرپێی خاڵی دەبێ. ئەو تەنگژەیە ناوی ژیان بوو، پردەکەش ژیانێکی ناڕاستەقینە بوو کە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ هەتا ئەو رۆژە خۆی پێهەڵخەڵەتاندبوو. یەکەم

جار بوو بیری لەوە دەکردەوە کە ژنەکەی حەز لە کەسێکی تر بکات و ئەو حاڵەش تووشی ترس و خەم و دڵەخورپەی کردبوو.

جلوبەرگی دانەکەندبوو و نەرم و لەسەرەخۆ لە ژووری نانخواردنەوە کە تەنیا چرایەکی تێدا دەگڕا و تەختەبەندی تەرکی ژوورەکە لەژێر پێیدا تەقەی دەهات هەنگاوی دەنا و دەچووە سەر فەرشی نەرمی تەلاری میوانداری کە تاریك بوو و تەنیا شەبەقی شووشەی ئەو قەتحەیە تۆزێك رووناکی کردبۆوە کە شۆقی چرای ژووری نانخواردنی لێدرابوو و وێنە تازەکەی خۆی تێگیرابوو و بە دیواری سەروو قەنەفەکەوە هەڵواسرابوو، لەوێوە بە ژووری ژنەکەیدا دەڕۆیشت کە دوو مۆمی لێداییسا و وێنەی خزموکەسان و دۆستانی نزیکی و کەلوپەلی جوان و زەریفی سەر مێزەکەی رووناك دەکردەوە کە لە زووەوە هەمووویانی دەدی و بۆی ئاشنابوون، لەوێشەوە هەتا بەردەرگای ژووری خەوەکەیان دەڕۆیشت و دەگەڕایەوە.

هەرجارێك کە ئەو مەودایەی دەپێوا، ماوەیەك لەسەر تەختەبەندی تەرکی وەتاغی نانخواردن رادەوەستا و لەبەرخۆیەوە دەیگوت «بەڵێ، حەتمەن دەبێ ئەو مەسەلەیە روون بکەمەوە و کۆتایی پێبێنم. حەتمەن دەبێ بیروڕا و بۆچوونی خۆمی لەوبارەوە پێبڵێم.» لەپڕ وەردەسووڕا و کە دەگەیشتە هۆڵی میوانداری و هێشتا شێواو و بێئۆقرە بوو و لە دڵی خۆیدا دەیگوت «بەڵام چ بکەم ئاخەر؟ چۆن ئەوەی لە دڵمدایە پێیبڵێم؟» کاتێکیش دەگەیشتە ژووری ژنەکەی و دیویست بگەڕێتەوە دیسان دەیگوت «بەڵام کە بیری لێدەکەمەوە، نازانم بڵێمچی، مەگین چبووە؟ چی قەوماوە؟ هیچ. لەگەڵ ڤرۆنسکی قسەی کردووە. با قسەی کردبێ چییە. لە کۆڕەکاندا مەگین ژنان کەم لەگەڵ پیاوان قسە دەکەن؟» کە جارێکی تر دەچووە ژووری ژنەکەی دەیگوت: «جگە لەوەش، دڵپیسی و خانەگومانی، دەبێتە هۆی ئەوەی خۆم و ژنەکەم سووك بین.» بەڵام ئەم داوەرییە کە لە رابردوودا زۆر بەلایەوە گرینگ بوو ئێستا ئیتر باری دڵی سووك نەدەکرد و بەلایەوە زۆر شتێکی بێ مانا بوو. لە دەرگای ژووری خەوەکەوە دیسان گەڕایەوە بۆ هۆڵی میوانداری. هەر لەگەڵ پێی دەنایە ژووری تاریکی نانخواردن بانگێك لە ناخەوە پێیدەگوت وانییە، بەوەدا کە هەمووان تێگەیشتوون و بەو مەسەلەیان زانیوە، وێدەچێ شتێك هەبێ. ئەو قوتەقوتەی میوانەکان لەخۆڕا نەبوو. دیسان لە ژووری نانخواردن بەخۆی دەگوت «نا، هەرچۆنێکە دەبێ لایەکی بە لایەکدا بخەم و کۆتایی بەو کێشەیە بهێنم. دەبێ ئەوەی لە دڵمدایە پێیبڵێم...» بەڵام دیسان لە هۆڵی میوانداری، کاتی گەڕانەوە لە خۆی دەپرسی «چۆنی پێبڵێم؟» دیسان دەیپرسی مەگین چی قەوماوە؟ وەڵامی خۆشی دەدایەوە، هیچ،

وەبیریشی دەهاتەوە کە دڵپیسی جگە لە چکۆڵە کردنەوە و سووکایەتیکردن بە ژنەکەی هیچ ئاکامێکی تری نییە و دیسان لە تەلاری میوانداری بیری دەکردەوە کە بارودۆخەکە گۆڕاوە. لەسەریەك واکەوتبووە گێژەنی فکر و خەیاڵەوە سەری لێبووبووە ماش و قوونی لێبووبووە ئاش. بیر و خەیاڵیشی وەك جەستەی بەردەوام مەودایەکی بەستراوی دەپێوا و بە هیچ کوێ نەدەگەیشت. بۆی دەرکەوت کە تەنیا خۆی ئازار دەدا و لە جەغزێکی تاریکدا هەڵدەسووڕێ، بۆیە دەستێکی بە نێوچاوانی خۆیدا هێنا و لە ژووری ژنەکەی دانیشت. لەوێ کە چاوی بە سیشوارێکی دەسك مەڕمەڕی کەوت و یادداشتێکی ناتەواوی دی لە پەنای داندرابوو دیسان بیروڕای گۆڕا و گێژەنی خەیاڵ بەرەو ناخی خۆی لوولی دایەوە. بیری لە ژنەکەی دەکردەوە و ئەوەی لە مێشك و دڵیدایە. بۆ یەکەم جار بوو ژیانی تاکەکەسی و بیرۆکە و کەلوپەلی ژنەکەی بە روونی و زیندوو لەبەرچاوی بوون و بیری ئەوەی کە ژنەکەی لەوانەیە و تەنانەت شتێکی سروشتیشە کە ژیانێکی تایبەت بەخۆی هەبێ، بۆیە هێندەی بەلاوە ناخۆش بوو کە بەپەلە ئەو فکر و خەیاڵەی لەسەری خۆی دەرهاویشت. ئەمە راست ئەو گێژەنە بوو، کە چاوی لە ناخی دەکرد لەترسانا دەلەرزی. نەیدەتوانی لەبیر و هەستیدا خۆی لە جێگەی کەسێکی تر دانێ. خووی بەوجۆرە کێشە و ئاریشە زەینییانە نەگرتبوو، ئەو بیر و خەیاڵە زەینی و رۆحییانەی بە شتێکی زیانبار و مەترسیدار دەزانی.

لە دڵی خۆیدا دەیگوت: «لە هەمووشی ترسناکتر و تاڵتر ئەوەیە کە هەموو ئەوانە راست ئێستا کە خەریکە کارەکەم بە ئاکام دەگات. (مەبەستی گەڵاڵەیەك بوو کە خەریکی وەبەرهێنانی بوو) تووشم بووە. ئێستا کە پێویستم بە هێمنایەتییەکی تەواو و هەموو توانا زەینییەکانی خۆم هەیە ئەم پەرۆشی و خەیاڵە بێ مانایە خەریکە وەك بەڵایەك ئاوقام دەبێ. بەڵام چ بکەم؟ من لەو کەسانە نیم کە لەژێر باری پەرۆشی و هەیەجاندا چۆك دادەدەن و غیرەتی ئەوەیان نییە بەرەوڕووی ببنەوە.»

بە دەنگێکی بەرز گوتی: من دەبێ لەسەر ئەو مەسەلەیە هەڵوەستە بکەم و کۆتایی پێبێنم و لە خۆمی دوور خەمەوە.

پاشان بەخۆی گوت: «من کارم بەسەر هەست و خەیاڵی و ئەوەی لە رۆحی ئەودا دەگوزەرێ یان رەنگە بگوزەرێ نییە. ئەوە پێوەندیی بە ویژدانی ئەوەوە هەیە، پێوەندیی بە ئایینی ئەوەوە هەیە.» کە ئەوەی گوت لە ناخەوە هەستی بە ئۆخژنێکی رۆحی کرد چونکە پاڵەوپشتێکی گونجاوی دۆزیبۆوە کە کێشە و گرفتەکانی لەودا دەدی.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بەخۆی گوت: «کەوایە ئەو مەسەلانەی پێوەندیی بە هەستی ئەوەوە هەیە، ئەوانە شتێکن کە پێوەندییان بە ویژدانی ئەوەوە هەیە و من مافی ئەوەم نییە خۆی تێوەردەم. ئەرکی من بە روونی دیارە. من بەرپرسی بنەماڵەم و دەبێ ڕێنوێنی بکەم، لەوبارەشەوە هەتا رادەیەك بەرپرسم، ئەرکی من ئەوەیە ئەگەر مەترسییەکم هەست پێکرد ئاگاداری کەمەوە، وریایی پێبدەم و ئەگەر پێویست بوو ناچاری بکەم یاسا و رێسای باوی کۆمەڵگا نەنێتە ژێرپێ. ئەرکی من ئەوەشە کە بە روونی و بێ پەردە قسەی لەگەڵ بکەم.»

ئەوەی کە دەبوو لەگەڵ ژنەکەی بیهێنێتە گۆڕێ بە روونی لە زەینیدا جێیگرتبوو. لەگەڵ ئەوەشدا سەبارەت بەو مەسەلەی کە دەبوو لەگەڵ ژنەکەی باسی بکات کەوتبووە فیکرەوە، بەداخیش بوو لەوەی کە دەبێ کات و وزەی فیکری خۆی، ئەگەرچی وەبەرچاویش نەدەهات، بۆ کاروباری بنەماڵەی سەرف بکات. لەگەڵ ئەوەشدا، شێوە و ریزکردنی ئەو زنجیرە بابەتانەی کە دەیویست وەك مژولیایش بۆ ژنەکەی بەیان بکات بە روونی و بە وردی وەك راپۆرتێکی فەرمی لە زەینییدا جێی گرت: «من دەبێ ئەو بابەتانەی پێبڵێم و بە روونی پێداگریی لەسەر بکەم، سەرەتا دەبێ گرینگایەتیی بیروڕای خەڵك و کردەوەی گونجاو و شیاوی کۆمەڵگای بۆ روون بکەمەوە، دووهەم دەبێ مانای ژنومێردایەتیی لە روانگەی ئایینەوە بۆ بەیان بکەم، سێهەم دەبێ بەپێی پێویست پێی بسەلمێنم کە ئەو بارودۆخە لەوانەیە ئاکامێکی خراپی هەبێ بۆ کوڕەکەمان. چوارەم دەبێ بیدەم بە گوێیدا کە لەوانەیە بۆخۆشی تووشی ئاکامێکی تاڵ و نالەباربێ.» پاشان پەنجەکانی لێك هەڵپێکا و بەری دەستی بەرەو خوارەوە گێڕا، گوشاری بۆ قامکەکانی هێنا و جومگەکانی پەنجەی تەقاند.

ئەو کارە، یانی لێکهەڵپێکانی پەنجەی و تەقاندنی جومگەکانی، عادەتێکی خراپ بوو کە هەمیشە دەبووە هۆی هێوربوونەوەی و هەروەها رووناکی و وردبینییەك کە ئێستا زۆری پێویستی پێی هەبوو کە بیگێڕێتەوە بۆ زەینی، تەقوکوتی عارەبانەیەکی کەوتە بەرگوێ کە لە دەرگای ماڵەکەیان نزیك دەبۆوە. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لە نێوەڕاستی تەلاری میوانداریی‌یەکە راوەستا.

ترپەی هەنگاوێکی ژنانەی هاتە گوێ کە بە قالدرمەکاندا وەسەر کەوت. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ ئامادە راوەستابوو کە ئەوەی لە دڵیدایە هەڵیڕێژێ. پەنجەکانی لێك هەڵپێکابوو و گوشاری بۆ دێنان تاکوو بزانێ جومگەیەکی ماوە بیتەقێنێ. جومگەیەکی تری تەقەی لێوەهات.

لەگەڵ بیستنی ترپەی سووکی هەنگاو، هەستیکرد ژنەکەی نزیك دەبێتەوە و ئەگەرچی زۆر لەو وتارە رازی بوو کە ئامادەی کردبوو بەڵام ئەو دیدارە هەتا رادەیەك ترسی خستبووە دڵییەوە.

## نۆ

ئانا سەرداخستوو مەنگۆڵەی کلاوەکەی دەلەرینەوە و وردە وردە دەهاتە پێشێ و تروسکەیەکی رووناك لەسەر روخساری دەدرەوشایەوە. بەڵام ئەو تروسکەیە شادیی پێوە نەبوو، لە رووناکایی ترسناکی سووتمانێك دەچوو لە شەوی ئەنگوستەچاودا. کاتێك چاوی بە مێردەکەی کەوت سەری هەڵێنا و گرژییەوە، دەتگوت تازە لە خەو راچەنیوە.

کلاوەکەی لەسەری داگرت و بێ ئەوەی راوەستێ بەرەو ژووری ئاڕایشتەکەی خۆی سەری پێوەنا و گوتی: تۆ هێشتا نەخەوتووی؟ سەیرە! ـ لە پشت دەرگاکەوە گوتیشی: شەو درەنگە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ!

ـ ئانا، من دەبێ قسەت لەگەڵ بکەم.

ئانا لە ژووری ئاڕایشتەکەی هاتەدەرێ و بە سەرسووڕمانەوە پرسیی: لەگەڵ من؟

ـ بەڵێ!

ئانا دانیشت و پرسیی: چبووە؟ سەبارەت بەچی؟ دەیباشە ئەگەر دەزانی گرینگە، قسە بکە، بەڵام بریا بخەوتایەین.

ئانا بە راست و چەپ دەیپرست و کە بیری لە قسەکانی خۆی دەکردەوە سەری سووڕمابوو کە ئاوا توانایی درۆکردنی هەیە. قسەکانی ئاسایی بوون و لەبز و راوێژیشی سروشتی، ئەی ئەوەی کە پێویستی بە خەوە چی دەنوێنێ؟ هەستی دەکرد درۆ وەك زرێیەکی پۆلایین دەیپارێزێ. هەستی دەکرد کە وزەیەکی نادیار یارمەتیی دەدات و پشتیوانیی لێدەکات.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ گوتی: ئانا، دەبێ وریاییت پێبدەم.

ـ وریایی؟ بۆچی؟

سەرنجی هێندە ساکار و شادانە بوو کە ئەگەر جگە لە مێردەکەی کە زۆر چاکی دەناسی، کەسێکی تر گوێی لە قسە و راوێژی ئاخافتنی بوایە هیچ شتێکی نائاساییی تێدا بەدی

نەدەکرد. بەڵام بۆ ئەو کە زۆر چاك لە خووخدەی ژنەکەی دەگەیشت و دەیزانی ئەگەر پێنج دەقیقە درنگتر لە وەختی خۆی بچێتە سەرجێ خەوەکەی، ئانا تێدەگا و هۆیەکەی لێدەپرسێ، بۆ ئەو کە دەیزانی ژنەکەی هەمیشە ئەو لە شادی و چێژ و خەمی خۆیدا دەکاتە شەریك، کەچی ئێستا دەیدی بە پێچەوانەی هەمیشە نایهەوێ لە حاڵوباڵی ئەو بگات و باسی حاڵ و بارودۆخی خۆشی بۆ ناکات" بۆیە بۆی دەرکەوتبوو کە وەزعێکی نائاسایی و ماناداری هەیە. دەیدی قووڵایی رۆحی ژنەکەی پەردەیەکی ئەستووری وەسەر کێشراوە و وەك جاران بە روونی نایبینێ. لەوەش گرینگتر ئەوەبوو بە لەبز و راوێژی قسەکردنەکەیدا بۆی دەرکەوتبوو کە ژنەکەی بەبێ شەرموشکۆ شووی لێهەڵکێشاوە و بە راشکاوی دەیهەوێ پێێبڵێ «نهێنی هەیە، بابێ، هەر دەبێ ببێ و لەمەبەدواوەش هەر دەبێ.» هەستی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ ئێستا وەك هەستی کەسێك وابوو کە دێتەوە بۆ ماڵێ و دەبینێ دەرگای ماڵێی لێداخراوە. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لەبەر خۆیەوە گوتی «رەنگە هێشتاش بتوانم کلیلەکەم بدۆزمەوە.»

بە لەبزێکی ئارام گوتی: من دەمویست وریاییت پێبدەم کە لەوانەیە بەو کەمتەرخەمی و خۆ نەپاراستنەت بیانوو بدەیە دەست خەڵکی کە پاشملە باست بکەن. ئەمڕۆ قسەکردنت لەگەڵ کۆنت ڤرۆنسکی (ئەو ناوەی بە لەبزێکی قایم و ئارام و دانار دانار درکاند) سەرنجی کۆڕەکەت بۆ لای خۆت راکێشابوو.

ئەو قسانەی دەکرد و چاوی لە چاوە پڕ بزەکانی ئانا بڕیبوو کە ئێستا شاراوە بوونیان لە بن پەردەی نهێنیدا لەبەر چاوی ترسناك دیاربوون و هەستی بە بێحاسڵبوونی قسەکانی خۆی دەکرد.

ئانا بە لەبزێك کە دەتگوت لە مانای قسەکانی ئەو ناگات و بە قەستی تەنیا لە دوایین وتەی ئەو گەیشتووە، وەڵامی دایەوە: تۆ ئەوە پیشەی هەمیشەییتە. هێندێ جار لەوە قەڵسی کە تاقەتم نییە و ماتم. هێندێ جاریش لەوە تووڕەی کە کەیفم سازە و قاقا دەکێشم. ئەمڕو کەیفساز بووم و وادیارە هەر ئەوەش تۆی زویر کردووە.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بە بیستنی ئەو قسەیە داچڵەکی و دیسان پەنجەی لێك هەڵپێکایەوە تاکوو جومگەکانی بتەقێنێ.

ئانا گوتی: ئەە، تۆخوا قامکت مەتەقێنە، زۆرم پێناخۆشە.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ تۆزێ گوشاری بۆخۆی هێنا و دەستی لێك بڵاوکرد و لەسەرخۆ گوتی: ئانا، ئەوە تۆی ئاوا قسە دەکەی؟

ئانا بە سەرسووڕمانێکی زۆر سادقانە و پێکەنینییەوە گوتی: تێناگەم، دەتەوەێ بڵێیچی؟ چیت لە من دەوێ؟

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ تۆزێ بێدەنگ بوو و دەستێکی بە ناوچاوان و چاوی خۆیدا هێنا. دیتی بەجێی ئەو شتەی کە لە دڵیدابوو، یانی وریایی پێدانی سەبارەت بەو شتەی کە کۆمەڵگا بە شتێکی نەشیاوی دەزانێ، خەریکە سەبارەت بە مەسەلەی پێوەندیدار بە ویژدانی ژنەکەیەوە دەدوێ و بێ ئەوەی بیهەوێ تووشی هەیەجان بووە و دیوارێکی خەیاڵی لە هەمبەر خۆیدا هەست پێدەکات.

زۆر لەسەرەخۆ و بە خوێنساردی گوتی: تکات لێدەکەم هەتا کۆتایی گوێ بۆ قسەکانم رادێرە. دەزانم دڵپیسی و خانەگومانی هەستێکی ناحەز و سووکوچرووکانەیە و قەت ئیزن بەخۆم نادەم کە ئەو هەستە بەسەر کردەوەمدا زاڵبێ، بەڵام هەڵسوکەوتی شیاو لە کۆمەڵگادا رێسایەکی هەیە کە لاریکردن و خۆلادان لەو رێسایە ئاکامێکی ناحەز و نەشیاوی هەیە. ئەمشەو نەك هەر بە ئەقڵ و بۆچوونی خۆم، بەڵکوو بەو شوێن و کاردانەوەیەدا کە کردەوەی تۆ لەسەر کۆڕەکەی دانا، بۆم دەرکەوت کە ئەو کارەی تۆ بە هیچ شێوەیەك ئەوە نەبوو کە کۆڕەکە چاوەڕوانییان دەکرد.

ئانا شانی هەڵتەکاند و گوتی: من تێناگەم ـ لە دڵی خۆیدا گوتی: «چاك و خراپ بوونی هەڵسوکەوتی من بۆ ئەو گرینگ نییە، بەڵام چونکە خەڵکی زانیویانە ئاوا تووشی نیگەرانی بووە.» گوتی: ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ، وادیارە حاڵت تێکچووەـ هەستا و بەرەولای دەرگاکە ملی پێوەنا، بەڵام مێردەکەی وەك ئەوەی بیهەوێ بەر بە رۆیشتنی بگرێ وەدوای کەوت.

ڕوخساری ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ گرژ و ناحەز بوو، ئانا قەت بەو شێوەیە نەیدیبوو. راوەستا و تۆزێ ملی وەرسووڕاند و دەستیکرد بە لێکردنەوەی درزیلەکانی قژی. گوتی: هەرچیت پێخۆشە بیڵێ، ئەوە گوێم شل کردووە. زۆر بە وردیش گوێ رادەگرم چونکە پێم خۆشە بزانم مەسەلە چییە.

ئەوەی گوت و لەو لەبز و راوێژە ئاسایی و لەسەرەخۆ و پڕمتمانەیەی خۆی و ئەو وشانەی هەڵیدەبژارد سەری سووڕمابوو.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ گوتی: من مافی ئەوەم نییە خۆ لە هەست و خواستە دەروونییەکانی تۆ وەردەم و ئەو کارەش بە شتێکی ناحەز و زیانبار دەزانم. ئێمە کاتێك رۆحی خۆمان دەپشکنین شتیوا دەبینینەوە کە واباشتر بوو هەروا لە قووڵایی رۆحدا بە شاراوەیی

بێننەوە. خواست و هەستی تۆ پێوەندیی بە ویژدانی خۆتەوە هەیە، بەڵام لە هەمبەر تۆ و خۆمدا و لە بەردەم خودادا بە ئەرکی سەرشانمی دەزانم کە ئەرك و تەکلیفەکانت بۆ روون بکەمەوە و تێتبگەیێنم ژیانی من وتۆ پێکەوە پێوەند دراوە و ئەو پێوەندەش خودا بەستوویێتی و دەستی مرۆڤی تێدا نییە. شکاندنی ئەو پێوەندییەش تاوانێکی گەورەیە و تاوانی واش سزاکەی زۆر قورس و گرانە.

ئانا گوتی: تێناگەم. ئاە خودایەگیان، بۆ بەدبەختی هێندەش شەکەتم خۆم بە پێوە ناگرم ـ کە ئەوەی گوت بە گورجی دەستێکی بە قژیدا هێنا و لەو دەرزیلانە دەگەڕا کە بە بسکییەوە مابوون.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لەسەرەخۆ گوتی: ئانا، تۆ ئەو خودایەی خۆشت دەویٚ ئاوا قسە مەکە. رەنگە بەهەڵە چووبێتم، بەڵام بڕوام پێبکە ئەوەی دەیلێم، بەخۆم و بە تۆی دەڵێم، بە هەردووکمان. من مێردی تۆم، خۆشم دەوێی.

ئانا ساتێك سەری داخست و بڵێسەی گاڵتە لە چاویدا کووژایەوە. بەڵام دەستەواژەی «خۆشم دەوێی» دیسان خستییە سەر هەوای سەرەڕۆیی. لە دڵی خۆیدا گوتی: «خۆشم دەوێی؟ ئاخەر ئەو کوا دەتوانیٚ کەسێکی خۆش بویٚ؟ ئەگەر ئەو وشەیەی لە خەڵکی نەبیستبایە تەنانەت نەیدەزانی بەکاریشی بێنیٚ. خۆ ئەو هەر نازانیٚ، عەشق و خۆشەویستی چییە.»

گوتی: ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ، من هەر بەڕاستی تێناگەم باسی چی دەکەی. روونتر پێمبڵیٚ چیت دیوە وا...

ـ پەلە مەکە، راوەستە با قسەکەم تەواوبکەم. من تۆم خۆش دەویٚ. بەڵام من لەبەر خۆم پێت ناڵێم. لە هەموو شتێك گرینگتر کوڕەکەمانە و پاشان خۆت. دووپاتی دەکەمەوە، رەنگە قسەکانی من نابەجیٚ و بێبنەما بن و من تووشی هەڵە بووبێتم. ئەگەر وابیٚ داوای لێبووردنت لێدەکەم. بەڵام ئەگەر هەست دەکەی کە رەنگێکی زۆر کەم لە راستی لە قسەکانمدا هەیە تکات لێدەکەم بیری لێبکەوە و ئەگەر بە دڵ ویستت، خۆ لە راستی لامەدە و پێمبڵیٚ...

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بیٚ ئەوەی خۆی بیهەویٚ قسەی دەکرد و قسەکانیشی هیچی ئەوانە نەبوون کە ئامادەی کردبوون.

ئانا لەناکاو وەقسە هات و بە بزەیەك کە بەزەحمەت دەیتوانی بیشارێتەوە، بە توندی گوتی: من هیچ قسەیەکم نییە پێتی بڵێم. ئیتر شەو درەنگە بخەوین زۆر چاکترە.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ تەنیا هەناسەیەکی هەڵکێشا و ئیتر متەقی نەکرد و بەرەو ژووری خەوەکەیان وەڕێکەوت.

کاتێك ئانا چووە ژووری خەوەکە مێردەکەی لەسەر جێگاکەی خەوتبوو و لۆچێکی سەخت لەسەر لێوە قووچاوەکەی دیاربوو. ئانا چووە سەر جێگاکەی خۆی و سات لەدوای سات چاوەڕێبوو دیسان مێردەکەی دستبکاتەوە بە قسەکردن. لە لایەکەوە پێی خۆش بوو قسە بکات، لە لایەکیشەوە لێیدەترسا. بەڵام کارنین متەقی لە خۆی بڕیبوو. ئانا ماوەیەکی زۆر جووڵەی لە خۆی بڕی و چاوەڕوان ما، بەڵام وردەوردە لەبیری بردەوە. دڵی ڕۆیشت بۆ لای ئەوی تر و هێنایە بەرچاوی خۆی، هەستی دەکرد دڵی لەگەڵ ئەوەدا کە بیر لە ئەو دەکاتەوە هەیەجان و شادییەکی پڕ لە تاوانیش خستوویەتە کوڵوکۆ. لەناکاو پرخەی نەرم و پەیتاپەیتای مێردەکەی بەرزبۆوە. سەرەتا ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ وەك ئەوەی لە پرخەی لووتی خۆی ترسابێ، ساتێك بێدەنگ بوو. بەڵام بە ماوەی دوو هەناسەکێشان راوەستا و لووتی دیسان پرخوهۆری نەرم و پەیتا پەیتای دەست پێکردەوە.

ئانا بە بزەیەکەوە و لەبەرخۆیەوە گوتی: درەنگە، شەو زۆر درەنگە- ماوەیەکی زۆر بێجووڵە راکشا، دەتگوت بریقەی چاوی خۆی لەو تاریکییەدا دەبینێ.

## دە

لەو شەوەوە ژیانی کارنین و ژنەکەی کەوتە سەر ڕێچکەیەکی تازە. هیچ ڕووداوێکی تایبەتیش نەقەومابوو. ئانا وەك جاران هاتوچۆی کۆڕی ئەشراف و لە هەموویان زیاتر ماڵی پرێنسس بێتسیی دەکرد و لە هەموو شوێنێك چاوی بە ڤرۆنسکی دەکەوت. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ هەموو ئەوانەی دەدی بەڵام هیچی لە دەست نەدەهات. هەرجارێك هەوڵی دەدا ژنەکەی قسەی دڵی بکات و بۆی ڕوون بکاتەوە بەڵام بەداخەوە دیواری بەرینی سەرسووڕمان و پێکەنینی ئانا لەبەر دەمیدا شین دەبوو. لە ڕواڵەتدا هەموو شتێك وەك رابردوو وابوو بەڵام لەڕاستیدا نێوانەکەیان بە تەواوی سارد بووبۆوە و گۆڕابوو. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ کە لە بواری کاروباری دەوڵەتیدا ئاوا بەهێز و سەرکەوتوو بوو لەم بوارەیاندا خۆی زۆر بە بێهێز و شکستخواردوو دەزانی. وەك گایەك کە بەرەو قەسابخانە رایکێشن، سەری تەسلیمی داخستبوو و چاوەڕێبوو ساتۆری قەساب لەسەر ملی وەسەماکەوێ. هەرجارێك کە ئەو بیرە مێشکی دادەگرت هەستی دەکرد دیسان دەبێ هەوڵی خۆی بدات. پێیوابوو بە نەرمی و مێهرەبانی و

ئامۆژگاری دەتوانیٚ نەجاتی بدات و یارمەتیی بدات کە وەخۆ بیٚتەوە و هەموو رۆژیٚ خۆی ئامادەدەکرد کە قسەی لەگەڵ بکات بەڵام هەرجاریٚك کە دەهات لەگەڵی بدویٚ هەستی دەکرد کە ئەو رۆحە ناپاك و فریودەرەی کە ژنەکەی کردۆتە دیلی خۆی بەسەر ئەویشدا زاڵ بووە و ئەو قسانەی کە ئامادەی دەکرد و لە زەینی خۆیدا تاوتوۆیی دەکرد بە هیچ کلۆجیٚ بۆی نەدەهاتە سەر زمان و نەیدەزانی لەوبارەوە لە ئەلفەوە بیٚتە بیٚ. بۆیە لەبز و راویٚژی بیٚ ئیختیار رەنگی گاڵتەی بەخۆیەوە دەگرت و دەبووەوە بە لەبزە ئاساییەکەی خۆی، گاڵتە و تیتاڵییەکەشی بەرەوڕووی کەسیٚك دەکردەوە کە قسەی وابکات. هەر بۆیە نەدەکرا بەو لەبزە ئەوەی لە دڵیدابوو دەربڕیٚ.

## یازده

ئەوەی کە بە ماوەی ساڵیٚکی رەبەق ئاواتی ڤرۆنسکی بوو و جیٚگای هەموو حەز و ئارەزووەکانی گرتبۆوە، ئەوەی بۆ ئانا خەونیٚکی ترسناك بوو، هەروەها پیٚی وا بوو گەیشتن بە بەختەوەری مەحاڵە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کە ترسناك بوو، فریودەریش بوو، وەڕاست گەڕا. ڤرۆنسکی بە رەنگی هەڵبزڕکاو و چەناگەی لەرزۆکەوە لە ژوورسەری ئانا دانەویبۆوە و لەبەری دەپاڕایەوە کە لەسەرخۆ بیٚت ئەگەرچی خۆشی نەیدەزانی چلۆن دەکریٚ لەسەرەخۆ بیٚ.

بە دەنگیٚکی لەرزۆك دەیگوت: ئانا، ئانا! تۆ ئەو خودایە...

بەڵام هەرچەندی ڤرۆنسکی زیاتر دەنگی هەڵدیٚنا ئانا بەپیٚچەوانەی ئەو زەمانەی کە شاد و لەخۆبایی و لووتبەرزبوو، ئیٚستا بیزار و شەرمەزار خۆی مات کردبوو و جارلەگەڵجار زیاتر دادەنەوییەوە، تا وای لیٚهات لەسەر قەنەفەکە هیٚندە بۆ پیٚشەوە نووشتایەوە بە سەرەوە کەوتە بەرپیٚی ڤرۆنسکی و ئەگەر ئەو نەیگرتایەتەوە دەمەوڕوو دەکەوت بەسەر فەرشەکەدا.

هەردوو دەستی ڤرۆنسکی بە سینگییەوە دەگوشی و بە گریانەوە دەیگوت: خودایە گیان تۆبە! خوداگیان!

ئەوەندە خۆی بە تاوانبار دەزانی و پیٚیوابوو تووشی تاوانیٚکی رەش بووە کە چاری نەبوو جگە لەوەی خۆی بە سووکوچرووك بزانیٚ و داوای لیٚبوردن بکات: لە ژیانیشدا جگە لە ڤرۆنسکی هیچ کەسی بۆ نەمابۆوە، بۆیە لەبەری دەپاڕایەوە و داوای لیٚبوردنی لیٚدەکرد. کە

چاوی لە ئەو دەکرد زیاتر هەستی بە سووکی و چرووکی خۆی دەکرد و ئیتر زمانی لە گۆ دەکەوت. بەڵام ڤرۆنسکی حاڵی قاتلێکی بوو کە لەسەر تەرمی کووژراوەکە راوەستابێ. ئەوەی بە دەستی ئەو گیانی لەدەست دابوو عەشقی ئەوان بوو، قۆناخی یەکەمی دلّدارییەکەیان بوو. کاتێك وەبیری دەهاتەوە کە ئەم شەرمەزارییە بەهۆی چییەوەیە لە دلّی خۆیدا هەستی بە ترس و نەفرەت دەکرد. ئانا لەبەر رووتەڵبوونی رۆحی خۆی لەژێر گوشاری شەرمەزاریدا خەریکبوو وردوپرد دەبوو، ئەو هەستە رۆح و هەستی ڤرۆنسکیشی داگرتبوو. بەڵام قاتلێ لەگەڵ ئەوەشدا کە لە تەرمی کووژراوەکە تۆقیوە ناچار دەبێ لەتوپەتی بکات و بیشارێتەوە و کەڵك لەو شتە وەرگرێ کە بۆ وەدەست هێنانی تووشی ئەو قەتڵە بووە.

هەر بەو رقە ئەشق وێنەیەی قاتڵەوە کاتێك کە خۆی بەسەر تەرمی قوربانییەکەدا دەدا و بەسەر زەویدا رایدەکێشێ و لەتوپەتی دەکات، ڤرۆنسکیش شێتانە روخسار و شان و ملی ئانای ماچباران دەکرد. ئانا توند دەستی گرتبوو و جووڵەی نەدەکرد. بەڵێ ئەو ماچانەی بە نرخی ئەو شەرمەزارییە وەدەست هێنابوو. ئەرێ، ئەم دەستەی کە هەمیشە هی من دەبێ دەستی هاودەستی منە. بۆیە ئەو دەستەی هەڵێنا و ماچی کرد. ڤرۆنسکی چۆکی دادا و دەیویست روخساری ببینێ بەڵام ئانا دەمووچاوی خۆی داشاری و هیچی نەگوت. ئاخری ئەو جۆرەی کە خۆی ناچار کردبوو هەستا و ئەوی لەخۆی دوور خستەوە. روخساری هەروەك پێشوو جوان و دڵڕفێن بوو و بەو رادەیەش بەزەییهێنەر بوو.

گوتی: هەمووشتێك تەواوبوو. من ئیتر لە تۆ زیاتر کەسم نییە. ئەوەت لەبیر بێ.

ـ من ناتوانم ئەوشتەی کە ژیان و بوونمە لەبیری بەرەمەوە. بۆ تاقە یەك خولەکیش لەو بەختەوەرییە....

ئانا بە بێزاری و ترسەوە گوتی: کام بەختەوەری! ـ ئەو ترسەش جۆرێك بوو کە بێ ئیختیار ڤرۆنسکیشی داگرت: تۆخودا ئیتر هیچ مەڵێ، تەنانەت یەك وشەش.

ئانا بە پڕتاو هەستا و خۆی لێ دوور خستەوە.

دیسان دووپاتی کردەوە: ئیتر لەو بارەوە یەك وشەشت لە دەم نەیەتەدەر ـ بە سیمایەکەوە کە سارد و ناهومێدیی پێوەدیاربوو و ئەوی تووشی سەرسووڕمان دەکرد لێی جیا بۆوە. لەو کاتەدا هەستی دەکرد کە ناتوانێ شەرمەزاری و ترس و شادیی خۆی بۆ چوونە نێو ژیانێکی تازەوە بە وشە دەببڕێ و هەر حەزیش ناکات لەوبارەوە زمانی بگەڕێ و هەستی خۆی بە چەند وشەی بێ مانا بخاتە ژێرپێ. بەڵام پاشانیش، رۆژی دوایی و دوایی تریش نەك هەر نەیتوانی وشەگەلێکی وا بدۆزێتەوە کە بتوانێ

ئەم هەستە پێچەڵاوپووچانە بە جوانی بەیان بکات، بەڵکوو تەنانەت بیر و ئەندێشەیەکی وای نەدۆزییەوە کە بتوانێ ناوەڕۆکی ڕۆحی خۆی کێشانە بکات و بە وردی لێیبڕوانێت.

لەبەر خۆیەوە گوتی «نا، ئێستا ناتوانم لەو بارەوە بیر بکەمەوە، دواتر کە هێوربوومەوە هەوڵی بۆ دەدەم.» بەڵام ئەو هێوربوونەوەیەی بۆ بیرکردنەوە پێویست بوو هیچ کات بە نسیبی نەبوو. هەرکات کە بە زەینیدا دەهات کە تا ئێستا چیی کردووە و داهاتووی چۆن دەبێ و دەبێ چ بکا، ترسی لێدەنیشت و ئەو فکر و خەیاڵەی لەسەری خۆی دەردەکرد.

لە دڵی خۆیدا گوتی «پاشان، پاشان، کاتێك کە هێوربوومەوە.»

بەپێچەوانە، لە خەودا کە دەسەڵاتی بەسەر بیرۆکە و خەیاڵی خۆیدا نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا هەموو دزێوی و کارە ناحەزەکانی لەبەرچاوی زەق دەبوونەوە. خەوێك بوو کە هەموو شەوێك دەیدی، دەیدی کە هەردووکیان مێردی ئەون و لەڕادەبەدەر نازی دەکێشن و دەیلاوێننەوە. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بە گریانەوە دەستی ماچ دەکرد و دەیگوت «ژیان ئاوا چەندە خۆشە.» ئەلکسی ڤرۆنسکیش لەوێ بوو و ئەویش مێردێ بوو، ئانا پێیسەیر بوو چونکە لە ڕابردوودا ئەو بارودۆخەی بەلاوە شتێکی مەحاڵ بوو و بە پێکەنینەوە دەیگوت کە ئاوا زۆر خۆش و ئاسانترە و ئێستا ئەوانیش هەردووکیان ڕازی و شیرینکامن. بەڵام ئەو خەونە وەك کامووسێك ئەوی لە ژێر گوشاری خۆیدا دەهاڕی و تۆقیوانە لە خەو ڕادەپەڕی.

## دوازدە

لەڤین دوای گەڕانەوە لە مۆسکۆ، سەرەتا هەرکاتێك خوازبێنی کردنەکەی و سووکایەتیی دەست بە ڕووەوەنانی وەبیردەهاتەوە دادەچڵەکی و سوورهەڵدەگەڕا و لە دڵی خۆیدا دەیگوت «لە زانکۆش کاتێك لە فیزیکدا نمرەی یەکم گرت لەساڵی دووهەمدا مامەوە هەر ئاوا داچڵەکیم و سوورهەڵگەڕام و خۆم بە دۆڕاو زانی. کاتێك کە نەمتوانی کێشەی خوشکیشم لە دادگا بە ئاکام بگەیەنم کە بە من سپێردرابوو پێم وابوو لەنێوچووم. بەڵام ئێستا کە چەند ساڵ بەسەر ئەو ماجەرایەدا تێپەڕیوە و بیری لێدەکەمەوە سەرم سووڕ دەمێنێ کە بۆ مەسەلەیەکی ئاوا چکۆڵە تا ئەو ڕادەیە تووشی خەم و پەژارەی کردووم. خەمی ئەو ناکامییەش هەروا دەبێ. زەمەن تێدەپەڕێ و ئازار و تاڵییەکەی لەبیردەچێتەوە.

بەڵام سێ مانگ بەسەردا هاتبوو و نەیتوانیبوو لەبیر خۆی بباتەوە و هەر کاتێك ئەو ڕۆژەی وەبیردەهاتەوە ژانێکی قورس سەرتاپای دادەگرت. لەڤین نەیدەتوانی هێوربێتەوە چونکە ماوەیەکی دوور و درێژ ئاواتی پێکهێنانی بنەماڵەی لە دڵدا بوو و هەستی دەکرد کە بەو رادەیە کامڵ بووە کە بتوانی ژیانی هاوبەش پێکبێنێ. بەڵام هەروا بێ ژن مابۆوە و گریمانەی ژن هێنانی لە هەموو کاتێك کەمتر بووبۆوە. خۆشی وەك دەورووبەرییەکانی هەستی دەکرد کە ڕەبەن مانەوە بۆ پیاوێکی لە تەمەنی ئەودا شیاو نییە. لەبیری بوو کە بەر لە ڕۆیشتن بۆ مۆسکۆ بە نیکۆلای خزمەتکاری گوتبوو کە ڕەعیەتێکی ساویلکە بوو و لەڤین حەزی دەکرد قسەی لەگەڵ بکات، «نیکۆلای دەزانی خەیاڵم هەیە ژن بێنم؟» نیکۆلای لەڕێوە وەڵامی دابۆوە «دەبوو زۆر لەوە زووتر بتهێنایە، کۆنستانتین دیمیتریچ.» بە لەبز و راوێژیشدا دیاربوو کە لەو بارەوە نابێ بەهیچ شێوەیەك دوودڵ بێ. بەڵام هێشتا ژنی نەهێنابوو و لەوە نەدەچوو ژنیش بێنێ. جێگای کیتی لە دڵیدا خاڵی نەبووبوو و هەر کاتێك بە خەیاڵ حەولی دەدا یەکێك لەو کچانەی کە دەیانناسێ لە جێگای ئەو دانێ، دڵی بڕوایی نەدەدا. ئەوەش بەجێی خۆی بیرەوەریی دەست بە رووەوەنانی و ڕۆڵێك کە خۆی لەو بوارەدا گێڕابووی لەوانە بوو لە شەرمانا بیتاوێنێتەوە. هەرچەندی بەخۆی دەگوت کە لەو نێوانەدا هیچ تاوانێکی نەبووە و بە وەبیرهێنانەوەی ئەو بیرەوەرییەش وەکوو بیرەوەرییە پڕ شوورەییەکانی تر وەلەرزین دەکەوت و روخساری سوورهەڵدەگەڕا. ئەویش وەك هەمووان لە رابردوودا تووشی کاری ناحەز بووبوو کە دەیزانی کارێکی باش نەبوون و دەبوو ویژدانی بە هۆی ئەو کارانەوە ئازاری دابێ بەڵام وەبیرهێنانەوەی ئەو کارە ناحەزانە بە هیچ جۆرێك بەقەد ئەم بیرەوەرییە کەمبایەخە ئازاری نەدەدا و بەو هۆیەوە هەستی بە سووکایەتی نەدەکرد. ئەو زامانە بە هیچ کلۆجێ ساڕێژ نەدەبوون. لە پاڵ ئەم بیرەوەرییەشدا ئێستا دەست بەڕووەوەنانەکەی وەبیرهاتبۆوە و ئەو شەوەی دەهاتەوە بەرچاو کە ڕەنگە لەبەر چاوی میوانەکان زۆر داماو بووبێ و بەزەییان پێیدا هاتبێ. بەڵام تێپەڕینی زەمان و کاری زۆر شوێنی خۆی دانا و رووداوە بە رواڵەت کەمبایەخەکان و گرینگیی ژیانی لادێی وردە وردە تۆزی بیرچوونەوەی بەسەر ئەو بیرەوەرییانەدا پرژاند. لەگەڵ تێپەڕینی هەر حەوتوویێك کەمتر دەکەوتەوە یادی کیتی. زۆر بێسەبرانەش چاوەڕێبوو بڵێن کیتی شووی کردووە یان بەمزووانە شوودەکات و هیوادار بوو کە ئەو هەواڵە وەك کێشانی ددانێکی وەژانهاتوو بۆ هەمیشە لە دەست ئەو ئازارە رزگاری بکات.

بەرەبەری نەورۆز بوو، بەهارێکی جوان و سازگار، دڵان پڕ بوون لە هیوا و ئیتر ترسی هەوای تووش و دە شەوەی شقاق لە گۆڕێدا نەمابوو. خەڵك لە تەنگانە خەڵەستبوون. بەهارێکی کەم وێنە بوو و گیا و گیانلەبەر و مرۆڤ هەموو پێکەوە شاد بوون. ئەم بەهارە جوان و شادیهێنەرە لەڤینی وریاتر کردبۆوە، بڕیاری دا چاوپۆشی لە رابردوو بکات و گۆڕانێك بەسەر ژیانی رەبەنیدا بێنێ و بناغەیەکی سەربەستی بۆ دارێژێ. ئەگەرچی زۆربەی ئەو گەڵاڵانەی جێبەجێ نەکردبوو کە کاتی گەڕانەوە لە مۆسکۆ دایڕشتبوون، زۆریشی هەوڵ دەدا کە ژیانێکی پاکی هەبێ و ئیماندار و لەخودا ترس بێ. ئیتر ئەو شەرمەی لە دڵدا نەمابوو کە کاتی تاوانکردن هەستی پێدەکرد و دەیتوانی بێ ئەوەی بەخۆدا بشکێتەوە چاو لە چاوی هەمووان بکات، لە مانگی فیورییەدا نامەیەکی لە لایەن ماریا نیکۆلایۆڤناوە پێگەیشتبوو. لەو نامەیەدا نووسرابوو کە بارووذۆخی سلامەتیی نیکۆلای برای زۆر خراپە و بەهیچ جۆرێکیش مل نادا کە بیبەنە لای پزیشك و ماریجەی بکەن. لەڤین دوای خوێندنەوەی ئەو نامەیە چوو بۆ مۆسکۆ و توانیبووی براکەی پێمل بکات کە بچێتە لای پزیشك و بۆ ماریجەکردنی نەخۆشینەکەی بە ئاوی گڕاو، بڕوا بۆ دەرەوی وڵات. لەوەی کە بە باشی توانیبووی رازیی بکات و نەهێڵێ بە رقدا بچێت و بۆ سەفەرەکەشی پارەی بە قەرز پێدابوو زۆر لە کاری خۆی رازی بوو. جگە لە کاروباری کشتووکاڵ کە لە بەهاردا پێویستی بە هەوڵ و چاوەدێریی تایبەت هەیە، دەبوو خەریکی نووسین و متالاش بێت چونکە لە زستانی رابردووەوە دەستی کردبوو بە نووسینی کتێبێك لە بواری کشتوکاڵدا. خاڵی تازە و بەرچاوی ئەو کتێبە ئەوەبوو کە لە کاری وەرزێڕیدا خووخدەی کرێکاریش وەك بارودۆخی هەوا و ئاو و خاك دەبێ بە شتێکی داسەپاوی بزانی و لە ئاکامدا داهاتی باشی کشتوکاڵ نابێ تەنیا پێمانوابێ بە هۆی دوو هۆکارەوە واتە خاك و مەڵبەند بەرهەم هاتووە، بەڵکوو لە ئاکامی سێ هۆکار خاك و بارودۆخی مەڵبەند و ئەخلاقی دیار و نەگۆڕی کرێکاریش پێکهاتووە. بەم شێوەیە بە هۆی ژیانی تەنیایی یان لەبەرئەوەی سەڵت و رەبەن بوو هەمیشە سەرقاڵ و گرفتار بوو و زۆر بە دەگمەن بە پێویستی دەزانی سەبارەت بە بیری ئاڵۆزی خۆی جگە لە ئاگافیا میخائیلۆڤنا لەگەڵ کەسێکی تر باس بکات و سفرەی دڵی بۆ بکاتەوە. ئەگەرچی کەم وابوو پێکەوە دانەنیشن و سەبارەت بە فیزیك و گریمانەگەلی ورزێڕی و بەتایبەت فەلسەفە نەکەونە مشتومڕ. چونکە فەلسەفە مەبەستێك بوو کە ئاگافیا میخائیلۆڤنا کەیفی پێدەکرد.

بەهاری ئەمسالْ لە هەموو ساڵێك درەنگتر هاتبوو. دوایین حەوتووەکانی ڕۆژووی گەورە، سەهۆڵبەندان و ئاسمان ساماڵ و ساو بوو. سەهۆڵەکان بە ڕۆژدا بڕێك دەتاوانەوە بەڵام شەوانە سەرما دەگەیشتە حەوت پلەی ژێر سیفر. بەفری سەر زەوی وەهای دەبەست کە ڕێگەوبانی ون دەکرد و عارەبانەکان لەڕێ لایان دەدا و بە کوێرەڕێدا دەڕۆیشتن. پاشان لە ناکاو ڕۆژی دووهەمی حەوتووی پاك بایەکی گەرم هەڵیکرد و هەوری بارانیی هێنا و هەتا سێ شەو و ڕۆژی ڕەبەق بارانێکی گەرم و بەلووزەو دایدا و خۆشی نەکردەوە. ڕۆژی پێنجەم بایەکەی خست و تەمومژێکی چڕ و خۆڵەمێشین وڵاتی تەنی و دەتگوت دەیهەوێ ئەو گۆڕانەی لە سروشتدا پێکهاتووە بزر بکات و بیشارێتەوە. لەژێر خێوەتی تەمتوماندا وڵات وەسەر ئاو نیشتبوو و سەهۆڵی ڕووبارەکان قرچووهۆڕیان پێکەوتبوو و دەشکان و دەبوونە قاڕقاڕە و بەسەر شەپۆلەوە دەکەوتنە گەڕیان و تەوژمی پێل ڕایدەماڵین. بەڵام ڕاست ڕۆژی یەکشەممەی دوای جێژنی پاك لای ئێوارە تەمومژەکە ڕەوی و گەواڵە هەورەکان وەك ڕەوە مەڕی سپی بە ئاسماندا بڵاو بوونەوە و هەواکەی خۆش کرد و ئاسمان ساماڵ بوو و بەڕاستی بوو بە بەهار. بەیانی خۆر هەڵات و ئەو توێژە سەهۆڵەی سەر ئاوەکانی تاواندەوە و سروەیەکی فێنك و شێدار دەڤەری لاواندەوە و سنگی زەویی ختووکەدا. گیاوگژی پیر خەریکبوون دیسان کراسی سەوز لەبەر بکەن و شەبەقی سەوزی پەلك و چرۆکان لە باوەشیاندا دەدرەوشانەوە. چرۆ بەسەر لقی گوڵەدووگ و بنجی ڕیزەلەمارانە و پەیکەری دۆچنی داری تووز کە بەرامەیەکی توندیان هەبوو خەریکبوو دەپشکووتن و مێشەنگوینی تازە باڵگرتوو لە پلوورە هاتبوونە دەرێ و لە دەوری لقوپۆپی زێڕینی زەردە بی دەسووڕانەوە و سروودیان دەچڕی و جوڕڕەپۆنپەش بەسەر چیمەن و سەوزەڵانی و سرووتی سەرمابردوودا دەخولانەوە و دەیانچریکاند، قاز و قوولینگ بە تەشقی ئاسماندا دەفڕین و قریوەی مەستانەیان دەگەیشتە گوێ. پاتاڵی توولەك کردوو کە جێجێ تووکی ساڵی پێشوو بەسەر پشت و لاتەڕافیانەوە مابوو لە بنگەڕ و مێرگ و لەوەڕگە دەیانبۆڕاند. بەرخۆڵەی ساوا بە دەوروبەری مێگەلی کولکن و تووك نەرموونۆڵدا کە هەموو دەیانباڕاند، هەڵبەزدابەز و غارغارێنیان دەکرد. منداڵانی گورجوگۆڵ بە کوێرە ڕێگاکاندا هەڵدەهاتن کە وردە وردە خەریکبوو کزر دەبوونەوە و شوێنی پێیان لەسەر قوڕەکە بەجێ دەما. لەسەر کانی و ئەستێرەکەشەوە دەنگی حیلکوهۆڕ و قاقای ژنان دەهاتە گوێ کە خەریکی شۆردنی ئەو جلوبەرگە جاوانە بوون کە خۆیان چنیبوویان. لە حەوشە و حەسارانیشەوە زرمەی تەوری ڕەعیەتەکان دەهات کە خەریکی شکاندنی کۆلکەدار و ئێزنگ

بوون، یان سەرقاڵی چاککردن و راستەوپاستە کردنی نیروئاموور و خێشك و ماڵوو بوون و ئامادەیان دەکردن بۆ جووت و شێوبڕین. بەڕاستی بەهار هاتبوو.

## سێزدە

لەڤین جزمە مل درێژەکانی لە پێ کرد و بۆ یەکەم جار بەبێ باڵتە و کەڵپۆس و تەنیا بە کۆتێکی ماهووتەوە رۆیشت بۆ مەزرا و جێجێ بە سەر سەهۆڵ و هێندێ جاریش بەسەر قوڕی نەرم و لینچقدا هەنگاوی دەنا و لەو چۆمەڵانە پەڕییەوە کە لەبەر پڕشنگی خۆرەتاودا دەبریسکانەوە.

بەهار وەرزی گەڵاڵە داڕشتن و فیکر و بیکرە بۆ داهاتوو. لەڤین کاتێك لە ماڵ هاتەدەرێ وەك ئەو دارانە کە هێشتا نازانن بەهارانە چرۆ و لکوپۆیەکانیان کە لە ناخیاندا شاراوەیە لە کوێوە سەر دەردێنن و چۆن گەشە دەکەن و هەڵدەچن، ئەویش ئاوا بە جوانی نەیدەزانی ئێستا لە کاری کشتوکاڵدا دەبێ چ بکا و لەکوێوە دەست پێبکات. بەڵام هەستی دەکرد کە زۆری گەڵاڵە و بیرۆکە لە سەردایە کە یەك لە یەکی باشترن. سەرەتا رۆیشت بۆ ئاژەڵدارییەکە. گایەلەکە لە گەوڕ هاتبوونە دەرێ و تووکی تازە دەرهاتووی سەر پێستەکەیان دەدرەوشایەوە و خۆری بەهار گەرمی داهێنابوون و بە بۆڕەبۆڕ بەرەو لەوەڕگە و مەزرا دەڕۆیشتن. لەڤین پاتاڵەکانی خۆی زۆر بە باشی دەناسی و مووبەموو تێیاندەگەیشت. ماوەیەك بەچاوی پەسندرانەوە تێیانڕاما و فەرمانیدا مانگاکان بەرن بۆ لەوەڕگە و گوێرەکەکانیش بەرن بۆ حەوشەی دەرەوەی گەوڕەکە. گالەوەڕێنەکەی شاد و گورجوگۆڵ رۆیشتە دەرێ و خۆی ئامادەکرد بۆ دەرکردنی گاڕانەکە. ژنانی مانگادۆش کۆشیان بەلادا کردبوو و پەلوپووزی سپی و ناسکیان کە هێشتا هەتاو نەیگەزیبوون و رەنگیان نەگۆڕابوو، هەرکام شوولێکیان بە دەستەوە گرتبوو و بەدوای ئەو گوێلکانەدا هەڵدەهاتن کە هەوای بەهاری مەستی کردبوون و قوشقی و بەلەسە غاریان دەدا و دەیانبۆڕاند. دەیانویست لە گەوڕەکەیان بکەنە دەرێ و رایانبدەن بۆ حەوشەی دەرەوە.

لەڤین دوای ئەوەی زۆری چاو لە گوێرەکە ساغ و تەندرووستەکان کرد و بە دیتنیان کەیفی ساز بووـ بۆی دەرکەوت پارگوێرەکان بەقەد گایەکی بەرجووتی گوند نشینان دەبن و گوێلکە

ساواکان کە سێ مانگیان تەمەنە وەك پارگوێر دەنوێنن ـ فەرمانی دا قەفیژ و سەوەتەکان لە کادێن بێننە دەرێ و ئاخوڕە گەڕۆکەکانیان بۆ پڕ بکەن لە وێنجە. بەڵام بۆی دەرکەوت کە لێوارەی ئاخوڕە دارینەکان کە پایزێ دروستیان کردبوون و لە زستاندا لەبەر بەفر و باران بێکەڵك کەوتبوون، زۆریان شکاون. پیاوێکی نارد بە دوای دارتاشدا کە بڕیاربوو خەریکی دروستکردنی جەنجەڕ بێ، بەڵام دەرکەوت کە سەرقاڵی چاککردنەوەی ماڵووە چونکە بڕیاربوو بەر لە رۆژووی گەورە کەڵتەی بکاتەوە. ئەوەش بووە هۆی رقهەستان و تووڕەبوونی لەڤین. تووڕە بوونەکەشی لەبەرئەوەبوو کە ئەو هەموو نالێکی و تێکەولێکەیە هەمیشە لە کاروباری کشتوکاڵ و ئاژەڵدارییەکەیدا هەیە، ئەگەرچی ساڵانێکی زۆر بوو بە هەموو توانایەوە هەوڵی دەدا، بەڵام هەر وا بوو. ئاخوڕە شکاوەکانیان بردبووە گەوڕی یەسترەکان، چونکە تەنیا بۆ گوێلەکان سازکرابوون و سووك و لە دەستان خۆش بوون. جگە لەوەش بۆی دەرکەوت کە جەنجەڕ و نیرەئاموور و ماڵوو کە فەرمانی دابوو لە زستانێدا هەموویان کەڵتە بکرێن و ئامادەیان بکەن بۆ بەهارێ، هەر بۆیە سێ دارتاشی گرتبوو بەڵام هێشتا کارەکانیان تەواو نەکردبوو. ماڵووەکەش کە ئێستا پێویستیان پێیبوو تازە خەریکی کەڵتەکردنی بوون. لەڤین پیاوێکی نارد بەدوای هاریکارەکەیدا، بەڵام بۆ هاتنی چاوەڕوان نەما و بەپەلە خۆشی رۆیشت بە دوایدا. ئەو رۆژە هاریکارەکەی وەکوو هەموو گیانلەبەرانی تر شاد و دڵخۆش بوو. کەڵپۆسێکی لەبەردا بوو کە ملیوانە و سەردەستەکانی پێستی بەرخ بوو. لقە گیایەکی وشکی بە دەستەوە بوو و لەلای جێ خەرمانەکەوە دەهات.

ـ دارتاش بۆ خەریکی چاك کردنەوەی جەنجەڕەکە نییە؟

ـ بەڵێ دوێنێ دەمویست عەرزتان بکەم، کاتی جووتکردن نزیکبۆتەوە و ماڵووەکە چاك بکاتەوە باشترە.

ـ ئەی زستانێ خەریکی چیبوو؟

ـ ئێستا دارتاشت بۆچییە؟

ـ ئاخوڕی گەڕۆکی گوێرەکەکان لەکوێیە؟

هاریکارەکەی دەستێکی راتەکاند و گوتی: گوتم بیهێننەوە سەر جێگاکەی خۆی، بەڵام خۆتان دەزانن ئەو لادێیە نەفامانە خۆ قسە بەگوێیاندا...

لەڤین نێوچاوانی تێکنا و گوڕاندی: ئەو لادێییانە نا، ئەو گزیرانە... تۆ قسەت بە گوێدا ناچێ، ئاخەر من تۆم بۆچی گرتووە؟... ـ بەڵام وەخۆ هاتەوە و تێگەیشت کە کار بە تووڕەیی

جێبەجێ نابێ، بۆیە بێدەنگ بوو و هەناسەیەکی هەڵکێشا. دوای ئەوەی گتێکی گرت پرسیی: دەی خۆ ئێستا کاتی ئەوە نەهاتووە دەست بکەین بە تووچاندن؟

ـ زەوییەکانی ئەولای تۆرکینۆ بۆ ئەوە دەبێ سبەی یان دووسبەی تووی پێوە بکەین.

ـ شەوەر؟

ـ ڤاسیلی و میشکام ناردووە، بەڵام ئەستەمە بتوانن کار بکەن، زەوییەکە زۆر قوڕە.

ـ پێتگوتوون چەند دسیاتین داچێنن؟

ـ شەش دسیاتین.

لەڤین گوڕاندی: ئەی بۆ هەموو زەوییەکان داناچێنن؟

ئەوەی کە تەنیا شەش دسیاتین لە زەوییەکانیان کردۆتە شەوەر و هەموو بیست دسیاتینەکەیان دانەچاندووە، زیاتری لەڤین قەڵس کرد. داچاندنی شەوەر، بەپێی زانستی کشتوکاڵ و تەنانەت بەپێی ئەزموونیش تەنیا کاتێك بەرهەمی باشی دەبێ کە زۆر زوو داچێندرێ، تەنانەت کاتێك کە بەفر نەچۆتەوە. بەڵام لەڤین قەت نەیتوانیبوو ئەو خواست و ئەزموونەی خۆی جێبەجێ بکات.

ـ چ بکەم، کارەکەرم بە دەستەوە نییە. ئەو لادێییانە خۆ کاریان لەگەڵ ناکرێ، سێ کەسیان هەر نەهاتن بۆسەر کار، ئێستاش ئەو سێمونە...

ـ دەتانتوانی جارێ خەریکی کا و تفاق بن.

ـ ئەو کارەشم کرد.

ـ دەی، ئەی کرێکارەکان چییان کرد؟

ـ پێنج کەس خەریکی دروستکردنی کۆمپووتن (مەبەستی کومپووست بوو، یانی کووت.) چورا کەسیش وێنجە دەجنن. چ بکەم، کۆنستانتین دیمیتریچ، دەنا شین دەبوو.

لەڤین بە باشی دەیزانی کاتێك دەڵێ «دەنا شین دەبوو» یانی تۆوی وێنجەی ئینگلیزیش ئێستا گنخاوە، چونکە دیسان ئەو دەستوورەی کە داوێتی بەڕێوەیان نەبردووە.

لەڤین گوڕاندی: من هەر لە کاتی ڕۆژووی گەورەوە نەمگوت بە دووکەڵێکیش هەوای هەمارەکە بگۆڕن؟

ـ خۆت نارەحەت مەکە، هەموو کارەکان لە کاتی خۆیدا دەکەین.

لەڤین بە تووڕەیی دەستێکی هەڵتەکاند و ڕۆیشت بۆ کادێنەکە تاکوو بزانێ وێنجە و ئالفەکە چیی لێهاتووە. پاشان گەڕایەوە بۆ گەوڕی ئەسپەکان. وێنجەکان هێشتا بەترەف

نەبووبوون. بەڵام کرێکارەکان خەریکی لێکدان و هەڵشێواندنی بوون. ئێستا هەر ئەوەی دەویست لە قاتی سەرێوە بە خەپە و بێڵ بیکەنە نێو کادێنەکەوە. لەڤین فەرمانی پێویستی بە کرێکارەکاندا و دوو کەسیانی نارد بۆ چاندنی تۆوی شەوەر و نەختێ هێوربۆوە و رەقەکەی دەرهەق بە گزیر لە دڵیدا بوو نیشتەوە. جگە لەوەش هەواکەی هێندە خۆش بوو و تاووساو بوو نەیتوانی لەوە زیاتر پیش بخواتەوە و رقی خۆی هەستێنێ.

دەنگی هەڵێنا و بە عارەبانەچییەکەی گوت کە خەریکی شۆردنی عارەبانەکەی بوو: ئینگات، ئەسپێك زین بکە.

ـ کام ئەسپیان قوربان؟

ـ کالپیك زین بکە.

ـ بە چاوان گەورەم!

لەگەڵ ئەوەدا کە ئەسپەکەیان بۆ زین دەکرد، لەڤین هاریکارەکەی بانگکرد کە لەو دەورووبەرە دەهات و دەچوو، بۆ ئەوەی ئاشتی بکاتەوە بانگی کرد و سەبارەت بە کاروباری بەهاری داهاتوو و گەڵاڵە کشتوکاڵییەکانی خۆی لەگەڵی دووا.

دەبوو زووتر دەست بکەین بە بردنی پەین بۆ کێڵگە بۆ ئەوەی بەر لە دوورینی یەکەم بەری وێنجەکە لەو کارە ببینەوە. پاشان زەوییەکانی دەورووبەریش بکێڵین و وەردی بدەینەوە و بۆ دوورین و هەڵگرتنەوەی وێنجە و ئالیك ئەو کرێکارانە بگرین کە بە مزی رۆژانە کار دەکەن، نەك ئەو رەعیەتانەی کە نیوەی داهاتەکە بەجێی هەقدەست و مزی خۆیان هەڵدەگرن.

گزیر بە وردی گوێی بۆ شل کردبوو و دیاربوو گوشار بۆ خۆی دێنێ کە وتەی ئەربابەکەی بسەلمێنێ بەڵام رواڵەتی خەم و هیوابڕاوییەکی پێوە دیاربوو کە لەڤین خووی پێگرتبوو و هەمیشە لە داخانی خۆی دەخواردەوە. ئەو حاڵەتەی روخساری گزیر نیشاندەری ئەوە بوو کە: ئەوانە هەمووی بەجێی خۆی بەڵام بزانین چیمان پێدەکرێ، خودا گەورەیە.

هیچ شتێك بەقەد ئەوە لەڤینی جاڕز نەدەکرد. تا ئێستا زۆری سەرکار و گزیر گرتبوو بەڵام هەموویان هەر لەو بارە بوون. ئەگەرچی ماوەیەکی زۆریش لەلای دەمانەوە بەڵام هەر لەسەر دەوری خۆیان بوون و نەدەگۆڕان. هەموویان بە یەك شێوە لەگەڵ بیر و روانگەی لەڤین هەڵسوکەوتیان دەکرد، بۆیە ئیتر لەڤین لێیان تووڕە نەدەبوو و تەنیا خۆی دەخواردەوە و بە دڵتەنگی هەستی دەکرد کە دەبێ دژ بەو وزە بەهێزە راپەڕێ و خەبات بکات کە نەیدەزانی جگە لە ناوی «خودا گەورەیە» چ ناوێکی تری بۆ وەدۆزێ. ئەوەشی هەمیشە وەکوو کێوێك لە هەمبەر خۆیدا دەدی.

گزیر گوتی: با بزانین فریا دەکەوین، کۆنستانتین دیمیتریچ.

ـ بۆ فریا ناکەوین؟

ـ چونکە دەبێ پازدە کرێکاری تر بگرین. بەڵام وەگیرمان ناکەوێ. ئەمڕۆ چەند کەس هاتبوون بەڵام بۆ هەقدەستی هاوینەیان داوای حەفتا رۆبڵ دەکەن.

لەڤین بێدەنگ بوو. ئەو دیسان ئەو وزەیەی لە هەمبەر خۆیدا بەدی دەکرد. دەیزانی هەرچەندەش هەوڵ بدەن ناتوانن لە سی و حەوت یان سی و هەشت کرێکار زیاتر بگرن. ئەوپەڕەکەی رەنگە چل کەسیان کرێکاری باش وەگیر بکەوێ، لەگەڵ ئەوەشدا نەیدەتوانی دەست لەسەر دەست دانێ و هەوڵ نەدات.

ـ بنێرن لە سووری[94] و چێڤرۆڤکا[95] کرێکار بێنن. دەبێ بگەڕێن، هەوڵ بدەن پەیدا دەبێ.

ڤاسیلی فیۆدۆرۆڤیچ بە لەبزێکی خەمبارانەوە گوتی: ئەگەر قسە لە ناردن بێ دەنێرم، بەڵام ئێسترەکانیش ئیتر کێشیان نەماوە.

لەڤین بە پێکەنینەوە گوتی: چەند یەستری تر دەکڕین با کارەکەیان سووک بێ. بەڵام دەزانم سەد یەستریشتان بۆ بکڕم کارەکانتان لەوە باشتر نابێ هیچ، خراپتریش دەبێ. بەڵام من ئەمساڵ ناهێڵم ئەوەی پێتان خۆشە بیکەن و خۆم سەرپەرشتی تەواوی کارەکان لە ئەستۆ دەگرم.

ـ بەڵام ئێوە سەرپەرشتیشتان نەکردووە تووشی کەمخەوی بوون. خۆ ئێمە لە خودامان دەوێ. لەبەر دەستی ئەربابدا کار بکەین زۆر کەیفسازتر دەبین.

عارەبانەچی ئەسپە چکۆلە شێیەکەی کە ناوی کالپیك بوو هێنای بۆ ئەربابەکەی، لەڤین لێی سواربوو و گوتی: دەی، گوتت خەریکن دەوروبەری دارستانەکە شەوەری لێ دادەچێنن؟ ئەوە دەچم بزانم چییان کردووە.

عارەبانەچی گوتی: ناتوانی لە چۆمەکە بپەڕییەوە، کۆنستانتین دیمیتریچ.

ـ دەی بەلای لێوارەکەدا دەڕۆم.

بە سواری ئەسپە شێی گورج و گوێقوت کە ماوەیەکی زۆر بوو کەس سواری نەبووبوو و هەوساری نەدەدا و بۆنی بە گۆلاوکە ئاوەکانەوە دەکرد، لە حەوشەی پڕ قوڕوچڵپاو تێپەڕی و بە وێرغەیەکی بەدەماغانەوە رووی لە سەحرا کرد.

---

94- Sury

95- Chevrovka

لەڤین کە لە گەوڕ و حەساری خزمەتکاران سەرودڵخۆش بوو، کاتێك گەیشتە سەحرا ئەوەندەی تر هەستی بە شادی و دڵخۆشی کرد. ئەسپە شێ نەرم لۆقەی دەکرد و کاتێ بەنێو دارستانەکەدا دەڕۆیشت دیتی کە بەفر خاڵخاڵ بە زەوییەوە ماوە و چۆڕچۆڕە کەوتۆتە بنیان و بەبای وادە خەریکە دەتوێنەوە. بەرامەی گەرم و تەڕوبڕی بەفر و شنەی فێنکی دەمەو بەهاری تامەزرۆیانە هەڵدەمژی و بە دیتنی بەژن و باڵای دارەکان کە باوەشیان بۆ بای دارئاوس گرتبۆوە و لقوپەلیان بە گرتك و گریمانە داپۆشرابوو کە لە هەرکامەیانەوە چرۆیەکی ناسك سەری هەڵدەدا و زەردەی بۆ بەهار و هەتاو دەگرت شادی لە دڵی دەگەڕا و بێئۆقرە بەرەو پێشەوە ئەسپە شێی دەئاژوا. کە لە دارستانەکە تێپەڕی دەشتێکی پان و بەرین وەك فەرشێکی مەخمەری سەوز لەبەر دەمیدا راخرابوو، دەشتێکی راست و یەکدەست، بێ ئەوەی پەڵەیەکی رووتی و کەچەڵی پێوە دیاربێ، تەنیا جێجێ نەبێ تۆقەنە بەفری پێوە مابوو کە چۆڕە چۆڕە دەتوانەوە و دەچوون بە گەرووی نەرمی خاکدا. نە بە دیتنی ئەسپ و جوانووی رەعیەتەکانی تووڕە بوو کە لە نێو مەزرا سەوزە پۆشەکەیدا دەخولانەوە و پێشێلیان دەکرد (تەنیا رەعیەتێك کە لەوێ بوو لەڤین داوای لێکرد دەریان بکات) و نە بە وەڵامی توانجئامێز و ساردوسڕی ئەو رەعیەتەی کە لە رێگا تووشی بووبوو و لێیپرسیبوو: دەی ئیپات، کاتی تووچاندن هاتووە یان نا؟ ـ رەعیەتەکە وەڵامی دابۆوە: دەبوو لە پێشدا زەوییەکانت شێو ببڕیبایە، کۆنستانتین دیمیتریچ ـ هەتا زیاتر دەڕۆیشت زیاتر شادی لە دڵی دەگەڕا و گەڵاڵەی کشتوکاڵ یەك لە یەك باشتر و پڕ داهاتتر لە زەینیدا دەگووران: بۆ وێنە بە خەیاڵیدا هات کە تەواوی ئەو دەشتە بەڕیزە خەلفی دارە بیی لێبچەقێنێ و بەرەو رووی باشوور وەك پەرژینی لێ بێ، بۆ ئەوەی بەفر بۆ ماوەیەکی زیاتر خۆ رانەگرێت و دەشتەکەش بکاتە نۆ پارچە و شەش بەشیان کووتی لێدا و سێ بەشەکەی تریشی بۆ لەوەڕگە بە شێوەی بەیار بێڵێتەوە و لەوسەری دەشتەکە گەوڕێك و هەسێڵێکی گەورە دروست بکات. دەوری زەوییەکانیش بەجۆرێك پەرژین بکات کە بتوانن بە ئاسانی کووتی حەیوانییان لێپڕژێنن. ئەو کاتە سێسەد دسیاتین لە زەوییەکە گەنمی لێ دادەچێنێ و سەد دسیاتین دەکاتە پەتاتە و سەد و پەنجا دسیاتین دەکاتە سێوەڕە و ناهێڵێ تەنانەت یەك دسیاتین لە زەوییەکە خەسار بێ و بێکەڵك بمێنێتەوە.

بەو خەیالانەوە، ئەسپەکەی دەئاژووت و بە کەناری زەوییەکەدا تێدەپەڕی بۆ ئەوەی سەوزەگیای تازە رسکاوی جاڕەکە پێخوست نەکات. وردە وردە بەرەولای ئەو کرێکارانە رۆیشت کە خەریکی چاندنی تووی سێوەڕە بوون. ئەو عارەبانەی کە تۆوەکەی لێ بار کرابوو

نەیانهێنابووە قەراغ کێڵگەکە و لە جاڕە گەنمەکەدا تایەکانی لە زەوی چەقیبوو و یەسترەکان بەنێو مەزراکەدا دەسووڕانەوە و پێشێلیان دەکرد. هەردوو کرێکارەکەش لەسەر جۆگەی قەراغ کێڵگەکە دانیشتبوون و وێدەچوو بە شەریکی خەریکی کێشانی قەننەیەك بن. خۆڵی نێو عارەبانەکە کە تۆوی شەوەریان ئاوێتەی کردبوو نەرم نەبوو، بەڵکوو وەك کولۆی لێهاتبوو یان بەستبووی. ڤاسیلی کە چاوی بە ئەربابەکەی کەوت هات بۆ لای عارەبانەکە و میشکا دەستیکرد بە تووچاندن. لەڤین کارەکەیانی بەدڵ نەبوو بەڵام زۆر کەم لە گەڵیان تێوەدەچوو، قەتیش سەرکۆنەی نەدەکردن. کاتێك ڤاسیلی گەیشتە لای لەڤین دەستووری پێدا کە ئەسپەکە بەرێتە قەراغ جاڕەکە رایگرێ.

ڤاسیلی گوتی: هیچ نییە ئەرباب، گەنم ئازایە بەوانە هیچی لێنایە.

لەڤین گوتی: تکات لێدەکەم لەسەری مەڕۆ و چیت پێدەڵێن ئەوە بکە.

ڤاسیلی گوتی: بەسەر چاو ئەرباب ـ رەشمەی ئەسپەکەی گرت و بۆ نەرمکردنی دڵی ئەرباب و خۆشامایی کردن گوتی: بەڵام ئەرباب، تووچاندنەکەمان قسەی لەسەر نییە و زۆر باش بە دەستمانەوە هاتووە، بەڵام لەو قوڕەدا پیاو باوکی دێتە بەرچاوی. دە شەقاو دەڕۆین پووتێك قوڕ بە لاقمانەوە دەنووسێ.

لەڤین گوتی: بۆ خۆڵی تۆوەکەتان دانەبێژاوە؟

ڤاسیلی وەڵامی دایەوە: خۆمان نەرمی دەکەینەوە ـ کلۆیەکی هەڵگرت لەسەر لەپی دەستی وردی کرد.

خەتای ڤاسیلی نەبوو ئەو خۆڵ و تۆوەی پێیان دابوو نەرم نەکرابوو، بەڕاستی دیتنی ئەو وەزعەش ناخۆش بوو.

لەڤین بۆ ئەوەی رقەکەی قووت داتەوە رێگایەکی دۆزیبۆوە کە زۆر جاریش ئەزموو بووی و کەڵکی لێ وەرگرتبوو. بۆیە دیسان پەنای بۆ ئەو رێگایە بردەوە و ئەوەی بە باش زانی. بۆیە چووە پێشێ تۆزێ چاوی لە میشکا کرد کە دەڕۆیشت و تۆوی دەچاند و لەگەڵ هەر هەنگاوێك تۆپەڵێك قوڕ بە کەوشەکانییەوە دەنووسا و دەیکێشا بەدوای خۆیدا. لە ئەسپەکەی دابەزی و قەرتاڵەی تۆوەکەی لە دەست ڤاسیلی وەرگرت و رۆیشت کە خۆی تۆوەکە بچێنێ.

ـ هەتا کوێ تۆوت پێوە کردووە؟

ڤاسیلی بە لاقی شوێنێکی نیشان دا و لەڤین وەڕێکەوت و دەستیکرد بە تووچاندن. هەنگاو هەڵێنانەوە زۆر دژوار بوو دەتکوت بە نێو خمخۆرکدا دەڕوا و بەر لەوەی بگاتە هۆگانی

ئەوسەری زەوییەکە ئازای ئەندامی وەسەر ئارەقە گەڕا و بەرکۆشی توو چاندنەکەی دایەوە دەست ڤاسیلی.

ڤاسیلی گوتی: ئەرباب هاوینێ کاتی گیا دروون لەبیرت بێ بۆ ئەو کەرتە شەوەرە لێم تووڕە نەبی.

لەڤین کە ئاوا زوو ئاکامی تەگبیرەکەی خۆی هاتەدەست، بە بزەیەکەوە گوتی: چۆن؟

ـ با هاوین بێ جا دەزانی جیاوازییەکەی لە کوێدایە. ئەو جێیانەی کە پارەکە بەهارێ من تۆوەکەیم چاند چاوی لێبکە، چەندە یەکدەستە. ئاخر من، کۆنستانتین دیمیتریچ، وا کار دەکەم کە پێموایە زەوییەکە هی باوکی خۆمە و دەمهەوێ کارەکەم بێعەیب بێ. قەت نامەوێ دەغەڵی بکەم و ناهێڵم کەسێکی تریش خراپ کار بکات. ئەگەر ئەرباب رازیبێ ئێمەش خێرمان وەڕێ دێ و ویژدانمان ئاسوودە دەبێ ـ ئاماژەی بە دەشتەکە کرد و درێژەی بە قسەکانی دا: چاو لێکە، پیاو کەیفی پێدەکات.

ـ ڤاسیلی بەهارێکی خۆشە، وانییە؟

ـ بەڵێ، بەهاری ئاوا خۆش پیرپیاوەکانیش وەبیریان نایە. ئێستا کە لە ماڵێ بووم، دیتم باوکیشم سێ بۆشکەی گەنم چاندووە. دەڵێ وابزنە جۆیە.

ـ ئێوە لەمێژە گەنم دادەچێنن؟

ـ لە پێرارەکەوە، خۆتان ئێمەتان فێرکرد، دوو بۆشکە گەنمتان پێداین. چوارسەد کیلۆیمان فرۆشت و باقییەکەیمان داچاند.

لەڤین رۆیشت بۆ لای ئەسپەکەی و گوتی: چاکە، هەتا دەتوانن کولۆکان ورد بکەن، ئاگات لە کاری میشکاش بێ. ئەگەر داهاتەکە باش بێ بۆ هەر دسیاتین پەنجا کاپێك دەستخۆشانەتان دەدەمێ.

ـ خودا سایەی ئێوەمان لەسەر کەم نەکات. دەستخۆشانەشمان پێنەدەی ئێمە هەر دۆعات بۆ دەکەین.

لەڤین سواری ئەسپەکەی بوو و رۆیشت بۆ ئەو کێڵگەیەی کە پارەکە شەوەریان لێداچاندبوو و هەروەها ئەو کێڵگەیەش کە بۆ چاندنی گەنمە بەهاروو شێویان بڕیبوو.

لە نێو سرووتە نیوە رزیوەکاندا شەوەر بە جوانی رسکابوون و لە حاڵی گەشەکردندا بوون. تەشقی زەوی شکابوو و بەفر و سەهۆڵ لە حاڵی گیانکەنشتدا بوون و ئەسپەکە هەتا قولاپەی لە قوڕ رۆدەچوو. هەرجارێ کە سمی لە زەوی دەردەکێشا جڵقوهۆڕی دەهات. رۆیشتن بە نێو

شێوەردەکەدا زۆر دژوار بوو. تەنیا ئەو شوێنانەی سەهۆڵەکەی بە باشی نەتوابۆوە لەژێر پێدا خۆڕاگریی دەکرد. کاری شێوبڕینەکە بە جوانی کۆتایی پێهاتبوو و هەتا دوو رۆژی تر دەکرا دەستبکەن بە ماڵووکردنی و رێك و تەکووزی کەن و دەست بکەن بە تووچاندن. کاروباری کشتوکاڵ بە باشی دەڕۆیشتە پێشێ و کەیفی پێساز دەبوو. لە گەڕانەوەدا رێگای چۆمەکەی گرتەبەر، بەو هیوایەی ئاوەکەی کەمی کردبێ. بۆیە زۆر بە ئاسانی توانیی لە چۆمەکە بپەڕێتەوە و دوو مراوییە کێویشی هەڵفڕاند. لەبەر خۆیەوە گوتی: «زیقاوڵەش دەبێ هاتبێتەوە.» خوداوڕاستان لەسەری پێچی رێگای ماڵێ تووشی باخەوانەکەی خۆی بوو و سەبارەت بە زیقاوڵە لێیپرسی باخەوان گوتی: بەڵێ هاتوونەوە.

لەڤین ئەسپەکەی تاودا کە خۆی بگەیێنیتە ماڵێ و بەپەلە نان و چاییەکەی بخوات و تفەنگەکەی ئامادەبکات بۆ شەوێ.

# چاردە

لەڤین کەیفخۆش و بەنەشە ئەسپە شێی تاو دابوو بەرەو ماڵێ کە زرەی زەنگوڵەی ئەسپێکی لەلای دەرگای ماڵەکەیەوە بەرگوێ کەوت.

لەبەرخۆیەوە گوتی: «ئەها، لە وێستگەی هێلاسنەوە هاتووە. راست کاتی شەمەندەفەری مۆسکۆ بوو... یانی کێیە؟ رەنگە نیکۆلای برام بێ، گوتبووی دەچم بۆ کانی گەرمکاو لە هەندەران، رەنگە بێشم بۆ لای تۆ.» سەرەتا هەستێکی تاڵ و ئاوێتەی ترس دڵی داگرت. دەترسا هاتنی براکەی و مانەوەی، ئەم شادی و خۆشییەی وەرزی بەهاری لێ تاڵ بکات. بەڵام بەهۆی ئەو هەستە کتوپڕەوە خۆی بە شەرمەزار زانی. بۆیە لەپڕ رۆحی ئامێزی کردەوە و بە شادییەکی پڕ خۆشەویستییەوە پڕ بە دڵ حەزی کرد ئەو میوانە براکەی بێ. مامزەیەکی لە ئەسپەکەیدا و کە لە پشت دارە ئەقاقیاکانەوە دەرکەوت، کاشەیەکی سێ ئەسپەی دی کە لە وێستگەوە هاتبوو و پیاوێك لە نێویدا دانیشتبوو کە باڵتەیەکی کەڵپۆسی لەبەردا بوو، لە دڵی خۆیدا گوتی: «وەڵڵا براکەم نییە. خۆزگە مرۆڤێکی سەروڕووخۆش بێ و پیاو بتوانێ سەری قسەی لەگەڵ بکاتەوە.»

کاتێك ستیپان ئارکادیچی ناسییەوە هەردوو دەستی هەڵێنا و کەیفسازانە دەنگی هەڵبڕی: هەك بەخێرێی، چەندەم پێخۆش بوو هاتی!

له دڵی خۆیدا گوتی: «ئێستا بۆم دەردەکەوێ کیتی شووی کردووە یان ئەگەر نەیکردووە کەنگێ دەیکات.»

هەستی دەکرد لەم ڕۆژە خۆش و دڵبزوێنەی بەهاردا یاد و بیرەوەریی کیتی ئیتر تاڵ و بەژان نییە.

ستیپان ئارکادیچ دەموچاوی لە پڕیشکەی قوڕ و لیتە هەڵکشابوو بەڵام تروسکەی شادی و لەشساغی لە رووخساریدا دەدرەوشایەوە، لەگەڵ ئەوەی لە کاشەکە دادەبەزی گوتی: چۆن یانی چاوەڕوانی من نەبووی؟ ـ لەڤینی لە باوەش گرت و بە دەم ماچوموچەوە گوتی: لە پێشدا هاتووم چاوم پێتبکەوێ، پاشان پێکەوە بچین بۆ ڕاو و دوای ئەویش پەلەیەك لە دارستانەکەمان لە یەرگووشێڤۆ[96] بفرۆشم.

ـ کارێکی باشت کرد. دیوتە چ بەهارێکە! خۆ سەفەرەکەت بەو کاشەیە ناخۆش نەبوو، ها؟

کاشەوان کە لەڤینی دەناسی گوتی: لە عارەبانە خراپتر نییە، کۆنستانتین دیمیتریچ.

لەڤین لە ناخی دڵەوە زۆر بە شادییەکی پاك و منداڵانەوە گوتی: چاکە زۆر زۆر خۆشحاڵم کە دیسان چاوم پێتکەوتەوە.

لەڤین میوانەکەی برد بۆ ژووری میوانداری، ئەو ژوورەی کە باری سەفەری ستیپان ئارکادیچ، یان جانتا و تفەنگی لەبەرگگیراو و قوتووی جگەرەی بەرگ و کەلوپەلەکانی تریان لێدانابوو، ڕێنوێنی کرد کە خۆی بشواتەوە و جلەکانی بگۆڕێ، خۆشی ڕۆیشت بۆ نووسینگەی ملکەکەی تاکوو سەبارەت بە جووت و چاندنی تۆوی سێوەڕە دەستووری پێویستیان پێبدا. ئاگافیا میخائیلۆڤنا کە هەمیشە لەبیری ئابڕووی بنەماڵەدا بوو، لەبەر هەیوانەکە پێشی پێگرت و سەبارەت بە خواردن و میوانداری پرسیی پێکرد.

لەڤین پێیگوت: هەرچۆنێکت پێباشە وابکە، بەڵام نەختێك زوو ـ پاشان بەپەلە ڕۆیشت بۆ لای هاریکارەکەی.

کاتێك گەڕایەوە ستیپان ئارکادیچ بە دەموچاوی شۆراو و سەری داهێنراو و لێوی پڕ بزەوە لە وەتاغەکە هاتەدەرێ و پێکەوە ڕۆیشتن بۆ نهۆمی سەروو. ستیپان ئارکادیچ گوتی: چەندەم پێخۆشە کە ئاخری بە خزمەتت گەیشتمەوە. ئێستا هیوادارم لێرە ڕاز و نهێنیی کارەکەتم بۆ دەرکەوێ، ڕاستت دەوێ بە ئاواتەوەم منیش ژیانێکی وەك تۆم هەبێ. لە خودا بەزیاد بێ چ ماڵێك، چەندە خۆش و ڕووناکە، چەندە دڵفەرێحەـ دەیگوت ڕووناك و دڵفەرێح، بەڵام

96- Yergoucnevo

نەیدەزانی خۆ هەمیشە وەك ئەو ڕۆژە بەهارییە نییە و هێندێ جار هەوا لێڵ و هەوروهەڵا دەبێ. لە درێژەی قسەکانیدا گوتی: ئەو دایە خاتوونەشت چ ژنێکی خوێنشیرین و بەحورمەتە. بەڵام من کلّفەتێکی جوان و سپیکەڵانە و خرپن و بەرهەڵبێنە سپیم لەوە پێچاکترە. بەڵام بۆ تۆی وشکە سۆفی و تەرکەدنیا هەر ئەوە بە باشتر دەزانم.

ستیپان ئارکادیچ زۆری خەبەر و هەواڵی تازە پێبوو، لە هەمووشیان گرینگتر بەلای لەڤینەوە ئەوەبوو کە بیستی براکەی واتە سرگی ئیڤانۆڤیچ دەیهەوێ ئەم هاوینە بگەڕێتەوە بۆ ئەم ئاواییە و لەگەڵ ئەو بژی.

ستیپان ئارکادیچ بە تووتووش خۆی لە قەرەی کیتی و بەگشتی بنەماڵەی ئیشچر باتسکی نەدا و تەنیا سڵاوی ژنەکەی بە لەڤین گەیاند. لەڤین لە ناخەوە حەزی لەو ئاخاوتنە نەرم و زمانە پاراوەی ستیپان ئارکادیچ دەکرد و زۆری لێڕازی بوو. وەك هەمیشە لەکاتی تەنیاییدا بیرۆکەگەلێك لە سەریدا و هەست و سۆزێك لە دڵیدا کەڵەکە بووبوون کە نەیدەزانی بۆ دەوروبەرییەکانی بدرکێنێ و لەگەڵیان بێنێتە گۆڕێ. ئێستاش سەرمەست بە بەرامە و هەوای بەهاری و شاعیرانەی خۆی و هەروەها ناڕازی بوونی لەسەر نەکەوتن لە کاروباری کشتوکاڵدا و هەروەها بیرۆکە و بۆچوونەکانی سەبارەت بەو کتێبانەی کە دەیانخوێنێتەوە، لە هەموشی گرینگتر ئەو بیرۆکەیە بوو کە لە بەرهەمەکەیدا ئاماژەی پێکردبوو و بنەماکەشی بێ ئەوەی خۆی تێگەیشتبێ، هەر ئەو ڕەخنەیە بوو کە لە هەموو کتێبە قەدیمییەکانی کشتوکاڵدا هەیە و مووبەموو هەمووی بۆ ستیپان ئارکادیچ باس دەکرد. ستیپان ئارکادیچ کە هەمیشە مێهرەبان و لەسەرەخۆ بوو و بە کینایەیەك تێدەگەیشت و لەوسەری دەهاتەوە. لەم سەفەرەدا لە هەموو کاتێك زیاتر دەرهەق بە لەڤین مێهرەبان بوو و لەڤین لە وتە و هەڵسوکەوتی هاوڕێکەیدا تێدەگەیشت کە ڕێز و خۆشەویستییەکی تازەی بۆی هەیە.

هەوڵەکانی ئاگافیا میخائیلۆڤنا و ئاشپەزەکەی بۆ ڕەنگینکردنی سفرە و سازکردنی چێشتی بەتام و خۆش ئاکامەکەی ئەوەبوو کە ئەو دوو هاوڕێ برسییە لەسەر سفرەکە دانیشتن و بە دەم چاوەڕوانیی چێشتەوە بە نان و کەرە و گۆشتی برژاوی قازو کارگی سوێر و ڤۆدکا و هێندێ وردە مەزەی تر خۆیان تێرکرد. لەڤین فەرمانیدا کە سووپەکە بەبێ پیراشکی بێنن، ئەگەرچی ئاشپەز بۆ سازکردنی پیراشکی زەحمەتێکی زۆری کێشابوو و دەیویست بە نواندنی ئەو هونەرەی خۆی میوانەکە تووشی سەرسووڕمان بکات. بەڵام ستیپان ئارکادیچ ئەگەرچی عادەتی بە جۆرێك خۆراکی تر گرتبوو، بەڵام هەموو نان و چێشتەکەی پێخۆشبوو و بەدڵ

مەیلی کرد: ڤۆدکای بۆندار و نان و کەرە و بەتایبەت گۆشتی برژاوی قاز و کارکی سوێر و شلەی رمۆسك و مریشکی سوورەوەکراو و شەرابی سپی هەموویانی زۆر بەلاوە خۆش و بەتام بوو و زۆر بەچێژ و ئیشتیاوە خواردی.

ستیپان ئارکادیچ دوای خواردنی گۆشتە برژاوەکە جگەرەیەی بەرگی گەورەی داگیرساند و گوتی: بەزیادبێ، زۆر خۆشبوو. من لێرە دەڵێی بە سواری پاپۆڕێکی گەورە هاتووم و دوای تاملکردنی گرمەو هاڕە و هەڵچوون و داچوون و ماندوویێتی و شەکەتییەکی زۆر گەیشتوومەتە رۆخێکی ئارام و دوور لە مەترسی. کەوایە تۆ پێتوایە دەبێ ماکی سەرەکیی کرێکار متالا بکەی و بۆ هەڵبژاردنی رەوشتی کشتوکاڵ بەپێی بارودۆخ و چۆنێتیی کارەکە رێنوێنییەکانی لەبەرچاو بگری. هەڵبەت لەو بارەوە من خاوەنڕا نیم بەڵام پێموایە ئەو بۆچوونە و لەبەرچاو گرتنی حەتمەن شوێن لەسەر کرێکار دادەنێ و هەوڵەکە بەفیڕۆ ناچێ.

ـ بەڵێ، بەڵام سەبرکە، من کارم بەسەر مەسەلەی ئابوورییەوە نییە، من مەبەستم زانستی کشتوکاڵە. لە کشتوکاڵیشدا دەبێ وەك زانستە سروشتییەکانی دیکە هەموو دیاردە و لایەنەکان لەبەرچاو بگری و کرێکاریش هەروەك تەواوی مەسەلە ئابووری و نەتەوەییەکان وەك بەشێك لەو دیاردەیەی شرۆڤەی دەکەی و لێی دەکۆڵییەوە لەبەرچاوی بگری...

لەو کاتەدا ئاگافیا میخائیلۆڤنا بە کەشەفێك مرەباوە هاتەژوورێ.

ستیپان ئارکادیچ نووکی قامکە قەڵەوەکانی خۆی بە نیشانەی تاموچێژی زۆر ماچکرد و گوتی: بەڕاستی دەستت خۆشبێ ئاگافیا میخائیلۆڤنا قازە برژاوەکەت قسەی لەسەر نەبوو، ڤۆدکا بۆندارەکەش هەر باسی مەکە! بەڕاستی دەستت خۆش بێ... ـ پاشان رووی لە لەڤین کرد و گوتی: دەی، کوستیا، وادیارە ئیتر کاتی خۆیەتی...

لەڤین لە پەنجێرەکەوە چاوێکی لە خۆر کرد کە لە پشت چڵەپۆپەی رووتی دارەکانەوە ئاوا دەبوو و گوتی: بەڵێ، ئیتر کاتی خۆیەتی. کۆزما، بڵێ با عارەبانە سووکەکە ئامادەبکەن ـ ئەوەی گوت و پاشان هەڵات بۆ نهۆمی خوارێ.

ستیپان ئارکادیچ بە ئارامی هەستاو چووە خوارێ، زۆر بە نەرمی بەرگی جاو و رەختەی لە جابەی بریقەدار داماڵی و سەرەکەی هەڵگرت، تفەنگێکی گرانبایی مۆدێرنی هێنادەرێ و دەستیکرد بە بەستنەوە و سڕینی. کۆزما بۆنی کردبوو کە دەستخۆشانەیەکی باشی دەست دەکەوێ بۆیە لە ستیپان ئارکادیچ دوورنەدەکەوتەوە و گۆرەوی و پۆستاڵەکانی دەکردە پێی و ستیپان ئارکادیچیش پێشی بەو خۆشخزمەتییەی کۆزما نەدەگرت.

ـ تۆ هەر بەڕاستی دەتەوێ دارستانەکەت بفرۆشی بە ریابینین؟
ـ بەڵێ، بۆ تۆ دەیناسی؟
ـ ئەیچۆن، زۆر چاکیشی دەناسم. مامەڵەم لەگەڵ کردووە. مامەڵەی جیدی و بێ سێ و دوو.

ستیپان ئارکادیچ پێکەنی. «جیددی و بێ سێ و دوو» قسەی زاری ئەو بازرگانە بوو.

ـ بەڵێ، قسەکردنەکەی پێکەنینییە ـ پاشان دەستێکی بە پشتی لاسکادا هێنا کە بە دەماخانە دەینووزاند و بە دەوری لەڤیندا هەڵدەسووڕا و لە پەستا جزمە و تفەنگەی دەلستەوە و بۆنی پێوە دەکرد، گوتی: تێگەیشتووە ئەربابەکەی بۆ کوێ دەچێ.

کە لە ماڵێ هاتنە دەرێ عارەبانەکە لەبەر پلیکانەکان راگیرابوو.

ـ پێمگوتن عارەبانەکە سازکەن، ئەگەرچی رێگاشمان دوورنییە. بەڵام ئەگەر پێتخۆش بێ دەتوانین بە پێیانیش بڕۆین.

ستیپان ئارکادیچ رۆیشت بۆ لای عارەبانەکە و گوتی: نا، بە سواری دەچین ـ گتێکی گرت و سوار بوو. بەتانییەك کە وێنەی کەوڵی بەبری پێوەبوو لە لاقوقولی خۆی پێچا و جگەرەیەکی بەرگی داگیرساند و گوتی: چۆن تۆ جگەرە ناکێشی؟ جگەرە خۆ تەنیا چێژی نییە، بەڵکوو تاج و نیشانەی چێژە. بەه بەه! ژیان هەر ئەوەیە. بەخوای خۆشە! ئەوە ئەو ژیانەیە کە ئاواتی بۆ دەخوازم!

لەڤین بە پێکەنینەوە گوتی: دەی، کێ پێشی پێگرتووی؟

ـ نا، تۆ مرۆڤێکی بەختەوەری. ئەوەی پێتخۆشە وەدەستت هێناوە. ئەسپت خۆش دەوێ، هەتە. تاجی و تولەی راوت خۆش دەوێ، هەتە. ئاشقی راوی، هەرکاتێك پێتخۆش بێ دەچی. هۆگری کشتوکاڵی ئەویشت هەیە.

لەڤین کە کیتیی وەبیرهاتبۆوە گوتی: رەنگە هۆی ئەوەبێ لەوەی هەمە رازیم و ئەوەی نیشمە خەمی بۆ ناخۆم.

ستیپان ئارکادیچ تێگەیشت، هێندێکی تێڕاما بەڵام هیچی نەگوت.

لەڤین لە ناخەوە سپاسی لە ئابلۆنسکی کرد کە بە وردبینییە هەمیشەییەکەی هەرکە تێگەیشت لەڤین حەز ناکا سەبارەت بە بنەماڵەی ئیشچر باتسکی بدوێن، هیچی نەگوت. بەڵام ئێستا ئیتر لەڤین دەیویست ئەوەی ئازاری دەدا و ناوێرێ لێی بدوێ، بیزانێ.

لە دڵیدا گوتی: «چەندە خراپە پیاو هەر لە بیری خۆیدا بێ» گوتیشی: دەی ئێستا کاروباری تۆ بەکوێ گەیشتووە؟

بریقەی شادی لە چاوانی ستیپان ئارکادیچدا درەوشایەوە.

ئەو پرسیارەکەی بەپێی مەیلی خۆی لێکدایەوە و لە وەڵامدا گوتی: چاکە، بەڵام تۆ قەبووڵت نییە کاتێك پیاو بەشی ڕۆژانەی خۆی نانە و وەدەستی کەوتووە، دەتوانێ ئیشتیای نانەناسکەش بکات؟ بە بڕوای تۆ ئەوە تاوانە. بەڵام من ژیانی بە بێ عەشقم قەبووڵ نییە. چ بکەم، هەرکەس بە شێوەیەك خولقاوە. ڕاستت دەوێ زیانی ئەو کارە بۆ خەڵکی زۆر نییە، بەڵام پیاو بۆ خۆی زۆری چێژ لێ وەردەگرێ...

لەڤین پرسیی: دەی بۆ دیسان چبووە؟

ـ بەڵێ هاوڕێ! دەزانی چی، بەڕاست تۆ ژنانی باسکراوی ئۆسسیان[97] دەزانی چۆنن... ئەو ژنانە پیاو تەنیا لە خەوندا دەیانبینێ... ئەو چەشنە ژنانە لەکاتی بەخەبەریشدا دەتوانی بیانبینی... ئەو چەشنە ژنانە زۆر ترسناکن. زانیوتە ژن بابەتێکە هەرچەندە متاڵای بکەی دیسان بە تەواوی تێیناگەی و سەرەندەری لێناکەی.

ـ کەوایە واچاکە هەر متاڵای نەکەی.

ـ نا، نازانم کام ماتماتیکزان گوتوویەتی: گەڕان بەدوای هەقیقەدا چێژی هەیە، نەك دۆزینەوەی.

لەڤین بێدەنگ بوو و گوێی ڕاگرتبوو بەڵام هەرچەندی هەولێدا نەیدەتوانی رەخنە بکاتە رۆحی هاورێکەیەوە و خۆی لە شوێنی ئەو دابنێ و هەستی ئەو و هەڵوێستەکردن لەسەر ئەو جۆرە ژنانە تێبگات.

## پازدە

شوێنی جووتگیری ئەو باڵندانەی کە ئەوان دەیانویست راویان بکەن لەو نزیکانە بوو، لە پەنا رووبارێك هەڵکەوتبوو کە بە نێو لێڕەواری سپیداراندا تێدەپەڕی. کاتێك گەیشتە لێڕەوارەکە لەڤین دابەزی و ئابلۆنسکیی برد بۆ سووچێکی رووتەنی شێوەزۆنگ کە قەوزە داپۆشیبوو و بەفرەکەی بە تەواوی توابۆوە. خۆشی چووە سووچێکی تر و لە بن دارە تووسێکی دوولفە راوەستا، تفەنگەکەی بە لقێکی وشکەڵی پەنا دارەکەوە هەڵپەسارد و کەڵپۆسەکەی لەبەری خۆی داکەند، کەمەربەندەکەی کردەوە و توندتر بەستییەوە و ئازادی و هەڵسووڕانی دەست و شانی خۆی تاقی کردەوە.

97- Ossian

لاسکا دێڵەسەگی پیری خۆڵەمێشین کە بۆ هەموو جێگایەك وەدوای دەکەوت، لەبەر دەمیدا هەڵتووتەکا و چاوی تێبڕی و گوێچکەی قوت کردەوە. خۆر خەریکبوو لە پشت جەنگەڵی چڕەوە ئاوا دەبوو و سێبەری دارتووسە پەڕگەنەکان لە نێو خەڵفی سپیدارەکاندا بە لقوپەلی داهاتوو و گرتکە و گریمانی ورد و هێشتا نەپشکووتوو لە ژێر پێستی لقەکاندا و لە رۆشنایی ئێوارەدا بە جوانی دیاربوون.

شیوەڵ و جۆگەی پێچەڵاوپووچ بەنێو لێرەواره چڕوپڕەکەدا کشابوون و ئاوێکی کەم بە نێویاندا ماریلەی دەکرد و بە ئاستەم گوێت لە خورەخوڕی دەبوو. پەڕۆك و باڵندە جریوە جریویان دەکرد و لەم دارەوە بۆ ئەو دار دەفڕین و دەنیشتنەوە.

هێندێ جار کە بێدەنگی باڵی بەسەر لێڕەوارەکەدا دەکێشا خشەخشی گەڵای نیوەپواوی ساڵی پێشوو کە بە هۆی نیشتنی زەوی و توانەوەی بەفر و رسکانی گیاوگژ کە لێوی خاکیان دەقەڵەشاندەوە و دەیانویست بە رووی خۆرەوە بگرژێنەوە، دەهاتە گوێ.

لەڤین کە جووڵەی بە ئاستەمی گەڵایەکی خووساوی پەڵکی دی لە پاڵ ساقەتەی سەوزی گیایەکی تازە رسکاودا لەبەر خۆیەوە گوتی«سەیرە، پیاو بەڕاستی دەتوانێ گوێی لە رسکان و گەشەکردنی گژوگیا بێ و بە چاوی خۆی بیبینێ!» راوەستابوو و گوێی شل کردبوو. هێندێ جار لەبەر پێی خۆی و زەویی تەڕ و قەوزە گرتووی دەڕوانی، هێندێ جاریش چاوی لە لاسکا دەکرد کە هەردوو گوێی قوت کردبۆوە، یان دەیڕوانییە رووبەڕووی خۆی و دیمەنی رووتوقووتی دارەکانی دەدی کە لە داوێنی کێوکەدا پەلیان هەڵخستبوو، جارجاریش سەری هەڵدەبڕی و لە ئاسمانی دەڕوانی کە جارلەگەڵجار تاریك دادەگەڕا و گەواڵە هەوری تەنك و سپی دایگرتبوو. سیسارکێك زۆر بەرز دەفڕی و بەسەر ئاسمانی لێڕەوارەکەدا نەرمنەرم باڵی لێدەدا. سیسارکێکی تریش کە راست وەك ئەوی تر باڵی لێدەدا و هەر لە ئاستی ئەوەوە بەرەو پێش دەفڕی لە چاوان ون بوو. جریوە جریوی باڵندە لە نێو لێڕەوارە چڕەکەدا بەردەوام رووی لە زیادبوون دەکرد. کوندەبوویەك لەو نزیکانە ناڵەی دەهات و لاسکا لەگەڵ بیستنی دەنگی کوندەبوو دادەچڵەکی و قوت و سرك چەند هەنگاو دەڕۆیشت و سەری بۆ لایەك خوار دەکردەوە و گوێی رادەگرت. قوومرییەك لەوبەری چۆمەکەوە دەنگی هات و بە شێوەی ئاسایی دووجاری کووکوو کرد، پاشان دەنگی گیرا و بە توندی ناڵاندی و خوێندنە ئاساییەکەی شێوا.

ستیپان ئارکادیچ لە پشت دەوەنێك هاتەدەرێ و گوتی: چۆن؟ یانی قومری ئاوا زوو؟

لەڤین گوتی: بەڵێ، گوێم لێیە ـ لەوەی کە بێدەنگیی دارستانەکەی بە دەنگی ناخۆشی خۆی شڵەژاندووە نارەحەت بوو: ئێستا دێن هێندەی نەماوە.

ستیپان ئارکادیچ دیسان خۆی خستەوە پشت دەونەکە و لەڤین جگە لە گڕی شقارتە و سکڵی سووری جگەرە و دووکەڵە شینەکەی هیچی تری نەدەدی.

«قرتقرت». قرتەی زامنی تفەنگ بوو کە ستیپان ئارکادیچ شووشەی بێدەنگییەکەی پێ چڕژاند.

ستیپان ئارکادیچ سەرنجی لەڤینی بۆ خوێندنێك راکێشا کە دەتگوت جوانووە ئەسپێکی شەیتانە دەحیلێنێ و پرسیی: ئەوە دەنگی چییە؟

ـ نازانی؟ ئەوە دەنگی کەروێشکی نێرە. بەڵام جارێ با بێدەنگ بین ـ ئەوەی گوت و خێرا زامنی تفەنگەکەی کێشا.

زیقە زیقێکی کەم لە مەودایەکی دوورەوە بەرگوێیان کەوت و دوای دوو چرکە بە شێوەیەکی ئاسایی و ئاشنا هاژە و سیرەی باڵی دەبیسترا، دوای دووسێ جار زیقە و سیرەسیر، فڕەفڕی باڵی تەواو نزیکبۆوە.

لەڤین چاوێکی لە راست و چەپی کرد و لە ناکاو بەرەوڕووی خۆی، بە سینگی شین و تاری ئاسمانەوە، بەسەر لقی باریك و لە تاریکیدا بزربووی سپیدارەکانەوە باڵندەیەك وەدیار کەوت، راست بەرەولای ئەو دەهات. فڕەفڕی باڵی تەواو نزیکبۆوە و دەتگوت چیڕەی دادڕینی بەردەوامی پەڕۆیەکی ناسکە لە ژوور سەرییەوە دەبیسترێ. ئیتر تەنانەت دەنووکە درێژەکەی و ملیشی دیاربوو، هەر لەوکاتەدا کە لەڤین تفەنگەکەی بە شانییەوە نووساندبوو و چەنەی لێتوندکردبوو و سێرەی لێگرت، لە پشت ئەو دەوەنەوە کە ستیپان ئارکادیچ خۆی مات دابوو بڵاچەیەکی سوور درەوشایەوە شریخەی گوللەیەك بێدەنگیی دارستانەکەی شڵەژاند و باڵندەکە وەك تیرێك بەرەو زەوی داگەڕا و سەرلەنوێ بەرەو سەرێ باڵی گرتەوە. بڵاچەیەکی تر بەرزبۆوە و شریخەی گوللەیەك، باڵندەکە کەوتە باڵەتەپێ، وەك ئەوەی بیهەوێ خۆی بە حەواوە راگرێ، چرکەیەك بێجووڵە راوەستا و سەرەوبن مایەوە. پاشان وەك شتێکی قورس و شل لەسەر زۆنگە رووتەنەکە کەوتە خوارێ و تەپەی هات.

ستیپان ئارکادیچ کە لە پشت تۆێژێك دووکەڵدا بزر بووبوو دەنگی هەڵێنا: یانی نەمپێکا؟

لەڤین لاسکای نیشان دا کە گوێی قوت کردبۆوە و کلکە تووکنەکەی لەسەر پشتی قانگڵە کردبوو، وردە وردە لەولاوە دەهات، وەك ئەوەی بێهەوێ چێژەکەی زیاتر بخایێنێ و لە بنەوە بزەشی بێتێ، کە نێچیرەکە بۆ ئەربابەکەی دەباتەوە. گوتی: ئەوە

نێچیرەکەت. خۆشحاڵم سەرکەوتوو بووی ـ بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئێرەییی پێدەبرد کە توانیبووی ئەو زیقاوڵەیە بپێکێ.

ستیپان ئارکادیچ کە خەریکبوو فیشەك باوێتەوە سەر تفەنگەکەی وەڵامی دایەوە: یەکەم فیشەکم نەیگرت، حەیفێ. دەنگێ مەکە... یەکێکی تر...

بەراستی زیقەزیقی کورت و لەپەستای زیقاوڵە دەهاتە گوێ. دوو زیقاوڵە شاد و تیژباڵ بە دوای یەکدات دەهاتن، تەنیا دەیانزیقاند و فڕەفڕی باڵیان دەهات. هەردووکیان هاتن و بەسەر سەریاندا تێپەڕین. شریخەی چوار فیشەك هەستا و زیقاوڵەکان وەك پەڕەسێلکە سووڕێکیان خوارد و لە چاو ون بوون.

ڕاوکردن لە شوێنی جووتگیری مەلان بێفایدە نەبوو. ستپان ئارکادیچ دوو نێچیری تری ئەنگاوت و لەڤینیش دوو دانە، بەڵام نەیانتوانی دانەیەکیان بدۆزنەوە. ویستیان بە سێ دانە نێچیرەوە بگەڕێنەوە. هەوا تاریك داهاتبوو. ئەستێرەی ناهید لە ئاسۆوە گەش و زیوێن هاتبووە سەرێ و سریوەی دەهات. لە پشت چڵەپۆپەی دارە تووسەکانەوە دەدرەوشایەوە و ئارکتورۆس لەلای ڕۆژهەڵاتەوە هەڵاتبوو و سوور و خەمناك چاوی لە زەوی دادەگرت. لەڤین لە ژوور سەری خۆیەوە حەوبرالەی دەدی و دیسان لێی ون دەبۆوە. زیقاوڵە ئیتر نەدەهاتن، بەڵام لەڤین بڕیاریدا هەتا ناهید لە ژوور چڵەپۆپەی دارتووزەکانەوە دیارە چاوەڕوان بێ، پاشان بڕواتە سەرترەوە و حەوتەوانان بە جوانی وەدیاربکەوێ. ناهید هاتە سەرێ و عارەبانەی حەوبرالە و تەنانەت نیرەکەشی[٩٨] بە روونی لە تاریکایی کەهووی ئاسماندا وەدیار کەوت، لەڤین هەروا چاوەڕوان بوو.

ستیپان ئارکادیچ گوتی: کاتی ئەوە نەهاتووە بڕۆینەوە؟

لێڕەوارەکە بێدەنگ و کڕوکپ تەنانەت مەلە وردیلەکانیش لە جموجۆڵ کەوتبوون.

لەڤین گوتی: با هێندێکی تر راوەستین.

ـ دەی چۆنت پێباشە وادەکەین.

بە مەودای دە ـ یازدە هەنگاو دوور لە یەکتر راوەستان.

لەڤین بێپێشەکی و لەناکاو گوتی: ستیپان، بۆ پێمنالێی، ژنخوشکەکەت مێردی کرد یان نا؟ ئەی کەنگێ؟

لەڤین بە رادەیەك هەستی بە خۆڕاگری و هێمنایەتی دەکرد کە پێیوابوو هیچ وەڵامێك ناتوانێ بیشڵەژێنێت. بەڵام قەت چاوەڕوانی ئەو وەڵامە نەبوو کە ستیپان ئارکادیچ پێیدایەوە.

---

٩٨- ئەورووپییەکان وێنەی حەوتەوانە بە عارەبانە دەزانن و سێ ئەستێرەی لای کلکەکەشی بە نیرەکەی.

ـ ئەو قەت لە بیری شووکردندا نەبووە و ئێستاش نییە. زۆر نەخۆشە و پزیشکان ناردوویانە بۆ هەندەران، تەنانەت دەترسن ئەو نەخۆشینە ماریجەی نەیەت.

لەڤین بە پەشۆکاوی گوتی: ئەوە دەڵێیچی؟ یانی نەخۆشینەکەی ئەوەندە مەترسیدارە؟ چییەتی؟ چبووە...

کاتێك ئەوان خەریکی قسەکردن بوون لاسکا هەردوو گوێی قوت کردبۆوە و جارجار ملی بۆ ئاسمان هەڵدەهێنا و جارجاریش بە چاوی سەرکۆنەوە، لێی دەڕوانین، وێدەچوو لە دڵ خۆیدا بڵێ: ئەوانەش بۆ دەمەتەقێ کاتیان وەگیر هێناوە، ئێستا وەختی ئەوەیە؟ ئەوا هات، چاو لێکەن، لە ژوور سەرتانە، نا وادیارە لە دەستیان دەردەچێ.

بەڵام لەوکاتەدا هەردووکیان گوێیان لە زیقەی تیژی زیقاوڵەیەك بوو کە وەك ویزەی قامچی لە گوێیاندا دەنگی دایەوە، هەردووکیان خێرا تفەنگەکانیان لە شانیان توندکرد و دوو بڵاچە لە کونی لوولەی تفەنگەکەنیانەوە دەرپەڕی و شریخەی دوو فیشەك بێدەنگیی شەو و لێڕەوارەکەی شڵەقاند. زیقاوڵەکە کە بەرز دەفڕی هەردوو باڵی پێکەوە نووساندو کەوتە نێو کۆڕی چڕوپڕی دارەکانەوە و لقوپۆپە باریکەکانی نووشتاندەوە.

لەڤین دەنگی هەڵێنا: لەخودا بەزیاد بێ، ئەوەیان هەردووکمان پێکامان ـ پاشان لەگەڵ لاسکا هەڵاتن بۆ نێو دارەکان بۆ ئەوەی نێچیرەکە بدۆزنەوە. لە دڵی خۆیدا گوتی: «بەڵام من خەمی چیم بوو؟» وەبیریشی هاتەوە: «ئاخ، نەخۆشینی کیتی... بەڵام چیم لەدەست دێ؟ مخابن.»

ـ ئەوەتا، دۆزییەوە، بەڕاستی سەگێکی زیرەکە! ـ باڵندەکە کە هێشتا گەرم بوو لە دەمی لاسکای ساندەوە و خستییە نێو توربێنەکەی شانییەوە کە پڕ بووبوو و دەنگی بەرزکردەوە: دۆزییەوە ستیپان.

## شازدە

لەڤین کاتی گەڕانەوە بە دەم ڕێگاوە سەبارەت بە نەخۆشینەکەی کیتی و پلانەکانی بنەماڵەی ئیشچر باتسکی پرسیاری لە ستیپان ئارکادیچ کرد و ئەوەی بۆی دەرکەوت دڵخۆشکەرانە بوو، ئەگەرچی بۆ ددانپێدانانی ئەو ڕاستییە بڕێك شەرمی دەکرد. ئەوەی کە بووبووە هۆی دڵخۆشیی، ئەوە بوو کە هێشتا دەیتوانی هیوادار بێ و هۆی گرینگتریش ئەوە بوو ئەو کەسەی کە بووبووە هۆی ئازار و ئەشکەنجەی ڕۆحی، ئێستا خۆی دەردەدار و لەشبەبار

بوو، بەڵام کاتێك ستیپان ئارکادیچ سەبارەت بە هۆی نەخۆشینەکەی کیتی دوا و ناوی ڤرۆنسکیی هێنا، لەڤین قسەکەی پێبڕی: من مافی ئەوەم نییە خۆم لە چۆنێتی بنەماڵەکەیان هەڵقوتێنم، راستت دەوێ حەزیش ناکەم خۆ لەو دارەتە بدەم.

ستیپان ئارکادیچ بۆ ساتێك دیتی لەڤین چۆن رەنگێکی هێنا و برد و روخساری هەڵبزرکا، زۆر باشیش لە ماناکەی تێگەیشت و بزەیەکی کەمڕەنگ بە زۆری نیشتە سەر لێوانی. ئەو خەفەتەی کە روخساری ئەوی پێتێکچوو بەتایبەت بەو هۆیەوە دیار و بەرچاو بوو کە جێگای شادی و نەشەیەکی پڕ پێکەنینی گرتبۆوە.

لەڤین پرسیی: تۆ کاری مامەڵەی دارستانەکەت لەگەڵ ریابی نین بە تەواوی کۆتایی پێهێنا؟

ـ بەڵێ، یەکلاییم کردەوە، ئەو پارەیەی دەمداتێ زۆر سەیرە: سی و هەشت هەزار رۆبڵە. هەشت هەزاری نەغد دەدا و باقییەکەی لە ماوەی شەشساڵدا. زۆرم چەنە لێدا لەگەڵی. هیچ لەوە زیاتر نادات و ناسازێ.

لەڤین بە لەبزێکی خەمناکەوە گوتی: دەی کەوابێ دارستانەکەت بە مفتە پێداوە و بڕایەوە.

ستیپان ئارکادیچ کە تێگەیشت لەڤین ئێستا لە هەموو شتێك نارازییە، پرسیی: بۆ بە مفتی پێمداوە؟

لەڤین وەڵامی دایەوە: چونکە ئەو دارستانەی تۆ لانیکەم هەر دسیاتینێکی پێنجسەد رۆبڵ دەژی.

ستیپان ئارکادیچ بە گاڵتەوە گوتی: ئاخ لە دەست ئەو مالیکە ورزێڕانە! ئێوە پێتانوایە ئێمە چونکە دانیشتووی شارین ئیتر هیچ تێناگەین. بەڵام کاتی بەرەوپێش بردنی کارەکان ئێمە هەمیشە باشتر لە ئێوە بە ئاکام دەگەین. بڕوام پێبکە بە تەواوی لێکمداوەتەوە. دارستانەکەم زۆر باش فرۆشتووە. راستت دەوێ زۆریش دەترسم کابرا پەشیمان بێتەوە. چونکە دارستانەکە بۆ راژە و ئاڵوودار نابێ ـ چاوەڕوانیش بوو بە وتنی وشەی راژە و ئاڵوودار بە لەڤینی بسەلمێنێ کە دڕدۆنگییەکەی بە ئینسافانە نییە ـ زیاتری بۆ ئێزنگ دەبێ، هەر دسیاتێنێکی پێموانییە سی ساژندار بدا. ئەویش بۆ هەر دسیاتینێك دووسەد رۆبڵی پێداوم.

لەڤین بزەیەکی ماناداری هاتێ. لە دڵی خۆیدا گوتی: «دەزانم، ئەو بیرکردنەوەیە لەو ناوەشێتەوە، هەموو شارستانییەکان ئاوان. بە دە ساڵ یەك دوو جار دێنە لادێ و دووسێ وشە و زاراوەی گوندنشینان بەر گوێیان دەکەوێ و ئیتر دەیکەنە بنێشتەخۆشکە و دڵنیان کە لە هەموو رازو نهێنییەکی کاروبار دەگەن و شارەزان. ئاڵوودار، راژە، پێموانییە سی ساژن دار بدا.» ئەو قسەی دەیکەن لە ماناکەشی هەر تێناگەن.»

گوتی: چاو لێکە ستیپان، من هیچ کات نایەم لە دایرەکەت فێرت بکەم کە فلان نامە چۆن بنووسی، ئەگەرچی رۆژێکیش پێویستم بە نامەیەکی ئیداری هەبێ دێم و داوا لە تۆ دەکەم بۆم بنووسی. بەڵام تۆ لە خۆت دڵنیای کە هەموو شتێك لە بواری دارستان و کاروبارەکانیا دەزانی. بەڵام کارەکەشی هەروا سانا نییە. تۆ دارەکانت بژاردووە.؟

ستیپان ئارکادیچ کە بەردەوام دەیویست تووڕەیی هاورێکەی بنیشێتەوە قاقایەکی کێشا: دارەکانم بژاردووە یانی چی؟ ئەگەر بلیمەتیش بی، خیزی رۆخی دەریا و چاوقرتاندی ئەستێرەکان...

ـ بەڵێ، بەڵام ریابی نین ئەوەندە بلیمەتە کە دەتوانێ دارەکان ببژێرێ. هیچ بازرگانێك ئەگەر خاترجەم نەبێ کە وەك تۆ دارستانەکەی مفت و مەرحەبا پێشکەش دەکەن، هەتا نەیبژێرێ نایکرێ. من دەزانم ئەو دارستانەی تۆ چییە. هەموو ساڵێك بۆ راو دەچم بۆ ئەوێ. هەر دسیاتینی پێنجسەد رۆبڵ دەژی. ئەویش دووسەد رۆبڵی بە تۆ داوە و بە قەرزیش. یانی تۆ نزیکەی سیهەزار رۆبڵت پێ بەخشیوە.

ستیپان ئارکادیچ بە لەبزێکی خەماوییەوە گوتی: چاکە، هێندەش زێدەڕۆیی مەکە. ئەی بۆ هێنامە سەرسەودا هیچ کەس کاپکێکی لەو زیاتر نەدامێ.

ـ چونکە پێکەوە دەستبەیەکییان کردووە. ئەو پارەی پێداون کە بکشێنەوە. من مامەڵەم لەگەڵ هەموویان کردووە زۆر باشیان دەناسم. ئەوانە خۆ بازرگان نین، دەڵاڵن، بۆ پارە هەموو کارێك دەکەن. ئەو لە مامەڵەیەکدا ئەگەر دە ـ پازدە لە سەت قازانجی زیاتری نەبێ بۆی قەتی خۆ لێنادا. خۆی ماتدەدا هەتا شتێکی یەك رۆبڵی بە بیست کاپك بکڕێ.

ـ باشە، ئیتر واز بێنە، تۆ ئەمڕۆ کەیفەکەت قنج نییە.

لەڤین بە لەبزێکی پەرۆشانەوە گوتی: قەت وانییە ـ لە ماڵێ نزیکبوونەوە. عارەبانەیەکی چوار تایەی چکۆڵەی چەرمینە کە شێل و یەرقەی ئاسنین و قایمی هەبوو بە خامووتی پان و قایم ئەسپێکی قەڵەوی تێکراوبوو و لەبەر پلیکانی بەر ماڵەکەیان راوەستابوو. گزیرێکی سوورهوولی کەمەربەند لەپشت کە ئەرکی عارەبانەچییەتیی ریابی نینی لە ئەستۆ بوو لەسەر عارەبانەکە قیت دانیشتبوو، ریابی نین خۆی چووبووە ژوورێ، هەتا بەر هەیوانەکە بەرەوپیریان هات. ریابی نین پیاوێکی کەڵەگەتی بەلەباریکەی نیمچە گەڕاوە بوو. خاوەنی سمێڵێکی درێژ و چاوی زەق و رەش بوو و ریشی تیفتیفە دابوو. عەبایەکی شینی شۆڕی لەبەردا بوو کە لە پشتەوە لەژێر کەمەرەکەیدا قوپچەی هەبوو. ملی درێژی جزمەکانی رێك و لە شوێنی قولاپەی

دووسیٚ چینی تیٚکەوتبوو بەسەر ئەوانیشدا جووتیٚ کلاٚشی گەورەی لەپیٚ کردبوو. دەسرەیەکی بەنیٚو چاوانیدا هیٚنا و ئارەقەکەی سڕی و داویٚنی عەباکەی کۆکردەوە و ڕیٚکوپیٚکی کرد، هەلٚبەت ئەگەر ئەو دەستەشی بە خۆیدا نەهیٚنایە هەر بۆ شناخ و لەباربوو. بە پیٚکەنینەوە بەخیٚرهاتنی لەڤین و ستیپان ئارکادیچی کرد و بۆ دەستومشتاخ و تەوقە دەستی بۆ لای ستیپان ئاکادیچ بردە پیٚشیٚ و ئەو کارەشی دەتگوت دەیهەویٚ شتیٚکی لیٚبستیٚنیٚ.

ستیپان ئارکادیچ دەستی گوشی و گوتی: زۆر چاك بوو هاتن. بەخیٚر بیٚن. پیٚم خۆشە.

ـ هەلٚبەت ڕیٚگا زۆر ناخۆش بوو، لەڕادەبەدەر. بەلاٚم من نەموێرا فەرمانی حەزرەتی پریٚنس بەڕیٚوە نەبەم، بەبیٚ رووپامایی عەرزتان دەکەم، ئەو ڕیٚگایەمان زیاتری بە پیٚیان بڕیوە بۆ ئەوەی لە کاتی خۆیدا بگەینە ئیٚرە ـ پاشان رووی کردە لەڤین و گوتی: ڕیٚز و حورمەتی زۆریشم بۆ کۆنستانتین دیمیتریچ هەیەـ ویستی لەگەلٚ ئەویش تەوقە بکات بەلاٚم لەڤین بەنیٚو چاوانیٚکی گرژەوە واینواند کە ئاگای لە دەست هیٚنانی ئەو نەبووە و دەستی کرد بە دەرهیٚنانی زیقاولٚەکان لە تووربیٚنەکەی. ریابی نین بە چاویٚکی سووکەوە لە زیقاولٚەکانی روانی و گوتی: تەشریفتان بردبوو بۆ ڕاو؟ چاکە، ئەوەش جۆریٚك ڕابواردنە. ئەو بالٚندانە ناویان چییە؟ یانی گۆشتەکەیان خۆشە؟ ـ وەك ئەوەی بیانداتە بەر توانج و تانە سەریٚکی لەقاند یانی: ئەو ڕابواردنە بایی زەحمەتەکەی دەبیٚ؟

لەڤین بە نیٚوچاوانیٚکی گرژەوە و بە زمانی فەڕەنسی بە ستیپان ئارکادیچی گوت: پیٚتخۆشە بچن بۆ نووسینگەکەم؟ قسەکانتان لەویٚ ببڕنەوە.

ڕیابی نین بە پۆز و ویقاریٚکەوە کە سووکایەتیی لیٚدەباری گوتی: گرینگ نییە، هەرکویٚتان پیٚباشە ـ وەك ئەوە وابوو کە بیهەویٚ تیٚیان بگەییٚنیٚ کە لەوانەیە بۆ کەسانیٚك دژوار بیٚ کە بە شیٚوەیەکی شیاو هەلٚسوکەوت لەگەلٚ خەلٚك بکەن، بەلاٚم بۆ ئەو لە هیچ کاریٚکدا هیچ دژوارییەك نییە.

کاتیٚك ریابی نین چووە ژوورەکەوە بەپیٚی خووخدە چاویٚکی لە دەوروبەری کرد، ویٚدەچوو چاو بۆ پەیکەرەی پیرۆز بگیٚڕیٚ، بۆیە کاتیٚك چاوی پیٚیکەوت خاچی خۆی کیٚشا. سەرنجی دۆلاٚب و قەفەزەی کتیٚبەکانی دا و هەر بەو چاوە پڕ دڕدۆنگی و گومانەوە کە لە زیقاولٚەکانی ڕوانیبوو ئاواش لە کتیٚبەکانی ڕوانی و چزەبزەیەك نیشتە سەر لیٚوی و دیسان بۆ لۆمە و تەوس سەری لەقاند، یانی بە هیچ شیٚوەیەك ناتوانیٚ قەبوولٚی بکات کە ئەوانە بایی زەحمەتەکەیان دەبن.

ئابلۆنسکی گوتی: پارەت هیٚناوە؟ دانیشن.

ـ پارەش دەبیٚ، خەمت نەبیٚ. من زیاتر بۆ ئەوە هاتووم زیارەتتان بکەم و قسەکانمان ببڕینەوە.

ـ ئیتر قسەی چی؟ بۆ دانانیشی؟

ڕیابی نین گوتی: گوێی مەدەرێ، دادەنیشم ـ دانیشت و دەستی خۆی بە شێوەیەکی زۆر پەشۆکاوانە لەسەر پشتی کورسییەکە دانا: بەڵام حەزرەتی پرێنس، دەبێ شتێکی لێداشکێنی، با زۆر تووشی زیان نەبم. پارەکەم حازر کردووە، هەتا کاپکی ئاخریم هێناوە. هەموو قیستەکانیش لە کاتی خۆیدا دەدەمە خزمەتتان.

لەڤین لەوکاتەدا تفەنگەکەی هێنا و خستییە نێو دۆڵابەکەوە و ویستی لە دەرگاکە بڕواتە دەرێ بەڵام بە بیستنی قسەکەی ریابی نین راوەستا و گوتی:

ـ دەتەوێ لێڕەواری مفتەت گیر بکەوێ. ئەوەندەش بە تەماح مەبە. ئابلۆنسکی ئەگەر زووتر بهاتبایە بۆلام پێمدەگوت بە چ نرخێك بیفرۆشێ، بەڵام حەیف درەنگ هات.

ڕیابی نین هەستا سەرپێ و بێ ئەوەی زمانی بگەڕێ بە بزەیەکەوە چاوی لە سەرتاپای لەڤین کرد.

پاشان رووی لە ستیپان ئارکادیچ کرد و بە پێکەنینەوە گوتی: کۆنستانتین دیمیتریچ زۆر قرِنیسە. بە هیچ کلۆجێ ناکرێ مامەڵەی لەگەڵدا بکەی. زۆر جار ویستوومە شتێکی لێبکڕم. پارەی نەغدیشم دەدایە.

ـ بۆ ماڵی خۆم بە مفتە بکەمە چنگی ئێوەوە؟ خۆ ماڵەکەم با نەیهێناوە و دزیشم نەکردووە.

ـ قسەیوا مەفەرموو، ئەمڕۆ ئیتر ناکرێ بە هیچ شێوەیەك کڵاو لەسەری خەڵك بنێی. ئەمڕۆ هەموو شتێك دەچێتەوە بەردەستی قازی، راست و رەوان و بێفڕوفێڵ. ئەمڕۆ هەموو کارەکان شوکر پاك و شەرافەتمەندانەن. شتیوا مەڵێ، ئێمە فێڵ و گزی لە کارماندا نییە و بە بێ تەڵەکە و چاوبەستن قسەمان کردووە و ئەو نرخەش کە لەسەر دارستانەکەیان داناوە زۆر گرانە و بە هیچ شێوەیەك بە قازانجم نییە. تکاتان لێدەکەم هەتا ئەوجێیەی بۆتان دەلوێ، لێی داشکێنن.

لەڤین گوتی: ئێوە مامەڵەکەتان بڕیوەتەوە یان نا؟ ئەگەر قسەتان بڕاوەتەوە ئیتر چەنەلێدان بێ مانایە. ئەگەر قسەشتان نەبڕاوەتەوە ئەوا من دەیکڕم.

ڕیابی نین رەنگی تێکچوو و بزە لەسەر لێوی تارا و شوێنەواری خوێڕییەتی و دڕندەخوویی و دڵڕەقی سەرتاپای داگرت. بە قامکە رەقەڵەکانی خێرا دوگمەی عەباکەی کردەوە و شاقەلی کراسەکەی وەدیار کەوت کە بەسەر پانتۆڵەکەیدا بەریدابۆوە، ریزە قۆپچەی زێوینی جلیسقەکەی و زریزەی کاتژمێرە باخەڵییەکەشی وەدەر کەوتن. جزدانێکی گەورە و قەبە و کۆنی لە باخەڵی دەرهێنا.

بە پەلە خاچی خۆی کێشا و دەستی هێناپێشێ و نێوچاوانی تێکنا. جزدانەکەی ئەمبارەوبار کرد و گوتی: تۆ مەپەڕە نێو مامەڵەکەمانەوە. دارستانەکە هی منە، ئەوەش پارەکەی، تازە من کڕیومە. ریابی نین ئاوا مامەڵە دەکات و زۆریش گوێ بە ماڵی دنیا نادا.

لەڤین گوتی: ئەگەر من بەجێی تۆ بوایەم پەلەم نەدەکرد.

ستیپان ئارکادیچ بە سەرسووڕمانەوە گوتی: ئەوە چ قسەیەکە هاوڕێی ئازیز، من بەڵێنم داوە.

لەڤین لە ژوورەکە چووەدەرێ و دەرگاکەی بە توندی پێوەدا. ریابی نین چاوی لە دەرگاکە بڕی و بە بزەیەکەوە سەری لەقاند.

ـ دەزانی چی، ئەوە گەنجە دەکرێ بڵێین منداڵە! خۆت دەزانی من دارستانەکەم لە ئێوە کڕیوە، بەڵام بڕوام پێبکە من تەنیا بۆ شانازییەکەی دەیکڕم. حەزدەکەم ریابی نین بێت نە کەسێکی تر کە دارستانی لە حەزرەتی ئابلۆنسکی کڕیوە. ئەگەر خودا بیهەوێ بەهرەو قازانجێکی کەمیش بە ئێمە دەگا، بەڵام هیچ شتێ مەعلووم نییە. خودا دەزانێ ئەوەی عەرزت دەکەم هەقیقەتە. تکایە چەند وشە بۆ گرێبەستی مامەڵەکە بنووسن.

دوای کاتژمێرێك بازرگان جلەکانی بەری رێکوپێك کرد . قۆپچەی زلی عەباکەی داخست و گرێبەستەکەی نایە گیرفانی و سواری عارەبانە یەرقکوتەکەی خۆی بوو و رۆیشت.

بە هاریکارەکەی خۆی گوت: ئاخ لەدەست ئەو ئەربابانە! هەموویان وەکوو یەك وان.

هاریکارەکەی قایشی هەوسارەکەی دایە دەست ئەربابەکەی و لەگەڵ ئەوەی قەیتانی کەوشەکانی بۆ دەبەستەوە گوتی: راست دەفەرمووی قوربان، مامەڵەکە چی! لێی رازیی؟

ـ ئەڕێ، ئەرێ، زۆریش...

## حەڤدە

ستیپان ئارکادیچ بە گیرفانی پڕ سفتەوە کە ریابی نین بۆ سێ مانگی داهاتوو پێی دابوو، رۆیشت بۆ نهۆمی سەرێ. مامەڵەی فرۆشتنی دارستانەکە سەریگرتبوو و گیرفانی پڕ بووبوو لە پارە، راو لە شوێنی جووتگیریی باڵندان زۆر خۆش بوو و ستیپان ئارکادیچ زۆر کەیفساز و بەنەشە بوو، هەر بەو هۆیەش حەزی دەکرد خەفەت لە دڵی هاوڕێکەی بتارێنێ. پێی خۆشبوو رۆژ کە لە سەرەتاوە بە خۆشی دەستی پێکردبوو هەر ئاواش بە خواردنی شێو کۆتایی پێبێنێ.

لەڤین هیچ نەشەی نەبوو، ئەگەرچی زۆری حەزدەکرد لەگەڵ میوانەکەی سەروڕوو خۆش و مێهرەبان بێ، بەڵام نەیدەتوانی بەسەر دڵتەنگی و بەدخولقییەکەیدا زاڵبێ. هەواڵی شوو نەکردنی کیتی گەشە و نەشەی خستبووە دڵییەوە بەڵام ئێستا وردە وردە خەریکبوو پەرێشانی دەکرد.

کیتی زەماوەندی نەکردبوو و نەخۆش بوو. نەخۆشیی ئەشقی کەسێك کە دڵی شکاندبوو و گرینگی بە خۆشەویستییەکەی نەدابوو. کیتیش لەگەڵ ئەو، یانی لەگەڵ لەڤین ئاوا جووڵابۆوە. هەر بۆیە ڤرۆنسکی هەقی بوو بە چاوی سووك بڕوانێتە لەڤین و هەر بەو هۆیەش نەیاری ئەو بوو. بەڵام لەڤین بیری لەو شتانە نەدەکردەوە. بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ هەستی دەکرد لە هەموو حاڵێکدا شتێك ئازاری دەدا و رقەکەشی بە دژی ئەو شتە نەبوو کە تووشی ئازاری کردبوو، بەڵکوو لەگەڵ هەموو ئەو شتانەی کە لە هەمبەریدا بوون تووڕە و جینگزی بوو. فرۆشرانی گەوجانەی لێڕەوارەکە و فریوخواردنی ئابلۆنسکی لە ماڵەکەی ئەودا رووی دابوو، بۆیە ئەوەندەی تر رقی هەستابوو.

لە نهۆمی سەرێ هات بەرەوپیری ستیپان ئارکادیچ و گوتی: دەی، تەواوبوو؟ حەزدەکەی شێو بخۆین؟

ـ بەڵێ، با بیهێنن. لێرە سەیر ئیشتیام کراوەتەوە. چۆنبوو بۆ شام ریابینینت گل نەداوە؟

ـ چاوی دەرێ با بڕوا.

ئابلۆنسکی گوتی: بەڵام هەڵسوکەوتت لەگەڵیدا سەیر بوو. تەنانەت دەستومشتاخت لەگەڵ نەکرد. بۆ تەوقەت لەگەڵ نەکرد؟

ـ چونکە من لەگەڵ نۆکەر دەست لێنادەمەوە. تەنانەت نۆکەر سەد هێندەی ئەو ماقووڵترە.

ئابلۆنسکی گوتی: تۆ وادیارە زۆر کۆنەپەرستی! ئەی تێکەڵاویی چینەکانی کۆمەڵ دەبێ بەچێ؟

ـ لێیگەرێ ئەوانەی پێیانخۆشە با تێکەڵ بن و یەکبگرن پیرۆزیان بێ. بەڵام من حەزی پێناکەم.

ـ وادیارە زۆر کۆنەپەرستێکی وشکی.

ـ راستت دەوێ من قەتم بیر لێنەکردۆتەوە چیم. من کۆنستانتین لەڤینم. هەر ئەوە.

ستیپان ئارکادیچ بە پێکەنینەوە گوتی: ئەویش کۆنستانتین لەڤینێك کە مەیموونی بۆ هەڵپەڕینی زەردە ناگرێ.

ـ بەڵێ زۆرم رق هەستاوە و پەرۆشیشم، دەزانی بۆ؟ رقم لەو مامەڵە، داوای لێبوردن دەکەم، قۆڕ و گەوجانەیەی تۆ هەستاوە...

ستیپان ئارکادیچ رۆحسووك و مێهرەبانانە نێوچاوانی تێکنا، وەك کەسێك کە بێتاوان ئازاریان داوە و دڵیان شکاندووە، گوتی:

ـ باشە ئیتر زۆری گوێ مەدەرێ. کەی بووە کەسێك شتێك بفرۆشێ و دوای مامەڵەکە پێینەڵێن «زۆر لەوە زیاتری دەهێنا» بەڵام کاتێك دەیویست بیفرۆشێ هیچ کەس لەوە زیاتری پێ نەدەدا. وێدەچێ تۆ رقت لەو ریابی نینە چارەڕەشە بێ.

ـ ڕەنگە وابێ. بەڵام دەزانی بۆچی؟ تۆ ئێستا دیسان دەڵێی من کۆنەپەرستم و لەو قسە هەڵیتوپڵیتانە. بەڵام من بۆیە رقم هەستاوە و ئاورم گرتووە بە چاوی خۆم دەبینم نەجیمزادان، کە خۆشم لە چینی ئەوانم و لەگەڵ ئەوەشدا کە هەڤیازیی چینایەتییەکەمان هەڵوەشاوەتەوە دیسان پێوەندیی خۆم لەگەڵ نەپساندوون، ئەگەرچی هەموو خەریکن سەگ و شوانیان دێتەوە و هیچ کام ئاهێکیان بە جەرگەوە نەماوە. نابووتبوونی نەجیمزادان هۆی ئەوەش نییە کە ماڵ و سامانی خۆیان لەسەر خۆشگوزەرانی و هەڵەخەرجی دانابێ، ئەگەر بۆ ئەوە بوایە قەیدی نەدەکرد. ئەرباب دەبێ ئەربابانە بژی. چونکە تەنیا ئەوانن کە دەتوانن بەو شێوەیە بژین. ئەمڕۆ ڕەعیەتەکان خەریکن هەموویان لە دەوروپشتی ئێمە ملك و زەوی دەکڕن. هەڵبەت من لەوە نارەحەت نیم. ئەرباب دەست لە ڕەش و سپی نادات، ڕەعیەت کار دەکات و ئارەق دەڕێژێ و تەمبەڵ و تەوەزەل وەلا دەنێ و دەیانخاتە پەراوێزەوە. بڕیاری کاریش هەر ئەوەیە. من زۆرم پێخۆشە کە ڕەعیەتەکان ئاوا سەرکەوتوون. من لەوە نارەحەتم کە دەبینم نەجیمزادان ئاوا نابووت دەبن و هۆیەکەشی ڕوون نییە و نازانم چ ناوێکی لێبنێم، ئەوەش بەهۆی چەشنێ ساویلکەییەوە تووشیان بووە. لە جێیەك قۆنتەراتچییەکی لەهێستانی ملکی خاتوونێکی خەڵکی نیس بە نیوە قیمەت دەکڕێ، لە شوێنێکی تریش ملکێك کە دسیاتینی دە ڕۆبڵی دەهێنا دسیاتینی بە یەك ڕۆبڵ بە بازرگانێکیان داوە بە ئیجارە. تۆ ئەمڕۆ بە بێ هیچ هۆیەك سی هەزار ڕۆبڵت بەو کابرا کلاوچییە بەخشی.

ـ دەی چ بکەم؟ داری لێڕەوارەکە دانە دانە بژمێرم؟

ـ جا ئەوە دیارە دەبێ بیژمێری. تۆ نەتبژاردوون، بەڵام ریابی نین هەمووی بژاردووە. منداڵەکانی ریابینین لە ئاسایشدا دەبن و دەتوانن درێژە بە خوێندن بدەن، بەڵام منداڵەکانی تۆ ڕەنگە نەتوانن.

ـ بەڵام، داوای لێبوردن دەکەم، من لەو دار بژاردنەدا سووکایەتی دەبینم. کاری ئێمە شتێکە و کاری ئەوان شتێکی تر. دەبێ ئەوانیش قازانجێکیان پێبگا. وەلحاسڵ کارەکە کۆتایی پێهاتووە و لەسەری نەڕۆین باشە. ئەمەش هێلکەوڕۆن کە من لە هەموو ئەو چێشتانەم پێخۆشترە کە بە هێلکە لێدەنرێن. ئاگافیا میخائیلۆڤنا هەر ئێستا لەو ڤۆدکا بۆنخۆشەمان بۆ دێنێ کە کەیفی لەلایە.

ستیپان ئارکادیچ لە پشت مێزەکە دانیشت و دەستی کرد بە گاڵتە کردن لەگەڵ ئاگافیا میخائیلۆڤنا و خاترجەمی دەکرد کە ماوەیەکی زۆرە فراوێن و شێوی ئاوا خۆشی نەخواردووە.

ئاگافیا میخائیلۆڤنا گوتی: چاکە ئێوە لانیکەم تاریفێك لە نان و چێشتەکەم دەکەن، بەڵام کۆنستانتین دیمیتریچ هەرچی لە پێشی دانێی دەیخوات و هەڵدەستێتە سەرپێ، تەنانەت ئەگەر نانی وشکی و بێپێخۆریش بێ.

لەڤین هەرچەندە هەوڵی دەدا بەسەر گرژی و بەدخولقییەکەیدا زاڵ بێ نەیدەتوانی و گرژ و رووتاڵ دانیشتبوو و قسەی نەدەکرد. دەیویست پرسیارێك لە ستیپان ئارکادیچ بکات بەڵام نەیدەزانی پرسیارەکەی چۆن و کەنگێ ئاراستە بکات. ستیپان ئارکادیچ چووبوە خوارێ و لە ژوورەکەی جلەکانی داکەندبوو و سەر و گیانی شۆردبوو، کراس خەوێکی چکۆلە و نەرمی لەبەرکردبوو و خۆی لە گەزدابوو. لەڤین بەردەوام لە ژوورەکەیدا ئەمپا و ئەوپای بوو و قسەی هەڵێتوپڵێتی دەکرد و نەیدەتوانی ئەوەی لە دڵیدایە دەریبڕێ.

پارووێك سابوونی بۆنخۆش کە ئاگافیا میخائیلۆڤنا بۆ میوانەکەی هێنابوو بەڵام ئابلۆنسکی دەستی لێنەدابوو هەڵیگرتبوو و چاوی لێدەکرد. سابوونەکەی لە بەرگە کاغەزییەکەی دەرهێنا و گوتی: ئەو سابوونانە چەندە جوان دروست دەکەن. چاوی لێکە، بۆخۆی بەرهەمێکی هونەرییە.

ستیپان ئارکادیچ دڵخۆشانە باوێشکی دەدا و فرمێسکی شادی لە چاویدا قەتیس مابوو گوتی: بەڵێ، ئەمڕۆ گەشەکردن لە هەموو بوارەکاندا وەبەرچاو دەکەوێ، بۆ وێنە لە شانۆ و هەموو ئەم ئامڕاز و کەرەسە پێویستانەی ژیاندا... دیسان باوێشکێکی تری داو پاشان گوتی: کارەباش بۆ هەموو شوێنێك کێشراوە...

لەڤین گوتی: بەڵێ، کارەبا... سابوونەکەی لەسەر جێگاکەی خۆی دانایەوە و لەناکاو پرسیی: ئێستا ڤرۆنسکی لەکوێیە؟

ستیپان ئارکادیچ باوێشکەکەی لەبیر چۆوە و گوتی: ڤرۆنسکی؟ لە پترزبۆرگە. ماوەیەك دوای رۆیشتنی تۆ ئەویش رۆیشت و تا ئێستاش بۆ جارێکیش نەگەڕاوەتەوە بۆ مۆسکۆ- هەنیشکی نایە سەر کورسییەکە و روخساری جوان و سوورهەڵگەڕاوی خۆی بە چاوی خەواڵوو و مێهرەبان و گەشەوە کە وەك ئەستێرە دەدرەوشایەوە، لەسەر لەپی دەستی دانا و گوتی: دەزانی چی کوستیا، گوێ بگرە با راستییەکەت پێبڵێم، خەتای خۆت بوو. تۆ لە رەقیبەکەت ترسای. من هەروەك ئەو کاتەش گوتم دەزانم کە بەخت و یەغباڵ زیاتر لەگەڵ کام لاتانە. بۆ راست نەڕۆیشتییە پێشێ و جەسوورانە... ـ بێ ئەوەی دەمی لێکبکاتەوە، تەنیا بە شەویلکە باوێشکی دا.

لەڤین چاوی لە ئەو بڕیبوو بەڵام بەخۆی گوت «یانی نازانیٚ کە من پیٚشنیاری ژیانی هاوبەشم پیٚکردووە؟ جۆریٚك ڕەنگی مەرایی و سیاسەتوانی لە روخساریدا دەبینم.» هەستی کرد سوورهەڵگەڕاوە و بیٚ ئەوەی شتیٚك بڵیٚ ڕاست چاوی لە چاوی ستیپان ئارکادیچ بڕی.

ئابلۆنسکی دریٚژەی بە قسەکانی دا: ئەگەر بکریٚ بڵیٚین کیتی دەرهەق بە ڤرۆنسکی هەستیٚکی هەبووە تەنیا شتیٚکی رواڵەتی بووە. دەزانی ئەو ناو و ناوبانگە بەرچاوە و باقوبریق و پلەوپایەی داهاتوو، نەك هەر کیتی بەڵکوو دایکیشی هەڵخەڵەتاندبوو.

لەڤین گرژ بوو. ئەو سووکایەتییەی کاتی پیٚشنیارەکەی تامڵی کردبوو وەك زامیٚکی تەشەنا کردوو دیسان کولابۆوە و دڵی وەژان خستبوو. لە ماڵی خۆیدا بوو و لە ماڵیٚشدا دیوارەکان پشتیوانی مرۆڤن.

پەڕییە نیٚو قسەکانی ئابلۆنسکییەوە و گوتی: سەبرکە، سەبرکە، باسی ناو و ناوبانگ دەکەی. ئیزنم بدە با لیٚت بپرسم ناو و ناوبانگ و نەجیمزادەیی و شکۆی ڤرۆنسکی یان هەرکەسیٚکی تر لە چیٚدایە کە بەهۆی ئەوەوە ڕەوایە من پیٚشیٚل بکات؟ تۆ ڤرۆنسکی بە نەجیمزادە دەزانی، بەڵام من نا. کەسیٚك کە باوکی بە فیٚڵ و تەڵەکە و دەغەڵی لە هیچەوە بە هەموو شتیٚك گەیشتووە و دایکی خودا دەزانیٚ لەگەڵ کیٚ پیٚوەندیی هەبووە... نا، دەبیٚ ببووری، من خۆم بە نەجیمزادە دەزانم و کەسانیٚك کە وەك خۆم بتوانن لە ڕەچەڵەکی خۆیان سیٚ بەرە مرۆڤی بە شەڕەف نیشان بدەن کە لە بواری زانست و فەرهەنگدا باڵاترین پلەوپایەیان هەیە، با مرخ و هۆش وەلانیٚین، وەك باوك و باپیری من هیچ کات سەریان بۆ کەس دانەنواندبیٚ و سووکایەتییان قەبووڵ نەکردبیٚ و چاو لە دەستی کەسیش نەبووبیٚتن... بەڵیٚ، من زۆر لەو جۆرە کەسانە دەناسم. بە بڕوای تۆ شوورەییە کە من داری لیٚڕەوارەکەم ببڕیٚرم و تۆش سی هەزار ڕۆبڵی خۆت بکەیتە چنگی ریابینینەوە. بەڵام تۆ دەتوانی لە ملکەکانی خۆت ئیجارە وەرگری یان هەر سوود و داهاتیٚك وەدەست دیٚنی کەیفی خۆتە. بەڵام من لەو جۆرە قازانجانەم وەگیر ناکەویٚ، هەر بەو هۆیەش ئەو ملکانەی لە باب و باپیرانەوە بە میرات بۆم ماوەتەوە یان بە زەحمەتی خۆم وەدەستم هیٚناوە بەلامەوە خۆشەویستە. نەجیمزادە ئیٚمەین نەك ئەو کەسانەی کە لەسەر بەخشین و پیٚشکەشیی زۆرداران دەژین و بە ئاسانی و بە هەرزان دەیانکڕن.

ستیپان ئارکادیچ سادقانە و بە پیٚکەنینەوە گوتی: ئەوانەت لەگەڵ کیٚیە؟ من لەو بارەوە هیچ دژایەتییەکم لەگەڵ تۆ نییەـ ئەوەی گوت، بەڵام زۆری پیٚخۆشبوو کە لەڤین ئاوا شۆر و شەوقیٚکی هەیە. پاشان گوتی: ئەو قسانە لەگەڵ من مەکە. ئەگەرچی زۆربەی ئەو شتانەی سەبارەت بە ڤرۆنسکی گوتت ڕاست نییە. بەڵام من ئیٚستا نامەویٚ بپەڕژیٚمە سەر ئەو باسە. تەنیا بە ڕاشکاوی پیٚتدەڵیٚم ئەگەر من لەجیاتی تۆ بوایەم پیٚکەوە دەچووین بۆ مۆسکۆ و...

ـ نا، من نازانم تۆ دەزانی یا نا، بەڵام گرینگ نییە. ئێستا بۆت باس دەکەم. من پێشنیاری ژیانی هاوبەشم بە کاترینا ئەلکساندرۆڤنا کرد و ئەو دەستی بە رووەوە نام. بۆیە ئێستا ئەو بۆ من تەنیا بیرەوەرییەکی تاڵ و پڕ شوورەییە.

ـ بۆچی؟ ئەو جەفەنگ و قسە قۆڕانە چییە؟!

ـ دەی باشە با هەر باسی نەکەین. ئەگەر هەڵسوکەوتیشم لەگەڵ تۆ وشك و ساردوسڕ بوو داوای لێبوردن دەکەم ـ ئێستا کە قسەی خۆی کردبوو و ئەو بارە قورسەی لەسەر دڵی لابردبوو، بووبۆوە بە لەڤینە لێو بەبزەکەی بەیانی و بە پێکەنینەوە دەستی هاوڕێکەی گرت و گوتی: ستیڤا، تکات لێدەکەم پێمبڵێ، لێم زویر نەبووی؟

ـ نا، چۆن لە تۆ زویر دەبم. لەبەرچی؟ زۆرم پێخۆشە ئەو قسانەمان کرد. بەڵام دەزانی راوی بەیانیان زۆر خۆشە. ئامادەی سبەینێ بەیانیش بچین؟ من دوای راوەکە پشوو نادەم و راست دەڕوم بۆ وێستگە.

ـ زۆر چاکە، دەچین!

## هەژدە

ڤرۆنسکی ئەگەرچی لە ژیانی دەروونیی خۆیدا جگە لە ئەشقەکەی هیچی تری تێدا نەبوو، بەڵام ژیانە ئاساییەکەی هەر ئەوە بوو کە بوو و لەسەر رەوتی پێشوو و پێوەندییەکانی لە کۆڕ و کۆبوونەوە و چوارچێوەی سەربازگەدا دەچووە پێشێ و هیچ کەس نەیدەتوانی رایگرێ. سەربازگە و مەسەلە پێوەندیدارەکان بەوەوە لە ژیانی ڤرۆنسکیدا شوێنی تایبەتی خۆی هەبوو، چونکە یەکە و کارەکەی خۆی زۆر بەلاوە شیرین بوو، لەوەش گرینگتر ئەوە بوو کە، ئەفسەر و هاوکارەکانی زۆریان خۆش دەویست. ئەفسەرانی هاوقەتاری تەنیا خۆشەویستییان بۆ ئەو نەبوو بەڵکوو زۆریشیان رێز بۆ دادەنا و شانازییان پێوە دەکرد. ئەوان هەستیان بە شانازی دەکرد کە لاوێکی ئاوا دەوڵەمەند و ساماندار و خوێندەوار، کە خاوەن توانایی زۆرە: لاوێك کە رێگای هەموو چەشنە سەرکەوتنێکی لەبەر دەمدایە و دەتوانێ سەرکەوتووانە پێیبگا و هیچ پلەوپایە و ئامانجێك نییە کە نەتوانێ و دەستی پێینەگات. بەڵام گوێ بە هیچ کام لەو شتانە نادات و لە نێو هەموو ئاوات و حەزەکانی ژیاندا تەنیا دڵی بە خۆشەویستی و هاوڕێیەتیی برادەرانی هاوقەتاری دەکرایەوە. ڤرۆنسکی لەو بیروڕا و باوەڕەی هاوڕێیانی دەرهەق بە خۆی

ئاگاداربوو و جگە لەوەش ئەو چەشنە ژیانەی بەلاوە شیرین بوو بۆیە هەستی دەکرد ئەرکی سەرشانییەتی کە ئەو خۆشەویستی و باوەڕەی هاوقەتارانی بپارێزێ.

دیارە سەبارەت بە ئەوینەکەی خۆی لەگەڵ هیچ کام لە هاوڕێیانی قسەی نەدەکرد و تەنانەت لە کاتی سەرخۆشیشدا ئەوەی کە نەدەکرا بیڵێ (ئەگەرچی قەت ئەوەندەی نەدەخواردەوە کە ئاگای لە زمانی خۆی نەمێنێ). هەرکاتێکیش هاوڕێیانی بەهۆی کەمتەرخەمییەوە دەیانویست ئاماژە بەو پێوەندییەی بکەن، لەڕێوە بەرپەرچی دەدانەوە. ئەگەرچی هەموو خەڵکی شار ئاگاداری ئەشقەکەی بوون ـ هەمووشیان دەیانزانی چ پێوەندییەکی لەگەڵ ئانا کارنینا هەیە ـ بەڵام زیاتر لاوەکان، بەهۆی ئەوەی ئەشقەکەیان بەلاوە دژوار بوو، یانی دەیاندی کە کارنین خاوەنی چ پلەوپایەیەکی کۆمەڵایەتییە و لەبەر چاوی کۆمەڵ زۆری گرینگی پێدەدرێ، ئێرەییبیان پێدەبرد.

زۆربەی ژنە جحێڵەکان کە لەمێژەوە ***ناوبانگی داوێنپاکیی*** کارنینایان بیستبوو، بەو هۆیەوە بەخیلییان پێدەبرد، بۆیە حەزیان بەو خلیسکانەی دەکرد و تەنیا چاوەڕوان بوون کە ناوی لە نێو کۆمەڵدا بزڕێ و وایلێبێ ئیتر بە چاوی سووک لێیبڕوانن و بکەوێتە ژێر گوشاری سووکایەتی و ئابڕووی ببێتە ئاردی نێو دڕوو. بۆیە هەر لە ئێستاوە تۆپەڵە قوڕیان ئامادەدەکرد بۆ ئەوەی لەکاتی خۆیدا سەری لە قوڕ بگرن . بەڵام بەساڵاچووان و خاوەن پلەوپایەکان زۆر نیگەران بوون کە دەیاندی خەریکە تووشی هەڵە و ئابڕووتکان دەبێ.

دایکی ڤرۆنسکی، کە لەو پێوەندییە ئاگاداربوو سەرەتا زۆری پێخۆش بوو. هۆی خۆشحاڵییەکەشی ئەوەبوو کە پێیوابوو هیچ شتێك بەقەد ئەوە کاریگەریی نییە کە لاوێکی خاوەن کەسایەتی و هەڵکەوتە بۆ کاملکردنی مگێز و تاسەی لاوەتی لەگەڵ خاتوونێکی پایەبەرز پێوەندیی ئاشقانەی هەبێ. هەروەها بەو هۆیەش کە ئەم کارنینایەی کە تا ئەو رادەیە سەرنجی کۆنتس ڤرۆنسکایای راکێشاوە و ئەو هەمووە باسی کوڕەکەی دەکات، دەردەکەوێ کە لەگەڵ ژنانی شۆخوشەنگ هیچ جیاوازییەکی نییە. بەڵام لەم دواییانەدا ئاگادارکرابۆوە ئەو پلەی کە بە کوڕەکەی پێشنیار کرابوو و زۆر گرینگ بوو بۆ داهاتووی، تەنیا بەو هۆیە کە لە سەربازگەدا دەمێنێتەوە و درێژە بە پێوەندی و چاوپێکەوتنەکانی لەگەڵ کارنینا دەدات رەتکرابۆوە و سەرانی باڵاش هەر بەو هۆیە لێی زویربووبوون و هەر ئەوەش بووبووە هۆی ئەوەی کە کارنینای لەبەرچاو بکەوێ. شتێکی تریش هەبوو کە ئەو خاتوونەی تووشی دڵەڕاوکێ و خەفەت کردبوو، ئەویش ئەوە بوو دەیدی ئەو پێوەندییە لەگەڵ ئەو پێوەندییە جوان و گەرموگوڕانەی کە لە نێوان گەوراندا هەیە و ئەم بەلایەوە پەسندە، زۆر جیاوازە. پێوەندییەکە جۆرێکی دیکەیە و هەروەك بیستبووی

کە ئەوە ئەشقێکی سووتێنەرە و لەوانەیە بەرەو ئاکارێکی ناحەز و گەوجانەی بکێشێ. ئەو لەو کاتەوە کوڕەکەی نەدیتبوو کە بێ ئەوەی ئاگاداری بکاتەوە مۆسکۆی بەجێ هێشتبوو، بۆیە لە ڕێگای کوڕە گەورەکەیەوە هەواڵی لێناردبوو کە بچێت بۆ دیدەنیی.

برا گەورەکەشی لێی زیز بوو چونکە تێنەدەگەیشت کە ئەوە چ ئەشقێکە، ئەشقێکی قووڵە یان ئاسایی، گەرم و سووتێنەرە یان نەرم و ئارام. گەندەڵە یان پاك (ئەو ئەگەرچی خۆی ژن و منداڵی هەبوو بژیوی سەماکەرێکی دابین دەکرد کە حەزی لێدەکرد. بۆیە لەو لایەنەوە نەیدەتوانی ڕەخنە لەو بگرێ.) بەڵام چونکە دەیزانی هیچ کەس ئەو ئەشقەی ڤرۆنسکی بە شیاو نازانێ و بەلایانەوە ناپەسندە ئەویش لەو کارە ناڕازی بوو.

ڤرۆنسکی جگە لەوەی زۆر دەروەستی کاروباری سەربازگە و دانیشتنی کۆڕ و کۆبوونەوەکان بوو، پیشەیەکی تریشی هەبوو کە ئەویش ئەسپسواری بوو و لەڕادەبەدەر حەزی پێدەکرد.

ئەو ساڵە بڕیاربوو ئەفسەرانی سوارەنیزام کێبەرکێی ئەسپسواریی لەمپەدار وەڕێبخەن. ڤرۆنسکی لەو کێبەرکێیەدا ناونووسیی کردبوو و ئەسپێکی ڕەسەنی ئینگلیزیی کڕیبوو، ئەگەرچی دڵی کەوتبووە داوی ئەوینەوە بەڵام بە هۆگرییەکی زۆرەوە هەوڵیدەدا وا بنوێنێ کە زۆری حەز لێی نییە، کەچی بەدەست خۆی نەبوو و دڵی بۆ ئەو کێبەرکێیە دەیکورکاند.

ئەو دوو ئەشقەی ڤرۆنسکی پێکەوە سازگار نەبوون و ئەو پێویستی بە هۆگری و پیشەیەکی وا هەبوو کە زۆر لە داوی ئەشقی ئانادا نەبێ و بتوانێ بە یارمەتیی ئەو ڕۆحی خۆی شاد بکات و هەیەجان و شەپۆلانی ئەوین دامرکێنێتەوە.

## نۆزدە

ڕۆژی کێبەرکێی ئەسپسواری کە لە کراسنۆیەسلۆ[٩٩] بەڕێوەچوو، ڤرۆنسکی زووتر لە کاتی ئاسایی گەیشتە هۆڵی میوانداریی باشگای ئەفسەران بۆ ئەوەی ئیستەیکێ بخوا. پێویستیش نەبوو لە خواردندا زێدەڕەوی بکات چونکە کێشی لەشی وەك جاران ڕاست چوار پووت و نیوەکە بوو، بەڵام نەدەبوو قەڵەو بێ و هەر لەبەرئەوەش پارێزی لە خواردنی ئاردی و شیرینی دەکرد. قۆپچەی باڵتەکەی کردبۆوە و هێلەگە سپییەکەی وەدیار کەوتبوو و هەردوو دەستی لەسەر مێزەکە دانابوو و چاوەڕوانی ئامادەکرانی ئیستەیکەکە بوو کە داوای کردبوو. خەریکی

99-Krasnoye selo

خوێندنەوەی ڕۆمانێکی فەڕەنسی بوو و لەسەر دەورییەکەی بەردەمی داینابوو. تەنیا بەو هۆیەش خۆی بە خوێندنەوەی کتێبەکەوە سەرقاڵ کردبوو، بۆ ئەوەی ناچار نەبێ لەگەڵ ئەو ئەفسەرانە قسە بکات کە دێن و دەچن و بتوانێ بە ئارامی دانیشێ و بیر بکاتەوە.

لەبیری ئەوەدا بوو سەردانی ئانا بکات. ئانا بەڵێنی پێدابوو هەر ئەو ڕۆژە دوای کێبەرکێی ئەسپسواری چاوی پێببکەوێ. بەڵام ڤرۆنسکی سێ ڕۆژ بوو ئانای نەدیتبوو و چونکە کارنین لە سەفەری هەندەران گەڕابۆوە نەیدەزانی بەڵێنەکە هەروا لەجێی خۆیەتی یان نا، نەشیدەزانی چۆن لەو مەسەلەیە ئاگاداربێ. دوایین جار لە ڤیلای[100] کچەکەی مامی چاوی پێیکەوتبوو. زۆر کەم دەچووە هاوینەهەوارەکەی کارنین، بەڵام ئەمڕۆ بڕیاری دابوو بچێت بۆ ئەوێ و لە بیری ئەوەدابوو چ بیانوویێك بۆ ئەو چوونەی بدۆزێتەوە.

«ئەها، فکری چاکە، دەڵێم بێتسی ناردوومی کە بپرسم ئانا دێت بۆ کێبەرکێکە یان نا. زۆر چاکە هەروا دەکەم...» کە ئەو بڕیارەی دا سەری لەسەر کتێبەکە هەڵگرت و لە خەیاڵی خۆیدا کە بە روونی دیدارەکەی خۆی و ئانای هێنایە بەرچاوی خۆی، گەشایەوە.

بەو پێشخزمەتەی گوت کە ئیستەیکی خستبووە سەر دەورییەکی زێوینی گەرم و هێنای لە بەردەمی داینا: کەسێك بنێرە بۆ ماڵی ئێمە و بڵێ خێرا سێ ئەسپ لە فایتوونەکە بکەنـ پاشان دەورییەکەی کێشا پێشەوە و ملی لە خواردن نا.

لە هۆڵی تەنیشتییەوە کە تایبەتی یاریی بیلیارد بوو دەنگی مشتومڕ و پێکدادرانی گۆ و قاقاکێشان دەهات. دوو ئەفسەر خۆیان بە ژووورێدا کرد. یەکیان لاوێکی کز و بەلەباریکە بوو و تازە لە زانکۆوە هاتبووە ریزی هێزەکەی ئەوانەوە، ئەوی دیکەشیان بەساڵاچوویێکی قەڵەوبوو، دەسبەندێکی لە مەچەکی کردبوو، چاویشی لەبەر قەڵەوی تەنیا دوو درزی مابوو.

ڤرۆنسکی چاوێکی لێکردن و نێوچاوانی تێکنا، وەك ئەوەی ئاگای لە هاتنیان نەبێ، سەری بەسەر کتێبەکەیدا گرتبوو بەدەم خوێندنەوەوە دەستیکرد بە خواردن.

ئەفسەرە قەڵەوەکە هات لە تەنیشتی دانیشت و گوتی: دەی، ئەوە خەریکی خۆت تێر و بەهێز دەکەی بۆ کێبەرکێکە؟

ڤرۆنسکی هەروا بە مرومۆچی دەمی سڕی و بێ ئەوەی چاو لە ئەفسەرە قەڵەوەکە بکات، وەڵامی دایەوە: ئەوە دیبینی!

---

١٠٠- واباو بوو ئەو کەسانەی کە پیشەکەیان ئیزنی نەدەدان هاوینان لە شار برۆنە دەرێ لە ناوچەکەدا ڤیلایەکیان بۆ بنەماڵەکەیان دەگرت و شەوانە یان بۆ پشوودانی کۆتایی حەوتوو دەچوونە ئەوێ.

قەڵەوە کورسییەکی بۆ ئەفسەرە لاوەکە سووڕاند کە دانیشێ و گوتی: ناترسی قەڵەو بی؟

ڤرۆنسکی بە وەڕەزییەوە ناوچاوانی تێکنا و گرژ بوو، بە جۆرێك کە ریزی ددانە رێکەکانی وەدیار کەوتن و بە ناقایلییەکەوە گوتی: چیتگوت؟

ـ دەڵێم ناترسی قەڵەو بی؟

ڤرۆنسکی دەنگی هەڵێنا: گارسۆن، پەرداخێکم خێرێس بۆ بێنە ـ پاشان کتێبەکەی لەولای دەورییەکەوە دانا و بێ ئەوەی وەڵامی ئەفسەرەکە بداتەوە، درێژەی بە خوێندنەوە دا.

ئەفسەری قەڵەو لیستەی شەڕابەکانی هەڵگرت و رووی کردە ئەفسەرە لاوەکە و گوتی: داوای چیبکەم؟ با بە ئیشتیای تۆ بێ.

ئەفسەرە لاوەکە شەرمنانە و بە لاچاوێك لە ڤرۆنسکیی روانی و لەگەڵ ئەوەدا کە دەیویست سمێڵە تازە هاتووەکەی بە قامك بگرێ گوتی: شەڕابی راینـ کە دیتیشی ڤرۆنسکی لووتیان پێدانانێ هەستا و گوتی: با بچین بۆ هۆڵی بیلیارد.

ئەفسەرە قەڵەوەکە زۆر گوێڕایەڵانە هەستا و رۆیشتن بۆ لای دەرگاکە.

لەو کاتەدا ئەفسەرێکی کەڵەگەتی چوارشانە، کە ناوی ملازم یاشڤین[١٠١] بوو، هاتەژوورێ و وەك سووکایەتی سەرێکی بۆ لای ئەو جووتە لەقاند و لە ڤرۆنسکی نزیکبۆوە.

دەستە پان و قامکە خەریتەکەی بە توندی لە شانی ڤرۆنسکی کوتا و بە دەنگێکی بەرز گوتی: سڵاو، دیمانەت بەخێر! ـ ڤرۆنسکی بە تووڕەیی سەری وەرسووڕاند.

بەڵام خێرا رەنگی روخساری ئارام بۆوە و خوێنی میهرەبانیی تێگەڕا.

سەروان بە دەنگی بۆڕ و بەرز گوتی: ئافەرم ئالیۆشا[١٠٢]، کەم دەخۆی و تەنیا پەرداخێکی چکۆلەش شەڕاب دەنۆشی.

ـ ئاخر برسیم نییە.

ئەفسەرەکە بە چاوێکی پڕ سووکایەتییەوە لەو دوو ئەفسەرەی روانی کە خەریکبوون لە هۆڵەکە دەچوونە دەرێ و گوتی: ئەو جووتەش دەڵێی چەقەن پێکەوە نووساون ـ لە پەنای ڤرۆنسکی دانیشت و ران و رەفیچکەی لە پانتۆڵە سواری و جەزمە مل درێژەکەی توند بووبوون و هەردوو چۆکی نووشتابوونەوە و دەتگوت هەر ئێستا پانتۆڵەکەی دەتەقێ. گوتی:

---

101- Yachvine

١٠٢- سووکەڵە ناوی ئەلکسی.

ـ چۆن بوو دوێشەو نەهاتی بۆ شانۆی کراسنێنسکی[103]؟ بەرنامەکەی زۆر خۆش بوو، لە کوێ بووی؟

ڤرۆنسکی وەڵامی دایەوە: لە ماڵی تۆرسکایا مامەوە.

یاشڤین تەنیا گوتی: ئەها!

یاشڤین قوماربازێکی لەزەبر و مەیخۆرەوەیەکی بێهاوتا بوو، نەك هەر گوێی بە یاسا و ڕێوشوێنە ئەخلاقییەکان نەدەدا بەڵکوو خدەو ئاکارێکی زۆر خراپیشی هەبوو. ئەو لە سەربازگەکەدا یەکێك لە باشترین هاوڕێیانی ڤرۆنسکی بوو.

ڤرۆنسکی ئەوی بە هۆی وزە و هێزە نائاساییەکەیەوە خۆش دەویست کە ئەوەش لە کاتی زۆر خواردنەوەی بادە و توانایی خۆڕاگری لە هەمبەر مەستیدا و لەگەڵ ئەوەشدا شاد و بەنەشە مانەوەی وەدیار دەکەوت، هەروەها بە هۆی وزە زەینییەکەشییەوە خۆشی دەویست کە کاتی پێوەندی و هەڵسوکەوت لەگەڵ بەرپرسان و هاوڕێیانی خۆی رادەنا و وای لێدەکردن بە چاوی ترس و ڕێزەوە لێیبڕوانن. هەروەها بە هۆی جەسووری و شارەزابوونی لە یاریدا کە بردنەوە و دۆڕاندنی دەگەیشتە دەیان هەزار ڕۆبڵ. هەمیشە سەرەڕای ئەوەی زۆری دەخواردەوە بە وردی و متمانەوە یاریی دەکرد، بەجۆرێك کە لە باشگای ئینگلیزیدا هاوتای نەبوو. جگە لەوانەش ڤرۆنسکی بۆیە ڕێزی بۆ دادەنا و خۆشی دەویست چونکە دەیزانی و هەستی دەکرد یاشڤین ئەوی لەبەر خۆی خۆش دەوێ نەك لەبەر سامان و ناو و پلەوپایەکەی. لە نێو هاوڕێیانیدا یاشڤین تەنیا کەسێك بوو کە ڤرۆنسکی حەزی دەکرد باسی ئەوینەکەی خۆی لەلا بکات. ئەگەرچی واوێدەچوو یاشڤین بۆ ئەو شتانە ساردوسڕ و بێعاتیفە بێ. ڤرۆنسکی هەستی دەکرد کە ئەو تەنیا کەسێکە کە دەتوانێ تێبیگات و بزانێ چ ڕەشەبا و فەرتەنەیەك ژیانی ئەوی داگرتووە و خەریکە لە خۆیەوە دەیپێچێ. بێجگە لەوەش دڵنیا بوو کە یاشڤین حەز بە ئابڕووچوون و سووکبوونی ئەموئەو و قسەی پاشملە ناکات و هەستی ئەو تەنیا شتە جوان و شیاوەکان دەبینێ. یانی دەیزانی و لەسەر ئەو باوەڕەش بوو کە ئەو ئەشقە گاڵتە نییە و بەهانەیەکیش نییە بۆ ڕابواردن، بەڵکوو شتێکی زۆر گەورە و جیددییە.

بەڵام ڤرۆنسکی سەبارەت بە ئەشقەکەی لەگەڵی نەدەدوا، ئەگەرچی دەیزانی ئەو لە هەموو شتێك ئاگادارە و بە شێوەیەکی زۆر شیاو تێدەگا. کاتێك ئەوەشی لە چاویدا دەخوێندەوە حەزی دەکرد و دەگەشایەوە.

کاتێك ڤرۆنسکی گوتی: کە شەوی ڕابردوو لە ماڵی تورسکایا بووە یاشڤین گوتی: ئائا، بەڵێ! ـ چاوە ڕەشەکانی بریقەی هات و دەستی کرد بە بادانی سمێڵی چەپەی و لێوی بە سمێڵەکەوە دەبرد بە دەمی خۆیدا. ئەوەش خووخدەیەکی خراپ بوو کە دەستبەرداری نەدەبوو.

---

103- Krasnensky

ڤرۆنسكی گوتی: ئەتۆ دوێشەو چیت كرد؟ بردتەوە؟

ـ هەشت هەزار. بەڵام سێ هەزاری هێشتا نەدراوە و وێدەچێ لۆتیخۆری بكات.

ڤرۆنسكی بە پێكەنینەوە گوتی: چاكە، كەوایە ئێستا دەتوانی لەسەر من گرێو بكەیت و بیدۆڕێنی. (یاشڤین بە بڕێكی زۆر پارە گرێوی لەسەر ڤرۆنسكی كردبوو.)

ـ خاترجەمبە نایدۆڕێنم.

ـ تەنیا ماخۆتین جێی مەترسییە.

دەمەتەقێ لە دەوروبەری گۆڕەپانی كێبەركێی ئەسپسوارییەكە ئەو رۆژە هەر بەردەوام بوو چونكە ڤرۆنسكی نەیدەتوانی بیر لە شتێكی تر بكاتەوە.

گوتی: چاكە با بڕۆین من تەواوم كرد ـ هەستا و بەرەولای دەرگاكە ملی پێوەنا. یاشڤینش هەستا و خۆی كێشایەوە و گوتی:

ـ بۆ من زووە جارێ فراوێن بخۆم، بەڵام شتێك دەخۆمەوە و ئێستا دێم ـ بەو دەنگە گڕ و بەرز و بەهێزە فەرماندەرانەیەی كە شووشەی پەنجەرەی دەلەرزاندەوە گوڕاندی: ئەهای، پەرداخێك شەراپم بۆ بێنن! ـ هەر خێراش پاشگەز بۆوە و گوتی: نا، مەیهێنن ـ رووی لە ڤرۆنسكی كرد و گوتی: تۆ دەڕۆیتەوە بۆ ماڵێ؟ منیش دێم.

پێكەوە رۆشتن بۆ ماڵی ڤرۆنسكی.

## بیست

ماڵی ڤرۆنسكی خانوویێك بوو بە شێوازی فەنلاندی، زۆر بەرین و پاكوخاوێن بوو، بە تیغەیەك كرابوو بە دوو بەشەوە. لێرە لە هۆردوو پتریتسكی لەگەڵی هاوماڵ بوو. كاتێك ڤرۆنسكی و یاشڤین چوونە ژوورێ پتریتسكی خەوتبوو.

یاشڤین چووە ئەودیوی تیغەكە و دەستی لە شانی پتریتسكی كوتا كە بە سەروقژی ئاڵۆزەوە سەری كردبووە سەر باڵنجە نەرمەكە و گوتی: هەستە، دەی هەستە، بەسە ئیتر تێر خەو نەبووی؟

پتریتسكی لەناكاو هەستا، لەسەر چۆك خۆی بەرزكردەوە و چاوی لە دەوروپشتی خۆی كرد و بە ڤرۆنسكیی گوت: برا نەگبەتەكەت هاتووە، منی لە خەو هەستاند و گوتی دەگەڕێتەوە ـ دیسان بەتانییەكەی لە خۆی پێچایەوە و سەری كردەوە سەر بالیفەكە و بە تووڕەییەوە بە یاشڤینی گوت كە

بەتانییەکەی لەسەر لادەبرد: لە کۆڵم بەوە یاشڤین، لێمگەڕێ ـ تلێکی دا، چاوی هەڵێنا و گوتی: ئەگەر راست دەکەی فێرمکە بزانم چی بخۆمەوە. تامی دەمم هێندە ناخۆشە دەڵێی....

یاشڤین بەو دەنگە گڕ و بەرزەی کە دیاربوو زۆری دەنگی خۆی پێخۆشە گوتی: ڤۆدکا، ڤۆدکا لە هەموو شتێك باشترە. ترێشچنکۆ بڕۆ ڤۆدکا و خەیاری سوێر بۆ ئەربابەکەت بێنە.

پتریتسکی بە روخسارێکی پەرێشانەوە دەستی بە چاوانیدا هێنا و پرسیی: ڤۆدکا؟ یانی کەڵکی هەیە؟ تۆش دەخۆیەوە؟ پێکەوە؟ دەی، کەوایە ڤۆدکا بخۆینەوە! ئەو بەتانییەی کە وێنەی کەوڵی بەور بوو هەتا ژێر باغەڵی لە خۆی هالاند و هەستا و گوتی: ڤرۆنسکی، تۆ ڤۆدکا دەخۆیەوە؟

بەرەو دەرگای نێوان دوو هۆدە رۆیشت و دەستێکی هەڵێنا و بە هەوای ئۆپێرا و زمانی فەرەنسی تێیهەڵکرد «لە شاری توول هەبوو پاشایەك...[104]» ڤرۆنسکی، ڤۆدکا دەخۆیەوە؟

ڤرۆنسکی کە خەریکی لەبەرکردنی پاڵتۆکەی بوو کە پێشخزمەتەکەی بۆی گرتبوو، گوتی: بڕۆ بەلای کاری خۆتەوە.

یاشڤین پرسیی: بۆ کوێ؟ ـ کە چاوی بە عارەبانە سێ ئەسپەکە کەوت نزیك دەبۆوە گوتی: ئەوەتا، ئەوەش عارەبانە.

ڤرۆنسکی گوتی: دەچم بۆ گەوڕی ئەسپەکان و پاشان دەبێ بچم بۆ لای بریانسکی[105].

ڤرۆنسکی بەڕاستی بەڵێنی دابوو کە بچێت بۆ لای بریانسکی کە دانیشتووی گوندی وێرستی پێتێرهۆڤ[106] بوو و بڕیاربوو پارەی ئەسپەکانی بۆ بەرێ و هیوادار بوو کە دەرفەتێکی بۆ هەڵکەوێت و بچێت بۆ ئەوێش. بەڵام هاوڕێیانی خێرا تێگەیشتن کە ئەو دەیهەوێ بۆ شوێنێکی تر بچێت.

پتریتسکی کە هەروا خەریکی چڕینی ئۆپێراکە بوو چاوێکی قرتاند و لێوی خڕ کردەوە، وەك ئەوەی بیهەوێ بڵێ: چاکە ئێمە دەزانین کە ئەم بریانسکییە کێیە!

یاشڤین گوتی: لەبیرت بێ وەدرەنگ نەکەوی ـ بۆ ئەوەی باسەکە بگۆڕێ لە پەنجێرەکەوە چاوی لە ئەسپە رەسەنە ترویکاکەی کرد کە خۆی پێیفرۆشتبوو و گوتی: ئەرێ لە ئەسپەکەی من رازییت؟

ڤرۆنسکی خەریکبوو دووردەکەوتەوە کە پتریتسکی هەرای لێکرد و گوتی: راوەستە، براکەت نامەیەك و یادداشتێکی بۆ داناوی. راوەستە بزانم لە کوێم داناون.

---

١٠٤- دێڕێك لە ئۆپێرای فاوست بەرهەمی شارێل گۆنۆ.

105- Briansky
106- Peternof

ڤرۆنسکی راوەستا.

ـ دەی کوا؟ لە کوێیە؟

ـ بەڵێ، کوا؟ مەسەلەکە ئەوەیەـ ئەوەی بە لەبزێکی پڕشکۆ، وەك ئەکتەرێك کە رۆڵی هاملێت بگێڕێ گوتی و قامکی شادەی لەبەر لووتیدا قیت کردەوە.

ڤرۆنسکی بە پێکەنینەوە گوتی: دەقسە بکە ئیتر، دیقت پێکردم.

ـ ئەها، خۆ کوورەکەم هەڵنەکردووە. کەوایە دەبێ لەم دەوروبەرە بێ.

ـ گاڵتەجاڕی وەلانێ. نامەکە لە کوێیە؟

ـ هەر بەڕاستی نازانم لەکوێم داناوە. رەنگە خەونم دیبێ. سەبرکە، سەبرکە، تووڕە بوونی ناوێ. ئەگەر تۆش وەکوو من دوێشەو چوار بتریت بە سلامەتیی براکەت هەڵچۆڕاندبایە لەبیرت نەدەبوو لەکوێ خەوتووی. پەلە مەکە، ئێستا وەبیرم دێتەوە.

پتریتسکی چووە پشت تیغەکە و لەسەر چرپاکەی خۆی راکشا.

ـ سەبرکە، من لێرە خەوتبووم و ئەویش لەوێ راوەستابوو. ئەرێ، ئەوەتا، ئەوەش نامەکەت ـ نامەکەی لە ژێر دۆشەکەکە خستبوو دەریهێنا.

ڤرۆنسکی نامەکەی دایکی و یادداشتی براکەی لێ وەرگرت. هەر ئەو نامەیە بوو کە چاوەڕوانی بوو بەدەستی بگا. نامەکەی دایکی هەمووی لۆمە و سەرکۆنە بوو، چونکە ڤرۆنسکی نەچووبوو بۆ لای دایکی و براکەی لە یادداشتەکەیدا بۆی نووسیبوو کە دەبێ پێکەوە قسە بکەن. ڤرۆنسکی دەیزانی کە هەردووکیان چییان دەوێ. بەخۆی گوت «پێوەندیی بە ئەوانەوە نییە» هەردووکیانی گرمۆڵە کرد لە گیرفانی پاڵتۆکەی ئاخنی تاکوو بەڕێوە بیانخوێنێتەوە. لە دالانی ماڵەکەدا تووشی دوو ئەفسەر بوو، یەکیان ئەندامی هێزەکەی خۆیان بوو ئەوی دیکەشیان ئەندامی هێزێکی تر بوو. ماڵی ڤرۆنسکی هەمیشە شوێنی کۆبوونەوەی ئەفسەران بوو.

ـ بۆ کوێ دەچی؟

ـ دەبێ بچم بۆ پیتێرهۆف

ـ لە تیزارسکۆیەوە ئەسپەکەیان بۆ هێناوی؟

ـ هێناویانە، بەلام من هێشتا نەمدیوە.

ـ دەڵێن گلادیاتۆر، ئەسپەکەی ماخۆتین دەشەلێ.

ئەوی تریان گوتی: قسەی قۆڕ دەکات. بەڵام ئێوە بەو قوڕوچڵپاوە چۆن دەتوانن بە پڕتاو لێخوڕن؟

پتریتسکی کە خزمەتکارەکەی بە ڤۆدکا و دەورییەك خەیارسوێرەوە لە بەردەمی راوەستابوو لەگەڵ چاوی بە میوانەکان کەوت دەنگی هەڵێنا: ئەها، ئەوانە رزگارکەری منن. بڕوانن ئەم یاشڤینە پێیگوتم ڤۆدکا بخۆمەوە بۆ ئەوەی حاڵم بێتەوە سەرخۆ.

یەکێك لە میوانەکان گوتی: بەڵام تۆ دوێشەو چاکت ئێمە قورمیش کرد. هەتا بەیانی نەخەوتین. پتریتسکی گوتی: بەڵام کۆتایی کارەکە زۆر خۆش بوو. والکۆڤ چووە سەربان و گوتی: خەمبار و دڵتەنگم. من گوتم: ئۆرکێسترا، هەوایەکی چەمەری لێدە. ئەویش هەر لەوێ لە سەربان لەگەڵ هەوای چەمەری خەوت.

پتریتسکی پەرداخی بە دەستەوە گرتبوو و بە روخسارێکی گرژەوە پرسیی: دەی یانی تۆ دەڵێی بیخۆمەوە؟

یاشڤین وەك دایکێك کە بیهەوێ دەوایەك دەرخواردی منداڵەکەی بدا لە ژوورسەری پتریتسکی راوەستابوو و دەیگوت: بەڵێ، بیخۆرەوە، حەتمەن ڤۆدکا بخۆرەوە دوای ئەو سۆدا بە ئاولیمۆی زۆرەوە. لە پاشانیش چۆڕێ شامپانی، بە ئەندازەی نیوە بتلێك.

ـ ئەها، ئەوە فکری چاکە. پەلە مەکە ڤرۆنسکی، پێکەوە دەیخۆینەوە.

ـ نا هاوڕێیان، خوداحافیز، من ئەمڕۆ مەشرووب ناخۆمەوە.

ـ بۆ، دەترسی قەڵەو بی؟ قەیناکا خۆمان بە تەنیا دەیخۆینەوە. سۆدا و لیمۆ بێنە.ـ ڤرۆنسکی لە ژوورەکە چووبووە دەرێ کە یەکێك قاوی لێکرد: ڤرۆنسکی!

ـ دەڵێی چی؟

ـ دەبوو مووی سەرت کورت کەیەوە، تا رادەیەکی زۆر کێشی لەشت دادەبەزی، بەتایبەت تەپڵی سەرت...

بەڕاستی ڤرۆنسکی پێشەسەری تەنك بووبوو خەریکبوو سەری تاس دەبوو. ئەو دڵخۆشانە پێدەکەنی و ددانە رێکوپێکەکەی وەدیار کەوت. کڵاوەکەی لە سەرە تاسەکەی کرد و لە ماڵێ چووەدەرێ و سواری عارەبانە بوو.

بە عارەبانەچییەکەی گوت: برۆ بۆ گەوڕ ـ نامەکانی دەرهێنا بیانخوێنێتەوە، بەڵام پاشگەزبۆوە چونکە نەیدەویست بەر لە دیتنی ئەسپەکە هۆش و بیری خۆی ئاڵۆز بکات.

## بیست و یەك

گەورە دارینەکە شوێنێکی کاتی بوو لە نزیك سبریس (گۆڕەپانی ئەسپسواری) دروست کرابوو، دەبوو دوێنێ ئەسپەکەی ڤرۆنسکییان هێنابێ بۆ ئەوێ.

ئەو هێشتا بۆ دیتنی ئەسپەکەی نەهاتبوو و لەو چەند رۆژەی رابردوودا سواری نەبووبوو و راهێنانەکەی بە راهێنەرێکی ئینگلیزی سپاردبوو. ئێستاش نەیدەزانی لە چ بارودۆخێکدا ئەسپەکەیان هێناوە بۆ ئێرە و وەزعی چۆنە. هێشتا لە عارەبانەکە دانەبەزیبوو مەیتەرەکەی، کە بە شێوەی ئینگلیزیان پێیان دەگوت «گرۆم»، لە دوورەوە ناسییەوە و قاوی لە راهێنەرە ئینگلیزییەکە کرد. کابرای ئینگلیزی کەڵەگەتێکی بەلەباریکە بوو، جووتێ چەکمەی ملدرێژی لە پێدا و کۆتێکی قوڵەی لەبەردا بوو و تۆپەڵە ریشێکی لەسەر چەناگەی هێشتبۆوە، دیاربوو سواری چاك نییە و بە قەڵافەتیدا دیاربوو، هەردوو هەنیشکی فش کردبۆوە و وەك سۆنە پاشەڵی بادەدا و بە لەرەلەر لەولاوە هات بۆ پێشوازیی.

ڤرۆنسکی بە ئینگلیزی لێیپرسی: پێمبڵێ، فرۆفرۆ چۆنە؟

دەنگی کابرای ئینگلیزی مەعلووم نەبوو لەکوێی گەروویەوە دێتە دەرێ کە: All right sir چاکە قوربان ـ کڵاوەکەی لەسەری داگرت و درێژەی بە قسەکانی دا: بەڵام واچاکە نەچی بۆ لای. دەمبێنم لە دەم نەکردووە، زۆر تۆڕ و سڵۆکە، نەچی باشترە. چونکە لەوانەیە خراپتر بێ.

ـ نا، دەبێ بچم، حەزدەکەم چاوم پێیبکەوێ.

کابرای ئینگلیزی، بە نێوچاوانێکی گرژ و بێ ئەوەی زاری لێك هەڵپچڕێ گوتی: باشە، فەرموو ـ قۆڵی راوەشاند و شلوشەوێق و تەوەزەلانە وەپێشی کەوت.

لەبەر گۆڕەپانی کێبەرکێکە چوونە نێو حەوشەیەکی چکۆلەوە. سەرباز نگابان کە لاوێکی گورج و وریا بوو و جلوبەرگی خاوێن و جوانی لەبەردا بوو، گسك بەدەستەوە پێشوازیی لێکردن و پاشان کەوتە دوایان. شوێنەکە پێنج ئەسپی لێبوو و هەرکام لە کۆزێکی جوداگانەدا راوەستابوون. ڤرۆنسکی دەیزانی ئەسپی رەقیبەکەی، یانی ئەسپە شێکەی ماخۆتین کە ناوی

گلادیاتۆره زۆر زەبەلاح و لەسەر لۆقە، ماسوولکەی سینگیشی بستێك پانە، دەبێ هەرئەو ڕۆژە هێنابێتیان بۆ ئەوێ. ئەو قەتی ئەسپەکە نەدیتبوو و زۆر کونجکاو و تامەزرۆ بوو بیبینێ و زیاتر لە ئەسپەکەی خۆی حەزی بە دیتنی ئەو ئەسپە شێیەی ماخۆتین دەکرد، بەڵام دەیزانی بەپێی یاساو ڕێسای ئەسپسواری نەك هەر نەدەبوو بیبینێ، بەڵکوو تەنانەت پرسوجۆ کردنیش سەبارەت بە ئەسپی ڕەقیبەکەی کارێکی شیاو نەبوو. کاتێك بە دالآنی نێوان کۆزەکاندا تێپەڕی ئەو گەنجەی کە لەگەڵی هاتبوو بۆ نێو گەوڕەکە لەبەر کۆزی دووهەم دەستی چەپەی هەڵبڕی و ڤرۆنسکی چاوی بە ئەسپە شێیەکی فیلەتەنی دەست و پێ بازوو کەوت. دەیزانی کە ئەو ئەسپە ڕاست گلادیاتۆرەکەی ماخۆتینە بەڵام وەك کەسێك کە ڕوو لە نامەی کراوەی بێگانەیەك وەردەگێڕێ، خێرا ڕووی کرد بەولاوە و ڕۆیشت بۆ کۆزەکەی فرۆفرۆ.

کابرای ئینگلیزی کە لە پێشییەوە دەڕۆیشت بە قامکە کەڵەی کە ژێر نینۆخە درێژەکەی پڕبوو لە چڵك ئاماژەی بۆ ئەوبەر کرد و بە لای شانیدا گوتی: ئەوە ئەسپەکەی ماك.... ماکۆ...یە ـ ئەو قەتی نەتوانیبوو ناوی ماخۆتین بە درووستی بێژ بکات.

ڤرۆنسکی گوتی: ماخۆتین؟ بەڵێ تەنیا ڕەقیبی جیددی من ئەوە.

کابرای ئینگلیزی گوتی: ئەگەر تۆ سواری ئەو ئەسپە بوایەی من گرێوم لەسەر دەکردی.

ڤرۆنسکی بە بیستنی تاریفی سوارچاکیی خۆی بزەیەکی هاتێ و گوتی: فرۆفرۆ خۆشبەزترە، ئەمەش بەهێزتر.

ـ لە کێبەرکێی لەمپەرداردا لە هەمووی گرینگتر شارەزایی سوارە و Pluckە.

ڤرۆنسکی نەك هەر Pluck، یانی تێکەڵاویی وزە و بوێریی خۆی پێکەم بوو بەڵکوو ئەرخەیان بوو کە هیچ کەس لە دنیادا ئەو توانایی‌ەی ئەوی نییە و ئەمەش لە هەموو شتێك گرینگترە.

ـ ئێوە دڵنیان کە پێویست ناکا زۆری ڕاوێچکە پێبکرێ؟

کابرای ئینگلیزی وەڵامی دایەوە: بەڵێ، پێویست ناکا ـ بە سەریشی ئاماژەی بە دەرگایەکی داخراو کردکە لە بەریدا ڕاوەستابوون و زرمەی سم لە زەوی کوتان و پڕمەی ئەسپی لێوە دەهات، گوتی: بەڵام تکایە بە دەنگی بەرز قسە مەکە، ئەسپەکە سەرشێت دەبێ.

دەرگای کۆزەکەی کردەوە و ڤرۆنسکی چووە ژووری، نێو کۆزەکە نیوە تاریك بوو و شۆقێکی کز لە دەلاقەیەکی چکۆلەوە دەهاتەژووری. ئەسپێکی کوێتی دەمبێنکراو لەسەر کای تازە ڕاوەستابوو و سمی لە تەرکی کوزەکە دەکوتا. ڤرۆنسکی کە چاوی لەگەڵ تاریکییەکە

راهات بێ ئیختیار هەر بە سەرنجێك تەواوی ئازای ئەندامی ئەسپە خۆشەویستەکەی هێنایە بەرچاوی خۆی. فرۆفرۆ ئەسپێکی دەستە و زۆریش بێعەیب نەبوو. لاقوقول باریك و سینگی ئەگەرچی زۆر هاتبووە پێشێ بەلاّم پان نەبوو. کەفەلّی داتەپیو و چوارپەلیشی بەتایبەت لاقی خوار دادەنا. دەست ولاقی کز و بێ ماسوولکە، بەلاّم تەنگەی زەلام بوو. کەلەکەشی ئێستا بەهۆی تەمرینی زۆر و ڕێژیمی خواردنەوە تێکقوپابوو و زۆری لەچاو دەدا. یەسقانی ڕەفیچکەی لە پێشەوە ئەستوورایی بەقەد قامکێك بوو بەلاّم کاتێك لە لاتەنیشتەوە تەماشات دەکرد زۆر پان بوون. لەسەریەك ئەگەر چاوپۆشی لە زگ و تەنگەی بکەی دەتگوت لە دوولاوە وەبەر مەنگەنە دراوە و بۆ لای درێژایی کێشی هاتووە. بەلاّم شتێك کە زۆر بەرچاو بوو و هەموو ئەو عەیبانەی دەشاردەوە ڕەسەنایەتییەکەی بوو. یەکسمیش ئەگەر ڕەسەن بوو ئیتر بە دەردی ئینگلیزییەکان دەڵێن هیچی تێدا ناهێڵێتەوە. ماسوولکەی ڕان و لاتەڕافی لەژێر ڕایەلّی دەمارەکانیدا وەك تانوپۆ تەنرابوون و لەژێر پێستە ناسك و نەرم و ئەتلەسییەکەیدا بە تەواوی بەرجەستە بووبوون و بە گوژم و قایم دیاربوون و دەتگوت یەسقانن. کاژەلاّکە کزەکەی هەتا بەرەو لای لمبۆزی دادەگەڕا پانتر دەبۆوە. پەڕەی لووتی لێك ڕەویبوونەوە و کاژەی ناوەوەیان سوور بوو، چاوە زەقەکانیشی بە ترووسکەی شادی و نەشە دەدرەوشانەوە. ئازای ئەندامی و بەتایبەت سەری حالّەتێکی ئاشکرای هەبوو کە دەردەکەوت خاوەنی هێز و وزەی دەروونییە و هێوری و مێهرەبانیشی بە روونی پێوە دیاربوو. دەتوانین بڵێین یەکێك لەو گیانلەبەرانە بوو کە تەنیا بەو هۆیە قسەناکەن کە پێکهاتەی جەستەیی دەمیان لەگەڵ ئەو کارە سازگار نییە.

لانیکەم وا هاتە بەرچاوی ڤرۆنسکی کە تەواوی ئەو شتانەی خۆی کاتی چاوی لێکردن سەبارەت بەو ئاژەلّە لە دلّیدایە هەمووی تێدەگا.

ڤرۆنسکی هەر لەگەڵ پێی نایە نێو کۆزەکەوە ئەسپەکە هەناسەیەکی قوولّی هەلّکێشا و چاوە زەقەکانی وا بە توندی بۆ لای ئەو گێڕا خوێن لە سووچی چاوییەوە هێرشی هێنا بۆ ڕەشێنکەی چاوی. دەمبێنەکەی جوولاّند و بە نەرمی دووسێ جار سمی لە عەرزی کوتا.

ڕاهێنەری ئینگلیزی گوتی: دیتووتە چۆن تووڕە و سەرشێت بووە.

ڤرۆنسکی لە ئەسپەکە چووە پێشێ و بە نەرمی گوتی: باشە، باشە، ئازیزەکەم...

هەتا زیاتری لێنزیك دەبۆوە ئەسپەکە زیاتر تووشی هەیەجان و بێئارامی دەبوو. بەلاّم کاتێك گەیشتە نزیك سەری ئەسپەکە ئارام بۆوە و ماسوولکەکانی لەژێر پێستە نەرم و ناسکەکەیدا لەرزین. ڤرۆنسکی دەستی بە ملیدا هێنا و بە نەرمی لاواندییەوە و چینێك لە

یاڵی کە بەسەر تیغەرەی ملیدا کەوتبوو بەو دیوەی دیکەدا، هەڵیگێڕایەوە و ڕێکوپێکی کرد. دەموچاوی لە پەڕەی ناسکی لووتی بردە پێشێ کە فشوفۆڵ لێك رەویبوونەوە و دەتگوت باڵی پارچکن. ئەسپەکە بە فیشکەوهووشە بە هەردوو کونە لووتیدا هەوای هەڵدەمژی و دەریدەدایەوە. گوێچکە نووك تیژەکانی دەلەرزاند و دایدەتەپاندن، لمبۆزە رەش و ئەستوورەکەی دەبردە پێشێ و دەتگوت دەیهەوێ بە قۆڵی ڤرۆنسکیدا بنووسێ. بەڵام کە دەمبێنەکەی وەبیرهاتەوە تەکانێکی پێدا و دیسان بە لاقە باریکەکانی تەپوکوت لە عەرزی کوتا و ئەمبارەوباری پێکردن.

ڤرۆنسکی دەستی بە پشت و لاتەڕافیدا هێنا و گوتی: هێواشبە ئازیزەکەم، لەسەرخۆ بە ـ لەوەش ئەرخەیان بوو کە ئەسپەکە زۆر بە دەماغە و لەوەش باشتر هەرنابێ، بۆیە لە کۆزەکە چووەدەرێ.

هەیەجانی ئەسپەکە شوێنی لەسەر ڤرۆنسکی دانابوو. هەستی دەکرد خوێن بە گوشار بەرەو دڵی شەپۆل دەدا و دەیهەوێ وەك ئەسپ هەڵسوکەوت بکات و گاز لە شتێك بگرێ. حاڵی زۆر ترسێنەر و لەگەڵ ئەوەشدا بەنەشە بوو.

ڤرۆنسکی بە راهێنەرەکەی گوت: چاکە، ئیتر هیوای گەورە و گرانم تۆی. کاتژمێر شەش و نیو لە گۆڕەپانەکە.

کابرای ئینگلیزی گوتی: زۆر باشە، بەڵام ئێوە دەچن بۆکوێ؟ میلۆرد؟ ـ قەتی ئەو وشەیە نەدەهاتە سەر زار، بەڵام بۆ رێزگرتن My Lordمی بە پرسیارەکەی خۆی زیادکرد.

ڤرۆنسکی بە سەرسووڕمانەوە سەری هەڵێنا و بە شێوەیەك کە تایبەتی خۆی بوو واقوڕماوانە بۆ ئەو پرسیارە رووهەڵماڵدراوانەیە، چاوی نەك لە چاوی بەردەنگەکەی بەڵکوو لە ناوچاوانی بڕی. بەڵام کە بۆی دەرکەوت کابرای ئینگلیزی ئەم پرسیارە نەك لە ئەربابەکەی بەڵکوو لە سوارکارێك دەکات، وەڵامی دایەوە:

ـ دەبێ سەرێك لە بریانسکی هەڵێنم، هەتا کاتژمێرێکی تر دێمەوە بۆ ماڵێ.

ڤرۆنسکی لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەوە چەندمین جارە ئەمڕۆ ئەو پرسیارەم لێدەکا؟» سوورهەڵگەڕا و ئەو حاڵەتەشی زۆر بەدەگمەن بۆ پێش دەهات. کابرای ئینگلیزی بە وردی چاوی لێدەکرد و وەك ئەوەی بزانێ ڤرۆنسکی دەچێ بۆکوێ گوتیشی: لە هەموو شتێك گرینگتر ئەوەیە کە کاتی سواری زۆر لەسەرەخۆ بی، هەوڵ بدەی بەهیچ شێوەیەك دڵتەنگ نەبی و واز لە پەرۆشی و خەمباری بێنی.

ڤرۆنسکی زەردەیەکی گرت و بە ئینگلیزی گوتی: زۆر باشە! ـ پاشان بازیدا سەر عارەبانەکە و فەرمانی بە عارەبانەچییەکەدا بەرەو پیتێرهۆڤ وەڕێکەوێ.

چەند هەنگاو دوورنەکەوتبوونەوە کە ئەو هەورەی لە بەیانییەوە ئاسمانی تەنیبوو و دیاربوو بارانی پێیە، ڕێژنەیەکی بە غورەمی داکرد.

ڤرۆنسکی لۆیی چادری عارەبانەکەی دادایەوە ولەبەرخۆیەوە گوتی: «لێمان تێکچوو، بارانیش نەبارییبوو گۆرەپانەکە قوربوو، ئێستا بۆتە زەلکاو.» لەنێو عارەبانە سەرداپۆشراوەکەدا نامەی دایکی و یادداشتی براکەی لە گیرفانی دەرهێنا و دەستیکرد بە خوێندنەوەیان.

بەڵێ، هەموو هەر ئەو قسانەبوو! دایکی و براکەی، هەردووکیان بە پێویستیان دەزانی خۆ لە کارە تایبەتییەکانی ئەو هەڵقوتێنن. ئەو خۆتێوەردانەش جاری وا بوو وای لێدەکرد ئیمانهەردە بێ، ئەوەش شتێك بوو کە زۆری بۆ دەهاتە پێش. لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئاخر چ پێوەندییەکی بەوانەوە هەیە؟ بۆ هەمووان بە ئەرکی خۆیانی دەزانن کە خەفەت بۆ کاروباری من بخۆن. بۆ لەمنیان هەڵپێچاوە؟ ڕەنگە هۆی ئەوەبێ بۆیان دەرکەوتووە کە ئەوە شتێکە خۆیان ناتوانن تێیبگەن. ئەگەر ئەوەش یەکێك لەو پێوەندییە ئاسایی و ناحەزانە بوایە کە لە نێو خۆیاندا زۆرە کاریان بەسەرمەوە نەدەبوو. وا هەست دەکەن ئەمە شتێکی دیکە بێ، خۆ گاڵتەجاڕیش نییە، خۆیان دەزانن ئەو ژنە بۆ من لە گیانم خۆشەویستترە. ئەوان لەو ڕاستییە ناگەن و ئازاریان دەدا. ئێمەش قسمەتمان هەرشتێك بێ و لە داهاتووشدا هەر شتێك ڕوویدات ئێمە خۆمان وەدیمان هێناوە و پەژیوانیش نیین.» کاتێ وشەی «ئێمە» هاتە سەر لێوی خۆی و ئانای پێکەوە ئاوێتە کرد. «نا، ئەوان دەبێ وانەی ژیانمان پێبلێین. بۆ خۆشەویستی هیچ بۆچوونێکیان نییە. نازانن بەبێ ئەو ئەشقە بۆ ئێمە نە بەختەوەری هەیە و نە چارەڕەشی و نە ژیانیش.»

ڤرۆنسکی لەمەڕ ئەو خۆتێوەردانەی خزموکەسانەوە زیاتر بەو هۆیە قەڵس بوو کە لە ناخی دڵییەوە هەقی پێدەدان. هەستی دەکرد کە ئەو ئەوینەی ئەوی بە ئاناوە پێوەند داوە بەپێچەوانەی ئەو شتەی کە لە کۆمەڵگای ئەشرافدا باوە، شەیداییەکی کاتی و زووتێپەڕ نەبوو کە ئەمرۆ هەبێ و سبەینێ لەنێو بچێت و تەنیا بیرەوەرییەکی شیرین لە ژیانی هەردوولایاندا بەجێبێڵێ. ئەو هەستی بە ڕەنج و بارودۆخی ژیانی خۆی و ئانا دەکرد، ئەو ژیان و بارودۆخە تاڵەی تێیدان و بەردەوام لەژێر چزووی چاوی خەڵکیدان و ناچارن خۆشەویستی و ئەشقەکەیان بشارنەوە. ناچاربوون درۆبکەن و پەنا بۆ فێڵ و تەڵەکە و ڕیا و مەرایی بەرن و بەردەوام لە بیری خەڵك و دەوروبەرییەکاندا بن، ئێستاش ئەو حەز و خولیایەی ئەوانی پێکەوە گرێ دەدا هێندە بەهێز بوو کە هەردووکیان جگە لە ئەوینەکەیان هەموو شتێکیان لەبیر بردبۆوە.

هەموو ئەو جارانەی کە ناچاربووبوو پەنا بۆ فێڵ و هەڵخەڵەتاندن و درۆ و دەلەسە بەرێ کە زۆریشی بۆ پاتە دەبۆوە و لەگەڵ سروشتی زۆر ناسازگار بوو، بۆیە بە شێوەیەکی زۆر تاڵ وەبیری

دەهاتەوە و هەر بەو رادەیەش بیری لەو هەستی شەرمە دەکردەوە کە کاتی درۆکردن و فێڵ و تەفرەدان لە سیمای ئانادا بەدیی کردبوو، هەروەها ئەو هەستە غەریبەی لە ناخیدا دییەوە کە کاتی ئاشنایەتی و پێوەندیگرتن لەگەڵ ئانا هێندێ جار لە ناخیدا دەگوورا و ئەوەش هەستی بێزارییەك بوو کە سەبارەت بە شتێك لە دڵیدا پەیدا دەبوو. ئێستاش لە دەستی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بێزار بوو یان لە دەستی خۆی و هەموو کۆمەڵگای نەجیمزادان، بۆی روون نەبوو. ئەوەندە بوو کە هەمیشە ئەو هەستەی لەخۆی تاراندبوو. ئێستاش تەکانێکی لە خۆیدا و کەوتەوە سەر رێچکەی بیر و فکری خۆی.

«بەڵێ، ئانا بەرلەوە ئەگەرچی بەختەوەر نەبوو، بەڵام لەسەرەخۆ و لەخۆبایی بوو، ئێستاش ئەو هێمنایەتی و نەرمییەی ماوە بەڵام وەدەری ناخات. لە لایەکیشەوە ناچارە و دەبێ کۆتایی بەو بارودۆخە بێنێ.» ئەوەش بڕیارێك بوو کە یەکلایەنە دابووی.

یەکەم جار ئەو فیکرە بە روونی لە دالغەیدا سەری هەڵدا کە بە هەرشێوەیەك بێ دەبێ کۆتایی بەو فێڵ و درۆیانە بێنێ و هەتا زووتریش بێ چاکترە. «من و ئەو دەبێ لە هەموو شتێك دەست دابشۆرین و خۆمان لە چاوی خەڵکی وەشارین و جگە لە ئەشقی خۆمان بیر لە هیچ شتێکی تر نەکەینەوە.»

## بیست و دوو

لێزمەی بارانەکە زۆری نەخایاند، کاتێك ڤرۆنسکی بە سواری عارەبانە، کە ئەسپی سەرە بەوێرغە دەرۆیشت و عارەبانەکە و دوو ئەسپەکەی تری دەکێشا گەیشتە شوێنی مەبەست، خۆر دیسان لە بن گەواڵە هەورەکان هاتەوە دەرێ. سەربانی ڤیلاکان و گەڵای پیرەدارانی زیزفۆن لەمبەرەوبەری شەقام خووسابوون و بریقەیان دەهات، دڵۆپ دڵۆپ ئاو لە لکوپۆپی داران دەتکا و پلووسکی سەربانەکان هێشتا کاریان دەکرد. ڤرۆنسکی لەبیری ئەوەدا نەبوو کە ئەو رێژنە بارانە چی لە گۆڕەپانی کێبەرکێکە دەکات بەڵکوو دڵخۆش بوو بەوەی کە بە هۆی ئەو رەحمەتەوە زۆر وێدەچێ ئەو بە تەنیا لە ماڵەوە بێ، چونکە دەیزانی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ کە تازە لە سەفەری هەندەران و ناوەندەکانی گەرمکاو گەڕاوەتەوە هێشتا لە پترزبۆرگە و نەهاتۆتەوە بۆ ماڵێ.

ڤرۆنسکی چونکە بەتەما بوو ئانا بە تاقی تەنیا لە ماڵەوە بێ، بۆ ئەوەی کەس پێینەزانێ، وەك هەمیشە بەر لەوەی بگاتە پردەکە لە عارەبانەکە دابەزی و بە پێیان بەسەر پردەکەدا

تێپەڕی. بە پلیکانی لای شەقامدا نەچوو، دەوری لێدا و ڕۆیشت بۆ بەردەرگای حەوشەی پشتەوە.

لە باخەوانەکەی پرسی: ئەرباب هاتۆتەوە؟

باخەوان وەڵامی دایەوە: نەخێر قوربان، تەشریفیان نەهێناوەتەوە. بەڵام خانم تەشریفیان لە ماڵێیە. تەشریفبەرن لە پلیکانەکانی بەر ماڵێوە بچنە ژووریٚ. پیاوی لێیە دەرگاکەتان بۆ دەکەنەوە.

ـ نا، پێویست ناکا. لە نێو باخەکەوە دەچم.

کە بۆی دەرکەوت ئانا لە ماڵێیە، چونکە بەڵێنیشی پێنەدابوو کە ئەمڕۆ دەچیٚ بۆ دیدەنیی، ئاناش پێیوانەبوو ئەو بەر لە کێبەرکێی ئەسپسواری بێت بۆ لای. ویستی بێچرپە بڕواتە ژووریٚ بۆیە شمشێرەکەی قەدی بە دەستی گرت بۆ ئەوەی تەقوکوتی نەیەت، بە ئەسپایی بەسەر ڕێچکەی خیزڕێژ کراوی باخەکەدا ڕۆیشت کە لە هەردوو لاوە گوڵی لێداچێندرابوو و گەیشتە بەر ئەو هەیوانەی کە بەسەر باخەکەیدا دەڕوانی. ڤرۆنسکی ئێستا ئەو فکر و خەیالانەوی کە بە ڕێگاوە سەبارەت بە بارودۆخی تاڵ و دژواری ژیانی لە مێشکیدا بوو هەمووی لەبیر چووبۆوە. تەنیا لە بیری ئەوەدا بوو کە هەتا چەند چرکەی تر نەك بە خەیاڵ بەڵکوو بە زیندوویی و بە شێوەیەکی ڕاستەقینەوە ئانا دەبینیٚ. ئێستا خەریکبوو بە قاڵدرمە نەوییەکانی بەر هەیواندا وەسەر دەکەوت و بۆ ئەوەی تەپەی پێی نەیەت بە ئەسپایی تەواوی بەری پێی لەسەر عەرزی دادەنا، لەناکاو ئەوەی هەمیشە لێی دەترسا و ناخۆشترین لایەنی پێوەندییەکەی بوو لەگەڵ ئانا هاتەوە بیری، ئەویش ڕوانینی پرسیارئامێز و وردی کوڕەکەی بوو کە ڤرۆنسکی پێیوابوو کوڕە زۆری ڕق لێیەتی و بە چاوێکی نامیهرەبانانەوە لێیدەڕوانیٚ.

ئەو کوڕە لە هەموو کەس زیاتر بووبووە کۆسپی پێوندییەکەیان. کاتێك ئەو لەلایان دەبوو ڤرۆنسکی و ئانا هیچ کام نەیاندەوێرا جگە لەو قسانەی کە لە حوزووری هەمواندا بۆ گوتن دەبیٚ، هیچی تر بدرکێنن. تەنانەت نەیاندەوێرا بە شێوەیەی کینایەش لە ئەلفەوە بێنە بیٚ یان وشەیەك بدرکێنن کە ئەو تێینەگا. ئەوان بۆ ئەو ژوانە و دیدارەکانیان هیچ بەڵێن و قەرارێکیان دانەنابوو بەڵکوو ئەو دیدار و پێکەوە دانیشتنانە بیٚ ئیختیار و لەخۆڕا بۆیان ڕێکەوتبوو. فریودانی ئەو منداڵەش بە لایانەوە شوورەیی بوو و لەلای ئەو وەك دوو ئاشنا پێکەوە قسەیان دەکرد. بەڵام ڤرۆنسکی سەرەڕای ئەو هەموو پارێز کردنە زۆر جار دەیدی کە منداڵەکە بە چاوێکی پرسیاراوی و وردبینانە و شەرمێونییەکی سەیر و نیگای سرك کە هێندیٚ جار میهرەبان

و هێندێ جاریش سارد و بێگانە بوو لێی دەڕوانیێ. وەك ئەوە وابوو کە منداڵەکە هەستی کردبێ کە پێوەندییەکی گرینگ لەنێوان ئەو و دایکیدا هەیە و ناتوانیێ تێیبگا.

بەڕاستی کوڕە هەستی دەکرد سەری لەو پێوەندییە دەرناچێ و هەرچەندی هەوڵیدەدا نەیدەتوانی هەستێکی شیاو و جوانی دەرهەق بەو پیاوە هەبێ و خۆی قانع بکات. بە هەستێکی ناسك و منداڵانەوە بە روونی دەیزانی کە باوکی و دایەنەکەی و پەرستارەکەیان، نەك خۆشەویستیی ڤرۆنسکی لە دڵیاندا نییە، بەڵکوو بە بێزاری و ترسەوە چاوی لێدەکەن. ئەگەرچی سەبارەت بە ئەو هیچیان نەدەدرکاند، کەچی دایکی بە چاوی چاکترین دۆست و هاوڕێ لێی دەڕوانیێ.

لە دڵی خۆیدا گوتی: «مانای ئەوانە چییە؟ ئەم پیاوە کێیە؟ من چۆن دەبێ خۆشم بویێ؟ خەتای منە کە لەوە تێناگەم، بلێی خۆشەویستی نەزانم، یان گەوجم.» سەرنجی پرسیارئامێز و ئەزموونکارانە و تا رادەیەکیش پڕ لە رق و تووڕەیی کوڕە و شەرمێونی و نیگای سرکی کە ڤرۆنسکیی تووشی خەفەت کردبوو هەر بەو هۆیەوە بوو. بوونی ئەو کوڕە لەم دواییانەدا هەمیشە هەستێکی پڕ لە بێزاری و بەبێ بنۆس و هەمیشە یەکسانی لە دڵی ڤرۆنسکیدا هەڵدەقوڵاند. ڤرۆنسکی و ئانا لە هەنتەشی کوڕەدا هەستیان وەکوو هەستی پاپۆڕەوانێك وابوو کە لە رووی جەمسەرنوێنەوە دەبینیێ کە بە پڕتاو دەڕواتە پێشێ و بە تەواوی لە بوارەکەی خۆی لایداوە، بەڵام ناتوانیێ راوەستێ و سات لە دوای سات رێبازی لە راستەقینەی خۆی دوورتر دەکەوێتەوە و بڕوا کردن بەو لادانەش بۆ ئەو وەك ئەوە وایە کە بڕوای بە لەنێوچوونی خۆی هەبێ.

کوڕە سەرنجی ساویلکانەی خۆی بۆ ژیان هەر ئەو جەمسەرنوێنەی پاپۆڕەوان بوو کە رادەکەی لادانی ئەوانی نیشان دەدا بەڵام ئەوان سەرەڕای ئەوەی تێیدەگەیشتن خۆیان لیێ گێل دەکرد.

ئەمجارە سریۆژا لە ماڵیێ نەبوو و ئانا بە تەنیا لەبەر هەیوانەکە دانیشتبوو و چاوەڕوانی هاتنەوەی کوڕەکەی بوو کە چووبوو بۆ گەڕان و باران لێی تێکدابوو. نۆکەرێکی لەگەڵ کچی خزمەتکارەکەیان ناردبوو بەدوایدا و خۆشی چاوەڕوانی هاتنەوەیان بوو. کراسێکی سپیی گوڵدۆزیکراوی لەبەردا بوو و لە سووچێکی هەیوانەکە و لە پشت گوڵەکانەوە دانیشتبوو، بۆیە گوێی لە ترپەی پێی ڤرۆنسکی نەبوو . سەری خۆی بە بسکە رەش و لوولەکەیەوە داخستبوو و نێوچاوانی بە ئاوپاشێکی فێنکەوە نووساندبوو کە لەسەر لاجامەکان داندرابوو. هەردوو دەستە جوان و ناسکەکەی بەو ئەنگوستیلانەوە کە زۆر لەبەرچاوی ئاشنابوون و ئەوەندەی تر جوانیان دەنواند بە ئاوپاشەکەوە گرتبوو. هەرجارێك کە بەژن و باڵا لەبار و دڵڕفێنەکەی و لاجانگ و

قۆڵ و شان و ملە سپیوسۆڵەکەی دەدی ئەوەندەی تر شەیدای دەبوو و دەتگوت قەتی نەدیوە. ڕاوەستا و ئاشقانە چاوی تێبڕی. بەڵام هەرکە ویستی هەنگاو هەڵێنێتەوە و لێی بچێتە پێشێ ئانا هەستی کرد و ئاوپاشەکەی دانا و ڕوخسارە هەڵبزڕکاوەی بۆ لای ئەو وەرسووڕاند.

ڤرۆنسکی چووە پێشێ و بە زمانی فەڕەنسی گوتی: ئەوە چییە؟ نەخۆشی؟

ویستی هەڵێ و باوەشی پێدابکات بەڵام وەبیری هاتەوە لەوانەیە کەسانێك لەو نزیکانە چاویان لێبێ. بۆیە ئاوڕی دایەوە بۆ لای دەرگای هەیوانەکە و وەکوو هەموو جارێك کە هەستی دەکرد دەبێ بترسێ و ئاگاداری دەورووبەری خۆی بێ، سوورهەڵگەڕا.

ئانا هەستا و هات بۆ لای، زۆر بە توندی دەستی گوشی و گوتی: نا. نەخۆش نیم. چاوەڕوانی... تۆ نەبووم.

ڤرۆنسکی گوتی: خودایەگیان، دەستت بۆ وا ساردە؟

ئانا گوتی: خوودارت کردم. بە تەنیام و چاوەڕوانی سریۆژا بووم. چووە بۆ گەڕان و لەملایەوە دێتەوە.

ئەگەرچی هەوڵیدەدا لەسەرەخۆ بێ بەڵام زمانی تەتەڵەی دەکرد و لێوی دەلەرزی. بۆ ئەوەی خۆی لە زمانی رووسی ببوێرێ و وشەی «ئێوە» کە زۆر سارد و ڕەق بوو بەلایەوە و زایەڵەی بێگانە بوونەکەی بۆ تامڵ نەدەکرا و لەبزی «تۆ»ش بێمەترسی نەبوو، بە زمانی فەڕەنسی درێژەی بە قسەکانی دا: ببوورە ئاوا کتوپڕ هاتم، بەڵام چ بکەم، ناتوانم تاقە ڕۆژێك بەبێ دیتنی ئێوە رابوێرم.

ـ ئەوە داوای لێبوردنی بۆچییە؟ زۆرم پێخۆشە هاتووی.

ڤرۆنسکی کە هێشتا دەستی ئانای بەرنەدابوو، تۆزێ خۆی دانەواند و گوتی: بەڵام وێدەچێ نەخۆشبی یان خەمێکت هەیە، بیر لە چی دەکەیتەوە؟

ئانا بە پێکەنینەوە گوتی: هەر ئەوەی وا هەمیشە بیری لێدەکەمەوە!

ڕاستی دەکرد. هەرکاتێك و هەرساتێك لێیان بپرسیبایە بیر لە چی دەکاتەوە زۆر ڕاشکاوانە وەڵامی دەدایەوە «تەنیا بیر لە شتێك دەکەمەوە. بەختەوەریم کە بۆتە هۆی چارەڕەشیم.» ئێستاش کە ڤرۆنسکی هاتبوو بۆ لای لە بیری ئەوەدا بوو کە بۆچی بۆ خەڵکی، بۆ وێنە بۆ کەسێکی وەك بێتسی (ئانا دەیزانی بێتسی و تۆشکڤیچ پێکەوە پێوەندیی نهێنییان هەیە) ئەو جۆرە ماجەرایانە سانایە، بەڵام بۆ ئەو بۆتە ئازار و دەردەسەری. ئەم بیرەی ئەمڕۆی لەبەر چەند هۆیەك زیاتر لە هەموو کاتێك ئازاری دەدا. سەبارەت بە کێبەرکێی ئەسپسواری

پرسیاری لێکرد. ڤرۆنسکی وەڵامی دایەوە و کە دیتی شڵەژاوە هەوڵی دا سەرگەرمی بکات، بۆیە بە لەبزێکی زۆر ساکار دەستی کرد بە باسکردنی چۆنێتیی کێبەرکێکە و هەموو وردەکارییەکانی.

ئانا کە چاوی لە چاوە نەرم و میهرەبانەکانی ڤرۆنسکی بڕیبوو لە دڵی خۆیدا گوتی «بیڵێم یان نەیڵێم؟ ئەو هێندە دڵخۆشە و بە رادەیەکیش سەرقاڵی کێبەرکێی ئەسپسوارییە کە ئەو جۆرەی پێویستە تێناگا و نازانێ ئەو رووداوە چەندە گرینگە بۆ هەردوولامان.»

ڤرۆنسکی لەپڕ قسەکەی گۆڕی و پرسیی: بەڵام نەتگوت کاتێك من هاتم بیرت لە چی دەکردەوە. تکایە پێم بڵێ.

ئانا وەڵامی نەدایەوە. تۆزێ سەری داخست و بەچاوی گەش و لە بن پەرژینی برژانگە درێژەکانییەوە چاوە پڕ پرسیارەکانی تێبڕی. گەڵایەکی لێکردبۆوە و ئەمدەست و ئەودەستی پێدەکرد و دیاربوو دەیهەوێ لەرزینی دەستی بشارێتەوە. ڤرۆنسکی کە ئەوەی دیت شوێنەواری گوێڕایەڵی و وەفاداریی موریدانەی کە دڵی ئانای بەجارێ لە داو خستبوو، بە روونی لە روخساریدا خۆی نواند.

ـ پێموایە شتێك رووی داوە. پێتوایە ئەگەر بزانم خەمێکت لە دڵدایە و من ناتوانم شەریکی ئەو خەمەت بم، ساتێك هەدادانم دەبێ؟ تۆ خودا پێمبڵێ.

ئانا بێ ئەوەی چاو لەسەر چاوی ڤرۆنسکی هەڵگرێ، هەستی کرد دەستی بە گەڵاکەوە جارلەگەڵ جار خەریکە زیاتر وەلەرزین دەکەوێ، لە دڵی خۆیدا گوتی «ئەگەر لە گرنگایەتیی ئەو مەسەلەیە نەگا قەتی لێ خۆش نابم. واچاکە پێی نەڵێم. بۆ تاقیی نەکەمەوە؟»

ڤرۆنسکی دەستی گرت و دووپاتی کردەوە: تۆ خودا پێمبڵێ!

ـ بیڵێم؟

ـ بەڵێ، بەڵێ، پێمبڵێ...

ئانا زۆر سووك و لەسەرخۆ گوتی: زگم پڕە.

گەڵا چکۆڵەکەی دەستی زیاتر لە پێشوو وەلەرزین کەوتبوو. بەڵام چاوی لەسەر چاوی ڤرۆنسکی هەڵنەدەگرت. دەیویست بزانێ بە بیستنی ئەو قسەیە چ گۆڕانێکی بەسەردا دێ. ڤرۆنسکی رەنگی هەڵبزڕکا. ویستی شتێك بڵێ بەڵام نەیگوت. دەستی ئانای بەردا و سەری داخست. ئانا لە دڵی خۆیدا گوتی «بەڵێ، وادیارە لە گرینگایەتییەکە گەیشت.» دەستی ڤرۆنسکیی گرت و بە نیشانەی سپاس گوشیی.

بەڵام ئانا بە هەڵە چووبوو. ئەو جۆرەی کە چاوی ژنانەی ئانا دیتبووی ڤرۆنسکی ئاوا لە گرینگایەتییەکە تێنەگەیشتبوو. بۆیە بە بیستنی ئەو هەواڵە رق و بێزارییەکی سەیر کە خۆشی نەیدەزانی لە کێ زۆر بە قورسی و گوشارێکی زۆرەوە نیشتە سەر دڵی. بەڵام هەر لەوکاتەدا بۆی دەرکەوت کە هەلەکە بەجارێ بەجێی ناسك گەیشتووە و ئەویش بە ئاواتی ئەو هەلە بوو، ئێستاش ئیتر شاردنەوەی پێوەندییان لە مێردەکەی ئانا بە هیچ کلۆجێ ناگونجێ و ناچارن هەتا زووە بە هەرشێوەیەك کە بۆیان دەلوێ کۆتایی بەو بارودۆخە نائاساییە بێنن. جگە لەوەش هەیەجانی ئانا شوێنی لەسەر رۆح و لەشی ئەویش دانابوو. بە چاوێکی پڕ لە پەرۆشی و خاکەڕایی تێیڕاما، دەستی ماچکرد و هەستا و بێ ئەوەی زمانی بگەڕێ رۆیی بۆ ئەوسەری هەیوانەکە.

پاشان هاتەوە بۆ لای و بە لەبزێکی قورس و قایم گوتی: بەڵێ، نە تۆ و نە من هیچ کاممان گاڵتە بە ئەشقەکەمان ناکەین و ئێستا چارەنووسمان لێککگرێدراوە- چاوێکی لە دەوروپشتی کرد و درێژەی پێدا: ئێستا دەبێ کۆتایی بەو بارودۆخە درۆیینە بێنین کە کەوتووینەتە نێوی.

ئانا لەسەرەخۆ گوتی: کۆتایی پێبێنین؟ چۆنی کۆتایی پێبێنین، ئەلکسی!

ئەو ئێستا هاتبۆوە سەرخۆ و بزەیەکی پڕ لە خۆشەویستی روخساری گەشاندبۆوە.

ـ دەست لە مێردەکەت بەردە با پێوەندییەکەمان ببێتە پێوەندییەکی راستەقینە.

ئانا بە دەنگێکی زۆر نەرم کە بەحاڵ دەبیسترا گوتی: مەگین ئێستا پێوەندییەکەمان راستەقینە نییە؟

ـ با، بەڵام پێوەندییەکی تەواو.

ئانا پەرۆش لە ژیان و بەندە بێ دەرووەکەی ئەو بارودۆخە ئاڵۆزە گوتی: بەڵام چۆن ئەلکسی؟ فێرمکە، چۆن؟ بۆ ئەو بارودۆخەی من تێدام دەروویێکی هەیە بۆ دەربازبوون؟ من مەگین ژنی بەمێرد نیم؟

ڤرۆنسکی گوتی: هەموو تەنگانەیەك دەروویێکی هەیە. تەنیا دەبێ بڕیاربدەی. هەر بارودۆخێك کە پێتوایە لەم بارودۆخەی ئێستات باشترە. بۆ من نازانم چەندە ئازار دەکێشی، لە دەستی خەڵك و کوڕەکەت و مێردەکەت جاڕز بووی و حەجمانت لێهەڵگیراوە؟

ئانا بە تەوسە بزەیەکی ساکارەوە گوتی: نا، لە دەست مێردەکەم نا، ئەو لە ریزەی نەبوانە. وادەزانم هەر نیشە. بیر لە ئەو ناکەمەوە.

ـ تۆ بەڕاستت نییە. من تۆ دەناسم. ئازار و خەفەتی ئەویشت لە دڵدایە...

ئانا گوتی: بەڵام، ئەو نازانێ ـ لەپڕیش روخساری سوورهەڵگەڕا. کولْمە و نێوچاوان و بەرملی سوورایی تێگەڕا و فرمێسکی شەرم لە چاوانیدا قەتیس ما و درێژەی پێدا: با ئیتر لەسەر ئەوە نەڕۆین.

## بیست و سێ

ڤرۆنسکی چەند جار، نەك ئاوا پێداگرانەش، حەولیدابوو هانی بدا بۆ دەمەتەقێ سەبارەت بە بارودۆخی ژیانی خۆی، بەڵام هەموو جارێك لەگەڵ ئەو چەشنە کەمتەرخەمی و دادوەرییە ساکارانەیەی ئەو بەرەوڕوو دەبوو. وەك ئەوە وابوو کە شتێك لەو باسە دابێ کە ئەو نەتوانێ یان حەز نەکات بۆخۆی روون بکاتەوە. دەتگوت لەگەڵ هاتنەگۆڕێی ئەو باسوخواسە، ئانای راستەقینە لە ناخیدا خۆی حەشار دەدا و ژنێکی تر، ژنێکی سەیر و بێگانە لەگەڵ ئەو، ژنێك کە ئەو خۆشی نەدەویست و تووشی ترس و دڵەخورپەی دەکرد، ژنێك کە لە هەمبەریدا رادەوەستا و خۆڕاگریی دەکرد و بەجێی ئەو خۆی دەنواند. بەڵام ئەمجار ڤرۆنسکی بڕیاری دابوو هەرچی لە دڵیدایە هەڵیڕێژێ.

ڤرۆنسکی بە لەبزێکی کە تایبەتی خۆی بوو، قورس و قایم و لەسەرەخۆ، گوتی: بزانێ یان نەزانێ... ئێمە کارمان بەسەر ئەوەوە نییە، ئەو دەزانێ یان نازانێ. ئێمە ناتوانین.... تۆ ناتوانی، بەتایبەت ئێستا ناتوانی بەوشێوە و بارودۆخەی ئێستا بەردەوام بی.

ئانا هەر بەو تەوسەبزە کەمترخامانەیەوە پرسیی: دەیباشە، بە بڕوای تۆ چ بکەین؟ـ ئانا کە لە پێشدا لەوە دەترسا ڤرۆنسکی ئەو جۆرەی پێویستە دووگیان بوونەکەی بەلاوە گرینگ نەبێ، ئێستا خەمی ئەوەی بوو ئاوا خێرا بەو ئاکامە گەیشتووە کە کارەکە یەکلایی بکەنەوە.

ـ دەبێ هەموو شتێکی بۆ روون بکرێتەوە و پاشان تەڵاقی لێوەرگرێ.

ئانا گوتی: زۆر باشە، گریمان ئەو کارەم کرد، دەزانی ئاکامی ئەو کارە بەکوێ دەگا؟ با هەر لە ئێستاوە پێتی بڵێم بەکوێ دەگا ـ کە ئەوەی گوت ئەو چاوانەی کە تا ئەو کاتە ترووسکەی خۆشەویستییان لێدەباری، بریقەی رقیان تێگەڕا.

ـ پێمدەڵێ: دەیدەی، کەوایە حەز لە پیاوێکی تر دەکەیت و لەگەڵیدا پێوەندیی ناشەرعیت هەبووە؟ (لاسایی مێردەکەی دەکاتەوە و راست وەك ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ قسە دەکات و وشەی ناشەرعی بە ددانە چیڕەوە دەردەبڕێ.) «من... بۆ ئاکامی ئەو کارە لە بواری ئایینی و کۆمەڵایەتی و بنەماڵەییەوە وریاییم پێدابوون. بەڵام تۆ گوێت بە قسەکانم نەدا. من ئێستا ناتوانم ناوی خۆم... (ئانا

دەیویست "ناوی کوڕەکەشم" بێنێ بەڵام نەیتوانی بە گاڵتە باسی کوڕەکەی بکات). بە شوورەیی و نەنگ رموودە بکەم.» گوتیشی: هەروەها لەو جۆرە قسانەش. هەروەها بەشێوەی دەسەڵاتداران و بە روونی و بە وردی کە تایبەتی خۆیەتی دەڵێ من ناتوانم دەستت لێهەڵگرم و ئەوەی لە دەستی بێت دەیکات بۆ ئەوەی کارەکە ئابڕووچوونی لێنەکەوێتەوە. زۆر بە وردی و لەسەرەخۆیش ئەوەی گوتوویە دەیکات، ئاکامەکەشی هەر ئەوەیە. ئەو مرۆڤ نییە. مەکینەیە ـ کە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچی بە هەموو خووخدە و شێوە و ئاکارییەوە هێنایە بەرچاوی خۆی و ئەوەی بە خراپەی دەزانی لە ئەندام و کردەوەی ئەودا پێیشك دەهات، بەبێ هیچ لێبووردەییەك و لە هەمبەر ئەو تاوانەدا کە خۆی دەرهەق بە ئەو کردبووی خستییە تای نێگەتیڤی تەرازووەوە، درێژەی بە قسەکانی دا: ... جا کاتێك کە رقی هەڵدەستێ، مەکینەیەکە ئاور هەڵدایسێنێ.

ڤرۆنسکی بە دەنگێکی نەرم و لەبزێکی وا کە بتوانێ قانعی بکات، هەوڵی دەدا ئارامی بکاتەوە، گوتی: بەڵام ئانا گیان، سەرەڕای هەموو ئەوانەش چارەیەکی ترمان نییە جگە لەوەی پێیبڵێین. ئەو کاتە بەپێی ئەو هەڵسوکەوتەی ئەو ئێمەش رێگە چارەیەك دەدۆزینەوە.

ـ دە، تۆ بیڵێ چ بکەین؟ هەڵمدەگری؟

ـ دەی وادەکەین، نابێ؟ من نازانم چۆن دەکرێ لەگەڵ ئەو بارودۆخە هەڵکەی. من ئەوە لەبەرخۆم نالێم. خەمی تۆمە ئاوا ئازار دەکێشی.

ئانا بە تووڕەیی گوتی: بەڵێ، خراپ نییە. پێکەوە بڕۆین و من ببمە گراوی تۆ؟ خراپ نییە!

ڤرۆنسکی زۆر لەسەرخۆ گوتی: ئانا!

ئانا درێژەی پێدا: بەڵێ، ببمە گراوی تۆ، ئابڕوو حەیا بەخۆم و... نەهێڵم.

دیسان ویستی بڵێ کوڕەکەم... بەڵام نەیتوانی ئەو وشەیە دەربڕێ.

ڤرۆنسکی نەیدەتوانی تێبگا کە ئانا، بەو کەسایەتییە بەهێز و سروشتە پاك و ئاکارە راستەیەوە چۆن دەتوانێ ئەو مەرجە پڕ لە فێڵ و درۆ و دەلەسەیە تاملێ بکات و حەز نەکات لە مێردەکەی جیابێتەوە و نەشیدەزانی هۆی سەرەکیی ئەو حاڵە کوڕەکەیەتی، بەجۆرێك کە تەنانەت نەیدەوێرا ئەو وشەیە بە زاریدا بێنێ. هەرکاتێك کە بیری لە کوڕەکە[١٠٧]ی و پێوەندیی

١٠٧- لە ڕووسیا بەر لە شۆڕش تەنیا ژن و مێردێك دەیانتوانی داوای تەڵاق بکەن کە خەتابار نەبن و لە هەموو بارێکەوە تەڵاق وەرگرتن زۆر دژوار بوو. ئەگەر تەڵاقەکەش جێبەجێ بکرایە لایەنی تاوانبار هەقی نەبوو ژیانی هاوبەشی پێکبێنێتەوە و هەقی سەرپەرشتی کردنی منداڵەکەشی پێنەدەسپێردرا.

داهاتووی خۆی و ئەو دەکردەوە، یانی دایکێك کە لە باوکی جیا بۆتەوە، ئەوەندەی کارەکە بەلاوە ترسناك و پڕشوورەیی دەبوو کە هەموو بنۆس وهۆیەکی وەلا دەنا و وەك ژنانی دیکە تەنیا لە هەوڵی ئەوەدابوو بە بیانووی ناڕاستەقینە و قسەی هیچەکەوپووچەکە دڵی خۆی هێوربکاتەوە و بەخۆی بسەلمێنێ کە بارودۆخی ژیانی لەچاو رابردوو هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نەهاتووە و دەتوانێ مەسەلەی تاڵ و ترسناکی داهاتووی کوڕەکەی لەبیر بەرێتەوە.

لە ناکاو دەستی ڤرۆنسکیی گرت و وەك پێشوو بە لەبزێکی سادقانە گوتی: تکات لێدەکەم، ئیتر هیچ کات سەبارەت بەو مەسەلەیە قسەم لەگەڵ مەکە.

ـ بەڵام، ئانا....

ـ قەتقەت بیر لە شتی وا مەکەوە. ئەو کارە بە من بسپێرە. زۆر چاك لە سووکایەتی و چارەڕەشی و بارودۆخی ژیانی خۆم ئاگادارم. بەڵام یەکلایی کردنەوەی ئەو کارە بەو ئاسانییەش نییە کە تۆ بیری لێدەکەیەوە و نالویێ بۆمان. ئەو کارە بە من بسپێرە و گوێ بگرە بزانە دەڵێم چی. سەبارەت بەو مەسەلەیە قەتم لەگەڵ مەدوێ. بەڵێنی دەدەی؟... نا، نا، بەڵێنم دەیە!

ـ هەر بەڵێنێك بڵێی دەیدەم. بەڵام ئەرخەیان نیم. بەتایبەت دوای ئەو شتەی کە باست کرد. من ناتوانم ئاسوودە بم کاتێك دەزانم تۆ تووشی پەرۆشی و شڵەژان بووی.

ئانا دووپاتی کردەوە: من؟ بەڵێ، من هێندێ جار خەمبارم و ئازار دەکێشم، بەڵام ئەگەر تۆ ئیتر لەوبارەوە لەگەڵم نەدوێی باشتر دەتوانم ئازارەکەم تامڵ بکەم. ئازاری من تەنیا ئەو کاتەیە کە تۆ سەبارەت بەو مەسەلەیە قسەم لەگەڵ دەکەی.

ڤرۆنسکی گوتی: تێناگەم.

ئانا قسەکەی پێبڕی و گوتی: دەزانم درۆکردن بۆ سروشتی باش و ئاکاری پاك و راستی تۆ چەندە دژوارە. بەزەییم پێتدا دێ. زۆر بیر لەوە دەکەمەوە تۆ بۆ بەهۆی منەوە ژیانی خۆت زایە دەکەی.

ـ من هەر ئێستا سەبارەت بە تۆ ئاوام بیردەکردەوە. چۆن دەتوانی لەبەر خاتری من هەموو شتێکی خۆت بکەیە قوربانی. من ناتوانم لەو تاوانەی خۆم خۆشبم کە تۆ لەبەر خاتری من ژیانت لێ تاڵ بێ.

ئانا لێیچووە پێشێ و بە بزەیەکی ئاوێتەی ئەشق و خۆشەویستییەوە چاوی لە چاوی بڕی و گوتی: من ژیانم تاڵە؟ من وەك برسییەك وام کە تێریان کردبێ، لەوانەیە سەرمای بێ و جلوبەرگەکەی شڕ بێ و بەهۆی ئەو جلە دڕاوانەوە تووشی شەرمەزاری بێ بەڵام ژیان تاڵ نییە. من و ژیان تاڵی؟ نا، وەرە، ئەوەش ژیانی شیرینی من...

گوێی لە دەنگی کوڕەکەی بوو کە هاتەوە، ئاوڕێکی بەپەلەی بۆ لای هەیوانەکە دایەوە و بە توندی هەستا. ترووسکەیەکی ئاشنا لە چاویدا دەروشایەوە. کتوپڕ دەستە ناسك و بەئەنگوستیلە رازاوەکەی هەڵێنا و سەری ڤرۆنسکیی گرت و چاوی لە چاوی بڕی و سەری خۆی بە لێوی پڕ لە پێکەنینییەوە بردە پێشێ و دەمی نایە نێو دەمی و هەردوو چاوی ماچکرد و خێرا لێی دوورکەوتەوە. ئانا دەیویست بڕوا بەڵام ڤرۆنسکی رایگرت.

بە تامەزرۆییەکی زۆروە چاوی لە چاوی بڕی و لە سەرەخۆ پرسیی: کەنگێ؟

ئانا بە هێواشی گوتی: ئەمشە سەعات یەك ـ هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و بە هەنگاوی نەرم و خێرا رۆیی بۆ پێشوازی کوڕەکەی.

سریۆژا لە باخی گەورە بوو کە رێژنە باران دایکردبوو، لەگەڵ دایەنەکەی چووبوونە ژێر ساباتی باخەکە هەتا باران خۆشی کردبۆوە.

بە ڤرۆنسکیی گوت: سەرچاوم، خوداحافیز، دەبێ زۆر زوو خۆم ئامادەبکەم و بچم بۆ گۆڕەپانی کێبەرکێی ئەسپسواری. بێتسی بەڵێنی داوە بێت بەدواما.

ڤرۆنسکی چاوی لە کاتژمێرەکەی کرد و بە هەڵەداوان رۆیشت.

## بیست و چوار

کاتێك ڤرۆنسکی لەبەر هەیوانی ڤیلاکەی ئانا چاوی لە کاتژمێرەکەی کرد، ئەوەندە پەشۆکابوو و کەوتبووە ماڵی بیرەوە میهەنگی کاتژمێرەکەی لەسەر سەفحەکەی دەدی بەڵام کاتەکەی بۆ مەعلووم نەبوو. خۆی گەیاندە سەر جادەکە و بە ئەسپایی لەسەر قوڕەکە هەنگاوی هەڵدێنایەوە و رۆیشت بۆ لای عارەبانەکەی. هێندە دڵی لەلای ئانا بوو بیری لە کات نەدەکردەوە و گوێی لەوە نەبوو دەرفەتی دەبێ بچێت بۆ دیدەنیی بریانسکی یان نا. هەروەك زۆر جار رووی دەدا تەنیا دالغەی رۆژانەی بۆ دەمایەوە، یانی تەنیا دەیتوانی وەبیر خۆی بهێنێتەوە کە بڕیاربدا کام ئیش لە دوای ئیشەکەی تر بەڕێوەببات.

لە عارەبانەچییەکەی نزیکبۆوە کە لە شوێنی دانیشتنەکەی خۆی و لەژێر سێبەری درێژەوەبووی زێرفۆنێکی پڕ لقوپۆپ وەنەوزی دەدا. تاوێك بە چێژەوە چاوی لەو پۆلە مێشەکوێرەیە کرد کە لە دەوری لەشی عارەقە کردووی ئەسپەکان شەپۆلیان دەدا و لەبەر

تیرێژی هەتاو رەنگاوڕەنگ دەبوون. پاشان عارەبانەچییەکەی وەخەبەر هێنا و خۆی هاویشتە سەر عارەبانەکە و پێیگوت بچێت بۆ ماڵی بریانسکی. دوای ئەوەی حەوت وێرست لە ماڵی ئانا دوورکەوتبۆوە تازە وەخۆ هاتەوە و توانیی چاوێك لە کاتژمێرەکەی بکات، بەڵام دیتی سەعات پێنج و نیوە و وەدرەنگ کەوتووە.

ئەو رۆژە بڕیاربوو چەند کێبەرکێ بەڕێوەبچێت. یەکیان کێبەرکێی گاردە تایبەتەکان بوو، پاشان کێبەرکێی دوو وێرستیی ئەفسەران و پاشانیش کێبەرکێی چوار وێرستی و لە کۆتاییشدا ئەو کێبەرکێیەی کە ئەو بەشداریی تێدا دەکرد. دەیتوانی لە کاتی خۆیدا بگاتە شوێنی کێبەرکێکە بەڵام ئەگەر بچووبایە بۆ دیدەنیی بریانسکی کاتێك دەگەیشتەوە کە تەواوی دەربار لەوێ دەبوون. ئەوەش جوان نەبوو. بەڵام بەڵێنی بە بریانسکی دابوو کە بچێت بۆ لای و هەر بەو هۆیە بڕیاری دا کە درێژە بە رێگاکەی خۆی بدات و بە عارەبانەچییەکەی گوت خێراتر باژوێ و خەمی ئەسپەکانی نەبێ.

چوو بۆ لای بریانسکی نزیك پێنج دەقیقە لەگەڵیدا بوو و پاشان بە تاڵووکە گەڕایەوە. ئەو غارە عارەبانەیە کە زۆر بە توندی و شوێنەکەشی دەشت بوو، تۆزێ هێوری کردەوە. ئەوەی سەبارەت بە پێوەندییەکەی لەگەڵ ئانا لەسەر دڵی قورسایی دەکرد، هەموو مەسەلە گەلێکی تەمومژاوی بوون کە پاش وتوێژەکەی لە گەڵیدا لە دالغەیدا مابوو، هەمووی لەسەری پەڕی. ئێستا بە تامەزرۆیی و هەیەجانەوە بیری لە کێبەرکێکە دەکردەوە. بەخۆی دەگوت کە هەرچۆنێك بێ دەبێ لەکاتی خۆیدا بگاتێ. هەروەها یادی شیرینی ژوانی ئەو شەوەی لەگەڵ ئانا پڕشنگێکی گەشی لە دڵ و رۆحی دەگێڕا.

هەتا زیاتر لە جەوی کێبەرکێکە نزیك دەبۆوە و وەپێش ئەو عارەبانانە دەکەوت کە لە کوێستان و پترزبۆرگەوە دەهاتن بەرەو ئەوێ زیاتر دڵی خۆی لە داوی ئەو کێبەرکێیەدا دەدی کە ئەمڕۆ بەڕێوەدەچوو.

هیچ کەسی لە ماڵێ نەدی. هەموو چووبوون بۆ گۆڕەپانی کێبەرکێ و پێشخزمەتەکەشی لەبەر دەرگا چاوەڕوانی ئەوبوو، لەگەڵ گۆڕینی جلەکانی پێشخرمەتەکەی پێیڕاگەیاند کە دەوری دووهەمی کێبەرکێکە دەستی پێکردووە و زۆر کەس هاتوون و سۆراخی ئەویان گرتووە و مەیتەرێکیش دووجار لە گەوڕەکەوە هاتووە.

ڤرۆنسکی دوای ئەوەی بە شێنەیی جلەکانی گۆڕی (ئەو هیچ کاتێك پەلەپەلی نەدەکرد و نەیدەهێشت ئەعسابی بەسەریدا زاڵ بێ) فەرمانی بە عارەبانەچییەکەی دا زوو بیگەیێنێتە

لای گەوڕەکان. شوێنی گەوڕەکان پڕبوو لە عارەبانە و ئاپۆڕەی خەڵك و ئەو سەربازانەی کە گۆڕەپانەکەیان ئابلۆقە دابوو، هەروەها چاوی بە شوێنی تەماشاچییان کەوت کە ئاپۆرەی خەڵك لەوێ شەپۆلی دەدا. دیاربوو کێبەرکێی دووهەم بەڕێوەدەچوو، چونکە کاتێك چووە نێو گەوڕەکانەوە گوێی لە زڕەی زەنگوڵەیەك بوو. لە نزیك گەوڕەکە چاوی بە گلادیاتۆری بۆر و بازووی ماخۆتین کەوت کە گوێپۆشە پەراوێز کەهووەکانی زۆر گەورە دەهاتنە بەرچاو و ژێر جلێکی پرتەقاڵی و کەهووی لێکرابوو و دەیانبرد بۆ گۆڕەپانی کێبەرکێکە.

لە کرێکاری گەوڕەکەی پرسی: کۆرد لە کوێیە؟

ـ لە نێو گەوڕەکەیە، خەریکی زینکردنی ئەسپەکەیە.

فرۆفرۆ، بە زینکراوی لەنێو کۆزەکەی خۆیدا کە دەرگاکەی کرابۆوە ئامادە راوەستابوو، خەریکبوون دەیانهێنا دەرێ.

ـ وەدرەنگ نەکەوتووم؟

کابرای ئینگلیزی گوتی: All right, All right هەموو شتێك جێبەجێ کراوە، هەموو شتێك جێبەجێ کراوە، خەمت نەبێ ـ ڤرۆنسکی سەرنجێکی سەر و یالۆبژ و ئەندامی جوان و دڵگری ئەسپەکەی دا کە سەرتاپای دەلەرزی و بە نابەدڵی چاوپۆشی لێکرد و لە گەوڕەکە هاتەدەرێ. لە کاتێکی زۆر باشدا گەیشتە نزیك شوێنی تەماشاچییان، بەجۆرێك کە سەرنجی هیچ کەسی بۆ لای خۆی رانەکێشا. کێبەرکێی دوو وێرستی خەریکبوو تەواودەبوو، هەموو چاویان لە گاردە سوارەکان بوو کە لە پێشەوە بوون و گاردە تایبەتەکان بە دوایاندا دەهاتن و ئەوپەڕی هەوڵی خۆیان دەدا و بەرەو هێڵی کۆتایی ئەسپەکانیان تاو دەدا. راوەستاوەکان لەنێو گۆڕەپانەکە و دەرەوەی بەرەو هێڵی کۆتایی وروژمیان برد و سەربازان و ئەفسەرانی گاردی سوارە چاوەڕوانی ئەفسەران و هاوڕێیانی خۆیان بوون و شاد و دڵخۆش هاواریان دەکرد. ڤرۆنسکی راست ئەو کاتە گەیشتێ کە زڕەی زەنگی کۆتایی کێبەرکێ لێدرا و گاردێکی سوارەی کەڵەگەت کە یەکەم بوو، سەرتاپای لە قوڕ هەڵکشابوو و لە سەر زینەکە خۆی کووڕ کردبۆوە و لەغاوی ئەسپە شێیەکەی شل کردەوە کە ئارەقە خووساندبووی و رەنگی خەڵووزیی دەنواند و وەهەناسەبڕکێ کەوتبوو، گەیشتە نێو ئاپۆرەی خەڵکەکە بۆیە سەرنجی هیچ کەسی رانەکێشا.

ئەسپە شێی زەبەلاح کەوتبووە. لۆقە و هەوڵی دەدا راوەستێ و ئەفسەری گاردیش وەك کەسێك کە لە خەوێکی قورس راچەنیبێ چاوێکی لە دەوروپشتی خۆی کرد و زەردەخەیەکی بە زۆری نیشتە سەرلێوی. ئاپۆرەی خەڵکەکە، بە دۆست و بێگانەوە دەورەیان لێدا.

ڤرۆنسکی بەقەستی خۆی لە کۆڕی ناوبەدەرەوان و ئەشرافزادەکان دەبوارد کە بە ئازادی و ویقارەوە هەڵسوکەوتیان دەکرد و قسەیان لەگەڵ دانیشتووانی شوێنەکە دەکرد. دەیزانی کارنینا و بێتسی و براژنی خۆی لەوێن و بۆ ئەوەی تووشی پەشۆکاوی و دڵەلەرزە نەبێ لێیان نزیك نەبۆوە. بەڵام ناسیاوەکانی لە پەستا تووشی دەبوون، رایاندەگرت و باسی کێبەرکێکانی پێشوویان بۆ دەگێڕایەوە و لێیان دەپرسی بۆچی درەنگ هاتووە؟

کاتێك کە بەشداربووانی کێبەرکێکە بانگکران بۆشوێنەکە تاکوو خەڵاتەکانیان وەرگرن و هەموو خەڵکەکە روویان لەوێکرد، برا گەورەکەی ڤرۆنسکی، ئەلکساندر، کە سەرهەنگ بوو و ڤاکسیلی بەسەر شانەوە بوو، کەڵەگەت نەبوو، ئەویش وەك ئەلکسی چوارشانە، بەڵام لە ئەو جوانتر و رووگەشتر بوو، دەم و لووت باریك و قەڵەمی و خوێنشیرین بوو. ئاسەواری سەرخۆشی بە روخسارییەوە دیاربوو و بە رووخۆشی هات بۆ لای ڤرۆنسکی.

گوتی: یادداشتەکەی منت بەدەست گەیشت؟ خۆ پیاو لە هیچ کوێ دەستی پێتڕاناگا.

ئەلکساندر ڤرۆنسکی، بەو ژیانەیەوە کە یەکسەر بووبووە خوشگوزەرانی و مەستی یەکێك لە دەستڕۆیشتووانی دەربار بوو.

ئەو ئێستا سەبارەت بە شتێك لەگەڵ ڤرۆنسکی دەدوا کە زۆری بەلاوە تاڵ و ناخۆش بوو، بەڵام چونکە دەیزانی لەوانەیە کەسانێك سەیریان بکەن، لە رواڵەتدا زەردەی دەگرت، وەك ئەوەی سەبارەت بە مەسەلەیەکی ناگرینگ گاڵتە لەگەڵ براکەی بکات.

ئەلکسی گوتی: یادداشتەکەم دی بەڵام تێناگەم تۆ خەمی چیتە؟

ـ خەمی ئەوەمە کە هەر ئێستا بە گوێیان هەڵدێنام کە تۆ هێشتا نەهاتووی و دووشەممەی رابردووش تۆیان لە پێترهۆڤ دیتووە.

ـ هێندێ ئیش هەیە کە باسکردن لەسەریان تەنیا شایانی ئەو کەسانەیە کە ئیشەکە پێوەندیی بەوانەوە هەیە ئەو کارەش کە تۆ ئاوا خەمی بۆ دەخۆی...

ـ باشە، کەوایە ئەو کاتە پیاو نابێ لە ئەرتەشدا خزمەت بکات و....

ـ تکات لێدەکەم خۆت لە کاروباری من وەرمەدە، هەر ئەوەندە.

ئەلکسی ڤرۆنسکی رەنگی بەڕووەوە نەمابوو و چەناگەی دەلەرزی. ئەوەش شتێك بوو کە زۆر بەدەگمەن بۆی پێش دەهات. ئەو پیاوێکی مەند و رۆحسووك بوو و زۆر بە دەگمەن رقی هەڵدەستا، بەڵام کاتێك لە دین دەردەچوو و چەناکەی وەلەرزین دەکەوت، دەبووە مرۆڤێکی ترسناك و ئەلکساندر ڤرۆنسکی بە باشی لەوە دەگەیشت. بە رووخۆشی زەردەیەکی گرت و گوتی:

ـ من تەنیا دەمویست نامەکەی دایەگیانم بە دەستت بگەیەنم. وەڵامی بدەوە و هەوڵ بدە بەر لە کێبەرکێکە لەسەرەخۆ بی، ***خودا پشت و پەنات بێ!*** ـ ئەوەی گوت و بە پێکەنینەوە لێی دوورکەوتەوە.

بەڵام دوای ئەویش سڵاوێکی دۆستانە رایگرت.

ستیپان ئارکادیچ بوو کە گوتی: ئەوە لایەك لە هاورێکەت ناکەیەوە؟ سڵاو، ***خۆشەویستەکەم*** ـ ئەو لێرە، لەنێو ئەو شکۆ و پرشنگدارییەی پترزبۆرگیش بەو روخسارە گەش و پڕ نەشەیە و لاریشە بریقەدار و رازاوەکەی کەمتر لە مۆسکۆ سەرنجراکێش نەبوو. گوتی: دوێشەو هاتم و زۆر خۆشحاڵم کە سەرکەوتنی تۆ دەبینم. کەنگێ بتبینم؟

ڤرۆنسکی گوتی: سبەینێ سەرێك لە باشگای ئەفسەران هەڵێنە ـ داوای لێبوردنی کرد و لەسەر قۆڵی باڵتەکەیەوە مەچەکی ستیپان ئارکادیچی گوشی و رۆیشت بۆ نێوەڕاستی گۆڕەپانەکە کە خەریکبوون ئەسپەکانیان بۆ کێبەرکێی گەورەی لەمپەردار ئامادەدەکرد.

ئەسپی بە ئارەقە خووساو و شەکەتی کێبەرکێی پێشوو لەگەڵ مەیتەرەکان دەگەڕانەوە بۆ گەورەکە، ئێستاش ئەسپی بەگوڕ و تازە نەفەسی کێبەرکێی دوایی کە زیاتریان ئینگلیزی بوون و هەموو سەریان لە کەللەپۆش گیرابوو و توندوتۆڵ زین کرابوون، هەموو دەتگوت باڵندەی زەبەلاح و سەیروسەمەرەن کە یەك بەدوای یەکدا دێن. فرۆفرۆ نێوقەد باریك و جوان بەو رەفیچکە تاڕادەیەك درێژانەوە وەك فەنەر نەرم، نەرم هەنگاوی دەنا و لەلای راستەوە دەیانهێنا. لەولاتریشەوە خەریکبوون ژێر جلی گلادیاتۆریان لێدەکردەوە و گوێچکە درێژەکانی قوت کربۆوە. جەستەی زەلام و بەرچاو و رێکوپێکی گلادیاتۆر کە کەفەڵێکی جوان و رەفیچکەی کورت و داکەوتوو بوو، بێ ئیختیار سەرنجی ڤرۆنسکی راکێشابوو. دەیویست بچێت بۆ لای ئەسپەکەی خۆی بەڵام لەپڕ ناسیاوێکی تووش بوو و لەقسەی گرت.

ئەو ئاشنایە کە ڤرۆنسکی لەگەڵیدا خەریکی قسەکردن بوو گوتی: ئا، ئەوەتا کارنین. بەدوای ژنەکەیدا دەگەڕێ. ژنەکەی لەو شوێنەی نێوەڕاست دانیشتووە. ئێوە چاوتان پێینەکەوت؟

ڤرۆنسکی تەنانەت چاوی لەو شوێنەش نەکرد کە ئانا لێیدانیشتبوو و بەپەلە رۆیشت بۆ لای ئەسپەکەی.

ڤرۆنسکی فریا نەکەوت زینی ئەسپەکەی تاقی بکاتەوە و ئەگەر شتێکی پێویست بوو بە خزمەتکارەکانی چاك بکات، بانگیان کردن بۆ شوێنی تیروپشکی ژوومارەکان کە هەرکەسەی

ژومارەی خۆی دەرکێشێ و شوێنی دەسپێکی خۆی لێ مەعلووم بێ. حەڤدە ئەفسەر بە ئاکاری بنەوشەیی و روخساری گرژ و رەنگی پەڕیوەوە بەرەو شوێنەکە رۆیشتن و هەرکەس پشکی خۆی دەرکێشا. ژومارە حەوت وەبەر ڤرۆنسکی کەوت. فەرمانی «سواربن» راگەیاندرا.

ڤرۆنسکی هەستی دەکرد کە ئەو و سوارەکانی تر خاڵێکن کە تەواوی چاوەکان لەسەر ئەوان گیرساونەتەوە، گوشارێکی رۆحی ماسوولکەکانی لەشی داگرتبوو و بەهۆی ئەوەشەوە هەڵسوکەوتی ئارام و رێکوپێکتر کردبوو و ڤیتوقۆز رۆیشت بۆ لای ئەسپەکەی. کۆرد کە کێبەرکێکەی بە جێژنێکی گەورە دەزانی، جلوبەرگی فەرمیی لەبەرکردبوو: باڵتەیەکی رەشی لەبەردا بوو و قۆپچەکانی داخستبوو، ملیوانە شەقورەقەکەشی گوشاری بۆ چەناگە و بنشەویلاکەی هێنابوو. کلاوێکی چوار دەوری ملەوەن و رەشی کردبووە سەری و جووتێ جەزمەی سواریی لە پێ کردبوو. وەك هەمیشە مەند و ماقووڵ خۆی رەشمەی ئەسپەکەی بە دەستەوە گرتبوو و لە بەردەمی راوەستابوو. فرۆفرۆ دەتگوت چەقوچۆ دایگرتووە و سەرتاپای دەلەرزی. چاوە پڕ بلێسەکەی زیت کردەوە و ئاوڕی دایەوە بۆ لای ڤرۆنسکی کە خەریکبوو لێینزیك دەبۆوە. ڤرۆنسکی قامکێکی کرد بە ژێر کەژووی ژێر سکی ئەسپەکەدا. ئەسپەکە زیاتر ئاوڕی دایەوە بۆ لای. لمبۆزی داچەقاند و ددانی وەدیارخست و گوێی داتەپاند. کابرای ئینگلیزی لێوی خۆی گەست، چونکە دەیویست هەرکەسێك زینکردنەکەی تاقی بکاتەوە بە تەوسەوە پێی پێبکەنێ.

ـ وا چاکە سوار بی، ئارامتر دەبیەوە.

ڤرۆنسکی دواین جار چاوێکی لە رەقیبەکانی کرد. دەیزانی لەکاتی بەرێوەچوونی کێبەرکێکەدا ئیتر نایانبینێ. دووکەس ئێستا بەرەو لای هێڵی دەسپێك دەڕۆیشتن. گالتسین، یەکێك لە مەترسیدارترین رەقیبەکان و هاوڕێی ڤرۆنسکی بوو و بە دەوری ئەسپەکوێتەکەیدا دەهات کە ملی هەڵدەسووڕاند و چەپۆکانی دەکرد. ئەفسەرێکی خریلانە کە گاردی تایبەت بوو و پانتۆڵێکی سواریی تەنگی لەپێدا بوو و وەك پشیلەیەك لەسەر زینەکەی خۆی مەڵاس دابوو و غاری دەدا و دەیویست لاسایی ئینگلیزییان بکاتەوە. پرێنس کووزۆلییۆڤ[١٠٨] رەنگ بزڕکاو لە سەر پشتی ماینە رەسەنەکەی خۆی دانیشتبوو کە پەروەردەی ئیلخی گرابۆسکی بوو، مەیتەرەکەی رەشمەکەی بە دەستەوە گرتبوو و دەیبردە پێشێ. ڤرۆنسکی و هەموو

108- Kousovier

هاوڕێکانی پرێنسیان دەناسی و بەتایبەت دەشیانزانی کە زوو هەڵدەچێ و زۆریش قۆڕەدەماخ ولەخۆ باییە. دەیانزانی لە هەموو شتێك دەترسێ و تەنانەت ترسی لە سواربوونی ئەسپی ئەرتەشیش هەیە. بەڵام راست بەو هۆیەی کە کێبەرکێکە مەترسیدار بوو گریمانەی ئەوە هەبوو کە لاق و دەست و ئەستۆ شکانی تێدابێ و لە نزیك هەر لەمپەرێك دوکتۆرێك و عارەبانەیەك کە وێنەی خاچێکی بەسەرەوە بوو و پەرستارێك لە نێویدا ئامادە دانیشتبوون، بڕیاری دابوو لە وکێبەرکێیەدا بەشداری بکات. چاویان بە یەکتر کەوت و ڤرۆنسکی بە مێهرەبانییەوە وەك ئەوەی دڵگەرمی بکات چاوێکی لێداگرت. تەنیا کەسێکی نەدەدی کە ئەویش گەورەترین رەقیبەکەی واتە ماخۆتین بوو. کە گلادیاتۆری لەژێر پێدا بوو.

کۆرد بە ڤرۆنسکیی گوت: پەلەمەکە. لەبیرت بێ کاتێك نزیك لەمپەرەکە دەبیتەوە نە خاویکەوە و نە تاویدە. ئەسپەکە ئازادکە با هەرجۆرێك خۆی پێی خۆشە بازبدا.

ڤرۆنسکی رەشمەی بە دەستەوە گرت و گوتی: زۆر چاکە، زۆر چاکە!

ئەگەر دەتوانی وەپێش کەوە ئەگەر هاتوو وەدواش کەوتی هەتا خولەکی کۆتایی هیوابڕاو مەبە.

ئەسپەکە دەرفەتی نەبوو بجووڵێ. ڤرۆنسکی بە تەکانێکی نەرم پێی لەسەر ئاوزەنگیی پۆڵایین و ددانەدار دانا و ئەندامی خاراو و بەهێزی خۆی هەڵدایە سەر ئەسپەکە و سووك و خۆڕاگر لەسەر ماڵی زینەکە دانیشت و وە جیڕەجیڕی خست. لاقی راستەشی خستە سەر ئاوزەنگی و بە دەستی رەقاس بووی هەوساری لە نێوان پەنجەکانیدا رێکوپێك کرد و کۆرد هەردوو دەستی بەردایەوە. فرۆفرۆ وەك ئەوەی دوودڵ بێ، کە بەکام لاقی بەرەو پێشەوە هەنگاو هەڵگرێ، ملی درێژی راست کردەوە و هەوسارەکەی کێشا و وەڕێکەوت، سوارەکەی سەرپشتی کە دەتگوت لەسەر فەنەر دانیشتووە بە نەرمی وە هەڵتەك هەڵتەك خست. کۆرد بە توندی شەقاوی هەڵێنایەوە و بە دوایاندا هەڵات. ئەسپەکە کە تووشی هەیەجان بووبوو هەرجارێ ملی بە لایەکدا بادەدا و هەوڵی دەدا سوارەکەی خۆی هەڵخەڵەتێنێ و ڤرۆنسکی بێهۆ حەولیدەدا بە دەست یان بە دەنگدان هێوری بکاتەوە.

خەریکبوون لە چۆمێك نزیك دەبوونەوە کە بەنداوێکیان لەبەردا دروست کردبوو، کە ئاوەکەی بگەڕێتەوەو لەوێوە بەرەو هێڵی دەسپێکی کێبەرکێ دەڕۆیشتن. هێندێ لە سوارەکان لە پێشەوە رۆیشتبوون و بڕێکیان لە دواوە دەهاتن کە ڤرۆنسکی لە ناکاو زرموکوتی ئەسپێکی لە پشت سەری خۆی بیست کە بە غار بە رێگا پڕ قوڕ و زێلاقەکەدا دەهات. ماخۆتین بە سواری گلادیاتۆری گوێقوت و پا چەرمووی خۆی وەپێشی کەوت. ماخۆتین قاقایەکی کێشا و

ددانە درێژەکانی وەدیارخست، بەڵام ڤرۆنسکی بە روانینێکی گرژ و توورە وەڵامی پێکەنینەکەی دایەوە. دەتوانین بڵێین ڤرۆنسکی ماخۆتینی نەدەکەوتە بەردڵ و ئێستا ئەوی بە رەقیبی کەللە رەق و مەترسیداری خۆی دەزانی و بۆ ئەوەش رقی هەستا کە رەقیبەکەی شانبەشانی ئەو دەیهەوێ باژوێ. فرۆفرۆ بە لاقی چەپەی کەوتە غار و دوو باز و چەپۆکانی کرد، بەڵام چونکە هەوسارەکەی بە توندی کێشرابوو، رقی هەستاو دەستیکرد بە لۆقەکردنێکی ناخۆش و سوارەکەی وەهەڵتەکهەڵتەك خست. کۆردیش نێوچاوانی تێکنا و بە دوای ڤرۆنسکیدا هەڵات.

## بیست و پێنج

ئەو ئەفسەرانەی لەو کێبەرکێیەدا بەشدارییان کردبوو حەڤدە کەس بوون. سوارەکان دەبوو مەودایەکی چوار وێرستی ببڕن کە گۆڕەپانەکەشی جەغزێکی هێلکەیی بوو و دەبوو بە بەر شوێنی راوەستانی داوەراندا تێپەڕن. مەودای کێبەرکێکە نۆ لەمپەری لێدامەزرێندرابوو. یەکیان بەنداوێکی پڕ لە ئاو بوو و دووهەمی دیوارێك بوو بە بەرزایی دوو ئارشین (نزیکەی یەك میتر و نیو) کە راست لەبەرشوێنی راوەستانی داوەران هەڵکەوتبوو، یەکێکی تریان خەندەکێکی وشك و دوای ئەویش خەندەکێکی پڕ لە ئاو، هەروەها کۆگایەك گیا و دوای ئەویش لەمپەرێك کە پێیان دەگوت «قەرەوێڵەی ئیرلەندی». یەکێك لە دژوارترین لەمپەرەکانیش دیوارێك بوو کە بنچك و دەوەنیان لەسەر چەقاندبوو لەو دیویشییەوە خەندەکێکیان هەڵکەندبوو کە ئەسپەکە نەیدەدی و ئەگەر نەیتوانیبایە بە سەر هەردوو لەمپەرەکەدا باز بدا دەگلا و دەست و لاقی دەشکا، دوای ئەوانەش دیسان دوو خەندەك بوو“ یەکیان وشك و ئەوەی دیکەشیان پڕ بوو لە ئاو و کۆتایی مەوداکەش دیسان تێپەڕین بوو بە بەر شوێنی راوەستانی داوەراندا. بەڵام شوێنی دەسپێکی کێبەرکێکە لەسەر جەغزە هێلکەییەکە نەبوو، بەڵکوو دووسەد، سێسەد میتر لە دەرەوەی جەغزەکە هەڵکەوتبوو و یەکەم لەمپەریشیان لەسەر ئەو رێگایە دامەزراندبوو، ئەویش چۆمەڵێك بوو کە بەنداویان بۆ سازکردبوو و ئاوەکە گەڕابۆوە و هاتبووە سەرێ. بەرینایییەکەشی دوو میتر بوو. سوارەکان لەوەیاندا بەدەست خۆیان بوو لە ئاوەکە بدەن یان بەسەریدا باز بدەن.

سوارەکان سێ جار بەڕیز کران و هەرجارێ ئەسپی یەکیان لەناکاو دەردەپەڕی و ناچاربوون سەرلەنوێ دەست پێبکەنەوە. سەرهەنگ سسترین[109] کە لەو بوارەدا فەرماندەرێکی بەئەزموون بوو، خەریکبوو رقی هەڵدەستا. بەڵام بۆ جاری چوارەم کە فەرمانی دەسپێك درا، سوارەکان هاوکات تاویاندا.

لەو ماوەدا کە سوارەکان بەڕیز دەبوون چاوەکان و کامێراکان هەموویان لە سەر گرووپە رەنگاوڕەنگەکەیان گیرسابوونەوە.

دەنگی «دەستپێکرا! وەڕێکەوتن!» لە هەموو لایەکەوە هەستا و کۆتایی بە بێدەنگی و چاوەڕوانی هێنا.

تەماشاچییانی راوەستاو، دانەدانە و پۆلپۆل کەوتنە جموجۆڵ و بەملا و بەولادا هەڵدەهاتن بۆ ئەوەی باشتر چاویان لێبێ. گرووپی چڕەبەندی سواران هەر لە خولەکی یەکەمەوە بڵاو بوونەوە. دیاربوو چۆن دوواندووان و سیانسیان بە دوای یەکدا لە بەنداوەکە نزیك دەبوونەوە. تەماشاچییان پێیان وا بوو هەموو سوارەکان پێکەوە غار دەدەن، بەڵام بۆ سوارەکان تەنانەت چرکەیەك پێشکەوتن یان دواکەوتن زۆر گرینگ بوو.

فرۆفرۆ سەرکێش و وەهەیەجان کەوتوو بە چوار ناڵ دەڕۆیشت، سەرەتا کەوتە دواوە، چونکە چەند ئەسپ زووتر دەرچوون. بەڵام سەرکێشی کرد و دەیویست هەوساری بۆ شل کرێ و ڤرۆنسکی بە هەموو توانایەوە هەوڵی دەدا کۆنتڕۆڵی بکا و لە ژێر رکێفی دەرنەچێ، بۆیە هێشتا نەگەیشتبووە بەنداوەکە بە سانایی وەپێش سێ سوار کەوت، بە جۆرێك کە کەفەڵی گلادیاتۆر، ئەسپە کوێتەکەی ماخۆتین لە پێشییەوە بوو کە زۆر رێکوپێك دەڕۆیشت و لە پێش هەمووشیانەوە دیانی شەپال بوو کە کووزۆلییۆڤ سواری بووبوو، هێندەشی نەمابوو کووزۆلییۆڤ گیانی دەرچێ ئەوەندە دەترسا.

ڤرۆنسکی چەند خولەکی سەرەتا نە بەسەر خۆیدا زاڵبوو، نە ئەسپەکەشی بە جوانی خستبووە ژێر کۆنتڕۆڵی خۆی. هەتا نەگەیشتە لەمپەری یەکەم، یانی بەنداوەکە، نەیدەتوانی بە جوانی ئەسپەکە باژوێ و زاڵبێ بە سەریدا.

گلادیاتۆر و دیان پێکەوە و راست لەیەك چرکەدا گەیشتنە لەمپەرەکە. وەك هەلووك پەڕین و لەوبەری بەنداوەکە نیشتنەوە و کەوتنەوە چوارتاڵ. فرۆفرۆش بە نەرمی بەجۆرێك کە

---

109- Cestrin

هەستی پێنەدەکرا، بەدوای ئەواندا خۆی هەڵدا و وەك ئەوەی باڵی گرتبێ، وەحەوا کەوت. بەڵام بەڕاست لەوکاتەدا کە ڤرۆنسکی خۆی بە حەواوە هەست پێکرد، لەناکاو دیتی کووزۆلییۆڤ لەبەر پێی ئەسپەکەی ئەم و لەوبەری بەنداوەکەوە کەوتۆتە ژێر ئەسپەکەی و پێکەوە دەگلێن. (کووزۆلییۆڤ لەگەڵ بازدانی ئەسپەکەی لەغاوی بۆ شل کردبوو، ئەسپەکەش کاتی نیشتنەوە ملی دانەواندبوو و سوارەکەی بەسەر ملیدا فڕێبدابوو.) ڤرۆنسکی دواتر ئەوەی بۆ دەرکەوت. ئێستا تەنیا دیتی خەریکە لەگەڵ فرۆفرۆ دەنیشنە سەر دەست یان سەری دیان. بەڵام فرۆفرۆ وەك پشیلەیەکی سووك و چالاك لەگەڵ خۆهەڵدانەکەی بە هەوڵی دەست و لاق و پشتی خۆی، توانیی لەولای ئەوانەوە بنیشێتەوە و نەکەوت بەسەر ئەسپە گلاوەکەدا.

ڤرۆنسکی گوتی: ئەی، گیان، بژیی فرۆفرۆ!

ڤرۆنسکی دوای بەنداوەکە بە تەواوی ئەسپەکەی هێنابووە ژێر رکێفی خۆی و تۆزێ خاوی کردەوە بۆئەوەی بەدوای ماخۆتیندا بەسەر لەمپەرە گەورەکەدا بپەڕێ و لە مەودای بێلەمپەری دواییدا کە دووسەد ساژن، نزیکەی چوارسەد مەتر دەبوو هەوڵبدا وەپێشێ بکەوێتەوە.

لەمپەری گەورە راست لەبەر شوێنی دانیشتنی داوەران هەڵکەوتبوو. کاتێك کە لە شەیتان نزیك دەبوونەوە، (ئەوە ناوێك بوو کە بەسەر لەمپەرە گەورەکەیاندا بڕیبوو.) تیزار و دەرباریان و تاقمی تەماشاچییان هەموو چاویان لە ئەو و ماخۆتین بڕیبوو کە ماخۆتین بەقەد درێژایی ئەسپێك لە پێش ڤرۆنسکییەوە بوو. ڤرۆنسکی هەستی بە هەموو ئەو سەرنج و چاوانە کرد کە لە هەموو لایەکەوە تێیان دەڕوانی، بەڵام جگە لە گوێچکەی ئەسپەکەی خۆی و زەوییەك کە بە پڕتاو بەرەولای دەفڕی و کەفەڵ و لاقە بازووەکانی گلادیاتۆر کە بە پڕتاو لەپێشەوە چوارناڵی دەکرد و مەودای نێوانیان کەم دەبۆوە، هیچی تری نەدەدی. گلادیاتۆر کە گەیشتە شەیتان خۆی هەڵدا و بێ ئەوەی لاقی لە هیچ شتێك بکەوێ کلکی پەخشان بووی لە پشت لەمپەرەکەوە لە چاوی ڤرۆنسکی ونبوو.

دەنگێکی بیست کە گوتی: بژیی!

هەر لەوکاتەدا تەختەی لەمپەر وەك برووسکە لەبەر چاوی ڤرۆنسکی زەقبوونەوە، تۆزێ لەسەر ئەسپەکەی خۆی هەڵێنا و ئەسپەکەش بێ ئەوەی تۆزە گتگرتێنك لە غارەکەیدا هەبێ خۆی هەڵاویشت و پاشان تەختەکان بزر بوون و تەنیا لە دواوەی شتێك تەقەی هات. فرۆفرۆ کە دیتنی گلادیاتۆری لە پێشەوەیە کەوتبووە هەیەجان و زووتر لەوەی پێویست بێ خۆی هەڵاویشتبوو و سمی دواوەی لە تەختەی لەمپەرەکە درابوو. بەڵام هیچ جیاوازییەك بەسەر

غاردانەکەیدا نەهات. ڤرۆنسکی کە پڕیشکە قوڕێك لە دەموچاوی کەوتبوو هەستی کرد هەر بەو مەودایەی پێشوو لە دوای گلادیاتۆرەوە دەڕوا و وەك پێشتر کەفەڵی گلادیاتۆر و کلکە قولەکەی لە پێش خۆیەوە دەدی و دەست و لاقە بازووەکەشی کە بە پڕتاو هەڵبەزدابەزیان دەکرد، بەڵام دوورنەدەکەوتنەوە.

هەر لەوکاتەدا کە ڤرۆنسکی لە بیری ئەوەدابوو وەپێش ماخۆتین بکەوێ، فرۆفرۆش دەتگوت خواستەکەی ئەوی بۆ دەرکەوتووە و بێ ئەوەی پێویست بە تێراخوڕین بێ، بە تەواوی توانایەوە غاری دەدا و لەلای تەنافەکەوە کە باشترین شوین بوو، لە ماخۆتین نزیك دەبۆوە، ماخۆتین ڕێگای پێنەدەدا لەولایەوە وەپێشی بکەوێ. بۆیە ڤرۆنسکی بە بیریدا هات کە دەتوانێ لەلای دەرەوە وەپێشی بکەوێ، فرۆفرۆ باری لاقی گۆڕی و لەولایەی ترەوە هەوڵی وەپێشکەوتنی دا. شانی فرۆفرۆ کە ئێستا بە ئارەقە ڕەش داگەڕابوو گەیشتبووە نزیك کەفەڵی گلادیاتۆر. هەر دوو ئەسپەکە چەند قەڵەمبازێك پێکەوە و شانبەشان غاریاندا. بەڵام بەرلەوەی بگەنە لەمپەرێکی تر ڤرۆنسکی بەو مەبەستەی کە مەودای جەغزێکی گەورەتر نەبڕێ لەغاوی ئەسپەکەی شل کرد و ڕاست لەوکاتەدا کە گەیشتە کۆگا گیایەکە بە پڕتاو وەپێش ماخۆتین کەوت. دەموچاوی لە قوڕ هەڵکشاوی خەنیم بۆ چرکەیەك وەك برووسکە بەبەر چاویدا تێپەڕی. تەنانەت پێیوابوو دەگرژێتەوە. ڤرۆنسکی وەپێش ماخۆتین کەوت بەڵام هەستی دەکرد لە پشتسەرییەتی و بەردەوام زرمەی سم و پرمەی لە پەستای پەڕەی لووتی گلادیاتۆری لە پشتسەری خۆیەوە دەبیست.

لە دوو لەمپەری تریش کە خەندەك و لاجامە بوو بە ئاسانی تێپەڕین، بەڵام ڤرۆنسکی هەروا فیشکە و زرمەی غاردانی ئەسپەکەی ماخۆتینی لە دوای خۆیەوە دەبیست کە لێی نزیك دەبۆوە. تۆزێ لەغاوەکەی بۆ شل کرد و بە خۆشحاڵییەوە هەستی کرد کە ئەسپەکەی بە ئاسانی خێراییەکەی زیادکرد و تۆزێ زرمەی سمی گلادیاتۆری لێ دوورکەوتەوە.

ئێستا ئیتر ڤرۆنسکی تەواو وەپێش کەوتبوو، ئەوەش شتێکبوو کە خۆشی حەزی پێدەکرد و کۆردیش ڕایسپاردبوو، بۆیە ئێستا زۆری متمانە بە سەرکەوتنی خۆی هەبوو. نەشە و هەیەجان و خۆشەویستی فرۆفرۆ ڕۆح و گیانی داگرت. دەیویست ئاوڕێك بۆ دواوە بداتەوە، بەڵام نەیوێرا و هەوڵیدا خۆی ئارام بکاتەوە و ئەوەندە گوشار بۆ ئەسپەکەی نەهێنێ و ئەوڕادە تواناییەی کە هەستی دەکرد لە لەش و ماسوولکەی گلادیاتۆردا ماوە، بۆ ئەسپەکەی خۆی بهێڵێتەوە. تەنیا لەمپەرێك مابوو کە لە هەموویان دژوارتر بوو. ئەگەر بیتوانیبایە بەر لە

هەمووان بەسەر ئەو لەمپەرەشدا بازبدات لەپێش هەموویانەوە دەگەیشتە هێڵی کۆتایی. لە قەرەوێڵەی ئیرلەندی نزیك دەبۆوە. ئەو و فرۆفرۆ لە دوورەوە لەمپەرەکەیان دەدی و هەردووکیان، ئەو و ئەسپەکەی بۆ ساتێك لە دڵیاندا هەستیان بە دڕدۆنگی کرد، لە گوێچکەی قوتی ئەسپەکەیدا دوودڵیی دیت و خەرەزەنگەکەی راوەشاند، بەڵام لەڕێوە بۆی دەرکەوت دڕدۆنگییەکەی لەخۆڕا بووە. ئەسپەکەی دەیزانی چ بکا، خێراییەکەی زیاتر کرد و بە رەوتی رێکوپێك و میزان، راست ئەو جۆرەی کە ڤرۆنسکی چاوەڕوانیی کرد، خۆی هەڵاویشت و خۆی دایە دەست وزەی فڕین، بەجۆرێك کە دوورتر لەوەی کە پێویست بوو بازیدا ئەوبەری خەندەکەکە و هەر بەو گوڕ و تین و غارەوە و بێ ئەوەی هەوڵی زیاتر بدا و تووشی سەرسم و هەڵنەگووتن بێ دەستی کردەوە بە چوارناڵ و کەوتەوە سەرڕەوتی خۆی.

ـ بژی ڤرۆنسکی!ـ دەنگی ئەو تاقمە بوو کە لەلای ئەو لەمپەرە راوەستابوون و ئەو دەیزانی هاوقەتاران و دۆستانی بوون. دەنگی یاشڤینی ناسییەوە بەڵام وەبەرچاوی نەهات.

ڤرۆنسکی لە دڵی خۆیدا بە فرۆفرۆی دەگوت «هەك بژیی، زێڕ و گەنجەکەم!» گوێشی بۆ ئافەرین و بژیبژیی دوای خۆی شل کردبوو. بەڵام کە زرمەی سمی گلادیاتۆری لە پشتسەرییەوە بیست لەبەرخۆیەوە گوتی: «ئەویش توانیی بەسەر لەمپەرەکەدا تێپەڕێ.» تەنیا لەمپەری کۆتایی مابوو کە خەندەکێکی پڕ لە ئاو بوو و بەرینایییەکەشی دوو ئارشین بوو. ڤرۆنسکی تەنانەت چاویشی لێنەدەکرد و بەقەستی ئەوەی کە بە مەودایەکی زۆر لە کەسی دووهەم دەگاتە هێڵی کۆتایی، دەستی کرد بە هەڵسووڕاندنی دەستی و بە شل و توندکردنەوەی لەغاوەکەی سەری ئەسپەکەی دادەنەواند و هەڵیدەهێنایەوە. هەستی دەکرد کە ئەسپەکەی خەریکە دوایین پاشەکەوتی وزەی خۆی لەکار دەکا. تەنیا شان و ملی نەخووسابوو، بەڵکوو ئارەقە زەنگوڵ زەنگوڵ لەسەر کۆپارە و سەر و گوێچکە نووك تیژەکانی راوەستابوو و کەوتبووە هەناسەبڕکێ. بەڵام دەیزانی ئەو وزە و توانایییەی ئەسپەکەی بۆ بڕینی مەودای دووسەد ساژن زیادە و کەم نییە. ڤرۆنسکی تەنیا بە مەودای نێوان خۆی و زەوی و رەوتی نەرمی ئەسپەکەدا هەستی دەکرد کە ئەسپەکەی چەندە بە پڕتاو دەڕوا. ئەوەندە بە ئاسانی بەسەر خەندەکەکەدا تێپەڕی کە دەتگوت هەر نەشی دیوە و وەك مەلێکی تیژباڵ بەسەر خەندەکەکەدا فڕی. بەڵام راست لەوکاتەدا ڤرۆنسکی بە ترسێکی زۆرەوە هەستیکرد کە بێ ئەوەی خۆی تێبگات چ کارێکی خراپی کردووە و لەگەڵ رەوت و بازی ئەسپەکە هەماهەنگ نەبووە و لەناکاو خۆی داوەتەوە بەسەر زینەکەدا. لەپڕ جۆری دانیشتنی لەسەر پشتی ئەسپەکە گۆڕا و تێگەیشت کە

رووداوێکی تاڵ و پڕمەترسی رووی داوە. بەر لەوەی بتوانێ بە جوانی تێبگات چبووە، لاقی بازووی گلادیاتۆری دی بە پڕتاو وەك برووسکە بە پەنایدا تێپەڕی و ماخۆتین وەپێشی کەوت. لاقێکی ڤرۆنسکی گەیشتە عەرزی و فرۆفرۆ راست بەسەر ئەو لایەدا گلا. هێشتا نەیتوانیبوو بە تەواوی لاقی لەژێر ئەسپەکە بێنێتە دەرێ کە فرۆفرۆ کەوتە سەر لاتەنیشت و دەستیکرد بە قرخەقرخ و هەوڵێدەدا هەستێتەوە. مله باریکەکەی لە ئارەقەدا خووسابوو و لەگەڵ هەر تەکانێك تۆزێك هەڵیدەهێنا و دایدەنەواندەوە. ئەسپەکە وەك مەلێکی پێکراو لەبەر پێیدا کەوتبوو و وەك مێوژۆکە دەلەرزی و لاقەفرتەی دەکرد. ئەو خۆهەڵدانە نابەجێیەی ڤرۆنسکی پشتی ئەسپەکەی شکاندبوو، بەڵام ئەو زۆر درەنگ ئەوەی بۆ دەرکەوت. ئێستا تەنیا دەیدی ماخۆتین بە پڕتاو لێی دووردەکەوێتەوە و ئەویش لە نێو قوڕ و زێلاقەدا گلاوە و زەوی لە ژێر پێیدا جووڵەی لێبڕاوە و فرۆفرۆ لەبەر چاوی بە لادا هاتووە و زۆر بە دژواری هەناسە دەکێشێ و ملی بۆ لای ئەو خوار کردۆتەوە و بە چاوە جوانەکانی تێیدەڕوانی. ڤرۆنسکی کە هێشتا تێنەگەیشتبوو چ روویداوە، هەوساری ئەسپەکەی گرت و کێشای. فرۆفرۆ دیسان هەوڵی دا هەستێ و وەك ماسی دەستیکرد بە جینگڵ لەخۆدان و ئاتەگی زینەکەی وەجیڕە جیڕ کەوت. هەستا سەر هەردوو دەستی بەڵام چونکە بڕستی لێبڕابوو نەیتوانی لەسەر لاقی راوەستێ و دیسان بەلادا کەوتەوە. ڤرۆنسکی بە رەنگی هەڵبزڕکاو و شێواوەوە، چەناگەی دەلەرزی، بە پاژنەی لاقی لە قەبرغەی ئەسپەکەی دەکوتا و دیسان دەستیکردەوە بە کێشانی لەغاوەکەی. بەڵام ئیتر فرۆفرۆ توانایی جووڵانی نەبوو و لمبۆزی لە قوڕەکە هەڵدەچەقاند و چاوی پڕ لە پرسیاری لە خاوەنەکەی بڕیبوو.

ڤرۆنسکی بە هەردوو دەستی سەری خۆی گرت و هاواری کرد: ئەی هاوار!.... ـ بە دەنگی بەرز هاواری کرد: ئاخ چیمکرد! کێبەرکێکەشم دۆڕاند، خەتای خۆم بوو، چ تاوانێکی پڕ شوورەیی و گەورە! چیمکرد لەو ئاژەڵە بەستەزمانە، چۆن ئەسپە نازەنینەکەم لەنێو برد، ملم شکێ بۆ کارێکی کردم!

خەڵکەکە و پزیشك و یاریدەدەرەکانیان و ئەفسەرانی هاوقەتاری هەموو هەڵاتن بۆ لای. خەمبار و پەشۆکاو راوەستابوو و هەستی دەکرد ساغ و سلامەتە. پشتی ئەسپەکەی شکابوو و بڕیاردرا ساردی بکەنەوە و نەجاتی بدەن. ڤرۆنسکی نەیدەتوانی وەڵامی پرسیارەکانیان بداتەوە و قسەی بۆ نەدەهات. رووی وەرگێڕا و بێ ئەوەی کڵاوەکەی هەڵگرێتەوە کە لە سەری داکەوتبوو، ملی رێی گرت و بێ ئەوەی خۆشی بزانێ بۆ کوێ دەچێ لە گۆڕەپانی تەڕاتێن

چووەدەرێ. هەستی دەکرد کە مرۆڤێکی چارەڕەشە. بۆ یەکەم جار لە ژیانیدا هەستی بە تاڵترین و ناخۆشترین کارەسات کرد و خەمێکی قورس دڵی ڕێکگوشی، خەم و نیگەرانییەك کە بۆی قەرەبوو نەدەکرایەوە و خۆشی زۆر بە تاوانبار دەزانی و هەستی بە قورسایی ئەو تاوانە دەکرد لەسەر دڵ و دەروونی.

یاشڤین کلاوەکەی هەڵگرتەوە و خۆی گەیاندێ و هەتا ماڵێ لەگەڵی چوو. ڤرۆنسکی نیو سەعات دواتر وەخۆ هاتەوە. بەڵام بیرەوەریی تاڵی ئەو کێبەرکێیە هەتا ماوەیەکی دوور و درێژ دڵتەزێنترین و تاڵترین شوێنی لەسەر دڵ و دەروونی دانا.

## بیست و شەش

پێوەندیی ڕواڵەتیی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لەگەڵ ژنەکەی لە چاو رابردوو گۆڕانێکی بەسەردا نەهاتبوو. تەنیا جیاوازییەکی لەگەڵ پێشوو هەبوو، ئەویش ئەوەبوو ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ کەمتر لە رابردوو کاتی مۆڵەتی هەبوو. ئەو ئەمساڵیش وەك ساڵانی پێشوو سەرەتای بەهار چووبوو بۆ ناوەندی ئاوی گەرماو تاکوو بارودۆخی لەشساغیی خۆی (کە هەموو ساڵێك بەهۆی قورسبوونی کارەکەیەوە لە وەرزی زستاندا تووشی نەخۆشی دەبوو) چارەسەر بکات و وەك هەمیشە مانگی ژوویيە گەڕابۆوە و لەڕێوە بە توانایيەکی زیاتر لە پێشووەوە دەستی کردبۆوە بە کار و ئیشەکەی خۆی. ژنەکەی وەکوو هەموو ساڵێك هاتبوو بۆ زۆزان و ئەویش لە پترزبۆرگ مابۆوە.

دوای ئەو مشتومڕەی کە پاش میوانداریيەکەی ماڵی پرێنسس تۆرسکایا لەگەڵ ژنەکەی وەڕێیخستبوو ئیتر قەت سەبارەت بە دڵپیسی و خانەگومانی لەگەڵ ئانا نەدوابوو. لەبزی ئاخافتنەکەی کە دەتگوت لاسایی کەسێك دەکاتەوە، بۆ ئەم هەڵسوکەوتانەی ئێستای لەگەڵ ژنەکەی زۆر ناسازگار بوو. نێوانەکەیان ساردوسڕ بوو. وێدەچوو دەمەقاڵێی ئەوشەوەی یەکەم کە ژنەکەی زۆریشی گوێ پێنەدابوو و نەیویستبوو کێشەکە گەورە بێتەوە، بۆیە زۆری بە دڵەوە نەگرتبوو. تەنیا تۆزێکی لێناڕازی بوو و رەنگدانەوەی داخ و خەفەتی پێوە دیاربوو و هیچی تر. وەك ئەوە وابوو کە لە خەیاڵی خۆیدا پێیبڵێ «تۆ نەتویست کێشەکەمان پێکەوە روون بکەینەوە، چ بکەم، لەودا خۆت تووشی زیان دەبیت. ئێستا تۆ داخوازیت هەیە و من ئیتر

زۆرم بەلاوە گرینگ نییە.» لەو دەمەتەقیٚ خەیاڵییەدا لەگەڵ ئەو، وەك کەسێك دەچوو کە بیەهۆ هەوڵی دابێت ئاورێك بکوژێنێتەوە و چونکە هەوڵەکەی بێئاکام بووە رقی هەستابیٚ و روو لە ئاورەکە بکات و بڵیٚ: ئێستا کە حەز ناکەی بکوژێیتەوە، کەوایە بسووتیٚ.

ئەو کە پیاوێکی بیر تیژ بوو و بۆ وردەکارییەکانی ئیشی دایرەکەی ئاوا بەتوانا بوو، سەری لەو شێواوییە شاراوەیەی نێوان خۆی و ژنەکەی دەرنەدەچوو هەر بەو هۆیەش نەیدەزانی چ بکا. چونکە تێگەیشتن لەو راستەقینەیەی ئێستا لە رادەبەدەر بەلایەوە ترسناك بوو.

ئەو سندووقەی کە هەستەکانی سەبارەت بە بنەماڵەکەی، یانی ئەم ژن و منداڵەی، لە نێویدا حەشاردابوو، لە سووچێکی رۆحی خۆیدا شاردبوویەوە و دەرگاکەی داخستبوو و لاکۆمۆری کردبوو. ئەو کە لە رابردوودا باوکێکی وردبین بوو و زۆری حاڵوباڵی کوڕەکەی بەلاوە گرینگ بوو، لە کۆتایی زستان بەملاوە درهەق بە ئەو زۆر ساردوسڕ بووبوو و ئەو هەڵسوکەوتە ناحەز و ساردەی لەگەڵ ژنەکەی هەیبوو لەگەڵ ئەویش هەروابوو. کاتێك کە چاوی پێیدەکەوت دەیگوت: ها، چۆنی لاوە!

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بیری دەکردەوە و دیدی تا ئێستا قەتی بەقەد ئەمساڵ کار و ئیشی دایرە نەبووە: بەلاَم نەیدەزانی هەموو ئەو ئیشانە بۆخۆی دایاندەتاشیٚ تاکوو خۆی لە کردنەوەی دەرگای ئەو سندووقە بدزێتەوە کە هەست و ئەرکی ژن و بنەماڵە و بیر و خەیاڵەکانی تایبەت بە ئەوانی تێدا شاردۆتەوە. ئەو هەستانەش هەرچەندە زیاتر لەو سندووقەدا بمابایەن ترسناکتر دەبوون. ئەگەر کەسێك هەقی بووبوایە لە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بپرسیٚ کە سەبارەت بە ئاکاری ژنەکەی چۆن بیردەکاتەوە، ئەلکسی ئەلکساندرڤیچی مەند و لەسەرەخۆ وەلاَمی نەدەدایەوە و رقیشی لەو کەسە هەڵدەستا کە ئەو پرسیارەی لێکردبوو. هەر بۆیە کاتێك سەبارەت بە حاڵوباڵی ژنەکەی پرسیاریان لێدەکرد، شوێنەواری بایبوون و سەختگیری لە سیمایدا وەدیار دەکەوت. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ نەیدەویست سەبارەت بە ئاکار و حاڵی رۆحیی ژنەکەی بە هیچ چەشنێك بیر بکاتەوە و هەر بەڕاستیش بیری لێنەدەکردەوە.

ڤیلای هەمیشەیی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لە پێترهۆڤ بوو و کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤناش هاوینانە ڤیلایەکی لە نزیك ئەوان بەکریٚ دەگرت و هەمیشە لەگەڵیاندا لە پێوەندیدا بوو. ئەمساڵ کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا بۆ جارێکیش نەهاتبوو بۆ پێترهۆڤ و تەنانەت جارێکی سەردانی ئانا نەکردبوو و بە زمانی کینایە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچی تێگەیاندبوو کە

نزیکایەتیی بێتسی و ڤرۆنسکی لەگەڵ ئانا شیاو نییە. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بە توندی بەرپەرچی دابۆوە و ئیجازەی پێنەدابوو گومانی خراپ بداتە پاڵ ژنەکەی و لەو کاتەوە ئیتر خۆی لە کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا لادەدا و نێوانی لەگەڵیدا ساردبۆوە. ئەو نەیدەویست بزانێ و نەیدەدی لەو کاتەوە زۆربەی خەڵك لە کۆڕ و کۆبوونەوەکاندا بە چاوی سووك تەماشای ژنەکەی دەکەن. نەیدەویست تێبگات و تێنەدەگەیشت بۆ ژنەکەی ئەوەندە پێداگری دەکا کە بچێت بۆ تسارسکۆی[110]. ئەو جێیەی کە بێتسی ماڵی لەوێ بوو و مەودایەکی وای لەگەڵ هەنگەکەی ڤرۆنسکی نەبوو. ئەو ئیزنی بەخۆی نەدەدا کە سەبارەت بەو شتە بیر بکاتەوە و بیریشی نەدەکردەوە. سەرەڕای ئەوەش ئەگەرچی نەیدەوێرا لە دڵی خۆشیدا دانی پێدا بنێ و نەك هیچ چەشنە بەڵگەیەکی نەبوو، بەڵکوو گومانیشی نەدەکرد کە بەڵگەیەکی ئەوتۆ هەبێ. لە ناخی خۆیدا دەیزانی کە مێردێکی هەڵخەڵەتاوە و بۆ ئەوەش زۆر پەرۆش و خەمناك بوو.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لە ماوەی هەشت ساڵ ژیانی شیرینی هاوبەشدا، کاتێك چاوی لە ئاکاری ژنانی حەشەری و پیاوانی هەڵخەڵەتاو دەکرد، بەخۆی دەگوت «چۆن دەکرێ مرۆڤ تا ئەو رادەیە خۆی سووك و چرووك بکات؟ چۆن دەتوانن درێژە بەو باروودۆخە نالەبارە بدەن؟» بەڵام ئێستا کە خۆی گیرۆدەی ئەو ئاپۆر و بەڵایە بووبوو، نەك لە بیری ئەوەدا نەبوو کۆتایی بەو بارووذۆخە ناحەزە بێنێ، بەڵکوو تەنانەت نەیدەویست لێشی ئاگاداربێ، هەر بەو هۆیەش حەزی نەدەکرد لێی ئاگاداربێ چونکە کێشەکە زۆر تاڵ و ناسروشتی بوو. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لە کاتی گەڕانەوەی لە هەندەرانەوە تا ئێستا دوو جار چووبوو بۆ زۆزان، جارێك بۆ نانی نیوەڕۆ و جارێکی تریش ئێوارە کە میوانی لەگەڵ بوو، بەڵام هیچ جارێکیان بۆ شەوێ لەوێ نەمابۆوە، ساڵانی پێشوو وانەبوو ئەگەر بۆ سەردان بچووبایە شەوێ لەوێ دەمایەوە.

ڕۆژانی کێبەرکێکە بۆ ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ رۆژانێکی پڕ لە کێشە بوون و کارەکانی دەڕژان بەسەریەکدا بەڵام هەر سەرەتای بەیانی کاتی بەرنامەکانی رۆژانی رێکوپێك دەکرد و بڕیاری دەدا زووتر نانی نیوەڕۆ بخوات و بچێت بۆ لای ژنەکەی، لەوێشەوە بچێت بۆ گۆڕەپانی ئەسپسواری، چونکە تەواوی کاربەدەستان لەوێ بوون و ئەویش دەبوو لەوێ بێ. بەو هۆیەش سەردانی ژنەکەی دەکرد کە پێیوابوو حەوتووی جارێك بۆ پاراستنی شێوە و رواڵەت چاوی پێیبکەوێ. جگە لەوەش دەبوو بەپێی بەڵێنێك کە پێیدابوو پازدەهەمی هەموو مانگێك بۆ

110- Tsarskoe

خەرجی رۆژانە پارەی بداتێ. چونکە زۆر بە سەر زەین و بیری خۆیدا زاڵ بوو، دوای ئەو کێشە دەروونی و خەیاڵانە ئیزنی بە خۆی نەدا لەوە زیاتر سەبارەت بە ژنەکەی پێبهەڵبڕێ.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ ئەو رۆژە بەیانی زۆر سەرقاڵ بوو. کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا رۆژی پێشوو نامیلکەیەکی بۆ ناردبوو. ئەو نامیلکەیەش بەرهەمی کەسایەتییەکی بەناوبانگ بوو کە سەفەری کردبوو بۆ چین و ئێستا لە پترزبۆرگ بوو. لە نامەیەکدا کە لەگەڵ ئەو نامیلکەیە بۆی ناردبوو تکای لێکردبوو کە ئەو مسافیرە بانگهێشتن بکات بۆ لای خۆی چونکە لە زۆر لایەنەوە مرۆڤێکی سەرنجڕاکێشە و بۆ کاروبارەکانی ئەویش بەکەڵکە. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ دەرفەتی نەبووبوو شەوی پێشوو نامیلکەکە هەتا کۆتایی بخوێنێتەوە و ئەو رۆژە بەیانی تەواوی کردبوو. پاشان بە کاروباری ئیداری راگەیشتبوو و گوێی بۆ راپۆرتە جۆراوجۆرەکان راداشتبوو، هێندێ کەسی بانگکردبوو بۆ ژوورەکەی و کەسانێکی دامەزراندبوو و کەسانێکی تریشی لەسەر کار لابردبوو. پاشان دەستیکردبوو بە دابەشکردنی پاداش و هەقدەست و مووچەی فەرمانبەرەکان. سەبارەت بەو نامانەش کە دەبوو بنووسرێن و وەڵام بدرێنەوە دەستووری پێویستی دابوو. کە خۆی گوتەنی یەکێك لە کارە قۆڕەکانی رۆژانە بوو، زۆریش کاتی دەگرتن. دوای ئەویش کاروباری خۆی: پزیشکەکەی هاتبوو بۆ سەردانی و گزیرەکەی بۆ کاروباری ماڵی هاتبوو بۆ لای. کاری راوێژ و تەکبیر لەگەڵ گزیرەکەی زۆری نەخایاندبوو. ئەو تەنیا ئەو برە پارەیەی بۆ ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ هێنابوو کە پێویستی بوو، هەروەها سەبارەت بە باری ماڵیی ئاگاداری کردەوە کە زۆر دڵخۆشکەرانە نەبوو، چونکە ئەمساڵ بە هۆی سەفەری پەیتاپەیتا لە رادەبەدەری پارە خەرج کردبوو و خەرجی لە داهاتی زیاتر بووبوو. بەڵام پزیشکەکەی کە لە پترزبۆرگ ناوبانگی هەبوو و نێوانەکەشیان زۆر خۆمانە بوو، زۆری لەلا مایەوە و لە کاری کرد. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ چاوەڕوانی هاتنی ئەو نەبوو و کاتێك لێی وەژوور کەوت سەری سووڕما، سەرسووڕمانەکەشی کاتێك زیاتر بوو کە دوکتۆر گوێیانەکەی نا بە سینگییەوە و پشکنینی جەرگی بۆ کرد و قامکی تێکوتا و سەبارەت بە لەشساغی پرسیاری لێکرد. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ نەیدەزانی کە کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنای هاوڕێی تێگەیشتووە کە ئەمساڵ باری تەندروستیی باش نییە و داوای لە دوکتۆر کردووە کە بچێت و پشکنینی بۆ بکا. کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا بە دوکتۆری گوتبوو: ئەو کارە تەنیا لەبەر دڵی من بکە.

دوکتۆر گوتبووی: حەزرەتی کۆنتس، من ئەو کارە لەبەر رووسیا دەکەم.

کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا گوتبووی: مرۆڤێکی بێوێنەیە.

دوکتۆر لەباری لەشساغیی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ رازی نەبوو. وا تێگەیشتبوو کە جەرگی لەڕادەبەدەر ماسیوە و خواردنی رۆژانەی باش نییە و سەفەرەکەشی بۆ ناوەندەکانی گڕاو لە هەندەران بێکەڵك بووە. داوای لێکرد هەتا دەتوانێ زیاتر هەڵسووڕێ و کار و جموجۆڵەکانی زیاتر بکات، هەروەها گوشاری رۆحی کەم کاتەوە و لە هەمووشی گرینگتر خەم و خەفەت لە دڵیدا رانەگرێ. ئەوەش بۆ ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ وەك ئەوە وابوو کە پێی بڵێن هەناسە هەڵمەکێشە. دوای پشکنینەکە رۆیشت و ئەلکسی ئەلکساندرڤیچی لەگەڵ خەم و پەژارەی دەردێکی بێ دەرمان بە تەنیا بەجێ هێشت.

دوکتۆر کاتێك لە نووسینگەی کارنین هاتەدەرێ لەبەر دەرگاکەدا تووشی سلیۆدین بوو کە هاوڕێی نزیکی ئەو و بەرپرسی نووسینگەکەی کارنین بوو. ئەوان لەکاتی خوێندنی زانستگاوە پێکەوە هاوڕێ بوون، ئەگەرچی زۆر کەم یەکتریان دەدی بەڵام زۆریان رێز بۆ یەکتر دادەنا و زۆر هاودڵ بوون، هەر بەو هۆیەش دوکتۆر کەسی لە ئەو شیاوتر پێشك نەدەهات کە سەبارەت بە نەخۆشەکەی لەگەڵی بدوێ و بێپەردە هەموو شتێکی لەلا بدرکێنێ.

سلیۆدین گوتی: زۆرم پێخۆشە پشکنینت بۆ کردووە. چونکە حاڵی باش نییە و پێموایە... دەی، کێشەکەی چییە؟

دوکتۆر لەژوور سەری سلیۆدینەوە ئاماژەی بە عارەبانەچییەکەی کرد کە عارەبانەکە بێنێتە پێشێ و لەگەڵ ئەوەی قامکی دەستەوانە چەرمییە ناسکەکەی بە دەستە سپییەکانییەوە گرتبوو و دەیکێشا گوتی: کێشەکە ئەوەیە ئەگەر تاڵە بەنێك نەکێشی مەحاڵە بتوانی بیپچڕێنی. بەڵام ئەگەر هەتا ئەو جێیەی دەکرێ بیکێشی، ئاماژەی قامکێك بەسە بۆ ئەوەی بپچڕێ. ئەویش بەهۆی توانایی و ئەرکناسی و خزمەت ئەوەندەی گوشار بۆ خۆی هێناوە خەریکە دەپسێـ بەشێوەیەکی مانادار برۆی وێك هێنا و درێژەی بە قسەکانیدا: هەروەها گوشارە دەرەکی و رۆحییەکانیشی کەم نینـ لەگەڵ ئەوەشدا کە دەچووە خوارێ بۆ لای عارەبانەکە پرسیی: ئێوە دێن بۆ کێبەرکێی ئەسپسواری؟ـ لە وەڵامی شتێکیشدا کە سلیۆدین گوتی و بە جوانی تێنەگەیشت وەڵامی دایەوە: بەڵێ، هەڵبەت کاتێکی زۆری دەوێ.

لە دوای دوکتۆر کە بەو پشکنینەی خۆی زۆری کاتەکەی گرتبوو جیهانگەڕی بەناوبانگ، کە سەفەری کردبوو بۆ چین، هات و خۆیکرد بە نووسینگەکەیدا. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ تازە نامیلکەکەی خوێندبۆوە و بە کەڵکوەرگرتن لەو زانیارییانەی کە خۆی پێشتر لەو بوارەدا هەیبوو بە وتە و هەڵسوکەوتی رۆشنبیرانە و ماریفەتی خۆی میوانەکەی لەو بوارەدا تووشی

سەرسوڕمان کرد. هاوکات لەگەڵ مسافیرە ناودارەکە هاتنی گەورە پیاوێکی ئەشرافزادەی شارستانیشیان راگەیاند، کە هاتبوو بۆ پترزبۆرگ و ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ ناچاربوو لەگەڵ ئەویش راوێژ و دانووستان بکات. دوای رۆیشتنی ئەویش کارنین هاتە سەر جێبەجێ کردنی کاروباری رۆژانەی لەگەڵ بەرپرسی نووسینگەکە و پاشان ناچاربوو بۆ ئەنجامدانی ئیشێکی گرینگ و بنەوەشی بچێت بۆ دیدەنیی کەسایەتییەکی خاوەن دەسەڵات. بەو شێوەیە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ نەیتوانی بەر لە کاتژمێر پێنجی دوانیوەڕۆ بگەڕێتەوە بۆ ماڵێ. نانی نیوەڕۆی لەگەڵ سلیۆدین مەیل کرد و پاشان داوای لێکرد پێکەوە بچن بۆ زۆزان و لەوێشەوە بچن بۆ گۆڕەپانی کێبەرکێی ئەسپسواری.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بێ ئەوەی خۆی ئاگاداربێ لە دەروویێك دەگەڕا کە چاوپێکەوتنی لەگەڵ ژنەکەی لە حوزووری کەسی سێهەمدا بێ، بۆیە سلیۆدینی لەگەڵ خۆی دەبرد.

## بیست و حەوت

ئانا لە نهۆمی دووهەمی ڤیلاکەی لەبەر ئاوێنەدا راوەستابوو و بە یارمەتیی ئانۆشکا دوایین قردێلەی بە دەرزیلە لە کراسەکەی دەدا کە گوێی لە تەقوکوتی تایەی عارەبانەکە بوو کە گەیشتە سەر رێچکەی خیزرێژکراوی بەر ڤیلاکە.

بەخۆی گوت «بێتسی ئاوا زوو نایەت.» لە پەنجێرەکەوە روانیی، چاوی بە عارەبانەکە کەوت کە کڵاوی رەش و گوێچکە بۆ ئەو ئاشناکانی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لێوەی هاتبووە دەرێ. لە دڵی خۆیدا گوتی: «تێکیدا! یانی شەوێ دەیهەوێ لێرە بمێنێتەوە؟» ئاکامی کارەکەشی هێندە بەلاوە رەش و ترسناك بوو کە بۆ ساتێك و بێ ئەوەی راوەستێ بە روخساری گەشاوە و بە زەردەخەنەی نەخشاوەوە رۆیشت بەرەوپیری. رۆحی درۆ و دەهۆی لە ناخی خۆیدا هەست پێدەکرد کە بەلایەوە ئاسایی بووبوو و خۆی رادەستی ئەو هەستە کرد و بێ ئەوەی بیر لە وتەکانی بکاتەوە دەستیکرد بە قسەکردن.

تەوقەی لەگەڵ مێردەکەی کرد و بە بزەیەکی خۆمانەوە سڵاوی لە سلیۆدین کرد کە وەك کوڕی ماڵێ وابوو و گوتی: چەندەم پێخۆشبوو هاتن! ـ پاشان رووی لە مێردەکەی کرد و یەکەم وشەیەك کە رۆحی دولاب و دەهۆ لە زارینا ئەمە بوو: هیوادارم شەوێ لێرە بمێنییەوە! بەخێربێی، ئێستا پێکەوە دەڕۆین. بەڵام حەیفێ بەڵێنیم بە بێتسی داوە. ئەو دێ بە دوامدا.

ئانا گوتی: خۆ جارێ زووە. چاییەك مەیل ناکەن؟ ئەوەی گوت و قامکی نا بە زەنگەکەدا. کە پێشخزمەتەکەی هات گوتی: چایی بێنە و بە سریۆژا بڵێ ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ هاتووە ـ پاشان رووی دەمی لە مێردەکەی و چاوی لە میوانەکەیان ـ گوتی: تەندروستیت چۆنە؟ میخاییل ڤاسیلی یۆڤیچ، ئێوە هێشتا نەهاتوون بۆ ئێرە. فەرموون بزانن بەرهەیوانەکە چەندە جوان و بەرژەوەند خۆشە.

ئانا زۆر بە سانایی و بە لەبزێکی سروشتی دەدوا بەڵام زۆر زۆر و لەرادەبەدەر بە توندی. ئەو خۆی هەستی بەوە دەکرد بەتایبەت کاتێك میخاییل ڤاسیلی یۆڤیچ بە چاوێکی وردبینانە تێیڕوانی، تێگەیشت کە میوانەکەیان زۆر بە وردبینییەکی تایبەتەوە سەرنجی دەدا.

میخاییل ڤاسیلی یۆڤیچ بێڕاوەستان رۆیشت بۆ بەر هیوانی بانجێڵەکە و ئانا چوو لە پاڵ مێردەکەیدا دانیشت.

گوتی: لەوە دەچێ تەندروستیت باش نەبێ.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ گوتی: بەڵێ، ئەمرۆ دوکتۆر هات بۆلام و سەعاتێکی تەواو کاتی گرتم. پێموایە یەکێك لە هاوڕێیانم ناردبووی. وادیارە لەشساغیی من زۆر بایەخدارە...

ـ جا دیارە، بەڵام گوتی چی؟

ئانا سەبارەت بە تەندروستی و کارەکانی پرسیاری لێکرد و هەوڵی دەدا پێملی بکات کە ماوەیەك پشوو بدات و بێت لەلای ئەو بمێنێتەوە.

ئەو قسەکانی زۆر بە توندی و بە لەبزێکی پڕ نەشەوە دەربڕی و لەگەڵ ئاخافتندا چاوانی دەدرەوشانەوە. بەڵام ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ ئێستا ئیتر هیچ گرینگییەکی بەو لەبز و راوێژەی نەدەدا. تەنیا گوێی بۆ قسەکانی راگرتبوو و لە مانا رواڵەتییەکانی حاڵی دەبوو و زۆر بە ساردوسڕی، بە لەبزێکی گاڵتەئامێزەوە، وەڵامی دەدایەوە. سەرلەبەری ئەم دەمەتەقێیە هیچ شتێکی تایبەتی تێدا نەبوو، بەڵام ئانا دواتر قەتی نەتوانی بەبێ هەستکردن بە ئازارێکی دڵتەزێن و پڕ شەرمەزاری بیر لەو ماوە کورتە بکاتەوە.

سریۆژا بەدوای دایەنەکەیدا هاتەژوورێ. ئەگەر ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ ئیزنی بە خۆی بدایە کە بە سەرنجێکی وردەوە بڕوانێ، تێدەگەیشت کە روانینەکانی بۆ ئەو و دایکی چەندە پەرۆش و شێواوە و چی لە دڵێدا رادەبڕێ. بەڵام ئەو نەیدەویست هیچ شتێك ببینێت و هیچیشی نەدەدیت.

ـ دەی، چۆنی لاوە! چاکیش گەورە بووە! ئیتر خەریکە دەبێ بە پیاوێکی حیسابی. سڵاو لاوە.

لەگەڵ سریۆژای ترس لێنیشتوو تەوقەی کرد.

سریۆژا کە لە رابردووشدا زۆری شەرم لە باوکی دەکرد، ئێستا کە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ دەستی کردبوو بە «لاوە، لاوە» و مەسەلەی ئالۆزی دۆست یان دوژمن بوونی ڤرۆنسکی لە زەینییدا زەقبووبووە، سەبارەت بە باوکی هەستی بە غەریبی دەکرد و بە چاوی بێگانەیەك تێیدەڕوانی. چاوی لە دایکی کرد و وەك ئەوەی بەو روانینە داوای پشتیوانیی لێبکات. چونکە تەنیا لە پەنا دایکی هەستی بە هێمنایەتی و سووکنایی دەکرد. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ کاتێك قسەی لەگەڵ دایەنی کوڕەکەی دەکرد شانی سریۆژای گرتبوو و کوڕەکەشی خۆی هێندە داماو دەهاتە بەرچاو و ئازاری دەکێشا کە خەریکبوو دەستبکات بە گریان و ئانا لەوە تێگەیشت.

ئانا بە دیتنی ئەو بارودۆخەی کوڕەکەی سوورهەڵگەڕابوو، کە تێگەیشت ئاوا داماوە، بەپەلە هەستا و دەستی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچی لەسەر شانی لابرد و ماچی کرد. پاشان دەستی گرت و بردی بۆ بەر بانجێڵەگە و خۆی گەڕایەوە بۆ لای مێردەکەی.

چاوێکی لە کاتژمێرەکەی کرد و گوتی: ئیتر کاتی رۆیشتنە. نازانم بێتسی بۆ نەهات؟

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ هەستا، قامکەکانی لێکهەڵپێکا و وە تەقەتەقی خستن و گوتی: من هاتبووم کە پارەت بدەمێ، چونکە بولبول تەنیا بە خوێندن زیندوو نییە. پێموایە پارەت پێویستە؟

ئانا بێ ئەوەی چاو لە چاوی بکات روومەت و لاجانگی سوورهەڵگەڕا و گوتی: نا، پێویستم نییە.... بەڵام بۆچی، پێویستم بە پارە هەیە. بەڵام خۆ دوای کێبەرکێکە دێنەوە بۆ ئێرە.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ گوتی: حەتمەن! کە لە پەنجێرەکەوە روانیی و فایتوونی دەستکاری ئینگلیزی دی کە پەردە و کەژاوەی هەبوو و شوێنی دانیشتنی عارەبانەچییەکەی زۆر چکۆڵە و بەرزبوو و بەرەولای ڤیلاکەی ئەوان دەهات گوتی: زۆر چاکە، ئەوەش جوانی پێترهۆڤ، پرێنسس تۆرسکایا، چ فایتوونێکی جوانە! بەڕاستی جوانە، چاکە، کەوایە ئێمەش دەڕۆین.

پرێنسس تۆرسکایا لە فایتوونەکە دانەبەزی، تەنیا خزمەتکارەکەی کە کڵاو و باڵتە و زەنگاڵی هەمووی رەش بوون لە نزیك پلیکانەکان لە فایتوونەکە دابەزی.

ئانا گوتی: چاکە، منیش دەڕۆم. خوداحافیز! ـ کوڕەکەی ماچکرد و رۆیشت بۆ لای ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ و دەستی بۆ لای درێژ کرد و گوتی: بەڕاستی پێم خۆشبوو هاتی!

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ دەستی ئانای ماچکرد.

ئانا گوتی: چاکە، کەوایە خوداحافیز! لانیکەم بۆ مەیلکردنی چایی سەرێکمان لێدەدەی. کە زۆرچاکە! ـ ئەوەی گوت و بە شادی و نەشەوە رۆیشتە دەرێ. بەڵام کە لە مێردەکەی دوورکەوتەوە و شوێنی لێوی ئەوی لەسەر پشتی دەستی هەست پێکرد، لەبەر رق و بێزاری مۆچڕکی پێداهات.

## بیست و هەشت

کاتێك کە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ گەیشتە گۆڕەپانی کێبەرکێی ئەسپسواری ئانا لە شوێنێك کە تایبەتی کۆبوونەوەی تاقمی کاربەدەستان و نەجیمزادان بوو لە پەنای بێتسیدا دانیشتبوو. ئەو لە دوورەوە چاوی بە مێردەکەی کەوت. دوو کەس، یانی مێردەکەی و گراوەکەی، دوو جەمسەری ژیانی بوون و ئەو نزیکبوونەوەی ئەوانی بەبێ یارمەتیی هەستی رواڵەتی بۆ لێکنەدەکرایەوە. لە دوورەوە نزیکبوونەوەی هاوسەرەکەی هەست پێدەکرد و بێ ئیختیار چاوی لەگەڵ هاتووچۆ و هەڵسوکەوتی دەگێڕا. لەگەڵ نزیکبوونەوەی بۆ شوێنەکە ئاکاریشی خستبووە ژێر چاودێری. دەیدی کەچەند دلۆڤانانە وەڵامی کڕنۆشی پڕمەرایی و جامە لووسکێی هێندێ لە تەماشاچییان دەداتەوە و دۆستانە و لووتبەرزانە لەگەڵ هاوقەتارانی خۆی چاکو خۆشی دەکات، یان زیرەکانە چاوەڕوانی سەرنجی دەسەڵاتداران دەمایەوە تاکوو کڵاوە چوار دەورە و گەورەکەی خۆی کە نووکی گوێچکەی رێکدەگوشی لەسەری داگرێ. ئەو هەموو هەڵسوکەوت و لایەنەکانی ئاکاری مێردەکەی دەناسی و هەموو کارەکانی لەبەر چاوی ئەو ناحەز و قیزەون بوون. لە دڵی خۆیدا دەیگوت «هەر بە دوای ناو و ناوبانگ و سەرکەوتنەوەیە و رۆحی جگە لەوە هیچ شتێکی تری تێدا نییە. بیری بەرز و لایەنگری رووناکبیری و سۆزی ئاینیی، هەموویان تەنیا چەك و کەرەسەیەکن بۆ گەیشتن بە سەرکەوتن.

ئانا بە روانینی مێردەکەیدا بۆ شوێنی دانیشتنی ژنان (چونکە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ چاوی بە ریزەکاندا دەگێڕا بەڵام نەیدەتوانی ژنەکەی لەنێو دەریای هاورێشم و دانتێل و قردێلە و کەزیە و چەتری رەنگاوڕەنگدا بناسێتەوە) زانیی کە چاو لە ئەو دەگێڕی. بەڵام بەقەستی خۆی تێنەگەیاند و هەمیەتی پێنەدا.

پرێنسس بێتسی دەنگی هەڵێنا: ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ، وا دیارە ناتوانی خاتوونەکەت بدۆزییەوە. فەرموو، ئەوەتا لێرەیە!

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ ئەو بزە سارد و هەمیشەییەی هێنایە سەر لێوی و گوتی: لێرە درەوشانەوەی جوانییەکان هێندە زۆرە کە مرۆڤ گێژوویژ دەکاتـ ئەوەی گوت و خۆی کرد بە نێو ریزی ژنەکاندا. زەردەیەکی بۆ ژنەکەی گرت، زەردەگرتنی مێردێك کە تازە لە ژنەکەی جیا بووبێتەوە و چاوی پێیکەوتبێتەوە. لەگەڵ پرێنسس و ئاشنا و رۆشناکانی تر سڵاو و چاکوخۆشیی کرد. لەگەڵ هەرکەسێك بە پێی رێز و کەسایەتی هەڵسوکەوتێکی تایبەتی هەبوو. یانی لەگەڵ ژنەکان برێکی گاڵتە کرد و سڵاو و چاکوخۆشیی لەگەڵ پیاوان کرد.

لە خوارەوە و پەنای شوێنەکە ژینراڵێکی ئاجودانی راوەستابوو کە بە هۆی زانیاری و تێگەیشتوویی و بەئەزموونی زۆری ناوبانگ دەرکردبوو و ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ رێزێکی زۆری بۆ دادەنا و ئێستاش لەگەڵیدا کەوتە قسەکردن.

لە نێوان دوو کێبەرکێدا هەمیشە دەرفەتێك هەبوو بۆ دەمەتەقێ. ژینراڵ دژایەتی لەگەڵ کێبەرکێی ئەسپسواری هەبوو، بەڵام بەپێچەوانە کارنین زۆری حەز پێدەکرد و هەمیشە لایەنگری ئەو ملمانێیە بوو. ئانا دەنگی ناسك و یەکهاویی مێردەکەی دەبیست و تەنانەت وشەیەکیش نەبوو کە لە زاری کارنین بێتەدەرێ و ئەو بە گوێچکە نەیقۆزێتەوە، زۆر چاکی دەزانی وتەکانی دوور لە راستی و سەداقەتن و بە بیستنیان هەموو گیانی دادەگیرا و جاڕز دەبوو.

کاتێك کێبەرکێی چوار وێریستی لەمپەردار دەستی پێکرد، ئانا بۆ پێشەوە نووشتابۆوە و بێ ئەوەی چاو لە ڤرۆنسکی بتروکێنێ، چاوی تێبڕی و دیتی کە چوو بۆ لای ئەسپەکەی خۆی و سوار بوو، بەڵام لەو ماوەیەدا بەردەوام دەنگی ناخۆش و جاڕزکەر و بەردەوامی مێردەکەی خەریکبوو مێشکی دەسمی. زۆری خەمی ڤرۆنسکی بوو و هەستی بە دڵەدوایی دەکرد، بەڵام زۆر لەوە زیاتر دەنگی جیکن و ناخۆشی مێردەکەی کە زۆر باش لە زیر و بەمەکەی دەگەیشت و بڕانەوەی نەبوو تووشی ئازاری کردبوو.

بەخۆی دەگوت «من ژنێکی خراپم، ژنێکی تەورخراپ و نانەجیم. بەڵام بێزارم لە درۆ و خۆفریودان و دووڕوویيم بۆ تامڵ ناکرێ. بەڵام ئەو پیاوە بە درۆوە زیندووە. ئەو بە کەینوبەینەکەمان دەزانێ، هەموو شتێکیش بە چاوی خۆی دەبینێ. چ هەستێك لە دڵیدایە کە ئاوا بە ئاسوودەیی خەریکی مشتومڕە؟ ئەگەر من و ڤرۆنسکیی بکوشتبایە رێزم بۆ دادەنا. بەڵام نا، ئەو حەزی لە درۆ و خۆفریودانە. تەنیا دەیهەوێ بە رواڵەت پاك بێ و بە هەر نرخێك

بێ ئابڕووی خۆی بپارێزێ.» ئەو لە دڵی خۆیدا ئەو قسانەی دەکرد و بیریشی نەدەکردەوە کە بەڕاستی چ چاوەڕوانییەکی لە مێردەکەی هەیە و حەزدەکا مێردەکەی چۆن بێ؟ هەروەها نەشیدەزانی ئەم چەنەوەری و زۆرویژییە نائاساییەی ئەمڕۆی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ، کە هەتا ئەو رادەیە جاڕزی کردووە هیچ شتێك نییە جگە لە رەنگدانەوەی دەرەکی و کێشە و پەرۆشییەکانی ناخی. هەروەك چۆن منداڵێك دەکەوێ بە زەویدا، بریندار دەبێ و بەملاوبەولادا هەڵدێ و هەڵبەزدابەز دەکا بۆ ئەوەی ژانەکەی لەشی بشکێ، ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ ئاوا پێویستی بە هەوڵی فیکری بوو تاکوو ئەو فیکرانەی کە بە نزیکی لە ڤرۆنسکی و پاتە بوونەوەی ناوی ئەو و حوزووری ژنەکەی لە زەینیدا گوورابوو یان سەرنجی بۆ لای خۆی رادەکێشا لە ناخی خۆیدا بیخنکێنێ. هەروەك هەڵبەزدابەزی منداڵی بریندار و ئێش پێگەیشتوو سروشتییە بۆ ئەویش سروشتی بوو کە بە زمانێکی پاراو و زانستییانە بدوێ.

دەیگوت: ئەو مەترسییەی کە لە کێبەرکێی ئەسپسواریی نیزامییان، یانی سوارەنیزمدا هەیە مەرجی سەرەکیی ململانێکەیە. ئەگەر بەریتانیا شانازی بە خەباتی پڕشنگداری سوارەنیزامییەکانی خۆی لەمێژوودا دەکا تەنیا لەبەرئەوەیە کە توانیوێتی بە درێژایی مێژوو ئەو هێزەی یەکیەتیی ئەسپ و مرۆڤ پێکەوە گرێ دەدا، پەروەدە بکات. وەرزش بە بڕوای من گرینگایەتییەکی زۆری هەیە، بەڵام ئێمە هەمیشە سەرنجی دیمەنە رواڵەتییەکانی ئەو کارە دەدەین.

پرێنسس تۆرسکایا گوتی: بۆ تەنیا رواڵەتی؟ دەڵێن یەکێك لە ئەفسەرەکان کاتی سواری دوو پەراسووی شکاوە.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بزە تایبەتەکەی خۆی هێنایەوە سەرلێو. بزەیەك کە تەنیا ددانەکانی وەدیار دەخست و نیشاندەری هیچ شتێکی تر نەبوو.

ـ تێدەگەم پرێنسس، پەراسوو شکان رواڵەتی کار نییە، کارەساتێکی دەروونییە بەڵام خۆ ئێمە قسەمان لەسەر ئەوە نییە ـ ئەوەی گوت و دیسان رووی لە ژینراڵ کردەوە کە قسەکەی لەگەڵ ئەو جیددی بوو، درێژەی بە قسەکانیدا: لەبیرت نەچێ لەم کێبەرکێیەدا تەنیا نزامییان بەشدارن، یانی کەسانێك کە ئەم پیشەیان هەڵبژاردووە و حەتمەن دەشیسەلمێنێ کە هەموو پیشەیەك لایەنی باش و خراپی تایبەت بەخۆی هەیە. پێشوازی لەو مەترسییەش بەشێك لە ئەرکی نیزامیی ئەوانە. راستە وەرزشێکی پڕ توندوتیژی و مەترسیداری وەك مشتە کۆڵە یان گابازیی سپانیاییەکان هەڵبەت رەنگ و بۆنی دواکەوتوویی و دڕندایەتیی پێوە دیارە بەڵام لەواندا پسپۆڕی شەرتی سەرەکییە کە نیشانەی گۆڕانە.

پرێنسس بێتسی گوتی: دیاره که زۆر پڕ هەیەجانە بەڵام ئەستەمە بتوانی وازی لێبێنی. ئەگەر من خەڵکی رۆمی کەونارا بوایەم مەحاڵ بوو نمایشتێکی گلادیاتۆرەکانم لە دەست دەرچێ.

ئانا هیچی نەگوت و دووربینەکەی لە چاوی نەدەکردەوە و چاوی لە شوێنێك بڕیبوو.

لەو کاتەدا ژێنراڵێکی کەڵەگەت بەنێو تەماشاچییاندا تێپەڕێ. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ قسەکەی بڕی و بەپەلە و بە ویقارەوە هەستا و بە دڵ کڕنۆشێکی بۆ ژێنراڵ کرد و سڵاوی لێکرد.

ژێنراڵ بە گاڵتەوە پێیگوت: تۆ لەو کێبەرکێیەدا بەشداریت نەکردووە؟

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بە گاڵتەوە وەڵامی دایەوە: سواریی من لەوانە دژوارترە. ئەگەرچی ئەو وەڵامە مانایەکی تایبەتی نەبوو بەڵام ژێنراڵ واینواند کە لە خاڵێ ناسکی وتەکە گەیشتووە و وەك دەڵێن چێژی لە شەکر شکاندنەکەی وەرگرتووە.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ دانیشت و درێژەی بە قسەکانیدایەوە: مەسەلەکە لە دوو لایەنەوە جێی سەرنجە. یەکیان لایەنی بەشداربووانی کێبەرکێکە و دووهەمی لایەنی تەماشاچییان. هۆگری بەم چەشنە نمایشانەش شایەدێکی سادقە بۆ کەمایەسیی زەوقی تەماشاچییان. من ئەو بیروڕایەم قەبووڵە، بەڵام...

ـ پرێنسس، وەرە با گرێو بکەین. تۆ گرێو لەسەر کێ دەکەی؟ ـ دەنگی ستیپان ئارکادیچ بوو کە لە خوارەوە لەگەڵ بێتسی قسەی دەکرد.

بێتسی وەڵامی دایەوە: من و ئانا گرێو لەسەر پرێنس کووزۆلییۆڤ دەکەین.

ـ من دەڵێم ڤرۆنسکی یەکەمە. لەسەر جووتێك دەستەوانە گرێو دەکەین!

ـ باشە! کردبێتمان.

ـ بەڵام زۆر جوانە، وانییە؟

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ، کاتێك لە تەنیشتەوە قسەیان دەکرد، تۆزێ بێدەنگ بوو بەڵام هەر خێرا درێژەی پێدایەوە: من لەگەڵ ئەوەدا هەم، بەڵام یارییەکی بوێرانە...

بەڵام لەو کاتەدا سوارەکان بە پڕتاو هاتن و قسەوباسەکان راوەستان، ئەویش ئیتر لەسەری نەڕۆیشت. هەموو هەستانە سەرپێ و چاویان لە گۆلاوەکە بڕی. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ هۆگری کێبەرکێی ئەسپسواری نەبوو و هەر بەو هۆیەش چاوی لە سوارەکان نەدەکرد و گێلانە دەستیکرد بە گەڕان بەنێو تەماشاچییەکاندا و بە چاوە ماندووەکانی لێیانی دەڕوانی. چاوی لەسەر ئانا گیرسایەوە.

ئانا ڕەنگی هەڵبزڕکابوو و روخساری زۆر جیددی بوو. دیاربوو جگە لە کەسێك هیچ کەس و هیچشتێك نابینێ. کەوتبووە هەناسەبڕکێ و لەگەڵ گوشینی باڕۆشەکەی، دەستی دەلەرزی. کارنین ماوەیەك تێیڕاما و پاشان بە پەلە رووی وەرگێڕا و لە تەماشاچییەکانی تری روانی.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بەخۆی گوت «ئەوەتا، ئەم ژنەش هەروایە، وەکوو هەمووان. هیچی هۆشیان لەلا نەماوە. سەرتاپایان بۆتە دڵەخورپە و هەیەجان. لێرە هەیەجان شتێکی سروشتییە.» نەیدەویست چاو لە ئانا بکات، بەڵام بێ ئیختیار سەرنجی بۆ لای رادەکێشرا. دیسان چاوی لە سیمای دەکردەوە و هەوڵی دەدا ئەوەی بە ئاشکرا لە روخساریدا ڕەنگی دابۆوە نەیبینێ و بە پێچەوانەی خواستی خۆی بە ترسێکی زۆرەوە ئەوەی کە دەیویست تێینەگا و تێیدا نەیخوێنێتەوە.

گلانی کووزۆلییۆڤ لە پاڵ یەکەم لەمپەردا هەمووانی تووشی شڵەژان کرد بەڵام ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لە روخساری بزرکاوی ژنەکەیدا کە نیشانەی سەرکەوتنی پێوە دیاربوو، بە روونی دەیدی کە ئەو کەسەی مەبەستی ئەوە نەگلاوە. دوای تێپەڕینی ماخۆتین و ڤرۆنسکی لە لەمپەری گەورە و کاتێك کووزۆلییۆڤ کە بە دوای ئەواندا دەهات بەسەرەوە گلا و دەست و لاقی ورد بوو و وەك تەرم کەوتە سەر زەوی و هاواری داخ و ترس لە زاری هەموانەوە هەستا، ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ دیتی کە ئانا تەنانەت نەشیدیبوو و زۆر بە دژواری تێدەگەیشت کە خەڵکەکە باسی چی دەکەن. بەڵام کارنین بەردەوام بە وردبینی و سەرنجێکی زیاترەوە چاوی لێدەکرد. ئانا کە سەرتاپا ئاوێتەی ڤرۆنسکی بووبوو، سەرنجی مێردەکەی لەسەرخۆی هەست پێدەکرد، کە لە لاتەنیشتەوە زەق و سارد تێیدەڕوانی.

لەپڕ سەری وەرسووڕاند و چاوێکی ماناداری لە مێردەکەی کرد و تۆزێك گرژ بوو، بەڵام دیسان دەستیکردەوە بە تەماشاکردن.

وەك ئەوە وابوو بەخۆی بڵێ «هەهوو، لێیگەڕێ هەرچۆنێك بیردەکاتەوە با بیکاتەوە، چش»
ـ دوای ئەوە ئیتر بۆ جارێکیش ئاوڕی لێنەدایەوە.

کێبەرکێکە ئاکامێکی خۆشی نەبوو. لەو حەڤدە ئەفسەرەی بەشدارییان کرد زیاتر لە نیوەیان گلان و دەست و سەر و لاقشکاو مانەوە. لە کۆتایی کێبەرکێکەدا هەموو شێواو و پەرێشان بوون و ئەو شێواوییەش زیاتر بەو هۆیەوە بوو کە تێزار ناڕازی بوو.

## بیست و نۆ

هەموو بە دەنگی بەرز ناڕازیبوونی خۆیان دەردەبڕی. هەموو ئەو وتەیان دووپات دەکردەوە، کە کەسێك گوتبووی: «ئیتر هەر ئەوە ماوە شێر و پڵنگ بێننە نێو گۆڕەپانەکەوە!» ترسێك کە سەرتا پای هەمووانی داگرتبوو بەڕادەیەك بوو کە کاتێك ڤرۆنسکی گلا و ئانا بە دەنگی بەرز دای لە قولپەی گریان، هیچ کەس کارەکەی بە شتێکی نائاسایی نەهاتە بەرچاو. بەڵام بەدوای ئەو گریانەدا روخساری ئانا وا گۆڕابوو کە بەڕاستی نەشیاو بوو. هۆش و ئیختیاری لەلا نەمابوو و وەك مەلێکی لەداو کەوتوو باڵەپڕژەی دەکرد و حەجمانی لێهەڵگیرابوو. هێندێ جار دەیویست هەستێ و بڕوا، بێ ئەوەی بزانێ بۆ کوێ، هێندێ جاریش هانای بۆ بێتسی دەبرد و دەیگوت: با بڕۆین، با بڕۆین.

بەڵام بێتسی گوێی لە قسەکانی نەبوو و بۆ پێشەوە داهاتبۆوە و لەگەڵ ژینڕاڵێك کە هاتبوو بۆ لای قسەی دەکرد.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ هات بۆ لای ئانا و بە ریزێکی زۆرەوە باسکی بۆ هێنا پێشێ و گوتی: ئەگەر پێتخۆشە فەرموو با بڕۆین! ـ بەڵام ئانا گوێی بۆ قسەکانی ژینڕاڵ راداشتبوو و ئاگای لە مێردەکەی نەبوو.

ژینڕاڵ دەیگوت: دەڵێن لاقی خۆشی شکاوە. بەڕاستی مسیبەتە!

ئانا وەڵامێکی بە مێردەکەی نەدایەوە و دووربینەکەی بەرزکردبۆوە و چاوی لەو شوێنە دەکرد کە ڤرۆنسکی لێی گلابوو. بەڵام شوێنەکە هێندە دوور بوو و حەشیمەتەکەش لەوێ ئاپۆرەیان دابوو هیچی نەدەدی. ئانا دووربینەکەی لە چاوی کردەوە و دەیویست خۆی بچێت بۆ شوێنی رووداوەکە بەڵام لەوکاتەدا ئەفسەرێکی سوارە بە تەقڵەکوت هات و هەواڵێکی بە تێزار راگەیاند. ئانا خۆی بۆ پێشەوە کێشا و گوێی شل کرد.

بە دەنگی بەرز هەرای لە براکەی کرد: ستیڤا، ستیڤا!

بەڵام براکەی گوێی لە دەنگی نەبوو و ئەو دیسان هەوڵیدا لە شوێنگەکە بچێتە دەرێ.

ئەلكسی ئەلكساندرڤیچ بە نەرمی دەستی لەسەر قۆڵی دانا و گوتی: من جارێكی تر پێشنیارت پێدەكەم ئەگەر حەزدەكەی لەگەڵتا دێمەوە بۆ ماڵێ.

ئانا بە بێزارییەوە خۆی كێشا دواوە و بێ ئەوەی چاوی لێبكا گوتی: نا، نا لە كۆڵم بەوە. من لێرە دەبم.

ئێستا دەیدی كە ئەفسەرێك لە شوێنی گلانی ڤرۆنسكی و لە نێوەڕاستی گۆڕەپانەكەوە ڕاست دێ بۆ لای ئەوان. بێتسی بە دەسرەیەك ئاماژەی پێكرد.

ئەفسەرەكە هەواڵی هێنا كە سوارەكە سلامەتە بەڵام پشتی ئەسپەكەی شكاوە.

ئانا بە بیستنی ئەو قسەیە لە جێی خۆی دانیشتەوە و روخساری خۆی لە ژێر باڕۆشەكەیدا شاردەوە. ئەلكسی ئەلكساندرڤیچ دیتی كە دەستی كردووە بە گریان و ناتوانێ بەر بە فرمێسك و تەنانەت پڕمەی گریانەكەشی بگرێ. كارنین ئانای خستە پەنای خۆی و دەرفەتی پێدا كە كولۆكوی دڵی هەڵڕێژێ و ئارام بێتەوە.

دوای ماوەیەك گوتی: بۆ جاری سێهەم پێشنیارت پێدەكەم كە بۆ ماڵێ لەگەڵتا بێم؟ ئانا چاوی لە چاوی دەكرد بەڵام نەیدەزانی چ وەڵامێكی بداتەوە. پرێنسس بێتسی چووە یارمەتیی و گوتی: ئەلكسی ئەلكساندرڤیچ، من ئانام هێناوە و بەڵێنیشم پێداوە بیبەمەوە بۆ ماڵێ.

كارنین بە بزەیەكی ژیرانە و بە لەبزێكی قایمەوە چاوی لە چاوی بڕی و گوتی: داوای لێبوردن دەكەن پرێنسس. بەڵام وادیارە ئانا حاڵی باش نییە و حەزدەكەم خۆم لەگەڵیدا بڕۆمەوە.

ئانا پەشۆكاوانە چاوێكی لە دەوروبەری كرد و بە نیشانەی بەقسەكردن هەستا و دەستی لەسەر مەچەكی مێردەكەی دانا.

بێتسی چرپاندی بە گوێیدا: من كەسێك دەنێرم بۆ لای و خەبەرەكەیت پێدەگەیێنم.

ئەلكسی ئەلكساندرڤیچ كاتی چوونەدەرێ لە شوێنگەكە، بەپێی عادەت لەگەڵ ئاشنا و ناسیاوەكانی كە تووشیان دەبوون رادەوەستا و قسەی دەكرد، ئاناش وەك هەمیشە ناچاربوو وەڵامی سڵاو و هەواڵپرسییەكانیان بداتەوە و قسە بكات، بەڵام ئاگای لە خۆی نەبوو و دەستی بە دەستی مێردەكەیەوە دەتگوت بە دەم خەوەوە دەڕوا.

لە دڵی خۆیدا گوتی: «كوژراوە یان نا؟ یانی راستە؟ بڵێی ئەمشەو بێت؟ بڵێی ئەمشەو چاوم پێیبكەوێ؟»

بێ ئەوەی قسە لەگەڵ كەس بكات سواری فایتوونەكەی ئەلكسی ئەلكساندرڤیچ بوو و بە بێدەنگی بە نێوان عارەبانەكانی تردا تێپەڕین. كارنین سەرەڕای دیتنی ئەو شتانە ئیزنی بە

خۆی نەدەدا بیر لە هەقیقەتی کاری ژنەکەی بکاتەوە. ئەو تەنیا دیاردە ڕواڵەتییەکانی دەدی. دیبووی کە ژنەکەی ئاکارێکی نەشیاوی بووە و بە ئەرکی خۆی دەزانی کە بۆ ئەو هەڵسوکەوتەی وریایی پێبدا. بەڵام زۆری بەلاوە دژوار بوو کە لە وریایی پێدان نەترازێ و تەنیا بە وەبیرهێنانەوە و تێگەیاندن ڕازی بێ. کە زاری دەکردەوە تەنیا دەیویست پێیبڵێ ئاکارەکەی ناحەز و نەشیاو بووە بەڵام بێ ئیختیار شتێکی تەواو جیاوازی بە دەمدا هات.

گوتی: ئەگەر بیری لێدەکەیتەوە دەبینی ئێمە لەڕادەبەدەر هۆگری ئەو نمایشە پڕ توندوتیژی و مەترسیدارەین. من بۆم دەرکەوتووە کە...

ئانا بە لالووتێکەوە گوتی: چۆن؟ تێناگەم دەڵێیچی...

کارنین زویربوو و خێرا هاتە سەر ئەوەی داخی دڵی هەڵڕێژێ.

گوتی: من دەبێ پێتان بڵێم کە...

ئانا لە دڵی خۆیدا گوتی «ئەها، دەستی پێکرد، ئێستا ڕوونکردنەوەی دەوێ....» ترسی لێنیشت.

کارنین بە زمانی فەڕەنسی گوتی: دەبێ پێتان بڵێم کە ئاکاری ئەمڕۆتان زۆر ناحەز بوو.

ئانا بە توندی سەری بۆ لای وەرسووڕاند و ڕاست چاوی لە چاوی بڕی، بەڵام ئیتر نەك بەو نەشە دڕۆیینەی پێشوویەوە کە بە ڕیا شتێکی دەشاردەوە، بەڵکوو بە لەبزێکی قایمەوە کە ترسەکانی بە دژواری دادەپۆشی، بە دەنگێکی بەرز و ڕووهەڵماڵدراوانە گوتی: کام ئاکاری ناحەز؟

کارنین ئاماژەی بە پەنجێرەی ئاوەڵای لای عارەبانەچییەکە کرد کە کرابۆوە و گوتی: ئاگات لە زارت بێ...

تۆزێ خۆی هەڵێنا و شووشەی پەنجێرەکەی هەڵکێشا.

ئانا دووپاتی کردەوە: چیم کردووە کە پێت ناحەز بوو.

ـ بە دیتنی گلانی یەکێك لە سوارەکان، وا هۆش و ئیختیارت لێبڕا کە نەتدەتوانی بیشاریتەوە.

چاوەڕێبوو ژنەکەی ناڕەزایەتی دەربڕێ، بەڵام ئەو نقەی نەکرد و چاوی لە پێش خۆی بڕی.

ـ من تکام لە ئێوە کردبوو کە لە نێو خەڵکدا ئاگات لە ئاکار و هەڵسوکەوتت بێ بۆ ئەوەی نەتەوییەکان نەتوانن قسە و قسەڵۆکت وەدوا بخەن. سەردەمێك بوو من باسی پێوەندیی تایبەتیی خۆمانم دەکرد، ئێستا ئیتر باسی ئەو جۆرە پێوەندییانە ناکەم. ئێستا ئیتر تەنیا باسی پێوەندیی ڕواڵەتیمان دەکەم. ئاکاری ئێوە لەنێو خەڵکدا جوان نەبوو. من حەزناکەم ئیتر ئەو جۆرە ئاکارە دووپات بکەیتەوە.

ئانا گوێی لە نیوەی قسەکانی کارنین نەدەبوو. بێزار بوو لێی و لە دڵی خۆیدا دەیگوت یانی راستە کە ڤرۆنسکی گیانی لەدەست نەداوە؟ ئەو سوارەی کە گوتیان سلامەتە و پشتی ئەسپەکەی شکاوە، ئەو بووە؟ کاتێك قسەکانی کارنین تەواوبوو ئانا زەردەیەکی گرت کە بەزۆر دەیویست گاڵتەجاڕانە بنوێنێ. بەڵام هیچ وەڵامێکی نەدایەوە چونکە قسەکانی مێردەکەی هەر نەبیستبوو. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ سەرەتا بوێرانە دەدوا بەڵام کاتێك کە بۆی دەرکەوت سەبارەت بە چی قسە دەکا ئەو ترسەی دڵی ژنەکەی داگرتبوو ئەویشی گرتەوە. بزەی ژنەکەی دیت و تێگەیشت کە زۆر پێس بەهەڵە چووە.

«ئەو بە خانەگومانیی من پێدەکەنێ. ئێستا ئەوەی کە ئەوجارە دەیگوت دووپاتی دەکاتەوە. دەڵێ کە خانەگومانیی من لە خۆڕایە و فکرێکی قۆڕ و پڕ شوورەییە.»

ئێستا کە ئاشکرابوونی ریسواییەکەی وەك شمشێرێك لە ژوور سەری هەڵواسرابوو، گەورەترین ئاواتی ئەوەبوو کە ئانا وەك ئەوجارە بە گاڵتەجاڕییەوە وەڵامی بداتەوە و پێی بڵێ کە ئەم هەموو دڵپیسی و خانەگومانییە شتێکی پڕ شوورەیی و بێبنەمایە. ئەوەی دەیزانی هێندە رەش و ترسناك بوو کە ئامادەبوو بڕوا بە هەموو شتێك بکا. بەڵام حاڵەتی روخساری ژنەکەی ئێستا هێندەی ترس و پەژارە و خەم پێوە دیاربوو کە تەنانەت مزگێنیی فێڵ و دەهۆی پێوە نەبوو کە تۆزێ هێوری بکاتەوە.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ گوتی: رەنگە بەهەڵە چووبێتم. بۆیە تکات لێدەکەم لێم ببوورە.

ئانا چاوێکی پڕ لە خەفەت و ناهومێدیی لە روخساری ساردوسڕی مێردەکەی کرد و لەسەرەخۆ گوتی: نا، بەهەڵە نەچووی. بەهەڵە نەچووی. چارم نەمابوو و ئێستاش ناتوانم هەست بە داماوی نەکەم. من گوێم لە قسەکانی تۆیە بەڵام بیر و خەیاڵم هەر لەلای ئەوە. ئەوم خۆش دەوێ و حەزی لێدەکەم. بوونی تۆم بۆ تامڵ ناکرێ و بەڕاستی لێت دەترسم و زۆریشت لێ بێزارم. هەر کارێکیشت پێخۆشە بیکە.

دوای ئەو قسانە پاڵی دا بە سووچێکی عارەبانەکەوە و دەستی بە دەموو چاوییەوە گرت و دای لە قوڵپەی گریان. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لە جێی خۆی نەبزووت و راست چاوی کە لە پێش خۆی و لە شوێنێکی نادیار بڕیبوو، نەیگوێستەوە" بەڵام روخساری لەناکاو ساردوسڕ و وشك هەڵگەڕا و ئەو حاڵەتە لە تەواوی ماوەی رێگادا بە روخسارییەوە مایەوە. کە لە ڤیلاکە نزیکبوونەوە هەر بەو حاڵەتەوە سەری بۆ لای ئەو وەرسووڕاند و گوتی:

ـ بەڵام تکات لێدەکەم ئەم بارودۆخە بە رواڵەت ئابڕوومەندانەیە بپارێزە... ـ لێرەدا دەنگی دەلەرزی و پاشان گوتی: تا ئەو کاتەی کارێك دەکەم کە شەرەف و ناو و ئابڕووی خۆم بپارێزم و ئاگادارت دەکەمەوە.

لە عارەبانەکە دابەزی و پاشان یارمەتیی دا کە دابەزێ. لەلای خزمەتکارەکان بێ ئەوەی شتێك بلێ دەستی ئانای گوشی و دیسان سواری عارەبانەکە بووەوە و گەڕایەوە بۆ پترزبۆرگ.

دوای رۆیشتنی ئەو پێشخزمەتێك لەلایەن پرێنسس بێتسییەوە هات و یادداشتنێکی بۆ ئانا هێنا: کەسێکم ناردووە بۆ لای ڤرۆنسکی تاکوو هەواڵی بزانێ، ئەویش بۆی نووسیوم ساغ و تەندروستە بەڵام زۆر شەکەت و پەرێشانە.

ئانا چاوێکی لە کاتژمێر کرد. هێشتا سێ سەعاتی مابوو، وەبیرهاتنەوەی دوایین ژوانەکەیان خوێنی لە نێو دەمارەکانیدا وەکوڵ هێنا.

«خودایە هەوا چەندە رووناکە! زۆر دەترسم. بەڵام من حەزدەکەم روخساری نەبینم. ئەم رووناکییە خەیاڵاوییەم زۆر پێخۆشە... مێردەکەم! ئاخ، بەڵێ... چاکبوو، شوکر بۆ خوا کارەکەم لەگەڵیدا یەکلابۆوە.»

## سێ

وەك هەموو ئەو جێگایانەی کە شوێنی کۆبوونەوەی خەڵکە، لە شارۆچکەی گەرمکاوەکانی ئاڵمانیش کە بنەماڵەی ئیشچر باتسکی لەوێ بوون دەکرێ بڵێی جۆرێك جێکەوتنی کۆمەڵایەتی بەڕێوەدەچوو، یانی بۆ هەرکام لە ئەندامانی بنەماڵە شوێنێکی تایبەت و نەگۆڕ دابینکرابوو. راست بەو شێوەیەی کە تەمومژ لە سەرمادا بە جۆرێکی دیار و نەگۆر پێکەوە دەنووسێن و شکلێکی بەرچاو و ناسراو وەك گوڵی کولووە بەفری لێدروست دەبێ، لەم شارۆچکەیەی ئاوی گڕاویش هەرکەس دەگەیشتێ خێرا لە شوێن و پێگەیەك کە تایبەتی خۆی بوو نیشتەجێ دەکرا.

(پرێنسس ئیشچر Fuerst Schtscher batski Samt Gemahlin und tochter باتسکی لەگەڵ هاوسەر و کچەکەیان) بەو باڵەخانەدا کە بەکرێیان گرت و بەو ناوبانگە

فەرمییەی کە بوویان و هەروەها بە بۆنەی ئاشنا و رۆشناوە کە پەیدایان کردن، لەڕێوە لە جێگای دیار و لە پێشدا دیاریکراوی خۆیان نیشتەجێبوون..

ئەو ساڵە پرێنسسێکی ئەڵمانیایی کە بەڕاستی تەبارێکی شایانەی هەبوو، هاتبوو بۆ شارۆچکەی ئاوی گڕاو و بەو هۆیەش کاری مسۆگەربوونی کۆمەڵایەتی بە وردی و رێکوپێکییەکی زیاترەوە بەڕێوەدەچوو. پرێنسس ئیشچر باتسکی ویستی هەرچۆنێك بێ کچەکەی خۆی بەو پرێنسسە ئەڵمانیاییە بناسێنێ و هەر ئەو رۆژە دوای هاتنی ئەو ریورەسمە کە بەڕێوەچوو، کیتی بە جلوبەرگی هاوینی ***زۆر ساکارەوە،*** یان بڵێین زۆر رازاوە و جوانەوە کە دەسکاری پاریس بوو، لەبەر دەمی پرێنسسی ئەڵمانیاییدا کڕنۆشێکی کرد و پرێنسس گوتی کە هیوادارە «سوورایی گوڵاڵە بە زووترین کات بۆ روخسارە جوان و ناسکەکەی بگەڕێتەوە.» بواری ژیانی بنەماڵەی ئیشچر باتسکی لەوە بەدواوە هێندە بە روونی مسۆگەر بوو کە لاری و لادان لەو رێگایە ئیتر ئەستەم بوو. ئەوان لەگەڵ بنەماڵەی لیدییەکی ئینگلیزی و باکنتسییەکی ئەڵمانیایی و کوڕەکەی کە لە شەڕی رابردوودا بریندار بووبوو و بیرمەندێکی سویدی و مۆسیۆکانووت و خوشکی ئاشنابوون. بەڵام ئەو کەسانەی کە زیاتر لەگەڵیان هەڵسوکەوتیان دەکرد بریتیبوون لە خاتوونێکی خەڵکی مۆسکۆ بە ناوی ماریا یۆگنییۆڤنا و کچەکەی، کە کیتی کچەی نەدەکەوتە بەردڵ، چونکە ئەویش وەك خۆی دەردی ئەوین کەلەلای کردبوو، هەروەها ئەفسەرێکی مۆسکۆیی کە کیتی لە منداڵییەوە ئەوی بە یۆنیفۆرمی نیزامی و سەرشانی رێشکۆدارەوە دیتبوو و دەیناسی، لێرەش بەو چاوە کونە سووژن و ملی رووتەڵەوە کە بۆینباخێکی تەڵخ و رەنگ بواردووی لێ توندکردبوو، زۆر قۆڕ و سەیروسەمەرەی هاتە بەرچاو و چونکە وەك چەقڵە پێیانەوە نووسابوو و لە کۆڵیان نەدەبۆوە، ئیتر بەجارێ لە دەستی وەڕەز بووبوو و حەزی دەکرد کوێر بێ و نەیبینێ. کاتێك پێوەندییەکانیان بەو شێوەیە جێکەوت کیتی زۆری هەست بە خەم و دڵتەنگی دەکرد بەتایبەت بەو هۆیەی کە باوکی چووبوو بۆ کارلسباد و ئەوی لەگەڵ دایکی بەجێ هێشتبوو. ئەو حەزی نەکرد ئەو کەسانەی دەیانناسێ چاوی پێیان بکەوێ و دەیزانی چاوەڕوانیی قسە و کاری تازەیان لێ ناکرێ. گرینگترین شتێك کە لەم شارۆچکەی گڕاوە ئەوی هۆگری خۆی کردبوو و خۆی پێوە سەرقاڵ دەکرد، وردبوونەوە لە هەڵسوکەوتی نەناسیاوان و راوبۆچوونی سەبارەت بە نهێنییەکانیان بوو. کیتی بەپێی خووخدەی خۆی خەڵك و ئەو کەسانەی نەیدەناسین هەموویانی بە خاوەنی شانوشکۆ دەزانی و ئێستاش سەرەڕای خۆسەرقاڵ کردن و راوبۆچوونی سەبارەت بە خەڵك کە

کێن و چۆنن و پێکەوە چ خزمایەتییەکیان هەیە، لە خەیاڵی خۆیدا باشترین و سەیرترین ئاوەڵناوی دەدانە پاڵ و وێڕای سەرنجەکانی خۆی هەوڵی دەدا ئەو بۆچوونانە وەڕاست بگەڕێ.

لە نێوان ئەو تازە ناسیاوانەدا کچێکی رووسی هەبوو کە لەگەڵ خاتوونێکی نەخۆش بۆ شارۆچکەی گڕاو هاتبوو ناوی مادام ئیشتال بوو و ئەو کچەش لە هەمووان زیاتر فکری ئەوی بەخۆیەوە خەریك کردبوو. مادام ئێشتاڵ لە بنەماڵەی نەجیمزادان بوو بەڵام هێندە نەخۆش بوو کە نەیدەتوانی لەسەر پێ خۆ بگرێ و تەنیا هێندێ جار کە هەواکەی خۆش دەبوو بە سواری کورسیلەی تایەدار بۆ گەڕان دەهاتەدەرێ. بەڵام هەروەك پرێنسس دەیگوت، ئەو دوورەپەرێزییەی بەهۆی نەخۆشینەکەیەوە نەبوو، بەڵکوو زیاتر بەهۆی لووت بەرزی و قۆڕەدەماخییەوە بوو و نەیدەویست لەگەڵ رووسییەکان سەری ئاشنایەتی داخا. کچە رووسییەکە پەرستاریی لە مادام ئیشتاڵ دەکرد، هەڵبەت پەرستاری تایبەتی ئەو ژنە بادیهەوایە نەبوو و هەروەك کیتی بۆی دەرکەوتبوو، لەگەڵ هەموو نەخۆشە کەلەلا و گردنشینەکانی ئەو شارۆچکەیە هەڵسوکەوتی دەکرد و زۆر بە شێوەیەکی سروشتیانە ئاگاداریی لێدەکردن. کیتی بە سەرنجەکانی خۆیدا بەو ئاکامە گەیشتبوو کە ئەو کچە رووسییە هیچ خزمایەتییەکی لەگەڵ مادام ئیشتاڵ نییە، بەڵام مزووریشی نەبوو، مادام ئیشتاڵ ئەوی بە ناوی ڤارنکا (سووکەڵە ناوی ڤاریا یان ڤارڤارا) بانگ دەکرد و خەڵکیش پێیان دەگوت مادموازێل ڤارنکا. جگە لەوەی کە کیتی زۆری حەزدەکرد سەری لە پێوەندیی ئەو کچە و مادام ئیشتاڵ و نەناسیاوەکانی تر دەرچێ، هەروەك زۆر جاری روودەدا، هەستی بە خۆشەویستییەك دەکرد سەبارەت بەو کچە کە خۆشی نەیدەزانی بۆچییە و نەشیدەزانی ئەو خۆشەویستییە چییە و کاتێك تووشی یەکتر دەبوون ئەویش ئەو هەست و حاڵەی هەبوو.

ئەو مادموازێل ڤارنکایە بۆ ئەوە نەدەبوو بە جحێڵی نەزانی، بەڵکوو وەك ئەوە وابوو کە ئاوەڵناوی جوانی و پیریی پێناکەوێ. دەکرا بە نۆزدەساڵانیشی بزانی و بە سی ساڵانیش. ئەگەر بە وردی سەرنجی روخساریت بدایە و رەنگ بزرکاوی و زەردەڵێیەکەی دەموچاویت لەبەر چاو نەگرتایە دەتدی کە زیاتر جوانە نەك ناحەز. ئەگەر داڵگۆشتییە لەڕادەبەدەرەکەی و سەرە گەورەکەی کە لەچاو جەستەی زۆری لەچاو دەدا، نەبوایە، دەکرا بە شۆخ و لەباری بزانی. بەڵام بێگومان زۆری سەرنجی پیاوان رانەدەکێشا. لە گوڵێکی جوان دەچوو کە هێشتا پەلك و پەڕەکانی نەوەریوە بەڵام ئیتر گەشاوەیی و بۆن و بەرامەی نەماوە. جگە لەوە بنۆسێکی تریش

هەبوو کە نەیدەهێشت لەبەرچاوی پیاوان دڵڕفێن بنوێنێ، ئەویش بێ بەش بوون لە ژیلەمۆی ژیان و ئاگاداری لە جوانیی خۆی بوو، کە کیتی ئەو دووانەی بە لای زۆرەوە هەبوو.

ڤارنکا هەمیشە سەرقاڵ دیاربوو کە هەر بەڕاستیش زۆر سەرقاڵ بوو، هەر بەو هۆیەش وایدەنواند کە نەیدەتوانی جگە لە کارەکەی گرنگی بە شتێکی تر بدات. هەر ئەو دژوارییە دەروونییەی نێوان ئەو جووتە، دڵی کیتیی بۆ لای خۆی رادەکێشا. کیتی هەستی دەکرد لە ئەو و شێوەی ژیانیدا سەرمەشقێك هەیە کە ئێستا بە تامەزرۆییەکی پڕژانەوە لە دووی دەگەڕا: خواستەکانی ژیانی و مەزنایەتیی لە ژیاندا، نەك پێوەندیی کچان و کوڕان لە کۆڕەکاندا کە کیتی زۆری لێ بێزار بوو، ئەوەشی بە نواندنی پڕ شوورەیی کاڵایەك دەزانی کە بۆ پەیداکردنی مشتەری هێناویانە بۆ کۆڕ و کۆبوونەوەکان. هەتا زیاتر لەو دۆستە نەناسیاوەی ورد دەبۆوە زیاتر خاترجەم دەبوو کە ئەو کچە راست ئەو ژنە کامڵەیە کە ئەو لە خەیاڵی خۆیدا رەسمی کردووە و دەیویست هەرچۆنێکە لەگەڵی ئاشنابێ و لێی نزیك بێتەوە.

ڤارنکا و کیتی رۆژی چەند جار یەکتریان دەدی و لە هەموو بەیەك گەیشتنێکدا چاوانی کیتی لێی دەپرسی «تۆ کێی؟ چکارەی؟ یانی تۆ ئەو بوونەوەرە دڵڕفێنەی کە من بیری لێدەکەمەوە؟» بەڵام سەرنجی دەشیگوت «بەڵام تۆ ئەوخودایە پێتوانەبێ من ئیزن بەخۆم دەدەم تاکوو بە زۆری خۆم بە کەسێکەوە هەڵواسم. تەنیا حەز بە هاوڕێیەتیت دەکەم و خۆشم دەوێی.» چاوی کچەکەش وەڵامی دەدایەوە «منیش تۆم خۆشدەوێ، تۆ زۆر زۆر مێهرەبانی. ئەگەر بۆم بکرایە لەوەش زیاتر خۆشمدەویستی» هەر بەڕاستیش کیتی دەیدی کە چەندە سەرقاڵە: یان منداڵی بنەماڵە رووسییەکانی لە گەرماوی گڕاوەکە دەهێنایەوە یان بەتانییەکی دەبرد بۆ ژنێکی نەخۆش و دەیدا بەسەر لاقیدا و رێکوپێکی دەکرد یان هەوڵی دەدا پیاوێکی نەخۆشی تووڕە و رقهەستاو هێوربکاتەوە یان بۆ نەخۆشێکی تر قاوە و غوراِبی بکڕێ.

ماوەیەك دوای هاتنی بنەماڵەی ئیشچر باتسکی بۆ شارۆچکەی گڕاو، دوو کەسی تریش کاتی خۆشۆردنی بەیانی لەوێ وەبەر چاو کەوتن کە سەرنجی غەوارانەی هەموانیان راکێشا. یەکیان پیاوێکی کەڵەگەتی پشت چەماوە بوو کە دەست و قامکی زەلام و درێژ دەتگوت شەنەیە و باڵتەیەکی کۆنی لەبەردا بوو کە زۆر بەبەری چکۆلە بوو، چاوە رەشەکانی لەگەڵ ئەوەدا کە زۆر ساکار و بەستەزمانانە بوون، ترسناکیان دەنواند، یەکێکی تریشیان ژنێکی هاوڵاوی بوو کە روخسارێکی مێهرەبان و فەقیرۆکەی هەبوو بەڵام زۆر شڕەپۆش و خەسپاڵ بوو. کیتی کە بۆی دەرکەوت ئەوانە رووسین، بە خەیاڵ دەستیکرد بە داڕشتنی چیرۆکی ئاشقانە

بۆیان. بەڵام چونکە پرێنسس بە رەنگی روخسار و ناوی میوانەکاندا بۆی دەرکەوت کە ئەو ژن و پیاوە، ناویان نیکۆلای لەڤین و ماریا نیکۆلایۆڤنایە و بۆی روونکردەوە کە ئەم لەڤینە چ پیاوێکی دڵچڵکن و بەدڕایە، خولیاکانی کیتی لە دەوری ئەو دوو کەسە بە تەواوی کۆتایی پێهات. ئەم پیاوە و ژنەکەی هاوڕێی، زۆر کرێت و چەپەڵ دەهاتنە بەرچاوی، بەڵام نەك بەهۆی ئەوەی کە دایکی پێیگوتبوو بەڵکوو زیاتر بەهۆی ئەوەیکە بۆی دەرکەوت ئەو لەڤینە برای کۆنستانتینە. ئەم لەڤینە بەو عادەتە عەسەبییەی خۆیەوە کە سەری بۆ لایەك بادەدا، تۆوی هەستێکی تاڵ و پڕ نەفرەتی لە ناخی کیتیدا گووراند.

کیتی پێیوابوو چاوی زەق و ترسناکی ئەو پیاوە کە منجڕانە لێی دەڕوانێ و نیگای لەسەر هەڵناگرێ تیتاڵ و رشقنجاڕییەکی تێدایە و هەوڵی دەدا خۆی لێ لادا و لەگەڵی بەرەو روو نەبێ

## سی و یەك

ئەو رۆژە هەواکەی ناخۆش بوو. لە بەیانییەوە هەتا نیوەڕۆ باران خۆشی نەکردبۆوە و نەخۆشەکان بە چەترەوە لە بازاڕی سەرداپۆشراودا کۆزیلکەیان بەستبوو.

کیتی لەگەڵ دایکی و ئەفسەرە رووسییەکە پیاسەیان دەکرد. ئەفسەرەکە رێدنگۆتێکی دەستکاری ئەورووپای لەبەردا بوو کە لە فرانکفۆرت کڕیبووی و بە شادی و نەشەیەکی زۆرەوە خۆی دەنواند. ئەوان لە نێو بازاڕەکە بە بەرێکدا دەڕۆیشتن و لەڤین و ئەوان لەوبەری دیکەوە هەوڵیان دەدا خۆی لێ ببوێرن و لووتیان بە لوتیدا نەتەقێ. ڤارنکا کراسێکی تۆخی لەبەردا بوو و کڵاوێکی رەشی لەسەرنابوو و لێوارەکەی بۆ خوارەوە نووشتابۆوە، لەگەڵ ژنێکی نابینای فەڕەنسی بە نێو بازاڕەکەدا دەگەڕان و هەرجارێك کە بەلای کیتیدا تێدەپەڕی چاوێکی دۆستانەیان لە یەکتر دەکرد.

کیتی کە چاوی لەسەر دۆستە نەناسەکەی خۆی هەڵنەدەگرت و دەیزانی لەگەڵ هاوڕێکەی بەرەو سەرچاوەی گڕاوەکە دەچن و بۆی هەیە لەوێ تووشی یەکتر بن بە دایکی گوت: دایەگیان دەتوانین قسەی لەگەڵ بکەین؟

دایکی وەڵامی دایەوە: ئێستا کە ئەوەندە هۆگری بووی، راوەستە با سەرەتا پرسوجۆیەکی لەبارەوە بکەین، پاشان خۆم سەری قسەی لەگەڵ دەکەمەوە. چ شتێکی سەرنجڕاکێشت لەودا دیوەتەوە؟ دەبێ

کلفەت یان شتێکی لەو چەشنە بێ ـ بە پۆزێکەوە سەری هەلێنا و گوتیشی: ئەگەر پێتخۆشە لەگەڵ مادام ئیشتاڵ سەری ئاشنایەتی بکەمەوە، خەمت نەبێ لەگەڵ براژنی ئاشنایەتیمان هەیە.

کیتی دەیزانی دایکی لە مادام ئیشتاڵ زویربووە، دەکرا بشزانێ کە خۆی لە ئاشنایەتیی ئەوان دەبوێرێ و هەر بەو هۆیەش لەوە زیاتر لەسەری نەڕۆیشت.

کاتێك کە ڤارنکا پەرداخێك ئاوی دایە دەست ژنە فەڕەنسییەکە، کیتی چاوی تێبڕیبوو، گوتی: بێوێنەیە. بەڕاستی کچێکی دلۆڤانە! دیتووتە چەندە ڕۆحسوك و مێهرەبانە؟!

پرێنسس گوتی: ئەو شەیدابوونەی تۆ زۆر شتێکی قۆڕە ـ کە دیتی لەڤین و ژنەکەی هاوڕێی لەگەڵ دوکتۆری ئەڵمانیایی لەسەر بابەتێك بە دەنگی بەرز و لەبزێکی قەڵسانە مشتومڕیانە و بەرەولای ئەوان دێن گوتی: وەرە، واچاکە بگەڕێینەوە.

گەڕانەوە و خەریکبوون چەند هەنگاوێك دوور بکەونەوە دەنگی مشتومڕەکەیان بوو بە هاوار و هەڵلا. لەڤین راوەستابوو و دەیگوڕاند، پزیشکەکەش رەقی هەستابوو. حەشیمەت دەورەی دابوون. پرێنسس و کیتی بەپەلە لە شوێنەکە دوورکەوتنەوە، بەڵام ئەفسەرەکە رۆیشت بۆ نێو خەڵکەکە تاکوو بزانێ کێشەکەیان لەسەر چییە.

دوای چەند خولەك هاتەوە.

پرێنسس لێیپرسی: ئەو قرموقاڵەیان لەسەر چیبوو؟

ئەفسەرەکە وەڵامی دایەوە: ئابڕووچوون و شوورەیی. پیاو دەبێ لەشتێك بترسێ ئەویش بەرەوڕووبوونە لەگەڵ رووسی لە دەرەوەی وڵات. ئەو کابرا درێژداهۆڵە لەگەڵ پزیشکەکەی بەشەڕ هاتبوو و جنێوی پێدەدا چونکە پێیوابوو بە باشی ماریجەی ناکا و گۆچانی لێهەڵێناوەتەوە و ویستوویە لێیدا. بەڕاستی عەیبە، شوورەییە، شوورەیی.

پرێنسس گوتی: بەڕاستی ناخۆشە! دەی کێشەکەیان بەکوێ گەیشت؟

ئەفسەرەکە وەڵامی دایەوە: باشبوو ئەو خاتوونە... ئەوەی وا کڵاوی گردی لەسەردایە، بوو بە ناوبژیوان. پێموا ئەویش رووسییە.

کیتی بە خۆشحاڵییەوە گوتی: مادامواززێل ڤارنکا؟

ـ بەڵێ، بەڵێ، ئەو زووتر لە هەمووان تێگەیشت دەبێ چ بکا. دەستی کابرای گرت و لەوێی دوور خستەوە.

کیتی بە دایکی گوت: دیتووتە دایەگیان، ئێوە پێتان سەیربوو کە من کەوتبووە بەردڵم.

کیتی لەو ڕۆژە بەدواوە لەگەڵ ئەوەدا کە هەڵسوکەوتی کچە نەناسەکەی خستبووە ژێر چاوەدێری، بۆی دەرکەوت کە ماداموازێڵ ڤارنکا لەگەڵ لەڤین و ژنەکەی هاوڕێشی ئەو پێوەندییە گەرموگوڕەی دامەزراندووە کە لەگەڵ نەخۆش و کەلەلاکانی تر هەیبوو. لێیان نزیکبووبۆوە و قسەی لەگەڵ دەکردن و بۆ ژنە کە هیچ زمانێکی هەندەرانی نەدەزانی بووبووە دیلمانج.

کیتی بە پێداگریی زۆرەوە داوای لە دایکی کرد کە ئیزنی پێبدا تاکوو لەگەڵ ڤارنکا ببێتە هاوڕێ. ئەگەرچی بۆ پرێنسس شانازی بوو کە لەگەڵ خاتوون ئیشتاڵ ئاشنابێ و ئیجازەی بە خۆی دەدا کە خۆی پێوەڕانێ، لەمەڕ ڤارنکاوە پرسوجۆی کرد و کەمتا کورتێك کەسایەتییەکەی بۆ دەرکەوت و بەو ئاکامە گەیشت کە هاوڕێیەتی لەگەڵیدا خراپ نییە. ئەگەرچی ڤازانجێکی ئەوتۆشی تێدا نییە: خۆی لە پێشدا چوو بۆ لای و سەری ئاشنایەتیی لەگەڵ کردەوە.

پرێنسس کاتێك کچەکەی چووبوو بۆ سەرچاوەی گراوەکە و ڤارنکا لە نانەواخانە بوو بە دەرفەتی زانی و چوو بۆ لای و بە بزەیەکی قوڕساخانەوە گوتی:

ـ ئیجازەم بدە خۆم بناسێنم. کچەکەم زۆری تۆ کەوتۆتە بەردڵ. بێگومان تۆ من ناناسی، من...

ڤارنکا نەیهێشت درێژە بە قسەکانی بدا و گوتی: ئەگەر بڵێم ئەو خۆشەویستییە دوولایەنەیە درۆم نەکردووە، پرێنسس..

پرێنسس گوتی: دوێنێ کارێکی باشت کرد ئەو هاوولاتییە بێچارەیەمانت هێور کردەوە.

ڤارنکا سوورهەڵگەڕا و گوتی: پێموانییە کارێکی زۆر گەورەم کردبێ.

ـ چۆن نەتکردووە، نەتهێشت ئەو لەڤینە خۆی تووشی دەردەسەری بکات.

ـ بەڵێ، ***ژنەکەی هاوڕێی*** قاوی لێکردم و من هەوڵمدا خاوی بکەمەوە. ئەو زۆر نەخۆشە و لە پزیشکەکەی رازی نییە. من عادەتم گرتووە کە ئاگاداری لەو جۆرە نەخۆشانە بکەم.

ـ بەڵێ، بیستوومە کە لەگەڵ پوورت لە مەنتۆن دەژین. ناوی پوورت مادام ئیشتاڵە، وایە؟ من لەگەڵ براژنی ئاشنایەتیم هەیە.

ڤارنکا دیسان سوورهەڵگەڕا و وەڵامی دایەوە: نا ئەو پووری من نییە. من پێیدەڵێم دایەگیان بەڵام دایکی راستەقینەم نییە. ئەو منی گەورە کردووە.

ئەو قسەیەی هێندە ساکارانە دەربڕی و راستوێژیی روخسارە کراوەکەی هێندە شیرین بوو کە پرێنسس تێگەیشت بۆ وا کەوتۆتە بەردڵی کیتی.

پرێنسس پرسیی: دەی ئێستا ئەو لەڤینە دەیهەوێ چ بکا؟

ڤارنکا وەڵامی دایەوە: لێرە دەڕوا.

لەوکاتەدا کیتی لە سەرچاوەی گڕاو گەڕایەوە و هات بۆ لایان، کاتێك دیتی دایکی لەگەڵ کچە سەری ئاشنایەتیی داخستووە لە خۆشیانا گەشایەوە.

ـ کیتی، تۆ زۆرت حەزدەکرد لەگەڵ مادموازێڵ...

ڤارنکا بە پێکەنینەوە پەڕییە نێو قسەکانی: بۆ دەفەرمووی مادموازێڵ؟ پێمبڵی ڤارنکا، هەموو بە ڤارنکا بانگم دەکەن.

کیتی لە خۆشیانا سوورهەڵگەڕا و ماوەیەك بێ ئەوەی زمانی بگەڕێ دەستی هاوڕێ تازەکەی خۆی گوشی. بەڵام دەستی ڤارنکا وەڵامی دەستگوشینەکەی ئەوی نەدەدایەوە و هەروا شل لە نێو دەستیدا مابۆوە. دەستی وەڵامی دەستگوشینەکەی نەدەدایەوە بەڵام روخساری بە زەردەخەنەیەکی ئارام و پڕ نەشە، ئەگەرچی بڕێك خەمناکەوە دەدرەوشایەوە و ددانە درشت و جوان و رێکوپێکەکەی وەدیار دەخست.

گوتی: من خۆم ماوەیەکی زۆر چاوەڕوانی ئەوە بووم.

ـ بەڵام تۆ زۆر سەرقاڵی...

ڤارنکا وەڵامی دایەوە: کوا سەرقاڵم، هیچ کارێکم نییە...

بەڵام هەر لەو کاتەدا ناچاربوو ئاشنا تازەکانی بەجێ بێڵێ چونکە دوو کچۆڵەی رووسی، کە باوکیان نەخۆش بوو بە لەز دەهاتن بۆ لای.

هەرایان دەکرد: ڤارنکا، دایەگیان کاری پێتە.

ڤارنکا لەگەڵیان رۆیشت.

## سی و دوو

ئەو زانیارییەی کە پرێنسس سەبارەت بە رابردووی ڤارنکا و پێوەندیی لەگەڵ مادام ئیشتاڵ و هەروەها سەبارەت بە مادام ئیشتاڵ خۆی وەدەستی هێنابوو بەم شێوەی خوارەوە بوو.

هێندێ کەسی دەیانگوت مادام ئیشتاڵ هێندەی مێردەکەی ئازارداوە هەتا دیقی پێکردووە و ناردوویە بۆ قەبران، هێندێکیش دەیانگوت کە مێردەکەی بە کاری چەپەڵ و تۆڵازی و داوێنپیسی زۆری ژنە ئازارداوە، بەڵام راستییەکەی هەرشتێك بوو خودا دەیزانی و مادام ئیشتاڵ هەمیشە نەخۆش و لەشبەبار بووە، بەڵام بەو حاڵەشەوە دڵتەڕ و بەگڕ بووە. منداڵەکەی کاتێك لەدایك بووبوو، ئەو لە مێردەکەی جیا

بووبۆوه و لەڕێوه منداڵەکەی مردبوو و خزموکەسانیشی کە دەیانزانی مادام ئیشتاڵ زۆر دڵناسکە و بەرگەی ئەو خەمە ناگرێ منداڵە مردووەکەیان گۆڕیبوو و منداڵێکی تر کە هەر ئەو شەوە لە پترزبۆرگ و هەر لەو ماڵەدا لەدایك بووبوو و کچی یەکێك لە کلفەتەکانی بوو لەجێی منداڵە مردووەکە دادەنێن. ئەو کۆرپەیەش ڤارنکا بوو. خاتوون ئیشتاڵ زۆر دواتر زانیبووی کە ڤارنکا کچی خۆی نییە، بەڵام سەرەڕای ئەوەش گەورەی کردبوو، وەلحاسڵ ڤارنکا لە شەوی لەدایکبوونییەوە بێکەس بووبوو.

مادام ئیشتاڵ زیاتر لە دە ساڵ بوو کە لە دەرەوەی رووسییە و لە باشوور نیشتەجێ و دوای ئەوە ئیتر گردەنشین بووبوو. هێندێك دەیانگوت خاتوون ئیشتاڵ بە چاکەکاری و رێزگرتن لە ئایین پێگەیەکی کۆمەڵایەتیی باشی بۆخۆی مسۆگەر کردووە، کەسانێکی تریش دەیانگوت ئەو لە ناخیشدا هەر ژنێکیێ باشە و پابەندە بە ئاکار و خووخدەی جوان و تەنیا لەبەر چاکەکاری زیندووە، بۆیە ناوبانگی دەرکردووە. هیچ کەس نەیدەزانی پێڕەوی چ مەزەبێکە و لەگەڵ گەورەترین کەسایەتیی هەموو ئایینەکان و رێبەرانی دینی پێوەندیی دۆستانەی هەبوو.

ڤارنکا لە دەرەوەی وڵات بەردەوام لەگەڵ ئەودا دەژیا و هەموو ئەو کەسانەی کە مادام ئیشتاڵیان دەناسی و خۆشیاندەویست، بە ناوی ڤارنکا بانگیان دەکرد.

پرێنسس کە ئەو زانیارییانەی وەدەست هێنا، بەرگریی لە هاوڕێیەتیی کچەکەی لەگەڵ ڤارنکا نەکرد، بەتایبەت کە دەیزانی ڤارنکا خاوەنی ئاکار و خووخدەیەکی شایانە و زۆر جوان پەروەردە کراوە، بە زمانی فەڕەنسی و ئینگلیزی قسە دەکا و زمانی لەنگە ناکا، لە هەمووشی گرینگتر ئەوەبوو کە لە لایەن خاتوون ئیشتاڵەوە پەیامی هێنابوو کە زۆر بەداخەوەیە کە بە هۆی نەخۆشینەوە ناتوانێ چێژ لە ئاشنایەتیی پرێنسس وەرگرێ.

کیتی دوای ئاشنایەتی لەگەڵ ڤارنکا رۆژ لەگەڵ رۆژ زیاتر دەکەوتە بەردڵی و هەستی بە خۆشەویستیی ئەو هاوڕێ تازەیەی دەکرد و هەر رۆژەی خدەو ئاکارێکی جوان و تازەی لەو کیژە ژیرەدا دەدۆزییەوە.

پرێنسس کاتێك بیستی ڤارنکا دەنگی خۆشە و گۆرانیی باش دەچڕێ داوای لێکرد شەوێکی بچێت بۆ ماڵەکەیان و گۆڕانییان بۆ بڵێ.

پرێنسس بە بزە و قوڕساخییەکی درۆیینەوە گوتی: کیتی پیانۆ دەژەنێ لە ماڵێ پیانۆیەکمان هەیە، ئەگەرچی پیانۆیەکی باش نییە، بەڵام هەرچۆنێك بێ ئەگەر بێی بۆ ماڵەکەمان خۆشحاڵ دەبین ـ بەڵام کیتی حەزی بەو پێشنیارە و زەردەخەنەکەی دایکی نەدەکرد، چونکە تێگەیشبوو کە ڤارنکا حەزی لە گۆرانی گوتن نییە. بەڵام ڤارنکا شەوێ هات

و دەفتەرێکی نۆتە لەگەڵ خۆی هێنابوو. پرێنسس ماریا یۆگنییۆڤنا و کچەکەی و ئەفسەرەکەشیان بانگهێشتن کردبوو.

ڤارنکا وەك نیشانی دەدا حوزووری ئەو میوانە نەناسیاوانە نارەحەتی نەکردووە و هەر لەرێوە رۆیشت بۆ لای پیانۆکە. نەیدەتوانی لەگەڵ گۆرانیگوتن پیانۆش بژەنێ، بەڵام نۆتە خوێنییەکەی زۆر باش بوو. کیتی کە زۆر باشی پیانۆ دەژنی پێکەوە ئاهەنگێکی باشیان گێڕا.

دوای ئەوەی ڤارنکا یەکەم گۆرانیی زۆر بە باشی چڕی، پرێنسس گوتی: تۆ بەڕاستی هونەرمەندانە گۆرانی دەڵێی و دەنگت زۆر خۆشە.

ماریا یۆگنییۆڤنا و کچەکەشی سپاسیان لێکرد و تاریفی ئاواز و دەنگە خۆشەکەیان کرد.

ئەفسەری چاو شیشلۆقیش لە پەنجێرەکەوە چاوی لە دەرێ کرد و گوتی: بڕوانن ئەو عالەمە بۆ گوێگرتن لە گۆرانی کۆ بوونەتەوە ـ هەر بەڕاستیش خەڵکێکی زۆر لەبەر پەنجێرەکەدا ئاپۆرەیان دابوو.

ڤارنکا ساکارانە گوتی: زۆر خۆشحاڵم کە بوومەتە هۆی شادی و دڵخۆشیی ئێوە.

کیتی بە غوروورەوە چاوێکی لە دەستە خوشکەکەی کرد. حەزی بە دەنگ و هونەرەکەی دەکرد و بە دڵ چاوی لە روخساری دەکرد و چێژی لێوەردەگرت، بەڵام لە هەمووی زیاتر عاشقی خاکەڕایی بوونەکەی بوو، چونکە دیاربوو ڤارنکا هیچ گرینگایەتییەك بە هونەرەکەی نادا و گوێشی لە ئافەرین و بارەقەڵای خەڵکی نییە، وەك ئەوە وابوو کە بیهەوێ بپرسێ: ئەرێ بەسە یان دیسان گۆرانیتان بۆ بڵێم؟

کیتی لە دڵی خۆیدا گوتی «ئەگەر من بوایەم بەجێی ئەو لە خۆشیانا پێم وەعەرز نەدەکەوت. کاتێك چاوم بەو هەموو خەڵکە بکەوتایە لەبەر پەنجێرە کۆ بوونەتەوە و حەز بە گۆرانییەکانم دەکەن لە خۆشیانا شاگەشکە دەبووم! بەڵام ئەو گوێی لەو شتانە هەر نییە، تەنیا دەیەوێ دڵی دایەگیانم نەشکێنێ و ببێتە هۆی دڵخۆشی بۆی. چ نهێنییەك لە وجوودی ئەودایە وا ئاوا روحسووك و دڵۆڤانە؟ چ شتێك ئەو توانابییەی پێداوە کە گوێی بە هیچ شتێك نەبزوێ و بەوپەڕی لەسەرەخۆیی و سەربەستییەوە هەڵسوکەوت دەکا؟ چەندەم پێخۆشە ئەوە بزانم و لێی فێربم!» لە دڵیدا سەرقاڵی ئەو بیر و خەیاڵانە بوو و چاوی لە روخساری ئارام و کراوەی ڤارنکا بڕیبوو. پرێنسس داوای لە ڤارنکا کرد کە گۆرانییەکی تریش بڵێ و ڤارنکا هەروا لە پەنا پیانۆکەدا راوەستابوو و بە دەستە کز و گەنمڕەنگەکەی نەرم چەپڵەی لێدەدا و گۆرانییەکی دیکەی هەروا بە ئاسانی و وردبینی و زەوقەوە چڕی و کەوتە بەردڵی گوێدێران.

گۆرانییەکەی دواییبان کە لە دەفتەری نۆتەکەدا بوو ئاوازێکی ئیتالیایی بوو. کیتی دەسپێکی ئاوازەکەی ژەنی و زۆری پێخۆش بوو، کە تەواوبوو چاوێکی لە ڤارنکا کرد.

ڤارنکا سوورهەڵگەڕا و گوتی: واز لەوەیان بێنە، بچۆ سەر ئاوازێکی تر.

کیتی چاوێکی پڕ پرسیار و ماناداری لێکرد و خێرا تێگەیشت کە بیرەوەرییەکی لەو ئاوازە هەیە و بەپەلە لاپەڕەی نۆتەکەی هەڵدایەوە و گوتی: باشە، دەچینە سەر ئاوازێکی تر.

بەڵام ڤارنکا دەستی لەسەر لاپەڕەکە دانا و بە پێکەنینەوە گوتی: نا، لێیدە، هەر ئەوە دەچڕم.ـ ئەو گۆرانییەشی وەك گۆرانییەکانی تر بە ئارامی و خوێنساردی و ڕێکوپێکی چڕی.

کاتێك ئاوازەکە تەواوبوو دیسان خەڵکەکە سپاسیان لێکرد و ڕۆیشتن بۆ چاییخواردنەوە. کیتی و ڤارنکا چوونە نێو باخچەیەك کە لە تەنیشت ماڵەکە هەڵکەوتبوو.

کیتی گوتی: وادیارە ئەو ئاوازە وەیادی بیرەوەرییەکی خستییەوە؟ هەر خێرا گوتیشی: نا، بۆم ڕوون مەکەوە تەنیا بڵێ وایە یان وا نییە؟

ڤارنکا زۆر ئاسایی گوتی: نا، بۆچی؟ پێتدەڵێم ـ ئیتر چاوەڕوانی پرسیاری کیتی نەمایەوە و درێژەی بە قسەکانیدا: بەڵێ، بیرەوەرییەك کە سەردەمێك زۆر تاڵ و بەژان بوو. من حەزم لە کوڕێك دەکرد و ئەو گۆرانییەم بۆ دەگوت.

کیتی چاوە گەورەکانی زیت کردەوە و بە مێهرەبانییەوە چاوی لە چاوی بڕیبوو و هیچی نەدەگوت.

ـ خۆشم دەویست، ئەویش منی خۆش دەویست. بەڵام دایکی ڕازی نەبوو، بۆیە لەگەڵ کچێکی تر زەماوەندی کرد. ئێستا لە نزیك ئێمە دەژی، زۆر جار دەیبینم. پێموایە بیریشت لێنەدەکردەوە کە ماجەرایەکی ئاشقانەم هەبێ؟ ـ ئەوەی گوت و ڕوخسارە جوانەکەی خوێنێکی گەرمی تێگەڕا کە کیتی سەردەمێك خۆی هەستی پێکردبوو و ئێستا دەتگوت ئەو ئاوری ئەوینە لە دڵی خۆیدا دەگرێ و خەریکە وجوودی ڕووناك دەکاتەوە.

ـ چۆن بیرم لێنەدەکردەوە؟ ئەگەر من پیاو بوایەم دوای دیتنی تۆ نەمدەتوانی هیچ ژنێکی ترم خۆش بوێ. من تێناگەم ئەو کوڕە چۆن توانیی گوێ بە قسەی دایکی بدا و تۆ لەبیر بباتەوە و بەختەوەریی تۆ زایە بکات. دەبێ زۆر دڵڕەق بێ.

ـ ئەیەڕۆ، نا، نا، ئەو پیاوێکی زۆر باش و ڕەزاسووکە. منیش ئیتر خەمی بۆ ناخۆم، بەپێچەوانە زۆریش بەختەوەرم ـ هەستا بەرەو ماڵێ بڕواتەوە و گوتی: دەی، ئەمڕۆ ئیتر گۆرانی ناڵێین؟

کیتی لە دڵی خۆیدا گوتی: تۆ چەندە دڵێکی باشت هەیە! بەڕاستی کچی چاکی ـ دەستی کردە ملی و ماچی کرد. گوتیشی: خۆزگە بمتوانیبایە تۆزێك لە ئێوە بچم.

ڤارنکا بە زەردەخەنەیەکی شیرین و پڕ ڤیانەوە گوتی: بۆ وەك کەسێکی تر بی؟ هەر وەکوو خۆت بی باشە و تۆش زۆر کچێکی باشی.

ـ نا، من هیچ باش نیم. بەڵام بیڵێ بزانم.... وەرە دانیشین ـ ئەوەی گوت و دیسان لەسەر کورسییەکی پەنای خۆی داینیشاندەوە و گوتی: پێمبڵێ بزانم، کاتێك بیری لێدەکەیتەوە ئەو کەسەی خۆشت ویستووە و بێوەفاییی لەگەڵ کردووی و پشتی لە ئیشقەکەت کردووە، تووشی خەفەت و دڵتەنگی نابی؟

ـ بەڵام ئەو پشتی لە ئیشقەکەم نەکردووە. من دڵنیام خۆشیدەوێم. بەڵام کوڕێکی گوێڕایەڵ بوو، هەر ئەوە.

کیتی کە هەستی دەکرد نهێنیی خۆی ئاشکرا کردووە و روخساری داگیرساو و لە شەرمانا سوورهەڵگەڕاوی رازەکەی دڵی لە هاوار داوە گوتی: بەڵێ، بەڵام ئەگەر ئەو بەقسەی دایکی نەکردایە و بە خواستی خۆی ئەو کارەی بکردایە...

ڤارنکا کە دیاربوو تێگەیشتبوو ئیتر باس لە خۆی نییە و خەم و خەفەتی کیتی لە گۆڕێدایە گوتی: ئەگەر وایدانێین بەڵێ، کارەکەی ناحەز بوو، بەڵام من خەفەتی بۆ ناخۆم.

کیتی گوتی: بەڵام سووکایەتی لەبیرناچێتەوە، نا، سووکایەتی پێکران مەحاڵە لەبیر بچێتەوە. وەبیر خۆی کەوتەوە لە کۆتاییی کۆڕی سەمادا، کاتێك ئورکێستراکە بێدەنگ بووبوو.

ـ بۆ سووکایەتی؟ مەگین تۆ کارێکی خراپت کردووە؟

ـ لە خراپیش خراپتر. کارەکەی من پڕ شوورەیی بوو.

ڤارنکا سەری لەقاند و دەستی لەسەر دەستی کیتی دانا.

گوتی: بۆ؟ بۆچی پڕشوورەیی؟ ئێوە وێناچێ بە پیاوێکتان گوتبێ خۆشمدەوێی کە بێوەفایی لەگەڵ کردبێتی.

ـ بەڵێ نەمگوتووە. قەت، تەنانەت یەك وشەش. بەڵام ئەو دەیزانی. نا، نا، چاو و ئاکاری مرۆڤ هەموو شتێك دەردەخا. نا، ئەگەر سەد ساڵی تریش زیندوو بم لەبیرم ناچێتەوە.

ڤارنکا کە بێزار بوو لە قسە شاردنەوە گوتی: دەی، لەوە زیاتر مەیپێچەوە، چی بووە؟ تێناگەم، کێشەکە چییە، ئێستا خۆشتدەوێ یان نا؟

ـ من لە ئەو بێزارم. بۆیە ناتوانم لەخۆم ببوورم.

ـ بۆ؟ چ تاوانێکت کردووە؟

ـ سووکایەتی، شوورەیی.

ڤارنکا گوتی: پەککوو، ئەگەر هەمووان وەك تۆ دڵناسك بووایەن!... هیچ کچێك نییە هەستی بەو حاڵەی تۆ نەکردبێ. گرینگیش نییە و زۆری گوێ مەدەیە!

کیتی بە سەرسووڕمانێکی پڕ لە کونجکاوییەوە چاوی لە چاوی ڤارنکا بڕی و پرسیی: ئەی چ شتێك گرینگە؟

ڤارنکا زەردەیەکی گرت و گوتی: ئەها، زۆر شت!

ـ بۆ وێنە چی؟

ڤارنکا کە نەیدەزانی چ وەڵامێکی بداتەوە گوتی: ئەها زۆر شتی لەوانە گرینگتر هەیە ـ بەڵام لەوکاتەدا پرێنسس لە پەنجێرەکەوە هەرای کرد: کیتی هەواکەی ساردی کردووە. یان شاڵێك لە سەروملت هاڵێنە، یان وەرە ژووریّ.

ڤارنکا هەستا سەرپێ و گوتی: وایە، ساردە و زۆریش درەنگە، من دەبێ بچم سەرێك لە مادام برێت هەڵێنم. داوای لێکردووم بچم بۆ لای.

کیتی دەستی گرت و بە روانینێکی پڕ لە پاڕانەوە و کونچکاوی و پڕ لە گڕی ئەشقەوە چاوی لە چاوی بڕی. نیگای کیتی دەیپرسی «چی، ئاخەر چ شتێك لەوە گرینگترە؟ چ شتێکە کە ئەو هێمنایەتییە بە ئێوە دەبەخشیّ؟ تۆ دەزانی، پێمبڵێی.» بەڵام ڤارنکا تێنەگەیشت کە نیگای کیتی چیی لەو دەویّ. تەنیا ئەوەی دەزانی کە ئەو شەوە دەبێ بچێت بۆ لای مادام برێت و زوو بگەڕێتەوە بۆ ماڵێ و سەعات دوازدە چایی بدا بە دایەگیانی. گەڕایەوە بۆ ژوورەکە و نۆتەکانی کۆکردەوە و خوداحافیزیی لە هەمووان کرد و رۆیشت.

ئەفسەرەکە گوتی: ئیزن بدە لەگەڵتا بێم.

پرێنسس وتەکەی ئەفسەری راست کردەوە و گوتی: بەڵێ، لەم کاتەی نیوەشەودا بە تەنیا نەڕۆی باشترە. یان لانیکەم بێڵە با پاراشا[111] ـ تان لەگەڵ بنێرم.

کیتی دەیدی کە ڤارنکا، کاتێك گوتیان دەبێ کەسێك لەگەڵیدا بچێت، بە زۆری زەردەخەنەکەی شاردەوە.

---

111- Paracha

ڤارنکا کڵاوەکەی هەڵگرت و گوتی: نا، من هەمیشە بە تەنیا دەڕۆم و هیچ ڕووداوێکیش ناقەومێ ـ جارێکی تریش کیتیی ماچی کرد و بێ ئەوەی پێیبڵێ کە چ شتێك زۆر گرینگە، دەفتەری نۆتەکانی نایە ژێر هەنگڵی، بە هەنگاوی گورج و خێرا لە تاریکوڕوونی شەوی هاویندا دوورکەوتەوە و ئەو ڕازەی کە چ شتێك گرینگە و ئەم هێمنایەتی و دڵفراوانییە ئێرەییهێن و مەزنە لە کوێوەیە، بە پێچراوەیی بردی لەگەڵ خۆیدا.

## سی و سێ

کیتی لەگەڵ خاتوو ئیشتاڵیش نێوانی خۆش کرد و ئەو نێوان خۆشییە و دەستە خوشکبوون لەگەڵ ڤارنکا نەك هەر شوێنێکی باشی لەسەر ئاکاری دانا بەڵکوو یارمەتییەکی بێوێنەش بوو بۆ دامرکانی ئازار و خەمۆکییەکەی. شیفاکەشی هی ئەوەبوو بەهۆی ئەو هاوڕێیەتییەی ڤارنکاوە دنیایەکی تەواو تازە و جیاوازی لە هەمبەر خۆیدا بەدی دەکرد و لەگەڵ دنیای پێشوو هیچ چەشنە وێچوونێکیان نەبوو، دنیایەکی پڕشکۆ و رازاوە. دنیایەکی بەرز، کە دەیتوانی لەوێوە هێمنانە لە رابردووی خۆی بڕوانێ. ئەوەشی بۆ دەرکەوێ کە جگە لە ژیانی خۆماکی کە هەتا ئەو رۆژە زاڵ بوو بەسەر رۆح و دەروونیدا، ژیانێکی پاك و پیرۆزیش هەیە. کە کلیلی ئەو ژیانە لە دیندا بوو، بەڵام ئەم دینە لەگەڵ ئەو دینەی کە لە منداڵییەوە دەیناسی زۆر جیاواز بوو. ئەو دینەی کە ئەو لە رابردوودا دەیناسی بەشداریکردن لە ڕێوڕەسمی نوێژی عەسر و بەیانی بوو لە پەرستگا «ماڵی بێوەژنان». کە دەکرا لەوێ هەموو ناسیاوان ببینی و هەروەها فێربوونی دەقە پیرۆزەکان لەلای قەشەو پیاوانی ئایینی. بەڵام ئەو دینەی کە تازە ناسیبووی زۆر بەرز و پیرۆز و پڕ لە راز بوو، لەگەڵ بیر و هەستی زۆر جوان و پاقژ ئاوێتە کرابوو و بڕوادار بوون بەو دینەش تەنیا بەو هۆیە نەبوو کە وەك فەرزێك بەجێی بێنێ، بەڵکوو لەبەرئەوە بوو کە لە دڵدا خۆشەویستی و ئەشقی دەخولقاند.

کیتی ئەو شتانە لە ڕێگای بیستنەوە فێر نەبوو. مادام ئیشتاڵ وەك جگەرگۆشەی خۆی لەگەڵی دەدوا و دەتگوت وەك دیاردەیەك لە بیرەوەرییەکانی سەردەمی لاویی خۆی، لەلای خۆشەویستە. تەنیا جارێك وریایی پێدا کە ئەشق و ئیمان شیفای تەواوی ژان و ئازارەکانی مرۆڤە و بەڕاستی کیمیای بەختەوەری و سوکناییە و هیچ دڵێك نییە خەم و کۆڤانی تێدا بێ و ئەشقی مەسیح سوکنایی پێنەبەخشێ و نەیلاوێنێتەوە. دوای ئەو دەرس و ئامۆژگارییانە لەڕێوە باسێکی تری دادەمەزراند.

بەڵام کیتی لە هەموو جووڵان و قسەکردن و نیگا ئاسمانییەکەیدا و (کیتی نیگای ئەوی بەو شێوەیە وەسف دەکرد) بەتایبەت لە تەواوی چیرۆکی ژیانی، کە بەهۆی ڤارنکاوە لەگەڵی ئاشنابووبوو، لە هەموو ئەوانەشدا "ئەوەی گرینگ بوو" و هەتا ئەو کاتە لێی بێخەبەر بوو، دەگەیشت.

بەڵام هەرچەند مادام ئیشتاڵ کەسێکی سەربەست و واڵا بوو و چیرۆکی ژیانیشی زۆر تاڵ و دڵهەژێن بوو، قسەکانیشی دڵگر و پیرۆز بوون، بەڵام کیتی بێ ئیختیار لەواندا هێندێ دیاردەی هەڵدەکڕاند کە پەرۆش و خەمباری دەکرد. دیتبووی کە مادام ئیشتاڵ کاتێك سەبارەت بە خزموکەسانی پرسیاری لێدەکا بزەیەکی سارد و پڕسووکایەتی دەنیشێتە سەرلێوی کە لەگەڵ بیری پاکی مەسیح نەدەگونجا. هەروەها دیتبووشی رۆژێك قەشەیەکی کاتۆلیك هاتبوو بۆ دیدەنیی و هەولێدەدا روخساری خۆی لە ژێر سێبەری ئاباژۆر راگرێ و بزەیەکی سەیری لەسەر لێو بوو. ئەم نیشانانە گەرچی زۆر گرینگ نەبوون بەڵام ئەویان تووشی پەرێشانی دەکرد و سەبارەت بە راستی و سەداقەتی مادام ئیشتاڵ تووشی دڕدۆنگی دەبوو. بەڵام ڤارنکای تەنیا و بێکەس و بێهاوڕێ و یاریشی دەدی، کە تاڵی و دڵشکاویی زۆری چەشتووە و هیچ چاوەڕوانییەکیشی لە کەس نەبوو، گلەیی و بناشتیشی لە کەس نەدەکرد، بۆیە ڤارنکا راست ئەو وێنە کامڵ و بێعەیبە بوو کە کیتی لە خولیاو زەینی خۆیدا دایڕشتبوو. بە ناسینی ڤارنکا تێگەیشت کە مرۆڤ پێویستە خۆی لەبیر بکا و خۆنەویست و خەڵکویست بێ تاکوو بە هێمنایەتی و بەختەوەری و رزگاری بگات. بۆیە کیتی حەزی دەکرد وەك ئەو وابێ. ئێستا کە بە روونی بۆی دەرکەوتبوو چی «لە هەموو شتێك گرینگترە» بەوە رازی نەبوو کە تەنیا دڵی پێیشاد بێ و بەڵکوو بە رۆح و گیانەوە خۆی تەسلیمی ئەو ژیانە نوێیە کردبوو. بە ئیلهام وەرگرتن لە وتەکانی ڤارنکا سەبارەت بەو کارانەی کە مادام ئیشتاڵ و خەڵکانی تر دەیکەن گەڵاڵەیەکی بۆ ژیانی داهاتووی خۆی داڕشتبوو. دەیویست وەك ئالین خۆشکەزای مادام ئیشتاڵ کە ڤارنکا بۆی باس کردبوو لە هەرکوێیەك بێ دەتوانێ هەژار و لێقەوماو بدۆزێتەوە و یارمەتییان بدا، ئینجیلیان بەسەردا داڵبەخش بکا و کتێبی پیرۆز بۆ لەشبەباران و تاوانباران و نەخۆش و کەلەلای کاتی گیانەڵڵا بخوێنێتەوە. بیری خوێندنەوەی ئینجیل بۆ تاوانباران وەك ئەو کارەی ئالین دەیکرد، کیتیی هۆگر و شەیدای خۆی کردبوو. بەڵام ئەوانە هەمووی خەیاڵ و نهێنییەك بوون کە کیتی نە لای دایکی باسی دەکرد و نە لەلای ڤارنکای دەستە خوشکی.

لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا هەتا کاتێك کە بتوانێ گەڵاڵەکانی خۆی بە حیسابی دابڕێژێ، هەر لەوێ لەو شارۆچکەی گراوە، کە پڕبوو لە نەخۆش و لێقەوماو دەرفەتی هەبوو بە لاسایی کردنەوەی ڤارنکا رێوو شوێنی تازەی ژیانی خۆی بەرێوەببات.

سەرەتا پرێنسس تەنیا دەیدی کیتی بەجارێ شەیدای خاتوو ئیشتاڵ (ئەو حاڵەتە رۆحییەیی کیتی بە شەیدابوون دەزانی) بووە و لەویش زیاتر رۆح و گیانی لەلای ڤارنکایە. ئەو دەیدی کیتی نەك هەر لە چاکەکاریدا لاسایی دەکاتەوە بەڵکوو بەرێدا رۆیشتن و ئاخافتن و چاوترووکاندیشی بێ ئیختیار وەکوو ئەوی لێهاتبوو. بەڵام پاشان بۆی دەرکەوت کە کچەکەی، جگە لە شەیدایی، گۆڕانێکی بنەوەشی و رۆحیی بەسەردا هاتووە.

پرێنسس دەیدی کیتی شەوانە ئینجیلێکی فەڕەنسی دەخوێنێتەوە کە خاتوو ئیشتاڵ بە دیاری پێیدابوو، ئەوەش شتێك بوو کە پێشتر قەتی پێوە نەدیبوو. دەیدی کە خۆ لە ئاشنایانی کۆڕی خۆیان دەبوێرێ و دەچێتە سەردانی ئەو نەخۆش و کەلەلایانەی کە ڤارنکا یارمەتیی دەدان و بەتایبەت دەچوو بۆ سەردانی بنەماڵەی هەژاری هونەرمەندێك بە ناوی پێترۆڤ. کیتی بە ئاشکرا شانازیی بە خۆیەوە دەکرد کە لەو بنەماڵەیەدا وەك خوشکێکی رۆحانی ئەرکی پەرستاریی خۆی بەجێ دێنێ. ئەوانە هەمووی باش بوون و پرێنسس دژایەتیی لەگەڵیان نەبوو بەتایبەت کە دەیزانی ژنی ئەو پێترۆڤە زۆر مرۆڤێکی باش و هێژایە و پرێنسسی ئەڵمانی کە زانیبووی کیتی هۆگری ئەو چاکەکاری و مرۆڤدۆستییە بووە و بەگیان و بە دڵ لەو پێناوەدا هەوڵ دەدا، زۆری کارەکەی بەدڵ بوو و ئەوی ناو نابوو «فریشتەی دڵنوایی». ئەوانە هەموو باش بوون بەشەرتێك تەلاسی تێدا نەبێ.

بە زمانی فەڕەنسی پێیگوت: ***تەلاس لە هیچ کارێکدا باش نییە.***

بەڵام کچە بە گوێی نەدەکرد. لە دڵیدا دەیگوت لە رێگای مەسیحدا هەر کارێك بکەی تەلاس و زێدەڕەوی نییە. بۆ پێڕەوی لە فێرکارییەکانی مەسیحدا کە دەڵێ «هەرکەس زللەی لە لایەکی روومەتت دا، ئەو لایەی تریشی بۆ راگرە با لێی دا، هەرکەسێکیش شەڕی لەگەڵ کردی و یەخەی کەواکەی گرتی کەواکەی بۆ داکەنە و پێشکەشی بکە.» چ تەلاس و زێدەڕەوییەکی تێدایە؟ بەڵام پرێنسس ئەو زێدەگاڤییەی بەدڵ نەبوو و زیاتر لەوە ناڕەحەت بوو کە هەستی دەکرد کیتی نایهەوێ سفرەی دڵی خۆی بۆ بکاتەوە. بەڕاستی هەرواش بوو کیتی فکر و هەستە تازەکانی لە دایکی دەشاردەوە، بەڵام ئەو نهێنیکارییەش بەوهۆیە نەبوو کە رێز بۆ دایکی دانەنێ یان خۆشینەوێ، بەڵکوو تەنیا لەبەرئەوەی دایکی بوو. ئەو نهێنییانەشی لەلای هەمووکەس دەدرکاند جگە لە دایکی.

جارێك پرێنسس سەبارەت بە خاتوو پێترۆڤا گوتی: ماوەیەکە ئیتر ئانا پاولۆڤنا هیچ سۆراغێکمان لێناگرێ، بۆیە بانگهێشتنم کرد، بەڵام وادیارە برێك زویربووە.

کیتی سوورهەڵگەڕا و لە وەڵامدا گوتی: نا، دایەگیان، پێموانییە وابێ.

ـ لەمێژە نەچووی بۆماڵیان؟

کیتی وەڵامی دایەوە: بڕیار وایە سبەینێ بچین بۆ گەڕان لە چیا.

پرێنسس گوتی: چاکە، بچن، کارێکی خراپ نییەـ بە وردی سەرنجی روخساری کچەکەی دا و هەوڵی دا هۆی پەرۆشییەکەی بۆ دەرکەوێ.

هەر ئەو رۆژە ڤارنکا بۆ نانی نیوەڕۆ هات بۆ ماڵی ئەوان و هەواڵی پێدان کە ئانا پاولۆڤنا پەشیمان بۆتەوە و نایە بۆ کێو. پرێنسس تێگەیشت کە کیتی دیسان سوورهەڵگەڕا.

کاتێك دووبەدوو مانەوە پرێنسس گوتی: کیتی، لە نێوان تۆ و بنەماڵەی پێترۆڤدا کێشە و دەمەقاڵێیە، شتێ رووی نەداوە؟ بۆ خاتوو پێترۆڤا منداڵەکانی نانێرێ بۆ ئێرە؟

کیتی وەڵامی دایەوە کە هیچ کێشەیەك لە نێوانیاندا رووی نەداوە و تێناگا بۆچی ئانا پاولۆڤنا دڵی لێی زویربووە. کیتی راستی دەکرد. هۆی ئەو گۆڕانەی پاولۆڤنای نەدەزانی بەڵام شکی بۆ شتێك دەچوو. بیری بۆ شتێك دەچوو کە نەیدەتوانی بە دایکی بڵێ، شتێك کە تەنانەت لە دڵی خوشیدا نەیدەدرکاند. ئەوەش یەکێك لەو شتانە بوو کە مرۆڤ دەیزانێ بەڵام ناوێرێ تەنانەت لەلای خۆشی دادانی پێدا بنێ، چونکە بۆچوونی خراپ و خەتاکارانە بەڕاستی ترسناك و پڕ شوورەییە.

زۆر جاریش پێوەندیی خۆی لەگەڵ ئەو بنەماڵەیە لێکدابۆوە و لە زەینیدا بێنەوبەرەی پێکردبوو. شادیی ساویلکانەی ئانا پاولۆڤنای وەبیردەهاتەوە و بە دیتنی بۆی دەردەکەوت کە ژنێکی باش و دڵپاکە، هەروەها دەمەتەقێ نهێنییەکانیان کە سەبارەت بە نەخۆش و گێڕانەوەی لە کار، کە پزیشك بە زیانباری دەزانی و هەروەها بردنی بۆ گەشت و گەڕان و بە یادی چکۆلەترین کوڕیان کە زۆری خۆشدەویست و پێیدەگوت «کیتیی خۆم» و بەبێ ئەو نەدەچووە نێو جێگاوبانەکەیەوە. ئەو کاتانە هەموو شتێك چەندە باش بوو. پاشان روخساری زۆر رەقەڵە و داڵگۆشتی پێترۆڤ و ملە درێژ و رێدنگۆتە قاوەییەکەی وەبیرهاتەوە و قژە تەنك و لوول و پێچپێچەکەی و چاوە شین و پڕ شانسەکەی کە سەرەتا ترسی دەخستە دڵەوە و نەخۆشانە هەوڵی دەدا و دەیویست لە حوزووری ئەودا خۆی گورجوگۆڵ و بەنەشە نیشان بدات. هەوڵە سەرەتاییەکانی خۆشی وەبیرهاتەوە کە دەیویست بەسەر رق و نەفرەتی خۆی دەرهەق بە ئەو و هەموو سیلدارەکاندا زاڵ بێ و حەول و لەخۆ نووسانی بۆ ئەوەی قسەیەك بدۆزێتەوە و لەگەڵ ئەوا بیهێنێتە گۆڕێ. نیگای پڕ لە شەرم و لێوڕێژ لە دلۆڤانیی ئەوی وەبیردەهاتەوە و هەستی هاودەردی و شێواویی خۆی و هەروەها ئاگاداربوون لە چاکەکارییەك کە لەوکاتەدا لە

دڵیدا دەگوورا. ئەمانە زۆر باش بوون! بەڵام هەموو ئەوانە سەرەتای کار بوون، ئێستا چەند ڕۆژێك بوو کە ئەم بارودۆخە بەجارێ شێوابوو. ئانا پاولۆڤنا لە هەنتەشی ئەودا کردەوەی سادقانەی خۆی لەبیر چووبۆوە و چاوی لەسەر ئەو و مێردەکەی هەڵنەدەگرت.

بڵێی شادی و نەشەی کابرای نەخۆش بەهۆی دیتنی ئەوەوە بووبێتە هۆی زویربوونی ئانا پاولۆڤنا؟

کیتی وەبیری هاتەوە کە: دوو ڕۆژ لەمەوبەر کاتێك ئانا پاولۆڤنا بە زیزی و خەمباری گوتبووی «فەرموون»، هەر چاوەڕوانی تۆیە. بەبێ تۆ حەز ناکا قاوەکەشی بخواتەوە، بەڵام نازانی چەند شەکەت و لاوازە.» لەبز و راوێژی شتێکی نائاساییی پێوە دیاربوو کە لەگەڵ دڵپاکییەکەی سازگار نەبوو.

«بەڵێ، ڕەنگە لەوەش ڕەنجابێ کە من بەتانیم دا بەسەر لاقوقولی مێردەکەیدا و بە جوانی تێوەم پێچا. ئەو کارەی من زۆر ئاسایی بوو. بەڵام مێردەکەی ئەو کارەی منی بەلاوە پەسند نەبوو و هێندەی سپاس لێکردم کە هەستم بە شەرمەزاری کرد. پاشان تابلۆیەکی لە سیمای من کێشایەوە کە زۆر چاك دەرهات و لە هەمووشی گرینگتر روانینەکانییەتی کە زۆر پەرێشانە و لێوڕێژە لە خۆشەویستی.» کیتی بە ترسەوە لە دڵی خۆیدا دووپاتی کردەوە «بەڵێ، بەڵێ، هەروایە. نا، ئاوا نابێ. نابێ بهێڵم.» پاشانیش دیسان بەخۆی گوت «ئەو زۆر بێچارەیە!»

ژاراوی ئەو دڕدۆنگییە شیرینی و شکۆی ژیانە تازەکەی ڕموودە کرد.

## سی و چوار

پرێنس ئیشچر باتسکی بەرلەوەی ماوەی مانەوەیان لە شارۆچکەی گەرمکاو کۆتایی پێبێ ڕۆیشت بۆ سەردانی یەکێك لە ئاشنا رووسەکانی لە کارلسباد چوو بۆ بادێن[112] و کێسینگێن[113] تاکوو خۆی گوتەنی ڕۆحی رووس پاشەکەوت بکات، پاشان گەڕایەوە بۆ لای کەسەکانی.

بیروڕای پرێنس و پرێنسس سەبارەت بە ژیانی هەندەران بە تەواوی دژییەك بوون. پرێنسس هەموو شتێکی بیانییەکانی بە باش دەزانی و ئەگەرچی لە کۆمەڵگای رووسدا خاوەن

---

112- Baden

113- Kissingen

پێگەیەکی بەرز بوو، هەوڵی دەدا لە دەرەوەی وڵات وەك خاتوونێکی ئەورووپی بێتە ئەژمار و نەدەکرا، چونکە خاتوونێکی رووسی بوو و هەر بەو هۆیەش ئاکاری ناسروشتی بوو و هێندێ جار دەبووە هۆی پەرێشانی و دەستوپێ تێکەڵهاتنی. پرێنس بەپێچەوانەی ئەو لە دەرەوەی وڵات هەموو شتێکی بەلاوە ئاڵۆز و نالەبار بوو و هەڵسوکەوت و دابونەریتی ئەورووپییەکانی نەدەکەوتە بەردڵ. خوخدەی رووسیی خۆی پاراستبوو و بەقەستی هەوڵی دەدا لە هەندەران کەمتر لەوەی کە بەڕاستی هەبوو ئەورووپایی بنوێنێ.

پرێنس، کزو لاواز، روومەتی چرچولۆچ و بەرخەبەبەی داکەوتوو، بەڵام زۆر شاد و بەنەشە لە سەفەر هاتەوە و کە دیتی کیتی بە تەواوی چاك بۆتەوە و عەلەمی لێبڕاوە، ئەوەندەی تر شادی و خۆشی دایگرت. خەبەری هاوڕێیەتیی کیتی لەگەڵ خاتوو ئێشتاڵ و ڤارنکا و گۆڕانێك کە بە وتەی پرێنسس لە جەستە و رۆحی کچەکەیاندا پێکهاتبوو، وەك کەمەی کەوان وێکی هێنا و ئەو ترسەی کە سەبارەت بە هەمووشتێك لە رۆح و مێشکیدا بوو ئێستا وەك کارگ هەڵتۆقی، ئەو بە هیچ شێوەیەك حەزی نەدەکرد کچەکەی لێی دوور بکەوێتەوە و ترسێك دایگرتبوو کە نەکا کچەکەی لە بازنەی دەسەڵاتی ئەو بچێتە دەرێ و نەتوانێ کۆنترۆڵی بکات. بەڵام ئەو خەبەرە ناخۆشانە لە دەریای تەندروستی و شادی و نەشە هەمیشەییەکەی کە ئێستا بە هۆی بەرەکەتی گەرماوە گڕاوەکانی کەرلسبادەوە باشتر خۆی دەنواند، نوقم بوون.

پرنس رۆژی دوای گەڕانەوەی، بە باڵتەی درێژ و چرچولۆچی روخساری رووسییانە و بەرخەبەبەی شۆڕەوە کە کەوتبووە سەر ملیوانەی شەق و رەقی کراسەکەی، شاد و بەدەماخ لەگەڵ کچەکەی رۆیشت بۆ سەرچاوەی گڕاوەکە.

بەیانی هەوا خۆش بوو. هەتاو گەش و لێو بەبزە و ماڵەکان خاوێن و نەشەبزوێن و باخچە و حەوشەکانیان پڕ لە گوڵ و رازاوە، دیتنی ژنانی خزمەتکار بە کولمەی سوور و قۆڵ و مەچەکی ناسکی ئەڵمانییەوە کە تێریان بیرە خواردبۆوە و رووخۆش و دەم بە پێکەنین خەریکی کاری خۆیان بوون شادییان لە دڵان دەگێڕا. بەڵام هەتا لە سەرچاوەکانی گڕاو نزیك دەبوونەوە تووشی نەخۆشی زیاتر دەبوون، کە ئەدگاریان لە ژینگەی ئاڵمانیدا کە نەزم و رێکوپێکی مسوگەر و بەپێی باوی شوێنەکە شتێکی ئاسایی بوو، هەموو خەمبارتر و چاو بە گریانتر دەهاتنە بەرچاو. ئەو دژوازییە زۆر نەدەهاتە بەرچاوی کیتی. هەتاوی پڕشنگدار و درەوشانەوەی چیمەن و سەوزایی و زایەڵەی مۆسیقا و چوارچێوەی سروشتیی روخسارە ئاشناکان و هەروەها گۆڕانی حاڵی ئەو نەخۆشانە کە یان بەرەو چاکبوونەوە دەچوون یان کەلەلا

و نەخۆشتر کەوتبوون، لە بەرچاوی کیتی جوانی دەنواند. بەڵام لەبەر چاوی پرێنس درەوشانەوە و پڕشنگی ئەو بەیانییەی هاوین و ئاواز و زایەڵەی ئۆرکێسترا کە هەوای والسی دەژەنی و باوی رۆژ بوو، بەتایبەت دیتنی ژنانی خزمەتکار کە قیتو قۆز و لەشساخ لە پاڵ ئەو مردووە بزۆکە خەماژۆیانەدا دەگەڕان کە لە هەموو ناوچەکانی ئەورووپاوە هاتبوون و لەوێ کۆ بووبوونەوە، زۆر دزێو و ناخۆش بوو.

لەگەڵ ئەوەشدا هەستی لەخۆبایی بوون و بە چەشنێك جحێڵبوونەوەی بەخۆیەوە دەدی کاتێك لەگەڵ کیژە جگەرگۆشەکەی قۆڵیان لە قۆڵی یەك خستبوو هەنگاویان دەنا. ئێستا وەك ئەوە دەچوو کە بە هۆی چوونە سەری تەمەن و ئاکاری خۆڕاگرانە و قەڵافەتی زەلام و بەهێزی خۆیەوە ناڕەحەت بێ و هەست بە شەرمەزاری بکات و هەستی وەك هەستی کەسێك وابوو کە بە رووتی چووبێتە نێو کۆڕ و کۆبوونەوەیەك.

باسکی کچەکەی بە هەنیشکی خۆیەوە گوشی و گوتی: من بە هاوڕێیانت بناسێنە. من ئێستا ئیتر تەنانەت ئەو چاوەی گڕاوە گازدار و گەناوەشم خۆش دەوێ چونکە بۆتە هۆی چاکبوونەوەت. حەیفێ ئێرە زۆر ناخۆشە و پیاو تووشی دڵتەنگی دەکا. ئەوە کێیە؟

کیتی ناوی هەموو ئاشنا و نائاشناکانی پێگوت کە لەوێوە تێدەپەڕین. راست لەبەر دەرگای چوونە ژوورەوەی باخەکە تووشی خاتوو بێرێت بوون کە نابینا بوو و ژنێکی تر دەستی گرتبوو و بووبووە چاوساغی، پرێنس کە دیتی بە بیستنی دەنگی کیتی شوێنەواری خۆشەویستی لە روخساری پیرێژنی فەڕەنسیدا وەدیار کەوت، زۆر خۆشحاڵ بوو. ژنە کوێرە هەر خێرا بە مێهرەبانییەکی لەڕادەبەدەر و تایبەتی فەڕنسییانەوە لەگەڵی کەوتە قسە و پیرۆزبایی لێکرد کە کچێکی ئاوا رۆحسووك و مێهرەبانی هەیە و هێندەی تاریف کرد و شووتیی نایە بن هەنگڵی، سەری گەیاندە ئاسمان. گوتیشی کە ئەو کچە خەزێنەی مرواری و گەوهەرە و فریشتەی دڵخۆشی و دڵدانەوەیە.

پرێنس بە پێکەنینەوە گوتی: کەوایە دەبێ فریشتەی ژمارە دوو بێ، چونکە ئەو مادموازێڵ ڤارنکا بە فریشتە دەزانێ.

مادام بێرێت وتەکەی ئەوی سەلماند: ئەرێ! مادموازێل ڤارنکا هەر باسی مەکە ، بەڕاستی ئەو فریشتەیەکی راستەقینەیە و ***قسەی لەسەر نییە.***

کە گەیشتنە نێو بازاڕ تووشی ڤارنکا بوون. بە هەڵەداوان دەهات بۆ لای ئەمان و کیسەیەکی سووری جوانی بەدەستەوە بوو.

کیتی گوتی: خاتوو ڤارنکا، ئەوە باوکمە، ئەمڕۆ هاتەوە.

ڤارنكا بە شێوەیەكی سروشتی و زۆر ئاسایی، وەكوو هەموو كارەكانی، سەری داخست و كڕنۆشێكی كرد، هەر خێراش بە شێوەیەكی خۆمانە وەك چۆن لەگەڵ هەمووان دەدوا، لەگەڵ پرێنس كەوتە قسەكردن.

پرێنس بە پێكەنینەوە گوتی: من ئێوە دەناسم، زۆر باشیشتان دەناسم ـ كیتی بە پێكەنینی باوكیدا تێگەیشت كە هاوڕێكەی ئەوی كەوتۆتە بەردڵ، بۆیە خۆشحاڵ بوو. پرێنس درێژەی بە قسەكانیدا: ئاوا بەپەلە بۆكوێ دەچیێ؟

ڤارنكا رووی لە كیتی كرد و گوتی دایەگیانم لێرەیە. دوێشەو هەتا بەیانی خەو نەچۆتە چاوی و دكتۆر پێیگوتووە بێتەدەرێ. ئێستاش كاردەستییەكەی بۆ دەبەم.

كاتێك ڤارنكا ڕۆیشت پرێنس گوتی: دەی، كەوایە ئەوە فریشتەی ژومارە یەك بوو.

كیتی تێگەیشت كە باوكی دەیهەوێ گاڵتە بە ڤارنكا بكا بەڵام ناتوانێ، چونكە ڤارنكا بەجارێ جێی خۆی لە دڵی باوكیدا كردبۆوە.

پرێنس گوتیشی: دەی، ئێستا چاومان بە هەموو ئاشناكانت دەكەوێ، مادام ئێشتاڵیش دەبینین، هەڵبەت ئەگەر بە شیاومان بزانێ.

كیتی كە دیتنی لەگەڵ هێنانی ناوی مادام ئێشتاڵ پزیسكی رشقنجاری لە چاوی باوكیدا بریقەی هات، بە ترسەوە پرسیی: مەگین تۆ مادام ئیشتاڵ دەناسی؟

ـ مێردەكەیم دەناسی، خۆشی تاڕادەیەك، هەڵبەت بەر لەوەی بچێتە ریزی ژنانی پیتیستەوە.

كیتی بە ترسەوە و هەروەها رێزێكی زۆر كە بۆ مادام ئێشتاڵ هەیبوو و ئێستا بیستی كە ناوێكی وای هەیە پرسیی: ژنانی پیتیست كێن باوەگیان؟

ـ خۆشم بە باشی نازانم. تەنیا دەزانم ئەو بۆ هەموو چارەڕەشییەكانی شوكری خودا دەكات، تەنانەت كاتێك كە مێردەكەشی مرد شوكری خودای كرد. بەڵام ئەوە زۆر كارێكی قۆڕیش نییە، چونكە ئەوان پێكەوە ژیانێكی تاڵیان هەبوو.

پرێنس بە دیتنی نەخۆشێكی قولەبنە كە لەسەر كورسیلەیەك دانیشتبوو و باڵتەیەكی قاوەیی لەبەردا بوو و پانتۆڵێكی سپیی لەپێ كردبوو و لاقە رەقەڵەكانی چرچولۆچی سەیری تێكەوتبوو، گوتی: ئەوە كێیە؟ چ روخسارێكی داماو و كلۆڵی هەیە.

كابرا كڵاوە حەسیرییەكەی لەسەر قژە تەنك و لوول و ئالۆزەكەی لابرد و نێوچاوانە پانەكەی كە كڵاوەكە سووری هەڵگێڕابوو و نیشاندەری نەخۆشی بوو وەدیار كەوت.

کیتی سوورهەڵگەڕا و گوتی: ئەوە پیّترۆڤە، وێنەگەرە- پاشان ئانا پاولۆڤنای پیشاندا کە دەتگوت بەقەستی، راست لەوکاتەدا کە ئەوان نزیکبوونەوە رۆیی بە شوێن منداڵەکەیدا کە دوورکەوتبۆوە و گوتی: ئەوەش ژنەکەیەتی.

پرێنس گوتی: چەن داماوە! بەڵام خوێنشیرینە! بۆ نەچووی بۆ لای؟ پێموا دەیویست شتێك بڵێ.

کیتی بڕیاردەرانە گەڕایەوە و گوتی: کەوایە با بچین بۆ لای.

ڕۆیشتن بۆ لای و لە پیّترۆڤی پرسی: ئەمڕۆ حاڵتان چۆنە؟

پیّترۆڤ هێزیدایە سەر گۆچانەکەی و هەستا سەرپێ، شەرمنانە چاوێکی لە پرێنس کرد.

پرێنس گوتی: ئەوە کچی منە. ئیجازە بفەرموون پێکەوە ئاشنابین.

کابرای وێنەگەر سەری داخست و زەردەیەکی گرت، بە جۆرێك کە ددانە سپییەکانی وەدیار کەوتن. رووی لە کیتی کرد و گوتی: ئێمە دوێنێ چاوەڕوانی ئێوە بووین.

پرێنسس ئەوەی گوت و لاتراسکەیەکی بەست خەریکبوو بکەوێ بەڵام دیسان جووڵانەکەی دووپاتکردەوە و دەیویست وا نیشان بدا کە لاتراسکە بەستنەکەی بە ئانقەست بووە.

ـ من دەمویست بێم بەڵام ڤارنکا گوتی کە ئانا پاولۆڤنا کەسێکی ناردووە و گوتوویێتی ئێوە پاشگەز بوونەتەوە.

پیّترۆڤ سوورهەڵگەڕا و کەوتە کۆخین، لەگەڵ ئەوەی چاوی بە دوای ژنەکەیدا دەگێرا گوتی: چۆن پاشگەز بووینەتەوە؟ـ بە دەنگی بەرز بانگی لە ژنەکەی کرد: ئانتا، ئانتاـ رەگی لاملە باریکەکەی هەستابوو و دەتگوت کەندرە.

ئانا پاولۆڤنا هات.

پیّترۆڤ کە دەنگی دەرنەدەهات لەبەر رقهەستاوی سیخەی سینگی دەهات بە دەنگێکی نەخۆشەوە پرسیی: تۆ بۆ ناردووتە بە پرێنسس بڵێن ئێمە نایەین بۆ سەیران؟

ئانا پاولۆڤنا بە بزەیەکی ساختەوە کە لەگەڵ ئاکاری پێشووی زۆر ناسازگار بوو گوتی: سڵاو، پرێنسس! ـ پاشان رووی کردە پرێنس و گوتیشی: خۆشحاڵم بە ئاشنایەتیتان. ماوەیەکە چاوەڕوانی هاتنی ئێوەین.

وێنەگەر بە دەنگێکی گڕەوە دیسان وەك ئەوەی سرتە بکا و بە لەبزێکی تووڕە و ئاڵەتیبیانەوە دووپاتی کردەوە: بۆ ناردووتە بە پرێنسس بڵێن کە ئێمە نایەین بۆ سەیران، ـ دیاربوو لەوەی کە دەنگی دەرنایە و ناتوانێ بەو لەبزەی کە دەخوازێ، قسەکەی دەربڕێ، زیاتر رقی هەستاوە و خەریکە لە دین دەردەچێ.

ژنە بە ناقایلییەوە وەڵامی دایەوە: ئاخ، خودایە، پێم وابوو ناچین.

ـ چۆن، کاتێك کە... ـ بەڵام دیسان کەوتە کۆخین و دەستی راتەکاند.

پرێنس بە نیشانەی خوداحافیزی کڵاوەکەی لەسەری داگرت و رۆیشت. هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و گوتی: ئاخ، ئاخ... داماوانە!

کیتی گوتی: بەڵێ، باوەگیان. دەزانی سێ منداڵیان هەیە. نە خزمەتکارێکیان هەیە و نە داهاتێك. مووچەیەکی زۆر کەم لە ئاکادێمی وەردەگرێ ـ ئەوەی دەگوت و هەوڵی دەدا بەسەر ئەو هەیەجانە رۆحییەیدا زاڵ بێ کە لە دوای قسەکانی ئانا پاولۆڤنا دەروونی داگرتبوو.

ـ ئا، ئەوەش مادام ئێشتاڵ! ـ ئاماژەی بە عارەبانەیەکی چکۆڵە کرد کە لە نێویدا شتێکی تێدابوو نەدەزانرا چییە و پەڕۆیەکی شینیان بەسەردا کێشابوو و لە نێو بالیفی ژێر چەترەکەدا کەوتبوو.

ئەو شتە شینە خاتوو ئیشتاڵ بوو. لە پشت سەریشییەوە خزمەتکارێکی زەبەلاح و کانێس ئەستوور دانیشتبوو و عارەبانەکەی لێدەخوڕی. لە پاڵ عارەبانەکەشدا کێنتی سویدی بە قژی زێڕینەوە راوەستابوو کە کیتی بەناو دەیناسی. هێندێك لە نەخۆشەکان لە پەنا عارەبانەکە هەنگاویان خاو دەکردەوە و وەك ئەوەی شتێکی سەیریان دیبێ لەو خاتوونەیان دەڕوانی.

پرێنس رۆیشت بۆ لای. کیتی لەڕێوە پزیسکی تیتاڵ و رشقنجاریی لە چاوی باوکیدا دی و خەم دایگرت. پرێنس لە مادام ئیشتاڵ نزیکبۆوە و بەوپەڕی رێز و ئەدەبەوە و بە زمانی شیرینی فەڕەنسی و بە شێوەیەکی زۆر پاراو، کە لەو سەردەمەدا تاقمێکی زۆر کەم بەو شێوەیە قسەیان دەکرد، لەگەڵیدا کەوتە ئاخافتن.

کڵاوەکەی لەسەری داگرت و بێ ئەوەی دیسان بیکاتەوە سەری گوتی: نازانم منت وەبیردێتەوە یان نا، بەڵام من واچاکە خۆم لە حوزووری ئێوەدا بناسێنم و وەبیرتانی بێنمەوە و سپاستان بکەم کە دەرهەق بە کچەکەم ئەو هەمموو گەورەییەتان نواندووە.

مادام ئیشتاڵ چاوە شینەکانی هەڵێنا و سەری بۆ لای ئەو بەرزکردەوە، شێوەی روانینەکەی جۆرێك بوو کە کیتی شوێنەواری زیزی و نارەزاییی تێدا بەدی کرد، گوتی: پرێنس ئەلکساندر ئیشچر باتسکی، زۆر خۆشحاڵم بە دیتنتان. نازانی چەندەم ئەو کچەتان خۆش دەوێ.

ـ هێشتا هەر ناساخی؟

مادام ئیشتاڵ گوتی: ئیتر خووم پێگرتووە. پاشان پرێنسی بە کێنتی سویدی ناساند. پرێنس پێیگوت: بەڵام وادیارە ئێوە هیچ نەگۆڕاون. دە دوازدە ساڵێك دەبێ کە شانازیی زیارتتانم نەبووە.

ـ خودا که خاچی له کولْ ناوین توانایی ئەوەشی پێ عەتا کردووین که بتوانین هەڵیگرین. مرۆڤ زۆر جار تووشی سەرسوورِمان دەبێ که بۆچی زیندووه...ـ به ناقایلی رووی له ڤارنکا کرد که بەتانییەکەی به باشی له دەوری لاقوقولی نەپێچابوو، گوتی: لەملایەوه...

پرێنس به زەردەخەنەوه وەڵامی دایەوه: رەنگه بۆ درێژەپێدانی چاکەکاری...

خاتوو ئیشتاڵ که حاڵەتی روخساری پرێنس له چاوی شاراوه نەبوو گوتی: داوەری کردن لەسەر کاره خراپ و باشەکانمان به دەست ئێمه نییه ـ رووی قسەی له کێنتی لاو بوو گوتی: دەی، کێنتی خۆشەویست ئەو کتێبەم بۆ دەنێری؟ زۆریشتان سپاس دەکەم.

پرێنس که چاوی به ئەفسەری رووسی کەوت لەوێ راوەستابوو، به خۆشحاڵییەوه گوتی: ئاخ، سەرهەنگ! ـ به کرِنۆشێك خوداحافیزی له خاتوو ئیشتاڵ کرد و لەگەڵ کچەکەی و سەرهەنگ که لەگەڵیان یەککەوتبوو دوورکەوتنەوه.

سەرهەنگ که ئاشنایەتییەکی ئەوتۆی لەگەڵ خاتوو ئێشتاڵ نەبوو و نەدەکەوته بەر دڵیشی بەقەستی گاڵته پێکردن گوتی: دیتووته پرێنس، ئەوەش نەجیمزادانی ئێمه!

پرێنس گوتی: هێشتاش هەروەك خۆیەتی.

ـ ئێوه بەر له نەخۆشییەکەی دەتانناسی؟ یانی بەرلەوەی گردەنشین بێ؟

پرێنس گوتی: بەڵێ کاتێك که له پێ کەوت من لەگەڵی ناسیاویم هەبوو.

ـ دەڵێن ده ساڵه لەجێی خۆی هەڵنەستاوه.

ـ هۆی ئەوەیه لاقی زۆر کورته. ژنێکی زۆر ناشیرین و ناقۆڵایه.

کیتی به نیشانەی نارِەزایەتی دەنگی هەڵبرِی: باوەگیان، بۆ قسەی وا دەکەی؟

پرێنس گوتی: ئازیزەکەم، ئەوه قسەی بەدوێژ و زمانشرِانه. بەڵام دیتت چۆن به گژ ڤارنکای تۆدا هات! پەککوو، له دەست کاتێك که ئەو ژنه قۆرِەدەماخانه نەخۆش دەکەون.

کیتی دیسان نارِەزایەتیی دەربرِی: دەواز بێنن، باوەگیان! ڤارنکا ئەوی له رۆح و گیانی خۆشتر دەوێ. جگه لەوەش نازانن چەنده مرۆڤێکی خێرخوازه. له هەر کەسێکت پێخۆشه بپرسه. هەمووان ئەو و ئالین ئیشتاڵ دەناسن.

پرێنس قۆڵی کچەکەی گوشی و گوتی: رەنگه وابێ و گومانی تێدا نییه. بەڵام واباش بوو کاری خێر جۆرێك بکەن که هیچ کەس نەزانێ.

کیتی وەڵامی نەدایەوه. بەڵام نەك ئەوەی که وەڵامێکی نەبێ بیداتەوه بەڵکوو لەبەرئەوەی فیکره نهێنییەکانی خۆی تەنانەت بۆ باوکیشی نەدرکێنێ. بەڵام سەیرەکەی لێرەدابوو که کیتی

سەرەڕای ئەوەی خۆی بە تەواوی ئامادەکردبوو کە پێڕەوی لە بیروڕای باوکی نەکا و نەهێڵێ بێتە نێو هەرێمی پیرۆزی بیروباوەڕ و بیرۆکەکانییەوە، هەستی دەکرد کە وێنەی پاك و پیرۆزی خاتوو ئیشتاڵ کە مانگێکی رەبەق لە گیانی خۆیدا پاراستبووی، بزر بووبوو و نەدەهاتەوە. وەك هێنانە بەرچاوی شکڵی لیباسێك کە بکەوێتە سەر زەوی پیاو لە زەینی خۆیدا سازی دەکات، کە لە شکڵەکەی ورد دەبێتەوە لەبەر چاوی ون دەبێ. ئەوەی مایەوە ژنێکی قوڵەبنە بوو کە تەنیا بەو هۆیە گردەنشین بووە چونکە ناحەز و نالەبارە و ڤارنکای بەستەزمان رووشکێن دەکا، چونکە بەتانییەکەی بە جوانی لە لاقوقولی نەپێچاوە. هەرچەندیش توانایی خەیاڵی خۆی دەبردە سەرێ و هەوڵی دەدا نەیدەتوانی مادام ئێشتاڵی رابردوو بهێنێتەوە بۆ دڵی خۆی.

## سی و پێنج

شادی و نەشەی پرێنس کچ و ژنەکەشی گرتەوە و شوێنی لەسەر ناسیاوان و تەنانەت پیاوە ئاڵمانییەکەی خاوەن ماڵێشیان دانا.

پرێنس کاتێك لەگەڵ کیتی لە سەرچاوەی گراو گەڕانەوە سەرهەنگ و ڤارنکا و ماریا یۆگنییۆڤنای بانگهێشتن کرد بۆ مەیلکردنی قاوە و فەرمانی دا کە مێز و کورسی بەرنە نێو باخچەکە و سفرەی قاوەلێتوون لەوێ راخەن، گەشانەوە و رووخۆشی و نەشەکەی جۆرێك بوو کە خاوەن ماڵ و خزمەتکارەکانیشی وەنەشە خستبوو. هەموو دەیانزانی کە پرێنس زۆر دەستودڵباز و میوانخۆشەویستە و نیو سەعات نەگوزەرا کە پزشکێکی نەخۆشی هامبۆرگی کە لە نهۆمی سەرووی ماڵەکەیان دەژیا بە عەزرەتەوە چاوی لەو کۆڕە رووسییە بەدەماخ و تەندروستە دەکرد کە لەژێر داربەڕووە گەورەکە کۆ بووبوونەوە. پرێنسس کە سەروقژی بە تۆڕ و قردێلە رازاندبۆوە و لە سووچی مێزێك کە سفرەیەکی زۆر سپی لەسەری راخرابوو و قاوە و نان و کەرە و پەنیر و گۆشتی ساردی نێچیر لە سەری چندرابوو، لەژێر دارێك و سێبەری لەرزانی گەڵاکانی دانیشتبوو و پەرداخی قاوە و نانی نقیشك پێداساوراوی بە هەموان دەدا. لەوسەری تری مێزەکەش پرێنس دانیشتبوو و بە ئیشتیا نانی دەخوارد، بە دەنگی بەرز قسەی دەکرد و قاقای دەکێشا و هەموانی وەپێکەنین دەخست. ئەوەی کڕیبووی لە پەنا خۆی بڵاوی

کردبوونەوە: مجریی جوان و دارینەی کەندەکاری کراو، بیریۆلکی[114] و چەقۆی پاکەت کەرەوە بە شکڵ و شێوەی جۆراوجۆر، دەچووە هەر شارێك کە سەرچاوەی گڕاوی لێبوو، بڕێکی لەو کەلوپەلانە دەکڕی و دەیدا بە هەمووان، بەتایبەت خاوەن ماڵەکەی و لیزشێن[115] کە خزمەتکاری بوو، بە ئاڵمانییەکی سەروپێ شکاو گاڵتەی لەگەڵ دەکردن و خاترجەمی دەکردن کە کیتی بەهۆی تایبەتمەندیی ئەو ئاوی گڕاوە چاك نەبۆتەوە، بەڵکوو پەرجۆی خۆراك و چێشتە خۆشەکانی ئەو و بەتایبەت سووپی هەڵووچەکەی شیفای پێداوە. پرێنسس بەو خووخدە رووسرەوشتانەی مێردەکەی پێدەکەنی بەڵام هێندە بەکەیف و سەرودڵخۆش بوو کە لە ماوەی مانەوەیان لەو شارۆچکەی گڕاوە کەس پێوە نەدیبوو. سەرهەنگ وەك هەمیشە بە گاڵتە و قسەی پرێنس پێدەکەنی بەڵام سەبارەت بە ئەورووپا کە پێیوابوو لە هەموو بارێکەوە لێکیداوەتەوە لەگەڵ پرێنسس هاوڕا بوو. ماریا یۆگنییۆڤنا کە ژنێکی رۆحسووك و رووخۆش بوو بە قسەکانی پرێنس وا پێدەکەنی لەوانەبوو لەخۆ بێتەوە و تەنانەت ڤارنکاش بە بێدەنگی پێدەکەنی و جاریوابوو بە بیستنی نەقڵ و نوکتەکانی پرێنس وا دەکولا لەوانەبوو شاگەشگە بێ و ئەوەش شتێك بوو کە کیتی تا ئەو کاتە پێوەی نەدیبوو.

هەموو ئەوانە بۆ ئەوەبوو کیتی شاد بێ و بکەوێتە نەشە، بەڵام ئەو نەیدەتوانی دڵگران نەبێ. نەیدەتوانی مەسەلەیەك حەل بکا کە باوکی بە سەرخۆشی خۆی و هەڵسوکەوت لەگەڵ دۆستانی ئەو و لەگەڵ ژیانێك کە بووی، ئەوی دەکردە هۆگری خۆی و بێ ئیختیار دەیخستە بەردەمی. شێوانی پێوەندیی ئەو لەگەڵ بنەماڵەی پێترۆڤ، کە ئەو رۆژە ئاوا بە ئاشکرا و زۆر بە ناخۆشی بۆی دەرکەوتبوو، بووبووە دەردی سەرباری دەردان. هەموو پێدەکەنین بەڵام ئەو نەیدەتوانی شادبێ و هەر ئەوەش ئازاری دەدا. حاڵی وەك حاڵی ئەو سەردەمە وابوو کە بە منداڵی و بەقەستی تەمبێ کردن لە ژوورێکدا زیندانییان دەکرد و گوێی لە قاقا و تریقانەوەی خوشکەکانی دەبوو.

پرێنسس پەرداخێکی قاوە دایەدەست باوکی کیتی و پرسیی: ئەو هەموو شتەت کڕیوە چیی لێبکەی؟

---

١١٤- کەلوپەلی دارینەی ورد و تاشراو کە بە شکڵی جۆراوجۆر تاشراوە و لەسەریەك هەڵیاندەچنن و دەبێ دانە دانە و بێئەوەی ئەوانیتر بجووڵێن، بە چەتاڵێك لەسەر یەکیان دانێن و دایانگرنەوە.

115- Lischen

ـ چ بکەم؟ دەچی بۆ پیاسەکردن، تووشی دووکانێك دەبی و ئیتر دەستت لە کۆڵ ناکەنەوە. «***حەزرەتی والا، جەنابی کۆنت، عالیجەناب***» کە گەیشتنە عالیجەناب ئیتر ناتوانم خۆڕاگری بکەم و دەبێ گیرفانم هەڵتەکێنم.

پرێنسس گوتی: هۆی ئەوەیە پیرو داهێزراوی.

ـ جا دیارە هۆی داهێزرانە. بەڵێ، خاتوونەکەم، هێندە بێتاقەت و دڵتەنگم نازانم چ بەڵایەك بەسەر خۆم بێنم.

ماریا یۆگنییۆڤنا گوتی: ئەوە چی دەفەرمووی پرێنس، تۆ کوا پیر و داهێزراوی؟ ئێستا ئاڵمان ئەو هەموو شتە خۆشەی لێیە.

ـ ئاخر هەموو شتە خۆشەکانم دیتووە: سووپی قەرەلوو، کاڵباسی نۆك، هیچ کامیان نییە نەمخواردبێ!

سەرهەنگ گوتی: چاکە، حەزرەتی پرێنس، فەرمایشتەکەت جوانە، بەڵام ئاڵمان پڕیشە لە شتی شیاوی دیتن!

ـ کام شتی چاك؟ دڵیان بە هیچوپووچ خۆشە. دڵی هەموانیشیان رفاندووە. دڵم بە چی خۆش بێ؟ من نەمتوانیوە دڵی هیچ کەسێك وەدەست بێنم. جزمەکانیشم دەبێ خۆم لە پێمی داکەنم و تەنانەت خۆم لە پشت دەرگای ژوورەکەم دایاننێم و بۆیاغیشیان بکەم. بەیانی دەبێ زوو هەستم و خۆم پۆشتە کەمەوە و بڕۆم بۆ هۆڵی میوانداری و چاییەك بنێم بە سەرمەوە کە بە خۆڕاییش گرانە. ماڵی خۆمان ئاوایە؟ پیاو بە شێنەیی لە خەو هەڵدەستێ، ئەگەر بێتاقەت بێ تۆزێ گوڕەگوڕە و هەراهەرا دەکا هەتا بەجوانی خەبەری دەبێتەوە و هۆش و گۆشی دێتەوە سەرخۆ و بەکاوەخۆ بیری لێدەکاتەوە.

سەرهەنگ گوتی: بەڵام لەبیرتان بێ، کات گەوهەرە!

ـ دەبێ بزانی کاتەکە چییە. جاری وایە پیاو تەواوی مانگەکەی نیو رۆبڵ ناژی. جاریواش هەیە دڵت نایە نیو سەعات کاتی خۆت بە هیچ نرخێك بە فیڕۆ بدەی. وانییە، کاتنکا؟ ئەوە چییە؟ تۆ بۆ ئاوا داهێزراوی؟

ـ هیچ نییە.

پرێنس رووی لە ڤارنکا کرد و گوتی: بۆکوێ؟ بۆ ئاوا زوو دەڕۆی؟

ڤارنکا کە هەستابوو دیسان دایەوە لە قاقای پێکەنین و گوتی: ئیتر دەبێ بڕۆم.

تەشك و داوێنی کراسەکەی راستەوپاستە کرد، خوداحافیزیی کرد و بەرەولای باڵەخانەکە وەڕێکەوت تاکوو کڵاوەکەی هەڵگرێ. کیتی رۆیشت لە گەلیدا. ڤارنکا لەبەر چاوی بووبووە مرۆڤێکی تر. نەك ئەوەی بووبێتە مرۆڤێکی خراپ، بەڵام لەگەڵ ئەو ڤارنکایەی پێشتر لە زەینیدا بوو زۆر جیاواز بوو.

ڤارنکا لەگەڵ ئەوەی چەتر و کیفەکەی هەڵگرت گوتی: من لەوەتا وەبیرم دێ قەت ئەوەندە پێنەکەنیوم. باوەگیانت چەندە پیاوی چاکە.

کیتی هیچی نەگوت.

ڤارنکا پرسیی: کەنگێ یەکتر ببینین؟

کیتی بۆ ئەوەی ڤارنکا تاقی بکاتەوە گوتی: دایەگیان دەیویست سەرێك لە ماڵی پێترۆڤ هەڵێنێ. ئێوە لەوێ نابن؟

ڤارنکا وەڵامی دایەوە: با، ئەوانیش لەسەر رۆیشتنن. من بەڵێنیم پێداون بۆ پێچانەوەی بارگەوبنەکانیان یارمەتییان بدەم.

ـ چاکە، کەوایە منیش دێم.

ـ نا، بۆچی دێی؟

کیتی چەترەکەی ڤارنکای گرت تاکوو نەهێڵێ بڕوا، چاوی زیت کردەوە و پرسیی: چۆن، بۆچی؟ نا، راوەستە. بۆ نەیەم؟

ـ هەر ئاوا. باوەگیانت تازە هاتۆتەوە، جگە لەوەش، ئەوان لە حوزووری تۆدا دڵحەساوە نین.

ـ نا، پێمبڵێ، بۆ حەز ناکەی من هاموشۆی ماڵی پێترۆڤ بکەم؟ چونکە دیارە پێتخۆش نییە، بۆ؟

ڤارنکا بە ئارامی گوتی: من کوا قسەی وام کردووە؟

ـ نا، تکات لێدەکەم پێم بڵێ.

ڤارنکا پرسیی: یانی پێتخۆشە هەموو شتێك بزانی؟

کیتی بە هەڵەپڕووکێ گوتی: ئەرێ هەموو شتێك، هەموو شتێك.

ڤارنکا زەردەیەکی گرت و گوتی: هۆیەکی تایبەتی نییە. تەنیا میخاییل ئەلکسییۆڤیچ (ناوی کابرای وێنەگەر ئەوەبوو) بەر لەوە دەیویست زووتر لێرە بڕوا، بەڵام ئێستا حەز ناکا بڕوات.

کیتی بە سیمایەکی پەرۆشەوە راست چاوی لە چاوی ڤارنکا بڕی و گوتی: دەی دەی...

ـ دەی، نازانم بۆ ئانا پاولۆڤنا گوتوویّتی هۆی ئەوەیکە مێردەکەی حەزدەکا لێرە بمێنێتەوە ئەوەیە کە تۆ لێرەی. هەر لەبەرئەوەش، یانی لەبەر خاتری تۆ، دەمەقاڵێیان لیّ پەیدابووە، کە زۆریش کارێکی بێجێیە و تۆ دەزانی کە ئەو نەخۆشانە چەندە دڵناسکن.

کیتی جار لەگەڵ جار وێك دەهات و رەنگی هەڵدەبزرکا، ڤارنکاش لەسەریەك قسەی دەکرد و هەوڵی دەدا دڵخۆشیی بداتەوە و هێوری بکاتەوە، چونکە کفارەی توندی فرمێسك یان سێڵاوی وتە (خۆشی نەیدەزانی کامیان) ئەوکیان گرتبوو.

ـ ئاوایە بۆیە چاکتر وایە نەچی... تێدەگەی خۆ... دڵمەندیش مەبە....

کیتی دیسان چەترەکەی لە ڤارنکا وەرگرت و بیّ ئەوەی چاو لە چاوی بکا بە هەڵەپڕووکیّ گوتی: سزای من هەر ئەوەیە، سزای من هەر ئەوەیە.

ڤارنکا بە دیتنی ئەو رقە منداڵانەیەی دەستەخوشکەکەی دەیویست پێبکەنیّ بەڵام دەترسا لێی زیز بیّ یان دڵی لێبیێشیّ.

گوتی: چۆن سزای تۆ هەر ئەوەیە؟ تێناگەم.

ـ سزای من ئەوەیە چونکە کارەکانی من سادقانە نەبوو، ساختە بوو، هەمووی بۆ مەرایی بوو، گیروگرفتی خەڵك چ پێوەندییەکی بە منەوە هەیە؟ ئاکامەکەشی ئەوەیە و بوومە هۆی دەمەقاڵێیان و کارێکم کرد کە هیچ کەس لێمی نەویستبوو. هەمووی بۆ ریا بوو. تەواو!

ڤارنکا لەسەرەخۆ گوتی: ئاخر مەرایی کردن بە چ مەبەستێك؟

کیتی لەگەڵ ئەوەی چەترەکەی ڤارنکای هەڵدەدا و دەیپێچایەوە گوتی: پەککوو چەندە گەوجانەیە، چ سووکایەتییەك! هیچ پێویستییەك بەو کارە نەبوو. هەمووی بۆ خۆڕانان بوو!

بەڵام ئاخەر بە چ مەبەستێك؟

ـ بۆ ئەوەی لەبەرچاوی خەڵکی، لەلای خۆم و لە بارەگای خودادا وەك مرۆڤێکی باش چاوم لێبکریّ. هەمووی بۆ فێڵ بوو! نا، ئێستا ئیتر فریو ناخۆم، تەسلیمی تۆش نابم، واچاکە کچێکی خراپ بم بەڵام لانیکەم فێڵباز و دووڕوو نەبم.

ڤارنکا بە سەرکۆنەوە گوتی: بەڵام کیّ گوتوێتی ئێوە فێڵباز و دووڕوون؟ جۆرێك قسە دەکەی دەڵێی...

بەڵام کیتی وا ئاوری گرتبوو لە ناخەوە هەڵدەقرچا، ئیجازەی نەدا ڤارنکا قسەکەی تەواوبکات.

ـ من باسی تۆ ناکەم، مەبەستم تۆ هەر نییە. تۆ لە هەموو لایەنێکەوە مرۆڤێکی کامڵی. بەڵێ، بەڵێ، دەزانم تۆ زۆر کچێکی باشی و لە پاکیدا بێوێنەی. بەڵام چ بکەم من کچێکی خراپم، ئەگەر خراپ نەبووایەم ئەو کێشەیە رووی نەدەدا. بۆیە لێمگەڕێ چۆنم با هەر ئاوا بم بەڵام ریاباز نەبم. من چکارم بەسەر ئانا پاولۆڤناوە داوە؟ لێیگەڕێ خۆیان چۆنیان پێخۆشە وا بژین و منیش چۆنم پێخۆشە با وابم. من ناتوانم جگە لەوە بم. ئەوانە هەمووی نادروستە، پێچەوانەیە...

ڤارنکا بە سەرسووڕمانەوە پرسیی: چی پێچەوانەیە؟

ـ هەموو شتێك. من ناتوانم بەبێ پێڕەویکردن لە دڵم هەناسە بکێشم، بەڵام تۆ بە پێڕەوی کردن لە خووخدەی خۆت دەژیی. من هەر لە خۆڕا و بێ ئەوەی بیری لێبکەمەوە خۆشم ویستی. بەڵام تۆ رەنگە بۆ ئەوە منت خۆش بووێ تاکوو نەجاتم بدەی یان شتم فێر بکەی.

ڤارنکا گوتی: ئەوە زۆر بێئینسافییە.

ـ بەڵام من باسی هیچ کەس ناکەم، تەنیا باسی خۆم دەکەم.

دەنگی پرێنسس کەوتە بەرگوێیان: کیتی، وەرە مەرجانەکانت پیشان باوەگیانت بدە.

کیتی لووتبەرزانە و بێ ئەوەی گوێ بە هاوڕێکەی بدا و خوداحافیزی لێبکات قوتووی مەرجانەکانی لەسەر مێزەکە هەڵگرت و رۆیشت بۆ لای دایکی.

دایکی و باوکی وێکڕا گوتیان: چبووە؟ ئەوە بۆ ئاوا سوور بوویەتەوە؟

کیتی وەڵامی دایەوە: هیچ نییە. ئێستا دێمەوە ـ ئەوەی گوت و بە هەڵەداوان گەڕاوە...

لە دڵی خۆیدا گوتی «هێشتا لەوێیە. خودایە، ئێستا چیی پێبڵێم؟ چیمکرد؟ چیم گوت؟ بۆ رەنجاندم؟ ئێستا چ بکەم؟ بڵێم چی؟» بەو فیکر و دڵگرانییەوە لەبەر دەرگاکەدا راوەستا.

ڤارنکا کڵاوەکەی لەسەر نابوو و لە پشت مێزەکە دانیشتبوو. چەترەکەی بە دەستەوە گرتبوو و چاوی لەو فەنەرە دەکرد کە کیتی شکاندبووی. سەری هەڵێنا.

کیتی لێی نزیکبۆوە و لەسەرەخۆ گوتی: ڤارنکا ببوورە، تۆخوا ببوورە. خۆشم نازانم گوتم چی. من...

ڤارنکا زەردەیەکی گرت و گوتی: نەمدەویست زویرت بکەم، بڕوام پێبکە بەڕاستیمە.

پێکەوە ئاشت بوونەوە. بەڵام لەگەڵ هاتنەوەی پرێنس، شوێنێك کە کیتی لێیدەژیا، بە تەواوی گۆڕابوو. ئەوەی فێری بووبوو حاشای لێ نەکرد بەڵام تێگەیشت کە ناتوانێ ئەو جۆرە بێ کە دڵی دەخوازێ و بەو فیکرانە تەنیا خۆی هەڵدەخەڵەتێنێ. وەك ئەوە وابوو کە وەخۆ هاتبێتەوە. هەستی کرد کە سەرکەوتن بەرەو پلەوپایەیەك کە دەیویست و پاك مانەوە و خۆڕانان و خۆپەرستی کارێکی

زۆر دژواره. جگە لەوەش بە باشی لە خەم و نەخۆشی و ئاویلکەدان و تاڵیی ئەم ژیانە گەیشتبوو. ئەو هەولانەی کە وەك ئەرکێك لەسەر شانی خۆی دادەنا تاکوو بتوانێ دڵی بەم ژیانە خۆش بێ، وەکوو ئەشکەنجە وابوو لەبەر چاوی. دەیویست هەرچی زووتر هانا بۆ هەوای ئازاد بەرێ، بگەڕێتەوە بۆ رووسیا و یێرگووشڤۆ[116]، چوونکە لە نامەکەیدا کە بەدەستی گەیشتبوو، بۆیان نووسیبوو کە دالیی خوشکی و منداڵەکانی چوون بۆ ئەوێ.

بەڵام خۆشەویستیی ڤارنکا هەروەك پێشوو لە دڵیدا بوو. کاتی خوداحافیزی داوای لێکرد کە بچێت بۆ رووسیا و سەردانیان بکا.

وارنگا گوتی: هەرکاتێك شووت کرد دێم بۆ لاتان.

ـ من قەت شوو ناکەم.

ـ دەی کەوایە منیش نایەم.

کیتی گوتی: چاکە، ئەگەر لەبەر خاتری تۆش بێ شوودەکەم. بەڵام لەبیرتنەچێ، بەڵێنت داوە.

پێشوێژیی پزیشکان وەڕاست گەڕا. کیتی ساخ و تەندروست گەڕایەوە بۆ رووسیا. وەك پێشوو بە نەشە و بێخەم و خەیاڵ نەبوو، بەڵام ئارام بووبۆوە و خەمەکانی مۆسکۆی ئێستا وەك بیرەوەرییان لێهاتبوو.

---

116- Yergouchevo

# یەك

سرگی ئیڤانۆڤیچ کازنیشێڤ بۆ ئەوەی برێك لە دەست چالاکییە فیکرییەکانی دەربازبێ و وچانێك بدا، لەجیاتی ئەوەی وەك جاران سەفەرێك بکات بۆ هەندەران، لە کۆتایی مانگی مەیدا چوو بۆ لای براکەی لە لادێ، ئەو لەسەر ئەو باوەڕەبوو کە ژیان لە گوند باشترین شێوەی ژیانە و هاتبوو بۆ لای براکەی تاکوو چێژ لەو ژیانە وەرگرێ. کۆنستانتین لەڤین زۆری پێخۆش بوو براکەی هاتووە بۆ لای، بەتایبەت کە دەشیزانی نیکۆلای برای ئەم هاوینە نایەتەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەدا کە هۆگرییەکی زۆری بە زڕبراکەی هەبوو و رێزی بۆ دادەنا، هەستان و دانیشتنی لەگەڵ ئەو پێخۆش نەبوو: نەك هەر پێی خۆش نەبوو بەڵکوو پێوەندیی براکەی لەگەڵ ژیانی گوندنشینانەی خۆی زۆر بەلاوە تاڵ بوو. گوند بۆ کۆنستانتین لەڤین جێگەی ژیان بوو، یانی شادی و رەنج و ئێش پێکەوە. بەڵام بۆ سرگی ئیڤانۆڤیچ ژیان لە گوند لەلایەکەوە حەسانەوە بوو لە کار و تێکۆشان، لە لایەکی تریشەوە دژەژارێك بوو بە دژی گەندەڵی و دەیویست بە ئاگاداری لەو دژەژارە چێژێکی زۆر وەرگرێ. کۆنستانتین لەڵڤین گوندی بەوهۆیە پێخۆش بوو کە گۆڕەپانی راستەقینەی کاری بەکەڵکە. بە بڕوای سرگی ئیڤانۆڤیچ خۆشیی گوند لەوەدابوو کە مرۆڤ لەوێ دەتوانێ تەنانەت دەست بۆ هیچ کارێك نەبا. جگە لەوەش پێوەندیی سرگی ئیڤانۆڤیچ لەگەڵ گوندنشینان و بەلای کۆنستانتین لەڤینەوە زۆر ناخۆش بوو. سرگی ئیڤانۆڤیچ دەیگوت خەڵکی رەشۆکی و گوندنشینانی خۆش دەوێ و لەگەڵ حاڵوباڵیان ئاشنایە و ئەغڵەب لەگەڵ لادێییەکان دەدوا و لە زمانیان دەگەیشت و ئەو کارەی بەبێ خۆڕانان ولووتبەرزی دەکرد و لە هەرکام لەو دەمەتەقێیانەدا زانیارییەکی گشتیی لە گوندنشینان و بەڵگە و شایەدی بۆ ناسینی حاڵوباڵی ئەوان وەدەست دەهێنا. ئەو چەشنە پێوندییە لەگەڵ گوندنشینان بە دڵی کنتستانتین لەڤین بوو. بە بڕوای ئەو وەرزێڕ هۆکاری سەرەکیی ئیش بوو و زۆر هۆگری گوندنشینان بوو و رێزی بۆ دادەنان، خۆی گوتەنی ئەو هۆگرییەش وێدەچوو بە هۆی ئەو شیرەوە بێ کە لە مەمکی دایەنە لادێییەکەی خواردبووی و تیکەڵ خوێنی بووبوو. لە مەقامی

کەسێکدا کە لە بواری ئیش و کاردا لەگەڵیان هاوڕەنج و هاوهەنگاو بوو، هێندێ جار کە وزەی جەستەیی و رۆحسووکی و ئینسافی ئەوانی دەدی شەیدایان دەبوو. بەڵام هێندێ جار کە ناڕاستی و دەستەوستانی و شەڕاب خواردنەوە و درۆکردن دەبووە کەندوکۆسپ لە بواری کارەکەیاندا، رقی لەو ئاکارەیان هەڵدەستا و تووڕە دەبوو. ئەگەر لە کۆنستانتین لەڤینیان دەپرسی گوندنشینانی خۆش دەوێ یان نا، بەڕاستی نەیدەزانی چ وەڵامێك بداتەوە. ئەو لادێییەکانی وەك خەڵکی تر خۆش دەویست و نەدەویست. هەڵبەت چونکە مرۆڤێکی چاکەخواز بوو هۆگرییەکەی بەسەر بێزارییەکەیدا دەشکایەوە. بەڵام نەیدەتوانی لادێیەکان لە خەڵکانی تر هەڵاوێرێ و لەوانی خۆشتر بوێن یان خۆشتری نەوێن، چونکە لەگەڵ گوندنشینان نەك هەر دەژیا و قازانجی بە قازانجی ئەوانەوە گرێدرابوو، بەڵکوو خۆی بە یەکێك لەوان دەزانی و لەخۆی و لە ئەواندا هیچ مەزنایەتی یان کەمایەسییەکی تایبەتی نەدەدی کە ئەو لە هەمبەر لادێییەکاندا راگرێ. جگە لەوەش ئەگەرچی ماوەیەکی زۆر لە مەقامی ئەرباب و ناوبژیوان و لە هەمووشی گرینگتر لە مەقامی رێنوێندا (چونکە وەرزێڕەکان متمانەیان پێدەکرد و چل وێرست رێگایان دەبڕی و بۆ راوێژ و تەگبیر دەهاتن بۆ لای) پێوەندییەکی زۆر نزیك و گەرموگوڕی هەبوو، باوەڕێکی دیاریکراوی سەبارەت بە ئەوان پەیدا نەکردبوو و وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارەش کە: «وەرزێڕەکان دەناسی یان نا» هەر بەو رادەیە دژوار بوو بۆی کە وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارەی: «خۆشت دەوێن یان نا»ی بەلاوە دژوار بوو. دیعایەی ناسینی جووتیارەکان بۆ ئەو لەگەڵ دیعایەی ناسینی خەڵکانی تر جیاوازیی نەبوو. ئەو بەردەوام بە وردی سەرنجی هەڵسوکەوتی هەموو خەڵك و بەتایبەت وەرزێڕەکانی دەدا و هەوڵی دەدا بیانناسێ و جووتیارەکانی بە مرۆڤگەلێکی باش و سەرنجڕاکێش دەزانی و بەردەوام تایبەتمەندیی تازەی لەواندا دەدۆزییەوە و باوەڕێکی تازەی دەخستە شوێنی باوەڕەکەی پێشووی خۆی. بەڵام سرگی ئیڤانۆڤیچ وا نەبوو. راست ئەو جۆرەی کە ژیانی لادێی پێخۆش بوو و پەسنی دەدا و لە هەمبەر شێوە ژیانێکی تردا کە حەزی پێنەدەکرد، رایدەگرت، هەر واش خەڵکی رەشۆکی و جووتیارانی لە هەمبەر چینێك لە خەڵکدا رادەگرت کە بە سووکی دەزانین و جووتیارەکانی لە خەڵکانی تر بە جیاواز دەزانی. زەینی ڕووناکی چەشنێك بۆچوونی تایبەتی لە ژیانی خەڵکدا خۆیا دەکرد کە تا رادەیەکیش هەر لە ژیانی ئەوان، بەڵام زیاتر لە دژوازییەکانیان سەرچاوەی دەگرت. ئەو هیچ کات باوەڕی خۆی سەبارەت بە لادێییەکان و ئەو کێشانەی بەهۆی هاودەردی لەگەڵ ئەوان بۆی خوار دەبۆوە، نەیدەگۆڕی.

لەو جیاوازییانەی بیروڕادا کە لە نێوان ئەو دوو برایەدا دەهاتە گۆڕێ سەرکەوتن هەمیشە بۆ سرگی ئیڤانۆڤیچ بوو چونکە ئەو سەبارەت بە جووتیاران و خووخدە و ئاکار و سەلیقەیان بڕوایەکی دیاریکراوی هەبوو بەڵام لەڤین هیچ بڕوایەکی دیار و نەگۆڕی سەبارەت هیچ شتێکی ئەوان نەبوو، بەجۆرێك کە لەو دەمەتەقێیانەدا هەمیشە گیرۆدەی ناتەباوێژی دەبوو لەگەڵ خۆیدا.

بۆ سرگی ئیڤانۆڤیچ برا چکۆلەکەی لاوێکی باش بوو کە دڵێکی (بە قەولی فەرەنسییەکان کە ئەو پەند و زاراوەی ئەوانی بە رووسی وەردەگێڕایەوە و بەکاری دەهێنا) لە جێی خۆیدا پاکی هەبوو. بەڵام زەینی ئەگەرچی زۆر بێدار و خاوەنی بیرێکی تیژ بوو، بەڵام کاریگەریی سەردەمی بەسەرەوە بوو و لە ئاکامدا تووشی ناتەبایی دەبوو. هێندێ جار بە گەورەیی و چاوپۆشی کردنی مەزنانە مەسەلەکانی بۆ روون دەکردەوە، بەڵام چێژی لە دەمەتەقێ وەرنەدەگرت لە گەڵیدا، چونکە بە سانایی لە کێشە و مشتومڕەکاندا بەرەندە دەبوو.

کۆنستانتین لەڤین براکەی بە پیاوێکی بەهۆش و زۆر خاوەن ژیار و بە بەرزترین مانای وشە نەجیم و بۆ هەوڵدان لە رێگای بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگادا بە کەسێکی لێهاتوو دەزانی. بەڵام هەرچەندە زیار تەمەنی دەچووە سەرێ و براکەی زیاتر دەناسی لە قووڵاییی زەینیدا ئەو ئەندێشەیە بەردەوام سەری هەڵدەدا کە ئەم توانایی و هەوڵانەی لە رێگای بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگادا، کە ئەو خۆی پێیوابوو بە تەواوی لێیان بێ بەش ە، لەوانەیە مەزنایەتی نەبێ و بەپێچەوانە کەمایەسی بێ: نەك کەمایەسیی حەز و ئاواتی پاك و شەرافەتمەندانە و بەرز، بەڵکوو کەمایەسیی ئەشقی ژیان، هەر ئەو شتەی کە بە شادیی دڵانی دێننە ئەژمار، هەر ئەو حەزەی کە مرۆڤ ناچار دەکا تاکوو لە نێوان رێگا زۆر و بێژوماەرکاندا لەوانە یەکیان هەڵبژێرێ و لەوەش زیاتر هیچی نەوێ. هەتا زیاتر براکەی دەناسی زیاتر تێدەگەیشت کە سیرکی ئیڤانۆڤیچ و زۆربەی کەسانی تر کە لە رێگای بەرژەوەندیی کۆمەڵگادا چالاکی دەنوێنن، لە رێگای سەفای دڵەوە نییە، بەڵکوو بە یارمەتیی بیرۆکە بەو ئاکامە گەیشتوون کە ئەم جۆرە تێکۆشانە کارێکی باشە و تەنیا بەو هۆیەش روویان لەو کارە کردووە. ئەو لەو گریمانەی خۆیدا کاتێك پێداگرتر بوو کە دیتی براکەی بۆ مەسەلەی پێوەندیدار بە بەرژەوەندیی کۆمەڵگا یان بەقای رۆح هەر ئەوەندە پابەندە کە بۆ تەگبیر و رای شەترەنج یان وردەکارییەك کە لە گەڵاڵەی مەکینەیەکدا بەکار هێنراوە.

جگە لەوانەش لەڤین مانەوەی هاوینەی براکەی لە ئاوایی بەو هۆیە بەلاوە ناخۆش بوو کە ئەو لەوێ، بە تایبەت هاوینان، ئەوەندە سەرقاڵی کاروباری کشتوکاڵ بوو کە رۆژانی درێژی

هاوینیش پیڕانەدەگەیشت و نەیدەتوانی هەموو کارەکانی بە تەواوی ئەنجام بدات، ئێستاش سرگی ئیڤانۆڤیچ بۆ پشوودان هاتبوو. بەڵام ئەگەرچی پشووی دەدا، یانی خۆی لە کاری تۆمار و داهێنانی هیچ بەرهەمێك نەدەدا، وای خوو بە تێکۆشانی فیکری گرتبوو کە هەر بیرۆکەیەك بە زەینی دەگەیشت دەبوو بە شێوەیەکی جوان و دوور لە درێژدادڕی بەیانی بکات و پێی خۆش بوو کەسێك لەلای بێ و گوێ بۆ وتەکانی راگرێ، ئاساییترین و سروشتیترین بیسەریشی ئەو بوو. ئەگەرچی پێوەندییەکەیان زۆر خۆمانە بوو و شەرموشکۆیان لە یەکتر نەبوو، بەڵام کۆنستانتین لەڤین نەیدەتوانی بە ئاسانی خۆی رازی بکات و بە تەنیا بەجێی بهێڵێ. سرگی ئیڤانۆڤیچ حەزی دەکرد لەسەر چیمەن و بەر خۆرەتاو راکشێ و خۆی بداتە بەر پڕشنگی بلاوێنی خۆرەتاو و بە خەیاڵێکی ئاسوودەوە قسە بکات.

بە براکەی دەگوت: تۆ باوەڕ ناکەی ئەم لەشگرانییە ئۆکراینی شێوەیە بۆ من چەند خۆش و چێژبەخشە! پیاو هیچ فیکرێکی لە سەردا نییە، راست وەك تۆپێکی خاڵی وایە.

بەڵام دانیشتن و گوێگرتن بۆ قسەی ئەو بۆ کۆنستانتین لەڤین زۆر ناخۆش و تاقەتبڕ بوو، بەتایبەت بەو هۆیەی کە دەیزانی ئەگەر خۆی لە مەزرا نەبێ کرێکارەکان بە کەیفی خۆیان پەین بە زەوییەکاندا بڵاو دەکەنەوە و بە جوانی کارەکان بەڕێوە نابەن. گاسنەکان بە جوانی رژد ناکەن و پاشان دەڵێن ئەم ئامووڕانەی ئەو داهێنەریان بووە بەکاری جووتکردن نایەن و نیرۆئامووره کۆنەکان باشترن و... لەو شتانە.

سرگی ئیڤانۆڤیچ پێی دەگوت: بێکاری بەو گەرمایە و لەو سەحرایە ئەوەندە بەملاو بەولادا هەڵدێی؟

لەڤین دەیگوت: نا، تەنیا بەسەر پێیەکەوە دەچم سەرێك لە نووسینگەکەم هەڵدێنم و دەگەڕێمەوە.

بەپەلەش بەرەو مەزراکە تێیدەتەقاند.

# دوو

سەرەتاکانی مانگی ژوئەن بوو کە ئاگافیا میخائیلۆڤنا دایەنی پێشوو و سەر سپی و کەیخوداژنی ئەمڕۆی ماڵی لەڤین، کاتێك کە شووشەیەك کارگی تازە خوێکراوی دەبرد بۆ ژێرخانەکە لاقی خلیسکا و کەوت بە زەویدا و مەچەکی دەستی لەجێ چوو. پزیشکی زێمستڤا هات کە لاوێکی چەقەسرۆ بوو و تازە کۆلێژی پزیشکیی تەواوکردبوو. چاوی لە دەستی پیرێژنەکە کرد و گوتی لەجێ نەچووە تەنیا کوتراوە و زەبری وێکەوتووە. بۆی هەڵبەستەوە و بۆ نانی نیوەڕۆ لەوێ مایەوە. دیاربوو حەز بە ئاخافتن لەگەڵ سرگی ئیڤانۆڤیچی ناودار دەکات و دانیشتن لەگەڵ ئەو بە شانازی دەزانێ، پێشی خۆشبوو رۆشنبیریی خۆی بنوێنێ و هەموو ئەو دەنگۆیانەی کە لەو ناوچەیەدا ببوونە بنێشتەخۆشکە هەمووی بۆ براکەی لەڤین گێڕایەوە و زۆریشی گلە و گازندە لە بارودۆخی کارەکانی زێمستڤا کرد. سرگی ئیڤانۆڤیچ بە وردی گوێی بۆ قسەکانی شل کردبوو، زوو زوو پرسیاری لێدەکرد، بۆیە زۆر کەیفی سازبوو کە گوێگرێکی تازەی دیوەتەوە و زۆر بە وردی و بە شێنەیی دەدوا، لەگەڵ ئەوەشدا زۆری رێز بۆ سرگی ئیڤانۆڤیچ دادانا، سرگی ئیڤانۆڤیچ وەنەشە کەوتبوو، لەڤین کە خووخدەی براکەی باش دەناسی و دەیزانی لە دوای وتاردان تووشی ئەو حاڵەتە دەبێ. کاتێك پزیشك رۆیشت سرگی ئیڤانۆڤیچ کەوتە سەر هەوای راوەماسی و دەستیدا کەلوپەلی راو تاکوو بڕوات بۆ گوێڕووبارەکە، زۆری راوەماسی پێخۆش بوو و وەك ئەوە وابوو کە شانازی بەو رابواردنە گەوجانەیەوە بکا.

کۆنستانتین لەڤین کە دەبوو بچێت بۆ مەزرا و سەرێك لە کرێکارەکانی هەڵێنێ کە خەریکی جووتکردن بوون، پێشنیاری بە براکەی کرد تاکوو بە سواری عارەبانە سووکەکەی خۆی بیگەیێنێتە چۆمی.

هاوین بەسەردا هاتبوو و کاتی ئەوەبوو چارەنووسی داهاتی ساڵ مەعلووم بێ و ئامادەبن بۆ کاروباری تووچاندنی ساڵی داهاتوو. زۆری نەمابوو بۆ کاتی دروێنە، جۆ بە تەواوی گوڵی دابوو، کاتی قەفوگوڵی گەنم بوو، رەپستە گەش و پاراو لەژێر پڕشنگی گەرمی هەتاودا رەش دەچوونەوە و بە دەم شنەی شەماڵەوە کەروێشکەیان دەکرد. کێڵگەی سەوز و رازاوەی وێنجە کە جێجێ جلە و باداك زەردی هەڵگیرابوون لە تەنیشت جارە جۆ و گەنمە بەهاروو یەکدەست بوونی دەشتەکەی تێکدابوو.

کاتێك کە گەنمی ڕەپستە کۆڵەکە دەدا و زەوی یەکپارچە دادەپۆشی، کاتێك کە جاڕ و بەیاری لە ژێر سمی مەڕ و ماڵاتدا وەك بەفرکوش لێهاتوو دیسان کێڵدراونەتەوە و جێجێ لەبەر ڕەقی، گاسن کاری لێنەکردووە و وشکە گیا و سرووتی ساڵی پێشوو بە دەرەوە ماون، کاتێك کە بەیانیان بۆنی پەین و کووتی بۆ مەزرا بروا و کۆما کۆماکراو و وشکەوەبوو لەگەڵ بەرامەی هەنگوینئاسای گیاوگژ ئاوێتە دەبێ و لە بنگەڕ و قۆپییەکانی قەراغ چۆمی گوڵ و گیا هەتا پشتێنە هەستاوە و وەك زەریای سەوز شەپۆل دەدەن و چاوەڕوانی شان و باهۆی مەڵەغانگێڕێکن بیاندووریێتەوە و جێجێ بنجە ترشۆکەی لاسك و گەڵا تورت ڕەش دەکاتەوە و بوونەتە خاڵی بەرجەستەی سەر سینگی دەشت، نیشانەی ئەوەیە کە سەرتای کاری ساڵانەی درویێنە و کۆکردنەوەی بەرهەم و داهات کە توانایی هەموو گوندنشینانی دەوێ، نزیکبۆتەوە و بەر لە دەستپێکردن وێدەچوو بۆ حەسانەوە لە کاری کشتوکاڵ هەلی هێمنایەتییەك هەڵکەوتبێ. دەغڵودان زۆر باشبوو و ڕۆژانە هەوا گەرم و تاووساو بوو، شەوانەش کورت و هەواکەی شێدار و شەونم پژێن.

لەڤین و براکەی دەبوو بۆ گەیشتنە مەزرا بەنێو لێڕەوارەکەدا تێپەڕن. سرگی ئیڤانۆڤیچ لەپەستا پەسنی جوانییەکانی دارستانی سەرسەوزی دەدا و هێندێ جاریش ئەو درەختە زیزفۆنە پیرەی کە لای نساری لێڕەوارەکە ڕەش دەچۆوە و بەژنی بە چرۆی زەردی تازە پشکووتوو ڕازابۆوە و هێندێ جاریش خەڵف و نەمامی شلك و ساوا کە وەك یاقووتی سەوز دەدرەوشانەوە، نیشانی براکەی دەدا. کۆنستانتین لەڤین حەزی نەدەکرد سەبارەت بە جوانییەکانی سروشت لەگەڵی بدوێن. لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە وەسفی جوانی، سروشت زایە دەکا. سەری بۆ قسەی براکەی دەلەقاند بەڵام بێ ئیختیار بیری لە شتێکی تر دەکردەوە. کاتێك لە لێڕەوارەکە هاتنە دەرێ سەرنجی لەسەر زەوییە بەیارەکەی سەر گردی رووبەڕوویان گیرسایەوە کە بە پوار و قریاشانی زەردهەڵگەڕاو داپۆشرابوو، لە چەند جێگاوە کووزی لێدرابوو و بە چەند تۆمەشان دابەش کرابوو، بەشێکیشی کووتی پێوە کرابوو و کێڵابوویان. گەنم و جۆی خیزەڵانییەکان پیرەکورە بووبوون. ریزێکیش عارەبانە بە دەشتەکەدا دەڕۆیشتن. لەڤین عارەبانەکانی بژارد و کە دیتی ئەوەی پێویستە دەیبەن بۆ سارا دڵی حەسایەوە و بە دیتنی لەوەڕگا چڕوپڕەکە کەوتە بیری دوورینەوە و وەکارخستنی ماڵەغانگێڕ. گیادوورین شتێکی تێدا بوو کە هەمیشە شوێنی لەسەر دڵی دادەنا. کاتێك گەیشتە مەزرا ئەسپەکەی ڕاگرت.

گژوگیا هێشتا ژێریان بە ئاونگ تەڕ بوو، سرگی ئیڤانۆڤیچ کە نەیدەویست داودەلینگی تەڕ بێ داوای لە براکەی کرد بە سواری عارەبانە لەو گیاجارەی بپەڕێنێتەوە و بیگەیێنێتە لای کۆڕی دارە

بییەکانی گویٚ چۆمی کە گۆمی پالٚ دارەکان پڕبوو لە ژیشکەماسی. لەڤین کە حەزی نەدەکرد گیاجارەکە لە ژێر سمی ئەسپ و تایەی عارەبانەکەدا پێپەست بکا، بەلاٚم بە نابەدلٚییەوە دەبوو ویستی براکەی بەجیٚ بێنیٚ. لقی ناسك و بەرزی گیاوگژ بە نەرمی لە تایەی عارەبانە و لاق و ڕەفیچکەی ئەسپەکە دەهالاٚن و پەلکی گولٚ و دانی فەریکەی گیا بە پەڕەی خووساوی تایەکانەوە دەنووسان.

سرگی ئیڤانۆڤیچ لە بن سێبەری دارە بییەکان دانیشت و کەوان و قولاپی راوەماسیی راستەوپاستە کرد، لەڤینیش ئەسپەکەی لە گیاجاڕەکە دوور خستەوە و بە دارێکەوە بەستییەوە، خۆشی بەپێیان وەنێو دەریای بەرینی گژوگیا کەوت کە شنەی بایەك نەدەهات تاکوو کەروێشکەی پێبکات. بنجی گەیشتووی گیامێشوولە کە بۆ نەرمی دەتگوت هەورێشمە لەو شوێنانەی کە سێلاٚوگر بوو هەتا پشتێنە دەهات.

کۆنستانتین لەڤین لە گیاجاڕەکە تێپەڕی و گەیشتە سەرڕێگاکە، تووشی کابرایەك بوو کە چاوی هەلٚماسیبوو و قەرتالٚەیەکی تایبەتی مێشەنگوێنی بە کۆلٚەوە بوو.

گوتی: فۆمیچ! ئەوە چییە، میشەنگوینی تازەت گرتووە.

ـ مێشەنگوینی تازەی چی، کۆنستانتین دیمیتریچ؟ ئەگەر بتوانین هەنگەکانی خۆمان راگرین، دەبیٚ شوکری خودا بکەین. ئەوە جاری دووهەمە مێشەکەمان پوورە دەدا و دەڕۆن. ئەگەر ئەو لاوانە نەبوایەن ئەوەشم بۆ نەدەگیرایەوە، کرێکارەکانی ئێوە خەریکی جووتکردن بوون، نیریان لە ملی ئەسپەکانیان داماڵیبوو و خۆیان گەیاندەلام و خەبەریان دامیٚ.

ـ دەی، فۆمیچ، تۆ دەلٚێیچی؟ کاتی گیا دوورین هاتووە یان جاریٚ راوەستین؟

ـ وەلٚلاٚ چیت عەرزکەم. ئێمە هەتا سێنپێوتێر رادەوەستین، بەلاٚم ئێوە هەمموو سالٚێك زووتر دەستبەکاردەبن. بەلاٚم دەستیش پێبکەن زەرەدی نییە. شوکر بۆخوا ئەمسالٚ گژوگیا هەراشە. مالاٚتەکانمان تێر دەبن.

ـ ئەی بۆ هەواکەی دەلٚێی چی؟

ـ خودا دەزانیٚ، رەنگە هەواکەی زۆریش خۆش بیٚ.

لەڤین گەڕایەوە بۆ لای براکەی. سرگی ئیڤانۆڤیچ هێشتا هیچی بۆ نەگیرابوو. بەلاٚم لەوە نەدەچوو دلٚگران بیٚ و زۆر شاد و بەکەیفیش بوو. لەڤین دیتی کە دوای وتوویژ لەگەلٚ دوکتۆر کەیفی سازبووە و حەزی لە قسەکردنە. بەلاٚم خۆی بە پێچەوانەی ئەو حەزی دەکرد زووتر بگەڕێتەوە بۆ مالٚیٚ و چەند مەلٚەغانگێڕ بەکریٚ بگریٚ بۆ سبەینیٚ و سەبارەت بە گیادروون کە فیکر و خەیالٚی بەخۆیەوە خەریك کردبوو بڕیاربدا.

گوتی: چاکە با بڕۆینەوە.

ـ پەلەی چیتە؟ جارێ دانیشە. ئەوە بۆوا خووساوی؟ ماسیم بۆ نەگیراوە بەڵام ئەوەش خۆی کەیفی لەلایە. خۆشیی راو، جا هەموو جۆرە راوێك، لەوەدایە کە پیاو لەگەڵ سروشت تێدەکەوێ. بڕوانە ئەو ئاوە بەو رەنگە شینەوە چەندە جوانە! ئەو گیاجارەی لێواری چۆمەکە ئەو نەقڵەم وەبیردێنێتەوە. بیستووتە؟ گیا بە ئاو دڵێ: من شەپۆل دەدەم، من شەپۆل دەدەم!...

لەڤین بە دۆژداماوی گوتی: من ئەو نەقڵەم نەبیستووە.

## سێ

سرگی ئیڤانۆڤیچ گوتی: دەزانی چی؟ من بیرم لە تۆ دەکردەوە. ئەو جۆرەی کە دوکتۆر دەیگوت بارودۆخی کار لەو ناوچەیەی ئێوە زۆر خراپە. من پێموایە ئەو لاوێکی تێگەیشتووە. من پێمدەگوتی و ئێستاش پێتدەڵێم تۆ کارێکی باش ناکەی ناچیتە کۆڕ و کۆبوونەوەی شۆراکان و دەستت لە کاروباری زێمستڤا کێشاوەتەوە. ئەگەر مرۆڤە باشەکان دەست لە کار بکێشنەوە بارودۆخەکە دەشێوێ. ئەو پارەیەی ئێمە دەیدەین هەموو دەدرێ بە مووچەخۆران، نە قوتابخانەیەك دروست دەکرێ و نە دەرمانگایەك وەگەڕ دەکەوێ، نە قابیلەیەك، نە دەواسازێك، هەرهیچ، هیچ.

لەڤین بە شێنەیی و بەبێ ئەوەی حەز بە وەڵامدانەوە بکا گوتی: بەڵام من هەوڵی خۆمم داوە. ناتوانم، چ بکەم؟

ـ ئاخەر چ کارێك هەیە کە تۆ ناتوانی بیکەی؟ بەڕاستی تێناگەم. ناتوانم باوەڕ بکەم کە کەمتەرخەمی، یان تواناییی کارت نەبێ. بەڵام بڵێی هۆی لەشگرانی بێ؟

لەڤین گوتی: نە ئەمەیە و نە ئەوە و نە سێهەمی. چوومە مەیدان و هەوڵی خۆمدا و دیتم هیچ کارێکم لە دەست نایە.

لەڤین دڵی لەلای براکەی نەبوو و هەر نەیدەزانی دەڵێ چی. چاوی لەوبەری رووبارەکە و شێوەردەکان بڕیبوو. تاپۆیەکی رەشی دی بەڵام بۆی مەعلووم نەبوو ئەسپە یان گزیرەکەیەتی بە سواری ئەسپ دێ.

ـ بۆ هیچ کارێکت لەدەست نایە؟ هەنگاوێکت هەڵگرت چونکە پێتوابوو بێئاکامە خێرا پاشگەز بوویەوە. یانی ئەوەندە بێورەی.

ئەو قسەی سرگی ئیڤانۆڤیچ لە دڵی لەڤین گران هات و گوتی: ئەوە چ پێوەندییەکی بە ورەوە هەیە؟ ئەگەر لە زانکۆ پێیان بگوتبایەم کە حیسابی ئەنتیگراڵ هەموو دەیزانن و تۆ نایزانی قەبوولم بوو کە بێورەم. بەڵام بۆ ئەم کارە دەبێ لەپێشدا بڕوامەند بی و بزانی کە ئەو کارانە پێویستی بە مرخێکی تایبەت هەیە و لەوەش گرینگتر دەبێ ئەوانە زۆر بە گرینگ بزانی تاکوو بتوانی باسی بێورەیی بکەی.

سرگی ئیڤانۆڤیچ کە دیتی براکەی ئەو ئەرکەی خۆی بە هێند ناگرێ کە پێوەی سەرقاڵە و بەتایبەت ئەوەی کە دیاربوو گوێی بە قسەکانی ئەم نابزوێ لە دڵەوە زویربوو و گوتی: یانیچی؟ یانی ئەو کارانە گرینگ نییە؟

لەڤین کە بۆی دەرکەوت تاپۆ رەشەکە گزیرەکەیەتی و رەنگە جووتیارەکانی مەرەخەس کردبێ و ئەوانیش خەریکی کردنەوەی نیروئامووره‌کانن، لەبەرخۆیەوە گوتی «یانی هەموو زەوییەکانیان کێڵاوە؟» وەڵامی خۆشیدایەوە «بەکارم نایەنە بەرچاو. چ بکەم؟ زۆرم بەدڵ نین.»

سرگی ئیڤانۆڤیچ دەموچاوە جوان و هۆشمەندەکەی پێکدادا و گوتی: دەزانی چی! هەر لێرە راوەستە و گوێم بۆ شلکە بزانە دڵێم چی. هەرشتێك سنوورێکی هەیە. ئەوە خراپ نییە کە پیاو وەك هەمووان نەبێ و راستوێژ و سادق بێ و لە درۆ و دەلەسە و فێڵ و تەڵەکە بێزار بێ. ئەوانە هەمووی بەجێیخۆی. بەڵام ئەوەی تۆ باسی دەکەی زۆر بێ مانایە و لەوانەیە مانایەکی خراپیشی هەبێ. چۆن دەتوانی دەرهەق بە خەڵکێك کە دیعایە دەکەی خۆشت دەوێن کەمتەرخەم بی...

لەڤین لە دڵی خۆیدا گوتی: «من کوا دیعایەی وام هەبووە.....»

ـ هەروەها لێیانگەڕێی، بمرن و یارمەتییان نەدەی؟ لێگەڕێی مامانە نەزانەکان کۆرپەی ساوا بکوژن و خەڵکی داماو لە گێژاوی نەزانیدا زایە بن، لەبەر دەستی میرزابنووسە بۆرینەکاندا دیل بن و تۆ نەتوانی یارمەتییان بدەی و کەڵك لەو دەرفەتە ورەنەگری بۆ یارمەتیدانیان چونکە پێتوایە شتێکی گرینگ نییە، ها؟

سرگی ئیڤانۆڤیچ ئەوی لە هەمبەر بابەتێکی دوو سەرەدا راگرت و گوتی: یان باری عاملاندن و گەشەکردنی تۆ باش نییە کە ناتوانی تێبگەی چ کارێکت لە دەست دێ، یان ناتەوێ واز لە ئاسوودەیی و لەشگرانی و خۆپەرستی بێنی، کامیانە، ها؟ تێناگەم.

کۆنستانتین لەڤین دیتی کە ناچارە تەسلیم بێ، یان قەبووڵی بکات کە هۆگری خەڵك و کاروبارەکانیان نییە. بۆیە خەم دایگرتبوو.

بە لەبزێکی قورس و قایم گوتی: ئەمەش و ئەوەش. من تێناگەم چۆن دەکرێ ئەو کارە...

ـ چۆن؟ یانی ئەگەر پارە بەجێ خەرج بکەین ناکرێ خزمەتکارێکی پزیشکی بۆ خەڵك دابین بکەین؟

ـ بە بڕوای من ناکری... بەو چوار هەزار وێرستە چوارگۆشەیەی ئێمە، کاتێك بەفرە قورسەکان دەتوێنەوە و دەشت و سارا دەبێتە دەریا، بەو کڕێوە و بادەوە و سەخڵەتییەی زستان و کاری دژواری لادێ وەختی دروێنە و هەڵگرتنی دەغڵودان... پێموایە گەیاندنی یارمەتیی پزیشکی بۆ خەڵك نالوێ. جگە لەوەش من کورت و کرمانجی بڕوام بە زانستی پزیشکی نییە.

ـ باشە باش، زۆری پێ لێهەڵمەبڕە... ئەو قسەیەی تۆ زۆر بێئینسافییە. من دەتوانم هەزار نموونەت بۆ بێنمەوە کە.... ئەی بۆ قوتابخانە دەڵێی چی؟

ـ قوتابخانە بۆچی؟!

ـ ئەوە چ قسەیەکە دەیکەی؟ بۆ دەکرێ سەبارەت بە فێرگە و فێرکاری کەمتەرخەم بی؟ ئەگەر قوتابخانە بۆ تۆ باش بووە دەبێ بۆ هەمووان باش بێ.

کۆنستانتین لەڤین خۆی لە تەنگژەیەکی مەعنەویدا دیتەوە بۆیە هەڵچوو و بێ ئیختیار هۆی سەرەکیی کەمتەرخەمیی خۆی سەبارەت بە کارە کۆمەڵایەتییەکان دەربری.

گوتی: ڕەنگە هەق بە تۆ بێ. بەڵام من بۆ دەبێ خۆم بۆ دروستکردنی دەرمانگایەك تووشی دەردەسەری بکەم کە هیچ کات کەڵکی لێوەرناگرم یان بۆ فێرگەیەك کە هیچ کات منداڵەکانم نانێرم، دەزانم وەرزێڕەکانیش نایانەوێ منداڵەکانیان بنێرن، ڕاستت دەوی هەر باوەڕیشم بە پێویستبوونی ئەو شتانە نییە.

سرگی ئیڤانۆڤیچ کە دیتی براکەی ئاوا کەمتەرخەمە سەبارەت بە کارە کۆمەڵایەتییەکان و چونکە ئەو چاوەڕوانییەشی لێینەبوو، بۆ ماوەیەك دۆژداما. بەڵام پیلانی هێرشەکەی خۆی گۆڕی.

تۆزێ بێدەنگ بوو، قولاپەکەی لە ئاوەکە دەرکێشا و دیسان تێیهاویشتەوە، بە بزەیەکەوە ڕووی لە براکەی کرد و گوتی:

ـ چاکە، ڕاوەستە بزانم، من پێت دەسەلمێنم کە دەرمانگا پێویستە، هەر ئەمڕۆ خۆت لەوێ پزیشکت هێنا بۆ ئاگافیا میخائیلۆڤنا.

ـ بەڵێ، بەڵام من پێم وانییە تازە دەستی ئەو ببێتەوە بە دەست.

ـ جارێ هیچ مەعلووم نییە. دەبێ بزانین.... ئێستا با بێینە سەر قوتابخانە. جووتیار و کرێکاری خوێندەوار بۆ تۆش باشتر و بەقازانجترە.

کۆنستانتین لەڤین بە دڵنیاییەوە وەڵامی دایەوە: وانییە، لە هەرکەس دەپرسی بپرسە، جووتیار ئەگەر خوێندەوار بێ ئیتر بەکاری هیچ شتێك نایە. ئامادە نییە ڕێگاوبان خۆش بکات و ئەگەر پردێکیش دروست بکات حەتمەن کەرەستەکانی دەدزێ.

سرگی ئیڤانۆڤیچ کە حەزی نەدەکرد دژایەتی لەگەڵ بیروڕاکانی بکا زۆر تێکچوو، بەتایبەت ئەوەیکە بەرانبەرەکەی هەرتاوێ لە لکێکەوە بۆ لکێکی تر دەفڕی و بەڵگەی نابەجێی دێنایەوە، بەجۆرێك کە نەیدەزانی وەڵامی کامیان بداتەوە، گوتی: با لەو قسانە گەڕێین خۆ کێشەکەمان لەسەر ئەوە نییە. ڕاوەستە بزانم، تۆ پێتوایە خوێندن بۆ خەڵك باشە یان نا؟

لەڤین بێ بیرکردنەوە گوتی: پێمباشە ـ ئەوەی گوت و هەر خێراش زانیی بڕوای بەو قسەیە نییە کە کردوویێتی. هەستی دەکرد کە ئەو قسەیەی قەبووڵ کردووە براکەی لەڕێوە پێی دەسەلمێنێ کە قسەکانی هەموو وڕێنە و بێ مانان. جا چۆنیشی پێدەسەلمێنێ، نەیدەزانی. بەڵام سوور دەیزانی کە براکەی بە دەلیلەوە پێی دەسەلمێنێ و چاوەڕوانی بەڵگە هێنانەوە بوو.

بەڵگەی براکەی زۆر لەوە سادەتر بوو کە بیری لێدەکردەوە.

سرگی ئیڤانۆڤیچ گوتی: ئەگەر قەبووڵتە ئەوە چاکە، وەك مرۆڤێکی بەشەڕەف ناتوانی لە هەمبەر بەرەپێدانی زانیاریدا کەمتەرخەم بی و هەر بەو هۆیەش ناتوانی هۆگری چالاکی نەبی لەو ڕێگایەدا.

کۆنستانتین لەڤین سوورهەڵگەڕا و گوتی: بەڵام من نەمگوت ئەو کارە بە باش دەزانم.

ـ چۆن؟ تۆ هەر ئێستا گوتت...

ـ مەبەستم ئەوەیە ئەو کارە نە قازانجی هەیە و نە جێبەجێش دەبێ.

ـ هەتا کاتێك هەوڵت نەدابێ ناتوانی بڵێی جێبەجێدەبێ یان نابێ.

لەڤین گوتی: چاکە، با وای دانێین کە جێبەجێدەبێ ـ ئەگەرچی بەڕاستی نەبووـ با وای دانێین کە جێبەجێدەبێ. لەگەڵ ئەوانەشدا بۆ دەبێ ئەو دەردەسەرییە بە تووش خۆمانەوە بکەین.

ـ مەبەستت چییە؟

ـ ئێستا کە سەبارەت بەو مەسەلەیە سەری قسەمان کردۆتەوە لە روانگەی فەلسەفییەوە بۆم روون بکەوە.

سرگی ئیڤانۆڤیچ گوتی: ئەوە چ پێوەندییەکی بە فەلسەفەوە هەیە؟ ـ لەڤین پێیوابوو لەبزی براکەی جۆرێکە کە دەڵێی بەرادەی ئەو باسی فەلسەفی نازانێ. هەر بۆیە رقی هەستا و بە تووڕەیی گوتی:

ـ ئەو پێوەندییەی هەیە کە بە بڕوای من لە هەموو کاتێکدا هانەی ئەو کارانەی کە دەیکەین چێژ یان قازانجی بۆ خۆمان هەیە. منی مالیکی ئەشرافی لە دامەزراوەی زێمستڤادا هیچ شتێکم پێشك نایە کە بۆ ئاسوودەیی من بەکەڵك بێ. زێمستڤا بۆ چاکسازی و بارودۆخی رێگاوبان هیچ کارێك ناکا و ناشتوانێ بیکا. من ئەسپم هەیە و رێگاوبانیش خراپ بێ پەکم ناکەوێ. من پێویستم بە پزیشکە نەك دەرمانگا. دادگای زێمستڤاش بەکاری من نایە و قەتم کار پێی نەبووە و سەرم پێیدا نەکردووە و لەمەبەدواوەش هەر سەری پێدا ناکەم. قوتابخانەش، هەر وەك گوتم، بە بڕوای من نەك پێویست نییە بەڵکوو زۆریش زەرەدی هەیە. زێمستڤاش بۆمن تەنیا ئەرکێکە کە بۆ هەر دسیاتینێك هەژدە کاپك بدەم و بچم بۆ شار، لەوێش لە ژووری پڕ لە کەلوپەل و چرپا و لێفەونوێندا بخەوم و گوێ بۆ ئەو قسە و وڕاوانە بگرم کە بیستنیان بێزارم دەکات. هیچ قازانجێکی تاکەکەسیش بۆ ئەو کارە هانم نادا.

سرگی ئیڤانۆڤیچ بە پێکەنینەوە قسەکەی پێبڕی: ئیجازە بدە. ئێمە ئەو کاتەی بۆ رووخاندنی سیستەمی کۆیلەداری خەریکی چالاکی بووین بە دووی قازانج و بەرژەوەندیی تاکەکەسییەوە نەبووین، بەڵام هەوڵی خۆماندا.

کۆنستانتین لەڤین کە جارلەگەڵ جار زیاتر هەڵدەچوو، پەڕییە نێو قسەکانی: نا، رووخاندنی سیستەمی کۆیلەداری شتێکی تر بوو. ئازادیی کویلەکان جگە لە قازانجی تاکەکەسی هیچی تر نەبوو. هانەی ئێمە مرۆڤە بەشەرەفەکان تەنیا ئەوەبوو کە ئەو بارە قورسەی بە کۆڵمانەوە بوو و ئازاری دەداین، داینێین. بەڵام بوونە ئەندامی شۆڕای زێمستڤا تەنیا دەمەتەقێکردنە لەسەر ئەوەیکە چەند کەس قومەشکەن بۆ خاڵیکردنی بیری ئاودەستەکانی شار پێویستە و چۆن دەبێ ئەو شارەی کە خۆمی تێدا دەژیم بۆرییەی دەرچوونی ئاوەڕۆی بۆ دابین بکرێ، یان بوونە ئەندامی لێژنەی دادوەران بۆ ئەوەی لادێییەکی قوڕبەسەر موحاکمە بکرێ لەسەر ئەوەی ژامبۆنێکی دزیوە و دوای شەش سەعات گوێگرتن بۆ وڕێنەی دادوەر و پارێزەران هەتا لە کۆتاییدا سەرۆکی دادگا لە ئالیۆشای پیر و گەمژەی من دەپرسێ «ئاغای گومانلێکراو، تۆ

ددانی پێدا دەنێی کە لەتێك گۆشتت دزیوە؟» بۆیە دەڵێم ئەوە شتێکی ترە و ئەو دووە جیاوازییان زۆرە.

کۆنستانتین لەڤین لە باسە سەرەکییەکەی خۆی لایدابوو و رۆڵی سەرۆکی دادگا و ئالیۆشای حەپۆلی دەگێڕا. پێیوابوو هەموو ئەوانە بۆ سەلماندنی قسەکانی پێویستە.

بەڵام سرگی ئیڤانۆڤیچ شانی هەڵتەکاند و گوتی: دەی باشە، ئێستا دەتەوێ بە چ ئاکامێك بگەی؟

ئەو ئاکامەی کە من دەمهەوێ پێیبگەم تەنیا ئەوەیە کە هەمیشە و ئەوەندەی لە توانامدا هەیە بەرگری بکەم لە مافی خۆم و ئەوەی کە پێوەندیی بە قازانج و بەرژەوەندیمەوە هەیە. کاتێك کە خوێندکاری زانکۆ بووین و پۆلیس کەلوپەلەکانمانی دەپشکنی و نامەکانمانی دەخوێندەوە ئامادەبووین بە تەواوی توانامانەوە بۆ پارێزگاری لە مافەکانمان خەبات بکەین وپارێزگاری لە مافی فێربوون و ئازادیمان بە ئەرکی سەرشانمان دەزانی. خزمەتی سەربازی کە پێوەندیی بە چارەنووسی منداڵەکانم و براکانم و خۆمەوە هەیە، تێیدەگەم و ئامادەم بەپێی توانایی خۆم لە بارەیەوە بدوێم. بەڵام باسکردن لەسەر ئەوەی کە چل هەزار رۆبڵ بووجەی زێمستڤا چۆن خەرج بکرێ یان دادوەری و مەحکوومکردنی ئالیۆشای گێل، لەو کارانەیە کە من تێیناگەم و ناتوانم ئەنجامیان بدەم.

کۆنستانتین لەڤین ئەوەندە بە توندی و ئاڵەتییانە دەدوا کە دەتگوت بەنداوی وتەی تەقیوە و سێڵاوی ئاخافتنی هەستاوە. سرگی ئیڤانۆڤیچ پێکەنی و گوتی:

ـ ئێستا وایدانێ سبەینێ خۆت بانگکرای بۆ دادگا، یانی بە باشتری دەزانی بەپێی یاسای دادگایی کردنی قەدیم موحاکمە بکرێی؟

ـ من بۆ دادگا بانگ ناکرێم. من هیچ کەس سەر نابڕم و کاریشم بە دادگا نییە ـ دیسان پەڕییە نێو باسێکەوە کە پێوەندیی بە باسە سەرەکییەکانەوە نەبوو، گوتیشی: ئەم دامەزراوانەی ئێمە وەك ئەو نەمامە کاژانە دەچن کە ئێمە لە جێژنی پەنجایەمدا دەیچەقێنین تاکوو وەك لێرەوارە خۆڕسکەکانی ئەورووپا بنوێنێ، بۆیە من ناتوانم ئەو نەمامانە ئاو بدەم و هیچ بڕوایەکیشم بە داهاتوویان نییە.

سرگی ئیڤانۆڤیچ تەنیا شانی هەڵتەکاند و بەو کارە دەیویست سەرسووڕمانی خۆی نیشان بدات کە باسەکەیان چ پێوەندییەکی بە داری کاژەوە هەیە، ئەگەرچی خێرا لە مەبەستی براکەی گەیشتبوو.

گوتی: ئیجازە بدە، باس و دەمەتەقێ و قسە بەزۆراندان ئاوا نابێ.

بەڵام کۆنستانتین لەڤین دەیویست عەیبی خۆی، یانی هۆگر نەبوونی بە کارە کۆمەڵایەتییەکان کە نەیدەویست ددانی پێدا بنێ، پووشبەسەر بکات بۆیە دەستی پێکردەوە:

ـ من پێموایە چالاكیی كۆمەڵایەتی هەتا لەسەر بنەمای بەرژەوەندیی تاكەكەسی مسۆگەر نەبێ، دەوام ناهێنێ. ئەوەش راستەقینەیەكی گشتییە، راستەقینەیەكی فەلسەفی ـ بە لەبزێكی توند و قایم وشەی فەلسەفیی دووپاتكردەوە. وەك ئەوەی بیهەوێ پیشانی بدات كە ئەویش وەك هەموو كەسێكی تر مافی ئەوەی هەیە كە لە بواری فەلسەفەدا قسە بكات.

سرگی ئیڤانۆڤیچ دیسان گرژییەوە و لە دڵی خۆیدا گوتی «ئەویش فەلسەفەی تایبەتی خۆی زەق كردۆتەوە و بۆ سەلماندنی بیروڕای خۆی كەڵكی لێوەردەگرێ.»

ـ باشە، تكات لێدەكەم لێرەدا فەلسەفە وەلانێ. گەورەترین كێشەیەك كە فەلسەفە لە هەموو سەردەمەكاندا لە هەمبەر خۆیدا دیتوویەتی ئەوەبووە كە پێوەندیی ناچاریی نێوان بەرژەوەندیی تاكەكەسی و كۆمەڵایەتی بدۆزێتەوە. بەڵام مەسەلەكە لێرەدا نییە. من ئەگەر نموونە هێنانەوەكەی تۆ روون بكەمەوە كێشەكە وەلا دەچێ، نەمامە كاژەكان ناچەقێنین، هێندێكیان دەنێژین و هێندێكیان تۆوەكەیان دادەچێنین، دەبێ زۆر بە وردی و دڵسۆزییەوە ئاگادارییان لێبكەین. تەنیا ئەو گەلانە داهاتوویان هەیە و دەتوانین بە نەتەوەی خاوەن ژیار و مێژوویان بزانین، كە بتوانین لایەنە گەورە و گرینگەكانی دامەزراوە و ناوەندەكانیان بناسین و ریزی بۆ دانێین.

سرگی ئیڤانۆڤیچ باسەكەی كێشایە سەر بواری فەلسەفی و مێژوویی ـ كە كۆنستانتین لەڤین هەر تەقەی سەری دەهاتـ پاشانیش پێیسەلماند كە بیروڕاكەی جوان نییە.

ـ بەڵام ئەوەیكە تۆ حەزت لەو كارە كۆمەڵایەتییانە نییە، بەهۆی تەوەزەلی و خدەی ئەربابانەی ئێمە رووسەكانەوەیە، تكات لێدەكەم بمبوورە كە ئاوا راشكاوانە قسە دەكەم، من دڵنیام كە ئەم بۆچوونانەی ئێستای تۆ گومڕا بوونێكی كاتییە و هەروا نامێنێ.

كۆنستانتین لەڤین بێدەنگ بوو. هەستی دەكرد كە بە تەواوی شكستی خواردووە، بەڵام سەرەڕای ئەوەش دەیدی كە براكەی لە مەبەستەكەی ئەو نەگەیشتووە. ئێستاش نەیدەزانی هۆیەكەی چییە. یانی بەهۆی ئەوەوە بوو كە نەیدەزانی ئەوەی لە دڵیدایە بە روونی بەیانی بكات، یان هۆی ئەوەبوو كە براكەی حەزی نەدەكرد، یان نەیدەتوانی تێیبگات. بەڵام نەیدەخواست لەو گێژاوی بیر و خەیاڵانەدا ئەوق بێ، وەڵامی براكەی نەدایەوە و كەوتە بیری فیكر و خەیاڵەكانی خۆی كە بە تەواوی لەگەڵ ئەوانە جیاواز بوون.

ـ چاكە با بڕۆین، هەستە با بڕۆین!

سرگی ئیڤانۆڤیچ داموسكی قولاپەكەی لە كەوانەكە هاڵاند و كۆنستانتین لەڤین ئەسپەكەی كردەوە و بەرەو ماڵێ وەڕێكەوتن.

# چوار

بیرۆکەیەك کە زەینی لەڤین کاتی دەمەتەقێ لەگەڵ براکەی پێوەی سەرقاڵ بوو و تایبەت بوو بە ژیانی دەروونیی خۆی، بەم جۆرە بوو: ساڵی رابردوو، رۆژێك کە چووبوو بۆ سەردانی دروێنەوانان و لەسەر گرفتێکی کار لە گزیرەکەی تووڕە بووبوو بۆ هێور کردنەوەی خۆی تەگبیرێکی کردبوو، تەگبیرەکەشی ئەوەبوو هەر خێرا داسەکە لە دروێنەوانێك دەستێنێ و خۆی دەستدەکا بە دروێنەکردن.

ئەو کارە بۆ ئەو هێندە خۆش بوو کە دوای ئەو رۆژە چەندین جار لە دروێنەکردندا بەشداریی کردبوو. جارێکیش تەواوی کێڵگەکەی بەر دەرگای خۆیانی بە تەنیا دووریبۆوە و ئەمساڵیش هەر لە سەرەتای بەهارەوە بڕیاری دابوو چەند رۆژێك داس بە دەستەوە بگرێ و لە بەیانییەوە هەتا ئێوارێ شانبە شانی دروێنەوانان دروێنە بکات. کاتێك براکەی هات لە بیری ئەوەدا بوو بڕیارەکەی بەرێتەسەرێ یان وازی لێبێنێ. نەیدەتوانی دڵی خۆی رازی بکات و چەند رۆژێك براکەی بە تەنیا بەجێ بێڵێ و هەروەها لەوەش دەترسا کە براکەی لەوبارەوە گاڵتەی پێبکات. بەڵام هەر ئەوەندەی کە بە پێیان بەنێو کێڵگەکەدا گەڕابوو چێژی داس بەدەستەوە گرتن و دروێنەکردنی وەبیرهاتەوە و بڕیاری دا سەری بچێت دروێنەکەی نەچێ. دوای ئەو دەمەتەقێ و دەمەقاڵییە لەگەڵ براکەی دیسان وەبیر بڕیارەکەی خۆی کەوتەوە.

لە دڵی خۆیدا گوتی «من پێویستم بە جموجۆڵی جەستەیی هەیە و ئەگەر ئەو کارە نەکەم بەجارێ خولکوخووم تێك دەچێ» ئەگەرچی شەرمی لە براکەی و رەعیەتەکان دەکرد بەڵام بڕیاری دا قسەی خۆی بەرێتە سەرێ.

لەڤین هەر لە ئێوارەوە چووە نووسینگەی ملکەکەی و دەستووری پێویستی سەبارەت بە کاروبارەکان دەرکرد و کەسانێکی نارد بۆ گوندەکانی دەوروبەر هەتا ماڵەغانگێڕەکان خەبەردار بکەن بۆ رۆژی دوایی و دەیویست لە مەزرای کالیناوە گیادوورین دەست پێبکا کە یەکێك لە گەورەترین و باشترین کێڵگەکانی بوو.

بە گزیرەکەی گوت: ماڵەغانەکەی من بنێرن بۆ تیت[117] با بۆم برەڤینێتەوە و تیژی بکات و سبەینێ لەگەڵ خۆی بیهێنێتەوە. رەنگە خۆشم بێم بۆ گیادوورین ـ کاتێ ئەو قسەیەی دەکرد هەوڵی دەدا هەست بە شەرمەزاری نەکات.

گزیر زەردەیەکی گرت و گوتی: بەسەر چاو گەورەم.

شەوێ کاتی چایی خواردنەوە بە براکەشی راگەیاند و گوتی:

ـ وادیارە هەوا بۆ گیادروون زۆر شیاوە، بە باشی دەزانم سبەینێ دەستبەکاربین.

ـ سرگی ئیڤانۆڤیچ گوتی: من زۆرم ماڵەغانگێڕان پێخۆشە.

ـ نازانی منیش چەندەم حەز لێیە. هێندێ جار خۆم لەگەڵ مووژیکەکان ماڵەغان دەگێڕم و سبەینێش دەمهەوێ هەتا ئێوارە شانبە شانی ئەوان کار بکەم.

سرگی ئیڤانۆڤیچ سەری هەڵێنا و بە کونجکاوییەوە چاوی لە براکەی بڕی.

ـ مەبەستت چییە؟ رۆژێك هەتا ئێوارە لەگەڵ مووژیکەکان؟

لەڤین گوتی: بەڵێ، کارێکی زۆر خۆشە.

سرگی ئیڤانۆڤیچ گوتی: بەڵێ، وەرزشێکی خۆشیشە، بەڵام کوا تۆ تاقەتی ئەو کارەت هەیە ـ وتەکەی تام و بۆنی گاڵتەجاڕی پێوە نەبوو.

ـ من تاقیمکردۆتەوە. سەرەتا تۆزێ دژوارە بەڵام دواتر وردە وردە لەگەڵی رادێی. پێموانییە لە ماڵە غانگێڕەکانی تر خوێڕیتر بم.

ـ ئاوا! بەڵام پێم بڵێ بزانم. مووژیکەکان چۆن دەڕواننە ئەو کارەت؟ حەتمەن پێدەکەنن و دەڵێن لەو ئەربابە!

ـ نا، پێموانییە وابن. بەڵام ئەو کارە ئەوەندە خۆشە و لەگەڵ ئەوەشدا هێندە سەختە پیاو دەرفەتی نامێنێ بیر بکاتەوە.

ـ چاکە، نانی نیوەڕۆش لەگەڵ ئەوان دەخۆی؟ خۆ ناکرێ گۆشت قەلی برژاو و شەرابی لافیتت بۆبنێرن.

ـ نا، کاتێك ئەوان بۆ خواردنی نانی نیوەڕۆ دەست دەکێشنەوە من دێمەوە بۆ ماڵێ.

ڕۆژی دوایی لەڤین زووتر لە کاتی ئاسایی هەستا، بەڵام کاروباری پێوەندیدار بە مڵکەکەیەوە تۆزێ وەدرەنگی خست و فریا نەکەوت زوو بڕوا بۆ مەزرا. کاتێك گەیشتێ ماڵەغانگێڕەکان یەکی قەرخێکیان دەرکردبوو و خەریکبوون قەرخی دووهەمیان دادەمەزراند.

---

117- Tite

گەیشتە سەر گردەکە و کە چاوی بە کێڵگەکە کەوت لایەکی دوورابۆوە و لەبەری لای نسارەکەوە دیاربوو. شوێنە دووراوەکان لە دوورەوە خۆڵەمێشینیان دەنواند و جلوبەرگی ماڵەغانگێڕەکان کە لە شوێنی دەسپێکی یەکەم بەردا دایاننابوون لە دوورەوە رەشیان دەکردەوە.

هەرچەندی لە کێڵگەکە نزیکتر دەبۆوە ریزی ماڵەغانگێڕان لەبەر چاوی بەربڵاوتر دەبوون. بەڕیز بەریان لە گیاجاڕەکە گرتبوو و یەکێك کەڕکەی لەبەردا بوو و یەکێکی تریان کراس، وەکوو لیزگە مووروو بەدوای یەکدا ریزیان بەستبوو و هەرکام بە شێوەی خۆی گەوزی لێدەدا. بژاردنی، چل و دوو کەس بوون.

ماڵەغانگێڕان لە کێڵگەکەدا کە زەوییەکی پڕ کەندولەند و ناتەکووز بوو و سەردەمێك بەهۆی بەنداو کەوتبووە ژێر ئاو، بۆیە زۆر بە شێنەیی دەچوونە پێشەوە. لەڤین هێندێك لەو پیاوانەی خەڵکی گوندەکەی خۆیانی ناسییەوە. یەرمیلی پیر کراسێکی شۆڕ و سپیی لەبەردا بوو، پشتی دانەواندبوو و گەوزی لێدەدا و ریزە قەرخی لە دوای خۆی بەجێدەهێشت. ڤاسکای لاویش کە ماوەیەك کاشەوانی خۆی بوو هەر گەوزێکی لێدەدا بە ماڵەغانە دەسك درێژەکەی نیوە مەلۆیەکی دەدوورییەوە. تیت کە پیاوێکی بەلەباریکەی کورتەباڵا بوو، هەر ئەویش لەڤینی فێری ماڵەغانگێڕان کردبوو. ئەو بەرەکەی لەپێش هەموویانەوە بوو قیت راوەستابوو بە ماڵەغانە دەسك درێژەکەی گەوزی لێدەدا و دەتگوت لە مەودای قەرخەکەیدا یاری دەکا. لەڤین دابەزی و ئەسپەکەی لە گوێ ڕێگاکە بەستەوە و رۆیشت بۆ لای تیت. تیت بە پێکەنینەوە کڵاوەکەی لەسەری داگرت و ماڵەغانێکی لەژێر بنچکێك دەرکێشا، دایە دەست لەڤین و گوتی: ئەرباب ماڵەغانەکەت ئامادەیە. چاکم تیژ کردووە، دەڵێی تیخی ریشتاشینە. وەك بە ئاویدا بێنی وایە.

لەڤین ماڵەغانەکەی هەڵگرت و دەستیکرد بە تاقیکردنەوەی. ماڵەغانگێڕەکان کە بەرەکەیان دەرکرد بە ناوچاوانی شەڵاڵی ئارەقە و قاقاکێشان بەدوای یەکدا چوونە سەر ڕێگاکە و بە رووخۆشی سڵاویان لە ئەربابەکەیان کرد. بەڵام هەتا پیرەپیاوە کەڵەگەتە دەموچاو چرچولۆچ و کۆستەکە کە کەڵپۆسێکی کوڵەباڵی لەبەردابوو بەرەکەی خۆی دەرنەکرد و نەگەیشتە سەرجادەکە هیچ کەس لەگەڵی نەکەوتە قسە.

پیرەپیاو چوو بۆ لای لەڤین و گوتی: بڕوانە ئەرباب. کە ماڵەغانەکەت بە دەستەوە گرت ئیتر نابێ راوستی.

لەڤین لە نێوان ماڵەغانگێڕەکانەوە گوێی لە حیلکەی پێکەنینێك بوو.

گوتی: هەوڵی خۆم دەدەم.

ئەوەی گوت و لە دوای تیتەوە راوەستا تاکوو ئەوانی تر دەستبەکاربن.

پیرەپیاو گوتی: وریابە خۆت بریندار نەکەی.

تیت تۆزێ چووە دواوە و جێگای بۆ چۆڵ کرد، لەڤین شانی لێداخست. گیاوگژی قەراغ رێگاکە زۆر هەڵنەستابوو لەڤینیش لەمێژ بوو ماڵەغانی بەدەستەوە نەگرتبوو و پێیناخۆش بوو کە لادێییەکان سەرنجی دەست و کارەکەی دەدەن، چەند خولەکی سەرەتا لە کارەکەی خۆی رازی نەبوو و زۆری گوشار بۆخۆی هێنا. لە پشت سەرییەوە گوێی لەو قسانە بوو:

ماڵەغانەکەی بەکار نایە، دەسکەکەی خوارە. چاو لێکە چۆن خۆی نووشتاندۆتەوە.

یەکێکی تر گوتی: پاژنەت لە زەوی توند بکە.

پیرەپیاوە گوتی: قەیناکا. چاك دەبن. وردە وردە دەستی رادێ. دیتووتە، ئەوە کەوتە سەربارەکەی... ئەو قەرخەی شانی بۆ داخستووە زۆر بەرینە. خۆی ماندوو دەکا... ئەربابە ئیتر، کار بۆخۆی دەکا.... بەڵام بڕوانن زۆری لەسەر لێدەدا... ئەوە ئێمە ئاوامان کار بکردایە دەیانکێشا بە سەرماندا....

گیایەکە وردە وردە نەرمتر دەبۆوە. لەڤین گوێی لە قسەی ماڵەغانگێڕەکان بوو بەڵام وەڵامی نەدەدانەوە و هەوڵی دەدا باشتر شان لە کارەکەی داخا، لە دوای تیتەوە قەرخی لێدەدا. سەد هەنگاوێك چوونە پێشێ. تیت لەسەرەخۆ دەچووە پێشێ و رانەدەوەستا و شەکەتیی پێوە دیارنەبوو. لەڤین دەترسا نەتوانێ بەرەکە دەرکا، چونکە زۆر ماندووبووبوو.

هەستی دەکرد خەریکە بڕستی لێدەبڕدرێ، بڕیاریدا کە داوا لە تیت بکات راوەستێ، بەڵام هەر لەوکاتەدا تیت راوەستا و دانەوییەوە قولێکی گیا هەڵگرت و دەمی مەڵەغانەکەی پێخاوێن کردەوە و زبرەکەی بەر پشتێنەی دەرهێنا و دەستیکرد بە تیژ کردنەوەی. لەڤینیش پشتی هەڵێنایەوە و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و چاوێکی لە دەوروبەر کرد. مووژیکێك لە دوای ئەوەوە بوو دیاربوو ئەویش زۆر ماندووبووە، چونکە هێشتا نەگەیشتبووە لای لەڤین راوەستاو دەستی کرد بە تیژکردنی ماڵەغانەکەی. تیت ماڵەغانەکەی خۆی و لەڤینی تیژ کردەوە و شانی لێداخستەوە.

جاری دووهەمیش کارەکە هەر بەو شێوە رۆیشتە پێشێ. تیت هەنگاو بە هەنگاو دەڕۆیشتە بەرەوە و راوەستانی نەبوو و شەکەتی نەدەناسی. لەڤین بڕێك لە دوای ئەوەوە بوو. هەوڵی دەدا ئیتر رانەوەستێ و کارەکەی جارلەگەڵ جار دژوارتر دەبوو. هێندێ جار هەستی دەکرد خەریکە توانایی و هێزی پێنامێنێ بەڵام راست لەو کاتەدا تیت رادەوەستا و دەستی دەکرد بە تیژ کردنەوەی مەڵەغانەکان.

بەو شێوەیە بەری یەکەمیان دەرکرد و ئەو یەکەم بەرە بە بڕوای لەڤین زۆر دژوار بوو. بەڵام کاتێك کە بەرەکەیان دەرکرد و تیت ماڵەغانەکەی نایە سەر شانی و بە شوێنە دووردراوەکەدا بە نەرمی گەڕایەوە، لەڤینیش وەك ئەو بە شوێنی قەرخەکەی خۆیدا گەڕایەوە. سەرەڕای ئەوەی دەموچاوی شەڵتانی ئارەقەبوو و دڵۆپ دڵۆپ بە لووت و لاملیدا دەهاتە خوارێ و پشتی یەکسەرە خووسابوو و دەتگوت لە ئاوت هەڵکێشاوە، شادییەکی سەیر دڵی داگرتبوو. بەتایبەت شادییەکەی هی ئەوەبوو کە دڵنیا بوو دەتوانێ تاقەت بێنێ.

تەنیا شتێك کە شادییەکەی لێدەشێواند ئەوەبوو کە وەك ئەوانی تر نەیدەتوانی ماڵەغان بگێڕێ. کاتێك چاوی لە قەرخەکەی تیت کرد کە راست دەتگوت لە گەڕووی مارت دەرکێشاوە و لە قەرخەکەی خۆشی دەڕوانی کە خوار و شپرزە و نارێك و پڕ لە داوەڵ بوو لە دڵێخۆیدا دەیگوت «دەبێ کەمتر قۆڵ و باسکم هەڵسووڕێنم و زیاتر شان و نێوقەدم شلکەم و لەگەڵ گەوزی ماڵەغانەکە بیگێڕم.»

لەڤین بۆی دەرکەوت کە تیت بەری یەکەمی زۆر بەخێرایی دەرکردووە و رەنگە ویستبێتی ئەربابەکەی تاقیبکاتەوە و ئەو بەرەی یەکەمیش لە هەموو بەرەکانی دیکە درێژتر بوو. بەرەکانی دوایی ئاسانتر بوون لەو یەکەم بەرە. سەرەڕای ئەوەش لەڤین ناچاربوو هەموو هێز و گوڕی خۆی بخاتە کار تاکوو لە ماڵەغانگێڕەکانی تر وەدوا نەکەوێ.

بیر و هۆشی هەمووی لەلای کارەکەی بوو و دەیویست شانبە شانی پیاوەکانی تر بڕواتە پێشێ و کارەکەی خۆی بە جوانی بەڕێوەبەرێ. ئەو تەنیا گوێی لە خشەی ماڵەغانەکان دەبوو و لە پێش خۆشییەوە تیتی دەدی کە قیت چەقیبوو و بە نەرمی شان و ناوقەدی بادەدا و دەڕۆیشتە پێشێ و کەوانەی قەرخەکەی و ساقەتە و سەرچڵی گیا و گوڵ بە نەرمی شەپۆلی دەدا و بەسەر دەمی تیژی ماڵەغانەکەیدا دەکەوتن، هەروەها بیری هەر لەلای دوایین گەوزی بەرەکان بوو کە زوو دەریبکەن و وچانێك بدەن.

لە جەنگەی کارەکەیدا لەسەر شان و پشتە بەئارەقە خووساوەکەی هەستی بە فێنکاییەکی خۆش کرد کە نەیزانی چییە و لە کوێوەیە. کاتی تیژکردنی ماڵەغانەکەی چاوی لە ئاسمان کرد و دیتی هەورێکی رەش و نەوی بەڕێوەیە و حەتمەن رێژنە و گۆپاڵەبارانێکی قورسی پێیە. هێندێك لە مووژیکەکان بە هەڵەداوان چوون بۆ لای جلەکانیان و بەپەلە لەبەریان کردەوە و هێندێکیشیان وەك لەڤین شانیان هەڵتەکاند و لە دڵەوە سلاویان نارد بۆ ئەو رەحمەتە شادیهێن و نەشەبزوێنە.

زۆریان قەرخی دیکەی کورت و درێژ درەکرد و قەرخی نەرم و شلکی گیایان یەك بەدوای یەکدا ریز دەکرد. لەڤین ئاگای لە تێپەڕینی کات نەمابوو و نەیدەزانی درەنگە یان زوو. گۆڕانێکی بنەڕەتی لە کارەکەیدا پێك هاتبوو، بۆیە زۆری حەز پێدەکرد. لە کاتی ئیشەکەیدا جاری وابوو لەبیری دەچووەوە چی دەکات و هەستی بە بارسووکی و نەشەیەکی زۆر خۆش دەکرد و هەر لەو کاتەدا بوو دیتی بەر کارەکەی ئەویش وەك هی تیت خاوێن و رێکوپێکە. بەڵام کە سەرنجی کارەکەی خۆ دەدا و تێدەکۆشا بە چاکی ئەنجامی بدات لەو کاتەدا بۆی دەرکەوت کە چەندە کارێکی دژوارە و کارەکەی ئاکامی خراپی لێدەکەوتەوە.

کە قەرخێکی تری لێدا و گەڕاوە، دەیویست دەستبکات بە قەرخێکی تر تیت راوەستا و چوو بۆ لای پیرەپیاوەکە و بە سرتە شتێکی پێگوت. هەردووکیان چاویان لە خۆر کرد. لەڤین بەخۆی گوت «ئەوانە باسی چی دەکەن، بۆ ناچنە سەر قەرخێکی تر؟» هەر لەبیریشی نەبوو مووژیکەکان لانیکەم چوار سەعات بوو لەسەریەك کاریان دەکرد و ئێستا کاتی قاوەڵتوون بوو.

پیرە پیاو گوتی: ئەرباب کاتی قاوەڵتوونە.

ـ کوێڕا، ئاوا زوو؟ باشە بچن نان و چاییەکەتان بخۆن.

ماڵەغانەکەی خۆی دا بە تیت و لەگەڵ ماڵەغانگێڕەکان کە دەچوون بۆ لای جلوبەرگ و کەلوپەلەکانیان تاکوو نان و پێخۆرەکانیان بێنن، ئەویش بەژێر وردەبارانی نەرم و بەنێو قەرخەکاندا رۆیشت بۆ لای ئەسپەکەی و تازە وەبیری هاتەوە کە بارانەکە بە قازانج نییە و قەرخ و مەلۆکان تەڕ دەبن و دەگنخێن.

گوتی: ئەوەی دووریومانەتەوە هەمووی زایە بوو.

پیرە پیاو گوتی: نا ئەرباب، بۆ زایە دەبێ؟ لە قەدیمەوە گوتوویانە: بارانباری بیدوورەوە، خۆریش کەوت ویشکی کەوە.

لەڤین ئەسپەکەی کردەوە و بۆ مەیلکردنی قاوە رۆیشتەوە بۆ ماڵێ.

سرگی ئیڤانۆڤیچ تازە لە خەو هەستابوو. لەڤین قاوەکەی خواردەوە و بەر لەوەی براکەی لیباس لەبەر بکات و بچێت بۆ ژووری نانخواردن، گەڕایەوە بۆ مەزرا.

# پێنج

لەڤین دوای خواردنی قاوەڵتی ئیتر نەگەڕایەوە شوێنەکەی پێشووی، بەڵکوو چووە نێوان پیرەپیاوێکی جەفەنگباز و مووژیکێکی لاو کە پاییزی رابردوو ژنی هێنابوو و یەکەم جار بوو کە مەڵەغانی بەدەستەوە دەگرت. پیرەپیاو خۆی داوای لێکرد لەلای ئەوەوە کار بکات.

پیرەپیاو خۆی کۆم نەدەکردەوە و لە پێش لەڤینەوە قەرخی لێدەدا و دەچووە پێشێ. نووکی پەنجەکانی بۆ لای دەرەوە دەگێڕا و بە خۆبادانێکی رێکوپێك و ورد کە دیاربوو زیاتر لە پیاسەکردن گوشار بۆ جەستەی ناهێنێ، بە جووڵانێکی وەك یاریکردن گیاوگژەکەی بەلادا دەخست و لە قەرخێکی رێکوپێکدا ریزی دەکردن. وەك ئەوانە وابوو دەمی تیژی مالەغانەکە لە خۆوە خەریکی گەڕان بێ و دەتگوت بە ئاویدا دەهێنێ.

میشکای لاویش لە دوای لەڤینەوە مالەغانی دەگێڕا. روخساری جحێڵ و خوێنی شیرینی هەمیشە بەبزە رازابۆوە. دوو لقی گیا باخەبێن لێك هاڵاندبوو و لەسەر نێوچاوانی قژی پێبەستبوو. نەرم شان و باهۆی بادەدا و دیاربوو حەزدەکا بمرێ بەڵام لە دەستکاری قورس نەناڵێنێ.

قەرخی لەڤین لە نێوان هەردووکیاندا بوو. کاری قورسی مالەغانگێڕان ئیتر لە کاتی گەرمادا دژوار نەبوو. ئەو ئارەقەی ئازای ئەندامی خووساندبوو فێنکی دەکردەوە و هەتاو کە لە سەر و پشت و دەست و بازۆڵەی رووتی دەدا و دەیسووتاندن زیاتری وزە و توانا پێدەبەخشی و ئەو کاتانەی ئاگای لە خۆی نەدەما و نەیدەزانی چی دەکا تینی زیاتری لە لەش و هەناوی دەگێڕا. دەتگوت مالەغانەکە بە ئاودا دێنێ. ئەو کاتانەش زۆر بۆ ئەو خۆش بوو. لەوانەش خۆشتر کاتێك بوو کە دەگەیشتە قەراخ چۆمەکە و ئەوێ کۆتایی قەرخەکە بوو، پیرەپیاو دەمی مالەغانەکەی بە چیمەنی چڕوپڕ و ئاونگ لێنیشتوودا دێنا و پاشان بە ئاوی چۆمەکە دەیشۆرد. جارێك قوتووە تەنەکە ژەنگاوییەکەی خۆی پڕکرد لە ئاو، کە فەرمووی لە ئەربابەکەی کرد ئاو بخواتەوە، چاوێکی قرتاند و گوتی: فەرموون ئەوە کەواسی منە، قسەی لەسەر نییە، بخۆرەوە.

هەر بەڕاستیش لەڤین قەتی خواردنەوەی ئاوا بەتام و چێژ نەخواردبۆوە کە ئاوێکی شیلەوگەرم و پڕ لە خەشوخاڵی سەوز بوو و بۆنی ژەنگی تەنەکەی لێدەهات. دوای ئاوخواردنەوە خێرا ماڵەغانەکەی نایە سەرشانی و شاد و رووخۆش وەرسووڕا و هەڵتەك هەڵتەك بەرەو شوێنی دەستپێکی قەرخەکان گەڕایەوە و دەرفەتی ئەوەی هەبوو ئارەقەی دەموچاوی بسڕێ و هەناسەیەکی قووڵ هەڵکێشێ و چاو لە دەستەی ماڵەغانگێڕەکان بکات کە وەك لیزگە مووروویێکی درێژ لە گیاجاڕەکەدا ریز بووبوون و بزانێ لە دەوروبەری و لە نێو لێرەوارەکەدا چی رادەبرێ.

هەتا ماندووتر دەبوو زیاتر ئاگای لە دەوروبەری خۆی دەبڕا و لەو کاتانەدا ئیتر دەستی نەبوون کە ماڵەغانەکەیان دەگێڕا، بەڵکوو ماڵەغانەکە خۆی دەگەڕا و قەڵافەتێکی وریا و سەرتاپا پڕ لە هەوای ژیانی بەدوای خۆیدا دەکێشا و ئیش بێ ئەوەی کرێکار بیری لێبکاتەوە، بە شێوەیەکی سێحراوی و بە وردی و رێکوپێکی بەڕێوەدەچوو. ئەو کاتانەش شیرینترین کاتی کار بوون.

دژوارییی کار تەنیا کاتێك بوو کە دەبوو لەو بێ ئیختیار کارکردنە دەست بکێشێتەوە و بیر بکاتەوە، یان کاتێك کە کەندولەندێك لەسەر رێگاکەیدا قوت دەبۆوە و دەبوو گیاوگژی دەوروبەر و نێو قووڵکە و چاڵو چۆڵەکان بدوورێتەوە. پیرەپیاو ئەو کارانەی زۆر بە سانایی بەڕێوەدەبرد. هەرکاتێك تووشی زۆپی یان چاڵێك دەبوو، نەزم و باری گەوزلێدانەکەی دەگۆڕی و گیاوگژی دەوری لەندەکەی بە نووکی ماڵەغانەکە یان قوونەکەی بە لادا دەخست و دەیقرتاند لەگەڵ ئەوەشدا بە وریاییەوە چاوی لە شوێنەکە دەکرد تاکوو بزانێ چی دێتە بەر گەوزی ماڵەغانەکەی. هێندێ جار لاسکی تەرچکی ترشۆکە، یان رمۆسکێکی دەقرتاند و دەیخوارد یان دەیدا بە ئەربابەکەی، یان چیلکەیەکی بە نووکی ماڵەغانەکەی فڕێ دەدا ئەولاوە یان تووشی هێلانە هەوێردەیەك دەبوو کە مەلی دایکە فڕەی دەهات و لە پێش دەمی ماڵەغانەکەوە دەردەپەڕی بۆیە بە ئەسپایی چاوێکی لە هێلانەکە دەکرد و لقە گیای دەوری هێلانەکەی بەجێ دەهێشت یان مارێکی لەبەر پێی خۆیدا دەدی، دەیگرت و بە شەنە دەسك درێژەکەی بەرزی دەکردەوە و پیشان لەڤینی دەدا پاشان لەولاوە بەرەڵڵای دەکرد.

بەڵام گۆڕانی نەزمی کارەکە بۆ لەڤین و ئەو لاوەی لە تەنیشت ئەوەوە کاری دەکرد زۆر ناخۆش بوو. ئەوان هەردووکیان لەسەر نەزم و بارێکی دیار بە ماڵەغانەکەیان گەوزیان لێدەدا

و لەگەڵ خشەی هاوئاهەنگی گەوز لێدانەکەیان گیاوگژ بە شەپۆل بەلادا دەکەوتن و دەبوونە قەرخ و نەیاندەتوانی نەزم و بارەکەیان بگۆڕن و ئاگاداری بەردەمی خۆیان بن.

لەڤین نەیدەزانی کات چۆن تێدەپەڕێ. ئەگەر کەسێك لێیبپرسیبایە لە کەنگێوە خەریکی ماڵەغانگێڕانی دەیگوت نیو سەعاتێك دەبێ. لەکاتێکدا ڕۆژ گەیشتبووە نیوەڕۆ و کاتی خواردنی نانی نیوەڕۆ بوو. پیرە پیاو کاتێك کە دەیویست قەرخێکی تازە دامەزرێنێ سەرنجی لەڤینی بۆ لای ئەو کوڕ و کچە مندالانە ڕاکێشا کە لەلای ڕێگاکە و لەو دەورووبەرەوە دەهاتن بۆ لای ماڵەغانگێڕەکان و چارەکەی نان و گۆزەڵەی پڕ کواسیان بەدەستەوە گرتبوو کە گۆزەڵەکان تۆپەوانەیەك لە زارکەکەیان ئاخنرابوو. لە هێندێ شوێن لە نێو گژوگیاکاندا ئەوق دەبوون.

پیرەپیاو مندالەکانی پیشانی لەڤین دا و گوتی: بڕوانە، جووجەڵەکان هاتن ـ دەستی بۆ چاوی کردە کەپر و چاوێکی لە خۆر کرد.

دوو قەرخی دیکەیان لێدا، پیرەپیاو ڕاوەستا و گوتی: ئەرباب، ئیتر کاتی نانخواردنی نیوەڕۆیە.

ماڵەغانگێڕەکان بە نێو قەرخەکاندا ڕۆیشتن بۆ لای چۆمەکە کە مندالەکان نانیان بۆ هێنابوون و لەلای لیباس و کەلوپەلەکانیان دایاننابوون و چاوەڕێیان بوون. هەموو کۆبوونەوە. ئەوانەی لە گوندە دوورەکانەوە هاتبوون لە ژێر سێبەری عارەبانەکان دانیشتن و ئەوانەی لە نزیکیشەوە هاتبوون چوونە ژێر سێبەری دارە بییەك کە گیاوگژیان بەسەر لقو پۆپەکانیدا دابوو بۆ ئەوەی سێبەرەکەی چڕوپڕتر بێ.

لەڤین کە حەزی نەدەکرد بڕواتەوە بۆ ماڵێ بڕێکیان لەلا دانیشت.

مووژیکەکان ماوەیەك بوو کە ئیتر شەرموشکۆیان لە ئەربابەکەیان نەمابوو و یەکیەك و دوو دوو هاتن بۆ بن دارەکە و ژێر عارەبانەکان و هێندێکیشیان لە چۆمەکەدا خەریکی خۆفێنك کردنەوە بوون و جحێڵەکانیان مەلەیان دەکرد. هێندێکیان خەریکی ڕێکوپێك کردنی شوێنی حەسانەوەکەیان بوون و چارەکەی نانەکەیان دەکردەوە و تۆپەوانەی زارکی گۆزەڵە کواسەکانیان دەردەهێنا. پیرەپیاو لە قاپەکەی خۆیدا هێندێ نانە ڕەقی ورد کرد و پاشان بە دەمی کەوچکەکەی وردی کرد، قوتووە تەنەکە ژەنگاوییەکەی هەڵگرت ئاوی کرد بەسەر ورکەناندا و هێندێ خوێی پێوەکرد، بەر لەوەی دەستبکا بە خواردنی سەری بۆ لای ڕۆژهەلات سووڕاند و دۆعایەکی خوێند.

پاشان لەسەر چۆك دانیشت و بە ئەربابەکەی گوت: فەرموو ئەرباب، ئەوە گۆشتاوی منە، ناخۆی؟

تێکوشیوی پیرەپیاو هێندە خۆش و ئیشتیابزوێن بوو کە لەڤین لە ڕۆیشتنەوە بۆ ماڵێ پاشگەز بۆوە. لەگەڵ پیرەپیاو بوو بە هاوقاپ و لەگەڵ خواردن سەبارەت بە کاروبارەکانی

لەگەڵی دەدوا و دیاربوو زۆر هۆگری هەڵسوکەوتی پیرەپیاوەیە و باسی ژیانی خۆی و ئەو مەسەلە گرینگانەی بۆ دەکرد کە وێدەچوو پیرەپیاو پێی خۆش بێ. هەستی دەکرد لە باری رۆحییەوە لە پیرەپیاو نزیکترە تا براکەی. بۆیە بەردەوام رووخۆش و لیو بەبزە بوو، خۆشەویستییەکی گەرموگوڕیش دەرهەق بە پیرەپیاو لە دڵیدا بوو. کاتێك کە پیرەپیاو هەستا و دۆعای خوێند و هەر لەوێ لە بن سێبەری دارەکە باقەیەك گیای خستە ژێر سەری و راکشا. لەڤینیش چاوی لە ئەو کرد و بێ ئەوەی گوێ بەو مێشە منجڕ و مڵۆزمانە بدات کە بە روخسارە ئارەقە کردووەکەیەوە دەنیشتەوە و بوونەوەر و مێرووی وردیش کە دەچوونە قۆڵ و ملیەوە و ختیلکەیان دەدا لە بن سێبەری دارە بییەکە خۆی لەگەزدا و خەوی لێکەوت، کاتێك خەبەری بۆوە خۆرەکە گەیشتبووە ئەودیوی دارەکە و خەریکبوو سێبەرەکەیان لێدووردەکەوتەوە و دەکەوتنە بەر خۆرەکە، پیرەپیاو ماوەیەك بوو خەبەری بووبۆوە و خەریکی رەقاندنەوە و تیژکردنەوەی ماڵەغانی لاوەکان بوو.

لەڤین چاوێکی لە دەوروپشتی خۆی کرد و دەشتەکەی ناسییەوە. هەموو شتێك لەبەر چاوی گۆڕابوو. دەشتەکە هەمووی دووردرابۆوە و بە پڕشنگێکی تازە و سەیرەوە دەدرەوشایەوە و قەرخە گیای درواو لەسەر زەوی درێژاودرێژ راکشابوون و لە ژێر تیشکی کلومنجڕی عەسردا پانتایی دەشتەکەیان پڕکردبوو لە بۆن و بەرامەی خۆیان. دەون و بنچکەکانی قەراغ چۆمەکە و گیاوگژی دەوروپشتیان دوردرابۆوە و رووت و قووت دیاربوون و چۆمەکە کە سەر لە بەیانی دیارنەبوو ئێستا وەك هێڵێکی زێوین و پێچەڵاوپووچ دەدرەوشایەوە و ماڵەغانگێڕەکان کە کەوتبوونە جموجۆڵ و دەیانویست دەست بکەنەوە بەکار و دیوارەی گیاوگژی چڕوپڕ و نەدرواوە و سووڕانەوەی سەقر و باشوو و لەنگەرگرتنیان لەسەر گیاجاڕە رووتاوەکە، هەمووی لەبەر چاوی لەڤین تازەیان دەنواند. کە بە تەواوی خەو بەریدا، حیسابی کرد کە چەندەیان لە گیاجاڕەکە دووریوەتەوە و ئەمڕۆ فریای چەندەی دیکە دەکەون.

ڕادەی دوورانەوەی گیایەکە بەپێی کاری چل و دوو کەس بێوێنە بوو. تەواوی مەزرا گەورەکە کە بە شێوەی بێگاری لە ماوەی دوو رۆژدا بە سی کەس دەدووردرایەوە، بە رۆژێك تەواویان کردبوو. تەنیا پەڵەیەك مابوو کە درێژیی قەرخەکانی زۆر کەم بوو، بەڵام لەڤین ئەو رۆژە دەیویست هەتا ئەو جێیەی دەلوێ زیاتر بدوورنەوە و زۆر بەداخەوە بوو کە خۆر ئاوا زوو بەرەو ئاسۆی رۆژاوا داگەڕابوو. هەستی بە شەکەتی نەدەکرد. حەزی دەکرد هەتا دەتوانن خێراتر و زۆرتر کار بکەن.

به پیرەپیاوی گوت: پێتوایە بتوانین مەزراکەی گردی ماشکینیش ئەمڕۆ بدوورینەوە؟

ـ بە هیوای خودا، بەڵام ڕۆژ ئەوەندەی بە بەرەوە نەماوە. بەڵێنی ڤۆدکا دەدەی بە کوڕەکان؟

کاتێك ماڵەغانگێڕەکان دیسان بۆ پشوودانی عەسرۆژە دانیشتن و جگەرەکێشەکان جگەرەیان داگیرساند، پیرەپیاو پێیگوتن ئەگەر مەزرای گردی ماشکینیش تەواوبکەن بۆ دەستخۆشانە ئەرباب بانگهێشتنیان دەکا بۆ خواردنەوەی ڤۆدکا.

ماڵەغانگێڕەکان گوتیان: ئەی بۆ تەواوی ناکەین؟ دەیدوورینەوە، تیت، مەگین وانییە، دەستی لێ هەڵێنین زۆر زوو تەواوی دەکەین. شەوێ شێوەکەمان قەڵەو دەبێ ـ لەڕێوە هەستان و بەرەو مەزراکەی گردی ماشکین وەڕێکەوتن و بەدەم ڕێگاوە یەکی بابۆڵەیەکیان خوراد.

تیت لە پێش هەموویانەوە بوو و دەیگوت: زووکەن، ببزوون. وریا بن خۆشتان نەدوورنەوە.

پیر و لاو کەوتبوونە گوڕڕە و هەوڵیان دەدا وەپێش یەکتر بکەون. ئەگەرچی زۆر بە دەستوبرد کاریان دەکرد بەڵام کارەکەیان خراپ و شپرزە نەبوو و بەرکار و قەرخەکان هەروا ڕێکوپێك و خاوێن بوون. لە سووچێکی مەزراکە پەڵەیەك گیا مابوو، ئەویش لە ماوەی پێنج دەقیقەدا تەوا بوو. یەکدوو کەس لە ماڵەغانگێڕەکان لە کۆتایی قەرخەکەیان نزیکبووبوونەوە کە مووژیکەکان ئەوانەی قەرخی خۆیان لێدابوو جلو کەلوپەلەکانیان هەڵگرتبوو و بەسەر ڕێگاکەدا بەرەو مەزرای گردی ماشکین دەڕۆیشتن.

خۆر گەیشتبووە سەر چڵەپۆپەی دارەکانی لای ڕۆژاوا کە ماڵەغانگێڕەکان گەیشتنە مەزرای گردی ماشکین و تەقوکوتی قوتوە ژەنگاوییەکانیان دەهات. گیاوگژی ئەوێ پشتێنەیەك هەستابوو و زۆر گەش و تەرچك و گەڵاپان بوون و زۆر لە شوێن سێوەڕە و مۆسك و چاڕە چەقیلە گیاجاڕەکەیان ڕەنگاندبوو.

دوای ئەوەی تۆزێ بیروڕایان گۆڕییەوە کە لە لای درێژاییی جاڕەکەوە دەست پێبکەن یان لای پاناییەوە، کە پرۆخۆریەرمیلین[118] کە مرۆڤێکی زەبەلاح و ڕەشتاڵە بوو و زۆر ماڵەغانگێڕێکی ئازا و لەزەبر بوو، قەرخێکی لە قەراغەوە لێدا و گەڕاوە و قەرخێکی تری دەست پێکرد. ماڵەغانگێڕەکانی تریش بەدوای ئەودا ریزیان بەست و بە لێژایی لای ڕێگاکەدا داگەڕان و پاشان بەرەولای لێرەوارەکە تێهەڵبوونەوە. خۆر لە پشت دارەکانەوە ئاوا بوو، شەونم

118- Prokhor Yermilin

وڵاتی تەڕکرد و تەنیا ماڵەغانگێڕانی سەر تەمباسکەکە خۆر لێیدا بوون و ئەوانی تر لە خوارەوە لە نێو تەمومژی هەستاو لە عەرزە شێدارەکە و لەودیوی گردەکەشەوە لەبەر نسێی فێنك و شەونماوی کاریان دەکرد و هەموویان شاد و بە نەشە بوون و خشەی ڕێکوپێکی گەوزلێدانی ماڵەغان و ویرەویری گۆرانییان ئاوێتە کردبوو.

بە خشەی نەرمی ماڵەغانەکاندا دیاربوو کە گیاوگژەکە تەرچك و تەڕ و پاراوە و بەرامەیەکی توندی لە دەشتەکە گێڕابوو و بارستایی قەرخەکان بەحاڵ هەنگاوی بەسەردا هەڵدەهاتەوە و درێژاودرێژ وەك گوریس ڕاخرابوون. لەو شوێنانەدا کە قەرخەکان کورت بوون ماڵەغانگێڕەکان هەموو لە پاڵ یەکدا کاریان دەکرد و تەقەی قووتووە تەنەکەی نێو قەدیان و لێکدرانی دەمی ماڵەغانەکانیان و گوڕە و هەرای پڕ لە شادی و وەپێش یەکتر کەوتنیان بووبووە زایەڵە و لە دۆڵ و لێڕەوارەکەدا دەنگی دەدایەوە.

لەڤین وەك پێشوو لە مابەینی مووژیکە لاوەکە و پیرە پیاوەکەدا بوو. پیرەپیاو کەڵپۆسەکەی خۆی لەبەرکردبوو بەڵام وەك پێشوو شاد و سەرخۆش بوو و ئازاد و چالاکانە کاری دەکرد و بە قسەی خۆش و جەفەنگ وەپێکەنینی دێنان. لە نێو لێڕەوارەکەدا بەردەوام کارگی گەورە و تازە هەڵتۆقیو دەهاتە بەر ماڵەغانەکەیان و پیرەپیاو هەرجارێك تووشی دەهات دادەنەوی و هەڵیدەگرتنەوە و دەیخستنە باخەڵییەوە و دەیگوت: ئەمەش دیارییەکی ترە بۆ خێزانم.

ئەگەرچی گیاوگژەکە تورت و پڕ ئاو بوو و لەبەر زەبری ماڵەغاندا خۆی نەدەگرت بەڵام هەڵچوون و داچوون بە هەوراز و نشێوی تەمباسکاکەدا زۆر دژوار بوو. لەسەریەك ئەو هەڵچوون و داچوونە بۆ پیرەپیاو گران و زەحمەت نەبوو، چونکە بە لاقی بەهێز و کاڵەپۆشەوە وردو لەسەرەخۆ دەچووە پێشێ و زۆر بەهێزانە گەوزی لێدەدا و لە لێژەکان وەسەر دەکەوت و بە سەرەو خوارییەکاندا دەگەڕا و ماندوویی نەناسانە و بەهێز و گوڕەوە کاری دەکرد. ئەگەرچی تەواوی ئەندامی و پانتۆڵە فشەکەی کە تۆزێ داکشابوو لە ژێر ئاتەگی کراسەکەیدا دەلەرزییەوە. بەڵام لقێکی گیای خواردن و کارگێکی نەدەبوارد و هەمووی هەڵدەگرتنەوە و بەردەوام لەگەڵ مووژیکەکان و ئەربابەکەی گاڵتەی دەکرد. لەڤین لە دوای ئەوەوە بوو زۆر جار لە دڵی خۆیدا دەیگوت حەتمەن ئێستا لە پێ دەکەوێ، چونکە لە لێژیوا وەسەر دەکەوتن کە هەڵگەڕان بە دەستی خاڵیشەوە دژوار بوو چ بگا بەوەی کە بە ماڵەغانگێڕانەوە وەسەر کەوێ. بەڵام پیرەپیاو زۆر بە ئاسانی دەڕۆیشتە پێشێ و بەبێ

کەموکوورِی قەرخی لێدەدا و گیای چرِوپرِی دەدوورییەوە. لەڤین هەستی دەکرد ئاگرێکی دەروونی پیرەپیاوی وەگەرِ خستووە و هانی دەدا.

## شەش

دوورینەوەی مەزرای گردی ماشکین تەواوبوو. ماڵەغانگێرِەکان دوایین قەرخیان دوورییەوە و جلوبەرگیان لەبەرکردەوە و بەرەو ماڵێ گەرِانەوە. لەڤینیش سواری ئەسپەکەی بوو خوداحافیزی لە مووژیکەکان کرد و رۆیشتەوە بۆ ماڵێ. کە گەیشتە سەر بستووەکە، ئاورِی دایەوە بەڵام ئەوان لە دۆڵەکەدا تەمومژێکی خەست دایپۆشیبوون و تەنیا دەنگی ئاخافتن و قاقاکێشانیان و تەقووکوتی پێکدادانی ماڵەغانەکانیان دەهات.

سرگی ئیڤانۆڤیچ سەعاتێك لەمەوبەر شێوی خواردبوو و لە ژوورەکەی خۆی شەربەتی ئاولیمۆی دەخواردەوە، کاتێك لەڤین بە سەروقژی ئاڵۆزاوەوە هاتەژوورێ کە قژی بە نێوچاوانە ئارەقە کردووەکەیەوە نووسابوو و کراسەکەی بەریشی بەروپشتی لە ئارەقەدا خووسابوو و رەشی دەنواند، نێوشانیشی جێجێ دەوەکی دەردابوو و دەستیکرد بە قسەکردن، براکەی خەریکبوو ئەو گۆڤار و رۆژنامانەی هەڵدەدایەوە کە پۆستەچی تاوێك لەمەوبەر بۆی هێنابوو.

لەڤین کە دەمەتەقێ ناخۆشەکەی رۆژی پێشووی بە تەواوی لەبیرچووبۆوە گوتی: ئێمە هەموو گیاجارِەکەمان دوورییەوە. نازانی چەندە خۆش بوو، خۆزگە لەوێ بوایەی. تۆ بڵێ چیمانکرد؟

سرگی ئیڤانۆڤیچ سەرەتا بە نێوچاوانێکی گرژەوە لە سەرتاپای براکەی روانی و گوتی: هاە، چاو لەو سەروتەرحەی خۆت بکە! باوکەکەمـ بە توورِەیی گوتیشی: دەرگاکە... خێرا دەرگاکە پێوەدە. حەتمەن پۆلێ مێشت لەگەڵ خۆت هێناوەتە ژوورێ.

سرگی ئیڤانۆڤیچ لە مێش وەرِەز بوو و تەنیا شەوانە پەنجەرەی ژوورەکەی دەکردەوە و نەیدەهێشت بە رۆژدا دەرگا و پەنجێرەکان بکرێتەوە.

ـ بە خودا تاقە مێشێکیشم نەهێناوەتە ژوورێ، ئەگەر هێنابێتیشم خۆم دەیگرم. بەڵام نازانی چەندە خۆش بوو. تۆ ئەمرِۆ چۆنت رابوارد؟

ـ من؟ زۆر چاك. بەڵام تۆ بڵێ بزانم، یانی هەر بەڕاستی ئەمڕۆ تا ئێوارە ماڵەغانت گێڕاوە؟ حەتمەن شلوشەکەت بووی. کۆزما چێشت و نانی بۆ سازکردووی.

ـ نا برسیم نییە. لە مەزرا نانم خواردووە. جارێ دەچم خۆم دەشۆم.

سرگی ئیڤانۆڤیچ چاوی لە براکەی بڕی، سەرێکی لەقاند و گوتی: باشە بڕۆ، منیش دێم بۆلات ـ پاشان بە پێکەنینەوە گوتیشی: بڕۆ ئیتر، خێرا بڕۆ ـ کتێبەکانی پێچایەوە و خۆی ئامادەکرد لەگەڵیدا بڕوا. ئەویش کەوتبوە نەشە و نەیدەویست لە براکەی هەڵبڕێ. پرسیی: کاتێك باران دایدا لەکوێ بووی؟

ـ بارانی چی؟ تەنیا نمەبارانێکی ورد بوو. چاکە هەر ئێستا دێمەوە. کەوایە تۆ خۆشت رابوارد، چاکتر، پێم خۆشە!ـ ئەوەی گوت و رۆیشت خۆی بشوات و جلەکانی بگۆڕێ.

چەند خولەك دواتر لە ژووری نانخواردن پێکەوە دانیشتبوون. ئەگەرچی لەڤین پێیوابوو برسیی نییە و تەنیا بۆ ئەوەی کۆزما زویر نەکا لەسەر مێزەکە دانیشت، بەڵام کە یەك دوو پارووی خوارد ئیشتیای کرایەوە و زۆری چێشتەکە پێخۆش بوو. سرگی ئیڤانۆڤیچ بە پێکەنینەوە تەماشای دەکرد.

گوتی: ئەها، لەبیرم نەبوو نامەیەکت بۆ هاتووە. کۆزما نامەکە لە خوارێیە، زەحمەت نەبێ بچۆ بیهێنە. بەڵام لەبیرت نەچێ دەرگاکە جوان پێوەدە.

نامەی ئابلۆنسکی بوو. لەڤین نامەکەی بە دەنگی بەرز خوێندەوە. ستیپان ئارکادیچ لە پترزبۆرگەوە نامەکەی ناردبوو. نووسیبووی «نامەیەکی دالیم بەدەست گەیشتووە، ئەو لە پێرگۆشووە، وێدەچێ گرفتێکی هەبێ. تکات لێدەکەم سەرێکی لێ هەڵێنە، رێنوێنیی پێویستی بکە، چونکە تۆ لە هەموو کارێکدا مامۆستای. بە دیتنی تۆ زۆر خۆشحاڵ دەبێ. بەستەزمانە زۆر تەنیایە. دایکی و باوکی و خوشکی هەموویان لە هەندەرانن.»

لەڤین گوتی: پێم خۆشە. حەتمەن دەچم بۆ لای. یان پێتچۆنە پێکەوە بچین؟ زۆر ژنێکی باشە. وانییە؟

ـ بۆ لەم نزیکانەیە؟

ـ مەوداکەی سی وێرست دەبێ. یان رەنگە چل وێرست. بەڵام رێگاکەی خۆشە. نیمچە سەفەرێکی خۆش دەبێ. حەزدەکەم بێی.

سرگی ئیڤانۆڤیچ هەروا بە پێکەنینەوە گوتی: زۆر چاکە، منیش پێم خۆشە.

دیداری برای چکۆڵە هەر لەخۆڕا وەنەشەی هێنابوو.

لەگەڵ ئەوەی چاوی لە سەروملی تاوەسووتی دەکرد کە لەسەر دەورییەکە دایخستبوو گوتی: هەی بژیی شێرەکوڕ، لەبەر ئەو ئیشتیایەت مرم!

ـ زۆر خۆشبوو، بەڕاستی کار دەرمانێکی بێوێنەیە هەتوانی هەموو دەرد و نەخۆشینێکە. من دەمهەوێ وشەیەکی نوێ بە فەرهەنگی پزیشکی زیادکەم. ئەویش Arbeitskurە[119].

ـ پێموانییە تۆ پێویستت بەو رژیمە هەبێ.

ـ بەڵام نەخۆشە رەوانییەکان زۆریان پێویستی پێیەتی.

ـ بەڵێ، دەبێ تاقیی بکرێتەوە. بەڵام من دەمویست بێم بۆ مەزرا و تەماشای دەست و ماڵەغانەکەت بکەم. بەڵام هەواکەی هێندە گەرم بوو هەتا لێڕەوارەکە هاتم و نەمتوانی، گەڕامەوە. هێندێ لەنێو دارەکان دانیشتم، پاشان بە پیاسەکردن گەڕامەوە بۆ نێودێ. لەوێ چاوم بە دایەنەکەت کەوت و سەبارەت بە بیروڕای مووژیکەکان لەمەڕ ئەو کارانەی تۆوە پرسیارم لێکرد. ئەو جۆرەی کە تێگەیشتم ئەوان کارەکەی تۆیان پێباش نییە. دەیگوت «ئەو کارانە لە ئەرباب ناوەشێتەوە.» لە سەریەك من پێموایە گوندنشینەکان لەسەر ئەو باوەڕەن کە پێویستی زۆریان بەوەیە کە کار بۆ ئەربابەکەیان بکەن و خۆیان بەلای کاری ئەوەوە خەریك بکەن، حەزیش ناکەن لەو سنووره بترازێ کە لە زەینی خۆیاندا بۆیان کێشاوە.

لەڤین وەڵامی دایەوە: رەنگە هەق بە تۆ بێ بەڵام ئەو کارە هێندە خۆشە کە من هەتا عومرم هەیە هیچ شتێکم ئەوەندە پێخۆش نەبووە. دیسان ئەوەش عەیبەکەی لە کوێ دایە؟ ئەوان ئەو کارەیان پێخوش نییە؟ با پێییان خۆش نەبێ، چ بکەم؟ من خۆم پێم وانییە، ئیرادێکی هەبێ. ها؟

سرگی ئیڤانۆڤیچ درێژەی بە قسەکانیدا: وادیارە لەو کارەی ئەمڕۆت زۆر قایلی.

ـ بەڵی، زۆریش. هەموو مەزراکەمان دووربییەوە. لەگەڵ مووژیکێکی پیر ئاشنابووم کە هەر خۆشە لەگەڵی بدوێی. ناتوانی بیهێنییە بەرچاوت کە چ مرۆڤێکە!

ـ چاکە، زۆریش چاك! منیش لە کاری خۆم رازیم. یەکەم دوو مەسەلەی شەترەنجم حەل کرد، کە یەکیان زۆر سەرنجڕاکێش بوو. بە وەگەڕ کەوتنی پیادە دەست پێدەکات، پیشانتی دەدەم. پاشان بیرم لە مشتومڕەکەی دوێنێمان کردەوە.

لەڤین بە رووخۆشی چاوێکی قرتاند و دوای خواردنی شێو زۆر بە ئیشتیاوە بەرەوڕووی براکەی دانیشت و هەرچەندی مێشکی خۆی هەڵگلۆفی و جەختی بۆ بیری خۆی هێنا وەبیری

---

١١٩- وشەیەکی ئاڵمانییە، یانی ڕژیمی کار.

نەهاتەوە مشتومڕەکەی دوێنێیان سەبارەت بە چی بوو. گوتی: مشتومڕی دوێنێ؟ کام مشتومڕ؟

ـ پێموایە هەق بە تۆیە. ناکۆکی و جیاوازی بیروڕامان لەوەدایە تۆ سوود و قازانجی تاکەکەسی بە هاندەری ئیشی کۆمەلایەتی دەزانی و من پێموایە هەموو مرۆڤێکی خاوەن ژیار دەبێ هۆگری بەرژەوەندییەکانی گشتی کۆمەلگا بێ. ڕەنگە هەق بە تۆ بێ و واچاکە چالاکیی کۆمەلایەتی زامنی بەرژەوەندییە تاکە کەسییەکان بێ. لەسەریەك تۆ وەك فەرەنسییەکان دەڵێن خاوەنی خووخدە و سروشتێکی کە لەرادەبەدەر پێی زیادی دادەکێشی و گوێ بە هیچ دەلیل و بەڵگە هێنانەوەیەك نادەی. تۆ، یان بە هەموو تواناتەوە لەگەڵ ئەشقێکی شێتانە دێیتە مەیدان، یان بە موو لە ڕێگە لانادەی و تووشی خەتا نابی.

لەڤین گوێی بۆ قسەی براکەی شل کردبوو، بەلام تێنەدەگەیی و تەنانەت نەیدەویست تێبگا. تەنیا لەوە دەترسا براکەی پرسیارێکی لێبکا و دەرکەوێ کە دڵی بە قسەکانی نەداوە و هیچی لێحاڵی نەبووە.

سرگی ئیڤانۆڤیچ دەستی نایە سەرشانی و گوتی: وایە هاوڕێ، وا نییە؟

لەڤین بە بزەیەکی مندالانە و تاوانبارانەوە وەلامی دایەوە: وایە، بەلام من پێداگری لەوە ناکەم کە قسەی خۆم بەرمە سەرـ لە دڵی خۆشیدا گوتی: «بەلام نازانم مشتومڕەکەمان سەبارەت بەچی بوو؟ هەڵبەت دەزانم هەق بە دەست هەردووکمان بوو. کەوایە کێشەیەکمان نییە. بەلام من دەبێ سەرێك لە نووسینگەی ملکەکەم بدەم و کارەکانم جێبەجێ بکەم.» هەستا سەرپێ خۆی کێشایەوە و زەردەیەکی گرت.

سرگی ئیڤانۆڤیچیش زەردەیەکی گرت و چونکە حەزی نەدەکرد لە براکەی دوور بکەوێتەوە کە شادی و نەشەی لێدەباری، گوتی: پێتخۆشە تۆزێ پیاسە بکەین؟ وەرە با بەیەکەوە بڕۆین. هەستە دەی، ئەگەر پێویست بوو سەرێکیش لە نووسینگەکەت هەڵدێنین.

لەڤین لەپڕ گوتی: هاە، خوداگیان! ـ ئەوەندەش بە دەنگی بەرز گوڕاندی، کە سرگی ئیڤانۆڤیچ هەڵبەزییەوە.

پرسیی: چییە؟ چیبووە؟

لەڤین کێشای بەسەر خۆیدا و گوتی: دەستی ئاگافیا میخائیلۆڤنا؟ هەر لەبیرم نەمابوو.

ـ زۆر چاکە. شوکر دەستی ژانی نەماوە.

ـ زۆر باشە، بەسەر پێیەکەوە دەچم سەرێکی لێدەدەم. هەتا تۆ کڵاوەکەت هەڵدەگری من دەگەڕێمەوە.

بەپەلە بە پلیکانەکاندا چووە خوارێ، پاژنەی کەوشەکانی لەسەر قالدرمەکان دەتگوت ناڵە تەقەی دێ.

## حەوت

ستیپان ئارکادیچ چوو بۆ پترزبۆرگ و قەستیشی لەو سەفەرە ئەنجامدانی پێویستترین و سروشتیترین کار بوو کە هەموو فەرمانبەرانی دەوڵەت بە ئەرکی خۆیان دەزانی و ئەگەرچی ئەوانەی فەرمانبەر نەبوون سەریان لێی دەرنەدەچوو، ئیشی دەوڵەتیش بەبێ ئەوە بەڕێوە نەدەچوو و ئەویش ئەمە بوو کە وەبیر وەزارتخانەی بێننەوە کە بوونیان هەیە. کاتێك ئەو چوو بۆ پترزبۆرگ بۆ بەجێهێنانی ئەرکەکەی ئەوەی پارەی لە ماڵێ بووی هەڵیگرت بۆ ئەوەی بچێتە سەیری کێبەرکێی ئەسپسواری و لە ڤیلاکانی دەرەوەی شار خەریکی دڵچەڕینی و خۆشگوزەرانی بێ، دالی منداڵەکانی هەڵگرت و رۆیشت بۆ لادێ تاکوو برێك لە خەرجی رۆژانەیان کەم بکاتەوە. ئەو چوو بۆ یەرگۆشوو ئەو مڵکەی وەك جیازی کاتی شووکردن هێنابووی بۆ ماڵی مێردەکەی، هەر ئەو مڵکەی کە ستیپان ئارکادیچ بەهارێ دارستانەکەی فرۆشتبوو و پەنجا وێرست لەگەڵ پاکرۆسکایا، مڵکەکەی لەڤین مەودای هەبوو.

باڵەخانەی گەورە و قەدیمی ئەو مڵکە لەمێژ بوو لە کەڵك کەوتبوو و پرێنس یەکێك لە باڵەخانەکانی تەنیشتی لە باڵەخانە ئەسڵییەکە جیاکردبۆوە و بە جوانی نۆژەنی کردبۆوە و بۆ نیشتەجێبوون ئامادەی کردبوو. ئەو باڵەخانەیە بیست ساڵ لەمەوبەر، یانی کاتێك کە دالی منداڵ بوو، دروست کرابوو. ماڵێکی زۆر گەورە و جێدار و بەرژەوەند خۆش بوو. ئەگەرچی وەك باڵەخانەکانی تەنیشتی هەتاوگر نەبوو و جادەکە دەکەوتە تەنیشتییەوە و بە بەر ماڵەکەدا تێنەدەپەڕی، هەڵبەت ئێستا ئەو باڵەخانەیە لە کەڵك کەوتبوو و بووبووە کەلاوە. سەرلە بەهارێ کە ستیپان ئارکادیچ بۆ فرۆشتنی دارستانەکە هاتبوو دالی داوای لێکردبوو سەرێکیش لەو باڵەخانەیەی هەڵێنێ و ئەگەر پێویستی بە نۆژەنکردنەوە هەبوو، وەستا و کرێکاری بۆ

بگرێ. ستیپان ئارکادیچ، وەك هەموو مێردە تاوانبارەکان کە زۆر گرینگی بە دڵحەسانەوەی هاوسەرەکەیان دەدەن، چووبوو بۆ دیتنی باڵەخانەکە و ئەوەی پێویست بوو ئەنجامی دابوو. ئەو پێیوابوو بەرگی قەنەفەکان بگۆڕدرێن باشە و هەموو دەرگاو پەنجێرەکانیش پەردەیان پێدا بدرێ و باخەکەش برازێتەوە و گوڵی تێدا بچێندرێ، هەروەها پردێکی لاجامەدار بۆ جوانی لەسەر بەنداوەکە هەڵبەسترێ، بەڵام گۆڕین و چاککردنەوەی تریش زۆر مابوو کە ناچاربوو ئەنجامیان بدات و دەشیزانی چاوپۆشیکردن لەوانە دەبێتە هۆی زویربوونی داریا ئەلکساندرۆڤنا، بەڵام لەبیری چووبوو.

ستیپان ئارکادیچ ئەگەرچی زۆری هەوڵ دەدا باوکێکی دڵسۆز و مێردێکی مێهرەبان بێ بەڵام نەیدەتوانی، لە بیریشی نەبوو کە ژن و منداڵی هەیە و خووخدەی پیاوانی رەبەنی رەچاو دەکرد. کاتێك گەڕایەوە بۆ مۆسکۆ سەربەرزانە مزگێنی بە ژنەکەی دا کە ئەوەی پێویست بووە ئەنجامی داوە و ماڵەکەی وەك چەپکە گوڵ لێکردووە و داوای لێکرد بچێت ببینێ. چوونی دالی بۆ دێ لە زۆر لایەنەوە بۆ ستیپان ئارکادیچ خۆش بوو. ژیان لە گوند بۆ منداڵەکانیش باش بوو و دەبووە هۆی ئەوەی خەرجی رۆژانەیان کەم بێتەوە و لەلایەکی ترەوە ئەویش لە مۆسکۆ دەیتوانی ئازادانەتر رایبوێرێ. بەڵام داریا ئەلکساندرۆڤنا بۆ تەندروستیی منداڵەکانی سەفەری هاوینەی بۆ گوند زۆر بە باش دەزانی و بەتایبەت بۆ کچۆڵەکەی کە دوای نەخۆشیی مێکوتە هەروا کز و لاواز مابوو و هەروەها بۆ ئەوەی ماوەیەك لە چنگ پرتەوبۆڵەی ئێزنگفرۆش و ماسیفرۆش و پێنەچی رزگاری بێ کە دەبوونە هۆی ئازار و خەفەتی و حەزی دەکرد ماوەیەك سەری سووك بێ. جگە لەوانەش بۆیە پێی خۆش بوو بچێت بۆ گوند دەیویست کاتێك خوشکی لە هەندەران گەڕایەوە کە بڕیاربوو نێوەڕاست مانگی هاوین بگەڕێتەوە، بیهێنێ بۆ ئەوێ چونکە پزیشکەکان پێیانوابوو مەلەکردن بۆ ئەو زۆر باش و بەکەڵکە. کیتی لە شارۆچکەی گراوەوە بۆی نووسیبوو کە هیچ شتێکی لەوە پێخۆشتر نییە کە هاوینێ لەگەڵ ئەو (یانی دالی) لە گوندی یەرگۆشوو رایبوێرێ کە داروبەردی پڕە لە بیرەوەریی سەردەمی منداڵی.

ژیان لەو گوندە سەرەتا بۆ دالی زۆر دژوار بوو. ئەو بە منداڵی لە دێ ژیابوو و ئەو خەیاڵەش لە زەینیدا بوو کە گوند ئەو لە چنگ ئازار و تاڵییەکانی شار دەربازدەکات و ژیان لە ئاوایی ئەگەرچی جوان و پڕ باقوبریق نییە (دالی بە سانایی لەگەڵ ئەو تەنگوچەڵەمانە راهات) بەڵام خۆش و دڵگرە و هەموو کارەکان بە ئاسانی بەڕێوەدەچن و دەبێتە هۆی بێخەمی و حەسانەوەی مێشك. لە دڵی خۆیدا گوتی «ئەوەی پێویستت بێ لێیەتی و بە هەرزان وەگیر

دەکەویٚ و دەستی پیٚڕادەگا، بۆ منداڵەکانیش زۆر بەکەڵکە.» بەڵام ئیٚستا وەکوو پلەوپایەی خاتوونیٚکی کابان و دایکی منداڵان هاتبوو بۆ گوند و دەیدی بارودۆخەکە بەهیچ شیٚوەیەك بەو جۆرە نییە کە بیری لیٚدەکردەوە.

هەر ئەو رۆژە دوای هاتنیان ریٚژنە بارانیٚك دایدا. شەویش داڵان و ژووری منداڵەکان پڕ بوون لە ئاو، بەجۆریٚك کە ناچاربوون نویٚن و بالیفی منداڵەکان بەرن بۆ ژووری میوانداری. ژنانی خزمەتکاریش هیچ کام نەیانتوانی ئاشپەزییان بۆ بکەن و بە وتەی ژنی گاوانەکە لەو نۆ مانگایەی بوویان، سیانیان ئاوس بوون و دوانیان بیٚژووکەزا بوون، یەکیان پیر بوو، ئەوانی تریش شیریان تیٚدا نەبوو، بەجۆریٚك کە نە نڤیشك و ماست هەبوو نە شیر کە منداڵەکان تیٚری پیٚبخۆن. نە هیٚلکە و مریشك هەبوو، بۆیە ناچاربوون کەڵەشیٚرە پیرەکان سەربڕن کە گۆشتەکەیان رەش و شین و جیڕبوو کە دەیانکردە تەڕەکەباب یان سووریان دەکردەوە، لەبەرجیڕی نەدەخورا. لەو ژنانە هیچ کەس نەبوو تەرکی ژوورەکان بشواتەوە، هەموو بۆ چەقاندنی پەتاتە چووبوون بۆ مەزرا. تەنانەت نەدەکرا بە عارەبانە بچن بۆ گەشت و گەڕان چونکە یەکیٚك لە ئەسپەکان سرك بوو و نەدەکرا خامووتەکەی لە مل بکەن. مەلە کردنیش نەدەلوا چونکە لیٚواری چۆمەکە بووبووە جیٚمۆڵ و پڕبوو لە کیٚویلە وپەینوپاڵی ماڵات و هیچ پەرژین و تەیمانیٚکی بۆ نەکرابوو و لەلای جادەکەوە بە جوانی دیاربوو. تەنانەت بۆ پیاسەکردنیش نەدەبوو چونکە تانۆکی باخەکە بەجاریٚ لەبەریەك هەڵوەشابوو، مانگاکان بەرگیٚڕەوەیان نەبوو و دەهاتنە نیٚو دارەکانەوە. گاڕانەکە جوانەگایەکی تیٚدا بوو کە زۆر زەبەلاح و ترسناك بوو، بەردەوام دەیبۆڕاند و ویٚدەچوو سەرشیٚتیش بیٚ. دۆڵابیٚك نەبوو جلوبەرگەکانی تیٚبخەن و ئەوانەی بووشن دەرگاکانیان پیٚوەنەدەدرا و هەرکەسیٚك بەلایاندا تیٚپەڕیبایە لەخۆوە دەکرانەوە. مەنجەڵی فافۆن و سویٚنە و تەنانەت تەشت و قازانی گڵیٚنەش بۆ گەرمکردنی ئاو و شۆردنی جلوبەرگ وەدەست نەدەکەوت. ژووری خزمەتکاران تەنانەت تەختەیەکیشی لیٚنەبوو بۆ ژیٚر وتوو.

داریا ئەلکساندرۆڤنا رۆژانی سەرەتا نەیدەزانی لەگەڵ ئەو بارودۆخە ناخۆش و نالەبارە چۆن هەڵبکات و نەیدەزانی چ بکات، ئەو بەهیوا بوو لەویٚ ژیانیٚکی ئاسوودە و بیٚخەم رابویٚرن کەچی راست بەپیٚچەوانە بوو. بە هەموو توانایەوە هەولیٚدەدا و خۆی لە تەنگژەیەکی بیٚدەرەتاندا دەدی، سات لەدوای سات ناچاربوو خۆی بخواتەوە و لە ناخەوە هەڵقرچیٚ و ددان بەخۆیدا بگریٚ و نەهیٚڵیٚ فرمیٚسك لە چاوی داوەریٚ. گزیری مڵکەکەی کە پیٚشتر ملازم بوو و

بە ئاکار و هەڵسوکەوتی سەرنجڕاکێش و بەڕێزانە جێی خۆی لە دڵی ستیپان ئارکادیچدا کردبۆوە و لە پیشەی دەرگاوانییەوە گەیشتبووە پلەی گزیری، بۆ دەزباز کردنی داریا ئەلکساندرۆڤنا لەو بارودۆخە تاڵ و پڕ چەرمەسەرییە هیچ هەوڵێکی نەدەدا و تەنیا بە راوێژێکی بە ئەدەبانە دەیگوت: ناکرێ هیچ چاوەڕوانییەکت لەو لادێییە بێشعوورانە هەبێ. هیچ کارێکیشمان پێناکرێ.

بۆ دەربازبوون لەو گرفت و کوێرەوەرییە رێگایەك نەبوو. بەڵام لە ماڵی ئابلۆنسکی وەکوو هەموو ماڵێکی تر پیرێژنێك هەبوو کە زۆر بێدەنگ و لەسەرەخۆ، بەڵام زۆر خاوەن ئەزموون و لێزان بوو. ئەو پیرێژنە ناوی ماتریایۆڤنا فیلیمۆنۆڤنا[120] بوو. هەوڵێدەدا دڵی خاتوونەکەی خۆش بکات و دڵنیای دەکرد کە «جێبەجێدەبێ: (ئەمە قسەی ئەوبوو و لە زاری ماتڤێ هاتبووە دەرێ) هەر بۆیە خۆی بە شێنەیی و بەبێ هەڵچوون و تووڕە بوون قۆڵی هەڵماڵی و دەستبەکاربوو.

هەر ئەو رۆژە خێرا رۆیشت بۆ لای ژنەکەی گزیر و لەگەڵ ئەو و مێردەکەی لەژێر دار ئەقاقییەکان چایی خواردەوە و هەموو گیروگرفتەکانی لەگەڵ هێنانە گۆڕێ. زۆری نەخایاند کە ژێر سێبەری دار ئەقاقییەکان بوو بە لێژنەی ماتریایۆڤنا فیلیمۆنۆڤنا و لە رێگای ئەو لێژنەیەوە کوێخا و ژنەکەی و ژمێریاری ملکەکەیان کە ئەندامی ئەوبوون گرفتەکان وردەوردە چارەسەر کران و لە ماوەی حەوتوویێکدا هەموو کارەکان بەڕاستی «جێبەجێ بوون». دڵۆپەی میچی ژوورەکان چاك کران، دایەنی کوێخایان هێنا بۆ ئاشپەزی و مریشکیان کڕی و نەبوونی شیریان چارەسەر کرد و تانۆکی دەوری باخەکەشیان نۆژەن کردەوە، دارتاش تەختەیەکی بۆ جلشۆردن دروست کرد و دەرگای دۆڵابەکانی چاك کردەوە و زەوارە و ئاڵقەڕێز و دوولایی لێدان و ئیتر نەدەکرانەوە. تەختەیەکی راستیان هێنا جاویان تێپێچا و سەرێکیان لەسەر دەسکی کورسییەك دانا و سەرەکەی تریشی لەسەر دۆڵابەکە، پاشان بۆنی ئوتوو ژوورەکەی داگرت.

ماتریایۆڤنا فیلیمۆنۆڤنا تەختەی ئوتووەکەی پیشاندا و گوتی: فەرموون، دیتووتە هەموو شتێك جێبەجێ بوو و ئیتر خەمی ناوێ.

تەنانەت پەرژینێکیان لە حەسیر دروست کرد و لە دەوری ئاوبەندەکەیاندا و لیلی توانیی مەلە بکات. کەرەسە و پێداویستی ژیانێکی ئاسوودە لە گوند دابینکرا، ئەگەرچی بەو

---

120- Matriona Filimonovna

ئاسانییە نەبوو کە داریا ئەلکساندرۆڤنا بیری لێدەکردەوە. هەڵبەت داریا ئەلکساندرۆڤنا بە شەش منداڵەوە نەیدەتوانی ژیانێکی ئاسوودەی هەبێ. یەکیان خەریکبوو نەخۆش دەکەوت و ئەوی دیکەیان مەترسیی نەخۆشیی لەسەر بوو. یەکیان داوای شتێکی دەکرد و ئەوی دیکەش پەڵپو بیانووی دەگرت، لەمجۆرە گرفتانە زۆر بوون و حەجمانیان لە داریا ئەلکساندرۆڤنا هەڵگرتبوو. زۆر بە دەگمەن هەڵدەکەوت ماوەیەکی کورت بە بێکێشە و دڵەخورپە رایبوێرێ. بەڵام ئەو کێشە و دڵەخورپە و گرفتانە تەنیا شتێك بوون کە داریا ئەلکساندرۆڤنا پێوەی سەرقاڵ دەبوو. ئەگەر ئەوانە نەبوایەن لەگەڵ فکر و خەیاڵی مێردەکەی دەکەوتە کێشەوە کە خۆشی نەدەویست. جگە لەوانەش ئەوەندەی کە نەخۆشی و خەم و پەرێشانی و دیاریدانی خووخدەی ناحەزی منداڵەکان بەژان بوو، داخی مێردەکەی سەرباری هەموویان بوو. بەڵام ئەو تاڵی و دڵەخورپە و خەمانە بە دیتنی هەڵخولان و هەڵبەزدابەزی منداڵەکانی هەمووی لەبیردەچۆوە. ئەو شادییانە هێندە بچووك بوون دەتگوت ریزە ئاڵتوونن لە نێو خیزەڵانیدا و ژنە لە کاتی خەم و دەردەسەریدا تەنیا رەشایی و دەنکە خیزەکانی دەدی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کاتوساتی خۆشی و دڵشادیش بوو کە ئەو تەنیا رێزە ئاڵتوونەکانی دەهاتە بەرچاو.

ئێستا لەو خەڵوەتەی ژیانی لادێدا داریا ئەلکساندرۆڤنا زیاتر ئاگای لە شادی و چێژەکانی ژیانی خۆی هەبوو. زۆر جار کە بە وردی دەیڕوانی بە سەد شێوە هەوڵیدەدا بەخۆی بسەلمێنێ کە بە هەڵە چووە و چاوی دایك خەتاپۆشە و کەموکوورییەکانی جگەرگۆشەی نابینێ. سەرەڕای ئەوانەش نەیدەتوانی لە دڵی خۆیدا نەڵێ هەرچییەك بێ منداڵی باشی هەیە و هەر شەشیان، هەرکامە و بە شێوەیەك بێوێنەن و بەو هۆیە هەستی بە خۆشی و شادی دەکرد و شانازیی پێوە دەکردن.

## هەشت

ئاخروئۆخری مانگی مەی، کە گیروگرفتەکانی ژیان هەموو تا رادەیەك چارەسەر کرابوون، نامەیەکی ستیپان ئارکادیچ هات کە لە وەڵامی گلە و گازەندەکانی داریا ئەلکساندرۆڤنادا نووسیبووی. مێردەکەی لەو نامەیەدا داوای لێبوردنی کردبوو کە هەموو گرفت و کەموکوورییەکانی

بە جوانی نەدیوە و چارەسەری نەکردوون. بەڵێنیشی دابوو کە بە زووترین کات دێ بۆ لایان. بەڵام ئەو دەرفەتەی بۆ نەڕەخسا و داریا ئەلکساندرۆڤنا هەتا یەکەمی ژوئەن لەو گوندە مایەوە.

یەکشەممە رۆژێك بەر لە جێژنی سێنپییەر هەموو منداڵەکانی برد بۆ کلێسە. داریا ئەلکساندرۆڤنا لە نێو قسەکانیدا کە بە شێوەیەکی خۆمانە و بە درێژدادڕی لەگەڵ خوشکی و دایکی یان دەستە خوشکەکانی دەدا و بە بیری بەرز و ئازادی خۆی سەبارەت بە ئایین ئەوانی تووشی سەرسووڕمان دەکرد. ئەو مەزەبێکی سەیر و تایبەت بەخۆی هەبوو کە دەچووە سەر بنەمای دۆنادۆن و باوەڕێکی قورسیشی پێی هەبوو و زۆری گوێ بە فێرکاریی نەگۆڕ و چەقبەستووی کلێسە نەدەدا. بەڵام وەك دایکێك، نەك هەر بەو مەبەستەی کە سەرمەشقی منداڵەکان بێ، بەڵکوو بە سەداقەت و ئیمانێکی قایمەوە ئەرکە مەزەبی و کلیسایییەکانی خۆی بەجێ دەهێنا و لەوێ کە ماوەی ساڵێك بوو منداڵەکانی نەچووبوون بۆ کلێسە تەواو دڵگران بوو. بۆیە بڕیاری دا لەم هاوینەدا و لەو گوندە ئەرکی خۆی بەجێ بێنێ و ماتریایۆڤنا فیلیمۆنۆڤناش لەگەڵی هاوبڕوا بوو و بڕیارەکەی زۆر بەدڵ بوو.

داریا ئەلکساندرۆڤنا لە چەند رۆژ لەمەوبەرەوە لە بیری ئەوەدابوو، کە بۆ کلێسە چی لەبەر منداڵەکانی بکات. دەستێکی بە جلوبەرگە کۆنەکانیاندا هێنا و رەنگوڕوویێکی تازەی پێبەخشین، کۆبە و لێچەکی لە پەراوێزەکانیان دا و بە دوگمە و کەلبەدوون رازاندنییەوە. تەنیا کراسی تانیا، کە پەرستاری ئینگلیزی دوورینەکەی لە ئەستۆ گرتبوو، جوان دەرنەهاتبوو و داریا ئەلکساندرۆڤنا رقی هەستا و زۆریش زویربوو. ئەو کچە ئینگلیزییە کە بڕیاربوو کراسەکە لە رووی نموونە کراسێکی ترەوە بدوورێ چینەکەی لە جێی خۆی لێنەدابوو و قۆڵی کراسەکەشی زۆر فشوفۆڵ دووریبوو، بەجۆرێك کە کراسەکە بۆ دەستکاری نەدەبوو و خەساری کردبوو. تانیا هێندەی ئەو کراسە لێ ناشیرین بوو کە هەرکەسێ دەیدی دڵی پێیدەسووتا. بەڵام ماتریایۆڤنا فیلیمۆنۆڤنا چارەیەکی بۆ دۆزینەوە ئەویش ئەوە بوو. پارچە والێکی بە نێوشانی کراسەکەدا دووری، کە پینەکەی دادەپۆشی. کاری کراسەکە تا رادەیەك جێبەجێ بووبوو، بەڵام کێشە لەگەڵ کچەی ئینگلیزی خەریکبوو ئاکامی خراپی لێبکەوێتەوە. هەتا بەیانی هەموو شتێك ئامادەبوو و کاتژمێر نۆ (داوایان لە قەشە کردبوو هەتا ئەو کاتە مسەبایەك بگرێ.) منداڵەکان شاد و دڵخۆش بە جلوبەرگی تازەوە لەسەر قاڵدرمەی هەیوانەکە راوەستابوون و چاوەڕوانی دایکیان بوون تاکوو بێت و سواری عارەبانە بن.

بەجێی ئەسپە ڕەشی تۆڕ و سەرشێت لە سەر ویستی ماتریایۆڤنا فیلیمۆنۆڤنا ئەسپە شێی گزیریان لە عارەبانەکە کرد. ئاخری داریا ئەلکساندرۆڤنا، کە بەهۆی رازاندنەوەی منداڵەکانەوە وەدوا کەوتبوو، بە کراسێکی سپیی ناسکەوە لە ماڵ هاتەدەرێ و سواری عارەبانەکە بوو.

داریا ئەلکساندرۆڤنا بە دڵەدوایی و هەیەجانەوە جلەکانی لەبەرکرد و بسکی داهێنا. لە رابردوودا بە دڵی خۆی لیباسی لەبەردەکرد و دەیویست جوان بێ و سەرنجی خەڵکی ڕاکێشێ. بەڵام هەرچەندە زیاتر دەگەڕاوە خۆڕازاندنەوەی پێ ناخۆشتر بوو، چونکە دەیدی کە بەردەوام ناحەز دەبێ، بەڵام ئێستا دیسان بە ئەشق و هەیەجانەوە لیباسی لەبەرکرد. ئیتر خۆڕازاندنەوەکەی نە بۆ دڵی خۆی بوو نە بۆ ڕاکێشانی سەرنجی خەڵك، بەڵکوو تەنیا قەستی لەو خۆخەملاندنە ئەوەبوو، کە لە نێوان چەپکە گوڵەکانیدا نەبێتە بنجە دڕوو. بۆ دوایین جار لەبەر ئاوێنەکە لە خۆی ڕوانی، بەژن و باڵای خۆی بەدڵ بوو. جوان بوو، بەڵام نەك ئەو جوانییەی کە بە کیژی بە ئاواتەوە بوو لە کۆڕی سەما و هەڵپەڕکێدا بەشداربێ و خۆی بنوێنێ، بەڵکوو بەشێوەیەك کە لەگەڵ ویستی هەنووکەی سازگار بێ.

لە کلێسە جگە لە گوندنشینان و خزمەتکاران و ژنەکانیان کەسی تری لێنەبوو، بەڵام داریا ئەلکساندرۆڤنا دەیدی یان پێی وابوو دەبینێ، کە خۆی و منداڵەکانی سەرنجی خەڵکیان ڕاکێشاوە و ئاواتیان بۆ دەخوازن. منداڵەکانی نەك هەر جلوبەرگەکانیان جوان بوو و سەروپۆتراکیان قسەی لەسەر نەبوو، بەڵکوو کردەوە و هەڵسوکەوتیشیان دڵگر و بە ئەدەبانە بوو. هەڵبەت ئالیووشا هەدای نەدەدا و بەردەوام لای دەکردەوە و دەیویست پشتی قەمسەڵە تازەکەی ببینێ. لەگەڵ ئەوەشدا زۆر لە دڵەوە نزیکبوو. تانیا وەك ژنێکی گەورە ڕاوەستابوو و ئاگای لە خوشك و برا چکۆڵەکانی بوو. بەڵام لیلی کە پاشەبەرە بوو بە ساویلکەییەکی منداڵانەوە کە هەموو شتێکی پێ سەیر بوو، سەرنجی هەمووانی بۆ لای خۆی ڕاکێشابوو، کاتێك دیتیان پەنچکە نانی متفەڕکی خوارد و بەشەڕابی متفەڕك لێوی تەڕکرد و بە ئینگلیزی گوتی: «Please Some more»[۱۲۱] زۆر دژوار بوو دان بە خۆتا بگری و پێنەکەنی.

منداڵەکان کاتێك بۆ ماڵ گەڕانەوە هەستیان دەکرد، کە کارێکی زۆر گرینگ و پڕشکۆیان ئەنجامداوە و هەوڵیان دەدا زۆر ئارام و لەسەرەخۆ بن.

---

۱۲۱- تکایە دیسانیش بمدەیە.

که گەیشتنەوە ماڵێش هەموویان شاد و رووخۆش بوون و قرە و لە یەکتر سرەواندن دەتگوت لە زاتیاندا نەماوە. بەڵام گریشا لەسەر مێزی قاوەڵتوون دەستیکرد بە فیتوولێدان و لەوەش خراپتر لە هەمبەر پەرستاری ئینگلیزیدا دەمدەرێژیی کرد و ناچاربوون سزای بدەن و لە خواردنی تۆلتۆلەی شیرین بێ بەش بوو. داریا ئەلکساندرۆڤنا ئەگەر لەوێ بوایە نەیدەهێشت لە رۆژێکی ئاوادا سزا بدرێ. بەڵام ناچاربوو پشتیوانی لە پەرستارەکە بکات و کچەی ئینگلیزیش لەسەر ئەوە پێداگربوو کە گریشا نابێ دەم لە تۆلتۆلەی شیرین بدات. ئەو رووداوەش شادییە گشتییەکەی تۆزێ شێواند.

گریشا دەگریا و دەیگوت نیکۆلاش فیتووی لێدا بەڵام ئەوتان سزا نەدا. دەیگوت بۆ تۆلتۆلە ناگری و گوێی لەو شتانە نییە بەڵام زوڵمەکە زۆر تاڵە. ناخۆش ئەوەیە فەرق و جیاوازی دادەنێن. ئەو قسەیەشی زۆر دڵهەژێن بوو، بۆیە داریا ئەلکساندرۆڤنا بڕیاری دا لەگەڵ پەرەستارەکە بدوێ و رازیی بکات کە لە گریشا خۆش بێ و هەر بەو مەبەستەش چوو بۆ لای. بەڵام کە بە ژووری میوانداریدا تێپەڕی دیمەنێکی دی کە دڵی پڕکرد لە شادی و نەشە، بەجۆرێك کە فرمێسك لە چاویدا قەتیسما و بڕیاریدا خۆی لە خەتابار خۆش بێ.

گریشا لە ژووری میوانداری لەبەر پەنجێرەی سووچی خوارەوە دانیشتبوو و تانیا دەوری بە دەستەوە لەبەر دەمی راوەستابوو.

تانیا بە بیانووی ئەوەیکە دەچێ نان بە بووکەڵەکانی دەدا ئیزنی لە پەرستاری ئینگلیزی وەرگرتبوو تاکوو بەشە تۆلتۆلەکەی خۆی بەرێ و لە ژوورەکەی خۆیان لەگەڵ بووکەڵەکانی بیخوا، بەڵام بەجێی ئەوەی بچێت بۆ ژوورەکەی خۆیان بەشە تۆلتۆلەکەی خۆی بردبوو بۆ براکەی تاکوو پێکەوە بیخۆن. گریشا بە هۆی ئەو غەدرەوە کە لێیکرابوو ئاوا ئەو سزایەیان بەسەردا سەپاندبوو، هەروا دەگریا. خوشکی تۆلتۆلەی بە دەمەوە دەکرد و لەگەڵ گریان و هەنیسك دەیگوت: خۆشت بخۆ، پێکەوە دەیخۆین.

هانەی تانیا سەرەتا دڵسۆزانە بوو بۆ براکەی. بەڵام پاشان کە بۆی دەرکەوت کارەکەی جوانە خۆشی دەستیکرد بوو بە گریان. لەگەڵ ئەوەشدا بە تەواوی خۆی لەبیرنەچووبۆوە و نیوە بەشە تۆلتۆلەکەی خۆی بە دەم گریانەوە دەخوارد.

منداڵەکان کە چاویان بە دایکیان کەوت سەرەتا ترس دایگرتن بەڵام کە چاویان لە چاوی کرد بۆیان دەرکەوت کە کارێکی خراپیان نەکردووە و بە زاری پڕ لە تۆلتۆلەوە تریقانەوە و لێوە پڕ پێکەنینەکەی خۆیان بەدەست و سەرقۆڵیان سڕی و فرمێسك و شیلەیان لە هەموو دەموچاوی خۆیان هەڵساوی کە لە شادیدا دەدرەوشانەوە.

داریا ئەلکساندرۆڤنا گوتی: بەقوربانت بم، تانیا، گریشا، لیباسە تازەکانتان ئاوا سپی و خاوێنە، نازانن... ـ هەوڵی دەدا نەهێڵێ جلوبەرگەکانیان پیس بکەن، بەڵام بەچاوی فرمێسك تێزاوەوە پێدەکەنی و پێکەنینەکەی لێوڕێژ بوو لە نەشە و شیرینی.

جلوبەرگە تازەکانی لە بەریان داکەند و رووپۆشی سپی و چینداری بۆ کچەکان هێنا و بۆ کوڕەکانیش چاکەتە کۆنەکانیان و لەبەری کردن، پاشان فەرمانی دا ئەسپە شێی گزیریش لە عارەبانە سەرداپۆشراوە سێ ئەسپەکە بکەن (ئەوەش بووە هۆی تێکچوون و پیشخواردنەوەی گزیر) تاکوو هەموویان بچن بۆ کۆکردنەوەی کارگ و پاشان بۆ مەلە کردن.

پڕ قەرتاڵەیەکیان کارگ کۆکردەوە و لیلی تەنانەت کارگێکی دۆزییەوە کە لەو چەشنە کارگانە بوو وا بە دەگمەن هەیە. بەر لەوە میس هوو[122] کارگی دەدۆزییەوە نیشانی دەدا تاکوو بە دەستە منداڵانەکەی هەڵیکەنێ، بەڵام ئەمجارەیان ئەو خۆی ئەم کارگەی دیبوەوە و هەموو هاواری شادییان لێهەستا و چەپڵەیەکیان بۆ لێدا.

پاشان بۆ مەلە کردن رویشتن بۆ گوێچۆمەکە و ئەسپەکانیان لەژێر دارەکان بەجێ هێشت. ئەسپەکان کە بە کلکیان مێش و مۆزیان لە خۆیان دەردەکرد ترێنتی[123] عارەبەوان بە دارێکەوە بەستنیەوە و خۆی چوو لەسەر چیمەنی بن دارێك لابەقنگ بۆی کەوت و قەننەکەی داگیرساند. دەنگی قریشکوهۆڕ و قیژەی پڕ لە نەشەی منداڵەکان لەنێو ئاوەکەدا بەردەوام دەگەیشتە ئەو شوێنەی کە ئەو لێی تخێڵ بووبوو.

ئەگەرچی ئاگاداری لە هەموو منداڵەکان و بەرگری کردن لە هاروهاجییەکانیان بۆ داریا ئەلکساندرۆڤنا ئاسان نەبوو، هەروەها زۆریش دژوار بوو، هەروەها دەبوو لە بیری بێ کە ئەو هەموو پانتۆڵ و گۆرەوی و کراس و چاکەت و کەوشی گەورە و چکۆلە و رەنگاورەنگ هەرکام هی کامەیانە و تێکەڵوپێکەڵ نەبن و کردنەوە و داخستنەوەی ئەو هەموو ئاغزوونە و قۆپچە جۆراوجۆرەش زۆر زەحمەت بوو، بەڵام چونکە خۆی هەمیشە حەزی لە مەلە کردن بوو، پێشی وابوو قازانجی زۆرە بۆ منداڵەکان ئەو رابواردنەی لە هەموو شتێك پێخۆشتر بوو. لاقە چکۆڵە و خڕپنەکانیانی دەگرت و سەرەوبن لە ئاوەکەی هەڵدەکێشان و بیستنی قیژەی پڕ لە شادی و

122- Hull
123- terenty

ترسیان و ڕەنگی بزڕکاویان و هەناسەبڕکێی ئەو فریشتە چکۆلانانە و چاوی گەش و پڕنەشە و ترسیان بۆ ئەو گەورەترین چێژ و خۆشی بوو.

کاتێك نیوەی منداڵەکان جلیان لەبەرکردبۆوە، ژنانی لادێیی بە جلوبەرگی خاوێن و رازاوەی ڕۆژی یەکشەمبەیانەوە هاتبوون و هەر بەو شەرم و فهێتە لادێییەیانەوە لە گوێ چۆمەکە راوەستابوون. ماتریایۆڤنا فیلیمۆنۆڤنا دەنگی بەرزکردەوە داوای لە ژنێکیان کرد یارمەتیی بدات و ئەو مەلافە و کراسەی کەوتبووە نێو ئاوەکەوە پێکەوە بیگوشن و ئاوەچۆڕی کەن و هەڵیبخەن بۆ ئەوەی ویشك بێتەوە. داریا ئەلکساندرۆڤنا لەگەڵ ژنانی گوندنشین سەری قسەی کردەوە. ژنەکان سەرەتا لە پرسیارەکانی نەدەگەیشتن و دەستیان بە بەردەمیانەوە دەگرت و پێدەکەنین، بەڵام زوو زاتیان شکا و کەوتنە قسەکردن لەگەڵیدا، هەر خێراش بە تاریفکردنی منداڵەکانی دڵی داریا ئەلکساندرۆڤنایان بەدەست هێنا.

یەکیان کە قژی تانیای دادەهێنا گوتی: چاو لێکەن چەندە جوانە. دەڵێی کەللەی شەکرە. حەیف لاوازە.

ـ ئاخر نەخۆش بووە.

یەکێکی تریان ئاماژەی بە منداڵە بەرمەمکانەکەی کرد و گوتی: مەلەت بەوەشیان کرد؟

داریا ئەلکساندرۆڤنا بە پۆزێکەوە وەڵامی دایەوە: نا، ئەوەیان تەمەنی سێ مانگە.

ـ تۆ خودا!

ـ تۆ خۆت منداڵت نییە؟

ـ با، چوارم هەبوو، دوانیان ماون. کچێك و کوڕێك. کچەکە مانگێك دەبێ لە شیرم بڕیوەتەوە.

ـ چەند ساڵانە؟،

ـ دوو ساڵ.

ـ یانی دوو ساڵ مەمکت داوەتێ؟

ـ دابی ئێمە وایە. دەبێ ماوەی سێدانە ڕۆژوو شیری پێبدرێ.

داریا ئەلکساندرۆڤنا قسەکانی زۆر پێخۆش بوو. سەبارەت بە منداڵبوون پرسیاری دەکرد و هەروەها نەخۆشییەکانیان و مێردەکانیان لە کوێن و چەند ڕۆژ جارێك دێنەوە بۆ ماڵێ.

قسەکردن لەگەڵ ژنانی لادێیی بۆ داریا ئەلکساندرۆڤنا هێندە خۆش و سەرنجڕاکێش بوو، ژیان و کێشە و مەسەلەکانیان هێندە وێك دەچوون کە دڵی نەدەهات بەجێیان بێڵێ. لە

هەمووشی خۆشتر بۆ داریا ئەلکساندرۆڤنا ئەوە بوو کە بە روونی دەیدی ئەو ژنانە لە هەموو شتێك زیاتر باسی زۆری و تەندروستی و جوانیی منداڵەکانی دەکەن.

یەکێك لە ژنە جحێڵەکان چاوی لە پەرستارە ئینگلیزییەکە بڕیبوو کە جلوبەرگی لەبەر دەکردەوە و کاتێك دیتی تەنوورەی سێهەمی لەبەرکرد نەیتوانی دان بە خۆیا بگرێ و پێکەنین پیرانی پێبەست و گوتی: چاو لێکە چەند تەنوورە بە سەریەکدا لەبەر دەکا، دوایی نایە ـ داریا ئەلکساندرۆڤناش بە پێکەنینەکانی ئەوان کەوتە پێکەنین و تەنیا کچە ئینگلیزی نێوچاوانی تێکنا و رووی کرد بەولاوە، چونکە دەیزانی بە ئەو پێدەکەنن بەڵام نەیدەزانی بۆ؟

## نۆ

داریا ئەلکساندرۆڤنا لەگەڵ منداڵەکانی کە مەلەیان کردبوو و هێشتا قژیان تەڕ بوو، لەچکەی بەسەرەوە بەرەو ماڵێ دەڕۆیشتن کە عارەبەوان گوتی: پیاوێك بەرەو ئێرە دێ، پێموایە ئەرباب پاکرۆسکایایە.

داریا ئەلکساندرۆڤنا روانیی و کە قەڵافەتی ئاشنای لەڤینی ناسییەوە بە کڵاو و دومی سیزۆنی[١٢٤] خۆڵەمێشینەوە دێ بەرەوپیریان دڵی خۆش بوو. هەمیشە بە دیتنی لەڤین دەگەشایەوە. ئەمجارەیان کە لەڤین ئەوی لە پلەوشکۆی بەرزی دایەکایەتیدا دەدی لە هەموو کاتێ زیاتر وەنەشە کەوت و خۆشحاڵ بوو. هیچ کەس وەك لەڤین نەیدەزانی لەو والآیی و رۆحبەرزییەی بگا و نەیدەزانی ئەو خووخدەیەی بە هۆی چییەوەیە.

لەڤین بە دیتنی ئەو خۆی لە هەمبەر یەکێك لە پەردەکانی خەیاڵی ژیانی بنەماڵەییدا دییەوە.

گوتی: داریا ئەلکساندرۆڤنا، ئێوە وەك باڵندەیەك وان کە جووجەڵەکانی خۆی دەخاتە ژێر پەڕوباڵی خۆی و لێیان دوورناکەوێتەوە.

دالی دەستی بۆ لای لەڤین درێژ کرد و گوتی: بەخێربێی، نازانی چەندەم پێخۆشە.

ـ بە دیتنی من خۆشحاڵی بەڵام هیچ هەواڵێکت پێنەدام کە هاتووی بۆ ئێرە. ستیڤا نامەی بۆ ناردم و هەواڵی هاتنتانی دامێ.

---

١٢٤- باڵتەیەکی سووکی تایبەتی وەرزی پاییز.

داریا ئەلکساندرۆڤنا بە سەرسووڕمانەوە پرسیی: ستیڤا نامەی بۆ ناردی؟

ـ بەڵێ، بۆی نووسیبووم کە ئێوە هاتوون و پێیوایە ئێوە ئیجازە بە من دەدەن کە یارمەتیتان بدەم، وادیارە گرفتێکتان هەیە ـ ئەوەی گوت و لە ناکاو دەستەپاچە بوو و بێدەنگ ما، چلێکی باریکی لە داری زیزفۆن قرتاند و نایە بەینی ددانییەوە و بە تەنیشت عارەبانەکەدا کەوتە رێ. حەپەسانەکەشی بۆ ئەو گریمانەیە بوو کە داریا ئەلکساندرۆڤنا بۆچوونی وابێ کە مێردەکەی یارمەتیی لەدەست دێ، بەڵام خۆی نایکات و خستوویەتە ئەستۆی بێگانەیەك. دیارە نابێ پێشی خۆشبێ و بەڕاستی داریا ئەلکساندرۆڤناش لەو کارەی ستیپان ئارکادیچ کە ئەرکی بنەماڵەیی خۆیەتی و دەیخاتە ئەستۆی کەسێکی تر، زۆر دڵگران بوو، هەر خێراش تێگەیشت کە لەڤین لەوە گەیشتووە. داریا ئەلکساندرۆڤنا لەڤینی هەر بەهۆی ئەو وردبینی و مووقەڵێشی و تێگەیشتنەوە خۆش دەویست.

لەڤین گوتی: هەڵبەت من تێگەیشتم کە ئەو نامەیە تەنیا بۆ ئەوەیە کە ئێوە حەزدەکەن چاوتان پێمبکەوێ، بۆیە زۆر خۆشحاڵم. زۆر بە باشی تێدەگەم ژیان لێرە بۆ ئێوە کە خووتان بە ژیانی شاری گرتووە ناخۆش و پڕ لە گرفتە و ئەگەر پێویستتان بە شتێك هەیە من لە خزمەتتاندام.

دالی گوتی: ئەیەڕۆ، نا. لە هەوەڵەوە نارەحەت بووم، بەڵام ئێستا لە سایەی دایەنی پیرمەوە هەموو کارەکان جێبەجێ کراون ـ کە ئەوەی دەگوت ئاماژەی بە ماتریایۆڤنا فیلیمۆنۆڤنا کرد کە تێگەیشتبوو مەبەستیان ئەوە و دۆستانە زەردەی بۆ لەڤین دەگرت. ئەو لەڤینی دەناسی و دەیزانی بۆ خاتوو کیتی خوشکی داریا ئەلکساندرۆڤنا دەزگیرانێکی باشە و بە ئاواتەوە بوو بتوانێ ئەو کارە رێکبخات.

داریا ئەلکساندرۆڤنا گوتی: فەرموو سواربە. ئێمە تۆزێ گردوکۆتر دادەنیشین.

ـ نا، من بە پێیان دێم. دەی منداڵەکان کێ لەگەڵ من بە ئەسپ کێبەرکێ دەکات؟

منداڵەکان ئاشنایەتییەکی ئەوتۆیان لەگەڵ لەڤین نەبوو، لە بیریان نەمابوو کەنگێ دیتوویانە. بەڵام هەستی تریق بوونەوە و بێزارییەك کە منداڵان زۆر جار سەبارەت بە گەوران هەیانە کە خۆیان بە هاوڕێیان دادەنێن و ئەوەش بۆ منداڵ زۆر ناخۆشە، دەرهەق بە لەڤین هەستی داگرتن. خۆڕانان، بۆ هەر شتێك بێ، لەوانەیە وریاترین و وردبینترین کەس هەڵخەڵەتێنێ، بەڵام تەنانەت گەمژەترین منداڵ لە خۆڕانان تێدەگات بۆیە هەرچەندەش بە شارەزایی و سەداقەتەوە بێ، بێزاریی خۆی دەردەبڕێ. بەڵام لەڤین هەر عەیبێکی ببێ، بە هیچ

شێوەیەك ئەهلی خۆڕانان نەبوو. هەر بۆیە منداڵەکان بەو شیرینی و خۆشەویستییەوە وەڵامیان دایەوە کە لە روخساری دایکیاندا دەرهەق بە ئەو دیتبوویان. کاتێك پێشنیاری پێکردن بۆ کێبەرکێی ئەسپسواری دوو منداڵە گەورەکەیان خێرا بازیاندا خواری و لەگەڵیدا دەستیان کرد بە غاردان، بە جۆرێك کە دەتگوت لەگەڵ دایەنەکەیان یان لەگەڵ میسهوول یان دایکیان هەڵدێن. لیلیش حەزی دەکرد لەگەڵیان غاربدا، داریا ئەویشی دایەدەست لەڤین. لەڤین کردییە قەڵاندۆشی و دەستیکرد بە هەڵاتن.

به شادی و نەشە و پێکەنینەوە گوتی: مەترسە، داریا ئەلکساندرۆڤنا، مەترسە، نە دەیدەم بە زەویدا نە دەهێڵم جییەکی زامار بێ.

داریا ئەلکساندرۆڤنا چاوی بە گورجوگۆڵی و هەڵاتنی چالاکانەی کەوت کە پیشاندەری وەزەی جەستەیی ئەوبوو و دیتی کە زۆر بە وریاییەوە هەنگاو دەنێ بۆیە خاترجەم بوو و بە بزەیەکی رەزامەندانەوە چاوی لێکرد.

لەڤین، لێرە لەو گوندە، لە نێو منداڵەکان و داریا ئەلکساندرۆڤنای دایکیاندا کە زۆر مێهرەبان بوو لە گەڵیدا شادی و نەشەی منداڵانەی خۆی وەبیرهاتبۆوە و دالیش ئەوەی زۆر پێخۆش بوو. لەگەڵ منداڵەکان غاری دەدا و فێری وەرزشی دەکردن و بە ئێنگلیزییە سەروپێ شکاوەی میسهووڵی وەپێکەنین دێنا و باسی کار و سەرقاڵییەکانی خۆی لە گوند بۆ داریا ئەلکساندرۆڤنا دەکرد.

داریا ئەلکساندرۆڤنا دوای نانی نیوەڕۆ لەگەڵ لەڤین دووبەدوو لەبەرهەیوانەکە دانیشتن و سەبارەت بە کیتی سەری قسەیان کردەوە.

ـ دەزانی کیتی دێ بۆ ئێرە هاوینێ لەلای من دەمێنێتەوە؟

لەڤین لە ناکاو سوورهەڵگەڕا و گوتی: بەڕاستیتە؟ ـ خێراش بە مەبەستی گۆڕینی باسەکە دەستیکرد بە قسەکردن: دەی، دەڵێیچی دوو مانگاتان بۆ بنێرم؟ ئەگەر لەڕووشت هەڵنایە بە خۆڕایی و دەتهەوێ حیسابی بکەی، بۆ هەرکامیان مانگی پێنج رۆبڵم بدەنێ.

ـ نا، سپاست دەکەم، ئیتر هیچ گیروگرفتێکمان نەماوە.

ـ باشە، کەوایە چاوم بە مانگاکانتان دەکەوێ و ئەگەر ئیجازە بدەن خزمەتکارەکان رێنوێنی دەکەم کە چۆنیان بلەوەڕێنن ـ بە مەبەستی ئەوەش کە بە قسەکانی داریا ئەلکساندرۆڤنا سەرگەرم بکا باسەکەی لەسەر ئاژەڵداری درێژە پێدا و گوتیشی کە مانگا مەکینەیەکە کە گیاوگژ دەکا بە شیر و لەو قسانە.

لەڤین ئەو قسانەی دەکرد بەڵام بێئۆقرانە دەیویست سەبارەت بە کیتی شتێك ببیستێ و لەگەڵ ئەوەشدا لەو باسو بابەتەش دەترسا. لەوە دەترسا ئەو هێمنایەتی و ئاسوودەییی خەیاڵەی بە هەزار زەحمەت وەدەستی هێناوە لێیتێك بچێت.

داریا ئەلکساندرۆڤنا بە ناچاری وەڵامی دایەوە: بەڵێ وایە، بەڵام ئەو کارانە زۆری ئەرك و ئاگاداری دەوێ، کێ دەتوانێ ئاگادارییان لێبکات.

دالی ئێستا بە یارمەتیی ماتریایۆڤنا فیلیمۆنۆڤنا ژیانی خۆی زۆر بە باشی سەروسامان پێدابوو و حەزی نەدەکرد ئاڵوگۆڕی بەسەردا بێنێ. جگە لەوەش باوەڕی بە زانیارییەکی لەڤین لە بواری کشتوکاڵدا نەبوو. ئەو باسەی سەبارەت بە مانگاکە دەیگوت مانگا مەکینەی شیر دروستکردنە تووشی بەد گومانیی کردبوو. پێیوابوو ئەو چەشنە بەڵگە هێنانەوەیە تەنیا دەبێتە هۆی شێوانی کاری کشتوکاڵ. ئەو لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە کشتوکاڵ ئەو قسانەی ناوێ و کارێکی زۆر سانایە. تەنیا دەبێ ئاو و لەوەڕی زیاتر بە مانگا سوور و مانگا بەڵەك بدرێ و نەهێڵن ئاشپەز زبڵوزاڵەکانی چێشتخانە بەرێ بۆ مانگای جلشۆری. وەك رۆژی روون ئاشکرا بوو کە باسکردن سەبارەت بە لەوەڕی گیایی و گلێرە بۆ مانگاکان بە بڕوای ئەو باسێکی هیچ و نابەجێ و ناڕوونە. لە هەمووشی گرینگتر ئەوەبوو کە ئەو دەیویست دیسان باسی کیتی بێنێتەوە گۆڕێ.

## دە

داریا ئەلکساندرۆڤنا دوای هێندێ بێدەنگبوون گوتی: کیتی نووسیوێتی زیاتر لە هەموو شتێك ئاواتەخوازی تەنیایی و هێمنایەتییە.

لەڤین بە شڵەژاوی پرسیی: دەی، ئێستا باشتر بووە؟

ـ شوکر بۆ خودا. بە تەواوی چاك بۆتەوە. من هەر لە سەرەتاوە دەمزانی نەخۆشیی هەوکردنی سییەکانی بێبنەمایە.

لەڤین گوتی: بەڕاستی هەواڵێکی خۆش بوو ـ کاتێك ئەوەی دەگوت لەبەر چاوی دالی شوێنەواری خەم و داماوی لە سیمایدا وەدیار کەوت. لەڤین بێدەنگ بوو و چاوی لە روخساری دالی بڕی.

داریا ئەلکساندرۆڤنا بە بزەیەکی پڕ لە خۆشەویستی و لەگەڵ ئەوەشدا تەشەراوییەوە گوتی: شتێکم پێبڵێ کۆنستانتین دمیترچ، تۆ بۆ رقت لە کیتی هەستاوە؟

لەڤین گوتی: من؟ رقم لێی هەڵنەستاوە.

ـ با، لێی دڵمەندی. بۆ ئەو کاتەی لە مۆسکۆ بووی نە بۆ لای ئێمە هاتی و نە بۆ ماڵی ئەوانیش چووی؟

لەڤین کە هەتا بناگوێی سوورهەڵگەڕابوو گوتی: داریا ئەلکساندرۆڤنا، من تەنانەت سەرم سووڕماوە کە تۆ، بەو دڵە مێهرەبانەتەوە، چۆن لە هەستی من تێناگەی. چۆن دەرهەق بە من هەست بە دڵسۆزی ناکەی، ئەویش لە کاتێکدا کە دەزانی...

ـ چی دەزانم؟

ـ دەزانی کە من داوام لێکرد شووم پێبکا و ئەویش دەستی بە روومەوە نا ـ ئەوەی گوت و تەواوی ئەو دڵۆڤانی و خۆشەویستییەی خولەکێك لەمەوبەر دەرهەق بە کیتی لە دڵیدا بوو یەکسەر بوو بە تووڕەیی و داخی شەرمەزار بوونەکەی ئەو رۆژە لە دڵیدا ژیایەوە.

ـ بۆ پێتوایە من دەبێ لەو شتە ئاگاداربم؟

ـ چونکە هەمووان دەزانن.

ـ ئەوە هەڵەی ئێوەیە. من ئاگادارنەبووم، بەڵام گومانم کردبوو.

ـ دەی خۆ ئێستا دەزانی.

ـ من تەنیا دەمزانی شتێك رووی داوە، بەڵام هیچ کات نەمتوانی لە بن زمانی کیتیی دەرکێشم کە چی قەوماوە. من تەنیا دەمدی کە رووداوێك قەوماوە و بۆ کیتی زۆر تاڵ و بەژان بووە، داواشی لێکردم کە لەو بارەوە بە هیچ جۆرێ لەگەڵی نەدوێم. ئەگەر بە منی نەگوتبێ دەزانم بە هیچ کەسی تریشی نەگوتووە. ئێستا پێمبڵێ، گوتتان چی؟

ـ من گوتم چیمان گوتووە.

ـ ئەو مەسەلە کەنگێ بوو؟

ـ کاتی دوایین سەفەرم بۆ مۆسکۆ.

داریا ئەلکساندرۆڤنا گوتی: دەزانی، من زۆرم زگ پێیدەسووتێ، یەکجار زۆر. تۆ تەنیا بەهۆی رۆحزلی و زویربوونەوە ئازار دەکێشی...

لەڤین گوتی: رەنگە، بەڵام....

دالی قسەکەی پێبڕی: بەڵام ئەو، بەستەزمانە... زۆرم زگ پێیدەسووتێ. ئێستا هەموو شتێك دەزانم...

لەڤین هەستا و گوتی: چاکە، داریا ئەلکساندرۆڤنا، دەبێ بمبووری... ئیجازە بفەرموون من دەڕۆم. لای ئێوەم خۆش.

دالی قۆڵی گرت و گوتی: نا، پەلە مەکە، پەلە مەکە، دانیشە.

لەگەڵ ئەوەی دادەنیشت گوتی: تکات لێدەکەم... با ئیتر لەسەری نەڕۆین. ـ بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەستی دەکرد کە ئەو هیوایەی کە پێیوابوو لە دڵیدا نێژراوە دیسان زیندوو بۆتەوە و کەتۆتە جموجۆڵ.

داریا ئەلکساندرۆڤنا گوتی: ئەگەر من ئێوەم خوشنەویستبایە ـ کە ئەوەی گوت فرمێسك لە چاوانیدا قەتیس ما: ئەگەر ئێوەم ئاوا بە باشی نەناسیبایە...

هەستە مردووەکە لە دڵی لەڤیندا بەردەوام زیاتر زیندوو دەبۆوە و سەری هەڵدەدا و بەسەر رۆحیدا زاڵ دەبوو.

داریا ئەلکساندرۆڤنا درێژەی بە قسەکانیدا: بەڵێ، من ئێستا هەموو شتێك دەزانم. تۆ ناتوانی لەوە بگەی. بۆ ئێوە پیاوان کە ئازادن و هەڵدەبژێرن هەمیشە روون و ئاشکرایە کە کێتان خۆش دەوێ. بەڵام کچ دەبێ بە شەرم و فهێتێکی کچانەوە چاوەڕوان دانیشێ، کچێك کە ئێوە پیاوان لە دوورەوە دەبینێ و باوەڕ بە قسەکانتان دەکا، لەوانەیە دۆژ دابمێنێ و نەزانێ کێی خۆش دەوێ و نازانێ چ بکا.

ـ بەڵێ، کاتێك لە دڵییەوە دەنگێك نابیستێ...

ـ دڵ خەبەر نادا. بەڵام ئاخەر، بیری لێبکەوە، ئێوە پیاوان دڵتان کچێك دەگرێ، دەچن بۆ ماڵەکەی لێی نزیك دەبنەوە، هەموو شتێکی بە باشی هەڵدەسەنگێنن، بە کاوەخۆ بیری لێدەکەنەوە کە ئەوەی دەتانهەوێ و لێیدەگەڕێن لەو کچەدا هەیە یان نا، هەرکاتێك دڵنیا بوون کە خۆشتان دەوێ دەچن بۆ خوازبێنی...

ـ بەڵام، یەکجار ئاواش نییە.

ـ گرینگ نییە، وەلحاسڵ کاتێك دەچنە خوازبێنی کە ئەوینەکەتان بەڕادەی کەماڵ گەیشتبێ، یان کاتێك کە دوو کچ هەڵدەبژێرن و دەکەونە بەردڵتان یەکیانتان پێباشترە. بەڵام لە کچە ناپرسن. دەیانهەوێ ئەویش بە دڵی خۆی هەڵبژێرێ، کاتێك ئەویش ناتوانێ هەڵبژێری، تەنیا وەڵام دەداتەوە، بەڵێ یان نا.

لەڤین لە دڵی خۆیدا گوتی: «بەڵێ، هەڵبژاردن لە نێوان من و ڤرۆنسکیدا.» ئەو مردووەی کە لە دڵیدا خەریکبوو وردە وردە زیندوو دەبۆوە دیسان مرد و دڵی بە شێوەیەکی زۆر بە ژان رەنجاند.

گوتی: داریا ئەلکساندرۆڤنا، مرۆڤ جلوبەرگ یان چووزانم ئەو شتانە بکڕێ ئاوای هەڵدەبژێرێ، نەك ئەوین. ئێستا ئیتر هەڵبژاردنەکە کراوە و چاکتر... ئیتر دووپاتکردنەوەشی نالوێ.

داریا ئەلکساندرۆڤنا گوتی: پەککو لە دەست ئەو غورورر و خۆبینییە... ـ لە دەمورِاوێژیدا دەتگوت سووکایەتییەك دەرهەق بە سووکایەتیی ئەو هەستەی لە هەمبەر هەستێکی تردا کە تەنیا ژنان تێیدەگەن هەست پێدەکرێ، کاتێك ئێوە داواتان لێکرد ژیانی هاوبەشتان لەگەڵ پێکبێنێ ئەو لە بارودۆخێکدا بوو کە نەیدەتوانی وەڵام بداتەوە. دڕدۆنگ بوو. دوودڵ بوو لە نێوان تۆ و ڤرۆنسکیدا کامتان هەڵبژێرێ. هەموو رۆژێك چاوی بە ڤرۆنسکی دەکەوت. لەمێژ بوو ئێوەی نەدیبوو. دیسان ئەگەر تۆزێ عازەبتر بووایە دەکرا... بۆ وێنە بەلای منەوە هیچ شك و دوودڵییەك نەبوو. من هەر لە سەرەتاوە لە ڤرۆنسکی بێزار بووم و ئاخریش دەرکەوت کە هەق بە من بووە.

لەڤین وەڵامەکەی کیتیی وەبیرهاتەوە کە گوتبووی: ئەوە هەر ناکرێ....

بە ساردوسڕی گوتی: داریا ئەلکساندرۆڤنا، سپاس بۆ مێهرەبانیتان. پێموایە بە هەڵە چووی. نازانم هەقی ئەوەم هەیە یان نا، بەڵام ئەو خوبینییە کە ئێوە ئاوا بە شتێکی سووکوچرووکی دادەنێن هەموو چەشنە بیر و خەیاڵێك سەبارەت بە کاترینا ئەلکساندرۆڤنا بۆ من دەردەخا و دەزانم بە هیچ شێوەیەك ناگونجێ، تێدەگەی، بەهیچ شێوەیەك ناگونجێ.

ـ من تەنیا شتێك دەڵێم. خۆ دەزانی من باسی خوشکێکم دەکەم کە بەقەد منداڵەکانی خۆمم خۆشدەوێ. من ناڵێم ئەو تۆی خۆشویستووە. تەنیا دەڵێم دەست بە رووەوەنانی تۆ لەو کاتەدا نیشاندەری هیچ شتێك نییە.

لەڤین هەستا سەرپێ و گوتی: نازانم. خۆزگە دەتزانی چۆن دڵم بە نەشتەر توێتوێ دەکەی! راست وەك ئەوەوایە جگەرگۆشەکەت مردبێ و ئێوە بڵێن: کۆرپەکەم، ئەگەر زیندوو بووایە دەبووە نازانم چیوچی، دڵیشتان بەو قسانە خۆش بکەن. بەڵام ئاخر کۆرپەکەت مردووە، مردوو...

داریا ئەلکساندرۆڤنا بە بزەیەکی خەماوییەوە کە سەرەڕای هەڵچوون و شڵەژانی لەڤین بەری لە تەشەر نەبوو گوتی: هاە، تۆش قسەی چەندە بێتام دەکەی ـ تۆزێ چووە فیکرەوە و پاشان درێژەی بە قسەکانیدا: ئێستا من هەموو شتێك دەزانم. کەوایە کاتێك کیتی بێت بۆ ئێرە ئیتر نایەی بۆ سەردانمان؟

ـ نا، نایەم. هەڵبەت لێی بێزار نیم. بەڵام تا ئەو جێیەی بۆم بکرێ هەوڵ دەدەم دڵی ئەو بە دیداری خۆم تووشی خەم و پەرۆشی نەکەم.

داریا ئەلکساندرۆڤنا سەرنجی مێهرەبانی لەسەر روخساری لەڤین گیرساندەوە و دووپاتی کردەوە: زۆر بێتامی، زۆر! باشە دەی. کەوایە وایدانێ لەو بارەوە نەدواوین ـ رووی لە کچەکەی کرد کە هات بۆ لایان و بە زمانی فەڕەنسی گوتی: چیت دەوێ تانیا؟

ـ پێمەڕەکەم لە کوێیە، دایەگیان؟

ـ کاتێك من بە زمانی فەڕەنسی قسەت لەگەڵ دەکەم تۆش بەو زمانە وەڵامم بدەوە.

کچە ویستی بیڵێ بەڵام لەبیری چووبۆوە بە زمانی فەڕەنسی بە پێمەڕە دەڵێن چی. دایکی یارمەتیی دا و پاشان دیسان بە زمانی فەڕەنسی پێیگوت کە لە کوێ بۆ پێمەڕەکەی بگەڕێ. ئەوەش بۆ لەڤین زۆر ناخۆش بوو و تەواو پێیتێکچوو.

ئێستا ئیتر لەماڵی داریا ئەلکساندرۆڤنا هیچ شتێك و تەنانەت منداڵەکانیشی وەك رابردوو خۆشەویست نەبوون.

لە دڵی خۆیدا گوتی «ئێستا بۆ لەگەڵ منداڵەکانی بە زمانی فەڕەنسی دەدوێ؟ ئەو کارە چەندە ناسروشتی و ناحەزە و منداڵەکانیش هەستی پێدەکەن. منداڵەکانیان فێری زمانی فەڕەنسی دەکەن و راستی و پاکی لە دڵیان دەسڕنەوە.» لە دڵیدا ئەوەی دەگوت نەیدەزانی کە داریا ئەلکساندرۆڤنا خۆشی زیاتر لە بیست جار بیری لەو مەسەلەیە کردۆتەوە و لەگەڵ ئەوەشدا بەو ئاکامە گەیشتووە کە ناچارە، ئەگەر بە نرخی لە دەستدانی پاکی و راستیشبێ، لەو رێگایەوە زمانی فەڕەنسی فێری منداڵەکانی بکات.

ـ ئێستا دەتانەوێ بچن بۆ کوێ؟ جارێ مەڕۆن.

لەڤین هەتا کاتی عەسرۆژە مایەوە بەڵام شادی و نەشەکەی نەمابوو و خەم دڵی داگرتبوو.

دوای خواردنەوەی چایی چووەدەرێ و فەرمانی دا ئەسپەکانی لە عارەبانەکە بکەن، کە گەڕاوە دیتی داریا ئەلکساندرۆڤنا بەجارێ شڵەژاوە، رەنگی روخساری هەڵبزڕکاوە و چاوی پڕبووە لە فرمێسك. کاتێك لەڤین چووبووە دەرێ داریا ئەلکساندرۆڤنا لەگەڵ رووداوێکی ترسناك بەرەوڕوو بووبوو، بە جۆرێ کە ئەوەی شادی و خۆشیی ئەو رۆژەی و گەشت و مەلەی منداڵەکانی بوو هەمووی لێ زایەبووبوو. بە بیستنی قیژەیەك لە ژووری منداڵەکانییەوە بە هەڵەداوان چوو و کەوت بەسەر دیمەنێکی زۆر خراپدا. تانیا قژی گریشای دەکێشا و گریشا بە روخساری تووڕە و شێواوەوە بە مست لە خوشکی بەربووبوو. بە دیتنی ئەو دیمەنە داریا ئەلکساندرۆڤنا هەر ئەوەبوو دڵی نەتۆقی و دەتگوت ئاسمان بە سەریدا رووخا. دەیزانی کە منداڵەکانی ئەو گوڵانەی کە شانازیی پێوە دەکردن، نەك هەر منداڵێکی ئاسایین بەڵکوو زۆریش دڕ و شەڕانین، خراپ پەروەردە کراون و بەدزات و شڕودڕ و رقئەستوورن. نەیتوانی نە بیر لە هیچ شتێك بکاتەوە و نە هیچ بڵێ، بەڵام نەیدەتوانی ئەو دڵگرانی و خەمەتاڵەی خۆی بۆ لەڤین باس بکات.

لەڤین دەیدی کە داریا ئەلکساندرۆڤنا داماوە و هەوڵی دەدا دڵداریی بداتەوە. دەیگوت کە ئەو رووداوە نیشاندەری هیچ نییە و هەموو منداڵێك پێکەوە شەڕ دەکەن و لە یەکتر دەسرەوێنن. بەڵام لەگەڵ گوتنی ئەو قسەیە لە دڵی خۆیدا گوتی«نا، من سەداقەتی منداڵەکانم زایە ناکەم و بە زمانی فەرەنسی لەگەڵیان نادوێم، بەڵام منداڵەکانی من هەر ئاوا نابن. واچاکە منداڵەکانمان زایە نەکەین و لە حاڵو هەوای سروشتی بەدەریان نەکەین. ئەو کاتە هەر لەخۆوە ژیر و خۆشەویست دەبن. بەڵێ، منداڵەکانی من ئاوا نابن.»

خوداحافیزیی کرد و رۆیشت، داریا ئەلکساندرۆڤناش داوای لێنەکرد بمێنێتەوە.

## یازدە

نیوەی مانگی ژوویە کوێخای ئەو گوندەی وا ماڵی خوشکی لەڤینی لێبوو و لە بیست وێریستی پاکرۆسکایا هەڵکەوتبوو، هات بۆ لای لەڤین تاکوو خەبەری کاروباری کشتوکاڵ و بارودۆخی دروێنەی پێڕابگەیێنێ. بەشی بەرچاوی داهاتی ئەو ملکە لە مەزرایەك بەرهەم دەهات کە بەهارانە لافاو دەیگرت و بە تەواوی دەکەوتە ژێر ئاو. لە رابردوودا ئەو زەوییانە بەدەست مووژیکەکانەوە بوون و بۆ هەر دسیاتینێك بیست رۆبڵیان دەدا. کاتێك کە ئەو ملکە کەوتە دەست لەڤین بارودۆخ و چۆنێتیی مەزراکەی لێکدایەوە و دیتی کە زۆر لەوە زیاتر دێنێ و نرخی هەر دسیاتینێکی کردە بیست و پێنج رۆبڵ. مووژیکەکان ئەو نرخەیان قەبووڵ نەکرد و لەڤین تێگەیشت کە ئەوان پەیمانکارانی دیکەش پەشیمان دەکەنەوە. بۆخۆی چوو بۆ ئەوێ و بەڵێنی دا کە دوورینەوەی بەشێك لە حاسڵاتەکە بدا بە کرێکاران و بەشێکیشی مووژیکەکان لەجیاتی هەقدەست گیا و وێنجە هەڵگرن. مووژیکەکانی ناودێ بە هەموو شێوەیەك چەتیان لە کارەکەی دەخست، بەڵام هیچیان بۆ نەچووەسەر و بەرهەمی مەزراکە هەر بەو شێوەیە هەڵدەگیرا و داهاتی زەویزارەکە دوو هێندە زیادی کرد. پارەکە و پێرارەکەش مووژیکەکان هەروا درێژەیان بە دژایەتییەکەیان دا، بەڵام هەڵگرتنی بەرهەم هەر بەو شێوەیە بەڕێوەچوو. ئەمساڵیش مووژیکەکان بەرهەمی هەموو مەزراکەیان بە یەك بەش و سێ بەش هەڵگرت و دوورییانەوە. ئێستا کوێخا هاتبوو و خەبەری بۆ لەڤین هێنابوو کە لە گیادروون تەواوبووە و لە ترسی باران راوێژکارەکەی بانگکردەوە لەبەر چاوی ئەو باخەگیاکانی بەش کردووە و بەشی ئەرباب بۆتە یازدە گیشە. لەڤین بە وەڵام و قسەگنخاندنی کوێخادا بۆی دەرکەوت کە کۆکردنەوەی

ئاوا بەپەلە و بەبێ ئیجازەی ئەو، هەروەها بە دەموڕاوێژی کابرای گوندنشیندا زانی کە فێڵ و پاشقلدانێك لە گۆڕێدایە، بۆیە بڕیاری دا خۆی بچێت و بە حیسابوکیتابەکە رابگا.

لەڤین بۆ نیوەڕۆ گەیشتێ و ئەسپەکەی لەلای هاوڕێیەکی ئەو پیرەپیاوە بەجێ هێشت کە مێردی دایەنی براکەی بوو. پاشان رۆیشت بۆ لای پیرە پیاو لە کەندووخانەکە تاکوو سەبارەت بە دوورینی گیاجاڕەکە و رادەی داهاتەکەی پرسیاری لێبکات. پارمنیچ کە پیرە پیاوێکی رووخۆش و سوێرقسە بوو، بە گەرمی پێشوازیی لێکرد و کار و ژیانی خۆی پێنیشاندا. هێندێکی سەبارەت بە هەنگداری و زێدە بوونی پلوورەکانی خۆی لەو ساڵەدا بۆ باسکرد، بەڵام لە وەڵامی پرسیارەکانیدا لەمەڕ گیادوورینەوە خۆی گێل دەکرد و بە ساردوسڕی وەڵامی دایەوە. ئەوەش زیاتری لەڤین تووشی دڕدۆنگی کرد. رۆیشت بۆ مەزراکە و چاوی لە گیشەکان کرد. دیاربوو کە هیچ کام لە گیشەکان پەنجا عارەبانە پڕ ناکەن و بۆ ئەوەی بەڵگەیەکی بۆ فێڵ و گزەی مووژیکەکان وەدەست کەوێ خێرا فەرمانیدا یەکێك لەو عارەبانانە بێنن کە گیایان کێشاوە و یەکێك لە گیشەکان بار بکەن و بیبەن بۆ کادێن. گیشەکە سیودوو عارەبانە زیاتر نەبوو. هەرچەندە کوێخا هەوڵی دا پێی بسەلمێنێ کە پێشتر گیایەکە بۆش بووە و چونکە ماوەیەك لە گیشەدا ماوەتەوە پەستێوراوە و تەنانەت سوێندیشی خوارد کە چەوتی لە کاریاندا نەبووە، بەڵام لەڤین ئیسەرەمی دەکرد کە گیایەکەیان بەبێ ئیجازەی ئەو بەش کردووە و ئەو هەر گیشەیەکی بە پەجا عارەبانە قەبووڵ نییە. دوای دەمەقاڵێیەکی زۆر هاتنە سەر ئەوەیکە مووژیکەکان ئەو یازدە گیشەیە هەڵگرن بۆ خۆیان کە بە پەنجا عارەبانەی دەزانن و بەشی ئەرباب سەرلەنوێ دابنێنەوە. ئەو چەلەحانێ و کێشە و هەرایەیان هەتا عەسری خایاند. کاتێك کە تەواوی گیایەکە بە جوانی بەشکرا، لەڤین راوێژکارەکەی خۆی بۆ چاوەدێری دانا و خۆی چووە سەر مەلۆیەکی چکۆڵە کە بە لقە بییەك دیاریکرابوو، دانیشت و بە شادی و نەشەوە چاوی بە مەزراکەدا گێڕا کە گوندنشینەکان تێیدا وەك خولخولە هەڵدەسووڕان و کاریان دەکرد.

لەوبەرەوە نزیك رەخی چۆمەکە، لەولای زەلکاوەکەوە، ریزی رەنگاوڕەنگی ژنانی لادێیی جموجۆڵیان بوو و زایەڵەی قاقاکێشان و قسەکردنیان دەبیسترا و قەرخ و مەلۆکانیان کۆدەکردەوە. مووژیکەکان بە دوایاندا دەڕۆشتن و باقەیان دەبەست، دووسێ کەسیش بە شەنەوە بەدوای ئەواندا دەهاتن و باقەکانیان لە گیشە دەدا لەلای چەپیشەوە تەقوکوتی عارەبانە دەهات کە بە گیاجاڕە رووتاوەکەدا دەڕۆیشتن و گیشەکان یەك لە دوای یەك بزر دەبوون و

بەجێی ئەوان بارستایی گیای نیوە وشك و بەرامەدار بە دوولادا شۆڕدەبوونەوە و لەسەر عارەبانەی پشتسەری ئەسپەکان هەڵدەچنران.

پیرە پیاو لە پەنای لەڤین دانیشت و گوتی: پێشینیان دەڵێن هەوا خۆش بوو حاسلات کۆ بکەیەوە، هەمارەکانت پڕ و دارماڵ دەبن. ئەوە خۆ گیا نییە، بەرامەکەی دەڵێی گەڵای چاییە ـ ئاماژەی بە باقەکان کرد کە دەیان بەستن و گوتیشی: بڕوانە دەڵێی ڕەوەیەك مراویی، گورج و برسین، ئەو وردە سەوزەی بۆت داکردوون رایدەماڵن. لە عەسرەوە تا ئێستا نیوەی راستیان زیاتر کۆکردۆتەوە.

پیرەپیاو رووی لە لاوێك کرد کە لەسەر تەختەی پێشی عارەبانەکە دانیشتبوو و هەوساری ئەسپەکەی بە دەستەوە بوو کە لە ریشاڵی شادانە دروست کرابوو، دەنگی هەڵێنا: دوایین کاروانە؟

لاوەکە ئەسپەکەی تۆزێ راگرت و گوتی: بەڵێ، دوایین کاروانە باوەگیان ـ سەری وەرگێڕا و بە پێکەنینەوە چاوی لە ژنێکی کوڵمە سوور و ڕووخۆش کرد کە لە تەنیشتەوە دانیشتبوو و درێژەی بە ڕێگاکەیدا.

لەڤین لە پیرەپیاوی پرسی: ئەوە کێیە؟ کوڕتە؟

پیرەپیاو بە بزەیەکی پڕ لە خۆشەویستییەوە وەڵامی دایەوە: کوڕی چکۆڵەمە.

ـ کوڕێکی گورجوگۆڵ و زیرەکە.

ـ بەڵێ. خراپ نییە.

ـ ژنی هەیە؟

ـ بەڵێ سێ ساڵە کچێکی لە فیلیپۆفەکان خواستووە.

ـ ئەی منداڵی هەیە؟

ـ منداڵی چی؟ یەکەم ساڵ هیچی نەدەزانی و شەرمی دەکرد ـ چونکە دەیویست باسەکە بگۆڕێ، گوتی: بەڵام دەزانی زۆر گیای چاکە، ها! هەر دەڵێی گەڵا چاییە.

لەڤین بە وردی چاوی لە ڤانکا (سووکەڵە ناوی ئیڤان) پارمنۆڤ و ژنەکەی کرد کە لە نزیك ئەوان خەریکی باقە بەستن و بارکردنی بوون. ئیڤان پارمنۆڤ لەسەر عارەبانەکە راوەستابوو و ئەو باقە گەورانەی کە ژنە شۆخوشەنگەکەی سەرەتا بە باوەش دەیهێنا پێشێ و پاشان بە شەنە سەری دەخست، لەسەر عارەبانەکە دەیچنی و بە ڕێکوپێکی دایدەنان و ڕاستەوپاستەی دەکردن. ژنە زۆر شارەزایانە و توندوتۆڵ و ڕووخۆش هەڵدەسووڕا. سەرەتا باخەکەی بە نووکی

شەنەکە ئەمبارەوبار دەکرد و پاشان نووکی شەنەکەی تێهەڵدەچەقاند، دوای ئەویش بە تەکانێکی نەرم و خێرا تەواوی قوورسایی جەستەی خۆی دەدایە سەر دەسکی شەنەکە و ناوقەدی باریکی کە بە کەمەرەیەکی سوور توند بەستبووی دایدەنەواند و راستی دەکردەوە و مەمکی توند و دەرپەڕیوی کە لە بن بەروانکەکەیدا شاردرابوونەوە، دەیدایە پێشێ و بە گورجی دەستی لەسەر دەسکی شەنەکە دەگوێستەوە و باقەکەی بەرز دەکردەوە.

ئیڤان کە دیاربوو دەیهەوێ ژنەکەی زۆر ماندوو نەبێ، باوەشی دەگرتەوە و بە هەردوو دەستی باقەکەی دەگرت و لەسەر عارەبانەکە دایدەنا. ژنە دوایین باقەی وەسەر خست و خۆی تەکاند و ویستی ئەو لقە گیایەی کەوتبووە ملییەوە دریهێنێ. لەچکە سوورەکەی کە لەسەر نێوچاوانە تاونەگەزیوەکەی هەڵکشابوو، هێنایەوە سەر نێوچاوانی و توندی کردەوە و خۆی کرد بە ژێر عارەبانەکەدا تاکوو باربەستەکان توند بکات. ئیڤان فێری دەکرد کە چۆن قولاپەکان قایم بکات، ژنەکەی لە کاتی بەستنی قولاپ و باربەندەکاندا شتێکی گوت کە ئیڤان قاقای کێشا. لە روخساری هەردووکیاندا عەشقێکی گەرم و لێوڕێژ لە خۆشەویستییەکی دڵپاکانە دەدرەوشایەوە و گڕی ئەوینی لاوێتیی پێوە دیاربوو.

## دوازدە

باری عارەبانەکەیان دابەست. ئیڤان بازیدا خوارێ و هەوساری ئەسپە نەجیم و خۆش ئاژۆکەی گرت: ژنەکەشی شەنەکەی فڕێدا سەر بارەکە و بە هەنگاوی پتەو و قۆڵڕاوەشاندن رۆیشت بۆ لای پولی ژنان کە تێکڕا هەڵدەپەڕین. ئیڤان عارەبانەکەی لە کێڵگەکەوە بردە سەر رێگا و چووە ریزی عارەبانەکانی ترەوە. ژنان، کە دەنگی ناسك و پڕ لە شادییان دەشتەکەی داگرتبوو، بە جلوبەرگی نەخشاو و بریقەدارەوە شەنەیان خستبووە سەرشان و بە دوای عارەبانەکاندا وەڕێکەوتن. دەنگێکی گڕی ژنانە کە زایەڵەیەکی وەحشیی پێوە دیاربوو گۆرانییەکی تێهەڵکرد و بەندی یەکەمی گوت و پەنجا دەنگی جۆراوجۆر، گڕ و ناسك، تێکڕا پێکەوە و بەیەك هەوا بەندەکەیان بۆ سەندەوە.

ژنان بەدەم گۆرانی گوتنەوە لە لەڤین نزیکبوونەوە و لە گوێی لەڤیندا دەتگوت گەواڵە هەورێکی چڕە بە گرمەیەکی پڕ لە شادییەوە بەرەو لای دێ. هەورەکە گەیشتە لای و ئەو و

گیشەکەی وا لەسەری دانیشتبوو و گیشەکانی تر و عەرابەکان و هەموو مەزراکە و سەرپاکی دەشتەکەی داگرت و ئەوانەش هەموو بە هەوای ئەو گۆرانییە و شادی و نەشە و چریکە و زایەڵەی دەنگی ژنان وەلەرزین کەوتن. لەڤین بەو نەشە و شادییەی ئەوان کە پڕبوو لە دەنگدانەوەی لەشساخی، ئێرەیی دەبرد و دەیویست ئەو گۆرانییەیان لەگەڵ بڵێتەوە کە شادی و سەرخۆشیی ژیان لە ئاوازەکەیدا شەپولی دەدا. بەڵام هیچ کارێکی لەدەست نەدەهات و ناچاربوو هەروا بە وەرکەوتنەوە بڕوانێ و گوێ راگرێ. کاتێك دەستەی ژنانی لادێیی وەك رەوە ئاسك دووردەکەوتنەوە لە چاو ون بوون و ئیتر دەنگیان بە گوێی نەدەگەیشت، خەمۆکی و دڵتەنگییەکی قورس دڵی داگرت، چونکە دەیدی چەندە تەنیا و دوور و نامۆیە لە دنیای کار و شادیی ئەوان. چەند کەس لەو گوندنشینانەی کە زیاتر لەوانی دیکە لەسەر بەشکردنی گیایەکە قڕەیان لەگەڵ دەکرد، ئەوانەی کە ئەو زویری کردبوون، ئەوانەی کە ویستبوویان فێڵ و گزەی لێبکەن، بە رووخۆشی لە هەمبەریان کڕنۆشیان دەبرد و دیاربوو هیچ رق و دەخەزێکیان لە دڵدا نییە و ناتوانن لە دڵیاندا رایگرن. لەو کارەشیان نەك هەر پەشیمان نەبوون بەڵکوو تەنانەت لە بیریشیان نەمابوو کە ویستوویانە فێڵی لێبکەن. ئەوانە هەمووی لە زەریای هەوڵ و تێکۆشان و شادیی گشتیدا نوقم بووبوون. خودا رۆژی رووناك و توانایی کاری پێبەخشیبوون و ئەوان رۆژگار و توانایی خۆیان بۆ کارەکەیان تەرخان کردبوو و هەر لەو ئیشەشدا پاداشتی خۆیان وەرگرتبوو. بەڵام ئەوەی کە کارەکە بۆ کێ بوو و داهاتەکەشی چیبوو مەسەلەیەکی ناسەرەکی و بێجێ بوو.

لەڤین زۆر جار گەشبینانە لەو ژیانەی روانیبوو و ئێرەییی بەو کەسانە بردبوو کە ژیانێکی ئەوتۆیان هەیە، بەڵام ئەو کاریگەرییەی کە پێوەندیی نێوان ئیڤان پارمنۆڤ و ژنەکەی لە سەری دانابوو وایلێکرد بیر لەوە بکاتەوە کە دەست لەو ژیانە ناخۆش و ناڕاستەقینەیە هەڵگرێ کە لەگەڵ تەنیایی و دڵتەنگی ئاوێتە بووە، خەریکە تەمەنی بە فیڕۆ دەڕوا و وا چاکە دەستبکات بە ژیانێکی پاك و پڕ لە کار و چالاکی و زەحمەتکێشان لەگەڵ خەڵك کە ئەویش تەنیا بڕێکی غیرەت و ئیرادە دەوێ.

ئەو پیرە پیاوەی لە پەنای دانیشتبوو، لەمێژ بوو رۆیشتبۆوە بۆ ماڵێ. لادێییەکان هەریەك بەلایەکدا بڵاوەیان کردبوو. خەڵکی گوندە نزیکەکان رۆیشتبوونەوە بۆ ماڵی خۆیان و ئەوانەی ماڵیشیان لە گوندە دوورەکان بوو لە دووسێ شوێن کۆ بووبوونەوە تاکوو شێو بخۆن و شەوێ لە مەزرا بمێننەوە. لەڤین کە هیچ کەس ئاگای لێی نەمابوو، هەروا لەسەر گیشەکە وەرکەوتبوو و دەیڕوانی و گوێی هەڵخستبوو و بیری دەکردەوە. ئەو گوندنشینانەی کە لە مەزرا مابوونەوە

تاکوو شەوێ لە ژێر ئاسمان ڕۆژ بکەنەوە، شەوی کورتی هاوینیان تێپەڕ کرد و هەتا بەیانی بەخەبەر مانەوە، سەرەتا قسە و دەمەتەقێی گشتی و قاقای بەنەشە و گەلە خەندەیان کاتی شێوخواردن بەر گوێ دەکەوت و دوای شێویش دەستیان کرد بە گۆرانی و قاقاکێشان.

زەحمەتی ڕۆژێك لە بەیانییەوە تا ئێوارە جگە لە نەشە هیچ شوێنێکی تری لە سەریان بەجێ نەهێشتبوو. بەر لە کازێوە دەنگی پێکەنین و گۆرانی گوتنیان تەواوبوو. ئیتر جگە لە قرەی بۆقان لە نێو زەلکاوەکەدا و پڕمەی کەپۆی ئەسپەکانیان کە لە گیاجاڕەکاندا بەسترابوونەوە، هیچ دەنگێکی تر نەدەهات و تەموومژێکی لێلّ دەشتەکەی داگرتبوو، لەڤین وەخۆ هاتەوە، لەسەر گیشەکە هاتە خوارێ و چاوێکی لە ئاسمان کرد و تێگەیشت کە ڕۆژ بۆتەوە.

هەولّی دەدا لە ئاکامی ئەو شەوە کورتەدا ئەو بیرەی کردبوویەوە و لە دلّیدا هەستی پێکردبوو، لێکیان بداتەوە و لە سەری ساغ بێتەوە، بە خۆی گوت «ئێستا دەبێ چ بکەم و چۆن؟» ئاکامی هەست و بیرۆکەکانی دەکرا لە سێ بوارەوە شرۆڤە بکرێ، یەکیان چاوپۆشی کردن لە ژیانی رابردووی و ئەو زانیاری و خوێندەوارییەی کە بە کەلّکی هیچ نەدەهات. ئەو چاوپۆشییەی زۆر بەلاوە شیرین بوو و زۆر ئاسانیشی دەهاتە بەرچاو. بیرۆکە و بۆچوونەکانی تریشی پێوەندییان بەو ژیانەوە هەبوو کە ئەو ئێستا حەزی دەکرد هەلّیبژێرێ، بە روونی هەستی دەکرد کە ئەم ژیانە، سادە و پاك و یاسامەند دەبێ و دلّنیا بوو کە لەم ژیانەدا ڕەزایەت و هێمنایەتی و بڕوا بەخۆبوون و نەفسبەرزی وەدەست دێنێتەوە، کە بێبەش بوون لەوانە تا ئەو ڕادەیە تووشی ئازار و خەمۆکیی کردبوو.

بەلّام بیرۆکەکانی تریشی لە جەغزی ئەو مەسەلەیەدا دەسووڕانەوە کە تێپەڕین لە ژیانی رابردوو و ڕۆیشتن بەرەو ژیانی نوێ لە چ ڕێگایەکەوە دەلوێ" لەو بارەشەوە هیچ بۆچوونێکی ڕووناکی نەبوو. بەخۆی دەگوت «ژن بێنم؟ کارێك بکەم کە نەتوانم خۆ لە ئیشکردن ببوێرم؟ دەست لە پاکرۆسکایا هەلّگرم؟ زەوییەك بکڕم و لەگەلّ گوندنشینەکان ژیانێکی هاوبەش دەست پێبکەم؟ ژنێکی لادێیی بێنم؟» ئەو پرسیارانە لەبەر دەمیدا زەقبووبوونەوە و وەلّامی بۆ نەدەدۆزینەوە، دیسان لە دلّی خۆیدا گوتی «بەلّام من شەوی ئەمشەو خەو نەچۆتە چاوم و ناتوانم وەلّامێکی شیاو بۆ ئەو پرسیارانەم وەدۆزم، ئەو مەسەلەیە دەمێنێتەوە بۆ دوایی، شتێك ڕوون و ئاشکرایە، ئەویش ئەوەیە ئەم شەوە چارەنووسی منی گۆڕیوە، خولیاکانی پێشووی من سەبارەت بە ژیانی بنەمالّەیی هەموو وڕێنە و هاتەرانپاتەران بووە، هەموو خەیالّەکان نابەجێ بوون. کارەکە زۆر ساناتر و ڕووناکترە لەوانە...»

چاوی لە گەواڵە هەورێکی سەیر کرد کە دەتگوت چۆڕی شیرە و ڕاست لە ژوور سەری و لە نێو هەورەسپییەکاندا دیاربوو کە دەتگوت ڕانە مەڕن لەسەر سینگی ئاسمان پەلیان هەڵخستووە و لەبەر خۆیەوە گوتی «چەن جوانە! ئەمشەو دەڵێی دەرگای بەهەشتی خودا ئاواڵەیە. ئەو هەورە سپیێ و لۆکەییە لە کۆێوە هات؟ ساتێك لەمەوبەر سەرم هەڵێنا جگە لە دوو هێڵی سپی هیچ شتێکی تر دیارنەبوو. بیرۆکەکانی منیش سەبارەت بە ژیان هەر ئاوا کتوپڕ و بێ ئەوەی هەستی پێبکرێ گۆڕانی بەسەردا هاتووە.»

لە مەزراکە هاتەدەرێ و ڕۆیشتە سەر ڕێگا و بەرەو ئاوایی کەوتە ڕێ. سروەیەك هەڵیکرد و مژێکی خۆڵەمێشین ڕەنگی خەمی بەسەر وڵاتدا پڕژاند. ئەوەش ئەو ساتە بوو کە هەموو ڕۆژێ بەر لە ئەنگووتنی گزنگی خۆر و سەرکەوتنی ڕووناکی بەسەر تاریکیدا هەموو شێتك لێڵ و خەمناکی دەنواند.

لە سەرمانا خۆی کووڕ کردبۆوە و ملی بە خوزدا گرتبوو و بەپەلە هەنگاوی دەنا. گوێی لە زڕەی ڕەنگوڵەیەك بوو، سەری هەڵێنا و لە دڵی خۆیدا گوتی «ئەوە چییە ئیتر؟ بڵێی کەسێك بەرەو ئێرە بێ؟» چل هەنگاو لەو لەولاوە بەسەر ڕێگا سەرسەوزەکەدا فایتوونێکی چوار ئەسپە کە چەند جانتایان لە سەربانەکەی دانابوو، بە پڕتاو بەرەو لای ئەو دەهات. ئەسپەکان لە هەردوو لاوە خۆیان بە ماڵبەندەکەوە دەنووساند تاکوو لاقیان نەکەوێتە قوڵکەی ڕێگاکەوە کە تایەی عارەبانە کاتی بارانبارین و تەڕوقوڕی دروستی کردبوو، بەڵام فایتوونەوان کە لە بەرێکەوە لەسەر سندوقەکەی خۆی دانیشتبوو، ئەسپەکانی وا لێدەخوڕی کە تایەی عارەبانەکە نەکەوێتە نێو قووڵکەکانەوە.

لەڤین لەوە زیاتر هیچی بۆ دەرنەدەکەوت و بێ ئەوەی گوێ بداتە ناسینی مسافیرەکان چاوێکی خێرای لە نێو فایتوونەکە کرد.

پیرێژنێك لە سووچێکی فایتوونەکەدا وێژنگی دەدا و کچێکی عازەبیش کە دیاربوو تازە لە خەو هەستاوە لەبەر پەنجێرەکە دانیشتبوو. لکەو ریشکۆی شەوکڵاوە سپییەکەی بە هەردوو دەستی گرتبوو، ڕوخسارە سپی و ناسکەکەی لە فیکردا نوقم بووبوو. زەین و بیری پڕ بوو لەو شێوە ژیانە پڕ شکۆ و پێچەڵاوپووچەی کە لەڤین نامۆ بوو لەگەڵی، کچە لە ژوورسەری ئەوەوە چاوی لە ئاسۆی ڕووناکی ڕۆژهەڵات بڕیبوو.

چاوی جوان و پاکی کچە ڕاست لەو ساتەدا کە خەریکبوو دیمەنەکە لەبەر چاوی لاچێ و فایتوونەکە تێپەڕێ بە ڕوخساری لەڤین کەوت. کچە ئەوی ناسییەوە و شادییەکی تێکەڵ بە سەرسووڕمان دەموچاوی دەگەشاندەوە.

لەڤین بە هەڵە نەچووبوو، کەسێك کە تەواوی ڕووناکایی و مانای ژیانی ئەوی لە وجوودی خۆیدا کۆدەکردەوە تەنیا کەسێك بوو، ئەویش کیتی بوو. کیتیی ناسییەوە. لەڤین زانی کە کیتی و دایکی لە وێستگەی هێلاسنەوە هاتوون و دەچن یەرگۆشۆڤ، تەواوی ئەو فیکر و خەیالانەی کە شەوێ ئەوی خستبووە گێژەنەوە و تەواوی ئەو بڕیارانەش کە بەخۆی دابوو، هەمووی لە ناکاو بزر بوون. بە بێزارییەوە خولیای زەماوەندکردن لەگەڵ کچێکی لادێیی وەبیرهاتەوە. دەرووی دەربازبوون لە تەنگژە و تەنگوچەڵەمەکانی ژیانی، هەروەها کێشەیەکی تاڵ و بەژان کە لەم دواییانەدا تووشی ڕەنج و ئازاری کردبوو لە نێو ئەو فایتوونەدا بوو کە لەوسەری ڕێگاکەوە لێی دووردەکەوتەوە.

کیتی سەری لە فایتوونەکە نەهێنا دەرێ و ئیتر چاوی لێنەکرد. تەقوکوتی تایەی عارەبانەکە نەدەبیسترا و زڕەی زەنگوڵەی ئەسپەکانیش وردە وردە خەریکبوو ئاسەواری نەدەما. وەڕینی سەگەڵ نیشاندەری ئەوەبوو کە فایتوونەکە لە ئاوایی تێپەڕیوە. ئەوەی بەجێ مابوو دەشتی چۆڵی دەوروبەری بوو و گوندەکە لە پێشییەوە ئەویش تەنیا لەگەڵ هەموو شتێك نامۆ، تەکوتەنیا بە ڕێگا پان و چۆڵەکەدا تێدەپەڕی.

چاوی لە ئاسمان کرد بەو هێوایەی هەورە لۆکەییەکە کە ئەو بە چاوی سەیرمانەوە لێی ڕوانیبوو و وەك هەموو ئەندێشە و هەستەکانی ئەو شەوەی خۆی هاتبووە بەرچاو دیسان ببیبنێتەوە. بەلام ئاسمان ئیتر هیچ وڕە لۆکە و گەواڵە هەورێکی پێوە نەمابوو. لەوێ لەو بەرزاییی و تەشقە بێپایانەی ئاسمان گۆڕانێکی ڕەمزاوی ڕووی دابوو. تەنانەت پەڵە هەورێك بە ئاسمانەوە نەبوو. تەنیا تۆێژێکی سپی کە بەردەوام لە شینایی ئاسماندا بەرەو پووکانەوە دەچوو، نیوەی ئاسمانی داگرتبوو. ئاسمان جارلەگەڵجار شینتر و ڕووناکتر دەبۆوە و وەلامی سەرنجە ورد و بێپایانەکانی ئەوی دەدایەوە.

لە دڵی خۆیدا گوتی «نا، ئەم ژیانە هەرچەندەش سادە و پڕ لە تێکۆشان بێ من ناتوانم پەسەندی بکەم، من "ئەو"م خۆش دەوێ.»

# سێزده

جگە لەو کەسانەی کە لە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ زۆر نزیکبوون هیچ کەسی تر نەیدەزانی کە ئەو پیاوە بە ڕواڵەت خوێنسارد و ماقووڵە کەمایەسییەکی هەیە کە لەگەڵ ڕەوشتی گشتی ئەو زۆر ناسازگارە، ئەویش ئەوەبوو کە نەیدەتوانی گریانی منداڵێك یان ژنێك ببینێ یان ببیستێ و کەمتەرخەم بێ، بە دیتنی فرمێسك خەم دایدەگرت و توانایی فیکرکردنەوە و بەڵگە هێنانەوەی بە تەواوی لەدەست دەدا. بەڕێوەبەری نووسینگەکەی و دەفتەردارەکەی لەوە ئاگاداربوون و ئەو ژنانەیان حاڵی دەکرد کە بۆ کارێك دەهاتن بۆ لای و وریاییان پێدەدان کە ئەگەر حەزدەکەن کارەکەیان بێئاکام نەمێنێتەوە لە هەنتەشی ئەودا ددان بە خۆیاندا بگرن و نەگرین. دەیانگوت: تووڕە دەبێ و گوێ ناداتە داواکارییەکەتانـ بەڕاستیش لەو کاتانەدا پەرۆشی و دڵگرانیی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ، بەهۆی دیتنی فرمێسك و گریان، دەبووە ڕق و تووڕەییەکی قورس و دۆ و دۆشاوی تێکەڵ دەکرد: هیچ کارێکم لەدەست نایە. تکایە بڕۆ دەرێ.

کاتێك کە ئانا، دوای گەڕانەوە لە کێبەرکێکە، ددانی بە پێوەندییەکەی خۆی لەگەڵ ڤرۆنسکیدا نا و دەستی بەبەر دەموچاوییەوە گرت و دەستیکرد بە گریان، ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بە هەست پێکردنی تووڕەیی لە دەروونی خۆیدا لەڕێوە تێگەیشت کە پەرۆشی و خەم بە هۆی دیتنی فرمێسکی ئاناوە سەرتاپای داگرتووە، چونکە ئاگاداری ئەو حاڵەی خۆی بوو و دەیزانی کە دەربڕینی هەستی خۆی لەو ساتەدا لەگەڵ بارودۆخی ڕوحیی سازگار نییە، هەوڵی دا دان بەخۆیدا بگرێ و هەڵنەچێ. هەر بەو هۆیەش نە جووڵەی کرد و نە چاوی لە ڕوخساری ئانا کرد. هەر بۆیەش ڕوخساری ڕەنگی مردووی لێنیشت و بووە هۆی واق وڕمانی زۆری ئانا.

کە گەڕانەوە بۆ ماڵێ کارنین لەگەڵ هاوسەرەکەی لە فایتوونەکە دابەزی و هەوڵی دا تاکوو بە شەرم و حەیا ئاساییەکەیەوە خوداحافیزیی لێبکات و وشەی وا بە زاریدا نەیەت کە تووشی دەروەست بوونی بکات. گوتی سبەینێ بڕیارەکەی خۆی بە ئاگاداریی ئەو دەگەیێنێ.

قسەی ژنەکەی کە ناحەزترین خانەگومانیی ئەوی دەرخستبوو دڵی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچی تووشی خەم و ئازارێکی قورس کرد. هەستی بەزەییەکی سووتێنەر کە بە دیتنی فرمێسکی ژنەکەی لە دڵیدا سەری هەڵدابوو ئەوەندەی تر ئازارەکەی لە ڕۆحی هاڵاند و هەڵیچۆقاند. بەڵام کاتێك لە فایتوونەکەدا تەنیا کەوت، بە سەرسووڕمان و شادییەوە دیتی کە لە دەست دڵسۆزییەکەش ڕزگاری بووە و لەدەست ئازاری گومان و دڵپیسیش کە لەم دواییانەدا وەرهەمی پێهەڵێنابوو.

هەستی کەسێکی بوو کە ماوەیەکی زۆر ددانی ئێشاوە و دوای تاملکردنی ئازار و ژانێکی تاقەتپڕووکێن، شتێکی گەورە، گەورەتر لە کاژەڵاکی، لە شەویلاکەی دەرکێشڕاوە و بێ ئەوەی بڕوای بە شیرینی و چێژی ڕزگاربوون هەبێ دەبینێ ئەوەی ماوەیەکی دوور و درێژ ژیانی پێتاڵ کردبوو و تەواوی فیکر و زیکری ئەوی بە خۆیەوە خەریك کردبوو ئیتر نەماوە و ئەو دیسان دەتوانێ بژی و هەرچی دەخوازێ بیری لێبکاتەوە و بیر لە شتگەلێکیش جگە لە ددانە ئێشاوەکەی خۆی بکاتەوە.

لە دڵی خۆیدا گوتی: «ژنەتیوە نارەسەنە، بێڕەحم، بێدین، هەرزە! من ئەوەم هەر لە سەرەتاوە دەزانی و هەمیشە دەمدی، ئەگەرچی دڵم پێی دەسووتا و هەوڵم دەدا خۆمی لێ گێل بکەم.» هەر بە ڕاستی پێیوابوو لە سەرەتاوە ئاگاداری ماجەراکە بووە. بیری لە ژیانی پێشوویان دەکردەوە و لە ڕابردوودا پێی وانەبوو شتێکی دزێوی تێدا بێ و هەر ئەو یادەوەرییانە و پاژەکانی ژیانی ڕابردوویان ئێستا لەبەر چاوی ڕەش و پڕ شوورەیی بوو. لەبەر خۆیەوە گوتی« هەر لە سەرەتاوە ژیانی هاوبەشی ئێمە هەڵە بوو، بەڵام ئەو هەڵەیە شتێکی دزێوی لەگەڵدا نەبوو. کەوایە من نابێ خۆم بە ناکام بزانم. خۆ تاوانی من نییە، ئەو تاوانبارە، بەڵام من کارم بە سەرییەوە نییە. ئیتر ئەو بۆ من لە ڕیزی نەبووانە...»

هەر شتێك بەسەر ئانا و کوڕەکەی بهاتبایە، کە لە ڕوانگەی کارنینەوە دەرهەق بە ئەویش وەك ژنەکەی هەستی سارد بووبۆوە و گوێی لێ نەبوو، تەنانەت پێی وا نەبوو کوڕیشی هەیە. تەنیا شتێك کە فیکری ئەوی بە خۆیەوە خەریك کردبوو ئەوەبوو کە چ بکا تاکوو باشترین و شیاوترین و ئاسوودەترین ئەدگار بۆ خۆی، کە لە ئاکامدا عادڵانەترین ئەدگار دەبوو، ئەو قرێژی و چەپەڵییەی ئانا بە هەڵخلیسکانی خۆی ئەویشی تێوەدابوو، لە خۆی بسڕێتەوە و هەروەها درێژە بە ڕێگای ژیانی پڕ لە چالاکی و کاری شەڕافەتمەندانە و بەکەڵکی خۆی بدات.

لە دڵی خۆیدا گوتی « من نابێ بەهۆی ئەوەی کە ژنێکی سووك و هەرزە تووشی تاوانێك بووە خۆم بە چارەڕەش بزانم. تەنیا دەبێ باشترین ڕێگای دەربازبوون لەو بارودۆخە نالەبار و

دژواره بدۆزمەوە کە ئەو تووشی منی کردووە.» بە گرژی و تووڕەییەکی لە پێشوو زیاترەوە دیسان کەوتەوە سەر ڕێچکەی بیرکردنەوە «ئەو ڕێگایە دەدۆزمەوە. من نە یەکەم مێردی هەڵخەڵەتاوم و نە دوایین مێردیش. لە ڕابردووشدا نموونەی ئەو ژنانە کەم نین کە خەیانەتیان بە مێردەکانیان کردووە و یەکەمیشیان لە مێژوودا هێلێن ژنە شۆخ و شەنگەکەی منەلاسی یۆنانی بوو کە لە زەینی هەمووواندا تازە بووبۆوە[١٢٥]. لە بنەماڵەی نەجیمزادانی ئەم سەردەمەش زۆر ژنی نانەجیمی وەبیر خۆی هێنایەوە، هەروەها مێردە هەڵخەڵەتاوەکانیانی هێنایە بەرچاوی خۆی. داریالۆڤ، پالتافۆسکی، پرێنس کاریبانۆڤ، کێنت پاسکۆدین، دێرام، بەڵێ تەنانەت دێرامیش،.... پیاوێکی بە شەرەف و بەڕێزی وەك دێرام.... سمیۆنۆڤ، چاگین، سیگۆنین... وایدانێین بە ناهەق کلاوی بێ غیرەتییان چۆتە سەر، بەڵام من هیچ کات جگە لە ناکامی هیچی دیکەم نەدیوە و هەمیشە هەستم بە هاودەردییان کردووە.» ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ ئەوەی دەگوت بەڵام درۆی دەکرد و قەت قەت دەرهەق بە چارەڕەشییەکانی ئەو کەسانە هەستی بە هاودەردی نەکردبوو. هەرچەند جارێ کە نموونەی ئەو ژنانەی دەدی کە خەیانەتیان بە مێردەکانیان کردبوو، زیاتر هەستی بە غووروور و خۆبینی کردبوو. ئێستا بەخۆی دەگوت «ئەو شوورەیی و ناکامییە لەوانەیە توشی هەموو کەس ببێ و ئێستاش بەرۆکی منی گرتووە. مەسەلەکە تەنیا ئەوەیە چۆن بە باشترین شێوە ئەو بارودۆخە تامڵ بکەم.» دەستیکردەوە بە بیرکردنەوە لەو کەسانەی کە وەك خۆی تووشی ئەو کێشە و تەنگژە پڕ شوورەییە بووبوون.

«داریالۆڤ لەگەڵ خەنیمەکەی دوئێلی کرد.»

دوئێل لە سەردەمی لاویدا بە تایبەت بە هۆی کارێکی ئەوتۆوە شوێنێکی سەیری لەسەر بیر و خەیاڵی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ دانابوو، چونکە لە کاروباری ئاسایی ژیاندا زۆر شەرمێون بوو و خۆشی ئەوەی باش دەزانی. ئەو نەیدەتوانی بیهێنێتە بەرچاوی خۆی کە دەمانچەیەکی بەرەوڕوو ڕاگیراوە و ترس داینەگرێ، چونکە لە ماوەی تەمەنیدا قەتی چەك بە دەستەوە نەگرتبوو. ئەو ترسە بووبووە هۆی ئەوەی هەر لە تەمەنی لاوییەوە بیر لە دوئێل بکاتەوە و لە زەینی خۆیدا وایدانێ کە ناچاربێ خۆی بخاتە مەترسییەوە. بەڵام لەو کاتەوە کە

١٢٥- ئاماژەیە بە ئۆپێرای کومیك La Belle Helene بەرهەمی ئوفنباخ کە لەو ڕۆژانەدا لە مۆسکۆ و پترزبۆرگ لەسەر شانۆ بوو.

لە ژیاندا سەرکەوتنی بەدەست هێنابوو و بە پلە و پایەیەکی بەرز گەیشتبوو ئەو هەستەی لەبیر چووبۆوە. بەڵام ئێستا ئەو هەستەی کە بە گەنجی خووی پێگرتبوو دیسان لە دڵیدا زیندوو بووبۆوە و ئەوەندە لە سەرشۆڕی و زەبوونیی خۆی دەترسا کە ماوەیەکی دوور و درێژ بیری لە دوئێل کردەوە و لە هەموو لایەنێکەوە هەڵیسەنگاند، ئەگەرچی دەیزانی کە هیچ کات و لە هیچ بارووددۆخێکدا کارێکی وا ناکات.

«کۆمەڵگای ئێمە، بە پێچەوانەی کۆمەڵگای ئینگلیز، بێگومان هێندە دواکەوتووانەیە کە تاقمێکی زۆر لە خەڵك دوئێل بە شتێکی باش دەزانن...» زۆربەی ئەو کەسانەش کە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ ڕێزی بۆ بیروڕاکەیان دادەنا لەو تاقمە بوون. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ ئاوا درێژەی بە بەڵگەهێنانەوەکەی دا «... بەڵام ئەو ئاکامەی لە دوئێل دەکەوێتەوە چییە؟ وایدانێین من ئەو پیاوەم بۆ دوئێل بانگکرد...» ئەو شەوە دوای بانگکردنەکە هەتا ڕۆژ دەبێتەوە دەمانچەیەك دەبینێ سێرەی لە سینگی گرتووە، دەیهێنا بەرچاوی خۆی دەلەرزی و بە روونی دەیدی کە هیچ کات کاری وا ناکات. دیسان کەوتەوە سەر ڕێچکەی بیرکردنەوە «... وای دانێین کە بۆ دوئێل بانگم کرد، وای دانێین کە فێرم دەکەن چ بکەم و لە شوێنی خۆم رامدەگرن و من دەست دەنێنم بە پەلەپیتکەی دەمانچەکەدا...» ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ هەردوو چاوی قووچاند. «وای دانێین کوشتم.» سەری راوەشاند تاکوو ئەو بیر و خەیاڵە لە خۆی دوور بخاتەوە»... پیاوێك دەکووژم تاکوو لەگەڵ ژنێکی تاوانبار و کوڕێکی کە ئەو ژنە بۆمی بووە یەکچاو ببمەوە. ئەو کارە چ مانایەکی هەیە؟ ئەو پیاوە بکوژرێ یان نەکووژرێ، من هەر دەبێ لەگەڵ ئەو ژنە تەکلیفم روون ببێتەوە. بەڵام ئەوەی کە زیاتر شکی بۆ دەچێ، یان تەنانەت روون و ئاشکرایە ئەوەیە کە من لەو دوئێلەدا یان دەکووژرێم یان بریندار دەبم. منی بێتاوان، کە بوومەتە قوربانی تاوانی ئەوان، دەکووژرێم یان بریندار دەبم. ئەوەش دەبێتە عوزری لە قەباعەت خراپتر. بەڵام جگە لەوانەش بانگکردن بۆ دوئێل لەلایەن منەوە زۆر کارێکی دزێوە. بۆ من هەر لە ئێستاوە نازانم کە هاوڕێکانم ناهێڵن من دوئێل بکەم؟ مەگین ئەوان دەهێڵن لێپرسراوێکی دەوڵەت، خزمەتگوزارێکی وەتەن، گیانی بکەوێتە مەترسییەوە؟ ئاکامەکەی دەبێ بەچێ؟ ئاکامەکەی ئەوە دەبێ کە سەرەڕای ئەوەی لێم روونە هەڕەشەی مەرگم لەسەر نییە ویستوومە بەو داواکارییەم بۆ دوئێل ئابڕووییەکی درۆیین وەدەست بهێنم. کارێکی ئاواش دوور لە جوامێرییە. ئەوەش درۆ کردنە لەگەڵ خۆم و دەوروبەرییەکانم. خۆ هەڵفریواندنە. نا، دوئێل نابێ هەر بیریشی لێبکەمەوە، هیچ کەسیش چاوەڕوانیی ئەو کارەی لە من نییە. من دەبێ ڕێز و خۆشناوییی خۆم بپارێزم کە بۆ درێژە پێدانی کارەکەم پێویستە.» خزمەت

کردن بە دەوڵەت کە بەر لەوە زۆر لەلای ئەو بایەخدار بوو ئێستا گرنگایەتییەکی زیاتری پەیداکردبوو.

دوای ئەوەی مەسەلەی دوئێلەکەی لێکدایەوە، بە شتێکی خراپی زانی و رەتی کردەوە، بیری لە تەڵاق کردەوە و ئەوەش رێگە چارەیەك بوو کە هێندێ لەو کەسانەی دەیناسین هەڵیانبژارد بوو. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ دوای ئەوەی تەواوی بوارە ناسراوەکانی تەڵاقی لە زەینی خۆیدا لێکدایەوە (ئەو مەسەلەیەش لە کۆمەڵگای گەوراندا کە ئەو باشی دەناسین کەم نەبوو) هیچ مەسەلەیەکی نەدۆزییەوە کە لەودا تەڵاق ئەوە بێ کە ئەو لەبەر چاوی گرتبوو. لە هەموو ئەو مەسەلانەدا مێرد هاوسەری تاوانباری خۆی لە پەیمانی ژنومێردایەتی ئازاد دەکرد یا دەیفرۆشت و ئەو لایەنەی کە بە هۆی تاوانەوە دەبوو لە مافی پێکهێنانی ژیانی هاوبەش بێبەش بێ، پێوەندییەکی خۆکرد و ئازادانەی بە پێی یاسا لەگەڵ مێردێکی تازە دادەمەزراند. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لەمەڕ خۆیەوە دەیدی کە تەڵاقی یاسایی، یا تەڵاقێك کە تەنیا ببێتە هۆی مەحکومییەت و تاراندنی ژنێکی تاوانبار گونجاو نییە. دەیدی کە مەرجە پێچەڵاوپووچەکانی ژیانی ئەو، بۆ بە دەستەوەدانی بەڵگەگەلێکی کرێت کە بەپێی یاسا بۆ مەحکووم کردنی ژنێکی تاوانبار پێویستە، ناگونجێ. دەیدی کە لەو ژیانەدا هێندێ وردەکاریی تایبەت هەیە کە نواندنی بەڵگەگەلێکی ئەوتۆ هەڵدەوەشێننەوە، تەنانەت ئەگەر بشگونجێ بیاننوێنێ، چونکە نواندنی ئەوانە ئەو زیاتر لە ژنەکەی لەبەر چاوی کۆمەڵگا سووك و بێئابڕوو دەکات. بڕیاری تەڵاقیش لەوانەبوو دادگایی کردنێکی ئابڕووبەرانەی لێبکەوێتەوە. بیانووی دەدایە دەست نەیارەکانی تاکوو بە تۆمەت و بوختان پلەی بەرزی کۆمەڵایەتیی ئەو دابەزێنن و خۆشناوییەکەی رمووده بکەن. مەبەستی سەرەکیی ئەو، یانی روون بوونەوەی بارودۆخەکە بە کەمترین زیان و خەسارەوە، لە رێگەی تەڵاقیشەوە نەدەگونجا. جگە لەوەش سوور سوور دەیزانی بە تەڵاق، تەنانەت ئەگەر بڕیاریش بدا بۆ تەڵاقدان، ژنە لە پەیمانی پێوەندی ژنومێردایەتی رزگاری دەبێ و لەگەڵ گراوەکەی خۆی ژیانی هاوبەش پێك دێنێ. ئەگەرچی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ پێیوابوو هەستێکی جگە لە کەمتەرخەمییەکی پڕ سووکایەتی سەبارەت بە ژنەکەی لە دڵدا نییە، نەیدەویست رێگای پێوەندی گرتنەکەی نێوان ڤرۆنسکی و ژنەکەی خۆش بکات، بە جۆرێك کە تاوانی ئەوی زۆر بە قازانج بوو. هێنانە بەرچاوی ئەو حاڵەش تەنانەت ئیمان هەردەی دەکرد کە بەهۆی ژانێکی دەروونییەوە دەناڵێ و لە نێو

فایتوونەکەدا خۆی نەدەگرت و جێگۆڕکێی دەکرد و هەموو جارێ تا ماوەیەك گرژ دەبوو و بەتانییە تیسکنەکەی لە دەوری لاقوقولە کز و بە سەرما حیزەکەی خۆی دەپێچا.

کە تۆزێك هاتەوە سەرخۆ درێژەی بە فکر و خەیاڵەکانی خۆی دا" سەرەڕای تەڵاقی فەرمی، لەوانەبوو وەك کاریبانۆڤ و باسکۆدین و دێرامی ئاخر بەخێر لە ژنەکەی خۆی جیا بێتەوە. بەڵام ئەو کارەش وەك تەڵاقی یاسایی بێعەیب نەبوو، یانی جگە لەوەی کە پڕ شوورەیی بوو ژنەکەشی بە بێ هیچ کۆسپێك دەخستە ئامێزی ڤرۆنسکییەوە. لەگەڵ ئەوەی کە بەتانییەکەی لە لاقی خۆی دەپێچایەوە بە دەنگێکیی بەرز گوتی: نا، ئیشی وا هەر نابێ، بە هیچ شێوەیەك نابێ. من نابێ داخ بچێتە سەر دڵم و ئەوانیش نابێ بەو ئاواتە بگەن.

خانەگومانییەك کە لە ماوەی بێخەبەرییەکەیدا زۆری ئازاردابوو، کاتێك کە ژنەکەی بە قسە تاڵەکانی خۆی ددانە ئێشاوەکەی کێشا، ئاسەواری نەما" بەڵام جێگەی خۆی دا بە هەستێکی دیکە و ئەویش ئەو ویستە دەروونییە بوو کە نەیدەویست ژنەکەی بە کاوی دڵی بگا و حەزی دەکرد لە هەمبەر تاوانەکەیدا سزا بدرێ. ئەو حاشای لەو هەستەی خۆی نەدەکرد کە لە ناخی دڵەوە ئاواتەخواز بوو کە ئانا لەبری تێکدانی هێمنایەتی و رمووەدەکردنی ناوی ئەو ئازار بکێشێ. دیسان لە زەینی خۆیدا دوئێل و تەڵاق و جیابوونەوەی لێکدایەوە و دیسان هەموویانی رەتکردەوە و بەو ئاکامە گەیشت کە رێگە چارە تەنیا شتێکە و ئەویش ئەوەیە کە لەلای خۆی رایگرێ و ئەوەی رووی داوە پووش بەسەری بکات و ئەوەی لە دەستی دێ بیکات بۆ ئەوەی پێوەندیی ئەو جووتە لەبەریەك هەڵوەشێ و لە هەمووشی گرینگتر ئەوە بوو کە لەلای خۆی دانی پێدا نەدەنا و ئەویش ئەمە بوو کە بە هەموو توانایەوە بۆ سزادانی هەوڵ بدات. «من دەبێ لەسەر بڕیاری خۆم ساغ ببمەوە و پێیڕابگەیەنم چونکە بارودۆخێکی تاڵ و نالەباری بۆ بنەماڵە پێکهێناوە، لێکم داوەتەوە و دیتوومە کە هەموو رێگە چارەیەك بۆ هەردوو لامان خراپترە لە Status quoی[126] رواڵەتی. منیش تەنیا کاتێك ئامادەم ئەو مەرجە لەبەر چاو بگرم کە ئەو بە تەواوی پێملی من بێ و لە قسەم دەرنەچێ، یانی پێوەندیی خۆی لەگەڵ گراوەکەی بپسێنێ.» کاتێك ئەو بڕیارە مسۆگەر بوو فیکرێکی گرینگی دیکە بە زەینی گەیشت و لەبەر خۆیەوە گوتی «تەنیا لەو رێگایەوەیە کە دەتوانم فێرکارییە ئایینییەکان لەمەڕ ئەوەوە لەبەر چاو بگرم، تەنیا لەو رێگایەوە ژنە تاوانبارەکەم لە خۆم تەرە ناکەم و ئەو دەرفەتەی بۆ دەڕەخسێنم کە چاکسازی لە خۆیدا پێك بێنێ و تەنانەت ئەگەرچی زۆر بە لامەوە دژوارە، بەشێك لە توانایی خۆم بۆ رێنوێنی و نەجاتی ئەو تەرخان

---

١٢٦- یانی پاراستنی باری ڕواڵەتی ئێستا.

بکەم.» ئەگەرچی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ دەیزانی کە بە هیچ چەشنێك ناتوانیٚ رەخنە بکاتە ئەخلاق و رەوشتی ژنەکەیەوە و هەموو ئەو هەوڵە چاکخوازانەیەش جگە لە شاردنەوەی راستییەکان بە خەیاڵ هیچ ئاکامێکی تری نابیٚ، ئەگەرچی لە تەواوی ئەو کاتە دژوارانەدا تەنانەت جارێك نەکەوتە بیری ئەوەی کە بۆ رێگە چارە یاریکاری لە ئایین ورەگریٚ، بەڵام ئێستا کە بڕیارەکەی بە بۆچوونی خۆی، لەگەڵ پێداویستییەکانی ئایین سازگاریی هەبوو و ئەو پشتیوانە ئایینییە بە قازانجی بوو، تا رادەیەك هێمنایەتیی پیٚ دەبەخشی. ئەو فیکرەشی بە دڵ بوو کە هیچ کەس ناتوانیٚ رەخنەی لێبگریٚ، کە لە تەنگژەیەکی ئاوا گرینگی ژیانیدا لەگەڵ فێرکارییە ئایینییەکان کە ئەو هەمیشە ئاڵای ئەوی لەسەر قاقڕی بێخەمی و کەمتەرخەمیی گشتی هەڵدەدا، هاوڕا نییە و عەمەلی پێنەکردووە. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ دوای بیرکردنەوە و شۆڕبوونەوە بە هەموو پاژەکانی تری ژیانیدا تەنانەت بەڵگەیەکی نەدیتەوە کە ببێتە هۆی ئەوەی پێوەندیی لەگەڵ ژنەکەی نەگونجیٚ و وەك رابردوو بەردەوام نەبیٚ. شکیشی لەوەدا نەبوو کە ئیتر بتوانیٚ وەك رابردوو بە چاوی رێزەوە لە ژنەکەی بڕوانیٚ، بەڵام هیچ بەڵگەیەکیشی نەبوو، نەدەبوو بیشیبیٚ کە ژیان لە خۆی تێك بدات و چونکە ژنەکەی مرۆڤێکی هەرزە و نانەجیم بووە و خەیانەتی پێکردووە ئەو ژیان لە خۆی تاڵ بکات و ئازار بکێشیٚ. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لەبەر خۆیەوە گوتی «بەڵیٚ، زەمان تێدەپەڕیٚ، زەمان هەموو کارەکان جۆر دەکات و پێوەندیی رابردوو دیسان بەردەوام دەبێتەوە. یانی تا ئەو جێیە بەردەوام دەبیٚ کە من هەست نەکەم ژیانم ٚ شێواوە. ئەو دەبیٚ چارەڕەش بیٚ، بەڵام من تاوانێکم نەکردووە و نابیٚ ژیان لە خۆم تاڵ بکەم و داخ و پەژارە تامڵ بکەم.»

## چاردە

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ کە گەیشتە پترزبۆرگ نەك لەسەر ئەو بڕیارەی خۆی پێداگر بوو، بەڵکوو نامەیەکیش کە دەیویست بۆ ژنەکەی بنووسیٚ لە زەینی خۆیدا واژینی دەکرد. کاتێك پێینایە ژووری دەرگاوانەکەوە چاوێکی لەو نامە و کاغەزانە کرد کە لە وەزارەتخانەوە هێنابوویان و گوتی هەموویان بێنن بۆ نووسینگەکەی.

لە وەڵامی پرسیاری دەرگاوانەکەدا گوتی: بە فایتوونەوانەکە بڵیٚ ئەسپەکان بکاتەوە و منیش لە نووسینگەکەم هیچ کەس وەرناگرم.ـ زۆریشی چێژ لەو قسەیە وەرگرت و چێژەکەشی نیشانەی خولکخۆشیی ئەو بوو، لەسەر دەستەواژەی «هیچ کەس وەرناگرم» پێداگریی کرد.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ دوو جار بە نێو ژووری نووسینگەکەیدا ئەمسەر و ئەوسەری کرد و لە پاڵ مێزی گەورەی نووسینەکەیدا، کە پێشخزمەت بەر لە ئەو هاتبوو و شەش مۆمی لەسەر هەڵکردبوو، راوەستا و قامکەکانی دەستی تەقاند و دانیشت، پاشان کەرەسەی نووسینی ئامادەکرد. هەردوو هەنیشکی لەسەر مێزەکە دانا و سەری بەلایەکدا خوار کردەوە و دوای تۆزێ رامان دەستیکرد بە نووسین و هەتا کۆتایی نامەکە ساتێك لە نووسین رانەوەستا. نامەکەی بەبێ سەردێڕ و بە زمانی فەڕەنسی نووسی و لەوێدا بە «ئێوە» ناوی ژنەکەی هێنابوو کە ئەو وشەیە لە زمانی فەڕەنسیدا ئەو ساردوسڕییەی نییە کە لە زمانی رووسیدا هەیەتی.

«لە دوایین ئاخافتنماندا بە ئێوەم راگەیاند کە بڕیاری خۆم سەبارەت بەو بابەتەی قسەمان لەسەر کرد، بە ئاگاداریتان دەگەیەنم. ئێستا دوای ئەوەی هەموو لایەنەکانی ئەو کارەم هەڵسەنگاندووە، بۆ بردنەسەری بەڵێنەکەم ئەم نامەیەت بۆ دەنووسم. بڕیاری من بەم شێوەی خوارەوەیە. ئاکاری تۆ هەرچۆنێك بووە من هەقی ئەوەم نییە کە ئەو پێوەندییە لەبەریەك هەڵوەشێنم کە وزەیەکی ئاسمانی لێکی گرێ داون. بینای چوارچێوەی بنەماڵە شتێك نییە کە بە هۆی هەوەس یان ویستی دڵ یان تەنانەت تاوانی یەکێك لە هاوسەرەکان وێران بێ و ژیانی ئێمە دەبێ وەك رابردوو بەردەوام بێ. ئەوەش بۆ من و ئێوە و کۆرپەکەمان رێگایەکە کە ناچارین درێژەی پێبدەین. من دڵنیام کە ئێوە لەو کردەوەیەی کە بۆتە بابەتی ئەم نامەیە پەشیمان بوونەتەوە و هەوڵ دەدەی پەشیمان بی و لەگەڵ من هاوکاری دەکەی تاکوو ئەوەی کە بۆتە هۆی دژایەتی و کێشەی نێوانمان لە ریشە هەڵکەندرێ و رابردوو لەبیردەکەی. ئەگەر ئەوەش نەکەی خۆت دەتوانی بیهێنیتە بەر چاوت کە چی چاوەڕوانی ئێوە و کوڕەکەمانە. لەو بارەوە هیوادارم لە دیداری داهاتووماندا بە وردبینییەکی زیاترەوە قسە بکەین و هەموو لایەنەکان بە جوانی شی بکەینەوە. چونکە ماوەی مانەوەتان لە زۆزان خەریکە کۆتاییی پێدێ و تکاتان لێدەکەم هەرچی زووتر و لانی زرۆ هەتا سێ شەممەی داهاتوو بگەڕێوە بۆ پترزبۆرگ. بۆ گەڕانەوەشتان هەموو کەرەسە و ئاسانکارییەکتان بۆ دابین دەکەم. تکاتان لێدەکەم سەرنج بدەنە ئەم نامەیە و ئەوەش بزانە کە ئەم داخوازییە بۆ من گرینگایەتییەکی زۆری هەیە.

ئەلکسی ئارنین

دوا وتە: پارەیەك کە لەوانەیە بۆ خەرجی جۆراوجۆر پێویستیتان بێ لەگەڵ نامەکەی دەخەم.»

نامەکەی خوێندەوە، لێی رازی بوو، بەتایبەت ئەوەی کە لەبیری نەچووبوو پارە بخاتە نێو پاکەتی نامەکەوە. لە نامەکەیدا نە قسەیەکی رەقی دیبەوە، نە سەرکۆنەیەك، بەڵام باسێکی

لە چاوپۆشی و بەخشینیش تێدا نەبوو. لە هەمووشی گرینگتر پردێکی زێڕین بوو کە بۆ گەڕانەوەی تاوانبار بەرەو ڕێگای ڕاست، هەڵیبەستبوو. نامەکەی دووقەد کرد و بە کاردێکی سەدەفی قورس سافوسووفی کرد و پارەکەی لە بەینی کاغەزەکە نا و خستییە نێو پاکەتەکەوە، بەچێژ و شادییەکەوە کە هەمیشە دوای کەڵك وەرگرتن لە ئامرازی نووسین و جوان نووسینەکەی سەرتاپای دادەگرت لە زەنگیدا.

بە پێشخزمەتەکەی گوت: ئەوە بدە بە نامەبەرەکە هەتا سەبەینێ بیگەیێنێتە دەستی ئانا ئارکادیۆڤنا لە زۆزان.

ـ بەچاوان گەورەم. دەستوور دەفەرموون کە چاییەکەتان بۆ بێنم هەر لێرە مەیلی بفەرموون؟

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ دەستووی دا چاییەکەی بۆ بێنێ و کاردە سەدەفە قورسەکەی بە دەستەوە گرت و لەگەڵ کایە پێکردنی ڕۆیشت بۆ لای کورسییە نەرمەکەی کە لەسەر مێزێکی تەنیشتی کورسییەکە چرایەك هەڵکرابوو و کتێبێکی نیوە خوێندراوەی بە زمانی فەڕەنسی سەبارەت بە تەتەڵەی ئووگووبین[١٢٧] لەسەر بوو.

لە ژوور کورسییەکەوە قەتحەیەکی هێلکەیی زێڕین بە دیوارەکەوە هەڵواسرابوو و وێنەیەکی جوانی روخساری ئانای تێدا بوو کە وێنەگەرێکی بەناوبانگ کێشابوویەوە. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ چاوێکی لێکرد. چاوانی تیژ و پڕ نهێنی و نیگای قورس و گاڵتەجاڕانەی ئانا وەك دوایین شەو کە شەڕە دەندووکەیان کردبوو زۆر روو هەڵماڵدراوانە چاوی لە چاوی کارنین بڕیبوو. وێنەی ئەو تۆڕە ڕەشەی کە درابوو بە سەری ئانادا و بسکی ڕەش و دەستی سپی و ناسك و قامکی شووش و باریك کە ئەنگوستیلەی جۆراوجۆریان تێکرابوو هەمووی مامۆستایانە کێشرابوونەوە و لەبەر چاوی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بێشەرمی و رووهەڵماڵدراوییان پێوە دیاربوو. هێندێکی چاو لە وێنەکە کرد و بە جۆرێك داچڵەکی کە لێوی کەوتە فرین و دەنگێکی وەك «بڕڕڕڕ» لە دەمی دەرپەڕی. سەری وەرسووڕاند، بە پەلە لەسەر کورسییەکە دانیشت و کتێبەکەی لێککردەوە. هەوڵی دا بیخوێنێتەوە و هۆگریی زۆری پێشووی سەبارەت بە خوێندنەوەی تەتەڵەی ئووگووبین لە دڵی خۆیدا ببزوێنێ بەڵام نەیتوانی.

---

١٢٧- ئاماژەیەکە بە تەتەڵەی حەوتەوانەی ئووگووبین (Eugubine) بە زاراوەی ئۆمبریایی سەبارەت بە ڕەوشتی ژیانی ژنومێردایەتی. ئەو تەتەڵانەی ساڵی ١٤٤٤ لە شاری گووبیوو دۆزرایەوە کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ئووگووبیوویان پێدەگوت.

چاوی بە دێڕی کتێبەکەدا دەخشاند بەڵام بیری لە شوێنێکی تر بوو، بیری نەك لە ژنەکەی، بەڵکوو لە گرفتێکی قورس دەکردەوە کە ماوەیەك بوو لە کاری ئیدارییەکەیدا سەری هەڵدابوو و ئێستا تەواوی فیکر و بیری بە خۆیەوە خەریك کردبوو. هەستی دەکرد کە زیاتر لە هەموو کاتێك بیر لەو تەنگژەیە دەکاتەوە و خەریکە چارەسەری بۆ بدۆزێتەوە و بەبێ خۆهەڵکێشان دەیتوانی بڵێ کە فکرێکی باش و بێوێنە لە زەینیدا گووراوە دەتوانێ ئەو گرێکوێرەیە بکاتەوە. ئەو فیکرەش دەبووە هۆی بەرزبوونەوەی پلە و پایەی ئەو و شکستخواردنی دوژمنەکانی و خزمەتێکی گەورەش بوو بە وڵاتەکەی. کە پێشخزمەت چاییەکەی لەبەر دەمی دانا و لە ژوورەکەی چووەدەرێ، ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ هەستا سەرپێ و چووە پشت مێزی نووسینەکەی، پەروەندەیەکی کاروبارەکانی ئەم دواییەی هەڵگرت و بە بزەیەکی رەزامەندانە و بە زۆرییەوە، دەستی دا قەڵەمێك و دەستیکرد بە خوێندنەوەی قووڵی دەوسییەیەك کە ویستبووی بۆی بێنن و پێوەندیی بەو مەسەلە دژوارەی ئێستای خۆیەوە بوو. مەسەلەیەکی وەك تایبەتمەندیی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لە کاروباری دەڵەتدا، یانی رەوشتێك کە تەنیا تایبەتی ئەو بوو، هەروەك چۆن کەسایەتییە بەرچاوەکانی دەوڵەت هەرکام رەوشتی تایبەتی خۆیان هەیە، سەروەرییەك کە هاورێ لەگەڵ ئاواتی ناوبانگ دەرکردن و دروستکاری و بڕوابەخۆ بوون و خۆڕاگری بووبووە هۆی پێشکەوتنی لە کاروباری دەوڵەتدا، ئەو فیکر و زیکری گوێ نەدان بە قاقەز و قاقەزبازی و داب و دەستووری ئیداری و پێداگری لەسەر کورت کردنەوەی نامە و نووسینە ئیدارییەکان و هۆگریی زۆری بە هەڵسوکەوتی روون لەگەڵ کاری سەرەکی و هەروەها کەڵك وەرگرتن لە کات هەبوو. مەسەلەکە ئەوە بوو کە کاری ئاوداشتنی دەشتەکانی پارێزگای زارایسك[١٢٨] لە کۆڕی کومیسیۆنی بەناوبانگی دووهەمی ژوئەندا کەوتبووە ژۆژەڤەوە. ئەو مەسەلەیەش پێوەندیی بە وەزارتخانەکەی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچەوە هەبوو. نموونەی بەرچاویش بێئاکام بوونی تەخشان و پەخشان و کاغەزبازی بۆ لابردنی کێشەکان بوو. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ باش لەو راستییە ئاگاداربوو. گەڵاڵەی ئاوداشتنی دەشتی زارایسك کاتێك کە لە ئەستۆی کەسێکی تر بوو و هێشتا نەدرابوو بە کارنین دەستی

١٢٨-Zaraysk، دوای سەرما و سەغڵەتی ساڵی ١٨٧٣ گەلێ «گەڵاڵەی ئاودێری» بۆ پارێزگاکانی نۆڤۆرۆسیك (Novorossik) و دوون ساراما دارێژرا و زۆریان یارمەتیی ماڵی لە لایەن دەوڵەتەوە بۆ تەرخان کرا و دەرفەتێکی باش هەڵکەوت بۆ هەڵپەرەستان و زۆر کەس لەو رێگایەوە قازانجیان کرد و دەڵەمەند بوون.

پێکردبوو و هەر بەڕاستیش پارەیەکی یەکجار زۆری لێ خەرج کرابوو و هەمووشی بە فیڕۆ چووبوو و هەمووشی بێئاکام بە هەدەر درابوو، دیاربوو ئەو گەلاڵەیە بە هیچ کوێ نەدەگەیشت.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ کاتێك ئەو پلە و پایەی پێسپێدرا لەڕێوە ئەو گرفتەی بۆ دەرکەوت و قۆڵی بۆ دوایی پێهێنانی هەڵماڵی. بەڵام هەتا ئەو کاتەی بە تەواوی هەستی نەکرد کە جێپێی قایم بووە، پێیوانەبوو لەو ڕێگایەدا پێشکەوتن وەدەست دێنێ، چونکە دەیزانی چاکسازی لەو بوارەدا لەگەڵ قازانجی کەسانێکی زۆردا ناسازگاریی هەیە. پاشان زۆر کاری تر لەبەر دەمیدا قوت بوونەوە و وای لێهات بە تەواوی قەستەکەی خۆی لەبیر چۆوە. ئەم گەلاڵەیە وەکوو هەموو کارەکانی دیکەی وەگەڕ کەوتبوو و لە خۆوە بەرەو پێشەوە دەچوو (کەسانێکی زۆر لەسەر ئەو گەلاڵەیە کاریان دەکرد و بژیوی خۆیان لەو ڕێگایەوە دابین دەبوو، لەوانە بنەماڵەیەك کە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ دەیناسین و زۆر پابەندی بنەماکانی ئەخلاق و نەریتی پاك بوون و تەنانەت زۆریش هۆگری مۆسیقا بوون و هەموو کچانی بنەماڵەکەیان ئامێری مۆسیقای ژێداریان دەژەنی و ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لە زەماوەندی یەکێك لە کچەکانی ئەو بنەماڵەیەدا، کە دابیان وابوو، بە جێی باوکی بووك لەوێ ئامادەبوو). هێنانە گۆڕی ئەو مەسەلەیە لە کومیسیۆمی ناوبراودا لەلایەن وەزارەتخانەی رەقیبەوە، بە بڕوای ئەلکساندرڤیچ کارێکی دەغەزدارانە بوو، چونکە لەوجۆرە دەوسییانە لە هەموو وەزارەتخانەیەکدا زۆرە و ئێستا کە بانگیان کردبوو بۆ ململانێ، ئەو بوێرانە ئامادەبوو کە بڕواتە مەیدان و داوای کردبوو کە کومیسیۆنێکی تایبەتی بۆ پێداچوونەوەی مەسەلەکە و هەڵسەنگاندنی کارەکانی کومیسیۆنی گەلاڵەی ئاودێریی سارای زاراییسك دابمەزرێ. بەڵام بە پێچەوانە کارەکەی لە خەنیمی دەغەزدار گران کردبوو و داوای کردبوو کە کومیسیونێکی تایبەتی دیکەش بۆ پێڕاگەیشتنی کێشەی هۆزە کەمینەکان[١٢٩] دامەزرێ. لە کومیسیۆنی دووهەمی ژوئەندا

---

١٢٩- ئەو مەسەلەیە لە ساڵانی شەستی سەدەی نۆزدەوە دەستی پێکرد. هۆزی باکشیر لە پارێزگاکانی ئۆفا و ئوورنبۆرگ خاوەنی یازدە دسیاتین زەوی و زار بوون. دەوڵەت بە مەبەستی بەڕووسی کردنی خەڵکی ئەو ناوچەیە ڕووسەکانی هاندا کۆچ بکەن بۆ ئەو ناوچەیە و ئاسانکاریی بۆ کردن کە زەوی و زارەکانی باکشیر بە ئیجارە هەڵگرن. سنووردانان بۆ ئیجارەکان زۆر ناڕوون بوون و هەلی دەرەخساند بۆ کەڵك وەرگرتنی نابەجێی

ئەو مەسەلەیە تەنیا بە ئاماژەیەك بەڕێوەچووبوو بەڵام ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بە هەموو توانایەوە پشتیوانیی لێکردن و بە هۆی بارودۆخی زۆر نالەبار و دژواری دانیشتووانی ئەو دەڤەرەوە زۆر زوو مەسەلەکەی بۆ دەرکەوت. باس کردن لەو مەسەلەیە بووبووە هۆی دەمەقاڵێ و شەڕە دەندووکە لە نێوان نوێنەرانی چەند وەزارەتخانەدا. نوێنەری ئەو وەزارەتخانەیەی کە لەگەڵ ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ رقەبەرایەتیی دەکرد و هەوڵی دەدا بیسەلمێنێ کە بارودۆخی کۆچەران لەو دەڤەرە بەرەو گەشانەوە دەچێ و هەرچەشنە گۆڕانکارییەك لە بارودۆخی ئێستای ناوچەکەدا دەبێتە هۆی شێواوی و تێکدانی گەشانەوەکە و ئەگەر کەمایەسییەکیش تووشی ناوچەکە بووبێ تەنیا بەهۆی ئەوەوەیە کە وەزارەتخانەکەی راژۆری ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بۆ بەڕێوەبردنی یاسا پەسند کراوەکە کەمتەرخەمی کردووە. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ دەیویست داواکارییەك بخاتە روو: یەکەم کومیسیۆنێکی تازە دامەزرێ تاکوو لە دەڤەرەکە سەبارەت بە بارودۆخی ژیانی کۆچەران و هۆزە کەمینەکان لێکۆڵینەوە ئەنجام بدات، دووهەم ئەگەر دەرکەوت کە بارودۆخی ژیانی کۆچەران بەڕاستی ئەو جۆرەیە کە لە بەڵگەنامە فەرمییەکاندا پێشکەش بە کومیسۆن کراوە و کاردانەوەی بووە، کومیسیۆنێکی تریش لە کارناسان و شارەزایان پێکبێ تاکوو هۆگەلی ئەم بارودۆخە دڵهەژێنەی کۆچەران لە روانگەی سیاسی و ئیداری و ئابووری و نەتەوەیی و ئاینییەوە تاوتوێ بکرێ، سێهەم داوا لە وەزارەتخانەی بەرهەڵستکار کرا کە سەبارەت بەو چالاکییانەی کە لە ماوەی دە ساڵی رابردوودا بۆ بەرگری کردن لە بەدیهاتنی بارودۆخی داخاوی و نالەباری ئێستا ئەنجامدرابوو و زانیاریی پێویست بخاتە بەردەم کومیسیۆن. چوارەمیش ئەوە بوو: داوا کرابوو لە وەزارەتخانە روونی بکاتەوە کە بە چ هۆیەك هەروەك لە نامەکانی ژوومارە ١٧٠١٥ و ١٨٣٠٨ رێکەوتی پێنجەمی دیسامبری ١٨٦٣ و حەوتەمی ژوئەنی ١٨٦٤دا هاتووە بە پێچەوانەی ناوەرۆکی یاسایی بنەڕەتی (بەرگی.... مادەی هەژدەهەم و تەبسەرەی مادەی سیو شەشەم) کاری کردووە. ئەلکسی

---

هەلپەرستان. ساڵی ١٨٧١ یاسایەك بۆ فرۆشتنی مەزراکان بە پێی مەرجە پڕ سوودەکان پەسند کرا و جگە لە کەڵك وەرگرتن لەو زەوییانە و تەنانەت زەوییە تایبەتەکانی دەوڵەتیش هەموو بە تاڵان چوون. کارمەندی پایە بەرزی پارێزگاکان لەو کەڵك وەرگرتن و ڕەفێن ڕفێنەدا بەشداریی ڕاستەوخۆیان هەبوو. کارەکەش ئابڕووچوونی لێکەوتەوە و والۆیۆڤ وەزیری کشتوکاڵ ناچاربوو دەست لە کار بکێشێتەوە.

ئەلکساندرڤیچ لەگەڵ ئەوەدا کە بیرۆکەکانی خۆی بە کورتی یادداشت دەکرد بە هۆی هەیەجانەوە روخساری سوورهەڵگەڕابوو. بەو بابەتانە کە لاپەڕەیەکی پڕکردبۆوە هەستا و قامکی بە زەنگەکەدا نا، نێوچاوانی تێکنا و بزەیەکی پڕ سووکایەتی نیشتە سەر لێوی. دیسان برێکی تری کتێبە فەڕەنسییەکە سەبارەت بە تەتەڵەی ئووگووبین خوێندەوە و کەوتەوە سەر هەوای خوێندنەوە. سەعات یازدە چووە نێو پێخەوەکەیەوە و کە ماجەرای ژنەکەی وەبیرهاتەوە مەسەلەکە بە هیچ شێوەیەك لە بەرچاوی وەك رابردوو رەشی نەنواند.

## پازدە

ئەگەرچی ئەو کاتەی ڤرۆنسکی بە ئانای گوتبوو کە ئەم حاڵە بەو حاڵە ناشێ و هەوڵی دابوو پێملی بکات کە رازی پێوەندییەکەیان لەلای مێردەکەی بدرکێنی و ئانا تووڕە و کەللەڕەقانە دژایەتیی کردبوو، بەڵام لە قووڵایی دڵیدا هەستی دەکرد حاڵی خۆی بە فێڵ و درۆ رمووده کردووه و دەیزانی کارەکەی دوور لە راستییە، بە دڵ و بە گیان حەزی دەکرد گۆڕانی بە سەردا بێنێ، بۆیە کە لەگەڵ مێردەکەی لە کێبەرکێی ئەسپسواری گەڕانەوە لە ساتێکی ناسك و پڕ لە هەیەجان و شڵەژاویدا هەموو شتێکی بە مێردەکەی گوت. ئەگەرچی ئاشکرا کردنی ئەو رازەی زۆر بە کارێکی دژوار و دڵتەزێن دەزانی، بەڵام دواتر رازی بوو لەو کارەی کە کردوویێتی. کاتێك مێردەکەی رۆیشت و ئەو بە تەنیا مایەوە بە خۆی گوت کە خۆشحاڵە و لەمەبەدواوە هەموو کارەکان روون بوونەتەوە و لانیکەم ژیانی لە درۆ و دەڵەسە و فێڵ و فریو پاك بۆتەوە. پێیوابوو بێ دوودڵی ئێستا بۆ هەمیشە بارودۆخی ژیانی مەعلووم بووە. رەنگە ئەو بارودۆخە نوێیە برێ ناخۆش بێ، بەڵام لەلایەکی ترەوە رووناك بۆتەوە و هیچ خاڵێکی رەش و تەمومژاویی تێدا نەماوە. لە دڵی خۆیدا دەیگوت لە بری ئەو ئازارەی کە بە درکاندنی ئەو رازەی خۆی تامڵی کرد و سەپاندی بەسەر مێردەکەیدا، ئێستا هەموو شتێك روون و بە رێوجێ بووە. هەر ئەو شەوە چاوی بە ڤرۆنسکی کەوت، بەڵام سەبارەت بەو قسانەی نێوان خۆی و مێردەکەی هیچی بۆ باس نەکرد، هەرچەند ئەگەر بیویستایە بارودۆخەکەی بەڕاستی روون بێتەوە دەبوو بۆی بگێڕایەتەوە.

بەیانیی رۆژی دوایی کە لە خەو هەستا یەکەم شت کە وەبیری هاتەوە ئەو قسانە بوون کە بە مێردەکەی گوتبوو. ئەو قسانەش هێندە بە لایەوە قێزەون و ترسناك بوون کە تێنەدەگەیشت

چۆن توانیویێتی خۆی پێمل بکات و ئەوانەی بە دەمدا بێ، نەشیدەتوانی بیهێنێتە بەرچاوی خۆی کە ئاکامی ئەو قسانە بە کوێ دەگات و دەبێ بە چی. بەڵام هەرچییەك بوو قسەی خۆی کردبوو و ئەلکسی ئەلکساندرڤیچیش لە ئەلفەوە نەهاتبووە بێ و رۆیشتبوو. بە خۆی گوت «ڤرۆنسکیم دیت و هیچم پێنەگوت. راست لەو کاتەدا کە دەیویست بڕوات هاتم بیگێڕمەوە و ماجەراکەی بۆ باس بکەم بەڵام پاشگەز بوومەوە، چونکە پێم وابوو جوان نییە کاتی هاتنی، مەسەلەکەم بۆ نەگێڕاوەتەوە و ئێستا لە کاتی رۆیشتندا پێی بڵێم. بۆیە دەمویست بیڵێم و نەمگوت؟» لە وەڵامی ئەو پرسیارەشدا تین و تاوی شەرمێك روخساری سوورهەڵگێڕا. زانیشی چی بۆتە هۆی ئەوەی ئەو رازە نەدرکێنێ، دیارە پێی شەرم بوو. دوێشەو کە پێیوابوو وەزعی بە تەواوی روون بۆتەوە ئێستا کتوپڕ نەك ناڕوون بوو بەڵکوو تووشی هەڵەمووتێك بووبوو کە نە رێگابوو بگەڕێتەوە نە بڕواتە پێشێ. زۆر لە ئابڕووچوون دەترسا، شەرمێك کە پێشتر بیری لێنەکردبۆوە. کە بە زەینی گەیشت مێردەکەی لەوانەیە چ کارێك بکات، بیرۆکەیەکی ترسناك و رەش بەرچاوی تاریك کرد. پێیوابوو هەر ئێستا کارداری مێردەکەی دێت و لە ماڵەکەی وەدەری دەنێ و وەك بێ ئابڕوویێك ناوی دەزڕێ و خەڵك لە کۆڵان و شەقام بە چاوی سووك لێی دەڕوانن و تف و نەحلەتی دەکەن. لە دڵی خۆیدا دەیگوت «ئەگەر لە ماڵەکەم وەدەر نێن پەنا بۆ کوێ بەرم.» هیچ وەڵامێکیشی نەدەدۆزییەوە.

کاتێك بیری لە ڤرۆنسکی دەکردەوە وای بە خەیاڵدا دەهات کە ئەو (ڤرۆنسکی) خۆشی ناوێ و ئانا وردە وردە وەکوو سەربارێکی لێدێ و ئیتر لەلای بێبایەخ دەبێ و خۆ لە قەرەی نادا، هەر بەو هۆیەش بوو کە سەبارەت بە ئەو هەستی بە دوژمنایەتی دەکرد. بە خەیاڵیدا دەهات کە ئەو قسانەی بە مێردەکەی گوتووە و بەردەوام لە دڵی خۆیدا دووپاتی دەکردنەوە، بە هەموو عالەمی گوتووە و هەموو کەس بیستوویێتی. نەیدەتوانی چاو لە چاوی دەورووبەرییەکانی بکات، خۆی بۆ رازی نەدەکرا و تەنانەت لە رووی هەڵنەدەهات خزمەتکارەکەی بانگ بکات" چوونە خوارێ و دیتنی کوڕەکەی و پەرەستارەکەشی ئیتر زۆر لەوە دژوارتر بوو.

کچی خزمەتکارەکەی کە ماوەیەك بوو لە پشت دەرگاکە راوەستابوو و گوێی هەڵخستبوو خۆی کرد بە ژووریدا. ئانا واق وڕمانە چاوی لە چاوی بڕی و ترس سووری هەڵگێڕا. کچە لەوەی کە بێ ئەوەی بانگی بکەن چووبووە ژوورێ داوای لێبوردنی کرد و گوتی کە گوێی زرینگاوەتەوە و پێیوابووە دەنگی زەنگەکەی بیستووە و جلەکانی ئانا و نامەیەکی بۆ هێنابوو.

پسوولەکە هی بێتسی بوو. بێتسی وەبیری هێنابۆوە کە ئەو رۆژە لیزا مێرکالۆڤا[130] و بارۆنس شتۆلز[131] لەگەڵ لایەنگرانی کالووژسکی[132] و ستریمۆڤی[133] پیر بۆ کایەی گۆلف دێن بۆ ماڵی ئەوان. یادداشتەکەی خۆشی بەو وشانە کۆتایی پێهێنابوو" حەتمەن وەرە، ئەگەر بۆ تەماشاکردنی رەوشت و ئاکاری خەڵکیش بێ. چاوەڕوانتانم.

ئانا یادداشتەکەی خوێندەوە و هەناسەیەکی هەڵکێشا. ئانووشکا کە خەریکی رێکوپێك کردنی شووشەی عەتر و شانەکانی سەر مێزی ئاراێشتەکە بوو ئانا پێیگوت: برۆ، ئێستا پێویستم بە هیچ نییە. برۆ، منیش هەر ئێستا جلەکانم لەبەر دەکەم و دێمە خوارێ، هیچم ناوێ.

ئانووشکا چووەدەرێ بەڵام ئانا جلوبەرگی لەبەر نەکرد و هەروا لە جێی خۆی هەڵنەستا و ملی بە خوزدا گرت، هەردوو دەستی شۆڕکردبۆوە و جاروبار سەرتاپای دەلەرزی و دەتگوت دەیهەوێ شتێك بڵێ یان هەستێ بەڵام هەروا لە جێی خۆی جووڵەی نەدەکرد. بەردەوام دووپاتی دەکردەوە: خوداگیان! خوداگیان! ـ بەڵام نە «خودا» بۆ ئەو مانایەکی بوو و نە «گیان»ەکە. بەو بیرۆکەیەوە کە بەهیوا بوو لە ئاییندا داڵدەیەك بدۆزێتەوە، ئەگەرچی قەت سەبارەت بەو ئایین و پەروەردەیەی کە فێری کرابوو تووشی دڕدۆنگی نەبووبوو، بەڵام ئێستا چەندەی هیوا بە ئاشتبوونەوەی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ هەبوو هەر ئەوەندەش هیوای بە یارمەتیی ئایین بوو. لە پێشدا دەیزانی کە یارمەتی خواستن لە ئایین تەنیا ئەو کاتە دەلوێ کە ئەوەی بۆ ئەو تەنیا مانای ژیانە حاشای لێبکات. حاڵی تەنیا شڕ نەبوو بەڵکوو بارودۆخی رۆحیی ئێستای خۆی، کە زۆری بەلاوە نامۆ بوو خەریکبوو وردە وردە تووشی ترس و دڵەڕاوکێی دەکرد. هەستی دەکرد، کە هەموو شتێك لە رۆحیدا وەك ئەو کاتەی لێهاتووە، کە چاو بە هۆی ماندوویییەوە رێشکەوپێشکە دەکات و یەك بە دوو دەبینێ. هێندێ جار نەیدەزانی لە چی بێزارە و تامەزرۆی چییە. ئەوەی بۆتە هۆی بێزاری و تامەزرۆیی لە گیانیدا شتێکە کە رابردووە یان شتێکە بڕیارە بێت. بەڕاستی نەیدەزانی چیی دەوێ.

---

130- Merkalova

131- Stolz

132- Kaluzhsky

133- Stremov

لە ناکاو هەردوو لاجەسەری کەوتە ژان و گوتی: ئاخ، چ بکەم؟ ـ کە وەخۆ هاتەوە دیتی بە هەردوو دەستی قژی خۆی دەکێشێ. لە جێی خۆی هەستا و دەستی کرد بە پیاسەکردن بە نێو ژوورەکەدا.

ئانووشکا کاتێ گەڕایەوە و دیتی خاتوونەکەی هەروەك پێشوو ماوەتەوە و جلوبەرگی نەگۆڕیوە گوتی: قاوە ئامادەیە و مامۆزل (مادموازێل بە زمانی ئەو) و سریۆژا چاوەڕێن.

ئانا لە پڕ وەبیری هاتەوە کە کوڕی هەیە، لە ناکاو بە دەنگی بەرز و تین و تاوێکەوە پرسیی: سریۆژا؟ سریۆژا چیی لێهاتووە؟

ئانووشکا بە پێکەنینەوە گوتی: وادیارە کارێکی خراپی کردووە.

ـ چۆن، چ کارێکی خراپی کردووە؟

ـ ئێوە چەند دەنکتان قۆخ لە ژووری پاڵوو دانابوو. وادیارە بە بێ ئیجازە یەکیانی خواردووە.

وەبیرهاتنەوەی کوڕەکەی لە ناکاو لەو تەنگژە بێ درووە دەربازی کرد. ئەو رۆڵی تا رادەیەك سادقانە و زۆر زێدەڕەوییانەی دایکێکی گرتبووە پێش کە تەنیا بەهۆی منداڵەکەیەوە زیندووە و لە ساڵانی رابردوودا کردبوویە ئامانجی سەرەکیی خۆی، وەبیری هاتەوە و دڵشادانە هەستی کرد کە لەو کاتەدا خاوەنی هێزێکە کە کاری بەسەر پێوەندیی خۆی لە سەر مێردەکەی و تەنانەت ڤرۆنسکیشەوە نییە. ئەو هێزەش کوڕەکەی بوو. دیتی لە هەر بارودۆخێکدا بێ ناتوانێ دەست لە کوڕەکەی بەردا. چش با مێردەکەی ئابڕووی بەرێ و لەماڵیش وەدەری نێت، چش با ڤرۆنسکی بە ساردوسڕی هەڵسو کەوتی لەگەڵ بکات و درێژە بە ژیانی سەربەستانەی خۆی بدات (دیسان بە بێزاری و سەرکۆنەوە بیری لە ڤرۆنسکی کردەوە). لە هیچ خالێکدا نەیدەتوانی دەست لە کوڕەکەی بەردات. ئەو ئامانجە لە ژیانیدا هەبوو" دەبێ هەوڵ بدات ئەو پێوەندییە بپارێزێ، تاکوو نەتوانن کوڕەکەی لێ بستێنن، تەنانەت دەبێ پەلەش بکات، بۆ ئەوەی هەتا کوڕەکەیان لێنەساندووە، بە زووترین کات کارێك بکات، کوڕەکەی هەڵگرێ و دەربازبێ. ئەمە تەنیا کارێك بوو کە دەبوو بیکات. دەبوو ئارام بێتەوە و خۆی لە چنگ ئەو بارودۆخە تاڵ و ئازاراوییە دەربازبکات. بیرکردنەوە لە کارێکی باش و بوێرانە سەبارەت بە کوڕەکەی، بیری ئەوەی زۆر زوو دەستی کوڕەکەی بگرێ و لەوێ دوور بکەونەوە، تەنیا سەرچاوەی هیوا و دڵحەسانەوەی بوو.

بەپەلە جلەکانی لەبەرکرد و بە هەنگاوی پتەو و توندوتۆڵ چووە خوارێ و چووە ژووری میوانداری کە سریۆژا و دایەنەکەی هەمیشە لە پاڵ مێزی ناشتاییدا چاوەڕوانی دەبوون.

سریۆژا، سەرتا پا سپی لە پاڵ مێزی کن ئاوێنەکە راوەستا بوو و بە پشتێکی کۆم و سەری داخستووەوە، کە دیاربوو بە وردی خەریکی شتێکە و ئانا لەگەڵ ئەو حاڵەتەی ئاشنابوو و هەر لە باوکی دەچوو، دەستی لەو گوڵانە وەردەدا کە لەبەر دەمی بوون.

دایەنەکەی قیت و سارد دانیشتبوو. سریۆژا، بەپێی عادەتی خۆی، بە دەنگێکی تیژ قیژاندی: «وەی، دایەگیان!» دردۆنگانەش راوەستا، دامابوو کە دەست لە گوڵەکان بەردا و هەڵێ بۆ لای دایکی و سڵاوی لێبکات یان سەرەتا چەپکە گوڵەکە ساز بکات و بە گوڵەوە بچێت بۆ لای.

پەرەستارەکە سڵاوی لە ئانا کرد و بە وردی و لەسەرەخۆ، دەستی کرد بە گێڕانەوەی خەتاکەی سریۆژا، بەڵام ئانا گوێی پێنەدەدا. لە بیری ئەوەدابوو پەرەستارەکەش لەگەڵ خۆی بەرێت یان نا. پاشان بڕیاریدا: نا، نایبەم، تەنیا لەگەڵ کوڕەکەم دەڕۆم.

ئانا شانی کوڕەکەی گرت و بە نیگایەکی نەك تووڕە بەڵکوو شەرمنانەوە، کە کوڕەکەی دڵخۆش کرد، چاوی لە چاوی بڕی و ماچی کرد و گوتی: بەڵێ، کارێکی خراپی کردووە- بێ ئەوەی شانی کوڕەکەی بەردا چاوی لە پەرستارەکە کرد کە بە سەرسووڕمانەوە سەیری ئانای دەکرد، گوتی: لێیگەڕێن با لەلای من بێ ـ پاشان لە پشت مێزەکە دانیشت.

سریۆژا کە هەوڵی دەدا بە حاڵەتی روخساری دایکیدا تێبگا کە لەمەڕ قۆخەکەوە چ سزایەك چاوەڕوانیەتی گوتی: دایەگیان، من... نا....

ئانا هەرکە دیتی پەرستارەکە لە ژوورەکە چووەدەرێ گوتی: سریۆژا، کارێکی خراپت کردووە، بەڵام ئیتر دووپاتی ناکەیەوە دەزانم. سریۆژا گیان، منت خۆش دەوێ، وایە؟

ئانا هەستی دەکرد کە فرمێسك لە چاویدا قەتیس ماوە. چاوی لە چاوە ترساو و لەگەڵ ئەوەدا پڕ شادییەکانی سریۆژا بڕی و لە دڵی خۆیدا دەیگوت «مەگین دەتوانم خۆشم نەوێ؟ بڵێی بۆ سزادانی من ئەویش لەگەڵ باوکی دەستبەیەکی بکەن؟» فرمێسك بە چاویدا هاتە خوارێ و بۆ ئەوەی لە کوڕەکەی بشارێتەوە لە ناکاو هەستا سەر پێ و بەپەلە رۆیشت بۆ بەرهەیوانەکە.

دوای رێژنەبارانی ئەو چەند رۆژەی رابردوو هەوا سارد و تاووساو بوو. خۆر پڕشنگی دادەباراند و لە نێوان گەڵای باران لێدراوەوە تروسکەی دەهات.

ئانا لە سەرمانا و هەروەها بە هۆی ترسێکی دەروونی کە لەو هەوا پاکەدا دیسان دڵی داگرتبوو، مۆچڕك و لەرزی پێدا دەهات.

به سرێژوای گوت که دەهات بۆ بەرهەیوانەکە بۆ لای: برۆ، برۆ بۆ لای مارییێت ـ خۆشی لەسەر حەسیری تەرکی هەیوانەکە دەستیکرد بە پیاسەکردن. لەبەر خۆیەوە گوتی: بەڵام بڵێی ئەوان بەڕاستی لێم خۆش نەبن؟ نازانن کە هیچ ڕێگایەکی ترم بۆ نەمابوو؟»

ڕاوەستا و چاوی لە چڵەپۆپەی سپیدارەکان کرد کە بە دەم باوە دەشنانەوە و گەڵا بارانلێدراوەکەیان لەبەر پرشنگی ساردی خۆر دەدرەوشانەوە و زانیی کە لێی خۆش نابن و لەوەبەدواوە هیچ کەس بەزەیی پێیدا نایەت و هەمووان لەگەڵێدا وەك ئەم ئاسمانە و ئەم سەوزەڵانییە سارد و سڕ دەبن و دیسان لە دڵی خۆیدا هەستی کرد کە هەموو شتێك بۆتە دووپۆ و دوولایەنە. لەبەرخۆیەوە گوتی «نابێ، نابێ بیری لێبکەمەوە و دەبێ وەڕێکەوم. بەڵام بۆکوێ؟ کێ، کێ لەگەڵ خۆمدا بەرم؟ بەڵێ، دەچم بۆ مۆسکۆ، بە قەتاری شەوانە دەڕۆم. ئانووشکا و سریۆژا لەگەڵ خۆم دەبەم و هەموو ئەو شتانەی کە پێویستم پێیان دەبێ، بەڵام بەرلەوە دەبێ نامە بۆ هەردووکیان بنووسم.» بەپەلە خۆی کردەوە بە ژوورێدا و چووە هۆدەی کارەکەی. لە پشت مێزەکەی دانیشت و بۆ مێردەکەی نووسی:

«دوای ئەو ڕووداوەی لە نێوانماندا قەوما ئیتر ناتوانم لە ماڵەکەتدا بژیم. دەڕۆم و سریۆژا لەگەڵ خۆم دەبەم. سەبارەت بە یاسا هیچ زانیارییەکم نییە و نازانم سریۆژا لەلای کامەمان دەمێنێتەوە. بەڵام لەگەڵ خۆمدا دەیبەم چونکە بەبێ ئەو ناتوانم بژیم. گەورەیی بنوێنە و لێگەڕێ کوڕەکە لەگەڵ من بێ.»

هەتا ئەوساتە بەپەلە و سروشتی دەینووسی. بەڵام ئاماژە بە گەورەیی کە لەودا پێی شك نەدەهات و لە لایەکی تریشەوە پێویست بوو نامەکە بە دێڕێکی شوێندانەر تەواوبکات وای لێکرد نەتوانێ لەوە زیاتر درێژە بە نامەکە بدات.

«لەبەر تاوان و پەشیمانیی خۆم ناتوانم لەوە زیاتر بنووسم چونکە....»

دیسان لە نووسین ڕاوەستا، شڵەژابوو. لەبەرخۆیەوە گوتی: «نا، ئیتر پێویست ناکات هیچی تر بنووسم.» نامەکەی دڕاند و بێ ئەوەی ئاماژە بە گەورەیی مێردەکەی بکات دیسان نووسییەوە و نایە نێو پاکەتەکەوە و سەرەکەی چەسپ کرد.

ئێستا دەبوو نامەیەکیش بۆ ڤرۆنسکی بنووسێ. نووسیی: «هەموو شتێکم بە مێردەکەم گوت:» ئەوەی نووسی و ماوەیەکی زۆر دانیشت، چونکە وزەی نووسین و درێژە پێدانی نامەکەی لە خۆیدا نەدەدی و ئەوەی دەینووسی زۆر تووڕە و تۆسنانە بوو و ڕێژەیەك نەرمی و ئاکاری ژنانەی پێوە دیارنەبوو. لە دڵی خۆیدا گوتی: «دوای ئەوە ئیتر دەتوانم چیی بۆ

بنووسم؟» دیسان لە شەرمانا سوورهەڵگەڕا. وەبیر کەمتەرخەمی و سەرساردیی ئەو کەوتەوە و هەستی داخ و خەفەت وای لێکرد کە نووسراوەکەی بدڕێنێ و بیکات بە هەزار کوتەوە. «پێویست ناکات هیچ بنووسم.» کەلوپەل و ئامرازی نووسینی کۆکردەوە و رۆیشت بۆ قاتی سەرێ و بە پەرستارەکەی و خزمەتکارانی راگەیاند کە هەر ئەو شەوە دەڕوات بۆ مۆسکۆ و بەبێ راوەستان دەستیکرد بە پێچانەوەی کەلوپەلەکانی.

## شازدە

خزمەتکار و باخەوان و پێشخزمەت هەموو لە ژوورەکانی ڤیلاکەدا دەهاتن و دەچوون و کەلوپەلیان دەبردە دەرێ. دەرگای گەنجە و دۆلابەکان هەموو ئاوەڵا بوون و دوو جار کەسێکیان نارد بۆ کڕینی کەندر. تەرکی ژوورەکان پڕ بوون لە رۆژنامە. دوو یەغدان و چەند تەلیس و دەستەنوێنی پڕ لە بەتانییان بردە دالانەکەی دەرەوە. فایتوونێك و دوو عارەبانە لەبەر پلیکانەکان راوەستابوون. ئانا لەبەر هەیەجانی پێچانەوەی بارگە و بنەکەی شێواوی و دڵەخورپەی لەبیر چووبۆوە و جانتای سەفەرەکەی ئامادەدەکرد کە ئانووشکا سەرنجی بۆ لای عارەبایەك راکێشا کە بە خڕوهۆڕ و تەقوکوت بەرەولای ڤیلاکە دەهات. ئانا لە پەنجێرەکەوە چاوی لە خوارێ کرد نامەبەرەکەی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچی دی لەبەر پلیکانەکان خەریکبوو قامکی بە زەنگەکەدا دەنا.

ئانا گوتی: بڕۆ بزانە چ باسە ـ لەسەرەخۆ و ئامادە بۆ هەر پێشهاتێك، لەسەر کورسییەکەی دانیشت و دەستی لەسەر کۆشی خۆی دانا. پێشخزمەت پاکەتێکی ئەستووری هێنا کە بە دەستوخەتی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لە سەری نووسرابوو.

گوتی: بە نامەبەرەکەم گوتووە کە راوەستێ هەتا وەڵامی نامەکەی بۆ دەبەم.

ئانا گوتی: زۆر چاکە ـ لەگەڵ چوونە دەرەوەی پێشخزمەت لە ژوورەکە، بە دەستی لەرزۆك و دڵەوریێزەوە پاکەتەکەی هەڵپچڕی. نامەکەی دەرکێشا و دەستیکرد بە خوێندنەوە... «بۆ گەڕانەوەتان هەموو کەرەسە و ئاسانکارییەکتان بۆ دابین دەکەم، تکاتان لێدەکەم سەرنج بدەنە ئەم نامەیە و

ئەوەش بزانە کە ئەم داخوازییە بۆ من گرینگایەتییەکی زۆری هەیە.» جارێکی تر بە وردی بە نامەکەدا هاتەوە و بۆ جاری دووهەمیش دیسان خوێندییەوە. کە لە خوێندنەوەی نامەکە بۆوە هەستی بە سەرما کرد. هەستی دەکرد چارەڕەشییەکی گەورە کە چاوەڕوانیی نەدەکرد بەرۆکی پێگرتووە.

بەیانی لەوەی کە رازەکەی خۆی بۆ مێردەکەی درکاندبوو پەشیمان بوو و تەنیا ئاواتی ئەوەبوو کە ئەو قسانە بە شێوەیەك بخاتە پشتگوێ. ئێستا ئەو نامەیە کە واینیشان دەدا چاوپۆشی لە قسەکانی کردبێ، ئاواتەکەی هاتبووە دی. بەڵام هەر لەو کاتەدا وای مەزندە دەکرد کە ئەو نامەیە زۆر ترسناکە و ئاکامێکی ناخۆشی هەیە.

لە دڵی خویدا گوتی: «هەقیەتی، قسەکانی هەمووی راستە، هەڵبەت هەمیشە هەر هەق بە دەست ئەوە، ئەو مەسیحییە، مەزن و دڵفراوانە! بەڵێ، بوونەوەری سووك و کرێت! سووکایەتی و ناپاکیی ئەویش جگە لە من هیچ کەس تێیناگا و قەتیش تێناگەن. منیش ناتوانم ئەوە لە هیچ کەس بگەیێنم. دەڵێن: پیاوێکی ئایینی و رەوشت پاکە، پیاوێکی بەشەرەف و تێگەیشتووە. بەڵام هیچ کەس ئەوەی من دیتوومە نەیدیتووە. ئەوان نازانن کە ئەو هەشت ساڵ چرۆی ژیانی لە ناخمدا ژاکاندووە، ئەوەی حەز و هیوام هەبوو هەمووی لەنێوبردووە. جارێکیش بیری لەوە نەکردۆتەوە کە من ژنێکی زیندووم و بە ئەشقەوە دەژیم. هیچ کەس نازانێ کە سات بە سات لەو هەشت ساڵەدا زویری کردووم و سووکایەتیی پێکردووم و بەو کارەی خۆی هەستی بە سەربەرزی کردووە. بۆ کەمم هەوڵدا، بە تەواوی توانامەوە هەوڵم نەدا کە ئامانجێك بدۆزمەوە و ژیانم بەرەو لای ئەو وەگەڕ بخەم؟ بۆ من هەوڵم نەدەدا کە مێردەکەم خۆش بوێ؟ کاتێك بۆم دەرکەوت کە ناچێتە دڵمەوە و ناتوانم خۆشم بوێ عەشقی خۆم لە کوڕەکەمدا دیتەوە. بەڵام ئاخری بەو جێیە گەیشت کە دیتم ئیتر ناتوانم خۆم هەڵفریوێنم. دیتم ژنێکی زیندووم و دڵم هەیە و هیچ تاوانێکیشم نییە و خودا وای ئافراندووم کە ئاشق بم و بە ئەشقەوە زیندوو بم. بەڵام ئێستا بەکوێ گەیشتووم؟ خۆزگە بیکوشتبایەم، خۆزگە ئەو بیکوشتبایەم، من هەموو شتێکم تامڵ دەکرد و لە هەموو زوڵمێکی ئەو خۆش دەبووم. بەڵام نا، ئەو....»

«چۆن نەمتوانی تێبگەم کە ئەو چی دەکات؟ ئەو دەزانم کارێك دەکات کە لەگەڵ زاتە شەیتانییەکەی سازگارە. هەموانیش هەقی پێدەدەن. منیش دڵشکاو و چارەڕەش و کەلەلاتر لە پێشوو دەمێنمەوە، تێدا دەچم...» ئەو رستەیەی نامەکەی وەبیرهاتەوە «.... خۆت دەتوانی بیهێنیتە بەر چاوت کە چی چاوەڕوانی ئێوە و کوڕەکەمانە.» ئەوە هەڕەشەیە کە بۆ

ئەوەی کوڕەکەم لێ بستێنێ. حەتمەن بە یاسا گەوجەکەشیان ئەو کارە بەڕێوەدەبەن و بۆیان دەچێتە سەر، بەڵام بۆ من نازانم مەبەستی لەو قسانە چییە؟ تەنانەت باوەڕ ناکات کە من کوڕەکەمم خۆش دەوێ، یان لەوانەیە ئەو خۆشەویستییەی من بۆ کوڕەکەم لەبەر چاوی سووک بێ (هەروەك هەمیشە سووکایەتیی پێکردووە.) هەستەکانم پێپەست دەکات. بەڵام دەزانێ من دەست لە کوڕەکەم هەڵناگرم. بەبێ کوڕەکەم، تەنانەت لەلای ئەو پیاوەش کە خۆشم دەوێ، ناتوانم بژیم. ئەگەر واز لە کوڕەکەم بێنم و رووی لێوەرگێڕم بێ ئابڕووترین و سووکترین ژن دەبم و ئەو دەزانێ من تواناییی ئەو کارەم نییە.»

ڕستەیەکی تری نامەکەی وەبیرهاتەوە «ژیانی ئێمە دەبێ وەك پێشوو درێژەی هەبێ...» لە دڵی خۆیدا گوتیشی «ئەم ژیانە لە رابردوودا پڕ لە ئازار بوو، لەو دواییانەشدا بەجارێ رەش و تاڵ بوو، ئێستا چۆن دەتوانین درێژەی پێبدەین؟ ئەویش هەموو ئەوانە دەزانێ کە من هەناسەکێشانم بە هۆی ئەشقەوەیە و ناتوانم بەبێ ئەشق بژیم و قەتیش لەو کارەی خۆم پاشگەز نابمەوە. خۆشی دەزانێ ئەو رێگایەی کە خستوویەتە بەرپێم تەنیا درۆ و خۆ هەڵخەڵەتاندنە و بەس. بەڵام ئەو بە پێویستی دەزانێ و حەزدەکا ئازارم بدات. من چاکی دەناسم. دەزانم چۆن ماسی بە ئاو زیندووە ئەویش ئاوا بە درۆ دەژی و چێژی لێوەردەگرێ. بەڵام نا، من دەبێ ئەو چێژەی لێ بکەمە ژەقنەمووت. من دەبێ ئەو داوانە بپسێنم کە دەیهەوێ وەك جاڵجاڵۆوکە بە دەورمدا بیتەنێ. هەرچی دەبێ با ببێ، قیروسیا. هەموو شتێك لە درۆ و خۆفریودان باشترە!»

«بەڵام ئاخر خوداگیان، چ بکەم؟ خودایە، بڵێی ژنێك هەبێ وەك من چارەڕەش و لێقەوماو؟...»

لەناکاو داچڵەکی و بەرگریی لە گریانەکەی کرد و گوڕاندی: نا، من نابەزم، زنجیر دەپسێنم.... ـ بەپەلە رۆیشت بۆ لای مێزەکە تاکوو نامەیەکی تری بۆ بنووسێ. بەڵام لە ناخی گیانییەوە هەستی دەکرد تواناییی پساندنی هیچ بەند و داوێکی نییە، تواناییی ئەوەی نییە لەو بارودۆخەی پێشووی خۆی دەربازبێ کە بە درۆ و ناڕاستی رمووده بووە.

لە پشت مێزی نووسینەکە دانیشت بەڵام بەجێی ئەوەی شتێك بنووسێ هەردوو دەستی لەسەر مێزەکە دانا و سەری کردە سەری و دەستیکرد بە گریان. وا دەگریا کە تەواوی جەستەی دەلەرزایەوە، وەك منداڵ زووڕە زووڕ دەگریا. قوڵپی گریانەکەی بۆ ئەوەبوو کە دەیدی خەونە رووناك و بلوورینەکەی وردوخاش بووە و لە نێو چووە. دەیزانی کە بارودۆخی ژیانی وەك رابردوو نابێ و زۆریش خراپتر دەبێ. هەستی دەکرد کە رێزی کۆمەڵایەتیی کە ئەو رۆژە بەیانی

بە شتێکی کەم بایەخی زانیبوو، زۆری بەلاوە گرینگە و ناتوانێ ئەو رێز و شکۆیە لەگەڵ پلەی ژنێکی ئابڕوو تکاو بگۆڕێتەوە کە مێردەکەی وازی لێهێناوە، کوڕەکەی لێی بێزارە و رووی لێوەرگێراوە و لەگەڵ گراوەکەی دەژی، هەرچەندی هەوڵی دا نەیدەتوانی لەوە بەهێزتر بێ کە خۆی حەزی پێدەکات، دەیزانی هەرگیز چێژ لە ئازادی و ئەوین وەرناگرێ و هەمیشە خۆی بە ژنێکی تاوانبار دەزانێ و پێیوایە هەڕەشەی شەرم و ئابڕووچوون وەك سێبەر بەدوایدا دەخوشێ. ژنێك کە بەهۆی پێوەندیی ناپاك لەگەڵ پیاوێکی بێگانە کە ناتوانێ ژیانی هاوبەشی لەگەڵ پێکبێنێ و مارە و تەڵاق بەستوویەتەوە، خەیانەت بە مێردەکەی دەکات. دەیزانی کە بارودۆخەکەی لەوە باشتر نابێ و لەگەڵ ئەوەشدا کێشەکە هێندە رەش بوو کە تەنانەت نەیدەتوانی بیهێنێتە بەرچاوی کە چۆن کۆتایی پێدێ. وەك منداڵانی تەمبێکراو زووڕە زووڕ دەگریا و نەیدەتوانی ددان بەخۆیدا بگرێ.

بە ترپەی پێی پێشخزمەتێك کە نزیك دەبۆوە وەخۆ هاتەوە، دەموچاوی خۆی لێشاردەوە و واینواند کە خەریکی نووسینی نامەیە.

پێشخزمەت گوتی: نامەبەر چاوەڕوانی وەڵامی نامەکەیە.

لەبەرخۆیەوە گوتی «ئاخر چیی بۆ بنووسم، بە تەنیا دەتوانم چ بڕیارێك بدەم؟ چی دەزانم؟ چیم دەوێ؟ چیم خۆش دەوێ؟» دیسان هەستی کرد کە هەموو شتێك لە رۆحیدا دووانە و دووپۆیە و زۆر لەو هەستە دەترسا و هەر هەلێکی بۆ هەڵدەکەوت خۆی پێوە هەڵدەواسی و دیویست خۆی لە چنگ ئەو بیر و ترسانە دەربازبکات. بەخۆی گوت «دەبێ ئەلکسی ببینم (ڤرۆنسکیی بەو ناوە بانگ دەکرد) تەنیا ئەو دەتوانێ پێمبڵێ کە چ بکەم. دەچم بۆ ماڵی بێستی. رەنگە لەوێ چاوم پێی بکەوێ.» هەر لەبیری نەمابوو شەوی رابردوو پێی گوتبوو کە ناچێ بۆ ماڵی پرێنسس تۆرسکایا؟ ڤرۆنسکیش گوتبووی ئەگەر تۆ نەچی منیش ناچم. قەڵەمەکەی هەڵگرت و بۆ مێردەکەی نووسی: «نامەکەت گەیشت. ئا.» قامکی نا بە زەنگەکەدا و نامەکەی دایە دەست پێشخزمەتەکە.

بە ئانووشکای گوت کە هاتبووە ژوورێ: ناڕۆین.

ـ یانی ناڕۆین ئیتر؟

ـ نا، تا سبەینێ دەست لە بارگە و بنەکە مەدەن. پێی بڵێ فایتوونەکەش جارێ راوەستێ، دەمەوێ بچم بۆ ماڵی پرێنسس.

ـ چ لیباسێکتان بۆ ئامادەبکەم؟

# حەڤدە

دەستەی گەمەی گۆلڤ کە پرێنسس تۆرنسکایا ئانای بۆ بانگهێشتن کردبوو بڕیاربوو لە نێوان دوو خاتوون و دڵدارەکانیاندا بەڕێوەبچێت. ئەم دوو خاتوونە ئەستێرەی پڕشنگداری کۆڕی گەوران بوون کە تازە لە پترزبۆرگ دامەزرابوو و بە لاسایی لاسایی کردنەوەیەکی تر «Lessept merveilles de monde»[134] ناوی دەرکردبوو. ئەو کۆڕە، ئەگەرچی بە بۆنەی هاتووچۆی ئاناوە گرینگییەکی زیاتری هەبوو بەڵام حەزی نەدەکرد بچێت و رقی لێیبوو. جگە لەوەش سترمۆڤی پیر، کە لیزامێرکالڤای خۆش دەویست و یەکێك لە کەسایەتییە دەستڕۆیشتووەکانی پترزبۆرگ بوو، لە کاروباری ئیداریدا رقەبەرایەتیی لەگەڵ ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ دەکرد. ئانا هەر بەو هۆیەوە حەزی نەدەکرد بچێت بۆ ئەو میوانییە و قسە توێکڵدارەکەی پرێنسس تورسکایاش لە یادداشتەکەیدا ئاماژە بوو بەو خۆگێلکردن و حاشا درۆیینە. بەڵام ئێستا ئانا بە هیوای دیتنی ڤرۆنسکی بڕیاریدا بچێت.

ئانا زووتر لە میوانەکانی تر گەیشتە ماڵی پرێنسس تۆرسکایا.

کاتێك کە دەچووە ژووریّ، پێشخزمەتی ڤرۆنسکیش بە ریشی لەسەر لاجانگ شانەکراوەوە گەیشتبووە ئەویّ کە دەتگوت ئاجوودانە تایبەتەکانە لەبەر دەرگای ماڵەکە راوەستابوو و کڵاوەکەی لەسەری داگرتبوو تاکوو رێز بۆ ئانا دانیّ و رێگای پێبدات بچێتە ژووریّ. ئانا ناسییەوە و تازە وەبیری هاتەوە کە دوێشەو ڤرۆنسکی گوتبووی نایەت. رەنگە یادداشتی ناردبیّ و داوای لێبوردنی کردبیّ کە نەهاتووە بۆ کۆڕەکە.

کاتێك ئانا لە دەرگانەی چوونە ژوورەوەدا جلەکانی سەرەوەی دادەکەند گوێی لە دەنگی پێشخزمەتەکەی ڤرۆنسکی بوو کە پیتی «ڕ»ی وەك پیاوماقووڵان بێژ دەکرد، کە لەگەڵ پێدانی یادداشتەکەی گوتی: لە لایەن بەڕێز کۆنتەوە هێناومەتە خزمەت پرێنسس.

---

١٣٤- سەیروسەمەرەکانی حەوتەوانەی دنیا.

ئانا دەیویست لە پێشخزمەتەکەی بپرسێ کە ئەربابەکەی لە کوێیە. حەزی دەکرد بگەڕێتەوە و نامەیەکی بۆ بنێرێ و بانگی بکات بۆ لای خۆی، یان خۆی بچێت بۆ لای ئەو. بەڵام هیچ کام لەو کارانەی بە شیاو نەدەزانی. دەنگی زەنگێك کە هاتنی ئەوی رادەگەیاند بەر لە چوونە ژوورەوەی بەرزبۆوە و پێشخزمەتەکەی پرێنسس تۆرسکایاش ئێستا لە بەرێکی تری دەرگانەکەدا راوەستابوو و چاوەڕێبوو ئانا بچێتە ژوورێ. پێشخزمەتێکی تر لە ژوورێکی دیکەوە گوتی: پرێنسس تەشریفی لە نێو باخەکەیە هەر ئێستا هەواڵی هاتنی ئێوەیان پێڕادەگەیێنم. خاتوونەکەم ئێوە تەشریف نابەن بۆ نێو باخەکە؟

هێشتا دڕدۆنگی و شڵەژانی بیری ئانا لە چاو ئەو کاتەی لە ماڵی خۆیان بوو هیچ فەرقێکی نەکردبوو و تەنانەت شێواوتریش بوو، چونکە دڵەدوا بوو و دەتگوت دەست و لاقی بەستراوە. دیتنی ڤرۆنسکی نە دەلوا بۆی و تازە ناچاربوو لەو ماڵە، لەو شوێنە نامۆیە، کە هەستی دەکرد پڕە لە دژایەتی و نامۆیی وەك دیل بمێنێتەوە. بەڵام جلوبەرگێکی لەبەردا بوو کە دەیزانی لەگەڵ روخساری لێك دەکاڵێنەوە. بە تەنیاش نەبوو. لە دەوروو بەری خۆی حاڵو هەوایەکی پڕ لە شادی و جێژن و حەسانەوەی دەدی کە خووی پێگرتبوو و بۆ ئەو لە ماڵی خۆیان خۆش و ئاسوودەتر بوو. ناچار نەبوو بیر بکاتەوە کە چ بکا. کارەکان هەموویان لەخۆڕا بەڕێوەدەچوون. کە چاوی بە بێتسی کەوت بەو جلوبەرگە سپی و جوانانەوە ئەوەندەی تر شۆخوشەنگ و رازاوەیە و سەرنج رادەکێشێ وەك هەمیشە زەردەیەکی گرت. پرێنسس تۆرسکایا، تۆشکڤیچی لەگەڵدا بوو، هەروەها یەکێك لە کچانی خزمیشیانی لەگەڵ بوو کە دایك و باوکی زۆریان پێخۆش بوو کە کچەکەیان وەرزی هاوین لەلای پرێنسسی ناودار رادبوێرێ.

ڕوخساری ئانا وادیاربوو شتێکی تایبەتی پێوە دیاربوو، بۆیە بێتسی لەڕێوە تێگەیشت.

ئانا وەڵامی دایەوە: دوێشەو زۆر خەوەکەم ناخۆش بوو ـ چاویشی لەو پێشخزمەتەکە بڕی کە دەهات بۆ لایان و وای مەزندە کرد دەبێ نامەی ڤرۆنسکیی هێنابێ بۆ خاتوونەکەی.

بێتسی گوتی: چەندەم پێخۆش بوو هاتی. زۆر ماندووم و هەر ئێستا دەمویست هەتا میوانەکان دێن بچم چاییەك بخۆمەوە ـ rووی لە تۆشکڤیچ کرد و گوتی: ئێوەش وا چاکە لەگەڵ ماشا بچن بۆ گۆڕەپانی گۆڵف و بزانن چیمەنەکەیان جوان بڕیوەتەوە ـ دیسان رووی لە ئانا کردەوە و بە بزەیەکەوە دەستی گوشی کە چەترێکی بە دەستەوە گرتبوو، گوتیشی: ئێمەش واچاکە هەتا دەرفەتمان هەیە پێکەوە بچین چاییەك بخۆینەوە و هێندێك دەردی دڵ بکەین. بە ئینگلیزیش دووپاتی کردەوە: من چەنەوەرێکی زۆر ساردوسڕ و راوێژ ناخۆشم، وانییە؟

ئانا گوتی: بەڵام ناتوانم ماوەیەکی زۆر لێرە بمێنمەوە و دەبێ حەتمەن بچم بۆ لای کۆنتس ڤرێدا[135]ی پیر. عومرێکە بەڵێنیم پێداوە ـ ئەو ئەگەرچی لەگەڵ درۆ و دەلەسە ناسازگار بوو بەڵام لە هەموو کۆڕ و کۆبوونەوەیەکدا بۆی بووبووە کارێکی زۆر ئاسان و بە شێوەیەکی سروشتی درۆی دەکرد و چێژیشی لێوەردەگرت.

ئێستا خۆشی نەیدەزانی بۆ ئەو شتەی ساتێك لەمەوبەر بیریشی لێنەدەکردەوە بە دەمیدا هاتبوو، ئەو قسەیەشی تەنیا لەبەرئەوە کردبوو کە دەیزانی ڤرۆنسکی نایەت بۆ ئەوێ و ناچاربوو بە شێوەیەك خۆی دەربازبکات و هەرچۆنێکە چاوی پێی بکەوێ. بەڵام بە چ هۆیەك کۆنتس ڤرێدای پیری هەڵبژاردبوو ، ئەویش کاتێك کە بڕیاربوو وەك زۆر کەسی دیکە چاوی پێیان بکەوێ، شتێك بوو کە هیچ روونکردنەوەیەکی بۆ نەبوو و نەیدەزانی سەبارەت بەوە بڵێ چی. لەگەڵ ئەوانەشدا، هەروەك دەرکەوت، لە نێو هەموو فێڵ و دهۆکاندا کە بۆ ژوانی ڤرۆنسکی بیری لێدەکردەوە ئەمە لە هەموویان باشتر بوو و بۆی هەڵدەسوورا.

بێتسی بە وردی چاوی لە ئادگاری ئانا کرد و گوتی: نا، ناهێڵم بڕۆی. بەڕاستی زۆرم خۆش دەوێی دەنا هەرکەسێکی تر ئەو قسەیەی بکردبایە دڵم لێی دێشا، رەنگە ماڵی ئێمەت پێناخوش بێ و ترسی ئەوەت هەبێ کە هاموشۆی ماڵی ئێمە بێتە هۆی ئەوەی قسەتان وەشوێن بخەن ـ هەر وەك عادەتی پێگرتبوو لەگەڵ ئەوەدا کە رووی قسەی لە پێشخزمەتەکەی بوو تۆزێ برۆی وێك هێنایەوە و گوتی: تکایە چاییەکەمان بۆ بێنن بۆ هۆڵە چکۆلەکە ـ یادداشتەکەی لە خزمەتکارەکەی وەرگرت، خوێندییەوە و بە زمانی فەرەنسی گوتی: ئەلکسی بەدادایی کردووە و بۆتە رفێقی نیوەڕێ. نووسیوێتی کە ناتوانێ بێت ـ ئەو قسەیەشی بە لەبزێکی زۆر ساکار و سروشتی دەربڕی کە دەتگوت قەت بە زەینی ناگات کە ڤرۆنسکی لەوانەیە بۆ ئانا زۆر لە یاریزانێکی گۆڵف گرینگتر بێ.

ئانا دەیزانی کە بێتسی خەبەری لە هەموو شتێك هەیە، بەڵام بە بیستنی ئەو لەبزە و شێوەی دەربڕینی ناوی ڤرۆنسکیدا بۆ ساتێك تووشی گومان بوو کە لەوانەیە رۆحیشی خەبەردار نەبێ.

ئانا بێموبالاتانە گوتی: سەیرە! وەك ئەوەی هاتنی ڤرۆنسکی هیچ گرینگایەتییەکی نەبێ بە لایەوە، هەروا بە بزەیەکەوە درێژەی بە قسەکانیدا: چۆن شتی وا دەڵێی؟ چۆن دەکرێ ماڵی

---

135- Vreda

ئێوەم پێناخۆش بێ و پێم وابێ قسەم وەدوو دەخەن؟ـ ئەو ناسکویژی و نهێنی پاراستنە بۆ ئانا، وەك هەموو ژنێکی تر، لەسەریەك دەتوانین بڵێین زۆر خۆش بوو، و لە ئەو هەوڵەی دابووی بۆ شاردنەوەی نهێنی و رازەکانی و نە رازەکە خۆشی، بەڵکوو شارەزایی بۆ شاردنەوەی رازەکە بەلایەوە زۆر خۆش بوو. گوتی: من ناتوانم لە پاپ کاتۆلیکتر بم. ستریمۆڤ و لیزا مێرکالۆڤا لە نێو خۆشناوەکاندا سەرتۆپن و لەگەڵ ئەوەشدا لە هەموو کۆڕ و کۆبوونەوەکاندا ئامادەدەبن. منیش ( زۆر پێداگرانە منەکەی بە دەمدا هات) هیچ کات لەو بارەوە وازی نەبووم. ئەگەر دەمهەوێ بڕۆم تەنیا لەبەرئەوەیە کە کاتم نییە.

ـ نا، بەڵام وێدەچێ حەز نەکەی چاوت بە ستێرمۆڤ بکەوێ. لێگەڕێ با ئەو و ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لە کومیسیۆنەکەدا هەر خەریکی کێشە و دەمەقاڵێ بن. ئێمە چکارمان بەسەر شەڕ و دەمقڕەی ئەوانەوەیە؟ لە کۆڕدا رووخۆشترین و قۆشمەترین پیاوە کە دەیناسم. یاریی گۆلڤیش زۆر باش دەکات، ئێستا خۆتان دەیبینن. چونکە بە پیری فێری پلاوخواردن بووە و حەز لە لیزا دەکات و خوی کردۆتە گەپجاڕی عالەم، جا با بزانین دەتوانێ بەڕەی خۆی لە ئاو دەرکێشێ. هەرچییەك بێ پیاوێکی زۆر شیرین و خۆش مەشرەفە، ئێوە ساڤۆ شتۆلتس دەناسن؟ زۆر ژنێکی باش و سەرنجڕاکێشە.

بێتسی ئەو قسانەی دەکرد و ئانا بە بزە زیرەکانەکەیدا هەستی دەکرد کە تا رادەیەك خەبەری لە بارودۆخی ئەو هەیە و لەبیری داڕشتنی پلانێکدایە. گەیشتنە وەتەغە چکۆڵەکە.

بێتسی گوتی: من دەبێ بۆ ئەلکسی بنووسمـ چوو لە پشت مێزەکە دانیشت و چەند دێڕێکی نووسی و نایە نێو پاکەتێکەوە. گوتی: نووسیم کە بۆ نیوەڕۆ حەتمەن بێت بۆ ئێرە. چونکە یەکێك لە خاتوونەکان کاتی نانخواردن پیاوی لەگەڵ نابێ. ئەوەش بزانە کە نامەکەم چەندەی کاریگەری دەبێ. بمبوورە دەبێ خولەکێك بەجێتان بهێڵم. تکایە خۆتان زارکی پاکەتەکە چەسپ کەن و بیاندەنێ با بیبەن ـ کاتێ ئەم قسەیەی دەکرد گەیشتە بەر دەرگاکە و گوتیشی: من دەبێ دەستووری پێویست بدەم.

ئانا بێ ئەوەی بیری لێبکاتەوە بەپەلە رۆیشت بۆ پشت مێزەکە و بێ ئەوەی نووسراوەکەی بێتسی بخوێنێتەوە لە ژێرەوە نووسیی: «حەتمەن دەبێ چاوم پێتان بکەوێ. وەرە بۆ باخی ڤرێدا. من سەعات شەش لەوێ دەبم.» زارکی پاکەتەکەی چەسپاند و کە بێتسی گەڕایەوە لەلای خۆی نامەکەی دایە دەست پێشخزمەتەکە.

بەڕاستی ئەوان لەسەر مێزێك کە بە شێوەی کەشەف هەڵکەوتبوو و بۆیان هێنابوون بۆ ژوورە چکۆڵە و فێنکەکە، بەر لە هاتنی مێوانەکان هەر وەك پرێنسس تۆرسکایا بەڵێنی دابوو

دەرفەتی چەنەوەرییەکی باشیان هەبوو، وازیان لە باسی لیزا مێرکالۆڤا هینا و خۆیان کردە قازی و دەستیان کرد بە هەڵسەنگاندنی چاکە و خراپەی میوانەکان.

ئانا گوتی: ژنێکی زۆر مێهرەبانە و خێرا خۆی لە دڵدا جێ دەکاتەوە.

ـ ئێوە دەبێ خوشتان بووێ. چونکە شەیدای ئێوەیە. دوێشەو دوای کێبەرکێی ئەسپسواری هات بۆ ئێرە. کاتێك دیتی ئێوە لێرە نین زۆری پێناخۆش بوو. دەڵێ ئێوە قارەمانێکی راستەقینەی رۆمانن و ئەگەر پیاو بوایە بۆ ئێوە خۆی بە ئاو و ئاوردا دەدا، ستێرمۆڤ پێیگوت پیاویش هەموو خەریکە بۆی شێت دەبن.

ئانا تۆزێ بێدەنگ بوو و بە لەبزێکی نەرم کە بە روونی دیاربوو کە بەبێ هەڵسەنگاندن قسەناکات، بەڵام ئەوەی دەیپرسێ گرنگایەتییەکی زۆری هەیە بۆی و گوتی: بەڵام تکاتان لێدەکەم ئەوەم پێبڵێن، من هەر نەمتوانیوە تێبگەم، پێوەندیی لەگەڵ پرێنس کالۆژسکی یان وەك دەڵێن میشکا، چۆنە؟

بێتسی گرژییەوە و چاوی لە چاوی ئانا بڕی.

گوتی: پێوەندییەکەیان زۆر ئەمرۆییانەیە. ئێستا ئیتر هەمووان ئەو چەشنە پێوەندییەیان هەڵبژاردووە. وەك دەڵێن حەیایان قووت داوە و ئابڕوویان... بەڵام خۆ ئەو کارەش بە هەموو چەشنێك دەکرێ.

ـ بەڵێ، بەڵام پێوەندیی لەگەڵ کالۆژسکی لە کام چەشنە؟

بێتسی بە نەشەیەکەوە کە چاوەڕوانیی لێنەدەکرا، دای لە قاقای پێکەنین و بە جۆرێك پێدەکەنی کە خۆی بۆ رانەدەگیرا و زۆر بە دەگمەن هەڵدەکەوت ئاوا پێبکەنێ.

ـ ئێوە لێرە خەریکن دەستدرێژی دەکەنە سەر هەرێمی تاکەکەسیی پرێنسس میاخکایا. ئەو پرسیارەی ئێوە لە پرسیاری منداڵانی لاسار دەچێ ـ بێتسی ئەگەرچی دەیویست پێنەکەنێ، بەڵام دیاربوو ناتوانێ دان بە خۆیدا بگرێ، کەوتە پێکەنین، پێکەنینێك کە تەنانەت مرۆڤە خەندەڕووەکانیش کەم واهەیە ئاوا پیران ببەستن، بە پێکەنینەوە کە قسەی بۆ نەدەهات و فرمێسك بە چاویدا دەهاتە خوارێ گوتی: دەبێ لە خۆیان بپرسن.

ئاناش کە وەك ئەو وەپێکەنین کەوتبوو گوتی: ئێوە پێدەکەنن، بەڵام من هیچ کات نەمتوانیوە تێبگەم. نازانم رۆڵی مێرد لەو نێوانەدا چییە؟

ـ مێرد؟ مێردەکەی لیزا مێرکالۆڤا بەتانیی لاق گەرمداهێنانی بە دەستەوە دەگرت و هەمیشە دەستەوتەزەر لە خزمەتیدا راوەستابوو تاکوو لە لاقوقولی ژنەکەی هاڵێنێ. بەڵام کەس نازانێ لە پشتی پەردەوە چی رادەبرێ و هیچ کەس کاری پێی نییە. خۆ دەزانی لە کۆڕ و میوانییەکاندا هەر وەك سەبارەت بە جلوبەرگی تاقمێك هیچ ناڵێن و تەنانەت بیریشی لێناکەنەوە، لەو بارەشەوە هەروایە.

ئانا بۆ ئەوەی باسەکە بگۆڕێ پرسیی: ئێوە دەچن بۆ ڕێوڕەسمی جێژن لە ماڵی رۆلانداکی[١٣٦]؟

بێتسی گوتی: پێموانییە بچم ـ بێ ئەوەی چاو لە چاوی دەستەخوشکەکەی بکات دەستیکرد بە تێکردنی چایی لە پەرداخە چکۆڵە و بریقەدارەکان. پەرداخێکی بردە بەردەمی ئانا و خۆی جگەرەیەکی هەڵگرت و بە سەری مۆدنە زێوینەکەیەوە کرد و دایگیرساند.

بێتسی پەرداخەکەی بە دەستەوە گرت و بێ ئەوەی پێبکەنێ گوتی: دیتووتە من حاڵم باشە و لە حاڵی تۆش دەگەم و لە حاڵی لیزاش. لیزا یەکێك لەو ژنە ساویلکانەیە کە وەك منداڵ چاك و خراپ لێك ناکاتەوە. لانیکەم ئەو کاتەی کە جحێڵ بوو تێنەدەگەیشت. بە زەردەخەنەیەکەوە درێژەی بە قسەکانیدا: ئێستا دەبینن کە ئەو سایلۆحی و دڵسافییە لەگەڵ سروشتی سازگارە، بۆیە ئێستا ئیتر رەنگە هەر بەقەستی خۆی گێل بکات و خۆی لە نەزانین دەدات. بەڵام هەرچۆنێك بێ ئەو کارە لە ئەو دەوەشێتەوە. دەتوانی مەسەلەیەکی ئاشکرا و سادە سەخت بگری و بیکەیتە هۆی ئازاری خۆت، دەشکرێ زۆر بە ساکاری چاوی لێبکەی و تەنانەت پێبکەنی و چێژیش وەرگری. رەنگە ئێوە پێتان خۆش بێ لە رادەبەدەر سەختگیری بکەن.

ئانا بیرمەندانە و بە لەبزێکی بنەوشییەوە گوتی: نازانی چەندەم پێخۆشە خەڵکی وەك خۆم بە باشی بناسم! بۆ ئەوەی بزانم لە خەڵکی باشترم یان خراپتر. چونکە پێموایە خراپترم.

بێتسی گوتی: منداڵێکی سەیری، منداڵێکی سەیری! هاتن.

## هەژدە

ترپەی پێ و دەنگی قسەکردنی پیاوێك هات و پاشان دەنگی پێکەنینێکی ژنانە، دوای ئەویش هەموو ئەو میوانانەی کە چاوەڕوانیان بوون: ساڤۆشتۆلتس و لاوێك کە تەندروستی لە سەرتاپای دەباری و بە ڤاسکا بانگیان دەکرد. دیاربوو کە گۆشتی برژاو و کارگی ناسك و بۆنخۆشی ترۆڤ و شەڕابی بۆرگۆنی زۆر پێدەکەوێ. ڤاسکا سەرێکی بۆ لای ژنەکان دانەواند و چاوێکی خێرای لێکردن. بە دوای ساڤۆدا رۆیشت بۆ تەلاری میوانداری و لەوێش لێی دوورنەدەکەوتەوە. دەتگوت پێوەی بەستراوە و چاوی گەشی خۆی لە سەر هەڵنەدەگرت، هەر

136- Rolandaky

دەتگوت دەیهەوێ بە چاو قووتی بدا. ساڤۆشتۆلتێس ژنێکی قژزێڕین و چاوڕەش بوو، جووتێك کەوشی ناڵچەبەرزی لە پێدا بوو و بە هەنگاوی ورد و گورجەوە هاتەژووری و توند و پیاوانە دەستی لەگەڵ ژنەکان لێکدایەوە.

ئانا هێشتا بۆ تاقە جارێکیش لەگەڵ ئەو ژنە تازە ناوبانگ دەرکردووە بەرەوڕوو نەبووبوو، لە جوانییە بێوێنەکەی و نوێخوازیی زۆری بۆ هەڵبژاردنی لیباس و بوێری و رووهەڵماڵدراوییەکەی سەری سووڕ مابوو. کڵاوپرچێکی زێڕینیشی بە قژە زەردەکەی خۆی زیادکردبوو و پۆپەیەکی جوان و بەرزی لە سەر سەری خۆی سازکردبوو، بەجۆرێك کە سەری لە باری بەرزایی لەگەڵ بەژنی رێك و نەرم و شلی و لە پێشیشەوە لەگەڵ بەرۆکی رووتی دەکاڵایەوە. هەڵسوکەوتی هێندە گورج و توندوتۆڵ بوو کە لەگەڵ هەر هەنگاوێکدا شکڵی ئەژنۆ و رەفیچکە و شلکەڕانی لە ژێر جلوبەرگەکانییەوە وەدیار دەکەوت و بێ ئیختیار ئەم پرسیارە لەلای بینەر دروست دەبوو کە ئەم بەژنە نەرموشلەی کە کراس شاردوویەتەوە و ئەو شلکەڕانەی لە خوارەوە کەوتۆتە ژێر پەردەی پڕچینی رازەوە و لە سەرەوە ئاوا رووتە بەڕاستی لە کوێ کۆتاییی پێدێ؟

بێتسی بەپەلە ئەوی بە ئانا ناساند.

ساڤۆ هێشتا ناساندن تەواو نەبووبوو بە پێکەنین و چاوقرتاندنەوە و لەگەڵ ئەوەی خەریکی کۆکردنەوەی داوێنی درێژی کراسەکەی بوو کە زۆر کەوتبووە لایەك دەستی پێکرد: هەر ناتوانن بیری لێبکەنەوە، هێندەی نەمابوو سەربازێك وەبەردەم و جیقو فیقی دەرهێنم. لە فایتوونەکەدا لەگەڵ ڤاسکا پێکەوە بووین کە... ئەها، ئێوە یەکتر ناناسن ـ ناوی بنەماڵەکەی گوت و لاوەکەی ناساند، لەگەڵ ئەوەشدا سوورهەڵگەڕا و قاقای کێشا، بەوە پێدەکەنی کە بە هەڵە ئەوی وەك خاتوونێکی نەناسیاو بە ناوی چکۆڵەی ڤاسکا ناساندبوو.

ڤاسکا جارێکی تر بێ ئەوەی هیچ بڵێ سەرێکی بۆ لای ئانا دانەواند و رووی لە ساڤۆ کرد و بە پێکەنینەوە گوتی: گرێوەکەت دۆڕاند، ئێمە زووتر گەیشتین. ئەو پارەیەی دۆڕاندووتە وەرەخواری.

ساڤۆ بە نەشە و گەشەیەکی زیاترەوە قاقای کێشا و گوتی: ئێستا خۆ ناکرێ!

ـ قەیدێ ناکات، بۆ دوایی، بەڵام لێتدەستێنم.

ـ باشە باش، زۆر باشە، رووی کردە خاتوونی خانەخوێ و گوتی: پەککوو، لەبیرم نەبوو پێتان بڵێم، منیش چەندە مرۆڤێکی گێژم.... مێوانێکم بۆ هێناون.... فەرموون.

میوانەکە لاوێکی بانگهێشتن نەکراو بوو کە ساڤۆ لەگەڵ خۆی هێنابووی و لەبیری نەبوو بیناسێنێ، مرۆڤێکی هێندە بەڕێز بوو کە لەگەڵ ئەوەشدا زۆر منداڵکار بوو هەردوو خاتوونەکە کاتی ناساندن هەستانە سەرپێ.

ئەو میوانە بانگهێشتن نەکراوە دلّداری تازەی ساڤۆ بوو.

دوای ئەوە پرێنس کالۆژسکی و لیزا مێرکالۆڤا لەگەڵ ستێرمۆڤ هاتن. لیزا مێرکالۆڤا ژنێکی بەژن زراڤی کەزیەڕەش بوو کە ئەدگاری رۆژهەلاّتییانەی لە دوورەوە هاواری دەکرد تەمبەڵ و لەشگرانە و چاوەجوانەکانی هەمووان بە رەمزاوی و پڕ نهێنییان دەزانی. جلە تۆخەکانی (بە جۆرێك کە ئانا لەرێوە سەرنجیدا و بە رێزەوە لێیڕوانی) لە جوانی و بەژن و بالاّی دەکالاّیەوە. ساڤۆ چەندە گورج و توندوتۆڵ و رێکوپێك بوو، لیزاش ئەوەندە نەرم و لە سەرەخۆ و بە شێنەیی بوو.

بەلاّم لەبەر چاوی ئانا لیزا زۆر لە ساڤۆ دلّڕفێنتر بوو، بێتسی سەبارەت بە ئەو بە ئانای گوتبوو کە رۆڵی منداڵێکی ساویلکەی گێڕاوە و وای نواندووە کە چاکو خراپ لێکناکاتەوە، بەلاّم کاتێك ئانا چاوی پێیکەوت هەستی کرد کە ئەو قسەیە راست نییە. ئەو بەڕاستی ژنێکی بێخەبەر و سایلۆح و تاقانە بەلاّم زۆر شیرین و خاکەڕا بوو. راستە کە لە ساڤۆ قۆڕساختر نەبوو، بەلاّم وەك ئەو سەرنجی پیاوانی رادەکێشا و ئەویندارەکانی یەکیان گەنج و ئەوی دیکەیان گەڕاوە، لێی دوورنەدەکەوتنەوە و بە چاو خەریکبوون هەڵیاندەلووشی. بەلاّم شتێك بوو مەزنتر لە شوێن و ژینگەی خۆی. وەك ئەڵماس دەچوو کە لە نێو وردە شووشەدا بدرەوشێتەوە. ئەو درەوشانەوەیەش لە چاوە جوان و بەڕاستی پڕ نهێنییەکانیدا دیاربوو. لە نیگای ماندوو و لەگەڵ ئەوەشدا لێوڕێژ لە بلێسەی ئەوین و ئەو چاوانەشی کە لە نێوان ئاڵقەیەکی رەشدا دەدرەوشانەوە سەداقەتێکی سەرسووڕهێنەر هەست پێدەکرا. هەرکە لەو چاوانەی دەڕوانی پێیوابوو هەتا قووڵایی وجوودی دەیناسێ و کە ناسیشی ناتوانێ شەیدای نەبێ و دڵی پێنەدۆڕێنێ. لەگەڵ دیتنی ئانا روخساری لە ناکاو بە بزەیەکی شاد و شیرین گەشایەوە.

هات بۆ لای ئانا و گوتی: بەڕاستی خۆشحاڵم بە دیدارتان! دوێنێ لە کێبەرکێی ئەسپسواری ویستم بێم بۆلاتان بەلاّم خێرا رۆیشتن. بەتایبەت دوێنێ حەزم دەکرد چاوم پێتان بکەوێ، بەڕاستی ترسناك بوو وانییە؟ ـ کە ئەوەی گوت جۆرێك چاوی لە چاوی ئانا بڕی کە دەتگوت بە تەواوی سفرەی دڵی بۆ دەکاتەوە.

ئانا سوورهەڵگەڕا و گوتی: بەڵێ، من قەت چاوەڕوانی ئەوەم نەدەکرد کە ئاوا ناخۆش و دڵهەژێن بێ.

لەو کاتەدا هەموو هەستان تاکوو بڕۆن بۆ نێو باخەکە.

لیزا بە پێکەنینەوە هەستا، لە پەنای ئانا دانیشت و گوتی: من ناچم، ئێوەش ناچن، وانییە؟ ئاخر گۆلڤیش بوو بە یاری؟

ئانا گوتی: نا، من پێم خۆش نییە.

ـ سەیرە! بەڵام ئاخر چی دەکەن کە تاقەتتان بەسەر نەچێ؟ مرۆڤ ئەگەر چاو لە ئێوە دەکا شادی و نەشە لە سەروڕووتان دەبارێ. ئێوە چێژ لە ژیان وەردەگرن و من خەفەت و پەژارە خەریکە دەمخنکێنێ.

ئانا گوتی: ئەوە چ قسەیەکە! کۆڕی ئێوە خۆشترین و پڕ نەشەترین کۆڕی پترزبۆرگە.

ـ ڕەنگە ژیان بۆ کەسانێك کە ئەندامی ئەم کۆڕەی ئێمە نین ناخۆشتر بێ. بەڵام من بەڕاستی نازانم شادی و نەشە چییە. ترسناکە، خەفەت خەریکە هەناسەم لێدەبڕێ.

ساڤۆ جگەرەیەکی داگیرساند و لەگەڵ دوو لاو رۆیشت بۆ باخەکە. بێتسی و ستێرمۆڤ لە سەر مێزی چاییەکە مانەوە.

بێتسی گوتی: ئەو قسانە چییە! ساڤۆ دەیگوت دوێشەو لە ماڵی ئێوە زۆر خۆشیان رابواردووە.

لیزا مێرکالۆڤا گوتی: هاه، نازانی چەندە ناخۆش بوو! دوای کێبەرکێکە هەموو رۆیشتن بۆ ماڵی ئێمە. بەڵام هەر ئەو قسانەی هەمیشە دەیجوونەوە. هیچ شتێکی تازەیان پێنەبوو. ئەو شەو هەر لە سەر قەنەفە وەرکەوتین. ئیتر ئەوە شادی و نەشەی لە کوێدایە؟ ـ دیسانیش رووی لە ئانا کردەوە و گوتی: دەی، پێمبڵێ، چی دەکەن کە تاقەتتان لەو ژیانە بەسەر ناچێ؟ پیاو ئەگەر چاو لە ئێوە دەکا دەڵێ: ئەوەش ئەو ژنەی کە بەختەوەر یان چارەڕەش، خەفەت نازانێ چییە. منیش فێر بکە، چی دەکەن؟

ئانا کە بەو پرسیارە منجڕانەیە سوور بووبۆوە گوتی: هیچ ناکەم.

ستێرمۆڤ هاتە نێو قسەکانیانەوە و گوتی: ئەوە باشترین کارە.

ستێرمۆڤ پیاوێکی پەنجا و یەك دوو ساڵان دەبوو، سەر و ریشی ماشوبرنجی و هێشتا رەنگی پیری لێنەنیشتبوو و جوانچاکیش نەبوو. خاوەنی قەڵافەتێکی لەبار و روخسارێك بوو کە وریایی و زیرەکیی پێوە دیاربوو. لیزا مێرکالۆڤا برازای ژنەکەی بوو و ئەو هەموو کاتی

پشوودان و رابواردنی لەگەڵ ئەو (یانی لیزا) بوو. کاتێك چاوی بە ئانا کەوت، ئەگەرچی لە چوارچێوەی کاری ئیداریدا چاوی بەرایی نەدەدا ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ ببینێ بەڵام چونکە پیاوێکی زیرەك و خۆڕێکخەر بوو هەوڵی دەدا لەگەڵ ژنی دوژمنەکەی زۆر مێهرەبان و سەرورووخۆش بێ.

زۆر بە نەرمی و زەردەخەنەیەکەوە بۆ سەلماندنی قسەکەی خۆی گوتی: نابێ هیچ کارێك بکەین ـ رووی لە لیزا کرد و گوتی: من هەمیشە بە ئێوەم گوتووە کە بۆ هەڵاتن لە دەست خەفەت نابێ بیری لێبکەیتەوە. راست ئەو جۆرەی کە بۆ دەربازبوون لە بێخەوی نابێ بیر لە بێخەوی بکەیتەوە. مەبەستی ئانا ئارکادیۆڤنا راست ئەوەبوو.

ئانا بە پێکەنینەوە گوتی: بریا ئەو قسەیەم کردبایە، چونکە نەك هەر قسەیەکی وشیارانەیە، بەڵکوو زۆریش راستە.

ـ نا، بیڵێ بزانین، بۆ ناتوانین هەر کاتێك کە خەومان دێ بخەوین و هەر کاتێکیش بێتاقەت بووین شادی بکەین؟

ـ دەبێ کار بکەین بۆ ئەوەی باش بخەوین. بۆ شادی و نەشەی رۆحمان دەبێ کار بکەین.

ـ کاتێك کارەکەم کەڵکی بۆ کەس نییە بۆ کار بکەم؟ چونکە زۆرم رق لە یانیهایە و لێشی وەڕزم.

ستێرمۆڤ بێ ئەوەی چاوی لێبکات دیسان رووی لە ئانا کرد و لە وەڵامیدا گوتی: ئێوە قەت نایەنە سەر رێی راست.

ئەگەرچی ستێرمۆڤ زۆر بە دەگمەن چاوی بە ئانا دەکەوت بەڵام لەو کاتانەدا جگە لە قسەی بێتام هیچی تری لە دەم نەدەهاتەدەرێ. ئەو قسە قۆڕانەشی ئەوە بوو کە کەنگێ دەچێ بۆ پترزبۆرگ، یان کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا چەندەی ئەو (یانی ئانا)ی خۆش دەوێ و بە راوێژێك دەریدەبڕی کە نیشاندەری ئەوەبوو حەزدەکات لەگەڵیدا مێهرەبان بێت و رێزی بۆ دابنێ و تەنانەت زیاتر لەوەش.

تۆشکڤیچ هاتەژوورێ و گوتی: هەموو چاوەڕوانی یاریزانانی گۆلڤن.

لیزا مێرکالۆڤا کە زانیی ئانا دەیهەوێ بڕوات داوای لێکرد کە نەڕوات، گوتی: تکات لێدەکەم مەچۆ، باشە ـ ستێرمۆڤ هەڵیدایە و گوتی: راست دەکات مەچۆ، حەزدەکەین لێرە دانیشی. چۆن ئەم کوڕە بەجێ دێڵی و دەچی بۆ دیتنی ڤرێدای پیر؟ دژوازیی نێوان ئەو دوو کوڕە زۆر نییە؟ جگە لەوەش بیانوویێکی دەدەیە دەست، کە پاشملە باست بکات. بەڵام ئەگەر

لێرە بمێنیتەوە هەستی تر لە دڵەکاندا سەرهەڵدەدەن و باشترین هەستەکانن، کە دەتوانین بڵێین راست پێچەوانەی غەیبەتکردن و پاشملە باسکردنی ئەموئەوە.

ئانا هێندێك دوودڵ بوو و چووە فیکرەوە. قسە نەرم و دڵگرەکانی ئەو پیاوە پڕهۆشە و حەزپێکردنی ساویلکانە و منداڵانەی لیزا مێرکالۆڤا کە دەرهەق بە ئەو دەریدەبڕی و لەسەریەك شوێنێکی نەجیمانە کە ئەو خووی پێگرتبوو، ئەوانە هەمووی لە دڵیدا هەستێکی نەرم و خۆشیان وەدی هێنابوو، ئەوەی چاوەڕوانیشی دەکرد لە سەر دڵی قورسایی دەکرد و بۆ ساتێك تووشی درۆنگی بوو کە بڵێی مانەوەی باشتر نەبێ و کاتی دژواری روونکردنەوەکەی بخاتە دواوە؟ بەڵام کە بیری لە تەنیایی و ماڵەکەی خۆی کردەوە و وەبیری هاتەوە کە ئەگەر بڕیارێك نەدا چی چاوەڕوانییەتی، کە وەبیری هاتەوە قژی سەر لاجانگی خۆی لە دەستی پێچاوە و خەریکە دەیکێشێ، خوداحافیزی کرد و رۆیشت.

## نۆزدە

ڤرۆنسکی لەگەڵ ئەوەدا ژیانێکی بە روڵەت کەمتەرخەمانەی کۆمەڵایەتیی هەبوو بەڵام زۆر لە ناڕێکوپێکی بێزار بوو. هەر لە سەرەتای لاوییەوە کە لە فێرگەی سەربازی بوو و حیسابەکانی لێ شێوابوو و داوای قەرزی کردبوو، دەستیان نابوو بە روویەوە و تامی تاڵی، بە خۆداشکانەوەی چێشتبوو، بۆیە ئیتر هیچ کات ئیجازەی نەدابوو ئەو بارودۆخە دووپات ببێتەوە.

بە مەبەستی ئەوەی هەمیشە ئیشەکانی خۆی بە رێکوپێکی ئەنجام بدات و بەپێی هەلومەرج، کەم و زۆر ساڵی پێنج جار، لە خەڵوەتدا دادەنیشت و سەرحیسابی کاروبارەکانی خۆی دەبوو. ئەو کارەی خۆی بە راستەوپاستە کردنی حیساب، یان نیسکەشۆر کردنی حیساب و کیتابەکانی دەزانی.

ڤرۆنسکی بەیانی رۆژی دوای کێبەرکێکە درەنگ لە خەو هەستا و ریشی نەتاشی و سەر و گیانی نەشۆرد و فەرەنجی لەبەرکرد و پارەی نەغد و سیایی حیسابەکان و نامەکانی لە سەر مێزەکەی بەردەمی خۆی ریز کرد و دەستبەکاربوو. پتریتسکی کە دەیزانی لەو کاتەدا زوو هەڵدەچێ و رقی هەڵدەستێ، کە خەبەری بۆوە دیتی هاوڕێکەی لە پشت مێزی کارەکەی خۆی دانیشتووە، بە هێواشی جلەکانی لەبەرکرد و بێ ئەوەی قسە بکات رۆیشتە دەرێ.

هەموو کەسێك شێواوی و ئالۆزییەکانی ژیانی خۆی بە وردی دەناسێ و نەخوازراوانە پێیوایە ئالۆزیی بارودۆخەکە و دژواری و رێکوپێککردن و راستکردنەوەی چەوتییەکان تایبەتی خۆیەتی و قەت بیر لەوە ناکاتەوە کە خەڵکیش گرفت و کێشەی لەو چەشنەیان هەیە. ڤرۆنسکیش نە بەری لەو بۆچوونە بوو نە غورووریکی ناوەکی، کە بێبنەماش نەبوو، پێیوابوو هەرکەسێکی تریش بێ بەجێی ئەو ئەگەر بکەوێتە بارودۆخێکی ئاوا دژوارەوە، زۆر زوو تووشی شێواوی دەبێت و ناچارە رێی لێ هەتڵە بێ و لە رێبازی خۆی لادەدا، بەڵام هەستی دەکرد ئەگەر دەیهەوێ تووشی داماوی نەبێ، ئێستا دەبێ هەرچۆنێکە سەرحیسابێکی کاروبارەکانی خۆی بێت و وەزعی خۆی روون بکاتەوە.

ڤرۆنسکی بەر لە هەموو شتێك ئەوەی لە هەموو ساناتر بوو، یانی چووە سەر مەسەلەی کاروبارە ماڵییەکانی. سیایی قەرزەکانی بە خەتێکی ورد و لە سەر لاپەڕەیەکی کاغەزی پۆستە نووسی و کە زێدەی کرد دیتی قەرزەکەی بۆتە حەڤدە هەزار و چەندسەد رۆبڵ و چەندسەد رۆبڵیشی بە مەبەستی سادەکردنەوەی کارەکەی چاوپۆشیی لێکرد. پارەی نەغد و هەبیی حیسابی بانکیشی زێدە کرد و دیتی تەنیا هەزار و هەشتسەد رۆبڵی پارە بۆ ماوەتەوە و هەتا ساڵی نوێش ناتوانێ چاوەڕوانی وەرگرتنی پارەی تر بێ. سیایی قەرزەکانی دیسان خوێندەوە و نووسییەوە و دابەشی کردن بەسەر سێ دەستەدا. دەستەی یەکەم ئەو قەرزانە بوون کە دەبوو خێرا بدرێتەوە، پارەی نەغدیشی بوو تاکوو ئامادە داینێ و هەرکاتێك داوایان کرد بێڕاوەستان بیداتەوە. ئەو دەستەیە لە قەرزەکان نزیکەی چوار هەزار رۆبڵ بوو: هەزار و پێنجسەد رۆبڵ پارەی ئەسپ و دووهەزار و پێنجسەد رۆبڵیش بڕی ئەو زەمانەتە بوو کە بۆ دۆستی گەنجی خۆی ڤێنێڤسکی[١٣٧] دانابوو کە لە حوزووری ئەودا بە قوماربازێکی گزیکاری دۆڕاندبوو. ڤرۆنسکی ویستبووی لەڕێوە پارەکە بدات (کە ئەو کاتە پارەی نەغدی لە گیرفاندا بوو) بەڵام ڤێنێڤسکی و یاشڤین پێداگرییان کردبوو کە ئەوان دەیدەن نەك ڤرۆنسکی کە خۆی قوماری نەدەکرد. ئەوانە بەجێی خۆی بەڵام ڤرۆنسکی دەیزانی کە لەو ماجەرا گەمارەدا، کە ئەو جگە لە بەڵێنێکی سەرزارەکی زەمانەتێکی تری بۆ ڤێنێڤسکی دانەناوە. دەبوو دووهەزار و پێنجسەد رۆبڵی پارەی حازر هەبێ تاکوو بێخاتە بەر ئەو کابرا فێڵباز و گزەونە و ئیتر چاوی بە چاوی نەکەوێتەوە. بەم شێوەیە دەبوو بۆ ئەم دەستەیەی یەکەمی قەرزەکانی کە زۆر گرینگ بوون چوارهەزار رۆبڵی پارەی نەغد هەبێ. دەستەی دووهەمی قەرزەکانی کە دەیکردە هەشتهەزار رۆبڵ زۆر گرینگ نەبوون. ئەو

137- Venevsky

قەرزانەش زیاتر بۆ گەوڕ و کاروبار و خزمەتکارەکان و پارەی تفاق و مزی فێرکاری ئینگلیزی و حیسابی چەرمدروو و ئەو جۆرە شتانە بوو. بڕی ئەو دەستەیەش لە قەرزەکان دەبوو دوو هەزار رۆبڵ بدات بۆ ئەوەی خەیاڵی ئاسوودە بێ. باقیی قەرزەکانی پێوەندیدار بە دووکان و هۆتێل و بەرگدروو و ئەو جورە شتانە زۆر گرینگ نەبوون. بەم شێوەیە دەبوو لانیکەم شەش هەزار رۆبڵی پارەی خەوتوو هەبێ، کەچی ئێستا تەنیا هەزار و هەشتسەد رۆبڵی هەبوو" تازە خەرجەکانی تری رۆژانەش کەم نەبوون، ئەم قەرزانە بۆ کەسێکی وەك ڤرۆنسکی کە هەمووان پێیان وابوو ساڵی سەد هەزار تمەنی داهات هەیە هیچ نەبوو. سامانی باوکیشی کە ساڵی دووسەد هەزار رۆبڵی داهات هەبوو هێشتا لە نێوان ئەو و براکانیدا بەش نەکرابوو. کاتێك کە برا گەورەکەی ڤرۆنسکی لەگەڵ پرێنسس ڤاریاچیرکۆڤا، کە کچی یەکێك لە دێکابریستەکان[١٣٨] بوو و هیچ ماڵ و سامانێکی نەبوو، ژیانی هاوبەشی پێکهێنا. زۆر قەرزدار بوو، ئەلکسی تەواوی داهاتی مڵکەکانی باوکی دا بە براکەی و قەناعەتی بە ساڵی بیست و پێنج هەزار رۆبڵ کرد. بە براکەی گوتبوو هەتا ئەو کاتەی ژن دێنێ (کە لەوانەبوو قەتیش نەهێنێ) ئەوەندەی لێ سەروزیادە. براکەی کە فەرماندەری یەکەیەکی سەربازی بوو و خەرجێکی قورسی بە رێشەوە بوو و تازە زەماوەندی کردبوو، نەیدەتوانی دەستی براکەی رەت بکاتەوە و چاوپۆشی لە دیارییەکی ئاوا بکات. جگە بیست و پێنج هەزار رۆبڵەش، دایکی کە ژنێکی دەوڵەمەند بوو ساڵانە بیست هەزار رۆبڵی دەدا بە ئەلکسی و ئەلکسی هەمووی خەرج دەکرد، بەڵام دایکی کە لەم دواییانەدا زانیبووی پێوەندیی لەگەڵ ئانا هەیە و لە مۆسکۆ رۆیشتووە، دەنگی لەگەڵ داگۆڕی و ئیتر پارەی بۆ نەدەنارد، هەر بەو هۆیەش ڤرۆنسکی کە ئیتر خووی بەو چل و پێنج هەزار رۆبڵە گرتبوو و ئەمساڵ تەنیا بیست و پێنج هەزار رۆبڵی وەرگرتبوو بۆیە تووشی تەنگانە هاتبوو. بۆ دەربازبوون لەو تەنگانەیەش نەیدەتوانی داوای پارە لە دایکی بکات. دایکی لە نامەکەیدا کە شەوی پێشوو بە دەستی گەیشتبوو بە توانجەوە گوتبووی کە حەزدەکات بە مەبەستی سەرکەوتنی لە ژیاندا و پێشکەوتن لە ئەرکەکانیدا یارمەتیی بدات بەڵام بە هۆی ئاکارێکەوە کە بۆتە هۆی شوورەیی بۆ بنەماڵەکەیان ناتوانێ یارمەتیی بدات، ڤرۆنسکی بەو قسەیە زۆری رق هەستابوو. دایکی دەیویست

١٣٨- دیکابریستەکان یان دسامبریستەکان ئەفسەران و پیاوانی سیاسی بوون کە لە دیسامبری ١٨٢٥ دا کاتی بوونە پاشای نیکۆلای یەکەم بە مەبەستی دابینکردنی حوکوومەتی یاسایی بنەڕەتی بوونە هاوڕێباز و بەڵام نیکۆلای یەکەم بزووتنەوەی ئەوانی سەرکوت کرد و هێندێکیانی لە سێدارەدا و باقییەکەشیانی بۆ میسر دوور خستەوە و ماڵ و سامانەکەیانی داگیر کرد.

وەسەر تەماحی بخات بەڵام بەو کارەی زۆری تووڕە کردبوو و بەجارێ خۆشەویستی ئەوی لە دڵیدا سارد کردبۆوە.

ئەگەرچی ئێستا گریمانەی پێوەندییەکەی لەگەڵ ئانا کارنینا تووشی فکر و خەیاڵی کردبوو و هێندێ شتی لە مێشکی خۆیدا پێشبینی دەکرد و دەیدی کە ئەو بەخشینە دڵفراوانانەیەی دەرهەق بە براکەی بە هۆی گەمژەییەوە بووە و ئێستا کە ژنیشی نەهێناوە پێویستی بە ساڵی سەدهەزار رۆبڵەکەی خۆی هەیە و ناتوانێ لە بەڵێنەکەی خۆی پاشگەز بێتەوە. بەڵێ، ئەو کارە نەدەلوا. هەرکاتێك بیری لە براژنی دەکردەوە و وەبیری دەهاتەوە کە ئەو ڤاریا شیرین و ئاکارجوانە هەرکاتێك تووشی دەبوو نیشانی دەدا کە دەستودڵبازییەکەی ئەوی لەبیرە و رێزی بۆ دادەنێ، بۆیە نەیدەتوانی لە بەڵێنەکەی خۆی پەشیمان بێتەوە. ئەو کارەش بۆ ئەو بەرادەی لێدانی ژنێك یان دزی کردن و درۆ بە لایەوە نەگونجاو بوو. تەنیا رێگایەك مابۆوە کە ناچاربوو بیگرێتەبەر و ڤرۆنسکی بە بێ دڕدۆنگی و دڵ لە دڵدان بڕیاریدا ئەو رێگایەش تاقی بکاتەوە. یانی دەهەزار رۆبڵ بە سووتو سەلەم وەرگرێ و (ئەوەش کارێك بوو کە بە ئاسانی جێبەجێ نەدەبوو) لە خەرجەکانی رۆژانەی تا ئەوجێیەی دەلوێ کەم بکاتەوە و ئەسپەکانیشی بفرۆشێ. کە ئەو بڕیارەیدا خێرا یادداشتێکی بۆ رۆلانداکی نووسی کە چەند جار پێشنیاری کڕینی ئەسپەکانی پێکردبوو. پاشان کەسێکی نارد بە دوای راهێنەری ئینگلیزی و کابرای سەلەمخۆردا نارد و ئەو پارەیەی بۆی مابۆوە بۆ قەرزوقۆڵەکانی تەرخان کرد. کە ئەو کارەی کرد نامەیەکی سارد و تووڕەی لە وەڵامی دایکیدا نووسی. پاشان سێ یادداشتی ئانای لە جانتاکەی خۆی دەرهێنا و دیسان خوێندنییەوە و سووتاندنی و کە ئاخافتنی دوێنێی خۆیانی وەبیرهاتەوە کەوتە خەیاڵ و بیرکردنەوە.

## بیست

ڤرۆنسکی بەم هۆیە زۆر بەختەوەر بوو کە یاسا و رێوشوێنێکی بۆ خۆی دانابوو و بە یارمەتیی ئەوان زۆر روون و بە بڕشتانە دیاریی دەکرد کە چ کارێك بکات و چ کارێك نەکات. ئەو رێوشوێنانە دەسەڵاتیان بەسەر جەغزێکی چکۆڵەی ئیش و مەسەلەکاندا هەبوو بەڵام دەسەڵاتەکەیان مسۆگەر بوو و ڤرۆنسکی کە کاری بەسەر ئەو مەسەلانەی دەرەوەی جەغزەکەوە نەبوو، هەرگیز بۆ کارێکی شیاو کە دەبوو بیکات تووشی دڕدۆنگی نەدەبوو. ئەو رێوشوێنانە بێ ئەوەی رێیەك بۆ دوودڵی و ڕاڕایی بهێڵنەوە دەستنیشانیان دەکرد کە قەرزی قوماربازە گزیکارەکە دەبێ بدرێتەوە بەڵام حیسابی

بەرگدروو پەلەی ناوێ یان درۆکردن لەگەڵ پیاوان جوان نییە بەڵام لەگەڵ ژنان قەیدێ ناکات، یان نابێ هیچ کەس هەڵخەڵەتێنێ، بەڵام فریودانی مێرد کارێکی نەشیاو نییە یان سووکایەتی پێکران بۆ ئەوە نابێ سزای بۆ دانەنرێ، بەڵام سووکایەتی کردن بە خەڵك قەیدێ ناکات و لەو جۆرە شتانە... ئەم رێوشوێنانە رەنگبوو ناماقووڵ و نەشیاو بن بەڵام پتەوی و خۆڕاگرییان شکی تێدا نەبوو، ڤرۆنسکی بە لەبەرچاوگرتنی ئەوانە هەستی دەکرد کە دڵحەساوەیە و جێی خۆیەتی سەربەرز بێ. تەنیا لەم دواییانەدا سەبارەت بە پێوەندیی لەگەڵ ئانا وردە وردە هەستی دەکرد کە ئەو یاسا و رێوشوێنەی دایناوە هەموو مەرجەکانی بە روونی و بە جوانی لەخۆ نەگرتووە و لە داهاتوودا کێشە و گرفت و دردۆنگیی بۆ سازدەبێ کە ئیتر بۆ روونکردنەوەی ئەوانە رێنما و دەروویێك نادۆزێتەوە.

پێوەندی ئێستای لەگەڵ ئانا و مێردەکەی بۆ ئەو زۆر روون و سانا بوو. ئەو پێوەندییانە لە یاسا و رێوشوێنە رێنماکەی ئەودا بە روونی و بە وردی لەبەر چاو گیرابوون.

ئانا ژنێکی بەرێز و بەشەرف بوو و دڵی پێدابوو و خۆشی دەویست، هەر بەو هۆیەش لەبەر چاوی ئەو شایانی زیاترین رێز بوو، تەنانەت زیاتر لەو کەسەش بوو کە ئەو بە شایانی ئەوەی بزانێ کە ببێتە هاوسەری یاسایی خۆی. ئامادەبوو دەستی لە بندا ببڕن بەڵام ئیجازە نەدا بە وشەیەك یان تەنانەت تەشەر و توانجێك ئازاری بدەن، یان لە گوڵ کاڵتری پێبڵێن. چونکە لەلای ئەو لە هەموو ئەو ژنانە بەرێز و شیاوتر بوو کە خۆیان بە شایانی ئەوە دەزانن کە رێزیان لێ بگیرێت.

پێوەندی لەگەڵ کۆمەڵگای نەجیمزادانیش روون و ئاشکرا بوو. هەموو ئازاد بوون کە نهێنی ئەو بزانن یان گومانی لێبکەن، بەڵام هیچ کەس نەدەبوو ئیجازە بەخۆی بدات کە سەبارەت بەوان قسە بکا. ئەگەرچی کەسێك قسەی بکردبایە ئەو ئامادەبوو دەمی ئەو کەسە ببەستێ و ناچاری بکات کە ئابڕووی تکاوی ژنێك کە ئەو خوشی دەوێت بپارێزێ و رێزی بۆ دابنێت.

پێوەندیی لەگەڵ مێردەکەی ئانا لە هەمووی رۆشنتر بوو. هەر لەو کاتەوە کە ئانا دڵی پێدا، ئەو بە هەقی دەزانی کە حەز لە ئانا بکات و خۆشی بوێ، مێردەکەشی بە ماکێکی زیادی دەزانی و بە ملۆزمی خۆیانی دێنایە ئەژمار. مێردەکەی ئانا تووشی بارودۆخێکی تاڵ و نالەبار هاتبوو. بەڵام هیچی لە دەست نەدەهات. کارنین هیچ هەقێکی نەبوو جگە لەوەی چەك بە دەستەوە بگرێ و پارێزگاری لە ئابڕووی خۆی بکات، ڤرۆنسکیش هەر لە سەرەتاوە ئامادەبوو کە لەو گۆڕەپانەدا ململانێی لەگەڵ بکات.

بەڵام لەم دواییانەدا پێوەندییەکی دەروونی و تازە لە نێوان ئەو و ئانادا وەدی هاتبوو کە بە تەمومژاوی بوونی خۆی ترسی خستبووە دڵییەوە. رۆژێك لەمەوبەر بوو کە ئانا هەواڵی

دووگیان بوونی خۆی پێڕاگەیاندبوو و ئەویش هەستی کردبوو کە ئەو هەواڵە و چاوەڕوانیی ئانا لە ئەو، پێویستی و دەروەستبوونێك بوو کە لە کۆمەڵە ڕێسای ڕێنوێنییەکانی ژیانیدا ڕەچاوی نەکردبوو. بەڕاستی غافڵگیر بووبوو و کاتێك ئانا ئەو ڕازەی لەلا درکاند، ئەو گوێی لە هاواری دڵی خۆی بوو کە دەبێ ئانا حاشا لە مێردەکەی بکات و دەستی لێ بەربدات. ئەو هاوارەکەی دڵی خۆی بە ئانا گوت. بەڵام ئێستا کە بە وردی مەسەلەکەی لێکدەدایەوە و هەڵێدەسەنگاند بە ڕوونی دەیدی کە واباشترە وازی لێبێنێ و لەگەڵ ئەوەشدا بەو ئاکامە گەیشت و لە دڵی خۆیدا گوتی ئەو فیکرە بڵێی نەشیاو نەبێ؟

«کاتێك پێیدەڵێم دەست لە مێردەکەت بەردە مانای ئەوەیە کە پێشنیارم پێکردووە شوو بکات بە من. یانی من ئامادەیی ئەوەم هەیە ژیانی هاوبەشی لەگەڵ پێکبهێنم؟ کاتێك من ئەسپێ لە گیرفانمدا سەوزەڵێ دەڵێ چۆن دەمهەوێ حاشای پێبکەم لە مێردەکەی؟ وای دانێین کە کێشە و گرفتی پارەم چارەسەر کرد، چۆن دەتوانم هەتا ئەو کاتەی لە چوارچێوەی نیزامی ئەرتەشدام، دەستی بگرم و هەڵیگرم؟ کاتێك ئەو پێشنیارەی پێدەکەم دەبێ بۆ ئەو کارە ئامادەبم. یانی پارەم هەبێ و واز لە خزمەتی ئەرتەش بهێنم.»

چووە فیکرەوە. ئەو پرسیارە کە واز لە خزمەتی ئەرتەش بهێنێ یان نەهێنێ ئەوی بەرەو مەسەلەیەکی تر ڕاکێشا کە مەحرەمانە بوو و لەخۆی زیاتر هیچ کەس خەبەری لێینەبوو. دەکرێ بڵێین گرینگترین و هەڵبەت شاراوەترین مەسەلەی ژیانی بوو.

ئەو مەسەلەیەش گەیشتن بوو بە خولیای منداڵی و گەنجێتی، خولیایەك کە خۆی دانی پێدا نەدەنا بەڵام هێندە بەهێز بوو لە ناخیدا کە ئێستا تەنانەت لەگەڵ ئەوینەکەیدا ململانێی دەکرد. یەکەم هەنگاوەکانی لە بواری کۆمەڵگا و خزمەتی ئەرتەشدا زۆر سەرکەوتوانە بوو، بەڵام دوو ساڵ لەمەوبەر هەڵەیەکی گەورەی کردبوو. ویستبووی بە ئازادییەکی تەواوەوە لە بواری خزمەتدا بڕواتە پێشێ و پلەیەك کە پێشنیاریان پێکردبوو ڕەتی کردبۆوە و پێیوابوو ئەو بەسووکزانینەی پلەوپایە ڕێز و قەدری دەباتە سەرێ، بەڵام کارەکەی وەك فیز و قۆڕەدەماخی چاوی لێکرا و وەدوا کەوت. بەو شێوەیە ناچاربوو وەك ئەفسەرێکی ئاسایی لە ئەرتەشدا خزمەت بکات و ئەو ڕێگایەشی بە وردی و زیرەکی درێژە پێدا و کردەوەی جۆرێك بوو کە نیشانی دەدا زویر نییە و قینی کەسیشی لە دڵدا نییە، ئاواتیشی تەنیا ئەوەیە بە ئاسوودەیی ژیان ڕابوێرێ. چونکە هەموو کاتەکانی خۆی بە خۆشی ڕادەبوارد، هەستی دەکرد کە وردە وردە خەریکە وەك کەسێکی لێدێ، کە حەزی لە هیچ شتێك نییە و دەوروبەرییەکانی پێیانوایە

هیچی ناویّ و تەنیا دەخوازیّ وەك لاویّکی ئاکارجوان و رووخۆش چاوی لیّبکەن. پیّوەندیی لەگەلّ ئانا کارنینا کە لە هەموو شویّنیّك دەنگی دابۆوە و بووبووە بنیّشتەخۆشکەی سەرزاران و سەرنجی هەمووانی بۆ لای ئەو راکیّشابوو، وایلیّکردبوو کە گڕی ئەو حەزە دەروونییەی واتە ناوبانگ دەرکردن لە ناخیدا دامرکیّتەوە. بەلاّم ژیلەمۆی ئەو ناوبانگخوازییە لە حەوتوویێك لەمەوبەرەوە دیسان گەشابۆوە و خەریکبوو لە دلّیدا بلّیسەی دەکیّشا و سیّرپووخۆڤسکۆی[139] هاوڕێی دەورانی منداڵیی، کە لە کۆمەلّگادا لەگەلّ ئەوان هاوشان و لە باری مالّی و سامانیشەوە لەگەلّ ئەو بەرانبەر بوو، هاوقەتاریّك بوو کە لە سالّیّکدا پیّکەوە لە فیّرگەی ئەرتەش هاتبوونە دەریّ و لە پۆل و بواری وەرزش و هاروهاجی و هەروەها لە خولیای ناو و پلەوپایەدا لەگەلّیدا رقەبەرایەتیی دەکرد، تازە لە ئەرك و کاروباری ئاسیای ناوەندی گەڕابۆوە و لەویّ دوو دەرەجە و میدالیای وەرگرتبوو کە زۆر بە دەگمەن دەدران بە ژینراڵیّکی گەنجی[140] وەك ئەو. هەر لە سەرەتای هاتنەوەی بۆ پترزبۆرگ بە جۆریّك باسیان دەکرد کە دەتگوت ئەستیّرەی گەلاویّژە و تازە هەلاّتووە. هاوڕیّ و هاوتەمەن و رەقیبی قوتابخانە و گۆڕەپانی یاری و هاروهاجییەکانی ئیّستا بووبووە ژینراڵ و لەوانە بوو پلەوپایەیەکی پیّبدریّ کە لە بواری کاروباری ئیمپراتۆریدا کاریگەری هەبیّ، کەچی ڤرۆنسکی، ئەگەرچی ئەفسەریّکی ئازاد و لە هەموو لایەنیّکەوە دیار و لەبەر چاوان بوو و هەروەها خۆشەویستی ژنیّکی جوان و دلّڕفیّن بوو، بەلاّم تەنیا ئەفسەریّکی سوارە بوو و لە بواری پیّشکەوتن و پلەوپایە وەدەست هیّنان وەلانرابوو تاکوو ئازاد بیّ و هەرچی پیّی خۆشە بیکات. لە دلّی خۆیدا گوتی «لیّمڕوونە ئیّرەیی بە سیّرپووخۆڤسکۆی نابەم و ناتوانم بیبەم بەلاّم پیّشکەوتنی ئەو نیشان دەدا کە دەبیّ پەلە نەکەم و پلەوپایەی داهاتووی منیش لە بواری سەربازیدا دوورنییە کە بەمزووانە دەستنیشان بکریّ. سیّ سالّ لەمەوبەر و لەم بارودۆخەی ئیّستای مندا بوو. ئەگەر ئیّستا واز لە خزمەتی ئەرتەش بهیّنم دەرگای سەرکەوتنەکان لە خۆم دادەخەم، ئەگەر لە خزمەتی ئەرتەشدا بمیّنمەوە هیچ شتیّك لەدەست نادەم. ئانا دەیگوت کە حەز ناکات گۆڕانیّك لە بارودۆخی ژیانیدا بەدی بیّنیّ. من کە ئەشق و خۆشەویستی ئەوم هەیە، ئیتر ئیّرەییبردن بە سیرپووخۆڤسکۆی زۆر کاریّکی نابەجیّیە.» بە ئەسپایی سمیّلّی خۆی بادا، لە پشت میّزەکە

139- Serpoukhovskoy

١٤٠- ئاماژەیە بە خاناتخیوە کە سالّی ١٨٣٧ بە سەرکەوتنی ژینراڵ کاوفمین خرایە سەر خاکی ڕووسیا.

هەستاو لە نێو ژوورەکەدا دەستیکرد بە پیاسەکردن. چاوانی گەشگەش دەبریسکانەوە و هەستی بە ئاسوودەیی و خۆڕاگری و نەشەیەك دەکرد کە هەمیشە دوای روونبوونەوەی بارودۆخی ژیانی سەرتاپای دادەگرت. هەمووشتێك لەبەرچاوی وەك ئەو کاتەی کە دوایین جار حیساب و کیتابەکانی روونکردبۆوە گەش و رووناك بوو.

## بیست و یەك

پتریتسکی گوتی: هاتووم بەدوای تۆدا. حیسابو کیتابەکانت چەندەی خایاند! چاکە ئاخری تەواوت کرد؟

ڤرۆنسکی وەڵامیدایەوە: بەڵێ تەواوم کرد ـ کە ئەوەی گوت ترووسکەی پێکەنینێك لە چاویدا درەوشایەوە و سمێڵی بە ئەسپایی بادا و دەتگوت دوای ئەو تەکووزی و نەزمەی کە لە کارەکانیدا پێکیهێنابوو هەرچەشنە جووڵان و بزوتنێکی توند و بەهێز لەوانەیە ئەو نەزمە تێك بدات.

پتریتسکی گوتی: تۆ هەمیشە دوای ئەم سەرحیساب بوون و پێداچوونەوەیە وەك ئەوە وایە کە لە گەرماو هاتبێتییە دەرێ. من لەلای گرتیسکاوە هاتووم (ئەوە بەرناڤێك بوو کە بەسەر فەرماندەی لیواکەیداندا بڕیبوو) هەموو چاوەڕێتن.

ڤرۆنسکی وەڵامی نەدایەوە و چاوی لە چاوی بڕی. خەیاڵی لە جێیەکی تر بوو.

گوێی بۆ دەنگی ئاشنای ئەو ئامێرە بادی و مسینانە راگرتبوو کە والْس و پۆلکایان دەژەنی و لە سەربازگەوە دەنگی دەگەیشتە ئەوێ، پرسیی: ئەوە چ خەبەرە؟

ـ جێژنیان بۆ سێرپووخۆڤسکۆی گرتووە.

ڤرۆنسکی گوتی: سەیرە، نەمدەزانی.

ترووسکەی پێکەنین زیاتر لە چاوانیدا درەوشایەوە.

ڤرۆنسکی کە بەخۆی سەلماندبوو بەهۆی ئەشقی ئاناوە بەوپەڕی بەختەوەری گەیشتووە، ناو و پلەوپایەی فیدای ئەوین کردبوو، یان لانیکەم گێڕانی ئەو رۆڵەی وەئەستۆ گرتبوو و ئیتر نەیدەتوانی ئێرەیی بە سێرپووخۆڤسکۆی بەرێت و لەوەی کە هاوڕێی دێرینی هاتبوو بۆ سەربازگەکە و ئەو نەچووبوو بۆ دیدەنیی زۆر دڵگران بوو. سێرپووخۆڤسکۆی هاوڕێی یەکدڵ و یەگرەنگی بوو بۆیە ڤرۆنسکی زۆر شاد و دڵخۆش بوو.

ـ ئای، چەندە خۆشحاڵم.

دێمین[١٤١]، فەرماندەی سەربازگە لە ماڵی ئەربابیدا نیشتەجێبوو. هەموو میوانەکان لەبەر هەیوانە بەرفرەوان و نەوییەکە کۆ بووبوونەوە. یەکەم شت کە لە دەرەوەی ماڵەکە سەرنجی ڤرۆنسکیی راکێشا سەربازانی گرووپی مۆزیك بوون کە بە ئێلەگی سپییەوە لە دەوری بانکەیەکی پڕ لە ڤۆدکا کۆ بووبوونەوە و فەرماندەکەشیان بە روخساری گەش و روویێکی خۆشەوە لە نێو ئەفسەرەکاندا راوەستابوو. فەرماندە بەسەر پلیکانی یەکەمی هەیوانەکەدا هاتە پێشێ و دەنگی بەرزکردەوە و زایەڵەی دەنگی وەسەر کۆڕی مۆزیکەکە کەوت کە چوار زەربییەکیان لە کارەکانی ئۆفنباخ دەژنی، دەستێکی بۆ لای سەربازانی بە ریزکراو هەڵێنا و فەرمانی پێدان. سەبازەکان لەگەڵ بەرپرسی دەستەکەیان و تاقمێکی تر ئەفسەر و دەرەجەدار لەگەڵ ڤرۆنسکی لە پلیکانەکان نزیکبووەوە، فەرماندە گەڕایەوە بۆ لای مێزەکە و پەرداخێکی هەڵگرت و هاتەوە بۆسەر پلیکانەکان و دەنگی هەڵێنا: بەخۆشیی هاوڕێی دێرین و ژینڕاڵی بوێر و ئازا سێرپووخۆڤسکۆی، هوڕڕا!

سێرپووخۆڤسکۆی، دەم بە پێکەنین و دەست بە پەرداخەوە بە دوای فەرماندەدا هاتە پێشێ و رووی کردە ئوستوارێکی سوورهوولی بەدەماخ کە بەرەوڕووی راوەستابوو و بەرپرسی دەستەی دووهەمی سەربازان بوو، گوتی: باندرانکۆڤ، تۆ رۆژ لەگەڵ رۆژ حجێڵتر دەبیتەوە.

ڤرۆنسکی سێ ساڵ بوو سێرپووخۆڤسکۆی نەدیتبوو. روخساری بەو ریشەی سەر لاجانگییەوە، پیاوانەتری دەنواند، لەگەڵ ئەوەشدا قەڵافەتی وەك رابردوو رێکوپێك و لەبار بوو. زۆر جوانچاك نەبوو بەڵام لەسەرەخۆیی و حەیابەخۆییەکەی سەرنجڕاکێش بوو، بەڵام روخساری گۆڕانێکی بەسەردا هاتبوو کە ڤرۆنسکی لەڕێوە تێگەیشت، ئەویش ئەو گەشاوەیی و نەرمییە بەردەوامە بوو کە لە سیمای کەسانێکدا وەدی دێ کە لە ژیاندا سەرکەوتوون و لێیان روونە کە دەوروبەرییەکانیش بە سەرکەوتوویان دەزانن. ڤرۆنسکی ئەو گەشاوییەی بۆ دەرکەوت و لەڕێوە ئەوەی لە روخساری سێرپووخۆڤسکۆیدا دۆزییەوە.

سێرپووخۆڤسکۆی لە پلیکانەکاندا هاتە خوارێ چاوی بە ڤرۆنسکی کەوت و بزەیەکی پڕ لە شادی روخساری گەشاندەوە. سەری تۆزێ بەرزکردەوە و پەرداخەکەی هەڵێنا و سڵاوی لە ڤرۆنسکی کرد و بەو کارە نیشانیدا کە ناتوانێ سەرەتا نەچێ بۆ لای ئەو ئوستوارە کە هەروا راست چەقیبوو و لێوانی ئامادەکردبوو بۆ ماچکردنی.

---

141- Demin

فەرماندەی سەربازگەکە رووی قسەی لە ڤرۆنسکی کرد و بە دەنگی بەرز گوتی: زۆرم پێخۆشە هاتی. یاشڤین پێیگوتم کە دڵتەنگی و حاڵت باش نییە.

سێرپووخۆڤسکۆی لێوانی تەڕ و ناسکی ئوستوارە بە نەشەکەی ماچکرد و لێوانی خۆی بە دەسرەکەی سڕی و رۆیشت بۆ لای ڤرۆنسکی.

دەستی بە گەرمی گوشی و بردی بۆ سووچێك و گوتی: دەی، چۆنی؟ زۆرم پێخۆشە چاوم پێتکەوت.

فەرماندەی سەربازخانە ئاماژەی بە ڤرۆنسکی کرد و بە دەنگی بەرز بە یاشڤینی گوت: میوانداریی لێبکەن ـ خۆشی رۆیشت بۆ لای سەربازەکان لە خوارەوە.

ڤرۆنسکی سەری بۆ لای سێرپووخۆڤسکۆی سووڕاند و گوتی: بۆ دوێنێ نەهاتی بۆ کێبەرکێکە؟ پێم وابوو لەوێ دەتبینم.

ـ هاتم، بەڵام درەنگ گەیشتمێ ـ پاشان گوتیشی: داوای لێبوردن دەکەم ـ رووی لە ئاجودانەکەی خۆی کرد و گوتی: وەرە، دەستوور بدە ئەوە بەسەر کوڕەکاندا دابەش بکەن.

بەپەلە سێ گەڵای سەد رۆبڵیی لە جزدانەکەی دەرهێنا دایە دەستی و سوورهەڵگەڕا، یاشڤین پرسیی: ڤرۆنسکی، حەزدەکەی شتێك بخۆی و لێوێك تەڕکەیەوە؟ هێی، خواردن بۆ کۆنت بێنن، هانێ ئەو پەرداخە بگرە و مەیلی بکە.

مەی نۆشین لە ماڵی فەرماندەی سەربازخانە ماوەیەکی زۆری خایاند.

زۆریان خواردەوە و سێرپووخۆڤسکۆییان بە دەستان بەرزکردەوە و هەڵیاندەدا بۆ حەوا... پاشان نۆرەی فەرماندەی سەربازخانە هات. فەرماندەش لەبەر دەمی گۆرانیبێژان و لەگەڵ پتریتسکی سەمای کرد و کە ماندووبوو هاتەدەرێ و لە سەر کورسییەك دانیشت و دەستیکرد بە بەڵگەهێنانەوە بۆ یاشڤین کە رووسیا سەرکەوتووترە لە پورۆس، بەتایبەت لە باری هێرشی سوارە نیزامەوە دەیویست پێیبسەلمێنێ. بەزمی مەینۆشینی هێندێك خاو بۆوە. سێرپووخۆڤسکۆی چووە ژوورێ و رۆیشت بۆ لای دەستشۆرییەکە تاکوو دەستی بشوا، ڤرۆنسکیش لەوێ بوو. ڤرۆنسکی ئاوی دەکرد بە سەری خۆیدا. ئێلەگەکەی لەبەری خۆی داکەندبوو و ملەتووکاوی و سوورەکەی دابووە بەر بەلۆعەکە و دەستی بە سەروملی خۆیدا دەهێنا. کە لە شۆردنەکەی بۆوە چوو لە پەنا سێرپووخۆڤسکۆی دانیشت. هەر لەوێ لە سەر کورسییەکە دەستیانکرد بە ئاخافتن و قسەکانیش بۆ هەردوو لایان زۆر خۆش و سەرنجڕاکێش بوو.

سێرپووخۆڤسکۆی گوتی: ژنەکەم هەواڵەکانی تۆی پێڕاگەیاندم. زۆر خۆشحاڵم کە زوو زوو دیدەنیت دەکرد.

ڤرۆنسکی بە پێکەنینەوە گوتی: ئەو لەگەڵ ڤاریا دەستە خوشکە. ئەو دوو ژنە تەنیا کەسانێکن لە نێو ژنانی پترزبۆرگدا کە من چێژ لە ئاخافتن و قسەکردن لەگەڵیان وەردەگرم ـ پێکەنینەکەشی بۆ ئەوەبوو پێشبینی دەکرد کە ئاخافتنەکەیان بە کوێ دەگات. بۆیە شاد و دڵخۆش بوو.

سێرپووخۆڤسکۆی بە پێکەنینەوە پرسیی: هەر ئەوە، ها؟

ڤرۆنسکی تۆزێ گرژ بوو و گوێی بە کینایەکەی نەدا و بۆ ئەوەی لەوە زیاتر درێژە نەکێشێ گوتی: بەڵێ، منیش لە تۆ بێخەبەر نەبووم بەڵام نەك هەر لە رێگای ژنەکەتەوە، زۆر خۆشحاڵم کە ئەو سەرکەوتنانەت وەدەست هێناوە و پێشم سەیر نییە چونکە بەڕاستی شایانی ئەو پلەوپایە بەرزانە هەی و لەوانەم زیاتر چاوەڕوانی لێت هەبوو.

سێرپووخۆڤسکۆی زەردەیەکی گرت. دیاربوو بە بیروڕای هاوڕێکەی سەبارەت بە خۆی دڵشادە و بە پێویستی نەزانی شادییەکەی خۆی بشارێتەوە.

ـ بەڵام من بە پێچەوانە، راست و رەوان ددانی پێدا دەنێم کە چاوەڕوانیی ئەوەم نەبوو، بەڵام خۆشحاڵم، زۆریش خۆشحاڵم. من بەرژەوەندخوازم و دان بەو کەمایەسییە رۆحییەی خۆمدا دەنێم.

ڤرۆنسکی گوتی: ئەگەر سەرکەوتوو نەبوایەی رەنگبوو ددانی پێدا نەنێی.

سێرپووخۆڤسکۆی دیسان پێکەنی و گوتی: پێموانییە. ناڵێم ژیان بە بێسەرکەوتن بایی زەحمەتەکەی نابێ، بەڵام زۆریش ناخۆشە. لەوانەیە بە هەڵە چووبێتم. بەڵام پێموایە لە بواری ئەو کارەدا کە بۆ خۆمم هەڵبژاردووە توانایيم هەیە ـ لە کاتێکدا کە چاوی بە هۆی ئاگاداری لە سەرکەوتنەکانی بریقەی دەهات گوتیشی: پێموایە ئەگەر دەسەڵات، هەر دەسەڵاتێکم هەبێ، چاکتر لەوەیە کە لە دەست زۆربەی ئەو خاوەن دەسەڵاتانەدا بێ کە دەیانناسم. بۆیە هەرچەندێك لە رێگای وەدەستهێنانی دەسەڵاتدا بڕۆمە پێشێ دڵخۆشترم.

ڤرۆنسکی گوتی: رەنگە ئەو قسەیە بۆ تۆ راست بێ بەڵام بۆ هەمیشە باش نییە. من هەر وام بیردەکردەوە، بەڵام ئێستا بە مرووری زەمان بۆم دەرکەوتوە کە بایەخی ژیان تەنیا بۆ وەدەستهێنانی دەسەڵات نییە.

سێرپووخۆڤسکۆی بە پێکەنینەوە گوتی: هەی بژی! منیش هەر ئەو کارەی کە بیستبووم تۆ کردووتە قۆڵم لێهەڵماڵی، مەبەستم ئەو پلەیەیە کە بە تۆیان پێشنیار کرد. هەڵبەت کارەکەم پەسند کرد، بەڵام هەر کارێك رێگایەکی هەیە، پێموایە کارەکەی تۆ لە بنەڕەتدا باش بوو بەڵام بەرێوجێ ئەنجامت نەدا.

ـ ئەوە کارێکە کە کراوە و خۆشت دەزانی من هیچ کاتێك پاشگەز نابمەوە لەو ڕێگایەی کە گرتومەتە بەر. جگە لەوەش قەت لەو کارەی دەیکەم پەشیمان نابمەوە.

ـ چاکتر، بەڵام ئەوە شتێکی کاتییە، ئەو ژیانە ڕازیت ناکات. من سەبارەت بە براکەت ئەو قسەیە ناکەم. ئەو کوڕێکی لە دڵا شیرینە ـ گوێی بۆ دەنگی هوڕڕایەك ڕاگرت کە کێشایان و پاشان گوتی: ڕاست وەك ئەم میواندارەمان. ئەوەتا، گوێت لێیە؟ ئەویش شاد و ڕازییە، بەڵام ئەو ژیانە بۆ ڕازی کردنی تۆ کافی نییە.

ـ من ناڵێم ڕازیم ناکات.

ـ خۆ مەسەلەش هەر ئەوە نییە. کەسانێکی وەك تۆ پێویستن.

ـ بۆچی پێویستن؟

ـ بۆچی؟ بۆ کۆمەڵگا. ڕووسیا پێویستی بە کەسانێکی وەك تۆ و حیزبێك هەیە. ئەگەر وانەبێ هەموو شتێك لە نێو دەچێ.

ـ مەبەستت چییە؟ حیزبی بێرتێنێڤ[١٤٢] لە هەمبەر کومۆنیستەکاندا؟

سێرپووخۆڤسکۆی کە دیتی بەو وڕێنەیە ئەوی تووشی گومان کردووە نێوچاوانی تێکنا و بە زمانی فەڕەنسی گوتی: نا، ***ئەوە هەمووی قۆڕیاتە،*** ئەو ماجەرایە هەمیشە بووە و دوای ئەوەش هەمیشە هەر دەبێ. لێرە کومۆنیستێك لە گۆڕێدا نییە. بەڵام پیلانگێڕان هەمیشە هێزێکی خراپکار و مەترسیدار و کۆنەپەرەست دادەهێنن. ئەوەش دەهۆیەکی کۆن و لەمێژینەیە. نا، ئەوەی پێویستە حیزبی جوامێرانە. کەسانێکی وەك من و تۆ.

ـ بەڵام ئاخر بۆچی؟ ـ ڤرۆنسکی ناوی چەند کەس لە دەسەڵاتدارانی هێنا و گوتی: بۆچی ئەوانە بە ئازاد نازانی؟

ـ تەنیا لەبەرئەوەی ئەوانە خاوەنی جوامێری پێویست نین، یان جوامێری هەر لە زاتیاندا نییە. ناوێکیان نییە و وەك ئێمە لە سەرچاوەی ڕووناکی و ژیان نزیك نین. شانو شکۆ نازانن چییە. دەتوانی بە پارە دڵخۆشییان بدەیەوە. بۆ ئەوەی بمێننەوە. دەبێ یاسا و ڕێسایەك بۆ خۆیان دابتاشن. بیرۆکە و یاسایەك دەدەنە دەرێ کە خۆشیان باوەڕیان پێینییە و جگە لە زەرەد هیچ ئاکامێکی نییە، تەنیا بیانوویێکە بۆ ئەوەی خانوویێکی دەوڵەتی و مووچەی زۆر و زەوەند بەدەست بهێنن. کاتێك پەتەیان دەخەنە سەر ئاو دەبینی کە کارەکەیان ***ئاوا سادە و***

---

142- Bertenev

***خۆراییە.*** ڕەنگە من لەوان خراپتر و گەمژەتر بم... ئەگەرچی تێناگەم بۆ دەبێ لەوان خراپتر بم... بەڵام من و تۆ گرینگایەتییەکمان هەیە کە ئەویش ئەوەیە ناتوانن بە ئاسانی بمانکڕن. ئەمڕۆ کەسانێکی وەك ئێمە لە هەموو سەردەمێك زیاتر بۆ وڵاتەکەمان پێویستە.

ڤرۆنسکی بە وردی گوێی ڕاگرتبوو، بەڵام مانای قسەکان زۆر نا، بەڵام هەڵسوکەوتی سێرپووخۆڤسکۆی لەگەڵ مەسەلەکە بەلایەوە سەرنجڕاکێش بوو، چونکە ئەویش ئێستا لە بیری خەباتدا بوو بە دژی دەسەڵات و لەو بوارەی ململانێدا زۆری خۆشەویستی و دوژمنایەتی هەبوو. ئێستاش بۆ ئەو، یانی ڤرۆنسکی، جگە لە خزمەت و سوارە نیزامەکەی هیچ شتێکی تر گرینگ نەبوو. ڤرۆنسکی هەروەها زانیی کە سێرپووخۆڤسکۆی بە توانایی تەواوەوە لە مەسەلەکان دەگات و بە وشیاری و دەمپاراوی، کە لە شوێنی ژیان و خزمەتەکەیدا دەگمەن بوو، دەیتوانی ببێتە خاوەنی دەسەڵاتێکی زۆر، ئەگەرچی بەلایەوە شوورەییش بوو، کەچی ئێرەیی پێدەبرد.

وەڵامی دایەوە: هەرچۆنێك بێ بۆ چوونە مەیدان شتێکی گرینگ هەیە کە من نیمە و ئەویش حەزی دەسەڵاتە. ئەوە زەمانێك لە دڵمدا بوو بەڵام ئێستا ئاسەواری نەماوە.

سێرپووخۆڤسکۆی بە پێکەنینەوە گوتی: داوای لێبوردن دەکەم، بەڵام ئەوەی دەیڵێی ڕاست نییە.

ـ نا، بەڕاستمە، هەقیقەتێکی حاشا هەڵنەگرە ـ بۆ ئەوەی سەداقەتی خۆی نیشان بدات گوتیشی: لانیکەم ئێستا...

ـ بەڵێ، ڕاست دەکەی. «ئێستا». بەڵام ئەو ئێستایە هەمیشە نابێ.

ڤرۆنسکی وەڵامی دایەوە: ڕەنگە.

سێرپووخۆڤسکۆی وەك ئەوەی فیکری ئەوی خوێندبێتەوە گوتی: تۆ دەڵێی «ڕەنگە» بەڵام من پێتدەڵێم «حەتمەن». منیش هەر بۆ ئەوە دەمویست چاوم پێتبکەوێ. تۆ کارێکت کرد کە دەبوو بتکردبایە. لەوە باش تێدەگەم. بەڵام نابێ سەرسەختی بنوێنی. من لە تۆم دەوێ ئەو ئیختیارەم پێبدەی کە لە نەبوونیشدا بەجێی تۆ بڕیاربدەم. من نامەوێ باڵت وەسەر بکێشم... ئەگەرچی، بۆ باڵت وەسەر نەکێشم؟ تۆ ئەو هەمووەت پشتیوانی لە من کردووە. هیوادارم دۆستایەتیمان زۆر گەرموگوڕتر لەو قسانە بێ ـ ئەوەی گوت و بە نەرمی و دڵۆڤانی گرژییەوە. درێژەی بە قسەکانیدا: بەڵێ. ئەو ئیختیارەم بدەیە و واز لە خزمەتی ئەرتەش بهێنە و من بێ ئەوەی هیچ کەس بزانێ دەتبەم بولای خۆم.

ڤرۆنسکی گوتی: بەڵام ئاخر هەوڵ بدە تێبگەی. من پێویستم بە هیچ نییە. تەنیا دەمەوێ هەموو شتێك وەك رابردوو بڕواتە پێشێ.

سێرپووخۆڤسکۆی هەستا و بەرەو رووی راوەستا.

ـ گوتت هەموو شتێك وەك رابردوو بێ. من لە مانای ئەو قسەیە دەگەم، بەڵام گوێ بگرە، من و تۆ هاوتەمەنین. رەنگە تاقمی ئەو ژنانەی کە تۆ دەیانناسی زۆر لە من زیاتر بێ... سێرپووخۆڤسکۆی بە زەردەخەنە و بزواندنی دەست و چاو دەیویست بە ڤرۆنسکی بڵێ کە نابێ ترسی لە دڵدا بێ و ئەویش بە نەرمی و پارێزەوە لە خاڵە بەژان و تاڵەکەی نزیکە دەبێتەوە . .... بەڵام من ژنم هەیە، باوەڕ بکە نازانم کام نووسەرە دەڵێ: کاتێك تەنیا ژنەکەی خۆت کە خۆشت دەوێ، بە باشی بناسی، تەواوی ژنان لەو کەسە باشتر دەناسی کە هەزاران ژن دەناسێ.

ڤرۆنسکی رووی قسەی لەو ئەفسەرە بوو کە چاوێکی لە نێو دستشۆرییەکە کرد و ئەوانی بانگکرد بۆ لای فەرماندەی سەربازخانەکە، دەنگی هەڵێنا: باشە هەر ئێستا دێین.

ڤرۆنسکی ئێستا حەزی دەکرد هەتا کۆتایی گوێ بۆ قسەکانی شل بکات و بزانێ چیی تری پێدەڵێ.

ـ بڕوانە، من بڕوام وایە، ژن گەورەترین کۆسپە لە رێگای پیاودا بۆ گەیشتن بە دەسەڵات و پێشکەوتن. خۆشویستنی ژنێك و لەگەڵ ئەویشدا سەرکەوتن لە کارێکدا زۆر دژوارە. بۆ کارکردن و بە ئاسوودەیی و بە بێکۆسپ و لەمپەر ئەشقێنی کردن تەنیا رێگایەك هەیە و ئەویش پێکهێنانی ژیانی هاوبەشە ـ سێرپووخۆڤسکۆی کە زۆری حەز لە هێنانەوەی پەند و نەقڵ بوو گوتی: چۆن... چۆن فیکری خۆمت بۆ روون بکەمەوە؟ راوەستە، پەلەمەکە، بەڵێ، وایدانێ بارێکت لە سەر شانە، تەنیا کاتێك دەتوانی بە دەستت کار بکەی کە بارەکەت توند لە پشتت بەستبێ. ئەویش ژیانی هاوبەشە. من کاتێك هەستم بەو راستییە کرد کە ژنم هێنا. لە پڕ دەستوباڵم ئازاد بوون. بەڵام ئەگەر بتهەوێ بەبێ ژنهێنان ئەو بارە هەڵگری دەستوباڵت وادەبەسترێ کە هیچ کارێکت پێناکرێ. چاو لە مازانکۆڤ و کرۆپۆڤ بکە. ئەوان کار و ژیانی خۆیان لە سەر ژن دانا و زایەیان کرد.

ڤرۆنسکی ژنە ئەکتەر و ژنە فەرەنسییەك کە گراوی ئەو دوو کەسە بوون هاتنەوە بیری و گوتی: دەبێ بزانی ژنەکەش کێبێ.

ـ ئەگەر ژنێکی ماقووڵ و سەرەژنیش بێ ئەوە خراپتر. هەرچەندە بارودۆخی ژن لە کۆمەڵگادا قایمتر و پلەوپایەی بەرزتر بێ پیاو زیاتر تووشی تەنگوچەڵەمە دەبێ. راست وەك ئەوە وایە نەك هەر بارەکە لە کۆڵ بنێی بەڵکوو بتهەوێ لە چنگ کەسێکی تری دەربێنی.

ڤرۆنسکی چاوی لە پێش خۆی بڕیبوو و بیری لە ئانا دەرکردەوە، گوتی: تۆ قەت کەست خۆش نەویستووە.

ـ ڕەنگە هەق بە تۆ بێ، بەڵام ئەو قسانەی منت لەبیرنەچێ. ئەوەشت لەبیربێ کە ژنان زۆر پووڵەکیترن لە پیاوان. ئێمە بە عەشق کێوێکی بەرز ساز دەکەین، بەڵام ئەوان زۆر ساکار و ئاسایی چاوی لێدەکەن.

ڕووی لەو پێشخزمەتە کرد کە هاتبووە ژوورێ و گوتی: ئێستا، ئێستا ـ بەڵام بە پێچەوانەی بۆچوونی ئەو پێشخزمەت نەهاتبوو کە دیسان بانگیان بکات بۆ کۆڕەکە، بەڵکوو یادداشتێکی بۆ ڤرۆنسکی هێنابوو.

ـ ئەوە خزمەتکارەکەی پرێنسس تۆرسکایا بۆ ئێوەی هێناوە.

ڤرۆنسکی پاکەتەکەی هەڵپچڕی و ڕەنگی هەڵبزڕکا.

بە سێرپووخۆڤسکۆی گوت: سەرم دێشێ، دەڕۆمەوە بۆ ماڵێ.

ـ باشە، خودات لەگەڵ بێ. دەی ئیختیارەکەم دەدەیتێ؟

ـ دواتر قسەی لێدەکەین. لە پترزبۆرگ دێم بۆلات.

## بیست و دوو

نزیك سەعات شەش بوو لەبەرئەوەی ڤرۆنسکی لە کاتی خۆیدا بگاتە جێژوانەکەی و هەروەها کەڵك لە فایتوونەکەی خۆی وەرنەگرێ چونکە هەموو ئەسپەکانیان دەناسی، فایتوونەکەی یاشڤینی بە کرێ گرت و دەستووری بە فایتوونئاژۆکەدا هەتا دەتوانێ خێراتر لێخوڕێ. فایتوونێکی قەدیمی چوار کەسی و جێدار بوو. ڤرۆنسکی لە سووچێکی دانیشت و لاقی درێژ کرد بۆ سەر کورسییەکەی رووبەڕووی و چوو دەماڵی فیکرەوە.

تا رادەیەك نەزم و باری ماڵی و حسابوکیتابەکانی بۆ روون بووبۆوە و قسەکانی سێرپووخۆڤسکۆی هاوڕێی و دۆستایەتییەکەی و ئەو وتانەش کە ئەوی بە کەسێکی شیاو زانیبوو بۆ رووسیا و لە هەمووشی گرینگتر چاوەڕوانیی دیداری ئانا، هەموو تێکەڵ بووبوون و هەستێکی گەرم و پڕ لە نەشەیان لە دڵی گێڕابوو و دەتگوت باڵی گرتووە. ئەو هەستە هێندە بەهێز بوو کە بێ ئیختیار پێدەکەنی. لاقی لە سەر کورسییەکە لابرد و دەستی بە ماسوولکەی

نەرم و بەهێزی رانیدا هێنا کە رۆژی رابردوو کاتی گلانەکەی تۆزێ کوترابوو، پاشان پاڵی دایەوە و دووسێ هەناسەی قووڵی هەڵکێشا.

لە دڵی خۆیدا گوتی: «چەندە دڵخۆشم، خودایە چەندە دڵخۆشم!» ئەو لە رابردووشدا زۆر جار بە هۆی ئاگاداربوون لە تەندروستیی خۆی هەستی بە خۆشی کردبوو، بەڵام قەت وەك ئەمجارە خۆی لە لەشی خۆی نزیك هەست پێنەکردبوو و گیانی خۆی خۆش نەویستبوو. لەوەی کە ئەو ژانە هێدییەی لە ماسوولکەی بەهێزی لاقی خۆیدا هەست پێدەکرد و چێژی لە جووڵان و کرانەوە و وێکهاتنەوەی ماسوولکەکانی سینگی وەردەگرت، کاتی هەناسەکێشان زۆر شاد و بەکەیف بوو. هەر ئەو رۆژە گەرم و رووناکەی هاوین کە هەستی ناهومێدیی لە دڵی ئانادا بەدی هێنابوو دڵی وەسەر باڵی نەشە دەخست و سەروملی کە دوای مەلەکردنی کاتژمێرێك لەمەوبەر گڕ و تینی تێگەڕابوو فێنکایی پێدەبەخشی. عەتری برنانتینی کە لە سمێڵییەوە بە لووتی دەگەیشت لەو هەوا تازەیەدا زۆر خۆش و دڵبزوێن بوو. هەموو ئەو شتانە کە لە پەنجێرەی فایتوونەکەوە دەیدین، هەموویان لەو هەوا پاك و فێنکە و لەو رووناکییە کزەی ئێوارەدا وەك خۆی گەشاوە و بە نەشە و بەهێزیان دەنواند. سەربانی ماڵەکان کە زەردەپەڕی دەمەوئێوارە لێی دەدان و دەدرەوشانەوە و هێڵی راستی پاڵ لاجامەی حەسار و سەر دیواری باڵەخانە و بانجێڵەکان و تاپۆی رێبواران و ئەو فایتوون و عارەبانانەی جاروبار تێدەپەڕین و سەوزایی بێجووڵەی دارستان و سەوزەڵانی و هێڵی راستی شێوەرد و دێراوی پەتاتە و تەرەکاری، تەڕی و پاراوی و جوانییان لێدەباری. هەموو شتێك وەك دیمەنی شاکارێك کە پەرەمووچی وێنەگەرێکی شارەزا کێشابێتی و تازە تەواوبووبێ بە جوانی دەدرەوشایەوە.

ڤرۆنسکی سەری لە پەنجێرەکەوە دەرکێشا و گەڵایەکی سێ رۆبڵیی لە گیرفانی دەرهێنا و دایە دەست لێخوڕەکە کە ئاوڕی دابۆوە و بە دەنگی بەرز گوتی: خێراتر، خێراتر! ـ دەستی کابرای لێخوڕ چووە پێشەوە و لە پاڵ چرای فایتوونەکەدا شتێکی هەڵگرت و هاژەی خەرەزن هەستا و فایتوونەکە لە سەر رێگا راستەکە وەك بای شەماڵ فڕی.

چاوی لە دوگمەی سەدەفیی زەنگی نێوان دوو پەنجێرەکە کرد و ئانای ئەو جۆرەی کە دوایین جار دیتبووی هاتە بەرچاو و لە دڵی خۆیدا گوتی: «لەو شیرین کامییە زیاتر هیچم ناوێ، هیچ شتێك! هەرچی زیاتر دەخایێنێ زیاترم خۆش دەوێ. ئەوەش باخی باڵەخانەی هاوینە هەوارەکەی ڤرێدا کە دەوڵەت پێیداوە. بەڵام ئانا لەو باخەدا لە کوێیە؟ کوێ؟ چۆنی بدۆزمەوە؟ بۆلێرە قەراری ژوانی داناوە؟ بۆ لە داوێنی نامەکەی بێتسیدا پەیامی بۆ ناردووم؟» ئەو

فیکرانە تازە بە زەینییدا هاتبوو، بەڵام ئیتر کاتی بیرکردنەوە نەبوو. فایتوونەکە هێشتا نەگەیشتبووە سەر شەقامی باخەکە بە کابرای فایتوون ئاژۆی گوت راوەستێ و هێشتا رانەوەستابوو دەرگاکەی کردەوە و بازیدا خوارێ و بە تووڵەڕێی نێو باخەکەدا بەرەولای باڵەخانەکە ملی پێوەنا. ئەو ڕێگایە چۆڵوهۆڵ بوو. چاوی لەلای راست کرد و دیتی. روخساری لە ژێر تۆڕدا شاردبۆوە، بەڵام ڤرۆنسکی بە روانینێك ئاکاری تایبەتی ئەو کە تەنیا هی ئەو بوو، کەوانەی شانوملی و شێوەی هەڵێنانی سەری ناسییەوە و تروسکەی شادی لە روخساری گەڕا. وەك ئەوەی وزەی کارەبا بە لەشیدا تێپەڕیبێ، سەرتاپای خۆی بە وشیارییەکی تازەوە هەست پێکرد، هەر لە جووڵانی لاقە چالاك و بەهێزکانییەوە بگرە هەتا هەستان و نیشتنەوەی سیپەلکی کاتی هەناسەکێشان و هەروەها شتێکیش لێوانی ختیلکە دەدا.

ئانا گەیشتە لای و دەستی بە توندی گوشی.

گوتی: لەوەی کە رامکێشای بەرەو ئێرە تووڕە نەبووی؟ ناچاربووم حەتمەن قسەت لەگەڵ بکەم ـ چینی سەخت و جیددیی لێوی ئانا کە لە ژێر تۆڕەکەیەوە وەدیار کەوت لە ناکاو خولك و خووی پێگۆڕی.

ـ من تووڕە بووبێتم؟ بەڵام چۆن هاتی بۆ ئێرە؟ بۆ ئێرە؟!

ئانا دەستی لە سەر مەچەکی ڤرۆنسکی دانا و گوتی: گرینگ نییە. با بڕۆین، من دەبێ قسەت لەگەڵ بکەم.

ڤرۆنسکی تێگەیشت کە چ رووداوێك قەوماوە و ئەو دیدارە دیدارێکی خۆش نابێ، لەلای ئانا هۆش و ئیختیاری لێدەبڕا. چونکە ئاگای لە هۆی پەرێشانییەکەی ئەو نەبوو، هەستی دەکرد ئەو پەشێوییە شوێنی لە سەر ئەویش داناوە.

ڤرۆنسکی دەستی ئانای بە باسکی خۆیەوە گوشی و هەوڵیدا تاکوو ئەوەی لە زەینیدا بوو لە روخساریدا بیخوێنێتەوە، پرسیی: دەیباشە، قسە بکە، چبووە؟

ئانا چەند هەنگاوی بە بێدەنگی هەڵێنایەوە و غیرەتی کۆکردەوە. لەپڕ راوەستا و بە هەناسەبڕکێیەکی توندەوە گوتی: دوێشەو پێمنەگوتی کە.... کاتێك لەگەڵ ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ گەڕامەوە بۆ ماڵێ هەموو شتێکم پێگوت... گوتم کە ناتوانم لەگەڵیدا بژیم و.... وەلحاسڵ هەموو شتێکم پێگوت.

ڤرۆنسکی گوێی بۆ راگرتبوو و بێ ئەوەی بزانێ تەواوی ئەندامی بۆ لای پێشەوە خوار کردبۆوە، دەتگوت دەیهەوێ لەو ڕێگایەوە کێشە دەروونییەکەی ئانا هێوربکاتەوە. بەڵام

کاتێك ئانا ئەو قسەیەی کرد ڤرۆنسکی لە ناکاو قەڵافەتی ڕاست کردەوە و گرژ بوو و شوێنەواری غورروور لە ڕوخساریدا وەدیار کەوت.

گوتی: بەڵێ، بەڵێ، ئەوە باشترە. زۆریش باشە. دەزانم کە تامڵکردنی ئەو بارودۆخە چەندە بۆ تۆ دژوارە.

بەڵام ئانا گوێی لە قسەکانی نەبوو، بەڵام فیکری ئەوی لە ڕوخساریدا دەخوێندەوە. نەیدەزانی ئەو حاڵەتەی لە ڕوخساری ڤرۆنسکیدا بەدیی دەکرد بەهۆی یەکەم فیکرەوە بوو کە بە زەینی گەیشتبوو، ئەویش ناچاربوو بچێتە مەیدانی دوئێل. بەڵام ئانا بیری لە دوئێل هەر نەکردبۆوە و بەو هۆیەش ئەو حاڵەتەی ڕوخساری، کە خەریکبوو دەڕەوی لە لای خۆی بە شتێکی تر دانا.

ئانا دوای وەرگرتنی نامەی مێردەکەی لە قووڵایی گیانیدا بەو یەقینە گەیشتبوو کە هەموو شتێك وەك ڕابردووی لێدێتەوە. دەیزانی کە ئەو وزە و توانایییەی نییە کە چاوپۆشی لە دژواری کارەکە بکات و واز لە کوڕەکەی بێنێ و بڕوات بۆ لای دلّدارەکەی. هەر ئەو بەیانییەی کە لە ماڵی پرێنسس تۆرسکایا ڕایبواردبوو ئەو مانایەی بە ڕوونی پێسەلماند. لەگەڵ ئەوانەشدا ئەو ژوانە بۆ ئەو زۆر گرینگ بوو. بە هیوابوو ئەو دیدارە بارودۆخەکەی بگۆڕێ و لە دەست ئەو کێشەیە ڕزگاری بکات. ئەگەر ڤرۆنسکی بە بیستنی ئەو هەواڵە بە لەبزێکی قایم و بە عەشقێکی ئاگرینەوە و بەبێ دوودڵی پێی بگوتبایە «دەست لە هەموو شتێك هەڵگرە و ڕەدووی من بکەوە!» ئەو دەستی لە هەموو شتێك بەردەدا و لەگەڵی هەڵدەگیرا. بەڵام ئەم هەواڵە لە ڤرۆنسکیدا ئەو ڕەنگدانەوەیەی نەبوو کە چاوەڕوانی دەکرد. ڤرۆنسکی تەنیا دەتگوت شتێك زویری کردووە.

ئانا بە توندی گوتی: نا، هیچ گرفتێکم نەبوو. ئەم کارەم هەر لەخۆڕا کرد. بێ ئەوەی بیری لێبکەمەوە. هانێ... ـ نامەی مێردەکەی لە دەستکێشەکەی دەرهێنا و دای بە ڤرۆنسکی.

ڤرۆنسکی نامەکەی وەرگرت و قسەکەی ئانای بڕی و گوتی: تێدەگەم، تێدەگەم... ـ بەڵام بێ ئەوەی نامەکە بخوێنێتەوە درێژەی بە قسەکانیدا: من تەنیا ئاواتێکم هەیە و شتێکم لە تۆ دەوێ، ئەویش ئەوەیە کۆتایی بەو بارودۆخە بێنین و ئیجازەم پێبدەی ژیانی خۆم تەرخان بکەم بۆ بەختەوەریی تۆ.

ئانا گوتی: ئەوە بۆ بە من دەڵێی؟ مەگین من لەو بارەوە دەکرێ دوودڵ بم؟ ئەگەر دوودڵ بووایەم....

ڤرۆنسکی دوو ژنی پیشاندا که دەهاتن بۆ لای ئەوان و گوتی:

ئەوانە کێن؟ نەکا بمانناسن ـ بەپەلە لەگەڵ خۆیدا کێشای بۆ لای توولەڕێی باخەکە.

ئانا گوتی: ئۆو. قەیناکا. با بمانبینن، گرینگ نییە ـ لێوی دەلەرزی. ڤرۆنسکی پێیوابوو چاوانی ئانا بە گڕێکی پڕ لە رقەوە لە ژێر تۆڕەکەوە لێی دەڕوانن: پێمگوتی کە مەسەلە ئەوە نییە. ناتوانم سەبارەت بە ئەشقی تۆ دڕدۆنگ بم، بەڵام بزانە چیی نووسیوە. بیخوێنەوە! ـ دیسان راوەستا.

ڤرۆنسکی لەگەڵ خوێندنەوەی نامەکە دیسان بێ ئیختیار پێملی ئەو هەستە بوو کە یەکەم جار بە بیستنی هەواڵی دەستبەردانی ئانا لە مێردەکەی سەرتاپای داگرتبوو، هەر ئەو هەستە سروشتییەی بەرەوڕوو بوون لەگەڵ مێردی سووکایەتی پێکراو. ئێستا نامەی ئەو مێردەی بە دەستەوە بوو، بێ ئیختیار بیری لە دوئێل دەکردەوە کە بێگومان هەر ئەو شەوە یان رۆژی دوایی نامەی بانگکردنی بەدەست دەگات. هەروەها بیری لە دوئێل دەکردەوە و لەوێ هەر بەو غوروور و خۆێنساردییەوە کە لەو کاتەدا لە روخساریدا بەدی دەکرا، گوللەیەك بەرەو حەوا دەتەقێنێ و چاوەڕوانە گوللەی مێردی سووکایەتی پێکراویش سینگی ئەو بسمێ. هەر لەو کاتەشدا وەبیری ئەو قسەیەی تاوێك لەمەوبەری سێرپووخۆڤسکۆی کەوتەوە و هەر ئەو رۆژە بەیانیش بە زەینی خۆیدا تێپەڕیبوو، ئەویش ئەوەبوو کە واچاکە خۆی گیرۆدە نەکات و دەیزانی کە ناتوانێ ئەو فیکرە لەگەڵ ئانا بێنێتە گۆڕێ.

نامەکەی خوێندەوە، چاوی بەرزکردەوە و لە ئانای روانی بەڵام شوێنەواری خۆڕاگریی پێوە دیارنەبوو. ئانا تێگەیشت کە ڤرۆنسکی خۆشی پێش ئەو بیری لەو بارودۆخە کردۆتەوە. دەیزانی هەرچی بیڵێ، دەربڕینی تەواوی ئەو فیکر و خەیاڵانە نییە کە لە مێشکیدا کەڵەکە بوون. تێگەیشت کە دوایین هیواشی نابەجێ بووە. ئەوەش ئەو شتە نەبوو کە چاوەڕوانیی دەکرد.

بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی: دیتووتە مێردەکەم چ جۆرە مرۆڤێکە؟ ئەو...

ڤرۆنسکی پەڕییە نێو قسەکانی: بمبوورە، بەڵام من ئەو بارودۆخەم پێباشە... ـ بە چاوێکی پڕ لە پاڕانەوە بۆ دەرفەتێك کە قسەی دڵی بکات، درێژەی بە قسەکانیدا: تۆ خودا لێمگەڕێ با قسەکەم بکەم. خۆشحاڵیی من لەبەرئەوەیە ئەو پێشنیارەی ئەو ناگونجێ.

ئانا کە دیاربوو هەر لەو کاتەوە هیچ هەمیەتێك بە قسەکانی نادا و لە خۆی دەنووسا کە بەر بە داوەرینی فرمێسکەکانی بگرێ گوتی: بۆ ناگونجێ؟ ـ هەستی دەکرد کە چارەنووسی دیاریکراوە.

ڤرۆنسکی دەیویست بڵێ کە دوای ئەو دوئێلەی کە ناچارە قەبووڵی بکات ئیتر درێژەی ئەم بارودۆخە ناگونجێ. بەڵام شتێکی تری گوت.

ـ درێژە پێدانی ئەم بارودۆخە ناگونجێ. هێوادارم ئیتر بڕیاربدەی و دەستی لێبەردەی. هیوادارم... ـ هەستی بە شەرمەزاری کرد و سوورهەڵگەڕا: ئیجازەم پێبدە کە مشوورێکی ژیانمان بخۆم و گەلاڵەی پێویستی بۆ دابڕێژم ـ دەیویست درێژەی پێبدات: سبەینێ...

بەڵام ئانا نەیهێشت درێژە بە قسەکانی بدا. دەنگی بەرزکردەوە: ئەی کوڕەکەم چی لێبکەم؟ نەتدیوە چیی نووسیوە؟ دەبێ دەستی لێهەڵگرم. نا، ناتوانم و نامەوێ واز لە کوڕەکەم بهێنم.

ـ بەڵام تۆخودا بیری لێبکەوە. کام ڕێیان باشترە؟ دەست لە کوڕەکەت هەڵگری یان درێژە بەو بارودۆخە تاڵ و نالەبار و پڕسووکایەتییە بدەی؟

ـ بارودۆخی من بۆ کێ پڕ سووکایەتییە؟

ـ بۆ هەمووان و لە هەمووشی زیاتر بۆ خۆت.

ئانا بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی: تۆ دەڵێی بارودۆخی پڕسووکایەتیی... قسەی وامەکە. ئەو قسانە بۆ من مانایان نییە ـ حەزی نەدەکرد ڤرۆنسکی لەو کاتەدا درۆبکات. چونکە جگە لە ئەشقەکەی هیچی بۆ نەمابۆوە و دەیویست ئەوی خۆشبوێ: تۆ دەبێ بزانی لەو ڕۆژەوە کە دڵم پێدای هەموو شتێکم گۆڕاوە. بۆ من تەنیا و تەنیا شتێك بوونی هەیە و ئەویش ئەشقی تۆیە. ئەگەر منت خۆش دەوێ جێگای خۆم هێندە بەرز و ژێر پێشم هێندە قایم و پتەو دەبینم کە هیچ شتێك بۆ من تاڵ و پڕسووکایەتی نابێ. من شانازی بە ژیان و بارودۆخی خۆمەوە دەکەم، چونکە... شانازیم بۆ ئەوەیە... ڕۆح زلم.... ـ قسەکەی تەواو نەکرد و نەیگوت کە غورور و شانازییەکەی بۆ چییە. فرمێسکی شەرم و هیوابڕاوی دەنگی لە نێو خۆیدا ئەوق کرد. دیسان ڕاوەستا و دای لە قوڵپەی گریان.

ڤرۆنسکی هەستی کرد کە ئۆناقێك گەرووی ڕێك دەگوشێ و شتێك لە لووتیدا لوول دەخوا و یەکەم جار لە ژیانیدا هەستی کرد کە دەیهەوێ بگری. نەیدەزانی بەڕاستی چی ئەوی ئاوا خەمبار و دڵپڕ کردووە. دڵی بۆ ئانا دەسووتا و هەستی دەکرد کە ناتوانێ یارمەتیی بدات و لەگەڵ ئەوەشدا دەیزانی کە تاوانی ئەو خەم و پەژارەیەی ئانا لە ئەستۆی ئەوە. دەیزانی کە غەدری لێکردووە.

بە دەنگێکی نووساوەوە گوتی: یانی بەڕاستی تەڵاق ناگونجێ؟ـ ئانا وەڵامێکی نەدایەوە و تەنیا سەری لەقاند ـ ناتوانی کوڕەکەت وەرگری و لێی جیا بییەوە؟

ئانا بە ساردی گوتی: بۆچی، بەڵام تەنیا لە کاتێکدا کە ئەو رازی بێ. ئێستا دەبێ بڕۆم بۆ لای ئەو- گومانەکەی وەڕاست گەڕابوو، ئەو بێ دەرەتانییە هەروا وەك رابردوو تەنگی پێهەڵچنیبوو.

- سێشەممە لە پترزبۆرگ دەبم و تەکلیفی خۆم روون دەکەمەوە، بەڵام با ئیتر لە سەری نەڕۆین.

ئەو فایتوونەی کە ئانا دەستووری دابوو بێتە بەر باخی ڤرێدا، هات بۆ لایان. ئانا خوداحافیزی لە ڤرۆنسکی کرد و رۆیشتەوە بۆ ماڵێ.

## بیست و سێ

کومیسیۆنی دووهەمی ژوئەن بە شێوەی ئاسایی رۆژی دووشەممانە کۆڕیان پێکدەهێنا. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ چووە هۆڵی دانیشتنەکە و بە پێی دابی خۆیان سڵاوی لە سەرۆکی کۆڕ و ئەندامانی کرد و چووە سەر جێگاکەی خۆی. دەستی لە سەر ئەو کاغەزانە دانا کە لەبەر دەمی ئامادەکرابوون و دانیشت. لە نێو ئەو کاغەزانەدا زانیاریگەلێکی تێدا بوو کە پێویستی پێیبوو و ویستبووی بۆی بهێنن، هەروەها پێشنووسی پێشنیارێك کە بڕیاربوو ئاڕاستەی کومیسیۆنی بکات. ئەگەرچی پێویستییەکی زۆری بەو یادداشتانە نەبوو، ئەو هەموو بابەتەکانی لەبەر بوو و بە پێویستی نەدەزانی ئەوەی دەیهەوێ باسی بکات، لە رووی کاغەزەوە وەبیری بێتەوە. دەیزانی ئەگەر کاتی خۆی بێت و روخساری رەقیبەکەی لە هەمبەر خۆیدا ببینێ و لووتبەرزانە هەوڵ بدات خوێنسارد و کەمتەرخەم بنوێنێ بە زمانێکی تەڕوپاراوتر دەتوانێ بدوێ و چاکتر لەوەی کە پێشتر ئامادەی کردبوو قسە بکات. هەستی دەکرد قسەکانی هێندە گرینگن هەر وشەیەکی چەندین مانای هەیە. لەگەڵ ئەوەشدا سەرەڕای ئەوەی گوێی بۆ قسەی دیتران رادەگرت روخسارێشی پاك و بێئازاری دەنواند. هەرکەس چاوی لێ بکردایە و دەماری شینی دەستە سپییەکانی بدیبایە کە وەك قەیتان بە سەریاندا رایەل کرابوون و قامکە شووش و باریکەکانی کە دوو سووچی کاغەزە سپییەکەی بەردەمی گرتبوو و سەریشی کە شەکەتانە بۆ لایەك خوار بووبۆوە، پێیوابوو کە هەر ئێستا لافاوی وتار لە دەمی دادەڕژێ و تۆفانێکی ترسناك وەڕێدەخات و هاوار لە گەرووی ئەندامانی کومیسیۆن

هەڵدەستێنیٚ، بەجۆرێك کە کێشە هەڵدایسێنن و قسەی یەکتری دەبڕن، سەرۆکی کومیسیۆنیش داوایان لێدەکا نەزم و بێدەنگی بپارێزن. کاتێك راپۆرتەکە کۆتایی پێهات و ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بەو دەنگە نەرم و ئارامەی خۆی رایگەیاند کە پێویستە هێندێك سەبارەت بە مەسەلەی هۆزە کەمینەکان بدویٚ، سەرنجی هەمووان بۆ لای راکێشران. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بە کۆخەیەك گەرووی خۆی ساف کرد و بیٚ ئەوەی چاو لە رەقیبەکەی خۆی بکات، بەپێی خووخدەی هەمیشەیی کاتی مژولیاشییەکەی چاوی لە یەکەم کەس کرد کە لەبەر دەمی دانیشتبوو و ئەمجارە پیرە پیاوێکی خڕپلانە و بێدەنگ بوو کە قەت سەبارەت بە مەبەستێك بیروڕای خۆی دەرنەدەبڕی. کاتێك باسەکەی گەیشتە سەر یاسای بنەڕەتی رەقیب لە جێی خۆی هەستا و دەستیکرد بە دژایەتی کردن. سترمۆڤ کە یەکێك لە ئەندامانی کومیسیۆن بوو، هەستی رووشابوو و خۆی لە هەمبەر تۆمەت و بوختاندا دەدی و بە هەموو توانایەوە بەرگریی لە خۆی دەکرد. ئاخریش کۆڕەکە شێوا. بەڵام ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ سەرکەوت و پێشنیارەکەی پەسند کرا. سیٚ کومیسیۆنی تازە دامەزران و رۆژی دوایی لە هەموو شوێنێکی پترزبۆرگ باس باسی ئەم کومیسیۆنە بوو. سەرکەوتنی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ زۆر لەوە زیاتر بوو کە خۆی بیری لێدەکردەوە.

بەیانیی رۆژی دوایی، کە سێشەممە بوو ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ کاتێك لە خەو هەستا زۆر بە نەشەوە سەرکەوتنەکەی دوێنێی خۆی وەبیرهاتەوە و کاتێك کە سەرۆکی نووسینگەکەی، بە مەبەستی بەخێرهێنانی ئەو سەبارەت بەو دەنگۆیانەی لەمەڕ کومیسیۆنەکەی رۆژی رابردوو بیستبووی و دەیویست بۆی بگێڕێتەوە، ئەگەرچی حەزی دەکرد خۆی کەمتەرخەم و بێموبالات نیشان بدا بەڵام نەیتوانی زەردەیەك نەگریٚ.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لەگەڵ سەرۆکی نووسینگەکەی خەریکی دەوام بوو و لەبیری نەبوو کە ئەو رۆژە سێشەممەیە، یانی رۆژێك کە دەستنیشانی کردبوو بۆ گەڕانەوەی ئانا ئارکادیۆڤنا و کاتێك کە پێشخزمەتەکەی هات و هەواڵی هاتنەوەی ئەوی هێنا تووشی سەرسووڕمانێکی تاڵبوو.

ئانا بەیانی زوو گەیشتبووە پترزبۆرگ. تێلگەرافی ناردبوو کە فایتوونی بۆ بنێرن و بۆیە پێیوابوو ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ ئاگاداری هاتنەوەیەتی. بەڵام کاتێك هاتەوە مێردەکەی پێشوازیی لێنەکرد. پێیانگوت کە هێشتا مێردەکەی لە نووسینگە نەهاتۆتەوە و لەگەڵ سەرۆکی نووسینگەکەی خەریکی کارە. ئانا گوتی کە هەواڵی هاتنەوەی بە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ راگەیێنن و چووە ژوورەکەی خۆی و دەستیکرد بە رێکوپێککردنی

کەلوپەلەکانی خۆی و چاوەڕێبوو مێردەکەی بێت بۆ لای. بەڵام سەعاتێکی خایاند و هیچ خەبەرێك نەبوو. ئانا چووە ژووری نانخواردن و بە قەستی و بە بیانووی دەستوور پێدانەوە بە دەنگی بەرز قسەی دەکرد بەو هیوایەی مێردەکەی بۆ ئەوێ بکێشێ. بەڵام ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لە نووسینگەکەی نەهاتەدەرێ ئەگەرچی ئانا گوێی لێبوو کە سەرۆکی نووسینگەکەی هەتا بەر دەرگای دەرێ بەڕێ کرد. ئانا دەیزانی کە مێردەکەی بە پێی عادەت زوو دەچێ بۆ فەرمانگە و حەزی دەکرد کە بەر لە ڕۆیشتنی چاوی پێیبکەوێ بۆ ئەوەی چۆنێتیی پێوەندییەکەیانی بۆ روون بێتەوە.

بە هەنگاوی پتەو بە تەلارەکەدا تێپەڕێ و چوو بۆ ژوری کارەکەی. کاتێك چووە ژوورێ دیتی کە ڕێدنگووتی لەبەردایە و دیارە کە خۆی ئامادەکردووە بڕوات، لە پەنا مێزێکی چکۆڵە دانیشتبوو و هەنیشکی نابووە سەری و خەمبارانە چاوی لە شوێنێك بڕیبوو. ئانا بەر لەوەی مێردەکەی لە هاتنی ئاگاداربێ چاوی پێی کەوت و تێگەیشت کە بیر لە ئەو دەکاتەوە.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ کە چاوی بە ئانا کەوت داترووسکا و ویستی لە جێی خۆی هەستێ بەڵام بیری کردەوە و لە جێی خۆی نەبزووت، نێوچاوانی تێکنا و ئانا قەتی ئاوا نەدیبوو بەڵام ئاخری بە پەلە هەستا و ڕۆیشت بۆ لای ئانا، هەروا کە چاوی نەك لە چاوی بەڵکوو لە تەوێڵ و بسکەکانی بڕیبوو گەیشتە لای و دەستی گرت و داوای لێکرد دانیشێ.

لە تەنیشتی دانیشت و گوتی: زۆر خۆشحاڵم بە هاتنەوەت... ـ دیاربوو دەیویست شتێك بڵێ بەڵام زمانی تەتەڵەی دەکرد. چەند جار ویستی دەستبکات بە قسەکردن بەڵام نەیتوانی. ئەگەرچی ئانا کاتێك خۆی بۆ ئەو دیدارە ئامادەدەکرد بڕیاری بە خۆی دابوو کە سووکایەتیی پێبکات و لەبەر هەڵسوکەوتەکەی سەرکۆنەی بکات، بەڵام هەرکە چاوی بە مێردەکەی کەوت نەیزانی بڵێ چی. دڵی پێیدەسوتا و کە بێدەنگییەکە زۆری خایاند ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ گوتی: سریۆژا باشە؟ـ بەڵام چاوەڕوانی وەڵام نەبوو و درێژەی بە قسەکانیدا: من ئەمڕۆ بۆ نانی نیوەڕۆ نایەمەوە بۆ ماڵێ، خێرا دەبێ وەڕێبکەوم.

ئانا گوتی: من دەمویست بچم بۆ مۆسکۆ.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ گوتی: نا، زۆر زۆر کارێکی باشت کرد هاتی بۆ ئێرە ـ دیسان بێدەنگ بوو.

ئانا دیتی مێردەکەی توانایی قسەکردنی نییە خۆی ڕچەکەی شکاند و رووی تێکرد و بێ ئەوەی چاو لە سەر چاوی هەڵگرێ کە لە بسك و تەوێڵی نەدەهاتە خوارێ، گوتی: ئەلکسی

ئەلکساندرڤیچ، من ژنێکی تاوانبارم، ژنێکی خراپم، بەڵام هەر ئەوەم کە پێشتر گوتم و نەگۆڕاوم، هاتوومەوە تاکوو پێتبڵێم ناتوانم بگۆڕێم.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لە ناکاو بە لەبزێکی توند، کە تووڕەیی و رقی پێوە دیاربوو، چاوی لە چاوی ئانا بڕی و گوتی: من لەوبارەوە پرسیارم لێنەکردی، بەڵام چاوەڕوانییەکم جگە لەوە لێت نەبوو ـ دیاربوو کە تووڕەیی هەموو تواناییەکەی بۆ گێڕابۆوە. بە دەنگی تیژ و ناسکی خۆی درێژەی بە قسەکانیدا: بەڵام هەروەك ئەو رۆژە پێمگوتی و لە نامەکەشدا بۆم نووسیبووی دووپاتی دەکەمەوە کە پێویست ناکا لەو مەبەستە ئاگاداربم. چاوپۆشی لە تاوانەکەت دەکەم. هەموو ژنەکان ئەوەندە مێهرەبان نین کە بۆ پێدانی هەواڵێکی ئاوا خۆش بە مێردەکەیان تا ئەو رادەیە بە تاڵووکە بن ـ وشەی "ئاوا خۆش"ی بە رقەوە دەربڕی ـ من هەتا ئەو کاتەی ئەم پەڵەی شەرمە نەبۆتە بنێشتە خۆشکەی سەر زاری خەڵکی و هەتا ئەو کاتەی کە ناوی من بە شوورەیی رمووده نەبووە چاوپۆشیی لێدەکەم. هەر بەو هۆیەش وریاییت پێدەدەم کە پێوەندیمان دەبێ هەر وەك پێشوو بێت و رێز لە یەکتر بگرین، بەڵام ئەگەر خۆت لەبەر چاوی خەڵك رەش بکەیت ناچارم بۆ پارێزگاری لە ئابڕووی خۆم کارێك بکەم.

ئانا بە ترسەوە چاوی لێکرد و بە دەنگێکی شەرمنانە و لەرزۆکەوە گوتی: بەڵام پێوەندیمان مەحاڵە وەك پێشووی لێ بێتەوە.

کاتێك جووڵەی ئاسوودەی دەست و سەری ئەوی دی و دەنگی تیژ و منداڵانە و لەبزە گاڵتەجاڕانەکەی بیست هەستی بێزاری لە دڵیدا بەزەییەکەی پێشووی سڕییەوە و جگە لە ترس هیچی تری تێدا نەمایەوە، بەڵام دەیویست بە هەر شێوەیەك بێ وەزعی خۆی روون بکاتەوە.

گوتی: من ناتوانم، من لەگەڵ پیاوێکی تر....

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بە پێکەنینێکی سارد و ژەهراوییەوە قسەکەی پێبڕی و گوتی:

ـ وادیارە، ئەو رێگا تازەی بۆ ژیانت هەڵبژاردووە شوێنی لە سەر ئەو بایەخانە داناوە کە بەلاتەوە پیرۆز بوون. هەرچەندێك ژیانی رابردووتان بەلامەوە شیرینە و رێزی بۆ دادەنێم و بێزم لە ژیانی ئێستات هەڵدەستێ، بەو رادەیەش بۆچوونی ئێوەم سەبارەت بە قسەکانم پێنادروستە و لە زەینی خۆمی بە دوور دەزانم.

ئانا هەناسەیەکی هەڵکێشا و سەری داخست.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بە گوڕوتینێکی زۆرەوە دەستی پێکردەوە: من تێناگەم تۆ کە تا ئەو رادەیە خاوەنی هەستێکی سەربەخۆی و بە راشکاوی لەلای مێردەکەت ددان بە خەیانەتەکەتدا

دەنێی و دیارە لەو کارەدا زۆر بوێرانە دەچیتە پێشێ و خۆت سەرکۆنە ناکەیت چۆن بەجێهێنانی ئەرکی هاوسەری دەرهەق بە مێردەکەت تا ئەو رادەیە بە شیاوی سەرکۆنە دەزانی؟

ـ ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ، تۆ چیت لە من دەوێ؟

ـ لە تۆم دەوێ کە ئەم مرۆڤە لێرە نەبینم و ئاکار و کردەوەت جۆرێك بێ کە خەڵك و خزمەتکارەکان نەتوانن لۆمەمان بکەن... ئیتر چاوت بەو کابرایە نەکەوێ. ئەوەش پێموانییە ئەوەندە کارێکی دژوار بێ، لە بەرابنەریشدا لە هەموو مافەکانی ژنێکی پاك و بە نامووس بەهرەمەند دەبی، لەوە زیاتر هیچم نییە پێتی بڵێم. ئێستا دەبێ بڕۆم. بۆ نیوەڕۆش نایەمەوە بۆ ماڵێ.

هەستا و رۆیشت بۆ لای دەرگاکە. ئاناش هەستا و بێ ئەوەی هیچ بڵێ تۆزێ خۆی خوار کردەوە و رێگای پێدا بڕوات.

## بیست و چوار

ئەو شەوەی کە لەڤین لە سەر گیشە گیاکە رۆژی کردەوە، بیهوودە نەبوو. کاری کشتووکاڵ ئەو جۆرەی کە ئەو قۆڵی لێهەڵماڵیبوو بەجارێ جاڕزی کردبوو و ئیتر ئەو هۆگرییەی پێشووی نەمابوو. سەرەڕای ئەوەی حاسڵاتێکی باشی هەبوو، بەڵام قەت بە ئەندازەی ئەمساڵ هیوابڕاو نەبووبوو و پێوەندییەکانیشی لەگەڵ رەعیەت و جووتیارەکان ئاڵۆز نەبووبوو و یان لانیکەم قەت پێیوانەبوو بەو شێوەیە بووبێ، هۆی ئەو بێهیوایی و کەللە رەقییەشی بە تەواوی بۆ روون بووبۆوە. چێژێك کە لە کاری وەردەگرت و نزیکبوونەوە لە مووژیکەکان و ئێرەییبردن بە ئەوان و ژیانیان و هۆگرییەك کە بەو شێوە ژیانەی ئەوان لە دڵیدا رسکا بوو، ئەو شەوە بۆ ئەو لە خەونەوە گەیشتبووە بڕیار و بیری لە بەڕێوەبردنی دەکردەوە، ئەوانەش بە تەواوی بیروڕای ئەوی سەبارەت بە کاری کشتوکاڵ گۆڕیبوو کە بە هیچ شێوەیەك نەیدەزانی وەك رابردوو هۆگری کار و ماڵەغانگێڕان بێت و نەشیدەتوانی چاوپۆشی لەو هەڵسوکەوتە نالەبارانەی خۆی بکات لەگەڵ کرێکار و جووتیارەکان، کە هۆی سەرەکیی دڵگرانییەکەی بوون. ئەو گاڕانەی کە هەوڵی دەدا رەگەزەکەیان بگۆڕێ و دەیویست وەکوو «پاوا»یان لێبێ، ئەو هەموو زەوییەی کە بە رێکوپێکی شێوی بڕیبوو و کووتی پێوە کردبوو، نۆ دانە کێڵگە کە نەمامی بیی لە دەورەیان چەقاندبوو، نەوەد دسیاتین زەوی کە بە حیسابی کووتی لێدابوو، مەکینەی تووچاندن کە دەیویست بەکاری بێنێ و وێنەی ئەوانە هەمووی بە مەرجێك خۆش و سەرنجڕاکێش بوون کە ئەو

خۆی یان هاوڕێ لەگەڵ دۆستەکانی، یانی ئەو کەسانەی کە لەگەڵیدا هاودڵ و هاوبیروباوەڕ بوون، کاری لە سەر بکەن. بەڵام بە روونی دەیدی کە شێوەی ملکدارییەکەی (ئەو کتێبەش کە سەبارەت بە کشتوکاڵ دەینووسی و لەودا گرینگترین ماکی کار کرێکاران بوون زۆری یارمەتی دابوو بۆ گەیشتن بەو روانگەیە) جگە لە خەباتێکی بێبەزەییانە و سەرسەختانە لە نێوان ئەو و ژێردەستەکانیدا شتێکی تر نییە. خەباتێك کە لەلایەکییەوە یانی لەلای خۆیەوە بە هەوڵێکی پڕ گوشار و بەردەوام بەڕێوەدەچوو کە هەموو کارەکان بە باشترین شێوە دەهاتنە ئەژمار و لە لایەکی تریشەوە بە شێوەیەکی ئاسایی بەڕێوەدەچوون. دەیدی کە لەو بێنەوبەرەیەدا لە لایەکەوە کەڵك لە زیاترین وزەو توانایی وەردەگرێ، یانی لە لایەن خۆیەوە، بەڵام ئەو لایەنەی تر بەبێ کەمترین هەوڵ و تەقەلا، یان تەنانەت بیانهەوێ هەوڵ بدەن کارەکان بە هیچ ئاکامێك نەدەگەیشتن جگە لەوەی گرانبایترین کەرەسە خراپ دەبوون و رەسەنترین ئاژەڵیش لەنێو دەچوون و بەپیتترین زەویش زایە دەبوون. لە هەمووشی گرینگتر ئەو وزەیەی بۆ کشتوکاڵ بەکاری دەهێنا نەك هەر بە فیڕۆ دەچوو بەڵکوو ئێستا کە مانای هەوڵدانی لەبەر چاو دیار و ئاشکرابوو ناچار ددانی پێدادەنا کە ئامانجی ئەو هەموو ئەرك و ماندووبوونەی بەفیڕۆ چووە و هیچ بایەخێکی نییە. بەڵام بەڕاستی ئەو دژایەتییە بۆچی بوو؟ ئەو نەیدەویست کاپکێك پارەی بە فیڕۆ بڕوات و ناچاربوو پێداگری لە سەر ئەوە بکات (دەنا نەیدەتوانی هەقدەستی کرێکارەکانی بدات). رەعیەتەکانیش دەیانویست بە شێنەیی و بەبێ خۆماندووکردن، بەو شێوەی کە خوویان پێگرتبوو کار بکەن. قازانجی ئەو لەوەدا بوو کرێکارەکان هەتا دەتوانن زیاتر کار بکەن و کارەکەشیان زۆر بەرێوجێ بێ و دەغەڵی نەکەن. کەرەسەی بووجاڕی و کولۆشکێن و جەنجەڕەکان خراپ نەکەن و بە دڵسۆزی و ویژدانەوە کار بکەن. کرێکارەکان دەیانویست خۆیان ماندوو نەکەن و بە وردی و بە شێنەیی خەریکی کار بن و لەگەڵ ئەوەشدا بە وچاندان و رابواردن کاتی خۆیان تێپەڕ بکەن، لە هەمووشی گرینگتر بە مەیلی خۆیان و بەبێ ترس و دڵەوڕێزە کار بکەن و گوێ بە کاری جوان و وردەکاری نەدەن. هاوینی ئەمساڵ لەڤین هەنگاو بە هەنگاو ئەوانەی دەدی، کرێکارەکانی ناردبوو تاکوو سێوەڕەی ئەو پەڵە زەوییانە بدوورنەوە کە پڕە لە گیاوگژ و دڕکوداڵ و بۆ توو نابێ و بۆ گزرە کەڵکی لێ وەرگرن، بەڵام ئەوان سێوەڕەی زەوییە باشەکانیان دووریبۆوە کە بۆ تووە لەبەر چاو گیرابوون و دەیانگوت گزیر دەستووری پێداوین و بەوە دڵدارییان دەدایەوە کە ئالیکی چاکە. بەڵام ئەو دەیزانی کە ئەو هەڵەیە بەو هۆیە روویداوە کە دوورینەوەی ئەو زەوییانە خۆشتر و ئاسانترە. ناردبووی کە مەلۆکان هەڵگێڕنەوە بۆ ئەوەی وشك ببنەوە. هەر لە کاتی هەڵگێڕانەوەی یەکەم ریزە مەلۆدا مەکینەکەیان شکاندبوو چونکە کرێکارەکە حەزی نەدەکرد لە جێی خۆی واتە لە ژێر پەڕەی

مەکینەکەدا بێ و تەپوتۆز و گرمەوهاڕەی بەسەردا بچێت. بە لەڤینیان گوت: قوربان ناڕەحەت مەبە ژنەکان بەدەست باشتری هەڵدەگێڕنەوە- جووتیارەکانیش ئامووره تازەکەیان پێباش نەبوو هەر بۆیە زۆر بێمووبالاتانە کاتی جووتکردن و گەیشتنە سەر هۆگانەکان گاسنەکانیان لە خاك دەرنەکێشابوو و لە کاتی گەڕانەوەدا دەندەکەیان لەق کردبوو و زۆریشیان ئەسپەکان ماندوو کردبوو، داواشیان لێدەکرد خوێنسارد بێ و دڵی خۆی ناڕەحەت نەکات. ئەسپەکانیان بەڕەڵڵا دەکرد و دەکەوتنە نێو گەنمەکانەوە چونکە هیچ کرێکارێك نەیدەویست بە ڕۆژدا وچان بدات و شەوانە کێشك بدێرێ و سەرەڕای ئەوەی کە قەدەغەی کردبوو و بڕیاری دابوو کە شەوانە بە نۆرە کێشك بدێرن و ڤانکاش کە لە بەیانییەوە هەتا ئێواری کاری کردبوو شەوێ کاتی کێشك گرتنەکەی خەوی لێکەوتبوو و پاشان ددانی بە تاوانەکەی خۆیدا نابوو و گوتبووی: هەرچۆنێك ئەمر بفەرموون، نۆکەرتانم ـ سێ سەری لە گوێلکە باشەکان کردبووە نێو وێنجەکەوە کە تازە هەڵەسوونی هێنابۆوە و گوێرەکەکان هەرسێکیان دڕابوون و هیچ باوەڕی نەدەکرد بە خواردنی وێنجە بایان کردبێ و دڕابێتن. بۆ دڵدانەوەی ئەربابەکەشیان دەیانگوت کە مالیکی گوندەکەی نزیکیان سێ ڕۆژە سەد و دوازدە سەر لە گوێرەکەکانی مندار بوونەتەوە. بەڵام هیچ کام لەوانە بۆ ئەوە نەبوو کە کەسێکی نەتەوی حەز بە زەرەد و زەیانی بکات یان بیهەوێ زەوی و زارەکەی لەنێو بەرێ، بە پێچەوانە، دەیزانی کە هەموو خۆشیان دەوێ و بە ئەربابێکی سادە و دڵسافی دەزانن (ئەوەش بۆ ئەوان گەورەترین دڵخۆشی بوو) هۆیەکەشی تەنیا ئەوە بوو کە دەیانویست هاوکات لەگەڵ ئاسوودەیی و ڕابواردن کار بکەن و نەك گوێیان بە قازانجی ئەربابەکەیان نەدەدا و سەریان لێی دەرنەدەچوو بەڵکوو بێ سێ و دوو لەگەڵ قازانجی ڕەوای خۆیان بە دژوازیان دەزانی. لەڤین ماوەیەك بوو لە پێوەندیی خۆی لەگەڵ کاری وەرزێڕی ناڕازی بوو. دەیزانی لۆتکەکەی کون بووە و ئاوی تێدەچێ بەڵام کونەکەی بۆ نەدەدۆزرایەوە و قەتیش بۆی نەدەدۆزرایەوە. وێدەچوو بە ئانقەست خۆی هەڵفریوێنێ. مالیکبوون نەك چێژی پێنەدەبەخشی بەڵکوو تووشی بێزاریشی دەکرد و نەیدەتوانی بچێت بە لای ملك و مەزراکەیەوە.

هۆکارێکی دیکەش لەو بارودۆخەدا شوێندانەر بوو و ئەویش هاتنی کیتی ئیشچر باتسکایا بوو کە سی ویرێستی لێ دوور بوو، (لەڤین) حەزی دەکرد بەڵام نەیدەتوانی بیبینێ. داریا ئەلکساندرۆڤنا ئابلۆنسکایا، کاتێك لەڤین چووبوو بۆ سەردانی، بانگهێشتنی کردبوو. یانی بانگهێشتنی کردبوو کە بچێت بۆ ماڵیان و دیسان خوازبێنی لە کیتی بکاتەوە، بە گوێشی دادابوو کە ئەمجارە خوشکی داخوازییەکەی ڕەت ناکاتەوە. لەڤین خۆشی بە چاوپێکەوتنی کیتی بۆی دەرکەوتبوو کە هەروا خۆشی دەوێ، بەڵام نەیدەتوانی بەوەیکە

لێیڕوون بوو کیتی له ماڵی خوشکییەتی بچێت بۆ ئەوێ. ئەو خوازبێنی و دەستبەڕووەنانە لەمپەرێکی سەختی لە نێوانیاندا درووست کردبوو. له دڵی خۆیدا دەیگوت «من ناتوانم تەنیا بەو هۆیەی کە نەیتوانیوە ببێتە هاوسەری ئەو پیاوەی کە حەزی لێیەتی، ژیانی هاوبەشی لەگەڵ پێك بهێنم.» هەر ئەو فیکرە دڵساردی دەکردەوە و گڕی رقی لە دەروونیدا هەڵدەگیرساند. «من ناتوانم بەبێ هەستکردن بە سووکایەتی قسەی لەگەڵدا بکەم یان بەبێ تووڕەیی چاوی لێبکەم، ئەویش هەر بەو هۆیە زیاتر لە من بێزار دەبێ و هەقیشێتی. جگە لەوەش دوای قسەکانی داریا ئەلکساندرۆڤنا من چۆن دەتوانم بچم بۆ ماڵەکەیان؟ یانی دەتوانم وابنوێنم کە لەو قسانەی پێیگوتووم ئاگادارنیم؟ من دەبێ زۆر بە دڵێکی گەورەوە بچم بۆ لای و لێیببوورم و بەزەییم پێیدابێ. من لە هەمبەر ئەودا رۆڵی مرۆڤێکی لێبوردووم دەبێ کە مەزنانە ئەو بە شایانی ئەشقی خۆی دەزانێ... داریا ئەلکساندرۆڤنا بۆ ئەوەی بە من نەگووت؟ ئەگەر بە هەڵکەوت چاوم پێیبکەوتایە کارەکە خۆی دەکەوتە سەر گەڕێکی لەبار و ئاوای لێنەدەهات، بەڵام ئەوە ئێستا زۆر مەحاڵە و ناگونجێ.»

داریا ئەلکساندرۆڤنا یادداشتێکی بۆ ناردبوو و داوای زینێکی ژنانەی لێکردبوو بۆ کیتی. نووسیبووی «بیستوومە زینێکی ئاوات هەیە. هیوادارم بێی بۆ ئێرە و زینەکە لەگەڵ خۆت بهێنی.»

ئیتر ئەوەی بۆ تامڵ نەدەکرا، چۆن ژنێکی فامیدە و وردبین دەتوانێ خوشکی خۆی ئاوا سووك بکات. دە یادداشتی نووسی و هەموویانی دڕاند، ئاخری زینەکەی نارد و هیچ یادداشتێکی لەگەڵ نەخست. نەیدەتوانی بنووسێ کە دەچێت، چونکە نەیدەتوانی بچێت. هەروەها نەشیدەتوانی بنووسێ بۆیە نایەم چونکە ناتوانم. چونکە ئەوەی بە کارێکی باش نەدەزانی. ئەگەر بچووبایە کارەکەی لەوەش خراپتر دەبوو. زینەکەی بەبێ وەڵام نارد و لەگەڵ ئەوەشدا کە دەیزانی کارەکەی ناحەز بووە، کاروباری ملکەکەی کە بە تەواوی لێی بێزار بوو بەسەر گزیرەکەیدا بەجێ هێشت و رۆیشت بۆ سەردانی سڤیاژسکی[١٤٣] کە هاوڕێی بوو و لە ناوچەیەکی دوور نیشتەجێبوو، چونکە لە نزیك ملکەکەی زەلکاوێك هەڵکەوتبوو کە خودا دابنابوو بۆ راوی پەڕپووت و مراوییەکێوی. ماوەیەك لەمەوبەر هاوڕێکەی نامەیەکی بۆ ناردبوو و داوای لێکردبوو بەڵێنەکەی بەرێتە سەرێ و بچێت بۆ لای. زەلکاوەکانی ناوچەی سووروۆڤسکی[١٤٤] کە پڕبوو لە باڵندەی کێوی لەمێژ بوو لەڤینی سەرهەوا خستبوو کە بچێت. بەڵام بە

143- Sviyazhsky
144- Surovsky

هۆی کاروباری مووچە و مەزراوە پێبینەکرابوو و سەفەرەکەی وەدوا خستبوو. ئێستا زۆر بە دڵخۆشییەوە دەچوو بۆ ئەو سەفەرە چونکە لەلایەکەوە لە ئیشچر باتسکایا دووردەکەوتەوە و لە لایەکی تریشەوە لە چنگ کێشە و گرفتی کاروباری وەرزێڕی دەربازدەبوو، دەچوو بۆ راو کە زۆری حەز پێدەکرد و هەرکاتێك دڵتەنگ دەبوو پەنای بۆ دەبرد و دڵی پێیدەکرایەوە.

## بیست و پێنج

هەتا ناوچەی سوورۆڤسکی نە هێلاسن هەبوو نە دلیجانی تیژڕەوی پۆستە. لەڤین بە سواری فایتوونەکەی خۆی چوو لە ڕێگاش لایدایە ملکی مۆژیکێك کە بووبووە ئەرباب و لەوێ ئالیکی بە ئەسپەکانیدا.

پیرەپیاوێکی بە دەماخی سەرتاس بوو ریشەپان و سوورەکەی جێجێ سپی بووبوو.

دەرگاکەی بۆ کردەوە و خۆی بە لاشیپانی دەرگاکەوە نووساند تاکوو فایتوونە سێ ئەسپەکەی لەڤین بڕواتە ژووری. لە حەوشە بەرفراوانە تازەدرووست کراوە خاوێن و ڕێکوپێکەکەدا کەپرێکی چەقاندبوو و چەند نیروئامووری لێدانابوو، شوێنێکی نیشان فایتوونئاژۆکەدا تاکوو فایتوونەکەی لێڕاگرێ و خولکی لەڤینی کرد بۆ ژووری. ژنێکی جحێلێ کە کراسێکی خاوێنی لەبەردا بوو و گالۆشی لە لاقە بێگۆرەوییەکانی کردبوو، دانەویبۆوە و تەرکی دالانە تازە درووستکراوەکەی بە پەڕۆی تەڕ دەسڕی. بە دیتنی سەگێك کە لەگەڵ لەڤین خۆی کرد بە دالانەکەدا هەڵبەزییەوە و قیژاندی، بەڵام کە بۆی دەرکەوت سەگەکە یانیگر نییە پێکەنینی بە ترسانەکەی خۆی هات. بەو دەستەی کە قۆڵەکەی هەڵکرابوو دەرگای ژوورەکەی پیشان لەڤیندا و دیسان دانەوییەوە و سەرە جوانەکەی داخستەوە و دەستی کردەوە بە سڕینی تەرکی دالانەکە.

پرسیی: سەماوەرەکە داگیرسێنم؟

ـ بەڵێ، تکایە.

ژوورەکە گەورە بوو و سۆپەیەکی دیواریی کاشیپۆشی تێدابوو کە تیغەیەك لە نێوەڕاستیدا بوو. مێزێکیان لە ژێر وێنەی پیرۆزدا دانابوو کە شکڵی جۆراوجۆری لە سەر کێشرابۆوە و دوو کورسی و قەرەوێڵەیەکی لە پەنا داندرابوو. نزیك دەرگای ژوورەکە دۆلابێکی لێبوو کە پڕبوو لە قاپ و قاچاغ. پەردەکان دادرابوونەوە و زۆر کەمی مێش لێبوو، ژوورێکی زۆر خاوێن و خۆش بوو و لەڤین ترسی

لێنیشت نەکا لاسکا تەرکی ژوورەکە پیس بکات، چونکە بەو دەشت و سارایەدا هەڵاتبوو لە زۆر ئەستێر و گۆلاواندا مەلەی کردبوو، لە سووچی ژوورەکە و لای دەرگاکەوە شوێنێکی پیشاندا و لاسکا لێی وەرکەوت. لەڤین چاوی بە ژوورەکەدا گێڕا و ڕۆیشت بۆ حەوشەی پێشەوە. ژنە جوانە کالۆش لەپێکە بە دوو سەتڵەوە کە بە دوو سەری دارێکدا شۆڕی کردبوونەوە و لە سەر شانی دانابوو بە هەڵەداوان وەپێشی کەوت و بۆ هێنانی ئاو ڕۆیشت بۆ سەر بیرەکە.

پیرەپیاو بە پێکەنینەوە دەنگی هەڵێنا: زووکە بزانم ـ هات بۆ لای لەڤین و هەنیشکی نایەسەر لاجامەی بەر هەیوانەکە و دیاربوو حەزی لە سوێرقسەییە گوتی: دەی قوربان، تەشریف دەبەی بۆ لای نیکۆلای ئیڤانۆڤیچ سڤیاژسکی؟ ئەوانیش جاروبار بەسەرمان دەکەنەوە.

لەگەڵ ئەوەی پیرەپیاو باسی ئاشنایەتیی خۆی و سڤیاژسکیی دەکرد دیسان دەنگی کرانەوەی دەروازە گەورەکە هات و چەند کرێکار بە ئاموور و کولۆشکێن و ماڵووەوە هاتنە حەوشە. ئەو ئەسپانە کە لە ئاموور و ماڵووەکانیان کردبوون هەموویان فیلەتەن بوون و دیاربوو برسییەتییان نەچێشتووە. کرێکارەکان دیاربوو ئەندامی بنەماڵەکەن. دوو کەسیان لاو بوون و کراسی چیتیان لەبەردا بوو و شەپکەیان لە سەر نابوو، دوو کەسی دیکەشیان لەوە دەچوو کرێکار بن و کراسی جاویان لەبەردا بوو" یەکیان پیر و ئەوی دیکەشیان گەنج بوو. پیرەپیاو لەلای هەیوانەکەوە هات بۆ لایان و دەستی کرد بە کردنەوەی خامووتی ئەسپەکان.

لەڤین پرسیی: چیتان داچاند ئەمڕۆ؟

ـ مەزراکەمان شێو بڕی بۆ پەتاتە. ئەخر ئێمەش پەڵە زەوییەکمان هەیە. ڕاوەستە فێدۆت[145] ئەسپە یەختەکراوەکە بەرمەدە. بیبە ئاوی بدە. ئەسپێکی تر بهێنە.

لاوە کەڵەگەت و بە دەماخەکە کە ڕواڵەتەن کوڕی پیرەپیاو بوو گوتی: باوەگیان ئەو گاسنانەی داوام کردبوو هێناویانە؟

پیرەپیاو کە خامووتی مل و هەوساری ئەسپەکەی کردبۆوە و گرمۆڵەی کردبوو، فڕێیدا سووچێك و گوتی: لە دالانەکەیە. هەتا نانی نیوەڕۆ دەخۆن وەسەر ئاموورەکانیان بخە.

---

145 Fedot

ژنە جوان و شەنگەکە بە سەتڵی پڕ لە ئاوەوە کە شانی پێکۆم کردبۆوە ڕۆیشت بۆ داڵانەکەو لەگەڵ چەند ژنی دیکەی شۆخ و شەنگ و جحێڵ گەڕاوە، منداڵ لە باوەش و بێمنداڵ کە مەعلووم نەبوو لە کوێوە هاتوون، وەژوور کەوتن.

سەماوەرەکە کەوتە گیزەگیز. کرێکاران و پیاوانی ماڵێ کە لە کاروباری ئەسپەکان بوونەوە ڕۆیشتن بۆ خواردنی فراوێن. لەڤین کە چایی و خواردەمەنیی خۆی لە نێو فایتوونەکەیدا هەبوو هێنای و داوای لە پیرەپیاو کرد چایی لەگەڵ بخواتەوە.

پیرەپیاو بە خۆشحاڵییەوە هات بۆ لای لەڤین دانیشت و گوتی: ڕاستت دەوێ، ساتێك لەمەوبەر چاییمان خواردەوە بەڵام لەگەڵ ئێوەش چاییەك دەخۆمەوە.

لەسەر چایی خواردنەوە پیرەپیاو باسی بوونە مالیکی خۆی بۆ لەڤین گێڕایەوە کە دە ساڵ لەمەوبەر سەدوبیست دسیاتین زەویی لە کابرایەکی مالیك بە ئیجارە گرتبوو، پارەکە ئەو زەوییانەی لە مالیکەکە کڕیبوو و سێسەد دسیاتنیشی لە مالیکێکی دراوسێیان بە ئیجارە گرتبوو. پەڵەیەك لەو زەوییە کە زۆر بە پیت نەبوو دابووی بە ئیجارە و نزیکەی چوارسەد دسیاتین کە دەشتێکی بەرین و گۆشتەزەوییەکی پڕ پیت بوو بە خۆی و بنەماڵە و دوو کرێکارەوە کاری لە سەر دەکرد. پیرەپیاو سکاڵای لەوە بوو کە کاروباری کشتوکاڵەکەی روو لە گەشە نییە. بەڵام لەڤین دەیزانی کە پیرەپیاو بۆ ئەوەی خۆی خاکەڕا نیشان بدا سکاڵایەتی و کاری وەرزێڕییەکەی بە پێچەوانەی قسەکانی زۆریش روو لە گەشەیە و داهاتی باشیشی هەیە. ئەگەر حاسڵ و داهاتی باشی نەبووایە چۆنی دەتوانی هێکتاری بە پێنجسەد ڕۆبڵ زەوی بکڕێت و ژن بۆ سێ کوڕ و برازایەکی بێنێ و ماڵەکەی دووجار دوای سووتمان سەرلەنوێ دروست بکاتەوە و هەرجاریش لە جارەکەی پێشوو باشتر. ئەگەرچی پیرەپیاو سکاڵای دەکرد بەڵام دیاربوو شانازی بە کاروبار و مڵك و کوڕ وبرازا و بووك و ئەسپ و مانگا و ماڵاتەکەیەوە دەکا و هەر بەڕاستیش شانازیی پێوە دەکرد. بە قسەکردن لەگەڵ پیرەپیاو بۆی دەرکەوت کە حەزی لە نوێخوازییە لە بواری کشتوکاڵدا. زەوییەکی زۆری شێو بڕیبوو و دەیویست دێراوی پەتاتەی لێهەڵدا و لەڤین لە ڕێگا دیتبووی کە زۆری دیکەشی ئێستا خەریکە گوڵەکەیان دەوەرێ. کەچی پەتاتەکانی خۆی (لەڤین) تازە خەریکبوو گوڵیان دەدا. زەوییەکانی بە ئاموورێکی تازە دەکێڵا کە لە مالکێکی وەرگرتبوو. گەنمیشی دادەچاند. شتێك کە بووە هۆی واقوڕمانی لەڤین ئەوەبوو کە پیرەپیاو کاتی بژارکردن ئەو لقە جۆیانەی مەزراکەی کۆدەکردەوە و دەیدا بە ئەسپەکانی. لەڤین زۆر جار ویستبووی ئەو گوڵە جۆیانە بچنێتەوە و نەهێڵێ خەسار بن بەڵام پێیوابوو ناگونجێ و وازی لێدەهێنا. بەڵام کابرای

وەرزێڕ لەو کارەدا سەرکەوتنی وەدەست هێنابوو و لەو ڕێگایەوە ئالیکێکی باشی بۆ یەکسمەکان دابین دەکرد.

ـ بۆ ژنان زۆر چاکە خەریکی گوڵچنینەوە بن و کارێکی ئاسانیشە، کۆی ئەکەنەوە و بە باوەش دەیهێنن لە قەراغ ڕێگاکە دەیکەنە مەلۆ و عەرابە دێت و باری دەکەن بۆسەر خەرمان.

لەڤین پەرداخێکی چایی بۆتێکرد و گوتی: بەڵام ئێمەی مالیك وا بەدەست ئەو کرێکار و سەپانانەوە پێوەبووین هەر مەپرسە.

پیرەپیاو پەرداخەکەی لە دەستی لەڤین وەرگرت و گوتی: دەستت خۆشبێ ـ بەڵام قەندی نەویست و لەتە قەندەکەی خۆی نیشاندا کە بە گاز لەتی کردبوو و لە وەڵامی لەڤیندا گوتی: مەگین دەکرێ لەگەڵ کرێکاری ڕۆژمز کار بکەی! پیاو تووشی ڕۆژە ڕەشی دەکەن. خۆ هیچت بەدەست ناهێڵن. بۆ وێنە ئەو سڤیاژسکییانە، ئێمە دەزانین زەوییەکانیان قسەی لە سەر نییە. گۆشتە زەوییەکی هەیە وەك گەوهەر وایە، بەڵام هیچ داهاتێکی نییە بۆیان. خۆ کرێکار دڵی پێی ناسووتێ.

ـ بەڵام خۆت مەگین کرێکاری ڕۆژمزت نییە؟

ـ کاری ئێمە جیاوازە. ئێمە خۆمان مووژیکین. ئێمە پێ بەپێی خۆیان کار دەکەین. کرێکارێك بزانین دەغەڵی دەکات لەڕێوە دەری دەکەین.

ژنە جوانە گالۆش لەپێکە هاتەژووری و گوتی: باوەگیان، فینۆگن[١٤٦] گوتوویە قیلی بۆ بەرین؟

پیرەپیاو هەستا سەرپێ و گوتی: بەڵێ، قوربان، ئاوایە ـ چەند جار خاچی خۆی کێشا و سپاسی لە لەڤین کرد و ڕۆیشتە دەرێ. کاتێك لەڤین چوو بۆ کۆخی وەرزێڕەکە تاکوو فایتوونئاژۆکەی بانگ بکات، پیاوەکانی بنەماڵەی دی لە سەر مێزی نانخواردن ریز بووبوون. ژنەکان ڕاوەستابوون و خزمەتیان دەکردن. کوڕی پیرەپیاوەکە لاوێکی ساغ و بە دەماخ بوو بە دەمی پڕ لە کاشاوە نەقڵێکی خۆشی گێڕایەوە و هەموویان قاقا پێکەنین، قاقای پێکەنینی ژنی گالۆش لەپێ، کە خەریکبوو کاسەکەی پڕ دەکردەوە لە سووپی کەلەم لە هی هەموویان بەرزتر بوو.

وێدەچوو ڕوخساری شیرین و دڵڕفێنی ژنەی گالۆش لەپێ لەبەرچاوی لەڤین ئەوەندەی تر هەستی تەبایی و ئاوەدانیی لەو ماڵە وەرزێڕییەدا سازکردبێ و شوێنی لە سەر ڕۆحی دانابێ.

146- Finogen

هەرچۆنێك بێ ئەو هەستە هێندە گەرموگوڕ بوو کە لەڤین بە هیچ شێوەیەك نەیدەتوانی خۆی لێ دەربازبکات. لە ماوەی ڕێگاشدا هەر لە ماڵی پیرەپیاوی وەرزێڕەوە هەتا ملکەکەی سڤیاژسکی بەردەوام بیری ئەو ماڵە لە دڵیدا زیندوو دەبۆوە و دەتگوت ئەو هەستە شتێکی تێدایە کە ئاوا سەرنجی بۆ لای خۆی ڕاکێشاوە.

## بیست و شەش

سڤیاژسکی لە ناوچەی خۆیدا سەرۆك خانان بوو. نزیکەی پێنجساڵ لە لەڤین گەڕاوەتر بوو و لەمێژ بوو ژنی هێنابوو. ژنخوشکەکەی کە کچێکی جوان و ڕووخۆش بوو و زۆر شۆخوشەنگ و شیرین هاتە بەرچاوی لەڤین، لەگەڵ ئەوان دەژیا. لەڤین دەیزانی کە سڤیاژسکی و ژنەکەی زۆر حەزدەکەن ئەو کچە شووی پێبکات. لەڤین ئەوەی لێ ڕوون بوو هەر وەك چۆن لاوانی سەڵتی سەر هەوای ژنهێنان کەوتوو، ئەگەر کەسیش سەبارەت بەو مەسەلەیە ئاماژەیەکیان پێنەکات و بە گوێیان هەڵنەهێنێ، بەڵام هەمیشە لەو شتانە ئاگادارن و تێیدەگەن. ئەوەشی دەزانی کە ئەگەرچی خۆی حەزی دەکرد ژن بێنێ و دەشیزانی و لەوە ئاگاداربوو کە ئەو کچە جوان و دلڕفێنە زۆر ژنێکی باش و شیاو دەبێ بۆی، تەنانەت ئەگەر حەزی لە کیتی ئیشچر باتسکایاش نەکردبایە، زەماوەندکردن لەگەڵ ئەوی بەو ڕادەیە بە شتێکی نەگونجاو دەزانی کە هەڵفڕین بە ئاسماندا. هەر ئەوەش ئەو خۆشییەی لێ حەرامکرد، کە لەلای سڤیاژسکی هەستی پێدەکرد و بەڵێنی بەخۆی دابوو.

کاتێك نامەکەی سڤیاژسکی گەیشتە دەستی کە بانگهێشتنی کردبوو بۆ ڕاو خێرا ئەو فیکرە بە مێشکیدا هات. بەڵام هاتە سەرئەوەی کە ئەو خواستەی سڤیاژسکی تەنیا گریمانەیەکە و بەس، ئەوەش تەنیا لە زەینی خۆیدایە و هیچ هۆیەك نییە کە ئەوەی بەسەردا بسەپێنێ. هەر بەو هۆیەش سەرەڕای ئەو گریمانە و فیکرانە ڕێگای سەفەری گرتەبەر. جگە لەوەش لە ناخی دڵیدا حەزی بەوە دەکرد کە خۆی تاقی بکاتەوە و هەست و سۆزی خۆی سەبارەت بە ئەو کچە هەڵسەنگێنێ. ژیانی بنەماڵەیی سڤیاژسکی لەرادەبەدەر شیرین و دڵگر بوو، سڤیاژسکی خۆشی باشترین نموونەی ئاغاوات بوو کە دەیناسی و بەلایەوە سەرنجڕاکێش بوو.

سڤیاژسکی یەکێك لەو کەسانە بوو کە هەمیشە لە روانگەی لەڤینەوە سەیری دەنواند و بەرێوەبەرایەتییەکەی لە بواری کاروباردا، کە زۆریش مەنتقی و پڕنۆمەند بوو، بەڵام دوور لە رەسەنایەتی بوو، رێگای خۆی دەگرتە بەر و کاری بەو ژیانە بوو کە لە بوارێکی ئاشکرا و مسۆگەر و تەواو سەربەخۆدا دەچووە پێشێ و دەکرێ بڵێین هەمیشە لەگەڵ داوەرەبییەکانی ناسازگار بوو. سڤیاژسکی مرۆڤێکی زۆر جوامێر و وەك دەڵێن لیبراڵ بوو. ئەو بە چاوی سووك لە نەجیمزادانی دەڕوانی و لە سەر ئەو باوەڕەبوو کە زۆربەی ئەوانە لە دڵەوە لایەنگری کۆیلەدارین بەڵام لەبەر ترس و شەرمەونی بیروباوەڕی خۆیان شاردۆتەوە. ئەو رووسیای وەك تورکیا بە وڵاتێکی گەندەڵ دەزانی و حوکوومەتی رووسیای هێندە پێگەندەڵ بوو کە ئیجازەی بە خۆی نەدەدا تەنانەت بە شێوەیەکی جیددی رەخنە لە کارەکانیشیان بگرێ. سەرەڕای ئەوە خزمەتی بە وڵاتەکەی خۆی دەکرد و سەرۆك خانانێکی بێوێنە بوو و بە کڵاوێکی پەڕاوێز سوور و نەخشاو بە کۆکارد (نیشانی فەرمی)یەوە سەفەری دەکرد ولەسەر ئەو باوەڕەش بوو کە ژیانی مرۆڤایەتی تەنیا لە هەندەران بایەخی هەیە و هەرکاتێك دەرفەتی بۆ هەڵکەوتایە سەفەری دەکرد بۆ دەرەوەی وڵات. لەگەڵ ئەوەشدا لە رووسیا کاری وەرزێڕیی بە شێوەیەکی زۆر پڕ وردەکاری و پێشکەوتووانە بەرێوەدەبرد و زۆر تامەزرۆیانە هەموو پێوشوێنی رووداوەکانی هەڵدەگرت و ئەوەی لە وڵاتدا رووی دەدا ئەو خەبەری لێیهەبوو. لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە وەرزێڕی رووسی لە رێگای گەشەکردن و گۆڕاندا لە قۆناغی نێوان مەیموون و مرۆڤدا چەقی بەستووە و جووڵە ناکات. سەرەڕای ئەوەش لە هەڵبژاردنی زێمستڤادا بە گەرموگوڕییەکی زیاتر لە خەڵکەوە دەستی ئەو وەرزێڕانەی گوشی کە بووبوونە خاوەنی مووچە و مەزرا و گوێی بۆ قسەکانیان رادەگرت. ئیمانی نەبوو بەڵام سەرنجێکی تایبەتی بە مەسەلەی چاکسازیی ژیان و پیاوانی ئایینی و کەموکوورییەکانی کلیسا دەدا و تێدەکۆشا کە لە گوندەکەی خۆی کلیسایەك دروست بکات.

سەبارەت بە کێشەکانی ژنان حەولی دەدا و بە شێوەیەکی بنەوەشی لایەنگریی لێدەکردن و بۆ ئازادیی تەواو و بەتایبەت مافی کارکردنیان خەباتی دەکرد" ژیانیشی لەگەڵ ژنەکەی ئەوەندە تەبا و گەرموگوڕ بوو، بنەماڵەکەشی زۆر رێکوپێك، سەرەڕای ئەوەی منداڵیشیان نەبوو لەگەڵ ژنەکەی ئەوەندە نێوانخۆش و هاودڵ بوون کە خەڵکی سەریان سوور مابوو و بە چاوی رێزەوە لێیان دەڕوانیی. کارێکیشی کردبوو کە ژنەکەی دەست لە رەش و سپی نەدات و فیکروزیکری ئەوەبوو کە کاتی خۆی لەگەڵ هاوسەرەکەی بە خۆشی و شادی رابوێرێ.

ئەگەر لەڤین ئەو خووخدەیەی نەبوایە کە بە شێوەیەکی زۆر گەشبینانە بڕوانێتە حاڵی خەڵك و بۆچوونێکی باشی لە بارەیانەوە هەبێ، کەسایەتیی سڤیاژسکی هیچ چەشنە گرفتێکی بۆ ساز نەدەکرد و هیچ پرسیارێکیشی لەلا دروست نەدەکرد و ڕەنگبوو لە دڵی خۆیدا بڵێ «پیاوێکی گەوجە، یان خۆڕانەرێکی دەهۆکار و خاپینۆکە.» شتەکەش روون بوو. بەڵام نەیدەتوانی ئەو بە گەوج بزانێ چونکە سڤیاژسکی نەك هەر زۆر زیرەك بوو، بەڵکوو مرۆڤێکی خوێندەوار و لەگەڵ ئەوەشدا زۆر خاکەڕا بوو. هیچ مەبەستێك نەبوو کە لێی ئاگادارنەبێ بەڵام ئەم زانیارییەی خۆی کاتێك نیشان دەدا کە ناچاربوایەت. بەخاپێنەر و خۆڕانەر زانینی ئەویش شتێکی مەحاڵ بوو، چونکە سڤیاژسکی بێگومان مرۆڤێکی زۆر چاکەخواز و زانا و بەشەڕەف بوو، بەردەوامیش زۆر بە سەروڕووخۆشی و نەشەوە کاری دەکرد و دەورووبەرییەکان زۆریان ڕێز بۆ دادەنا و بە شێوەیەکی ئاگادارانە هیچ کات کارێکی خراپی نەدەکرد و نەشیدەتوانی بیکات.

لەڤین هەوڵی دەدا تێبگات بەڵام دەرنەدەچوو و هەمیشە ئەو و ژیانی بە مەتەڵۆکەیەکی گران دەزانی کە بۆی هەڵنایەت.

ئەوان دوو هاوڕێی یەکڕەنگ بوون و بەو هۆیەش لەڤین ئیجازەی بە خۆی نەدەدا کە بە چاوێکی تاقیکارانەوە لە حاڵوباڵی هاوڕێکەی وردبێتەوە و لە قووڵترین ریشەی جیهانبینیی ئەو تێبگات، بەڵام هەمیشە زەحمەتەکەی بێئاکام دەمایەوە. هەرجارێك دەیویست لە ژووری میوانداریی زەینی ئەو بەولاترەوە بچێت کە بۆ هەمووان کراوە بوو بۆی دەردەکەوت کە سڤیاژسکی هێندێك پەشێو دەبێ و ترسێکی کەمڕەنگ لە نیگایدا وەدیار دەکەوێت. دەتگوت لەوە دەترسێ لەڤین لە ناخی دڵ و ڕۆحی بگات و لە کاتی سەرخۆشی و دڵسافیشدا لە هەمبەر ئەودا خۆڕاگریی دەکرد.

لەڤین ئێستا دوای جاڕزبوون لە کاروباری کشتوکاڵ پێیناخۆش نەبوو ماوەیەك لەلای سڤیاژسکی بمێنێتەوە. جگە لەوەش دیتنی ئەو دوو کۆترە شیرینکام و بەختەوەرە کە لە خۆیان و لە خەڵکی رازی بوون و لە هێلانەی پاك و پڕ لە شادییاندا ئاشقانە دەژیان شوێنێکی زۆر چێژبەخشی لە سەر هەست و رۆحی دانابوو. زۆر لە ژیانی خۆی وەڕەز و دڵسارد بوو، بەدوای ئەوەدا دەگەڕا کە لەو رازە بگات وا ئەو رووناکی و بەختەوەری و خۆشەویستییەی بە ژیانی هاوڕێکەی بەخشیوە. جگە لەوەش لەڤین دەیزانی کە لە ماڵی سڤیاژسکی خان و ئاغاکانی جیران ملکی دەبینێ و دەیویست لە باس و ئاخافتنی لە سەر مەسەلەی وەرزێڕی و هەڵگرتنی

داهات و بەرهەمی ساڵانە و گرتنی کرێکار و سەپان و ئەو جۆرە شتانە کە نەیدەزانی بۆچی بە شتێکی خراپ و ناحەزی دەزانن، بەڵام ئێستا بە بڕوای خۆی زۆر گرینگی دەنواند، بەشداری بکات و بیروڕای خۆی دەربڕێت و بیروڕای ئەوانیش بزانێ. لەڤین لە دڵی خۆیدا دەیگوت «ڕەنگە ئەو مەسەلانە لە سەردەمی کوێلەداریدا گرینگایەتییەکیان پێنەدرابێ یان ئەمڕۆش لە ئینگلستان بە گرینگی نەزانن. بە هەردوو باریشدا هەلومەرجەکە ئاشکرا بووە و هەشە، بەڵام لە رووسیا ئەمڕۆ کە هەموو شتێك ژێرەوژوور بووە و تازە خەریکە وردەوردە جێ دەکەوێ و مەسەلەی چۆنێتیی جێکەوتنی هەلوومەرجەکەش تەنیا مەسەلەیەکی گرینگە لە سەرانسەری رووسیادا.»

ڕاو ئەو جۆرەی کە لەڤین چاوەڕوانی دەکرد وا نەبوو. زەلکاوەکە وشك بووبوو و باڵندە روویان تێنەدەکرد. رۆژێکی تەواو لە سەحرا ماتڵ بوو و تەنیا سێ نیچیری راو کرد، بەڵام وەك هەمیشە کەیفخۆش و شاد و بەنەشە، بە زەینێکی وشیارەوە، کە بە هۆی جموجۆڵی جەستەییەوە بوو لە راوکردن گەڕایەوە. کاتی راو، کە پێیوابوو بە هیچ شێوەیەك بیرناکاتەوە جاروبار پیرەپیاوە جووتیارەکە و بنەماڵەکەی وەبیردەهاتەوە و دەتگوت ئەو هەستەی کە بە دیتنی ئەو بنەماڵەیە لە دڵیدا گووراوە نەك سەرنجی رادەکێشا بەڵکوو چارەسەر کردنی کێشەکەی خۆشی لەودا دەدی.

ئەو رۆژە ئێوارە، کاتی چایی خواردنەوە، دوو مالیك کە بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەیەکی تایبەت بە ماڵ و میرات هاتبوون دەمەتەقێیەکی سەرنجڕاکێش دەستی پێکرد کە لەڤین لە دڵەوە چاوەڕوانی شتێکی ئاوا بوو.

لەڤین لەلای خاتوونی بنەماڵە و لە سەر مێزی چاییەکە دانیشتبوو و دەبوو لەگەڵ ئەو و خوشکی کە بەرەوڕووی دانیشتبوو قسە بکات. خاتوون ژنێکی دەموچاو خڕ و قژ زێڕین و کورتەباڵا بوو، رووخۆش و دەم بە پێکەنین و چاڵی چەنە و روومەتی سپی و ناسکی شیرینی و جوانیی لێدەباری. لەڤین هەوڵی دەدا لە سۆنگەی ئەوەوە ئەو مەتەڵە هەڵدا کە زۆری بەلاوە گرینگ بوو و ئەویش رازی مێردەکەی بوو کە دەیویست تێیبگات، بەڵام پەشۆکابوو، پەشۆکاوییەکەشی هی ئەوەبوو کە ژنخوشکی هاوڕێکەی بەرەوڕووی دانیشتبوو بە کراسێکەوە کە پێیوابوو لەبەر ئەو لەبەری کردووە و پێسیری کردۆتەوە و سینگە سپی و بەفرینەکەی دڵ و سەرنجی بۆ لای خۆی رادەکێشا. ئەو چاکە چوار پاڵووەی بەرۆکی لە سەر سینەی نەرم و دۆڵی مەمانی ئەوەندە دڵڕفێن بوو هۆش و ئیختیاری لە لەڤین بڕیبوو. پێیوابوو بە ئەنقەست و تەنیا

لەبەر ئەو بەرۆکی بەفرینی ئاوەڵا کردووە و هەقی بەخۆی نەدەدا چاوی تێببڕێت و هەوڵی دەدا سەرنجی خۆی لێبدزێتەوە. ئەو بۆ کرانەوەی ئەو پێسیرە خۆی بە خەتابار دەزانی. پێیوابوو دەیهەوێ کەسێك بخاتە داوی خۆیەوە و بە پێویستی دەزانی شتێکی بۆ روون بکاتەوە بەڵام روونکردنەوەی ئەو شتە نەدەگونجا و بەو هومێدەوە بەردەوام سوورهەڵدەگەڕا و پەشۆکاوانە لەبەر خۆیەوە دەکەوتە جموجۆڵ و نەیدەزانی چ بکا. پەشۆکاوییەکەی ئەو شوێنی لە سەر کچەکەش دانا. بەڵام خاتوون وایدەنواند کە لەوە نەگەیشتووە و بە ئەنقەست دەیویست خوشکی هان بدات و وەقسەی بهێنێ.

خاتوونی خانەخوێ درێژەی بە قسەکانیدا و گوتی: تۆ فەرمووت کە مێردەکەم هۆگری بەو شتانە نییە کە رووسی بن. بە پێچەوانە، راستە ئەو کاتێك دەچێتە دەرەوەی وڵات خوشحاڵ و بەکەیفە بەڵام هیچ کات لە هەندەران بە ئەندازەی ئێرە هەست بە شادی و نەشە ناکات. ئەو لێرە خۆی لە ژینگەی سروشتی خۆیدا دەبینێ. لێرە کاری زۆرە و ئەو توانایییەی هەیە کە هۆگریی خۆی بۆ هەموو شتێك نیشان بدات. راستی چاوت بەو قوتابخانەیە نەکەوتووە کە ئێمە لێرە دروستمان کردووە؟

ـ با دیتوومە.... ئەو بینا چکۆڵەی کە لاولاو هەموو دیوارەکانی داپۆشیوە؟

ـ بەڵێ کاری ناستیایە ـ ئاماژەی بە خوشکی کرد.

لەڤین کە هەوڵی دەدا چاو لە بەرۆکە ئاوەڵاکەی نەکات پرسیی: ئێوە خۆتان لەوێ مامۆستان؟ـ هەستی دەکرد بەرەورووی خۆی چاو لە هەر جێگایەك بکات پێسیری ئاوەڵا و سینگی بەفرینی ناستیا لەبەر چاوییەتی.

ـ بەڵی پێشتر من مامۆستا بووم، بەڵام ئێستا خاتوونێکی زۆر باش مامۆستایە و ئێستا فێرکاریی وەرزشیشمان دەستپێکردووە.

لەڤین گوتی: نا، سپاستان دەکەم، ئیتر چایی ناخۆمەوە ـ ئەگەرچی هەستی دەکرد کە ئەو کارەی دەیکا رووهەڵماڵدراوییە، چونکە توانایی درێژەدان بەو دەمەتەقێیەی نەبوو سوورهەڵگەڕا، بۆیە هەستا سەرپێ و گوتی: وادیارە لەوێ قسەیان خۆش کردووە ـ چووە سەر مێزەکەی تر کە خاوەنماڵ و دوو میوانی مالیك لێیدانیشتبوون. سڤیاژسکی لە بەرێکەوە دانیشتبوو و بەلەمرکی لە سەر مێزەکە دانابوو و پەرداخی چاییەکەی هەڵدەخولاند و بە دەستەکەی تری ریشی لە قولەمیچەی گرتبوو و هەڵیدەگێڕایەوە بۆ لای لووتی و دەتگوت بۆنی پێوە دەکات و دەستی لێبەردەدا و دیسان دەیگرت و بایدەدایەوە.

به چاوە رەش وگەشەکانی راست چاوی لە سمێڵی ماشوبرنجیی ئەو مالیکە بڕیبوو کە بە شەوق و زەوقەوە قسەی دەکرد و دیاربوو قسەکانی ئەو بە جۆرێك رابواردن دەزانێ. ئەو مالیکە سکاڵای لەدەست وەرزێڕەکان دەکرد. لەڤین لێی روون بوو کە سڤیاژسکی دەتوانێ وەڵامێکی ئەوەندە گورچووبڕ بەو مالیکە بداتەوە کە تەواوی سکاڵا و بەڵگەهێنانەوەکانی بکاتە بڵقی سەرئاو، بەڵام بەهۆی پلەوپایەکەیەوە ناتوانێ ئەو وڵامەی پێبداتەوە و تەنیا وەك قسەی قۆڕ و بۆ رابواردن گوێی بۆ گرتبوو.

ئەو مالیکە دیاربوو لە لایەنگرانی سەرقورسی سیستەمی کوێلەداری و لەو کۆنە وەرزێڕانەبوو کە حەزی ئەو کارەی لە دڵدایە. لەڤین ئەو نیشانەیەی لە ریدنگۆتە زۆر قەدیمییەکەیدا دەدی کە لەبەر کۆنەیی بریقەی دەهات و هێشتا رەنگی پێوە نەگرتبوو، هەروەها بە چاوە زیرەك و پڕ لە گڕی تووڕەیی و زمانە تەڕ و لەبزە بە دەستوورەکەیدا دیاربوو کە خوویێکی خانانەی هەیە و راوەشاندنی بادیهەوایانەی دەستەپان و جوان و خۆرلێدراوەکەی کە ئەنگوستیلەیەکی قەدیمی لە قامکە تیتۆلەیدا بوو ئەوەندەی تر ئەو دیاردەیەی زەق دەکردەوە کە شەیدای دەسەڵات و کوێلەدارییە.

## بیست و حەوت

مالیك بە بزەیەکی زیرەکانەوە کە روخسارە بەساڵاچووە وریا و دڵگرەکەی روونکردەوە گوتی: ئەگەر پێمحەیف نەبوایە ئەوەی دامەزراندووە و وەرێمخستووە پشتی تێکەم و دڵ لەو هەموو ئەرك و زەحمەتە بەردەم کە تا ئێستا لەو پێناوەدا کێشاومە... دەستم لە هەموو شتێك دادەشت... دارونەدارم دەفرۆشت و وەك نیکۆلای ئیڤانۆڤیچ دەچووم گوێم بۆ هێلێنی شۆخوشەنگ رادەگرت.

نیکۆلای ئیڤانۆڤیچ سڤیاژسکی گوتی: دەی کەوابوو بۆیە دەستی لێ داناشۆی و نایفرۆشی، دیارە لێکتداوەتەوە و ئەو کارە بە قازانجت نییە.

ـ ئەو لێکدانەوەی کردوومە تەنیا ئەوەیە کە لە ماڵی خۆم دەژیم، کە نە کڕیومە و نە بە کرێم گرتووە و هێشتاش بەهیوام ئەو رەعیەتانە بێنە سەر ئەقڵ. بڕوام پێبکەن، ئەوانە جگە لە ئارەقخواردنەوە و فیسق و فجوور هیچ کارێکی تر نازانن. ئەوەی بوویان دابەشیان کرد و

خواردیان. نه ئەسپێکیان بۆ ماوەتەوە نه مانگایەك . هەموو له برسانا دەمرن. کاتێکیش دەیانگری به رەنجبەر و کرێکار ماڵەکەت به تالاّن دەبەن، کەرەسەکانت لێدەشکێنن و خراپی دەکەن، سەرەڕای ئەوانەش دادگات لێدەگرن و شکایەتت لێدەکەن.

ـ دەی خۆ تۆش دەتوانی شکایەت له ئەوان بکەیت.

ـ من شکایەت بکەم؟ قەت کاری وا ناکەم! قسەی وات بۆ سازدەکەن که پیاو دەڵێ بریا ملم بشکایه و شکایەتم نەکردبایه. بۆ وێنه له گارگه هەقدەستەکەیان له پێشدا وەرگرت و بێ ئەوەی کار بکەن بۆی دەرچوون. پێتوایه ئەو دادگایەی ئێوه چییان لێدەکات؟ فحێل! نەخێر، کاری ئێمه ئەگەر بۆشمان بچێته سەرێ تەنیا هەر به هۆی قازی و کوێخای ئاواییەوەیه. رەعیەتی تاوانبار دەبێ وەك قەدیم قامچی بچێژێ بۆ ئەوەی ببێته بنیادەم، دەنا ناچاری دەست له هەموو شتێك بەردەی و هەڵێی بۆ ئەوسەری دنیا.

دیاربوو ئەو مالیکه دەیهەوێ بەو قسانه تیزوتانووت له سڤیاژسکی بگرێ. بەلاّم سڤیاژسکی نەك رقی هەڵنەدەستا، بەڵکوو وەك رابواردنێك دەیڕوانییه دەموراوێژی.

به پێکەنینەوە ئاماژەی به مالیکەکەی دیکه کرد و گوتی: بەلاّم من و لەڤین و ئەو بەڕێزه کاروباری مڵکەکانمان بەو شێوەیه هەڵناسووڕێنین.

مالیك گوتی: بەڵێ وایه، کاری میخاییل پێترۆڤیچ کەوتۆته گەڕ و خەمی هیچی نییه. بەلاّم لێیان بپرسه بزانه کاروبارەکەی به شێوازی ئاوەزبنەمای ئێوه دەڕواته پێشێ؟ ـ دیاریشبوو که به گوتنی وشەی ئاوەزبنەما خۆی دەنوێنێ.

میخاییل پترۆڤیچ گوتی: کاروباری مڵکداریی من، شوکر بۆ خودا، زۆر ئاسانه. دەبێ پاره بۆ ماڵیاتی پاییز ئامادەبێ. رەعیەتەکان دێن بۆلام و دەڵێن: باوەگیان، رۆژێدەر و سەرچاوەی بژیوی ئێمەی، دەستمان بگره. ئاخر، رەعیەتەکانی ئێمه هەموویان خۆمانەن، پیاو دڵی پێیان دەسووتێ. پارەیان دەدەمێ تاکوو قستی یەکەمی ماڵیاتەکەیان بدەن و دەڵێم: ئێوەش لەبیرتان بێ کوڕم، من یارمەتیمدان، بەلاّم ئێوەش کاتێك پێویستم پێتان بوو یارمەتیم بدەن. توو چاندن هەیه، وێنجه دوورین و گیادوورین و کۆکردنەوەی و دروێنەی گەنم و جۆ هەیه. بەڵێنیشیان لێوەردەگرم که هەر بنەماڵەیەك چەندەم بێگاری پێقەرزداره. بەلاّم هێندێ جار مووژیکی ناڕاست و دەغەڵێش هەیه“ ئەوەش حاشای لێناکرێ.

لەڤین کە ئاگاداری ئەو جۆرە پێوەندی و هەڵسوکەوتە باوکانەیەی ئاغا و رەعیەتەکان بوو چاوێکی لە سڤیاژسکی کرد و پەڕییە نێو قسەکانی میخاییل پێترۆڤیچ و رووی قسەی لە مالیکی سمێڵ ماشووبرینجی بوو پرسیی: دەی، بیروڕای ئێوە چییە؟ ئێستا دەبێ بەڕێوەبردنی کاروباری ملك چۆن بێ؟

ـ دەکرێ هەر بە شێوەی میخائیل پێترۆڤیچ بەڕێوەی بەری. یان دغلّ و دانیان پێبدەی لەجیاتی هەقدەستەکەیان یان زەوییان بە ئیجارە بدەیتێ، بەڵام بەو شێوەیە سامانی مەملەکەت لەنێو دەچێ. لە سیستەمی کۆندا داهاتی زەوییەکانی من ئەگەر باشی کار لە سەر بکرایە یەك و نۆی دەبڕی، بەڵام ئەگەر لەجیاتی هەقدەست دەغڵیان پێبدەی لە یەك و سێ تێناپەڕێ. ئەو ئازادییەی کوێلەکان رووسیای وێران کردووە.

سڤیاژسکی بە بزەیەکەوە چاوی لە لەڤین کرد و تەنانەت وەك تەشەر چاوێکی لێداگرت، بەڵام لەڤین قسەکانی مالیکی بە پێکەنینی نەدەزانی. لە قسەکانی ئەو باشتر تێدەگەیشت تا قسەکانی سڤیاژسکی. زۆربەی قسەکانی ئەو مالیکە راست بوو، کە هۆی شێواویی بارودۆخی روسیای دەخستە ئەستۆی ئەو ئازادییەی بە کۆیلەکان دراوە، بە لای لەڤینەوە شتێکی تازە بوو و پێیوابوو شتێکی حاشاهەڵنەگرە. دیاربوو کە ئەو مالیکە بیروڕای خۆی دەردەبڕێ و ئەوەش زۆر کەم روو دەدات. فیکرێك نەبوو کە بە مەبەستی خەریك کردنی زەینی بێکاری خۆی و وەك رابواردن پێیگەیشتبێ، بەڵکوو فیکرێك بوو کە هەڵقوڵاوی بارودۆخی تایبەتی خۆی بوو، فیکرێك بوو کە لە خەڵوەتی گونددا، دوای ئەوەی گرفتەکانی خۆی لە هەموو لایەنێکەوە هەڵسەنگاندبوو و بە وردی بیری لێکردبۆوە لە زەینیدا سەری هەڵدابوو.

دەیگوت: مەسەلەکە ئەوەیە کە.... تکایە بڕوانن.... هەر پێشکەوتنێك تەنیا بەو مەرجە سەردەگرێ کە دەسەڵات و زۆری لە پشت بێ ـ بە قسەکانیدا دیاربوو کە دەیهەوێ زانیاریی مێژوویی خۆی بنوێنێ: بۆ وێنە لە چاکسازیی پیتێر یان کاترین ئەلکساندر بڕوانن، مێژووی ئەورووپا بێننە بەرچاوی خۆتان، پێشکەوتن لە بواری کشتوکاڵدا لە هەموو شتێك بەرچاوترە. تۆ بڕوانە پەتاتە. تەنانەت پەتاتەش ئەگەر زۆری لە سەر نەبوایە لە رووسیا جێ نەدەکەوت. هەر ئەو هێڵەقونێرانەی پێشووی ئێمەش بۆ هەمیشە باو نەبوون، داهێنانی ئەوان رەنگە کاری پرێنسە باکوورییەکان بووبێ کە بەر لە مەغوولەکان بە سەرماندا زاڵ بوون و دەسەڵاتیان لە دەستدا بووە، بەڵام حەتمەن ئەویش هەر بە زۆر جێکەوتووە. ئێشتاش، لەم سەردەمە نوێیەدا، ئێمە مالیکەکان، لە سایەی سیستەمی کوێلەدارییەوە لە بواری کشتوکاڵدا داهێنانی تازەمان زۆر بووە: دەزگای وشککەرەوەی ئالیك و زۆر مەکینە و دەزگای جۆراوجۆری وەرزێڕیمان

داهێنا. بردنی پەیمان بۆ مەزراکان کردە باو، ئەوانە هەمووی ئەگەر زۆر و دەسەڵاتیان لە پشت نەبوایە جێنەدەکەوتن. مووژیکەکان سەرەتا ملیان نەدەدا، بەڵام وردە وردە فێربوون. ئێستا کە سیستەمی کویلەداری هەڵوەشاوەتەوە، دەسەڵاتیان لێ ساندووین و کشتوکاڵی ئێمە، کە روو لە گەشانەوە بوو و هەتا ئاستێکی بەرز رۆیشتبوو، دیسان شکستی هێنا و گەڕایەوە بۆ چاخی بەربەریێتی. ئەوە بیروڕای منە.

سڤیاژسکی گوتی: بەڵام بۆ وادەڵێی؟ ئەگەر کشتوکاڵ ئاوەزبنەما بێ، یانی لە سەر بنەمای ئەقڵ و ڕێسای نوێ هەوڵی بۆ بدەی دەتوانی بە کرێکاری رۆژمز بەڕێوەبەری.

ـ بەڵام بفەرموو کاتێك دەسەڵاتیان لێ سەندوومەوە چۆنی بەڕێوەبێنم؟

لەڤین لە دڵی خۆیدا گوتی «ئەها، ئەوە هەر ئەو وەزەی کارەیە وا من دەڵێم و گرینگترین هۆی داهاتی کشتوکاڵە.»

ـ بە کرێکار.

ـ کرێکار حەز ناکەن باش کار بکەن و لە دەزگا و کەرەسە نوێیەکانیش بێزارن. کرێکاری رووسی تەنیا شتێك باش دەزانێ و ئەویش ئەوەیە کە وەك گا زگی بەرداتەوە و ئارەق بخواتەوە و هەر کەرەسەیەکیش بدەیە دەستی لەڕێوە دەیشکێنێ. ناوادە ئەسپەکان ئاو دەدەن و لەغاو و دەمبێنەکانیان لە لووت دەکەن، تەگەری باش و دەورەداری عارەبانەکان دەگۆڕن و تەگەری خراپ و دارین دەخەنە جێگایان و باقیی پارەکەی دەدەن بە ڤۆدکا، میلەی ئاسنین یان گوڵمێخ دەخەنە نێو کولۆش هاڕەکەوە تاکوو بیشکێنن. هەر شتێك خوویان پێنەگرتبێ لێیبێزارن. کاروباری کشتوکاڵمان هەر بەو هۆیە ئاوا لە دوایە. زەوییەکان هەموو بوونەتە بەیار و گیاوگژی هەرزە و دڕکوداڵ لێکیداوە یان دراون بە مووژیکەکان. زەوییەك کە سەردەمێك ڕێژەی سێمیلیون کیلۆی داهاتی گەنم هەبوو، ئێستا لە سێسەد هەزار کیلۆ زیاتر نادا. سامانی گشتی بەبا چووە. ئەگەر لەڕووی حیسابەوە بیانویستبایە رووسیا کاول بکەن ئاوا بە چاکی لە دەستیان نەدەهات.

پاشان دەستیکرد بە شرۆڤەکردنی خەریتەی هەڵوەشاوەی سیستەمی کوێلەداری کە بەپێی سەلیقەی ئەو دەبوو بەڕێوەبچووبایە بۆ ئەوەی ئەو کێشە و گرفتانە ساز نەبوایەت. لەڤین هیچ هۆگرییەکی بەو خەریتەیە نەبوو و کاتێك شرۆڤەی مالیك کۆتایی پێهات گەڕایەوە سەر گریمانەی یەکەمی خۆی و رووی لە سڤیاژسکی کرد و بەو مەبەستەی کە ئەویش بیروباوەڕی خۆی دەربڕێ گوتی: شکی تێدا نییە کە ئاستی کشتوکاڵی ئێمەش دادەبەزێت و لەم

هەڵسوکەوتەی ئێستاشماندا لەگەڵ کرێکارەکان کشتوکاڵێکی ئاوەزبنەما و پڕ داهات نابێ و هەموو ئەوە دەزانین.

سڤیاژسکی ئەمجارە بە لەبزێکی بنەوەشییەوە وەڵامی دایەوە: من پێموانییە وابێ. تەنیا شتێك کە من بە روونی دەیبینم ئەوەیە کە ئێمە لە کاری کشتوکاڵ شارەزا نین. ئاستی کشتوکاڵی ئێمە لە سەردەمی کوێلەداریدا زۆریش پڕ داهات نەبووە و بگرە زۆریش لە خوارێ بووە. ئێمە لە کشتوکاڵی خۆماندا نە کەڵك لە مەکینە وەردەگرین و نە لە ئاژەڵی بەهێز، نە بەڕێوەبەرایەتی دەزانین چییە و نە سەرمان لە ژمێریاری دەردەچێ. ئەگەر لە وەرزێڕی ئێمە بپرسی نازانێ چ کارێك داهاتی باشی تێدایە و چ کارێك تێیدا نییە.

مالیك بە تەشەرەوە گوتی: ژمێریاریی ئیتالیایی. باشترین ژمێریاری دنیا بێنن، کاتێك کرێکار هەرچی بە دەستییەوەیە خراپی دەکات ئیتر چیت بە دەستەوە دەمێنێ؟

ـ بۆ هەرچی هەیە خراپی دەکەن؟ کولۆشهاڕی پیزەریی ئێوە کە رووسییە، خراپی دەکەن، بەڵام هی من هەڵمیشە خراپی ناکەن. یەکسمی رووسیی ئێوە سەقەت دەکات کە نازانم لە چ رەسەنێکە و دەبێ بە کلك رایکێشی بۆ ئەوەی بەڕێدا بڕوا، بەڵام ئەسپی فلامان یان تەنانەت ئەسپی دووڕەگی دانیمارکی ـ رووسیی منیان بۆ سەقەت ناکرێ. هەروەها لە هەموو بوارێکی دیکەدا. ئێمە هەرچۆنێکە دەبێ ئاستی کشتوکاڵمان بەرینە سەرێ.

ـ بەڵێ، ئەگەر بکرایەت قسەمان نەبوو، نیکۆلای ئیڤانۆڤیچ. ئێوە زۆر بە ئاسانی دەتوانن لە دەزگا و مەکینە و ئەسپی گرانبایی کەڵك وەرگرن. بەڵام من کوڕێکم هەیە ناردوومە بۆ زانستگاە و چکۆڵەکانیشم لە قوتابخانەی دواناوەندین و دەبێ خەرجی خوێندنی ئەوان بکێشم و ناتوانم ئەسپی فلامان بکڕم.

ـ بانکیان بۆیە داناوە لە کاتی ئاوادا کێشەکان چارەسەر بکات.

ـ بانك تەنیا بە کەڵکی ئەوە دێ کە پاشماوەی ماڵی خەڵك بە مفتە لە چنگیان دەرهێنێ. من ئەوەم ناوێ قوربان پێشکەش بە خۆیان.

لەڤین گوتی: من لە سەر ئەو باوەڕە نیم کە ئاستی کشتوکاڵ ببرێتە سەرێ، یان بتوانی بیبەیتە سەرێ. من دەستم لە کارەکەدایە و باری ماڵییەکەشم بۆ هەڵدەسووڕێ بەڵام قەت لەو بوارەدا سەرکەوتوو نەبووم. نازانم قازانجی بانکیش بۆ کێیە؟ ئەوەندە دەزانم کە خۆم هیچ دەسمایەیەکم لە بواری کشتوکاڵدا نەبووە وەگەڕی بخەم و زەرەدم نەکردبێ. ئاژەڵی باشم کڕی، زەرەدم کرد، ماشینم کڕی، زەرەدم کرد...

مالیکی سمێڵ ماشووبرنجی دیاربوو قسەکەی ئەوی بەدڵە و هێندەی پێخۆش بوو دای لە قاقای پێکەنین.

لەڤین درێژەی بە قسەکانیدا: منیش بە تەنیا نیم. بە شایەدی هەموو ئەو کەسانەی بە لەبەرچاوگرتنی یاسای زانستی خەریکی کاروباری کشتوکاڵن، کاری هەمووان، جگە لە بڕێکی دەگمەن، زەرەدی بەدواوەیە. دەی خۆ ئێوە دەڵێن ملکدارییەکەتان داهاتی باشی هەیە؟ ـ هەر لەڕێوە لە نیگای سڤیاژسکیدا ئەو نیشانەی ترسەی بەدی کرد کە کاتێك دەیویست لە ژووری میوانداریی زەینی ئەو بەولاوەتر بچێت لەگەڵی بەڕەوڕوو بوو.

جگە لەوەش ئەو پرسیارەی لەڤین بەبێ توێکل نەبوو. خاتوونی خانەخوێ تاوێك لەمەوبەر کاتی چاییخواردنەوە پێیگوتبوو کە ئەوان هەر ئەو هاوینە کارناسێکی ژمێریاری ئاڵمانییان لە مۆسکۆوە هێناوە و پێنجسەد رۆبڵی لێوەرگرتوون و حیسابەکانی بۆ لێکداونەتەوە و بەو ئاکامە گەیشتووە، کە ئەوان ساڵی سێهەزار و بڕێك زەرەد دەکەن. خاتوون بڕی زەرەدەکەی بە جوانی لەبیرنەبوو بەڵام کارناسە ئاڵمانییەکە ئەوی بە وردی حیساب کردبوو و تەنانەت یەك لە چواری کاپکیشی لە قەڵەم نەختسبوو.

مالیك کاتێك باس هاتە سەر داهات و قازانجی ملکی خانەخوێکە زەردەیەکی گرت، دیاربوو دەیزانی قازانجی ملکی هاوسێ خانانەکەی چەندەیە.

سڤیاژسکی وەڵامی دایەوە: رەنگە پڕ داهات نەبێ، بەڵام ئەوە تەنیا نیشاندەری ئەوەیە کە یان من ورزێڕێکی باش نیم، یان ئەوەی کە دەسمایەکەم بۆ زۆربوونی قازانج وەکار خستووە.

لەڤین واقوڕماوانە دەنگی بەرزکردەوە: ئای ئای! قازانج رەنگە لە ئەورووپا مانای هەبێ، چونکە لەوێ کاتێك لە سەر زەویوزارێك ئیش دەکەن نرخی دەڕواتە سەرێ، کەچی لە رووسیا کاتێك لە سەر زەویوزارێك کار دەکەن بێ پیتی دەکەن و نرخەکەی دادەبەزێ، هەربۆیە بەهرە و داهات بوونی نییە.

ـ چۆن بوونی نییە؟ ئەوە یاسایە، دەسمایە قازانجی هەیە.

ـ کەوایە یاسا بۆ ئێمە راست نییە، قازانج لە رووسیا بۆ روونکردنەوە نابێ، بەپێچەوانە، هۆی سەرلێشێواوییە. نا، تکات لێدەکەم بفەرموون کە ئاخێزگەی ئەو قازانجە چییە؟

ـ ئێوە ماست مەیل ناکەن؟ ـ رووی لە ژنەکەی کرد و گوتی: ماشا، بڵێ پیاڵەیەك ماست بێنن یان توودڕك. ئەمساڵ توودڕك چاکی خۆ راگرتووە.

سڤیاژسکی زۆر به رووخۆشی هەستا و دوورکەوتەوە، بەجۆرێك کە دەتگوت ئاخافتنەکەی راست لەو جێگایەدا کە بە بڕوای لەڤین تازە خەریکبوو دەستی پێدەکرد، بە تەواوبووی زانیوە.

لەڤین کە بێبەردەنگ مابۆوە قسەکانی لەگەڵ مالیك درێژە پێدا و هەوڵی دەدا پێیبسەلمێنێ کە کێشەی کار تەنیا بەو هۆیەوەیە کە ئێمە نامانەوێ تایبەتمەندییەکانی خوو و خدە و زاتی کرێکارانی خۆمان بناسین. بەڵام مالیك وەکوو هەموو ئەو کەسانەی کە بە پێی بۆچوون و گریمانەی خۆیان لە قوژبنی تەنیاییدا بیردەکەنەوە، بیرگەی خۆی لە سەر هەموو بیر و فکرێك داخستبوو و جگە لە ئەندێشەکانی خۆی باوەڕی بە هیچ شتێکی تر نەبوو. بۆیە هەروا پێداگریی دەکرد کە: مووژیکی رووسی بەرازێکی غەرزیوە و جگە لە ژیانی بەرازانە هیچی تری ناوێ و بۆ دەربازکردنی ئەو لە ژیانە دزێوەکەی تەنیا زۆرەملی پێویستە کە ئەو نییەتی و دار و قامچی پێویستە و ئێمە بە رادەیەك ئازدیخوازین کە قامچییەکەی هەزارساڵەمان لەگەڵ بڕێك پارێزەر و بەندیخانە ئاڵوگۆڕ کردووە. ئەو بەندیخانەیەی کە لەوێ سووپی خۆش دەدەن بە مووژیکە گلاو و بێکەڵکەکان و رادەیەکی بەرچاویش هەوای پاك و خاوێن هەڵدەمژن.

لەڤین کە هەوڵی دەدا بگەڕێتەوە سەر ئەو مەسەلەیە کە مەبەستی بوو، گوتی: بۆ ئێوە پێتانوایە کە ناتوانن دەستتان بەوجۆرە پێوەندییەی نێوان خان و رەعیەت رابگا کە دەبێتە هۆی پڕقازانجبوونی وەزی کار؟

مالیك وەڵامی دایەوە: رەعیەتی رووسی هەتا تێلا و زەبروزەنگی لە سەر نەبێ کار ناکات و ئێستاش ئەو تێلایەیان لە دەست ساندووین.

سڤیاژسکی کە ماستەکەی خواردبوو و جگەرەیەکی داگیرساندبوو، هاتەوە نێو بازنەی ئاخافتنەکە و پرسیی: چ مەرجێکی تازەی کارتان پێشك دێ؟ هەموو ئەو پێوەندییانەی کە لەگەڵ وزەی کار هەیە دیاریکراوە و بە تەواوی لێیان کۆڵیوەتەوە. پاشماوەکانی بەربەریَتی و شوێنەواری کۆمەڵگای هاوبەشی سەرەتایی بەپێی کەفالەتی گشتی هەر لە خۆڕاوە لەنێو دەچێ، سیستەمی کۆیلەداری هەڵوەشاوەتەوە و مەرجی کاری ئازاد ماوەتەوە. بەمشێوانە، خزمەتکاری دایمی و کرێکاری رۆژمز یان ئیجارەدار، دابین و ئامادەکراون و دەبێ لە سەر کار دایانمەزرێنی. چارەیەکیشمان جگە لەوە نییە.

ـ بەڵام ئەو شێوازەی کار بۆ ئەورووپا پەسند نییە.

ـ ئەورووپا پەسندی نەکردووە و بە شوێن شێوازی تازەدا دەگەڕێن و زۆر وێدەچێ بشیان دۆزێتەوە.

لەڤین وەڵامی دایەوە: منیش راست مەبەستم ئەوەیە. ئێمە بۆ نەگەڕێین بۆ خۆمانی بدۆزینەوە؟

ـ چونکه ئەوە راست وەك ئەوە وایە کە ئێمە سەرلەنوێ دەست پێبکەین و شێوازێکی تازە بۆ دروستکردنی هێلاّسن داهێنین. ئەوە هێلاّسنیان داهێناوە و حازر و ئامادەیە.

لەڤین گوتی: بەلاّم ئەگەر ئەوەی ئەوان دایانهێناوە بەکاری ئێمە نەهات و ئەگەر بێ مانا بوو؟

دیسان ئاسەواری ترس لە چاوی سڤیاژسکیدا دەرکەوت.

ـ بەڵێ، ئەو خۆهەڵکێشانانە شتێکی تازە نین. ئێمە هەر خەریکی شاتوشووتین کە ئەوەی ئەورووپا لێیدەگەڕێ ئێمە دۆزیومانەتەوە و لەو قسانە. بەلاّم لێمببوورن کە ئەو قسەیە دەکەم، ئێوە لە هەموو ئەو کارانە ئاگادارن کە لە ئەورووپا بۆ مەسەلەی مسۆگەرکردنی کار لەبەرچاو گیراوە؟

ـ نا، زۆر ئاگاداریم لێینییە.

ـ ئەو مەسەلەیە ئێستا بە تواناترین فیکر و زەینەکانی ئەورووپای بە خۆیەوە خەریك کردووە. بۆ وێنە بزوتنەوەی شوولتێزـ دلیچ[147].... و ئەو هەموو کتێبەی کە سەبارەت بە مەسەلەی کارو کرێکار نووسراوە، باڵی لاسال کە لە هەمووان لیبرالترە... سیستەمی مووڵهاوزێن[148] ئەوانە هەمووی راستەقینەیە، حەتمەن ئێوە ئەوە دەزانن.

ـ بە گشتی دەیزانم، بەلاّم زۆر ناڕوون.

ـ نا، ئێوە خاکەڕایی دەکەن. من لێمڕوونە کە ئێوە ئەو مەسەلانە لە من کەمتر نازانن. من هەڵبەت مامۆستای زانستی کۆمەلاّیەتی نیم، بەلاّم هۆگری بابەتەکەم و ئێوەش ئەگەر بەڕاستی هۆگریتان بەو بابەتانە هەیە دەبێ لێیبکۆڵنەوە.

ـ بەلاّم ئەوان بەو کارانەیان بە کوێ گەیشتوون؟

ـ داوای لێبوردن دەکەم...

مالیکەکان هەستان و سڤیاژسکی پێشی بە لەڤین گرت و نەیهێشت باسەکە لەوە زیاتر درێژە پێبدات کە بەردەوام دەیویست پشتپەردەی تەلاری میوانداری زەینی ئەو ببینێ و رۆیشت بۆ بەڕێکردنی میوانەکانی.

147- Schultz - Delitsch

148- Mulhausen

# بیست و هەشت

ئەوشەوە لە هەنتەشی دوو خاتووندا لەڤین زۆر ناخۆشی لێ گوزەرا. بیری کردەوە کە تەنیا ئەو نییە لە دەست ئەو بارودۆخەی کاری کشتوکاڵ سکالاّیەتی و ئەو نارەزایەتییەش حالّەتێکە کە هەموو ورزێرانی رووسیا گیرۆدەی بوون، دامەزراندنی پێوەندیش لەگەڵ کرێکاران، بەجۆرێك کە ئەوانیش ئەوەندە بە دڵ کار بکەن کە لە ماڵی وەرزێرە بەساڵاچووەکە دیتبووی نەك خەونێکی تەمومژاوی، کە ئەویش کێشەیەکە و دەبێ چارەسەر بکرێ. ئەو فیکرەش تووشی هەیەجانی کرد. پێیوابوو ئەو کێشەیە چارەسەر ناکرێ و دەبێ بۆ چارەسەرکردنی هەوڵ بدات.

خوداحافیزیی لە خاتوونی خانەخوێ و خوشکەکەی کرد و بەڵێنی پێدان کە سبەینێش لەوێ بمێنێتەوە و بە سواری فایتوون بچن بۆ لێرەواری دەوڵەتی و چاو لە هەرەسهێنانی چیا بکەن کە زۆر سەرنجراکێش بوو. بەرلەوەی بچێتە ژووری خەوەکەی سەرێکی لە ژووری کاری خانەخوێکەی هەڵێنا تا ئەو کتێبانەی کە سڤیاژسکی سەبارەت بە مەسەلەی کاری کرێکاران بە باشی زانیبوون و داوای لێکردبوو بیانخوێنێتەوە، لێی وەربگرێ. ژووری کارەکەی سڤیاژسکی هۆڵێکی بەرفراوان بوو و دوو مێز و چەند دۆلابی پڕ لە کتێبی تێدابوو. مێزەکان یەکیان دارین و قورس بوو کە خۆی بۆ ئێشی نووسین کەڵکی لێوەردەگرت و یەکیشیان مێزێکی گرد بوو و چرایەکیان لە سەر دانابوو و رۆژنامە و گۆڤار بە زمانە جۆراوجۆرەکان لە دەوری چراکە وەك ئەستێرە چندرابوون. دۆلابێك لە نزیك مێزی نووسینەکەی بوو چەندین چەکمەجەی هەبوو کە هەرکامیان بە نیشانەی زێرین دەستەبەندی کرابوون و هەر چەکمەجەی تایبەت بە شتێك بوو.

سڤیاژسکی کتێبەکانی هێناو دایە دەستی و لە سەر کورسیلە لانکەیی و نەرمەکەی خۆی دانیشت.

لەڤین لەلای مێزە گردەکە راوەستابوو و چاوی لە گۆڤار و رۆژنامەکان دەکرد، سڤیاژسکی پێیگوت: چییە شتێکی باشت پەیداکردووە؟

که دیتی لەڤین گۆڤارێکی هەڵگرتووە گوتی: ئەها، بەڵێ، وتارێکی زۆر باشی تێدایە ـ بە شۆرو شادییەکی زۆرەوە گوتیشی: وادیارە، لە کاری دابەشکردنی لەهێستاندا تاوانباری سەرەکی فێردریك نەبووە. بەڵکوو وادیارە....

بە لەبزێکی روون و پاراوەوە کە تایبەتی خۆی بوو، ئەو تازە دۆزراوە گرینگ و سەرنجڕاکێشە مێژوویییەی بە وردی بۆ روونکردەوە. سەرەڕای ئەوەی کە زەینی لەڤین ئێستا لە هەموو شتێك زیاتر لە داوی مەسەلەی کشتوکاڵدا بوو، بە بیستنی قسەی خانەخوێکەی لە دڵی خۆیدا گوتی «بەڕاستی ئەو کابرایە چی لە مێشکیدایە؟ بۆ مەسەلەی دابەشبوونی لەهێستان ئەوەندە گرینگە بەلایەوە؟» کاتێك قسەکانی سڤیاژسکی تەواوبوو لەڤین وەك ئەوەی لە دەمی دەرپەڕیبێ پرسیی: دەی، ئاکامەکەی؟ـ بەڵام سڤیاژسکی وەڵامی نەدایەوە. خاڵی گرینگ ئەوەبوو کە چاوەڕوانی راگرت بەڵام بە پێویستی نەزانی بۆی روون بکاتەوە کە مەسەلە گرینگەکە چییە.

لەڤین هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی: بەڵێ، ئەو مالیکە ناڕازییەی ئەمشەو بە بڕوای من مرۆڤێکی سەیر بوو. مرۆڤێکی زیرەکە و زۆربەی قسەکانی راست بوون.

سڤیاژسکی گوتی: تۆش قسەی وادەکەی براله. ئەو پیاوێکی زۆر کۆنەپەرستە و بە شێوەی نەهێنی لایەنگری سەرسەختی سیستەمی کۆیلەدارییە، وەکوو هەموو مالیکەکانی تر.

ـ کە ئێوە رێنوێنیتان وەئەستۆ گرتووە...

سڤیاژسکی پێکەنی و گوتی: بەڵێ، بەڵام من هەوڵ دەدەم کە ئەوان بەرەو رێگایەکی تر رێنوێنی بکەم.

لەڤین گوتی: ئەوەی کە زەینی منی زۆر بەخۆیەوە خەریك کردووە، ئەوەیە کە ئەو کارەی ئێمە دەیکەین، یانی کشتوکاڵی زانستی و وەك دەڵێن ئاوەزبنەما سەرکەوتوو نییە و ئەوەی سەرکەوتووە مڵکداریی هاوڕێ لەگەڵ سووتخۆرییە، یانی کارێك کە ئەو مالیکە بێدەنگە دەیکات، کە خۆی گوتەنی زۆر سادەیە و لێرەدا هەق بە دەستی ئەو مالیکە کۆنەپەرستەیە. بەڵام تاوانبار کێیە؟

ـ هەڵبەت خۆمان تاوانبارین. جگە لەوەش ئەو قسەیەی ئێوە دەیکەن راست نییە. کشتوکاڵی ئێمە کوێی ناسەرکەوتووە؟ ڤاسیلچیکۆڤ زۆر سەرکەوتووە.

ـ کارگاکەی...

ـ بەڵام من تێناگەم هۆی سەرسووڕمانی ئێوە چییە. خەڵکی ئێمە لە هەردوو بواری ماددی و مەعنەویدا وەدوا کەوتوون بۆیە هەرشتێك کە تێی نەگەن و پێشتر نەیاندیبێ

دژایەتیی لەگەڵ دەکەن. ئەوەش روون و ئاشکرایە. ئەم شێوە کشتوکاڵە لە ئەورووپا بۆیە سەرکەوتووە چونکە خەڵکەکەیان تێگەیشتوون. یانی ئێمەش دەبێ فەرهەنگ و ژیاری خەڵکەکەمان بەرینەسەرێ. هەر ئەوە و تەواو.

ـ بەڵام چۆن دەکرێ خەڵکی بکەینە خاوەن ژیار و فەرهەنگ؟

ـ بۆ ئەو کارە سێ شت پێویستە: قوتابخانە و قوتابخانە و قوتابخانە.

بەڵام ئێوە خۆتان گوتتان خەڵك لە باری ماددیشەوە لەدوان. کەوایە قوتابخانە کوا دەردی ئەوان دەوا دەکا.

ـ دەزانی چی، ئێوە چیرۆکی ئەو پێشنیارانەم وەبیردێننەوە کە پزیشك بۆ چارەسەری نەخۆشەکەی بە کەسوکاری ئەوی دەکا: «وا چاکە ڤژۆکەری بدەنێ.» ـ «دامانێ پێی خراپتر بوو.»ـ «کەوایە زەرووی لێبگرن.» ـ «لێمان گرت خراپتر بوو.» کەوایە تەنیا داوا لە خوا بکەن شیفای بۆ بنێرێ.» ـ«داوامان لە ئەویش کرد خراپتر بوو.» ـ «ئێستا ئەوە بۆتە نەقڵی ئێمە. من باسی گەشەی ئابووری دەکەم، دەڵێن هیچ قازانجێکی نەبووە، دەڵێم سووسیالیزم، دەڵێن خراپتر. دەڵێم خوێندەوارکردنی خەڵك، دەڵێن خراپتر.

ـ بەڵام ئەوەم پێبڵێ قوتابخانە چ کەڵکێکی بۆ وەرزێڕەکان هەیە؟

ـ بەرچاویان روون دەکاتەوە، پێویستی تازەیان بۆ وەدی دێنێ.

لەڤین بە گوڕوتینێکەوە گوتی: من سەرم دەرناچێ، ئاخر قوتابخانە بۆ دەبێ بۆ باری ماڵیی خەڵك یارمەتیدەر بێ؟ دەڵێی قوتابخانە و خوێندەواری دەبێتە هۆی ئەوەی خەڵك هەست بە پێویستی تازە بکەن، بەڵام ئاخر ئەوە دەبێتە عوزری لە قەباحەت خراپتر. کاتێك نەتوانن ئەو پێویستییانە وەدەست بێنن لە ئەمرۆ چارەڕەشتر دەبن. جگە لەوەش، فێربوونی بیرکاری و خوێندنەوەی ئامۆژگاری و پەند کوا بۆ ئەوان دەبێتە یارمەتیدەری ماڵی؟ ئەوە شتێکە من قەت نەمتوانیوە تێیبگەم. دوو رۆژ لەمەوبەر چاوم بە ژنێك کەوت کە منداڵێکی شیرەخۆرەی بە باوەشەوە بوو، لێمپرسی دەچی بۆکوێ؟ گوتی: دەچم بۆ لای مامان. منداڵەکەم کۆڵنجی کردووە دەیبەم تاکوو چارەسەری بکات. گوتم مامان چۆن کۆڵنجی منداڵ چاك دەکاتەوە؟ گوتی: منداڵەکە لە نێو کولانەی مریشکەکاندا دادەنێ و پاشان دەستدەکا بە دۆعا خوێندن.

سڤیاژسکی بە پێکەنینەوە گوتی: دەی، ئەوە خۆت وەڵامی خۆتت دایەوە. بۆ ئەوەی کۆڵنجی منداڵەکەیان ئاوا چارەسەر نەکەن پێویستە...

لەڤین بە بێتاقەتییەوە وەڵامی دایەوە: ئاە، نا! ئەو جۆرە چارەسەرکردنەی کۆڵنج بە بڕوای من هەر وەکوو ئەو هەوڵە وایە کە بۆ ماریجەکردنی خەڵك کەڵك لە قوتابخانە وەردەگرن. خەڵك لێقەوماو و لە فەرهەنگ بێ بەشن. ئەوەش راستییەکە و بۆ هەمووومان روون و ئاشکرایە، هەر ئەو جۆرەی کە ئەو دایکە لادێییە لێیڕوونە کە منداڵەکەی کۆڵنجی کردووە، چونکە منداڵەکەی بەردەوام دەگری و ژێرنابێتەوە. بەڵام قوتابخانە چۆن یارمەتیی خەڵك دەدات کە لە چنگ نەزانی و لێقەوماوی رزگاریان بێت؟ ئەوەش بەوڕادەیە بێ مانایە کە منداڵ بۆ ماریجەکردن بخەیتە نێو کولانەی مریشکەوە. دەبێ هۆکاری لێقەوماوی بدۆزییەوە و لەنێوی بەری.

ـ دەی کەوابێ تۆ لانیکەم لەو بارەوە لەگەڵ سپەنسێر، کە هیچ هۆگرییەکیشت پێینییە، هاوڕای. ئەویش لە سەر ئەو باوەڕەیە کە زانست بە هۆی ئاسوودەیی و دابینبوونی ژیانەوە و خۆی گوتەنی شۆردنەوەی بەردەوام، وەدەست دێ، نەك لە ئاکامی خوێندن و حیساب کردنەوە.

ـ کەوایە زۆر خۆشحاڵم، یان زۆر بە داخەوەم، کە لەگەڵ ئەو هاوڕام. بەڵام ئەوە مەبەستێکە کە من زۆر لەمێژە دەیزانم. قوتابخانە هیچ کەڵکێکی نییە، ئەوەی گرینگە هەلومەرجی ئابوورییە کە دەبێتە هۆی زیادبوونی ماڵ و سامان و ئاسودەیی بۆ خەڵك، ئەگەر خەڵك بەوجێیە گەیشتن ئیتر قوتابخانە گرینگە و کەڵکی دەبێ.

ـ لەگەڵ ئەوەشدا ئەمڕۆ فێرکاری و قوتابخانە لە تەواوی ئەورووپا ئیجبارییە.

لەڤین پرسیی: دەی خۆت چی؟ لەو بارەوە لەگەڵ سپەنسێر هاوڕای؟

بەڵام دیسان دیاردەی ترس لە چاوانی سڤیاژسکیدا خۆی نواند، زەردەیەکی گرت و گوتی:

ـ نا، بەڵام ئەو شێوە ماریجەکردنەی کۆڵنج زۆر باشە. هەر بەڕاست خۆت ئەوەت لەو ژنە لادێییە بیست؟

لەڤین دیتی کە ناتوانێ پێوەندی ژیانی راستەقینەی ئەو پیاوە لەگەڵ بیرۆکەی خۆی بدۆزێتەوە. دیاربوو کە هیچ جیاوازییەکی نییە ئاکامی بەڵگەهێنانەوەکانی دەبێ بە چی. تەنیا پێویستی بە بەڵگەهێنانەوە بوو و پێشیخۆش نەبوو کە بواری بەڵگەهێنانەوەکانی تووشی تەنگژەی بکات. ئەوەی پێ خۆش نەبوو و بە گۆڕینی قسەکان و کێشانی بەرەو بابەتێکی خۆش و پێکەنینی ئیتر وازی لە باسەکە هێنا.

تەواوی ئەو شتانەی ئەوڕۆژە شوێنیان لە سەر دانابوو، زیاتر لە هەموو ئەوانەی کە لە رێگا و لە ماڵی کابرا وەرزێڕە بەساڵاچووەکە دیتبووی و هەستی پێکردبوو، دەتگوت بناغە و دەسپێکی ئەو کاریگەری و بیرۆکانەی ئەو رۆژەیەتی و ئێستا تووشی هەیەجان و شڵەژانی

کردووە. ئەم سڤیاژسکیەش بەو مێهرەبانی و سەروڕوو خۆشییەوە، ئەو بیرۆکانەی تەنیا بۆ نواندنیان لە کۆمەڵگادا و بۆ کاتی ئاخافتن لەگەڵ ئەموئەو لە مێشکیدا پەروەردە کردووە و دیاربوو کە فڕی بەسەر ئەو ژیانەیەوە نییە کە لە لەڤینی دەشاردەوە، لەگەڵ ئەوەشدا خۆی کردبووە هاوڕەنگی خەڵك و بە یارمەتیی ئەو بیرۆکانەی کە لەگەڵ فیکرەکانی خۆی سازگار نەبوون بیرۆکەی خەڵکی ڕێنوێنی دەکرد، ئەو مالیکە تووڕە و رقهەستاوەش بەو داوەرییانەوە، کە ژیانی لێ تاڵ کردبوو و هەقیشی بوو، بەڵام هەڵەکەی لەوەدا بوو کە دەرهەق بە کەسانێك رقی لە دڵی خۆیدا کۆکردبۆوە کە تەواویان لە چینی هەڵکەوتووی کۆمەڵگا بوون و لە ئاکامدا ناڕەزایەتییەکانی خۆی لە کاری کشتوکاڵ و ئەو هیوا لێڵەی کە بۆ دۆزینەوەی ڕێگە چارەیەك بۆ ئەو کێشە و گرفتانە لە دڵی خۆیدا پەروەردەی دەکرد، هەموو ئەوانە دەستیان دەدا دەست یەك و ترسێکی پڕ لە شك و تێکەڵ بە چاوەڕوانیی ڕێگەچارەیەکی نزیکیان لە دڵیدا بەدی دەهێنا.

کاتێك لەو ژوورەدا تەنیا کەوت کە بۆیان تەرخان کردبوو و لە سەر دۆشەکە فەنەرییەکە ڕاکشا کە بە هەر جووڵانێکی دەست و لاقی لە ناکاو هەڵدەستایەوە و هەتا ماوەیەکی زۆر خەوی لێنەدەکەوت. ئەگەرچی سڤیاژسکی زۆری قسەی بیرمەندانە بۆ کردبوو، بەڵام هیچ کام لە قسەکانی ئەوی بە دڵ نەبوو، کەچی قسەکانی ئەو مالیکە بۆ ئەوە دەبوو بیری لێبکاتەوە. لەڤین بێ ئیختیار هەموو قسەکانی ئەوی وەبیردەهاتەوە و لە خەیاڵی خۆیدا وەڵامی بۆ دەدۆزینەوە.

«بەڵێ، دەبوو لە وەڵامیدا بڵێم: ئێوە دەڵێن کشتوکاڵی ئێمە بۆیە بە هیچ کوێ ناگات چونکە مووژیکەکان حەزیان لەو داهێنانە نوێیانەی ئێمە نییە و ئێمە دەبێ ئەو هەنگاوانەی بۆ سەرکەوتن پێویستن بە زۆر هەڵیبێنینەوە. من دەڵێم ئەگەر کاری کشتوکاڵی ئێمە بەبێ ئەو داهێنانە نوێیانە ڕاوەستایە هەق بە ئێوە بوو. بەڵام خۆ ڕانەوەستاوە و لە هەرکوێ کرێکار بەپێی خووخدەی خۆی ئیش بکات کارەکە دەڕواتە پێشێ، هەروەك چۆن کاری ئەو وەرزێڕەی سەر ڕێگای ئێرە دەڕواتە پێشێ. ناڕەزایەتیی ئێوە و من لە کاری وەرزێڕیمان نیشانیدا کە یان خەتاکە لە ئێمەیە یان لە کرێکاران. ئێمە هەر لە سەرەتاوە دەمانویست قسەی خۆمان بەرینەسەرێ. یانی ڕێوڕەسمی ئەورووپییەکی کەللە رەقمان ڕەچاو کردووە و کارمان بە تایبەتمەندییەکانی وزەی کار نەبووە کە لە ئیختیارماندا بووە. ئێستا واچاکە هەوڵ بدەین و قەبووڵی بکەین کە ئەو وزەی کارەی هەمانە بەری لە کەموکووڕی نییە. بەڵێ، مووژیك

رووسییە و کارەکانیشی بەپێی خۆماکی خۆی ئەنجامدەدات نەك بەپێی ئاوەزی، ئێمەش دەبێ هەوڵ بدەین کشتوکاڵی خۆمان بەپێی ئەو راستییە گەشە پێبدەین. دەبوو پێم بگوتبایە: وایدانێ کە ملکەکەی ئێوە وەك ملکی ئەو وەرزێڕە کاری لە سەر دەکرێ و ئێوەش رێگایەکتان دەدۆزییەوە کە کرێکار هۆگری پەیدابکات بە گەشەکردنی کارەکەی و لە چاکسازی و داهێنانی نوێدا رادەی هاوسانیتان رادەگرت و کارێکتان دەکرد کە کرێکارەکەتان لە ئیشەکەی نەبێزرێ و دڵخۆشانە قەبووڵی بکات، ئێوەش بێ ئەوەی تەواوی پیت و فەڕی زەوییەکەتان بکێشن و زایەی بکەن، دوو یان سێ بەرانبەری ئێستا داهات و حاسڵی لێهەڵگرن. ئەو کاتە حاسڵەکەتان لە نێوەڕاستدا بەش دەکرد و نیوەتان دەدا بە کرێکارەکە. بەو حیسابە بەشی ئێوە لە ئێستا زیاتر دەبوو و کرێکارەش زیاتری پێدەبڕا. بۆ ئەو کارەش دەبێ رادەی نوێخوازی برێك دابەزێنن و کرێکار دڵخۆش بکەن بە کارەکەی. ئەوەش کە چۆن ئەو کارە وەگەڕ دەخەن مەسەلەیەکی ناسەرەکییە و بێگومان بۆتان جێبەجێدەبێ.»

ئەم خەیاڵە لەڤینی بە توندی تووشی هەیەجان کرد. هەتا نیوەشەو هەر بەخەبەر بوو و بیری لە وردەکارییەکان دەکردەوە کە چۆن دەتوانێ بیخاتە گەڕ و سەرکەوتووانە بە دەستییەوە بێ. سەرەتا نەیدەویست رۆژی دوایی لەوێ بڕوات، بەڵام بڕیاریدا زوو بگەڕێتەوە بۆ ماڵی خۆیان. جگە لەوەش ئەو ژنخوشکەی سڤیاژسکی بەو بەرۆك و پێسیرە کراوەیەوە هەستی شەرم و پەشیمانی لەلا دروست دەکرد و پێیوابوو تووشی تاوانێکی ناحەز و خراپ بووە. بەڵام لە هەمووی گرینگتر ئەوەبوو بڕوات و ئەو کارە بخاتە دواوە. دەبوو بەزووترین کات، بەر لە دەستپێکردنی تووچاندنی پایزەکێڵ گەڵاڵەکەی خۆی لەگەڵ رەعیەتەکان بێنێتە گۆڕێ تاکوو کارەکە بەپێی ئەو شێوە نوێیە ئەنجام بدرێ. بڕیاریدا کە شێوەی کشتوکاڵی رابردوو هەر لە بنەڕەتدا بگۆڕێ.

## بیست و نۆ

وەگەڕ خستنی گەڵاڵە نوێیەکەی لەڤین لەگەڵ گیروگرفتی زۆر بەرەوڕوو بوو، بەڵام هەتا توانیی هەوڵیدا هەڵبەت ئەوەی دەیویست وەدەستی نەهێنا بەڵام بەو جێیە گەیشت کە بێ ئەوەی خۆی هەڵخەڵەتێنێ بێتە سەر ئەو باوەڕەی کە ئەو کارەی بایی زەحمەتەکەی دەبێ. یەکێك لە گرفتە گەورەکان ئەوەبوو کە کارەکە لە کاتی بەڕێوەبردندا بوو و نەیدەتوانی رایگرێ

و هەموو شتێك لە سەر بنەمای نوێ دامەزرێنێ. وەك ئەوە وابوو کە بیهەوێ مەکینەیەك لە کاتی هەڵبوونیدا تەعمیر و میزان بکات.

هەر ئەو شەوەی گەیشتەوە ماڵێ گەلاڵەکەی خۆی لەگەڵ گزیرەکەی هێنایە گۆڕێ. گزێر هەتا ئەو جێیەی قسەکانی ئاغاکەی بە خۆشحاڵییەوە لەگەڵی کۆك بوو کە دیاربوو کارەکانی تا ئەو زەمانە بێکەڵك بووە، گوتی کە خۆشی لە سەرەتاوە قسەی ئاوای کردووە بەڵام هیچ کەس گوێی بە قسەکانی نەبزواوە. بەڵام کاتێك پێشنیارەکانی لەڤینی بیست سەبارەت بە شەریککردنی کرێکاران لە هەموو کاروباری مڵکەکەدا تەنیا تۆزێ رەنگی هەڵبزرکا و هیچ چەشنە بیروڕایەکی دەرنەبڕی و لەڕێوە مەسەلەی کۆکردنەوەی باقەجۆیەکانی هێنا گۆڕێ و گوتی کە رۆژی دوایی حەتمەن دەبێ دەستوور بدات زەوییەکان بکێڵنەوە، بەجۆرێك کە هەستی کرد ئێستا قسەکردن لە سەر ئەو مەسەلەیە بێجێیە.

کاتێك لەوبارەوە لەگەڵ رەعیەتەکانی خۆی دەدوا و پێشنیاری پێدەکردن کە زەوییەکانیان بە شەرت و شێوەیەکی نوێ دەداتێ، هەموو جارێك لەگەڵ ئەو مەسەلە گەورەیە بەرەوڕوو دەبوو و ئەویش ئەوەبوو کە ئەوان ئەوەندە سەرقاڵی کاری رۆژانەیان بوون کە دەرفەتیان نەبوو بیر لە چاك و خراپ یان زەرەد و قازانجی ئەو گەلاڵەیە بکەنەوە.

سەپانی ساویلکە، ئیڤانی گاوان، دیاربوو پێشنیارەکەی لەڤینی سەبارەت بە بوونە شەریك لە قازانج و سوودی ئاژەڵداری زۆر بە باشی تێگەییوە و لەڕێوە پێشوازیی لێکرد و زۆری بە دڵ بوو. بەڵام هەرجارێك کە لەڤین باسی قازانجەکانی داهاتووی بۆ دەکرد و پێداگریی لە سەر دەکرد شوێنەواری ترسێك روخساری ئیڤانی دادەگرت و داخی ئەوەی لێدەهات، کە ناتوانێ هەتا کۆتایی گوێ بۆ قسەی ئەربابەکەی شل بکات و لەڕێوە کارێکی بۆ خۆی دادەتاشی کە نەدەکرا وەپاشی بدات یان بەپەلە شەنەکەی دەست دەدایە و کۆڵێکی ئالف لە کادێنەکە دەهێنا دەرێ یان ئاوی دەکردە ئاخوڕاوی مانگاکانەوە یان ژێری پێی دادەدان و شیاکەی دەڕشت.

گرفتێکی تریش هەبوو، ئەویش دڕدۆنگیی زۆری گوندنیشینان بوو و بە هیچ شێوەیەك دڵیان پاك نەدەبۆوە. ئەوان بڕوایان نەدەکرد کە ئەربابەکەیان مەبەستێکی جگە لە چەوسانەوە و کارلێکێشانی ئەوانی هەبێ. ئەوان سوور سوور دەیانزانی کە ئەوەی دەیڵێ وانییە و قەت مەبەستی سەرەکیی خۆی وەدەر ناخات و شتێکی تری لەژێر سەردایە. خۆشیان هەر وابوون کاتێك بیروڕای خۆیان دەردەبڕی زۆریان قسە دەکرد بەڵام قەت ئەوەی مەبەستی سەرەکییان بوو دەریان نەدەبڕی. جگە لەوەش یەکەم شەرتی گوندنشینان بۆ قەبووڵکردنی گرێبەستەکەی

ئەوەبوو کە ناچار نەبن شێوەی کاری خۆیان بگۆڕن و کەرەسە و مەکینەی نوێ بەکار بێنن. (بۆیە لەڤین هەستی دەکرد کە مالیکە زمانتاڵەکەی ماڵی سڤیاژسکی ناهەقی نەبوو.) ئەوان دەیانزانی کە گاسنی ئەورووپایی چاکترین جووتی پێدەکرێ و دەزگای بژار و کولۆشکێنیش خێراتر کار دەکەن بەڵام هەزار و یەك بیانوویان دێنایەوە تاکوو کاریان پێنەکەن لەڤینیش ئەگەرچی لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە دەبی ئاستی شتە نوێیەکان دابەزێنن، بەڵام لەو داهێنانە نوێیانە کە سوور سوور دەیزانی لە کۆنەکان باشترن ناچاربوو چاوپۆشی بکات. لە ئاکامدا سەرەڕای ئەو هەموو کێشە و گرفتە بە مەبەستی خۆی گەیشت و پایزێ گەڵاڵەکەی دەست پێکرد، یان لانیکەم خۆی پێیوابوو دەستی پێکردووە.

لەڤین سەرەتا دەیویست تەواوی مەزرا و کاروباری گوندەکە یەکجێ و بەپێی گرێبەستی شەریکایەتی بدات بە گزیر و ڕەعیەتەکان. بەڵام زوو بۆی دەرکەوت کە ئەو کارە ناگونجێ و بڕیاریدا کە دابەشی بکات. ئاژەڵداری و باخی میوە و تەڕەکاری و گیاجاڕ و گەنم و جۆ هەرکام بکات بە چەند بەشەوە و هەر بەشەی بێتە مەزرایەکی سەربەخۆ و بدرێ بە بنەماڵەیەك. ئیڤان ئەو گاوانە ساویلکەیە کە بە بڕوای لەڤین لە هەموویان باشتر لە مانای گەڵاڵەکە گەیشتبوو، شەریکەیەکی زبارەیی ڕێك خست کە زیاتر لە ئەندامانی بنەماڵەکەی خۆی پێکهاتبوو و ڕەزایەتیی خۆی بۆ شەریکایەتی لە ئاژەڵداریدا دەربڕی. شەش بنەماڵەی لادێیی بە یارمەتیی فیۆدۆر ڕێزوونۆڤ[149] کە دارتاشێکی زیرەك بوو، پەڵە زەوییەك کە دوورتر بوو و هەشت ساڵ بوو بەیار مابۆوە بەپێی ئەو مەرجە زبارییە نوێیە هەڵیانگرت و شووراییێڤ[150] بەپێی ئەو مەرجە سەوزیکارییەکەی لە ئەستۆ گرت. ئەو بەشانەی تری مڵکەکە وەك پێشوو مایەوە، بەڵام هەر ئەم سێ یەکەیە بووە دەسپێکی ڕێکخراوە نوێیەکەی ئاوایی و بە تەواوی سەرنجی لەڤینی بۆ لای خۆی ڕاکێشا. هەڵبەت بارودۆخی سوود و قازانجی ئاژەڵداری جارێ باشتر لە رابردوو نەبوو. ئیڤان بە تەواوی دژی گەرمکردنی تەویلەی مانگاکان و گرتنی نڤشك لە خامەی تازە بوو، لە سەر ئەو باوەڕەش بوو کە مانگا لە هەوای سارددا کەمتری ئالیك دەوێ و نڤشکێك کە لە خامەی ترشاو دەگیرێ زیاتر خۆڕادەگرێ، وەك رابردوو هەقدەستی دەویست و قەبووڵی نەدەکرد کە ئەو پارەیەی وەریدەگرێ هەقدەست نییە بەڵکوو بێحانەیەکە و دواتر لە سوودەکەی دەگێڕنەوە.

149- Feodor Rezunov

150- Chourayer

لە راستیدا گورووپی فیۆدۆر ڕێزوونۆڤ بەپێی ئەو گرێبەستەی کە قەبووڵیان کردبوو بەر لە تووچاندن دیسان بە نیروئامووری گاسن تیخەیی ئەورووپی شێویان بڕیوە و بیانووشیان ئەوەبوو کە بە جوانی فریا ناکەون و کاتی تەواویان بۆ ئەو کارە نییە.

مووژیکەکانی ئەو گرووپە، ئەگەرچی پەیمانیان بەستبوو کە بەپێی مەرجی تازەی زەبارەیی لە سەر زەوییەکان کار بکەن، بەڵام بە ملکی شەریکایەتییان نەدەزانی بەڵکوو وەك کڕین چاویان لێدەکرد کە نرخەکەی لە بەروبۆی مەزراکە دەدەنەوە و ئەندامانی ئەو گورووپە و ڕێزوونۆڤ خۆشی بەردەوام بە لەڤینیان دەگوت «واچاکە پارەی زەوییەکە وەرگری. چونکە تۆش خاترجەمتر دەبی و ئێمەش زیاتر هەست بە ئازادی دەکەین.» جگە لەوەش بنیادی ئاژەڵدارییەك و کادێنێك کە بەڵێنیان دابوو و بەپێی گرێبەستێکی کە لە نێوانیاندا هەبوو، دەبوو لە زەوییەکەدا دروستی بکەن، بە بیانووی جۆراوجۆر خستیانە دواوە و زستان بەسەردا هات.

شوورایێڤ ئەو سەوزیکارییەی کە هەڵیگرتبوو دەیویست بە ئیجارە بیدات بە لادێییەکانی دیکە و دیاربوو لە گرێبەستەکەی نێوانیان زۆر بە هەڵە تێگەیشتبوو و بە ئانقەستیش خۆی لە گێلی دابوو.

هەڵبەت لەڤین زۆر جار لەگەڵ مووژیکەکان دەدوا و قازانج و بەروبۆی ئەو کارە گەورەی کە دەستیان پێکردبوو بە وردی بۆی شی دەکردنەوە، بەڵام هەستی دەکرد کە ئەوان تەنیا گوێیان لە دەنگی دەبێ و لەم گوێیانەوە دەیبیستن و لەو گوێیەی تریانەوە دەردەچێ و دڵنیان کە ئەو هەرچی بڵێ ئەوان ناهێڵن هەڵیانخەڵەتێنێ. لەڤین ئەو حاڵەی بەتایبەت کاتێك هەست پێدەکرد کە لەگەڵ زیرەکترینیان، یانی ڕێزوونۆڤ قسەی دەکرد و فیکری ئەوی لە تروسکەی چاوانیدا دەخوێندەوە. ئەو تروسکەیەش بە روونی نیشانی دەدا کە کابرای لادێیی لە دڵی خۆیدا پێی پێدەکەنێ و تەواو دڵنیایە کە ئەگەر فریودانێك لە ئارادا بێ ئەو فریو ناخوات.

بەڵام سەرەڕای هەموو ئەوانە لەڤین پێیوابوو کە گەڵاڵەکەی سەری گرتووە و بە وردبینییەکی زۆرەوە لە کاری ژمێریاری و پێداگری لە سەر بەردەوام بوونی کارەکەی ئاخری پێیان دەسەلمێنێ کە بەهرەی ئەو چەشنە ڕێکخستن و بیرۆکەی گەڵاڵە داڕشتنەکەی بێوێنەیە و کارەکانی زۆر بە باشی دەڕواتە پێشێ.

ئەو کارانە لەگەڵ باری قورسی بەڕێوەبردنی کاروباری ملکەکەی کەوتبووە سەرشانی و هەروەها کاری نووسینی کتێبەکەی هێندەی هاوینەکەی پڕکردبوو کە سەری نەدەپەرژا بچێت بۆ ڕاو. کۆتایی مانگی ئووت بوو کە لەلایەن خزمەتکاری ئابلۆنسکی کە زینەکەی بۆ هێنابۆوە ئاگادارکرا کە ئەوان گەڕاونەتەوە بۆ مۆسکۆ. هەستی دەکرد بە وەڵام نەدانەوەی

نامەکەی داریا ئابلۆنسکی و بێئەدەبییەکەی خۆی کە هەرکاتێك بیری لێدەکردەوە لە شەرمانا سوورهەڵدەگەڕا، تەواوی پردەکانی پشت سەری خۆی رووخاندووە و ئیتر هیچ کات ناچێت بۆ دیدەنیی ئەوان. ئەو کاتێك بیری لە سڤیاژسکیش دەکردەوە هەروا هەستی بە شەرمەزاری دەکرد چونکە بەبێ خوداحافیزی لە ئەو و خێزانەکەی گەڕابۆوە بۆ گوندەکەی خۆیان. خەیاڵی نەبوو تازە بگەڕێتەوە بۆ لای ئەویش. ئێستا ئیتر گوێی بەو شتانە هەر نەدەدا. کاری رێکخستنی گەڵاڵە نوێیەکەی وەهای سەرقاڵ کردبوو فریا نەدەکەوت سەری خۆی بخورێنێ و لە ماوەی تەمەنیدا قەت هەتا ئەو رادەیە بیری نەکردبۆوە. ئەو کتێبانەی کە سڤیاژسکی پێیدابوو هەموویانی خوێندەوە و رایسپارد لە شار چەند کتێبی دیکەشی بۆ بکڕن. تەنانەت ئەو کتێبە ئابووری و سۆسیالیستییانەی کە سەبارەت بەو مەبەستەی ئەو نووسرابوون هەمووی خوێندەوە و هەر ئەو جۆرەی کە چاوەڕوان بوو هیچ شتێکی سەبارەت بە کارەکەی خۆی لێهەڵنەکڕاندن. لە کتێبە ئابوورییەکاندا، بۆ وێنە کتێبی میل، کە بەر لە کتێبەکانی تر زۆر بە تامەزرۆییەوە خوێندییەوە و سات بە سات چاوەڕێبوو وەڵامی مەسەلەکەی خۆی تێدا وەدۆزێ، یاساگەلێکی بەرچاو کەوت کە لە بارودۆخی کشتوکاڵی ئەورووپایان هەڵگوێستبوو. بەڵام بە هیچ شێوەیەك تێنەدەگەیشت بە گشتی ئەو یاسایە لە کوێدایە کە لەگەڵ مەسەلەکانی ئێستای رووسیا یەکی دەگرتەوە. ئەو گرفتەی لە کتێبە سۆسیالیستییەکاندا دی. ناوەرۆکی ئەو کتێبانە یان خەیاڵپڵاوی نەگونجاو و خوش بوو لە دەورانی زانکۆدا خولیای بووبوو، یان چاکسازی و نۆژن کردنەوەی هەلومەرجێك بوو کە تایبەتی ئەورووپا بوو و لەگەڵ مەسەلەگەلی کشتوکاڵی رووسیا هیچ وێچوونێکی نەبوو. کتێبە ئابوورییەکانیش باسی یاساگەلێکیان کردبوو کە کتومت بۆ هەموو شوێن و وڵاتێك گونجاو بوون. مەکتەبی سۆسیالیزم دەیگوت کە گەشەکردن بەپێی ئەو یاسایانە دەبێتە هۆی رووخانی سیستەمەکە و هیچ کام لەو دوانە نەك هیچ وەڵامێکیان بۆ ئەو مەسەلەیە بە دەستەوە نەدابوو بەڵکوو چکۆلەترین ئاماژەشیان پێ نەکردبوو کە ئەوان، یانی لەڤین و مووژیکەکانی و وەرزێڕانی رووسی بە گشتی وزەی کار و میلیۆنان دسیاتین زەوی چی لێبکەن تاکوو لە سەر رەوتی ئاسوودەیی و قازانجی گشتی شوێنی بەرچاو دابنێ.

لەڤین هەرکە پێی نایە ئەو بوارەوە هەموو ئەو کتێبانەی کە سەبارەت بە ئەو مەسەلەیە نووسرا بوون بە وردی و هۆگرییەکی زۆرەوە دەیخوێندنەوە و بڕیاری دابوو کە پاییز بچێت بۆ دەرەوەی وڵات و ئەو مەسەلانە لە شوێنی خۆیان متاڵا بکات، چونکە نەیدەویست کاتی لێدوان سەبارەت بە بوارە

جۆراوجۆرەکانی کە بۆی دەهاتە پێشێ ئیتر گرفتی بۆ دروست بکات، چونکە زۆر جار کە لە بیرۆکەی بەردەنگەکەی خۆی دەگەیشت و دەیویست بیروڕای خۆی دەبڕێت دەیانگوت: تۆ قەتت کتێبی کاوفمان[151] و جۆنز[152] و دووبۆیس[153] و میچێللی[154] خوێندۆتەوە؟ حەتمەن بیانخوێنەوە، ئەوان باشیان لەو مەسەلەیە کۆڵیوەتەوە. ئێستا بە روونی دەیدی کە کاوفمان و میچێللی قسەیەکی نوێیان پێنییە و لانیکەم دەیزانی لە دوای چی هەڵدەسووڕێ، دەیدی کە رووسیا زەویی پڕ پیت و داهات و مرۆڤی باش و زەحمەتکێشی هەیە و لە هێندێك بواردا، بۆ وێنە لە ملکی کابرا پیرەی سەر رێگاکەیدا دیتبووی، کە خەڵك ئەگەر بیانهەوێ دەتوانن بەروبوومی زۆر باش لە زەوی وەدەست بێنن. بەڵام لە زۆر بواردا کە دەسمایەکەیان بە شێوەی ئەورووپی وەگەڕ بخەن داهاتەکەیان زۆر خراپە و هۆکارەکەشی تەنیا ئەوەیە کە خەڵك دەخوازن وزەی خۆیان تەنیا بە شێوەیەك کە تایبەتی خۆیانە بە باشی وەگەڕی دەخەن و ئەو دژوازییەش بە هەڵکەوت نییە بەڵکوو مسۆگەرە و لە گیانی خەڵکدا ریشەی داکوتاوە. ئەو پێیوابوو رووسەکان دەست بەسەردا گرتنی ئەو زەوییە پان و بەرینانەی وەڵاتەکەیان کە بەبێ داهات ماونەتەوە و کاری کشتوکاڵ لەواندا بە ئەرکی سەرشانی خۆیانی دەزانن و هەتا ئەو کاتەی تەواوی زەوییەکان داگیر دەکەن وشیارانە بە ئەرکی خۆیان دەزانن کە سەبارەت بەو رەوشت و شێوازانەی کە پێیانوایە شیاوە پێی وەفادار دەبن و ئەو شێوازانەش قەت ئەو جۆرە نییە کە ئەوان پێیان وایە خراپە. ئەو دەیویست ئەو مەبەستە وەك بیروڕا لە کتێبەکەیدا بگونجێنێت و راستەوخۆ لە سەر ملکەکەشی دابەزێنێت.

## سی

کۆتایی مانگی سێبتامبر بۆ بینایەك کە بڕیاربوو لە زەوییە شەریکە زەبارییەکاندا دروست بکرێ، دەستەك و راژەیان هێنا بۆ شوێنەکە و نقیشکی بەرهەم هاتوو لە شیری مانگاکانیان فرۆشت و پارەکەیان دابەش کرد. کاری کشتوکاڵ لە راستیدا بە باشی دەڕۆیشتە پێشێ، یان لانیکەم لەڤین پێیوابوو کە باش

151- Kaufmann
152-Jones
153- Dubois
154- Mitchelli

دەڕواتە پێشێ. ئێستا تەنیا پێویست بوو بڕوات بۆ هەندەران و ئەو کاروبارانەی لە وڵاتە ئەورووپییەکان لەو بوارەدا بەڕێوەچووە لە شوێنی خۆی متالآی بکات و بەڵگەیەکی باوەڕ پێکراو وەدەست بێنێ سەبارەت بەوەی کە لە ئەورووپا ئەوەی بەڕێوەچووە دروست نییە و بتوانێ مەسەلەکە لە باری هزرییەوە روون بکاتەوە و کۆتایی بە نووسینی کتێبەکەی بهێنێ و ئەو کتێبەش، بەپێی ئەو خولیایانەی لە مێشکی خۆیدا داڕشتبوو، نەك بەدیهێنەری شۆڕشێك بوو لە بواری زانستی ئابووریدا، بەڵکوو سیستەمە کۆنەکەشی بەجارێ لەبەریەك هەڵدەوەشاند و بنەمای زانستێکی نوێی سەبارەت بە پێوەندیی نێوان وەرزێڕ و زەوی دادەمەزراند. لەڤین تەنیا چاوەڕێبوو داهاتی گەنمەکەی بفرۆشێ و پارەکەی وەرگرێ و بەرەو ئەورووپا وەڕێبکەوێ. بەڵام باران و تەڕوتووشی دەستیپێکرد و هەڵگرتنی خەرمان و هەڵکەندنی پەتاتە نەدەگونجا و تەنانەت فرۆشتنی گەنمەکەشی دەژوار بوو. چونکە رێگاوبان تەواوی بووبووە قوڕاو و زیلاقە و کەڵ دەرنەدەچوو، دوو ئاش سێلاو رایماڵین و هەواش رۆژ لەگەڵ رۆژ تووش و ناخۆشتر دەبوو.

بەیانیی سییەمی سێبتامبر هەواکەی تاوساو بوو و لەڤین هیوادار بوو هەوا خۆش بێت و دەستیکرد بە پێچانەوەی بارگەوبنەی سەفەر. دەستووری بە گزیردا گەنم بار بکەن و ناردی بۆ لای بازرگانی دەغڵودان کە پارەی لێوەرگرێ و خۆی بە سواری کەوتە گەڕان بە نێو زەوییەکانیدا تاکوو بەر لە رۆیشتنی دەستووری کارەکانیان پێبدات.

بەڵام کاتێك کارەکانی راستەوپاستە کرد، ئێوارە بارانێکی بەخوڕ دایدا و لە ملیوانەی بارانییەکەی و لە ملی چەکمەکانییەوە ئاو دەچووە ژوورێ و سەرتاپای خووسا بەڵام زۆر بە کەیف و بەدەماغ گەڕایەوە بۆ ماڵێ. باران و سەرما لای ئێوارە توندتری کرد. تەرزەلووکەیەکی ورد دایدا و وەها دەدرا بە سەرو گوێلاکی ئەسپە بەستەزمانەکەیدا کە ناچاربوو لارەولار بڕوات، بەڵام لەڤین کە کڵاوە بارانییەکەی لە سەر کردبوو و خۆی توندوتۆڵ داپێچابوو گوێی لێنەبوو، جارجار بە نەشەوە چاوی لە دەورووبەری خۆی و گۆلکاو و ئاوی لێڵی جۆگە و ئاودڕان دەکرد و هەروەها زەنگوڵی دڵۆپە باران کە بە لکی داراندا شۆڕبووبوونەوە و هێندێ جاریش پەڵەی سپیی تەرزەلووکەی نەتواوە کە لە سەر تەختەی پردەکە و گوێڕێگا مابوونەوە، یان گەڵای ئەرخەوانی و هێشتا نەژاکاوی داربناو کە بە بارستایی زۆرەوە لەبەر دارە رووتەڵەکاندا راخرابوون سەرنجی رادەکێشا. سەرەڕای دڵتەنگیی سروشتی دەورووبەری، هەستێکی تایبەت و نەشەبزوێن دڵی داگرتبوو. ئاخافتنی لەگەڵ گوندنشینانی دەورووبەر و دورەدەستی گوندەکەیان دیاربوو کە ئەوان وردە وردە خوو بەو پێوەندییە تازانە دەگرن، ئەو وەرزێڕە پیرەی کە لەڤین ماوەیەك لە ماڵەکەی لایدا و خۆی وشك کردەوە دیاربوو گەڵاڵەکەی ئەوی بە دڵە و خۆی خوازیاری ئەوەبوو کە لەگەڵ چەند کەسی دیکە بۆ کڕینی ئاژەڵ ببێتە شەریك.

لەڤین لە دڵی خۆیدا گوتی «تەنیا دەبێ بۆ گەیشتن بە ئامانج سەرسەختی بنوێنم و من بە مەبەستی خۆم دەگەم و ئەوەیکە مەبەستیشمە بایەخی کار و زەحمەتەکەی هەیە. ئەو بەرنامە کاری تاکە کەسیی خۆی نییە و بارودۆخی ژیانی وەرزێڕەکان دەبێ لە بنەڕەتدا گەشەی پێبدرێ. هەژاری دەبێ جێی خۆی بە دەوڵەمەندی و دڵخۆشی بدات، پێکهاتن و یەکگرتوویی بەرهەم و داهات دەبێ جێگای دژایەتی و دژوازی بگرێتەوە. وەلحاسڵ شۆڕشێکی بەبێ خوێن رشتن، شۆڕشێکی مەزن، سەرەتا ناوچەی قەزا و پاشان پارێزگا، دوای ئەویش رووسیا و لە ئاکامدا تەواوی دنیا دەتەنێتەوە" چونکە فیکری باش قەت بەبێ ئاکام نامێنێتەوە و خۆشی و قازانجی بە دواوەیە. بەڵێ ئەوە ئامانجێکە بایەخی هەیە و مرۆڤ دەبێ لە پێناویدا ئارەق بڕێژێ، ئەوەش تەواوی کاری من، (کوسیتا لەڤینە)، کاری منێك کە بە بۆینباخی رەشەوە چوومە کۆڕی سەما و کاترینا ئیشچر باتسکایا پێشنیار و خوازبێنییەکەمی رەتکردەوە و لەبەرچاوی خۆم کە ئاوا زەبوون و سووکم هیچ هەمییەتێکی نییە. دڵنیاشم کە فرانکلین[١٥٥] کاتێك بیری لە رابردووی خۆی دەکردەوە وەك من خۆی بە سووك و ناچیزە دەزانی و هەستی بە لووتبەرزی نەدەکرد. ئەوانە هیچ کام گرینگ نین. ئەویش حەتمەن بۆخۆی ئاگافیا میخائیلۆڤنایەکی بووە و گەلاڵەکانی خۆی لەگەڵ هێناوەتە گۆڕێ و بۆی روونکردۆتەوە.»

لەڤین سەرقاڵی ئەو بیر و خەیاڵانە بوو و وڵات تاریك داهات کە گەیشتەوە ماڵێ.

گزیر کە چووبوو بۆ لای کابرای بازرگان هاتبۆوە و بەشێك لە پارەکەی هێنابوو. قەرار و بڕیەی کاری لەگەڵ وەرزێڕە پیرەکە دانابوو کە داخوازی بەشداری کردن بوو لە شەریکەکەدا و گزیر لە رێگای گەڕانەوەدا بۆی دەرکەوتبوو کە تەواوی حاسڵاتی گەنم لە سەحرا ماوەتەوە و سەد و شەست خەرمانی ئەوان لە چاو هی خەڵکی هەر نایەتە ئەژمار.

کە شێوی خوارد بەپێی عادەت کتێبێکی هەڵگرت و لە سەر کورسییەکی نەرم دانیشت و لەگەڵ خوێندنەوە لەبیری سەفەرێکدا بوو کە بۆ تەواوکردنی کتێبەکەی لەبەری بوو. ئەمڕۆ گرنگایەتیی کارەکەی زۆر بە روونی لەبەر چاوی بوو و خاڵی سەرەکی و بنەڕەتیی ئەندێشەکانی هەر لە خۆوە بەند بە بەند لە زەینیدا شکڵی دەگرت و مرێس دەبوو. لە دڵی خۆیدا دەیگوت «ئەوە

---

١٥٥- تۆلستۆی، بێنجامین فرانکلینی زۆر خۆش دەویست و لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە تەواوی بەرهەمەکانی بە زمانی ڕووسی وەرگێڕدرێنەوە و چاپ بکرێن و بکەونە بەر دیدەی خەڵك بە گشتی.

دەبێ یادداشت بکرێ، ئەوە دەبێ وەك پێشەکییەکی کورتی لێبێ کە بەرلەوە بە پێویستم نەدەزانی.»

هەستا تاکوو بچێتە پشت مێزی نووسینەکەی و لاسکاش کە لەبەر پێیدا وەرکەوتبوو هەستا و خۆی کێشایەوە و چاوێکی لێکرد، دەتگوت دەیهەوێ بپرسێ بچێت بۆکوێ؟ بەڵام لەڤین دەرفەتی یادداشتکردنی نەما چونکە بەرپرسانی گورووپی وەرزێڕەکان هاتبوون تاکوو سەبارەت بەو کارانەی کە دەبوو بیکەن راوێژ بکەن و لەڤین چوو بۆ ژوورەکەی دیکە بۆ لایان.

دوای ئەوەی سەبارەت بە کاروباری رۆژی دوایی دەستووری پێویستی پێدان و چاوی بە مووژیکەکان کەوت کە کاریان پێیبوو و مەرەخەسی کردن، گەڕایەوە بۆ ژوورەکەی خۆی و دەستیکرد بە نووسین. لاسکا لە ژێر مێزەکەدا لە پەنای لاقی وەرکەوت و ئاگافیا میخائیلۆڤناش بە دەم گۆرەوی چنینەوە لە سەر جێگای خۆی دانیشت.

لەڤین دوای ماوەیەك نووسین لەناکاو یادی کیتی و خوازبێنییەکەی خۆی و دیتنی ئەو رۆژەی لە نێو فایتوونەکەدا، هەمووی لە زەینی خۆیدا تاوتوێ کرد و ئاراوقارای لێهەڵگیرا. هەستا و دەستیکرد بە پیاسەکردن بە نێو ژوورەکەدا.

ئاگافیا میخائیلۆڤنا گوتی: بۆ ئەوەندە لەو ژوورەدا خۆت قەتیس کردووە و تاقەتت نەماوە؟ واچاکە بڕۆی بۆ گڕاو.

ـ دووسبەی هەر دەچم، ئاگافیا میخائیلۆڤنا. نەك هەر بۆ گڕاو، بەڵکوو دەبێ کارەکەم بە ئاکام بگەیەنم.

ـ چ کارێك! ئەوەندە خۆت بۆ ئەو مووژیکانە تووشی ئازار و دەردەسەری کرد بەس نییە؟ هەتا ئێرەش خەڵك پاشملە دەڵێن ئەرباب میداڵیا لە تێزار وەردەگرێ. هەر بە راستیش سەیرە. چ کارت بەسەر ئەوەوە داوە! ئاوا خۆت خستۆتە زەحمەتەوە بۆ ئەوان؟

ـ من خۆ زەحمەت بۆ ئەوان ناکێشم. کار بۆ خۆم دەکەم.

ئاگافیا میخائیلۆڤنا لە هەموو وەردەکارییەکانی گەڵاڵەی کشتوکاڵەکەی لەڤین ئاگاداربوو. لەڤین ئەغڵەب هەموو کارەکانی خۆی بە وردی بۆ باس دەکرد و زۆر جار دەهاتە پێشێ کە پێکەوە دەکەوتنە مشتومڕ و روونکردنەوەکانی ئاگافیا میخائیلۆڤنای بە دڵ نەبوو. بەڵام ئەمجارە ئاگافیا میخائیلۆڤنا بە شێوەیەکی خراپ لە قسەکانی لەڤین گەیشت.

هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی: هەڵبەت مرۆڤ دەبێ بەر لە هەموو شتێك بیر لە نامەی کردەوەکانی خۆی بکاتەوە. با دوور نەڕۆین هەر ئەم پارفیۆن دنیسچەی گوندی خۆمان، راستە پیاوێکی لادێیی نەخوێندەوار بوو، بەڵام خودا مردنێکی وای بە نەسیب کرد کە ئاواتی بۆ بخوازی. بەر لە مردنەکەی قەشە هاتەژوور سەری و دۆعای خوێند و وسڵی تایبەتیدا ـ ئەم پارفیۆنە وەرزێڕێك بوو کە تازە کۆچی دوایی کردبوو.

لەڤین گوتی: من باسی نامەی کردەوەکانم ناکەم، دەڵێم ئەم کارانە بۆ زیادبوونی بەرهەم و داهاتی خۆم دەکەم. ئەگەر مووژیکەکان چاکتر کار بکەن بە قازانجی منە و بەهرەی زیاترم پێدەگات.

ـ لادێیی تەوەزەل، هەر کارێکی بۆ بکەی، پێنازانێ و لە سەر کارەکەی خەونووچکە دەیباتەوە. ئەگەر ویژدانی هەبێ، کار دەکا و ئەگەر نەشیبێ دەغەڵی دەکات و هیچیشی لەگەڵ ناکرێ.

ـ بەڵام خۆتان گوتتان ئیڤان وریا بۆتەوە و چاکتر بە مانگاکان رادەگا.

ئاگافیا میخائیلۆڤنا، کە دیاربوو پێوشوێنی زنجیرەی فیکرەکانی خۆی نەك سەرسەری و بە رێکەوت بەڵکوو زۆر بە وردی گرتووە، وەڵامی دایەوە: من تەنیا شتێك دەڵێم، ئێوە دەبێ ژن بێنن. هەر ئەوەو تەواو.

ئاماژەی ئاگافیا میخائیلۆڤنا بە مەبەستێك کە ساتێك لەمەوبەر خۆی بیری لێدەکردەوە تووشی دڵتەنگی و زویربوونی کرد. نێوچاوانی تێکنا و وەڵامی نەدایەوە. دیسان دانیشتەوە و دەستیکردەوە بە نووسین و فیکر و بیرۆکەکانی خۆی سەبارەت بە گرینگایەتیی ئەو کارە لە مێشکی خۆیدا دووپاتکردەوە. ئێستا هێندێ جار لە بێدەنگی ژوورەکەدا گوێی بۆ چرتەی میلی گۆرەوی چنینەکەی ئاگافیا میخائیلۆڤنا شل دەکرد و ئەو فکرەی وەبیردەهاتەوە کە هەوڵی دەدا خۆی لێ ببوێرێ و دیسان گرژ دەبۆوە.

سەعات نۆ بوو کە زرەی زەنگوڵەی چەند ئەسپ و جیڕەی تەگەری عارەبانەیەکی بیست بە نێو قوڕوچڵپاودا دەڕۆیشت. ئاگافیا میخائیلۆڤنا گوتی: فەرموون، ئەوە میوانتان هات و لەو دڵتەنگییە نەجاتتان دەدات ـ ئەوەی گوت و هەستا و رۆیشت بۆ لای دەرگاکە. بەڵام لەڤین وەپێشی کەوت. کارەکەی نەدەچووە پێشێ و میوانەکەشی هەرکەسێك بوو دەبووە هۆی دڵخۆشی بۆی.

## سی و یەك

لەڤین هەتا نێوەڕاستی پلیکانەکان هاتبووە خوارێ کە گوێی لە کۆخەیەکی ئاشنابوو لەسەر پێگوڕکەی بەر دەرگاکە، بەڵام کۆخەکەی بە هۆی ترپەی پێی خۆیەوە بە روونی نەدەبیسترا و هیوادار بوو کە بە هەڵە چووبێ. پاشان قەڵافەتی کەڵەگەت و رەقەڵەی ئاشنایەکی هێنایە بەرچاوی خۆی، کە ئیتر ناتوانێ خۆی هەڵخەڵەتێنێ. سەرەڕای ئەوانەش هەروا هیوادار بوو کە بەهەڵە چووبێ و ئەو کابرا کەڵەگەتە کە بە دەم کۆخینەوە خەریکی داکەندنی باڵتە کەڵپۆسەکەی بوو نیکۆلای برای نەبێ.

لەڤین براکەی خۆش دەویست، بەڵام حەزی نەدەکرد هەمیشە لەبەر چاوی بێ. ئێستا بە هۆی فیکرێکەوە کە بە زەینی گەیشتبوو و وەبیرهێنانەوەی ئاگافیا میخائیلۆڤنا تەواو تووشی پەرۆشی و شێواویی کردبوو و حەزی نەدەکرد چاوی بە براکەی بکەوێ. بەجێی میوانێکی سەرخۆش و بەدەماخ و بێگانەیەك کە هیوادار بوو لە بەندی فیکر و خەیاڵە ئاڵۆزەکەی دەربازی بکات، براکەی هاتبوو کە زۆر باشی دەناسی و دەبوو لەلای دانیشێ و ئەویش مەحرەمانەترین فیکرەکانی دەورووژاند و ناچاری دەکرد هەمووی بۆ باس بکات.

بەهۆی ئەو هەستە ناحەزەوە لە خۆی بێزار بوو، بۆیە بە هەڵەداوان رۆیشت بۆ سەر پێگۆڕکەی هاتنەژوورەوە، کە لە نزیکەوە براکەی دی شێواوییە دەروونییەکەی خێرا لەبیر چۆوە و جێگای خۆیدا بە دڵسۆزی. ئەگەرچی نیکۆلای لە دیدارەکەی پێشوویدا بە باسی نەخۆشی و لەشبەباریی خۆی ئەوی تووشی ترس کردبوو، ئێستا لەوکاتیش کزتر و بێهێزتر بووبوو، هەر بەڕاستی وای لێهاتبوو تەنیا پێست و یەسقانەکەی مابوو.

لەسەر پێگۆڕکەکە راوەستابوو و ملە درێژ و باریکەکەی بۆ لایەك دەلەقاند و شاڵگەردنەکەی هێندە بە تووڕەیی لە ملی دەکردەوە کە دەتگوت دەیهەوێ بیپچڕێنێ و بزەیەکی ساردوسڕ نیشتبووە سەر لێوی. لەڤین بە دیتنی ئەو زەردەیە کە وەڕەزی و ناساغی پێوە دیاربوو هەستی کرد کە ئۆناقێك گەرووی رێکدەگوشێ.

نیکۆلای بێ ئەوەی چاو لەسەر روخساری براکەی هەڵگرێ بە دەنگێکی گڕەوە گوتی: چاك هاتم بۆلات . لەمێژ بوو دەمویست بێم، بەڵام نەخۆشی بڕستی لێ بڕیبووم ـ دەستە رەقەڵە و قامکە درێژەکانی بە ریشیدا هێنا و گوتیشی: بەڵام ئێستا زۆر باشم.

لەڤین گوتی: بەڵێ! ـ بەڵام کاتێك ماچوموچی لەگەڵ کرد روومەتی لە رادەبەدەر کزی براکەی لە ژێر لێویدا هەست پێکرد و لە نزیکەوە زیتەی چاوە گەورەکانی دی کە تروسکەیەکی سەیریان لێهەڵدەستا، بۆیە دیسان ترسێك دەروونی داگرتەوە.

چەند حەوتوو لەمەوبەر لەڤین بۆ براکەی نووسیبوو کە بەشێکی کەم لە میراتی هاوبەشیان کە هێشتا بەشیان نەکردبوو فرۆشتوویێتی و ئێستا نزیکەی دوو هەزار رۆبڵ بە نیکۆلای قەرزدارە.

نیکۆلای گوتی هاتووە بۆ وەرگرتنی پارەکەی و لەوەش گرینگتر دەیهەوێ ماوەیەك لە زێدەکەی بمێنێتەوە و پێوەندیی خۆی لەگەڵ خاکەکەی تازە بکاتەوە، تاکوو وەك پاڵەوانانی کەونارا بۆ خەباتێکی کە لەبەریەتی وزەی پێویست وەرگرێ. سەرەڕای کووڕ بوونەوەی پشتی کە لەچاو رابردوو زیاتر بوو و بێجگە لە داڵگۆشتییەکەی کە بە هۆی کەڵەگەتییەوە زیاتر دیاربوو، هەڵسوکەوتی وەك هەمیشە لەگەڵ گورجی و تووڕەیی تێکەڵ بوو. لەڤین بردی بۆ ژووری کارەکەی خۆی.

براکەی زۆر بە شێنەیی جلەکانی گۆڕی، ئەوەش کارێك بوو کە لە رابردوودا نەیدەکرد و تووکەسەری تەنك و نەرمی خۆی بەشانە داهێنا و بەدەم پێکەنینەوە بە قالدرمەکاندا وەسەر کەوت.

زۆر مێهرەبان و رووخۆش بوو، راست وەك سەردەمی منداڵیی کە لەڤین لەبیری مابوو. تەنانەت باسی سرگی ئیڤانۆڤیچیشی بە لەبزێکی دوور لە رق و قینەوە کرد. کە چاوی بە ئاگافیا میخائیلۆڤنا کەوت هێندێکی گاڵتە لەگەڵ کرد و هەواڵی خزمەتکارە قەدیمییەکانی لێ پرسێ. هەواڵی مەرگی پارفیۆن دنیسۆڤیچ شوێنێکی ناخۆشی لەسەر دانا. شوێنەواری ترسی لە روخساریدا وەدی هێنا، بەڵام زۆر زوو هێمنایەتیی خۆی وەدەست هێنایەوە.

گوتی: بەڵام، پیریش بوو ئیتر ـ مەبەستی قسەکانی گۆڕی و رووی دەمی لە براکەی کرد و درێژەی بە قسەکاندا: دەی براله، یەکدوو مانگ لەلات دەمێنمەوە، پاشان دەچم بۆ مۆسکۆ، دەزانی میاخکۆڤ بەڵێنی داوە کە لە دایرەکەی کارێکم بۆ بدۆزێتەوە. دەمهەوێ ببمە فەرمانبەری دەوڵەت. دەمهەوێ ئاڵووگۆڕێك بەسەر ژیانمدا بهێنم. دەزانی ئەو ژنەشم لە کۆڵ خۆم کردەوە؟

ـ ماریا نیکۆلایۆڤنا؟ بۆ؟ چیی کردبوو؟

ـ ئاخ، ژنێکی خراپ بوو. نازانی چەندەی گێروگرفت بۆ دروست کردم ـ بەڵام نەیگوت چ گێروگرفتێك. نەیدەتوانی بیڵێ کە ماریا نیکۆلایۆڤنای لەبەر ئەو هۆیە لە خۆی تاراندووە کە چایی کەمڕەنگی بۆ دەهێنا و لە هەمووشی گرینگتر چونکە ئەوی بە نەخۆش دەزانی و پەرستاریی لێدەکرد: جگە لەوەش، دەمهەوێ ئیتر ڕەوتی ژیانی خۆم بگۆڕم. هەڵبەت منیش وەك هەمووان کەمم کاری گەوجانە نەکردووە، بەڵام پارە گرینگ نییە. خەمی بۆ ناخۆم. لە هەمووی گرینگتر لەشساغییە و شوکر بۆ خودا ئێستا چاك بوومەتەوە.

لەڤین گوێی ڕاگرتبوو و چووبوو دەماڵی فیکرەوە و نەیدەزانی بڵێ چی، چونکە نیکۆلایش هەر ئەو حاڵەی هەبوو و نەیدەزانی بڵێ چی؟ کە دەستیکرد بە پرسیارکردن سەبارەت بە کاروبارەکانی و لەڤین خۆشحاڵ بوو کە دەیتوانی سەبارەت بە کارەکەی خۆی قسە بکات چونکە لەو بارەوە دەیتوانی سادقانە بدوێ و لەخۆفشین و خۆڕانانی نەدەزانی، پیلان و گەڵاڵەکانی بۆ براکەی ڕوونکردەوە.

نیکۆلای گوێی ڕاگرتبو، بەڵام دیاربوو ئەو قسانەی بەدڵ نییە.

ئەو دوو کەسە هێندە لە یەك نزیکبوون و چاکە و خراپەی یەکیان دەناسی کە چکۆلەترین حاڵەت و لەبزی قسەکردنیان بۆ یەکتری لە وشە وێژاتر بوو.

ئێستا تەنیا فیکرێك لە مێشکی هەردووکیاندا بوو، ئەویش نەخۆشی و مەرگی نزیکی نیکۆلای بوو کە هەر چەشنە فیکرێکی تری لە زەین دەتاراند. بەڵام هیچ کام غیرەتیان نەدەکرد باسی بکەن، بەو هۆیەش هەر قسەیەك جگە لەوەی لە دڵیاندا بوو دەیاندرکاند و لێی نەدەپرنیگانەوە. لەڤین لەوەتا عومری هەبوو بەقەد ئەمشەو حەزی لە تێپەڕینی کات و وەختی خەو نەکردبوو. قەت لە هیچ میوانی و دانیشتنێکدا و لەگەڵ هیچ غەوارەیەك بە ئەندازەی ئەمشەو ئاکاری ساختەچییانە و درۆکامین نەبوو و ئاگاداربوون لەو حاڵە و بێزاری لەو ئاکارە درۆیینە، هەڵسوکەوتی ئەوی ساختەچییانەتر دەکرد. حەزی دەکرد بۆ حاڵی برا خۆشەویست و کەلەلاکەی بگری بەڵام ئێستا ناچاربوو گوێ بۆ قسەکانی شل بکات و سەبارەت بە ژیانی داهاتووی باخێوێ.

چونکە هەوای ژوورەکە شێدار بوو و تەنیا ژوورێکیان گەرم دەکرد لەڤین جێوبانی براکەی لە پشت پەردەکە دەرهێنا و بردی بۆ ژوورەکەی خۆی.

براکەی لە جێگاکەی خزا، بەڵام بەدەم خەو و بەخەبەرییەوە، وەك نەخۆش و لەشبەباران بەردەوام ئەمدیوەودیوی دەکرد و دەکۆخی و هەموو جارێك کۆخە پیرانی پێدەکرد و نەیدەتوانی

بەڵغەمی سینگ و گەرووی دەردات و لە بن لێوەوە شتێکی دەگوت. هێندێ جار دەیناڵاند و هەناسەیەکی قووڵی هەڵدەکێشا: ئاخ، خودایەگیان ـ یان هەرکاتێك بەڵغەمی سینگی خەریکبوو بیخنکێنێ بە تووڕەیی شەیتانی بە لەعنەت دەکرد. لەڤین ماوەیەکی زۆر گوێی بۆ راگرت و خەوی لێنەدەکەوت. فیکری جۆراوجۆر بە مێشکیدا دەهات بەڵام هەموو ئەو فیکرانە لەسەر خاڵێك دەگیرسانەوە ئەویش مەرگ بوو.

مەرگ کە کۆتایی ناچاریی هەموو شتێك بوو، یەکەم جار بە هێزێکی قورسەوە لە هەمبەریدا خۆی نواندبوو. ئەو مەرگە لەبەر چاوی و لە جەستەی برا خۆشەویستەکەیدا کە خەبەری بووبۆوە و دەیناڵاند و بەبێ لێکدانەوە و بەپێی عادەت هێندێ جار یادی خودای دەکرد و هێندێ جاریش لەعنەتی بۆ شەیتان دەنارد بە هیچ شێوەیەك وەك بەرلەوە بیری لێدەکردوە لێی دوورنەبوو، چونکە مەرگ لە وجوودی خۆیدا بوو. بە تەواوی هەستی پێدەکرد. ئەمڕۆ نا، سبەینێ“ سبەینێ نا“ سی ساڵی تر“ هیچ جیاوازییەکی نییە. بەڵام ئەم مەرگە ناچارییە چی بوو؟ ئەو نەك هەر نەیدەزانی، نەك هیچ کات بیری لێنەدەکردەوە، بەڵکوو نەیدەتوانی و نەیدەوێرا بیریشی لێبکاتەوە.

«من کار دەکەم، دەمهەوێ بەرنامەیەکی زۆر گەورە بە ئاکام بگەیەنم و لەبیرم چۆتەوە کە هەموو شتێك تەواودەبێ و مەرگ راستەقینەیەکە.»

بە تاریکی ئەژنۆی لە باوەش گرتبوو و چەنەی لەسەر کڵاوەی چۆکی دانابوو و لەسەر چرپاکەی دانیشتبوو. گوشاری زەینیی بە جۆرێك بوو کە خەریکبوو هەناسەی لە سینگیدا راوەستێ. بەڵام هەرچەندە جەخت و گوشاری فیکر و خەیاڵی زیاتر دەبوو روونتر دەیدیت کە بەڕاستی و بە بێگومان شتێکی لەبیر بردۆتەوە و ئەو خاڵە بە رواڵەت چکۆڵەیەی لە ژیانیدا لە بەرچاو نەگرتووە و ئەوەی کە مەرگ دەگاتێ و دوایی بە هەموو شت دێنێ و دەست پێکردنی کارێك لە ماوەیەکی ئاوا کورتدا کارێکی بێهودەیە و دەردێکی بێ دەرمانە. بەڵێ ئەوە راستییەکی تاڵ و بەژانە بەڵام هەیە و حاشای لێناکرێ.

بە ناهومێدی گوتی«بەڵام ئاخر هێشتا من زیندووم. هەر ئێستا چیبکەم؟»

مۆمێکی هەڵکرد و بە ئەسپایی هەستا و چووە بەر ئاوێنەکە و چاوی لە روخسار و سەر و پۆتراکی خۆی بڕی. بەڵێ، مووی سپی کەوتبووە لاجانگییەوە. دەمی داپچڕی. کاکیلکەکانی زۆریان خورابوونەوە. باسکی خۆی هەڵماڵی و چاوی لە ماسوولکەکانی کرد. نا، هێشتا زۆر بەهێز بوون. بەڵام نیکۆلنکاش کە لەوێ کەوتبوو و بەو تۆزە سپییەلکەی بۆی مابۆوە جارجار هەناسەیەکی هەڵدەکێشا، زەمانێك بەهێز بوو و

خاوەنی مەچەك و بازۆڵەی پڕوزە بوو. لە ناکاو زەمانێکی وەبیرهاتەوە کە هەردووکیان منداڵ بوون و لە پەنای یەکەوە دەخەوتن و چاوەڕوان بوون فیۆدۆر باگدانیچ لە ژوورەکە بڕواتە دەرێ تا بە سەرین و باڵنج بکەونە گیان یەکتر و وەها پێدەکەنین و دەیانقریشکاند کە نەیاندەتوانی ددان بە خۆیاندا بگرن و تەنانەت ترسی فیۆدۆر باگدانیچیش نەیدەتوانی بێدەنگیان بکات و نەیدەتوانی شادی و شۆری شیرینی ژیان کە لە دڵیاندا شەپۆلی دەدا و هاژەی دەهات هێوربکاتەوە. «ئێستاش ئەو سینگە تێکقوپاو و خاڵییە... منیش، کە نازانم بۆ زیندووم و چیم بەسەر دێ....»

ـ ئەحوو، ئەحوو... لەعنەت لە شەیتان.... تۆ چی دەکەی؟ بۆ ناخەوی؟

قڵخە و قۆخەی براکەی بوو کە سەری لە بەخەبەریی ئەو سووڕ مابوو.

ـ نازانم. خەوم لێ زڕاوە.

ـ بەڵام من چاك خەوتم. ئیتر ئارەقەشم نەکردووە. چاو لێکە، دەست لە کراسەکەم بدە. ویشکە، وانییە؟

لەڤین دەستی لە کراسەکەیدا و ڕۆیشت بۆ پشت پەردەکە و مۆمەکەی کوژاندەوە. بەڵام ماوەیەکی زۆر بەخەبەرما و خەوی لێنەکەوت. تازە خەریکبوو مەسەلەی چۆنێتیی ژیانی بۆ روون دەبۆوە، کە مەسەلەی تازە و دژواری مەرگ زەق و زیندوو لەبەرچاوی چەقیبوو.

«خەریکە دەمرێ، ناگاتە بەهارێ. چۆن دەتوانم یارمەتیی بدەم؟ دەتوانم چیی پێبڵێم؟ خۆم کوا سەرم لەو مەتەڵە دەردەچێ؟ تەنانەت بوونەکەشیم لەبیر بردبۆوە.»

## سی و دوو

لەڤین زۆر لەمەوبەر لەو خاڵە گەیشتبوو کە کاتێك کەسێك بە خاکەڕایی و لێبوردنی لەڕادەبەدەرەوە پیاو تووشی شەرمەزاری دەکات، زۆری پێناچێت بە هۆی دڵناسکی و جینگزی بوونەوە لەبەر چاوت دەکەوێ و ناتوانی تاملّی بکەیت. هەستی دەکرد کە ئەم حاڵە بۆ براکەشی دێتە پێشێ و بەڕاستی نەرمی و لەسەرەخۆیی نیکۆلای برای زۆری نەخایاند. هەر لە بەیانی رۆژی دواییەوە رووشهەڵبوو و بەردەوام تووڕە و جینگزی، لە بەهانەیەك دەگەڕا بۆ کێشە و شەڕ و هەرا.

لەڤین خۆی بە تاوانبار دەزانی و نەیدەتوانی چاکسازی لەو حاڵەتەی خۆیدا بەدی بێنیێ. هەستی دەکرد ئەگەر هەردووکیان دەست لە خۆڕانان هەڵگرن و ئەوەی لە دڵیاندا بوو و دەیانویست بیدرکێنن، یانی راست ئەو فیکرە یان ئەو هەستەی لە دەروونیاندا بوو بە یەکتریان بگوتبایە، ئەو کاتە چاویان لە چاوی یەکتر دەبڕی و ئەو تەنیا دەیگوت «تۆ دەمری، دەمری، دەمری!» نیکۆلاش تەنیا دەیگوت «دەزانم کە بەم زووانە دەمرم و دەترسم، دەترسم، دەترسم!» ئەگەر بیانویستبایە تەنیا ئەوەی لە دڵیاندایە بۆ یەکتری دەربڕن، جگە لەو وشانە هیچی دیکەیان نەدەگوت. بەڵام ئەو سەداقەتە لە ژیاندا ناگونجێ و بەو هۆیەش کۆنستانتین هەوڵی دەدا کارێك بکات کە لە هەموو ماوەی تەمەنیدا خەباتی بۆ دەکرد و تێیدا سەرکەوتوو نەدەبوو، دەشیدی کە زۆر کەس لە دەستیان دێ و ناتوانن بەبێ ئەو بژین: هەوڵی دەدا شتێك جگە لەوەی کە بیری لێدەکردەوە لە دڵیدا بوو بیدرکێنێ و هەستی دەکرد کە درۆیین بوونی وتەکانی دیار و ئاشکرایە. هەروەها هەستی دەکرد کە براکەی لە درۆکەی دەگات و لە دین دەردەچێ.

ڕۆژی سێهەم نیکۆلای داوای لە براکەی کرد کە بەرنامەی چاکسازی خۆی دیسان بۆ روون بکاتەوە و نەك هەر کارەکەی ئەوی بە باش نەزانی بەڵکوو بە ئانقەست ئەوی وەکوو بەرنامەی کومۆنیستەکان دەشوبهاند و دەستیکرد بە رەخنە گرتن لێی.

ـ تۆ فیکری خەڵکیت وەرگرتووە و هێندێك گۆڕانت بەسەردا هێناوە و دەستت لە رەسەنایەتییەکەشی وەرداوە و دەتهەوێ لە جێگایەك بەکاری بێنی کە ناگونجێ.

ـ بەڵام ئەوە بزانە گەڵاڵەکەی من لەگەڵ قسەی کومۆنیستەکان زۆر جیاوازە. ئەوان مڵکایەتیی تایبەتی و دەسمایە و میرات بە شتێکی ناعادڵانە دەزانن و دەیانهەوێ لە نێویان ببەن، بەڵام من نەك هەر حاشا لە خاوەندارێتی و هەقانەتی ئەوان ناکەم بەڵکوو ئەوان بە Stimulus[١٥٦]ێکی گرینگ دەزانم بۆ خەبات و هەوڵدان (لەڤین زۆری رق لە بەکارهێنانی ئەو وشە بیانییانە بوو، بەڵام لەو کاتەوە کە هۆگری ئەو گەڵاڵە تازە بووبوو بێ ئیختیار بەکاری دەهێنان) هەروەها دەمهەوێ نەزمێك بە کاری زەحمەتکێشان بدەم.

١٥٦- وشەیەکی لاتینییە، یانی دنەدەر، هاندەر.

نیکۆلای بەو ملە باریکەیەوە کە لە نێو ملیوانەکەیدا بەرەو لایەك دەلەقی بە قەڵسییەوە گوتی: هەر ئەوەیە کە دەیڵێم. تۆ بیرۆکەی خەڵکیت وەرگرتووە و ئەوەی هۆی بەرەندە بوون و هۆگرییە لێت سڕیوەتەوە و دەتهەوێ بە هەمووانی بسەلمێنی کە شتێکی نوێت داهێناوە.

ـ بەڵام ئاخر قسەکانی من هیچ وێچوونێکی لەگەڵ...

لێرەدا نیکۆلای گڕی رق لە چاوانیدا بڵێسەی کێشا و بە چزەبزەیەکی گاڵتەجاڕانەوە گوتی: قسەکانی ئەوان لانیکەم تۆزێکی جوانی و هیوا پێوەیە و دەکرێ بڵێین جۆرێك رووناکی و رێکوپێکی بیرکاریانەشی هەیە و روونیشە. رەنگە بتوانین بڵێین قسەکانیان تاریفی بەردەڕەق و کەسنەزانە. ئێستا وایدانێین کە بکرێ ئەوەی لە رابردوودا رووی داوە رۆیشتووە و چاوپۆشیی لێدەکەین و وەك دەڵێن غەوری سەر ئاوێنەکە دەسڕین. ئەو کاتە ئیتر نە ملکایەتی دەبێ و نە بنەماڵە، مەسەلەی کاریش چارەسەر دەبێ، بەڵام قسەکانی تۆ هەمووی وڕێنە و قسەی هاتەران پاتەرانە.

ـ تۆ بۆ هەموو شتێك تێکەڵ دەکەی؟ من هیچ کات کومۆنیست نەبووم.

ـ بەڵام من بووم و لەسەر ئەو باوەڕەم کە هێشتا بۆ ئەو قسانە زووە. بەڵام قسەکانیان بەجێ و مەنتقییە و داهاتوو بۆ ئەوانە. وەك ئایینی مەسیح لە یەکدوو سەدەی سەرەتاوە.

ـ من تەنیا باوەڕم وایە کە وزەی کار دەبێ وەکوو هۆکارێکی سروشتی و بە شێوەی زانستی و ئەزموونی لێی بکۆڵینەوە و تایبەتمەندییەکانی بناسین و...

ـ ئەو کارە قەت پێویست نییە. وزەی کار بەپێی رەوت و گۆڕانی خۆی شکڵی تایبەت بەخۆی پەیدا دەکات. سەرەتا وزەی کار بە شێوەی کوێلە بوو، پاشان بوو بە Metayer (ئیجارەیی). لە رووسیاش کرێکاری وا هەن کە لەجیاتی هەقدەستی خۆیان دغڵ و دان وەردەگرن و هەروەها ئیجارەدار و کرێکاری رۆژمزیش هەن. ئیتر بەدوای چیدا دەگەڕێی؟

لەڤین بە بیستنی ئەو قسانە لە ناکاو ئاڵەتی بوو، چونکە لە دڵەوە دەترسا کە نەوەك قسەی براکەی راست بن، نەکا راستبێ کە ئەو بیهەوێ لە نێوان کومۆنیست و شێوە دیارەکانی کاردا هاوسەنگی دامەزرێنێ و ئەو کاتە کارێکی وا نەگونجێ.

لەڤین بە گوڕ و تینەوە گوتی: لە رێگایەك دەگەڕێم کە کار بۆ خۆم و بۆ کرێکار یانی بۆ هەردوولامان بە قازانج و پڕ پیت و بەرەکەت بێ. من دەمهەوێ کارێك بکەم کە...

ـ تۆ ناتەوێ هیچ کارێك بکەی. تۆ هەروەك لە تەواوی ماوەی تەمەنتدا کردووتە تەنیا دەتهەوێ کارێك بکەی کە لەگەڵ خەڵکی جیاواز بی. تۆ ناتهەوێ وەك هەمووان بە ئاسانی کار لە کرێکاران بکێشی، بەڵکوو دەتهەوێ رەنگی فکرێکی داهێنەرانە بە کارەکەت بدەی.

لەڤین کە هەستی دەکرد ماسوولکەیroومەتی چەپەی بێ ئیختیار دەپەڕێ و لە دەست خۆیدا نییە گوتی: چاکە، یانی تۆ ئاوا بیردەکەیتەوە؟ باشە، کەوایە لە کۆڵم بەوە با هەر کارێك پێم خۆشە بیکەم.

ـ تۆ هیچ کات باوەڕت بە شتێك نەبووە و ئێستاش هەر باوەڕت نییە. تۆ تەنیا حەزت لە خۆپەرستییە و هیچی تر.

ـ راست دەکەی، من خۆپەرستم، کەوایە لەکۆڵم بەوە.

ـ زۆر چاکە، دەڕۆم، لەوە زیاتر ئازارت نادەم. دەبوو زۆر لەوە زووتر بڕۆیشتبایەم. تۆش هەرچیت پێخۆشە بیکە، چاوت دەرێ. سەد بریا هەر نەهاتبایەم.

لەڤین هەوڵی دەدا براکەی هێوربکاتەوە بەڵام نیکۆلای گۆیی بە قسەکانی نەدەدا و تەنیا دەیگوت چاکترین کار ئەوەیە لە یەکتر جیا ببنەوە. کۆنستانتین لەڤین دەیدی کە براکەی تووشی ژیانێکی قورس و نالەبار بووە.

نیکۆلای لەڤین خۆی ئامادەکردبوو بڕوات کە کۆنستانتین دیسان هات بۆ لای و بە زمانێکی نائاساییی داوای لێکرد کە ئەگەر تاوانێکی کردووە و دڵی رەنجاندووە لێی ببوورێ.

نیکۆلای بە بزەیەکەوە گوتی: ئەها، دەتەوێ گەورەیی بنوێنی؟ ئەگەر دەتهەوێ هەقت پێبدەم قسەم نییە و تۆ دڵت بەوە خۆشە قەیناکا. هەق بە تۆیە بەڵام سەرەڕای هەموو ئەو قسانە دەبێ هەر بڕۆم.

نیکۆلای بەر لە رۆیشتن ماچوموچی لەگەڵ براکەی کرد و چاوێکی سەیر و ماناداری لێکرد و لە ناکاو گوتی: هەرچی بوو رابرد کوستیا، لێم دڵمەند مەبە ـ کە ئەوەی دەگوت دەنگی دەلەرزی.

ئەوە تەنیا وشەگەلێك بوون کە سادەقانە دەربڕین. لەڤین تێگەیشت کە براکەی لە پشت پەردەی ئەو وشانەوە دەیهەوێ بڵێ «تۆ دیتووتە و دەزانی کە من چەندە حاڵم شڕە. رەنگە چاومان بە یەکتر نەکەوێتەوە.» لەڤین ئەوە تێگەیشت و فرمێسك بە چاویدا هاتە خوارێ. جارێکی تر براکەی ماچکرد بەڵام نەیتوانی هیچ بڵێ.

لەڤین سێ رۆژ دوای رۆیشتنی براکەی بەرەو سەفەری هەندەران رۆیشت. لە وێستگەی شەمەندەفەر چاوی بە ئیشچر باتسکی کوڕە مامی کیتی کەوت و ئێشچرباتسکی کە دیتی ئاوا پەرۆش و خەمبارە سەری سووڕما.

ئیشچرباتسکی لێی پرسی: چییە؟ دەڵێی دڵتەنگی، چبووە؟

ـ هیچ نییە. لەم دنیایەدا خۆ شادی نەماوە هەستی پێبکەم.

ـ چۆن نەماوە؟ وەرە با بەجێی ئەوەی بچی بۆ مووڵهووز[157] یان هەر بە قورگیراوێکی تر با بە یەکەوە بچین بۆ پاریس. ئەو کاتە دەبینی دنیا چەندە خۆشە و رەنگینە.

ـ نا، ئیتر کاری من تەواوە. کاتی مردنمە.

ئیشچر باتسکی بە پێکەنینەوە گوتی: هاهوو، تۆش گاڵتەی وادەکەی! من تازە دەمهەوێ ژیان دەست پێبکەم.

ـ بەڵێ، منیش تا ماوەیەك لەمەوبەر وام بیردەکردەوە، بەڵام ئێستا دەزانم کە گیای مردنم.

لەڤین وەسفی هەستێکی دەکرد کە بەڕاستی لەم دواییانەدا لە دڵیدا بوو. لە هەموو شتێکدا مەرگ یان شوێنەواری نزیکبوونەوە لە ئەوی بەدی دەرکرد. بەڵام ئەو کارەی کە گەڵاڵەکەی داڕشتبوو و دەستی پێکردبوو زیاتر لە هەموو شتێك خۆی پێوە سەرقاڵ کردبوو. هەرچییەك بوو دەبوو هەتا مەرگ هەڵێنەکوتاوەتە سەری بیهەوێ و نەیهەوێ دەبێ درێژە بە ژیان بدات. لە چاوی ئەودا پەردەیەکی تاریك بەسەر هەموو شتێکدا کشابوو، بەڵام بەهۆی ئەو تاریکییەوە هەستی دەکرد تەنیا رچەیەك کە لەبەر پێیدا کراوەتەوە هەر ئەو کارەیە کە دەستی پێکردووە و ئەو بە هەموو توانایەوە گرتوویەتە بەر و بەرینادات.

---

157- Mulhouse

# یەک

کارنین و ژنەکەی هەروا لە ماڵێکدا دەژیان و هەموو رۆژێك چاویان بە یەکتر دەکەوت، بەڵام وەك غەوارە و نەناسیاو. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ رێ و شوێنێکی بۆ خۆی دانابوو کە هەموو رۆژێك ژنەکەی ببینێ تاکوو خزمەتکارەکان تێنەگەن و قسە و قسەلۆکان بڵاو نەکەنەوە. بەڵام بۆ فراوێن نەدەهاتەوە بۆ ماڵێ. ڤرۆنسکی هاتوچۆی ماڵی ئەلکسی ئالکساندرویچی نەدەکرد. ئانا لە دەرەوەی ماڵێ ژوانی لەگەڵ دادەنا و مێردەکەشی ئەوەی دەزانی.

ئەو بارودۆخە بۆ هەر سێ لایان ناخۆش بوو. هەرکام لەوان ئەگەر چاوەڕوانی گۆڕانی ئەو بارودۆخە نەبوایە و وای دانەنایە کە ئەو نامرادییە کاتییە و بە زوویی دوایی پێدێ، نەیدەتوانی تەنانەت تاقە رۆژێك تاملی بکات. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ هیوادار بوو ئەو کێشەیە وەك هەموو شتێکی تر تێپەڕ بێ و لەبیربچێتەوە و ناوی ئەو بە شەرم و شوورەیی رموودە نەکات. ئانا کە هۆکاری سەرەکیی ئەو ئاریشەیە بوو و قورسایی باری ئازارەکەی زیاتر لە دیتران هەست پێدەکرد، بەو هۆیە تاملی دەکرد کە نەك هەر چاوەڕوان بوو بەڵکوو لێی روون بوو کە ئەم گرێپووچکەیە زۆر زوو دەکرێتەوە و تەمومژی ئەو پەژارە و دۆشدامانەی دەڕەوێ. هەر نەشیدەزانی چ شتێك ئەو گرێ کوێرەیە دەکاتەوە. بەڵام سوورسوور دەیزانی ئەو شتە، هەرچییەك بێ، زۆر زوو دەگاتێ. ڤرۆنسکیش، بێ ئیختیار پێڕەویی لە ئانا دەکرد و چاوەڕوانی شتێك بوو کە بەدەر لە ئیرادەی خۆی بوو و دەبوو هەرچۆنێکە ئەو ئاریشەیە چارەسەر بکات.

نێوەڕاست مانگی زستان ڤرۆنسکی حەوتوویێکی زۆر تاڵ و پڕ لە کەسەری رابوارد. میوانداریی پرێنسێکی بیانییان خستبووە ئەستۆی کە هاتبوو بۆ پترزبۆرگ و ئەو دەبوو لەگەڵی بگەڕێ و شوێنە مێژوویی و سەرنجڕاکێشەکانی نیشان بدات. ڤرۆنسکی قەڵافەتێکی لەباری هەبوو، جگە لەوەش هەڵسوکەوتێکی مەند و ماقووڵانەی کەم وێنەی هەبوو، زۆری لەگەڵ گەورە پیاوان هەڵسوکەوت کردبوو بۆیە بۆ میوانداری کردن لە پرێنس هەڵیانبژاردبوو.

بەڵام بەڕێوەبردنی ئەو ئەرکەی زۆر لە شان گران بوو. پرێنس دەیویست هیچ کام لەو شوێنە مێژوویی و دیدەنییانەی رووسیا نەبوێرێ کە وێدەچوو لە وڵاتەکەی لێی بپرسن دیتوویێتی یان نا. لە لایەکەوە خۆشی حەزی دەکرد ئەوەندەی دەتوانێ بە شوێن و شارەکانی رووسیادا بخولێتەوە و خۆشی رابوێرێ. ڤرۆنسکی دەبوو پرێنس بۆ هەموو شوێنێك بەرێ و سەیرانی پێبکات. بەیانیانە دەچوون بۆ دیتنی شوێنە دیدەنییەکانی پترزبۆرگ و شەوانە لە چێژ و خۆشییە نەتەوەییەکان کامڕەوا دەبوون و لە بەزم و رابواردنە تایبەتەکانی رووسیادا بەشدارییان دەکرد. لەشساغی و خۆڕاگریی پرێنس بەڕادەیەك بوو کە تەنانەت لە نێو پرێنسەکاندا نائاسایی دەنواند. جگە لەوەش بە هۆی وەرزش و ئاگالەخۆ بوون هێندە بەهێز بوو کە سەرەڕای ئەو هەموو دڵچەرێنی و رابواردنە زێدەڕۆیانە هێندە بەدەماخ و شاد بوو دەتگوت خەیاری سەوز و تەرچك و ئاوداری هۆڵەندییە. پرێنس زۆری سەفەر کردبوو، لەسەر ئەو باوەڕەش بوو یەکێك لە گرینگترین قازانجەکانی سەفەر لەو سەردەمەدا ئەوەیە کە هەلی چێشتنی هەموو چێژ و خۆشییەکانی ئەو وڵاتانەت بۆ دەرەخسێنێ. چووبوو بۆ ئیسپانیا و لەوێ چەند سیرناد[158]ی بەڕێوەبردبوو، لەوێ لەگەڵ ژنێکی ئیسپانی پێوەندیی نزیکی دامەزراندبوو. لە سویسرا چووبوو بۆ راوی بزنەکێوی و لە ئینگلتەرا بە رێدنگووتێکی سوورەوە بە سواری بەسەر چەند لەمپەردا تێپەڕیبوو. لە تورکیا توانیبووی بچێتە کاخی پاشایەتی و لە هێندوستانیش سواری فیل بووبوو، ئێستاش هاتبوو بۆ رووسیا و دەیویست چێژ لەو خۆشی و لەززەتانە وەرگرێ کە تەنیا لە رووسیا بۆی دەلوێ.

بۆ ڤرۆنسکی کە بە شێوەیەك رۆڵی سەرۆکی تەشریفاتی پرێنسی لە ئەستۆ بوو زۆر دژوار بوو کە تەواوی ئەو کەیف و خۆشیانە بە پرێنس بچێژێ کە ئەموئەو پێیان پێشنیار دەکرد. کێبەرکێی ئەسپسواری هەبوو، ناوساجی و هەرمێشك هەبوو، راوی ورچ و ترویکا (کاشەی سێ ئەسپە) سواری و کەیف و نەهەنگ و مەینۆشین لە نێو قەرەچییەکان و لە ئاکامیشدا شکاندنی جامەکان بەوجۆرەی کە لە رووسیا باو بوو. پرێنس زۆر بە ئاسانی لە رۆحی رووس گەیشتبوو و لە ناخی خۆیدا وەخەبەری هێنابوو. کەشەف و پەرداخی چینیی دەشکاند و ژنانی قەرەچیی لەسەر کۆشی دادەنا و وەك ئەوە وابوو کە بپرسێ: دەی، چیی تریش؟ یانی رۆحی رووس هەر ئەوەیە؟

---

١٥٨- کۆنسێرتی چکۆلەی شەوانە کە پیاوی ئاشق بە هیوای نەرمکردنی دڵی گراوەکەی لەبەر پەنجەرەی ماڵەکەی بەڕێوەی دەبرد.

لەسەریەك لە نێو تەواوی چێژ و خۆشییەکانی رووسیادا کە بۆی دەلوا زیاتر دڵی بۆ لای هەڵسوکەوت و رابواردن لەگەڵ ژنانی ئەکتەری فەڕەنسی و سەماکارانی باله و خواردنەوەی شامپانیی چاپ سپی مایل دەیکورکاند. ڤرۆنسکی خۆی خووی بە ژیان و هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەشراف و گەورە پیاوان گرتبوو، بەڵام بەهۆی ئەوەوە کە لەم دواییانەدا رۆحیاتی گۆڕابوو، یان رەنگە بەهۆی نزیکیی لەڕادەبەدەر لەگەڵ پرێنس، ئەو حەوتووە کە لەگەڵ ئەو گوزەراندی زۆر تاڵ و دژوار بوو بەلایەوە. ئەو لە تەواوی ئەو حەوتووەدا هەستی کەسێکی هەبوو کە کردوویانەتە ئێشکگری شێتێکی مەترسیدار، لە شێتەکەش دەترسا و لەوەش تۆقیبوو کە ئاوەز و ئەقڵی خۆی بە هۆی نزیکبوون لەو شێتەوە بدۆڕێنێ، بەردەوام هەستی دەکرد کە بە هیچ شێوەیەك تەنانەت بۆ ساتێکیش نابێ لە بازنەی ئەو حەیا و فەهێتە تەشریفاتییە بترازێ نەکا وەبەر پلاری لۆمە و سووکایەتی بکەوێ. بە سەرسووڕمانەوە دەیدی کە ئاکاری پرێنس لەگەڵ ئەو کەسانەی کە دەیانهەوێ خۆیان بە ئاو و ئاوردا بدەن بۆ ئەوەی کەیف و خۆشییەکانی رووسی پێبچێژن پڕە لە سووکایەتی. زۆر جار بە بیستنی بیروڕای پرێنس سەبارەت بە ژنانی رووسی کە دەیویست لێیان ورد بێتەوە و خەریکبوو بە چاو هەڵیاندەلووشین، ڤرۆنسکی لەبەر بێزاری و شەرم سوورهەڵدەگەڕا. بەڵام لە هەمووی گرینگتر هەڵسوکەوتی پرێنس بەو هۆیەوە بۆ ڤرۆنسکی دژوار بوو و هەستی دەکرد بارێکی قورسە بە کۆڵییەوە کە بێ ئیختیار لە وجوودی ئەودا خۆی بەدی دەکرد. ئەوەش کە ئەو لەو ئاوێنەیەدا دەیدی وەڕەزی دەکرد و خۆی لەبەرچاو سووکدەبوو. ئەوەی دەیدی، وێنەی پیاوێك بوو کە زۆر گەمژە و هەپلەگونە و زۆریش قۆڕەدەماخ و لەخۆڕازییە، بەڵام خاوێن و لەشساغە و هیچی تر. راستییەکەشی ئەوەبوو کە هیچی لە گەورە پیاوان کەم نەبوو، ڤرۆنسکیش نەیدەتوانی حاشا لەو راستییە بکات. پیاوێکی خوێنسارد و لەسەرەخۆ بوو. سەری بۆ گەورە و سەرۆکان دانەدەنەواند و هەڵسوکەوتیشی لەگەڵ بەرانبەرەکانی زۆر سادە و خاکەڕایانە بوو، بەڵام بە چاوێکی مێهرەبانانەی سووکایەتی ئامێزەوە چاوی لە ژێردەستان دەکرد. ڤرۆنسکی خۆشی راست ئاوا بوو، ئەو ئاکارەشی زۆر بە باش دەزانی. بەڵام لە هەمبەر پرێنسدا خۆی بە بەردەست دادەنا و لە مێهرەبانیی سووکایەتی ئامێزی ئەو بێزار بوو.

لە دڵی خۆیدا دەیگوت «دەڵێی گایە! یانی من بەڕاستی وەك ئەو وام؟

هەرچۆنێك بوو کاتێك رۆژی حەوتەم بەر لە وەڕێکەوتنی پرێنس بۆ مۆسکۆ ماڵئاوایی لێکرد و پرێنس سپاسی لێکرد، لەوەی کە لە بەرەورووبوون لەگەڵ ئەو ئاوێنە دزێونوێنە رزگاری بووە هەستی بە خۆشی و بەختەوەری کرد. لە وێستگەی شەمەندەفەر خوداحافیزیی لێکرد. تازە لە راوی ورچ گەڕابوونەوە و ئەو شەوە تا بەیانی شایەدی هونەرنوێنیی بوێرانەی رووسییەکان بوون.

# دوو

ڤرۆنسکی کە گەڕایەوە بۆ ماڵێ نامەیەکی ئانایان دایە دەستی. نووسیبووی «من نەخۆشم و زۆریش دڵتەنگم. ناتوانم لە ماڵ بێمە دەرێ بەڵام نەدیتنی تۆش لەوە زیاتر ناتوانم تاملّ بکەم. ئێوارە وەرە. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ سەعات حەوت دەچێ بۆ نووسینگەی شۆڕا و هەتا سەعات دە نایەتەوە بۆ ماڵێ.» ڤرۆنسکی تۆزێ چووە فیکرەوە. پێیسەیر بوو سەرەڕای ئەوەی کە مێردەکەی پێیگوتبوو کە ئیتر نەهێڵێ بە ماڵیاندا بچێت، ئانا زۆر راشکاوانە داوای لێکردبوو بچێت بۆ لای. بۆیە بڕیاریدا بچێت.

ڤرۆنسکی ئەو زستانە بووبووە سەرهەنگ و ماڵەکەی لە سەربازخانە بردبووە دەرێ و بە سەڵتی دەژیا. نانەکەی خوارد و خێرا لەسەر قەنەفەکە راکشا و بیرەوەریی ئەو دیمەنە ناخۆشانەی کە لەم چەند رۆژەدا دیتبووی پێنج خولەکێك لەگەڵ وێنەی ئانا و مووژیکی راوچی، کە بۆ راوی ورچ رۆڵی سەرەکیی گێڕا پێکەوە ئاوێتە بوون و لە زەینی ئەودا پێکەوە یەکیان گرت و ئاخری خەوی لێکەوت. کاتێك خەبەری بۆوە هەوا تاریك داهاتبوو، لە ترسانا لەرزی لێهات و بەپەلە مۆمێکی داگیرساند. لە دڵی خۆیدا گوتی «یانی چی! چ خەونێکی ترسناك بوو! بەڵێ، بەڵێ، هەر ئەو مووژیکە راوچییە بوو، لەبەر چاوم پیاوێکی کوڵەبنەی چەپەڵ بوو کە ریشێکی تەنك و ئاڵۆزاوی هەبوو، دانەوییبۆوە و دیارنەبوو چی دەکات و لەپڕ دەستیکرد بە قسەکردنێکی سەیروسەمەرە بە زمانی فەڕەنسی. بەڵێ، لە خەودا هیچی دیکەم نەدی. بەڵام ئەو ترسە چیبوو؟» دیسان وێنەی مووژیکە راوچییەکەی بە روونی هێنایەوە بەرچاوی خۆی و ئەو قسە بێ مانا فەڕەنسییانەی کە ئەو دەیکردن و ساردوسڕیی ترسێك پشتی لەرزاند.

لە دڵی خۆیدا گوتی «چ ورێنە و هاتەڕان پاتەرانێك!» چاوێکی لە کاتژمێرەکەی کرد.

سەعات بووبووە هەشتو نیو. زەنگی لێدا و بانگی پێشخزمەتەکەی کرد، بەپەلە جلوبەرگی لەبەرکرد و رۆیشتە بەرهەیوان و سەرقاڵدرمەکان، خەونەکەی خۆی لەبیربردەوە و خەمەکەشی تەنیا لەبەرئەوەبوو درەنگ خەبەری بووبۆوە. کاتێك لە پلیکانی چوونە ژوورەوەی ماڵی کارنین نزیکبۆوە چاوی لە کاتژمێرەکەی کرد. دە خولەکی مابوو بۆ نۆ. فایتوونێکی بەرز و تەسك کە دوو ئەسپی

بەڵەکی تێکرابوو لەبەر پلیکانەکان ڕاگیرابوو. فایتوونەکەی ئانای ناسییەوە. لەبەر خۆیەوە گوتی «حەتمەن دەیهەوێ بێت بۆ ماڵی ئێمە. زۆر باش دەبوو ئەگەر بهاتبایە و پێم خۆش نییە سەر بکەم بەو ماڵەدا، بەڵام، چ بکەم. خۆ ناتوانم خۆم بشارمەوە.» بەبێ هیچ شەرم و شکۆیەك، کە لە منداڵییەوە نەیدەزانی چییە، لە کاشەکەی خۆی دابەزی و ڕۆیشت بۆ لای دەرگاکە. دەرگاکە کرایەوە و دەرگاوان بەتانییەك بە دەستەوە هاتەدەرێ و فایتوونەوانەکەی بانگکرد. ڤرۆنسکی ئەگەرچی عادەتی نەبوو گوێ بە وردەکارییەکان بدات بەڵام ڕوانینی پڕ لە واقوڕمانی دەرگاوانەکەی دیت و ڕاست لە نێو چوارچێوەی دەرگاکەدا لووتی بە لووتی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچدا تەقی. شۆقی چراگازەکە ڕاست لە کارنینی دەدا و ڕوخساری هەڵبزڕکاو و پەرێشانی ئەوی لە ژێر کڵاوە ڕەشەکەیدا و قەرەوێتە سپییەکەی کە کەوتبووە ژێر ملیوانەی تیسکنی باڵتەکەی بە ڕوونی دیاربوو. چاوی بێسۆما و ماتی کارنین لەسەر ڕوخساری ڤرۆنسکی گیرسایەوە. ڤرۆنسکی سەری ڕێزی بۆ دانەواند و کارنین لێوی خۆی گەست، دەستی بۆ لای کڵاوەکەی خۆی بەرزکردەوە و بە پەنایدا تێپەڕی. ڤرۆنسکی دیتی کە کارنین بێ ئەوەی ڕوو وەرگێڕێ سواری فایتوونەکە بوو، لە پەنجەرەی فایتوونەکەوە بەتانیی پاگەرمۆك و دووربینی دوو چاوی خۆی لە دەرگاوانەکە وەرگرت و ئیتر لەبەرچاو ون بوو. ڤرۆنسکی گەیشتە بەر هەیوانی ژوورێ. نێوچاوانی تێکنابوو، ترووسکەی غورووڕ و تووڕەیی لە چاوانیدا دەدرەوشایەوە.

لە دڵی خۆیدا گوتی «لەو بارودۆخە ئاڵۆزە! ئەگەر تۆزێ ورەی بەرخۆ بنایە و بۆ پارێزگاری لە ئابڕووی خۆی کارێکی بکردایە من دەمتوانی بەرهەڵستی ببمەوە و هەستی خۆم دەربڕم. بەڵام ئەو سستییە، ئەو بێغیرەتییە... ئەو من بە پیاوێکی خاپینۆك دەزانێ، بەڵام من کەسم هەڵنەخەڵەتاندووە و لە فێڵ و دەهۆ و نهێنیکاری بێزارم.»

ڤرۆنسکی لە کاتی دیدارەکەی ئەو ڕۆژەوە لەگەڵ ئانا لە باخی ڤرێدا تەواو گۆڕابوو، بێ ئیختیار لاوازیی ئانای قەبووڵ بوو و سەری بۆ داخستبوو. ئانا بە تەواوی خۆی تەسلیمی بڕیارەکەی ئەو کردبوو، ئامادەش بوو گوێڕایەڵانە بە قسەی بکات و تەنیا دەیویست چارەنووسی ڕوون بکاتەوە.

ڤرۆنسکی ماوەیەك بوو بە پێچەوانەی جاران ئیتر بیری لەو نەدەکردەوە کە پێوەندییەکەیان هەڵوەشێتەوە. خولیاکانی بۆ ناوبانگ دەرکردن دیسان ڕەویبوونەوە و ئەو هەستی دەکرد خەریکە واز لە جەغزی هەوڵەکانی دێنێ کە هەموو شتێك لەودا ڕوون و ئاشکرایە، خۆی دابووە دەست فەرمانی دڵی و ئەو فەرمانەش بەردەوام پێوەندیی ئەوی لەگەڵ ئانا قایمتر و بەهێزتر دەکرد.

هێشتا لەبەر هەیوانەکە بوو کە گوێی لە ترپەی پێی بوو. تێگەیشت کە ئانا چاوەڕوانییەتی و گوێی بۆ دەنگەکان ڕاگرتووە و ئێستا دێت بۆ تەلاری میوانداری.

ئانا کە چاوی پێیکەوت دەنگی بەرزکردەوە: نا، نا، ئەگەر دۆخەکە بەو شێوەیە بڕواتە پێشێ، زۆر زۆر زووتر کێشەکەمان روون دەبێتەوە.

ـ چی؟ چی خۆشەویستەکەم؟

ـ دەپرسی چی؟ سەعاتێك، دوو سەعاتە... چاوەڕوانم... ئازار دەکێشم... نا، نا، نامەوێ کێشەت لەگەڵدا بکەم، ناتوانم خۆم تووڕە بکەم. حەتمەن نەتتوانیوە، نا، کێشە ساز ناکەم.

ئانا هەردوو دەستی خستە سەرشانی ڤرۆنسکی و بە سەرنجێکی قووڵ و پڕ لە ئەوینەوە و لەگەڵ ئەوەشدا تاقیکارانە لە چاوانی ورد بۆوە. چاوی لە چاوی بڕی و دەیویست دەورانی دووری و تامەزرۆیی قەرەبوو بکاتەوە و هەروەك لە هەموو ژوانێکدا، لە خەیاڵی خۆیدا لەگەڵی دەژیا و (زۆریش لە ئەو چاکتر بوو، لە دنیای راستەدا نەدەگونجا) بە دڵ حەزی دەکرد تێکەڵی بێت و لێی جیا نەبێتەوە.

## سێ

کاتێك لە پشت مێزی بەرچراکە دانیشتن ئانا لێیپرسیی: لەگەڵی بەرەوڕوو بووی؟ خەتای خۆت بوو درەنگ هاتی.

ـ بەڵام بۆ هەر لە ماڵێ بوو؟ خۆ ئەو دەبوو لە نووسینگەی شۆڕا بێ؟

ـ چوو بۆ شۆڕا و هاتەوە دیسان نازانم چوو بۆ کوێ. بەڵام گرینگ نییە. هەر باسیشی نەکەین باشە. تۆ چیت دەکرد؟ هەر لەگەڵ پرێنس بووی؟

ئانا ئاگای لە هەموو پاژەکانی ژیانی هەبوو. ڤرۆنسکی دەیویست بڵێ کە هەتا بەیانی نەخەوتووە و بەریبەیانی تازە خەوی لێکەوتبوو بەڵام کە روخساری شاد و پڕ هەیەجانی ئەوی دیت داخی هات ئەو قسەیە بکات و گوتی کە ناچاربووە بچێت هەواڵی رۆیشتنی پرێنس راگەیێنێ.

ـ چاکە، نەجاتت بوو؟ پرێنس رۆیشت؟

ـ شوکر بۆ خودا. باوەڕ ناکەی کە تامڵ کردنی چەندە بۆ من دژوار بوو.

ئانا نێوچاوانی تێکنا و گوتی: بۆچی؟ مەگین ئەوە ژیانی هەمیشەییی ئێوە لاوان نییە؟ ـ ئەوەی گوت و دەستیدا کلافەی کاموا و میلی گوڵدۆزی کە لەسەر مێزەکە دابنابوو، بێ ئەوەی چاو لە چاوی ڤرۆنسکی بکات دەستیکرد بە چنین.

ڤرۆنسکی کە سەری لە حاڵەتی روخساری ئانا سووڕ مابوو بۆ ئەوەی لە مانای ئەو حاڵەتە بگات گوتی: من لەمێژە ئەو جۆرە ژیانەم وەلا ناوە ـ بە بزەیەکەوە کە ددانە سپی و

ڕێکوپێکەکانی وەدیار کەوتن درێژەی بە قسەکانیدا: ددانیشی پێدا دەنێم، لەم حەوتووەدا کە ئەو جۆرە ژیانەم دەدی دەتگوت لە ئاوێنە دەڕوانم و زۆر ناخۆش بوو.

ئانا کلافەی گوڵدۆزییەکەی بە دەستەوە گرتبوو بەڵام نەیدەچنی و بە سەرنجێکی سەیر و پڕترووسکە و تۆسنانەوە چاوی لە ڤرۆنسکی دەکرد.

گوتی: ئەمڕۆ بەیانی لیزا هاتبوو بۆ دیدەنیم. ئەوان دوای ئەو دەردپێدانەی من لە لایەن کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤناوە، بێ ئەوەی ترسێکیان هەبێ، ڕووهەڵماڵدراوانە دێن بۆ ئێرە. باسی میوانی و ڕابواردنەکانتانی بە شێوەی ئەسینایی بۆ دەکردم. هەر بەڕاستی وادیارە ئێوە نازانن حەیا و شوورەیی چییە.

ـ من تەنیا دەمویست بڵێم کە...

ئانا قسەکەی پێبڕی: ئەمە هەر ئەو تێرز[159]ەیە کە بەر لەوە لەگەڵ تۆ ئاشنابوو؟

ـ من دەمویست بڵێم...

ئانا دیسان قسەکەی پێبڕی و گوتی: ئێوە پیاوان چەندە بێشەرمن! ـ قسەی دەکرد و هەڵچوون و ئاڵەتی بوونی جارلەگەڵ جار زیاتر خۆی دەنواند و بەو شێوەیە هۆی تووڕە بوونەکەی خۆی بۆ ئاشکرا دەکرد: چۆن تێناگەی کە ئەمە شتێك نییە کە ژنێك بتوانێ لە بیری بباتەوە. ئەویش ژنێك کە ناتوانێ لەگەڵ ژیانی تۆ ئاشنابێت. من جگە لەوەی کە خۆت پێمدەڵێی چیی تر دەزانم؟ چیم دەزانی؟ چۆن بزانم ئەوەی کە تۆ بە منت گوتووە ڕاستە یان نا؟

ـ ئانا، تۆ دەتهەوێ زویرم بکەی. تۆ بەڕاستی بڕوا بە قسەی من ناکەی؟ مەگین من بە تۆم نەگوت کە هیچ فیکر و خەیاڵێك لە سەرمدا نییە کە لە تۆی بشارمەوە.

ئانا کە دیاربوو دەیهەوێ فیکر و خەیاڵی گومانلاویی لەسەر خۆی دەرباوێ گوتی: بەڵێ، بەڵێ بەڵام خۆزگە بتزانیبایە کە ئەم بارودۆخە بۆ من چەندە ناخۆش و دژوارە! باوەڕ بە قسەکانت دەکەم، باوەڕ دەکەم. باسی چیت دەکرد؟

بەڵام ڤرۆنسکی نەیتوانی ئەوەی دەیویست بیڵێ، خێرا وەبیری بێتەوە. ئەو کێشە و گومانانەی لەم دواییانەدا بەردەوام هەست و ناخی ئانای دادەگرت و ترسی خستبووە دڵییەوە و هەرچەندەش هەوڵی دەدا ئەو ترسە بشارێتەوە نەیدەتوانی، گڕی ئەشقەکەشی خەریکبوو دادەمرکایەوە. ئەگەرچی دەیزانی هۆی ئەو گومان و ئێرەییە تەنیا ئەشقی ئەوە. گەلێ جاران بە خۆی گوتبوو کە ئەوینی ئانا ئەوپەڕی بەختەوەرییە، ئێستاش کە ئەو ژنە حەزی لێدەکرد،

---

159- Terese

ئەوینەکەشی خۆشەویستیی ژنێك بوو کە ئەشقی لە هەموو نێعمەتێك پێ مەزنتر بوو، ئەو (ڤرۆنسکی) زۆر لە بەختەوەری دوور بوو، زۆر بەر لەوەی کە بە دوای ئەودا مۆسکۆ بەجێ بێڵێ. ئەو کاتە ئەو خۆی بە ناکام دەزانی بەڵام هەستی دەکرد بە مراد دەگات. ئەمڕۆ هەستی دەکرد کە کامڕەواییەکەی ناوەتە پشتسەر. ئانا بە هیچ شێوەیەك ئەو ژنە نەبوو کە یەکەم جار دیتبووی. رواڵەت و ناخی هەردوو گۆڕابوون و لەچاو رابردوو قەڵەو و ناحەز بووبوو، کاتێك کە باسی ژنە ئەکتەری دەکرد لە روخساریدا رقێك دیاربوو کە خوێنی تاڵ کردبوو. ڤرۆنسکی بە چاوی پیاوێك لێی دەڕوانی کە گوڵێکی هەڵپساندووە و لە دەستیدا ژاکاوە، ئەو جوانی و تەرچیکییەشی کە بە هۆی تەماحی ئەوەوە چنیوێتی زایە بووە و بە زەحمەت دەتوانێ ئەو بۆن و بەرامەیەی تێدا ببینێتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا دەیدی کە ئەو کاتەی زیاتر لە ئێستا گڕی ئەشقی ئانای لە دڵدا بوو ئەگەر بەڕاستی بیویستبایە دەیتوانی لە دڵی خۆی دەرهاوێژێ، بەڵام لەم کاتەدا پێیوابوو ئەگەرچی ئیتر ئەشقی ئەو لە دڵیدا سارد بۆتەوە بەڵام ناتوانێ پێوەندیی خۆی لەگەڵ ئەودا بپسێنێ.

ئانا گوتی: دەی، ئێستا پێمبڵێ بزانم، دەتویست سەبارەت بە پرێنس چی بڵێی؟ من شەیتانم لە دڵم دەرکرد ـ ئەوان لە نێوان خۆیاندا بە دڵپیسییان دەگوت شەیتان ـ سەبارەت بە پرێنس خەریکبووی دەتگوت چی؟ لە دەست چی ئەوەندە بێزار بووی؟

ڤرۆنسکی گوتی: ئاخ، نازانی، ئیتر بۆم تامڵ نەدەکرا ـ هەوڵی دەدا سەرەداوی فیکر و خەیاڵی کە پسا بوو بیبینێتەوە: ئاشنایەتیی نزیك لەگەڵ ئەودا بە قازانج نییە. هەرچەندە لێی نزیك ببیتەوە زیاتر دەتەوێ لە دەستی قوتار بی. ئەگەر بمهەوێ وەسفی ئەوت بۆ بکەم، راست وەك ئەو ئاژەڵە دابەستانە وایە کە زۆر باش لەوەڕاون و لە پیشانگاکاندا میدالیا وەردەگرن. هەر ئەوە ـ ئەو قسەیەی هێندە بە رقەوە دەربڕی کە سەرنجی ئانای راکێشا.

ئانا هەڵیدایە: سەیرە، چۆن شتی وا دەبێ؟ ئەو ئەم هەموو شتانەی دیوە و خوێندەواریشی هەیە؟

ـ ئەو خوێندنەی ئەو لەگەڵ خوێندنی خەڵك جیاوازە. خوێندنێکە تایبەتی خۆیان. دیارە خوێندنەکەشی تەنیا بۆ ئەوە باشە کە هەقی پێبدات سووکایەتی بە خوێندەواری بکات. بەجۆرێك کە هەموویان سووکایەتی بە هەموو شتێك جگە چێژە حەیوانییەکان دەکەن.

ئانا وەڵامی دایەوە: بەڵام ئێوە پیاوان هەمووتان حەز بەو چێژە حەیوانییە دەکەن ـ ڤرۆنسکی تێگەیشت کە ئانا خەریکە نیگا خەمتێزاوەکەی لێ دەدزێتەوە.

بە پێکەنینەوە گوتی: ئێستا چی بووە کە ئاوا بەرەڤانیی لێدەکەی؟

ـ بەرەڤانیی چیی لێبکەم؟ خۆ بۆ من فەرق ناکات، بەڵام پێموایە ئەگەر ئەم جۆرە رابواردنەت پێخۆش نەبوایە، دەتتوانی خۆی لێ ببوێری و نەچیتە ژێربار. بەڵام دیارە چێژ لە بینینی تێرز وەردەگری بە جلوبەرگی حەواوە....

ڤرۆنسکی دەستی ئانای گرت کە لەسەر مێزەکەی دانابوو، ماچی کرد و گوتی: دیسان، دیسان شەیتان سەری هەڵداوەتەوە....

ـ بەڵێ، بەڵام ناتوانم. تۆ نازانی چەندە چاوەڕوانت بووم و ئەو ماوەیەم چەندە بە سەختی رابوارد. پێموایە دڵپیس نیم. من دڵپیس نیم. کاتێك تۆ لێرە، لە پەنام دانیشتووی باوەڕ بە قسەکانت دەکەم، بەڵام کاتێك نازانم لە کوێی و خەریکی رابواردنی ژیانی خۆتی و من ئاگام لێنییە....

خۆی کێشا دواوە و ئاخری قولاپەکەی لە گۆلی داوەکە دەرکێشا و دەستە ناسکەکانی بە جووڵانێکی خێراوە لەنێو سەردەستە گوڵدۆزی کراوەکەیدا خستە کار و گوڵە کاموای سپی کە لەبەر شۆقی چراکە دەدرەوشایەوە بە یارمەتیی قامکە گەورەی، دەستی کرد بە لێکقوڵفەکردنی تاڵە نەرم و سپییەکان.

دەنگی ئانا لە ناکاو بە زایەڵەیەکی نائاسایی بەرزبۆوە: دەی، بڵێ بزانم، لە کوێ چاوت بە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ کەوت؟

ـ لە دەم دەرگای هاتنەژووری تووشی بووم.

ـ ئاواش سەری داخست؟

ملی هەڵێنا و بە چاوی نیوەئاوەڵاوە حاڵەتی روخساری خۆی بەپەلە گۆڕی و دەستی لەسەریەك دانا و ڤرۆنسکی لە روخساری جوانی ئەودا راست ئەو حاڵەتەی دەموچاوی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچی دی کاتێك لەبەر دەرگاکە لووتی بە لووتیدا تەقی و سەرێکی لەقاند. زەردەیەکی گرت و ئانا پێکەنی، هەر ئەو پێکەنینە تایبەتەی کە لە ناخی سینگییەوە دەهاتەدەرێ و یەکێك لە جوانییە بەرچاوەکانی بوو.

ڤرۆنسکی گوتی: من بە هیچ شێوەیەك لەو کابرایە ناگەم. ئەگەر هەر ئەو کاتەی لە هاوینە هەوارەکە هەموو شتێکت پێگوت لێت جیا بووبایەتەوە، ئەگەر بانگی بکردایەم بۆ

دوئێل... تێدەگەیشتم. بەڵام لەو ئاکارەی ناگەم. چۆن دەتوانێ ئەو بارودۆخە تامڵ بکات؟ دیارە زۆریش ئازار دەکێشێ.

ئانا بە تەشەرێکەوە گوتی: ئەو؟ خەیاڵت تەخت بێ، زۆر لەو بارودۆخە رازییە.

ـ ئەگەر هەموو شتێك دەکرێ بە باشی و بە خۆشی تەواوبێ، کەوایە ئێمە بۆ ئازار دەکێشین؟

ـ ئەو لەو قسانە ناگا، من چاکی دەناسم، تەواوی وجوودی لەگەڵ درۆ و خۆفریودان ئاوێتەیە، ئەگەر ئەو کابرایە رێزەیەك هەست و غیرەتی ببوایە دەگونجا ئاوا لەگەڵ من بژی؟ ئەو نە هیچ تێدەگا و نە هەستیشی هەیە. کەسێك کە بەقەت دەنکە جۆیەك غیرەتی هەبێ دەتوانێ لەگەڵ ژنێك لە ژێر میچێکدا بژی کە خەیانەتی پێکردووە؟ دەتوانێ لەگەڵی بژی و «تۆ»ی پێبڵێ؟

دیسان لاسایی کردەوە و بە زمانی فەرەنسی گوتی: تۆ، ***ئانای خۆشەویستم.***

ـ ئەوە خۆ بەشەر نییە، کوا پیاو ئاوایە. بووکە باخەیە، هیچ کەس ئەو شتانە نازانێ، بەڵام من دەزانم. ئاخ ئەگەر من لە جێی ئەو بووایەم ژنێکی وەك خۆمم لەمێژ بوو کوشتبوو، لەتوپەتم دەکرد. ئیتر پێمنەدەگوت ***ئانای خۆشەویستم.*** ئەوە کوا بەشەرە، مەکینەیەکی قورمیشکراوی فەرمانگەیە، وەزارەتخانەیە، خۆ تێناگا من ژنی ئەوم، تێناگا لەبەر چاوی من پیاوێکی غەوارەیە. بوونی لە ژیانمدا شتێکی زیادییە... کورە واچاکە هەر باسی نەکەین، شیاوی ئەوە نییە هەر ناوی بێنی.

ڤرۆنسکی هەوڵی دەدا هێوری بکاتەوە و گوتی: تۆ بە هەڵە چووی، ئاناگیان، بەهەڵە چووی. بەڵام هیچ گرینگ نییە. باسی ئەو ناکەین. ئێستا پێمبڵێ بزانم چیت کرد؟ چیبووە؟ نەخۆشییەکەت چییە؟ دوکتۆر گوتی چی؟

ئانا بە شادییەکی مانادارەوە چاوی لێکرد. دیاربوو دیمەنی ناحەز و دزێوی تری لە مێردەکەی وەبیرهاتۆتەوە و چاوەڕوانی دەرفەتێکە لاسایی بکاتەوە.

ڤرۆنسکی درێژەی پێدا: من پێم وانییە تۆ نەخۆش بی. ناڕەحەتییەکەت بەهۆی دوو گیانییەکەتەوەیە. کەنگێ چاوەڕوانی بین؟

گڕی گاڵتەجاڕی لە چاوی ئانادا کوژایەوە و بزەیەکی تر کە چیرۆکی رازێکی لە ڤرۆنسکی دەشاردەوە جێگەی ئەوی گرتەوە.

ـ زوو، زۆر زوو. تۆ دەتگوت تووشی تەنگانە هاتووین و دەبێ دەروویێك بۆ دەربازبوون بدۆزینەوە. ئەگەر دەزانی تاملّکردنی ئەو تەنگژەیە بۆ من چەندە دژوارە، من حازر بووم هەموو شتێکی خۆم بدەم تاکوو بتوانم بە ئازادی و بەبێ سەرنەویکردن تۆم خۆش بووێ، ئیتر ئاوا بەردەوام ئازارم نەدەکێشا و تۆشم بە دڵپیسی و گومانی خۆم ئازار نەدەدا... بەم زووانە ئەو ئازارە کۆتاییی دێ... بەڵام نەك ئەو جۆرەی ئێمە بیری لێدەکەینەوە.

خەمی ئەوەش کە ئەو دەربازبوونە چۆن دەبێ، ئەوەندەی دیکە تەزاندی و هێندەی دڵ بە خۆی سووتا کە فرمێسك لە چاوانیدا قەتیسما و نەیتوانی درێژە بە قسەکانی بدات. دەستە سپییەکەی کە بە ئەگوستیلەکانییەوە لەبەر شۆقی چراکە بریقەی دەهات لەسەر قۆڵی ئەو دانا.

ـ دەربازبوونمان بەو شێوەی کە بیری لێدەکەینەوە نابێ. نەمدەویست پێتبڵێم بەڵام تۆ ناچارت کردم. بە زوویی مەسەلەکە چارەسەر دەبێ و هەمووومان دەحەسێینەوە. ئیتر ئازاریش ناکێشین.

ڤرۆنسکی کە لە مەبەستی نەگەیشتبوو گوتی: هیچ تێناگەم.

ـ تۆ دەتپرسی کەنگێ؟ بەم زووانە. قسەکەم پێمەبڕە، منیش گیانم لە پێناوی ئەو حەسانەوەیە دادەنێم ـ پاشان بە هەڵەپڕووکێ گوتی: ئەوە نازانم، بەڵام سوور دەزانم، بەم زووانە دەمرم و زۆریشم پێخۆشە کە دەمرم و خۆم و ئێوەش ئاسوودە دەبن.

فرمێسك بە چاویدا هاتە خوارێ. ڤرۆنسکی بە سەردەستیدا نووشتایەوە و دەستیکرد بە ماچکردنی و هەوڵیدا هەیەجانی خۆی کە دەیزانی بێبنەمایە و بەڵام نەیدەتوانی بە سەریدا زاڵ بێ، هەرچۆنێکە بیشارێتەوە.

ئانا دەستی ئەوی بە توندی گوشی و گوتی: بەڵێ، هەروا باشترە. حەزم لێبکە و خۆشتبوێم. ئەوە تەنیا شتێکە کە بۆم ماوەتەوە.

ڤرۆنسکی وەخۆ هاتەوە و سەری هەڵێنا.

ـ تۆش قسەی وادەکەی! ئەو وڕاوە بێسەرەوبەرانە چییە!

ـ نا، واڕوە نییە، راستییە.

ـ یانی چی؟ راستیی چی؟

ـ راستییەکەی ئەوەیە کە من دەمرم. خەونم دیوە.

ڤرۆنسکی پرسیی: خەون؟ ـ خێرا وەبیر ئەو مووژیکە کەوتەوە کە خۆی لە خەونیدا دیبووی.

ئانا گوتی: بەڵێ خەون، لەمێژە ئەو خەونەم دیوە. لە خەونمدا دیتم کە بەپەلە چووم بۆ ژووری خەوەکەم تاکوو نازانم شتێك بێنم، یان سەرێك لە ژوورەکە هەڵێنم. خۆ دەزانی مرۆڤ لە خەودا باش نازانێ. ـ بە چاوانی زەق و ترسلێنیشتووەوە درێژەی پێدا: دیتم سووچی ژوورەکە شتێکی لێیە.

ـ هاە، لەو قسەیە! تۆ چۆن دەتوانی باوەڕت بەو شتانە....

بەڵام ئانا نەیهێشت قسەکەی تەواوبکات، چونکە ئەو شتەی کە دەیویست باسی بکات زۆر گرینگ بوو.

ـ دیتیشم ئەو شتەی کە نەمەدەزانی چییە مووژیکێکی کورتەباڵا بوو کە ریشێکی ئاڵۆزکاو و قەڵافەتێکی ترسناکی هەبوو. دەمویست هەڵێم بەڵام ئەو بەسەر توورەکەکەیدا داهاتەوە و دەستیکرد بە نێویدا و لە شتێك دەگەڕا...

خۆشی دەستیکرد بە لاسایی کردنەوەی و نیشانیدا کە مووژیکەکە چۆن گەڕاوە. ڤرۆنسکی کە خەونەکەی خۆی وەبیرهاتبۆوە هەستی کرد کە ئەو ترسە دیسان سەرتاپای داگرتووە.

ـ مووژیکەکە نێو توورەکەکەی دەگەڕا و لەژێر لێوییەوە بە زمانی فەڕەنسی و راوێژێکی توند، کە پیتی «ر»ی بە شێوەی فەڕەنسییانی باکوور بە ژێر مەڵاشووی و بێ ئەوەی نووکی زمانی بلەرزێنێتەوە دەریبڕی، بەڵام زۆر بە زمانێکی رەوان گوتی: ***دەبێ ئاسن بکوتی و نەرمی بکەی وەك هەویر-*** منیش لە ترسانا دەمویست خەبەرم بێتەوە و راچەنیم. بەڵام لە خەو راچەنینەکەشم بەشێك لە خەونەکەم بوو، نەمدەزانی مانای ئەم شتانە چییە. کۆرنی[160] پێیگوتم: «زایەمان، تۆ کاتی زایەمان دەمری. زایەمان دایەگیان...» منیش لە خەو راچەنیم.

ڤرۆنسکی گوتی: ئەو وڕێنەیە چییە! هەموو قسەی هاتەران پاتەرانە! ـ بەڵام خۆشی باش دەیزانی و بە راوێژیدا دیاربوو ئەوەی دەیلێ باوەڕی پێینییە.

ـ چاکە، با هەر باسی نەکەین. زەنگ لێدە با دوو چاییمان بۆ بینن. بەڵێ، پەلە مەکە، ئیتر زۆر ناخایێنێ...

بەڵام لە ناکاو بێدەنگ بوو. رەنگیشی لەڕێوە هەڵبزڕکا و ترس و دڵەخورپە کتوپڕ جێی خۆیدا بە هێمنایەتی و شیرینکامی. ڤرۆنسکی لە مانای ئەو گۆڕانە نەدەگەیشت. ئانا لە هەناوی خۆیدا جووڵانی بوونەوەرێکی زیندووی هەست پێکردبوو.

---

160- korny

# چوار

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ دوای ئەوەی لە دەرگانەی ماڵەکەی خۆیدا لووتی بە لووتی ڤرۆنسکیدا تەقی، هەروا کە دەیویست رۆیشت بۆ ئوپێرای ئیتالی. دوو پەردە لە ئوپێراکە مابوو، هەموو ئەو کەسانەی کە حەزی دەکرد بیانبینێ، چاوی پێیان کەوت. کە گەڕایەوە بۆ ماڵێ بە وردی چاوی لە رەختاوێزەکە کرد و کە چاوی بە باڵتەیەکی سەربازی نەکەوت بە پێی عادەت رۆیشت بۆ ژوورەکەی خۆی. بەڵام بە پێچەوانەی خووخدە نەچووە سەر چرپای خەوەکەی بەڵکوو هەتا سەعات سێی بەیانی لە ژوورەکەی خۆیدا پیاسەی کرد. رق و تووڕەیی ئاراوقارای لێهەڵگرتبوو چونکە ژنەکەی ئابڕووی خۆی نەپاراستبوو و تەنیا مەرجی ئەو، یانی رێگە پێنەدانی گراوەکەی بۆ ماڵێی لەبەرچاو نەگرتبوو. ژنەکەی داخوازیی ئەوی وەپشت گوێ خستبوو، بۆیە دەبوو بۆ سزادانی ئەو، شەرتی هەڕەشەکەی بەرێتەسەر، یانی لە دادگا داوای تەڵاق بکات و ئەو لە منداڵەکەی جیا بکاتەوە. ئاگای لە هەموو کێشە و ئاریشەکان بوو. کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا بە کینایە بە تێیگەیاندبوو کە ئەمە باشترین رێیە بۆ ئەوەی لەو تەنگوچەڵەمە و تەنگژەیە دەربازبێ. لە ماوەیەك لەمەوبەرەوە کاری تەڵاق تا رادەیەك ئاسان بووبۆوە و ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بۆ زاڵبوون بەسەر ئەو تەشریفات و کێشە و گرفتە ئیدارییانەدا دەیزانی تووشی تەنگوچەڵەمە نابێ. جگە لەوەش گرفتەکەی تەنیا ئەوە نەبوو، سەبارەت بە دەوسیەی کەمینە نەتەوەکان و هەروەها کاری گەڵاڵەی ئاودێریی دەشتی زارایسك کەوتبووە ژێر گوشار کە لەم دواییانەدا بەجارێ ئەعسابی شێوابوو.

ئەو شەوە خەو نەچووە چاوی و بە شێوەیەکی سەرسووڕهێنەریش گڕی رقەکەی بڵێسەی کێشابوو، هەتا بەیانیش بەجێیەك گەیشت کە لەوە زیاتر نەدەگونجا. بەپەلە جلەکانی لەبەرکرد و وەك ئەوەی کاسەی رق و دەغەزی لێوڕێژ بووبێ و خەمی ئەوەی بێ قومێکی بە فیڕۆ بڕوا،

خۆی دەخواردەوە و ترسی بوو ئەو وزە پێویستەی نەمێنێ کە بتوانێ لەگەڵ ژنەکەی بەرەوڕوو بێ، بۆیە کە تێگەیشت ژنەکەی لە خەو هەستاوە رۆیشت بۆ ژوورەکەی.

ئانا کە پێیوابوو مێردەکەی زۆر باش دەناسێ لەگەڵ چاوی پێیکەوت هاتەژوورێ تووشی واقوڕمان بوو. ناوچاوانی تێکنا و چاوانی کە بە هۆی خەم و پەژارەوە لە رەشەوە دەهات لە شوێنێکی رووبەڕووی خۆی بڕی بۆ ئەوەی نیگای خۆی لە ئەو بدزێتەوە. ئەلکسی لە داخی ئەو سووکایەتییە هێندەی رق هەستابوو لێوی خۆی دەکورۆشت، ئاکار و هەڵسوکەوت و راوێژی زۆر توند و خۆڕاگرانە بوو، بە چەشنێك کە ئانا قەتی ئاوا نەدیتبوو. کە هاتەژوورێ بەبێ سڵاو و چاکوچۆنی راست رۆیشت بۆ پشت مێزی نووسینەکەی و دەستیدا کلیل و دەرگای چەکمەجەکەی کردەوە.

ئانا دەنگی هەڵبڕی: چیتدەوێ؟

ـ نامەی خۆشەویستەکەت.

ئانا چەکمەجەکەی داخستەوە و گوتی: لێرە نییە.

بەڵام ئەو هەربەوەدا بۆی دەرکەوت کە باشی بۆ چووە و بە تووڕەیی پاڵی بە دەستییەوە نا و پڕیکرد بەو جانتا بچووکەدا کە دەیزانی ئانا گرینگترین کاغەزەکانی تێدەخات. ئانا دەیویست جانتاکەی لە دەست بڕفێنێ بەڵام ئەلکسی پاڵێکی پێوەنا و دووری خستەوە.

جانتاکەی نایە ژێر باخەڵی و بە هەنیشکی وابەخۆیەوە گوشی کە شانی قیت بووبۆوە. گوتی: دانیشە، دەبێ قسەت لەگەڵ بکەم.

ئانا شەرمەزار و واقوڕماو و بێدەنگ و مات چاوی تێبڕی.

ـ خۆ پێمگوتبووی ئیجازە نادەم کەڵەگاکەت بێنیتە ماڵێ.

ـ من دەبوو چاوم پێیبکەوێ تاکوو...

بێدەنگ بوو چونکە هیچ بیانوویێکی بۆ نەدەدۆزرایەوە.

ـ من کارم بەسەر ئەو شتانەوە نییە و نامەوێ بزانم کە ژنێك بە چ قەستێك دەخوازێ کەڵەگاکەی ببینێ.

ئانا سوورهەڵگەڕا و گوتی: من تەنیا دەمویست... ـ ئەو قسە تاڵ و رووهەڵماڵدراوانەیەی کارنین وایلێکرد رقی هەستێ و غیرەت وەبەر خۆی بنێ. گوتی: بەڕاستی تێناگەی کە خەریکی راست و رەوان سووکایەتیم پێدەکەی و تۆمەتم دەدەیتە پاڵ؟

ـ تەنیا ژن و پیاوی بەئابڕۆ هەقی هەیە بە تۆمەت و سووکایەتی زیز بێ. بەڵام ئەگەر بە دز بڵێی دز تەنیا دەربڕینی راستەقینەیە.

ـ ئەو دڵڕەقییەی تۆ شتێکی تازەیە. تا ئێستا نەمدیبوو چێژ لە ئازاردانی من وەرگری.

ـ تۆ ئەوە بە دڵڕەقی دەزانی کە مێردێك تەنیا بۆ پاراستنی ئابڕووی خۆی باڵ بەسەر ژنەکەیدا بکێشێ و پارێزگاری لە ئابڕووی خۆی بکات؟ ئەوە دڵڕەقییە؟

ئانا گڕی رقی بڵێسەی کێشا و گوڕاندی: ئەوە لە دڵڕەقی خراپترە، ئەگەر حەزدەکەی بزانی، ناوی ئەوە خوێڕییەتییە ـ لەپڕ هەستا کە بڕوات.

کارنین بە قیژەی ناخۆشی کە ئێستا لەچاو کاتی ئاسایی پەردەیەك زیلتر بوو دەنگی هەڵبڕی: نا، ئەوە تێکتدا ـ بە دەستە زلەکەی وا بە رقەوە مەچەکی دەستی گرت و لە جێی خۆی داینیشاندەوە کە شوێنی بازنەکانی مەچەکی سوورهەڵگێڕا و گوتی: خوێڕییەتی؟ ئەگەر تۆ دەتهەوێ ئەو وشەیە بەکار بێنی دەبێ بزانی خوێڕی کەسێکە کە مێرد و کوڕەکەی لە پێناوی پیاوێکی غەوارەدا دەفرۆشێ و نان لە دەستی مێردەکەشی دەخوا.

ئانا سەری داخست، ئەوەیکە شەوی رابردوو بە گراوەکەی گوتبوو دووپاتی نەکردەوە و نەیگوت کە مێردەکەی ئەوە و کارنین لەو نێوەدا زیادییە و مڵۆزمێکە و بەس، تەنانەت فیکرێکی ئاوا هەر بە مێشکیشیدا نەهات. ئەو بە تەواوی هەستی دەکرد کە قسەی مێردەکەی راستە و تەنیا بە دەنگێکی نەرم و لەسەرەخۆ گوتی:

ـ تۆ ناتوانی لە خۆم باشتر تێبگەی کە کەوتوومەتە چ دۆخێکی ناحەز و نالەبارەوە، بەڵام بۆ قسەی ئاوا دەکەی؟

کارنین هەروا بە تووڕەیی گوتی: بۆچی ئەو قسەیە دەکەم؟! بۆیە ئەو قسەیە دەکەم تاکوو بزانی چونکە داواکارییەکەی منت لەبەرچاو نەگرتووە ویستووتە ئابڕووی خۆت و من بەری، دەبێ کارێك بکەم و کۆتایی بەو بارودۆخە بێنم.

ـ تۆش ئەو کارە نەکەی ئەم دۆخە بەم زووانە و هەر بۆخۆی کۆتایی پێدێ ـ ئەوەی گوت و دیسان فیکری نزیکبوونەوە لە مەرگ کە ئێستا ئاواتی بۆ دەخواست چاوی پڕکرد لە ئەسرین.

ـ ئەو بارودۆخە زووتر لەوەی تۆ و خۆشەویستەکەت بیرتان لێکردۆتەوە کۆتایی پێدێ. ئێوە دەتانهەوێ بە کەیفی خۆتان رایدەن و ئەوەی پێتان خۆشە...

ـ ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ، من ناڵێم چەپۆککێشان بەسەری کەوتوودا نیشانەی گەورەییە، ئەوە نیشانەی پەستی و خوێڕییەتییە.

ـ بەڵێ، ئێوە تەنیا لە بیری خۆتاندان، بەڵام بیر لە ئازاری پیاوێك ناكەنەوە كە مێردتانە. بۆ ئێوە گرینگ نییە كە تەواوی ژیانی ئەوتان زایە كردووە، كاریشتان بەوە نییە كە وایلێهاتووە شەو و رۆژ ئاسار... ئالار... ئاسار دەكێشێ.

ئەلكسی ئەلكساندرڤیچ ئەوەندە بە توندی قسەی دەكرد زمانی كەوتبووە تەتەڵەكردن و نەیدەتوانی وشەكە بە جوانی دەربڕێ. ئاخریش گوتی ئاسار. ئانا ئەو زمان تێكەڵهاتنەی مێردەكەی بەلاوە پێكەنینی بوو بەڵام خێرا لە خۆی شەرمەزار بۆوە كە لەو بارودۆخەدا توانیبووی شتێكیوا بە گاڵتەجاڕی دابنێ. سەرەتا هەستی بە حاڵ و رۆحی ئەو كرد و خۆی لە جێی ئەو دانا و دڵی پێیسووتا. بەڵام دەیتوانی چیبڵێ یان چیبكات؟ سەری داخست و بێدەنگ بوو. كارنینیش هێندێك بێدەنگ بوو، پاشان كە دەستیكردەوە بە قسەكردن دەنگی كەمتر لە پێشوو لە قیژە دەچوو، گوڕ و تین و تووڕەییەكەشی كەمێك نیشتبۆوە و بەبێ بیركردنەوە و بە هەڵكەوت لەسەر وشەگەلێك پێداگریی دەكرد كە گرینگییەكی ئەوتۆیان نەبوو.

گوتی: هاتووم پێتبڵێم كە...

ئانا چاوێكی لێكرد. كە حاڵەتی روخساری وەبیرهاتەوە ئەو كاتەی نەیدەتوانی وشەی ئازار بە جوانی دەربڕێ لە دڵی خۆیدا گوتی «نا، ئەوە هەر من ئاوام بە بیردا هاتووە، مەگین دەگونجێ خاوەنی چاوانێكی وا رەشبین و لەسەرەخۆییەكی ئاوا بڕوابەخۆیانە سۆز و هەستی لە دڵدا بێ؟»

ئانا لەسەرەخۆ گوتی: ناتوانم هیچ شتێك بگۆڕم.

ـ من هاتبووم پێتان بڵێم سبەینێ دەچم بۆ مۆسكۆ و ئیتر سەر بەمماڵەدا ناكەمەوە و ئەو پارێزەرەی كە كاری تەلاقەكەی پێدەسپێرم خۆی ئەوەی پێویست بێ بە ئاگاداریتانی دەگەیێنێ. ـ هەوڵیدا ئەوەی دەیهەوێ سەبارەت بە كوڕەكەی وەبیری بێتەوە، پاشان گوتیشی: كوڕەكەم لەلای خوشكم دەبێ.

ئانا لە بنەوە چاوێكی لێكرد و پەشۆكاوانە گوتی: تۆ سریۆژات تەنیا بۆ ئەوە دەوێ كە منی پێئازار بدەی. خۆ تۆ خۆشت ناوێ، لێگەڕێ با لەلای خۆم بێ.

ـ بەڵێ، خوشەویستی كوڕەكەشم لە دڵمدا نەماوە، چونكە یادی ئەو لەگەڵ نەفرەتم لە ئێوە پێكەوە گرێ دراون. لەگەڵ ئەوەشدا ناهێڵم لەلای تۆ بێ، خوداحافیز.

دەیویست بڕوات بەڵام ئەمجار ئانا رایگرت، دیسان بە لەبزێكی شێنەیی گوتی: ئەلكسی ئەلكساندرڤیچ لێگەڕێ با سریۆژا لەلای من بێ. هەر ئەوەندە و هیچی تر ناڵێم. لێیگەڕێ با لەلای من بێ. لانیكەم تا مندا... لەو دوو گیانییە نەجاتم دەبێ. لێگەڕێ با لەلای من بێ.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ شڵەژاو بە پڕتاو خۆی لە دەستی راپسکاند و بێ ئەوەی هیچ بڵێ لە ژوورەکە چووەدەرێ.

## پێنج

کاتێك کە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ خۆیکرد بە ژووری چاوەڕوانیی پارێزەری بەناوبانگی پترزبۆرگیدا، پڕ بوو لە خەڵك. دوو ژنی لێ بوو، یەکیان جحێڵ و ئەوی تریان بەساڵاچوو، هەروەها ژنێکی کارەکەر و سێ پیاو: یەکیان بانکدارێکی ئەڵمانی بوو کە ئەنگوستیلەیەکی لە قامکدا بوو، یەکی دیکەشیان کاسپکارێکی ریشن بوو، سێهەمیش فەرمانبەرێکی مڕومۆچ بوو کە عەبایەکی بە شانیدا دابوو و خاچێکی لە ملدا و دیاربوو هەموویان زۆر لەمێژە چاوەڕوانن. دوو نووسیاری پارێزەرەکە لە پشت مێزەکانی خۆیان خەریکی نووسین بوون و جیڕەجیڕی قەڵەمەکانیان دەهات. کەرەسەی نووسینەکانیان بە بڕوای ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ، کە لەو بوارەدا خاوەنڕا بوو زۆر باش و گرانبایی بوون. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ نەیدەتوانی چاوپۆشی لەو خاڵە بکات. یەکێك لە نووسیارەکان، هەروا کە دانیشتبوو، بە ناوچاوانێکی گرژ و روویێکی ناخۆشەوە رووی دەمی لە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ کرد و گوتی:

ـ چیت دەوێ؟

ـ من ئیشم بە بەڕێز پارێزەرە.

بە قەڵەمەکەی دەستی دانیشتووانی نیشاندا و بە لەبزێکی ناخۆش و تووڕە وەڵامی دایەوە: ئاغای پارێزەر کاری هەیە ـ دەستیکردەوە بە نووسین. ـ

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ گوتی: بڵێی نەگونجێ کاتێکی زۆر کەم...؟

ـ کاتی ئازادیان نییە. هەموو کاتیان گیراوە. فەرموون دانیشن با نۆرەتان بگاتێ.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ کە دیتی ناچارە خۆی بناسێنێ، زۆر لەسەرەخۆ و ماقووڵانە گوتی: کەوایە تکاتان لێدەکەم ئەگەر زەحمەت نییە ئەو کارتەی من بدەنە خزمەتیان.

نووسیار کارتەکەی لێ وەرگرت و چاوێکی لێکرد و بە ناقایلییەوە رۆیشت بۆ ژووری پارێزەر.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لەگەڵ بنەمای دادیاریی ئاشکرا دژایەتیی نەبوو بەڵام هێندێك لە وردەکارییەکانی ئەو یاسایەی رووسیای بە هۆی هێندێك مەسەلەی تایبەتی بەڕێوەبەرایەتییەوە بە دڵ نەبوو. ئەگەر توانیباشی و بیویڕایە کە ئەوەی ئەو شتەی کردۆتە ژێدەر و پەسندی کردووە مەحکوومی بکات، لێیڕانەدەوەستا. هەموو تەمەنی لە کاروباری دایرە و فەرمانگەدا رابردبوو، بەو هۆیە هەرکات شتێکی بە دڵ نەبوایە بە توندی نارەزایەتیی دەردەبڕی و نەیدەتوانی چاوپۆشیی لێبکات و پێیوابوو بە هۆی چاکسازی و رەخنەوە دەکرێ ئەو کارانە بەرەو رێگای باش و راست بەرێ. لە دامەزراوە نوێیەکانی دادیاریدا ئەو رۆڵەی پارێزەرانی ئاریشە و بەرتاوان لە کاری دادپرسیدا لە ئەستۆیان گرتبوو هیچیانی بە دڵ نەبوو. تا ئێستا کاری نەکەوتبووە لای پارێزەران و هەر بەو هۆیەش دژایەتییەکەی لەگەڵ کاری ئەوان تەنیا لایەن و باری بنەڕەتەکەی بوو. بەڵام ئێستا دژایەتییەکەی لەگەڵ ئەو دامەرزاوەیە بە هۆی ئەو هەڵسوکەوتە نالەبارەیان و شێوەی وەرگرتنی لە نووسینگەی پارێزەر ئەوەندەی تر زیادی کرد.

نووسیار گەڕایەوە و گوتی: ئێستا دێن.ـ هەر بەراستیش دوای دوو خولەك قەڵافەتی یاسا ناسی بەساڵاچوو کە بۆ راوێژ کردن لەگەڵ پارێزەر هاتبوو لەگەڵ پارێزەر خۆی لە چوارچێوەی دەرگاکەدا وەدەر کەوتن.

پارێزەر پیاوێکی خریلانە و قەڵەو بوو کە سەرێکی قۆق و ریشێکی رەشی مەیلەوسوور و برۆی کەمرەنگ و نێوچاوانێکی زەقی هەبوو. خۆی رازاندبۆوە و بۆینباخی خەتخەت و زنجیری دوو لۆی سەعات و تەنانەت پۆستاڵەکانیشی بریقەی دەهات و دەتگوت گەنجێکە و خۆی بۆ شەوی زاوایی رازاندۆتەوە. روخساری زیرەکی لە لادێی دەچوو بەڵام ئاڕایشتەکەی دیاربوو بۆ خۆ نواندنە بەڵام نیشاندەری سەلیقەی خراپی ئەو بوو.

پارێزەر رووی لە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ کرد و گوتی: فەرموو.ـ بە ناوچاوانێکی گرژەوە لە پەنا خۆیەوە رێگای پێدا بچێتە ژووری و دەرگاکەی پێوەدا.

ئاماژەی بەو کورسییەی پەنا مێزی نووسینەکەی کرد کە کاغەز و دەوسییەی لەسەر بڵاو کرابۆوە و گوتی: نافەرمووی؟ـ خۆشی لەسەر کورسیی بەرپرسایەتی دانیشت و دەستە چکۆڵەکانی خۆی کە قامکی قوڵە و تووکی پشت دەستی سپی بوو بە یەکیدا هێنان و سەری بۆ لایەك خوار کردەوە. بەڵام هەر راست لەوکاتەدا قاروونەیەك بە فڕەفڕ بەلای روومەتیدا تێپەڕی. پارێزەر زۆر چالاکانە کە چاوەڕوانیی لێنەدەکرا، دەستی لێکبڵاو کرد و قاروونەکەی گرت و دیسان وەك پێشوو دانیشتەوە.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ کە لەم کارەی پارێزەری بە سەرسوورِمانەوە روانیبوو گوتی: بەر لەوەی باسی کێشەکەی خۆمت بۆ بکەم دەمەوێ عەرزتان بکەم ئەو مەسەلەی کە سەبارەت بە ئەو دەمەوێ راوێژتان لەگەڵ بکەم دەبێ زۆر مەحرەمانە بمێنێتەوە.

بزەیەکی زۆر کەمرەنگ سمێڵی سوور و داچۆڕاوی پارێزەری جووڵاندەوە.

ـ ئەگەر نەمتوانیبایە ئەو رازانەی پێمی دەسپێرن بیانپارێزم پارێزەر نەبووم. بەڵام ئەگەر ئێوە پێویستتان بە شایەدیدان و پێداگرییە...

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ چاوێکی لە چاوی پارێزەر کرد و دیتی کە چاوە شین و زیرەکەکانی بزەیان لێدەبارێ و هێشتا رازی خۆی نەدرکاندووە، دەیزانی ئەو لەوسەری دێتەوە.

کارنین گوتی: ئێوە ناوی من دەزانن؟

پارێزەر کرنۆشێکی کرد و گوتی: ئێوە دەناسم و... ـ دیسان قاروونەیەکی بە چنگی گرت و درێژەی بە قسەکانیدا: وەکوو هەموو رووسەکان لەگەڵ کارە جوان و بەکەڵکەکانی ئێوە ئاشنام.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ هەناسەیەکی هەڵکێشا و هەوڵیدا ورە بەرخۆی بنێت بەڵام کە بڕیاریدا بەبێ شەرمەزاری و زمان تەتەڵەکردن قسە بکات و تەنانەت جەخت لەسەر هێندێ لەو وشەکان بکات، دەنگی باریك بۆوە، گوتی: من مێردێکی چارەڕەشم کە ژنەکەم خەیانەتم پێدەکات و دەمهەوێ بە شێوەی یاسایی لێی جودا ببمەوە، یانی تەڵاقی بدەم بە شەرتێك کە کوڕەکەم نەدرێ بە دایکی.

پارێزەر هەوڵی دەدا رێنەدات زەردەخەنە چاوە شینەکانی داگرێ، بەڵام نەشەیەك کە نەیدەتوانی بیشارێتەوە لە نێو بیبیلەیدا تروسکەی دەهات و ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ دەیدی کە ئەو تروسکەیە تەنیا شادیی کەسێك نییە کە داواکارییەکی بە سوودی وەرگرتبێ، ئێرە سەرکەوتنی لێبوو، نەشەی لێبوو کە لە چاوانی ئەودا سەمایان دەکرد، هەر ئەو تروسکە شوومەی کە لە چاوانی ژنەکەشیدا دیتبووی.

ـ حەزرەتی عالی دەخوازن کە بۆ کاری تەڵاق یارمەتیتان بدەم؟

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ گوتی: بەڵێ وایە. بەڵام دەبێ لە ئێستاوە عەرزتان بکەم کە لەوانەیە من کەڵکی نابەجێ لە وەخت و تاقەتی ئێوە وەرگرم. دەمەوێ لە پێشدا راوێژتان لەگەڵ بکەم. راستە دەمەوێ ژنەکەم تەڵاق بدەم، بەڵام شێوەی بەڕێوەچوونی ئەو ئەرکەش بۆ من زۆر گرینگە. چونکە ئەگەر بزانم ئەو کارە بە دڵی من هەڵناسوورێ واز لە بەدوادا چوونەکەم دێنم و چاوپۆشی لە مەسەلەی یاسایی دەکەم.

پارێزەر وەڵامی دایەوە: هەڵبەت هەمیشە هەروایە. کارەکە دەبێ بە ئیختیار و ڕەزایەتی ئێوە بێ.

پارێزەر چاوی لە لاقی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بڕی، چونکە هەستی دەکرد بریقەی شادی لە چاوانیدایە کە نەیدەتوانی بیشارێتەوە مشتەرییەکەی دەڕەنجێنێ، پاشان چاوی لە گازیرێك کرد بەبەر چاویدا دەفڕی و دەستەکانی دیسان بێ ئیختیار لێك بڵاو بوون بەڵام لەبەر ڕێزی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ ئەمجارەیان خۆی لە گرتنی بوونەوەرە وردیلەکە پاراست.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ درێژەی پێدا: ئەگەرچی من لە سەرجەم یاسای وڵاتەکەمان لەو بارەوە بێئاگا نیم بەڵام دەمویست لەسەریەك بزانم کە ئەم جۆرە کێشانە لە دادگا چۆنی کۆتایی پێدێ؟

پارێزەر بێ ئەوەی سەری هەڵێنێ و لە ڕوخساری کارنێن بڕوانێ ڕەزامەندانە و هەر بەو لەبزەی کە مشتەرییەکەی خۆی پێیدەدوا گوتی: ئێوە حەزدەکەن بۆتان شرۆڤە بکەم کە کام لەو ڕێگایانە لەگەڵ داواکارییەکەی ئێوەدا دەگونجێ؟

کە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بە ئاماژەی سەر ڕەزایەتی دەربڕی، پارێزەر درێژەی بە قسەکانیدا و تەنیا جارجار لەو پەڵە سوورانەی دەڕوانی کە لەسەر ڕوخساری ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ دەرکەوتبوون.

ـ تەڵاق لە یاسای ئێمەدا... ـ ناڕەزایەتی لەو یاسایەی لە لەبز و ڕاوێژیدا هەست پێدەکرد ـ هەروەك دەزانن لە هێندێك بارەوە دەگونجێ ـ ڕووی لە نووسیار کرد کە سەری لە کەلێنی دەرگاکەوە هێنابووە ژوورێ و گوتی: پەلە مەکەن ـ لەگەڵ ئەوەشدا هەستا سەرپێ و چەند وشەیەکی بە گوێدا چرپاند و دیسان دانیشتەوە: لە دۆخێکی وەك کەمئەندامیی یەکێك لە ژن و مێرد یان پێنج ساڵ خۆ ونکردن و بێهەواڵ بوونی لایەنێکیان... ـ کە ئەوەی گوت قامکێکی قوڵە و تسکینی خۆی نووشتاندەوە: پاشان خەیانەتی یەکێك لەو جووتە... ـ ئەو وشەیەی بە چێژێکی ئاشکراوە دەربڕی: ئەوەش خۆی چەند جۆری هەیە ـ لەگەڵ بژاردنی جۆرەکان هەروا قامکە قوڵەکانی خۆی دەنووشتاندەوە، ئەگەرچی مەسەلەی سەرەکی و ناسەرەکیی ئەوان نەدەکرا لە پاڵ یەکتردا بنێی: کەم ئەندامیی ژن یان مێرد، پاشان خەیانەتی ژن یان مێرد ـ چونکە هەموو قامکەکانی نووشتابوونەوە، سەر لە نوێ ڕاستی کردنەوە و درێژەی پێدا: ئەوانەی کە گوتم باری ڕواڵەتی بوون. بەڵام من پێموایە ئێوە شانازیتان پێبەخشیوم کە بۆ ئاگاداربوون لە چۆنێتیی بەڕێوەبردنی یاسا هاتوون بۆ لای من. بەم هۆیە بە لەبەرچاوگرتنی دۆخ و بابەتێك کە پێشینەی هەیە دەبێ عەرزتان بکەم کە مەسەلەی تەڵاق لە ڕاستیدا دەچێتە

چوارچێوەی ئەو خاڵانەوە... لەمەڕ ئێوەوە دیارە کەمئەندامی پێموانییە بیگرێتەوە و پێنج ساڵ خۆونکردن و بێهەواڵیش کە...

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بە نیشانەی ڕەزایەت سەری لەقاند.

ـ کەوایە دەمێنێتەوە خەیانەتی لایەنێك و سەلماندنی تاوان و پێکهاتنی هەردوو لایان، بەڵام ئەگەر پێکهاتنێکی ئاوا لە گۆڕێدا نەبێ یانی تۆمەتبارکردنی تاوانبار بەبێ رازیبوونی خۆی، دەبێ عەرزتان بکەم کە ئەم مەسەلەی دواییيان زۆر بە دەگمەن هەڵدەکەوێ ـ پارێزەر ئەوەی گوت و چاوێکی لە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ کرد و هێندێك بێدەنگ بوو، وەك فرۆشیاری چەکێك کە هەموو تایبەتمەندییەکانی ئەو دەمانچە و تفەنگانە بۆ کڕیارەکەی شی دەکاتەوە و چاوەڕوان رادەوەستێ کە خۆی یەکیان هەڵبژێرێ. بەڵام ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ هیچی نەگوت و لە ئاکامدا پارێزەر دەستیپێکردەوە: بە بڕوای من ئاساییترین و ئاسانترین و ئاقڵانەترین رێگا هەڵبژاردنی خەیانەت و سەلماندنی تاوانە بە رەزایەتی هەردوولا. هەڵبەت ئەگەر بەرانبەرەکەی من مرۆڤێکی دوور لە ژیار و فەرهەنگ بوایە، من قەتم ئیجازە بە خۆم نەدەدا کە بابەتەکەی ئاوا بۆ شی بکەمەوە، بەڵام پێموایە بۆ ئێوە مەسەلەکە ئاشکرایە.

بەڵام ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ هێندە پەشۆکابوو کە ئاقڵانەبوونی ئەو رێگایەی لەڕێوە بۆ دەرنەکەوت و سەرلێشێواوییەکەی لە چاوانیدا دیاربوو، بەڵام پارێزەر خێرا بۆی شرۆڤە کرد.

ـ کاری دوو کەس بە جێیەك دەگات کە ئیتر ناتوانن پێکەوە بژین. ئەوەش راستییەکی حاشا هەڵنەگرە. ئەگەر هەردوو ئامادەبن کە دەست لەیەك بەردەن، وردەکاری و چۆنێتیی رواڵەتی مەسەلەکە گرینگایەتییەکی ئەوتۆی نامێنێ. جگە لەوەش ئەوە ساناترین و خاترجەمترین رێیە.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ ئێستا بە جوانی تێگەیشت، بەڵام پابەندی باری ئایینیی مەسەلەکە بوو و نەیدەتوانی ئەو رێگایە هەڵبژێرێ.

گوتی: هەڵبژاردنی ئەو رێگایە بۆ ئەو مەسەلەیەی ئێمە بە هیچ شێوەیەك ناگونجێ. کەوایە تەنیا شتێك دەمێنێتەوە، یانی ئاشکراکردنی تاوان بەبێ رەزایەتی تاوانبار بە بەڵگە و هەروەها ئەو نامەگەلەی کە من بە دەستمەوەیە.

پارێزەر کە باسی نامە هاتە پێشێ توند لێوی بەیەکدا ناو دەنگێکی باریکی لە کەپۆیەوە دەردا کە بەزەیی و سووکایەتیی پێوە دیاربوو.

گوتی: سەرنج بدەن، ئەو جۆرە کێشانە هەروەك خۆشتان دەزانن، پایەبەرزانی ئایین پێداچوونەوەی بۆ دەکەن و ئەو رووحانییانەی بەسەر ئەو مەسەلە و ئاریشانەدا رادەگەن زۆر

کونچکاون و دەیانهەوێ مووبەموو بۆیان شی بکەیتەوە ـ ئەو قسەیەشی ئاوێتەی زەردەخەنەیەك کرد و نیشانیدا کە لەگەڵ رووحانییان هاوسەلیقەیە: نامە بێگومان دەتوانی تا رادەیەك بۆ سەلماندنی کێشەکە بەکار بێ، بەڵام دەبێ بەڵگەی روونت، بە دەستەوە بێت، یانی شایەد بێنی. بەڵام بە گشتی ئەگەر ئەو شانازییە بە من دەدەی و من بە شیاوی بڕوا و متمانەی خۆت دەزانی هەڵبژاردنی ئەو رێگایەی کە بە قازانجتە بیخە ئەستۆی من. ئەگەر کەسێك بیهەوێ کارەکەی ئاکامی باشی هەبێ نابێ بۆ هەڵبژاردنی رێگاکەی زۆر سەختگیری بکات.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ کە لە ناکاو رەنگی پەڕیبوو گوتی: ئەگەر وایە... ـ بەڵام لەو کاتەدا پارێزەر هەستا سەرپێ و رۆیشت بۆ لای نووسیار کە دیسان هاتەژووری و باسەکەی پێبڕیبوون.

ـ بەو ژنە بڵێ ئێرە دووکانی سەوزەفرۆشی نییە ئەوەندە لەسەری دەڕوا.

ئەوەی گوت و دیسان گەڕایەوە بۆ لای ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ.

لەگەڵ ئەوەی دەگەڕایەوە شوێنی خۆی بە دزییەوە قاروونەیەکی تری گرت و نێوچاوانی تێکنا و لەبەر خۆیەوە گوتی: «کە هاوین دادێ تەواوی قەنەفە و پەردەکانم دەخۆن.»

گوتی: دەی، دەتانفەرموو....

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ هەستا و دەستی بە لێواری مێزەکە گرت و گوتی: من بڕیارەکەی خۆم بە شێوەی نووسین بە ئاگاداریتان دەگەیێنم ـ ساتێك بێدەنگ بوو پاشان گوتی: بەو فەرمایشتانەی جەنابتدا بۆم دەرکەوت کە تەڵاقی یەکجاری خراپ نییە. بەڵام دەکرێ بفەرموون مەرجی خۆتان چییە؟

پارێزەر بێ ئەوەی وەڵامی دوایین پرسیارەکەی کارنین بداتەوە گوتی: هیچ کارێك نییە جێبەجێ نەبێ، بەو شەرتەی ئێوە ئیختیاری هەموو شتێکم بدەنە دەست ـ لەگەڵ ئەوەی دەڕۆیشت بۆ لای دەرگاکە و چاوی و کەوشەکانی هەردووکیان بریقەیان دەهات پرسیی: پێتوایە تا کەنگێ دەتوانم لە بڕیارەکەتان ئاگادارم؟

ـ هەتا حەوتوویێکی تر. ئێوە گەورەیی بنوێنن و ئاگادارم بکەن کە قەبووڵی دەکەن ئەو کارە وەئەستۆ بگرن یا نا و هەروەها مەرجەکانیشتان دەستنیشان بکەن.

ـ بە چاوان قوربان.

پارێزەر بە رێزەوە کڕنۆشێکی کرد و کە مشتەرییەکەی چووەدەرێ و بە تەنیا مایەوە خۆشحاڵیی خۆی دەربڕی. ئەوەندە شاد و کەیفخۆش بوو کە بە پێچەوانەی خووخدەی خۆی

نرخەکەی بۆ ئەو ژنە داشکاند کە چەنەی لێدەدا و دەستی لە قاروونە گرتنیش هەڵگرت و بڕیاریدا زستانی داهاتوو مۆبلەکانی وەك سیگۆنین[161] بەرگی مەخمەریان تێگرێ.

## شەش

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لە کۆڕی حەڤدەی ئووتی کومیسیۆندا سەرکەوتنێکی بەرچاوی وەدەست هێنا بەڵام لە ئاکامی ئەم سەرکەوتنەدا ریسەکەی لێبۆوە بە خوری. کومیسیۆنێکی تازە بۆ پێداچوونەوەی هەموو لایەنەکانی دۆخی ژیانی هۆزە کەمینەکان دامەزرا و بەخێرایی و توندییەکەوە کە ئاکامی هەوڵی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بوو بەرەو ناوچەکە بەڕێ کران. ئاکامی توێژینەوەکانی کومیسیۆن لەماوەی سێ مانگدا راگەیاندرا. ژیانی کەمینەکان لە روانگەی سیاسی و بەڕێوەبەرایەتی و ئابووری و نەتەوەیی و ماددی و ئایینییەوە توێژینەوەی بۆ کرابوو. پەرسڤی روونیان بە هەموو پرسیارەکان دابۆوە. مسۆگەریی ئەو پەرسڤانەش بۆ دڕدۆنگی نەدەبوو چونکە بەرهەمی بۆچوون و داوەریی مرۆڤەکان نەبوو کە هەمیشە تووشی هەڵە و چەواشەکاری دەبن. بەڵکوو ئاکامی کاروباری ئیداری بوون کە لەسەر بنەمای بەڵگە مسۆگەرن. ئەم پەرسڤانە هەموویان ئاکامی دراوە فەرمییەکان، یانی راپۆرتی پارێزگاران و ئوسقۆفەکان بوو، کە خۆی ئاکامی راپۆرتی قایمەقامی گشتی شارەکان و قەشەکان بوو، ئەوانیش بە نۆرەی خۆیان بەپێی بەڵگەگەلێك دابینکرابوون کە سەرۆکی مەڵبەندەکان و قەشەی ئەو ناوچانە ناردبوویان و هەر بەو هۆیەش راست و دروست بوونی پەرسڤەکان جێگای شك و گومانی نەهێشتبۆوە. هەموو پرسیارەکان، بۆ وێنە هۆی خراپیی بەروبووی کشتوکاڵ یان هۆگریی لادێییەکان بە ئایین و ئەو جۆرە شتانە و هەروەها مەسەلەگەلێك کە بەبێ یارمەتیی دەزگاکانی بەڕێوەبەرایەتی چارەسەر نابن و هەتا چەندین سەدەی تریش چارەسەر ناکرێن بە روونی وەڵامیان درابۆوە و رێگە چارەی باش ولەباریان بۆ پێشنیار کرابوو کە هەموو بیروڕاکانی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچی پەسند دەکرد. بەڵام ستێرمۆڤ کە لە دوایین کۆڕی کومیسیۆندا بە توندی ژان بە دڵی گەیشتبوو، دوای گەیشتنی راپۆرتەکە بە کومیسیۆن تاکتیکێکی بەکار هێنا کە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بە تۆزیش چاوەڕوانیی

161- Sigonin

نەدەكرد. یانی خۆی و چەند کەس لە ئەندامانی کومیسیۆن کە توانیبووی بیانکاتە هاودەستی خۆی، لە ناکاو بە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچەوە پێوەست بوون. ئەوان نەك هەر زۆر بە گوڕ و تینەوە لایەنگری بەڕێوەبردنی ئەو کارە پێشنیارکراوانەی کارنین بوون، بەڵکوو خۆشیان لەو بوارەدا گەلێ پێشنیاری رادیکالانەیان کرد. ئەو پێشنیارانە ئەوەندە زێدەڕەوانە بوون کە کاریگەرییان لەسەر بنەمای پێچەوانەی بیروڕای کارنین دانا. پێشنیارەکان وەرگێران. جا ئەو کاتە مەبەستی ستێرمۆڤ بۆ گرتنەبەری ئەو تاکتیکە روون بۆوە. ئەو دەستپێکردنانە ئەوەندە دواکەوتووانە لە کڵ دەرهاتن کە دەوڵەتییەکان و بیروڕای گشتی و ژنانی بیریار و رۆژنامەکان هەموویان بە یەکدەنگ بە گژ خاوەن فکری سەرەکی، یانی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچدا هاتن. ستێرمۆڤ لە ناکاو خۆی دا دواوە و واینواند کە کوێرانە گەلاڵە و پلانەکەی کارنینی بەڕێوەبردووە و ئێستا خۆشی سەری سووڕماوە و لە هەمبەر ئەو کارانەدا کە بەڕێوەچوون هەست بە شەرمەزاری دەکات. ئەو کارانەش بوونە هۆی ئەوەی کارنین ریسەکەی لێ ببێتەوە بە خوری. بەڵام سەرەڕای لەشبەباری و چارەڕەشییەکانی ژیانی بەچۆکدا نەهات. ئەندامانی کومیسیۆن بوونە دوو دەستە، تاقمێك لە ئەندامانی کومیسیۆن کە ستێرمۆڤ سەرۆکیان بوو پاکانەیان بۆ هەڵەی خۆیان دەکرد و دەیانگوت کە بڕوامان بە کارەکانی کومیسیۆنی پێداچوونەوە کردووە کە بە پێشنیاری ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ دامەزراوە و بەڵام ئێستا بۆمان دەرکەوتووە راپۆرتەکانی کومیسیۆن هەمووی هەڵێتو پەڵێت بووە و هیچ کام بایەخی کاغەزە کۆنێکیان نەبووە. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ و تاقمی لایەنگرانی ئەو هەڵچوونەیان بە دژی بەڵگە فەرمییەکان بە کارێکی مەترسیدار زانی و درێژەیاندا بە بەرەڤانی کردن لە راپۆرتەکانی کومیسیۆنی پێداچوونەوە. لە ئاکامدا کۆڕی گەورەپیاوان و تەنانەت کۆمەڵگاش ئاڵۆزیی تێکەوت و ئەگەرچی هەموو بە گوڕ و تینەوە هۆگری مەسەلەکە بوون بەڵام هیچ کەس نەیدەتوانی تێیبگا و سەریان لێی دەرنەدەچوو کە هۆزەکەمینەکان بەڕاستی تووشی رۆژڕەشی و گەندەڵی هاتوون یان ژیانێکی خۆش و ئاسوودەیان هەیە. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بە هۆی ئەو ئاڵۆزییەوە هەروەها تا رادەیەکیش بە هۆی ئەو سووکایەتییەوە کە خەیانەتی ژنەکەی تووشی کردبوو هەستی بە قورسایی بارێکی زۆر گران دەکرد لەسەر شانی و بەجارێ بڕستی لێ بڕابوو. بەڵام ئەو سەرەڕای ئەم بارودۆخە نالەبارەش بڕیارێکی گرینگیدا“ رایگەیاند کە ئیجازە دەخوازێت و خۆی دەچێت بۆ ناوچەکە و مەسەلەکە تاوتوێ دەکات. ئەو کارەش بووە هۆی سەرسووڕمانی زۆربەی ئەندامانی کومیسیۆنەکە و کاتێك ئیجازەکەی وەرگرت، بەرەو پارێزگا دوورەکان وەڕێکەوت.

ئەو سەفەرەی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ قرموقالێکی زۆری لێکەوتەوە، بەتایبەت بەو هۆیەی کە راست بەر لە سەفەرەکەی، ئەو برە پارەی کە بۆ خەرجی رێگا پێویست بوو و دەبووە نرخی دوازدە ئەسپ وەرینەگرت و بە شێوەیەکی فەرمی دایەوە.

بێتسی لەو بارەوە بە پرێنسس میاخکۆڤای گوت: بە بڕوای من ئەو کارەی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ نیشاندەری پاکی و جوامێرییە. کاتێك هەموو دەزانن کە هێلاسن بۆ هەموو شوێنێك دەڕوا ئیتر مەزاخی ئەسپ چ مانایەکی هەیە؟

بەڵام پرێنسس میاخکۆڤا لە گەڵیدا هاوڕا نەبوو و تەنانەت بە بیستنی بیروڕای پرێنسس تۆرسکایا رقی هەستا و گوتی: بۆ کەسێکی وەك ئێوە کە نازانم چەند میلیۆنتان سامان هەیە ئەو قسەیە ئاسانە. من بە پێچەوانە کاتێك مێردەکەم هاوینان دەچێت بۆ بەرێوەبردنی کارێکی ئیداری و تۆێژەری زۆر خۆشحاڵ دەبم. سەفەر کردن بە فایتوون بۆ لەشساغیی خۆی باشە و خۆشی حەزی لێدەکات. جگە لەوەش قەرارمان داناوە کە ئەو پارەیەی زیادی دەمێنێتەوە، بۆ خەرجی فایتوون و فایتوونەوانی من سەرف بکرێ.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ کاتی سەفەرکردن بۆ پارێزگا دوورەکان نزیکەی سێ رۆژ لە مۆسکۆ مایەوە.

ڕۆژی دووهەمی بەر لە گەیشتنی چووبوو بۆ دیدەنیی قایمەقامی گشتیی مۆسکۆ. لەسەر چوار رێیانی شەقامی گازتنایا[١٦٢] کە هەمیشە پڕ بوو لە فایتوون و هێلینگە. لەناکاو گوێی لە دەنگێك بوو کە بە پێکەنینەوە و بە ناوی خۆی بانگی دەکرد، دەنگەکەش هێندە بەرز بوو نەیتوانی ئاوڕ بداتەوە. چاوی بە ستیپان ئارکادیچ کەوت کە لە سووچی شۆستەکە راوەستابوو و کوڵە باڵتەیەکی باوی رۆژی لەبەردابوو، کڵاوێکی تەسکیش کە باوی رۆژ بوو نابووی بە تیلاگی سەرییەوە و پێکەنینێك کە ددانە سپییەکەی لە نێوان لێوی سووریدا وەدیارخستبوو روخساری روونکردبۆوە. سەرتاپای لەبەر گەنجێتی و بە دەماخی تڕووسکەی دەهات و بە هاوار و پێداگری دەیویست هەرچۆنێکە رایگرێ و نەهێڵێ بڕوات. دەستێکی بە پەنجەرەی فایتوونێك گرتبوو کە لە سووچێك راوەستابوو و سەری خاتوونێك بە کڵاوێکی مەخمەرییەوە لێیهاتبووە دەرێ و روخساری دوو منداڵیش لە پشت شووشەکەوە دیاربوو و دەتریقانەوە و بە دەستەکەی تری ئاماژەی بە ئەو (یانی مێردی خوشکی دەکرد). خاتوونی نێو فایتوونەکەش بە روویێکی

---

162- Gazetnaya

خۆش و مێهرەبانەوە زەردەی دەگرت و دەستی بۆ ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ رادەتەکاند. ئەو خاتوونە دالی بوو لەگەڵ منداڵەکانی.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ حەزی نەدەکرد لە مۆسکۆ تووشی ناسیاوێك بێت، بەتایبەت ژنبراکەی کە چاوی بەراییی نەدەدا بیبینێ. کڵاوەکەی بە نیشانەی سڵاو لەسەری داگرت و دەیویست درێژە بە رێگاکەی بدات بەڵام ستیپان ئارکادیچ داوای لە فایتوونەوانەکەی کرد راوەستێ و بە نێو بەفرەکەدا هەڵات بۆ لای.

ستیپان ئارکادیچ سەری لە پەنجێرەی فایتوونەکەوە بردە ژوورێ و گوتی: چۆن دڵت هات ئاگادارمان نەکەیت؟ لەمێژە هاتووی؟ دوێشەو لە هۆتێل دووسوو[١٦٣] بووم. لەسەر ئەو تەتەڵەی کە ناوی میوانەکانی لەسەر دەنووسن چاوم بە کارنین کەوت بەڵام بڕوام نەدەکرد تۆبی، دەنا دەهاتم بۆلات ـ لاقی لە عەرزی کوتا بۆ ئەوەی بەفری پۆستاڵەکانی بتەکێنێ و درێژەی بە قسەکانیدا: بەڵام نازانی چەندە بە دیتنت خۆشحاڵم ـ هەروەها گوتیشی: بەڵام ئاخر چۆن دڵت هات بە دوو وشە ئاگادارمان نەکەیت؟

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بە ساردوسڕی وەڵامی دایەوە: فریا نەکەوتم. زۆر گرفتارم.

ـ وەرە با بچین بۆ لای خێزانم. ئەویش زۆر حەزدەکا بتبینێ.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ ئەو بەتانییەی کە لە لاقوقولە سارۆکییەکەی پێچرابوو کردییەوە و لە فایتوونەکە دابەزی و بە نێو بەفرەکەدا رۆیشت بۆ لای فایتوونەکەی داریا ئەلکساندرۆڤنا.

دالی بە بزەیەکی خەماوییەوە گوتی: ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ، چبووە؟ بۆ روومان لێ وەردەگێڕی؟

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ گوتی: زۆر سەرقاڵم. خۆشحاڵم بە دیتنتان ـ لەبزیشی بە روونی نیشانی دەدا کە حەز بە دیتنیان ناکات: حاڵتان چۆنە؟ خۆ نەخۆش نین؟

ـ حاڵی ئانای خۆشەویستم چۆنە؟

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لە بن لێوەوە منجاندی و دەیویست بگەڕێتەوە بەڵام ستیپان ئارکادیچ رایگرت و گوتی: دەزانی سبەینێ چی دەکەین؟ دالی، بۆ نانی نیوەڕۆ بانگهێشتنی

163- Dusseaux

بکە. بە کازنیشۆڤ و پێستسۆڤیش[164] دەڵێین بێن تاکوو لەگەڵ رووناکبیرەکانی مۆسکۆ میوانداریی لێبکەین.

دالی گوتی: بەڵێ داواتان لێدەکەم تەشریف بێنن. ئەگەر حەزتان لێیە ئێمە کاتژمێر پێنج یان شەش چاوەڕوانتان دەبین. بەڵام حاڵی ئانای نازەنینی من چۆنە؟ زۆر لەمێژە...

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ نێوچاوانی تێکنا و لە بن لێوەوە منجاندی: حاڵی باشە. دەی بە یارمەتیتان ـ ئەوەی گوت و رۆیشت بۆ لای فایتوونەکەی خۆی.

دالی قاوی لێکرد: تەشریف دێنی؟

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ شتێکی گوت بەڵام دالی لەبەر تەقوکوتی هاتوچۆی فایتوون و هێلینگە حاڵی نەبوو.

ستیپان ئارکادیچ دەنگی بەرزکردەوە: من سبەینێ دێم سەرێکت لێهەڵدێنم.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ سواری فایتوونەکە بوو، جۆرێك خۆی لە سووچەکە توندکرد، کە چاوی بە هیچ کەس نەکەوێ و خۆی لە چاوی ئەموئەو بشارێتەوە.

ستیپان ئارکادیچ رووی لە ژنەکەی کرد و گوتی: مرۆڤێکی سەیرە! چاوێکیشی لە کاتژمێرەکەی کرد و بە نیشانەی لاواندنەوەی ژن و منداڵەکانی دەستی برد بۆبەر دەموچاوی، رایتەکاند و گورجوگۆڵ و بە نەشە بەسەر پێیانە رێیەکەدا رۆیشت و دوورکەوتەوە.

دالی دەنگی هەڵێنا: ستیڤا، ستیڤا! خێراش سوورهەڵگەڕا.

ستیپان ئارکادیچ ئاوڕی دایەوە.

ـ دەبێ باڵتە بۆ گریشا و تانیا بکرم، پارەمان بدەیە.

ـ قەیناکا، بڵێ خۆم دەیاندەمێ ـ لەگەڵ ئاشنایەك کە بە فایتوون لەوێوە تێدەپەڕی بە سەرودەست لەگەڵیدا کەوتە چاکوخۆشی کردن و لە نێو ئاپۆرەی خەڵکدا بزر بوو.

---

164- Pestsov

## حەوت

ڕۆژی دوایی یەکشەممە بوو. ستیپان ئارکادیچ چووبۆ شانۆی بالشوی کە گوورووپی باڵە سەمایان دەکرد تاکوو ئەو ملوانکە مەرجانییە بدات بە ماشاچیبی سۆڤا[١٦٥] کە شەوی پێشوو بەڵێنی پێدابوو، ئەو ماشاچیبی سۆڤایە سەماکارێکی شۆخوشەنگ و تازەکار بوو کە بە واسیتەی ئەوەوە لەو گوورووپەدا وەرگیرابوو. ملوانکەی پێدا و هەلی بۆ ڕەخسا تاکوو لە تاریکایی پشت پەردەکە ڕوومەتە جوانەکەی ماچ بکات کە بە هۆی وەرگرتنی دیارییەکەوە لەبەر خۆشحاڵی ترووسکەی دەهات. جگە لە پێدانی دیارییەکە دەیویست بەڵێنی ژوانی لێ وەرگرێ بۆ کۆتایی بەرنامەکە. بۆی ڕوونکردەوە کە ناتوانێ سەرەتای شانۆکە لەوێ بێت و بەڵێنی پێدا کە بۆ پەردەی کۆتایی دێتەوە و بۆ مەیلکردنی شێو دەیبا لەگەڵ خۆی. ستیپان ئارکادیچ دوای شانۆکە ڕۆیشت بۆ ئۆخۆتنی ریاد[١٦٦] کە بازارێکی تەڕەبار بوو. لەوێ خۆی بۆ فراوێن، ماسی و مارچێوەی کڕی و سەعات دوازدە چوو بۆ هوتێل دووسوو چونکە دەیویست لەگەڵ سێ کەس، کە بەختەوەرانە هەرسێکیان لەو هوتێلە نیشتەجێبوون چاوپێکەوتنی هەبێ. یەکیان لەڤین بوو کە تازە لە هەندەران گەڕابۆوە و لەو هوتێلە ژوورێکی گرتبوو" ئەوی دیکەشیان سەرۆکی نوێی فەرمانگەکەی بوو کە تازە بەو پلەوپایە گرینگەی گەیشتبوو و بۆ سەردان و کاروباری فەرمانگە هاتبوو بۆ مۆسکۆ و سێهەمیش مێردەکەی خوشکی واتە کارنین بوو، ستیپان ئارکادیچ دەیویست بۆ فراوێن ئەو لەگەڵ خۆی بەرێتەوە بۆ ماڵێ.

ستیپان ئارکادیچ زگەڕۆ بوو و زۆری حەز لە میوان و میوانداری بوو بەڵام زیاتر لەوەی بچێت بۆ میوانی چێژی لە میوانداری وەردەگرت. میوانداریی زۆر گەورەش نا، بەڵام لە باری چۆنێتییەوە شیاو، میوانییەکانیشی زۆر ڕێکوپێك و بەرێوجێ بەڕێوەدەچوون و خۆراك و خواردنەوە ئاشی دەگێڕاو بەرنامەی میوانداریی ئەمشەوی زۆر پێخۆش بوو. بۆ شێو مارچێوە و ماسیی خەشەی داوا

165- Macha tchibi ssova

166- Okhotni Ryade

کردبوو کە بە زیندوویی بیهێنن بۆ چێشتخانە، هەروەها بۆ خۆراکی سەرەکیش ڕەزبیڤی زۆر ناسك و سادەی داوا کردبوو لەگەڵ شەڕابی تایبەت. ئەوە خۆراك و شەڕابەکەی. بەڵام میوانەکان: کیتی و لەڤین بوون، بە مەبەستی ئەوەی بوونی ئەو دوانە لەو کۆڕەدا زۆر لە چاونەدات کچەکەی پووری و ئیشچر باتسکیی لاویشی بانگهێشتن کردبوو، بۆ ڕازاوەتر کردنی نان و خوانەکە و کۆڕەکە دوو میوانی پایەبەرزی وەك سرگی کازنیشۆڤ و ئەلکسی ئەلکساندرڤیچی بانگهێشتن کردبوو. سرگی ئیڤانۆڤیچ فەیلەسووف بوو و خەڵکی مۆسکۆ، ئەلکسی ئەلکساندرڤیچیش پیاوی دەوڵەت و هۆگری کار و خزمەتگوزاری بوو و خەڵکی پترزبۆرگ. جگە لەوانیش پیستسۆڤی بەناوبانگی بانگهێشتن کردبوو، کە لیبراڵ و لەگەڵ ئەوەشدا قسە خۆش و مامۆستای مۆسیقا و مێژووزان بوو، زۆریش لە بیری ئەوەدا نەبوو لە خەڵکی نزیك بێتەوە و ببێتە هاوڕەنگیان. ئەو لاوێکی پەنجا ساڵان و زۆر زمانپاراو و قسەقوت بوو و وەك گوڵی مەجلیس چاوی لێدەکرا و ڕازێنەرەوەی کۆڕەکە بوو بۆ ئەوەی کەیفی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ و کازنیشۆڤ ساز بکات و گوڕوتینیان وەبەربنێت بۆ ئەوەی دەست بکەن بە ئاخافتن.

قستی دووهەمی پارەی لێڕەوارەکەی بەدەست گەیشتبوو و هێشتا خەرجی نەکردبوو. دالی لەم دواییانەدا زۆر شیرین و مێهرەبان بووبوو و فیکری ئەو میوانییەش لە هەموو بارێکەوە بۆ ستیپان ئارکادیچ دڵپەسەند بوو و شاییی لە دڵیدا دەگێڕا. بەڵام دوو شت هەبوو کە تا ڕادەیەك شادییەکەی دەشێواند، بەڵام ئەو دوو شتە کە پەڵەیەك بوون لە دەریای شادی و نەشەدا، گیانی ئەویان خستبووە سەر باڵی شەپۆلان و ئەوق بووبوون. ڕۆژی ڕابردوو کە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچی لە شەقام دیتبوو بۆی دەرکەوتبوو کە زۆر ساردوسڕ بووە لەگەڵیدا. بە هەڵسوکەوت و قسەکردنەکەشیدا بۆی دەرکەوتبوو کە مێردەکەی خوشکی خەمێکی لە دڵدایە و لەوەی کە نەیویستووە بێتەماڵیان و لە هاتنی خۆی ئاگاداری نەکردوون و هەروەها ئەوەی سەبارەت بە پێوەندیی نێوان ئانا و ڤرۆنسکی بیستبووی، وای بۆچوو کە پێوەندیی نێوان خوشکی و زاواکەیان نابێ گەرموگوڕ بێ.

ئەوە یەکێك لەو دوو پەڵەیە بوو کە کەوتبوونە سەر دڵی ستیپان ئارکادیچ. پەڵەی دووهەمیش کە سەرخۆشییەکەی لێتێك دەدا سەرۆکە تازەکەی بوو کە وەك هەموو سەرۆکە تازەکان هەر لە سەرەتای کارەوە ناوبانگی ناباری و سەختگیرییەکانی بڵاو بووبۆوە. دەیانگوت سەعات شەشی بەیانی هەڵدەستێ و زۆر پڕکارە و چاوەڕوانیی لە ژێردەستەکانیشییەتی کە وەك ئەو بن. جگە لەوەش دەیانگوت زۆر تووڕە و تۆسنە و ڕووی لە هیچ کەس نایەشێ و

بووبووە دەنگۆ کە لە باری سیاسییەوە بیروڕای ڕاست بە پێچەوانەی سەرۆکەکەی پێشووە، یانی دژی ئەو ڕێبازەیە کە ستیپان ئارکادیچ هەتا ئەمڕۆ خۆی بە ڕێبواری دەزانی. دوێنێ ستیپان ئارکادیچ بە یۆنیفۆرمەوە هاتبوو بۆ ئیدارە و سەرۆکی تازە زۆر بە رووخۆشییەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ کردبوو و ماوەیەك وەك هاوڕێ لەگەڵی دووا بوو، هەر بەو هۆیەوە ستیپان ئارکادیچ بڕیاریدا کە ئەمڕۆ بە فراکەوە بچێت بۆ دیتنی. لەگەڵ ئەوەشدا خەمی بوو نەکا سەرۆك بە پێچەوانەی چاوەڕوانییەکەی پێشوازیی لێبکات. ئەوەش ترسی دووهەمی بوو. بەڵام ستیپان ئارکادیچ بە پێی خۆماك هەستی دەکرد کە کارەکان هەموو جێبەجێدەبن. کە دەیویست بچێتە نێو هوتێلەکەوە لە دڵی خۆیدا گوتی «خەڵك هەموو مرۆڤن و مرۆڤەکانیش هەموو تاوانبارن. کەوایە تووڕەیی و شەڕوشۆر بۆچییە؟»

کڵاوەکەی بە لاتیلاگی سەرییەوە نابوو بە ڕێڕەوی هوتێلەکەدا دەڕۆیشت بەو پێشخزمەتەی گوت کە دەیناسی: ڤاسیلی، چۆنی؟ ئەو ریشە چییە هێشتووتەتەوە؟ لەڤین لە ژووری ژمارە حەوتە، نا؟ تکایە ڕێنوێنیم بکە. لەگەڵ ئەوەشدا بپرسە بزانە کۆنت ئانیچکێن (سەرۆکی نوێ) ئیجازەی لەسەرە کەسێك بچێت بۆ لای؟

ڤاسیلی بە پێکەنینەوە گوتی: بەچاوان. لەمێژە تەشریفتان نەهێناوە بۆ ئێرە.

ـ دوێنێ هاتم. بەڵام لە دەرگاکەی دیکەوە هاتمە ژوورێ. ژووری ژمارە حەوت ئەمەیە؟

کاتێك ستیپان ئارکادیچ چووە ژوورێ لەگەڵ مووژیکێکی خەڵکی تڤێر[167] لە نێوەڕاستی ژوورەکە ڕاوەستا بوون و ئارشینێك بە دەستەوە پێستی ورچێکی تازە ڕاوکراوی ئەندازە دەگرت.

ستیپان ئارکادیچ دەنگی بەرزکردەوە: ئاە. ڕاوتان کرد؟ لەو پێستە چاکە! ورچێکی سەیر بووە! سڵاو ئارخیپ.

دەستی مووژیکەکەی گوشی و هەروا بە باڵتە و کڵاوەوە لەسەر لێواری کورسییەك دانیشت.

لەڤین کڵاوەکەی لێ وەرگرت و گوتی: باڵتەکەت داکەنە و جوان دانیشە.

---

167- Tver

ستیپان ئارکادیچ شاقەلی باڵتەکەی لێك بڵاوکرد و گوتی: نا، دەبێ بڕۆم. هاتووم تەنیا ساتێك چاوم پێتبکەوێ ـ بەڵام پاشان باڵتەکەی داکەند و تەخت دانیشت و سەعاتێك لەگەڵ لەڤین سەبارەت بە راو و قسەوباسی خۆیان دووان.

کاتێك کابرای مووژیك رۆیشت ستیپان ئارکادیچ گوتی: دەی، بڵێ بزانم چووی بۆ دەرەوەی وڵات چیت کرد؟ چووی بۆ کوێ؟

ـ هیچ، چووم بۆ ئاڵمان و پرۆس و فەرەنسا و ئینگلتەڕا. بەڵام نەك پێتەختەکانیان، تەنیا چووم بۆ شارۆچکە پیشەسازییەکانیان. زۆرم شتی نوێ دی. زۆر خۆشحاڵم کە چووم و چاوم بەو شتە سەرنجڕاکێشانە کەوت.

ـ بەڵێ، دەزانم. دەتەوێ سەروسامان بە ژیانی کرێکاران بدەی.

ـ قەت بیر لە شتی وا ناکەمەوە. لە رووسیا مەسەلەی کرێکار هەر بوونیشی نییە. مەسەلەی گرینگ لە رووسیا پێوەندیی نێوان کرێکار و زەوییە. ئەو کێشەیە لە ئەورووپاش هەر هەیە. بەڵام مەسەلەی ئەوێ چاکسازی بۆ ئەو هەلانەیە وا کردوویانە. شکاوەکان گاو دەکەنەوە. کەچی لێرە...

ستیپان ئارکادیچ بە وردی گوێی بۆ قسەکانی راگرتبوو.

ئاخری گوتی: بەڵێ، بەڵێ، رەنگە هەق بە تۆ بێ. زۆر خۆشحاڵم کە دەتبینم بە دەماخ و کەیفخۆشی. ورچ راو دەکەی، کار دەکەی و سەرتاپات شۆر و تامەزرۆییە.

ئیشچر باتسکی دەیگوت چاوی پێتکەوتووە خەمبار و هیوابڕاوانە هەر باسی مەرگت کردووە.

لەڤین گوتی: راست دەکا، ئێستاش هەروام، بەردەوام بیر لە مەرگ دەکەمەوە. راستییەکەی ئەوەیە ئەجەل تەپی داوەتە سەرم. ئەو قسانە هەمووی وڕێنەیە... راستت دەوێ، من لە رادەبەدەر فیکر و کارەکەمم خۆش دەوێ. بەڵام راستییەکەی ئەوەیە کە... بیری لێبکەوە، تەواوی دنیای ئێمە تۆپەڵێك خەنەتیلکەیە کە لەسەر ئەم گۆی زەوییە رسکاوە. ئێمەش پێمانوایە دەتوانین شتێکی گەورە بەرهەم بێنین. بیرۆکەی گەورە و کاری مەزن... هەموو ئەوانە جگە لە چەند وردە خیزی بێنرخ هیچی تر نییە.

ـ بەڵام هاوڕێ، ئەو قسانە شتێکی تازە نین. هەتا دنیا بووە ئەو قسانەش هەر هەبوون.

ـ بەڵێ، شتێکی تازە نییە، بەڵام ئەوە بزانە، هەرکاتێك بە روونی لەو قسانە تێگەیشتی شتەکان بایەخیان نامێنێ. کاتێك دەزانی ئەمڕۆ یان سبەی دەمری و هەموو شتێك لە نێو دەچێ ئەو کاتە هەموو شتێك لەبەر چاوت بایەخی خۆی لە دەست دەدات. منیش پێموایە

فیکرەکانم زۆر گرینگن. بەڵام راستییەکەی ئەوەیە تەنانەت ئەگەر بتوانم وەگەڕیشیان بخەم، گرنگایەتییەکەی زایتر لە هەڵبڕین و راوکردنی ئەو ورچە نییە. بەم شێوەیە ژیانی خۆمان رادەبوێرین و خۆمان بە راو و کارەوە سەرقاڵ دەکەین بۆ ئەوەی مەرگ لە بیر خۆمان بەرینەوە.

ستیپان ئارکادیچ بە وردی و بزەیەکی نەرمەوە گوێی بۆ قسەکانی لەڤین شل کردبوو.

ـ دەی، دەڵێی چی؟ ئێستا لێمتێگەیشتی؟ لە بیرتە چۆن هەڵتدەکوتا سەرم و دەتگوت بۆ لە ژیاندا هەر بە دوای چێژ و خۆشیدا دەگەڕێم؟

ـ ئەوەندەشی سەخت مەگرە، ئەی ئاکاری!....

ـ نا، خۆشیی ژیان ئەوەیە کە... ـ لەڤین سەرەداوی قسەکانی لێ ون بوو و ئاخری گوتی: نازانم بڵێم چی. تەنیا دەزانم کە بەم زووانە دەمرم.

ـ بەڵام بۆ بەم زووانە؟

ـ دەزانی چی؟ کاتێك بیر لە مردن دەکەیتەوە بۆت دەردەکەوێ کە ژیان شتێکی ئەوەندە خوش و بەنرخ نییە... بەڵام ئارامتر دەبیتەوە.

ـ بە پێچەوانە، کۆتاییەکەی خۆشترە ـ ستیپان ئارکادیچ بۆ دەیەمین جار هەستا و گوتی: ئیتر دەبێ بڕۆم.

لەڤین نەیهێشت بڕوات و گوتی: نا، بۆکوێ دەچی. دانیشە. کەنگێ بتبینمەوە؟ سبەینێ لێرە دەڕۆم.

ـ هەه ، هەر لە بیرم نەبوو. من بۆیە هاتبووم کە... پێتبڵێم ئەمڕۆ بۆ فراوێن بێی بۆماڵی ئێمە. براکەشت لەوێ دەبێ، کارنینی زاواشمان هەر دێ.

لەڤین گوتی: سەیرە! ئەو لێرەیە؟ ـ دەیویست سەبارەت بە کیتی پرسیاری لێبکات. بیستبووی کە سەرەتای زستان چووە بۆ ماڵی خوشکی لە پترزبۆرگ کە ژنی دیپلۆماتێکە. نەشیدەزانی گەڕاوەتەوە بۆ مۆسکۆ یان نا. بەڵام لەو پرسیارە پاشگەز بۆوە و لە دڵی خۆیدا گوتی: «لێرە بێ یان لێرە نەبێ بۆ من هیچ جیاوازییەکی نییە.

ـ دەی، کەوایە دێی؟

ـ باشە، دێم.

ـ چاکە، ئەگەر وایە سەعات پێنج بە فراکەوە.

ستیپان ئارکادیچ هەستا و چووە خوارێ بۆ ئەوەی چاوی بە سەرۆکی نوێ بکەوێ. ئەوەی بە خۆماك هەستی پێکردبوو راست وابوو. سەرۆکی نوێ بە پێچەوانەی ئەو دەنگۆیانەی بڵاو

بووبوونەوە و دەیانگوت پیاوێکی زمان تاڵ و سەختگیرە، کەچی مرۆڤێکی خۆش مەشرەف و مێهرەبان دەرچوو و ستیپان ئارکادیچ ناشتای لەگەڵ خوارد و لەلای مایەوە و پاشان کاتژمێر سێ بوو کە رۆیشت بۆ لای ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ.

## هەشت

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ کە لە کلیسا گەڕایەوە نەچوو بۆ هوتێل. ئەو رۆژە بەیانی دوو ئیشی بە دەستەوە بوو: یەکەم ئەو گورووپە لە نوێنەرانی هۆزەکەمینەکان کە دەچوون بۆ پترزبۆرگ و لەو کاتەدا لە مۆسکۆ بوون، دەبوو لەگەڵیان کۆ ببێتەوە و دوای رێنوێنیکردن بەڕێیان بکات، دووهەم ئەوەبوو کە نامەیەك کە بەڵێنی بە پارێزەر دابوو بینووسێ. چوونی ئەو گرووپەی نوێنەران بۆ پترزبۆرگ، ئەگەرچی لەسەر خواستی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ خۆی نێردرابوون، وێدەچوو کێشەیەك دروست بێ و تەنانەت هێندێ مەترسیشی بە دواوە بێت و ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ زۆر دڵخۆش بوو کە لە مۆسکۆ تووشیان بووە. ئەندامانی ئەو گورووپە هیچ کام لە ئەرك و رۆڵی خۆیان ئاگادارنەبوون. لە رووی ساویلکەییەوە پێیاندابوو کارەکەیان هەر ئەوەیە کە پێویستییەکانیان روون بکەنەوە و دۆخ و کێشەکانی ناوچەی خۆیان بە شێوەیەکی راستەقینە باس بکەن و داوای یارمەتی لە دەوڵەت بکەن، بە هیچ شێوەیەکیش نەیاندەزانی کە هێندێك لە پێشنیار و داواکارییەکانیان دەبێتە هۆی ئەوەی بەرهەڵستکارەکانیان سەر هەڵدەنەوە و بە زیانی خۆیان تەواوبێ.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ ماوەیەکی زۆر لەگەڵیان دانیشت و رێوشوێنی بۆ دانان. هەروەها وەبیریشی هێنانەوە کە لەوە زیاتر پێی لێهەڵنەبڕن و کاتێکیش بەڕێی کردن چەند نامەی بۆ پترزبۆرگ نووسی و ناردی بۆ ئەو کەسانەی کە ئەو گورووپە رێنوێنی دەکەن. گرینگترین یارمەتیدەریشی لەو کارەدا کۆنتس لیدیا ئیڤانۆڤنا بوو. ئەو لە کاری رێنوێنیکردنی گرووپی نوێنەراندا زۆر شارەزا بوو و هیچ کەس نەیدەتوانی وەك ئەو لەسەر مەبەستێك هەرا و ئاژاوە ساز بکات و گەورەی نیشان بدات و گورووپی نوێنەران بەرەو رێگایەکی راست و باش رێنوێنی بکات. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ کاتێك لەو کارە بۆوە و نامەیەکی بۆ پارێزەر نووسی و بێ

ئەوەی چکۆڵەترین دڕدۆنگی و گومانی هەبێ، کردییە موختار کە هەرچۆنێکی پێباشە ئاوا قۆڵی لێهەڵماڵێ. سێ یادداشتی ڤرۆنسکیش کە بۆ ئانای نووسیبوو لەگەڵ نامەکەی خست.

لەو کاتەوە کە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بۆ دووربوون لە هاوسەرەکەی لە ماڵێ هاتبووە دەرێ، لەو کاتەوە کە چووبوو بۆ لای پارێزەر و داخوازیی خۆی لەگەڵ هێنابووە گۆڕێ و بەتایبەت لەو کاتەوە کە بۆ ئەو کێشەیەی ژیانی دەوسیەیەکی پێکهێنابوو و کردبوویە مەسەلەیەکی یاسایی، زیاتر لە ویست و قەستی خۆی گەیشتبوو و ئێستا بە روونی دەیدی کە دەتوانێ پێوشوێنی بگرێ.

خەریکی چەسپاندنی زارکی پاکەت نامەکە بوو کە دەنگی بەرزی ستیپان ئارکادیچی بیت. ستیپان ئارکادیچ لەگەڵ پێشخزمەتەکەی کارنین قسەی دەکرد و ئیسرەمی بوو کە هاتنی ئەو بە ئەربابەکەی راگەیێنێ.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لە دڵی خۆیدا گوتی «چ بکەم. با بێتە ژوورێ. چاکتر. هەر ئێستا وەزعی خۆم روون دەکەمەوە و باسی کێشەی خۆم و خوشکی بۆ دەکەم و بۆی روون دەکەمەوە کە بۆچی ناتوانم بچم بۆ ماڵەکەی و خۆم نەجات دەدەم.»

کاغەزەکانی کۆکردەوە و خستییە نێو فایلە قایشەکەیەوە و دەنگی بەرزکردەوە: داوای لێبکە تەشریف بێنێتە ژوورێ.

دەنگی ستیپان ئارکادیچ هات بە پێشخزمەتەکەی دەگوت کە نەیدەهێشت بچێتە ژوورێ: دیوتە قسەکانت درۆبوون، ئەوەتا ئەربابەکەت لە ژوورێیە. ـ هەر لە دالانەکە باڵتەکەی داکەند و چووە ژوورێ، بە پێکەنینەوە گوتی: زۆر خۆشحاڵم کە توانیم بتدۆزمەوە. هیوادارم کە....

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ هەستا و بێ ئەوەی داوا لە ستیپان ئارکادیچ بکات کە دانیشێ بە ساردوسڕی گوتی: ناتوانم بێم بۆ ماڵی ئێوە.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ دەیویست هەر لە ئێستاوە ئاکاری ساردوسڕ بگرێتە پێش و دەبوو لەگەڵ برای ژنەکەی کە خەریکبوو تەلاقی دەدا ئیتر گەرموگوڕ نەبێ. بەڵام بیری لە دەریای رۆحی ستیپان ئارکادیچ نەدەکردەوە کە لێوڕێژ بوو لە چاکەخوازی و دڵنەرمی.

ستیپان ئارکادیچ چاوەگەش و روونەکانی زیت کردەوە.

بە سەرسووڕمانەوە و بە زمانی فەڕەنسی گوتی: بۆ ناتوانی؟ مەبەستت چییە؟ نەخێر، بەڵێنت داوە و ئێمەش هەموومان چاوەڕێین.

ـ مەبەستم ئەوەیە خزمایەتی و پێوەندییەکانمان دەبێ کۆتاییی پێبێت و هەر بەو هۆیەوە ناتوانم بێم بۆ ماڵی ئێوە.

ستیپان ئارکادیچ هەروا بە پێکەنینەوە گوتی: چۆن؟ یانیچی؟ بۆ؟

ـ چونکە خەریکم لە خوشکت، یانی ژنەکەم جیا دەبمەوە. دەبێ....

بەڵام ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ فریا نەکەوت قسەکەی تەواوبکات چونکە ئاکاری ستیپان ئارکادیچ جۆرێك بوو کە بە هیچ شێوەیەك چاوەڕوانیی نەدەکرد. ستیپان ئارکادیچ هەناسەیەکی هەڵکێشا و لەسەر کورسییەکە دانیشت.

ئابلوونسکی بە شڵەژاوییەکی زۆرەوە گوتی: ئاخ ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ، ئەوە چ قسەیەکە تۆ دەیکەی!ـ شوێنەواری ژان و ئازارێکی قورس لە روخساریدا خۆی نواند.

ـ بەڕاستمە بۆ باوەڕ ناکەی؟

ـ ببوورە، بەڵام من ناتوانم باوەڕ بەو قسەیە بکەم. نا، باوەڕ ناکەم.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ دانیشت. هەستی کرد قسەکانی ئەو کاریگەرییەی دەیویست نەیبوو بۆیە ناچاربوو روونی بکاتەوە و روونکردنەوەکەشی هەرچییەك بێ ناتوانێ ئاڵوگۆڕ لە پێوەندیی ئەو مرۆڤەدا پێکبێنێ.

گوتی: بەڵێ، من کەوتوومەتە بارودۆخێکی زۆر تاڵ و پڕ ئازارەوە و جگە لە تەڵاق هیچ چارەیەکی دیکەم نییە.

ـ چاولێکە، ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ، من تەنیا شتێکت پێدەڵێم، من چاکت دەناسم، پیاوێکی بێوێنە و راست و دروستی. ئاناش دەناسم، داوای لێبوردن دەکەم کە ناتوانم بیروڕای خۆم سەبارەت بە ئانا بگۆڕم، دەزانم کە ژنێکی باش و بێوێنەیە. هەر بەو هۆیە، داوای لێبوردن دەکەم، ناتوانم باوەڕ بەو شتە بکەم. دەبێ هەڵەیەك رووی دابێ.

ـ بریا هەڵە بووایە...

ستیپان ئارکادیچ پەڕییە نێو قسەکانی و گوتی: ئیجازە بدە، من دەزانم چ حاڵێکت هەیە.... هەڵبەت.... هەرچییەك بێ ئەو کارانە بۆ پەلەو هەلە نابێ. ئەوە بۆ پەلە نابێ!

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بە ساردوسڕی گوتی: من پەلەم نەکردووە. بەڵام ئەوە کارێك نییە پیاو بتوانێ لەگەڵ کەسێك بیهێنێتە گۆڕێ و راوێژی لەسەر بکات. من بڕیاری خۆم داوە.

ستیپان ئارکادیچ هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و گوتی: بەڕاستی ناخۆشە. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ.... من ئەگەر لەجێی تۆ بووایەم کارێکم دەکرد. تکا، پاڕانەوە، ئەو کارە بکە،

وادیارە هێشتا هیچت نەکردووە. بەڵام بەر لەوەی دەستبەکاربی واچاکە چاوت بە ژنەکەی من بکەوێ. قسەی لەگەڵ بکە. ئەو زۆری ئانا خۆش دەوێ، بەقەد خوشکی خۆی. تۆشی زۆر خۆش دەوێ. ژنێکی سەیرە. تۆخودا وەرە لەگەڵ ئەو قسە بکە. ئەو پیاوەتییە بکە. تکات لێدەکەم.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ چوو دەماڵی فیکرەوە و ستیپان ئارکادیچ بە چاوێکی برایانە و هاودەردییەوە رووی تێکرد و بێدەنگییەکەی شکاند. دیسان بە زمانێکی تکاکارانەوە گوتی: دێی؟ لەگەڵێدا قسە دەکەی؟

ـ نازانم، هەر بەو هۆیە بوو هۆیە نەهاتم بۆ ماڵتان. پێموایە دەبێ خزمایەتییەکەمان کۆتاییی پێبێ.

ستیپان ئارکادیچ گوتی: ئاخر بۆچی؟ تێناگەم. جارێ با وایدانێین جگە لە پێوەندیی خزمایەتی، ئەو هەستە پاکەی هاورێیەتی (لێرەدا ستیپان ئارکادیچ دەستی کارنینی گوشی) و رێزی تایبەت کە من هەمیشە بۆ تۆم هەبووە، کە دەزانم تۆش بۆ من هەروای و لەوانەیە زیاتریش. بەڵام ئەگەر ئەو گریمانە رەشەی تۆ وەڕاست گەڕا، من هیچ کات ئیجازە بە خۆم نادەم کە خۆ لە کاری تۆ یان خوشکم هەڵقوتێنم، بەڵام هیچ هۆیەکیش نابینم کە هەست و خۆشەویستیی من دەرهەق بە تۆ سارد بکاتەوە. چونکە تۆ ئەگەر خوشکیشم تەڵاق بدەی لەبەر چاوی من هەر ئەو کارنینە خۆشەویستەی جارانی. بەڵام ئێستا تکات لێدەکەم گەورەیی بنوێنە و وەرە لەگەڵ خێزانم قسە بکە. ژن لە زمانی یەکتر دەگەن. بەڵکوو کارێك بکات.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بە ساردی گوتی: باشە، وێناچێ من و تۆ لەو کێشەیە بە چاوێك بڕوانین. کەوایە لەسەری نەڕۆین باشترە.

ـ باشە بۆ نایەی؟ ئەمڕۆ بۆ نیوەڕۆ وەرە. ژنەکەم چاوەڕێتە. تکات لێدەکەم وەرە. لە هەمووشی گرینگتر سەبارەت بەو کێشەیە حەتمەن قسەی لەگەڵدا بکە. ئەو زۆر ژنێکی تێگەیشتووە. تۆ خودا وەرە. لەبەر پێتدا چۆك دادەم و دەپاڕێمەوە لێت، دڵم مەشکێنە و وەرە.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی: باشە، ئەوەندە پێداگری دەکەی ناچارم بێم. باشە دێم.

بۆ ئەوەی باسەکە بگۆڕێ مەسەلەیەکی هێنا گۆڕێ کە جێی سەرنجی هەردوولایان بوو، ئەویش سەرۆکە تازەکەی ستیپان ئارکادیچ بوو کە هێشتا تەمەنێکی واینەبوو و ئاوا زوو پلەوپایەیەکی بەرزی وەدەست هێنابوو.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بەر لەوانەش کۆنت ئانیچکینی خۆش نەدەویست و هەمیشە جیاوازیی بیروڕایان هەبوو. بەڵام ئێستا نەیدەتوانی هەستی بێزاریی خۆی بشارێتەوە کە بۆ هەموو فەرمانبەرێکی دەوڵەتی روون و ئاشکرایە، ئەویش بێزاریی کەسێکە کە لە ململانێیەکدا شکستی خواردووە و حەریفەکەی سەرکەوتووە و پلەوپایەیەکی بەرزی وەدەست هێناوە.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بە چزەبزەیەکی ژەهراوییەوە پرسیی: دەی، تا ئێستا چاوت پێیکەوتووە؟

ـ بەڵێ دیتوومە، دوێنێ هاتبوو بۆ دایرەکەمان. وادیارە زۆر بەسەر کاری خۆیدا زاڵە و زۆریش لە کاردا بە دەستوبردە.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ گوتی: بەڵێ، بەڵام دەستوبردەکەی بۆ چ رێگایەك بەکەڵکە و کاریگەریی هەیە؟ لەو رێگایەدا بەڕاستی کاری باش دەکات یان ریسی خەڵکی دەکاتەوە بە خوری؟ چارەڕەشیی دەزگا دەوڵەتییەکانی ئێمە سیستەمی کاغەزبارییە و ئەو ئاغایەش نوێنەری پایەبەرزی ئەو سیستەمەیە.

ستیپان ئارکادیچ گوتی: راستییەکەی ئەوەیە من نازانم دەبێ چ رەخنەیەکی لێبگرم. سەرم لە رێبازە سیاسییەکەی دەرناچێ. تەنیا ئەوەندە دەزانم پیاوی چاکە. هەر ئێستا لەلای بووم. پێکەوە ناشتاییمان خوارد، دەزانی چیم فێر کرد؟ فێرم کرد شەڕاب بە پرتەقاڵەوە بخواتەوە. جەرگی مرۆڤ بە تەواوی مشتوماڵ دەدا. پێمسەیر بوو کە هێشتا ئەو شتەی تاقی نەکردۆتەوە. زۆری پێخۆش بوو. هەر بەڕاستی دەتوانم بڵێم مرۆڤێکی بێوێنەیە.

ستیپان ئارکادیچ چاوێکی لە کاتژمێرەکەی کرد و گوتی:

ـ ئەك باوکە، سەعات لە چوار تێپەڕیوە و من دەبێ بچم بۆ لای دالگاڤۆشین. دەی با پێتنەڵێمەوە. تکایە بۆ نیوەڕۆ حەتمەن وەرە. نازانی ئەگەر نەیەی من و ژنەکەم چەندەی پێتێك دەچین و دڵمەند دەبین؟

هەڵسوکەوتی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ کاتی ئاخافتن لەگەڵ ژنبراکەی هیچ وێچوونێکی لەگەڵ کاتی پێشوازییەکەی نەبوو.

بە دڵتەنگی وەڵامی دایەوە: بەڵێنیم داوە، باشە دێم.

ستیپان ئارکادیچ بە پێکەنینەوە وەڵامی دایەوە: زۆر زۆرت سپاس دەکەم و هیوادارم پەشیمان نەبیتەوە. لەگەڵ ئەوەی بە دەم رۆیشتنەوە باڵتەکەی لەبەر دەکرد دەستی لەسەری پێشخزمەتی هوتێلەکە درا، قاقای کێشا و رۆیشتە دەرێ.

دیسان گەڕایەوە بۆ بەردەرگای ژوورەکە و گوتی: کاتژمێر پێنج، تکایە بە فراکەوە وەرە.

## نۆ

کاتژمێر شەش بوو، هێندێك لە میوانەکان هاتبوون و بە دوای ئەواندا خانەخوێ گەیشتێ. ئەو لەگەڵ سرگی ئیڤانۆڤیچ و کازنیشۆڤ و پیستسۆڤ کە لەبەر دەرگای هاتنە ژوورەوە تووشیان بووبوو هاتنە ژوورێ. ئەو دوو کەسە ئابلونسکی گوتەنی لە نموونە بەرچاوەکانی رۆشنبیریی مۆسکۆ دەهاتنە ئەژمار. هەردووکیان لە باری وشیاری و کەسایەتییەوە هەڵبژاردەبوون. ڕێزیان بۆ یەکتر دادەنا بەڵام دەکرێ بڵێین پێکەوە لەسەر هەموو شتێك خاوەنی بیروڕای جیاواز بوون و نەدەکرا قەت چاوەڕوانی ئەوە بی سازگاری لە نێوانیاندا هەبێ. بەڵام ئەو جیاوازییەیان بەو هۆیە نەبوو کە ڕێبازی بیرکردنەوەیان دژی یەك بێ بەڵکوو ڕاست بەو هۆیە بوو کە لە دنیای ئەندێشەدا سەر بە لایەنێك بوون، بە چەشنێك کە دژخوازەکانیان بە چاوێك دەیانڕوانییە هەردووکیان، بەڵام هەر لەو ڕێبازە هاوبەشەدا هەرکام خاوەن بۆچوون و ڕوانگەی تایبەت بە خۆیان بوون و تەنانەت لە شتە هەرە چکۆڵەکانیشدا جیاواز بوون. لەو لایەنەوە کە هیچ شتێك وەك دژایەتیی بیروڕا نابێتە هۆی کێشە و ناکۆکی لە نێوان دوو کەسدا، ئەوان نەك پێکەوە هاوبڕوا نەبوون بەڵکوو ماوەیەکی درێژ بوو عادەتیان گرتبوو کە زۆر لەسەر ڕاو بۆچوونی جیاوازی خۆیان سوور نەبن و تەنیا بە گومڕاییی چەقبەستووی یەکتر پێبکەنن.

ئەوان بە دەم باسکردنی بارودۆخی هەواوە لە ماڵی خانەخوێ نزیك دەبوونەوە کە ستیپان ئارکادیچ گەیشتە لایان. لە میوانەکان پرێنس ئەلکساندر دیمیتریچ، خەزووری ئابلۆنسکی و ئیشچر باتسکیی گەنج و تووروۆڤتسین[168] و کیتی و کارنین هاتبوون و لە تەلاری میوانداری بوون.

ستیپان ئارکادیچ لەڕێوە تێگەیشت کە بەبێ ئەو جەوی تالارەکە ویشکە و دڵی پێ ناکرێتەوە. داریا ئەلکساندرۆڤنا کراسە هەورێشمینە خۆڵەمێشییەکەی خۆی لەبەرکردبوو، بەڵام دیاربوو دڵی خۆش نییە، چونکە لە لایەکەوە دڵگرانی ئەوەبوو کە منداڵەکانی دەبوو لە ژووری خۆیان و بە جیا نان بخۆن و لە لایەکی تریشەوە خەمی ئەوەی بوو کە مێردەکەی هێشتا نەهاتبۆوە و خۆی نەیدەتوانی ئەو جۆرەی پێویستە میوانەکان ڕێك بخات و سەریان گەرم

---

168- Tourovtsin

بکات. هەموویان وەك پرێنسی پیر دەیگوت، وەکوو کچانی قەشە چووبێتن بۆ میوانی بێدەنگ و ماقووڵ دانیشتبوون و دیاربوو سەریان سوورماوە کە بە بۆنەی چییەوە لێرە کۆ بوونەتەوە و بە زۆر جارجار قسەیەکیان دەکرد بۆ ئەوەی باوەڕ بە بوونی خۆیان بکەن. توورۆڤتسین کە پیاوێکی دڵپاك و قسەخۆش بوو، بە روونی دیاربوو کە لەو کۆڕەدا هەست بە غەریبی دەکات و بزەی لێوە ئەستوورەکانی لەگەڵ دیتنی ستیپان ئارکادیچ ئاشکراتر لە زمانی دەیگوت«برالە، تۆ لێرە ئێمەت لەگەڵ ئەو مەزن و ماقووڵانە خستۆتە تەنگژەوە! من دەبوو لە کافەی Ghateau des fleurs بوومایە تاکوو بە دڵی خۆم دوو قومی پێداکەم.» پرێنسی پیر بێدەنگ دانیشتبوو و بە لاچاوێك لە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچی دەڕوانی و ستیپان ئارکادیچ دەیزانی هەر ئێستا نەقڵێکی تیتاڵی و تانووتئامێزی ئامادەکردووە تاکوو لە خزمەت ئەو کەسایەتییە بەناوبانگەدا بیگێڕێتەوە کە دەتگوت نۆبەرە گێلاسە لێرە دایانناوە و ئەوانی دیکەیان هێناوە بۆ سەیری و لەسەر سفرەیەکی رەنگین خەڵکیان بۆ بانگهێشتن کردووە. کیتی چاوی لە دەرگاکە بڕیبوو و خۆی ئامادەدەکرد تاکوو کاتی هاتنە ژوورەوەی کۆنستانتین لەڤین سوورهەڵنەگەڕێ. ئیشچر باتسکیی لاو کە بە کارنینیان نەناساندبوو هەوڵی دەدا وابنوێنێ کە هەر گوێشی لێنییە و پێیناخۆش نەبووە. کارنین بەپێی دابی کۆڕ و میوانییەکانی پترزبۆرگ لە میوانداریيەکدا کە ژنانیش بەشداریی تێدا دەکەن بە فراك و بۆینباخی سپییەوە هاتبوو، ستیپان ئارکادیچیش بە رەنگی روخساریدا بۆی دەرکەوت کە تەنیا لەبەر بەڵێنەکەی هاتووە. بوونیشی لەو کۆڕەدا ناچارییە و تاوانی ساردیی کۆڕەکەش بەر لە هاتنەوەی ستیپان ئارکادیچ کە ئامادەبووانی لە جێی خۆیان ویشك کردبوو لە ئەستۆی ئەوە.

ستیپان ئارکادیچ هاتەژوورێ و داوای لێبوردنی کرد و روونی کردەوە کە فلان پرێنس مەحتەلی کردووە و ئەو پرێنسەش بیانووی هەمیشەی بوو بۆ هەموو وەدرەنگ کەوتنەکانی. بەڵام خولەکێکی نەخایاند کە هەموو میوانەکانی دیسان بە یەکتر ناساند و ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ و سرگی ئیڤانۆڤیچی لەلای یەکەوە دانیشاند و باسی پەرەپێدانی زمانی رووسیی لە لەهێستان بۆ دامەزراندن، پیستسۆڤیش لەڕێوە هاتە نێو باسەکەوە و مشتومڕ ساز بوو. پاشان دەستی لە شانی توورۆڤتسین کوتا و شتێکی پێکەنینی بە گوێیدا چرپاند و ئەوی لەلای پرێنسی پیر و ژنەکەی دانیشاند و دوایی چوو بۆ لای کیتی و پێیگوت کە ئەمڕۆ زۆر جوان بووە و ئیشچر باتسکیی و کارنینی بە یەکتر ناساند و وەلحاسڵ لە چاوتروو‌کانێکدا ماجوومی کۆڕەکەی سەرلەنوێ وا تێکهەڵشێلایەوە کە کۆڕەکە شنەی گەشە و نەشەی تێگەڕا و هەمووان

پێکەوە کەوتنە ئاخافتن و دەمەتەقێ. تەنیا کۆنستانتین لەڤین دیارنەبوو. بەڵام ئەو وەدرەنگ کەوتنەکەی ئەو زۆر بەجێ بوو، چونکە کاتێك ستیپان ئارکادیچ چووە ژووری نانخواردن و دیتی شەڕابی پۆرتۆ و ورچیان لە دووکانی دێپری[169] کڕیوە نەك لە دووکانی لێڤێ[170]، ئەوەش هەڵەیەکی گەورە بوو کە دەبوو خێرا بە دوایدا بچن. بۆیە لەڕێوە فایتوونەوانەکەی نارد بۆ دووکانی لێڤێ و کاتێ گەڕایەوە بۆ ژووری نانخواردن تووشی لەڤین بوو.

لەڤین گوتی: وەدرەنگ نەکەوتووم؟

ستیپان ئارکادیچ دەستی خستە سەرشانی و گوتی: جا تۆ کەنگێ لە کاتی خۆیدا ئامادەبووی؟

لەڤین کە بە دەستەوانەکانی خەریکی تەکاندنی بەفری سەر کڵاوەکەی بوو بێ ئیختیار سوورهەڵگەڕا و پرسیی: زۆرت میوان هەیە؟ کێن؟

ـ کەس نییە، هەموو خۆمانەن. کیتیش لێرەیە. وەرە با لەگەڵ کارنین بە یەکتان بناسێنم.

ستیپان ئارکادیچ چونکە پێشکەوتنخواز بوو و هەروەها خاوەنی بیرێکی ئازادیش بوو دەیزانی کە ئاشنابوون لەگەڵ کارنین بۆ هەموو کەس مایەی فەخر و شانازییە و هەر بەو هۆیەش باشترین هاورێکانی خۆی پێدەناساند. بەڵام کۆنستانتین لەڤین لەوکاتەدا وا شڵەژابوو نەیدەتوانی هیچ چێژێك لەو ئاشنایەتییە وەرگرێ و هەر دەتگوت بەسەر دنیاوە نییە. ئەو لەو شەوە تاڵەوە کە قەتی لە بیرنەدەچۆوە و بۆی بووبووە تاڵترین بیرەوەری، ئەو شەوەی کە ڤرۆنسکی لە کۆڕەکەی ماڵی ئیشچر باتسکی بوو و کیتی دڵڕەقانە وەڵامی «نا»ی پێدابۆوە (ئەگەر دیتنە برووسکە ئاساکەی ئەو رۆژەی لە پەنجێرەی فایتوونەکەوە دیتی و تیژ بە پەنایدا تێپەڕی نەهێنینە ئەژمار) چاوی پێینەکەوتبوو. بەڵام لە دڵی دابوو کە ئەمڕۆ لێرە دەیبینێ، بەڵام هەوڵی دەدا خۆی شلوێ نەکات و بە خۆی دەسەڵماند کە خەبەرێ لەو شتە نییە. بەڵام بە بیستنی ناوی کیتی و بوونی لەو کۆڕەدا خەریکبوو لە خۆشیانا بفڕێ و لەگەڵ ئەوەشدا ترسێکی وا لە دڵی نیشت و کەوتە دڵەکوتە کە هەناسەی سوار بوو و نەیدەتوانی ئەوەی دەیهەوێ بیڵێ، دەریبڕێت.

---

169- Depret
170- Leve

له دڵی خۆیدا گوتی «بڵێی ئێستا بەژن و باڵای چۆن بێ؟ یانی هەروەك پێشوو وایە، یان ئەو جۆرەی کە لە فایتوونەکەدا دیتم؟ ئەگەر ئەوەی داریا ئەلکساندرۆڤنا دەیگوت راست بێ چی دەبێ؟ بەڵام بۆ نابێ راست بێ؟»

زۆر بە دژواری قسەکانی خستەوە سەریەك و گوتی: زۆرم پێخۆشە، تکایە لەگەڵ کارنین بە یەکمان بناسێنە. لە رووی ناچارییەوە هەنگاوی قورسی هەڵێنایەوە و چووە نێو هۆڵی میوانداری و چاوی پێیکەوت.

کیتی نە ئەو جۆرە بوو کە پێشتر دەیناسی، نە ئەو جۆرەش بوو کە لە فایتوونەکەدا دیتبووی. بەڵکوو بە شێوەیەکی تەواو گۆڕا بوو.

کیتی شڵەژاو و شەرمەزار و شەرمن کە ئەوەش ئەوەندەی تر جوان و دڵڕفێنی کردبوو، لەڕێوە چاوی بە لەڤین کەوت کە پێی نایە نێو تەلارەکەوە. چاوەڕوانی بوو. بە دیتنی گەشایەوە و شادی لە گیانی گەڕا، بەڵام بە هۆی ئەو خۆشحاڵییەوە هەستی بە شەرمەزاری کرد. شەرمەزارییەکەشی بە جێیەك گەیشت کە راست لەوکاتەدا کە لەڤین چوو بۆ لای خاتوونی خانەخوێ و دیسان چاوێکی لە کیتی کرد، هەرسێکیان، لەڤین و دالی و تەنانەت کیتی خۆشی کە هەموو شتێکی دەدی، پێیان وابوو خۆی پێڕاگیر نابێ و دەست دەکات بە گریان. کیتی سوورهەڵگەڕا، رەنگی بزرکا و دیسان سوورهەڵگەڕایەوە و هەتا لەڤین گەیشتە لای وەك پەیکەرە لە جێی خۆی وشك بووبوو و تەنیا لێوی بە زەحمەت دەجووڵانە. لەڤین لێی نزیکبۆوە و کڕنۆشێکی کرد و دەستی بردە پێشێ.

کیتیش ناچار توندوتۆڵ دەستی لەڤینی گوشی و گوتی: ماوەیەکی زۆرە نەمدیوی ـ ئەگەر جووڵانی بە ئاستەمی لێوی و فرمێسکی قەتیسماوی چاوانی کە ئاوا گەشتریان دەنواند، نەبوایە پێتوابوو کاتێك ئەو قسانە لە زاری هەڵدەفڕێ زۆر ئارام و لەسەرەخۆیە.

لەڤین کە بزەیەکی شیرین روخساری گەشاندبۆوە گوتی: ئێوە منتان نەدیوە بەڵام من چاوم پێتان کەوت. کاتێك لە وێستگەی شەمەنەفەرەوە دەچوون بۆ یەرگووشڤا لە رێگا ئێوەم دیت.

کیتی بە سەرسووڕمانەوە پرسیی: کەنگێ؟

لەڤین کە هەستی دەکرد لەبەر شەپۆلی ئەو بەختەوەری و شادییەدا تاقەت ناهێنێ کە گیانی داگرتووە گوتی: دەچوون بۆ یەرگووشڤا. ـ لە دڵی خۆشیدا گوتی «چۆن غیرەتم کردووە و توانیومە خەیاڵی شتێکی ناپاك بدەمە پاڵ دڵێکی ئاوا ناسك و بێگەرد؟ بەڵێ، وادیارە ئەوەی داریا ئەلکساندوونا دەیگوت راستە.»

ستیپان ئارکادیچ قۆڵی لەڤینی گرت و بردی بۆ لای کارنین.

ـ ئیجازە بفەرموون با بە یەکتان بناسێنم ـ بەناو ئەوانی بە یەکتر ناساند.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ دەستی لەڤینی گوشی و بە ساردی گوتی: زۆر خۆشحاڵم کە جارێکی تر چاوم پێتکەوتەوە.

ستیپان ئارکادیچ بە سەرسووڕمانەوە پرسیی: چۆن؟ بۆ ئێوە یەکتر دەناسن؟

لەڤین بە پێکەنینەوە گوتی: ئێمە نزیکەی سێ سەعات لە شەمەندەفەردا پێکەوە بووین و وەکوو کۆتاییی بالماسکە، زۆر بە کونچکاوییەوە لە یەکتر هەڵبڕاین. لانیکەم بۆ من وابوو.

ستیپان ئارکادیچ گوتی: سەیرە، ئاووا! ـ ئاماژەی بە ژووری نانخواردن کرد و گوتی: دەی، تکایە فەرموون.

پیاوان چوون بۆ ژووری نانخواردن و لە مێزی بەرکوڵ کە بە شەش جۆر ڤۆدکا و بەو رادەیەش پەنیری جۆراوجۆر لەگەڵ کاردی پەنیری زێوین و چەند جۆر خاڤیار و شاماسی و کۆنسێروی جۆراوجۆر و دەوریی پڕ لە لەتکە نانی فەڕەنسی رازابۆوە، نزیکبوونەوە.

پیاوان لە دەوری ڤۆدکای بۆنخۆش و مەزەی چندرا و لە دەوریان راوەستان و دەمەتەقێی سرگی ئیڤانۆڤیچ و کارنین و پیستسۆڤ سەبارەت بە پەرەپێدانی زمان و فەرهەنگی رووسی لە لەهێستان راوەستا و چاوەڕوانی فراوێن بوون.

سرگی ئیڤانۆڤیچ کە وێنەی نەبوو بۆ کۆتاییهێنان بە جیددیترین و زەینیترین باسەکان و بە نەقلێکی خۆش لەڕێوە حاڵوهەوای کۆڕ و بەردەنگەکانی خۆی دەگۆڕی، لێرەش بێکار رانەوەستا.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ هەوڵی دەدا تاکوو بیسەلمێنێ کە بە رووسی کردنی لەهێستان تەنیا لە رێی بنەما و رێسایەکەوە دەگونجێ کە دەبێ لە لایەن دەوڵەتی رووسیاوە لە لەهێستان دامەزرێ.

پیستسۆڤ لەسەر ئەوە پێداگر بوو کە نەتەوەیەك تەنیا ئەو کاتە دەتوانێ نەتەوەیەکی تر لە نێو خۆیدا بتوێنێتەوە کە وڵاتی ئەو نەتەوەیە پڕ بکات لە خەڵکی خۆی و لەوێ ریشە داکوتن.

کازنیشۆڤ بیروڕای هەردووکیانی، هەڵبەت بە هێندێ شەرت و مەرجەوە قەبووڵ بوو. کە لە تالاری میوانداری هاتنە دەرێ بە مەبەستی بڕینەوەی باسەکە بە پێکەنینەوە گوتی:

من پێموایە بۆ بە رووسیکردنی نەتەوە کەمینەکان تەنیا رێگایەك هەیە ئەویش زۆربوونی زاوزێ و منداڵ خستنەوەیە. هاوکاریی من و براکەم لەو رێگایەدا زۆر خراپە. بەڵام ئێوە ئاغایانی خاوەن ژنومناڵ لەو بوارەدا دەتوانن شوێندانەر بن. بەتایبەت زەحمەتەکانی ئێوە ستیپان ئارکادیچ لە رێگای وڵاتدا زۆر جێگای رێزە ـ دیسان لە رووی ستیپان ئارکادیچی

خانەخوێ کردەوە و بە پێکەنینەوە پەرداخە چکۆڵەکەی بردە پێشێ کە بۆی پڕ بکاتەوە و پرسیی: ئێوە چەند منداڵتان هەیە؟

هەموو پێکەنین و لە هەمووشیان شادتر ستیپان ئارکادیچ، لەگەڵ جاوینی پەنیری تەڕ پەرداخەکەی سرگی ئیڤانۆڤیچی پڕکردەوە لە ڤۆدکای بۆنخۆش و گوتی: بەڵێ، ئەوە باشترین ڕێگایە.

دەمەتەقێکە هەر بەڕاستی بەو گاڵتەیە کۆتاییی پێهات.

خانەخوێ گوتی: ئەو پەنیرە ناخۆش نییە، حەزدەکەی کەمێك مەیل بکەی؟

پاشان رووی لە لەڤین کرد و بە دەستی چەپ ماسوولکەی باسکی گرت و گوتی: تۆ دیسان وەرزش دەکەی؟

لەڤین پێکەنی و ماسوولکەی باسکی توندکرد و گۆی بازۆڵەی پۆڵایینی وەك تۆپی جیڕ لە ژێر پەنجەی ئابلۆنسکی و ژێر کراسەکەیەوە هەڵماسیبوو.

ـ لەو بازۆڵەیە! راست دەڵێی بازۆڵەی سامسۆنە.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ کە زۆر لە راودا شارەزا نەبوو، تۆزێکی پەنیر بە پەنچکە نانێکی ناسکدا ساوی و گوتی: دەی، کەسێك کە ورچ راو دەکا دەبێ هەر ئاوا بەهێز و پاڵەوان بێ.

لەڤین زەردەیەکی گرت و لە پێش ژنەکان و خاتوونی خانەخوێ کە دەیانویست بچن بۆ پشت مێزی بەرکوڵ، کڕنۆشێکی نەرمی کرد و چووە ئەولاوە و گوتی: وانییە، بەپێچەوانە منداڵێکیش دەتوانێ ورچ راو بکات.

کیتی کە بێهودە هەوڵی دەدا کارگێکی خڕ و لووس بە نووکی چنگاڵەکەی هەڵگرێ و بۆی هەڵنەدەگیرا، تۆڕی سەر قۆڵی کە سپیایی ناسك و پڕ ترووسکەی دەستی لە نێویدا دەدرەوشایەوە و لەگەڵ جووڵانەوەیدا لەرزینی پێوە دیاربوو گوتی: بیستوومە ئێوە ورچتان راو کردووە ـ سەرە جوانەکەی تۆزێ بۆ لای لەڤین سووڕاند و بە بزەیەکی شیرینەوە درێژەی پێدا: یانی هەر بەڕاستی ناوچەی ئێوە ورچی لێیە؟

ڕواڵەتەن پرسیارەکەی کیتی هیچ شتێکی نائاساییی پێوە دیارنەبوو بەڵام بۆ لەڤین لەبز و راوێژی دەنگ و جووڵانی لێو و دەست و چاوانی کیتی هەرکام مانایەکی پڕ لە هەست و رازی تێدابوو کە بە وشە دەرنابردرێن. ئەوانە لێبوڕێژ بوون لە داوای لێبوردن و متمانەپێکردن و لاواندنەوە. لاواندنەوەیەکی پڕ لە خۆشەویستی و شەرم و حەیا، هەروەها مزگێنی و هیوا و ئەوین بوون کە لەڤین نەیدەتوانی باوەڕ بکات و لە خۆشیانا دڵی بەپڕتاو لێیدەدا و لەوانە بوو هەناسەی راوەستێ.

لەڤین بە پێکەنینەوە گوتی: نا، بۆ راو چووبووین بۆ پارێزگای تڤێر و لەوێ دەگەڕاینەوە کە لە نێو شەمەندەفەردا لەگەڵ بۆفرێر[171]ی ئێوە یان مێردی خوشکی، مێردی خوشکتان یەك کەوتین. یەککەوتنێکی سەیر بوو. بە زمانێکی گاڵتەئامێزەوە گێڕایەوە کە چۆن شەکەت و ماندوو و خەواڵوو بە کەڵپۆسێکەوە لە ناکاو خۆی کردووە بە کووپەکەی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچدا.

ـ فەرمانبەری شەمەندەفەر، بە پێچەوانەی پەندە بەناوبانگەکە[172] دەیویست دەرمبکات چونکە کەڵپۆسم لەبەردا بوو. من دەستمکرد بە خۆڕانان و تاریف لەخۆکردن ـ پاشان لەڤین رووی کردە کارنین کە ناوی خۆی و باوکی لەبیرچووبۆوە و بێ ئەوەی بتوانێ بە شێوەیەکی ماقووڵانە و بە ئەدەبانە بدوێ پێیگوت: تۆش سەرەتا بە هۆی کەڵپۆسەکەمەوە لەگەڵ ئەو فەرمانبەرە هاودەنگ بووی، کەچی دوایی لایەنگریت لێکردم و نەتهێشت دامبەزێنێ، بۆیە جێی خۆیەتی سپاستان لێبکەم.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ کە نووکی قامکەکانی خۆی بە دەسرەیەك دەسڕی گوتی: بەڵێ ئاخر وەبیرم هاتەوە مافی مسافیر بۆ هەڵبژاردنی جێگا لە یاسادا هیچ ئاماژەیەکی پێنەکراوە.

لەڤین بە پێکەنینەوە گوتی: من دەمزانی تۆ تووشی دوودڵی بوویت و نازانی لایەنگری لە کاملامان بکەی. منیش هەوڵم دەدا بە قسەی قەڵەمی و زانایانە دزێویی کەڵپۆسەکەم بشارمەوە.

سرگی ئیڤانۆڤیچ کازنیشۆڤ کە لەگەڵ خاتوونی خانەخوێ دەدوا بەڵام دڵی لەلای قسەی براکەی بوو بە لاچاوێك سەرنجی دەدا و لە دڵی خۆیدا دەیگوت: «ئەمڕۆ سەیر وەنەشە کەوتووە، دەڵێی شێری بە گوێ گرتووە.» ئەو نەیدەزانی لەڤین هێندە شادە لە خۆشیانا خەریکە بفڕێ. لەڤین دەیزانی کیتی گوێی بۆ قسەکانی شل کردووە و ئەوەی دەیبیستێ پێی خۆشە. جگە لەوەش بیری لە هیچ شتێکی تر نەدەکردەوە. نەك هەر لەم ژوورەدا بەڵکوو لە تەواوی دنیادا بۆ ئەو جگە لە دوو کەس هیچ کەسی تر بوونیان نەبوو: یەکیان خۆی، کە پێیوابوو بۆتە کەسێك کە بە پلەوپایەیەکی بەرز گەیشتووە و ئەوی تریش کیتی بوو. هەستی دەکرد گەیشتۆتە سەر لووتەکەیەکی ئەوەندە بەرز، کە سەر لە بەرزاییەکەی سوور دەمێنێ و

---

١٧١- وشەیەکی فەرەنسییە بە مانای مێردی خوشك و ژنبرا و هێوەر، شووبرا...

١٧٢- پەندێکی ڕووسییە: کاتێك دێیتە ژوورێ، جلەکانت دەتناسێنن، کاتێك دەڕۆی قسەکانت.

لە مەودایەکی زۆر دوورەوە هەموو ئەو مرۆڤە باش و چاکەخوازانە و هەموو ئەم کارنین و ئابلۆنسکییانە و تەواوی دنیا لە ژێر پێی خۆیدا دەبینیٚ.

ستیپان ئارکادیچ بیٚ ئەوەی سەرنجی کەس راکێشیٚ و تەنانەت گومان لەلای کەسێك دروست بکات، وەك ئەوەی بلێی بە هەلکەوت بووە، چونکە جێگای دیکە نەمابوو کیتی و لەڤینی لە پالٚ یەکدا دانیشاند.

بە لەڤینی گوت: دەی تۆش وەرە لێرە دانیشە.

خواردەمەنییەکان هێندە جوان و بەتام بوون قاپ و کەوچکەکانیش هێندە رازاوە و زەریف بوون کە ئەوەندەی تر ئیشتیایان دەبزواند و ستیپان ئارکادیچ لە هەردوو بارەوە خاوەن سەلیقە و بە مشوور بوو. سووپی ماریلوویز[173] زۆر خۆش و بەتام بوو، پیراشکییەکان چکۆلە بوون و هێندەش ناسك بوون بە لێو دەخوران. دوو پێشخزمەت و ماتڤیٚ کە بۆینباخی سپییان لە ملدا بوو گورجوگۆلٚ و بێدەنگ خزمەتیان دەکرد و شەڕاب و خواردەمەنییان دەهێنا. خۆراکەکە چەندە بەتام و ئیشتیابزوێن بوو، گەرموگوڕی و هاودلێیی سەر مێزەکانیش هەروا. ئاخافتنی دووکەسی و تیکڕایی بۆساتێك تووشی بێدەنگی نەبوو و لە کۆتاییی خواردندا قسە و باسەکەیان وا گەرم داهاتبوو پیاوان تەنانەت ئەو کاتەی لەسەر مێزەکەش هەستان هەروا درێژەیان بە قسەکانیاندا و تەنانەت ئەلکسی ئەلکساندرڤیچیش زۆر بە گوڕ و تینەوە دەدوا.

## دە

پیستسۆڤ هەمیشە حەزی دەکرد تا کۆتایی درێژە بە باسەکان بدات و قسەکانی سرگی ئیڤانۆڤیچی بەدلٚ نەبوو، بەتایبەت بەو هۆیەی کە هەستی بە نادروستیی قسەکانی خۆی دەکرد.

کاتی نانخواردن رووی لە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ کرد و گوتی: من هیچ کات نەمگوتووە کە تەنیا بە هۆی زۆربوونی خەلکەوە دەتوانی بەسەر ولاتێکی تردا زالٚ بی، بەلکوو لەسەر ئەو باوەڕەم کە زۆربوونی خەلك دەبیٚ لەگەلٚ، وزە بنەڕەتییەکان ئاوێتە بکریٚ، نەك لەگەلٚ بنەمای ئەخلاقی.

---

173- Marie Louise

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بە شێنەیی و بە لەبزێکی نەرم و دەنگێکی لەرزۆك وەڵامی دایەوە: من پێموایە ئەوانە پێکەوە جیاوازییان نییە. بە بڕوای من نەتەوەیەك دەتوانێ بەسەر نەتەوەیەکی تردا زاڵ بێ کە لە ڕێگای ژیاردا پێشکەوتووتر بێ، نەتەوەیەك کە...

پیستسۆڤ کە لە قسەکردندا هەمیشە با تاڵووکە بوو و وەك ئەوەوابوو کە بە ڕۆح و گیان ئەوەی دەیڵێ ئیمانی پێیەتی قسەکەی پێبڕی و بە دەنگێکی گڕ گوتی: مەسەلەکە ئالێرە دایە: پێشکەوتن لە ڕێگای ژیاردا چییە؟ ئینگلیزی لەو ڕێگایەدا پێشکەوتووترن یان ئاڵمانی و فەڕەنسییەکان؟ کامیەك لەوانە دەتوانێ ئەوی تریان لە خۆیدا بتوێنێتەوە؟ ئێمە دیتمان کە فەڕەنسییەکان ڕەخنەیان کردە وڵاتی راینەوە و ڕەنگی فەڕەنسییاندا بە فەرهەنگەکەی ئەوان. بەڵام ئاڵمانییەکان لە فەڕەنسییەکان دواکەوتووتر نین.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ هێندێك برۆی وێکهێنا و گوتی: بە بڕوای من لایەنێك دەتوانێ ڕەخنە بکاتە نێو ئەوی دیکەوە کە سیستەمی فێرکارییەکەی باشتر و پێشکەوتووتر بێ.

پیستسۆڤ گوتی: بەڵام فێرکاریی باش و پێشکەوتوو چۆن دەتوانین دەستنیشان بکەین.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ گوتی: من پێموایە ئەوە روون و ئاشکرایە.

سرگی ئیڤانۆڤیچ بە بزەیەکی نەرمەوە هاتە نێو باسەکەوە: یانی بەڕاستی روون و ئاشکرایە؟ ئەمڕۆ هەموو لەسەر ئەو باوەڕەن کە فێرکاریی کلاسیك (یانی فێرکارییەك کە لەسەر بنەمای زمان و فەرهەنگی لاتینی و یۆنانی کەونارایە) باشترین شێوەی فێرکارییە. بەڵام ئێمە شایەدی مشتومڕ و شەڕە دەندووکەی توندی نێوان لایەنگرانی هەردوو شێوە فێرکارییەکەین و ناتوانین حاشای لێبکەین کە تاقمی بەرهەڵستکاریش بەڵگەی قایمیان بە دەستەوەیە بۆ بەرەڤانی لە بیروڕای خۆیان.

ستیپان ئارکادیچ گوتی: سرگی ئیڤانۆڤیچ، ئێوە کە لایەنگری فێرکاریی کلاسیکن، حەز لە شەڕابی سوور دەکەن؟

سرگی ئیڤانۆڤیچ پەرداخەکەی خۆی بردە پێشێ و بە بزەیەکی دڵفراوانانەوە هەروەك رووی دەمی لە منداڵێك بێ گوتی: من بیروڕای خۆم لەمەڕ ئەم یان ئەوشێوە فێرکارییەوە دەرنەبڕی ـ رووشی کردە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ و درێژەی بە قسەکانیدا: تەنیا دەڵێم هەردوو لایەنەکە بەڵگەی قایمیان بە دەستەوەیە بۆ بەرەڤانی لە بیروڕای خۆیان. من فێرکاریی خۆم کلاسیك بووە بەڵام قەت لەو کێشەیەدا بەڵگەیەکم پێشك نایە بۆ بەرگریکردن لە فێرکارییەکەم. من سەرم

لەوە دەرناچێت کە بە چ هۆیەك و هەقێك دەتوانین فێرکاریی کلاسیك لە سیستەمی فێرکاریی نوێ بە پێشکەوتووتر بزانین.

پیستسۆڤ بۆ پەسندکردنی قسەکەی گوتی: کاریگەریی زانستی سروشتیش لە کاری فێرکاری و پێشکەوتندا لە زانستەکانی دیکە کەمتر نییە. بۆ وێنە ئەگەر سەرنجی زانستی ئەستێرەناسی و گیاناسی یا زیندەوەرناسی بدەن بۆتان دەردەکەوێ کە لە راستیدا هەموویان سەر بە دەزگایەك لە یاساگەلی گشتین.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ گوتی: من ناتوانم بە تەواوی ئەو بیروڕایە پەسند بکەم. من پێموایە دەبێ قەبووڵمان بێت کە هەر ئەو کارەی فێربوونی زمانەکان شوێن لەسەر گەشەکردنی بیری مروڤ دادەنێت و کاریگەرییەکەشی زۆر بەکەڵکە. جگە لەوەش ناتوانین حاشای لێبکەین کە بەرهەمی نووسەرانی رۆم و یۆنانی کەونارا کاریگەرییەکی باشی هەیە لەسەر خووخدەی خوێندکاری زانکۆ، بەڵام مخابن، فێرکاریی زانستی سروشتی راهێنانی زیانبەخشی بەدواوەیە کە دەبێتە ئاپۆر و بەلای ئەم چاخەی ئێمە.

سرگی ئیڤانۆڤیچ دەیویست شتێك بلێ بەڵام پیستسۆڤ بەو دەنگە گڕەی قسەکەی پێبڕی و بە گوڕوتینێکی زۆرەوە دەستیکرد بە سەلماندنی ئەوەی کە ئەو قسەیە راست نییە و سرگی ئیڤانۆڤیچ بە ئارامی چاوەڕوانی هەلێك بوو کە بەو وەڵامەی ئامادەی کردبوو قانعیان بکات.

ئاخری بە زەردەخەنەیەکی ناسکەوە رووی لە کارنین کرد و گوتی: بەڵام ناتوانین حاشای لێبکەین کە هەڵسەنگاندنی تەواو و بەراوردکردنی هەموو چاکی و خراپییەکانی ئەو دوو شێوە زانستە زۆر دژوارە و ئەگەر ئەو هەڤیازییەی کە ئێوە ئێستا باستانکرد یانی دزەکردنی ئەخلاقی، بۆچی نەڵێین، دژە نیهێلیستیی فێرکاریی کلاسیك نەبووایە، مەسەلەی هەڤیازیی یەکێك لەو دوو شێوە بەسەر ئەوی تریاندا بەم زووانە و بە تەواوی یەکلایی نەدەبۆوە.

ـ بێگومان هەروایە.

سرگی ئیڤانۆڤیچ هەر بەو بزە ناسکەوە گوتی: ئەگەر ئەم هەڤیازییە کاریگەریی دژە نیهیلیستی زانستی کلاسیك نەبووایە ئێمە لە بەراوردکردنی ئەم دوو رێگایە زیاتر ورد دەبووینەوە و چاکی و خراپییەکانی هەردوو لامان بە تەرازوویێکی میزانتر هەڵدەسەنگاند و بوارێکی بەرینترمان بە هەردوو لایان دەدا. بەڵام ئێستا دەزانین کە ئەم حەبانەی فێرکاریی کلاسیك وزەی شیفابەخشی دژە نیهیلیستییان تێدایە و ئێمە دەوێرین بۆ نەخۆشەکانمانی بنووسین ـ قسەی خۆشی بەو نەقڵە کۆتایی پێهێنا: بەڵام ئەگەر ئەو حەبەی کە باسمان کرد تایبەتمەندیی شیفابەخشیی پێوە نەبوو دەبێ چ بکەین؟

باسی حەبەکەی سرگی ئیڤانۆڤیچ هەمووانی خستە پێکەنین و ئەوەی لە هەمووان توندتر و بە نەشەتر قاقای کێشا توورۆڤستین بوو: چونکە دوای گوێگرتن لەو دەمەتەقێیە، تەنیا شتێك کە چاوەڕوانیی دەکرد ئەو گاڵتە و قسەی کۆتاییی بوو کە ئەویشی بیست.

ستیپان ئارکادیچ بۆ بانگهێشتنی پیستسۆڤ هەڵەی نەکردبوو. کاتێك پیستسۆڤ لە کۆڕێکدا ئامادەبووایە وتووێژی رووناکبیرانە دادەمەزرا و دوایی نەدەهات. کاتێك سرگی ئیڤانۆڤیچ بەو گاڵتەیە کۆتاییی بە باسەکە هێنا پیستسۆڤ مەبەستێکی تری هێنا گۆڕێ.

گوتی: تەنانەت ناکرێ قەبووڵی بکەین کە مەبەستی دەوڵەت ئەوەبووە. دیارە دەوڵەتیش بۆ هەڵبژاردنی رێسای خۆی لێکدانەوەی گشتی لەبەر چاو دەگرێ و گوێ بەو ئاکامانەش نادا کە وێدەچێ لێی بکەوێتەوە. بۆ وێنە مەسەلەی فێرکاریی ژنان دەبێ بە زیانباری بزانن بەڵام دەوڵەت بۆ ژنان خولی فێرکاریی باڵا و زانکۆی دامەزراندووە.

باسەکە خێرا کێشرایە سەر مەسەلەی تازەی فێرکاریی ئافرەتان.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە مەسەلەی فێرکاریی باڵای ئافرەتان لەگەڵ مەسەلەی ئازادییان تێکەڵ بووە و تەنیا لەولایەنەوە وێدەچێ بە زیانباری بزانن.

پیستسۆڤ گوتی: من بە پێچەوانە، پێموایە ئەو مەسەلەیە لێك جیا ناکرێتەوە و خولێکی پووچەڵ پێك دێنن. ژن بە هۆی کەمایەسیی فێرکاری لە مافی خۆی بێبەش دەبێ، بەڵام هەر ئەو کەمایەسیی فێرکارییەی ئافرەت بە هۆی بێبەشبوونی ئەوەوەیە لە مافی خۆی. نابێ لە بیرمان بچێت کە هەلومەرجی کۆیلەیی ژنان هێندە سەخت و کۆنە کە ئێمە زۆر جار نامانەوێ لەو خەرەندە قووڵە بگەین کە بۆتە هۆی لەیەك دووركەوتنەوەمان.

سرگی ئیڤانۆڤیچ بێدەنگ بوو هەتا پیستسۆڤ تۆزێ دەرفەتی پێدا، گوتی ئێوە باسی ماڤ دەکەن، مافی دامەزران لە کارێکی وەك لێژنەی دادوەری، راوێژکاریی شۆڕای شار و سەرۆکایەتیی شۆڕای زێمستڤا، مافی فەرمانبەریی دەوڵەت یا نوێنەرایەتیی خەڵك...

ـ هەڵبەت شکی تێدا نییە هەروایە.

بەڵا م ئەگەر ژنان، بە شێوەی تاقیکردنەوەیەکی جیاواز و زۆر دەگمەن، بتوانن ئەرکێك بەڕێوەبەرن، من پێموایە باش نییە وشەی ماف بەکار بێنین، بەڵکوو جوان وایە بڵێین «ئەرك». لە هەرکەسێك بپرسین کەسپت چییە و پێمان بڵێ خەریکی کار کردنە، جا لە هەرکام لەو کەسپانەدا وەکوو ئەندامی لێژنەی داوەری یان راوێژکاریی شۆڕای شار یا مووچەخۆریی دایرەی تێلگەراف لەڕێوە هەست دەکەین کە خەریکی ئەنجامدانی ئەرکێکە.

کەوایە واچاکە بڵێین ژنان خوازیاری ئەنجامدانی ئەرکی خۆیانن و ئەمەش کامڵترین یاسایە. تەنیا دەبێ ئافەرینیان پێبڵێین کە دەیانهەوێ شانبەشانی پیاوان خزمەت بە وڵاتەکەیان بکەن.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ قسەکەی ئەوی پەسند کرد: ڕاست وایە، بەڵام مەسەلەکە ئەوەیە کە توانایی ئەنجامدانی ئەو ئەرکەیان هەیە یان نا.

ستیپان ئارکادیچ گوتی: ئەگەر فێرکاری لە نێو ژناندا برەو پەیدابکات حەتمەن توانایی کاریشیان دەبێ. ئەوەش شتێکە کە دەیبینین...

پرێنسی گەورە کە ماوەیەك بوو گوێی بۆ باسەکە شل کردبوو و چاوە مژمۆر و پر تەشەرەکانی زیت کردبۆوە، گوتی: بەڵام ئەو پەندە چی لێبکەین؟ کچەکانیشم لێرەن، بەڵام قەیناکا، دەیڵێم: ژنان قژیان درێژە بەڵام ئەقڵیان....

پێستسۆڤ بە توورەیی گوتی: سەبارەت بە ئەقڵی ڕەشپێستەکانیش بەر لە ئازادی هەر ئەوەیان دەگوت.

سرگی ئیڤانۆڤیچ گوتی: من تەنیا ئەوەم پێ سەیرە ژنان لە دوای ئەرکی نوێ دەگەڕێن، کەچی ئێمە پیاوان بەداخەوە هەوڵ دەدەین ئەو ئەرکەی پێیان سپاردووین دەغەڵانە خۆی لێبدزینەوە.

پێستسۆڤ گوتی: ئەرك و مووچە پێکەوەن. مافی هەبوونی دەسەڵات و پارە و شانازی. بەڵام ژنان بە شوێن ئەو شتانەوە نین.

پرێنسی پیر گوتی: ڕاست وەك ئەوە وایە من بمهەوێ مافی شیرپێدانی منداڵم هەبێ و گازندە بکەم کە بۆچی بۆ ئەو کارە پارە بە ژنان دەدەن بەڵام بە منی نادەن.

دیسان توورۆڤتسین دای لە قاقای پێکەنین و سرگی ئیڤانۆڤیچ داخی لێهات کە بۆچی ئەو ئەم قسەیەی نەکردووە. تەنانەت ئەلکسی ئەلکساندرڤیچیش پێکەنی.

پێستسۆڤ گوتی: بەڵام پیاوان ناتوانن شیر بە زارۆ بدەن. بەڵام ژنان...

پرێنسی پیر کە ئیجازەی بەخۆی دەدا تاکوو لەلای کچەکانی لەو جۆرە گاڵتانە بکات گوتی: بۆچی، من لە پاپۆڕدا دیتم ئینگلیزییەك شیری دەدا بە منداڵەکەی.

سرگی ئیڤانۆڤیچ گوتی: هەرچەند کەست لەو ئینگلیزییانە پێشك دێ کە لەو هونەرانە بەهرەمەندن بەو ڕادەیەش ژنان بکەنە فەرمانبەری دەوڵەت.

ستیپان ئارکادیچ کە بەردەوام چیبیسوای لە بەرچاو بوو، ئەوی وەبیرهاتەوە و قسەکەی پێستسۆڤی پەسند کرد و گوتی: بەڵێ، بەڵام ئەگەر کچێك بنەماڵەی نەبێ دەبێ چ بکا؟

داریا ئەلکساندرۆڤنا وێدەچوو زانیبێتی مەبەستی ستیپان ئارکادیچ کام کچە ڕەنگی هەڵبزرکا و لە ناکاو پەڕییە نێو قسەکانیان: ئەگەر بە وردی بەسەرهاتی ئەو کچە لێکبدەیەوە دەبینی کە پشتی لە بنەماڵەی خۆی و بنەماڵەی خوشکی کردووە کە دەیتوانی لەوێ کارێکی وای لە ئەستۆ بێ کە شیاوی ژنە.

پێستسۆڤ بە دەنگی گڕ و بەرزی لەڕێوە وەلامی دایەوە: بەلام ئێمە باسی ڕێسا دەکەین. ژن دەکرێ مافی ئەوەی هەبێ سەربەخۆ بژی و بە خوێندەواریی بالا بگات، بەلام ئەگەر تێبگات کە هەموو ئەو دەرکانەی لێداخراوە هەست بە دڵتەنگی و دەستبەسەری دەکات.

پرێنسی گەورە دیسان گوتی: منیش هەست بە دەستبەسەری و دڵتەنگی دەکەم کە ناتوانم لە دایەنگەیەك وەکوو دایەن دامەزرێم ــ تووروۆڤتسین ئەو قسەیەی زۆر پێخۆش بوو و دیسان قاقایەکی بەرزی کێشا و لاسقی ئەستوور و تورتی مارچێوەیەکی لە سۆسەکە هەڵکێشا.

## یازدە

هەموو میوانەکان جگە لە کیتی و لەڤین لە وتوویژی گشتیدا بەشدارییان کرد. سەرەتا، کاتێك باسی دزەکردنی نەتەوەیەك بۆ نێو نەتەوەیەکی تر کرا لەڤین بێ ئیختیار کەوتە بیری ئەوەی کە بیروڕای خۆی لەو بارەوە، دەربڕێ، بەلام ئەم فیکرانە کە لە رابردوودا گرینگیی زۆریان هەبوو بۆی، ئێستا دەتگوت لە نێو خەونێکی لێڵ و تاریکدا و لە تاریکوڕوونی زەینیدا جاروبار ترووسکەیەکی دەهات و ئیتر گرینگیی نەبوو بەلایەوە. تەنانەت زۆریشی پێ سەیر بوو کە بۆ ئەوانە لەسەر ئەو باسە کە بە کەڵکی هیچ کەس نایە ئەوەندە توندوتیژی دەنوێنن؟ کیتیش هەر ئاوای بیردەکردەوە. پێیوابوو قسەکانی ئەوان سەبارەت بە ماف و خوێندەواریی بالای ژنان دەبێ سەرنجڕاکێش بێ، ئەو وەبیر دەستە خوشکی دانیشتووی هەندەرانی خۆی ڤارنکا کەوتەوە کە ئەوکات زۆری خۆش دەویست و بە ئاواتەوە بوو وەك ئەو وابێ، بەلام دواتر دڵی رەنجاندبوو. زۆری بیر لە حاڵوباڵی خۆی کردبۆوە کە ئەگەر شوو نەکات چ بکات و لەو بارەوە زۆر لەگەڵ خوشکی دوابوو. بەلام ئێستا ئەو باسە بۆ ئەویش ئیتر هیچ گرینگایەتییەکی نەبوو. ئێستا لەگەڵ لەڤین کەوتبووە ئاخافتن ئەویش نەك ئاخافتن، مامەڵەیەکی رازاوی کە ساتبەسات زیاتری لە یەکتر نزیك دەکردنەوە و پێوەندییەکەیانی قایمتر دەکرد و ترسێکی شیرین و نەناسراوی لە ناخیاندا دەچاند و بەرەبەرە دەڕسکا.

سەرەتا کیتی لە لەڤینی پرسی کە ساڵی رابردوو چۆنی ئەو لە فایتوونەکەدا دیتووە و لەڤین باسی گەڕانەوەی لە گیادروون و شەو بەکێوی و ماندووبوونی خۆی بۆ کرد و پاشان بۆی باس کرد کە لەسەر رێگا گەورەکە لە نێو فایتوونێکدا بووە و تیژ بەلایدا تێپەڕیوە.

ـ بەیانی زوو بوو، شەو و رۆژی، وێدەچوو تازە لە خەو هەستابێتی. دایەگیانت لە سووچەکەی تری فایتوونەکەدا خەوتبوو. بەیانییەکی زۆر فێنك و خۆش بوو. من بە پێیان بەسەر رێگاکەدا دەڕۆیشتم، کە چاوم بە فایتوونەکەی ئێوە کەوت، بەخۆم گوت دەبێ کێ بێ بەو بەیانییە زووە بە فایتوونێکی چوار ئەسپەوە تێدەپەڕێ؟ زۆر فایتوونی چاك بوو، زڕەی زەنگوڵەی ئەسپەکانیشی زۆر نەشەبزوێن بوو، کتووپڕ ئێوە وەك برووسکە بەبەر چاومدا تێپەڕین و دوورکەوتنەوە. ئاوا دانیشتبووی و لکەی شەوکڵاوەکەشت ئاوا بە هەردوو لادا شۆڕکردبۆوە و دەستت پێوە گرتبوون، لە فیکر و خەیاڵدا نوقم بووبووی ـ ئەوەی گوت و پێکەنی، پاشان گوتیشی: چەندەم پێخۆش بوو بزانم لەو کاتەدا بیرت لە چی دەکردەوە. فیکرێکی گرینگ بوو؟

کیتی لە دڵی خۆیدا گوتی: «نەکا سەروشکڵم زۆر شێواو بووبێ؟» بەڵام بە دیتنی بزەیەکی ئاشقانە کە یادی ئەو ساتە دیدارە لەسەر روخساری لەڤین نەخشی کردبوو هەستی کرد شوێنێك کە ئەم دیدارە لەسەر هەست و رۆحی لەڤینی داناوە زۆر خۆش و دڵبزوێن بووە. بۆیە سوورهەڵگەڕا و بە پێکەنینێکی شاد گەشایەوە.

ـ راستت دەوێ هیچم لە بیرنییە.

لەڤین لە توورۆڤتسینی روانی کە لەبەر پێکەنین چاوی پڕ بووبوو لە ئاو و جەستەی دەلەرایەوە گوتی: ئەو توورۆڤتسینە چۆن ئاوا لە ناخی دڵەوە پێدەکەنێ؟

کیتی پرسیی: ئێوە لەمێژە دەیناسن؟

ـ کێ هەیە ئەو نەناسێ!

ـ بەڵام پێموایە بە پیاوێکی باشی نازانی.

ـ نا، پیاوێکی خراپ نییە، بەڵام هێندێ سووکە.

کیتی گوتی: نا وانییە. واچاکە هەتا درەنگ نەبووە بیروڕای خۆت سەبارەت بە ئەو بگۆڕێ. منیش سەرەتا پێم وابوو مرۆڤێکی سووك و چرووکە، بەڵام پاشان بۆم دەرکەوت مرۆڤێکی زۆر مێهرەبان و بێوێنەیە. ئەوەندە دڵنەرم و رۆحسووکە مەگین خودا بزانێ.

ـ تۆ لە کوێوە ئاگات لە دڵییەتی؟

ـ من و ئەو پێکەوە زۆر هاوڕێیەکی نزیکین، زۆر چاکی دەناسم ـ بە بزەیەك کە پەژیوانی و لەگەڵ ئەویشدا متمانەی بە ئەو (یانی بە لەڤین)ی پێوە دیاربوو گوتیشی: زستانی رابردوو، ماوەیەك دوای ئەوەی... ئێوە... هاتن بۆ ماڵی ئێمە، منداڵەکانی دالی هەموویان مێکوتەیان گرت. خوداوڕاستان ئەو رۆژێك چوو بۆ دیدەنییان و دەتوانی بیهێنیتە بەرچاوت؟ ـ لێرەدا کیتی وەك چپەکردن دەنگی هێواش کردەوە و گوتی: ئەوەندەی دڵ بە دالی سووتا کە هەر لەوێ مایەوە تاکوو بۆ پەرستاریکردن لە منداڵەکان یارمەتیی بدات. سێ حەوتوو لە ماڵی خوشکم مایەوە و وەك دایەنێك ئاگاداریی لە منداڵەکان کرد.

خۆی بۆ لای خوشکی خوار کردەوە و گوتی: خەریکم باسی تووررۆڤتسین و مێکوتەگرتنی منداڵەکان بۆ کۆنستانتین دیمیتریچ دەگێڕمەوە.

دالی چاوێکی لە تووررۆڤتسین کرد کە دەیزانی باسی ئەو دەکەن و بە نەرمی گرژییەوە و گوتی: بەڵێ، زۆر پیاوی چاکە ـ لەڤین جارێکی تر چاوی لە تووررۆڤتسین کرد و ماقما کە بۆ لە رابردوودا نەیزانیوە کە ئەو پیاوە تا ئەو رادەیە دڵۆڤان و جوامێرە.

بە خۆشحاڵی گوتی: زۆر بەداخەوەم، زۆر بە داخەوەم، ئیتر سەبارەت بە هیچ کەس خراپ بیرناکەمەوە. ـ ئەوەش هەستێك بوو کە بەڕاستی لە دڵیدا بوو.

## دوازده

لەو باسەدا کە سەبارەت بە مافی ژنان دامەزرابوو مەسەلەی نابەرانبەریی نێوان ژن و پیاو هاتە گۆڕێ کە ئاخافتن لە حوزووری ژنەکانیشدا ئاسان نەبوو. پێستسۆڤ لەسەر نانخواردن چەند جار ویستی ئاماژەی پێبکات. بەڵام سرگی ئیڤانۆڤیچ و ستیپان ئارکادیچ زۆر بە پارێزەوە خۆیان لەو دارەتە دا.

بەڵام کاتێك لەسەر مێزەکە هەستان و ژنان لە ژووری نانخواردن چوونە دەرێ، پێستسۆڤ کە لەگەڵ ئەوان نەڕۆیشتبوو رووی لە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ کرد و هۆی گرینگی ئەو نابەرانبەرییەی بۆ شرۆڤە کرد. بە بڕوای ئەو نابەرانبەریی ژن و مێرد لەوە دابوو کە سزادانی خەیانەتی ژن بە مێرد و مێرد بە ژن نە لە یاسادا بەرانبەر پێشبینی کراوە و نە لە زەین و باوەڕی خەڵکدا.

ستیپان ئارکادیچ بە تاڵوکە لە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ نزیکبۆوە و پێشنیاری پێکرد کە بچێت و پێکەوە جگەرەیەك بکێشن.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بە ئارامی وەڵامی دایەوە: نا، من جگەرە ناکێشم ـ هەروەك بڵێی دەیهەوێ نیشانی بدات کە باکی لەو قسەوباسانە نییە، بە بزەیەکی ساردەوە رووی لە پێستسوڤ کرد و گوتی: بە بڕوای من ئەو بیروڕایە لە زاتی مەسەلەکەدایە ـ ئەوەی گوت و ویستی بچێت بۆ تەلاری میوانداری کە لەناکاو توورۆڤتسین کە بە هۆی زۆرخواردنەوەی شامپانی وەنەشە هاتبوو و ماوەیەك بوو چاوەڕوانی دەرفەتێك بوو کە ئەو بێدەنگییە تاڵەی خۆی بشکێنێ بەبێ پێشەکی رووی لە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ کرد کە هێژاترین میوانی ئەو کۆڕە بوو، بە بزەیەکی رۆحسووکانەوە کە کەلێنی خستبووە بەینی لێوە سوور و تەڕەکانییەوە گوتی: نازانم جەنابتان بەسەرهاتی پریا چنیکۆڤتان بیستووە؟ ڤاسیا پریا چنیکۆڤتان عەرز دەکەم. ئەمڕۆ بیستم لە تڤێر لەگەڵ کڤیتسکی[١٧٤] دوئێلی کرد و کوشتی.

هەروەك چۆن کەسێك کە جێیەکی جەستەی دێشێ یان بریندارە پێیوایە لەگەڵ هەر جووڵانێك ئەو شوێنەی لە جێیەك دەکوتێ و دەکولێتەوە، ستیپان ئارکادیچیش هەستی دەکرد کە بۆ بەدبەختی ئەو رۆژە بەردەوام دەمەتەقێکان دەگەڕانەوە سەر ئەو شوێنە کۆڵەوارەی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ. دیسان هەوڵیدا مێردەکەی خوشکی نەجات بدات بەڵام ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بە هۆی کونجکاوییەوە پرسیی:

ـ پریاچنیکۆڤ بۆچی دوئێلی کرد؟

ـ لەبەر ژنەکەی. بەڕاستی بوێریی نواند. کەڵەگای ژنەکەی بانگکرد بۆ دوئێل و کوشتی. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بە خوێنساردییەوە گوتی: سەیرە! بڕۆی وێکهێنا و رۆیشت بۆ تەلاری میوانداری.

دالی لە ژوورێکی چکۆڵە کە لەوێوە دەچوونە نێو تەلارەکەوە هات بۆ لای و بە بزەیەکەوە کە ترسی پێوە دیاربوو گوتی: زۆر خۆشحاڵم تەشریفت هێناوە، حەزدەکەم هێندێکتان لەگەڵ بدوێم. فەرموو با لێرە دانیشین.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ هەر بەو حاڵەتە ساردوسڕەوە بە نێوچاوانی گرژەوە لەلای داریا ئەلکساندرۆڤنا دانیشت و بە بزەیەکی درۆیینەوە گوتی:

ـ چاکتر، چونکە دەمویست لە خزمەتتان مەرەخەس بم. چونکە سبەینێ وەڕێدەکەوم.

داریا ئەلکساندرۆڤنا لێی روون بوو کە ئانا بێتاوانە و هەستی کرد کە رەنگی پەڕیوە و لێوی لە داخی ئەو کابرا خوێنساردە دڵڕەقە دەلەرزێ کە هەروا بە ئاسانی دەیویست ئابڕووی هاوڕێ بێتاوانەکەی بەرێت.

---

174- Kvitsky

بە پێداگرییەکەوە کە ئیجبار بە سەریدا سەپاندبوو چاوی لە چاوی کارنین بڕی و گوتی: ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ من حاڵی ئانام لە ئێوە پرسی و ئێوە هیچ وەڵامێکتان پێنەدامەوە. حاڵی چۆنە؟

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ، بێ ئەوەی چاو لە چاوی بکات وەڵامی دایەوە: وەك دیارە هیچ کەمایەسییەکی نییە.

ـ ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ، بمبوورە، من مافی ئەوەم نییە پرسیارێکی ئاوا بکەم، بەڵام ئانام وەك خوشکی خۆم خۆش دەوێ. من داوا لە ئێوە دەکەم، تکاتان لێدەکەم، پێمبڵێن چیی لە نێوانتاندا رووی داوە؟ ئێوە تۆمەتی چ تاوانێك دەدەنە پاڵی؟

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ نێوچاوانی تێکنا و بە چاوی نیوە قووچاوەوە سەری داخست و گوتی:

ـ پێموایە مێردەکەت بۆی باس کردووی کە بە چ هۆیەك بە پێویستی دەزانم پێوەندیم لەگەڵ ئانا ئارکادیۆڤنا بپسێنم و لێی جیا ببمەوە ـ بێ ئەوەی چاو لە چاوی دالی بکات ئەوەی گوت و نەخوازراوانە چاوی لە ئیشچر باتسکی بڕی کە بە نێو ژوورەکەدا تێدەپەڕی.

دالی دەستە رەقەڵەکانی خۆی لەبەر دەموچاویدا گرت و هەڵێگولۆفی و بە توندی و لەبزێکی گەرموگوڕ گوتی: من باوەڕ بە شتیوا ناکەم. باوەڕ ناکەم. ناتوانم باوەڕ بکەم ـ بە پڕتاو هەستا دەستی لەسەر شانی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ دانا و گوتی: لێرە ناکرێ قسەی لێبکەین، تکایە وەرە با بڕۆین.

شڵەژانی داریا ئەلکساندرۆڤنا بەڕاستی شوێنی لەسەر ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ دانا. هەستا و گوێڕایەڵانە بە دوایدا رۆیشت بۆ ژووری دەرسخوێندنی منداڵەکان. لە پشت مێزێك کە نایلۆنەکەی هەمووی بە نووکی قەڵەم و قەڵەمتراش رووشابوو دانیشتن.

دالی کە چاوی لە چاوە سرکەکانی کارنین بڕیبوو گوتی: من باوەڕ ناکەم، ناتوانم باوەڕ بەو شتە بکەم.

کارنین گوتی: ناکرێ باوەڕ بە راستەقینە نەکەین ـ جەختیشی لەسەر وشەی راستەقینە کرد.

داریا ئەلکساندرۆڤنا گوتی: بەڵام ئاخر چیی کردووە؟ چی؟ چیی کردووە؟ هەر بەڕاستی چیی کردووە؟

کارنین گوتی: ئابڕووی خۆی ناوەتە ژێر پێ و خەیانەتی بە مێردەکەی کردووە. ئەو کارەی کردووە.

دالی دەستی بەبەر دەموچاوییەوە گرت و گوتی: نا، نا، شتی وا نابێ، نا، تۆ خودا شتیوا مەڵێ... بەهەڵە چووی.

لێوانی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بە بزەیەکی سارد درزی تێکەوت بەڵام چاوانی هەروا خەمیان لێدەباری. ئەو بەو بزەیە دەیویست نیشانی بدات کە لێی روونە و بە هەڵە نەچووە. بەڵام جەختی ئەو بەرەڤانییەی دالی ئەگەرچی دڵنیاییەکەی تووشی سستی نەکرد بەڵام زامی دڵی تەشەنا کردەوە و لە داخ و رقدا لووتی هەڵقرچاند و گوتی: ئەگەر ژن بۆخۆی لەلای مێردەکەی ددانی پێدابنێ ئیتر بەهەڵە چوون مانای نییە. خۆی ددانی پێدانا کە هەشت ساڵ ژیان و کوڕەکەمان هەمووی پووچ بووە و ئەو دەیهەوێ ژیانێکی نوێ پێکبێنێ.

ئانا و تاوان؟ نا؟ من ناتوانم ئەوانە پێکەوە پێوەند بدەم.

ئێستا راست چاوی لە روخساری مێهرەبان و هەڵبزرکاوی دالی بڕیبوو، هەر بەو هەستەشەوە کە پێیوابوو زمانی پشکووتووە، گوتی: داریا ئەلکساندرۆڤنا، نازانی چەندە ئاواتەخواز بووم کە گریمانەیەك هەبوایە بۆ گومان و هەڵەکردن. تا ئەو کاتەی دڵنیا نەبووم ژیان زۆر تاڵ بوو بەلامەوە بەڵام لە ئێستام شیرینتر بوو. کاتێك دڕدۆنگ بووم هێشتا هیوایەکم هەبوو، بەڵام ئێستا ئیتر هیچ هیوایەکم نەماوە و لەگەڵ ئەوەشدا شك و دڕدۆنگی رۆح و گیانی داگرتووم. لە هەموو شتێك دڕدۆنگم و تەنانەت لە کوڕەکەی خۆشم بێزارم. هێندێ جار باوەڕ ناکەم کە کوڕی خۆم بێ. من پیاوێکی چارەڕەشم.

پێویست نەبوو ئەو قسەیە بکات. داریا ئەلکساندرۆڤنا ئەوەی لە نیگایدا دەخوێندەوە. دڵی پێیدەسووتا و دڵنیایی و متمانەی دەرهەق بە دەستە خوشکەکەی لە کزیی دا.

ـ پەککوو، چەندە سامناکە! بەڵام ئەوە راستە کە بڕیارت داوە تەڵاقی بدەی؟

دالی بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە گوتی: ئیتر دەتوانم چ بکەم؟ ئیتر دەتوانم چ بکەم! نا، ئەوە چ قسەیەکە دەیکەی؟

کارنین وەك ئەوەی فیکری ئەوی خوێندبێتەوە گوتی: بەڵێ، چارەڕەشی لەم چەشنە دەرد و ئازارانەدا ئەوەیە کە بە پێچەوانەی دەدرەکانی تر، وەك زیانێکی کەوا قەرەبوو نابێتەوە یان مەرگی ئازیزان، بۆ ئەوەش نابێ وەك خاچ قورسییەکەی تامڵ بکەیت و لەگەڵی بسازێی. لێرەدا دەبێ کارێك بکەیت. پیاو دەبێ خۆی لە گێژاو و فەرتەنەی ناوزڕاوی دەربازبکات. ژیانی ژن و مێردایەتی کوا دەکرێ سێ کەسی بێت؟

دالی سەری داخست و گوتی: تێدەگەم، باش تێدەگەم ـ تۆزێ بێدەنگ بوو و بیری لە حاڵی خۆی و ژیانی ژن و مێردایەتیی خۆی کردەوە کە کەلاوڕێژ بوو لە خەم و خەفەت و لەناکاو و بە توندی سەری هەڵێنا و دەستی بە نیشانەی پاڕانەوە لەسەریەك دانا و گوتی: پەلەمەکە، ئێوە مەسیحین. بیر لە حاڵی ئەو بکەوە. ئەگەر لە خۆتی بتارێنی ئەو بێچارەیە چ بکات؟

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ گوتی: داریا ئەلکساندرۆڤنا، من بیرم لێکردۆتەوە. لەو بارەوە زۆرم بیرکردۆتەوە ـ چەند پەڵەی سوور لە دەموچاویدا وەدیار کەوتن. داریا ئەلکساندرۆڤنا هەستی کرد کە دڵی بەڕاستی بۆ ئەو پیاوە دەسووتێ: من کاتێك ئەو کارەم کرد کە ئەو خۆی ماجەرای ئابڕووچوونەکەی منی گێڕایەوە. من وەك رابردوو گوێم لێخەواند و دەرفەتم پێدا بیر بکاتەوە و رەنگە پەشیمان ببێتەوە، بەڵام ئاکامەکەی بوو بەچی؟ تەنانەت ئامادە نەبوو ئەو مەرجە بچووکەی من یانی پاراستنی شەرەف و ئابڕوومان لەبەر چاو بگرێ ـ بە گوڕو تین و تووڕەییەوە درێژەی پێدا: مرۆڤ دەتوانێ کەسێك رزگار بکات کە خۆی حەزی لە خۆهەڵداشتن نەبێ. بەڵام کاتێك رۆح و سروشتی کەسێك وا گەندەڵ دەبێت کە پێیوایە خۆهەڵداشتن رزگارییە ئیتر چیت لە دەست دێ؟

ـ هەموو کارێك، جگە لە جیابوونەوە.

ـ بەڵام ئاخر هەرکارێك یانی چی؟

ـ نا، دەزانم ئەو دۆخە زۆر تاڵ و ترسناکە. کاتێك ژنێك سایەی مێردی لەسەر نەبێ بە تەواوی تووشی هەڵدێران دەبێ.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ شان و برۆی هەڵتەکاند و گوتی: دەی، دەی پێمبڵێ چ بکەم؟ ـ کە دوایین خەتای ژنەکەی وەبیرهاتەوە، هێندەی رق هەستا کە وەك سەرەتای ئاخاوتنەکەیان سارد بۆوە. لەجێی خۆی هەستا و گوتی: زۆر سپاستان دەکەم بۆ ئەو هاودەردییەتان. ئیتر دەبێ بڕۆم.

ـ نا، پەلە مەکە. تۆ نابێ بەو شێوەیە تووشی فەوتانی بکەی. پەلە مەکە، من تۆزێکت باسی خۆم بۆ دەکەم. منیش مێردەکەم خەیانەتی پێکردم. لە داخ و رقدا خەریکبوو دیق بکەم و دەمویست واز لە هەموو شتێك بێنم، دەمویست خۆم... بەڵام وەخۆ هاتمەوە. پێتوایە کێ یارمەتیی دام؟ ئانا بوو کە نەجاتی دام. ئێستاش دەبینی زیندووم و منداڵەکانم گەورە دەکەم. مێردەکەشم گەڕاوەتەوە بۆ نێو باوەشی بنەماڵە و لە هەڵەی خۆی گەیشتووە و ئێستا باشتر و پاکتر بووە. منیش زیندووم... من لە مێردەکەم خۆش بووم. ئێوەش دەبێ لە ئانا خۆش بن.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ گوێی بۆ راگرتبوو، بەڵام قسەکانی ئیتر شوێنی لەسەر دانەدەنا. ئەو رقەی کە ئەو رۆژە وایلێکرد بڕیاری تەڵاق بدات دیسان لە گیانیدا سەری هەڵدایەوە. تەکانێکی لە خۆیدا و بە دەنگی بەرز و مەیلەو جێکن دەستی پێکرد:

ـ ببوورە، من ناتوانم و نامەوێ لێی خۆش بم و پێمۆایە بەخشینی تاوانێکی ئاوا خۆی تاوانە. هەرکارێکی بلێی بۆ ئەو ژنەم کرد بەڵام ئەو هەمووو شتێکی نایە ژێرپێ و پێخوستی کرد، ژیانی منی لە زەلکاوێك هەڵکێشا کە وەك زاتی خۆی وابوو ـ بە دەنگێکی لەرزۆك و دڵی پڕەوە درێژەی پێدا: من مرۆڤێکی دەغەزدار و رقئەستوور نیم و هیچ کات رقم لە هیچ کەس نەبووە، بەڵام بە تەواوی وزە و هەستمەوە لەو ژنە بێزارم و بە هیچ شێوەیەك ناتوانم لێی ببورم. چونکە تۆ نازانی چەندەی سووکایەتی بە من کرد. لەبەرچاوی خۆم کابرای هێنایە ماڵێ.

داریا ئەلکساندرۆڤنا بە دەنگێکی نەرم و شەرمنانە گوتی: ئەو کەسانەی کە رقیان لێتە تۆ خۆشت بووێن.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بە نیشانەی سووکایەتی بزەیەکی مانادار هاتێ. ئەو لەمێژ بوو لەگەڵ ئەو کەلامەی ئینجیل ئاشنابوو، بەڵام نەیدەتوانی ئەو راهێنانە لە ژیانی خۆیدا بەکار بێنێ.

ـ ئەو کەسانەی رقییان لێتە، بەڵێ، بەڵام ئەو کەسەی کە تۆ رقت لێیەتی ناتوانی خۆشت بووێ. ببوورە کە بە خەمەکانی خۆم دڵتەنگم کردی. خەمی هەرکەسێك بۆ خۆیەتی و بەس. ـ ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ ئەوەی گوت و هەوڵیدا بەسەر قینی خۆیدا زاڵ بێ و بە خوێنساردی و هێمنانە خوداحافیزی کرد و رۆیشت.

## سێزدە

کاتێك لەسەر مێزەکە هەستان لەڤین دەیویست لەگەڵ کیتی بڕوات بۆ تەلاری میوانداری بەڵام دەترسا کیتی ئەو لێکنزیکبوونەوە ئاسایی و ئاشکرایەی پێخۆش نەبێ. بۆیە لەگەڵ پیاوەکان مایەوە و لە باس و دەمەتەقێکانیاندا بەشداریی کرد و بێ ئەوەی چاو لە کیتی بکات جموجۆڵ و روانین و شوێنی دانیشتنی ئەوی لە نێو تەلارەکەدا هەست پێدەکرد.

لەڤین بەبێ چکۆڵەترین زەحمەت ئەو بەڵێنەی پێیدابوو رەچاوی کرد و ئێستا هەوڵی دەدا کە بەجێی بێنێ، ئەو بەڵێنەش ئەوەبوو کە هەمیشە سەبارەت بە هەمووکەس باش بیر بکاتەوە و هەمووانی خۆش بووێ. باس لەسەر کۆمۆن، یان یەکەی ژنانی هاوبەشی سەرەتایی بوو، پێستسۆڤیش بنەمای تایبەتی ئەوی دەدی کە ئەوەی ناونابوو هاودەنگیی سەرەتایی. لەڤین نە لەگەڵ پێستسۆڤ هاوڕا بوو نە لەگەڵ براکەی کە بە شێوەیەکی تایبەت بە خۆی گرینگایەتیی کۆمۆنی رووسیی پەسندیش دەکرد و حاشاشی لێدەکرد. بەڵام بەشداری کردنی ئەو لەو باسەدا تەنیا بەو مەبەستە بوو کە هەوڵ بدات ئەوان پێکبێنێ و توندی و گرژیی پەرسڤەکانیان نەرم بکاتەوە و نەهێڵێ ببێتە چەلەحانێ. ئەوەی کە خۆی دەیگوت بە گرینگی نەدەزانی و هەروەها بڕوای بە گرنگایەتیی باسەکەی ئەوانیش نەبوو. تەنیا شتێکی دەویست ئەویش ئەوەبوو خۆی و ئەوانەی لەو کۆڕەدان شاد و دڵخۆش بن. ئەو ئێستا تەنیا شتێکی بەلاوە گرینگ بوو، ئەو شتەش سەرەتا لە تەلاری میوانداری بوو پاشان رۆیشت و لە نزیك دەرگاکە راوەستا. لەڤین بێ ئەوەی سەری وەرسووڕێنێ چاو و بزەی ئەوی لەسەر خۆی هەست پێدەکرد و هەر بەو هۆیەش نەیدەوێرا ئاوڕ بداتەوە. کیتی لەبەر دەرگاکەدا لەگەڵ ئیشچر باتسکی وێستابوو و چاوی لە ئەو دەکرد.

لەڤین رۆیشت بۆ لایان و گوتی: پێم وابوو دەچی بۆ لای پیانۆکە" موسیقا زۆر شتێکی باشە و من لە دێ لێی بێبەشم.

ـ نا، ئێمە تەنیا بۆ ئەوە هاتین بۆ ئێرە کە ئێوەش بێنین. سپاست دەکەم کە هاتیـ ئەو قسەی لەگەڵ زەردەخەنەیەك، وەکوو دیارییەك بۆ پاداش پێشکەش بە لەڤین کرد ـ ئەو باسانە بە کەڵکی چیدێ؟ دە رۆژیش دانیشن هیچ کامیان ناتوانێ ئەوی تریان قانع بکات.

لەڤین گوتی: بەڵێ، وایە، مرۆ زیاتر لەبەرئەوە گەرم دادێ و دەکەوێتە دەمەتەقێ و شەڕەقسە چونکە لە قسەی بەرانبەرەکەی تێناگات و نازانێ کە دەیهەوێ چی بسەلمێنێ.

لەڤین لە زۆربەی مشتومڕ و ئاخافتنی نێوان کەسایەتییە زانا و خاوەن ژیارەکاندا دیتبووی دوای هەوڵدانێکی زۆر و کەڵك وەرگرتن لە قسەی پڕکاکڵ و ورد و مەنتقی، ئاخری تێدەگەن کە ئەوەی ئەو ماوەیە تێکۆشاون بە خەنیمەکەیانی بسەلمێنن، ئەو خۆی زۆر لەوەپێش و تەنانەت لە سەرەتای باسەکەوە، زانیویێتی بەڵام هەرکام لەوان مەبەستێکی دیکەی بووە و تەنیا بەو هۆیە دەرینەبڕیوە چونکە ترساوە لەوەی لەو قسەبەزۆران دانەدا ببەزێت، یان زۆر جار خۆی دیتبووی کە لە کاتی چەلەحانێدا لە مەبەستی بەرانبەرەکەی گەیشتووە و پەسندیشی کردووە و بۆی دەرکەوتووە کە ئەو هەموو بەڵگەهێنانەوانە پێویست نەبوون، لە لایەکی

تریشەوە هێندێ جار پێش هاتووە کە ویستوویێتی شتێك دەربڕێ و بۆ سەلماندنی بە دوای بەڵگەدا گەڕاوە، بەڵام ئەگەر بیتوانیبایە مەبەستی خۆی بە روونی و سەداقەتەوە بەیان بکات، خەنیم حەتمەن قەبووڵی دەکرد و دەستی لەو دەمەقاڵێیە هەڵدەگرت. ئێستاش دەیهەویست ئەوە بە کیتی بڵێ.

کیتی نێوچاوانی گرژ کرد و خۆی ئامادەکرد تاکوو هەوڵ بدات لە قسەکانی تێبگات، بەڵام کە لەڤین دەستیکرد بە روونکردنەوە کیتی لەڕێوە لە مەبەستەکەی گەیشت.

ـ تێدەگەم. مرۆڤ دەبێ لە مەبەستی خەنیمەکەی بگات و ئەو بیرەی کە بەلایەوە گرینگە بێزانێ و ئەو کاتە دەتوانێ کە...

کیتی بە باشی لە مەبەستەکەی لەڤین گەیشت و ئەوەی ئەو بە ناتەواوی دەریبڕیبوو بە روونی شرۆڤەی کرد. لەڤین گەشایەوە و زەردەیەکی گرت و تێپەڕین لەو باسە ئاڵۆز و چروپڕەی پێستسۆڤ و براکەی ئەویش بەو راڤەکردنە ورد و روونەی کیتی کە بە چەند وشە کۆتاییی بەو بیرۆکە پێچەڵاوپووچ و فەلسەفییە هێنا، بەلای لەڤینەوە سەرسووڕهێنەر بوو.

ئیشچرباتسکی بە تەنیا بەجێی هێشتن و کیتی چووە پشت مێزێك کە بۆ یاریی پاپەزێن ئامادەکرابوو، دانیشت و لەتکە گەچێکی بە دەستەوە گرت و دەستیکرد بە کێشانی گردی لەسەر ماهووتە سەوز و نوێیەکە.

ئەوان درێژەیان بەو باسوخواسەدا کە سەبارەت بە خوێندنی ژنان لەسەر مێزی نانخواردن دامەزرابوو. لەڤین لەگەڵ داریا ئەلکساندرۆڤنا هاوڕا بوو کە دەیگوت ئەو کچەی کە مێردی نەکردووە دەبێ لە ماڵدا کاری ژنانە بۆخۆی پەیدابکات و هیچ ماڵێك نییە، کە پێویستی بە یارمەتی ژنان نەبێ و لە هەموو بنەماڵەیەکی هەژار و دەوڵەمەنددا راهێنەر و پەرستارێکی ژن لە خزموکەس یان مزەوەر هەن و دەبێ بشبن.

کیتی سوورهەڵگەڕا، بەڵام سادقانە و بوێرانە چاوی لە لەڤین بڕی و گوتی: نا، رەنگە بارودۆخی ژیانی ئەم کچە یان ئەوی تر جۆرێك بێ کە نەتوانێ بەبێ هەستکردن بە شەرمەزاری بچێتە نێو بنەماڵەیەکەوە و خۆی...

لەڤین وەڵامی دایەوە: بەڵێ، بەڵێ... بەڵێ، هەق بە تۆیە.

تەواوی ئەو شتانەی کە پێستسۆڤ لەسەر نانخواردن سەبارەت بە ئازادیی ژنان باسی دەکرد تازە تێگەیشت و تەنیا بەو هۆیەش تێگەیشت کە ترس و سووکبوونی بە کچی مانەوەی لە

دڵی کیتیدا دیت و چونکە خۆشیدەویست ترسی ئەو خەفەت و سووکییەی هەست پێکرد و خێرا لە قسەی خۆی پاشگەز بۆوە و بەڵگەکانی خۆی بە نابەجێ زانی.

ماوەیەك هەردوو بێدەنگ بوون و کیتی بەردەوام خەریکی کێشانی گردی بوو لەسەر ماهووتی مێزەکە. چاوی بە ترووسکەیەکی نەرم دەدرەوشانەوە. لەڤین ئێستا خۆی بە پیڕەو و گوێڕایەڵی ئەو دەزانی و فراوانبوونی ئاسۆی بەختەوەریی لە تەواوی وجوودی خۆیدا هەست پێدەکرد.

کیتی گوتی: بڕوانە، تەواوی سەر مێزەکەم خەتخەتی کرد ـ گەچەکەی لەولاوە داونا و تەکانێکی لە خۆیدا دەتگوت دەیهەوێ هەستێ.

لەڤین بە ترسەوە لە دڵی خۆیدا گوتی «من بە تەنیا... بەبێ ئەو... چیبکەم؟» گەچەکەی هەڵگرت و لە پشت مێزەکە دانیشت و گوتی: پەلە مەکە، زۆر لەمێژە دەمهەوێ پرسیارێکت لێبکەم.

کیتی بە نیگایەکی ترساو و پڕ لە مێهرەبانییەوە راست چاوی لە چاوی لەڤین بڕی.

ـ فەرموو، پرسیارەکەت بکە.

ـ ئەها، ئەم پرسیارەی من ـ پیتی یەکەمی وشەی پرسیارەکەی خۆی لەسەر مێزەکە نووسیی: ك. و. د. ك. ن. م. ئـ. ب. ك. ە. ك. ن. ی. ە. ئـ. ك. ـ مەبەستی ئەمەبوو: کاتێك وەڵامت دامەوە کە ناگونجی، مەبەستتان ئەوەبوو کە هیچ کات ناگونجێ یان هەر ئەو کاتە ـ زۆرمەحاڵ بوو کە کیتی بتوانێ ئەو مەتەڵە گرانە هەڵدا. بەڵام لەڤین وای چاو تێبڕیبوو کە دەتگوت ژیانی بەوەوە بەستراوە کە ئەم پیتانە بۆ کیتی وێژا هەیە یان نا.

کیتی بە نیگایەکی بنەوشی لێیدەڕوانی، پاشان ناوچاوانی گرژی خۆی نا بە دەستییەوە و دەستیکرد بە خوێندنەوە. جارجار سڵۆکانە چاوی لێدەکرد کە ئایا ئەوەی بیری لێدەکاتەوە راستە؟

سوورهەڵگەڕا و گوتی: تێگەیشتم.

لەڤین پرسیی: کام لەو پیتانە راستە؟ ئەمە؟ ـ قامکی لەسەر پیتی «ە» دانا کە ماناکەی «هیچ کات» بوو.

کیتی گوتی: مانای ئەو پیتە «هیچ کاتە.» نا، ئەوە راست نییە.

لەڤین مێزەکەی پاك کردەوە و گەچەکەی دایەدەست کیتی، ئەویش ئەم پیتانەی نووسی: ئـ. ك. ن. و. ت. ب.

دالی کاتێك ئەو جووتەی پێکەوە دی، کە دیتی کیتی گەچی بەدەستەوە گرتووە و بە بزەیەکی شەرمنانە و شیرینەوە سەری بەرزکردۆتەوە و چاو لە لەڤین دەکات و روخساری سەرنجڕاکێشی لەڤینیشی دی کە لەسەر مێزەکە سەری داخستووە و نیگای گەرم و پڕ لە یاوی جارێك لە مێزەکە و جارێك لەو دەبڕێ" ئەو خەمە قورسەی کە دوای ئاخافتن لەگەڵ کارنین لەسەر دڵی قورساییی دەکرد لە بیری چۆوە. روخساری لەڤین لەناکاو درەوشایەوە. تێگەیشتبوو. مانای پیتەکانی کیتی ئەمە بوو: ئەو کاتە نەمدەتوانی وەڵامێکی تر بدەمەوە.

لەڤین شەرمێونانە چاوی پڕ لە پرسیاری لەسەر روخساری کیتی گیرسایەوە.

ـ تەنیا ئەو کاتە؟

بزەی کیتی وەڵامی دایەوە: بەڵێ.

لەڤین دیسان پرسیی: ئەی... ئێستا؟

ـ بیخوێنەوە. من ئارەزووی خۆم دەنووسم. گەورەترین ئارەزووم ـ پیتی یەکەمی ئاواتی خۆی نووسی: «خ. ب. ئـ. ر. ل. ب. خ. ب. ل. خ.» مانای ئەو پیتانە ئەمەبوو: خۆزگە بتوانیبایە ئەوەی رابڕد لە بیری خۆتی بەریتەوە و لێم خۆشبی.

لەڤین گەچەکەی بە قامکی لەرزۆك و بێهێزی هەڵگرت و شکاندی و پیتی یەکەمی ئەم وشانەی نووسی: هیچ نەبووە کە لە بیری ببەمەوە یانی لێت خۆش بم. من قەتم دەست لە خۆشویستنی تۆ هەڵنەگرتووە.

کیتی بە زەردەخەنەیەکی شیرینەوە چاوی لە چاوی بڕی.

لەسەرخۆ گوتی: تێگەیشتم.

لەڤین دانیشت و رستەیەکی درێژی نووسی: کیتی لە هەمووی گەیشت و نەیپرسی راست تێگەیشتووە یان نا، گەچەکەی لێ وەرگرت و خێرا وەڵامی دایەوە.

لەڤین ماوەیەك نەیتوانی ئەوەی نووسیوێتی تێبگات و چەند جار چاوی لە چاوی کرد. لە خۆشیانا بەرچاوی تاریك بووبوو. بە هیچ شێوەیەك نەیدەتوانی ئەو وشانەی کە مەبەستی کیتی بوو لەگەڵ ئەو پیتانە پێوەندی بدات. بەڵام لە چاوانی جوان و گەش و شیرینیدا ئەوەی دەیویست دییەوە. سێ پیتی نووسی: بەڵام هێشتا خەریکی نووسین بوو کیتی لەسەر دەستییەوە مەبەستی ئەوی هەتا کۆتایی خوێندەوە و وەڵامەکەی نووسییەوە: بەڵێ!

پرێنسی گەورە چوو بۆ لایان و پرسیی: یاریی نووسیارێن دەکەن؟ بەڵام ئەگەر دەتهەوێ فریای شانۆ بکەوی دەبێ بڕۆین.

لەڤین هەستا و کیتیی هەتا بەردەرگاکە بەڕێ کرد.

لەم وتووێژەدا هەموو شتێك گوترابوو. کیتی پێیگوتبوو کە خۆشی دەوێ و بە باوکی و دایکی دەڵێ کە سبەینێ بەیانی لەڤین دەچێ بۆ ماڵی ئەوان.

## چاردە

کاتێك کیتی ڕۆیشت لەڤین بە تەنیا مایەوە، ڕۆیشتنی کیتی ئاراوقارای لێهەڵگرتبوو، دڵی لەوانەبوو سینگی کون بکات، بە ئاواتەوە بوو هەرچی زووتر بەیانی بێت و دیسان چاوی بە کیتی بکەوێتەوە و پێوەندیی خۆی لەگەڵیدا بۆ هەتا هەتا گرێ بدات، بەجۆرێك کە ئەوەندە لەو چاردە کاتژمێرەی کە مابووی بۆ بەیانی دەترسا و دەبوو ئەو ماوەیە دوور لە خۆشەویستەکەی بێ، ئەوەندە لە مەرگ نەدەترسا. هەستی دەکرد ناچارە لەگەڵ کەسێك بێت و قسە بکات و هەرچۆنێکە تەنیا نەکەوێت و کاتەکان هەڵخەڵەتێنێ. ستیپان ئارکادیچ بۆ ئەو باشترین هاودەم بوو بەڵام ئەو ڕۆیشت و گوتی لە شوێنێك بانگهێشتن کراوە ـ لە ڕاستیدا دەچوو بۆ باڵە. لەڤین تەنیا فریاکەوت پێیبڵێ کە زۆر دڵخۆشە و ئەوی خۆش دەوێ و هەتا ماوە ئەو چاکەیەی لە بیرناچێتەوە. ڕوانین و بزەی ستیپان ئارکادیچ لەڤینی حاڵی کرد کە ئەو جۆرەی کە پێویستە تێگەیشتووە.

ستیپان ئارکادیچ دەستی لەڤینی گوشی و بە نەرمی گوتی: چاکە، ئیتر بیر لە مردن ناکەیتەوە؟

لەڤین وەڵامی دایەوە: نا.

داریا ئەلکساندرۆڤناش کاتی ماڵاوایی بە لەبزێك کە زیاتر لە پیرۆزبایی دەچوو گوتی: زۆر خۆشحاڵم کە دیسان لەگەڵ کیتی یەککەوتن، هاوڕێی لەمێژینە زۆر خۆشەویستە و جێگای ڕێزن.

بەڵام ئەم قسەیەی داریا ئەلکساندرۆڤنا لە دڵی لەڤین گران هات. داریا ئەلکساندرۆڤنا نەیدەتوانی تێبگات کە حاڵی ئەو چەند پەرۆشە. ئەو کێشە ڕۆحییە شتێك نەبوو کە ئەو هەستی پێبکات و ئەو نەدەبوو ئیجازە بەخۆی بدات کە سەبارەت بەوە قسە بکات.

لەڤین ماڵاوایی لێکردن بەڵام بۆ ئەوەی بە تەنیا نەبێ لەگەڵ براکەی خۆی لەدەسك نا.

ـ تۆ دەچی بۆ کوێ؟

ـ لە شۆڕای شار، کۆبوونەوەم هەیە.

ـ منیش لەگەڵ خۆت دەبەی؟

سرگی ئیڤانۆڤیچ بە پێکەنینەوە گوتی: کێشەیەك نییە، وەرە با بڕۆین. ئەمڕۆ بۆ ئاوات لێهاتووە؟

لەڤین پەنجێرەی فایتوونەکەی کردەوە و گوتی: پێتناخۆش نییە. پەنجێرەکە بکرێتەوە؟ هەواکەی زۆر قورسە. پرسیت بۆ ئاوام لێهاتووە؟ بەختەوەر بووم. زۆر بەختەوەر بووم. تۆ بۆ تا ئێستا ژنت نەهێناوە؟

سرگی ئیڤانۆڤیچ زەردەیەکی گرت و گوتی:

ـ زۆر خۆشحاڵم. ئەو وادیارە زۆر کچێکی با...

بەڵام لەڤین نەیهێشت رستەکەی تەواوبکات و ملیوانەی باڵتە چەرمەکەی ئەوی بە هەردوو دەستی گرت و هەڵیداوە بۆ بەرچاوی و گوتی: قسە مەکە، قسە مەکە.... هیچ مەڵێ ـ رستەیەك کە براکەی دەیویست دەربیڕێ، پێیوابوو زۆر دزێو و سووکە و لەگەڵ شیرینکامییەکەی ئەو ناسازگارە.

سرگی ئیڤانۆڤیچ کەوتە پێکەنین، پێکەنینێکی پڕنەشە کە زۆر بە دەگمەن هەڵدەکەوت ئاوا قاقا بکێشێ.

ـ باشە، لانیکەم دەتوانم بڵێم بەو بۆنەوە زۆر خۆشحاڵم.

لەڤین گوتی: ئەوەش سبەینێ دەتوانی بیڵێی. ئێستا ئیتر هیچ مەڵێ، زمانت نەگەڕێ. قڕوقەپ[١٧٥] ـ دیسانیش ملیوانەی پان و تیسکنی باڵتەکەی کازنێشۆڤی هەڵکێشا بۆبەر دەموچاوی و گوتیشی: زۆرم خۆش دەوێی. دەی، گوتت دەتوانم بێم بۆ کۆبوونەوەکەتان.

ـ ئەی بۆ نایەی، هیچ گرفتێك نییە.

لەڤین کە لە خۆشیانا پێی وەعەرز نەدەکەوت و زەردە لە لێوی دوورنەدەکەوتەوە پرسیی: ئەمڕۆ باسەکەتان لەسەر چییە؟

گەیشتنە شوێنی کۆبوونەوەکە. لەڤین گوێی لە نووسیاری کۆبوونەوەکە گرت کە راپۆرتی دانیشتنەکەی پێشووی بە زمانێکی دەمبلێ دەخوێندەوە. دیاربوو نووسیار خۆی ئەوەی دەیخوێنێتەوە تێیناگات. بەڵام لەڤین بە روخساریدا بۆی دەرکەوت کە پیاوێکی باش و دڵۆڤان و چاکەخوازە. ئەوەش بەوەدا دیاربوو کاتێك دەقەکەی دەخوێندەوە شەرمی دەکرد. پاشان مژولیایش دەستی پێکرد. باسەکە لەسەر تەرخانکردنی بووجە بۆ کار و کێشانی بۆڕی بۆ فلان شوێن و ئەو قسەوباسانە بوو. سرگی ئیڤانۆڤیچ هێندێ بابەتی باس کرد و لەگەڵ دووکەس لە ئەندامان کەوتە راوێژ و ماوەیەکی زۆر بە لەبزێکی سەرکەوتووانە دوا، ئەندامێکی تر کە شتێکی لەسەر پسوولەیەك نووسیبوو سەرەتا بە رووپامایی و دواتر بە چەند رستەی تاڵ و ژەهراوی بەڵام بە لەبزێکی نەرم و بە ئەدەبانەوە وەڵامی دایەوە، دوای ئەویش سڤیاژێسکی، کە ئەویش لە دانیشتنەکەدا

---

١٧٥- وەرگیراو لە چیرۆکی «یادداشتەکانی شێتێك» بەرهەمی گۆگۆل.

ئامادەبوو، بە چەند وتەی ورد و ڕێکوپێك و بە لەبزێکی پڕ نەزاکەتەوە کە نیشاندەری شانوشکۆی ئەو بوو بیروڕای دەربڕی. لەڤین گوێی بۆ هەموو قسەکان ڕاگرت و بە ڕوونی دەیدی کە تەرخانکردنی بووجە و کێشانی بۆڕی هیچ کام ئەو گرنگایەتییەیان نییە کە ئەو بیری لێدەکردەوە و ئەندامانی کۆڕەکەش لە یەکتر زویر نەبوون و هەموویان کەسانێکی دڵپاك و چاکەخوازن و کارەکان هەمووی بە ئاسانی و ڕاوێژ و هاوفیکریی ئەوان بە جوانی دەچێتە پێشێ. هیچ کامیان گرفتی بۆ کاری ئەوی دیکە دروست نەدەکرد و تێکڕا لە ئیشی خۆیان ڕازی بوون. لە هەمووی سەرنجڕاکێشتر بۆ لەڤین ئەوەبوو کە ئەو ڕۆژە دەتگوت قووڵاییی ناخی هەموویان بە ڕوونی دەبینێ و لە ڕێگەی هێندێ دیاردەی چکۆڵەوە کە پێشتر شاراوە بوون ڕێچکەیەکی لە ناخیاندا کردۆتەوە و بە ڕوونی دەیدی کە هەموویان دڵپاکن، بەتایبەت ئەو ڕۆژە کە هەستی دەکرد هەموویان ڕێزی بۆ دادەنێن و خۆشیان دەوێ، بەوەشدا دیاربوو کە هەموو ئەندامان بە نەرمی لەگەڵی دەدوان و تەنانەت نەناسیاوەکانیش بە چاوێکی خۆمانە لێیان دەڕوانی.

سرگی ئیڤانۆڤیچ لێیپرسی: دەی، چۆنبوو؟ لەو هاتنەت ڕازیی؟

ـ زۆر ڕازیم، قەت پێموانەبوو تا ئەو ڕادەیە بەکەڵك بێ، بێوێنە بوو.

سیڤیاژیسکی هات بۆ لای و بۆ مەیلکردنی چایی بانگهێشتنی کرد. لەڤین تێنەدەگەیشت و نەیدەتوانی وەبیر خۆی بێنێتەوە کە ئەو ڕۆژە بە چ هۆیەك لە سڤیاژێسکی دڵمەند بووە و چ چاوەڕوانییەکی لێی بووە و لە وجوودی ئەودا نەیدیوەتەوە. بۆی دەرکەوت کە ئەو پیاوێکی بەهۆش و فامیدە و زۆر میهرەبان و چاکەخوازە.

لەڤین گوتی: ئا، زۆرم پێخۆشە! ـ هەواڵی ژنەکەی و ژنخوشکی لێپرسی و وەبیرهاتنەوەی بیرۆکەکانی خۆی نەقڵێکی سەیرە. چونکە وەبیرهاتنەوەی ژنخوشکی سڤیاژێسکی وایلێکرد کە بیر لە ژنهێنان بکاتەوە و پێیوابوو کە ژنەکەی و ژنخوشکی سڤیاژێسکی لە هەموو کەس باشتر لە بەختەوەریی ئەو دەگەن و هەر بەو هۆیەش بە خۆشحاڵییەوە چوو بۆ ماڵی ئەوان.

سڤیاژێسکی هەواڵی کاروبارەکانی گوندی لێپرسی و وەك هەمیشە لێی ڕوون بوو کە بە هیچ شێوەیەك ناگونجێ شتێك بێنیتە بەرچاوت کە ئەو شتە لە ئەورووپا پەیدا نەبێت و دایاننەهێنابێ. بەڵام ئێستا ئەو قسانە بۆ لەڤین هیچ تاموچێژێکیان نەبوو، بە پێچەوانە، هەستی دەکرد کە سڤیاژێسکی ڕاست دەکات و ئەوانە هیچ کام گرینگایەتییان نییە و دەیدی کە سڤیاژێسکی چەندە بە وردی و بە نەرمی خۆی لە قسە و بیرۆکەکانی خۆی دەبوارد. خاتوونەکانی ماڵی سڤیاژێسکی زۆر سەروڕووخۆش و مێهرەبان بوون. لەڤین پێیوابوو ئەوانیش ئێستا لە هەموو شتێك ئاگادارن و ئەو هەڵبژاردنەی ئەویان بەدڵە و تەنیا لەبەر وردبینی و هەمەتی ئەو باسی ناکەن. دوو سێ سەعات لەوێ دانیشت، لە زۆر بارانەوە قسەیان کرد و تەنیا شتێك کە بەلایدا نەچوون ئەو حەزە دەروونییە بوو کە لە نێو ڕۆحیدا شەپۆلی

دەدا. بیری نەدەکردەوە و نەشیدەزانی کە تەواویانی بێتاقەت کردووە و زۆری لە کاتی خەوەکەیان لاداوە. سڤیاژێسکی بە باوێشکدان ئەوی هەتا بەرهەیوانەکە بەڕێ کرد و سەری لەو هەموو نەشە و دڵخۆشییەی دۆستەکەی سوور مابوو.

سەعات لە یەکی دوای نیوەشەوی لادابوو. لەڤین گەڕایەوە بۆ هوتێل. کە بیری دەکردەوە هەتا دە ساعاتی دیکە دەبێ بە تەنیا بێت، بێئۆقرەیی تەنگی بە رۆحی هەڵدەچنی و خەمی دنیا لە دڵی بار دەبوو. پێشخزمەتی نۆبەدار مۆمەکانی بۆ هەڵکرد و دەیویست بڕوات بەڵام لەڤین رایگرت. ئەو پێشخزمەتە کە ناوی یەگۆر[176] بوو و پێشتر لەڤین سەرنجی نەدابوویە پیاوێکی زۆر باش و زیرەك بوو لەوەش گرینگتر زۆر دڵۆڤان بوو.

ـ یەگۆر تۆ زۆرت بێخەوی کێشاوە، بەخەبەرمانەوە زۆر ناخۆشە؟

ـ چ بکەین؟ کاری ئێمە هەر ئەوەیە ئیتر. خزمەتکردن لە ماڵی ئاغاوات ئاسانترە، بەڵام بەقەد ئێرە هەقدەستمان وەگیر ناکەوێ.

مەعلووم بوو کە یەگۆر سێ کوڕ و کچێکی هەیە. کچەکەی بەرگدرووە و یەگۆر دەیویست بیدات بە کوڕێکی چەرمدروو کە کرێکارێکی گەنج بوو.

لێرەدا لەڤین بیروڕای خۆی لەوبارەوە دەربڕی و گوتی کە لە ژیانی هاوبەشدا لە هەموو شتێك گرینگتر ئەشق و خۆشەویستییە و ئەگەر ئەشق لە گۆڕێدا بێ هەمیشە بەختەوەری لەگەڵ خۆی دێنێ، چونکە بەختەوەری هەمیشە لە ناخی مرۆڤ خۆیدایە.

یەگۆر بە وردی گوێی بۆ قسەکانی لەڤین شل کردبوو و دیاربوو بە باشی فیکری ئەو دەخوێنێتەوە بۆ پەسندکردنی قسەکەی لەڤین شتێکی گوت کە بە هیچ شێوەیەك ئەو چاوەڕوانییەی لێی نەبوو. گوتی کاتێك کە لە خزمەت ئەربابە پێشووەکاندا بووە کە هەموویان زۆر مێهرەبان و ئاکارجوان بوون، زۆریان لێڕازی بووە، ئێستاش لە ئەربابەکەی رازییە، ئەگەرچی پیاوێکی فەڕەنسییە.

لەڤین لە دڵی خۆیدا گوتی «چەندە پیاوی چاکە!»

ـ دەی، یەگۆڕ پێمبڵێ بزانم، کاتێك ژنت هێنا زۆرت خۆش دەویست؟

یەگۆر وەڵامی دایەوە: ئەیچۆن، مەگین دەکرێ پیاو ژنەکەی خۆی خۆش نەوێ؟

لەڤین دیتی کە یەگۆریش وەك ئەو دەردەڵ و حەزێکی دەروونی لە ناخیدا قوڵپە دەکات و دەیهەوێ دەروەکانی دڵی خۆی بۆ ئەو بکاتەوە.

---

176- Yegor

به چاوانی زیت و گەشەوە کە ترووسکەی حەزێك لە نێویاندا دەدرەوشایەوە دەستی پێکرد: ژیانی من ژیانێکی سەیر بوو. من لە منداڵییەوە... ـ دیاربوو نەشەی لەڤین، وەکوو باوێشك شوێنی لەسەر ئەویش داناوە.

بەڵام لەو کاتەدا زرەی زەنگێك هات و یەگۆر رۆیشت و لەڤین بە تەنیا مایەوە. نیوەرۆ شتێکیوای بۆ نەخورابوو و لە ماڵی سڤیاژێسکیش چایی خواربۆوە نەك شێو، لەگەڵ ئەوانەشدا نەیدەتوانی بیر لە شێو بکاتەوە. شەوی پێشوو خەو نەچووبووە چاوی بەڵام خەوی نەدەهات. هەوای ژوورەکەی فێنك بوو بەڵام هەستی دەکرد خەریکە لە گەرمانا دەخنکێ. هەردوو دەرییچەی پەنجێرەکەی کردەوە و لە پشت مێزی بەر پەنجەرەکە دانیشت. لە سەربانی پڕ لە بەفری بینای ئەوبەرییەوە خاچێکی نەخشاو و بە زنجیر رازاوەی کلێسەیەك دیاربوو، لە سەروو خاچەکەشەوە کەلووە سێ سووچی بە هەوسار ( ممسکالاعنە) و ئەستێرەی گرشەداری عارەبانەچی کە بەرەو تەشق دەرۆیشت. جارێك چاوی لە خاچەکە دەکرد و جارێکیش لە ئەستێرەکە. هەوای سارد و شێدار کە بە شێوەیەکی یەکهاوی دەهاتەژووریٚ پڕ بە سینگی هەڵیدەمژی و ئەو روخسار و بیرەوەرییانەش کە دەکەوتنە سەر لاپەڕەی خەیاڵی دەتگوت لە خەودا دەیانبینیٚ. سەعات لە سێی لادابوو کە پێیەکی لە داڵانەکەوە بیست و سەری بردە دەریٚ تاکوو بزانیٚ کێیە. میاسکینی قومارچی بوو کە لەڤین دەیناسی و تازە لە باشگا دەهاتەوە. لەڤین لە دڵی خۆیدا گوتی «قوڕبەسەری چارەڕەش!» فرمێسکی دڵسۆزی و خۆشەویستی دەرهەق بەو مرۆڤە بەدبەختە لە چاویدا قەتیسما. دەیویست لەگەڵی بدویٚ و دڵخۆشی بداتەوە، بەڵام وەبیری هاتەوە کە رووتو قووتە و تەنیا کراسێکی لەبەردایە، خێرا پاشگەز بۆوە و رۆیشت دیسان لەبەر پەنجێرەکە دانیشت تاکوو لەبەر شنەی ئەو هەوا ساردە، وەك ئەوەی خۆی لە رووبارێك هەڵکێشیٚ فێنك بێتەوە، چاوی لە وێنەی سەیری ئەو خاچە دەکرد کە بێدەنگ بوو بەڵام بۆ ئەو پڕ بوو لە مانا، هەروەها ئەو ئەستێرە پڕشنگدارە کە بەرەو پەڕپەڕۆچکە هەڵدەکشا. سەعات شەش تێپەڕیبوو کە خشوهۆڕ و تەقوکوتی گەسکلێدەران و تەرکشۆرانی هوتێل لە داڵانەکەوە هەستا و کەڵەزەنگی کلێسا ئیماندارانی بانگکرد بۆ نوێژ، لەڤین هەستی کرد کە سەرما وردە وردە خەریکە لەرزی لێدێنیٚ. پەنجەرەکەی پێوەدا دەست و دەموچاوی شۆرد و خۆی پۆشتە کردەوە و لە هوتێلەکە چووەدەریٚ.

# پانزده

شەقامەکان چۆڵ بوون. لەڤین رۆیشت بۆ ماڵی ئیشچر باتسکی. دەروازەی گەورەی ماڵیّ داخرابوو و هەموو شوێنێك کڕ و بێدەنگ. گەڕاوە بۆ هوتێل و چووە ژوورەکەی خۆی و داوای قاوەی کرد. پێشخزمەتی رۆژ کە ئیتر یەگۆر نەبوو، قاوەی بۆ هینا. لەڤین دەیویست لەگەڵ ئەویش سەری قسە دامەزرێنیّ بەڵام زەنگیان لێدا و پێشخزمەت ناچاربوو بڕوات. لەڤین ویستی قاوەکە بخواتەوە و لەتێکی نانە ناسکە نایە دەمی بەڵام دەتگوت دەمی لەگەڵی بێگانەیە و نەیدەزانی چ بکا، ئیشتیای نەیبرد و لە گووپی دەریهێنا و باڵتەکەی لەبەرکرد و دیسان لە هوتێل وەدەر کەوت تاکوو لە نێو شار پیاسە بکات. هێشتا نەبووبووە سەعات دە کە دیسان گەیشتەوە بەر پلیکانەکانی ماڵی ئیشچر باتسکی. خزمەتکارەکان تازە لە خەو هەڵدەستان و ئاشپەز خەریکبوو بۆ کرینی کەلوپەل دەچوو بۆ بازاڕ. ناچاربوو لانیکەم دوو سەعاتی دیکە خۆی بخافڵێنیّ.

لەڤین دوێشەو و ئەمڕۆ بەیانیش دەتگوت لە خەو و بێخەبەریدا رایبواردووە و هەستی دەکرد کە لە هەلومەرجی ژیانی ماددی چۆتە دەریّ و خۆی دەرباز کردووە. رۆژێکی تەواو هیچی نەخواردبوو و دوو شەو بوو خەو نەچووبووە چاوی. چەند کاتژمێر بە لیباسی تەنکەوە لەبەر سەرما گەڕابوو، ئێستاش نەك هەر بە دەماختر و لەشساغتر بوو لە هەموو کاتێك، بەڵکوو هەستیدەکرد لە بەندی جەستە ئازاد بووە: بە چالاکی و بیّ ئەوەی هێز بداتە سەرماسوولکەکانی لاقی بەرێدا دەڕۆیشت و هەستی دەکرد تواناییی هەموو کارێکی هەیە. سوور دەیزانی ئەگەر پێویست بێت دەتوانیّ هەڵفڕیّ یان دیواری ماڵێك لە بناغە دەرهێنیّ. بە شەقامەکاندا پیاسەی دەکرد و بەردەوام چاوی لە کاتژمێرەکەی دەکرد و لە دەوروبەری خۆی دەڕوانی.

ئەوەی لەو سەعاتەدا لە شەقامەکان چاوی پێیکەوت دوای ئەو رۆژە ئیتر چاوی پێینەکەوتەوە. بەتایبەت ئەو منداڵانەی دەچوون بۆ قوتابخانە و ئەو کۆترە شینکانەی لە سەربانی ماڵەکان دەفڕین و دەهاتن لە سەر شۆستەکان دەنیشتنەوە و ئەو نانە سپی و ناسکانەی کە ئاردیان لیّ پڕژاندبوون و

دەستێکی نادیار لەسەر پێشخوانی دووکانەکە هەڵیدەچنین هەموو شوێنێکی قورسیان لەسەر دانابوو. ئەو نانانە و کۆترەکان و ئەو دوو منداڵە لەبەر چاوی بوونەوەری سەر زەوی نەبوون. ئەوانە هەمووی لە چرکەیەکدا رووی دابوو. کورێژگەکە هەڵاتبوو بۆ لای کۆترەکان و سەری بەرزکردبۆوە و بە پێکەنینەوە چاوی لە چاوی ئەم کردبوو، کۆترەکانیش لە شەقەی باڵیان دابوو و بە نێو پڕووشەی بەفر و ترووسکەی خۆری بەیانیدا هەڵفڕیبوون، لە دەلاقەی نانەواخانەکەوە بۆنی نانی گەرمە تەندوور دەهاتەدەرێ و دەستەوارێك نانی سپی و گەلاگەلا لەسەر پێشخوانی دووکانەکە بۆ راکێشانی مشتەری داندرابوو. جوانیی هەموو ئەوانە هێندە نائاسایی بوون کە لەڤین لە خۆشیانا پێدەکەنی و دەشگریا. رێگاکەی لە خۆی دوور خستەوە و مەودایەکی دووری لە کۆڵانەکانی گازتنی[177] و کیسلۆڤکا[178]وە بڕی و بۆ لای هۆتێلەکە و کاتژمێرەکەی لە بەردەمی دانا و چاوەڕوانی نیوەڕۆ ما. دەتگوت هەر خولەکێك سالێکە و دوایی نایە. لە ژوورەکەی تەنیشتەوە باسی مەکینە و فێڵوتەڵەکە و ساختەچێتییان دەکرد و دەنگی کۆخەی تازە لەخەو هەستاوێك دەهاتە گوێ. ئەوان نەیاندەزانی مێهەنگی کاتژمێر خەریکە لە دوازدە نزیك دەبێتەوە. مێهەنگ گەیشتە سەر دوازدە. لەڤین لە هوتێلەکە هاتەدەرێ. عارەبانەچی دەتگوت هەموو ئاگادارن، بە روخسارێکی کراوە و زەردە تێزاوەوە دەوریان دا. کەوتنە دەمەقاڵێ لەگەڵ یەکتر و هەرکام بە عارەبانەی خۆیاندا هەڵدەگوت. لەڤین یەکیانی هەڵبژارد و بۆ ئەوەی ئەوانی دیکە دڵمەند نەبن بەڵێنی پێدان لە داهاتوودا کار بە هەموویان دەکات و بە عارەبانەچییەکەی گوت بەرەو ماڵی ئیشچر باتسکی وەڕێبکەوێت. عارەبانەچی بەو ملیوانە سپییەوە کە لە ژێر کەڵپۆسەکەیەوە هاتبووە دەرێ و مله سوور و ئەستوورەکەی رێك گوشیبوو زۆر سەرنجڕاکێش بوو. عارەبانەکە لە عارەبانەی ئاسایی بەرزتر بوو و زۆر خێراش دەڕۆیشت و لەڤین دواتر وێنەی ئەوی هەر نەدییەوە. ئەسپەکەی رەسەن بوو و هەوڵی دەدا بە چوارناڵ بڕوات بەڵام ئەوەندە بە نەرمی دەڕۆیشت دەتگوت راوەستاوە. عارەبانەچی شارەزا بوو و راست رۆیشت بۆ بەر دەرگای ماڵی ئیشچر باتسکی، بە رێزێکی زۆرەوە هەنیشکی بە موسافیرەکەی هەڵێنا و جلەوی ئەسپەکەی کێشا و گوتی: «هۆئششش» تۆزێ کشایە دواوە تاکوو راست لەبەر قالدرمەکان رایگرێت. دەرگاوانی ماڵی ئیشچر باتسکی وێدەچوو خەبەری لە هەموو شتێك هەبێت. ئەوەش بەو بزەیەی نیشتبووە سەر لێوی و بە روانین و قسەکەیدا دیاربوو کە گوتی:

ـ لەمێژە تەشریفتان نەهێناوە بۆ ئێرە، کۆنستانتین دیمیتریچ.

177- Gazetny

178- Kislovka

نەك هەموو شتێكی دەزانی بەڵكوو بە بڕوای لەڤین دەیویست پێبكەنێ و ددانی بە خۆیدا دەگرت بۆ ئەوەی دڵشادیی خۆی بشارێتەوە. لەڤین كە چاوی لە چاوە پیر و میهرەبانەكانی كابرای دەرگاوان كرد تەنانەت دیمەنێكی تازەی لە شیرینكامیی خۆی دۆزییەوە.

ـ لە خەو هەستاون؟

ـ فەرموون ـ كە لەڤین گەڕایەوە كڵاوەكەی لێ وەرگرێتەوە كە دابوویە دەستی گوتی: لێیگەڕێ با لێرە بێ ـ ئەوەش خۆی مانایەكی هەبوو.

پێشخزمەت پرسیی: دەفەرمووی ئاگاداریان بكەم كە بۆ دیدەنیی كێ هاتووی؟

ئەو پێشخزمەتە ئەگەرچی لاو بوو و تازە لەوێ دامەزرابوو، گەنجێكی رێكوپێك و رووخۆش بوو و دیاربوو زۆریش تێگەیشتووە.

لەڤین گوتی: پرێنس... پرێنسس... پرێنسسی چكۆڵە...

یەكەم كەس كە چاوی پێیكەوت مادموازێل لینۆن بوو. لەوسەری تەلارەكەوە دەهات چینی كەزیە و تەواوی روخساری دەدرەوشایەوە. تازە دەستی كردبوو بە قسەكردن لەگەڵیدا كە لە ناكاو ترپەی پێ و خشەخشی داوێنی كراسێك هات و لەڤین ئیتر مادموازێل لینۆنی نەدی و ترسێكی پڕ لە شادی و هەستی نزیكبوونەوە بەختەوەری لە چاوانیدا خۆی نواند. مادموازێل لینۆن بە لەز رۆیشت بۆ لای دەرگاكەی تر و بە تەنیا بەجێی هێشت. لەگەڵ چوونەدەرەوەی ئەو، ترپەی سووك و زۆر خێرای هەنگاونان بەسەر چێوفەرشی تەركی داڵانەكەدا هاتە گوێی و سۆمایی چاوی، ژیانی، خۆی، باشتر لە خۆی، ئەوەی لێیدەگەڕا و ماوەیەكی درێژ بە ئاواتییەوە بوو، بە هەنگاوی توند لێی نزیك دەبۆوە. بەڕێدا نەدەڕۆیشت بەڵكوو بە وزەیەكی نادیارەوە بۆ لای ئەو دەخوشی.

لەڤین تەنیا چاوە گەش و راستوێژەكەی ئەوی دەدی كە ترسی شادی و ئەشقێك لە نێویدا شەپۆل دەدات و دڵی خۆشی كەلاورێژە لەو ئەشق و شادییە. تروسكەی ئەو چاوانە جارلەگەڵ جار نزیك دەبۆوە و خەریكبوو بە تروسكەی خۆی چاوە شەیداكانی ئەوی وەشەوارە دەخست. كیتی ئەوەندەی لێهاتە پێشێ كە داوێنی كراسەكەی لە چۆكی لەڤین دراو هەردوو دەستی بەرزبوونەوە و لەسەر شانی لەڤین نیشتنەوە.

كیتی ئەوەی دەیتوانی كردبووی. بە لەز چووبوو بۆ لای و بە شەرم و شادییەكی زۆرەوە دڵ و گیانی خۆی پێشكەش كردبوو. لەڤین لە باوەشی گرت و لێوی لەسەر لێوە ماچخوازەكانی دانا.

کیتیش شەوی رابردوو خەو نەچووبووە چاوی و بەیانیش لە چاوەڕوانیی ئەودا چرکە و خولەکی بژاردبوو. دایکی و باوکی بەبێ دڵلەدڵدان رازی بوون و دڵشادیی کچەکەیان دڵی لێورێژ کردبوون لە شادی. کیتی چاوەڕوانی ئەو بوو. دەیویست یەکەم کەس خۆی بێ هەواڵی بەختەوەریی خۆی و ئەوی پێڕادەگەیێنێ. خۆی ئامادەکردبوو کە بە تەنیا بچێت بۆ پێشوازیی و زۆری ئەو فیکرەی خۆی بە باش دەزانی و لەلایەکیشەوە زۆری شەرم دەکرد و خۆشی نەیدەزانی چ بکات. ترپەی پێ و قسەکردنەکەی بیستبوو لە پشت دەرگاکە چاوەڕێ راوەستابوو، کە مادموازێل لینۆن بڕوات. مادموازێل لینۆن رۆیشت و ئەو بێ ئەوەی بیری لێبکاتەوە یانی هەڵیسەنگێنێ کە چ بکات و چۆن بکات خۆی خستە باوەشی لەڤین و ئەوەی کردی کردی.

دەستی لەڤینی گرت و گوتی: وەرە با بچین بۆ لای دایەگیانم. لەڤین تا ماوەیەك حەپەسابوو و نەیدەزانی چی بڵێ و ئەوەش نەك بە هۆی ترسێکەوە بێ کە لە دڵیدا سەری هەڵدابوو، یان لەوە ترسابێ بە قسەکردن شکۆی ئەو هەستە بەرزەی خۆی زایە بکات، بەڵکوو بەو هۆیە بوو کە هەرجارێك دەیویست شتێك بڵێت و رازی دڵی خۆی دەربڕێت هەستی دەکرد کە فرمێسکی شادی لە چاوی دەزێ. دەستی گرت و ماچی کرد.

ئاخری بە دەنگێکی گڕ گوتی: یانی ئەمە راستەقینەیە؟ من خەون نابینم؟ ناتوانم باوەڕ بکەم کە تۆ منت خۆش دەوێ.

کیتی بەو «تۆ»یە و شەرمێونیی لەڤین کە چاوی لە چاوی بڕیبوو گرژییەوە.

بە ئەسپایی و لەبزێکی مانادارەوە گوتی: بەڵێ، زۆر بەختەوەرم.

کیتی بێ ئەوەی دەستی ئەو بەربدات بەرەو ژووری میوانداری هەنگاوی نا.

پرێنسس کە چاوی پێیان کەوت دڵی پڕبوو و فرمێسك بە چاویدا هاتە خوارێ، بەڵام خێرا پێکەنی و بە هەنگاوێکی خێرا و بەهێز کە لەڤینی تووشی سەرسووڕمان کرد هات بۆ لایان، سەری لەڤینی بە هەردوو دەستی گرت و نێوچاوانی ماچکرد و بە فرمێسکی خۆی روومەتی ئەوی تەڕکرد.

ـ دەی، کەوایە هەموو شتێك تەواوبوو! چەندەم پێخۆشە، کیتیی منت خۆش بوێ. کیتی، زۆر دڵشادم. پیرۆزت بێ کچم!

پرێنسی پیر کە هەوڵی دەدا خۆی کەمتەرخەم نیشان بدات گوتی: دەی، هەموو کارەکانتان رێکخست؟ ـ بەڵام کاتێك چاوی لە لەڤین کرد، لەڤین دیتی ئەویش چاوی فرمێسکی تێزاوە.

پرێنس دەستی لەڤینی گرت و کێشای بۆ لای خۆی و گوتی: لەمێژە بە ئاواتی ئەم رۆژەوەم. من لەو کاتەوە کە ئەم چەتیوە شێتە دەیویست...

کیتی قیژاندی: باوەگیان! ـ بە دەستی دەمی باوکی گرت.

پرێنس گوتی: باشە، هیچ نالێم. زۆر، زۆر، خۆش... ئاخ، منیش چەندە شێتم!

کیتیی لە باوەشی گرت و ناوچاوان و دەستی و دیسان ناوچاوانی ماچکرد و خاچی کێشا.

کیتیش دەستی باوکی ماچکرد، لەڤین کە دیتی کیتی ئاوا بە هەستەوە دەمی نا بە دەستی گۆشتنی باوکییەوە هەتا چەند چرکە دەمی لێنەکردەوە، هەستی خۆشەویستییەکی نوێ سەبارەت بەو پیاوە لە دڵیدا رسکاو لە ناخەوە هەژاندی.

## شازدە

پرێنسس لێو بەبزە و بێدەنگ لەسەر کورسییەك دانیشتبوو، پرێنسیش لە تەنیشتی دانیشتبوو. کیتی لە پاڵ کورسییەکەی باوکی راوەستابوو و هەردوو دەستی باوکی گرتبوو. هەموو بێدەنگ بوون.

پرێنسس یەکەم کەس بوو کە حاڵی دڵەکانی دەربڕی و هەست و ئەندێشەکانی بەرەو بواری ژیان گێڕایەوە و لێکی گرێ دانەوە. ئەو کارەش سەرەتا لە روانگەی هەمووانەوە وەکوو یەك سەیر و تەنانەت تاڵیش بوو.

ـ کەنگێ دەبێ قۆڵی لێهەڵماڵین؟ کەنگێ دەبێ ناوی خودای لێبێنین و بە مەبارەکی رێوڕەسمی دیاریکردن بەڕێوەبەرین. گوێستنەوەش کەنگێ دەبێ؟ ئەلکساندر، تۆ دەڵێی چی؟

پرێنسی گەورە ئاماژەی بە لەڤین کرد و گوتی: بۆ لە من دەپرسی؟ ئەوەی دەبێ بڕیاربدات ئەوا لێرەیە.

لەڤین سوورهەڵگەڕا و گوتی: کێ؟ ئەگەر لە من دەپرسن، لە سبەینێ زووتر نییە، ئەمڕۆ شیرینییەکەی دەخوێن و سبەینێ گوێستنەوە.

ـ جا ئەوە قسەیە، چاوەکەم دەست لەو قسە هەڵێت پلێتانە هەڵگرە!

ـ دەی، سبەینێ نا، حەوتوویێکی تر.

ـ ئەو کوڕە دەڵێی بەجارێ شێت بووە!

ـ ئاخر بۆچی؟

پرێنسس کە بە دیتنی ئەو تالووکە بوونەی لەڤین شاد و دڵخۆش دەگرژییەوە گوتی: ئاخر قەزاوگرم بیرت لە جیازی نەکردۆتەوە؟

لەڤین ترسێك لە دڵی گەڕا و بە خۆی گوت «کەوایە جیازی و کەبکەبە و دەبدەبەی زۆرم بە ریشەوەیە. دەی، قەیناکا. مەگین جیازی و دیاریکردن و گێرەوکێشە دەتوانن دڵخۆشی و شیرینکامییەکەم لێزایە بکەن؟ هیچ وزەیەك نییە بتوانێ ئەو خۆشییەم لێ تاڵ بکات.» چاوێکی لە کیتی کرد و دیتی بیری وەدواکەوتنی زەماوەند بە هۆی تەدارەك و ئامادەکردنی جیازییەوە ڕێزەیەك زویری نەکردووە. لە دڵی خۆیدا گوتیشی «کەوایە دەبێ پێویست بێ.»

داوای لێبوردنی کرد و گوتی: من بۆ ئەو شتانە هیچ زانیارییەکم نییە. تەنیا حەز و ئارەزووی خۆم دەربڕی.

ـ چاکە، ئەوەش فیکرێکی بۆ دەکەین. جارێ دەکرێ دیاریکردنەکەی ناوی خودای لێبێنین و بە دۆست و خزمان راگەیێنین. خۆ ئەوە هیچ کێشەیەکی نییە.

پرێنسس ئەمەی گوت و لە مێردەکەی چووە پێشێ و بە دڵ ڕوومەتی راموسی و دەیویست دوورکەوێتەوە بەڵام پرێنس قۆڵی گرت و دڵسۆزانە لە باوەشی گرت و وەك ئەویندارانی لاو، بە پێکەنینەوە چەند جار لەسەریەك ماچی کرد. وەك ئەوە وابوو کە ئەو ژن و مێردە بەساڵاچووە بۆساتێك پەشۆکابوون و بەڕاستی نەیاندەزانی ئەوانن دیسان ئاشقبوون یان کچەکەیان. کاتێك پرێنس و پرێنسس ڕۆیشتن لەڤین لە دەزگیرانەکەی نزیکبۆوە و دەستی گرت. ئێستا ئیتر بەسەر هەست و سۆزی خۆیدا زاڵ بووبوو و دەیتوانی قسە بکات و زۆری وتەی نەدرکاو لە دڵدا بوو. بەڵام ئەوەی گوتی هیچی ئەوە نەبوو کە دەیویست بیڵێت.

ـ من زۆر چاك دەمزانی ئەو کارە سەردەگرێ. زۆر بێهیوا بووم، بەڵام لە قووڵایی گیانمدا هەمیشە دڵنیا بووم. لەسەر ئەو باوەڕەم کە چارەی ئێمە لەیەك نووسرابوو.

کیتی گوتی: ئەی من چی؟ تەنانەت ئەو کاتەی کە... ـ قسەکەی خۆی خواردەوە بەڵام چونکە چاوە راستوێژەکانی لە چاوی لەڤین بڕیبوو، بوێرانە درێژەی پێدا: تەنانەت ئەو کاتەی کە بەختەوەریم لە خۆم تاراند. من هەمیشە دڵم لەلای تۆ بوو بەڵام خەڵەتا بووم. دەبێ بڵێم... تۆ بێژی ئەوەت لەبیربچێتەوە؟

ـ ڕەنگە بەرژەوەندی کارەکەت وابووبێ. زۆر شت هەیە کە تۆ دەبێ لە من ببوری. منیش دەبێ شتێکت پێبڵێم کە...

دەیویست هەر ئەو کاتە یەکێك لەو شتانەی کە بڕیاری دابوو لەگەڵیدا بهێنێتە گۆڕێ. هەر لەو ڕۆژی یەکەمەوە بڕیاری دابوو کە دوو شتی پێبڵێت، یەکیان ئەوەبوو کە ئەویش بێتاوان نییە و ئەوەی تریش ئەوەبوو کە ئیمانی بە خودا هەیە. ددانپێدانانی ئەو دوو شتە زۆر دژوار بوو بەلایەوە، بەڵام لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە دەبێ ددانی پێدا بنێ.

گوتی: نا، جارێ لێی گەڕێ، پاشان پێتدەڵێم.

ـ باشە قەیناکا، بۆ دوایی، بەڵام حەتمەن پێمبڵێ. من لە هیچ شتێك ناترسم. دەبێ هەموو شتێك بزانم. چونکە دڵنیابە کە...

لەڤین ڕستەکەی ئەوی تەواوکرد: دڵنیابم کە هەرجۆرێك بم، شووم پێدەکەیت و هەر عەیب و کەمایەسییەکیشم هەبێ دەستم بە ڕووەوە نانێی. وایە؟

ـ بەڵێ وایە، بەڵێ.

مادموازێل لینۆن هاتەژوورێ و قسەکانی پێبڕین. ئەو دڵسۆزانە و بێ ئەوەی خۆی شیرین بکات، بە پێکەنینەوە هاتە پێشێ و پیرۆزباییی لە دەستپەروەدەکەی خۆی کرد. هێشتا نەچووبووە دەرێ کە خزمەتکارانیماڵێش یەکبەدوای یەکدا هاتن بۆ پیرۆزباییان لێ کرد. دوای ئەوانیش خزمەکانیان هاتن و خۆتێوەردان و بڕوبیانووی کەسوکار دەستیپێکرد و لەڤین هەتا ڕۆژێکی دوای زەماوەند نەیتوانی لێی دەربازبێ. لەڤین لەو ماوەیەدا زۆر ناڕەحەت بوو چونکە لە بەرچاوگرتنی دابونەریت و هەڵسوکەوتی ماقووڵانە تەنگی بە ڕۆحی هەڵچنیبوو. بەڵام ئاسۆی بەختەوەریی بەردەوام گەشتر و فراوانتر دەبوو. هەمیشە هەستی دەکرد کە چاوەڕوانییەکیان لێیهەیە و نەیدەزانی چییە، هەر کارێکیان پێبگوتایە دەیکرد و بۆ هیچ کامیان گنجی نەدەهێنایە نێوچاوان و بە دڵ ئەنجامی دەدان. ئەو پێیوابوو ماوەی دەزگیرانییەتی لەگەڵ هی خەڵك جیاواز دەبێ و دابونەریتی باوی بنەماڵەی بووك هەموو چێژ و خۆشییەکانی لێ زایە دەکات. بەڵام لە ئاکامدا ئەو کارانەی هەمووان دەیکەن ئەویش کردی و زۆریشی بەلاوە شیرین بوو، زیاد بوونی هێندێك لە تایبەتمەندییەکانیش وایلێکرد کە زۆر لەگەڵ دیاریکردنی ئاسایی جیاواز بوو.

مادموازێل لینۆن دەیگوت دەبێ بە بۆنەی ئەو ڕووداوە پیرۆزەوە شیرینیمان بدەیتێ، لەڤین لەڕێوە دەچوو شیرینیی دەکڕی.

سڤیاژێسکی دەیگوت زۆر خۆشحاڵم هەر مەبارەکیی دەوێ. بەڵام واچاکە لە فۆمین چەپکە گوڵێك بکڕی و بیبەی بۆ دەزگیرانەکەت.

ـ وایە، دەبێ بیکرم؟ ـ بەغار دەڕۆیشت بۆ گوڵفرۆشی.

براکەی دەیگوت دەبێ وامی بانکی وەرگرێ چونکە زۆری خەرجی دەبێت و دەبێ دەلیایەك دیاری بکرێ. لەڤین لەرێوە، دەڕۆیشت بۆ لای فولدا.

لە شیرینیخانە و گوڵفرۆشی و لای فولدا دەیدی کە هەموو چاوەڕوانی ئەون و بە دیتنی ئەو دەگەشێنەوە و وەکوو هەموو ئەو کەسانەی تر کە لەو چەند رۆژەدا هەڵسوکەوتی لەگەڵیان بوو شادی و خۆشییەکەی لێگەورەتر دەکەنەوە. سەیر ئەوە بوو نەك هەموو خۆشیان دەویست بەڵکوو تەنانەت ئەو کەسانەی کە لە رابردوودا رووی خۆشیان نەدەدایە و سارد و بێموبالات بوون دەتگوت هەموو نووشتەیان لێکراوە و لە هەموو کارێکدا رۆحسووك و گوێڕایەڵ بوون و ئەوی پێویستی بووایە بۆیان ئامادەدەکرد و بە دڵی ئەو هەڵدەسووڕان. لەوەشدا کە دەزگیرانی کچێکی بێوێنە و پڕ کەماڵە و بەختەوەرترین مرۆڤی دنیایە هەموو لەگەڵیدا هاوڕا بوون. کیتیش هەروا بوو. کاتێك کۆنتس نۆردستۆن رووهەڵماڵدراوانە و بە توانجەوە گوتی کە بە ئاواتی مێردێکی باشتر بووە بۆی، کیتی وا بە گژیدا هاتەوە و بە دڵنیاییەوە پێیسەلماند کە لەڤین باشترین پیاوی دنیایە، کە خەنیم ناچاربوو قسەی خۆی قووت بداتەوە و ئیتر لەبەر چاوی کیتی بەبێ بزەی شیرین و رووخۆشانە لەگەڵ لەڤین بەرەوڕوو نەدەبوو.

ئەو ددانپێدانانەی کە لەڤین بەڵێنی بە کیتی دابوو یەکێك لە دژوارترین کارەکانی ئەو ماوەیە بوو. لەڤین لەگەڵ پرێنس راوێژی کرد و ئیجازەی لێ وەرگرت کە دەفتەری یادداشتەکانی رۆژانەی بدات بە کیتی تاکوو بیخوێنێتەوە و ئەوەی لەسەر دڵی قورسایی دەکرد و تووشی ئازاری ویژدانی کردبوو هەمووی لەو دەفتەرەدا نووسیبوو. ئەو ئەم یادداشتانەی لە کاتی خۆیدا و بە مەبەستی پێکهێنانی ژیانی هاوبەشیی لە داهاتوودا، نووسیبوو. دووشت بوو کە بووبووە هۆی ئازاری ویژدانی: یەکیان تاوانەکانی بوو و ئەوی دیکەشیان ئیمانی. بێئیمانییەکەی بۆ کیتی زۆر ناخۆش نەبوو. کیتی خۆی مەسیحییەکی زۆر ئیمانپتەو نەبوو و قەت لە هەقیقەتی ئایینیدا تووشی گومان نەبووبوو، بەڵام بێ ئیمانییە رواڵەتییەکەی لەڤین قەتی تووشی پەرۆشی نەکرد. چونکە قوڵایی و پاکیی رۆحی ئەوی لە ئاوێنەی ئەشقدا دیتبوو و ناسیبووی، تەواوی ئەوانەش کە دەیویست لەو ئاوێنەیەدا دۆزیبوویەوە. بڕواشی بەوە نەبوو کە ئەو حاڵەتە رۆحییەی لەڤین بێئیمانی بێ. بەڵام دانپیانانەکانی دیکەی لەڤین ئەوەندە بەلایەوە تاڵبوون دەستی کرد بە گریان.

لەڤین دوای کێشەیەکی زۆر لەگەڵ خۆیدا دەفتەرەکەی پێدابوو. دەیزانی کە هیچ راز و نهێنییەك نابێ تەمومژ بخاتە سەر ژیانی ئەو و هاوسەرەکەی. هۆی بڕیاردانەکەشی هەر ئەوەبوو. بەڵام خۆی لە جێگای کیتی دانەنابوو و بیری لەوە نەکردبۆوە کە ددان پێدانانەکانی چ کاریگەرییەکی لەسەر کیتی دەبێ. تەنیا ئەو شەوەی کە بەر لە چوونی بۆ شانۆ چوو بۆ ماڵی

ئیشچر باتسکی و که پێینایه ژوورەکەی کیتی، دیتی روخساری جوان و شیرینی دەزگیرانەکەی خەمێکی قورس دایگرتووە و ئاکامی ئەو بێموبالاتی و بڕیارە کتوپڕەی بوو کە قەرەبوو نەدەکرایەوە، لە لایەکەوە زۆری بەزەیی پێیدا هات و لەلایەکیشەوە تێگەیشت کە چ فەرتەنەیەکی پڕ مەترسی و رابردوویێکی رەش و رمووده بە تاوان ئەو لە پاکی و بێگەردیی کۆترئاسای کیتی جیا دەکاتەوە و لەو کردەیەی خۆی پەشیمان بۆوە و ترسی لێنیشت.

کیتی ئەو دەفتەرەی کە لەسەر مێزەکەی بەردەمی بوو لە خۆی دوور خستەوە و گوتی: هەڵیگرە، لایبە، ئەو نامە رەشەی کردەوەکانت هەڵگرە. بۆ ئەوەت دا بە من بیخوێنمەوە؟ ـ بەڵام بە دیتنی روخساری لەڤین کە نیشاندەری داماوییەکەی بوو، هێوربۆوە و گوتی: بەڵام نا، هەرچییەك بوو چاکت کرد پیشانتدام، چاکتر زانیم. بەڵام ترسناکە، بەڕاستی ترسناکە.

لەڤین سەری داخستبوو متەقی نەدەکرد. نەیدەتوانی هیچ بڵێ.

لەسەرەخۆ گوتی: لێم خۆش نابی؟

ـ بۆچی؟ لێت خۆشبووم، بەڵام زۆر ترسناك بوو.

بەڵام بەختەوەریی لەڤین هێندە مەزن بوو بەو ددانپێدانانە زایە نەبوو، بەڵکوو رەنگێکی تازەشی بەخۆوە گرت. کیتی لێیخۆش بوو بەڵام لەڤین دوای ئەوە کەمتر خۆی بە شایانی هاوسەرێتی ئەو دەزانی. لە دڵیشەوە سەری رێزی بۆ پاکیی ئەو دادەنەواند و زیاتری قەدری ئەو بەختەوەرییە زانی کە خۆی بە شایانی نەدەزانی.

## حەڤدە

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لەگەڵ ئەوەی وتوێژەکانی سەر نانخواردنەکەی بێ ئیختیار لە زەینی خۆیدا لێك دەدایەوە، بەرەو خەڵوەتی ژوورە چکۆڵەکەی خۆی لە هوتێل گەڕایەوە. قسەکانی داریا ئەلکساندرۆڤنا سەبارەت بە لێبوردن و چاوپۆشیکردن لە تاوانی ژنەکەی ئەوەندەی تر گرێ رقی لە دڵیدا گەشاندەوە. لەبەرچاو گرتنی فێرکاری و پەروەردەی مەسیح لەو بوارەدا، یان سەرپێچی کردن، کێشەیەکی سەخت بوو کە نەدەکرا هەروا بە سانایی باسی بکەی. لەلایەکیشەوە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لەو بارەوە بڕیاری خۆی دابوو و وەڵامی نەرێنیی بەو حوکمە ئەخلاقییە دابۆوە. لە نێو ئەو قسانەدا کە کردبوویان قسەکانی

تووڕۆڤتسینی ساویلکە، کە گوتبووی «بوێرانە بانگی کرد بۆ دوئێل و کوشتی» قووڵترین شوێنی لەسەر زەین و خاتری دانابوو. هەڵبەت هەموویان کاری ئەو مێردە هەڵخەڵەتاوەیان پەسند کردبوو و تەنیا بە هۆی ئەدەبەوە لە هەنتەشی ئەودا بێدەنگ بووبوون.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لە دڵی خۆیدا گوتی «وەلحاسڵ کارەکە کۆتاییی پێهاتووە و پێویست ناکات لەوە زیاتر سەری خۆی پێوە بێشێنم.» لەگەڵ ئەوەدا کە بیری هەر لە لای سەفەری سبەینێی و مەسەلەی پێڕاگەیشتنی کارەکانی بوو، چووە نێو ژوورەکەی خۆی و سۆراخی پێشخزمەتەکەی خۆی لە دەرگاوانەکە کرد کە هەتا ژووریّ لەگەڵی هاتبوو.

دەرگاوان گوتی کە پێشخزمەتەکەی تاوێك لەمەوبەر چۆتە دەرێ. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ داوای چایی کرد و لە پشت مێزەکە دانیشت و دەستیدا خەریتەی ڕێنوێنیی فرۆم[١٧٩] تاکوو ڕێگای سەفەرەکەی لێکبداتەوە.

پێشخزمەتەکەی کە گەڕایەوە هاتەژووریّ و گوتی: داوای لێبوردن دەکەم گەورەم. بەسەر پێیەکەوە چوومە دەرێ. دوو برووسکە هاتبوو.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ برووسکەکانی لیّ وەرگرت و کردییەوە. برووسکەی یەکەم هەواڵی دامەزرانی ستێرمۆڤ بوو، پلەیەکیان پێدابوو کە کارنین چاوەڕوان بوو بیدەن بە خۆی: ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ پەڕەی برووسکەکەی فڕێدا لایەك و سوورهەڵگەڕا، ڕقهەستاوانە هەستا سەرپیّ و دەستیکرد بە پیاسەکردن بە نێو ژوورەکەدا. لە دڵی خۆیدا دەیگوت « Quos vult perdere dementat»[١٨٠] مەبەستیشی لە Quos (هەرکەس) کەسانێك بوو کە بۆ ئەو دامەزراندنە کاریگەر بوون. بۆ ئەوەش هەڵنەچووبوو کە ئەو پلە و پایەیان نەداوە بەخۆی و بە ئاشکرا وەژێر پیّ نراوە و غەدریان لێکردووە، بەڵکوو پێیسەیر بوو و نەیدەتوانی تێبگات کە ئەم کەسانە چۆن نازانن ستێرمۆڤ هەرزەوێژ و پیاوی کار نییە، لە هەموو کەسێکیش نەشیاوترە بۆ ئەو پلەیە. چۆن تێناگەن بەو دانانە بەجێیە خۆیان زایە کردووە و ئابڕووی خۆشیان بەبا داوە؟

بە ڕقهەستاوی برووسکەی دووهەمی هەڵپچڕی و لە دڵی خۆیدا گوتی «ئەمەش هەر هەواڵێکی لەو چەشنەیە!» ئەمەیان هی ژنەکەی بوو. واژۆی «ئانا» بە قەڵەمی شین لەسەر

---

١٧٩- Froom ڕێنمای هێلاسن لەو سەردەمەدا بۆ ڕووسیا و قوڕنەی ئەورووپا.

١٨٠- پەندێکی لاتینییە: خودا بیهەویّ هەرکەس لەنێوبەریّ، ئەقڵی لیّ دەستێنێتەوە.

لاپەڕەکە و لە خوار برووسکەکەوە بەر لە هەموو شتێك سەرنجی ڕاکێشا. ئەم ڕستەیەی خوێندەوە: «خەریکم دەمرم. تکات لێدەکەم، رجات لێدەکەم وەرەوە. ئەگەر گەردنم ئازا بکەی ئاسوودەتر دەمرم.» برووسکەکەی فڕێدا سووچێك و چزەبرەیەکی پڕسووکایەتی نیشتە سەر لێوی. سەرەتا پێیوابوو فێڵێك لە گۆڕێدایە. فێڵ و تەڵەکە، لەوەشدا هیچ گومانی نەبوو.

لە دڵی خۆیدا گوتی «هیچ فێڵ و دووڕوویییەك نییە کە شەرمی لێبکات، حەتمەن کاتی منداڵبوونی هاتووە، بەڵام مەبەستییان چییە. دەیانهەوێ زۆڵەکەیان بە ریشی منەوە بەستن؟ ئابڕووم بەرن؟ بەر بە تەڵاق بگرن؟ بەڵام باسی مردنی کردووە... برووسکەکەی هەڵگرتەوە و دیسان خوێندییەوە. لە ناکاو مانای سادە و ڕاشکاوی نووسراوەکە شوێنی لەسەر دانا. بە خۆی گوت «ئێستا ئەگەر بەڕاستی بێ چی؟ ئەگەر قسەکەی راست بێ و ئازار بکێشێ و مەرگی لێ میوان بێ و سادقانە پەشیمان بووبێتەوە؟ منیش سەداقەتی ئەو بە فێڵ و دووڕوویی بزانم و نەچم بۆ لای؟ کارێکی وا نەك دڵڕەقییە و هەمووان مەحکوومم دەکەن، بەڵکوو جۆرێك گەوجییەتیشە.»

بە پێشخزمەتەکەی خۆی گوت: پیووتێر، بە فایتوونەوانەکە بڵێ نەڕوات، من دەگەڕێمەوە بۆ پترزبۆرگ.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بڕیاریدا بگەڕێتەوە بۆ پترزبۆرگ و چاوی بە ژنەکەی بکەوێت. ئەگەر باسی نەخۆشینەکەی دووڕوویی و فێڵ بووایە هیچی نەدەگوت و دیسانیش ڕێگای سەفەری دەگرتەبەر، بەڵام ئەگەر ئەو بەڕاستی نەخۆش و کەلەلا بووایە و بیویستایە لەسەرە مەرگدا ئەو ببینێ، ئەگەر هێشتا زیندوو بێ لێی خۆشدەبێ، ئەگەر لە کاتی خۆی درەنگتر بگەیشتایە دوایین ئەرکی خۆی دەرهەق بە ئەو بەجێ دەهێنا؟

لە ماوەی ڕێگادا ئیتر بیری لەوە نەکردەوە چی دەکات.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ شەوی لە ڤاگۆندا رابوارد و بەیانی شەکەت و ماندوو بە سەروچاوی نەشۆراوەوە، بەو هەوا تەمومژاوییەی پترزبۆرگ، بە فایتوون لە بلۆاری نیۆڤسکییەوە، کە لەو کاتەدا چۆڵ و هۆڵ بوو رۆیشتەوە بۆ ماڵێ. چاوی لە پێش خۆی بڕیبوو و بیری لەوە نەدەکردەوە کە چی چاوەڕوانییەتی. نەیدەتوانی بیری لێبکاتەوە چونکە کاتێك دەیویست بیهێنێتە بەرچاوی خۆی کە چی چاوەڕوانییەتی نەیدەتوانی بیرنەکاتەوە کە ئەگەر ژنەکەی بمرێت هەموو کێشەکانی ژیانی کۆتاییی پێدێت. نانەواخانە و دووکانی داخراو و عارەبانەی شەوکار و ئەو دەرگاوانانەی کە شۆستەی بەر ماڵەکانیان دەماڵی، هەموو بە پڕتاو

بەبەر چاویدا تێدەپەڕین و ئەو هەموویانی دەدی و هەوڵی دەدا بیری ئەوەی کە چاوەڕوانییەتی و هەروەها ئەوەی کە غیرەتی نەبوو ئاواتی بۆ بخوازێت و ئەگەرچی ئارەزووەکە لە دڵیدا بوو دەیویست لە بیرگەی خۆیدا بیخنکێنێ. بە سواری فایتوون لە پلیکانی چوونەژوورەوەی ماڵێ نزیکبۆوە. فایتوونێك و عارەبانەیەك لەبەر دەرگای ماڵێ راگیرابوون و عارەبانەچی خەونووچکە دەیبردەوە. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ کە گەیشتە سەرسەرا و پێی نایە بەر هەیوانەکە بڕیاری خۆی، وەك ئەوەی لە سووچێکی شاراوەی مێشکی خۆی دەرکێشێت، لە زەینیدا لەگەڵی کەوتە کێشە. ئەو بڕیارەش ئەمە بوو: ئەگەر فێڵ بوو، بە سووکایەتی پێکردن و خاترجەمی لەگەڵی بەرەوڕوو دەبم و دەگەڕێمەوە، ئەگەر راستیش بوو، دەیبینم و هەرکارێك شیاو بێ دەیکەم.

بەر لەوەی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ قامك بە زەنگەکەدا بنێت دەرگاوان دەرگاکەی کردەوە.

دەرگاوان، پێترۆڤ یان هەر ئەو کاپیتۆنیچە، بوو کە بەو باڵتە کۆنە و ملیوانەی بێبۆینباخ و سەرپایی لە پێ، قەڵافەتێکی سەیری هەبوو.

ـ خاتوون حاڵی چۆنە؟

ـ دوێنێ بە سلامەتی منداڵەکەی بوو.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لە جێی خۆی ویشك بوو و رەنگی هەڵبزڕکا. ئێستا بە روونی دەیدی کە تا چ رادەیەك ئاواتەخوازی مەرگی بووە.

ـ دەی، حاڵی چۆنە؟

کۆرنی بە بەروانکەی سپییەوە کە تایبەتی بەیانیان بوو بە قاڵدرمەکاندا هەڵات بۆ خوارێ.

وەڵامی دایەوە: حاڵی باش نییە. دوێنێ دوکتۆرەکان هەموو کۆ بووبوونەوە و راوێژیان کرد. ئێستاش دوکتۆر لێرەیە.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ گوتی: ئەو کەلوپەلانە بێنە ژوورێ ـ لەوەی کە هێشتا گریمانەی مردن لە گوڕێدا هەیە بە هەستێکی پڕ ئۆخژنەوە چووە ژوورێ و پێی نایە دالانەکەوە.

باڵتەیەکی سەبازی بە رەختاوێزەکەوە هەڵواسرا بوو. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ دیتی و پرسیی: کێ لێرەیە؟

ـ دوکتۆر و مامان و کۆنت ڤرۆنسکی.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ رۆیشت بۆ لای ژوورەکانی ناوەوە.

هۆدەی میوانداری کەسی لێنەبوو. مامانەکە بە شەوکلاو و قردیلەی بنەوشەوە، کە ترپەی پێی کارنینی بیست لە ژوورەکەی ئانا هاتەدەرێ.

هات بۆ لای ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ و بە شێوەیەکی خۆمانە کە بە هۆی نزیکبوونی مەرگەوە نەشیاوی نەدەنواند قۆڵی گرت و بردی بۆ ژووری خەوەکەی ئانا.

گوتی: شوکر بۆ خودا تەشریفتان هێنا. هەر دەڕاوێنێ و ناوی تۆی لەسەر زمانە.

دەنگی دوکتۆر لە ژووری خەوەکە بە لەبزێکی فەرماندەرانەوە بەرزبۆوە: زووکەن زوو، سەهۆڵ بێنن.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ چووە ژووری پێشەوە. ڤرۆنسکی، لە پاڵ مێزەکەدا لەسەر لایەکی بەرەوڕووی دەرگای ژووری خەوەکەی ئانا دانیشتبوو و لاقەبرغەی بە پشتیی کورسییەکەوە نابوو، سەری بە هەردوو دەستی گرتبوو و دەگریا. بە دەنگی دوکتۆر هەستا سەرپێ، دەستی لە دەموچاوی کردەوە و ئەلکسی ئەلکساندرڤیچی دی. بە دیتنی ئەو واحەپەسا کە هێزی ئەژنۆی نەبوو خۆڕاگرێ و لە جێی خۆی دانیشتەوە و سەری بە خوزدا گرت، دەتگوت دەیهەوێ خۆی بشارێتەوە. بەڵام ورەی وەبەر خۆی ناو هەستا سەرپێ، گوتی: لە حاڵی گیانکەشتدایە. دوکتۆرەکان دەڵێن هیچ هیوایەك نییە. من لە ئیختیاری ئێوەدام. هەرکارێکت پێخۆشە دەتوانی لەگەڵمدا بیکەی. بەڵام ئیجازەم بدە لێرە بمێنمەوە. دەسەڵات بە دەست ئێوەیە. من...

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ کە چاوی بە فرمێسکەکانی ڤرۆنسکی کەوت، هەستی کرد ئەو حاڵە شێواوەی رۆحی کە بە دیتنی ئازاری خەڵك لە دڵیدا کۆدەبۆوە لە ناخیدا سەری هەڵداوە. رانەوەستا کە ڤرۆنسکی قسەکەی تەواوبکات رووی وەرگێڕا و بەپەلە رۆیشت بۆ لای دەرگاکە. لە ژووری خەوەکەوە دەنگی ئانا دەهات کە شتێکی دەگوت. دەنگی پڕ لە شۆر و نەشە بوو و لەبزیشی بە روونی دەبیسترا. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ چووە ژووری خەوەکەی و لە چرپاکە نزیکبۆوە. ئانا رووی لەلای ئەو بوو. کوڵمەکانی سوورهەڵگەڕابوون و چاوانی دەدرەوشانەوە. دەستە سپی و ناسکەکانی لە قۆڵی کراسەکەی هاتبووە دەرێ و لۆیەکی بەتانییەکەی گرتبوو هەڵیدەگولۆڤی. کە چاوی پێیکەوت پێیوابوو نەك هەر حاڵی زۆر باشە و تاویاوی نییە بەڵکوو زۆریش خۆشحاڵ و بەدەماخە. بەپەلە و بە دەنگی بەرز قسەی دەکرد و زیروبەمی دەنگی راست لەگەڵ هەستی یەکی دەگرتەوە.

ـ چونکە ئەلکسی، مەبەستم ئەلکسی ئەلکساندرڤیچە ( چ چارەنووسێکی سەیر و ترسناکە! هەردووکیان ناویان ئەلکسییە.) چونکە ئەلکسی داخوازییەکەم رەت ناکاتەوە. ئەگەر من بووایەم لە بیرم دەچۆوە، بەڵام ئەو لێم خۆش دەبێت... بەڵام ئاخر بۆ نایەت؟ ئەو پیاوێکی باش و مێهرەبانە. خۆشی نازانێ چەندە پیاوی چاکە. ئاخ خودایە گیان! چەندە دڵتەنگم! زووکەن، زووکەن چۆڕێ ئاوم بدەنێ. ئاخ، ئاو خراپە بۆی، بۆ کچەکەم؟ باشە، باشە، دایەنی بۆ بێنن. من رازیم. تەنانەت زۆریش باشە. ئەلکسی دێت و ئەگەر منداڵەکە ببینێ نارەحەت دەبێ. لایبەن، ئەو منداڵە لابەن.

مامانەکە گوتی: ئانا ئارکادیۆڤنا، ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لێرەیە. بەرەورووی خۆت ـ ئەوەی گوت و هەوڵیدا سەرنجی ئانا بۆ لای مێردەکەی راکێشێ.

ئانا کە مێردەکەی نەدەناسی گوتی: ئاخ، قسەی وا دەکەن، بەڵێ، بیدەن بە من. کچەکەم بدەنێ. هەتا ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ نەهاتووە بمدەنێ. ئێوە بۆیە دەڵێن هاتووە ترسی ئەوەتان هەیە لێم خۆش نەبێ. هۆیەکەشی ئەوەیە ئێوە نایناسن. هیچ کەس ئەو بە جوانی ناناسێ. تەنیا من دەیناسم. بەڵام بۆ منیش هێندێ دژوارە. دەبێ چاوەکانی بناسی. چاوی سریۆژاش راست لە چاوی ئەو دەچن. هەر بۆیە تاقەتی دیتنیانم نییە. نانی نیوەڕۆیان دا بە سریۆژا؟ ئاخر من دەزانم، هەموو لە بیریان دەچێ. بەڵام ئەو قەتی لە بیرناچێ. دەبێ سریۆژا بێنن بۆ ژووری پاڵوودار و داوا لە مارییێت[181] بکەن لەلای بخەوێت.

لە ناکاو خۆی کۆکردەوە و تۆقیوانە بێدەنگ بوو و دەستی هەڵێنا بۆ لای دەموچاوی، دەتگوت دەیهەوێ خۆی لە شەپلاخە بپارێزێ. چاوی بە مێردەکەی کەوتبوو.

دیسان دەستیکردەوە بە قسەکردن: نا، نا، من لێیناترسم. لە مردن دەترسم. ئەلکسی، وەرە بۆ ئێرە. من بەپەلەم، چونکە کاتم نەماوە. ئیتر ژیانم هیچی بەبەرەوە نەماوە. ئێستا دیسان چەقوچۆ دامدەگرێتەوە و ئەو کاتە ئیتر هیچ تێناگەم. ئێستا تێدەگەم، نێوچاوانی گرژی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ رەنگی ئازاری بەخۆوە گرت. دەستی ئانای گرت و ویستی شتێك بڵێ، بەڵام نەیتوانی لێوی ببزێوێ. لێوی خوارەوەی دەلەرزی. هێشتا لەگەڵ هەیەجانی خۆی لە کێشەدابوو و تەنیا جارجار چاوێکی لە ئانا دەکرد. هەرجاریش کە چاوی پێی دەکەوت، دەیدی چاوانی چەندە بە نەرمی و مێهرەبانی تێیدەڕوانن و خۆی قەتی چاوانی ئانا ئاوا نەدیتبوو.

---

181- Mariette

ـ راسته، تۆ نازانی... راوەستە، پەلە مەکە... ـ بێدەنگ بوو. وەك ئەوە وابوو بیهەوێ وەخۆ بێتەوە. پاشان دەستی پێکردەوە: بەڵێ، بەڵێ، بەڵێ، دەمویست ئەوەت پێبڵێم. سەرت لە من سوور نەمێنێ. من هەر ئەوەم کە بووم... بەڵام لە وجوودی مندا ژنێکی تر هەیە کە لێیدەترسم. ئەو ژنەی تر دەیویست ئەوی خۆشبوێ. منیش دەمویست لە تۆ بێزار بم، بەڵام نەمدەتوانی لە بیری بەرمەوە کە پێشتر چ ژنێك بووم. من ئێستا ئەو ژنە نیم. من ئانای راستەقینەم، سەرتاپا خۆمم. ئێستا خەریکم دەمرم. دەزانی دەمرم. لە ئەو بپرسە. من ئێستا هەستیان پێدەکەم. ئەو کێشە قورسانەی بە دەست و لاق و قامکەکانمدا هەڵواسراون. چاو لە قامکم بکە چۆن گەورە بوونەتەوە. بەڵام ئەوە زۆر زوو تەواودەبێ... تەنیا شتێکم دەوێ، لێمببوورە، بە دڵ گەردنم ئازاکە. من ژنێکی خراپم، بەڵام دایەنەکەم بۆی دەگێڕامەوە، دەیگوت، ئەو ژنە پیرۆزە شەهیدەکە، ناوی چیبوو؟ لە من خراپتر بوو. من دەچم بۆ رۆم. ئەوێ دەشت و بیابانە و لەوێ ئازارم بە هیچ کەس ناگات. تەنیا سریۆژا دەبەم و کچەکەم... بەڵام نا، تۆ ناتوانی لێم خۆش بی. من دەزانم، تاوانی من بۆ لێخۆشبوون نابێ. نا، نا، برۆ، تۆ زۆر باشیـ دەستی دەتگوت گڕی تەندوورن. بە دەستێکی دەستی کارنینی گرتبوو بە دەستەکەی تریشی لە خۆی دووردەخستەوە.

شێواویی رۆحی ئەلکساندرڤیچ بەردەوام توندتر دەبوو، ئێستا بە رادەیەك گەیشتبوو کە نەیدەتوانی بەرەنگاری ببێتەوە. هەستی دەکرد ئەوەی کە بە شێواویی دەزانی، بە پێچەوانە حاڵ لێهاتنێکی مەزن بوو کە لە ناکاو دەیگەیاندە بەختەوەرییەك کە تا ئێستا نەیچێشتبوو. ئەو بیری نەدەکردەوە کە پەروەردە و وانەی مەسیح کە ئەو لە ماوەی تەمەنیدا ویستبووی پێڕەویی لێبکات ئەوی پێمل کردبوو کە لە دوژمنانی ببوورێ و ئەوانی خۆشبوێ، بەڵام هەستی ئەو حاڵلێهاتنە رۆحییە و بەخشینی دوژمنەکانی گیانی لە ئەشق لێورێژ کردبوو. لە پەنا چرپاکەی چۆکی دادا و سەری کردە سەرقۆڵی ئانا و گەرمایی یاوەکەی لەسەر کراسەکەیەوە خەریکبوو ناوچاوانی بسووتێنێ و وەك منداڵێك هۆنهۆن گریا. ئانا سەری مێردەکەی لە باوەش گرت کە خەریکبوو تاس دەبوو. خۆی کێشا پێشەوە و بە غوروورێکی بەرزەوە سەری بەرەو ئاسمان هەڵبڕی.

ـ دیتت، من دەمزانی! ئێستا هەموو خوداتان لەگەڵ بێ، خوداتان لەگەڵ!... دیسان هاتن. بۆ ئەوانە ناڕۆنە دەرێ؟ ئەو کەلپۆسانەم لێبکەنەوە، سووتام.

دوکتۆر دەستی بەرزکردەوە و بە هێواشی لەسەر بالیفەکەی دانا و بەتانییەکەی بە شان و ملیدا دا. ئانا ئارام و بێدەنگ لەسەر پشت خەوت و بە نیگایەکی پڕ ترووسکەوە چاوی لە پێش خۆی بڕی.

ـ له بیرت بیّ تەنیا شتێك كه له تۆم دەویّ لێبوردنه. هیچی ترم ناویّ... ـ چاوی له دەرگاكەی تر بڕی كه ڤرۆنسكی لەویّ بوو و گوتی: بۆ ئەو نایەت؟ وەره، وەره، وەره دەستومشتاخی لەگەڵ بكه.

ڤرۆنسكی هات بۆ لای چرپاكه و كه چاوی به ئانا كەوت به هەردوو دەستی دەموچاوی خۆی گرت.

ئانا گوتی: دەستت لابه لەسەر دەموچاوت، چاو لێكه، پیاوی خودایه، بەڵیّ، دەستت لابه، لایبه دەی. ئەلكسی ئەلكساندرڤیچ دەستی لەسەر روخساری لابه، دەمەویّ دەموچاوی ببینم.

ئەلكسی ئەلكساندرڤیچ دەستی ڤرۆنسكیی گرت و لەسەر دەموچاوی لایبرد، كه به هۆی خەم و شەرمەزارییەوه گنجی تێكەوتبوو.

ـ دەستی بگوشه و لێی خۆشبه.

ئەلكسی ئەلكساندرڤیچ كه نەیدەتوانی ددان به خۆیدا بگریّ و بیّ ئیختیار فرمێسك به چاوانیدا دەهاته خواریّ، دەستی ڤرۆنسكیی گوشی.

ئانا گوتی: خودایه زۆر شوكر، خودایه زۆر شوكر. ئێستا هەموو شتێك ئامادەیه. بریا بمتوانیبایه تەنیا تۆزیّ لاقم راكێشم. چاكه، زۆر چاكه ـ پاشان وێنەی كاغەز دیوارییەكەی نیشان دان و گوتی: ئای، ئەو گوڵانه چەنده ناشارەزایانه رەسم كراون، شێوەیان له وەنەوشه هەر ناچێت. خودایه، خودایه، كەنگیّ تەواودەبێت؟ تۆزێكم مۆرفین بدەنیّ. دوكتۆر، بۆ مۆرفینم نادەنیّ؟ خودایەگیان، خودایه!

لەسەر جێگاكەی دەستیكرد به جینگڵدان.

پزیشكی پسپۆڕ و هەموو پزیشكانی تر دەیانگوت نەخۆشینی یاوی منداڵ بوونه و نەوەدونۆ لەسەد مەرگی پێوەیه. رۆژێكی تەواو تاویاوی بووه و وڕێنەی كردووه، داڵغەی له دەست دابوو. نیوەشەو له هۆش خۆی چووبوو و نەبزی به ئاستەم لێیدەدا.

هیچ كەس پێیوانەبوو زیندوو دەمێنیّ.

ڤرۆنسكی رۆیشتەوه بۆ ماڵی خۆیان. بەڵام بەیانی هاتەوه تاكوو له حاڵی ئانا ئاگاداربیّ. ئەلكسی ئەلكساندرڤیچ له ژووری تەنیشتەوه هات بەرەوپیری و گوتی: نەچی بۆ هیچ كویّ، رەنگه بگرییێت. ـ خۆشی بردی بۆ ژوورەكەی ئانا.

بەری بەیانی دیسان حاڵی تێكچوو زۆری جووڵه جووڵ دەكرد و بەپەله دەدوا و دەیڕاواند، دیسان داڵغەی لەدەست دابوو. رۆژی سێهەمیش دیسان هەر ئەوه حاڵی بوو، بەڵام دوكتۆر

گوتی تۆزێ هیوادارتره. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ چوو بۆ ئەو ژوورەی کە ڤرۆنسکی لێیدانیشتبوو، دەرگاکەی پێوەدا و بەرەوڕووی دانیشت.

ڤرۆنسکی کە هەستی دەکرد کاتی قسەی جیددی نزیکبۆتەوە گوتی: ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ، من ناتوانم قسە بکەم. ببووره، دەزانم ئەو بارودۆخە بۆ ئێوە زۆر دژوارە بەڵام بڕوام پێبکە بۆ من زۆر ترسناکە.

دەیویست هەستێ بەڵام ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ دەستی گرت و گوتی:

ـ تکات لێدەکەم گوێم بۆ ڕاگرە. چارەمان نییە. من بە ئەرکی خۆمی دەزانم کە ئەو هەستانەی ڕێنوێنییان کردووم و دەشیکەن بۆ ئێوە شی بکەمەوە، تاکوو ئێوە سەبارەت بە من تووشی هەڵە نەبن. تۆ دەزانی من بڕیارم دابوو ژنەکەم تەڵاق بدەم و تەنانەت کارە سەرەتاییەکانیشم جێبەجێ کردووە. لێتان ناشارمەوە و کاتێك هەنگاوم بۆ ئەو کارە هەڵێنایەوە دوودڵ بووم و زۆریشم ئازار کێشا. ددانی پێدادەنێم کە ویستی تۆڵە کردنەوە لە تۆ و لە ئانا ئۆقرەی لێبڕیبووم. کاتێك برووسکەکەم بە دەست گەیشت، نەك هەر بەو هەستەوە بەڵکوو بە ئاواتی مەرگی ئەوەوە بەرەو ئێرە وەڕێکەوتم، بەڵام... ـ لێرەدا گتێکی گرت و دوودڵ ما کە هەستی ڕاستەقینەی خۆی پێبڵێت یان نا. درێژەی بە قسەکانیدا: بەڵام کە لەو حاڵەدا چاوم پێیکەوت لێی خۆش بووم. بەختەوەرییەك کە ئاکامی ئەو لێبووردنە بوو بۆی ڕوونکردمەوە کە ئەرکی من بەرانبەری ژنەکەم چییە. بە تەواوی لە تاوانی خۆش بووم، دەمهەوێ ڕوومەتەکەی دیکەشم بۆ شەقەزللە ڕاگرم و عاباکەی خۆم بدەم بە کەسێك کە کەواکەی لێساندووم. لە دەرگای خوداش بپاڕێمەوە کە لە چێژی ئەو لێبوردووییە بێبەشم نەکات ـ فرمێسك لە چاوانیدا قەتیس مابوو و ڕوانینی ئارام و ڕوونی، ڤرۆنسکیی تووشی سەرسووڕمان کرد. کارنین گوتیشی: ئەوە حاڵی من بوو کە بۆم باس کردی. ئێوە دەتوانن من لە قوڕ و زەلکاودا پێشێل بکەن و لەبەر چاوی خەڵکی ئابڕووم بەرن. من ئەو لە خۆم ناتارێنم و قەتیش ئێوە سەرکۆنە ناکەم. ئەرکی من بە ڕوونی دیارە و تێیدەگەم. دەبێ لەگەڵیدا بم و لەگەڵیشی دەبم. هەرکاتێك ویستی چاوی پێتان بکەوێ من خۆم ئاگادارت دەکەم. بەڵام ئێستا وای بە باش دەزانم کە تۆ لێرە دوور بکەویتەوە.

هەستا سەرپێ و قوڵپی گریان نەیهێشت درێژە بە قسەکانی بدات. ڤرۆنسکیش هەستا و بێ ئەوەی بتوانێ پشتی ڕاست بکاتەوە بە پشتێکی کۆم و لە بنەوە چاوی لە کارنین کرد.

پشتی شکابوو. لەو هەستەی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ نەدەگەیشت بەڵام دەیزانی کە هانەی ئەو شتێکی بەرزترە لە روانگەی ئەو و لە رادەی تێگەیشتنی ئەو بەدەرە.

## هەژدە

ڤرۆنسکی دوای ئاخافتن لەگەڵ ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ، کاتێك لەماڵەکەی کارنین هاتەدەرێ و لەسەر پلیکانەکان راوەستا، بە زەحمەت وەبیری هاتەوە لە کوێیە و دەبێ بچێت بۆ کوێ. شەرمەزار بوو و هەستی بە سووکایەتی دەرکرد، هەستی تاوان دڵی داگرتبوو و هیچ رێگایەکی پێشك نەدەهات کە ئەو پەڵەی شەرمەزارییە بشواتەوە و دیسان بتوانێ سەری خۆی بەرز راگرێت. هەستی دەکرد لەو رێگا راست و بێکەندولەندە لایداوە کە تا ئەمڕۆ قوڕساخ و لووتبەرزانە پێیدا دەڕۆیشت. تەواوی ئەو شتانەی کە هەتا ئەو کاتە وەك خدەی مسۆگەر و عادەتی ژیان دەچوون لە ناکاو بووبوون بە ناڕاستەقینە و رەنگی نامۆییبیان بە خۆوە گرتبوو. مێردی هەڵخەڵەتاو، مێردێك کە هەتا ئەو کاتە بوونەوەرێکی سووك و کۆسپێکی قۆڕ بوو کە بەبێ هیچ هۆیەك و بەرێکەوت لەسەر رێگای بەختەوەری ئەو قوت بووبووە، لە ناکاو بانگی کردبوو و لەسەر سەکۆیەکی بەرز و ترسناکی راگرتبوو و ئەم مێردە لەسەر ئەو سەکۆیە جینگن و درۆیین و مەڵحەکەی نەدەنواند بەڵکوو سادە و دڵپاك و خاوەن شانوشکۆ دیاربوو. ڤرۆنسکی نەیدەتوانی هەست بەو حاڵە نەکات. لە ناکاو رۆڵەکان گۆڕدرابوون. ڤرۆنسکی سەربەرزیی ئەو و سەرشۆڕیی خۆی و راستی ئەو و ناڕاستی خۆی دەدی. هەستی دەکرد کە ئەو مێردە دڵشکاوە سەرەڕای داخ و دڵتەنگی مەزن و دڵۆڤانە، خۆشی وەك کەسێکی خاپینۆك سووك و هیچوپووچە. بەڵام ئەو ئاگاداربوونە لە سووکایەتیی خۆی لە هەمبەر کەسێکدا کە ئەو نابەهەق سووکایەتیی پێدەکرد پاژێکی زۆر کەم لە دەردەکانی بوو. هەستی لێقەوماوییەك کە بە زمان ناگوترێ رۆحی داگرتبوو، ئەوەش بە هۆی ئەوەوە بوو کە لەم دواییبیانەدا پێیوابوو کە ئەو ئەشقە گەرم و ئاگرینەی ئانا وردە وردە خەریکە لە دڵیدا سارد دەبێتەوە، لە هەموو کاتێك گەرمو بەجۆشتر بووبوو. بەتایبەت کە دەیدی ئەو گراوە خۆشەویستە بۆ هەمیشە لەدەست دەدات. ئەو لەو ماوەیەی نەخۆشینەدا ئانای بە تەواوی ناسیبوو و زۆر باش لە رۆحی

نزیکبووبۆوە، پێشیوابوو هەتا ئەو کاتە خۆشی نەویستووە و ئێستا کە ئاوا بە باشی ناسیوێتی و ئەو جۆرەی کە پێویستە شەیدای بووە، لەبەر چاوی سووك بووە و بۆ هەمیشە ئەوی لە دەست داوە و تەنیا بیرەوەرییەکی پڕ شوورەییی لە زەینی ئەودا بەجێ هێشتووە. لە هەمووشی نەنگینتر ئەو کاتە تاڵ و پڕ شوورەییە بوو کە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ دەستی ئەوی لەسەر روخسارە شەرمەزارەکەی لابردبوو. بەو حاڵەوە لە سەر قاڵدرمەکانی ماڵی کارنین مات و داماو راوەستابوو و نەیدەزانی چ بکات.

دەرگاوان پرسیی: دەفەرموون هێلینگەیەك بانگ بکەم؟

ـ بەڵێ، هێلینگە!

کە گەیشتەوە ماڵێ، دوای سێ شەو بێخەوی، هەروا بە جلوبەرگەوە لەسەر قەنەفەیەك دەمەوڕوو راکشا و سەری کردە سەر هەردوو دەستی و دەتگوت لە خاچ دراوە. سەری قورس بووبوو. وێنەی خەیاڵی و بیرەوەری و فیکری مەزن زۆر سەیر و بە روونی و خێراییەکی سەرسووڕهێنەرەوە لە بیرگەیدا دەردەکەوتن و جێگۆڕکێیان دەکرد: هێندێ جار دەوای بۆ نەخۆشەکە ئایەرە دەکرد و بە لێواری کەوچکەکەدا دەڕژا خوارێ، بڕێجاریش قۆڵی سپی و ناسکی مامانەکەی دەدی و هێندێ جاریش حاڵی شێواوی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ کە لە پاڵ چرپاکەی ئانادا چۆکی دادابوو.

بەخۆی گوت «بخەوە، لە بیری بەرەوە.» لەبزیشی لە لەبزی مرۆڤێکی لەشساغ دەچوو کە دڵنیایە ئەگەر ماندووبێت و خەوی بێت لەڕێوە خەوی لێدەکەوێت. هەر بەڕاستیش زەینی لەو کاتەدا تاریك و لێڵ بوو و دەستی کرد بە تلانەوە لە نێو گێژاوی فەرامۆشیدا. شەپۆلی زەریای ژیانی بێهۆشی خەریکبوو لوولی دەدا و لە نێو خۆیدا ئەوقی دەکرد کە لە ناکاو وەك ئەوەی کارەبایەکی پڕ وزە بە چەشنی گڕێکی بەهێز لە جەستەی درابێ وا داترووسکا کە تەواوی ئەندامی لەسەر فەنەری قەنەفەکە بەرزبۆوە و کەوتەوە. دەستیکردە کۆڵەکەی لەشی و بە ترسەوە هەستا سەرچۆك. چاوانی وا زەقبووبوونەوە کە دەتگوت قەت نەخەوتووە. شەکەتی و سستیی لەشی کە چەند خولەك لەمەوبەر ئازای ئەندامی داگرتبوو، لە ناکاو ئاسەواری نەمابوو.

قسەکانی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لە گوێیدا دەزرینگایەوە کە دەیگوت «ئێوە دەتوانن من لە قوڕ و زەلکاودا پێشێل بکەن...» ئەوی لە هەمبەر خۆیدا دەدی و روخساری ئاناش کە تاوتێ سووری هەڵگێڕابوو و تروسکەی چاوانیشی کە بە ئەشق و میهرەبانییەوە نەك لە ئەو

بەڵكوو لە ئەلكسی ئەلكساندرڤیچی دەڕوانی. ئادگاری خۆی هێنایە بەرچاو كاتێك ئەلكسی ئەلكساندرڤیچ دەستی ئەوی لەسەر روخساری لابرد و لە روانگەی خۆیەوە پێیوابوو دەبێ زۆر قۆڕ و گەوجانە بووبێ. دیسان لاقی راكێشا و خۆی دایەوە بەسەر قەنەفەكەدا و وەك پێشوو چاوی قووچاند.

دیسان دووپاتی كردەوە «بخەوە، بخەوە دەی» بەڵام كاتێك چاوی دەنووقاند روخساری ئانای بەر روونی دەدی و ئەمجارەیان وەك ئەو شەوە وابوو كە لای كێبەركێی ئەسپسواری دیتبووی.

بە دەنگێكی بەرز بە خۆی گوت و دووپاتی كردەوە: «ئەم بەسەرهاتە تەواوبوو، ئیتر درێژە ناكێشێ. ئانا حەزدەكات ئاسەوارەكەی لەسەر زەینی خۆی بسڕێتەوە، كەچی من ناتوانم بەبێ ئەو بژیم. چۆن دەتوانین تازە ببینە یەكدڵ؟ چۆن ئاشت ببینەوە؟» بێ ئەوەی خۆی ئاگای لێبێ بەردەوام ئەو رستانەی بە دەنگی بەرز لەبەرخۆیەوە دووپات دەكردەوە. ئەو دووپاتكردنەوەیەی قسەكانی دەبووە هۆی ئەوەی ئەو وێنە و بیرەوەرییانەی تری كە هەستی دەكرد لە زەینیدا كۆبوونەتەوە و ژیلەمۆیەكی دامركاون دیسان سەر هەڵدەن و بگەشێنەوە. بەڵام ئەم دووپاتكردنەوانە خەیاڵی ئەوی بۆ ماوەیەكی زۆر وەگەڕ خست و یادی ساتە شیرینەكانی رابردوو و لەگەڵ ئەوانیش سووكایەتیی ئەم دواییە لە بیرگەیدا سەری هەڵدەدا و بە خێراییەكی توند و سەرسووڕهێنەر یەك لەدوای یەك دەهاتنە بەرچاوی خەیاڵی. دەنگی ئانای دەبیست كە دەیگوت «دەستی لەسەر دەموچاوی لابە.» ئەو دەستی لادەبرد و شەرمەزاری و جۆرێك گەمژەییی لەسەر روخساری خۆی هەست پێدەكرد.

هەروا كەوتبوو و هەوڵی دەدا خەوی لێبكەوێت ئەگەرچی دەیزانی نابێ هیچ هیوایەكی بە خەوتن بێ و بەردەوام قسەی هاتەرانپاتەرانی دووپات دەكردە كە بە هۆی بیرێكی شێواوەوە لە مێشكیدا دەگووران و دەیویست بەو شێوەیە بەرگری لە سەرهەڵدانی خەیاڵەكانی تری بكات. گوێی شل كردبوو و سرتوخورتێكی سەیر و شێتانەی بەردەوام دەهاتە گوێ: «نەمتوانی قەدری بزانم، نەمتوانی كەڵك لەو دەرفەتە وەرگرم كە بۆم هەڵكەوتبوو، نەمتوانی قەدری بزانم. نەمتوانی كەڵك لەو دەرفەتە وەرگرم كە بۆم هەڵكەوتبوو.»

لە دڵی خۆیدا گوتی «یانیچی؟ خەریكم شێت دەبم؟» لە وەڵامی خۆشیدا گوتی « رەنگە! مەگین مرۆڤ چۆن شێت دەبێت؟ مەگین مرۆڤ چۆن خۆی دەكووژێ؟» چاوی هەڵێنا و بە سەرسووڕمانەوە لە پاڵ سەری خۆیدا باڵنجێكی دی كە ڤاریای براژنی گوڵدۆزیی كردبوو. دەستێكی بە ریشكۆی پەراوێزی باڵنجەكەدا هێنا و هەوڵیدا كە ڤاریا وەبیر خۆی بێنێتەوە و

بیر لەو دوایین جارە بکاتەوە کە دیتبووی. بەڵام بیرکردنەوە لە شتێکی تر جگە لە ئانا ئازاری دەدا. «نا دەبێ بخەوم.» باڵنجەکەی ڕاست کردەوە و سەری کردە سەری. بەزۆر چاوانی قووچاندبوو. لەپڕ هەستا و دانیشت. لە دڵی خۆیدا گوتی «کاری ئەشق و دڵداری بۆ من تەواوبووە. دەبێ بیری لێبکەمەوە و بزانم چیم پێدەکرێ. چ ڕێگایەکم بۆ ماوەتەوە؟» ژیانی خۆی جگە لە ئەشقی ئانا، بەپەلە لە فیکری خۆیدا لێکدایەوە.

حەزی ناوبانگ؟ سێریووخۆڤسکۆی؟ کۆڕی ئەشراف؟ دەربار؟» هیچ کام لەوانە نەیتوانی دڵی بۆ لای خۆی ڕاکێشێ. ئەوانە هەمووی لە رابردوودا مانایەکیان هەبوو بەڵام ئێستا ئیتر بۆ ئەو بوونیان نەبوو. لەسەر قەنەفەکە هەستا. جلی سەرەوەی داکەند و کەمەربەندەکەی کردەوە و سینگی خۆی رووت کرد تاکوو ئاسوودەتر هەناسە هەڵکێشێ و دەستیکرد بە پیاسەکردن بە نێو ژوورەکەدا. دیسان گوتی «پیاو هەر ئاوا شێت دەبێت.» پاشانیش لەسەرەخۆ گوتی: «هەر ئاواشە مرۆڤ خۆی دەکوژێت تاکوو پەڵەی شەرم لە خۆی بسڕێتەوە.»

ڕۆیشت بۆ لای دەرگاکە و پێوەیدا. پاشان بە چاوێکی زیت و لێوکورۆشتنەوە هات بۆ لای مێزەکە و دەمانچەکەی هەڵگرت کە لەسەری داندرابوو، چاوێکی لێکرد و کۆلاسەکەی کێشا و فیشەکدانەکەی سووڕاند تاکوو گوللەیەك بچێتە بەر لوولەکەی و چوو لەماڵی فیکرەوە. نزیکەی دوو خولەك سەری داخست و روخساری گوشارێکی توندی رۆحی گرژی کردبوو، دەست بە دەمانچەوە راوەستا. لەبەر خۆیەوە گوتی: «ڕاست وایە!» وەك ئەوە وابوو کە پێداچوونەوە و مەنتقی روون و بەردەوامی فیکرەکانی بە بێ ئەملاوئەولا بەو ئاکامەی گەیاندبێ. هەر بەڕاستیش ئەو «ڕاست وایە»ی کە ڕێگایەکی بۆ بڕوبیانوو بۆ نەهێشتبۆوە تەنیا ئاکامی دووپات بوونەوەی ئاڵقەی وێنە و بیرەوەرییەك بوو کە دەیان جار لە ماوەی ئەو کاتژمێرەی دواییدا لە زەینی خۆیدا لێکیدابۆوە. هەر ئەو بیرەوەرییانەی بەختەوەریی ئێستای کە بۆ هەمیشە تێپەڕیبوون، هەر ئەو بۆچوونە پووچەی کە لە ژیانی داهاتوویدا روودەدات و ئەو ئاگاداربوونە لە سووکی و سەرشۆڕیی خۆی. ئاڵقەی ئەم دیمەن و هەستانە هەموو جارێك بە یەك شێوە بوون و خۆیان بە زەین و رۆحیدا دەکرد.

کە فیکرەکانی بۆ سێهەمین جار بەو شێوە پووچەی پێشوو دەوری لێدایەوە و بیرەوەری و ئەندێشەکانی بوونە ڕێنیشاندەر، دووپاتی کردەوە «ڕاست وایە» و لوولەی دەمانچەکەی نا بەلای چەپی سینگییەوە و بە تەکانێکی توندی دەستی وەك ئەوەی بیهەوێ مستی بقووچێنێ قامکی بە پەلەپیتکەیدا نا. تەقەی نەبیست بەڵام زەبرێکی توند وەسینگی کەوت و کەوت

بەلادا. ویستی لێواری مێزەکە بگرێ بۆ ئەوەی نەکەوێت، دەمانچەکەی فڕێدا و بە لارەوەلارەوە لەسەر عەرزی دانیشت، بە سەرسووڕمانەوە چاوێکی لە دەورووبەری خۆی کرد. لە ژێرەوە چاوی لە پێچکەی خواری مێزەکە و قەرتاڵەی کاغەزە کۆن و پێستی پڵینگێك کرد بەڵام ژوورەکەی خۆی نەدەناسییەوە. سیڕەسیڕی کەوشی خزمەتکارەکەی کە لە ژووری میوانداریی‌ەوە بە پەلە دەهات و نزیك دەبۆوە، وەخۆی هێنایەوە. گوشاری بۆ بیرگەی خۆی هێنا و تێگەیشت کە لەسەر عەرزی دانیشتووە. بە کوێرەکوێرە دەستی بە دوای دەمانچەکەدا گێڕا و بەخۆی گوت «چەندە بێقابیلەتم! گوللەکەم بەخەتا چووە.» دەمانچەکە لە پەنایدا کەوتبوو و ئەو لە شوێنێکی دوور لێیدەگەڕا. هەروا بۆ دەمانچەکە دەگەڕا و بە لایەکی تردا داهاتبۆوە، بەڵام نەیتوانی خۆی راگرێ و کەوت بەلادا" خوێن بە سینگیدا دەهاتە خوارێ و لە خوار خۆیەوە شۆلاوگەی بەستبوو.

خزمەتکارە تەرپۆشەکەی کە ریشی لەسەر لاجانگی داهێنابوو و هەمیشە بە هۆی کەمتاقەتییەوە لە دەست ئاشناکانی گازندەی دەکرد کە دیتی ئەربابەکەی لە تەرکی ژوورەکەدا کەوتووە هێندە ترسا کە ئەوی بەو خوێن و خوڕەوە بەجێ هێشت و هەڵات بۆ دەرێ تاکوو یارمەتیدەرێك پەیدابکات. سەعاتێك دوایی ڤاریای براژنی هات و بە یارمەتیی سێ پزیشك، کە بۆ هێنانیان پیاوی بە هەموو لایەکدا ناردبوو، هەرسێکیان پێکەوە گەیشتن و بریندارەکەیان لەسەر چرپایەك راکێشا و خۆی بۆ پەرستاری لەلای مایەوە.

## نۆزدە

هەڵەی ئەلکساندرڤیچ کاتێك خۆی بۆ دیتنی ژنەکەی ئامادەدەکرد ئەوەبوو کە بیری لەوە نەکردبۆوە پەشیمانیی ئانا لەوانەیە سادەقانە بێت و لە تاوانی ببوورێت بۆ ئەوەی نەخۆشینەکەی نەیمرێنێت. ئەو هەڵەیە دوو مانگ دوای گەڕانەوە بۆ مۆسکۆ هەروا بە چڕوپڕی دەوری تەنیبوو. بەڵام هەڵەی ئەو تەنیا ئەمە نەبوو کە پێشبینی گریمانەیەکی ئەوتۆی نەکردبوو بەڵکوو لەوەشدا بوو کە هەتا چاوی بە ژنە کەلاکەکەی نەکەوت لەگەڵ حاڵی دڵی خۆی ئاشنا نەبوو. ئەو لە پەنای چرپای ژنە نەخۆشەکەی سەرەتا بە هۆی هەستی هاودەردییەوە کە بە دیتنی ئازاری خەڵکی لە دڵیدا سەری هەڵدەدا و لە رابردوودا بە باشی نەدەزانی و تەنانەت

پێیوابوو زیانباریشە و تەنانەت پێشی شەرم بوو، چۆکی دادا و زۆری دڵ بە ژنەکەی سووتا و شەرمی لە خۆی دەکرد کە مەرگی ئەوی بە ئاوات خواستبوو و لەوەش گرینگتر چێژی لێبوردن، هەموو ئەوانە نەك گڕی ئازارەکەیان دامرکاند بەڵکوو شادی و هێمنایەتییەکیشیان بە رۆحی بەخشی کە هەتا ئەو کاتە قەتی ئەو چێژە رۆحییە بۆ دەرنەکەوتبوو. لە ناکاو هەستی کرد ئەوەی بووبووە سەرچاوەی ئازارەکانی سەرچاوەی روونی رۆح و گیانی بوو، ئەو مەتەڵە گرانەش کاتێك کە ژنەکەی لۆمەی دەکرد و بە سووکی دەزانی و رقی لێدەکێشا دژوار بوو، بەڵام کاتێك لێیخۆش بوو و خۆشیویست روون و ئاسان بوو بۆی و هەڵیهێنا.

ئەو لە ژنەکەی خۆش بوو و کە دیتنی پەشیمانە و ئازار دەکێشێ زۆری دڵ پێیسووتا. ڤرۆنسکیی بەخشی و بەتایبەت کاتێك ئەو هەواڵەی پێگەیشت کە بە هۆی هیوابڕاوییەوە ئەنجامی دابوو بەزەییی پێیداهات. زۆریشی خەمی کوڕەکەی بوو و خۆی سەرکۆنە کرد کە ئەو جۆرەی پێویستە پێیڕانەگەیشتبوو. بەڵام سەبارەت بە کچە ساواکەی هەستێکی تایبەتی هەبوو کە ئەوەش نەك دڵسۆزی بەڵکوو خۆشەویستیش بوو. سەرەتا تەنیا بەزەیی پێیدا دەهات و خەمی بۆ ئەو ساوایە دەخوارد کە عەولادی خۆی نەبوو. دەیزانی کاتی نەخۆشیی دایکی هیچ کەس پەرستاریی لێنەکردووە و ئەگەر ئەو بەفریای نەگەیشتبایە زۆر لەوانەبوو بمردبایە. نەخوازراوانە هۆگری ئەو زارۆکە بەستەزمانە بووبوو. رۆژی چەند جار دەچوو بۆ ژووری منداڵەکە و ماوەیەکی زۆر لەوێ دادەنیشت، بەجۆرێك کە دایەن و پەرستاری منداڵەکە، کە سەرەتا شەرمیان لێدەکرد وردە وردە خوویان پێگرت. هێندێ جار نیو سەعات بێدەنگ بەلایەوە دادەنیشت و چاوی لە روخساری سوور و زەرنەقووتە ئاسا و چرچولۆچی زارۆ خەوتووەکە دەبڕی و لە دەستی چکۆڵە و خڕپن و مشتی قووچاوی کە بە دەمولووت و بن چەناگەی خۆیدا دەهێنا، ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بە تایبەت لەو ساتانەدا هەستێکی پڕ لە شادی رۆحی دادەگرت و لە خۆی رازی بوو، هیچ شتێکی نائاساییشی لە کاری خۆیدا نەدەدییەوە و بە پێویستی نەدەزانی کە شتێك بگۆڕێت.

بەڵام هەتا زەمان زیاتر تێدەپەڕی زیاتر بۆی روون دەبۆوە کە هەرچەندە بارودۆخەکە بۆ ئەو سروشتی و ئاسایی بێ ناهێڵن لەو بارودۆخە ئاساییەدا بمێنێتەوە، هەستی دەکرد جگە لەو وزە چاکەخوازانە و هەستە پاکەی کە رۆحی ئەوی رێنوێنی دەکرد، وزەیەکی تریش هەبوو کە ئەویش بیر چەوتی بوو، ئەگەرچی بەهێزتر نەبوو بەڵام لانیکەم بە رادەی وزەی یەکەم زۆردار بوو و زاڵ بوو بەسەر ژیانیدا، ئەو وزەیەش چێژی خاکەڕایی بوونی لێ زەوت دەکرد کە ئامانجی سەرەکیی ئەو

بوو. هەستی دەکرد کە هەمووان بە سەرسوڕمانەوە چاوی لێدەکەن و نیگاکانیان پڕ لە پرسیارە و سەریان لە ئاکاری ئەو دەرناچێت و چاوەڕوانیی کارێکیان لێهەیە. ئەو بەتایبەت ساردوسڕیی پێوەندیی لەگەڵ ژنەکەی و درۆیینبوونی ئەو ژیانەی هەست پێدەکرد.

کاتێك ئەو نەرمی نواندنە کە بە هۆی نەخۆشییەکەی ئاناوە بوو کۆتاییی هات، ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ وردە وردە تێگەیشت کە ئانا لێیدەترسێ و بوونی ئەو وەکوو بارێك دەزانێ لەسەر کۆڵی خۆی و ناتوانێ ڕاست چاو لە چاوی ببڕێت. وەك ئەوە وابوو کە شتێکی پێویست بێ، بەڵام دڵی ڕازی نەدەبوو بیدرکێنێ. وەك ئەوە وابوو کە هەست بکات پێوەندییەکەیان ناتوانێ بەردەوام بێت و چاوەڕوانییەکی لێیهەیە.

لە کۆتاییی مانگی فیورییەدا کچە ساواکەی ئانا، کە ئەویشیان ناو نابوو ئانی نەخۆش کەوت. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بەیانی کە چووبوو بۆ ژووری منداڵەکان دەستووریدا بچن بە دوای پزیشکدا و پاشان چوو بۆ ئیدارەکەی. کە کاری دایرەکەی تەواوبوو، نزیك سەعات چوار گەڕایەوە بۆ ماڵێ. کە گەیشتە بەر هەیوانەکە چاوی بە خزمەتکارێکی شۆخوشەنگ کەوت کە جلو بەرگێکی کەلبەدوون کراوی لەبەردا بوو و کۆڵەباڵێکی پێستە ورچی بە شانیدا دابوو و باڵتەیەکی ژنانەی بە دەستەوە بوو کە پێستی سەگلاوك بوو.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ پرسیی: کێ لێرەیە؟

خزمەتکاری کۆڵەباڵ لەبەر، وەك ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ تێیگەیشت، بە زەردەخەنەیەکەوە وەڵامی دایەوە: پرێنسس لیزاوتا فێۆدۆرۆڤنا تۆرسکایا.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ تێگەیشتبوو کە لە تەواوی ئەو ماوە دژوارەدا ئاشناکانیان لە کۆڕ و کۆبوونەوەکاندا، بە تایبەت ژنەکان، زۆریان خۆ لە کاری ئەو و ژنەکەی هەڵدەقوتاند. ئەو خۆشحاڵییەکی کەمڕەنگی لە هەڵسوکەوتی هەموو ئاشناکانیاندا دەدی، هەر ئەو خۆشحاڵییە ئاشکرایەی کە لە چاوانی پارێزەرەکەدا دیتبووی و ئێستا لە چاوی خزمەتکارەکەدا دەیدی. هەموو دەتگوت ڕۆنی قازت لێداون، وەك ئەوە وابوو کە کچێك بە شوو بدەن. کاتێك تووشی دەبوون بە خۆشحاڵییەکی کەمڕەنگەوە هەواڵی ئانایان لێدەپرسی.

هاتنی پرێنسس تۆرسکایاش بە هۆی ئەو بیرەوەرییانەوە کە بە دیتنی ئەو سەریان هەڵدەدایەوە بۆ ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ زۆر ناخۆش بوو هەر بەو هۆیەش خۆشی نەدەویست. بۆیە ڕاست ڕۆیشت بۆ ژووری منداڵەکان. لە ژووری یەکەم سریۆژا لەسەر مێزەکە خۆی ڕاکێشابوو، لاقی لەسەر کورسییەکە دانابوو و خەریکی وێنەکێشان بوو و سەرخۆشانە قسەی

دەکرد. ژنێکی جحێڵی ئینگلیزی کە لە کاتی نەخۆشیی ئانادا بەجێی پەرەستارە فەڕەنسییەکە هاتبوو، لە پەنا سریۆژا دانیشتبوو و خەریکی چنینی دەستەوانە بوو کە چاوی بە کارنین کەوت لەڕێوە هەستا سەرپێ.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ دەستی بە سەری سریۆژادا هێنا و وەڵامی پرسیاری پەرستارەکەی سەبارەت بە حاڵی ئانا دایەوە و خۆی لە پەرستارەکەی پرسی پزیشك بۆ نەخۆشییەکەی baby چیی گوتووە.

ـ دوکتۆر گوتی شتێکی گرینگ نییە گەورەم، دەستووری حەمامی داوە.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ گوێی بۆ قیژەی گریانی منداڵەکە راگرت کە لە ژوورەکەی تەنیشتەوە دەهات گوتی: ئەو بەستەزمانە هەر ئازار دەکێشیّ.

ژنەی ئینگلیزی بە لەبزێکی قایمەوە گوتی: پێموایە دایەنەکەی وا شیری دەداتیّ باش نییە، گەورەم.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ راوەستا و گوتی: چۆن؟

ـ منداڵەکەی کۆنتس پۆلیش وابوو، گەورەم. زۆریان دەوای جۆراوجۆر دەرخواردی ئەو منداڵە بەستەزمانە دا قوربان، پاشان دەرکەوت کە ئەو منداڵە هەر لە برسانا گریاوە. دایەنەکەی مەمکی وشکی کردبوو.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ خەیاڵ هەڵیگرت و دوای ئەوەی ماوەیەك راوەستا لە دەرگاکەی دیکەوە چووە ژوورەکەی تەنیشت. زارۆکەکە لە باوەشی دایەنەکەیدا بوو و سەری بە پشتدا کەوتبوو و خۆی هەڵدەگوشی. نە مەمکی پەنەمیوی دایەنەکەی دەگرت و نە دەستی لە قیژە و گریان هەڵدەگرت. دایەنەکانیش هەرچەندەی هەوڵیان دەدا بۆیان ژیر نەدەبۆوە.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ گوتی: هەر چاك نەبۆتەوە؟

دایەنەکە گوتی: نەخێر، هەدادانی نییە. وێدەچیّ ژانی زۆر بیّ.

ـ میسئیدوارد دەڵیّ رەنگە دایەن مەمکی شیری تێدا نەبیّ.

ـ منیش هەر وایبۆ دەچم.

ـ ئەی بۆ هیچ ناڵێی؟

دایەنی بەساڵاچوو ناڕازییانە گوتی: بەکیّ بڵێم؟ ئانا ئارکادیۆڤنا هێشتا نەخۆشە.

ئەم دایەنە لە خزمەتکارانی قەدیمیی ئەم ماڵە بوو ئەم قسە سادە و ئاساییەشی بە بڕوای ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ ئاماژەیەك بوو بە وەزعی خۆی.

گریانی منداڵەکە زیاتر بوو. ئەوەندەی قیژاندبوو دەنگی نووسابوو. دایەنی پیر دەستی هەڵتەکاند و ڕۆیشت بۆ لای دایەنی شیربدە و منداڵەکەی لێوەرگرت و دەستیکرد بە گەڕان بە نێو ژوورەکەدا و هەڵتەکانی منداڵەکە.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ گوتی: دەبێ بە دوکتۆر بڵێم پشکنین بۆ ئەو دایەنە بکات.

دایەنی شیربدە کە بە رواڵەت ژنێکی جوان و تەرپۆش و لەشساغ بوو، دەترسا جوابی بکەن، لە بن لێوەوە شتێکی گوت و بزەیەکی مانادار بۆ ئەو شك و گومانەی ئەوان نیشتە سەرلێو و مەمکی گەورە و خڕخۆڵی خستەوە نێو باخەڵی و شاردییەوە. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ ئەو بزە مانادارەشی هێنایە سەر خۆی.

دایەنی پیر، کە هەروا دەگەڕا بە نێو ژوورەکەدا و دەیویست منداڵەکە ژێر بکاتەوە، گوتی: بەستەزمانی چارەڕەش!

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لەسەر کورسییەك دانیشت و بە روخسارێکی خەمناك و داماوانەوە چاوی لە دایەنەکە دەکرد کە بە نێو ژوورەکەدا دەهات و دەچوو.

کاتێك منداڵەکە ژێر بۆوە خستیانە نێو چرپا لانکەییەکەیەوە و دایەن باڵنجەکەی بۆ رێکوپێك کرد و چووە ئەولاوە، ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ هەستا و بە ئەستەم و بە پێدزکە لە منداڵەکە چووە پێشێ. تۆزێ بێدەنگ بوو و هەر بەو روخسارە خەمناکەوە چاوی لە کۆرپەکە بڕی. بەڵام لە ناکاو بزەیەك نیشتە سەرلێوی کە مووی سەری و پێستی نێوچاوانی هەڵکشا. هەستا و بە ئەسپایی لە ژوورەکە چووەدەرێ.

کە هاتەژووری نانخواردن زەنگی لێدا و دەستووری بە پێشخزمەتێکدا کە هاتەژوورێ، تاکوو کەسێك بنێرێ بە دوای پزیشکدا. لە دەستی ژنەکەشی نارەحەت بوو چونکە گوێی لەو کۆرپە بەستەزمانە نەبوو و نەیدەویست ئاوا بە دڵتەنگییەوە بچێت بۆ لای و هەروەها نەشیدەویست چاوی بە پرێنسس بێتسی بکەوێت. بەڵام وێدەچوو ژنەکەی تووشی سەرسووڕمان بێت کە وەکوو جاران نەچووە بۆ لای، بۆیە هەوڵیدا و تۆزێ گوشاری بۆ خۆی هێنا و ڕۆیشت بۆ ژووری خەوەکە، بەسەر مافوورەی نەرمدا هەنگاوینا و لە ژوورەکە نزیکبۆوە و بێ ئیختیار گوێی لە ئاخافتنێك بوو کە نەیدەویست بیبیستێ.

بێتسی گوتی: ئەگەر ئەو نەیویستبایە بڕوات، لەم وەڵامە لالووتانەیەی تۆ دەگەیشتم و ئەویش تێدەگەیشت. بەڵام مێردەکەت گەورەتر لەوەیە سەختگیری بکات.

دەنگی ئانا کە دیاربوو شێواوە، هاتەگوێی: قسەیوا مەکە، من لەبەر مێردەکەم نالێم. خۆم حەزی پێدەکەم.

ـ بەڵام پێموانییە تۆ رازی بی بەوەی پیاوێك کە لەبەر تۆ پەنای بۆ خۆکوژی بردووە بێماڵئاوایی...

ـ هەر لەبەرئەوە حەز ناکەم.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ وەك کەسێك کە تاوانێکی ئەنجامدابێت تۆقیوانە راوەستا و ویستی بێچرپە بگەڕێتەوە، بەڵام کە بیری کردەوە کارێکی وا لە ئەو ناوەشێتەوە و پاشگەز بۆوە و گەڕایەوە و دوای کۆخەیەك دەرگای ژوورەکەی کردەوە. ژنەکان قسەی خۆیان بڕی و ئەو چووە ژوورێ.

ئانا ربدۆشامبرێکی خۆڵەمێشینی لەبەردا بوو قژە کورتکراوەکەی وەکوو دڕووی ژیشك پڕ و رەش بە سەرە خڕەکەیەوە ئێستا تۆزێك دێژ بووبۆوە و لەسەر قەنەفەیەك دانیشتبوو. وەك هەمیشە بە دیتنی مێردەکەی رەنگی روخساری هەڵبزڕکا. سەری داخست و بە دڵگرانییەوە چاوی لە بێتسی بڕی. بێتسی جلوبەرگێکی دابی رۆژی لەبەردا بوو و کڵاوەکەی لەسەر کەزیەی وەکوو ئاباژۆری چرا باڵی فش کردبۆوە و کراسێکی کەهووی لەبەردا بوو کە خەتەکانی شەفتول و سەرنجڕاکێش بوون و خەتی باڵاکەی بۆ لایەك و داوێنەکەی بۆ لایەکی تر خوار بووبۆوە. لە پەنای ئانا دانیشتبوو و بەژنی وەك تەختە پان و تەنکی خۆی قیت کردبۆوە، سەری بە لایەکدا خستبوو و بە چزەبزەیەکی گاڵتەجاڕانەوە لەگەڵ ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بەرەوڕوو بوو.

وەك ئەوەی بە دیتنی ئەو تووشی واقوڕمان بووبێ گوتی: ئا، زۆر خۆشحاڵم کە ئێوە لە ماڵێ دەبینم. لە هیچ کوێ ناتوانین بتبینین. من لە کاتی نەخۆشییەکەی ئاناوە ئێوەم نەدیتووە. زۆرم تاریفی زەحمەتەکانتان بیستووە! ـ پاشان بە لەبزێکی لاوێنەر و مانادارەوە، وەك ئەوەی بۆ سپاسکردن لە هەڵسوکەوتی لەگەڵ ژنەکەی خۆی میدالیای مەزنایەتی و بیر بەرزیی پێببەخشێ گوتی: تۆ بەڕاستی مێردێکی بێوێنەی!

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بە ساردی سەری داخست، دەستی ژنەکەی ماچکرد و سەبارەت بە ناساغییەکەی لێی پرسی.

ئانا کە خۆی لە چاوی دەدزییەوە وەڵامی دایەوە: وادیارە هێندێك باشترم.

ـ بەڵام بە رەنگی روخسارتدا وێدەچێ تاوتێت هەبێ ـ جەختی لەسەر وشەی «تاوتێ» کرد.

بێتسی گوتی: ئێمە زۆرمان قسەکرد. وا هەست دەکەم بەهۆی لەخۆڕازی بوونی منەوە بێت. ئیتر دەڕۆم.

هەستا سەرپێ بەڵام ئانا سوورهەڵگەڕا و بە توندی دەستی گرت و گوتی:

ـ نا، تکات لێدەکەم مەڕۆ. من دەبێ قسەتان لەگەڵ بکەم... ـ پاشان رووی لە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ کرد و گوتی: نەك، لەگەڵ ئێوە ـ ناوچاوانی هەتا گەردنی سوورهەڵگەڕا و گوتیشی: من نامەوێ و ناشتوانم شتێك لە ئێوە بشارمەوە.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ قامکی دەستی تەقاند و سەری داخست.

بێتسی دەڵێ کۆنت ڤرۆنسکی حەزدەکات بێت بۆ ئێرە و بەر لە رۆیشتن بۆ تاشکەند خوداحافیزیمان لێبکات ـ کاتی گوتنی ئەو قسانە چاوی لە مێردەکەی نەدەکرد و بەپەلە بوو کە هەموو قسەکانی زوو تەواوبکات، ئەگەرچی زۆر دژوار بوو: من گوتم کە ناتوانم چاوم بە چاوی بکەوێت.

بێتسی قسەکەی بۆ راست کردەوە و گوتی: نا، ئاناگیان تۆ گوتت بە دەست ئەلکسی ئەلکساندرڤیچە.

ـ نا من ناتوانم رێی بدەمە ماڵەکەم و ئەوەش هیچ پێوەندییەکی بە... ـ لە ناکاو قسەکەی بڕی و بە چاوێکی پڕ پرسیارەوە چاوی لە مێردەکەی کرد ـ بەڵام مێردەکەی چاوی لە ئەو نەدەکرد: وەلحاسڵ ناخوازم ببیینم.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ خۆی قیت کردەوە و ویستی دەستی بگرێت.

یەکەم هەڵوێستی ئانا ئەوەبوو کە دەستی خۆی لە دەستی تەڕی ئەو کە دەمارەکانی هەستابوون و لە دەستی ئەو دەگەڕان راپسکێنێ. بەڵام پاشان بە ئاشکرا گوشاری بۆ خۆی هێنا و دەستی ئەوی گوشی.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ گوتی: سپاسی ئەو هەستە خۆمانەیەت دەکەم، بەڵام... ـ بە دڵتەنگی و شێواوی هەستی کرد کە کێشەکە لە خەڵوەتی خۆیدا بە ئاسانی و دڵخۆشی دەتوانێ چارە بکات و نەیدەتوانی لەلای پرێنس تۆرسکایا بیهێنێتە گۆڕێ، چونکە بێتسی ئەو وزە چەوتە بوو کە ژیانی ئەوی بە پێی رێسای کۆمەڵگا رێنوێنی دەکرد و نەیدەهێشت خۆی بداتە دەست حوکمی ئەشق و لێبوردن. هەروا کە چاوی لە پرێنس تۆرسکایا دەکرد قسەکەی خۆی بڕی.

بێتسی هەستا و گوتی: زۆر چاکە ئاناگیان، خوداحافیز، ئانای ماچکرد و لە ژوورەکە چووەدەرێ. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بەرێی کرد.

بێتسی لە ژوورە چکۆڵەکەی میوانداری راوەستا و دەستی کارنینی بە توندی گوشی و گوتی: ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ، من بەڕاستی ئێوە بە پیاوێکی جوامێر دەزانم. من لە نێوان تۆ و ئانادا بێگانەیەکم و بەس بەڵام هێندەم ئانا خۆش دەوێ و رێزیشم بۆ ئێوە هەیە، ئیجازە بە خۆم دەدەم و پێشنیارێکم بۆ ئێوە هەیە. ئیجازە بدە با بێت. ئەلکسی بەڕاستی وێنەی بەرچاوی شەرافەتە و موسافیری تاشکەندە.

ـ پرێنسس، سپاس بۆ هۆگری و پێشنیارەکەتان، بەڵام تەنیا ئانایە کە دەبێ بزانێ و بڕیاربدات کە رێ بە کێ بدات و رێ بە کێ نەدات.

کە ئەو قسانەی دەکرد بەپێی عادەت و بە هۆی شەرەف و بەرزییەوە برۆی هەڵدەتەکاند، بەڵام لەڕێوە بیری کردەوە کە مانای قسەکانی هەرچییەك بێت بۆ ئەو بارودۆخەی ئەوی تێدایە، باسکردنی شەرەف بەجێ نییە. ئەو ئەو مانایەی لە بزەی مزیڕانە و گاڵتەئامێزی بێتسیدا دی کە کاتی قسەکردن لە چاوانیدا دیاربوو.

# بیست

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ دوای کڕنۆشێك بۆ بێتسی ماڵاوایی لێکرد و گەڕایەوە بۆ لای ژنەکەی. ئانا راکشابوو بەڵام بە بیستنی ترپەی هەنگاوەکانی ئەو بەپەلە هەستا و وەك پێشوو دانیشت و بە نیگایەکی پڕ لە ترسەوە چاوی لە مێردەکەی بڕی. کارنین چاوە فرمێسك تێزاوەکەی دی.

ـ زۆر سپاس بۆ ئەو هەستە یەکدڵییەت لەگەڵ من ـ ئەم رستەیەی کە بە فەڕەنسی گوتبوو لەلای بێتسی، بە زمانی رووسی و زۆر بە مێهرەبانییەوە دووپاتی کردەوە. چوو لە پاڵیدا دانیشت. کاتێك کارنین بە زمانی رووسی لەگەڵی دەدوا و پێیدەگوت «تۆ»، ئەم وشەی «تۆ»یە وای رقی ئانا هەستاندبوو کە ددان بە خۆداگرتنەکەی دژوار بوو. کارنین درێژەی بە قسەکانیدا: بۆ بڕیارەکەشت هەر سپاست دەکەم. منیش پێموایە ئێستا کە کۆنت ڤرۆنسکی موسافیرە هاتنی بۆ ئێرە زۆر پێویست نییە. ئەگەرچی....

ئانا لە ناکاو بە رقێکەوە کە نەیدەتوانی دان بەخۆیدا بگرێ قسەکەی پێبڕی: من خۆشم ئەوەم گوت، ئیتر بۆ دووپاتی دەکەیتەوە؟ ـ لە دڵی خۆشیدا گوتی: «بەڵێ، هیچ پێویست ناکات پیاوێك لە ژنێکی کە خۆشی دەوێ و لە تاوی ئەو پەنای بۆ خۆکوژی بردووە، ژنێکیش

که ناتوانێ بەبێ ئەو (یانی ئەو پیاوە) بژی خوداحافیزی بکات.» پاشان لێوی بەسەر یەکدا ناو چاوی پڕپلێسەی لەو دەستانەی مێردەکەی کرد کە دەمارەکانی هەستابوون و بە ئارامی لە یەکی دەساوین. بە لەسەرەخۆییەکی زیاترەوە گوتیشی: ئیتر با لەو بارەوە نەدوێین.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ گوتی: من چارەی ئەو کێشەیە بۆ خۆم دەهێڵمەوە و زۆر خۆشحاڵم کە دەبینم....

ئانا کە رقی لەو دەم مردوولەییەی مێردەکەی هەستابوو لە پێشدا دەیزانی چی دەڵێ، بەپەلە رستەکەی بۆ تەواوکرد... کە دەبینی هەردووکمان حەز بەوە دەکەین.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ قسەکەی پەسندکرد: بەڵێ، خۆتێوەردانی پرێنس تۆرسکایاش لە مەسەلەی دژواری بنەماڵە زۆر بێجێیە. بەتایبەت ئەو کە خۆی...

ئانا بە توندی گوتی: من باوەڕ بەو قسانە ناکەم کە وەشوێنیان خستووە. من دەزانم ئەو سادقانە منی خۆش دەوێ.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ هەناسەیەکی هەڵکێشا و بێدەنگ بوو، ئاناش بە شڵەژاوی دەستی لە مەنگۆڵەی کەمەرەی ربدۆشامبرەکەی وەردەدا و بە هەستێکی پڕ لە بێزاریی تاڵ و قێزەونەوە جارجار چاوێکی لە مێردەکەی دەکرد. ئەو بەهۆی ئەو بێزارییەوە خۆی لۆمە دەکرد بەڵام نەیدەتوانی بە سەریدا زاڵ بێت. ئێستا تەنیا ئارەزوویێکی هەبوو. ئارەزووەکەشی ئەوەبوو کە لە چنگ ئەو دیدارە تاڵ و جاڕزکەرەی کارنین رزگاری ببێت.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ گوتی: هەر ئێستا ناردم بە دوای دوکتۆردا.

ـ من باشم، دوکتۆرم بۆ چییە؟

ـ بۆ تۆ نا، بۆ وردیلە. بەردەوام دەگری و ژیر نابێتەوە، دەڵێن دایەنەکەی مەمکی شیری تێدا نییە.

ـ بۆ نەتهێشت خۆم شیر بدەم بە منداڵەکەم؟ لەبەرت دەپاڕامەوە بەڵام تۆ نەتهێشت. دەی چ بکەم، هەرکارێکیش بکەم فایدەی نییە. ئەو منداڵە بەستەزمانە دەکووژن. (ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ تێگەیشت کە مانای ئەم «هەرکارێکیش بکەم»ە چییە.) ئانا زەنگی لێدا و دەستووریدا منداڵەکەی بۆ بێنن: من داوام لێکردی کە خۆم مەمکی بدەمێ و نەتهێشت، ئێستاش سەرکۆنەم دەکەی.

ـ من سەرکۆنەم نەکردووی...

ـ با، سەرکۆنەم دەکەی. خودایە، من بۆ نەمردم؟ ـ دای لە قوڵپەی گریان. هەولێدا وەخۆ بێتەوە و گوتی: ببوورە، مێشکم خەریکە دەتەقێ. من سپڵەم. بەڵام برۆ...

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ کاتێك لە ژووری ژنەکەی هاتەدەرێ خاترجەمانە بەخۆی گوت: نا، ئەم بارودۆخە هەروا بەردەوام نابێت.

ئەو بارودۆخەی ژیانی لەبەر چاوی خەڵك و بێزاربوونی ژنەکەی لەسەریەك توانایی ئەو وزە رازاوی و چەوتە کە بە پێچەوانەی وزە پاك و رۆحانییەکەی شوێنی لەسەر ژیانی دانابوو و هانیدەدا گۆڕان بەسەر پێوەندیی نێوان خۆی و ژنەکەیدا بێنێ و مەیلی بۆی ببێت، قەت وەکوو ئەمرۆ بە روونی لە هەمبەریدا خۆی نەنواندبوو. ئەو بە روونی دەیدی کە کۆمەڵگا و ژنەکەی چاوەڕوانییەکیان لێیهەیە، بەڵام تێنەدەگەیشت دەیانهەوێت چ بکات. هەستی دەکرد ئەو حاڵە دێوی رق لە ناخیدا وەخەبەر دێنێ و رووناکیی رۆحی رەش دادەگیرێت و بایەخی کارە باشەکەی زایە دەکات. لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە پساندنی پێوەندی لەگەڵ ڤرۆنسکی بە قازانجی ئانایە، بەڵام ئەگەر هەمووان لەسەر ئەو باوەڕە بووایەن کە ئەو کارە ناگونجێ، ئامادەبوو دیسان ئیجازە بدات کە بە ئازادی چاویان بە یەکتر بکەوێت، بەڵام تەنیا بە مەرجێك کە ناوی منداڵەکان بە نەنگ و شوورەیی رمووده نەبێت، منداڵەکانی لێ دوورنەخەنەوە و دۆخە کۆمەڵایەتییەکەی تووشی نسکۆ نەبێت. ئەو بارودۆخەش ئەگەرچی زۆر تاڵ بوو بەڵام لە پساندنی پێوەندی باشتر بوو، چونکە بەو شێوەیە ئانا لە تەنگژەی ئابڕووچوون دەرباز نەدەبوو و خۆشی لە هەموو ئەو شتانەی کە بەلایەوە شیرین بوون بێبەش دەبوو. بەڵام لە خۆی رانەدەدی. لە پێشدا دەیزانی کە هەمووان بە دژی ئەو رادەوەستن و ناهێڵن ئەوەی کە ئەمرۆ بە باشی دەزانێت و پێیوایە سروشتییە ئەنجامی بدات، بە پێچەوانە پێملی دەکەن تاکوو کارێك بکات کە زۆر دزێوە بەڵام بە بڕوای ئەوان پێویستە.

## بیست و یەك

بێتسی هێشتا لە هۆڵەکە نەهاتبووە دەرێ تووشی ستیپان ئارکادیچ بوو. ئەو لە ریستۆرانی ئێلیستیڤ کە سەدەفی تازەی خواردنی هێنابوو دەگەڕایەوە.

ستیپان گوتی: ئا، پرێنسس، چاوم روون بۆوە، چەندەم پێخۆشە چاوم پێتکەوت! چووم بۆ ماڵی ئێوە.

بێتسی کە خەریکبوو دەستکێشەکەی لە دەست بکات گوتی: حەیفێ دیدارەکەمان زۆر کورتە چونکە من خەریکم دەڕۆم.

ـ پەلە مەکە پرێنسس، دەستکێشەکەت لە دەست مەکە. ئیجازە بدە دەستە نەرم و ناسکەکەت ماچ بکەم. بڕوام پێبکە زۆرم حەز لە ژیانەوەی ئەو دابە کۆنەیە، یانی ماچکردنی دەستی ژنان ـ دەستی بێتسیی ماچکرد و پرسیی: کەنگێ بێم بۆ زیارەتتان؟

بێتسی بە پێکەنینەوە گوتی: تۆ شیاوی ئەوە نیت.

ـ وانییە، زۆریش شیاوم، چونکە ئێستا زۆر مرۆڤێکی سەنگین و زەنگیم ـ بە راوێژێکی مانادارەوە گوتیشی: نەك هەر کێشەکانی بنەماڵەی خۆم، بەڵکوو هی خەڵکیش راستەوپاستە دەکەم!

بێتسی کە لەڕێوە تێگەیشت مەبەستی ئانایە وەڵامی دایەوە: وەی چەندەم پێخۆشە! ـ گەڕاوە بۆ هۆڵەکە و پێکەوە لە سووچێك راوەستان. بێتسی بە سرتەسرتێکی مانادارەوە گوتی: ئەو پیاوە خەریکە ئانا دەکووژێ. ناگونجێ، ناگونجێ، نابێ...

ستیپان ئارکادیچ کە شوێنەواری هاودەردی و ئازارێکی قورس بە روخسارییەوە دیاربوو سەری لەقاند و گوتی: خۆشحاڵم کە ئێوە ئاوا بیردەکەنەوە. من هەر بۆ ئەو مەسەلەیە هاتووم بۆ پترزبۆرگ.

بێتسی گوتی: لە تەواوی شاریدا باس، باسی ئەوانە. دۆخێکی زۆر خراپە. تامڵ ناکرێ. ئانا خەریکە وەك بەفر دەتوێتەوە. مێردەکەی نازانێ ئانا یەکێك لەو ژنانەیە کە ناتوانن لەگەڵ دڵیان گاڵتە بکەن. ئەو دەبێ یەکێك لەو دوو رێگایە هەڵبژێرێ: یان ڤرۆنسکی بە زۆر لێرە دوور بخاتەوە یان ئانا تەڵاق بدات.

ئابلۆنسکی هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی: بەڵێ، بەڵێ..ڕاست وایە... من هەر بۆ ئەوە هاتووم.... هەڵبەت نەك هەر بۆ ئەوە. دەزانی بوومەتە ئاجودانی تایبەت و هاتووم سپاس لەو کەسانە بکەم کە پلەیان پێدام. بەڵام لەو گرینگتر رێکخستنی ئەو کارەیە.

بێتسی گوتی: چاکە، خودا دەوامتان بدات.

ستیپان ئارکادیچ هەتا بەر هەیوانەکە بێتسیی بەڕێ کرد و جارێکی تر دەستی ماچکرد، ئەمجارەیان سەرودەستکێشەکە و نەرمایی مەچەکی راموسی و نوکتەیەکی رووهەڵماڵدراوانەی بە گوێیدادا، بەجۆرێك کە بێتسی نەیدەزانی دەبێ پێبکەنێ یان زیز بێ. ستیپان ئارکادیچ چوو بۆ لای خوشکی و دیتی بە کوڵ دەگری.

ستیپان ئارکادیچ ئەگەرچی شادی و رووخۆشی لە سەروڕووی دەباری بە دیتنی خوشکی لەڕێوە رەنگی تێکچوو و شوێنەواری خەمخۆرییەکی سادقانە و شۆرێکی شاعیرانە کە لەگەڵ

حاڵی دەگونجا لە روخساریدا خۆی نواند. چاکوچۆنیی لەگەڵ کرد و پرسیی کە بەیانیی چۆن رابواردووە.

ئانا گوتی: زۆر زۆر خراپ. ئەم بەیانییە و دوانیوەڕۆ و رۆژەکانی تریش، رابردوو و تەنانەت داهاتووش.

ـ پێموایە تۆ خۆت تەسلیمی خەم و کەسەر کردووە. دەبێ وەخۆ بێیتەوە و بوێرانە لە ژیان بڕوانی. دەزانم ئەو کارە زۆر دژوارە، بەڵام....

ئانا لە ناکاو گوتی: من بیستوومە ژنان پیاوانیان تەنانەت بە هۆی عەیبەکانیشیانەوە خۆش دەوێ بەڵام من لە گەورەیی و شکۆکەشی بێزارم. ناتوانم لەگەڵیدا بژیم. هەوڵ بدە تێبگەی. تەنانەت بە دیتن و وێکەوتنی دەستیشی بێزم هەڵدەستێ و بەدەست خۆشم نییە. ناتوانم لەگەڵیدا بژیم، چ بکەم، ناتوانم. پێشتر هەستم بە چارەڕەشی دەکرد و پێم وابوو بەدبەختی لەوە زیاتر نییە، بەڵام داماویی ئێستام بەڕادەیەکە کە ناتوانم بیری لێبکەمەوە، بڕوام پێدەکەی؟ ئەگەرچی دەزانم لە روانگەی تۆوە مرۆڤێکی نازەنین و دڵۆڤانە و من بایەخی چلێك مووی ئەوم نییە، بەڵام سەرەڕای ئەوانە من لێیوەڕەزم. بە هۆی گەورەییەکەیەوە لێیبێزارم و هیچ رێگایەکم بۆ نەماوەتەوە.

دەیویست بڵێ جگە لە مەرگ هیچ رێگایەکی بۆ نەماوەتەوە بەڵام ستیپان ئارکادیچ نەیهێشت ئانا ئەو وشەیە دەربڕێ، گوتی: تۆ نەخۆشی و تووشی گوشاری رۆحی بووی. بڕوا بکە، لەخۆڕا دنیات لە خۆت کردۆتە چەرمە چۆلەکە. قەت ژیان ئەوەندە رەش و هیوابڕ نییە کە تۆ بیری لێدەکەیتەوە.

ستیپان ئارکادیچ پێکەنی. هەرکەسێکی تر جگە لە ئەو ئەگەر لەگەڵ ئەو ناهومێدییەی ئانا بەرەوڕوو بووایە زاتی نەدەکرد پێبکەنێ. پێکەنین لە دۆخێکی ئاوادا دڵڕەقی و رووهەڵماڵدراوییەکی زۆری دەویست، بەڵام پێکەنینەکەی ئەوەندە دڵپاکانە بوو و شتێك بوو لە چەشنی دڵنەرمی و مێهرەبانیی ژنانە کە بە هیچ شێوەیەك ئازاردەر نەبوو، بەڵکوو شتێکی تێدابوو کە ژاراوی ناهومێدیی دەسڕییەوە و ئاسوودەییی بە دڵ دەبەخشی و ئانا زۆر زوو ئەوەی بۆ دەرکەوت.

گوتی: نا ستیڤا، من کارەکەم زۆر خراپ کەوتووە، خراپ، تەنانەت لە خراپیش خراپتر. هەڵبەت ناتوانم بڵێم یەکجاری رووخاوم و فەوتاوم، بە پێچەوانە، هەست دەکەم هێشتا کێشەی

من تەواو نەبووە و تاریکستانێکم لە پێشە. من وەکوو بەنێك وام کە دەیکێشن و ئاخری دەپچڕێم. بەڵام ئەو بەنە هێشتا نەپساوە، ئەگەر بپسێ زۆر ترسناك دەبێ.

ـ قەت شتیوا نابێ، بۆ دەپسێ؟ دەتوانی زۆر بە شێنەیی گوشارەکە کەم بکەیتەوە، چونکە هیچ تەنگانەیەك نییە کە دەرووی دەربازبوونی نەبێ.

ـ زۆرم بیر لێکردۆتەوە. تەنیا دەروویێکی دەربازبوون هەیە...

ستیپان ئارکادیچ دیسان بە نیگا ترساوەکەیدا زانیی کە مەبەستی خوشکی لەو تەنیا ڕێگایە، مردنە. نەیهێشت قسەکەی تەوا بکات، گوتی:

ـ شتیوا مەڵێ، راوەستە. تۆ ناتوانی وەزعی خۆت وەکوو من حیساب بکەی. راوەستە با بیروڕای خۆمت راست و رەوان پێبڵێم ـ کە ئەوەی گوت دیسان بزە شیرینەکەی کە وەکوو رۆنی بادام نەرم و هێورکەرەوە بوو بە ئارامی نیشتە سەر لێوی. من هەر لە سەرەتای کارەوە دەستم پێکرد. تۆ شووت بە پیاوێك کرد کە بیست ساڵ لە خۆت گەورەتر بوو. لە لایەکی تریشەوە تۆ ئاشقی نەبووی، چونکە نەتدەزانی ئەشق چییە. دەبێ قەبووڵیشی بکەی کە ئەو کارەت هەڵە بوو.

ئانا گوتی: ئەویش چ هەڵەیەکی ترسناك!

ـ بەڵام دووپاتی دەکەمەوە تازە کارێکە و کراوە. داخ و دیقیش مەکە دڵی خۆتەوە چونکە هیچ دەردێك دەوا ناکات. دیسان دەبێ ئەوەش قەبووڵ بکەین کە بۆ بەدبەختی، کاتێك ئەشقت ناسی، ئاشقی پیاوێك جگە لە مێردەکەی خۆت بووی. ئەوەش چارەڕەشییەکی گەورەیە. بەڵام ئەوەش کارێکە و تازە هاتۆتە پێشێ، مێردەکەشت قەبووڵی کردووە و لە تاوانەکەت خۆش بووە ـ دوای هەر رستەیەك تۆزێ گتی دەگرت و چاوەڕوانی وەڵامی ئانا دەبۆوە، بەڵام ئانا متەقی نەدەکرد ـ ئەوە بارودۆخی ئێستایە، جا مەسەلەکە لێرەدایە ئایا دەتوانی درێژە بە ژیان لەگەڵ مێردەکەت بدەی یان نا؟ حەزدەکەی لەگەڵیدا بژیی؟ ئەویش حەزدەکات درێژە بە ژیان بدات لەگەڵ تۆدا؟

ـ نازانم، بەڕاستی نازانم.

ـ بەڵام خۆت گوتت ناتوانی بوونی ئەو لە ژیانتدا تامل بکەی.

ـ نا، نەمگوت. حاشا من شتیوا ناڵێم. نازانم، سەرم لە هیچ دەرناچێ.

ـ بەڵێ، بەڵام ئیجازە بدە...

ـ تۆ ناتوانی تێبگەی. هەست دەکەم خەریکم بە سەرەوە هەڵدەدێردرێم بۆ نێو گێژاوێك و تەنانەت مافی ئەوەم نییە هەوڵ بدەم بۆ رزگاربوونی خۆم. ناتوانم.

ـ خەم مەخۆ، ئێمە لە ژێرەوە خێوەتێك شتێك دەگرین و نەجاتت دەدەین. من زۆر باش دەزانم و تێدەگەم لە چ بارودۆخێکدای. دەزانم کە ناتهەوێ دڵت رازی بکەی و ئەوەی کە دەتهەوێ و هەستی پێدەکەی دەربیڕی.

ـ من هیچ شتێکم ناوێ، هیچ... تەنیا دەمهەوێ هەموو شتێك کۆتاییی پێبێ.

ـ بەڵام ئەو بارودۆخە دەبینێ و تێشیدەگا. تۆ بەڕاستی پێتوایە تاملکردنی ئەم کێشەیە بۆ ئەو ئاسانە؟ تۆ ئازار دەکێشی، ئەویش هەروا. ئاخرەکەشی ئەو کێشەیە دەبێ بەچی؟ ئێستا وایدانێین تەلاق کۆتایی بە کێشەکە دێنێ ـ دەربڕینی ئەو وشەیە بۆ ستیپان ئارکادیچ سانا نەبوو. کە ئەوەی گوت چاوێکی ماناداری لە ئانا کرد.

ئانا هیچی نەگوت و تەنیا سەرە مووکورتەکەی بە نیشانەی حاشا لەقاند. بەڵام ستیپان ئارکادیچ کە دیتی روخساری خوشکی رووناکیی تێگەڕا و جوانیی رابردووی بەخۆوە گرت تێگەیشت ئانا تەنیا بەو هۆیە ئەو داواکارییەی نییە چونکە بە بەختەوەرییەکی مەحاڵی دەزانێ.

ستیپان ئارکادیچ گوتی: من زۆرم دڵ بە هەردووکتان دەسووتێ، بە ئاواتەوە بووم بتوانم ئەو کێشەیە چارەسەر بکەم ـ ئەوەی گوت و بە جەسارەتێکی زیاترەوە پێکەنی و درێژەی بە قسەکانیدا: مەیڵێ، هیچ مەڵێ! من تەنیا هیوادارم خودا ئەو توانایییەم پێبدا کە ئەوەی لە دڵمدایە بیهێنمە سەر زمانم. دەڕۆم، دەڕۆم تاکوو چاوم بە ئەویش بکەوێ.

## بیست و دوو

ستیپان ئارکادیچ هەر بەو پۆز و هەوایەوە کە لە دایرە لەسەر کورسیی بەرپرسایەتی دادەنیشت خۆی کرد بە ژووری کاری ئەلکسی ئەلکساندرڤیچدا. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ هەردوو دەستی لە پشتەوە هەڵپێکابوو و لە نێو وەتاغەکەدا پیاسەی دەکرد. فیکری هەر لەو کێشەیە دەکردەوە کە ستیپان ئارکادیچ لەگەڵ ئانا هێنابوویە گۆڕێ.

ستیپان ئارکادیچ بە دیتنی زاواکەی خۆی کە بە پێچەوانەی خووخدە لە ناکاو حەپەسابوو، گوتی: مزاحیم نابم؟ـ بە مەبەستی شاردنەوەی حەپەسانەکەی ئەو قووتووە جگەرەیەی تازە کڕیبووی و دوگمەی زارکەکەی جۆرێکی نوێ بوو لە گیرفانی دەرهێنا و تۆزێ بۆنی پێوە کرد و جگەرەیەکی لێدەرهێنا.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بە ساردوسڕی وەڵامی دایەوە: نا، مزاحیم نییت. چیت دەوێ؟

ستێپان ئارکادیچ کە تۆزێ تووشی رووپامایی بووبوو و لەو حاڵەی خۆی کە تا رادەیەك نامۆ بوو بۆی، سەری سوورِما و گوتی: دەمویست... حەزم دەکرد.... بەڵێ، دەمویست برێکت قسە لەگەڵ بکەم.

ستێپان ئارکادیچ ئەو هەستەی لە دڵی خۆیدا هێندە بەلاوە نامۆ بوو و سەری لێیسوورِما کە بڕوای نەکرد ئەوە هاواری ویژدانی بێت، کە پێی دەڵێ ئەو کارەی دەیهەوێ بیکات کارێکی خراپە. گوشاری بۆ خۆی هێنا تاکوو بە سەر رووپامایییەکەیدا زاڵ بێت.

بە روخساری سوورهەڵگەڕاوەوە گوتی: هیوادارم لە خۆشەویستیی من بۆخوشکم و هەروەها ئەو رێزە تایبەتەی بۆ خۆتم هەیە دڵنیا بی.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ دیسان متەقی نەکرد، بەڵام ئەو حاڵەتی خاکەڕایی و ئامادەبوون بۆ فیداکاری و لەخۆبردوویییەی لە سیمایدا دیاربوو ستێپان ئارکادیچی تووشی سەرسوورِمان کرد.

ستێپان ئارکادیچ هەروا کە لەگەڵ شەرمێونی بەربەرکانێی دەکرد گوتی: مەبەستم ئەوەبوو... دەمویست سەبارەت بە خوشکم و کێشەی نێوانتان قسەت لەگەڵ بکەم.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بزەیەکی خەماوی نیشتە سەرلێوی و چاوی لە ژنبراکەی کرد و رۆیشت بۆ لای مێزی نووسینەکە و نامەیەکی نیوەنووسراوی هەڵگرت، دایە دەستی و گوتی: من هەر لە بیری ئەودا بووم و پێم وابوو لە رێگای نووسینەوە باشتر دەتوانم مەبەستی خۆم بگەیێنم و دەزانم ئەویش تاقەتی دیتنی منی نییە، بۆیە خەریکبووم نامەم بۆ دەنووسی.

ستێپان ئارکادیچ نامەکەی لێ وەرگرت و بە واقوڕمان و شێواوییەوە لە چاوانی کزی کارنینی روانی کە لە ئەوی بڕیبوو و نامەکەی خوێندەوە.

«دەزانم کە دیتنی زۆر بەلاتەوە ناخۆش و تاڵە. ئەگەرچی ئەوە بۆ من زۆر دژوارە بەڵام دەبینم بارودۆخەکە ئاوایە و دیارە هەر ئاواش دەبێ. لۆمەت ناکەم و خودا بە شایەد دەگرم لەو ماوەیەدا کە نەخۆش بووی بە گیانو دڵ بڕیارم دابوو هەموو ئەو کێشانەی لە نێوانماندا بووە لە بیریان بەرەمە و ژیانێکی نوێ دەست پێبکەم و قەت لەو کارەی کردوومە پەشیمان نەبمەوە و دوای ئەوەش ئامانجی من تەنیا چاکەکاری و رزگاربوونی ئێوەیە لەو کێشەیە و ئێستاش کە دەبینم ئەوەی دەمویست و بیرم لێدەکردەوە نالوێت، حەزدەکەم بزانم چی دەبێتە هۆی بەختەوەریی راستەقینە و حەسانەوەی رۆحی ئێوە. من سەرم لە پێناوی خواست و هەستی ئینسانی ئێوەدایە.»

ستێپان ئارکادیچ نامەکەی دایەوە بە کارنین و چونکە نەیدەزانی بڵێچی هەروا بەو سەرسوورِمانەی پێشترەوە چاوی لە مێردی خوشکی بڕی. ئەو بێدەنگییە بەڕادەیەك بۆ هەردوو لایان تاڵ بوو کە کاتێك ستێپان ئارکادیچ لە کارنین رامابوو لەرزینێکی نەخۆشانە کەوتە سەرلێوی.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ رووی لێ وەرگێڕا و گوتی: ئەوەی دەمویست پێیبڵێم ئەمە بوو.

ئابلۆنسکی کە ئۆناقێکی تاڵ گەرووی رێکدەگوشی و لەبەر دڵپڕی نەیدەتوانی وەڵامی بداتەوە، زۆر بە زەحمەت گوتی: بەڵێ، بەڵێ... ـ ئاخری گوتی: بەڵێ، بەڵێ، زۆر باش لە حاڵی ئێوە تێدەگەم.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ پرسیی: حەزدەکەم بزانم بەڕاستی خوشکت چیی دەوێ.

ستیپان ئارکادیچ گوتی: دەترسم خۆشی نەزانێ و سەری لە کار و کێشەی خۆی دەرنەچێت. ئەو ناتوانێ بڕیاربداتـ پاشان وتەکەی خۆی راست کردەوە و گوتی: ئەو لە ژێر باری گەورەییی تۆدا هەست بە تێکشکان دەکات و ئەگەر ئەو نامەیە بخوێنێتەوە ناتوانێ وەڵام نەداتەوە و دەزانم بۆ گەورەییی ئێوە سەر دادەنەوێنێ.

ـ دەی دەبێ چ بکەین؟ چۆن بزانین ئەو چیی دەوێ؟

ـ ئەگەر ئیجازە بفەرمووی من بیروڕای خۆمت عەرز دەکەم. من پێموایە تەنیا خۆت دەتوانی تەگبیرێکی وابکەی کە کۆتایی بەو بارودۆخە ناخۆشە بێنێ.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ قسەکەی پێبڕی: کەواتە تۆ پێتوایە دەبێ کۆتاییی پێبێت.ـ دەستی خۆی بە شێوەیەکی نائاسایی لەبەر چاوی راتەکاند و درێژەی پێدا: بەڵام چۆن؟ من هیچ دەرووییێکم پێشك نایە کە بتوانین لێوەی دەربازبین.

ئابلۆنسکی شڵەژا و هەستایە سەرپێ، گوتی: هیچ تەنگانەیەك نییە کە رێگای دەربازبوونی نەبێ. سەرەتا تۆ دەتویست پێوەندییەکەتان بپسێنی... ئەگەر ئێستاش لەسەر ئەو باوەڕەی و ناتوانن یەکتر بەختەوەر بکەن...

ـ بەختەوەری لێکدانەوەی جۆراوجۆری هەیە. بەڵام وای دانێ من بە هەموو کارێك رازی بم و هیچ داواکارییەکیشم نەبێ، چ دەرووییێك دەبینی بۆ دەربازبوون لەو تەنگژەیە؟

ستیپان ئارکادیچ هەر بەو بزە شیرینەوە کە کاتی قسەکردن لەگەڵ ئانا نیشتبووە سەر لێوی و وەك رۆنی نەرمکەرەوە بوو گوتی: ئەگەر بیروڕای منت دەوێ... ـ ئەو بزەیە کە لێوڕێژ بوو لە مێهرەبانی بە رادەیەکی قانع کرد کە بێ ئیختیار هەستی بە کەمایەسیی خۆی کرد و ملی داخست و ئامادەبوو ئەوەی ئابلۆنسکی دەیڵێ قەبووڵی بکات. ئابلۆنسکی درێژەی بە قسەکانیدا: ئانا بەلای ئەوەدا هەر نەچوو خۆشی لەو دارەتە نەدا. بەڵام تەنیا رێگاچارەیەك بۆ دەربازبوون لەو کێشەیە و ئاناش لەو داواکارییە زیاتر پێموانییە بیبێت، ئەویش ئەوەیە کۆتایی بە پێوەندی و هەموو ئەو بیرەوەرییانە بێنن

که رابردوو بۆ ئەوی زیندوو دەکاتەوە. بە بڕوای من چارەی ئێوە هەر ئەوەیە پێوەندیی تازەی نێوانتان روون بکەنەوە. ئەو پێوەندییە تازەیەش تەنیا بەو شەرتە دەوام دێنێ کە هەردوو لاتان ئازاد بن.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بە بێزارییەوە قسەکەی پێبڕی و گوتی: تەڵاق...

ستیپان ئارکادیچ سوورهەڵگەڕا و گوتی: بەڵێ، پێموایە تەڵاق تەنیا رێگا چارەیە و بۆ ژن و مێردێکی وەك ئێوە ماقووڵانەترین کارە. چی دەکرێ؟ کاتێك دوو کەس دەبینن کە ژیانی هاوبەشیان تاڵ بووە و پێکەوە ناسازێن... ئەوەش لەوانەیە هەمیشە روو بدات.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ چاوی قووچاند و هەناسەیەکی هەڵکێشا.

ئابلۆنسکی کە جارلەگەڵجار بە سەر شەرمەکەی خۆیدا زاڵ دەبوو گوتی: لێرەدا تەنیا مەسەلەیەك دێتە گۆڕێ، ئەویش ئەوەیە ئایا یەکێك لە ئێوە دەتوانێ و حەزی لێیە لەگەڵ سێهەمییەك ژیانی هاوبەش پێکبێنێ یان نا. ئەگەر حەزتان لێنەبێ کێشەکە زۆر سادەیە.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ کە لە ناخەوە دەهەژا و گرژ بووبوو لە بن لێوەوە شتێکی بە خۆی گوت، بەڵام وەڵامی نەدایەوە. ئەوەی بۆ ئابلۆنسکی تا ئەو رادەیە سادەی دەنواند ئەو هەزار جاری لە زەینی خۆیدا هەڵسەنگاندبوو و ئەو رێگا چارەی ستیپان ئارکادیچی نەك زۆر بەلاوە سادە بوو بەڵکوو بە شتێکی نەگونجاویشی دەزانی. ئەو بیری لە هەموو لایەنەکانی تەڵاق کردبۆوە و بە بڕوای ئەو بەو هۆیە نەدەگونجا چونکە ئابڕووی چەند ساڵەی خۆی و ئەو رێزەی بۆ ئایینی دادەنا ئیجازەی پێنەدەدا کە ئەو تاوانی خەیانەتەی دراوەتە پاڵ ژنەکەی بیگرێتە ئەستۆ، جا چبگا بەوەی بهێڵێ ژنێك کە ئەو لە تاوانی خۆش بووە و خۆشیدەوێ بە ئاشکرا تووشی تاوان بێت و ناوی بزڕێ. بەڵگەی گرینگیتریشی هەبوو کە وایدەکرد کاری تەڵاق مەحاڵ بێ.

ئەگەر ژنەکەی تەڵاق بدایە کوڕەکەی چی بەسەر دەهات؟ مەحاڵە بیسپێرێت بە ژنەکەی چونکە دایکێك کە تەڵاق وەردەگرێ ئیتر ژیانی بنەماڵەیی ناشەرعی دەبێ و حاڵی کوڕێکیش کە بەرهەمی ژیانی هاوبەشیی پێشووە لە چوارچێوەی بنەماڵەیەکی ئاوا ناپەسەندا دیارە پەروەردە و عاملاندنەکەی سەقەت دەبێ. ئەگەر لەلای خۆشی بێت کارەکەی رەنگی تۆڵە بەخۆوە دەگرێت و ئەو حەز ناکات تۆڵە لە ژنەکەی بکاتەوە. بەڵام جگە لەوانە هۆیەك کە زیاتر لە هەموو شتێك کاری تەڵاقی ئەستەم کردبوو ئەوەبوو ئەگەر بۆ تەڵاق رەزامەندی نیشان بدات ئەو کارە دەبێتە هۆی رووخانی یەکجاریی ئانا. قسەکەی داریا ئەلکساندرۆڤنا لە مۆسکۆ لە مێشکیدا نەخشی بەستبوو کە پێیگوتبوو بڕیاردان بۆ تەڵاق نیشانەی ئەوەیە تەنیا لە بیری کارڕاستیی خۆتدای و بەو کارە دەبیتە هۆی لەنێوچوونی ئانا. ئەو ئەم قسانەی بە لێبوردنی خۆی و خۆشەویستیی منداڵەکان پێوەند دابوو و ئێستا ئەوانەی بە شێوەی خۆی لێکدەدایەوە. یانی بە

تەڵاقدانی ئانا و ئازادکردنی ئەو لە قەیدی ژیانی هاوبەش، دوایین پێوەندیی خۆی لەگەڵ ژیانی منداڵەکانی دەپساند کە خۆشیدەویستن و ئاناشی لە دوایین بیانووی بۆ گەڕانەوە بەرەو ڕێگای باش و ئابڕوومەندانە بێبەش دەکرد و بێبەزەییانە بەرەو هەڵدێری دەبرد. ئەو دەیزانی ئانا، ئەگەر تەڵاق وەرگرێ دەچێت بۆ لای ڤرۆنسکی و پێوەندی ئەوان پێوەندییەکی ناشەرعی و ناپاك دەبێت، چونکە بەپێی یاسای کلێسە بۆ ژنێك کە مێردەکەی زیندوو بێ شووکردنەوە گونجاو نییە. ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بەخۆی گوت: ئەو دەچێ بۆ لای ڤرۆنسکی بەڵام دوو ساڵی پێناچێت یان ڤرۆنسکی واز لە ئەو دێنێ یان ئەو خۆی دڵدەدا بە کەسێکی تر و ئەگەر من بۆ تەڵاق ڕەزامەندی نیشان بدەم تاوانی ئەو هەڵە ناپاکییانە هەمووی لە ئەستۆی من دەبێت ـ ئەو سەدان جار ئەو بیر و خەیاڵانەی لە زەینی خۆیدا وەرد دەکردەوە و دڵنیا بوو کە تەڵاق بە پێچەوانەی بیروڕای ژنبراکەی، نەك کارێکی ساکار نییە، بەڵکوو زۆریش نەگونجاوە. ئەو هیچ کام لە قسەکانی ستیپان ئارکادیچی بەدڵ نەبوو. بۆ هەر وشەیەکیش هەزار جاری حاشا دەکرد. لەگەڵ ئەوانەشدا گوێی بۆ قسەکانی گرت و هەستی دەکرد کە ئەو وزە چەوت و وێرانکەرەی ژیانی ئەو ڕێنوێنی دەکات و ئەو ناچارە پێڕەویی لێبکات هەمووی بەو وشانە دەردەبڕدرێن.

ـ مەسەلەکە ئەوەیە کە تۆ بە چ شەرتێك بۆ تەڵاق ڕەزامەندی نیشان دەدەی؟ ئانا هیچ داواکارییەکی نییە و زات ناکات باسی تۆ بکات. بۆیە هەموو کارەکەی بە گەورەیی تۆ سپاردووە.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ وردەکارییەکانی هێنایەوە بیر خۆی، لە کاتێکدا کە مێرد خەتا بگرێتە ئەستۆ و بە شێوەی ڤرۆنسکی دەستی بە بەر دەموچاوییەوە گرت و هەستی بە شەرمەزاری کرد و لە دڵی خۆیدا گوتی «خودایە، ئاخر تاوانی من چییە؟»

ـ تۆ تووشی شڵەژان بووی، من باش تێدەگەم. بەڵام ئەگەر باشی بیر لێبکەیتەوە...

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بەخۆی گوت «ئەگەر کەسێك زللەی لە ڕوومەتی ڕاستەتدا ڕوومەتی چەپی بۆ ڕاگرە با لێیبدات، ئەگەر کەسێکیش ویستی کەواکەت لێبستێنێ عەباکەشتی پێشکەش بکە.»

دەنگی جیکن و شێوەقیژەی بەرزکردەوە: بەڵێ، بەڵێ! بەدناوی بۆ خۆم قەبووڵ دەکەم و تەنانەت واز لە کوڕەکەشم دێنم... بەڵام واچاك نییە ئەو باسە وەلا بنێین؟ ئەگەرچی، هەرکارێکت پێخۆشە بیکە....

ڕووی لە ژنبراکەی وەرگێڕا بۆ ئەوەی نەتوانێ ڕوخساری ببینێ و چووە سەر کورسیلەی بەرپەنجێرەکە دانیشت. زۆر دڵتەنگ و شەرمەزار بوو. بەڵام سەرەڕای ئەم خەم و شەرمەزارییە، بەهۆی خاکەڕایی و دڵفراوانییەوە لە دڵیدا هەستی بە شادی و نەرمییەکی زۆر دەکرد.

ستیپان ئارکادیچ خەم دایگرت و بێدەنگ بوو.

ئاخری گوتی: ئەلکسی، بڕوام پێبکە ئانا قەدری ئەو گەورەیی و دلفراوانییەت دەزانێ ـ پاشان گوتی: بەلام وادیارە خودا وای بە باش زانیوە ـ کە هەستی کرد قسەیەکی نابەجێ و بێ مانای کردووە بە دژواری توانیی ددان بە خۆیدا بگرێ و پێنەکەنێ.

ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ دەیویست وەلامی بداتەوە بەلام ئۆناق گەرووی رێکدەگوشی و بێدەنگ بوو.

ستیپان ئارکادیچ گوتی: ئەوە کارەساتێکە و قەوماوە، دەبێ قەبوولی بکەین. من ئەو کارەساتە وەك کارێکی ئەنجامدراو قەبوول دەکەم و هەولّ دەدەم یارمەتیی ئێوەش بدەم.

کاتێك ستیپان ئارکادیچ لە وەتاغی ژنبراکەی هاتەدەرێ خەم دایگرتبوو بەلام ئەو حالّە نەبووە هۆی ئەوەی بڕوای بە کارەکەی خۆی نەبێ و دلّی پێی خۆش نەبێ چونکە دلّنیابوو ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لە قسەی خۆی پاشگەز نابێتەوە. هۆکارێکی دیکەش لەگەلّ رەزامەندییەکەی ئەو ئاوێتە دەبوو. ئەو بیرە لە زەینیدا گووڕابوو کە کاتێك ئەو کارە سەریگرت ئەو ئەم مەتەلۆکەیە لە ژنەکەی و هاوڕێ نزیکەکانی دادێنێ: جیاوازیی من و چەقۆ چییە؟ وەلام: چەقۆ دەبڕێ، بەلام هیچ کەس رازی ناکات، بەلام من بڕیم و لەگەلّ ئەوەدا سێ کەسیشم رازی کرد، یان چاکترە ئەمە بلّێم: چ وێچوونێك هەیە لە نێوان من و... ـ بە پێکەنینەوە بە خۆی گوت «نا، بیردەکەمەوە و شتێکی باشتر دەدۆزمەوە.»

## بیست و سێ

ئەگەرچی تیرەکەی ڤرۆنسکی لە دلّی خۆی نەدرابوو بەلام برینەکەی مەترسیدار بوو و چەند رۆژ ئەوی لە نێوان مەرگ و ژیاندا راگرت. کاتێك بۆ یەکەم جار قسەی کرد، تەنیا ڤاریای براژنی لە ژوورسەری بوو.

ڕاست چاوی لە چاوی بڕی و گوتی: ڤاریا، تۆ دەبێ بزانی من گوللەکەم لەدەست دەرچوو. تکات لێدەکەم قەت لەو بارەوە لەگەلّم مەدوێ و هەرکەسیش پرسیاری لێکردی هەر ئەوە بلّێ، دەنا کارەکەم زۆر قۆڕ و گەوجانە دەنوێنێ.

ڤاریا هیچ وەلامێکی نەدایەوە و بە سەریدا داهاتەوە و بە بزەیەکی پڕشادییەوە چاوی تێبڕی. چاوانی ڤرۆنسکی گەش بوون و تاویاویان پێوە دیارنەبوو بەلام زۆرخەمناك و جیددی دیاربوون.

گوتی: چاکە، خودا شوکر. هیچ کوێت نایێشێ؟

ڤرۆنسکی سینگی نیشاندا و گوتی: ئێرەم کەمێك.

ـ کەوایە با پانسمانەکەت بۆ بگۆڕم.

کاتێك ڤاریا برینپێچییەکەی بۆ دەگۆڕی، ڤرۆنسکی شەویلاکە و ددانی توند بە سەریەکدا نابوو چاوی لێدەکرد. کاتێك کارەکەی تەواوبوو ڤرۆنسکی گوتی:

ـ ئەو قسەیەی دەیکەم وڕێنە نییە. تکات لێدەکەم کارێك بکە هیچ کەس باسی ئەم رووداوە نەکات کە من بە قەستی خۆکوشتن گوللەم لە خۆم داوە.

ڤاریا بە بزەیەکەوە چاوی پڕپرسیاری تێبڕی و گوتی: هیچ کەس قسەی واناکات. تەنیا هیوادارم کە ئیتر گوللەکەت بە هەڵە دەرنەچێت.

ـ ئیتر دەرناچێت. بەڵام خۆزگە دەرچووبایە و...

بزەیەکی خەماوی نیشتە سەرلێوی.

سەرەڕای ئەو قسانە و بزە خەماوییەکەی کە ترسی خستە دڵی ڤاریاوە، کاتێك تاویاوەکەی نیشتەوە حاڵی بەرەو چاکبوونەوە بوو، هەستی کرد باری خەمەکەی سووك بووە. وەك ئەوە وابوو کە بەو کارەی پەڵەی نەنگ و شوورەییەك کە بەر لەوە تامڵی کردبوو لە خۆی سڕیوەتەوە. ئێستا دەیتوانی بە ئاسوودەیی بیر لە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ بکاتەوە. ئێستا بۆی روون بووبۆوە کە کارنین پیاوێکی جوامێر و دڵفراوانە و لە هەمبەر گەورەیی ئەودا هەستی بە سووکایەتیی خۆی نەدەکرد. جگە لەوەش دیسان کەوتبۆوە سەر رچەی پێشووی ژیانی. دەیدی کە دەتوانێ بەبێ شەرمەزاری چاو لە چاوی خەڵکی بکات و درێژە بە ژیانی ئاساییی خۆی بدات و خۆی بداتەوە دەست خووخدەکانی خۆی. بەڵام هەستێکی بوو کە سەرەڕای هەوڵی بەردەوام نەیدەتوانی لە دڵی خۆی دەربکات و ئەو داخە قورسەشی بۆ ئەوە بوو کە ئانای بۆ هەمیشە لە دەستدابوو و ئەو هەستەش بەرەو سنووری ناهومێدی دەیبڕەتاند. چونکە کفارەی تاوانەکەی لە هەمبەر ئەو مێردە غەدر لێکراوەدا دایەوە لە دڵەوە بڕیاریدا دەست لە گراوەکەی دابشۆرێ و ئیتر نەکەوێتە نێوان ئەو و مێردەکەیەوە کە لە تاوانی خۆی پەژیوان بووبۆوە، بەڵام نەیدەتوانی داخی لەدەستدانی ئەشقی ئانا لە دڵی پاك بکاتەوە و بیرەوەریی ئەو کاتە شیرینانەی لەگەڵی رایبواردبوو و لە رابردوودا قەدری ئەو کاتانەی نەزانیبوو لەبیربەرێتەوە. بەڵام ئێستا ئەو یاد و بیرەوەرییە شیرینانە ئاراوقارایان لێهەڵگرتبوو.

سێرپووخۆڤسکۆی ئەرکێکی سەربازیی بۆ داتاشی بۆ ئەوەی بینێرێت بۆ تاشکەند، ئەویش بەبێ شك و دوودڵی قەبووڵی کرد، بەڵام هەرچەندە کاتی وەڕێکەوتنەکەی نزیك دەبۆوە فیداکارییەکەشی لەو رێگایەدا کە بە ئەرکی سەرشانی خۆی دەزانی قورستر دەبوو.

برینەکەی چاك بووبۆوە و ئێستا دەروژووری دەکرد و خەریکبوو خۆی بۆ سەفەری تاشکەند ئامادەدەکرد.

لە دڵی خۆیدا گوتی «خۆزگە دەمتوانی جارێکی تر چاوم پێیبکەوێ و دوای ئەوە بشمرم چش.» کاتێك بۆ ماڵئاوایی چوو بۆ لای پرێنسس بێتسی و ئەو فیکرەی لەگەڵ هێنایە گۆڕێ، هەر بۆیە بێتسی چوو بۆ لای ئانا و وەڵامی رازی نەبوونی ئەوی بۆ ڤرۆنسکی هێنایەوە.

ڤرۆنسکی کە ئەو هەواڵەی بیست بە خۆی گوت «چاکتر، خۆسووك کردن و لاوازیش رادەیەکی هەیە، خەریکم بەو خۆبەدەستەوەدانە هەموو وزەی خۆم بفەوتێنم.

بەیانیی رۆژی دوایی بێتسی خۆی چوو بۆ دیدەنیی ڤرۆنسکی و هەواڵی بۆ هێنا کە ئابلۆنسکی دڵنیایە کە ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ رازی بووە تەڵاقی بدات و بەو شێوەیە دەتوانێ چاوی بە ئانا بکەوێت.

ڤرۆنسکی بێ ئەوەی تەنانەت بیهەوێ بێتسی بەرێ بکات، هەموو بڕیارەکانی خۆی لەبیربردەوە و بێ ئەوەی بپرسێ کەنگێ دەتوانێ بچێت بۆ دیتنی ئانا یان بزانێ کە مێردەکەی لە ماڵێیە یان نا لەرێوە رۆیشت بۆ ماڵی کارنین. بێ ئەوەی شتێك یان کەسێك ببینێ بە زەحمەت توانیی بەرگری لە هەڵاتنی خۆی بکات و بە تاڵووکە بە پێپلیکانەکاندا سەرکەوت و خۆیکرد بە ژوورەکەی ئانادا. بێ ئەوەی بیر بکاتەوە یان تێبگات ئانا بە تەنیا لە ژوورێیە یان کەسێکی تریشی لێیە باوەشی پێداکرد و دەست و دەموچاو و گەردنی ماچباران کرد.

ئانا کاتێك بیری لە گریمانەی دیدارێکی ئاوا دەکردەوە وەڵامی خۆی لە زەینیدا دادەرِشت بەڵام فریا نەکەوت وەڵامە ئامادەکراوەکەی پێبداتەوە و سۆزی ئەشقی ڤرۆنسکی سەرتاپای داگرت. دەیویست ئەو و خۆی ئارام بکاتەوە بەڵام تازە درەنگ بوو. ئاوری ڤرۆنسکی ئەویشی گرت و لێوی وا دەلەرزی هەتا ماوەیەك نەیتوانی قسە بکات. ئاخری دەستی ڤرۆنسکیی بە سینگی خۆیەوە گوشتی و گوتی: بەڵێ، رۆح و گیانی منت داگیرکردووە و من بۆ تۆ دەژیم.

ڤرۆنسکی گوتی: لە سەرەتاوە دەبوو هەروابێ و هەتا زیندووشین هەروا دەبێ. ئەوەش شتێکە کە ئێستا تێیدەگەم.

ئانا، کە جار لەگەڵ جار رەنگی هەڵدەبزرکا، سەری ئەوی بە سینگی خۆیەوە گوشی و گوتی: بەڵێ، راستدەکەی. بەڵام دوای ئەوەی بە سەرمان هات ئەم بارودۆخەی ئێستا شتێکی ترسناکی لەخۆ گرتووە.

ڤرۆنسکی سەری هەڵێنا و بە برەیەك کە ددانە سپی و قایمەکانی وەدیارخست گوتی: ئەوانە هەمووی تێدەپەڕن، بەسەر دەچن، ئێمەش بەختەوەر دەبین. ئەشقی ئێمە ئەگەر هێشتا رێگای هەبێ بۆ ریشە داکوتان بەو هۆیەوە ریشە دادەکوتێ چونکە شتێکی ترسناکی لەخۆ گرتووە.

ئانا نەیدەتوانی بە پێکەنینەوە وەڵامی نەداتەوە و وەڵامەکەشی نەك بە وشە، بە نیگا پڕتروسکەکەی بوو. دەستی ڤرۆنسکیی گرت و لە روومەتی ساردی خۆی هەڵساوی و کردی بە نێو قژە کورتەوە کراوەکەیدا.

ـ من بەو قژە کورتەوە ئیتر ناتناسمەوە. چەندە جوان بووی! وەك کوڕێکی منداڵ دەچی! بەڵام رەنگت زۆر پەڕیوە.

ئانا بە پێکەنینەوە گوتی: بەڵێ، زۆر کز بووم ـ دیسان لێوی کەوتەوە لەرزین.

ڤرۆنسکی گوتی: ئێمە دەچین بۆ ئیتالیا و تۆ دیسان لەشساخیی خۆت وەدەست دێنیتەوە.

ئانا لە نزیکەوە چاوی لە چاوی ئەو بڕی و گوتی: یانی بەڕاستی دەکرێ ئێمە پێکەوە وەك ژن و مێرد وابین و پێکەوە بنەماڵەیەك پێکبێنین؟

ـ من تەنیا سەرم لەوە سووڕماوە کە چۆن ماوەیەك کەوتمە سەر ئەو خەیاڵەی کە واز لە ئەشقی تۆ بێنم!

ئانا خەیاڵ هەڵیگرت و لە پەنای روومەتی ڤرۆنسکییەوە چاوی لە خاڵێکی پشتسەری ئەو بڕیبوو. گوتی: ستیڤا دەیگوت ئەو هەرچی من بیڵێم قەبووڵی دەکات، بەڵام من ناتوانم خۆم بکەمە بەرمنەتی ئەو جوامێرییەی ئەو. من تەڵاقی لێ وەرناگرم. ئێستا ئیتر کەوتوومەتە ئەولای بێتفاقییەوە، هەرچی دەبێ با ببێ! تەنیا نازانم سەبارەت بە سریۆژا چ بڕیارێك دەدات.

ڤرۆنسکی بە هیچ شێوەیەك تێنەدەگەیشت کە ئەو لەو کاتەدا چۆن دەتوانێ بیر لە کوڕەکەی یان لە تەڵاق بکاتەوە. یانی ئێستا شتێك هەبوو کە بەلایەوە گرینگ بێ؟

ڤرۆنسکی دەستی ئانای توند گرتبوو و هەوڵی دەدا تاکوو سەرنجی ئەو بۆ لای خۆی رابکێشێ، گوتی: باسی ئەوانە مەکە، هەر بیریشی لێمەکەوە ـ بەڵام ئانا هەروا خەیاڵی فڕیبوو.

ئانا گوتی: ئاخ، بۆ من نەمردم؟ چەند خۆشدەبوو بمردایەم! لیزگەی فرمێسك بە نەرمی بە روومەتیدا هاتە خوارێ، بەڵام هەوڵی دەدا زەردە بگرێ تاکوو بە خەمەکەی خۆی دڵدارەکەی تووشی دڵتەنگی نەکات.

ڕەتکردنەوەی ئەو ئەرکەی پێیان سپاردبوو، یانی سەفەری پڕمەترسی و پڕشانازیی تاشکەند لەگەڵ کاروبارەکانی پێشووی ڤرۆنسکی کارێکی پڕ لە شوورەیی و مەحاڵ بوو، بەڵام ڤرۆنسکی ئێستا بەبێ دوودڵی لەو سەفەرەی تاشکەند پاشگەز بووبۆوە و کە بۆی دەرکەوت ئەو بڕیارە لە روانگەی بەرپرسەکانییەوە زۆر کارێکی ناحەز و ناپەسەندە، وازی لە خزمەتی ئەرتەش هێنا.

مانگێك دوایی ئەلکسی ئەلکساندرڤیچ لەگەڵ کوڕەکەی خۆی لە ماڵێ بە تەنیا مایەوە، ئانا تەڵاقی وەرنەگرت بەڵکوو بە توندی خۆی لێبوارد و لەگەڵ ڤرۆنسکی تێیتەقاند بۆ دەرەوەی وڵات.